# پرس و ڕاوێژ
# لەسەر ئەحکامەکانی نوێژ
## (پاکژیی – نوێژ)

نجم الدين فرج احمد

بەرگی یەکەم

چاپی یەکەم

١٤٣٢ك - ٢٠١١ ز

ناوی کتێب بەکوردی: پرس و راوێژ لەسەر ئەحکامەکانی نوێژ
نوسینی: نجم الدین فرج احمد
بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر
نەخشەسازی ناوەوە: جمعە صدیق کاکە
خەت: نەوزاد کۆیی
بەرگ: أمین مخلص
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٣٢ك — ٢٠١١ز
تیراژ: ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپیاردنی ( ١٨٨٣ ) ساڵی ٢٠١٠ پێدراوە

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و راگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٢٨
مۆبایل : ٢٢ ٥١ ٤٦٠ ٠٧٥٠ - ٩١ ٧٢ ١٣٨ ٠٧٧٠
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

بسم الله الرحمن الرحيم

انَ الحَمْـدَ للهِ نَحْمَـدُهُ ونَسْـتعِينُهُ ونَسْـتغْفِرُهُ، ونَعُـوذُ باللهِ مِنْ شُرورِ أنفُسِنا ومِنْ سَيِّئاتِ أعْمالِنا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَن يُضلِلِ فلا هادِيَ لَـهُ. وأشْهَدُ أنْ لا الـهَ إلا اللهُ وأشهَدُ أنَّ محمداً عَبدُهُ ورسُولُهُ.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا

أمَّا بعدُ: فإنَّ أصْدَقَ الحَـديثِ كِتـابُ اللهِ، وخَـيرَ الهَـدِي هَدْيُ محمدٍ (صلى الله عليه وسلم)وشَرَّ الامُورِ مُحْدَثاتها، وكُلَّ مُحْدَثةٍ بدْعَـةٌ وكُـلَّ بدْعَـةٍ ضَلالَةٌ، وكُـلَّ ضَلالةٍ في النّارِ

# پێشەکی

## الحمد لله رب العالمين و الصلاة و السلام على رسوله الامين محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

قورئان و سوننەت زۆریان جەخت لەسەر نوێژکردن کردۆتەوە، نوێژ لەو فەرزە خواییە مەزنانەیە کە نابێت بە هیچ شێوەیەك وازی لێ بهێنرێت، کاتێکی زۆری موسوڵمانی پابەند بە نوێژ دەڕوات، موسوڵمانە سەرڕاستەکان واز لەو کارو پیشانەیان دێنن کە نوێژیانی تێدا دەچێت، هەرچەندە پارەو دەسکەوتیشی زۆر بێت، چونکە نوێژکردنەکەیان پێ گرنگترە.. لەبەر ئەو گرنگیەتی کە دەبینیت پێنجیەکی هەموو کتێبێکی شەرع باسی نوێژ دەکات، کتێبێکی وەکو (نَيلُ الأوطار)ی شەوکانی لە چواریەکی زیاتر باسی نوێژە.. لە ناو هیچ میللەتێکیشدا نابینیت کتێبی تایبەت لەسەر نوێژ نەنوسرابێت، مەگەر میللەتی کورد!! شتێکی سەیرە کە لەوسەری وولاتی مەندناوەوە (باشوری فیلیپین) بۆ گامبیا (لە رۆژئاوای ئەفریقا) یان لە فنلەنداوە (لە باکوری گۆی زەوی) بۆ ئوسترالیا (لە باشووری گۆی زەوی) دەبینیت موسوڵمانان بە زمانی خۆیان کتێبیان لەسەر نوێژ نوسیووە، تەنانەت کتێب دەبینی بە ناوی (نوێژی حەنەفی)یەوە دانراوە! کەچی کورد کە زیاتر لە سەد ساڵە بە کوردی دەنوسێت کتێبێکی تێروتەسەلی لەسەر ئەو روکنە خواییە جێ بایەخە نیە، ئەو روکنەی کە هەندێ شەرعناسی وەکو ئیمامی ئەحمەد وازلێهێنانی وەکو لادانی شەرع لە داوەری حسێب کردووەو هەردووکیانی

بە كافربوونێك داناوە كە كەسی وازلێهێن لە دین و ئوممەت دەچێتە دەرەوە!

لەوەش سەیرتر لە ناو كوردا ئەوەیە كە مەلاو داعیش نابینیت شارەزابوونی لە نوێژ كردبێتە ئەركێكی سەرەكی.. سەدانیان دەبینیت كتێبێكی پاك و پوختی وەكو (صفة صلاة النبي صلى الله عليه وسلم)ی شێخی ئەلبانی رەحمەتی بۆ نوسراوەو خراوەتە بەردەستی، كەچی ئەوەندە خۆی ماندوو ناكات بیخوێنێتەوەو نوێژەكەی خۆی لەبەردا راست كاتەوە! لە كاتێكدا كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم جاری وا هەبوو نوێژی بۆ یەك یەكی یاوەرانی راست دەكردەوە..

بەرهەمی زركەتاڵی ئەم بایەخ نەدانە بە شەرع و روون نەكردنەوەو بڵاونەكردنەوەی بە گشتی لە لایەن مەلای كوردەوەو شارەزانەبوونی خەڵكیش لە نوێژ وای كرد كە نەوەیەكی گەنجی كورد دروست ببێت كە ـ بەقەدەر باپیرو نەنكە نەخوێندەوارەكانیشیان ـ دەربارەی نوێژ نەزانن ..

گەنجێكی كورد لە شارێك لە شارەكانی نەرویجەوە پرسیارێكی بۆ ناردم كە دەڵێ: (من نازانم نوێژ بكەم، ئایا بۆم هەیە تەنها ئەڵڵاهو ئەكبرەكانی بكەم؟) ناچار گەنجێكی ترم بۆ ئەو شارە ناردووە تا چۆنیەتی نوێژەكەی فێر بكات!! لە كاتێكدا لە باكوری نەرویج كە باكوری هەموو دنیایە نەرویجی هەیە موسوڵمان بووەو فێریش بووە نوێژەكەی بە عەرەبی بكات..

حاڵی نەبوونی ئەم گەنجانە لە دینەكەو نەزانینی نوێژكردنیان خەمێكی زۆری خستبووە سەر كۆڵم، هەرچەندیشم دەكرد كاتی ئەوەم نەدەدۆزیەوە بكەومە نوسینی كتێبێكی تایبەت لەسەر نوێژ، چونكە

رۆژانە بە وەڵامدانەوەو ئاڕاستەكردنی ئەو هەموو گەنجەی كوردەوە خەریك دەبووم كە بە ئەوروپادا بڵاوبووبوونەوە.. تا ناچار بووم كاتێك بڕەخسێنم بەو ئومێدەی كورتەیەك دەربارەی نوێژ بنووسم، بەڵام كە كەوتمە ناو باسەكانەوە، هی ئەوە نەما بە كورتە كتێبێك دەرچم، چونكە هەر سەرباسەكان و یەك بەڵگە لەسەریان دەیكردە زیاتر لە سێسەد لاپەڕە! بۆیە بە ناچاری بە خەڵكەكەم ڕاگەیاند كە تا شەش مانگ تەلەفۆنم دەبڕم و لەسەر تۆڕی پاڵتۆكیش دەرس ناڵێمەوە بەڵكو كتێبێك لەسەر نوێژ بنووسم.. زیاتر لە هەشت مانگم سەرف كرد تا ئەم دوو بەشەی نوێژم بۆ تەواو كرا: (پاكژیی و چۆنیەتی نوێژكردن)كە دەكاتە بەرگی یەكەمی نوێژ..

بەرگی دووەمیش دوو بەشە:

- بەشی یەكەم: نوێژی سووننەت و كورتو كۆی نوێژ.
- بەشی دووەم: نوێژی كۆمەڵ و نوێژی هەینی و نوێژی جەنازە..

لەگەڵ ئەوەدا كە باسەكانی نوێژ لەم كتێبەدا زۆر دیارە بەڵام ئەوە ڕادەگێنم كە زۆر باسی تری فەرعی لەسەر نوێژ هەبووە كە بۆ ئەوەی قەبارەی كتێبەكە لەوە زیاتر نەبێت وازم لێهێناوە..

لاف ئەوە لێنادەم كە كتێبێكی زۆر گشتگیرم لەسەر نوێژ نوسیووە، بەڵام خوای گەورە لێمانی وەرگرێت دەتوانم بڵێم ئەوەی بۆ ئەنجامدانی فەرزی نوێژ داواكراوە لەم كتێبەدا هەیە والحمدلله.. چونكە لە باسەكانی پاكژییدا زۆر لە فەرموودەكانم هێناوەتەوەو بە دوای توێژینەوەی موحەقیقانی وەكو هەردوو ئیمامی ئینوحەجەرو نەوەوی و ئیبنو حەزمو شەوكانی و سددیق خان و ئیبنوعوسێمیندا چوومەتەوەو لە چۆنیەتی

نوێژکردنیشدا زۆرینەی باسەکانی شێخ محمد ناسروددینی ئەلبانی رەحمەتیم لێرەدا هێناوەتەوە کە لەسەر نوێژ نوسیوونی[١]..

بەشی پاکژی کە بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەیە کردوومە بە دە بەشی ترەوە ناوم ناوە باس، وەکو: باسی جۆرەکانی ئاو، باسی پیسیی، باسی پاك کردنەوە، باسی تارات، باسی سوننەتە سروشتیەکان، باسی دەستنوێژ، باسی مەسح، باسی غوسڵ، باسی تەیەمموم، باسی ئەو خوێنەی لە ئافرەتان دێت.. هەر باسێکیشم وەکو کۆبەندێکی سەربەخۆ بە بەتاڵ هێشتنەوەی لاپەڕەیەك لەوی پێش و پاش خۆی جوێ کردۆتەوە.. هەر باسێکیش چەندین مەسائیلی تری تێدایە، بۆ نموونە باسی مەسح دەبێتەوە بە چوار بەش: مەسح لەسەر خوفف، مەسح لەسەر گۆرەوی، مەسح لەسەر عەمامەو سەرپۆش، مەسح لەسەر گەچی شکاویی.. هەموو باسەکانی تریش هەر وان..

لە کۆتایی بەرگەکەشدا لیستی سەرباسەکان و مەسەلەکان بە ناوی (ناوەرۆك) بە دوورودرێژی دیاری کراوە کە لە چەند لاپەڕەیەکدان ..

## هەندێك ووردەکاریی هونەریانەی نوسینەکە :

١ ـ یەکێك لە خاڵە گرنگەکانی ئەم کتێبە ئەوەیە کە زاناو شەرعناس و سەرچاوەکان بە خوێنەر دەناسێنێت، بەڵام بە شێوەیەکی ئەکادیمی زانکۆیی، جگە لەوەی لە کۆتایی کتێبەکەدا لیستی ناوی سەرچاوەکان بە تەفسیلێکی رێژەیی نوسراون، دیسان هەندێك زاناو کتێب ناسێنراون، کە پێویستە قوتابی و خوێنەر سەرنج بداتە ریزبەندیی ساڵەکانی ژیانیان، تا

---

[١] ئەسڵی کتێبەکە کە ناوی (أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه وسلم) سێ بەرگە.

بزانێت چ پێشەوایەك پێش ئەوی تریان ژیاوە، یان کامیان قوتابی کامیان بوون.. جگە لەمەش لە لاپەڕەکانیشدا ئاماژەی خێرایان پێکراوە، بەڵام بە شێوەیەکی تایبەت کە هیوای ئەوەم بووە کە قوتابی زیرەکتر کات.

تا لاپەڕە دوو سەدی بەرگەکان ناوی نوسەر پاشان کتێبەکەی لە پەڕاوێزدا نوسراوە، لەوە بەدوا تەنها ناوی کتێبەکە نوسراوەتەوە، بۆ ئەوەی قوتابیەکەش وای لێ بێت تا ئەو شوێنە شارەزای ناوی شەرعناسان و کتێبەکانیان بووبێت.. بۆ نموونە تا ئەو شوێنە لە پەڕاوێزدا دەنوسرێت: (النووي: المجموع) یان (ابن قدامة: المغني).. بەڵام لەوە بەدوا دەنوسرێت: (المجموع، المغني).. تەنها ناوی کتێبەکە دەنوسرێت و ئەوە حسێب کراوە کە تۆ ئیتر ئەوە دەزانیت کە ئەم کتێبانە هی کێن..

٢ ـ ئاماژە بە لاپەڕەو بەرگی سەرچاوەکان وا نوسراوە، بۆ نموونە: المجموع (٧٢/١٥) واتە : بەرگی پازدە لاپەڕە حەفتاو دوو ..

٣ ـ نامەوێت لەبەر تەممەڵی یان گوێ پێنەدان، یان لەبەر خاتری مەسروفاتی چاپ کردن، سەڵاواتەکان لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بۆ بیدعەیەك کورت کەمەوەو بیان کەم بە ( ص، یان صلعم، یان د .خ) چونکە جگە لەوەی کە هەموو ئەمانە بیدعەن، رێزنەگرتنیشە لەو نێرراوە تایبەتەی خوای بەخشندەو لەو پێشەوا تاقانەمان کە ئەم دینەی پێگەیاندووین.. حسابیشم کرد هەموو سەڵاواتەکان (صلى الله عليه وسلم) و نووسینی (خوا لێی رازی بێت) کە بۆ یاوەرانم نووسیوە لە هەموو بەرگی یەکەمدا ناکاتە چەند لاپەڕەیەك، ئیتر لە هەزار نوسخە کتێبدا چەند لاپەڕەیەك چیە بۆ سەڵاواتدان لەو پێغەمبەرە خۆشەویستە صلى

الله علیه وسلم و ڕێزنان لە یاوەرە بەهیممەتەکانی خوا لێیان ڕازی بێت بەکار بهێنرێت ؟!

٤ ـ ناونیشانی بەش و باسەکانم بە فۆنتی گەورەو لە ناوەندی دێڕەوە نووسیووە هەروەها ئەو سەرباسانەی وام زانیووە کە لە چوارچێوەی باسەکانی خۆیاندا بڕێك سەربەخۆییان هەیە. بۆ نموونە باسەکانی دەستنوێژ هەر دەبێت روکنەکانی دەستنوێژو سوونەتەکانی دەستنوێژو دەستنوێژ شکان ببنەوە بە سەرباسی ناوەندی دێڕ.. یان روکنەکانی نوێژو بەتاڵ بوونەوەی نوێژ.. باسە لقیەکانیانیشم هێناوەتەوە سەری دێڕو بە فۆنتی جیاواز نووسیومن و خەتم بەژێردا هێناون، تا زیاتر دەرکەون..

٥ ـ لە هەموو مەسەلەیەکدا بەڵگەکانم هێناوەتەوەو ئەو فەرموودانەی لە بوخاری و موسلیم وەرنەگیرابن موناقەشەی حوکمی سەحیحێتی یان زەعیفیم بە نەقڵ کردنی حوکمی فەرموودەوانان روون کردۆتەوە، دوای ئەوەی ریوایەتی دروستیی فەرموودەکە ساغ بۆتەوە ئینجا هاتوومەتە سەر راو بۆچوونی شەرعناسان، یان راوبۆچوونیانم هێناوە لەگەڵ ئەو بەڵگانەی خۆیان پێ پشت ئەستوور کردووە.. جاری وا هەبووە زۆر لەسەر راجوێییەکانیان چووم، چونکە زانینی راجوێیی شەرعناسانیش زانستێکەو ئەوی پەی پێ نەبات درك بە بەرفراوانی شەرع نابات، وەکو قەتادە دەڵێ : (ئەوی راجوێیی شەرع نەزانێت بۆنی شەرعی بەسەردا نەچووە)[١] ! پاشان بۆ ئەوەی خوێنەری بەڕێز لە ڕاڕاییدا نەهێڵمەوە، دوای موناقەشەی راو بۆچوونی شەرعناسان ئەوەی پێم پەسەندتر بووە هەڵم بژاردووەو منیش تەبەننام کردووەو بۆ جویێ کردنەوەی هاتوومەتەوە

---

[١] ابن عبدالبر : جامع بیان العلم و فضله ( ٢/٤٦ ) .

سەری دێرو نووسیومە من پێم وایە ....... خەتیشم بەژێر زۆربەیاندا هێناوە .. بۆ ئەوەی ئەو خوێنەرەی تواناو تاقەتی خوێندنەوەی ئەو هەموو راجوێیی و ناکۆکیانەی نیە یان لەسەرەتاوە قەناعەتی بە تەرجیح دانەکەی من هەیەو پێی وایە من دوای توێژینەوەو خۆماندوو کردن ئەو بۆچوونەم پەسەندتر ناساندووە، ئەویش وەری بگرێت.. هیچ بۆچوون و حوکمێکم لە خۆمەوە نەنووسیوە، تا نەمزانیبێت چەندین زاناو شەرعناس ئەو بۆچوون و حوکمەیان دەرکردووە نەچووم بە لایانەوە، رۆڵی من هێنانەوەی رای هەموان و تا توانام بووبێت تەرجیح پێدانی بەهێزەکەیانم خستۆتە روو.. بەمەش وویستوومە وەرگرتنی شەرعەکە ئاسانتر بکەم.. بۆیە لەو باوەڕەدام ئەو کەسەی دەیەوێت فەتوای شەرعی من لەسەر مەسەلە شەرعیەکان بزانێت دەتوانێت یەکسەر تەماشای ئەوانە بکات کە لێم نووسیوە (پێم وایە ..) ، ئەو کەسەش کە دەیەوێت موناقەشەی بەڵگەکانم بکات، دەتوانێت هەموو باسەکە بخوێنێتەوە.. ئەگەر هەر قەناعەتی نەکرد خۆ بەزۆر بە بۆچوونی خۆمانیەوە پابەند ناکەین !

لە کۆتایی ئەم پێشەکیەدا داوام لە داعیە بەرێزەکان ئەوەیە قوتابیانی خۆیان لە نوێژەکە شارەزا کەن.. قوتابیەکانیش با بە بایەخەوە دیراسەی بەڵگەی نوێژەکانیان بکەن..

داواشم لەو براو خوشکە بەرێزانەی هەبوون و خوای گەورە توانای دارایی پێ بەخشیوون لە چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبەدا دەست نەگرنەوەو کەمتەرخەم نەبن، با بە توانای دارایی ئەوان دووسەد هەزار لەم کتێبە چاپ بکرێت و هەموو ماڵێکی کورد لە هەندەران و باشورو

ڕۆژهەڵاتی کوردستان دانەیەکی تێدا بێت تا وەکو (سەرچاوەی باسەکانی نوێژ) لەبەر دەستی هەموو موسوڵمانێکدا هەبێت، تا بە یارمەتی خوای گەورە زانینی ئەحکامی نوێژەکان لەبەر دەستی هەمواندا بێت..

خوای گەورە بەرەکەتی خۆی بخاتە ناو ئەم ڕەنجە کەمەوەو بیکاتە مایەی بەرچاوڕوونی موسوڵمانان و تێشوویەکی قیامەت بۆ نوسەرو خێرەومەندو بڵاوکارو گەیێنەرانی.. ئامین .

وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

والحمد لله رب العالمين

# چەند ڕێڕەوێکی پێویست

( ١ )

## پێناسەی شەرع :

لـە سـەرەتای هـاتنی ئیسـلامەوە زاراوەی شـەرع بـە زۆر مانـا بـەكار دەهێنرا:

. **شەرع بە مانای هەموو ئیسلام**: ئەمە پێناسەی نەوەی یەكەمی ئیسلامەتیە[١]، بەم مانایاشە تا ئێستا كۆمەڵگی كوردەواریدا چارەسەركردنی كێشەیەكی وەكو تەڵاقدا دەڵێ: بۆ حوكمی یاسا ئەوە دادگا، بۆ حوكمی شەرعیش ئەوە مەلا ..

. **شەرع زاراوەیەكی بە كوردی كراوی بەرامبەر زاراوەی (فیقه)ی عەرەبییە**: ئەمە بە كارهێنانی شەرعناسانی دوای یاوەران و تابعینە، كە بریتیە لە: زانستی شەرعناسیی (علم الفقه) كە زانستیەكی سەربەخۆی ئیسلامییە بۆ زانینی ئەو بڕیارو یاسا عەمەلییانە دامەزراوە كە بە پێی ڕێسا ڕاستەكان لە بەڵگە گشتیەكانی شەریعەتی ئیسلامەوە وەرگیراوە[٢] . لەم زانستەدا عەقائیدو تەفسیلاتی فیقهی دەستووری باس ناكرێت.

---

[١] عمر سليمان الأشقر : تاريخ الفقه الاسلامي ( ل ١١ ) .

[٢] الآمدي : الإحكام في أصول الأحكام ( ٥/١ ) .

**. سێیەم : شەرع بە مانای داوەری کردن (قەزاوەت) ە** : وەکو دەوترێت لەناو خۆیاندا شەرعیان کرد.. واتە کێشەیەك کە هەبوو لە ناو خۆیانداو هەر خۆیان داوەرییان کردو گەیشتنە چارەسەری..

ئەم کتێبەی بەردەست دەربارەی باسەکانی شەرعە وەکو پێناسەی (فیقە) بۆیە لە سەرەتاوە وەکو رەویەی شەرعناسانی کۆن بە باسی پاکژی دەست پێ دەکات. شەرعناسانی کۆن و زۆرینەی شەرعناسانی سەردەم کتێبە فیقهیەکانیان دابەش دەکرد بۆ (کتاب) کتابیش بۆ (باب) بابیش بۆ (مسائل) .. بۆیە بە کتاب (الطهارة) دەستیان پێ دەکرد پاشان کتاب (الصلاة) پاشان کتاب (الزکاه) ..

( ٢ )

**خوێندنی شەرع :**

ئەگەر خوێندنی شەرع وەکو خوێندنی ئەکادیمی ئەم سەردەمە لێ بکەین، دەبێ خوێندنەکە بکەینە سێ قۆناغ :

**قۆناغی سەرەتایی** : قۆناغی پێووتنەوە، بە عەرەبی پێی دەڵێن: (تەڵقین)[١] کردن . واتە قوتابی کتێبەکانی لەبەر دەستدا دەبن و مامۆستایەکی زانا دەیانڵێتەوە پێی، وەکو ئەوەی کە فەقێی کۆمەڵگەی کوردەواری دەچنە خزمەت مامۆستایانی ئایینی و کتێبی (فَتحُ القَریب)یان بۆ نموونە لە خزمەتدا دەخوێنن.. هەرچەندە بۆ دەسپێکی سەردەم لەو باشتر (الفِقهُ المَنهجي) یە .. ئەگەر کەسێك وویستی شەرع بە بەڵگەوە بخوێنێت دەشێت لای شارەزایەکی سەرەتایی (پوختەی فیقهی

---

[١] تەڵقین دادان نا کە بۆ مردووە !

شەریعەت) بخوێنێت کە تاریق هەمەوەندی نوسیوێتی، یان کتێبی (الوجیز في فقه السنة و الکتاب العزیز) کە بیستوومە کراوە بە کوردی ، یان (فِقْهُ السُّنَّة) ی سەید سابق بخوێنێت کە (تمَامُ المِنَّة) کەی شێخی ئەلبانیشی لەگەڵدا بێت، کە تەخریجی فەرموودەکانی فقه السنةی تێدایە.. بەڵام ناخۆشی ئەم کتێبەیان ئەوەیە کە سەید سابقی ڕەحمەتی جاری وا هەیە راو بۆچوونی جیاوازی دە شەرعناس دەهێنێتەوە بەڵام تەرجیح بە هیچیان نادات و خوێنەر لە ڕاڕاییدا بەجێ دەهێڵێت !

**قۆناغی بەراوورد کردنی راوبۆچوونەکانی ناو مەزهەب وزانینی بەڵگەی شەرعی:** بۆ نموونە پەی بەوە ببات بۆچی ئیمامی ئەبو یوسف کە قوتابی ئیمامی ئەبو حەنیفەیە لە پاك بوونەوەی پێستەی سەگ و بەراز بە خۆشکردنیان راو بۆچوونی لەگەڵ ئیمامی ئەبو حەنیفەدا جیاوازە؟ بەڵگەی کامیان بەهێزترەو چۆن؟! یان بۆچی ئیمامی نەوەوی کە پێشەوایەکی مەزهەبی شافیعیە لە مەسەلەی قنووتی نوێژی بەیانیاندا لەگەڵ ئیمامی شافیعیدا راجوێیە؟! رای کامیان بەهێزترەو چۆن؟ ئەمەش لە کۆمەڵگەی ئێمەدا عادەتەن بە مەلایەك دەکرێت کە چووبێتە سەرو کتێبی (کفایة الاخیار)[1] وەك ئەو مامۆستایانەی تەرجیحی

---

[1] کتێبی ( کفایة الاخیار في حل غایة الاختصار) نوسینی تەقیوددین ئەبوبەکری کوڕی محمدی کوڕی حوسەینی دیمەشقیە کە ساڵی ٨٢٩ ك کۆچی دوایی کردووە. کتێبێکی کورتی مەزهەبی ئیمامی شافیعیەو بەڵگەی شەرعی زۆری تێدایە، هەرچەندە زۆرینەی زەعیفە، بەڵام راو بۆچوونی پێشەوایانی مەزهەبەکەی لەخۆ گرتووەو تەرجیحیشی بە پەسەندترینیان داوە.. بۆیە زۆر جێ بایەخە. پێم باشە فەقێی کورد دوای فتح القریب ئەم کتیبە بخوینیت.. هەرچەندە بە داخەوە ئەمیش و ئیبنو حەجەری هەیتەمیش تەکفیری ئیمامی ئیبنو تەیمییە دەکەن ..

راجوێیی شەرعناسانی مەزهەبی شافیعی لە (توحفەی ئیبنو حەجەر)[١] دەوە دەدەن، یان کەسێك بێت کە دیراساتی شەرعی خوێندبێت جا لە زانکۆ بێت یان لە دەرەوەی، بە مەرجێك دوو بەرابەری کتێبی مەنهەجی خوێندنەکەی زانکۆی خوێندبێت. بە داخەوە زانکۆی ئێستا بە تایبەتی لە وولاتی موسوڵمانانداو بە تایبەتی تریش کۆلیجەکانی دیراساتی ئیسلامی شارەزای لێهاتوو بەرهەم ناهێنن..

## قۆناغی شەرعناسی و هەڵسەنگاندنی بەڵگەی مەزهەبەکان:

لەوانەیە هەر خۆی بگاتە ئـەوەی توێژینـەوە لەسـەر بەڵگـەکان بکـات یـان پـەنا بەرێتـە بـەر توێژینـەوەی زانایـانی تـری پسـپۆڕ کـە ئاسـان دەسـتی دەکەوێت.. بۆ نموونە کە لەوە دەکۆڵێتەوە بۆچـی لـە مەزهـەبی شـافیعیدا پیـاو دەسـتنوێژ لـە ژنـی دەشـواتەوەو لـە سـێ مەزهەبەکـەی تـردا دەستنوێژیان لێك ناشکێت؟! دەگەڕێتەوە سەر فەرموودەکانی جمهور[٢]، رای جـوداو دووری فـەرموودەوانان دەبینێـت لەسـەر سـەنەدی فـەرموودەکان، خـۆی سـەحیح و زەعیفیـانی بـۆ لێـك جـوێ ناکرێنـەوە، یـان ناتوانێـت تـەرجیح بـە توێژینـەوەی فـەرموودەوانێکیان بـدات، بۆیـە یەکسـەر توێژینەوەی شێخی ئەلبانی رەحمەتی وەردەگرێت، ئەمـە وەکـو بەڵگەکـە، بـەڵام وەکـو راوبۆچـوونی شەرعناسـیی مـەرج نیـە هـەر لـە ئەلبانیـەوە

---

[١] کتێبێکە ناوی (تحفة المحتاج بشرح المنهاج) نوسینی ئەحمەدی کوڕی محمدی کوڕی عەلی کوڕی حەجەری هەیتەمییە، کە ساڵی ٩٧٤ ك کۆچی دوایی کردووە، ئیعتیمادی زانایانی مەزهەبی شافیعی لەسەر ئەم کتێبەو چەند کتێبێکی ترە .

[٢] بە سێ لە چوار پێشەواکە (ئیمامانی ئەبو حەنیفەو مالیك و شافیعی و ئەحمەد) رەحمەتی خوایان لێ بێت دەوترێت جمهور . کە دەوترێت ئەمە رای جمهوورە یەعنی سێ لەم پێشەوا بەڕێزانە رای وایەو یەکێکیان رای جیاوازی هەیە..

وەربگرێـــت، چـــونکە فـــەرموودەوانی وا هەیـــە هـــەر شـــارەزای زانســـتی فەرموودەوانیەکەیەو شـەرعناس نیـە، هـەر وەکـو کـە هەیـە شەرعناسـەو پســـپۆڕی فـــەرموودەوانی نیـــە.. بۆیـــە ناشـــێت بـــە دووری بـــزانین کـــە توێژەرەوەیەکی شەرعناسی وەکو ئیبنو عوسێمینی ڕەحمەتی دەبینیت لـە حوکمی خوێندا بۆ نموونە یان لە حوکمی پـاکی شـەرابدا ڕای پێچـەوانەی ڕای ئەلبانییە ! چونکە لەوانەیە ئەو بەڵگەیەی لای شـێخی ئـەلبانی وەکو فـەرموودەی سـەحیح یـان حەسـەن سـەلمێنرا بێـت لای ئیبنـو عوسـێمین زەعیـف بێـت، چ بـە توێژینـەوەی خـۆی گەیشـتبێتە ئـەو حوکمـە چ بـە توێژینـــەوەی غـــەیری شـــێخی ئـــەلبانی. یـــان فەرموودەکـــە لای ئـــەمیش سەحیحە بەڵام ئەو بۆچوونە شەرعیەی هـەر یەکـەیان لێوەی وەرگرتـووە لەگەڵ یەکتریدا جیاوازن.. ڕەحمەتی خوا لە هەموویان بێت ..

( ٣ )

## کورتەیەك لەسەر بەشەکانی زانستی شەرعناسیی

شەرعناسانی سەردەمی دوای یاوەران و تابعین کە باسەکانی شەرعیان لە دوو توێی کتێبی تایبەتدا نوسیەوە ، باسەکانیان لە سەرەتادا کرد بە دوو بەشەوە: بەشی خواپەرستیەکان و بەشی سەوداوامەڵەکان.

**بەشی خواپەرستیەکان** : ئەم بابەتانەی لەخۆ گرت:

١- پاکژی ٢- نوێژ ٣- جەنازە ٤- زەکات ٥- ڕۆژوو ٦- ئیعتیکاف ٧- حەج و عەمرە ٨- مزگەوت و ئەحکامەکانی ٩- ســوێند و نــەزر ١٠- جیــهـاد ١١- خۆراك و خواردنەوە ١٢ - ڕاوو سەربڕراو ..

**بەشی سەوداومامەڵە** : ئەم بابەتانەی لەخۆ گرت:

١- هاوسەرێتی (تەڵاق وجیابوونەوە) ٢- سزاکان ٣- مامەڵەکانی فرۆشتن ٤- قەرز ٥- رەهن ٦ و٧- ئاودێریی وچاندن ٨- کرێدان ٩- حەواڵەکاریی ١٠- بەش هەڵگرتنەوەی شەریکایەتی (الشفعه) ١١- بریکاریی (وەکالـەت) ١٢- خوازیاریی ١٣- ئەمانەت دانان ١٤- زەوت کردن ١٥- دۆزینەوە ١٦-کەفالەت کردن ١٧- دەلاڵی کڕین وفرۆشتن (الجعاله) ١٨- شەریکایەتی ١٩ ـ داوەریی ٢٠ ـ وەقف ٢١ ـ خەڵات ودیاری ٢٢ ـ دەسبەسەراگرتن و گرتنەخۆ (الحِجْر) ٢٣ ـ وەسێت ٢٤ ـ میرات ..

شەرعناسانی شافیعی مەزهەب هاتن و کردیان بە چوار بەشەوە ، فەرموویان : ئەحکامی شەرع یان پەیوەندی بە رۆژی دواییەوە هەیە یان بە ژیانی دنیاوە :

ـ ئەوەی پەیوەندی بە رۆژی دواییەوە هەیە : خواپەرستیەکانە .

ـ ئەوەی پەیوەندی بە ژیانی دنیاوە هەیە :

٭ یان ئەوانەیە کە پەیوەندییان بە مانەوەی تاکی مرۆڤەکەوە هەیە ، ئەوەش سەوداومامەڵەکانە ..

٭ یان پەیوەندی بە مانەوەی جۆری توخمی مرۆڤەوە هەیە کە هاوسەرێتیە .

٭ یان پەیوەندی بە ژیانی شارستانێتیەوە هەیە کە سزاکانە[١] ..

حەنەفیەکان وەکو ئیبنو عابدینی حەنەفی باسەکانیان کرد بە سێ بەشەوە: خواپەرستیەکان ، سەوداو مامەڵە ، سزاکان .

---

[١] محمد علي الفاروقي التهانوي : كشاف اصطلاحات الفنون ( ٣٢/١ ) .

- خواپەرستیەکەی کردە پێنج باس: نوێژو زەکات و رۆژوو حەج و جیهاد.

- سەوداو مامەڵەکانیشی کردە پێنج بەشی تر: پارەو دارایی (ئەمانەت دانان، خوازیاریی و ئەوانە) .ئینجا هاوسەرێتی و ئەوەی پەیوەندی پێوەی هەیە، ئینجا ناکۆکی و دەعوا (مەبەستی ناکۆکی و شەڕو شۆڕ ئینجا داوەریی و ئەوانەی پەیوەندییان بە داوەرییەوە هەیە) .

- سزاکانیشی کردە پێنج بەشی تر: سزاکان (القصاص) سزای دزی، سزای زینا، سزای تۆمەتبار کردنی داوێن پیسی، سزای پاشگەزبوونەوە لە ئیسلام[١]..

ئیبنولجیززی مـالیکیش کـە خـەڵکی غەرناتـەی ئەندەلوسـە (٧٤٥ ی ك کۆچی دوایـی کـردووە) هـات و کتـێبی (قـوانین الأحکـام الشـرعیة ومسـائل الفروع الفقهیة)ی نووسی کە لەسەر راجوێیی و بەراورد کردنی بۆچوونی شەرعناســانە، باســەکانی شــەرعی تێــدا کــرد بــە دووبەشــەوە: خــوا پەرســتیەکان وســەوداو مامەڵـە. بـەڵام هـەر یـەك لەمانـەی کـرد بـە دە بەشەوە کە ناوی نان (کتاب)، هـەر کتابێکیشی کـرد بـە سـەد (بـاب) دوە.. بۆیە هەموو شەرع لای ئیبنولجیززی بوو بە بیست کتاب و دوو سەد باب:

بەشی یەکەم : بریتیە لە : کتابی ١ - پاکژی ٢ - نوێژ ٣ - جەنازە ٤ -زەکات ٥ - رۆژوو ئیعتیکاف ٦ - حەج ٧ - جیهاد ٨ - سوێندو نەزر ٩ - خۆراك و خواردنەوە ١٠ - قوربانی وعەقیقەو خەتەنەکردن ..

بەشی دووەم : بریتیە لە : ١ - هاوســەرێتی ٢ - تەڵاق و جیــابوونــەوە ٣ - مامەڵەکانی فرۆشتن ٤ - ئەو گرێبەســتانەی وەکو کڕین و فرۆشــتنن

---

[١] حاشیە ابن عابدین ( ٥٦/١ ) چاپی سێیەم / الامیریە - قاهیرە

٥ ـ داوەریی و شایەتیدان ٦ ـ ئەوانەی پەیوەنییان بە داوەرییــەوە هــەیە ٨ ـ خوێن و سزاکان ٩ ـ خەڵات و دیاری و هاوشێوەیان ١٠ ـ وەسێت و میرات..

ئینجا هەموو بەشەکانی بە بەشێك کۆتایی پێ هێنا ناوی نا کتاب الجامع..

ئیبنولجیززی لە هۆی دابەشکردنی باسەکانیدا بەو شێوەیە دەڵێ: لەبەر ئەوەیە کە ئەو باسانەی لێك دەچن یان لێك نزیکن یان لق و چڵی یەکترن پێکەوەبن، بۆ ئەوەی ئەوەندە بەش بەش نەبێت و لق و پۆپیان لێ نەبێتەوە[١].

دوای ئەمانیش شەرعناسانی تر هاتن وبە گوێرەی پێداوویستی نەوەکان باسەکانیان بەرفراوانتر کرد، تا گەیشتە ئەوەی یەکێکی وەکو ئیمامی شەوکانی باسەکانی شەرع لە کتێبی (نیل الاوطار) ەکەی خۆیدا بکات بە پەنجاوشەش کتاب وهەر کتابێك بە (أبواب) و ئەبواب بۆ باب وبابەکانیش بکاتەوە بە مەسائیل.. تەنانەت پاکژی و نوێژەکەی کردووە بە دە کتابەوە..

شەرعناسانی سەردەم لەگەڵ پێداوویستی نەوەی نوێ کە لە قوتابخانەیەکدا گەورە دەبوون کە لە سیستمی رۆژئاواوە هاتبوو، باسەکانی شەرعیان بە شێوەی نوێ خستەوە پێش چاو، کردیانن بە کۆبەند (أبواب) ئینجا بەند (فصول) ئینجا باس (مباحث) وە هەروەها..

---

[١] ابن الجزي : قوانين الأحكام الشرعية ( ل ٩١٦ ) .

هەندێکی تریشیان شێوازی تری نوێیان داهێنا، بەوەی باسەکان بە ریز پێشکەش کەن بێ ئەوەی ناوی کتاب و باب یان بەندو بەشیان لێ بنێن..

لەم سی چل ساڵەی دواییشدا زۆر لە زانایان کۆبوونەوەو بڕیاری نووسینەوەی هەموو شەرعیان پێکەوەدا، بەمەش کۆگای شەرعی (دائرە المعارف: ئینسیکلۆبیدیا) هاتە پێشەوە کە دەیان بەرگی گەورەیە..

من پێم باش بوو ریزبەندی کۆنی کتێبە شەرعیەکان بهێڵمەوە، بۆ ئەوەی خوێنەر بە شێوازو سیستمی خوێندنی ئیسلام ئاشنا کەمەوەو ئەو مۆرکی رەسەنێتی ئوممەت و تایبەتمەندێتیەکەی خۆمان کە کەلەپووری ئەم ئوممەتە دایڕشتووە نەفەوتێت، بەڵام لە جیاتی کتاب نووسیم بەش، لە جیاتی باب نووسیم باس.. بێ ئاڵۆزیی و تێکەڵاوییش بابەکانم جودا هێشتنەوە ..

★ ★ ★

( ٤ )

## کورتەیەك لەسەر
## چۆنیەتی پەیدابوونی مەزهەب و تۆمارکردنی

**سەردەمی یاوەران:** ئیمامی حاکمی نەیسابووری لە کتێبەکەی خۆی (المدخل الى كتاب الاكليل)دا دەڵێ: ئەو یاوەرە بەڕێزانەی سوونەتیان لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم بۆ نەوەکانی دواى خۆیان نەقڵ کرد لە ژن و پیاو چوار هەزار کەس بوون کە لە ماوەی بیستوسێ ساڵی پێغەمبەرایەتیدا هاوڕێی بەردەوامی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوون، باسی هەر هەموو ووردەکاریەکانی ژیانی پێغەمبەری خوایان صلى الله عليه وسلم دەکرد[1]..

ئیمامی ئیبنولقەییم ئەو یاوەرانەی بە پێی زۆرو کەمی ریوایەتەکانیان کردووە بە سێ پۆلەوە:

یەکەم : ئەوانەی موفتی بوون و زۆریان گێڕاوەتەوە، ئەم بەڕێزانە حەوتن: سەیدنا عومەری کوڕی خەتتاب و سەیدنا عەلی کوڕی ئەبو تالیب و سەیدنا عبداللەی کوڕی مەسعوودو خاتوو عائیشەو سەیدنا زەیدی کوڕی سابیت و سەیدنا عبداللەی کوڕی عەبباس و سەیدنا عبداللەی کوڕی سەیدنا عومەر خوا لێییان رازی بێت.. ئیبنوحەزم دەڵێ: فەتوای هەر یەکێك لەم بەڕێزانە بەرگێك دەبێت.

دووەم: ئەوانەی ریوایەتەکانیان مام ناوەندییە. سێزدە یاوەرن: سەیدنا ئەبوبەکرو خاتوو ئوم سەلەمەو سەیدنا ئەنەسی کوڕی مالیك و سەیدنا

---

[1] ابو عبدالله محمد بن عبدالله الحاكم النيسابوري : المدخل الى كتاب الاكليل ل ٧ و ٨..

ئەبوسەعیدی خودری و سەیدنا ئەبو هورەیرەو سەیدنا عوسمانی کوڕی عەففان و سەیدنا مەعازی کوڕی جەبەل و سەیدنا عبداللەی کوڕی عەمری کوڕی عاس و سەیدنا عبداللەی کوڕی زوبەیرو سەیدنا ئەبو موسای ئەشعەریی و سەیدنا سەعدی کوڕی ئەبی وەققاس و سەیدنا سەلمانی فارسی و سەیدنا جابری کوڕی عبدالله خوا لێیان رازی بێت ..

سێیەم : ئەوانەی کە کەمیان گێڕاوەتەوە، ئەمانیش زۆر زۆرن.

بەڵام هەموو ئەوانەی موفتی بوون ژمارەیان سەدو سیو قسوورە لە پیاوو ژن[١] ..

**سەردەمی تابعین:** کە سەیدنا عوسمان خوا لێی رازی بێت لە سەردەمی حوکمڕانی خۆیدا رێی بە یاوەران دا لە مەککەو مەدینەوە بچنە ناوچەکانی تری ئیسلام، ئیتر یاوەران چوونە میسرو بەسرەو کوفەو شام و خۆراسان و ناوچەکانی تر.. بەمەش زانستی شەرعی بڵاوتربۆوەو نەوەیەك لە تابعین سوودی لە نزیکی لەو یاوەرە بەرێزانەوە وەرگرت..

بۆ نموونە کووفە: کوفە جگە لەوەی کە بووە پایتەختی خیلافەتی سەیدنا عەلی کوڕی ئەبوتالیب خوا لێی رازی بێت زیاتر لە سێسەد یاوەری تێدا نیشتەجێ بوو، چەندین موفتی و شەرعناسیی تێدا نیشتەجێ بوو، وەك سەیدنا ئیبنو مەسعوودو سەیدنا ئەبوموسای ئەشعەریی و سەیدنا سەعدی کوڕی ئەبووەققاس و سەیدنا ئەنەس و دەیانی تر کە بوونە مامۆستای شەرعناسانی وەك:

- عەلقەمەی کوڕی قەیسی نەخەعی (٦٢ ك).خاڵی ئیبراهیمی نەخەعییە.

---

[١] ابن القيم الجوزية : أعلام الموقعين ٢٢٢/١ ـ ٢٣٨ .

- ئەسوەدی کوڕی یەزیدی نەخەعی.
- ئەبو مەیسەرە عەمری کوڕی شەراحیلی هەمەدانی.
- مەسرووقی کوڕی ئەجدەعی هەمەدانی (٦٣ ك).
- شورەیحی کوڕی حاریسی کیندی (٨٣ ك).

ئەمانیش ئەو زانستیەیان گەیاندەوە بە زانایانی تری وەك:

- ئیبراهیمی کوڕی یەزیدی نەخەعی (٩٦ ـ ١٤٥ك / ٦٦٦ ـ ٧١٥ ز).
- حەممادی کوڕی ئەبو سولەیمان ( ١٢٠ك / ٧٣٧ز).
- مەنسووری کوڕی موعتەمیری سەلەمی ( ١٣٣ ك).
- سولەیمانی کوڕی میهرانی ئەعمەش (١٤٨ ك)..

ئیبراهیمی نەخەعیش بوو بە مامۆستای حەممادو حەممادیش دواتر بوو بە مامۆستای ئیمامی ئەبو حەنیفە (٨٠ـ ١٥٠ك/٦٩٩ ـ ٧٧٠ز) کە یەکەمین سەرمەزهەبی چوار پێشەواکەی ئەهلی سووننەتە.. لەم زانایانەوە مەدرەسەی رەئی هاتە پێشەوە کە ئیمامی ئەبوحەنیفە بووە پێشەوای. بەرامبەر مەدرەسەی فەرموودە لە مەدینە بە پێشەوایەتی ئیمامی مالیك.

مەدینە: زۆرینەی گەورەترین زانای ئەم ئوممەتە لە مەدینە پێگەیشتن و هەموو فەرموودەو زانستیە شەرعیەکانی یاوەرانیان لەخۆگرت و پاشان بەو پەڕی دەستپاکیەوە گەیاندیانەوە بە نەوەی دوای خۆیان، لەوانە ئەم سێزدە بەڕێزەی حەوتی یەکەمینیان بە (حەوت شەرعناسەکە) ناوبانگیان دەرکرد:

- سەعیدی کوڕی موسەییب (٩٤ ك کۆچی دوایی کردووە).
- عوروەی کوڕی سەیدنا زوبێری کوڕی عەووام (٩٤ ك).
- ئەبو بەکری کوڕی عبدالرحمانی سەیدنا حاریسی مەخزومی (٩٤ ك).

ـ عوبەیدواللەی كوڕی عبداللەی كوڕی عوتبە (٩٠ ك/٧٠٨ ز).

ـ خاریجەی كوڕی سەیدنا زەیدی كوڕی سابیت (٩٩ ك/ ٧١٧ ز).

ـ قاسمی كوڕی محمدی كوڕی سەیدنا ئەبوبەكری سددیق (١٠٧ ك/ ٧٢٥ز).

ـ سولەیمانی كوڕی یەسار (١٠٧ ك/٧٢٥ ز).

ـ عبداللەی كوڕی سەیدنا عبداللەی كوڕی سەیدنا عومەری كوڕی خەتتاب.

ـ سالی كوڕی دووەمی سەیدنا ئیبنوعومەر(١٠٦ ك/ ٧٢٤ ز)..

ـ ئەبانی كوڕی سەیدنا عوسمانی كوڕی عەففان (١٠٥ ك ٧٢٣ ز).

ـ ئەبو سەلەمەی كوڕی سەیدنا عبدالرحمانی كوڕی عەوف (٩٤ ك ٧١٢ز)..

ـ عەلی كوڕی ئیمامی حوسەینی كوڕی سەیدنا عەلی كوڕی ئەبو تالیب (زەینولعابدین ٩٥ ك ٧١٣ ز)..).

ـ نافیعی مەولای سەیدنا عبداللەی كوڕی عومەر(١١٧ ك/ ٧٣٥ ز)...

ئەم پۆلە بەڕێزە زانستیە شەرعیەكانی خۆیان گەیاندەوە بە نەوەی دوای خۆیان، بۆیە لە دوای ئەمانیش لە مەدینە ئەم بەڕێزانە بوونە موفتی:

ـ ئەبوبەكر محمدی كوڕی عەمری كوڕی حەزم (١٢٠ ك/ ٧٣٨ ز) و دوو كوڕەكەی محمدو عبدالله.

ـ عبداللەی كوڕی سەیدنا عوسمانی كوڕی عەففان .

ـ جەعفەری (سادق)كوڕی محمدی كوڕی عەلی (زەینولعابدین) كوڕی سەیدنا حوسەین (٨٣ ـ ١٤٨ ك/ ٧٠١ ـ ٧٧٦ ز).

ـ عبداللەی كوڕی قاسمی كوڕی محمدی كوڕی سەیدنا ئەبوبەكری سددیق .

ـ محمدی كوڕی موسلیمی كوڕی شیهابی زوهری (١٢٤ ك/ ٧٤٢ ز)..

ئەم بەڕێزانەو قوتابیەكانیان لە پێگەیاندنی زانای تردا بەردەوام بوون تا زنجیرەكە گەیشتە:

ـ ئیمامی مالیك (٩٣ ـ ١٧٩ك / ٧١٥ـ ٧٩٦ز).

ـ ئیمامی مالیكیش مامۆستای ئیمامی شافیعییە (١٥٠ ـ ٢٠٤ ك/ ٧٦٦ ـ ٨٢٠ ز).

ـ ئیمامی شافیعیش مامۆستای ئیمامی ئەحمەدی كوڕی حەنبەلە (١٦٤ ـ ٢٤١ ك / ٧٨٠ ـ ٨٥٥ ز )..

<u>**سەردەمی دوای تابعین:**</u> كە كۆتایی حوكمڕانی ئەمەوی و سەرەتای حوكمڕانی عەبباسیەكان و گەشانەوە شارستانێتیەكەی ئیسلامە.. لەم سەردەمەدا عومەری كوڕی عبدالعەزیز ـ كە لە ساڵی (٩٩ـ١٠١ك) ببوو بە خەلیفە ـ شیهابەددینی زوهری تەكلیف كردبوو بكەوێتە هاندانی كۆكردنەوەی فەرمووده، ئیتر گەشتی كۆكردنەوەی فەرمووده دەستی پێكردو سەدان قوتابی بۆ كۆكردنەوەی فەرمووده لێبڕان.. ئینجا كە بە توێژینەوەو لێكدانەوەی فەرمووده راو بۆچوونی جیاواز پەیدابوو، سەدان قوتابی تریش كەوتنە تۆماركردنی فەتواو بۆچوونی شەرعناسان.. لێرەوە مەزهەبەكان دروست بوون، قوتابی وا هەبوو رای ئیمامی ئەبوحەنیفەی كۆكردبۆوەو فەتوای تەنها بە پێی رای ئیمامی ئەبو حەنیفەو مەدرەسەی كووفە دەدا. قوتابی واش هەبوو رای ئیمامی ئیسحاقی كۆكردبۆوەو هەموو فەتوایەكی لەسەر بۆچوونی ئەو ئیمامە دەدا.. هەبوو تەنها لەسەر رای

ئیمامی مالیك و مەدرەسەی فەرموودە دەدا.. قوتابی تریش لەسەر راو بۆچوونی ئیمامی شافیعی یان محمدی کوڕی حەسەن یان ئیمامی ئەحمەد یان ئەوزاعی و ئەوانی تر دەدا..

محمدی کوڕی حەسەنی شەیبانی قوتابی ئیمامی ئەبو حەنیفە بوو لە کووفە، بۆ خوێندنی فەرموودە چووبووە خزمەت ئیمامی مالیك لە مەدینە، لە هەمان کاتدا ئیمامی شافیعیش چووبووە خزمەتی ئیمامی مالیك بۆ خوێندنی موەتتەئەکەی ئیمام.. ئیمامی شافیعی دواتر بوو بە سەر مەزهەب، بەڵام محمدی کوڕی حەسەن هەر لەسەر مەزهەبی ئیمامی ئەبو حەنیفەو مەدرەسەی رەئی مایەوەو بوو بە سێیەمین کەسایەتی مەزهەبی حەنەفی لە دوای ئیمامی ئەبو حەنیفەو ئیمامی ئەبویوسف.. کە دەوترێت شەیخەینی حەنەفی مەبەستیان ئیمامی ئەبو یوسف و ئەم محمدی کوڕی حەسەنی شەیبانییەیە کە ئەویش کتێبێکی بە ناوی (الموطأ)ەوە نوسیووە..

ئیمامی مالیك فەرموودەی مورسەلی پێ قبووڵ بوو[١] ئەم دوو قوتابیە نەجیبە کە خۆیان بوونەوە بە زانا، مورسەلیان پێ قبووڵ نەبوو.. ئیمامی شافیعی تەنها مورسەلی سەعیدی کوڕی موسەییبی قبووڵ بوو.. هەروەها زۆرینەی فەرموودەوانان پێیان قبووڵ نەبوو مورسەل بکەنە سەرچاوەی ئەحکام[٢].. ئیمامی ئەحمەدیش کە بووە قوتابی ئیمامی

---

[١] ئەو فەرموودەیە کە ناوی یاوەر (سەحابی) لە سەنەدەکەیدا نەهاتووە. وەك ئەوەی سەعیدی کوڕی موسەییب یان قەیسی کوڕی ئەبو حازم یان عوبەیدوللەی کوڕی عەدی کە تابعینن یەکسەر دەفەرموون پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم فەرموویەتی .. (السیوطي: تدریب الراوي ل ١٢٦).

[٢] ئیمامی موسلیم لە سەرەتای سەحیحیەکەی (١/٢٨)و ئیبنو عەبدولبیر لە تەمهیدەکەیدا (١/١٩)ئەم راو بۆچوونانەیان بە دووورودرێژی باس کردووە..

شافیعی رای ئیمامی مالیکی پێ پەسەندتربوو وەك لە رای ئیمامی شافیعی! بۆیە گەڕایەوە سەر رای ئیمامی مالیك . لەمەوەیە دەبینیت کە مالیکی و حەنبەلی فەرموودەی مورسەلیان پێ قبووڵەو ئەحکامەکانی لێوە وەردەگرن، بەڵام حەنەفیەکان و شافیعیەکان فەرموودەی مورسەل بۆ عەقیدەو ئەحکامی شەرعی وەرناگرن . ئەمە یەکێکە لە راجوێییە ئوسوڵیەکانی ئەم چوار مەزهەبەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت.. راجوێییەکانی تریش ئاوا دروست دەبوون، بەڵام هەموو زاناکان بەرێزەوە دەیانڕوانیە دیدو رای یەکترو کەسیان ئەوی تری نەدەشکاند.. بەڵام نەوەکانی دواتر کە خۆیان تواناو هیممەتیان کەم بۆوە، خۆیان بە مەزهەبەکاندا هەڵواسیی و دەمارگیرێتییەکی ناڕەوایان مومارەسە کرد، گەیشتە ئەوەی شافیعی و حەنەفی نوێژ لە دوای یەکترییەوە نەکەن و هەردووکیشیان لە دوای حەنبەلییەوە !!

★ ★ ★

# ناساندنی هەندێك لە زانایان

## ( بە پێی هاتنیان یەك لەدوای یەك )

ئەمەشم بە پێویست زانی، تا خوێنەر زیاتر بە زانایانێك ئاشنا کەم کە لە مەلای کوردی نابیستێت، لەبەر ئەوەی مەلای کورد شافیعی مەزهەبن و زۆر پابەندن بە راو بۆچوونی شەرعناسانی دوایین (موتەئەخخیرین)ی مەزهەبەکەوە، جگە لە لاوازی لایەنی فیکریی و سیاسی دوو خاڵی تری لاوازییان لە خودی شەرعناسییەکەشدا هەڵگرتووە:

**یەکەمیان:** شەرع لە فەرموودەوە وەرناگرن.. کە رایەکی خەتیبی شەربینییان دەست دەکەوێت وا دەزانن دوو هەنگیان لە دارێکدا دۆزیوەتەوە، ئیتر لا ناکەن بەلای فەرموودەوە.. لەوە ناکۆڵنەوە کە ئایا بەڵگەکەی چییە؟ یان بۆچی پێچەوانەی فەرموودەیەکی سەحیحی لای ئیمامی ئەحمەد فەتوای داوە! ئەمەش خاڵێکی لاوازی خوێندنی حوجرەیەو نەوە بە نەوەی فەقێیایەتی هێناویانە..

**دووەمیان:** ئیکتیفا هەر بەو پازدە بیست کتێبە دەکەن کە لە ساڵانی فەقێیایەتی دەیخوێنن، ئەمەو دەمارگیرییە مەزهەبییەکە وایان لێ دەکات جورئەتی توێژینەوەیان بۆ دروست نەبێت.. نەوێرن بە دووی راوبۆچوونی نوسەرە مەزهەبییەکانیاندا بچنەوە..لە کاتێکدا کە مەزهەبی شافیعی لە هەموو مەزهەبەکانی تر زیاتر توێژەرەوەی بەهێزی وەکو ئیبنوحەجەری عەسقەلانی و ئیمامی نەوەوی و زەهەبی و سیوتی تێدایە کە بە بێ دەمارگیریی توێژینەوەیان

كردووەو مەزهەبەكەی خۆشیان سەرخستووە.. جگە لە شاپیاوی وەكو ئیمامی بەیهیقی كە بە بێ دەمارگیریی مەزهەبی خودی ئیمامی شافیعی سەرخستووەو كتێبی (معرفە السنن)ی لەسەر داناوە كە نموونەیەكی زۆر دەگمەنە لەسەرخستنی دیدو بۆچوون بێ ئەوەی لە قەدرو ڕێزی ئیمامی بەرامبەرەكانی كەم كاتەوە.

لەم ڕوانگەیەوە بوو كە بە پێویستم زانی بیست فەرمووودەوان و بیست شەرعناس و بیست توێژەرەوەی ئوممەت بە خوێنەران ئاشنا كەم لەوانەی ئەم شەرعەیان لێوە وەردەگیرێت، مەبەستیشم لەمە چەند شتێكە:

**یەكەم:** خوێندەواری كورد بیر بخەمەوە كە وەرگرتنی شەرع (فیقە) بە بەڵگەوەیە، مەرج نیە هەر وا بزانێت دەبێت هەر لە ئیمامی شافیعیەوە وەربگرێت، یان لە ئیمامی نەوەویەوە، یان هەر دەبێت لە یەكێك لەم چوار ئیمامە ناسراوەوە (ئیمامی ئەبو حەنیفەو ئیمامی مالیك و ئیمامی شافیعی و ئیمامی ئەحمەد)ەوە وەربگرێت، هیچ مەرج نیە.. باشە ئەگەر كەسێك حوكمێكی شەرعی بە بەڵگەوە لە ئیمامی ئەوزاعی یان لەیسی كوڕی سەعد یان ئیبنوحەزمەوە وەرگرت، ناشێت؟! كە ئەم سێ بەڕێزەش پێشەوای شەرعناسیین و وەكو چوار ئیمامە بەڕێزەكەن..

**دووەم:** سەرچاوەكانی فەرموودە سەرچاوەی شەرع و فەتواشن.. تۆ دەتوانیت كتێبێكی وەكو سونەنی نەسائی بكەیتە سەرچاوەی وەرگرتنی شەرع و فەرموودە، ئەم كتێبە بەنرخە شێخی ئەلبانی ڕەحمەتی توێژینەوەی فەرموودەكانی كردووەو فەرموودە سەحیح و

حەسەنەکانی لە سێ بەرگی یەکەمدا تۆمار کردووەو بەرگی چوارەمیشی تەرخان کردووە بۆ فەرموودە زەعیفەکان.. بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە بەنرخە کە ٥٧٤ لاپەڕەیە هەر هەمووی لەسەر نوێژەو ریزبەندی فەرموودەکانیش بە شێوازی کتێبە فقهیەکانە.. واتە هەر بە باسەکانی پاکژیی دەست پێ دەکات.. ئیتر بۆچی ناشێت ئەم نوێژو رۆژوو ئەحکامانە لە فەرموودەوە وەربگیرێت.. ئەمە بۆ ئەوە نالێم گەنجە تامەزرۆکان هان دەم کتێبە شەرعیەکان واز لێ بهێنن، نا ئەمەم بۆ مامۆستایان و فەقێ و داعیەکانە، کە بۆچی کەمێك لا ناکەن بە لای فەرموودەوە؟!

**سێیەم:** پێشەوایان و سەر مەزهەبانی ئەهلی سووننەت چوار نین و زیاتر لە بیست پێشەوان.. بەلاّم ئەوانی تر قوتابیەکانیان مەزهەبەکەیان بلاّو نەکردوونەتەوە، یان دەرفەتی حوکم کردنیان نەبووە، هۆی بەربلاّوی مەزهەبی حەنەفی هێزی مەزهەبەکە نیە، کە ئێستا حەوت سەد ملیۆن موسولّمان زیاتر حەنەفین، بەلّکو هۆکەی ئەوەیە کە حوکمڕانەکان وەکو عوسمانیەکان و مەغۆلە موسولّمانەکان و غەزنەوی و ئەوانی تری رۆژهەلاّت حەنەفی بوون و مەزهەبەکەیان بوو بە مەزهەبی رەسمی دەولّەت.. کەوابوو مەلایەکی کورد بۆی نیە نەهێلّێت کەسێك لە پێشەوایەکی تری غەیری ئەو چوار ئیمامە بەڕێزەوە وەربگرێت.. باشە بۆچی ناشێت کەسێك بۆچوونی ئیمامێکی وەکو عەلقەمە یان مەسرووق یان ئیبنوسیرین وەربگرێت کە مامۆستای چوار پێشەواکەن؟! یان لە ئیبنوحەزم و ئیبنو تەیمییەو شەوکانیەوە وەربگرێت کە موحەقیقانی ئەم شەرع و دینەن؟!

## یەكەم : فەرمووداوانان (المُحَدِّثون)

١ ـ **ئیمامی مالیك** : (٩٣ ـ ١٧٩ك / ٧١٥ـ ٧٩٦ز) ئەبو عبدالله مالیكی كوڕی ئەنەسی ئەسبوحی، زانای گەورەی مەدینەو یەكێك لە چوار پێشەوا سەرمەزهەبەكانی ئەهلی سوننەتە.. لە نۆسەد زاناوە فەرموودەی وەرگرتووەو سەد هەزار فەرموودەی بە دەستی خۆی نوسیوەتەوە، لە حەڤدە ساڵیدا بۆتەوە بە مامۆستاو لە بیستویەك ساڵیدا بە بڕیاری حەفتا زانای زەمانی خۆی بووە بە موفتی، تەنها زانایەك بووە كە لەبەر زۆری قوتابی و موراجیعینی وەكو خەلیفە (حاجب)ی هەبووە واتە سكرتێر.. كتێبی زۆری نوسیووە، لە فەرموودەدا كتێبی (المُوَطَّأ)ی بە چل ساڵ نوسیوە كە ١٧٢٠ فەرموودەیە، بە دەرس بە نۆ هەزار كەسی وەكو ئیمامی شافیعی ووتۆتەوە. لە شەرعیشدا كتێبی (المُدَوَّنَةُ الكُبْرَى) ی هەیە كە سیوشەش هەزار فەتوای خۆیەتی. ئەوەندە شەرعناس بووە دەرهەقی وەكو پەندی پێشینان ووتراوە :(لا یُفْتَى ومَالِكٌ في المَدینَة) واتە : مالیك لە مەدینە بێت كەس فەتوا نادات. لە فەرمووداوانیشدا سەنەدی هەر فەرموودەیەك لە مالیكەوە بۆ نافیع بۆ ئیبنو عومەر بچێتەوە بەهێزترین سەنەدی فەرموودەی لای ئەهلی سوووننەت و جەماعەتە!!

٢ ـ **عبدالرزاقی سەنعانی** : (١٢٦ ـ ٢١١ ك/ ٧٤٢ـ ٨٢٧ ز) ئەبوبەكر عبدالرزاق كوڕی هوممامی سەنعانیە، خاوەنی كتێبی (المُصَنَّف) . قوتابی ئیمامی مالیك و ئەوزاعی و سوفیانی سەوری و سوفیانی كوڕی

عویەینەیە.. باشترین تەحقیقی کتێبەکەی ئەوەیە کە حبیب الرحمانی ئەعزەمی هیندستانی لە ١٩٧٠ دا کردویّتی، چاپێ نوێی لە المکتب الاسلامی کراوەو ١٢ دوازدە بەرگە..

٣ ـ **ئیمامی شافیعی** : (١٥٠ ـ ٢٠٤ ك/ ٧٦٦ ـ ٨٢٠ ز) ئەبوعبدالله محمدی کوڕی ئیدریسی شافیعی قورەیشی موتتەلیبی، لە غەززەی فەلەستین لەدایکبووە، بە دوو ساڵی کە هەتیو کەوت دایکی بردی بۆ مەککە، لە تەمەنی نۆ ساڵیدا موەتتەئەکەی ئیمامی مالیکی لەبەر کرد، لە حەڤدە ساڵییدا خۆی چووە خزمەت ئیمامی مالیك لە مەدینەو بووە قوتابی ئەو.. زانای قورەیش و یەکێك لە پێشەوایانی سەر مەزهەبی ئەهلی سووننەت و جەماعەتە، مامۆستای ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلە.. کتێبی (الرسالة)ی لە ئوسوڵی فیقهدا نووسی کە لە جیهاندا بە یەکەمین کتێبی فیقهی دەستووری دادەنرێت. لە فەرموودەوانیشدا کتێبی (المُسْند)ی داناوە.. قوتابیەکانی لە میسر دەرس و فەتواکانیان کۆکردەوەو کردیانە کتێبێك بە ناوی (الأم) کە هەموو فەتوا نوێیەکانی ئیمامی شافیعی لەویّدایە.. فەتوا نوێیەکانی ئیمامی شافیعی گرنگن چونکە دوای ئەوە هات کە لە میسر کتێبی کەشکۆڵی بینی کە تۆمارێکی گەورەی فەرموودە بوو، عبداللەی کوڕی سەیدنا عەمری کوڕی عاس نوسیبووی کە ئیمامی شافیعی بینی زۆر فەتوای کۆنی خۆی بە هۆی فەرموودەکانی ناو ئەم کتێبەوە گۆڕی..

٤ ـ **ئیبنو ئەبی شەیبە** : ( ١٥٣ ـ ٢٣٥ ك/ ٧٦٩ـ ٨٥١ ز ) ئەبو عبدالله محمدی کوڕی قازی ئەبو شەیبەی کوڕی عوسمانی کوڕی خواستەی کوفی عەبسی، خاوەن کتێبی (التفسیر) و (المُسْند) و (المُصَنّف)ە. کتێبی

(المُصنّف في الاحاديث والآثار)ی لە فەرموودەوانیدا هەیە کە بڕی (٣٩،٠٩٨) سیونۆ هەزارو نەوەدو هەشت فەرموودەو قەولی یاوەرانی تێدایە، شێخ محمد عەووامە تەحقیقێکی زۆر جوان و گرنگی کردووەو بۆ جاری چوارەمین لە مەککەی پیرۆز چاپ کراوەو ٢٦ بیستوشەش بەرگە.. ئیبنو ئەبی شەیبە هاوڕێ و مامۆستای ئیمامی ئەحمەدو ئیسحاقی کوڕی راهەویە.. مامۆستای هەر شەش پێشەوای فەرموودەوانانە جگە لە ئیمامی ترمزی. ئیمامی ئەبو زەرعە دەڵێ: (١٠٠،٠٠٠ سەد هەزار) فەرموودەم لە ئیبنو ئەبی شەیبەوە وەرگرتووە ! جارێکیان لە بەغدا (٣٠،٠٠٠) سی هەزار کەس ئامادەی مونازەرەیەکی بوون دژ بە موعتەزیلە.. هەر سێ کوڕەکانیشی هەر زانای فەرموودەوانی دەرچوونەوە..

٥ ـ **یەحیای کوڕی مەعین** : (١٥٨ ـ ٢٣٣ ك / ٧٧٤ ـ ٨٤٤ ز) ئەبوزەکەریا یەحیای کوڕی مەعینی کوڕی عەونی بەستامی، لە ئەنبار لەدایکبووەو لە بەغدا گەورەبوو، پشکە میراتی باوکی هەزارهەزارو پەنجا (ملیۆنێك و پەنجا هەزار) درهەم بوو، هەر هەمووی لە رێی زانست و فێربوون و تۆمار کردنی فەرموودەی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم خەرج کرد، تەنانەت پارەی نەعلێکی نەمابوو لە پێی کات! دەڵێ: فەرموودەی وا هەیە بیستو پێنج جار نوسیومەتەوە، زیاتر لە هەشت سەد هەزار فەرموودەی بە دەستی خۆی نوسیوەتەوەو بەتۆمار کراوی بۆ ئەو ئوممەتەی جێهێشتووە! سەدوچواردە فەردەو چوار رەشکە کتێبی فەرموودە کە خۆی نوسیبوونی لە ماڵیدابوو.. دەیانبینی فەرموودە هەڵبەستراوەکان لە خاوەنەکانیانەوە دەکرێت! پێیان ووت:

مەگەر نازانیت درۆن؟! فەرمووی بەڵێ، دەزانم بەڵام دوایی هۆشداریی دەدەمە موسوڵمانان كە كام سەنەدە راستەو كام سەنەدە هەڵەیە یان درۆیە.. هاوڕێ و مامۆستای هەر یەك لە ئیمامی ئەحمەدو ئیسحاق و ئیبنولەدینی و ئەبوبەكری كوڕی ئیبنوشەیبەو ئەبو خەیسەمە بوو، هەر هەموویان رێزیان لێ دەگرت.. لەبەر دەستیدا بە پێوە دەوەستان، دانەدەنیشتن تا پێی دەڵێن دانیشن! هیچ كەسێك لە سەردەمی خۆیدا لە هەڵاوێردنی فەرموودەی سەحیح و زەعیفدا لەم شارەزاتر نەبوو، فەرموودەوانانی گەورەو پسپۆڕ لەمیان دەپرسیەوە.. لەبەر ئا ئەم خزمەتە مەزنەیە كە شایانی ئەوە بوو كە كاتێك لە مەدینە كۆچی دوایی كرد، ئەو دارانەی پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم لەسەر شۆرابوو (تاتەشۆرەكە) بۆ شوشتنی ئەمیش لەسەری هێنرایەوە دەرەوەو لەسەری شۆرا!! یەحیای كوڕی مەعین لە فەرموودەوانە دەگمەنەكانە كە لە لقە فقهیەكاندا لەسەر مەزهەبی ئیمامی ئەبو حەنیفەی رەحمەتی بوو..

٦ ـ **ئیمامی ئەحمەد** : (١٦٤ ـ ٢٤١ ك / ٧٨٠ ـ ٨٥٥ ز) ئەبو عبدالله ئەحمەدی كوڕی محمدی كوڕی حەنبەلی شەیبانی لە بەغداد لەدایكبووە. چوارەمین پێشەوای سەر مەزهەبی ئەهلی سوونەت و جەماعەتە، قوتابی ئیمامی شافیعی بووە، ئیمامی شافیعی رەحمەتیش قوتابی ئیمامی مالیك بووە.. ئیمامی ئەحمەد مامۆستای بوخارییەو بوخاری مامۆستای موسلیمە، موسلیمیش مامۆستای ترمزی و ئیبنوخوزەیمەیە!! ئیمامی ئەحمەد یەكێكە لەو چوار زانایەی زیاتر لە (٦٠٠,٠٠٠) شەش سەد هەزار فەرموودەی لەبەر بووە. كتێبی (المُسْنَد)

ی لە فەرمووودەوانیدا داناوە کە چل هەزار فەرمووودەی تێدایە، پێش ١٢٣ ساڵ لەمەوبەر لە هیندستان چاپ کرا بەڵام تەواو نەکرا، پاشان لە میسر بە سەرپەرشتی شێخ ئەحمەد شاکری فەرمووودەوانی مەزن لە ١٩٤٦ دا بە (٥٠) پەنجا بەرگی قەبارە گەورە چاپ کرا، لە نەرویج لە خزمەتیدام.. پاشان چاپی تر کرایەوە.. کەم زانا هەن فەرمووودەوانیش بووبن و شەرعناسیش، ئیمامی ئەحمەد دانسقەی ئەو زانا دەگمەنانەیە.. لەسەر هەڵوێستی دژی موعتەزیلە زۆری ناسۆر بە دەست حاکمەکانی سەردەمەوە چێشت.. لە حەفتاوحەوتساڵیدا کۆچی دوایی کرد. سەد هەزار پیاوو شەست هەزار ئافرەت جەنازەکەیان بۆ گۆڕستانی کەرخ برد لە بەغدا .

٧ ـ **ئیمامی بوخاری** : (١٩٤ ـ ٢٥٦ ك/ ٨١٠ ـ ٨٧٠ ز) ئەبو عبدالله محمدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاری جوعەفی خاوەنی سەحیحی بوخارییە، شازدە ساڵ فەرمووودەی کۆ کردۆتەوە، نزیکەی (٩٠٠,٠٠٠) نۆسەد هەزار فەرمووودەی لەبەر بووە.. سەحیحەکەی ناوی (الجَامِعُ المُسْنَدُ الصَّحِيحُ المختصَرُ من أمور رسولِ الله صلى الله عليه وسلم وسُنَنِهِ وأيَّامِهِ) بەڵام هەر بە سەحیحی بوخاری بەناوبانگە، (٧٣٩٧) حەوت هەزارو سێ سەدو نەوەدو حەوت فەرمووودەی تێدایەو بە شێوەی شەرعناسی (فقه) فەرمووودەکانی ڕێك خستووە.. باشترین شەرحی بوخاری کتێبی (فتح الباري) یە کە ئیمامی ئیبنو حەجەری عەسقەلانی ڕەحمەتی بە بیستو سێ ساڵ کردوێتی و لە خزمەت دوو چاپیدام نوێترینیان لە مەککەی پیرۆز کراوە ١٥ پازدە بەرگەو چاکترینە، چونکە هەندێك شەرح و تەعلیقی شێخ ئیبنوبازی ڕەحمەتی پێوەیە ..

٨ ـ **ئەبوداوود** : ( ٢٠٢ ـ ٢٧٥ ك/ ٧٥٠ ـ ٨١٩ ز ) سولەیمانی کوڕی ئەشعەسی ئەزەدی سەجستانی[١].. خاوەنی کتێبی (السُنَن) ە کە (٣٥) سیو پێنج کتابەو (٥٢٧٤) پێنج هەزارو دوو سەدو حەفتاوچوار فەرموودەی تێدایە. زۆر شەرح کراوە باشترینیان بەلامەوە (عَون المعبود) ی شەمسول حەقی عەزیم ئابادییە.. ئەبوداوود مامۆستای ئیمامی ترمزی و ئیمامی نەسائی بووە .

٩ ـ **ئیمامی موسلیم** : ( ٢٠٤ ـ ٢٥٩ ك/ ٨٢٠ ـ ٨٧٣ز ) ئەبولحوسەین موسلیمی کوڕی حەججاجی قوشەیری نەیسابووری[٢]، خاوەنی سەحیحی موسلیمە کە (٧٢٧٥) حەوت هەزارو دووسەدو حەفتاو پێنج فەرموودەی تێدایە، لە کۆی (٣٠٠ر٠٠٠)فەرموودە هەڵیبژاردوون.. ئیمامی نەوەوی شەرحی کردووە، کردویّتی بە ٥٤ پەنجاوچوار (کتاب) و هەر کتابێکیش چەندین (باب)ە .. چاپی نوێی ١٢ بەرگە، وام لە خزمەت چاپی کۆن ونوێیدا کە هەژدە بەشەو نۆ بەرگە .

١٠ ـ **ئیبنوماجە**[٣] : ( ٢٠٩ ـ ٢٧٣ ك/ ٨٢٤ ـ ٨٨٦ز ) ئەبوعبدالله محمدی کوڕی یەزیدی قەزوینی (سەر بە ئێرانی ئەمڕۆیە) کتێبەکەی ئەمیش ناوی

---

[١] سەجستان : شارێك خۆراسانی گەورە بووە کە ئێستا بەشێکی گەورەی سەر بە ئەفغانستانە بەشێکی تری سەر بە ئێرانە .

[٢] نەیسابوور یەکێك بووە لە مەڵبەندە ئاوەدانەکانی زانستی و شارستانێتی ئیسلام ، دەکەوتە سنوری ئێران و ئەفغانستانی ئەمڕۆوە ، ئێستاش بە هەرێمی مەشهەدی ئێران دەڵێن : نەیسابوور ..

[٣] بە فەزڵی خوای پەروەردگار نامیلکەیەکم لەسەر مێژوی ژیانی شەش پێشەوایانی فەرموودەوانی (بوخاری ، موسلیم ، ئەبوداوود ، ترمزی ، نەسائی ، ئیبنوماجە) نوسیووە بە ناوی نجم الدین فەرەجەوە لە هەولێر لەلایەن نوسینگەی تەفسیر چاپکراوە.

(السنن)ه کە (٤٫٣٤١) چوار هەزارو سێ سەدو چلویەك فەرموودەی سەحیح و حەسەن و زەعیفی تێدایە. (٣٧) سیو حەوت کتاب و هەزارو پێنج سەد بابە.. زۆر شەرحی هەیە لەوانە حاشیەی سندی و شەرحی سیوتی .ئیبنو کەسیر دەڵێ: تەفسیرێکی باشی نوسیووە.. هەروەها کتێبێکی مێژوویی بەرفراوان کە لە سەردەمی یاوەرانەوە تا سەردەمی خۆی هێناوێتی.. شێخی ئەلبانی رەحمەتی لە خزمەتە گەورەکانی بە فەرموودەی پێغەمبەری پێشەوامان تەحقیق کردنی سونەنی سێ لەم چوار پێشەوایەی فەرموودەیە (ئەبوداوودو ترمزی وئیبنوماجە) کە سەحیحەکانی بە جیا چاپ کردوون وزەعیفەکانیشیان بە جیا..

١١ ـ **ترمزی** : ( ٢٠٩ ـ ٢٧٩ ك/ ٨٢٤ ـ ٨٩٢ز ) ئەبو عیسا محمدی کوڕی عیسای ترمزی، لە شاری ترمز[١] لەدایك بووە. ئەمیش خاوەنی کتێبی (الجامع الصحیح) ە کە هەر بە سونەنی ترمزی بەناوبانگە، (٥٠) پەنجا کتابەو (٣٩٥٦) سێ هەزارو نۆسەدو پەنجاو شەش فەرموودەی تێدایە.. باشترین شەرحی سونەنی ترمزی (تحفَة الاحوَذي بشرح سنن الترمذي) یە، کە عبدالرحمانی موبارەکفوری رحمەالله کردویێتی..

١٢ ـ **ئیمامی ئەبو زەرعەی رازی:** (٢١٠ ـ ٢٦٤ ك/٨٢٦ ـ ٨٧٨ ز) عوبەیدوڵڵەی کوڕی عەبدولکەریمی کوڕی یەزیدی کوڕی فەڕووخ، فەرموودەوانی مەزنی (رەی)[٢] کە ساڵی ٢١٠ی کۆچی لەدایکبووە.. لە سێزدە ساڵیەوە بۆ

---

[١] شارێکی خۆراسان بووە، لەسەر روباری جەیحوونەو ئێستا سەر بە ئەفغانستانە .

[٢] زاڵێك بۆ ناوی شاری رەی زیاد کراوەو بووە بە رازی، وەکو شاری مەرۆ کە بووە بە مرووزی ..

ماوەی چواردە ساڵ بۆ وەرگرتنی زانستی شەرعی بە تایبەتی فەرموودە لێبڕا، بۆ فێربوون و وەرگرتنی چووە خۆراسان و جەزیرەو عێراق و شام و میسرو حیجاز.. لە سیودوو ساڵیدا کەوتەوە دەرس ووتن..

مامۆستای ئیمامی موسلیم و ترمزی و نەسائی و ئیبنوماجەو ئیسحاقی کوڕی موساو حەرمەلەو رەبیعی کوڕی سولەیمان و محمدی رازی و سەدانی ترە..

ئەبوزەرعە بە موعجیزەی لەبەر کردن هەژمارد کراوە.. کابرایەك لای عبداللەی کوڕی ئیمامی ئەحمەد تەڵاقی خوارد کە ئەبو زەرعە سێ سەد هەزار فەرموودەی لەبەرە، عبدالله خەمی تەڵاقی کابرای بوو، بۆیە لە باوکی پرسی شتێکی وا بووە، باوکی فەرمووی: وا نازانم تەڵاقی کەوتبێت، بڕۆن لە ئەبو زەرعە خۆی بپرسن.. کە چوون و پرسیان، سەری نزم کردوو فەرمووی: ان شاء الله تەڵاقەکەی نەکەوتووە، چونکە سێی سەد هەزار فەرموودەم لەبەرە وەکو کە خەڵکی (قل هو الله احد)یان لەبەرە!!

ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەربارەی ئەبو زەرعە دەیفەرموو: هەموو فەرموودە حەوت سەد هەزارەو ئەم پیاوە شەش سەد هەزاریانی لەبەرە!!

ئیمامی ئیسحاقی کوڕی راهەوەی دەیفەرموو: هەر فەرموودەیەك ئەبو زەرعە نەیزانێت ئەسڵی نیە..

سەیر ئەوەیە کە ئەم هەموو فەرموودانەی بە سەنەدەوە لەبەر بووە، زانیویّتی کامیان سەحیحەو کامیان زەعیفە، سەرباری هەمووی تا مردن ئەوەی لە بیر بووە کە ئەو فەرموودەیانی لە کێ و لە کوێ و کەی و لە چ کۆڕێکیدا وەرگرتووە!! ئەم هەموو زیرەکیە بخەرە پاڵ

عەقیدەی پاکیی و ئەو هەموو خواناسی و دینداریێتی و خۆبە بەبچووك زانین و راسگۆییەی کە زانایانی وەکو ئیمامی زەهەبی باسی لێوە دەکەن..

**١٣ـ نەسائی** : ( ٢١٥ ـ ٣٠٣ ك / ٨٣١ ـ ٩١٩ز ) ئەبوعبدالرحمان ئەحمەدی کوڕی شوعەیبی نەسائی لە شاری نەسای سەر بە خۆراسانی ئەو زەمانە (کە ئێستا سەر بە ئۆزبەکستانە) لە دایکبووە، لە پازدە ساڵیەوە بە دوای زانستیە شەرعیەکاندا چووە عێراق و جەزیرەو شام و حیجازو میسر.. زۆر بە تەقوا بوو.. هەر رۆژە نارۆژێك بەڕۆژوو دەبوو، لەگەڵ والی میسردا چووە جیهادو ئەو وەسفی دەکات کە بەجەرگترین جەنگاوەری بووە.. نەشچۆتە دیوەخانی هیچ دەسەڵاتدارێك.. مامۆستای ئیمامی تەحاوی بووە.. کتێبەکەی ئەمیش ناوی (السنن) ە کە (٥١) کتاب و (٥٧٧٤) پێنج هەزارو حەوت سەدو حەفتاوچوار فەرموودەیە.. باشترین شەرحی حاشیەی سیندیە کە بە چوار بەرگ چاپ کراوە.. بە شەرحی ئەوو سیوتیشەوە چاپ کراوەو هەشت بەرگە..

**١٤ ـ ئیبنو خوزەیمە** : ( ٢٢٣ ـ ٣١١ ك/ ٨٣٩ ـ ٩٢٧ز ) ئەبوعبدالله محمدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی خوزەیمەی سەلەمی نەیسابووری، شافیعی مەزهەب، بە پێشەوای پێشەواکان بەناوبانگە ! چونکە مامۆستای ئیمامی بوخاری و موسلیم و ئەبو حاتەمی بوستی و دەیان زانای تر بووە، خاوەنی کتێبی سەحیحی ئیبنو خوزەیمە کە ناوە تەواویەکەی بریتیە لە (مختصر المختصر من المسند الصحيح عن النبي صلى الله عليه وسلم)..کتێبی جگە لە فەرموودە نوسیوون، وەکو کتێبی (التوحيد) کە بە دیدی ئەهلی سووننەت و جەماعەت نوسیوێتی.. هانی محمود الجليس

دکتۆرانامەکەی لەسەر ئیبنوخوزەیمە هێناوە بە ناوی (الإمام ابن خزيمة ومنهجه في مختلف الحديث في صحيحه). ئێستا بە ناوی (صحيح ابن خزيمة) وە چاپ کراوە، بە تەحقیقی دکتۆر محمد مستەفای ئەعزەمی توێژینەوەی فەرموودەکانیشی شێخی ئەلبانی کردوونی، چوار بەرگەو لە المكتب الاسلامي بەیروت لە ١٩٧٠ك چاپ کراوە ..

١٥ ـ **ئیبنول جاروود**: ( ٢٣٠ ـ ٣٠٧ ك/ ٨٤٦ ـ ٩٢٢ز ) ئەبو محمد عبدالله کوڕی عەلی کوڕی جاروودی نەیسابووری، کتێبێکی نوسیووە بە ناوی (المشيخة) کە ناوی مامۆستاکانی خۆی تێدایە، یەکێك لەوان ئیمامی زوهلیە کە سەرۆکی فەرموودەوانانی نەیسابوور بووەو ئیبنولجاروود نزیکەی (٤٠٠) چوارسەد فەرموودەی لێوە گێڕاوەتەوە.. ئیبنولجاروود بە کتێبی (المُنتقَى مِن السُّنَنِ المُسْنَدَةِ) بەناوبانگ بوو .. دکتۆر محمد بن عبد الكريم بن عبيد کتێبێکی لەسەر نوسیووە بە ناوی (الإمام الحافظ عبد الله ابن الجارود النيسابوري وأثره في السنن) . هەموو فەرموودەکانی سەحیح و حەسەنن، زەعیف تێیدا دەگمەنە ..

١٦ ـ **تەبەرانی** : ( ٢٦٠ ـ ٣٦٠ ك/ ٨٢١ ـ ٩٢٠ز ) ئەبولقاسم سولەیمانی کوڕی ئەحمەدی تەبەرانیە، لە عەککا لە فەلەستین لەدایك بووە.. خاوەنی هەر سێ کتێبی فەرموودەیە کە بە ناوی موعجەمەوە ناسراون: (المعجم الكبير ، المعجم الوسيط ، المعجم الصغير). لە سێزدەساڵیەوە بۆ ماوەی شازدە ساڵی ڕەبەق کەوتە وولاتان بۆ خوێندنی زانستە شەرعیەکان، بە خزمەت سەدانی وەکو ئیمامی ئەبو زەرعەو نەسائی و عبداللەی کوڕی ئیمامی ئەحمەد گەیشت.. لە ناوەڕاستی تەمەنیدا لە باسی

ماموّستاكانیدا نوسیویّتی: بە خزمەت زیاتر لە هەزار زانا گەیشتووم!! دەربارەی غەریبی و دەسكورتی زەمانی فەقێیەتی خۆی دەیفەرموو: (٣٠) سی دانە ساڵ لەسەر حەسیر بۆ بەدەست هێنانی ئەم زانستیانە خەوتووم..

ئیمامی زەهەبی دەربارەی دەڵێ: سەنەدی دنیاناس، پیاوی راستگۆو دەستپاكیی ..دەیان كتێبی چەندین بەرگی نوسیووە، كە یەكێكیان تەفسیرەو یەكێكیان سیرەیە كە (دلائل النبوة)یە..

تەنها (معجم الوسیط)ەكەی بڕی (٥٢,٠٠٠)پەنجاو دوو هەزار فەرموودەی تێدایە. تەمەنی گەیشتە (١٠٠) سەد ساڵ و دە مانگ !

(معجم الكبیر)ەكەی تایبەتە بە یاوەرانەوە، باسی (١٦٠٠) هەزارو شەش سەد یاوەر دەكات، ئەوانەی فەرموودەیان زۆر گێڕاوەتەوە ئەم تەنها سێ یان چوار فەرموودەی لێوە وەرگرتوون، بەڵام زۆر بایەخی داوە بەو یاوەرانەی كە كەمیان فەرموودە گێڕاوەتەوە.. ئەوانەی هیچیشیان نەگێڕاوەتەوە هەر باسی كردوون تا بیان ناسێنێت.. لەگەڵ ئەوەشدا (٢٢٠٢١) بیستودوو هەزارو بیستویەك فەرموودەی لێوە گێڕاونەتەوە.. شێخ حەمدی سەلەفی كوردی بادینی تەحقیقی كردووەو لە دوو توێی (٢٥) بیستو پێنج بەرگدا بە چاپ گەیشتووە ..

١٧ـ **ئیبنو حیببان** : ( ٢٧٥ ـ ٣٥٤ ك/ ٨٨٦ ـ ٩٦٥ز ) ئەبو حاتەم محمدی كوڕی حیببانی بوستی كە خەڵكی شاری (بوست)ی نزیكی كابوولی ئەمڕۆیە، دنیای ئەو سەردەمە هەمووی بۆ زانستیە شەرعیەكان گەڕا، تا بووە یەكێك لە زانایانی بێ وێنەی سەردەمی خۆی.. لە كتێبی (الأنواع) خۆیدا كە باس لە ماموّستاكانی دەكات دەڵێ: رەنگە لە دوو هەزار زیاتر

بن.. ئینجا دەکەوێتە نوسینەوەی مێژووی ژیانی هەر یەکەیان!.. مامۆستای ئیبنو مندەو حاکم و زەوزەنی و سەدانی ترە.. ئیبنوحیببان یەکێکە لەو زانا دەگمەنانەی فەرموودەوانیشن و شەرعناسیشن، جگە لەمەش شارەزای زانستیەکانی جرح و تعدیل و زمانی عەرەبی و پزیشکی و گەردووناسی بوو.. کتێبی دەربارەی هەموو ئەم زانتسیانە نووسیووە.. تەنها دوو کتێبی لەسەر علم الرجال کە چاپ کراون (عِلَلُ حديثِ مالِك) دە بەرگ و (عِلَلُ أوهامِ أصحابِ التّواريخ) دە بەرگە ! ئەمە جگە لە کتێبی تری وەکو (أسَامِي مَنْ يُعْرَفُ بالْكُنَى) کە سێ بەرگە.. هەندێك توێژەرەوەی بەرێزی وەکو ئیمامی ئیبنو حەجەری عەسقەلانی بە توندوتیژییان حسێب کردووە چونکە هەندێك پیاوانی سەنەدیان زاناو شەرعناسانی بە زەعیف داناون تەنها ئەو ئەو حوکمەی لەسەر داون ..

١٨ ـ **ئیبنو السسەکەن** : (٢٩٤ ـ ٣٥٤ ك/ ٩٠٠ ـ ٩٦٠ز) ئەبو عەلی سەعیدی کوڕی عوسمانی کوڕی ئەسسەکەن، لە بەغداد لەدایکبووە، قوتابی ئەبولقاسمی بەغەوی و ئەبو جەعفەری تەحاوی و ئیبنو ئەبی داوود بووە، لە حافزانی بەناوبانگی فەرمووده بوو، کتێبی (المُنتقَى الصَّحيح) ی داناوە کە ئیمامی ئیبنو حەزم مەتحی کردووە..

١٩ ـ **حاکم** : (٣٢١ ـ ٤٠٥ ك/ ٩٣٠ ـ ١٠١٤ز) ئەبوعبدالله محمدی کوڕی عبدالله نەیسابووری کە بە الحاکم ناسراوە.. لە تەمەنی بیستساڵیەوە نەیسابووری بەجێ هێشت و بەرەو بەغدادو شام و حجاز بۆ وەرگرتنی زانستی شەرعی کەوتە رێ.. قوتابی ئیمامی دارەقوتنیەو ئەمیش وەکو مامۆستاکانی بە خزمەت نزیکەی دوو هەزار زانای سەردەمی خۆی

گەیشتووەو زانستیی لێیانەوە وەرگرتووە.. بۆ چەندین جار بۆتە قازی نەیسابوور، ماوەیەکی تریش سەفیری سەرکەوتووی نێوان دەوڵەتی بوەیهی بەغداو دەوڵەتی سامانی بوو.. ئیمامی ئیبنوکەسیر لە کتێبی (البداية والنهاية)کەیدا لە مەتحیدا دەڵێ: خاوەن زانست بوو، فەرموودەوان و خاوەن لەبەر کردن بوو، ئەهلی تەقواو دینداری قایم و دەستپاکی وبۆخوا ساغ بوونەوە بوو، خاوەن وەرعێکی پاك بوو.. لە تەمەنی هەشتاو چوارساڵیدا کۆچی دوایی کردووە..

کتێبی (المُستَدرِك علَى الصَّحيحينِ)ی نوسیووە، کە بە پێی پێناسەی خۆی ئەو فەرموودانەی تێدایە کە لای بوخاری موسلیم نین ومەرجی فەرموودەی سەحیح و حەسەنی لای ئەوانی بەسەردا دەچەسپێت یان مەرجی یەکێکیانی تێدایە، هەندێکیشیانی بە ئیجتیهادی خۆی خستۆتە ریزیان.. لەبەر ئەوەی زۆرینەی فەرموودەوانان وایان ئیمامی حاکم ناساندووە کە لە حوکمدان بەسەر فەرموودەدا ئاسانکار بووە، بەڵام زانایەکی گەورەی وەکو ئیمامی زەهەبی (قوتابی ئیمامی ئیبنو تەیمیەیە) بە دوای سەنەدی فەرموودەکانی حاکمدا چۆتەوە.. بۆیە فەرموویانە: مەرجە بۆ وەرگرتنی فەرموودەی لای حاکم حوکمی ئیمامی زەهەبیشی لەگەڵ بێت.. کتێبەکە یەکەمجار لە هندستان لە چوار بەرگی گەورەدا چاپ کرا، پاشان لە لوبنان، لە دار الکتب العلمیە بە تەحقیقی مستەفا عبدالقادر عەتا کە چوار بەرگ بوو (٨٨٠٣) هەشت هەزارو هەشت سەدو سێ فەرموودە بوو، بەڵام دواتر شێخ موقبل الوادیعی یەمەنی رەحمەتی تەحقیقی کردو لە دار الحرمین لە میسر بە پێنج بەرگ لە ١٤١٧ / ١٩٩٧ دا چاپ کرا کە ژمارەی فەرموودەکانی بوو بە (٨٨٣٩) هەشت هەزارو هەشت سەدو سیونۆ

فەرمووده.. شێخ موقبیل کارێکی چاکی کردووه کە هەموو بەدواداچوونەکانی ئیمامی زەهەبیشی لەم کتێبەیدا هێناوەتەوه ..

٢٠ ـ **ئەلبانی** : (١٣٥٥ ـ ١٤٢٠ ك (١٩١٤ـ ١٩٩٩)) ئەبوعبدالرحمان محمد ناسروددینی کوڕی نوحی کوڕی نەجاتی ئەلبانی، لە شاری ئەشقۆدرەی ئەلبانیا لەدایك بووەو لە هەشتاو پێنج ساڵی تەمەنی پیرۆزیدا لە ئەردەن کۆچی دوایی کرد.. شێخی ئەلبانی رەحمەتی کە باوکی ـ لەبەر پاراستنی دینیان هێنانیە سوریا ـ تەمەنی نۆ ساڵان بوو، باوکی زۆر حەزی دەکرد ببێتە مەلایەکی حەنەفی، بۆیە قورئانی پێ لەبەر کردو تەجوید فێربوو، کتێبی فقهی حەنەفیشی خوێند بەڵام لە تەمەنی بیست ساڵییەوه کەوتە ژێر کاریگەری مەقالەکانی شێخ محمد رەشید رەزای میسری کە رەسەنێتی و نوێخوازییان پێوه بوو.. لە سەرەتاوه بە کتێبی (الْمغني عن حَمْلِ الأسْفَار)ی حافزی عێراقی هاتە جیهانی فەرموودەوانیەوەو کە لە دنیای فانی دەرچوو خۆی زیاتر لە هەشتا کتێبی لەسەر فەرموودەو توێژینەوەی نوسی! کە یەکەمین کتێبی بریتی بوو لە (تحذير الساجد من اتخاذ القبور مساجد) پاشان کتێبی تر کە هەندێکیان وەکو (إرواءُ الغليل فِي تخريج أحاديثِ مَنارِ السَّبيل) یازده بەرگە، یان (سلسلة الاحاديث الصحيحة) و (سلسلة الاحاديث الضعيفة ) کە بیستوسێ بەرگن و (أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم) سێ بەرگە وه هەروەها ..

کەس گومانی لەوەدا نەبوو ـ مەگەر ناحەزانی ـ کە شێخی ئەلبانی تاقانە پسپۆڕی فەرموودەوانی سەردەم بوو، بۆیە دەوترێت ئەلبانی زەمانی ئیبنوحەجەری عەسقەلانی هێنایەوه.. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا

لە هەندێك باسی عەقیدەدا (وەك پێناسەی كوفرو ئیمان) دیدی وەكو مورجیئە بوو، لە (واقیعناسیی و جیهادو حاكمێتی)یشدا شارەزا نەبوو.. زۆرجاریش لە فەتوادا دەكەوتە هەڵەی شەرعیەوە چونكە بەقەدەر ئەوەندەی كە فەرموودەناس بوو شەرعناس نەبوو ! بۆیە لە ناو زۆرینەی سەلەفیەكاندا فەرموودە لە ئەلبانی وەردەگیرێت و شەرعیش لە بن بازو ئیبنو عوسێمینی رەحمەتی .

★ ★ ★

## شەرعناسان (الفقهاء)

بێگومان، کە دەوترێت شەرعناسیی(الفقە) یەکسەر ناوی چوار پێشەوای بەڕێزی چوار مەزهەبەکەی ئەهلی سوونەت و جەماعەت ریز دەکرێت: ئیمامی ئەبوحەنیفەو ئیمامی مالیك وئیمامی شافیعی و ئیمامی ئەحمەد.. لەبەر ئەوەی شتێکمان لەسەر سێ ئیمامی دوایین نوسیووە پێویست بە دووبارە کردنەوە ناکات، بۆیە لێرەدا ان شاء الله تەنها باسێکی ئیمامی ئەبو حەنیفە دێنینەوە (لە ریزبەندی خۆیدا)، چونکە پێش ئەویش سەدان شەرعناسی تری گەورە هەن، لەوانە:

١ـ **عەلقەمەی کوڕی قەیس:** (٠٠ ـ ٦٢ ك / ٠٠ ـ ٦٨٢ ز) عەلقەمەی کوڕی قەیسی کوڕی عبداللەی نەخەعی کوفی، قوتابی نەجیبزادەی سەیدنا ئیبنومەسعوود، هەر کەسێك عەلقەمەی دیووە ووتوێتی: هەموو شتێکی ئیبنومەسعوودی هەڵگرتۆتەوە تەنانەت شێوەی دانیشتن و رۆیشتنیشی، ئیبراهیمی نەخەعیش کە گەورەترین شەرعناسی کووفە بوو هەموو شتێکی ئەمی هەڵگرتبۆوە. بۆیە بەهێزترین سەنەدی ریوایاتی کووفە مەنسوور لە ئیبراهیمی نەخەعی و ئەویش لە عەلقەمەوە (ئیبراهیم خوشکەزای عەلقەمەیە) ئەویش لە سەیدنا ئیبنو مەسعوودەوە.. هەر وەکو کە بەهێزترین سەنەدی ریوایاتی مەدینە لە ئیمامی مالیکەوە بۆ نافیع، بۆ سەیدنا ئیبنوعومەرە خوا لێیان رازی بێت..

عەلقەمە لە زەمانی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم لەدایکبووەو دوای تەمەنی نەوەد ساڵی لە ساڵی ٦٢ ك كۆچی دوایی

کردووە.. نیشانەیەکی توانای خوای گەورەبوو لە زانین و لەبەرکردندا .. بە پیرێتی ئەیفەرموو: لە گەنجیمدا هەرچیەکم لەبەر دەکرد دەتووت کتێبی کراوەم لەبەر دەستدایەو دەیخوێنمەوە..

پیاوێکی خواناس وبەتەقوابوو، دەنگی خۆش بوو، ئیبنومەسعوود دەیفەرموو: قورئانمان بۆ بخوێنە.. سەیرە کە لە زانستی شەرعیدا ئەوەندە سەرکەوت کە یاوەرانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پرسیاری شەرعییان لێ دەکردا!

عەلقەمە زانستی شەرعی لە زۆر لە یاوەرانی تر جگە لە سەیدنا ئیبنومەسعوود وەرگرتووە، لەوانە: سەیدنا عومەرو سەیدنا عوسمان و سەیدنا عەلی و خاتووعائیشەو سەیدنا ئەبوددەرداء و سەیدنا خالیدی کوڕی وەلیدو سەیدنا حوزەیفەو سەیدنا خەبباب و سەیدنا سەعدو سەیدنا عەممارو سەیدنا ئەبوموساو سەیدنا سەلەمەی کوڕی زەیدو دەیانی تر..

لە قوتابیەکانیشی: ئیمامی شەعبی وعوبێدو ئیبراهیمی نەخەعی و ئیبنوسیرین و موسلیمی کوڕی سەبیح و سەدانی تر..

ئیمامی ئەحمەد دەیفەرموو: عەلقەمە جێمتمانەیە ئەهلی خێرو چاکەیە.. یەحیای کوڕی مەعینیش ـ کە مامۆستای ئیمامی ئەحمەدە ـ هەر وا وەسفی دەکرد..

ئەبوموسەننا دەڵێ: لە حەج بە دوو ریز خەڵکم دی ئیبنومەسعوود لە ریزێك و عەلقەمە لە ریزەکەی تر خەڵکیان فێری قورئان و مەناسیکی حەج و پاشان حەرام و حەڵاڵ دەکرد..

لەگەڵ ئەم زانست و پلەو ناوداریەیدا هەوڵی دەدا دوای نوێژی جەماعەت خۆی لە مزگەوت و خەڵکەکە بشارێتەوەو بێتەوە

ماڵەکەی.. ووتیان بۆ وا دەکەیت؟ بۆچی ئاڵقەیەکی دەرس لە مزگەوت دانامەزرێنیت؟ فەرمووی: پێم خۆش نیە بڵێن: ئەوە ئاڵقە دەرسی عەلقەمەیە.. ووتیان : ئەدی بۆچی سەردانی والی ناکەیت تا معاشێکیان لێ سەنیت؟ فەرمووی: دەترسم بچمە لایان، چونکە بە چوونەکەم ئەوان زیاتر لەمن دەسەنن وەك لەوەی من لێییان دەسەنم!

٢. **مەسرووقی کوڕی ئەجدەع:** (٠٠ ـ ٦٢ ك / ٠٠ ـ ٦٨٢ ز) ئیمامی زەهەبی کە باسی مەسرووق دەکات دەڵێ: پێشەوای دیارو نموونەیی ئەبوعائیشەی وادیعی هەمەدانی مەسرووقی کوڕی ئەجدەعی کوڕی مالیك.. کە بە منداڵیی دزراو ناوی مەسروق (واتە دزراو)ی بەسەردا بڕا..باوکی لە سەرەتای ئیسلامەوە موسوڵمان بوو.. خۆشی لە سەردەمانی یاوەران و تابعیندا ژیاو نوێژی لەدوای سەیدنا ئەبوبەکری سددیقەوە خوا لێی رازی بێت کردووە.. سوارچاکێکی لێهاتوو بوو.. لەبەر ئەوەی ماوەیەکی زۆر لە خزمەتی خاتووعائیشەدا بوو کە کچی بوو ناوی نایەوە عائیشەو دەڵێن: لەبەر خاتری خاتووعائیشە هیچ قسەیەکی عائیشەی کچی رەت نەدەکردەوە.. جارێك نەبێت کە عائیشەی کچی زۆری لێ کرد بێت خواردنێك بخوات کە بە تایبەت بۆی دروست کردبوو، کە پێی ووت، فەرمووی: رۆڵە بەڕۆژووم. کچەکەی ووتی: ئاخر کەمێکیش بەزەییت بە خۆتدا بێتەوە. فەرمووی: ئاخر لەبەر ئەوەی بەزەییم پێیدا دێتەوە ناخۆم، چونکە رۆژێکی لە پێشە درێژییەکەی پەنجا هەزار ساڵە..

لە خزمەتی کۆمەڵێك یاوەردا زانستیەکانی ئیسلامی وەرگرت لەوانە: خاتووعائیشەو سەیدنا عومەرو سەیدنا عوسمان و سەیدنا

عەلی و ئوم رۆمان و سەیدنا ئوبەی کوڕی کەعب و سەیدنا مەعازو سەیدنا خەبباب و هەرچوار عبداللەکە: سەیدنا ئیبنومەسعوودو سەیدنا ئیبنوعەبباس و سەیدنا ئیبنوعومەرو سەیدنا ئیبنوعەمری کوڕی عاس و سەیدنا موغیرەی کوڕی شوعبەو دەیانی تر..

له قوتابیەکانیشی: شەعبی و ئیبراهیمی نەخەعی و یەحیای کوڕی وەسساب و ئەبووائیل و عبدالرحمنی کوڕی سەیدنا ئیبنومەسعوودو مەکحوول و محمدی کوڕی نەشرو ئەنەسی کوڕی سیرین و دەیانی تر..

ئیبراهیمی کوڕی محمد کە برازای مەسرووق بوو دەڵێ: خالیدی کوڕی عبدالله والی ئەمەویەکان لە بەسرە سی هەزار درهەمی بۆ مامە مەسرووقم نارد، زۆریش دەستکورت و پێویست بوو، بەڵام رەتی کردەوەو هیچی لێ هەڵنەگرت.. کە کچەکەشی دا بە ئەبوئیسحاقی سوبەیعی چونکە دەوڵەمەند بوو پێی ووت: ئەگەر دە هەزار درهەمم بدەیتێ.. ئەویش دایێ، هەر ئەو رۆژە هەمووی کردەوە بە مەسرووق ئەو موجاهیدانەی في سبيل الله دەچوونە غەزا.. مەسرووق لە جەنگی قادسیەدا (لە نێوان موسوڵمانان و فارسە مەجووسەکاندا بوو) دەستێکی پەڕی، لە شەری خەواریجیشدا لە بەرەی سەیدنا عەلی بوو خوا لێی رازی بێت..

خاوەن خواپەرستی و سوجدەو شەونوێژ.. بەردەوام دەبینرا کە قاچەکانی لە زۆری شەونوێژیدا دەئاوسان..

٣ـ <u>**مەعازەی کچی عبدالله :**</u> (٠٠ ـ ٨٣ ك / ٠٠ ـ ٧٠٢ ز) مەعازەی کچی عبدالله .. خاتوونی زاناو شەرعناس، زاهیدەو خواناس، قوتابی زیتی خاتوو عائیشەو سەیدنا عەلی کوڕی ئەبوتالیب خوا لێیان رازی بێت..

پاشان قوتابی هیشامی كوڕی عامرو سیلەی كوڕی هوشەیمی مێردی.. ماموٚستای لێوەشاوەی ئەبوقەللابەی جورمی و یەزیدی رەشەك و عاسم و عومەری كوڕی زەڕو ئیسحاقی كوڕی سوەیدو ئەیووبی سەختیانی ماموٚستای ئیمامی مالیك و دەیانی تر..

یەحیای كوڕی مەعین دەیفەرموو: مەعازە جێمتمانەی گێڕانەوەی فەرموودەیە..

ئیمامی زەهەبی دوای وەسف كردنی دەڵێ: نموونەی پیاوچاكیی و خواناسییەو ریوایەتەكانی لە كتێبە سەحیحەكاندان..

مەعازە شەوانی بە شەونوێژ دەبردە سەرو دەیفەرموو: سەرم لەو چاوە سوڕماوە كە خەوی دێت و دەشزانێت چاولێكنانی گۆڕ چەند توول دەكێشێت!

كە كوڕەكەی و مێردەكەی شەهیدبوون، شەونوێژەكانی زیاتر كرد، دەیفەرموو: بەو ئومێدەی خوای گەورە لە رۆژی دواییدا لە مێردو رۆڵەكەمم دانەبڕێت!

٤. **سەعیدی كوڕی موسەییب:** ( ١٤ـ ٩٤ ك / ٦٣٧ ـ ٧١٥ ز) ئەبومحمد سەعیدی كوڕی موسەییبی كوڕی حەزەنی ئەبووهەبی مەخزوومی، دوو ساڵ بەسەر حوكمڕانی سەیدنا عومەری كوڕی خەتتابدا خوا لێی رازی بێت تێپەڕیبوو كە ئەم لە مەدینە لەدایكبوو.. قوتابی یاوەرانەو لە خزمەتی دایكی موسوڵماناندا پەروەردە بووە، قوتابی دایكە عائیشەو ئوم سەلەمەو خولەفای راشیدین و سەیدنا زەیدو سەیدنا سەعدی كوڕی ئەبو وەققاس و سەیدنا ئەبوموسایە.. كە بووە زاوای سەیدنا

ئەبوهورەیرە هەر خوا دەزانێت چەند فەرموودەی لە خەزووریەوە وەرگرتووە !

لەبەر ئەم کەشە پڕ خواناسی و زانستیە شەرعیەیە پێی دەڵێن: زانای پڕ زانستی قورئانەوانی و تەفسیر.. بیری فەرموودەوانی و سەرچاوەی فەزاوەت و شەرعناسیی، پێی دەوترێت سەیدی شەرعناسان و شەرعناسی شەرعناسان.. شارەزاترین کەس بوو لە داوەری کردنەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و سەیدنا ئەبوبەکرو سەیدنا عومەردا خوا لێیان رازی بێت..

لەگەڵ ئەو بارودۆخە گونجاوەدا کە بۆی لوابوو دەڵێ: لە وەرگرتنی زانستی شەرعیدا جاری وا هەبووە بە مانگ لە سەفەرو هاتوچۆدا بووم بۆ وەرگرتنی فەرموودەیەك.. ئەم زانستە زۆرە لەگەڵ بێ هەواو فیزیی و تەقواو دینداریی.. کەسایەتیەکی زۆر بە سام و هەیبەتی بۆ دروست کردبوو، بە تایبەتی لە رووی پیاوانی دەسەڵاتی سیاسییدا..

رۆزی ژیانی خۆی بە فرۆشتنی رۆن مسۆگەر دەکرد، کە بڕی چوارسەد درهەمی دەهاتە دەست.. لەو سەردەمەشدا زانایان لە بەیتولمال پمعاشیان بۆ بڕابۆوە، بەڵام ئەم وەری نەدەگرت، جارێکیان پێیان ووت: بووە بە سیونۆ هەزار درهەم بۆ وەری ناگریت؟ فەرمووی: خوایە! تۆ دەزانیت ئەم چوار سەدەی بە رۆن فرۆشیەکەش پەیدای دەکەم زۆریم لێ زیادە بەڵام بۆ ئەوەی موحتاجی دەستی دەسەڵاتداران نەبم خوای وا بۆ خۆم و ماڵ و منداڵی سەرف دەکەمەوە..

عبدالملیکی کوڕی مەروان کە والی مەدینە بوو پێش خیلافەتەکەی داوای کچەکەی کرد بۆ وەلیدی کوڕی، نەیدایەو دواتر

دای بە یەکێك لە قوتابیە هەژارەکانی خۆی کە کوسەیری کوڕی ئەبی وەدداعە بوو، تەنها دوو درهەمیشی کردبوو بە مارەییەکەی..

ئاوا بووە یەکێك لە حەوت شەرعناسەکەی مەدینەو بێ موونافیس بووە یەکێك لە پێشەوایانی ئیسلام.. مەکحوول دەڵێ: دنیا گەڕام لە سەعیدی کوڕی موسەییبم زاناتر نەبینی.. عەلی کوڕی مەدینی دەڵێ: وا نازانم زانیاری کەس لە تابعیندا بگاتە زانیاری سەعیدی کوڕی موسەییب .. ئاخر لەبەر ئائەم پلە بەرزەی متمانەیە کە ئیمامی شافیعی فەرموودەی مورسەل لە کەس وەرناگرێت غەیری سەعیدی کوڕی موسەییب.. سەیدنا سەعید کتێبی نەنوسیوون، چونکە لەو سەردەمەی ئەودا هێشتا شارستانێتی ئیسلامی مابووی پێبگات، بەڵام وەکو عومەری کوڕی عبدالعەزیز دەڵێ: کەسم نەبینی لە مەدینە بووبێت بە زاناو پشکێکی زانستی سەعیدی کوڕی موسەییبی پێ نەبێت..

لە زۆر خواپەرستیی و ملکەچییدا پێی دەوترا: راهیبەکەی قورەیش..

٥. **عامری شەعبی** (٢٣ ـ ٩٤ ك / ٦٤٠ ـ ٧٠٥ ز) لە ماوەی ناوەندی حوکمڕانی سەیدنا عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی رازی بێت لەدایکبوو، نوێژی لەدوای سەیدنا عەلییەوە کردووە خوا لێی رازی بێت و بە خزمەت خاتوو عائیشە گەیشتووە، ئیمامێکی گەورەی ئەهلی سوونەتە، مەنسوری کوڕی عبدالرحمان لێیەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: زانستی شەرعم لە زیاتر لە پێنج سەد یاوەرەوە وەرگرتووە[١]. مامۆستای

---

[١] ابن حجر (تهذيب التهذيب: بـ٥ ل٥٩)..

عەلقەمەو نەخەعی و ئیبنو ئەبی لەیلاو شورەیحی قازی و حەممادو مەکحوول و عەتاء و سەدانی تره.. سەیر ئەوەیە ئەم زانا مەوسووعییە گەورەیە هیچ شتێکی نەدەنووسیەوە، هەرچی دەیخوێند لەبەری دەکرد. لە تەفسیردا پێشەوا بوو، لە ریوایەتی فەرموودەدا کەس نەدەگەیشتە ئاستی شانی، لە زمانەوانیدا فەرهەنگ بوو، دەڵێن سێ هەفتە هەموو رۆژێك پاش عەسران کۆڕی شیعری گرتووەو تەنانەت دێڕە شیعرێکی دووبارە نەکردۆتەوە! دەیفەرموو: ماوەی بیست ساڵە هەر چی فەرموودەیەك لە هەر کەسێکەوە دەبیستم نوێ نیە لام.. ئەوەی گوێم نەداوەتێ و بیرم چۆتەوە هەر کەسێك لەبەری کردایە دەچووە ریزی زاناکانەوە..

عەلی کوڕی قاسمی هوزەلی دەڵێ: ئیبنوسیرین پێی ووتم: برۆ شەعبی بگرەو بەری مەدە، چونکە چەندین جار دیوومە بە ئامادەبوونی یاوەران فەتوای دەدا.. یەعنی ئەو یاوەرانە بە فەتواکەی رازی دەبوون چونکە دەیانزانی لە زانینەوە دێت!

سوفیانی کوڕی عویەینە دەڵێ: ئیبنوعەبباس تاقە زانای زەمانی خۆی بوو، عامری شەعبی تاقە زانای زەمانی خۆی بوو، سوفیانی سەوری تاقە زانای زەمانی خۆی بوو..

٦. **حەسەنی بەسری:** (٢١ ـ ١١٠ ك / ٦٣٨ ـ ٧٢١ ز) ئەبوسەعید حەسەنی کوڕی یەساری بەسری.. گەنجی پڕ زانست و تەقواو خواناسیی و رەوانبێژیی و خۆبەکەمزانین و سوارچاکی جیهادو ئازایەتی .. باوکی خزمەتکاری سەیدنا زەیدی کوڕی سابیت بوو، دایکیشی بەردەستەی خاتوو ئوم سەلەمەی خێزانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم

بوو.. لە مەدینە لەدایكبوو.. كە كۆرپەبوو زۆر جار دایكی لەماڵ نەدەبوو دەگریا، خاتوو ئوم سەلەمە مەمكی دەخستە دەمی و بە وویستی خوا شیری بۆ لێ دەهات، هەندێك لە زانایان فەرموویانە: ئەو رەوانبێژییەی حەسەنی بەسری بەرەكەتی ئەو شیرەی ئوم سەلەمە بووە..

جوانترین گەنجی مەدینە بوو، بەڵام جارێك ئەسپەكەی لەقەی لێداو لووتی شكاند.. باوكی دەڵێ: بازووی حەسەنم پێوا یەك بستی تەواوبووا! ساڵی ٣٧ ك هاتە بەسرەو نیشتەجێ بوو، دەرسی لەو هەموو یاوەرە عەزیانە وەرگرت و وەك زانا پێگەیشت، وەك جوامێرییشی لە ساڵی ٤٣ ك بۆ ماوەی دە ساڵ لە بەرەی خۆراسان لە جیهاد دا بوو. موهەللەبی كوڕی ئەبو سوفرەی فەرماندە حەسەنی بەسری لەبەر متمانەی بە ئازایەتی و دڵسۆزیەكەی دەیخستە پێشی پێشەوەی رووبەڕووبوونەوەكان.. پاشان گەڕایەوەو بەسرەو بوو بەو پێشەوا مەزنەی وەكو ئاڵای ئوممەت دەشەكایەوە..

حەسەنی بەسری پێشەوایەكی گەورەی ئوممەتە.. ئەوانەی بۆ زانستی یاوەران دەگەڕێن، حەسەنی بەسری سەرچاوەیەكی سەرەكیەتی.. ئەوانەی بۆ خواناسیی و تەزكیەی نەفس دەگەڕێن شێخ حەسەنی بەسری سەرمەشقیانە.. ئەوانەی بۆ دانایی و پەندی پەسەند دەگەڕێن، لای ئەم پێشەوا ئاڵایە بە مەبەست دەگەن..

ـ دەیفەرموو: مردن دڵنیاییەو گومانی تێدا نیە، گومانیشەو دڵنیایی تێدا نیە..

ـ كەسێك كۆچی دوایی كردبوو، خەڵكەكە بە سەرسامیەوە سەیری قەرەباڵغی جەنازەكەیان دەكرد، پێی وت: ئا ئەوە شوێنەكەیەتی لای

کۆڵەکەی مزگەوتەکە، ئازایەتی ئەوەیە کەسێکتان شوێنەکەی بگرێتەوە..

ـ فەرقەدی کوڕی یەعقووب فالودجی نەدەخوارد (وەك دۆندرمەو ئاسکریم بووە)، حەسەنی بەسری لێی پرسی: بۆچی نایخۆیت؟ ووتی: دەترسم شوکرانەی خوام پێ نەکرێت لەسەری.. فەرمووی: هەی گەلۆر، چما شوکرانەی خوات لەسەر ئاو کردووە؟!

زۆر لە خەمی قیامەتیدابوو، هەمیشە خەمباری هەبوو، هەمیشە وا دەبینرا دەتووت تازە عەزیزێکی مردووە! بە خەڵکەکەی دەوروبەری خۆی دەڵێ: بە خزمەت حەفتا یاوەری بەدریی گەیشتووم، ئەگەر ئێوە ئەوانتان بەو خەم و پۆشاك و لێپرانەیانەوە ببینیایە دەتانووت: شێتن.. بە خوا ئەوانیش ئێوەیان ئاوا ببینیایە دەیانووت: ئەمانە هەر بۆ دنیایان ژیاون و پشکی ڕۆژی دواییان واز لێ هێناوە!!

ووتیان بۆچی ئەوەندە دەگری؟ فەرمووی: گریان جێ بەزەییە، بەڵکو خوای میهرەبانیش جارێك بمخاتە بەر بەزەیی خۆی..

ووتیان: هەیە کردەوەی چاکە ناکات چونکە گومانی باشی بە ڕەحمەت و بەزەیی خوای گەورە هەیە.. فەرمووی: درۆ دەکات، ئەگەر گومانی باشی بە خوای گەورە ببردایە فەرمانەکانی جێبەجێ دەکرد.. خەڵکی بێ تێشوو چۆن بەرەو بیابان دەکەوێتە ڕێ؟!

هەموو دووشەممەو پێنج شەممەو ڕۆژە سووننەتەکانی تر بەڕۆژوو دەبوو..

ئا ئەمە ئەو حەسەنی بەسرییەیە کە قەتادە دەیفەرموو: زانایانیش لای حەسەنی بەسری وەکو عەوامی خەڵکی شەرم دەکەن سەر هەڵبڕن..

سەرەتای رەجەبی ١١٠ ك كۆچی دوایی كرد، ئەو رۆژە یەكێكە لە رۆژە مێژووییەكانی ئیسلام، حەمیدوتتەویل دەڵێ: حەسەنی بەسری ئێوارەی پێنج شەممە گیانی سپاردو دوای نیوەڕۆی هەینی برایە گۆڕستان، هەرچی خەڵكی شار هەبوو بە ژن و پیاوەوە هاتبوونە دوای جەنازەكەی، تەنانەت بۆ یەكەمین جاربوو لە مێژووی ئیسلامدا هەموو مزگەوتەكانی بەسرە كەسی لێ نەمێنێت تا نوێژی عەسر بە جەماعەت بكرێت!

٧ـ **عورووەی كوڕی زوبەیر:** (٢٣ ـ ٩٤ ك / ٦٤٢ ـ ٧١٣ ز) كوڕی سەیدنا زوبەیری كوڕی عەووامە كە یەكێكە لەو دە یاوەرەی كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە دنیادا مژدەی بەهەشتی پێدان، دایكی عوروە ئەسمائی كچی سەیدنا ئەبوبەكری سددیقە خوا لێیان رازی بێت. عوروە ساڵی (٢٣ ك) لەدایكبوو، یەكەمین یاوەر كە دەرسی لێوە وەرگرت خاتوو عائیشە بوو كە پووری خۆیەتی! كە عائیشەخان كۆچی دوایی كرد عوروە فەرمووی: ئەگەر سێ ساڵ لەمەوبەریش بمردایە خەمم نەبوو چونكە هەرچی فەرموودەی لایە لەبەرم كردووە!

عوروە یەكێكە لە حەوت شەرعناسەكەی مەدینە.. هەموو ژیانی لە بەسرەو میسر بردە سەر بەڵام لە مەدینە كۆچی دوایی كرد..

عوروە جگە لەوەی سەرچاوەیەكی ریوایەتی فەرموودە بوو، جگە لەوەی شەرعناسێكی وا قاڵ و قووڵ بوو، نموونەی پیاوچاكیی بوو، كەس وەكو ئەو لە رۆژوو نوێژو خواپەرستیدا نقووم نەدەبوو.. رۆژی حەوت جزمی قورئان دەخوێند.. ئەوەندە هۆشی لە نوێژەكانی دەبوو هۆشی لە دەوروبەری دەبڕا .. سەرنجدە ئەم رووداوەی:

لە سەردانی وەلیدی کوڕی عبدالملیکدا کە خەلیفە بوو لاقی تووشی نەخۆشی داخوران بوو، کە گەیشتنە جێ، وەلید پزیشکی لێ کۆکردەوە، پزیشکەکان پێیان ووت: دەبێت بیبڕێتەوە، رازی بوو، پێیان ووت: برێك شەراب بخۆرەوە تا بێهۆش ببیت و هەست بەو هەموو ئازارە نەکەیت، فەرمووی: نا لە ناو نوێژەکەدا بۆم ببڕنەوە! کە گەیشتمە تەحیات قاچم درێژ دەکەم و بۆم ببڕنەوە.. واشی کرد.. تەنانەت وەلید کە بە قسەکردنەوە خەریك بوو دەڵێ: کە دوای بڕینەوەی لاقی بە شیشی سوورەوەکراوە داخیان کرد بۆنی گۆشتی برژاوم بەسەردا هات ئاوڕم دایەوە بینیم قاچیان بڕیوەتەوەو تەواو بوون!! فەرمانیدا لاقەکەی بشۆن و کفنی کەن تا نوێژی لەسەر بکات و بینێرێت بۆ گۆڕستان.. لەو کاتەدا بانگی کوڕە گەورەکەی کرد کە ناوی محمد بوو، وەڵامی نەبوو! بانگی کردەوە ، هەر وەڵامی نەبوو.. فەرمووی: بە خوا نەماوە بۆیە وەڵام ناداتەوە، چونکە ئەوە یەکەم جارێتی لە ژیاندا بانگی کەم و وەڵام نەداتەوە.. کە چوونە دەرەوە بینیان لە لە خانی ئەسپەکانی وەلیددا ئەسپێك لەقەی لێداوەو کۆتا هەناسەی دەدات!! کە گیانی سپارد، عوروە فەرمووی ئەویشم بۆ بشۆن و کفنی کەن.. پاشان لاقە بڕراوەکەی و کوڕە گەورەکەیان بە کفن کراوی لەبەر دەستی داناو ئەویش بە دانیشتنانەوە نوێژی لەسەر کردن و پاشان رووی کردە لاقە بڕراوەکەی وو فەرمووی: بڕۆ ئامانەتی خوا بیت، بە خوا قەسەم بۆ گوناحێکم نەبردوویت! رووی کردە جەنازەی کوڕەکەشی وفەرمووی: بڕۆ خوا لێت رازی بێت، جارێك تووڕەت نەکردووم. ئینجا دەستی بەرز کردەوەو فەرمووی: خوایە لاقە راستەکەمت بردەوە کە بەهێزتربوو، کوڕە گەورەکەمت بردەوە کە

باشتربوو، خوایە هەردووکیانم بۆ بکەیتە توێشووی قیامەتم.. کوڕەکانی تریشی باش دەرچوون ، تەنانەت محمدی کورەزاشی هەر بووەوە بە فەرموودەوان و شەرعناس..

زوهری دەڵێ: سێ کەسم بینی دەریای زانست بن: سەعیدی کوڕی موسەییب و عوروەی کوڕی زوبەیرو عوبەیدوڵلای کوڕی عبدالله ( کوڕەزای سەیدنا عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی رازی بێت)!!

عومەری کوڕی عبدالعەزیز دەیفەرموو: وا نازانم کەس لەم سەردەمەدا لە عوروە زاناتر بێت.

سوفیانی کوڕی عویەینە دەیفەرموو: واریسی زانستیەکانی عائیشە سێ کەسن: قاسمی کوڕی محمد( برازای خاتوو عائیشەیە)، عوروەی کوڕی زوبەیر (خوشکەزایەتی)، عەمرەی کچی عبدالرحمنی کوڕی سەعد کە ئیمامی زەهەبی دەرهەقی دەڵێ: عەمرە زانای پڕ زانست و شەرعناس و خاوەن بەڵگەیە ..

٨ـ **عەتائی کوڕی ئەبو رەباح:** (٢٤ ـ ١١٤ ك / ٦٤٦ ـ ٧٢٣ ز) موفتی کەعبە، گەورەپێشەوای شەرعناسانی یەمەن عەتائی کوڕی ئەبو رەباح ئەسلەمی کوڕی سەفوان کە لە نزیکی شاری تەعز لە یەمەن لەدایکبوو، بووە قوتابی دوو سەد کەس لە یاوەرانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم، لەوانە: خاتووعائیشەو ئوم سەلەمەو ئوم هانی و ئەبوهورەیرەو ئیبنو عەبباس و ئیبنوعومەرو ئیبنوزوبەیرو جابری کوڕی عبداللەو ئەبوسەعیدی خودری و بەرێزەکانی تر.. بوو بە مامۆستای ئەوزاعی و ئەبو حەنیفەو لەیسی کوڕی سەعدو موجاهیدو

قەتادەو ئەییوبی سەختیانی و زوهری و عەمری كوڕی دینارو ئیمام جەعفەری سادق و سەدانی تر[١] ..

لە سەردەمی حوكمڕانی سەیدنا عوسمانی كوڕی عەففاندا خوا لێی ڕازی بێت لەدایكبوو، پاش هەشتاو هەشت ساڵ تەمەن وحەفتا حەج لە مەككە كۆچی دوایی كرد.. لەمەوەیە كە دەیانووت هیچ كەس بە قەدەر عەتاء شارەزای ئەحكامی حەج بێت..

پێی دەوترا (كانی زانستی)..

لە مەككەوە پرسیارێكیان بۆ ئیبنوعەبباس نارد لە مەدینە، فەرمووی: توخوا عەتائتان لایەو پرسیار بۆ من دەنێرن؟!!

عەتاء ڕەحمەتی خوای لێ بێت زۆر ناشیرین بووە.. زۆر ڕەش بوو و سەری مووی پێوە نەمابوو، ریشیشی لە خەنە دەگرت.. چاوی خێل و ئەبلەق بوو، دواتریش یەكجاری كوێر بوو.. و لووتی پان و قاچی شەل و دەستێكی گۆج بوو، دەستە ساغەكەشی لە شۆڕشەكەی سەیدنا عبداللەی كوڕی زوبێردا كە دژی ئەمەویەكان كردی، پەڕی.. كەچی ئەوەندە جێ متمانەی زانایان و شەرعناسان بوو دەیانووت: هەر كەسێك عەتاء و سەعیدی كوڕی موسەییب و حەسەنی بەسری و ئیبراهیمی نەخەعی پشتیوانی لێ بكات، ئوممەتەكە هەمووی پشتیوانی لێ دەكات!!

كە خەلیفە عبدالملیكی كوڕی مەروان هاتە حەج، عەتائی بانگ كرد، عەتاء چووە لای.. كە هات عبدالملیك هەستایە سەر پێ و بەرەو پیری چوو لە تەنیشت خۆی داینیشاند.. عبدالملیك ووتی : پێداویستی

---

[١] ئیمامی زەهەبی لە كتێب (سیر اعلام النبلاء) دا ناوی ٧٥ كەسی لە قوتابیە هەڵكەوتەكانی عەتاو هێناوە كە بوونەتەوە بە موفتی..

خۆتم پێ بڵێ تا بەسەر چاو جێبەجێی کەم. عەتاء فەرمووی: لە خوا بترسەو ئەم حەرەمەی کەعبە گەورەتر کە، لە خوا بترسەو چاوت لە زارۆکی کۆچکەرو پشتیوانان بێت، تۆ بە رەنجی باوکی ئەمان گەیشتوویتەتە ئەم جێیە، لە خوا بترسەو سەرپەرشتی موجاهیدانی سەر سنوور بکە، تۆ بەوان پارێزراویت.. دەرگاشت بەڕووی موحتاجاندا دامەخە ، لە هەموویدا عەبدولەلیك دەیووت بەسەر چاو.. پاشان چاوەڕێ بوو پێداوویستی خۆی بڵێ، بەڵام هیچی نەووت، عەبدولەلیك پێی ووت پێداوویستی خەڵکیت داوا کرد، ئەدی پێداوویستی خۆت؟ فەرمووی: من پێویستیم بە عەبد نیە.. کە رۆیشت، عەبدولەلیك گەڕایەوە کۆڕەکەی خۆی ووتی: بە خوا قەسەم ئائەوە دەسەڵاتە، ئا ئەوە گەورەییە، ئا ئەوە پلەوپایەیە..

ئەوزاعی دەڵێ: ئەو رۆژەی عەتاء کۆچی دوایی کرد لەسەرانسەری سەر زەمیندا کەسێك نەبوو لێی رازی نەبووبێت، تەنانەت ناحەزەکانیشی ..

ئیبنوجورەیج دەڵێ: هەژدە ساڵی بەردەوام دەرسم لای عەتاء خوێندو شەووڕۆژ لە خزمەتیدابووم، جارێك نەمدی پۆشاکێکی وای لەبەردا بێت بایی پێنج درهەم ببێت.. معاشی بەیتولمالی وەرنەدەگرت و هەرچیەکیشی دەدرایە دەیکردەوە بە خێر..

عبداللەی کوڕی دیباج دەڵێ: هەموو ساتێکی کۆڕی عەتاء زیکربوو، شتی وا بە فەسیحی دەووت دەتووت وەحی بۆ دێت!! بیست ساڵی تەواو لە مزگەوت بوو، کە نوێژی دەکرد دەتووت ناچەمێتەوە.. کە دەچووە سوجدە باڵندەی بەسەرەوە دەنیشتەوە وایان دەزانی کۆتەرە داری سوتاوە!!

٩ـ **نافیعی مەولای سەیدنا ئیبنوعومەر:** (٠٠ ـ ١١٧ ك / ٠٠ ـ ٧٣٧ ز) نافیعی مەولای سەیدنا عبداللەی کوڕی عومەر یەکێك لە پێشەوای شەرعناسان و فەرمووەدەوانانی مەدینەو ئالْقەی نێوان تابعین و یاوەران..

ئیمامی مالیك دەیفەرموو: ئەگەر ریوایەت لە نافیعەوە هات مۆری کەو بەدوایدا مەگەڕێ چونکە لە هەموو ریوایەتەکانیدا یەك هەڵە نەبینراوە..

ئیمامی بوخاری دەربارەی دەیفەرموو: راستترین سەنەد لە نێو هەر هەمواندا سەنەدی (مالیك لە نافیع و ئەویش لە ئیبنوعومەرەوەیە)..

ئەمە قوتابیە نەجیبەکەی ئیبنو عومەرو عائیشەخان و ئوم سەلەمەو ئەبو هورەیرەو ئەبو سەعیدی خودری و رافیعی کوڕی خەدیج و ئەبو لوبابەیە.. مامۆستای زوهری و ئەیوبی سەختیانی و حەمیدی تەویل و ئیبنوجورەیج و بەکیری کوڕی عبداللە و ئیبنو ئەبی زیئب و ئیبنوئەبی لەیلاو ئەوزاعی و زەیدو عاسم و مالیك و لەیس و سەدانی ترە ..

ئەمە نافیعە کە بووە جێ متمانەی عومەری کوڕی عبدالعەزیزو خەزێنەداری یەمەن و پاشان ناردی بۆ میسر تا خەڵکەکەی فێری فەرمووده بکات..

ئەم زانا بەڕێزە لە دوای نوێژی بەیانیەوە تا خۆر هەڵدەهات فەرموودەی بە قوتابیەکانی دەووتەوە..

ئەدی گرنگ نیە کە ئەم پیاوەی کە ئاوا بەم دینەوە بووە بە پێشەوای ئەم ئوممەتە، بێ نەسەبە.. خەڵکی ناوچەی دەیلەمی باکوری

ئێران بوو، هەندێك دەڵێن كابوولییە.. لە شەڕێكدا بە زارۆكی كەوتە دەست ئیبنو عومەر خوا لێی رازی بێت، ئەویش هێنایەوە بۆ مەدینەو وەكو كوڕی خۆی سەرپەرشتی كردو ئەو پیاوە مەزنەی لێ دەرچووا! لەو زەمانەشەوە پێی دەڵێن: ئەبو عبداللەی عەدەوی (بەرەبابی سەیدنا عومەر) قورەیشی!

١٠. **قەتادە:** (٦٠ ـ ١١٨ ك / ٦٧٩ ـ ٧٣٨ ز) ئەبولخەتتاب قەتادەی كوڕی دەعامەی سدووسی، كوێرو گەڕو گوول! بەڵام پێشەوای زانایانی تەفسیرو فەرموودەوانی و شەرعناسیی.. پسپۆڕی زمانەوانی و فەرهەنگی نەسەبزانیی و دیوانی شیعری عەرەبی! نیشانەیەك لە گەورەیی خوا لە شت لەبەر كردندا ..

ئیمامی ئەحمەد دەڵێ: هەرگیزاو هەرگیز دووجاری فەرموودەیەك بۆ نەووتراوەتەوە، چونكە هەر بە یەكەمین بیستنی لەبەری دەكردا! دەڵێ: یەك جار سەحیفەكەی جابرم بۆ خوێندەوە لەبەری كردو كردیەوە بە بەڵگەی راوبۆچوونەكانی !

خۆی دەڵێ: قەت بە كەسێكم نەووتووە بۆم بڵێرەوە، هەرچیەكیشیان پێ ووتم: وا دڵم داوەتێ لە ناخمدا رووداوەو بیرم نەچۆتەوە..

لە هەموو تەفسیرەكانی ئەهلی سووننەتدا بۆچوونی قەتادە وەردەگیرێت و لە هەر شەش سەرچاوەی فەرموودەی ئەهلی سووننەتدا ریوایەتی قەتادە هەیە.

ئیمامی زەهەبی لە باسیدا دەڵێ: حافزی سەردەم، پێشەوای ئەهلی تەفسیرو فەرموودەوانان، قەتادەی بەسری، قوتابی سەیدنا ئەنەسی

كوڕی مالیك و ئەبوتوفەیل خوا لێییان ڕازی بێت لە تابعینیش سەعیدی كوڕی موسەییب و ئەبولعالیەو ئەبوعوسمانی نەهدی و زورارەی كوڕی ئەوفاو عیكرەمەو حەسەنی بەسری و ئیبنوسیرین و عەتاء و مەعازەو بشرو بەشیرو ئەبولشەعساء و سەدانی تر. قەتادە دەڵێ: دوازدە ساڵ قوتابی حەسەنی بەسری بووم، سێ ساڵی تەواو هەموو نوێژەكانی بەیانیم لە دوایەوە كردووە، شایانی ئەوەبوو ئەوەندە لە خزمەتیدا بمێنمەوە..

مامۆستای ئەیوبی سەختیانی و مەعمەرو ئەوزاعی و موسعیری كوڕی كودام و شوعبەو جەریری كوڕی حازم وئەبو عەوانەو ئەو چینەی زانایانی ئیسلام بوو.

بە كۆڕا(ئیجماع)ی زانایان قەتادە حوججەیەو بۆچوونی قبووڵە.. لەگەڵ ئەوەشدا كە دیدێكی قەدەریی تێدابووە، لەگەڵ ئەوەشدا وەكو ئیمامی زەهەبی دەڵێ: بەڵام كەسێك لە زانایانی ئیسلام نابینیت بە ڕاستگۆو جێمتمانەو حافزو دەسپاكی نەزانێت.. بەڵكو خوای گەورە ئەم گومان باشیەی بۆ بكاتە مایەی لێبوردنی لەو بیدعەیەی كە هەر مەبەستی بە مەزن ڕاگرتنی خوای میهرەبان بووە، ئێمە داوای لێبوردنی بۆ دەكەین و بە گومڕای دانانێین و ئومێدەوارین تۆبەی كردبێت و لێی وەرگیرابێت[1]..

---

[1] قەتادە نكووڵی لەوە دەكرد كە هەموو رزقێك خوا دابێتی .. دەیفەرموو: حەرام رزقی خوایی نیەو عەبد بە سەرپێچی پچڕیوێتی!

لە زانستی راجوێییدا[1] ئەوەندە شارەزابوو، حەسەنی بەسری پرسی پێ دەکردەوە.. لە پیریی‌دا لێیان پرسی بۆچی رای خۆت لە مەسەلە شەرعیەکاندا نادەیت؟ فەرمووی: چل ساڵە هیچ شتێکم لە بۆچوونی خۆمەوە نەووتووە..

مەعمەر دەیفەرموو: کەسم لە زوهری و قەتادەو حەمماد زاناتر نەدیووە..

زیرەکی قەتادە وەکو موعجیزە وابووە، وەکو کۆمپیوتەر هەرچی تێدا تۆمار کراوە پاراستوێتی و هەر ساتێك وویستبێتی هێناوێنتیەوە پێشێ! دەڵێ: یەك ئایەت نەماوە لە قورئاندا زانیاریەکم دەربارەی نەبیستبێت.. سەیر ئەوەیە ئەم زانا بەرێزە ئەوەندە لەش سووك بووە کە هیچ فەرموودەیەکی بە بێ دەستنوێژ نەگێڕاوەتەوە! هەموو هەفتەیەك خەتمێکی قورئانی دەکرد..

لە هەمووان سەیر تر ئەوەیە کە خەڵکێك لە شام لەسەر دێرە شیعرێك یان لە یەمەن لەسەر نەسەبی کەسێك رایان جیاواز دەبوو، نامەیان بۆ قەتادە دەنارد کە وەڵامە راستەکەی چییە!!

لە لەفزی گێڕانەوەدا موراعاتی دادپەروەریی و راستگۆیی دەکرد، ئەوەی بۆ خۆییان باس کردووە فەرموویەتی:(حَدَّثنا) ئەوەی بیستوێتی فەرموویەتی:(حَدَّث).

سەمورەی کوڕی شەوزب دەڵێ: سابیت پیاوی خواپەرستییە، خۆ لە حەرام پاراستن قابیلی ئیبنوسیرینە، زاهدێتی سیمای مالیکی کوڕی

---

[1] علم الاختلاف : بریتی بوو لە : یەکەم: زانینی راوبۆچوونی زاناکان لە کێشە جیاوازەکان. دووەم: زانینی بەڵگەی هەر لایەکیان. سێیەم: زانینی هێزو لاوازی بەڵگەکان و چۆنیەتی ئیستیدلال پێکردنیان.. بەشێك لەو زانستە لەم سەردەمەدا پێی دەوترێت: (الفقه المقارن)..

دینارەو زانستی شەرعی وا لە لای حەسەنی بەسری و قەتادەش خوا دایناوە بۆ لەبەرکردن و پاراستنی زانستی..

قەتادە بە قوتابیەکانی خۆی دەوت: توندڕەو مەبن، بە خۆتان سەرسام مەبن، بۆ خوا بێ هەواوفیزبن، بزانن خوای گەورە چۆن بەرزتان دەکاتەوە..

ئەم پایەبەرزەی ئەهلی سووننەت لە واسیت لە عێراق کۆچی دوایی کرد ئەو شارەی ئێستا ئەهلی سووننەتی تێدا غەریبە..

١١. **ئیمام جەعفەری سادق:** (٨٠ ـ ١٤٨ ك / ٦٩٩ ـ ٧٦٨ ز) جەعفەری کوڕی محمدی کوڕی ئیمام زەینولعابدینی کوڕی ئیمامی حوسەین شەهیدی کەربەلا.. ئیمامی شەشەمی شیعەیە، کوڕی ئیمامی باقرو باوکی ئیمام موسای کازمە..

دایکی ئوم فەروەیە، کە کچی قاسمی کوڕی محمدی کوڕی سەیدنا ئەبوبەکری سددیقە خوا لێی رازی بێت دایکی ئوم فەروەش ئەسمائی کچی سەیدنا ئەبوبەکرە خوا لێی رازی بێت.. یەعنی ئیمامی جەعفەر لە بەرەبابی دایکیەوە لە دوو کەسی بەڕێزی خانەوادەی سەیدنا ئەبوبەکرەوە خوا لێی رازی بێت هاتووە.. لەبەر ئەمەیە ئیمامی جەعفەر دەڵێ: (وَلَدَني ابوبكر مَرَّتين) واتە دووجار لە ئەبوبەکرەوە لەدایکبووم..

ساڵی ٨٠ ك لە دایکبووە.. لەبەر ئەوەی هەرگیز درۆی لێ نەبیستراوە ئەو نازناوی (صادق) واتە راستگۆی بەسەردا بڕاوە..

یەکێکە لە شەرعناسانی تابعین و قوتابیانی یاوەرانی وەکو سەیدنا ئەنەسی کوڕی مالیك و سەیدنا سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی خوا

لێییان رازی بێت.. بەهێزترین سەنەدی ریوایەتەكانی لە باوك و باپیریەوەیەتی كە هەموویان جێمتمانەن.. لە مامۆستاكانی تری لە تابعین: عەتائی كوڕی ئەبو رەباح و زوهری و عوروەو عیكرەمەو محمدی كوڕی مونكەدیرو عبداللەی كوڕی ئەبو رافیع و باپیرە قاسمی كوڕی محمدی كوڕی سەیدنا ئەبوبەكری سددیق.. ئەمانەش هەموو جێ متمانەو شەرعناسانی تابعینن..

لە قوتابیەكانیشی: یەحیای كوڕی سەعیدی ئەنساری قەتتان و یەزیدی كوڕی عبداللەی لەیسی و ئەییوبی سەختیانی و ئیمامی مالیك و سوفیانی سەوری و سوفیانی كوڕی عویەینەو شوعبەو محمدی كوڕی سابیتی بەنانی و ئیمامی ئەبو حەنیفە.. كە هەموویان جێ متمانەو شەرعناسی تابعین و تابیعی تابیعینن..

ئیمامی موسلیم و ئەبوداوودو ترمزی و نەسائی و ئیبنوماجە ریوایەتیان لێوە وەرگرتووە..

هیاجی كوڕی بوستامی تەمیمی كە قوتابی ئیمامی جەعفەر بوو، باس لە سەخاوەتی ئیمام دەكات دەڵێ: ئەوەندەی هەیبوو دەیبەخشی، تەنانەت بەشی ماڵ و منداڵەكەی خۆی نەدەمایەوە.. كە داوەری دوو لایەنی ناكۆكی دەكرد، لە ماڵ و سامانی خۆی قەرەبووی دەكردنەوەو رێكی دەخستنەوە!!

فەرمایشتەكانی هەموو حیكمەت بوون.. لەوانە:

ـ (چاكە بە سێ سیفەت تەواو دەبێت: بە خێرا ئەنجامدانی ، بە بچووك بینینی، بە پەنهان كردنی)..

ـ ( ئەوی قەناعەت بەوە دەكات كە هەیەتی، بەسی دەبێت.. ئەوی چاوی لە ماڵی خەڵكی بێت بە هەژاریی سەر دەنێتەوە! ئەوی تێكەڵ

بە زانایان بێت بەڕێز دەبێت، ئەوی تێکەڵ بە گەمژەو گەمبۆڵان بێت سووك دەبێت)..

جارێك لە کۆڕی ئەبو جەعفەری مەنسووردا بوو، مێشێك ئەبو جەعفەری زۆر ئیزعاج کرد، هەر دەری دەکردو دەهاتەوە، مەنسوور لە ئیمام جەعفەری پرسی: ئەرێ خوا مێشی بۆچی دروست کردووە؟ ئیمام فەرمووی: بۆ ئەوەی ستەمکاران زەلیل کات..

ئیمامی ئیبنوحەجەر دەربارەی دەڵێ:(أبو عبد الله المعروف بالصادق فقيه صدوق)[1] واتە: ئەبوعەبدوالڵەی راستگۆ شەرعناسێکی راستوێژە..

ئەبوحاتەمی رازی دەڵێ: (متمانە پێکراوە، لەو جۆرە نیە لێی بپرسرێت)[2].

ئیمامی ئیبنوتەیمیە دەرهەقی دەڵێ: جەعفەری کوڕی محمد بە کۆڕا (ئیجماع)ی ئەهلی سووننەت لە پێشەوایانی دینە[3]..

شیعەو گێلەسوونی قسەیەك بڵاو دەکەنەوە کە گوایە ئیمامی ئەبو حەنیفە دووساڵ دەرسی لای ئیمام جەعفەر خوێندووەو فەرموویەتی: (لولا سنتان لهلك النعمان) واتە ئەگەر ئەو دووساڵە نەبوایە ئەبو حەنیفە بە هیلاك دەچوو! هەروەها گوایە هەموو زانستیەکانی لەو بەڕێزەوە وەرگرتووە، لەبەر ئەوەی ئەمیش ئیمامی سێ پێشەواکەی ترە، دەی کەوابێت ئیمام جەعفەر لە هەمووان

---

[1] الحافظ ابن حجر العسقلاني : تقريب التهذيب / بـ١ ل١٤١ .

[2] ابوحاتم : الجرح والتعديل ٤٨٧/٢ . واتە هی ئەوە نیە بەدوویدا بچیتەوەو لێی دڵنیا بیت کە جێ متمانەیە..

[3] ابن تيميه : المنهاج ٢٤٥/٢ .. سەیری ئەو مەتحەو هەڵوێستی شیعەی نەگبەت بکە کە هەمیشە وا بڵاو دەکەنەوە کە ئیمامی ئیبنوتەیمیە دژی ئیمامی جەعفەر قسەی کردووە.. لەعنەت لە درۆزن..

مەزنترەو شایانترە شوێنی کەوین.. ئەمە هەم درۆیە هەم گێل کەززابییە، هەم بە دەردی ئێرانی دەڵێن: :کلاو لەسەر نانە!:

یەکەم: ئیمامی جەعفەرو ئیمامی ئەبو حەنیفە لە ساڵی ٨٠ ك کۆچیدا لە دایکبوون و ئیمامی ئەبو حەنیفە ساڵی ١٥٠ ك دوو ساڵ دوای ئیمامی جەعفەر کۆچی دوایی کردووە.. کەوابوو هەردووکیان زانای هاوشانی یەکن و دەشێت ئیمامی ئەبو حەنیفە بەشێکی لە زانستی لە ئیمامی جەعفەرەوە وەرگرتبێت، ئەمەش لە نێوان زانایاندا زۆرە وەکو ئیمامی ئیبنوتەیمییەو ئیمامی زەهەبی.. یان ئیمامی شافیعی و ئیمامی ئەحمەد کە هاودەنگی کۆڕی یەکتریی بوون..

دووەم: ریوایاتی شیعە وا دەناسێنن کە ئیمامی ئەبو حەنیفە دوژمنی ئیمامی جەعفەر بووە[1]. کە واش نیە.. بەڵام خۆ دیارە ئیمامی جەعفەر زۆر دژی رەئی و قیاس بووەو ئیمامی ئەبو حەنیفەش مەزهەبەکەی لەسەر ئەو دوانەیە.. ئیمامی مالیك و شافیعی و ئەحمەدیش دوورن لە ئوسوڵی مەزهەبییانەی ئیمامی ئەبو حەنیفەو لە هیچ شتێکدا نەکەوتوونەتە ژێر کاریگەری ئەوەوە..

سێیەم: هەرچی لاپەڕەی مێژووی ئەو سەردەمە هەیە شایەتی ئەوە دەدات کە مامۆستای هەرە گەورەو کاریگەریی ئیمامی ئەبو حەنیفە حەممادی کوڕی ئەبو سولەیمانە کە قوتابی ئیبراهیمی نەخەعییەو ئەمیش قوتابی عەلقەمەی کوڕی ئەسوەدەو عەلقەمەش قوتابی سەیدنا عبداللەی کوڕی مەسعوودە خوا لێی رازی بێت.. مامۆستای دووەمی ئیمامی ئەبو حەنیفە عەتائی کوڕی ئەبو رەباحە.. لە هیچ

---

[1] بڕوانە: أصول الكافي ١/ ٣٩٢ـ ٣٩٣.

شوێنێکدا یەك ریوایەت نیە ئەوە بسەلمێنێت کە ئیمامی ئەبو حەنیفە یەك راوبۆچوونی ئیمامی جەعفەری وەرگرتبێت، لەگەڵ ئەوەشدا کە مەتحی جوانی کردووە، بەوەی کە شەرعناسترین زانایە..

چوارەم: ئەگەر لەبەر زۆربلێیی ئەوەمان وەرگرت کە چوار مەزهەبەکەی ئێمە لە ئیمامی جەعفەرەوە هاتووە، ئێ باشە وەکو ئێوە لە ئیمام موساتانەوە وەرگرتووە، ئێمەش لە قوتابیەکی تریەوەمان بە بەڵگەوە وەرگرتووە.. ئیتر ئاو بێنەو قاچت بۆ دەستنوێژ بشۆ..

١٢. **ئیمامی ئەوزاعی:** (٨٨ ـ ١٥٧ ك / ٧٠٧ ـ ٧٧٤ ز) فەرموودەوانی شەرعناس، پارێزەری مافی ئەهلی کیتاب و موسوڵمان، موفتی گەورەی شام عبدالرحمانی کوڕی عەمری ئەوزاعی، لەدایکبووی شاری بەعەلبەکی لوبنان و گۆشکراوی شام.. قوتابی نەجیبزادەی زانست.. چووە بەسرەو زانستی قەتادەی وەرگرت، چووە کوفەو زانستی ئیمامی شەعبی وەرگرت کە لە پێنج سەد یاوەرەوە دینەکەی وەرگرتبوو.. چووە مەککەو زانستی عەتائی کوڕی ئەبو رەباحی وەرگرت، چووە مەدینەو زانستی نافیع و زوهری وەرگرت، هاتەوە شام و گوڵە گەنمەکانی مەحکوولیشی هەموو کۆکردەوە.. ئەم گەشتەی بردیە ئاستی ئیمامی مالیك و سوفیانی سەوری و عبداللەی کوڕی موبارەك بۆیە پەیوەندی بە هەر سێکیانەوە هەبوو!

ئاوا بووە سەر مەزهەبێکی سەربەخۆی فەرموودەوانی و شەرعناسیی، بەڵام قوتابیەکانی بۆچوونەکانیان کۆنەکردەوەو مەزهەبی ئەمیش وەکو مەزهەبی لەیسی کوڕی سەعد پووکایەوە، تەنها ئەو رایانەی ماون کە خەڵکانی تر ئیستیدلالیان پێ کردووە..

ئیمامی ئەوزاعی جێمتمانەی هەموو فەرمووده‌وانانی ئەهلی سوونەت و جەماعەتە، بوخاری و موسلیم و ئەبوداوودو نەسائی و ترمزی و ئیبنوماجەو داریمی و دارەقوتنی و ئیمامی ئەحمەدو محمدی كوڕی حەسەنی شەیبانی و تەبەریی و داوودی زاهیریی و ئەوانی تر لێیانەوە گێڕاوەتەوە..

كاتێك مەسیحیەكانی جەبەل لوبنان شۆڕشیان دژی ساڵحی كوڕی عەلی والی عەبباسی ڕاگەیاندو كەوتنە كوشتنی ئەو گوندنشینانەی لێیانەوە نزیكبوون، ساڵحیش پەیمانی دا تەفروتوونایان كات، هاتە سەریان و ئەوەی بەشداری شەڕیشی نەكردبوو لە جێ و ڕێی خۆیان دەری كردن و زیانی لێدان.. ئیمامی ئەوزاعی كە بیستی چووە لای والی و پێی ووت: ئەوانە بە پێی شەرعی خوا ئەمانیان لە ووڵاتی خۆیاندا دراوەتێ، ناهەقییە سزای تاوانی كەسانێك بەسەر هەموویاندا بدرێت.. خوای گەورەش دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾ الأنعام/١٦٤ واتە: گوناحی كەس نادرێت بەسەر كەسێكی تردا.. پێغەمبەری خواش صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: (مَن ظلَمَ مُعَاهِداً أو كَلَّفَهُ فوقَ طاقَتِهِ فأنَا حَجِيجُهُ) واتە: هەر كەسێك ستەم لە هاوپەیمانێك بكات یان زیاد لە توانای خۆی بەسەردا بدات، ئەوە من لە دادگای قیامەتدا وەك تەرەف بەرامبەری ڕادەوەستمەوە.. بەردەوامیش بوو لەسەر سەندنەوەی ماف ئەو مەسیحیانەو گێڕانەوەیان بۆ جێ و ڕێی خۆیان و قەرەبوو كردنەوەیان لە بەیتولمال.. كۆڵی نەدا تا قەناعەتی بە والی كردو هەموویانی هێنایەوە جێی خۆیان..

ئەم زانا بەڕێزە لە ١٥٧ك/٧٧٤ لە بەیرووت كۆچی دوایی كردووە، ئێستاش كۆلیجی ئیمامی ئەوزاعی لە بەیرووت بە ناوی ئەوەوەیە كە

چەند قوتابیەکی بەڕێزی کورد لەوێ بڕوانامەیان وەرگرتووە.. والحمد لله..

١٣- **لەیسی کوڕی سەعد:** (٩٤ - ١٧٥ ك / ٧١٣ - ٧٩٥ ز) شێخی ئیسلام و حافزی مەزنی میسر لەیسی کوڕی سەعد کوڕی عبدالرحمان.. جێمتمانەی فەرمووددەوانان کە خاوەن شەش سەحیحەکەی ئەهلی سوونەت دەیان فەرموودەیان لێوە ریوایەت کردووە.. لە میسر لەدایکبووەو زانستی لە خزمەت پێشەوایانی ئیسلام وەکو: عەتاء و ئەبو مولەیکەو زوهری و سەعیدی مەقبەریی و ئەبوزوبەیری مەککی و ئەوانە خوێندووە..

ئیمامی شافیعی دەیفەرموو: لەیس لە مالیك زاناتر بوو بەڵام قوتابی نەبوو مەزهەبەکەی لەخۆ بگرن و زانستەکەی بلاوکەنەوە..

ئیمامی ئەحمەد دەیفەرموو: لەیس زۆر زانایە، جێمتمانەیە، فەرموودەکانی راستن..

خۆی دەڵێ: ساڵی ١١٣ چوومە خزمەتی نافیع لە مەککە فەرمووی تەمەنت چەندە ؟ ووتم: بیست ساڵ. فەرمووی: ریشت لە چل ساڵان دەچێت..

رۆژێك قوتابیەکانی پێیان ووت: جاری وا هەیە فەرموودەیەکمان پێ دەڵێیت لە کتێبەکانتدا نیە. فەرمووی: ئەوەی لە بیروهۆشمدایەو نەخراوەتە سەر تیانووس زۆر لەوە زیاترە کە نوسراوەتەوە.. ئەگەر هەمووی بنوسرایاتەوەو عارەبانەیەك نەیدەگرت..

فەرموودەکانی یەکسەر لە یەکێکی جێمتمانەی وەکو هیشامی کوڕی عورەوەوە وەردەگرت ئەمیش لە دایکیەوە کە ئەسمائی کچی

سەیدنا ئەبوبەکری سددیقە خوا لێیان رازی بێت.. یان یەکسەر لە سەعیدی مەقبەریی، ئەویش لە باوکیەوەو ئەمیش لە سەیدنا ئەبوهورەیرەوە خوا لێی رازی بێت دەیگێڕایەوە.. دەیان ریوایەتی تری ئاوا کە لە فەرموودەوانیدا بە ناوی ئەسانیدی لەیسەوە ناوبانگیان دەرکردووە.. جا بزانە چ گەورەییەکە کە تا رۆژی قیامەت ناوی ئەم زانا بەرێزە بەو سەنەدانەوەیە!!

لەیس حەزی بەسەرخستنی فەرموودەبوو، نەیدەهێشت کەس راوبۆچوونی شەرعناسان لە بەرامبەریدا بخاتەڕوو، ئەوەندەش کاریگەربوو دەستە گومڕاو لادەدەرەکان کۆڕی گەورەیان پێ نەدەگیرا.. هەرچەندە ئەم زۆر لە راجوێیی و ناکۆکی بەدووربوو، لە هەشتاساڵیدا فەرمووی: تەمەنم بووە بە هەشتاو لەگەڵ بیدعەچییەکدا نەکەوتوومەتە موجادەلەوە..

کە گەڕایەوە میسرو زاناو سیاسەتمەدارو عەوامی میسر دەوریان لێدا، ناچاربوو رۆژەکەی بکات بە چوار بەشەوە، بەشێك بۆ ئاڕاستەی حاکم و قازی وولات تا ئاگای لە داوەریی خەڵکی بێت، بەشێکی بۆ قوتابی و دەرس ووتنەوەو بەشێکی بۆ ئەهلی بازاڕ چونکە خۆشی بازرگانێکی گەورەبوو، بەشێکی تریشی بۆ عەوامی خەڵکی و پرسیارەکانیان.. بەردەوام ئەبو جەعفەری مەنسوور ـ کە خەلیفە بوو۔ داوای لێ دەکرد ببێتە والی میسر، بەڵام ئەم هەر رەفزی کردو هیچ بەرپرسێتیەکی بۆ وەرنەگرتن.. جارێکیان ئەبو جەعفەری بانگی کردو لێی پرسی بۆچی وەریناگریت؟ فەرمووی: من کابرایەکی موالیم و بێ کەسم.. والێتیش کەسی پشت ئەستووری دەوێت، ئەبو جەعفەری ووتی: ناتەوێت بیکەیت دەنا بە منەوە بەهێز دەبیت.. ئینجا پێی

ووت: دەی باشە پیاوێكی باشی وەكو خۆت و بە دەسەڵاتم بۆ هەڵدە.. فەرمووی: عوسمانی كوڕی حەكەمی جوزامی پیاوچاكیشەو خاوەن عەشرەتیشە.. كە عوسمان بیستیەوە، سوێندی خوارد تا ماوە قسە لەگەڵ لەیس نەكاتەوە!!

خوای گەورە سامان و دەوڵەمەندیەكی زۆری بە ئیمامی لەیس بەخشیبوو، چەندی زانست پێدابوو دوو ئەوەندەی سەروەت و سامان پێدابوو..

محمدی كوڕی رومح دەڵێ: واریداتی ساڵانەی هەشتا هەزار دینار دەبوو، كەچی یەك ساڵ زەكاتی لێ نەدا!! چونكە نەدەمایەوە تا ساڵی بەسەردا تێپەڕێت! هەمووی دەبەخشی..

ساڵی سەد دیناری بەردەوامی بۆ ئیمامی مالیك بڕیبۆوەو لە میسرەوە بەردەوام بۆ مەدینە بۆی دەنارد، ئینجا كردی بە هەزار دینار، هەزار دیناریشی ساڵانە دەنارد بۆ لەیسی كوڕی لەهیعە، هەزاریش بۆ مەنسووری كوڕی عەممار، جاریەیەكیش لەو كاتانەدا لە لای بوو سێ سەد دیناری دا بەویش..

كە ئیمامی مالیك كچەكەی دا بەشوو جوابی بۆ لەیس نارد (عەسفەر)ی بۆ بنێرێت، بۆ رەنگ كردنی پۆشاك، سی باری بۆ ناردبوو، دوو باری بەكار هێناو باقیەكەی تری فرۆشتەوەو كردیە مەسرووفی ئاهەنگی بەشوودانەكە..

ماڵی ئیبنو لەهیعە سووتا هەزار دیناری بۆ نارد.. ژنێك داوای قاپێك هەنگوینی لێكرد، تەنەكەیەكی بۆ پێچایەوە..

سەخاوەتی ئەم زانا بەرزە گەیشتبووە ئەوەی کە زستانان دیوەخانی تێرکردنی خەڵکی هەبوو کە هەموو رۆژێك رۆنی مانگاو هەنگوینی دەدانێ و هاوینانیش بادەمی کوتراوو شەکر..

عبداللەی کوڕی ساڵح دەڵێ: بیست ساڵ لە خزمەتی لەیسدابووم، نە نیوەڕۆ نە شێوان ژەمێکی خواردنی بە بێ خەڵکی نەخوارد.. بۆیە کە کۆچی دوایی کرد هەموو خەڵکی میسر بۆی دەگریان.. خالیدی کوڕی عبدالسلامی سەدەفی دەڵێ: لە خزمەت باوکمدا بەشداری جەنازەکەی لەیسمان کرد، هەرچی کەسێکم دەدی دەگریا، هەر یەکە پرسەی لەوی تر دەکرد، کەس نەیدەزانی ماڵە کۆست کەوتووەکە کامەیە، ووتم: ئەرێ بابە دەڵێی یەك یەکی ئەم خەڵکە خاوەن جەنازەکەن؟ فەرمووی: بەڵێ هەر وایە کوڕم، پیاوی وا نابینرێتەوە..

١٤ـ **مەکحوول** : (٩٧ ـ ١٦١ ك / ٧١٦ ـ ٧٨١ ز) ئیمامی مەکحوولی کابولی ناسراو بە هوزەلی ئەهلی قورئان و خواناسیی، فەرموودەوان، شەرعناس، ئەستێڵکی زانست.. لە کابول لەدایکبووە.. بۆ خزمەتکاری گەێنرایە میسرو بە ئافرەتێك فرۆشرا، لەگەڵ دەرکەوتنی سیمای نەجابەت و بلیمەتی و زیرەکی ژنەکە بۆ زانست وەرگرتن ئازادی کرد.. مەکحوول دەڵێ: کە بۆ وەرگرتنی فەرموودەو شەرع کەوتمە کار وانازانم زانا لە میسردا مابووبێت بە خزمەتی نەگەیشتبووبێتم و هەرچی لابووە لێمەوە وەرنەگرتبێت.. ئینجا چوومە عێراق و زانا بە زانای گەڕام تا زانستی ئەوێشم وەرگرت، پاشان بۆ مەدینە.. لەوێش بە خزمەت هەموو ئەو زانایانە گەیشتم کە پێم وایە فەرموودەیەکیان لایەو من

لەبەرم نەكردووە.. زانای ئەوێشم تەواو كردن، ئینجا چوومە شام و لە بێژنگمدا، هەرچیم كەم بوو لەوێ تەواوم كرد..

پاش ئەم گەشتەی تەمەن لە دیمەشق جێگیربوو، لە هەموو شامدا لەو زاناتری لێ نەبوو.. لە جیهانی ئەو سەردەمەی ئیسلامیشدا مەكحوول بووە یەك لە چوار زانای هەرە گەورەی ئوممەتی موسوڵمان ! لەوێش مایەوە تا ساڵی ١١٢ك كۆچی دوایی كرد رحمەالله..

مەكحوول لە گەشتی زانستیدا چۆتە خزمەت سەیدنا ئیبنوعومەرو سەیدنا ئەنەسی كوڕی مالیك و ریوایەتی سەیدنا سەعدی كوڕی ئەبووەققاس و كۆمەڵێكی لە یاوەرانەوە نەقڵ كردووە وەكو خاتوو عائیشەو ئوم ئەیمەن و سەیدنا ئوبەی كوڕی كەعب و سەوەبان و عوبادەی كوڕی سامیت و ئوم ئەیمەن وئەو بەڕێزانە بێ ئەوەی بە خزمەتیان گەیشتبێت.. لە تابعینیش بۆتە قوتابی ئەبو موسلیمی خەولانی و مەسرووق و سەعیدی كوڕی موسەییب و شەعبی و شورەیحی قازی و ئەو چینەی زانایان..

بوو بەو یەكە زانایەی كە ئیمامی زوهری دەیفەرموو: زانست وا لای چوار كەس: سەعیدی كوڕی موسەییب لە مەدینە، شەعبی لە مەككە، حەسەن لە بەسرەو مەكحوولیش لە شام..

سەعیدی كوڕی عبدالعەزیز دەیفەرموو: مەكحوول لە زوهری زاناترە..

كە وەڵامی پرسیاری دەدایەوە سەرەتا دەیووت: لا حول ولا قوة الا بالله ئینجا دەیفەرموو: وەڵامەكەت بە پێی بۆچوونی فلان زانا ئاوایەو بە پێی بۆچوونی فیسار زانا ئاوایە، تا خاوەن پرسیار خۆی وەڵامی ئەو زانایانە وەرگرێت، رای خۆی نەدەدا مەگەر پێیان بدایا.. لەبەر ئەوەی

کەسێکی قسەخۆشیش بوو بۆ زۆرینەی وەڵامەکان بە فارسی دەیفەرموو: نەمی دانەم..

لەبەر ئەوەی هەموو خاوەن دیدو ڕێچکە جیاوازەکان دەهاتنە کۆڕی مەکحوول و ئەویش رووی لەگەڵ هەمواندا خۆشبوو، لەوانە غەیلانی دیمەشقی، لەمەوە هەندێك زانا دژی هەڵوێستی مەکحوول دەوەستانەوەو بە دەستەی (قەدەریی) یان هەژمارد دەکرد. بۆیە کەسایەتییان لاواز دەکرد.. هەرچەندە دەیانی وەکو سەعیدی کوڕی عبدالعزیز لە ناو خەڵکیدا دەوەستایەوەو بەرگریی لێ دەکردو ئەوەی بە تۆمەتبار کردنی سیاسی دەدایە قەڵەم..

ئیمامی ئەوزاعی دەڵێ: بیستمان کە دوو زانای تابعین قسە لەسەر قەدەر دەکەن: حەسەنی بەسریی و مەکحوول کە بە دوویدا چووینەوە، وا نەبوو، خۆشیان بیستبوویانەوەو بەخۆیاندا چووبوونەوە..

لە تەقواو خواناسیدابوو دەیفەرموو: بەرەو ئیعدامم ببەن پێم خۆشترە وەك لەوەی بمکەنە داوەر، بمکەنە داوەر پێم خۆشترە وەك لەوەی بمکەنە خەزێنەداری بەیتولمال..

هەموو جارێك بە خەڵکی مەجلیسی خۆی دەووت: بە چ روویەکەوە دەچنەوە حوزوری خوای گەورە، هانیدان بۆ ڕێ و جێییەك، هەوڵ بۆدانیتان ئیهمال کرد، هۆشداریی ڕێی شەیتان و دۆزەخی دانێ، کەچی خۆی لێ ناپارێزن و ئەو دەگرنەبەر..

١٥- **سوفیانی سەوری:** (٩٧ - ١٦١ ك / ٧١٦ - ٧٨١ ز) ئیمامی زەهەبی لە وەسفیدا دەڵێ: شێخی ئیسلام، پێشەوای قورئان خوێنان، زانای موجتەهید، سەروەری زانا کاراکانی سەردەمی خۆی، خاوەنی کتێبی

(موسەننیفولجامیع) ئەبوعبدالله سوفیانی کوڕی سەعیدی سەوری تەمیمی موزەڕی کە نەسەبی دەگاتەوە بە سەیدنا ئیسماعیل.. سەوری ناوی هۆزی باپیرانێتی و خۆی کووفییە.. ئەمە ئەو سوفیانەیە کە پێشەوایان شوعبەو سوفیانی کوڕی عویەینەو یەحیای کوڕی مەعین پێیان دەووت ئەمیرولموئمینینی فەرموودەوانی..

ئەم دین و شەرعەی لە شەش سەد زاناو شەرعناسەوە وەرگرتووە کە هەیانە یاوەرە وەکو سەیدنا ئەبوهورەیرەو جەریری کوڕی عبداللەو ئیبنوعەبباس و ئەوانە خوا لێیان ڕازی بێت، هەشیانە پێشەوایانی تابعینن، وەکو: ئیبراهیمی کوڕی عبدالاعلی و ئیبراهیمی کوڕی عوقبەو ئەسوەدی کوڕی قەیس و ئیمام جەعفەری سادق و حەبیبی کوڕی ئەبو سابیت و حەممادی کوڕی ئەبوسولەیمان.

ئەمما ئەوانەی زانستیان لێوە وەرگرتووەو ریوایەتیان لێوە کردووە، ئەوە ئیمامی ئیبنولجەوزی دەڵێ: لە بیست هەزار کەس زیاترن! لەوانە: ئیمامی ئەوزاعی و ئیمامی ئەبوحەنیفەو ئەعمەش و ئیبنوعللییەو عبداللەی کوڕی موبارەك و عەلی کوڕی حەفسی مەدائینی و فوزەیلی کوڕی عیازو ئەوانە..

زرنگ وووریاییەکەی وای لێکرد هەر بە منداڵی بکەوێتە وەرگرتنی زانستی گەورەکان.. کە ئەبو ئیسحاقی سوبەیعی لە کۆڕی زانستدا بەو منداڵییەوە دەیبینی دەیفەرموو: ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْحُكْمَ صَبِيًّا﴾مریم/١٢ ..

سوفیانی سەوری دەربارەی سەردەمی منداڵیی و دەرس خوێندنی دەڵێ: شتێکم لەبەر نەکردوە ئەم دڵ و هۆشەم بۆمیان نەپاراستبێت!

ئەمما خواناسیی وپیاوچاکیەکەی، کە پلەوپایەیەو فەزڵی خوایە دەیبەخشێتە خاوەن هیممەتەکان.. بڕوانن دەربارەی چۆن دەڵێ: هەر

فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم پێ گەیشتبێت لەخۆمدا تەتبیق کردووە با جارێکیش بووبێت..

ئیبنووەهەب دەڵێ: جارێك دوای نوێژی مەغریب سوفیانی سەوریم بینی چووە سوجدە، هەر هەڵنەستایەوە تا بانگی عیشایدا!!

بیشری حافی دەیفەرموو: سوفیانی سەوری لە زەمانی خۆیدا وەکو ئەبوبەکرو عومەر بوو لە زەمانی خۆیاندا..

عبداللەی کوڕی موبارەك دەیفەرموو: زانستیم لە هەزارو سەد مامۆستاوە وەرگرتووە، کەسیانم پێ مەزنتر نەبووە لە سوفیانی سەوری، کەس وەکو ئەو شارەزای حەڵاڵ و حەرام نەبوو..

١٦- **سوفیانی کوڕی عویەینە :** (١٠٧ - ١٩٦ ك / ٧٢٧ - ٨١٦ ز) زاهیدو خواناس ، فەرموودەوانی شەرعناس پێشەوای گەورە کە فەرموودەوانان لەسەر راستی ریوایەتەکانی رێکن و زانایانی تابعین شایەتی زانست و راستگۆیی بۆ دەدەن: سوفیانی کوڕی عویەینەی کوڕی ئەبوعیمرانی هیلالی لە ١٠٧ ك لە کووفە لەدایکبوو.. قوتابی نەجیبی ئیمامی زوهری و ئەبوئیسحاقی سوبەیعی و عەمری کوڕی دینارو ئەبوززینادو عاسیمی کوڕی ئەبونەجوودی قورئان خوێن و ئەعمەش و عبدالملیکی کوڕی عومەیرو محمدی کوڕی مونکەدیرو ئەییوبی سەختیانی و مەنسووری کوڕی موعتەمیرو حەمیدی تەویل و یونسی کوڕی عوبێدو شوعبەو دەیانی تر.. مامۆستای ئیمامی شافیعی و ئیمامی ئەحمەدو ئیسحاق و محمدی کوڕی ئیسحاق و ئیبنوجورەیج و زوبەیری کوڕی بەککارو یەحیای کوڕی ئەکتەم و سەدانی دیکە..

لە چواردە ساڵیەوە بە خزمەت سەدان زانا گەیشت، تا خۆی بووە ئەو ئاگرەی لەسەر لوتکەی چیا کراوەتەوە.. ئیمامی زەهەبی دەرهەقی دەڵێ: ئەمە ئەو زانایەیە کە باپیرو کورو کوڕەزا دەرسیان لا خوێندووە! کە خەڵکانێکی زۆر خۆیان بۆ حەج ئامادە دەکرد بەو هیوایەی لەوێ بچنە خزمەت سوفیانی کوڕی عویەینە.. نموونەی زاناو پێشەوای زاهیدان بوو..

خۆی و پێنج برای تری بوونە فەرموودەوان ..

عبداللەی کوڕی وەهەب دەیفەرموو: کەسم نەدیووە لە تەفسیردا بەقەدەر سوفیان شارەزابێت.. ئیمامی ئەحمەدیش دەیفەرموو: کەسم نەدی بە قەدەر سوفیان لە سونەتدا شارەزابێت.. وەکیعیش دەڵێ: شەرعناسییمان هەر لە سوفیانەوە وەرگرت..

ئیمامی شافیعی دەیفەرموو: ئەگەر مالیك و سوفیان نەبوونایە زانستی شەرعی لە مەدینە نەدەپارێزرا.. هەروەها دەیفەرموو: ئوسوڵی زانست سەدو پەنجاوقسوور فەرموودەیە تەنها شەشیان لای سوفیان نەبوو..

حەممادی کوڕی زەید دەڵێ: سوفیانم لە ئاڵقەی دەرسی عەمری کوڕی دیناردا دەبینی مێردمنداڵێك بوو هێشتا پرچییان بۆ نەتاشیبوو!

چووە کۆڕی دەرسی ئیمامی زوهری و پرسیاری کرد، دەریان کردە دەرەوە، لە بەر دەرگای مزگەوتەکەوە گوێی لە دەرسەکە گرت، کە ئیمامی زوهری بینی فەرمووی بیهێننەوە ژوورەوە..

لە کۆڕی عبدالکەریمی جەزەریدا دادەنیشت و دەیپرسی، ئەویش بە گەورەکانی دەوت: بڕواننە ئەو منداڵە چەند پرسیاری هەیەو شەرم ناکات دەپرسێت.. ئەدی ئێوە بۆچی ناپرسن؟

ئەحمەدی کوڕی عبداللەی عیجلی دەڵێ: سوفیانی کوڕی عویەینە لە دوو ساڵیەوە قورئانی خوێندو لە حەوت ساڵیەوە فەرموودەی لەبەر کرد! لەگەڵ یەکەمین دەرس ووتنەوەیدا حەوت هەزار فەرموودەی لەبەربوو..

- لەگەڵ ئەم پلەو ناوداییەیدا نموونەی زاهدێتی بوو.. حەرمەلەی کوڕی یەحیا دەڵێ: رۆژێك سوفیانی کوڕی عویەینە دەستی گرتم و لە قۆڵی جببەکەیدا نانێکی جۆی دەرهێناو فەرمووی: گوێ بە قسەی خەڵك مەدە.. بە خوا ئەوە شەست دانە ساڵە خۆراکی من نانی جۆیە..

لە پەندو ئامۆژگاریەکانی:

- ( هەر کەس ئەقڵی زیادی کرد رزقی کەم دەکات).
- هەر کەس گوناحباریەکەی بە هۆی حەزو ئارەزوویەوە بووبێت ئومێدی لێخۆشبوونی هەیە، ئەمما ئەو کەسەی گوناحەکانی بە هۆی لووت بەرزیەوەیە بێت، مەترسی ئەوەی لێ دەکرێت دوورخرێتەوە لە رەحمەتی خوا، چونکە گوناحی سەیدنا ئادەم کە بە هۆی حەزی خواردنیەوە بوو، خوا لێی خۆشبوو، ئەمما گوناحی ئیبلیس کە بە هۆی تەکەببوریەوە بوو کەوتە بەر سزای لەعنەتی خوا).
- ( دەزانن نموونەی زانست وەکو چییە؟ وەکو دار الاسلام وایە، کە دەنەمەزراو دەسەلاتی بەرفراوان نەکرا هێزی کوفر دێتە سەری و دەیکاتە دارالکوفر.. ئەگەر زانستیش بلاونەکرایەوەو نەخرایە بواری کردەوەوە ئەوە نەفامی بە ناو خەڵکیدا بلاو دەبێتەوە)..

١٧. <u>**حەممادی کوڕی ئەبو سولەیمان:** ( ـ ١٢٠ ك / ٧٣٧ ز)</u> حەممادی کوڕی ئەبو سولەیمانی کوڕی موسلیم.. ئەسڵی ئەسبەهانیەو قوتابی سەیدنا

ئەنەسی کوڕی مالیکەو لە تابعینیش قوتابی سەعیدی کوڕی موسەییب و شەعبی و زەیدی کوڕی وەهەب و ئەو چینە بوو.. مامۆستای سوفیانی سەوری و شوعبەی کوڕی حەججاج و حەممادی کوڕی سەلەمەو ئیسماعیلی کوڕی و دەیانی تر بوو.. ئیبراهیمی نەخەعیی رێکوپێکترین قوتابی ئەو بوو.. پاشان ئیمامی ئەبوحەنیفە، کە ١٨ ساڵی دواییی تەمەنی لە خزمەتیدابوو تا کۆچی دوایی کرد.. لە خۆشەویستی ئەمدا ئیمامی ئەبو حەنیفە کوڕێکی خۆی ناونایەوە حەمماد..

حەمماد لە شەرعناسییدا زانایەکی دەگمەن بوو، ئەبو ئیسحاقی شەیبانی دەیفەرموو حەمماد لە شەعبی زاناترە! خواناسێکی خاوەن تەقواو وەرع بوو، دەوڵەمەندێکی زۆر سەخی بوو، لە رەمەزاناندا تێرکردنی پێنجسەد کەسی لە ئەستۆ دەگرت و لە پێش جەژنیشدا یەکی سەد درهەمی دەدانێ.. بە ویقارو سام و هەیبەت بوو.. پەرکەمی لەگەڵ بوو، هەر کە هۆشی دەهاتەوە یەکسەر دەستنوێژی دەگرتەوە.. جارێك گلەیی و گازاندەی لێ نەبیستراوە..

یەکێکە لە سەرانی مورجیئە.. لە ساڵی (١٢٠ ك) دا کۆچی دوایی کرد.. رەحمەتی خوا لێ بێت

١٨- <u>**ئیبنوشیهابی زوهری:**</u> ( - ١٢٤ ك / - ٧٤٤ ز) ئیمامی گەورەی فەرموودەوانان ئەبوبەکر محمدی کوڕی موسلیمی کوڕی عبداللەی کوڕی شیهابی زوهری کە سوحاحی ستتەی ئەهلی سوونەت پڕە لە ریوایەتەکانی ئەو، هەر لەسەرەتای لاویەوە دوو هەزارو دووسەد فەرموودەی لەبەربوو نیوەیان بە سەنەدی نەپساو دەگەیشتەوە بە

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم .. فەرمووده‌و زانستی لە یاوەرانەوە وەرگرتووە لە کەسانی بەرێزی وەکو سەیدنا ئەنەسی کوڕی مالیك و سەیدنا سەهلی کوڕی سەعدو لە تابعینیش لە حەوت شەرعناسەکەی مەدینەو لە ئیبنو عومەر.. مامۆستای عەتاء و عومەری کوڕی عبدالعەزیزو قەتادەو ئەییوبی سەختیانی و مەنسووری موعتەمیرو سالحی کوڕی کەیسانە کە هەر یەکەیان لە خۆی گەورەتر بوون بە پلەو تەمەنیش .. ئەمە جگە لە دەیان قوتابی تری وەك سوفیانی کوڕی عویەینەو موسای کوڕی عەقەبەو مەعمەرو لەیس و ئیمامی مالیك و ئیبنوئەبی زیئب و محمدی کوڕی ئیسحاق..

ئیمامی ئەحمەد دەیفەرموو: بەهێزترین سەنەد ئەو زنجیرەیە کە لە زوهریەوە دەچێتەوە سەر سالم و لەویشەوە بۆ ئیبنوعومەر..

ساڵی ( ١٢٤ ك/ ٧٤٤ ز) لە کۆتا سنووری فەلەستین و حیجاز نێژرا..

١٩ـ **ئیمامی ئەبو حەنیفە :** (٨٠ ـ ١٥٠ ك/ ٦٩٩ ـ ٧٧٠ ز) ئەبوحەنیفە نوعمانی کوڕی سابیتی کوڕی نوعمان.. باوکی کە بازرگان بوو لە کابوولەوە هاتە کووفەو نیشتەجێ بوو، لە ساڵی (٨٠ ك)دا خوای گەورە نوعمانی پێ بەخشی، لە سەرەتای منداڵییەوە شاگردێتی باوکی دەکرد.. کە ئیمامی شەعبی چاوی پێی کەوت بە باوکی ووت: ئەم کوڕە زۆر زیت و زرنگە حەیفە کردووتە بە شاگرد، بیخەرە بەر خوێندن.. باوکیشی بە ئامۆژگاریەکەی کردو ناردیە خوێندن.. سەرەتا هەر رووی لە زمانەوانی و ئەدەب کرد، دوایی رووی کردە علم الکەلام و مونازەرەو زۆر تێیدا سەرکەوتوو بوو.. لە هەموو کۆڕێك دەبینرا تیانووس و پێنووسی ئامادە کردووە بۆ موناقەشەی گرووپەکان لە باسەکانی

عەقیدەدا.. تا جارێك لە دەرسی شەرعناسیی حەممادی کوڕی ئەبوسولەیماندا دانیشت، ئیتر وازی لە هەموو زانستیەك هێناو لەگەڵ بازرگانێتیەکەیدا کە زۆر سەرڕاست ناسرابوو، بە دەرسی حەممادەوە ئەوەندە پابەندبوو، دەرسێکی نەفەوتاند.. ئەوەندەش حەممادی خۆشوویست کە کوڕێکی خۆی ناونایەوە حەمماد..

لە چل ساڵیدا کە حەمماد کۆچی دوایی کرد ئیمامی ئەبو حەنیفە لە شوێنی ئەو بووە موفتی کوفە.. شێوازێکی نوێی لە دەرس ووتنەوەدا داهێنا، ئەویش ئەوە بوو کە کێشەیەکی دەخستە بەر دەست هەموو قوتابیەکانی و دەیفەرموو بگەڕێن بزانن حوکمی شەرعی ئەو کێشەیە چییە؟ ئیتر کە هەموویان لە هەموو لایەکەوە کێشەکەیان هەڵدەسەنگاندو وەڵامیان دەدایەوە رای خۆی پێدەوتن و بەم جۆرە رای خۆی و هەموویانی دەکرد بە یەك، ئەمەش هۆکاری ئەوە بوو کە قوتابیەکانی لە بۆچوونی ئەو لایان نەدەدا..

ئیمامی ئەبو حەنیفە چونکە دەوڵەمەند بوو بەردەوام بەسەر قوتابیەکانیشیدا دەگەڕاو نەیدەهێشت هیچ یەکێکیان موحتاجی کەس بن!! ئیمامی ئەبو یوسف(١٧٣ك/٧٩٧ز) دەڵێ: بۆ ماوەی بیست ساڵ دەرسی پێ دام و خۆم و ماڵ و منداڵییشی بەخێو کردم!! کە پێم ووت: جەنابت زۆر سەخیت و دڵت باشە.. فەرمووی: تۆ حەممادت نەدی، هەرچی سیفەتی چاکە هەیە تێیدابووا! مەبەستی حەممادی مامۆستای خۆی بوو..

ئیمامی ئەبو حەنیفە خاوەن دیدی خۆیەتی لە زانستی ئوسوڵ و وەرگرتن لە قورئان و فەرموودەوە، هەر لەو دوو سەرچاوەیەوە وەردەگرێت بەڵام مەرجی بۆ وەرگرتنی فەرموودە قورسترە بۆیە

ئیعتیمادی کەمی لەسەر فەرمووده کردووه. بۆ له قورئان وەرگرتنیش زۆر قووڵ بۆی رۆ دەچێت و زیاتر ئیعتیماد دەکاته سەر تێگەیشتن و وەرگرتن له قورئان.. وەکو جمهووری شەرعناسانی تر قەولی یاوەران وەردەگرێت بەڵام زۆر لێی دەکۆڵێتەوەو لەوانەشە وەری نەگرێت، که هاتیشه سەر تابعین دەڵێ: ئێمەش وەکو ئەوانین..

ئیمامی ئەبو حەنیفه کتێبێکی تایبەتی لەسەر شەرعناسیی نەنووسیووە، بەڵام فەتواکانی کۆکراونەتەوە، ئەمه جگه لەوەی که ئیمامی ئەبو حەنیفه شتێکی تری داهێنا، ئەویش (تەقدیر کردن و وەڵام بۆ ئامادەکردن)ە.. ئیمام نزیکەی شەست هەزار پرسیاری دروست کردووەو وەڵامی شەرعیی بۆ ئامادە کردوون.. واته: ئەگەر وا قەوما، ئەمه وەڵامەکەیەتی.. ئەگەر وانەبوو، ئەمه وەڵامەکەیەتی..

محمدی کوڕی حەسەنی شەیبانی (١٨٩ ك/٨٠٥ ز)که قوتابی ئیمامی ئەبو حەنیفەیه، زۆرینەی بۆچوونەکانی ئیمامی کردووه به چەندین کتێب و راڤەی کردوونەوە.. دواتر ئەبولفەزڵی مرووزی (٣٤٤ ك/٩٥٥ ز)که به حاکمی شەهید بەناوبانگه پوختەی مەزهەبەکەی له کتێبێکدا به ناوی (الكافي) نوسیوەتەوەو شمس الائمەی سەرەخسی (٤٨٣ ك/ ١٠٩٠ ز) به (٣٠ سی) بەرگ راڤەی کردۆتەوە.. ئێستا ئەو سی بەرگه چاپ کراوەو گەورەترین مەرجەعی شەرعناسیی حەنەفییە..

ئیمامی ئەبو حەنیفه شارێیەکی بۆ شەرعناسیی (فقه) شکاند، که هەتا دنیا دنیایه زانایان لەسەری دەڕۆن، لەبەر ئەوەیه که ئیمامی شافیعی دەیفەرموو: هەموو شەرعناسان له شەرعناسییدا قەرزاری ئیمامی ئەبو حەنیفەن..

لەبەر ئەوەی عەبباسیەکان و عوسمانیەکان و مەغۆل و ئیگۆرو ماوراء النهر هەموویان بە مەزهەبی حەنەفی حوکمڕانیان کرد، ئەم مەزهەبە ئێستا لە ناو موسوڵماناندا لانی کەم نزیکەی هەشت سەد ملیۆن شوێن کەوتووی هەیە..

ئیمامی ئەبو حەنیفە زۆر خاوەن تەقوابوو، وەرع و دوور لە حەرام، قورئان خوێن و خاوەن شەونوێژ.. لەو شوێنەی کە ئێستا لێی دفن کراوە لە بەغدا لە گەڕەکی ئەعزەمییە کە هەر بە ناوی خۆیەوە ناونراوە پێنج هەزار جار خەتمی قورئانی لێکردووە[1]!!

٢٠. **ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەی:** (١٦١- ٢٣٨ ك / ٧٧٨ - ٨٥٣ ز) ئەبو یەعقووب ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی موخلەدی حەنزەلی مرووزی.. شێخی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای جیهانی ئیسلام، گەورەی حافزان و پێشەوای زانایانی قورئانەوانی و فەرمووودەو شەرعناسیی و سەرقافڵەی ڕاستگۆیان و خواناسان ..

بۆیە پێی دەوترێت ڕاهەوەی چونکە لە نێوان ڕێی مەککەو مەراوزەدا لەدایکبوو..ڕاه بە فارسی ڕێگایەو وەی: ئازارو ناسۆرە.. واتە ناسۆری ڕێ..

لە نەیسابورەوە بۆ گەشتی زانستی وەرگرتن کەوتە ڕێ بۆ عێراق و حیجازو یەمەن و شام و دوایی‌ش گەڕایەوە خۆراسان .. ئەمە مامۆستای مامۆستاکانە.. مامۆستای سوفیانی کوڕی عویەینەو ئیبنومەهدیە..

---

[1] نازناوی ئیمامی ئەبو حەنیفە ئیمامی ئەعزەمە، بۆیە بەو گەڕەکەش ووتراوە ئەعزەمییە.. ئیمامی ئەبو حەنیفە یەکێکە لە ڕەنگ ڕێژەکانی شاری بەغدا، ئەو ڕاوێژی بە ئەبوجەعفەری مەنسوور کرد کە لەو شوێنەدا ئەو شارە دروست بکات!

ئیمامی ئەحمەد دەربارەی دەیفەرموو: پێشەوایەکە لە پێشەوای موسوڵمانان.. نەعیمی کوڕی حەمماد دەیفەرموو: هەر خۆراسانیەکت بینی قسە بە ئیسحاق دەڵێ دینداریەکەی بە چەواشەکاریی بزانە.. داریمی دەیفەرموو: ئیسحاق بە راستگۆیی خۆی پێشڕەوی رۆژهەڵات و رۆژئاوای جیهانی موسوڵمانانی گرتە دەست..

ئیمامی ئیسحاق چەندین کتێبی گەورەی نووسیون ، لەوانە تەفسیرو المسند (چاپ کراوە).. سەیر ئەوەیە ئەوەندە لەبەر کردنی بەهێز بووە کە هەر کاتێك زانستیەکی شەرعی باس کردبێت، لە زاکیرەی خۆیەوە یەکسەر بە بێ کتێب هێناویێتیەوە، چونکە دەیفەرموو: حەفتا هەزار فەرموودەم هەر لە کتێبەکانی خۆمەوە لەبەر کردووە..

جارێکیان لە یەك دەرسدا یازدەهەزار فەرموودەی بە قوتابیەکانی ووت، پاشان بۆی دووبارە کردنەوە بێ ئەوەی پیتێکی بپەڕێنێت یان ووشەیەکی لێ تێك بچێت!!

ئیمامی ئیسحاق لە سەرەتایدا لەسەر مەزهەبی ئیمامی ئەبو حەنیفە بوو بەڵام ئەبوبەکری مروەزی لە کتێبی( الورع)ەکەی خۆیدا لە قاسمی کوڕی محمدەوە دەگێڕێتەوە کە ئیمامی ئیسحاق لە رێی حەج کردنیدا لای دایە بەسرەو عبدالرحمانی کوڕی مەهدی بینی، لە عبدالرحمانی پرسی: جەنابت بۆچی وا رقت لە ئیمامی ئەبو حەنیفەیە؟ هەر لەبەر ئەوەی ئەهلی رەئیە؟ خۆ ئیمامی مالیك و ئەوزاعی و سوفیانیش رەئیان بووە.. فەرمووی: چۆن ناوو ئاستی ئەبو حەنیفە لەگەڵ ئەو زانایانەدا ریز دەکەیت.. ئەبو حەنیفە دەڵێی حوشتری پەڕیدەیەو بە تەنها کەوتۆتە دۆڵێکی ووشکەوە.. دەڵێ: دواتر زانیم خەڵکێکی زۆر هەن کە رایان وەکو ئێمە نیە بەرامبەر بە ئەبو

حەنیفە[١].. ئەم رووداوە وای كرد ئیمامی ئیسحاق پێداچوونەوەی هەڵوێستی خۆی لە ئیمامی ئەبو حەنیفەو مەدرەسەی رەئی بكاتەوەو بەرەو دیدو بۆچوونی جمهووری فەرمووودەوانان و شەرعناسانی تر بێت.. لەو رووداوەشەوە بوو بە یەكێك لە قوتابیەكانی عبدالرحمانی كوڕی مەهدی.. سوفیانی كوڕی عویەینەو فوزەیلی كوڕی عیازو وەكیعی كوڕی جەڕاح لە مامۆستاكانی تری ئیسحاقن..

بۆتەوە بە مامۆستای محمدی كوڕی و ئیمامی بوخاری و ئیمامی موسلیم و ترمزی و ئەبوداوودو نەسائی و داریمی و محمدی كوڕی نەسری مرووزی .. لەبەر ئەمەیە كە پێی ووتراوە مامۆستای پێشەواكان.. یەحیای كوڕی موعین مامۆستای ئیمامی ئەحمەدەو ئیمامی ئەحمەدیش هاوشانی ئیسحاقە كەچی ئیسحاق بۆتەوە بە مامۆستای هەردووكیان!! بۆیە ئیمامی ئەحمەد دەربارەی دەیفەرموو: ئیسحاق لای ئێمە پێشەوایە هەر وەكو كە شافیعی لای ئێمە پێشەوایە[٢]..

ئیمامی ئیبنوحەجەری دەربارەی دەڵێ: (اسحاق ثقة حافظ مجتهد)[٣]..

لە تەمەنی حەفتاو حەوتساڵیدا لە نەیسابوور كۆچی دوایی كرد رحمه الله..

★ ★ ★

---

[١] أبوبكر المروذي : كتاب الورع / تحقيق سمير الزهيري ل ١٢٢ .

[٢] ابوبكر البغدادي: تاريخ مدينة السلام / ت: بشار عواد معروف: بـ٧ ل٣٦٨ و٣٧٠.

[٣] ابن حجر العسقلاني : تقريب التهذيب ب ١ ل١٢٦.

## توێژەرەوانی شەرعناسان ( محققوا الفقهاء )

ئەمەش پۆلێکی تری پێشڕەوانی ئوممەتن، ئەمانە بلێسە بەدەستانی ئەهلی سوونەت و جەماعەتن، ئا ئەمانەن کە هەم لە سەنەدی فەرموودە کۆڵیونەتەوەو هەم ئەحکامیان لە واتاکانیان وەرگرتووە.. زۆر لەمان لە فەرموودەوانان گەورەترن، چونکە فەرموودەوان جاری وا هەیە فەرموودە نەقل دەکات بەڵام شەرعناس نیە.. ئەمە جگە لەوەی دەیانی وەکو ئیمامی بەیهیقی کە لەم پێشەوا عەزیزانەیە لە هەموو روویەکی فەرموودەوانی و شەرعناسییەوە پێشەوا بووە.. ئەم بەڕێزانە هەیانە فەرموودەوان بووەو بۆتە شەرعناس، هەشیانە شەرعناسەو لە زۆر توێژینەوەی بەڵگەکاندا بووە بە فەرموودەوانیش ..

**ئیمامی تەبەری:** (٢٢٤ ـ ٣١٠ ك / ٨٣٨ ـ ٩٢٣ ز) لێکدەرەوەی قورئان، مێژوونوسی ئوممەتی ئیسلام، پێشەوای سەربەخۆی شەرعناسیی، پێشەنگی کاروانی زۆرنووسانی زانایان، ئەبوجەعفەر محمدی کوڕی جەریری کوڕی یەزید، ناسراو بە ئیمامی تەبەری، لەدایکبووی شارۆچکەی ئامولی سەر بە مازندەرانی ئێران، کە سەر بە پارێزگای قەزوینی ئێرانی ئەمڕۆیە.. لە حەوتساڵیدا قورئانی لەبەر کردو لە هەشت ساڵیدا فەرموودە، لە نۆ ساڵیدا قیرائاتی خوێندو ئیمامەتی نوێژی بۆ خەڵکی کرد!! لە شازدە ساڵیەوە بۆ وەرگرتنی زانستی شەرع کەوتە وولاتان.. چووە بەیرووت و دیمەشق و مەدینەو لە میسریش بووە قوتابی رەبیعی کوڕی سولەیمان کە قوتابی هەر نزیکی ئیمامی شافیعی بوو، پاشان چووە رەی و

خۆراسان و زانستی شەرعی لەوێش کۆکردەوە.. ئیتر بووە یەکێك لە هەڵکەوتووانی مەزهەبی شافیعی، پاشان ئەمیش وەکو ئەوزاعی و لەیسی کوڕی سەعدو عبداللەی کوڕی موبارەك بووە سەرمەزهەبێکی سەربەخۆ.. بەڵام لەبەر نەبوونی قوتابی زۆرو بە رەسمی نەبوونی مەزهەبەکەی، مەزهەبی تەبەری هەر لە ناو زانایان و شەرعناساندا بەناوبانگ و کاریگەر مایەوە..

کتێبی زۆری نوسیووە، لەوانە:

- تەفسیرەکەی (جامع البیان) کە بە (٣ سێ) ساڵ نوسیوێتی و بە یەکەمین تەفسیری ئەهلی سوننەت دادەنرێت.

- (تاریخ الامم والملوك) کە پێی دەوترێت تاریخی تەبەری.

- (تاریخ الرجال) کە لەسەر مێژووی ژیانی یەك یەکی یاوەران و تابعینە.

- (کتاب القراءات و التنزیل).

- (اختلاف علماء الامصار) کە لە هۆی راجوێیی شەرعناسان دەکۆڵێتەوەو بۆچوونەکانیان دەردەخات و پاشان تەرجیح بە بۆچوونی یەکێکیان دەدات، ئەم کتێبەی لەسەر بەراووردی مەزهەبەکانە.. ئەم جۆرە کتێبانە بە هەموو زانایەك نانوسرێت، چونکە شارەزاییەکی زۆری مەزهەبەکان دەخوازێت..

- (تهذیب الآثار) کە فەرموودەیەو لەسەر شێوازی فەرموودەوانان توێژینەوەی سەنەدی هەموو فەرموودەیەك دەکات و ئەو ئەحکامە شەرعیانە روون دەکاتەوە کە فەرموودەکە ئاماژەی پێ دەکات، بەڵام بە داخەوە پێش تەواو کردنی کۆچی دوایی کرد..

- (صریح السنة) کە بۆچوونە شەرعیەکانی خۆی تێدا تۆمار کردووە.

ـ (كتاب آداب النفس الجيدة والأخلاق النفيسة) كە لەسەر پەروەردەی دەروونە، چونكە تەبەریش وەكو ئیبنومسكەوەی وغەزالی وئیبنولقەییمو شێخی گەیلانی خاوەنی تیۆری خۆی بووە لە تەزكیەی نەفسدا..

ـ هەروەها كتێبی (آداب القضاة) و (آداب النفوس) و (فضائل أبي بكر و عمر رضي الله عنهما) دەیانی تر..

ئیبنوخەللیكان دەڵێ: تەبەری زانای موجتەهیدی سەردەم و جێمتمانەی دینداریی و خاوەن زاكیرەی لەبەر كردن و ئیمامێكی شەرعناسیی و پسپۆڕێكی زانینی راجوێیی و راكۆێیی شەرعناسان بوو..

خەتیبی بەغدادی دەڵێ: قسەی تەبەری ناوكۆیی نێوان شەرعناسانی پێ دەكرا، كەس لە زەمانی ئەودا ئەو هەموو زانستەی لا كۆنەبووبۆوە..

لە كۆتایی ژیانیدا كەوتە بەر حەملەی بیرتەسكە حەنبەلیەكانی بەغداو بە تۆمەتی شیعەگەرێتی گۆشەگیریان كرد تا كۆچی دوایی كرد..

ئیمامی زەهەبی دەڵێ: خوا عافوویان كات ناوی ئەم و ناوی ئەبو جەعفەر محمدی كوڕی جەریرێكی تریان لێ تێكەڵ بوو كە ئەویان شیعەیەو باپیری ناوی رۆستەمە..

ـ **دارەقوتنی** : (٣٠٦ ـ ٣٨٥ ك) ئەبول حەسەن عەلی كوڕی عومەری كوڕی ئەحمەدی دارەقوتنی، خەڵكی گەڕەكی دارەقوتنی (لۆكەخانە)ی بەغدایە، یوسف القەوواس دەگێڕێتەوە: پێش دە ساڵی نانێكی چەوریان لە ماڵەوە بۆ دەكرد بە بابۆڵەو دەچووە كۆڕی زانایان، بەڵام نەیاندەهێشت بچێتە ژوورەوە بۆیە لەبەر دەرگا دادەنیشت، دەگریاو بابۆڵەكەی دەخواردو گوێی لە زانستیەكەش وەردەگرت و لەبەری دەكرد!! خۆم چەند جار دارەقوتنیم لە كۆڕی ئیبنو مەنیع

دەرکردووە[١] !! ئیبنو کەسیر دەربارەی دەڵێ: ئەوەندە بە دوای زانستدا وێڵ بوو، تا لە فەرموودەوانی و پیاوناسیدا، لە جەرح و تەعدیلدا، لە گێڕانەوەو نوسین و کتێب داناندا، ئینجا لە شەرعناسی و قیرائاتدا، پاشان لە سەلامەتی باوەڕو سەرڕاستی مەزهەب و دادپەروەریی و راستگۆیی و دەستپاکییدا بووە پێشەوای زەمانی خۆی[٢].. دەرسی لە دووسەد زاناوە وەرگرتووە.. دکتۆر عبدالله الروحەیلی کە دکتۆرای لە ئیمامی دارەقوتنیدا وەرگرتووە لە دکتۆرانامەکەیدا (الامام الدارقطني وکتابه السنن /ل١٨٠) نوسیوێتی : کۆی کتێبەکانی دارەقوتنی کە زانیاری من گەیشتێ (٥٣) پەنجاو سێ کتێبە .. کتێبەکەی ئەمیش ناوی (السنن) ەو شێوەی ریزبەندی فەرموودەکانی وەکو شەرعناسان کردووە، چونکە خۆشی شەرعناسێکی شافیعی مەزهەب بووە، شارەزای بەراوردی مەزهەبەکانیش بووە.. لە لایەن شوعەیبی ئەرنائووتیەوە تەحقیق کراوەو لە مؤسسة الرسالەی بەیرووت بە چوار بەرگ چاپ کراوە..

**ئیمامی نەوەوی:** (٦٣١ ـ ٦٧٦ ك / ١٢٣٣ ـ ١٢٧٨ ز) ئەبوزەکەریا یەحیای کوڕی شەرەفوددینی حوزامی ساڵی ٦٣١ك سونبوولی خواناسیی و زانست و فەرمان بەچاکە.. راڤەوانی فەرموودەو توێژەرەوەی ناوکۆییە شەرعناسیەکان.. خاوەنی شەرحی سەحیحی موسلیم (١٨ بەرگە)، خاوەنی کتێبی المجموع (٢٠ بەرگە)، خاوەنی کتێبی (ریاض

---

[١] تاريخ دمشق ( ١٢/٢ ) .
[٢] البداية و النهاية ( ٣١٧/١١ ).

الصالحين) کە ماڵی موسوڵمانی خوێندەوار  نیە لە جیهاندا دانەیەکی تێدا نەبێت!!

ئەم کەڵەزانایەی پێی دەوترا (محی الدين) واتە زیندووکەرەوەی دین.. خۆی لەم نازناوە زۆر بێزار بوو، دەیفەرموو: هەر کەسێك وام پێ بڵێت گەردنی ئازاد ناکەم ..

لە گوندی نەوای سەر بە دیمەشق لەدایکبوو.. لە سەردەمانی کەڵەپیاوانی وەکو ئیبنوتەیمیەو ئیبنوسەلاح وعززەدینی کوڕی عبدالسلام دەیانی تردا ژیاوە..

لـە سـاڵ ٦٤٩ ك دا بـاوکی هێنـای بـۆ دیمەشـق لـە مـاوەی چـوار مانگـدا کتێبی (التنبيه) لەبەر کرد، لە ماوەی چـواری تـردا چـواریەکی (العبـادات) ی کتێبی (المهذب) لەبەر کرد .

لە ساڵی ٦٥١ دا (لە تەمەنی بیست ساڵیدا) لە خزمەت باوکیدا چوو بۆ حەج، نزیکەی مانگ و نیوێك لە مەدینە مانەوە  لە زۆربەی کاتی سەفەرەکەدا هەر نەخۆش بوو، تا دای گرتبوو، باوکی دەڵێ: لەو مازە درێژەی نەخۆشی و سەفەرەکەیدا جارێك ئاخ و ئۆفێکی نەکردا!!

رۆژانە دوانـزە دەرسـی خوێنـدووە، هـەر شـەش کتێبـە سـەحیحەکان و (موطـأ)ی ئیمـامی مالیـك و (شـرح السـنة)ی ئیمـامی بەغـەوی و (سـنن الدارقطني) و چەندەها کتێبی تری فەرموودەی ، وەکو مەسـنەدی ئیمـامی شافیعی و مەسنەدی ئیمامی ئەحمـەدو مەسـنەدی دارمـی و ئـەبو یـەعلاو سەحیحی ئەبو عەوانە خوێندووە.. کتێبی (الکمال في أسماء الرجال) ی لای شێخ خالیدی کوڕی یوسفی نابولسی خوێندووەو لە پاشان شەرحی لەسـەر نووسـیووە ! جگـە لـەوەی زانیاریـەکانی فـەرموودە (علـوم الحـديث)ی لای

هەندێك لە هاوەڵەکانی ابن الصلاح خوێندووەو دوایی خۆی کتێبی (التقریب)ی لەسەر ئەو بابەتانە نووسیووە.

ئیبنوعطاری قوتابی ئیمام دەگێڕێتەوە : ئیمامی نەوەوی رەحمەتی بۆی دەگێڕامەوە دەیگووت : لە شەوورۆژدا کاتم بە فیڕۆ نەداوە، گەر بە رێگاشدا بڕۆیشتمایا یا قورئانم دەخوێند یا دەوری دەرسی ترم دەکردەوە.. ئاخر بۆیە لە ماوەی شەش ساڵدا هەموو خوێندنی تەواو کردووە!! قورئانی زۆر خوێندووە، یادی خوای زۆر کردووە، لە هەرەتی لاویدا پشتی لە دنیاو رووی لە قیامەت بووە ..

لە شەوو رۆژێکدا یەکجار نانی دەخوارد، ئەویش پارشێوان، یەك جاریش ئاوی دەخواردەوە ئەویش هەر پێش نوێژی بەیانیان!!

ئیمامی نەوەوی نوسراوی زۆری هەیە، هەیە کورتن ، هەشیانە دوورو درێژن، لە کورتەکان وەکو: بستان العارفین ، الاربعین ، الاذکار ، التقریب ، منهاج الطالبین ، الارشاد في علوم الحدیث، المبهمات، تحریر الالفاظ للتنبیه، التبیان في آداب حملة القران.. دوورو درێژیش وەکو: شرح صحیح مسلم کە ١٨ بەرگە، المجموع في شرح المهذب کە بیست بەرگە ، لە نێوان ئەو دوو جۆرە کتێبانەشدا هی تری وەکو ریاض الصالحین (سێ هەزار حەدیس زیاترە) الایضاح ، التنقیح ، العمدة في تصحیح التنبیه ، الایضاح في المناسك ، الفتاوی ، الروضة (چوار بەرگە) شرح قطعة البخاري ، مسودة في طبقات الفقهاء هەن .. ئەمانەش دیسان جگە لە هی تر کە یان تەواوی نەکردوون وەکو الاسماء ، اللغات ، التحقیق (تا باب المسافر)، بەشێك لە الوسیط.

ئیمام توخنی ئەو شتانە نەکەوتۆتەوە کە زانیویێتی حەرامن، بەو رادەیەش توخنی ئەو شتانەش نەکەوتۆتەوە کە گومانیان لەسەر بوو بێت.. شتی لە هیچ کەسێك وەرنەدەگرت تا لە دینداریيەکەی دڵنیا نەبوو

بێت! گەر شتێکیشی وەربگرتایە هێندەی لێ دەکۆڵیەوە تا دەچووە بـنج و بنەوانییەوە!

تـا گـەورەش بـوو هەرچـییەك بـاوکی بـۆ نەیهێنایـە نەیدەوویسـت، باوکیشی نان و هەنجیری لە حەڕانەوە بۆ دەهێنـا.. ژیـانی بـە زبـری بـردە سەر، جل و بەرگی زبری دەپۆشی، زۆربـەی جـاران جـل و بـەرگی پینـاوی بوو زۆر خاکی بوو بە دەگمەن بووە دوو پێخۆری هەبوو بێـت! ئەوەنـدەی لـە دیمەشـق دەبـوو هـەر دۆشـاو، یـا سـرکە یـا زەیـتی لا دەبـوو، ئـاوا خـۆی رادەگرت تا دەچووەوە بۆ گوندەکەی خۆیان (نەوا)..

لە بەرامبـەر دەسەڵاتداران و فەرمانڕەوایاندا وەسـتاوەو قسـەی هـەقی بەرامبـــەر کـــردوون، لەبـــەر خـــاتری خـــوای گـــەورە شـــەرمی لـــە کـــەس نـەکردووەو قسـەی هـەقی بـە گـوێی هەموانـدا داوە، گـەر بـەرەو روو بـە کەسێکی نەووتبێت، بـە نامـە بـۆی نـاردوون، رایچڵەکاندوون، دەسـەڵات و توانـای خـوای گـەورەی خسـتۆتەوە پـێش چـاویان، بـە سـزاو عـەزابی خـوا ترساندوونی ..

ئیمامی نەوەوی پێش لە دنیا دەرچوونی لە دیمەشقەوە سەفەر دەکات بۆ بیت المَقْدِس لە شاری قودسی پیرۆز ، لەوێ زیارەتی قیبلەی یەکەمینی موسوڵمانان دەکات ، ئینجا دەچێت بۆ خەلیل و زیارەتی ئیبراهیمولخلیل دەکات ـ سەلامی خوای لێ بێ ـ ئینجا لەوێشەوە بۆ زیارەتی ئیمامی شافیعی لە قاهیرە ، بەڵام کە گومەزی سەر گۆڕەکەی ئیمامی شافیعی دەبینیت، هەر سەلامێك دەکات و دەگەڕێتەوە، ئیتر یەکسەر دێتەوە بۆ دیمەشق دەچێتەوە ئاواییەکەی خۆیان (نەوا) لەوێ نەخۆش دەکەوێت، کەس وکاری بە دەوریەوە دەبن کە لە ٢٤ی رەجەبی ٦٧٦ ك دا کۆچی دوایی دەکات و تەرمەکەشی هەر لە و ئاواییەی نەوا بە خاك دەسپێررێت.

**ئیمامی بەیهیقی** : (٣٨٤ ـ ٤٥٨ ك) ئەبوبەکر ئەحمەدی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی موسای بەیهیقی خوسرەوجەردی نەیسابووری[1].. لە تەمەنی پازدە ساڵیدا لە کەسوکار دابڕاو بەرەو بەغداو کوفەو مەککەی پیرۆزو مەڵبەندەکانی تری ئیسلام کەوتە رێ و بوو بە قوتابی دەیانی وەکو حاکمی نەیسابووری و ئەبو عەلی روزباری و ئیبنو فۆرەك و ئەبو نەسری شیرازی وئیبنو عەلی ئیسفەراییینی.. تا بووە مامۆستای سەدانی وەکو یەحیای کوڕی مندەو ئیبنو فەزڵی فەراوی و ئیبنو عەبدولوەهابی دەههان.. جگە لە کەسانی نزیکی خۆی وەکو ئیسماعیلی کوڕی وعوبەیدواللەی کوڕی محمدی کوڕی (کوڕەزای خۆی). بەیهیقی لە زانا دەگمەنەکانی ئیسلامە. ئیمامی ئیبنو تەیمییە دەرهەقی دەیفەرموو: بەیهیقی لە فەرموودەوانیدا لە یاوەرانی شافیعیدا لە هەموویان شارەزاترەو لە هەمووشیان زیاتر شافیعی سەرخستووە[2].. بەیهیقی بە دینداریی و پسپۆڕی خۆی بووە یەکێك لە هەرە دەگمەنەکانی زانستی (عِلَل الحديث) کە لە فەحس کردن و دۆزینەوەی لاوازی فەرموودەدا وەکو زانستی نەشتەرگەریی جەستەیە ، بەیهیقی بە بێ مونافیس لە نەشتەرگەریی فەرموودەدا یەکێکە لە ریزی ئیمامی ئەحمەدو یەحیای کوڕی موعین و ئەبو

---

[1] بەیهیق کۆمەڵێك ئاوەدانی بوون دوو رۆژەڕێ لە نەیسابوورەوە دوور بوون ..

[2] کتێبی (معرفة السنن والآثار) ی نوسیوە کە نۆ بەرگە، هەمووی ریوایەتی فەتواکانی ئیمامی شافیعیە، بە شێوەی مونازەرە هێناونیەوە لە بەرامبەریشدا ئەقوالی بەرامبەرەکانی، پاشان بەڵگەی قورئان و فەرموودەی بۆ فەتواکانی ئیمامی شافیعی هێناوەتەوە، لەبەر ئەوەی بەیهیقی یەکێکیشە لە شارەزایانی (علل الحديث) زۆر ووردەکارانە بەرپەرچی بەرامبەرکانی داوەتەوە ، بێ ئەوەی دەمارگیریی بۆ مەزهەب و ئیمامەکەی هەبێت ! ئەمەش گرنگە ..

حاتەمی بوستی و دارەقوتنی ئەوانی تر.. هەمیشە بە رەفتارەكانی پارسەنگی كەسایەتی خۆی رادەگرت..

ئیبنو كەسیر دەربارەی دەڵێ : لە ووردەكاری فەرموودەو شەرع و كتێب داناندا تاقە زانای زەمانی خۆی بوو..

ئیمامی زەهەبی دەڵێ: بەیهیقی ئەگەر بیویستایە ببێتە سەرمەزهەبێكی سەربەخۆ، لەبەر زۆر شارەزایی دەیتوانی لەبەر دینداری و بەراووردكاریی راجوێییش سەركەوتوو دەبوو..

بەیهیقی وەكو بوخاری و موسلیم دوای ئەوەی شارەزای زانست بوو، هاتەوە شاری خۆی و كەوتە دەرس ووتنەوەو كتێب دانان.. سەرەتا كتێبی ئادابی نوسی كە ئێستا بە چوار بەرگ چاپ كراوە، ئینجا (إثبات الرؤية) و (إثبات عذاب القبر) ، (الخاتم) و (حياة الانبياء) كە هێشتا دەسنووسن، ئینجا (دلائل النبوة) كە بە حەوت بەرگ چاپ كراوە.. ئینجا (معرفة السنن) كە بە حەوت بەرگ چاپ كراوە، ئینجا (السنن الكبرى) بە دە بەرگ چاپ كراوە ، ئینجا (شُعَبُ الايمان) نۆ بەرگی ترە، ئینجا دەیانی تر، بەڵكو سەدانی تر.. سیوتی دەڵێ: سەرجەمی ئەوەی كە بەیهیقی نوسیونی هەزار كتێبە، هەیانە یەك بەرگەو هەشیانە دە بەرگە ..

# ناساندنی هەندێك كتێبی سەرچاوەی شەرعناسی

ـ فتح الباري شرح صحيح البخاري : الحافظ أحمد بن علي ابن حجر العسقلاني

بەناوبانگترین شەرحی سەحیحی بوخارییە ، هەموو ئوممەتی ئیسلام پێیان وایە هیچ كتێبێكی شەرحی فەرموودەی ناگاتێ ، ئیمامی ئیبنو حەجەر هەر لەو كاتەی تەمەنی بوو بە ٤٤ ساڵ بۆ ماوەی زیاتر لە ٢٥ ساڵ پێوەی خەریك بووە ، پڕە لە زانستیەكانی شەرع ، هەموو فەقێ و مەلاو توێژەرەوەو داعیەكی ئیسلام پێویستی پێیەتی ، جگە لەوەی شەرحی فەرموودەكانە بە سەدان فەرموودەی تریشی تێدایە ، ئیبنو حەجەر یەكێكە لە توێژەرەوەكانی شەرعیش ، فەرموودەكان شەرح دەكات ، فەرموودەی تریان بۆ دەهێنێتەوە ، یەك یەك باس لە سەنەدەكانیان دەكات ، ئینجا بۆچوونی شەرعناسان لەسەر مەسەلەكان دەهێنێتەوەو باس لە راجوێیی زمانەوانی فەرموودەكان دەكات ئینجا تەرجیح بە یەكێكیان دەدات ، ئیبنوحەجەر بۆ ئەم شەرحەی بوخاری ١٢٠٠ كتێبی تری خوێندۆتەوە ! رەحمەتی خوای لێ بێت خۆی شافیعی مەزهەب بووە بەڵام هەست بە مەزهەبێتیەكەی ناكرێت .. زۆر چاپ كراوە ، هەیە ١٣ بەرگی گەورەیە وەكو چاپی دارالكتب العلمیەی لوبنان ، كۆتا چاپی كە بە خزمەتی گەیشتووم چاپی نایابی دارالسلامی سعودیەیە كە ١٥ بەرگەو لە ساڵی ١٤٢١ ك / ٢٠٠٠ دا چاپ كراوەو تێبینیەكانی شێخ بن بازی رەحمەتی لەسەرە ..

ـ مجموع الفتاوى : لشیخ الاسلام تقی الدین أبی العباس أحمد بن عبدالحلیم ابن تیمیە الحرانی : لە گەورەترین مەوسوعەی باوەڕ پێكراوی موسوڵمانانە ، زانایانی ئیسلام بە درێژایی مێژوی دوای دانانی ئەم كتێبە بە یەكێك لە سەرچاوە سەرەكیەكانی دیدی ئەهلی سوننەت و جەماعەتیان داناوە ، جگە لەوانەی كە بە هۆی تەعەسووبی مەزهەبیەوە رقێكی كوێرانەیان لە ئیبنو تەیمییە بووەو بە فاسق و كافریان ناساندووە !! هەر كەس ئەم كتێبەی هەبێت و باش لێی تێ بگات ،

پێویستی بە زۆر سەرچاوەی سەرەکی نامێنێت ، کتێبێکی زۆر گشتگیرە لە باسەکانی عەقیدەو شەرع و ئوسوڵ و فەرموودەو فەرموودەوانی و تەسەووف و ئوسوڵی و علم الکەلام و مەنتیق و فەلەسەفەو مونازەرات .. هەمووشی بە شێوازێکی ئاسان .. ئەوەی ئەهلی عەقیدەیە ، ئەوی ئەهلی تەفسیرە ، ئەوی فەرموودەوانە یان شەرعناسە ، یان وێڵی دووی شێوازەکانی موناقەشەیە پێویستی بەم کتێبە نایابە دەبێت کە بە دوو قەبارە چاپ کراوە : یەکەمیان ٣٧ بەرگەو دووەمیان ٢١ بەرگە ..

## ڕێڕەوی باس

**پاکـژی: (الطهـارة):** لـە ڕوی زمانەوانییـەوە (عەرەبیەکـەی): واتـە پـاك و خـاوێنی و دوری لـە پیسـیی مـاددی، وەکـو میـزو شـتی وا، یـان مەعنەوی، وەکو هەبونی کەم و کورتی و نوقسانی لە شتێکدا، هەروەها بە مانای گوناح و سەرپێچی فەرمان.. نەك بە مانای پاکی ودوری لە چڵك و چەپەڵی، وەکو زاراوە کوردیەکەی دەیگەێنێت.

لـە ڕوی شـەرعییەوە: شەرعناسـان پێـی دەڵـێن: (رَفْـعُ الْحَـدَثِ) واتـە: نەمانی بەربەستی نوێژ، لە لـەش گرانـی ونـەبونی دەسـتنوێژ، جا بـە ئـاو بێتـە دی، یـان بـە تەیـەممومم، هـەروەها نەهێشـتنی پیسـایی و، ئـەوی لـە حوکمیدایە، بە لەش و جێگاوە.

**پاککردنـەوە (الـتطهیر)** بریتییـە لـە ئامـادەکردنی بـەرگ و شـوێنی نوێژ.

هـەر کـەس بـەم جـۆرە پاکـژ نـەبو، بـۆی نییـە دەسـتنوێژو ئـەوی لـە حوکمی ئەودان ئەنجام بـدات، لابردنـی حـوکمی پیسـی مـاددی، بـە لادان و نەهێشتنی خـودی پیسـاییەکە دێتـە دی، لابردنـی پیسـی مەعنـەویش، بـە لابردنی حوکمەکەی دەبێت.

### حوکمی پاکژیی:

پاککردنەوە لە پیسی و پیسایی، لەگەڵ هەبونی تواناداا، فـەرزە، چـونکە خوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾ المـدثر/ ٤ واتـە پۆشـاکەکانت پاکـژ کـــەرەوە، هــــەروەها: ﴿أَن طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْعَٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ﴾

البقرة/١٢٥ واتـە: دەی سا هـەردووكتان (بـە سـەییدنا ئیبراهیم و سـەیدنا ئیسماعیلی كوڕی سەلامیان لێ بێت دەفەرموێ) ماڵەكەی من (كەعبە) بـۆ ئەو كەسانەی دێن تەواف دەكەن و، لێی دەمێننـەوە و، خـەڵوەت دەكێشن وركوع و سوجدەی لێ دەبەن، پاك كەنەوە

پاك بونەوە لە بێ نوێژیی فەرزە، تا ڕێی نوێژكردن هـەبێت، چونكە پێغەمبەری خوا صلى الله علیـه وسلم دەفـەرموێ: (لا تقبَلُ الصَّلاةُ بغَیرِ طُهُورٍ)[1] واتە نوێژی بێ دەست نوێژ، قبوڵ نابێت.

## گرنگی پاكژیی:

١ـ مـەرجی دروسـتی نوێـژە، چـونكە پێغەمبـەر صـلى الله علیـە وسـلم دەفەرموێ: (لا تقبَلُ صَلاةُ مَنْ أحدَثَ حَتـى يَتوَضَّأ)[2] واتـە: نوێـژی ئـەو كەسە دروست نابێت، كە بێ دەستنوێژبوە، تـا دەسـتنوێژ نەگرێتـەوە.. نوێژكردن بە دەستنوێژەوە، خـوا بـە مـەزن زانینـە، بـێ دەسـتنوێژی و لەش گرانی ـ هەر چەندە پیس دیار نـین ـ بـەڵام بـە پیسـی مەعنـەوی حسـێبن و، دەبێـت خۆیـان لـێ پـاك كرێتـەوە، تـا بتوانرێـت ڕێـی پەرسـتنەكان بگیرێتـە بـەر، لـەش گرانـی و بـێ دەسـتنوێژیی، دەبنـە بەربەستی ئەو پەرستن و خوا بە مەزن دانانەو، پێچەوانەی پاكیشن.

٢ـ خوای پەروەردگار مـەتحی پاكژەوانانی كـردوە كـە دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ﴾ البقـــرە / ٢٢٢ واتـــە: خـــوای گـــەورە تۆبەكاران و پاكژەوانانی خـۆش دەوێـت. مـەتحی ئـەهلی مزگەوتەكـەی قیبای مەدینەی ئـاوا كـرد، كـە فـەرموی: ﴿فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا۟﴾

---

[1] موسلیم (٢٢٤).
[2] متفق علیه بوخاري (١٣٥)، موسلیم (٢٢٥).

وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُطَّهِّرِينَ ﴾ التوبە / ١٠٨ واتە: پیاوانی وای تێدایە، حەز دەكەن پاك ببنەوە، خوای گەورەش پاكژەوانانی خۆش دەوێت..

٣. خۆ پاك نەكردنەوە لەپیسی و نەجاسەت و، كەمتەرخەمی لە پاكژیی، هۆكارێكە بۆ شایان بونی ئەشكەنجەو ژانی گۆڕ.. ئیبنوعەبباس خوا لێیان ڕازی بێت گوتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بە لای دوو گۆڕدا تێپەڕی، فەرموی: (إِنَّهُمَا يُعَذَّبَانِ، ومَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ، أَمَّا هَذا فَكَانَ لا يَسْتَتِرُهُ مِنْ بَولِهِ.. )[1] واتە: ئەوانە ئێستا ئەشكەنجە دەدرێن، بە دیدی پێشوی خۆیان، لەسەر شتێكی زۆر گەورەش نیە، كە ئەشكەنجە دەدرێن ! ئەمەیان كاتی میز كردنی، خۆی پاك نەدەكردەوە.

## پلەكانی پاكژی:

پاكژی، یەكەمین دەروازەی چونە ناو پەرستنەكانە. یەكەم ڕوكنی پەرستنەكان، كە فەرز بو، نوێژەكان بون، ئینجا زەكات، ئینجا ڕۆژو، ئینجا حەج، دەستنوێژیش پێشەكی نوێژەكەیە، هەمو كتێبە فیقهیەكان، بە باسی پاكژی دەست پێ دەكەن، فەرمودەیش دەفەرموێ: (مِفْتَاحُ الصَّلاةِ الطَّهُورُ)[2]. واتە: كلیلی نوێژ پاكژییە، چونكە دەستنوێژ مەرجی نوێژە، بۆیە دەبێت حەتمەن پێشی كەوێت، چونكە مەرج پێش مەرج كراوە، ئیمام موسلیمیش لە ابو مالك الاشعرییەوە دەگێڕێتەوە، كە پێغەمبەر

---

[1] بوخاری (٢١٦)، موسلیم (٢٩٢)، ئەبو داود (٢٠)، ترمزی (٧٠)، نەسائی (٣١).

[2] ترمزی (٢٣٨)، ئەبوداود (٦١٨/١)، ئیبنو ماجە (٢٧٥/١)، داریمی (٦٨٧/١)، الحاكم (٤٥٧/١)، ئەحمەد (١٠٠٦/١)، عبدالرزاق: المصنف (٢٥٣٩/٢)، البیهیقی: الكبری (٢٠٩٤/٢). والطحاوی : شرح معانی الاثار (١٥١٣/١).

صلى الله عليه وسلم فەرموی: (الطهورُ شَطرُ الايمَانِ) واتـە: پاكـژی نیـوەی باوەڕە.

**پاكژی چوار پلەیە :**

یەكـەم: پاككردنـــەوەی دەرەوە لـــە هـــەمو پیســـیەكی بەرجەســـتەیی (ماددی) واتایی (مەعنەوی).

دووەم: پاككردنەوەی ڕەفتارو ڕەوشت لە گوناح و تاوان.

سێیەم: پاككردنەوەی دڵ و دەرون لە هەر حەزێكی خوارو خێچ.

چوارەم: پاككردنەوەی نییەت لە غەیری خواویستی.

ئەوانەی بۆ خوا سوڵحاو ئیرادە بەهێزن، هەست بە هەر چواری دەكەن و، لە مەیدانی ململانێی شەیتان و نەفسدان و، ڕویان لە سەركەوتنە، بەڵام ئەوانەی كورت بینن، تەنها دیاردەو رواڵەت دەبیـنن، هـەر پلـەی یەكەمی ئەم پاكژییانە، یان لایەنێكی ئەمیش ! دەبینن.

ئـــەوەی لێـــرەدا باســـیان دێـــت، پاكـــژیی شـــەرعییە، كـــە شەرعناســـان كردویانە بە دووبەشەوە:

١ ـ پاكـژیی واتـایی (حـوكمی): بریتیـە لـە پـاكبون لـە جەنابـەت (لـەش پیسیی) و نەبونی دەستنوێژو تەیەممم..

٢ ـ پاكژی بەرجەستە (حەقیقی) : واتە پاكبون لە پیسیی، ئەمـەش لـە جەستەو پۆشاك و جێگادایە.

باشتر وایە ئێمەش وەكو ئەو ریزبەندییەی، زۆرینەی شەرعناسان بـۆ باسە فیقهیەكان كردویانە، باس بە باس، بێیینە سەر بابەتەكانی پاكـژیی، كە بە جۆرەكانی ئاو دەست پێ دەكات:

★ ★ ★

# باسی یەکەم

# جۆر و یاساکانی ئاو

- ئاوی ڕوت.
- ئەو ئاوەی شتی پاکی تێکەوتوە.
- ئەو ئاوەی شتی پیسی تێکەوتوە.
- ئاوی تکاو لە دەستنوێژو غوسڵ و بەکارهێنانەوەی.
- بەرماوە.

## باسی یەکەم

## جۆروپاساکانی ئاو

ئەوەی پیسی پێ پاك دەكرێتـەوە، ئـاوی ئاسـاییە، كـە لـە ئۆكسـجين و هايـدرۆجين پێـك هـاتوە، كـە سەرچـاوەكەی، بـاران و، كـانی و، روبـارو، دەريـاو، زەرياكانـە، چـونكە لـە هـەمو شـلەمەنييەكی تـر، زيـاتر توانـای پاككردنەوەی هەيەو، زۆرتـر دەمێنێتەوەو ئاسان دەست دەكەوێت..

## جۆری یەکەم: ئـاوی روت

واتە ئەو ئـاوەی، كـە خـۆی لـە خۆیـدا پاكـەو پـاك و پاكەرەوەشـە، كـە هیچی تری تێكەڵ نەبوە، وەكو ئاوی باران و، دەرياو، روبـارو، بـيرو، كـانی، سوێر بێت، يان شيرين، سارد بێت، يان گـەرم.. بـۆ نمونـە، بـە چـا، يـان بـە گوڵاو ناوترێت ئاوی ڕوت.

**جۆرەكانی:**

**١. ئاوی باران و بەفرو تـەزرە:** هەموی پاكە، چونكە خـوای گـەورە دەفـــەرموێ: ﴿وَيُنَزِّلُ عَلَيۡكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ﴾ الانفـــال/١١ واتـــە: خـوای گـەورە ئاوێـك لـە ئاسمانـەوە دەنێرێتـە خـوارەوە، تـا پێـی پاكتـان كاتەوە. هەروەها: ﴿وَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً طَهُورًا﴾ الفرقان/ ٤٨ واتـە: ئـاوێكی پاكمان لە ئاسمانەوە ناردۆتە خوارەوە (باراندوە).

- ئەبو هورەيرە - خـوای لـێ ڕازی بێـت - دەگێڕێتـەوە: ((كـانَ رسُولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليهِ وسَلَّمَ إذا كبّر فِي الصَّلاةِ، سَكَتَ هُنيهَةً قَبْلَ القِراءَةِ، فَقُلْتَ: يـا

رسولَ اللهِ - بأبي أنتَ وأمّي- أرَأيْتَ سُكُوتكَ بينَ التكبيرِ والقِراءةِ، مَا تقـولُ ؟ قالَ: أقولُ: اللهُمَّ بَاعِدْ بَينـي وبينَ خَطايايَ، كَمَا بَاعَدْتَ بينَ المْشْرِقِ والمغْرِبِ، اللهُمَّ نَقِّنِي مِنْ خَطايايَ كَمَا يُنَقَّى الثَوبُ الأبيضُ مِنْ الدَنَسِ، اللـهُمَّ اغْسِلْنِي مِنْ خَطَايايَ بِالثَلْجِ والماءِ والبَرَدِ))[١] واتە: کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسـلم نوێـژی دادەبەسـت، دوای تـەکبیرەی ئیحـرام (چـونە نـاو نوێـژ) و، پـێش خوێندنی سورەتی فاتیحە، ماوەیەك بـێ دەنـگ دەبـو، منـیش لـێم پرسـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا، دایـك و بـاوکم بـە قوربانـت بـن، ئـەوە لـە نێـوان تەکبیرو خوێندنەکەت (سـورەتی فاتیحـە) دا چـی دەفـەرمویت؟ فـەرموی: دەڵــێم: خوایــە لــە گوناهــەکانم دورم خــەرەوە، بەقــەدەر ئەوەنــدەی خۆرهــەڵات و خۆرئــاوات دور خســتۆتەوە، خوایــە پــاکم کــەرەوە لــە گوناهـەکانم وەکـو کـە جـل و بـەرگی سـپی لـە چـڵك و چـەپەڵ پـاك دەکرێتەوە، خوایە گوناهەکانم بەبەفر ئاو تەزرە بشۆوە.

**٢. ئاوی دەریا:** ئـەبو هورەیرە ـ خـوا لێـی ڕازی بێـت ـ دەگێڕێتـەوە (سَألَ رَجُلٌ رَسولَ اللهِ صلى الله عليه وسلم، فقالَ: يا رسـولَ اللـهِ، إنَـا نَرْكَـبُ البحْرَ، نَحْمِلُ مَعَنَا القليلَ من المـاءِ، فـإنْ توَضَّأنَا بـهِ عَطِشْنَا، أفَنَتوَضَّأُ بمَـاءِ الْبَحْـرِ ؟ فقـالَ رسـولُ اللـهِ صـلى الله عليـه وسـلمَ: هُـوَ الطَّهُـورُ مَـاؤهُ، الحِـلُّ مَيْتَتهُ)[٢] واتە: کابرایەك لە پێغەمبەری پرسی صـلى الله عليـه وسـلم: ئـەی

---

[١] بوخاری (٧٤٤)، موسلیم (٥٩٨)، ئەبو داود (٧٨١)، ئەحمەد (٢/٢٣١)، نەسائی (٦٠)..

[٢] ئەبو داود (٨٣)، نەسائی (٥٩)، ترمزی (٦٩) ئیبنوماجە (٣٨٦) مالیك (١/٢٢) ترمزی دەڵێ: حسن صحيح، وسألت محمد بن إسماعيل البخاري عن هذا الحديث فقال: (حديث صحيح) واتە: ترمذي دەفەرموێ ئەم حەدیسە حەسەن و سەحیحە، دەربارەشی لە محمدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاریم پرسی، ئەویش گوتی: حديث صحيح. شێخی ئال بەسسام، کە لە گەورە زانایانی حەرەم بو، رحمە الله (لە ٢٠٠٣/٢/١ کۆچی دوایی کرد) لە توضيح الاحكام

پێغەمبەری خوا، ئێمە کە گەشتی دەریا دەکەین، ئاو کەم لەگەڵ خۆمان هەڵ دەگرین، ئەگەر دەستنوێژی پێ بگرین، بێ ئاو دەمێنینەوەو تینومان دەبێت، ئایا بۆمان هەیە لە دەریا دەستنوێژ بشۆین ؟ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموی: ئاوی دەریا پاکەو، مردارەوە بوەکەشی حەڵاڵە..

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە وەڵامی کابرادا نەیفەرمو: بەڵێ، تا هۆی پاکێتی دەریا ڕون بکاتەوەو بەس. بەڵکو حوکمێکی تریشی ڕون کردەوە ـ گەرچی پرسیاریشی دەربارەی لێ نەکرا بو ـ کە بریتییە لە حەڵاڵێتی مردارەوەبوی ناو دەریا.. ئیبنول عەرەبی دەڵێ: ئەمە بۆ ئەوەیە، زیاتر شت فێر بین و، موفتیش فێری شێوازی فتوا دان بکات.. دەفەرموێ مردارەوە بوی دەریاکە، واتە ئەوی لە ناویدا دەژی و مردار بۆتەوە، نەك یەکێك لەسەر وشکانی دەژی و، کەوتۆتە ناوی تێیدا مردوە، ئەمیان حەڵاڵ نییە.

ئیمام شافیعی دەڵێ: ئەم فەرمودەیە نیوەی زانستی پاکژییە.

ئیمام ئەبو حەنیفە مردارەوە بوی ـ دەریا غەیری ماسی ـ بە حەڵاڵ نازانێت، ئیمام ئەحمەد هەموی پێ حەڵاڵە، جگە لە بۆق و مارماسی و تیمساح، چونکە بۆق و مارماسی، تەبیعەت ناچێتە سەریان تیمساحیش کەڵبەی هەیەو دڕندەیە. ئەمما ئیمام مالیك و شافیعی، هەمو شتێکی دەریا بە حەڵاڵ دەزانن، بەڵگەشیان ئەوەیە کە خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ الْبَحْرِ وَطَعَامُهُ﴾ المائدە/٩٦ واتە ئەوی لە دەریادا ڕاوی دەکەن، هەروەها خۆراکەکانی بۆتان حەڵاڵە. (صید لێرەدا بە مانای ڕاو

---

(٨٩/١) دا دەڵێ: ئوممەت هەموی ئەم فەرمودەیەی قبوڵ کردوە، زیاتر لە ٣٠ پێشەوای فەرمودە بە سەحیحیان زانیوە، ناوی زۆریشیان دەهێنێت...

کراوەکەیـە، نـەك راوکـردن).. ڕاسـتترین ڕا بەلامـەوە ئەوەیـە، کـە هـەمو شتێکی دەریا حەڵاڵە.

**٣. ئاوی زەمزەم:** عـەلی کـوڕی ئـەبو تالیـب ـ خـوا لێـی ڕازی بێـت ـ گێڕایەوە، کە ((أنَّ رسُولَ صلى الله عليـه وسلم دَعَـا بسَجْلٍ مِـنْ مـاءِ زَمْـزَم، فشَـرِبَ مِنْـهُ، وتوَضَّـأ))[1] واتـە: پێغەمبـەر صـلى الله عليـه وسـلم داوای دۆلکەیـەك ئـاوی بـیری زەمزەمـی کـرد، کـە هێنایـان لێـی خـواردەوەو، دەستنوێژی پێ گرت.

**٤ـ ئـاوی گـۆڕاو:** چ بـە هـۆی زۆر مانـەوەوە گـۆڕا بێـت، چ بـە هـۆی جێگەو ڕێگەیەوە بێت، چ بە هۆی ئەوە بێت، کە شتی پاکی تێکەوتبێت و، لێـی جیا نەکرێتـەوە، وەکـو قـەوزەو گـەڵاو گیـاو.. هتـد. چـونکە ئەمانـە سـیفەتی ئـاوی ڕوت لـە ئاوەکـە دانـابڕن، ئەمـەش کـۆڕا (ئیجمـاع)ی شەرعناسانی لەسەرە. ئـەو ڕێسایەی هـەمو ئـەم جۆرە ئاوانـە دەگرێتـەوە ئەوەیە، کە هەر ئاوێك سیفەتی ئاوی ڕوتی پێوە بو، بۆ دەستنوێژ شوشتن دەشـێت. خـوای گـەورەش دەفـەرموێ: ﴿فَلَمْ تَجِـدُواْ مَآءً فَتَيَمَّمُواْ﴾ المائـدة/٦ واتە: ئەگەر ئاوتان دەست نەکەوت، تەیەمموم بکەن..

---

[1] عبداللەی کوڕی ئەحمەد لە الزوائد (٧٦/١) هێناویتیەوەو ئەحمەد شاکر (کە توێژەرەوەیەکی میسریەو لە ئاست و پلەی ئەلبانی ڕەحمەتیدایە) دەڵێ: سەحیحەو ئەلبانیش لە (ارواو الغليل ژمارە ١٣) دا بە حەسەنی ناساندوە.

## جۆری دووەم: ئەو ئاوەی شتی پاکی تێکەوتوە

ئەو شـتی پـاکی وەکـو، خـۆڵ و، گـڵ و، سـابون و، عـەترو، چـاو، ئـاردو، زەعفـەران و.. هتـد تێکـەوتوە، کـە لـە ئاوەکـە جیـا ناکرێتـەوە. حـوکمی ئەمیش پاك و پاکەرەوەیە، چونکە سیفەتی ئـاوی ڕوتـی پێـوە مـاوە. ئـوم عەتییـە، کـە ئافرەتـە سـەحابەیەکی پێغەمبـەرە صـلى الله عليـه وسـلم دەگێـڕێتەوە: ( دَخَلَ علينا رسولُ اللّهِ صـلى الله عليـه وسـلم، حِينَ تُوُفِّيَتْ ابْنَتُهُ (زَينبُ) فقَالَ: اغْسِلْنَها ثلاثاً، أو خمساً أو أكثرَ مِن ذلكَ إنْ رَأيـتنَّ بمَاءٍ وسِدْرٍ، واجْعَلْنَ فِي الأخِيرَةِ كافُوراً أو شَيئاً مِـن كـافورَ، فـإذا فَـرَغْتنَّ، فـآذِنَّنِي. فلَمَا فَـرَغْنَ آذَنّـاهُ، فأعْطانـا حِقْـوَهُ، فقـال: "أشْعِرْنَها إيّـاه)[١].. واتـە: کاتێـك زەینەبی کچی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کۆچـی دوایـی کـرد، پێغەمبـەر صلى الله عليه وسلم تەشـریفی هێنـا بـۆ لامـان و فـەرمووی: سـێ جـار، یـان پێنج جار، یا زیاتر بە سیدرو ئاو بیشۆن، کۆتا جاریش کافور، یان شـتێکی تری وەکـو کـافوری تێکـەن، کـە لـە شوشتنیشـی تـەواو بـون، بـانگم بکـەن. ئێمەش دوایـی بانگمـان کـرد، کـە هـات عەباکـەی خـۆی دایـنێ و فـەرمووی: تێوەی پێچن). ئەگەر سیفەتی ئـاوی ڕوتـی پێـوە نـەما، پاکـە، بـەڵام وەکـو شەرعناسان گوتویانـە پاکـەرەوە نامێنێـت[٢]. ئـوم هـانی دەگێڕێتـەوە: ((أنَّ النبيَّ صلى الله عليه وسلم اغْتسَلَ، هُوَ وميمونَةُ مِن إناءٍ واحِدٍ. قَصْعَةٌ فِيها

---

[١] بوخاری (١٢٥٨)، موسلیم (٩٣٩)، ئەبو داود (٣١٤٢) نەسائی (١٨٨٠)، ئیبنو ماجە (١٤٥٨)، ترمزی (٩٩٠) دەربارەشی دەفەرموێ (حديث حسن صحيح)،..

[٢] ابن قدامه: المغني (١٢/١)، النوي: المجموع (٥٠/١)، المقبلي: البحر الزخار (٢٧/١).

أثـرُ الْعَجِـينِ))[١] واتـە: پێغەمبـەر صـلی الله علیـە وسـلم ومەیمونـەخانی خێزانی، لە تەشتێکدا پێکەوە خۆیان شوشت، کە هەویری کۆنی پێوە بو.

ئاشـکرایە، کـە هـەر شـتێك زینـدوی پـێ پـاك دەبێتـەوە، بـۆ شوشـتنی مردوش دەشێت. بۆیە لە هەر دووفەرمودەکەی سەرەوە، ئـەوەمان بـۆ ڕون دەبێتەوە، کە ئاو هەر چەند شتی پاکی تێ بکەوێت ـ مادام سـیفەتی ئـاوی ڕوتی پێوە بمێنێت ـ هەر بە پاك و پاکەرەوە دەمێنێتەوە.

## جۆری سێیەم: ئەو ئـاوەی شتی پیسی تێ کەوتوە

ئەمەش دووحاڵەتە:

### یەکەم: ئەو ئاوەی، کە پیسییەکە، تام، یان بۆن، یان ڕەنگی گۆڕیوە:

ئیبنول مونزیرو ئینول مولەققەن، کۆڕای شەرعناسانیان لـەم بـارەوە هێناوەتەوە، کە ئەو ئاوە ـ زۆر بێت، یان کەم ـ بۆ پاککردنەوە ناشێت[٢].

### دووەم: ئەو ئاوەی کە هیچ سیفەتێکی نەگۆڕاوەو بە سیفەتی ئاوێتی هەر ماوە:

جمهوری شەرعناسان، ڕایان لەسەر ئەوەیـە، کـە پـیس نـەبوە[١]، چـونکە کـە پێغەمبـەر صـلی الله علیـە وسـلم لـەو فـەرمودەدا، کـە ئیمـام موسـلیم

---

[١] احمد (٦/٣٤٢)، نەسائی (٢٤٠)، ئیبنوماجە (١/١٣٤ ژمارە ٣٧٨)، ابن خزیمة (٢٤٠) شێخی ئەلبانی لە صحیح النسائي (١/٥١) وصحیح ابن ماجە (٣٧٨) ومشکاة المصابیح (٤٨٥) وإرواء الغلیل (١ / ٦٤) بە سەحیحی داناوە بڕوانە :.

[٢] سید سابق: فقه السنة (١/١٦).

ریوایـەتی كـردوە دەفـەرموێ: ((طَهـورُ إنـاءِ أحَـدِكُمْ إذَا وَلَـغَ فيـه الكَلـبُ أنْ يَغْسِلَهُ سَبْعَ مَرَّاتٍ أُولاهُنَّ بالتُّرَابِ))[٢] واتە: ئەگەر سەگێك دەمی خستە نـاو دەفر (قاپ) ی یەكێتانەوە، با حەوت جار بیشواتەوە یەكەمجارەكەیان، بـا بـە گـڵ بێـت. دەڵـن: ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی، ئەگـەر ئـاوێكی كـەم پیسیی تێكەوت، ئەو ئاوە خۆیشی حوكمی پیسی وەردەگرێـت... هەنـدێكی تریان دەڵێن: مـادام پێغەمبـەر صلى الله عليه وسلم فەرمویـەتی: ((المَاءُ طَهورٌ، لا يُنَجِّسُهُ شَيءٌ)) ئاو پاكەو، هیچ پیسی ناكات، كەوا بو ئاوەكە ـ كەم بێت، یان زۆر ـ پاك و پاكەرەوەیە.

هەروەها فەرمودەكەی ئەبو سەعیدی خـودری ـ خـوا لێـی ڕازی بێـت ـ كە لای هەمو پێشەوایانی فەرمودە، وەكو ئەحمەدو یەحیای كوڕی مـەعین و ئیبنوحـەزم و ئیبنوحیببـان و حـاكم وئیبنوخوزەیمـەو ئیبنوتەیمییـە مەقبولە (جگە لە ئیبنو قەتتان، كـە بۆچـونی لـە ڕای ئـەو شەرعناسـانەی پێشـو بـەهێزتر نیـە)، كـە دەڵـێ لـە پێغەمبـەریان صلى الله عليه وسلم پرسی: (يا رسولَ اللهِ، أنَتَوَضَّأُ مِن بئرِ بُضَاعَةَ ؟ فقالَ صلى الله عليه وسلم: المَاءُ طَهورٌ، لا يُنَجِّسُهُ شَيءٌ)[٣] واتـە: ئـەرێ ئـەی پێغەمبـەری خـوا، ئایـا لـە

---

[١] الشوكاني: نيل الاوطار (٤١/١)، ابن رشد: بداية المجتهد (٢٤/١)، ابن قدامة المقدسي: المغني (٢٢/١)، الخطيب الشربيني: مغني المحتاج (٢١/١).

[٢] موسلیم (١٨٣/٣).

[٣] ئەبوداود (٥٤/١ ژمارە ٦٦)، ترمزی (٩٦/١ ژمارە ٦٦) و بە حەسەنی داناوە، نەسائی (١٧٥/١ ژمارە ٣٢٥)، ئەحمەد (٣١/٣ و ٨٦)، بەیهیقی لە السنن الكبرى (٤/١ و ٢٥٧)، دارەقوتنی (٣٠/١ ژمارە ١١)، تلخيص الحبير (١٣/١)، ئیمامی ئەحمەدی كوڕی حەنبەل دەفەرموێ: حەدیسی بیری بوزاعە سەحیحە .

بیرەكەی بوزاعـە (بُضاعة) دەسـتنوێژ بگـرین؟ فـەرمووی: ئـاو خـۆی پاكـە، هیـچ شتێك پیسی ناكات[1].

ئەمەش مەزهەبی ئیبنو عەبباس و ئەبو هورەیرەو حەسەنی بەسـری و ئیبنـول مەسـییەب و عیكرەمـەو ئیبنـو ئـەبی لـەیلاو سـەوری و داودی زاهیری و نەخەعی و مالیك و ئەوانی تـرە، بۆیـە ئیمـام غـەزالی دەیگـوت: خۆزگـە مەزهـەبی شـافیعی لـە مەسـەلەی حـوكمی ئـاودا، وەكـو مەزهـەبی ئیمـام مالیـك بوایـە[2]! بۆیـە غـەزالی ڕەحمـەتی وا دەڵـێن، چـونكە خـۆی شافیعییەو، شافیعییەكان ئیعتیمادیان كردۆتە سەر فەرمودەیەكی زەعیف، بۆیـە لـە بۆچـونە فیقهیەكـەی ئـەم مەسـەلەیەدا، بـە تـەواوی - وەكـو مەزهەبی ئیمام مالیك و ئەحمەد - نەیانپێكاوە.. فەرمودەكەش ئەوەیە كە ئیبنو عومـەرخوا لێیـان ڕازی بێـت دەیگێڕێتـەوە كـە پێغەمبـەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (إذا كانَ الماءُ قُلّتين، لَمْ يَحْمِلْ الخبَثَ)[3] واتە: ئەگەر ئاو گەیشتە بڕی دوو قوللە[4]، ئیتر هەرچی تێكەوێت، پیسی ناكات..

شـێخ سـەیید سـابق لـە (فقـه السـنة) كەیـدا ڕەچـاوی هەنـدێك لـە شەرعناسـانی فـەرمودەی كـردوە، لەوانـەی كـە ئـەم فـەرمودەیان - هـەر

---

[1] بێگومان بەو مەرجەی، یەكێك لە سێ وەسفەكانی (تام و ڕەنگ و بۆن) ی نەگۆڕا بێت.

[2] سید سابق: فقه السنة چاپی الاعلام العربی میسر ٢٠٠٤ (ل ١٧). هەر سێ بەرگەكەی كراوە بە یەك بەرگی (١١٣٤) لاپەڕەیی.

[3] ئەبو داود(١/١٧)، نەسائی (١/٤٦)، ترمزی (٦٧)، ئەحمەد (١/٣١٤)، دارەقوتنی (١/١٨٧)، حاكم لە مستەدرەكیدا (١/١٣٣) بە سەحیحیشی ناساندوە..

[4] (قوللە: گۆزەی گەورەی ئەو زەمانە بوە، بە حساباتی ئێستای ئێمە دەكاتە ١٥٧ كلگم، شێخ ئال بەسسام لە توضیح الاحكام (١/٩٦) دا دەڵێ ٥٠٠ ڕەتڵی عێراقی، واتە: ٢٠٠ كلگم لە ئاوی شیرین.

چەندە گرنگ و پێویستە ـ بە (مُضْطَرَبٌ سَنَدَاً وَمَتنَاً) ناساندوە[١]، ئەوان گوتویانە: لە ڕوی سەنەدەکەیەوە: لەبەر ئەوەیە، کە تەنها ئیبنوعومەر ریوایەتی کردوەو، لەویشەوە تەنها عوبەیدوڵڵەی کوڕی، لە روی دەق (مەتن)ەکەشیەوە، چونکە فەرمودەی تر هەیە، باسی سێ قوللە و یەکێکی تر باسی چل قوللە دەکات، قوللەش لای هەموان رون نەبوە، لە دیاریکردنی قەبارەی گۆزەکەدا، ڕایان لێك دور کەوتۆتەوە، هەر چەندە هەندێکیان گوتویانە بە قوللەی هیجر (هۆزێکە)، ئەمە جگە لەوەی لە ریوایەتی تریدا هاتوە دەفەرموێ: (لمْ يُنَجَّسْ) نەك (لَمْ يَحْمِلْ الخَبَثَ)..

زۆر لە شەرعناسان لە موناقەشەی ئەم فەرمودەدا بەشدار بون، شەوکانی بۆچونی هەموانی باس کردوەو، پاشان بە سەحیحی داناوە، شێخ احمد شاکری میسری و شێخی ئەلبانی بە سەحیحیان داناوە[٢].

ئەو ڕێسایەی ئەم جۆرە ئاوانە دیاری دەکات، گۆڕان و نەگۆڕانی، تام و بۆن و ڕەنگی ئاوەکەیە، هەر کامێك لەمانە گۆڕا، ئاوەکە پاکژ نامێنێت، جا ئیتر ئەو ئاوە کەم بێت، یان زۆر، ئیبنول مونزیرو ئیمام نەوەوی کۆڕای شەرعناسانیان لەسەر ئەمە نەقڵ کردوە. ئەمە ڕای ئیمام مالیك و زاهیریەکان و ئیبنو تەیمییەو ئیبنوالقەییم و محمد بن عبدالوهاب و شەرعناسانی نەجدیشە.. هەمویان دەڵێن: هەر ئاوێك پیسی تێکەوت، بەڵام تام و بۆن و ڕەنگی نەگۆڕی، پاکژ دەمێنێت..

---

[١] وەکو بەیهیقی و موززی و ئیبنو تەیمییە (توضیح الاحکام ١/٩٥).

[٢] بڕوانە: الالباني: إرواء الغليل (١ / ٦٠) وصحيح الجامع (٧٥٨( دەربارەی دەفەرموێ: (الحديث صحيح رواه الخمسة مع الدارمي والطحاوي والدارقطني والحاكم والبيهقي والطيالیسي باسناد صحيح عنه، وقد صححه الطحاوي وابن خزيمة وابن حبان والذهبي والنوي و العسقلاني، وإعلال بعضهم إياه بالاضطراب مردود).. واتە: ئەوەی دەڵێ موزتەریبە، قەولەکەی وەرناگیرێت.

كەوابو هەر ئاوێك پیسی تێكەوت و، ڕەنگ، یان، تام، یان بۆنی گۆڕی، پیسە، بەڵام ئەگەر ئەمانەی لێ لادرا، دەگەڕێتەوە سەر ئەسڵە پاكەكەی، وەكو زۆرینەی ئەو ئاوەی، كە لە مەركەزی شارە گەورەكانی ڕۆژئاوادا بەكاردێت، كە لە هەندێك وڵاتدا حەفتاو پێنج لە سەدی، ئاوی زێرابەو پاك كراوەتەوە[1].. لیژنەی هەمیشەیی شەرعناسانی جەزیرە، فەتوایان لەسەر پاكی ئەم جۆرە ئاوە داوە، كە پاك بۆتەوەو، بۆ هەمو پێداویستیەكانی موسوڵمان، بە تایبەتی دەستنوێژو غوسڵی دەشێت[2]..

## جۆری چوارەم: ئاوی تكاو لە دەستنوێژو غوسڵ

### ئاوی تكاو لە دەستنوێژ

ئەو ئاوەیە، كە لە دەموچاو ئەندامانی دەستنوێژی موسوڵمان، كەوتۆتە خوارەوە.. شەرعناسان هەر لە كۆنەوە، موناقەشەی ئەم جۆرە ئاوەیان لا بۆتە باس، كە ئایا هەر بە پاكی دەمێنێتەوە، یان بە بەكارهێنانەكەی پیس دەبێت و، جارێكی دیكە ناشێت بۆ پاكژیی بەكار بهێنرێتەوە؟! شەرعناسان لەم مەسەلەیەدا دووپۆلن:

---

[1] لەساڵی ١٩٩٥ دا لە ناوەڕاستی ڤیەننای پایتەختی نەمسا، كۆشكێكی زۆر گەورەم بینی، كە دەرەوەی دیمەنی ڕەنگاو ڕەنگی جوانی لێكرابو، لە هاوڕێكانم پرسی ئەمە چیە وا جوانە؟! وتیان: ئەمە زێرابی شارەو، لێرەدا ئاوەڕۆكە سەر لە نوێ پاك دەكرێتەوەو بەكار دەهێنرێتەوە..

[2] بڕیاری ژمارە(٦٤) لە (١٣٩٨/١٠/٢٥) و بڕیاری خولی (١١) كە لە (١٣ی ڕەجەبی ١٤٠٩ - ١٩٨٩/٢/١٩) گیرا ..

## پـۆلی یەکـەم: ئەوانـەی گوتویانـە پاکـە و پاکـەرەوە مـاوە:

ئەمـەش ڕای سـەیدنا عـەلی کـوڕی ئـەبو تالیـب و، ئیبنـو عومـەرو، ئـەبو ئومامــەو، کۆمــەڵێکی زۆری ســەلەفە، هــەروەها ڕای ناســراو بــەناوبانگی مەزهەبی ئیمام مالیك و ڕیوایـەتێکی لای ئیمـام شـافیعی و، ئەحمەدیشـە، هەروەها ڕای ئیمام ئیبنـو حـەزم و، ئیبنولـونزیرەو، شێخولئیسلام ئیبنـو تەیمییەش ئەمیانی پێ پەسەندتر بوە[1].. هەندێك لە بەڵگەی ئەمان:

١ ـ ئەسڵ ئەوەیە، کە ئاو پاکەو هیچ شتێك پیسی ناکات، وەکو لە فەرمودەکەی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم هاتوە، کە ((الْمَاءُ طَهورٌ لا يُنَجِّسُهُ شَئٌ))[2] واتە: ئاو پاکەو، هیچ شتێك پیسی ناکات.. مەگەر تام، یان بۆن، یان ڕەنگی گۆڕا بێت، یان پێناسەی ئاوی ڕەها (موتڵەق)ی بەسەردا نەچەسپێتەوە..

٢ ـ ئەوە سەلمێنراوە، کە یاوەران ئاوی ماوە، لە دەستنوێژی پێغەمبەری خوایان صلى الله عليه وسلم بەکار دەهێنایەوە:

★ ئەبو جوحەیفە خوا لێی ڕازی بێت، دەگێڕێتەوە: ((خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْهَاجِرَةِ، قَالَ: فَتَوَضَّأَ فَجَعَلَ النَّاسُ يَتَمَسَّحُونَ بِفَضْلِ وَضُوئِهِ))[3] واتە: دوای نیوەڕۆیەك پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم تەشریفی هێنایە لامان، دەستنوێژی شوشت، کە

---

[1] ابن قدامة: المغني (٣١/١)، النوي: المجموع (٢٠٥/١)، ابن حزم: المحلى (١٨٣/١)، ابن تيمية: مجموع الفتاوى (٥١٩/٢٠)، ابن المنذر: الاوسط (٢٨٥/١).

[2] ئەبو داود (٢٦٦)، ترمزی (٦٦)، نەسائی (١٧٤/١)، کەمال السسەید سالم لە صحيح فقه السنة (١٠٤/١) دا دەڵێ: حەسەنە .

[3] بوخاری (١٨٧)، ئەحمەد: مسند الكوفيين (١٨٣٧٩) دەشفەرموێ: على شرط الشيخين.

تەواو بو، کۆمەڵێك خەڵك پەلاماری ئاوی ماوەی دەستنوێژەکەیان داو، دەستیان پێ تەڕ دەکردو، بە دەموچاو لەشی خۆیاندا دەهێنایەوە. ئیمام ئیبنو حەجەری عەسقەلانی، ڕەحمەتی خوا لێ بێت دەڵێ: ئیحتیمالی ئەوە زۆرتر، کە پەلاماری ئەو ئاوەیان دابێت، کە لە شوشتنی ئەندامە پیرۆزەکانی، دەستنوێژی تکابۆوە، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە ئاوی بەکارهاتوی دەستنوێژ پاکە[١].

٭ فەرمودەکەی مەسوەرەی کوڕی مەخرەمە، خوا لێی ڕازی بێت، کە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ((وَإِذَا تَوَضَّأَ كَادُوا يَقْتَتِلُونَ عَلَى وَضُوئِهِ))[٢] واتە: کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەستنوێژی دەشت، یاوەران خەریك بو شەڕیان لەسەر ئەو ئاوەی دەستنوێژەکەی دەکرد..).

٭ لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە خوا لێی ڕازی بێت گێڕاوەتەوە: (دَعَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِقَدَحٍ فِيهِ مَاءٌ فَغَسَلَ يَدَيْهِ وجْهَهُ فِيهِ وَمَجَّ فِيهِ ثُمَّ قَالَ لَهُمَا اشْرَبَا مِنْهُ وَأَفْرِغَا عَلَى وُجُوهِكُمَا وَنُحُورِكُمَا)[٣] واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم داوای دەفر (قاپ) ێك ئاوی کرد، کە بۆیان هێنا دەست ودەموچاوی تێدا شوشت ولە دەمی وەردا، پاشان بەم و بە بیلالی فەرمو: لێی بخۆنەوەو، بیکەن بەسەر دەموچاو ملتاندا..

٣ ـ ئەو فەرمودەی، کە ئیبنو عومەر خوا لێیان ڕازی بێت دەیگێڕێتەوە، دەڵێ: (كَانَ الرِّجَالُ وَالنِّسَاءُ يَتَوَضَّئُونَ فِي زَمَانِ رَسُولِ اللَّهِ

---

[١] ابن حجر: فتح الباري (٣٥٣/١).
[٢] بوخاری (١٨٩).
[٣] بوخاری (١٨٨).

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَمِيعًا )[١] واتە: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم، ژن و پیاو پێکەوە دەستنوێژیان دەشوشت..

لە ڕیوایەتێکی تردا، لە ڕێی عوبەیدوڵڵەی کوڕی نافیعەوە، دەڵێ: (كُنَّا نَتَوَضَّأُ نَحْنُ وَالنِّسَاءُ عَلَى عَهْدِ رَسولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ نُدْلِي فِيهِ أَيدِينا)[٢] واتە: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم، ژن و پیاو لە یەك تەشتێكدا دەستنوێژمان دەشوشت، هەمومان لە یەك کاتدا دەستمان تێیدابو..

٤ ـ فەرمودەکەی، کە ئیبنو عەبباس خوا لێیان ڕازی بێت، کە دەڵێ: (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَغْتَسِلُ بِفَضْلِ مَيْمُونَةَ) [٣] واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، غوسڵی هەر بەو ئاوە دەردەکرد، کە خاتو مەیمونەی خێزانی خوا لێی ڕازی بێت، خۆی پێ شوشتبو..

٥ ـ ڕوبەییعی کچی موعەویز خوا لێی ڕازی بێت، دەڵێ: (إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَسَحَ رَأْسَهُ مِنْ فَضْلِ مَاءٍ كَانَ بِيَدَيْهِ )[٤] واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم مەسحی سەری بەو ئاوە زیادە کرد، کە بە دەستی پیرۆزیەوە مابو..

---

[١] بوخاری (١٩٣)، ئەبوداود (٧٩)، نەسائی (٥٧/١)، ئیبنوماجە (٣٨١) .

[٢] ئەبوداود هێناویێتیەوەو دەرهەقی دەفەرموێ: سەحیحە.

[٣] موسلیم (٣٢٣)، لە فەرمودەیەکی تری متفق علیە دا هاتوە کە: (كَانَا يَغْتَسِلاَنِ فِي إِنَاءٍ وَاحِدٍ) واتە پێکەوە لە یەك تەشتی گەورەدا غوسڵیان دەردەکرد..

[٤] ئەبوداود ژمارە (١٣٠) و لای دارەقوتنی (٨٧/١)، کەمال السەید سالم لە صحیح فقه السنة (١٠٥/١) دا دەڵێ: حەسەنە.

٦ ـ ئیبنولمونزیر کۆڕا (ئیجماع) ی شەرعناسانی نەقڵ کردوە[١]، کە گوتویانە: ئەو ئاوەی لە دەستنوێژو غوسڵی موسوڵمان، دەتکێتەوە سەر پۆشاکەکەی پاکە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر پاکێتی ئەو ئاوەی، لە دەستنوێژ تکاوەتەوە، جا کە ئەو حوکمە لەسەر پاکێتی ئاوا بنبڕانە بێت چی بە بێ هەبونی بەڵگە، ڕێ لەوە دەگرێت دەستنوێژی پێ بشۆرێتەوە ؟! ئەوی پێچەوانەی ئەم بۆچونەیە چ بەڵگەیەکی پێیە؟!

**پۆلی دووەم: ئەوانەی کە فەرمویانە پاك نەماوەو ناشێت بەکار بێتەوە:** بەڵگەی ئەمان، وەکو بەڵگەکانی ئەوان، ئەوەندە بەهێز نیە، ڕای شەرعناسانی پۆلی یەکەم لاواز کات:

١ ـ (عَنْ حُمَيْدٍ الْحِمْيَرِيِّ قَالَ لَقِيتُ رَجُلًا صَحِبَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَرْبَعَ سِنِينَ كَمَا صَحِبَهُ أَبُو هُرَيْرَةَ قَالَ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ تَغْتَسِلَ الْمَرْأَةُ بِفَضْلِ الرَّجُلِ أَوْ يَغْتَسِلَ الرَّجُلُ بِفَضْلِ الْمَرْأَةِ زَادَ مُسَدَّدٌ وَلْيَغْتَرِفَا جَمِيعًا )[٢] واتە: حومەیدی حیمیەری

---

[١] ابن المنذر: الاوسط (١/٢٨٨).

[٢] ئەبو داود (٨١) بە سەحیحی داناوە.. شەوکانی لە بەرگری لە سەنەدەکەی دەفەرموێ: بەیهیقی وای ڕاگەیاندوە: گوایە مورسەلە (پاوەڕێك لە زنجیرەی سەنەدەکەیدا نەماوە) ئیبنو حەزمیش ئیددیعا دەکات گوایە داود، کە لە حەمیدی کوڕی عبدالرحمانی دەگێڕێتەوە زەعیفە.. نەوەویش گوتویەتی: حافزانی فەرمودە لەسەر ئەوە کۆن، کە ئەمە فەرمودەیەکی زەعیفە.. بەڵام ئیمامی ئیبنو حەجەری عەسقەلانی دوای ئەوەی لە بلوغ المرامدا سەنەدەکەی بە سەحیح ناساندوە، سەرسامی خۆی لەم قەولەی نەوەوی دەربڕیوە، چونکە دەڵێ: پیاوانی سەنەدی فەرمودەکە، هەمویان جێمتمانەن و، کەسم لە فەرمودەوانان نەدیوە، بە زەعیفی دانابێت.. ئال بەسسامیش دەڵێ: ئیبنو حەزم لە ناوی حەمیددا بە هەڵەدا چوە، چونکە ئەو حەمیدە کوڕی عبدالرحمان نیە، کە زەعیفە، ئەمە حەمید کوڕی عبداللەیە، کە شەرعناس و جێ متمانەیە (فقيهٌ ثقة). توضيح الاحكام (١/١٠٣).

گێڕایەوە کە پیاوێکی بینی کە چوار ساڵ لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بو صلی الله علیه وسلم، ئەو گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەرهەڵستی کردوە لەوەی ژن بە ئاوی ماوەی بەر پیاو غوسڵی خۆی دەرکات، هەر وەکو کە نابێت پیاو بە ئاوی ماوەی بەر ژن غوسڵی خۆی دەرکات، با هەردووکیان هەر لێی هەڵهێنجن.. ئەم شەرعناسە بەڕێزانە دەڵێن: دیارە، کە جائیز نیە ئاوی بەکارهێنراوی یەکتری، بەکار بهێنن. کەوابو ئاوی بەکارهێنراو پاکیش بێت، پاك کەردوە نەماوە..

ئیمام ئیبنو حەجەری عەسقەلانی، کە بەرگری لە سەحیحێتی فەرمودەکە کردوە دەڵێ: فەرمودەکانی تریش سەحیحن، کەوابو ئەوەی رون دەبێتەوە ئەوەیە، کە ئەم فەرمودەیەی حومەیدی دیگێڕێتەوە، بۆ پاك و خاوێنی زیاترە، نەك بۆ رێ لێگرتنی تەواوی..

* * *

## ئاوی تکاوە لە غوسڵ

. **ئاوی تکاوە لە غوسڵ**: ئەو ئاوەیە، کەلە غوسڵەوانێك تکاوەتەوە، ڕای شەرعناسان لە پاکێتیی و بەکارهێنانەوەی ئەم ئاوەش وەکو بەکارهێنراوی دەستنوێژ دووپۆلن:

**پۆلی یەکەم: ئەوانەی گوتویانە پاك ماوەو دەشێت بەکار بێتەوە**: ئەمەش ڕای سەیدنا عومەرو، ئەبو هورەیرەو، ئیبنو عەبباس و، ئیبنو عومەرو، سەعدی کوڕی ئەبو وەققاس و، کۆمەڵێك لە شەرعناسانی

سەلەف و، ئەبو عوبەیدو ئیبنولمونزیرو ئەوانەیە، هەروەها مەزهەبی حەنەفی و، مالیكی و شافیعی و، ریوایەتێكی ئیمام ئەحمەده[1]، بەلگەشیان:

١ ـ فەرمودەكەی ئیبنو عەبباسە، خوا لێی ڕازی بێت، كە گوتویەتی: (أنَّ النَّبيَّ صلى الله عليه وسلم كانَ يَغْتَسِلُ بِفَضْلِ مَيمُونَةَ)[2] واتە: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، بەو ئاوەی لە خۆشوشتنی مەیمونەی خێزانی دەمایەوە غوسلی خۆی دەردەكرد.

٢ ـ عائیشەخان خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: (من و پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، لە جەنابەتدا بوین، لە یەك تەشتدا غوسڵمان دەردەكرد..)[3].

٣ ـ ئەو فەرمودەش بەلگەیە، كە ئەبو هورەیرە ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ دەگێڕێتەوە، كە (أنَّ النَّبيَّ صلى الله عليه وسلم لَقِيَهُ فِي بَعْضِ طُرُقِ المدينَةِ وهُو جنبٌ، فانْخَنَسَ مِنهُ، فَذَهَبَ، فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ جَاءَ، فقَالَ: أينَ كُنتَ يا أبا هُريرَةَ ؟ فقالَ: كُنتَ جُنُباً فكَرِهتُ أنْ أُجَالِسَكَ وأنا عَلَى غَيرِ طَهَارَةٍ. فقالَ: سُبْحَانَ اللهِ، إنَّ المؤمِنَ لا يَنْجُسُ)[4] واتە: جارێك لە كۆڵانێكی مەدینەدا، پێغەمبەری بینی صلى الله عليه وسلم، بەڵام لەبەر

---

[1] عبدالرزاق: المصنف (١/١١٠)، ابن ابي شيبة (١/٣٨)، ابن المنذر: الاوسط (١/٢٧٩)، ابوعبيد: الطهور (٢٣٦)، السرخسي: المبسوط (١/٦١)، الشافعي: الأم (١/٨)، ابن قدامة المقدسي: المُغني (١/٢٨٣).

[2] ئەبوداود (٦٨)، ترمزی (٦٥)، شێخی ئەلبانی بە سەحیحی داناوە لە: صحيح الجامع (١٩٢٧).

[3] بوخاری (٢٩٩)، موسلیم (٣٢١).

[4] بوخاری (٨٠)، موسلیم (١١٥)، ئەبوداود (١/٥٢)، نەسائی (١/١٤٥)، ترمزی (١٢١) دەربارەشی دەفەرموێ: (حديث حسن صحيح)، ئیبنو ماجە (٥٣٤)، ومسند أحمد (٢/ ٢٣٥) .

ئەوەی لەشی گران بو (لە جەنابەتدا بو)، نەهاتە خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، پاشان ـ دوای غوسڵ دەرکردن ـ هاتەوە خزمەتی، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لێی پرسی: ئەرێ ئەبو هورەیرە لە کوێ بویت ؟ ئەویش گوتی: لە جەنابەتدا بوم، بۆیە حەزم نەکرد بە لەشی پیسەوە لە خزمەتتدا بم. ئەویش فەرموی: پاك و بێ خەوشی بۆ خوا، موسوڵمان پیس نابێت.

کـە پێغەمبـەر صـلی الله علیـە وسـلم دەفـەرموێ: (موسـوڵمان پـیس نابێت)، کەوا بو ئەو ئاوەش، کـە خـۆی پـێ شوشـتوەو، ئـەوی لـە غوسـڵ و دەسـتنوێژی تکاوەتـەوە، هـەموی هـەر پـاك مـاوەو، بەکارهێنانەوەشـی ئاساییە.

ئیبنولمونزیر دەڵێ: عەلی کوڕی ئـەبو تالیـب و، ئیبنـو عومـەرو، ئـەبو ئومامـەو، عـەتاءو، حەسـەن و، مـەکحول و، نەخـەعی دەڵـێن: هەرکەسـێ مەسحی سەری لە بیر چو، ئەو کاتەی بیری دەکەوێتەوە، دەتوانێت هەر بە تەڕی ریشی ـ ئەگەر پێوەی ما بو ـ دەستی تەڕ کات و، مەسحی سەری پـێ بکات.

ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی، کـە ئـاوی بـەکار هێنـراو، بـەلای ئـەو بەرێزانەوە، پاك و پاکەرەوەیە.. ئیمام مالیك وئیمام شافیعی، خۆیـان ئـەم رایەیان وەرگرتوە، ئیبنو حەزم دەڵێت: سوفیانی سـەوری و، ئـەبو سـەورو، هەمو زاهیریەکانیش، رایان وایە.

**پۆلی دووەم: ئەوانەی گوتویانە پاك نەماوەو ناشێت بەکار بێتەوە:** ئەمە مەزهەبی ئیبنو عومەرو، عبداللەی کوڕی سەرجس و، جوەیرییەی کچی حارسە خوا لێیان ڕازی بێت، هەروەها ڕای حەسەنی

بەسری و، ئەحمەدو ئیسحاق و، شەعبی و ئیمام مالیك و، ئەوزاعی و، شافیعی (لەیەکێك لەقەولەکانیدا)، هەروەها شەرعناسانی مەدرەسەی ڕەئی... داودی زاهیریی و[١]، بەلگەشیان:

١ ـ حەکەمی کوڕی عەمر خوا لێی ڕازی بێت، گێڕایەوە، کە: ((نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَتَوَضَّأَ الرَّجُلُ بِفَضْلِ طَهُورِ الْمَرْأَةِ))[٢]پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەرهەڵستی لەوە کردوە، کە پیاو دەستنوێژ بە ئاوی ماوەی دەستنوێژی ژن بشوات..

٢ ـ فەرمودەکەی لای حەمیدی حیمیەری، کە دەڵێ: ((لَقِيتُ رَجُلًا صَحِبَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَرْبَعَ سِنِينَ كَمَا صَحِبَهُ أَبُو هُرَيْرَةَ قَالَ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ تَغْتَسِلَ الْمَرْأَةُ بِفَضْلِ الرَّجُلِ أَوْ يَغْتَسِلَ الرَّجُلُ بِفَضْلِ الْمَرْأَةِ زَادَ مُسَدَّدٌ وَلْيَغْتَرِفَا جَمِيعًا))[٣] واتە: پیاوێکم بینی، کە چوار ساڵ لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بو، صلی الله علیه وسلم، ئەو گێڕایەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەرهەڵستی کردوە، لەوەی ژن بە ئاوی ماوەی بەر پیاو غوسڵی خۆی دەرکات، هەر وەکو، کە نابێت پیاو بەئاوی ماوەی بەر ژن، غوسڵی خۆی دەرکات، با هەردووکیان هەر لێی هەڵهێنجن..

واتە: لە یەك کاتدا، بۆ نمونە بە جام لە سەتڵێك، یان لە تەشتێکی دەرکەن و، بیکەن بەسەرو لەشی خۆیاندا.

---

[١] الاوسط (٢٩٢/١ )، المغني (٢٨٢/١).

[٢] ئەبو داود (٨٢)، ترمزی (٦٤)، نەسائی (١ / ٧٩) ، ئیبنوماجە (٣٧٣)، ئەحمەد (٦٦/٥) هێناویانەتەوەو ئیبنو حەجەرو شێخی ئەلبانی بە سەحیحیان داناوە بەڵام ئیمامی بوخاری و دارەقوتنی و نەوەوی بە زەعیفیان داناوە..

[٣] ئەبوداود (٨١)، نەسائی (١٣٠/١)، بەیهیقی ١ / ١٩٠). کەمال السەید سالم لە صحیح فقه السنة(١٠٦/١) دا دەفەرموێ: سەنەدەکەی سەحیحە، لە پەڕاوێزی ژمارە ٣٤ دا باس کرا

٣ ـ ئەوەی، كە لە سەیدنا عەلی كوڕی ئەبو تالیبەوە خوا لێی ڕازی بێت گێڕراوەتەوە، كە: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَليهِ وَسَلَّمَ وَأَهْلُهُ يَغْتَسِلُونَ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ، وَلا يَغْتَسِلُ أَحَدُهُمَا بِفَضْلِ صَاحِبِهِ) [١] واتە: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، لەگەڵ خێزانیدا، لە یەك تەشتدا خۆیان دەشوشت، بەڵام هیچیان ئاوی تكاوەی ئەوی تریانی، بەكار نەدەهێنا..

٤ ـ ئەم شەرعناسە بەڕێزانە بەڵگە، بەو فەرمودەش دێننەوە، كە ئەبو هورەیرە، خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، كە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: ((لا يَغْتَسِلُ أَحَدُكُمْ فِي الماءِ الدائِمِ وهُوَ جُنُبٌ)) [٢] واتە: كەستان، كە جەنابەتتان لەسەر بو، خۆ لە ئاوێكی وەستاودا نەشوات، یان ئەوەی، كە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم (نَهَى أنْ تغْتَسِلَ المَرْأةُ بِفَضْلِ الرَّجُلِ والرَّجُلُ بِفَضْلِ المرأةِ)[٣] واتە: بەرهەڵستی لەوە كردوە، كە ژن بە ئاوی بەكارهێنراوی پیاو، بۆ غوسڵ خۆی بشوات و، پیاویش بەو ئاوەی ژنێك، كە بۆ غوسڵ دەركردنی بە كاریهێناوە، خۆی بشوات..

شافیعییەكان دەڵێن: ئەم بەرهەڵستی كردنەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەبەر پیس نەكردنی ئاوەكەیە، كەوا بو ئاوە بەكار هێنراوەكە سیفەتی ئاوی پاكژی نەماوە ..

ئیمام ئەبو حەنیفەو ئەبو یوسف دەڵێن: هەر پیس بوە!

---

[١] ئیبنو ماجە (١٣٣/١)، كەمال السەید سالم لە صحیح فقە السنة (١٠٦/١) دا: زەعیفە.

[٢] موسلیم، شەرحی ئیمامی نەوەوی (٥٧٨/١).

[٣] ئەبو داود ، كەمال السەید سالم لە صحیح فقە السنةدا دەفەرموێ: سەنەدەكەی سەحیحە بڕوانە: العون المعبود (١٤٨/١).

٥ ـ هەروەها ئەو فەرمودەیە دەکەنە بەڵگەی بۆچونی خۆیان، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرمویٚ: (لا يَبُولَنَّ أحَدُكُمْ فِي الماءِ الدَّائِمِ ولا يَغْتَسِلُ فيهِ مِنَ الجَنَابَةِ)[1] واتە: کەستان میز نەکاتە ئاوی وەستاوەوە، کە جەنابەتیشی لەسەر بو، خۆی لە ئاوێکی وەستاودا نەشوات. دەڵێن: ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە ئەو ئاوە بەکارهێنراوەش، وەکو میز پیسییە !

ئەمانی تریش لە وەڵامیاندا گوتویانە: ئەگەر ئەمە وا بوایە! دەبوایە، ئـەو تەشـت و مەنجـەڵ و لەگەنانـەی، کـە دەسـتنوێژیان تێـدا دەگیرێـت، دواتر بشۆرانایەتەوە، یـان ئـەو بـەرگ و پۆشـاکانەی، ئـاوی بـەکارهێـنراوی دەستنوێژو غوسڵیان بەردەکەوت دەبو بشۆرانایەوە !! ئەمـەش کەسـی تـر وای نەفـەرموە، چـونکە ئـەو تەشـت و مەنجەڵانـە بـە کـۆڕای هـەمو شەرعناسـان، پـاکن. سـەنعانی لـە کتـێبی (سـبل السـلام) دا دەڵـێ: دیـارە فەرمودەکە، بەرهەڵستی لە میزکردن و خـۆ شوشـتنەکە پێکـەوەو، لەیـەك کاتـدا، لـە هـەمان ئـاودا دەکـات. واتـە میـز مەکەنـە ئـاوێکی وەسـتاوەوە، پاشانیش خۆتانی تێدا بشۆنەوە. مالیکییـەکان دەڵێن: بـە کار هێنانـەوەی ئاوێك، کە بە کار هاتبێت، مەکروهە[2].. ..

ئەوەی بۆچـونی وردەکـارترو، بەڵگـەی بـەهێزترە، ڕای پـۆلی یەکەمـە، بەڵام زۆر لە شەرعناسان گوتویانە: دەشێت بەڵگەی هەردوولا لێکدرێت و

---

[1] ئەبو داود بەم لەفزە گێڕاوێتیەوە، ئەسڵەکەشی لە صَحیحَین دایە، بڕوانە العون المعبود (١٣٣/١) بۆ ڕای حەنەفیەکانیش بڕوانە فتح القدیر (٨٧/١).

[2] ابن رشد: بداية المجتهد ٣٧/١

بوترێـت[١]: لـە لایـەنی ئیحتیاتـەوە، باشـتر وایـە ئـاوی بەکارنـەهێنراو، بـۆ دەستنوێژو غوسڵ بەکار بهێنرێت، ئەگینا بەڵگەیەکی بەهێز لەسـەر ئـەوە نیە، کە ئاوی تکاوە لە دەستنوێژو غوسڵ پیس بوبێت.. والله اعلم[٢].

★ ★ ★

## بەرمــاوە (السؤر)

بەرماوە: ئەو ئاوەیە، کـە لـە پـاش خواردنـەوە لێـی ماوەتـەوە، ئـەمیش چەندین جۆرە:

**١. بەرماوەی مرۆڤ:** مرۆڤەکە موسـوڵمان بێـت، یـان کـافر، ژن بێـت، یان پیاو، پاك بێت، یان لە حەیزو نیفاسدا بێت. بـە دەسـتنوێژ بێـت، یـان لەش پیس، بەرماوەکەی هـەر پاکە. ئـەوەش، کـە خـوای گـەورە دەربـارەی کـافران دەفـەرموێ، کـە پیسـن: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُشۡرِكُونَ نَجَسٞ﴾ التوبـە/ ٢٨ ئـەوە پیسی واتاییە (معنوی) واتە بـاوەڕو عەقیـدەیان نـاڕەوایـەو، زۆر لـە پیسـی نایان گێڕێتەوە، دەنا مەبەست لەوە نییە، کە خۆیان ولاشەیان پیس بێت. خـۆ موسـوڵمانان بـە درێـژایی مێـژوی خۆیـان، هـەر تێکـەڵاویان لەگـەڵ کافراندا هەبوە، بـەردەوام وەفـدیان دەهاتـە لای موسـوڵمانان، تەنانـەت بـۆ

---

[١] ابن حجر العسقلاني: فتح الباري (٣٠٠/١)، الصنعاني: سبل السلام (٢٨/١)، الشوكاني: نيل الاوطار (٣٦/١)..

[٢] بۆ تەفسیلی زیاتر دەتوانرێت جگە لەو سەرچاوانەی ناوبراون، تەماشای ئەم سەرچاوانە بکرێت: ابن عبدالبر: الاستذكار (٢٥٣/١)، ابن عبدالبر: التمهيد (٤٣/٤)، ابن قدامة: المغني (١٩/١)، ابن المنذر: الاوسط (٢٨٥/١).

خزمـەت پێغەمبـەر صـلی الله علیـه وسـلم، دەهاتنـە نـاو مزگەوتەكەشـی! هەرگیز نەشی فەرموە: ئەو شتانە بشۆنەوە، كە ئەوان بەری كەوتون، یـان بەكاریان هێناوە[1]. بەڵگەش زۆرە:

- بۆ نمونە: ئـەو فـەرمودەی لای ئەنـەس، خـوا لێـی ڕازی بێـت، كـە دەڵێ: (كُنّا نَغْزو مَعَ رسُولِ اللهِ فَنصِيبَ مِنْ آنيَـةِ المشـركينَ وأسْقِيَتِهِمْ فَنَسْتَمْتِعَ بهَا ولا يَعِيبُ ذلك عَليهم)[2] واتە: لە خزمەت پێغەمبەردا صلی الله علیـه وسـلم غـەزامان دەكـرد، كـە قـاپ و قاچـاخ و دەفـرو كـەل و پەلەكانیانمان دەست دەكەوت و، بـەكارمان دەهێنایـەوە، هـیچ عەیبـەی لێ نەدەگرتن.

- هەروەها عائیشە ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ دەیگوت: (كُنْـتُ أشْـرَبُ وأنَـا حَائِضٌ، فأُنَاوِلُه النبيَّ صلى الله عليه وسلم فَيَضَعَ فَـاهُ عَلَـى مَوضِعِ فِـيَّ)[3] واتە: لە حەیزدا بوم، كە ئاوم لە دەفرێكدا دەخواردەوە، دوایی دەمدایە دەســت پێغەمبــەر صــلی الله علیــه وســلم، ئــەویش لــەو شــوێنەوە دەیخواردەوە كـە مـن لێـوەی خواردبومـەوە، دەمـی دەنـا بـە جـێ دەمـی منەوە.

ئەوەش، كە هەندێك لە شەرعناسانی مالیكی گوتویانە: كە ناشێت هیچ شـتێكی كـافرو موشـریك بـە كـار بهێنرێتـەوە، لەبـەر ئـەوەی پیسـن و، پیسییەكەیان پیسـی عەینییـە، بەڵگەكـەیان بـە هێـز نییـە، ئـەوان كـە

---

[1] فقه السنة (٢٠/١)، نيل الاوطار (٣١/١ و ٨٨)، ابن الجزي: قوانين الاحكام (ل ٤٥).

[2] ئیمامی ئەحمەدو ئەبو داود، بە سەنەدی سەحیحیەوە گێڕاویانەتەوەو، ئەلبانیش دەڵێ سەحیحە (ارواء الغليل ٧٦/١).

[3] موسلیم (٢١٠/٣) ئەحمەد (٢١٠/٦) البغوى: شرح السنه (١٣٤/٢) لەگەڵ كەمێك جیاوازی لەفزەكانیاندا ..

دەڵێن: لەبـەر ئەوەمانـە، کـە خـوای گـەورە فەرمویـەتی: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُشۡرِكُونَ نَجَسٌ﴾ التوبـة/ ٢٨ واتـە: کافرەکـان پیسـن، هـەروەها لەبـەر فەرمودەکـەی بوخاری و موسلیم، کە لە ئەبو سەعلەبەی خوشەنی (ابـو ثعلبـة الخُشَني) دەگێڕنەوە، کە دەڵێ: (قُلتُ يا رسولَ اللهِ إنّا بـأرضِ قـومٍ أهْلِ كتـابٍ أفنأكُلُ في آنِيَتهمْ ؟ فقَالَ النبيُّ صلى الله عليه وآله وسلم: لا تأكلوا فيها إلا أنْ تجدُوا غَيرَهَا فاغْسِلُوها وكُلُوا فيها)[١] واتـە: وتم: ئـەی پێغەمبـەر خـوا، ئێمـە لـە ناوچەیەکین کە هی ئەهلی کیتابە (مەسیحی و جولەکەو ئەوانـە) ئایا لـە قاپ و دەفری ئەواندا بخۆین ؟ فەرموی: نەخێر، هی تر بدۆزنەوە، ئەگەر نا، ئەوە بیشۆن، ئینجا تێیدا بخۆن. بەڵام جمهور، کە وەڵامیان داونەتەوە، گوتویانە: کافر پیسیی عـەینی نییـە، بـەڵکو لـە ڕوی مەعنەویـەوە، خـوای گەورە بە پیس دایناوە، ئەمـەش کـۆڕا (ئیجمـاع)ی شەرعناسـانی لەسـەرە. فەرمودەکەش بەڵگەی ئەوەی تێدا نییە، چونکە ئاشکرایە، کە ئـەو ئـەهلی کیتابانـە، گۆشـتی بـەرازو شـەرابیان، لـەو قـاپ و دەفرانەیانـدا خـواردوە، ئاسەواری ئەو خۆراکە بە قاپەکانەوە ماوە.

٢ـ بـەرماوەی ئەوانـەی گۆشـتیان دەخورێـت: ئـەمیش پاکـە، چـونکە لیکەکـەی هـەر لـە جێ و ڕێـی پاکـەوە هـاتوە، ئـەمیش حـوکمی پاکیەکەی ئەوێی وەرگرتوە. ئیبنول مونزیر دەڵێ: ڕای شەرعناسان لەسەر ئەوە کۆیە، کە بەرماوەی هەمو گیان لەبەرێك، کە گۆشـتی بخورێـت پاکـە، دەشـێت بخورێتـەوەو دەستنوێژیشـی پـێ بگیرێـت. بـەڵام حەنـەفی و حەنبەلییەکان دەڵێن: هەر گیانلەبـەرێك، گۆشـتی نـەخورێت بەرماوەکـەی

---

[١] بوخاری (٥١٦١)، موسلیم (١٩٣٠).

پیسە، جگە لە پشیلەو ئەوی وەکو ئەوە[١]. مالیکی و زاهیرییەکانیش دەڵێن: بەرماوەی هەموو گیانلەبەرێك پاك و پاكەرەوەشە[٢]. وا پێدەچێت ئەم بۆچونە بەهێزتر بێت، لەبەر بەڵگەی فەرمودەی ئەستێڵکەکە، کە لای ئیبنوعومەرە خوا لێیان ڕازی بێت. لەبڕگەی داهاتودا هاتوە.

## ٣. بەرماوەی ئێسترو گوێ درێژو دڕندەو باڵندەی گۆشت خۆر:

ئەمەش پاکە، چونکە ـ جابری کوڕی عبدالله ـ خوا لێیان ڕازی بێت ـ گێڕاوێتیەوە، کە لە پێغەمبەری نازداریان صلى الله عليه وسلم پرسی: (أَنَتَوَضَّأُ بِمَا أَفْضَلَتِ الحُمُرُ؟ قَالَ: نَعَم وبما أفضَلَتِ السِّبَاعُ كُلُّهَا)[٣] واتە: ئایا بە بەرماوەی گوێ درێژ، دەستنوێژ بشۆین ؟فەرموی: بەڵێ بە بەرماوەی هەموو ئاژەڵانی تریش.

ـ ئیبنو عومەر ـ خوا لێیان ڕازی بێت ـ دەڵێێ: (خَرَجَ رسولُ اللّهِ صلى الله عليه وسلم في بَعْضِ أَسْفَارِهِ لَيلاً، فَمَرُّوا عَلَى رَجُلٍ جَالِسٍ عِنْدَ مُقْرَاةٍ لَهُ فقالَ عُمرُ - رضي الله عنه -: أَوَلَغَتْ السِّبَاعُ عليك الليلةَ في مقراتِكَ ؟ فقالَ لَهُ النبيُّ صلى الله عليه وسلم: يا صاحبَ المقراةِ، لا تخبرْهُ، هذا مُتَكَلِّفٌ ؛ لَهَا مَا حَمَلَتْ في بطونها ولنَا مَا بَقِيَ شَرابٌ وَطهورٌ)[٤] واتە: شەوێك

---

[١] المجموع / النوي ٢٢٨/١

[٢] ابن الجزي: قوانين الاحكام: ل ٤٥

[٣] مەسنەدی ئیمامی شافیعی (ل ٨)، دارەقوتنی (٦٢/١ ژمارە ٢٠٠)، بەیهیقی: السنن الكبرى (٢٤٩/١) ئیمامی بەیهیقی دەربارەی حەدیسەکە گوتویەتی: ئەم حەدیسە چەندین سەنەدی تری هەیە، ئەگەر هەموو لێکدرێن حەدیسەکە بەهێز دەکات، بەڵام شێخی ئەلبانی بە زەعیفی داناوە بڕوانە: تمام المنة (٤٧).

[٤] الدارقطني: كتاب الطهارة، باب حكم الماء إذا لاقته النجاسة (١ / ٢٦) ژمارە (٣٠) زۆر لە ئیمامانی کۆن و نوێ فەرمویانە کە حەدیسەکە زەعیفە، لەوانە: ئیبنو حەجەر لە کتێبی التلخيص و شێخی ئەلبانی لە: تمام المنة (٤٨).

پێغەمبـەر صـلی الله علیـه وسـلم، کـه لـه سـەفەرێکی شـەویدا بـو، بـەلای کابرایەکدا تێپەڕین لای ئەستێڵکێکەوە (حەوزی ئاوە) دانیشتبو: عومەری کـوڕی خـەتتاب لێـی پرسـی: ئـەرێ ئەمشـەو دڕنـدە لـە ئەسـتێڵکەکەتیان نەخواردۆتەوە ؟ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم یەکسەر فـەرموی: کاکـەی خاوەئەسـتێڵك پێـی مـەڵێ، ئەمـە لەسـەر خـۆی زیـاد دەکـات، ئـەوی لێـی خواردۆتەوە بەشی خۆی لە گەدەی خۆیدا هەڵگرتوەو، ئەوی ماویشـەتەوە، هی ئێمەیەو بۆ خواردنەوەشەو، پاکیشە

هەروەها یەحیای کوڕی سـەعید دەڵـێ: (أنَّ عُمَـرَ خَـرَجَ فِي رَكْـبٍ فِـيهِمْ عَمْرُو بْنُ العاصِ، حَتّى وَرَدُوا حَوْضاً، فَقَالَ عَمرُو: يـا صـاحِبَ الحـوضِ، هَـلْ تـرِدُ حَوضَكَ السِّبَاع ؟ فقالَ عُمَرُ: لا تخْبِرْنـا، فإنّـا نَـرِدُ عَلَـى السِّباعِ، وتَـرِدُ عَلَينـا)[1] واتـە: جارێـك عومـەری کـوڕی خـەتتاب، لەگـەڵ کۆمەڵێکـدا لـە سەفەردا بو، عەمری کوڕی عاسیشیان لەگەڵدا بـو، گەیشـتنە حـەوزێکی ئاو، عەمر لـە خـاوەن حەوزەکـەی پرسـی: ئـەرێ دڕنـدە نایەنـە سـەر ئـەم حەوزەی تۆ ؟ عومەر خێرا گوتی: پێمان مەڵێ، ئێمەو دڕندە تێکەڵاویمان هەیە، ئەوان دێنە لامان و، ئێمەش دەچینە لایان..

**٤. بەرماوەی پشیلە:** ئەمیش هەر پاکە، چونکە پشیلە خۆی پاکەو، بـەوەش پـیس نابێـت، کـە دەم لـە پیسـیەوە بـدات، (مشـکیش هـەر ئـەو حوکمـەی هەیـە)، لەبـەر ئـەو فـەرمودەی، کـە کەبشـەی کچـی کـەعب گێڕاوێتیەوە، کە دەڵێ: (أنَّ أبَا قَتادَةَ دَخَلَ عليها فَسَكَبَتْ لَهُ وَضُوءاً، فَجَاءَتْ

---

[1] موطأ مالك: كتاب الطهارة باب الطهور للوضوء، حەدیسی ژمارە (١٤)، (١/٢٣و٢٤) و البيهقي لە: السنن الكبرى (١ / ٢٥٠) والدارقطني لە (سننه ١/٢٢) بەڵام شێخی ئەلبانی ڕەحمەتی بە زەعیفی داناوە بڕوانە: تمام المنة (٤٨)..

هِرَّةٌ تشْرَبُ مِنهُ، فأَصْغَى لهَا الإنـاءَ، حتَّـى شَـرِبَتْ مِنـهُ، قالَـتْ كَبْشَـةُ: فرَآنـي أَنْظُرُ، فقَالَ: أتعْجَبِينَ يا ابْنَةَ أخِي ؟ فقُلْتُ: نَعَـمْ، فقَـالَ: إنَّ رسـولَ اللهِ صلَّى الله عليـه وسـلمَ قـالَ: إنَّهَـا لَيسَـتْ بِـنجَسٍ، إنمَّـا هِـيَ مِـنْ الطَّـوَّافِينَ علَـيكُمْ والطَّوَّافاتِ)[1]واته: ئەبو قەتادە هاتۆتەوە ماڵی و، ئەمیش ئاوی بۆ تێکـردوە، پشیلەیەكیش لەو كاتەدا هاتوەو لە ئاوەكەی خواردۆتـەوە، ئـەبو قـەتادەش قاپەكەی بـۆ لار كردۆتـەوە، تـا زیـاتر بخواتـەوە. كەبشـە دەڵـێ: بینیمـی وا سەیری دەكەم، وتی: كچی بـرام دیـارە پێـت سـەیرە؟! وتـی: بـەڵێ، گوتی: ئاخر پێغەمبەر صلی الله علیـه وسـلم فەرمویـەتی، كـە پشـیلە پـیس نـین، ئەمانە لەوانەن، كە بەردەوام لە ماڵانماندا دێن و دەڕۆن.

**٥. بەرماوەی سەگ و بەراز:** پیسن، نابێت توخنیان بكەون. بـەراز لە هەمو رویەكەوە پیسەو گڵاوە. سـەگیش گڵاوە، چونكە لـە فـەرمودەی بوخــاری و موســلیمدایە، كــە ئــەبو هــورەیرە، خــوا لێــی ڕازی بێــت دەگێڕێتـەوە، كـە پێغەمبـەر صـلی الله علیـه وسـلم فەرمویـەتی: (إذا شَـرِبَ الكَلْبُ فِي إناءِ أحَدِكُمْ فَلْيَغْسِلْهُ سَبْعاً)[2] واتە: ئەگەر سـەگ دەمـی نایـە قـاپی كەسێكتانەوە، با حەوت جار بیشوات. لە ڕیوایەتێكی تری ئیمام ئەحمـەدو موسلیمدا دەفـەرموێ: (طَهورُ إنـاءِ أحَـدِكُمْ، إذا وَلَـغَ فيـهِ الكَلْـبُ، أنْ يَغْسِلَهُ

---

[1] ئــەبوداود (١٨/١)، نەســائی (٥٥/١)، ترمــزی (١٥٣/١ ژمــارە ٩٢) دەربارەشــی فەرمویــەتی حەسەن سەحیحە و بوخاریش بە سەحیحی داناوە، ئیبنوماجە (١٣١/١)، ئیمامی ئەحمەد لە مەسنەدەكەی خۆی (٢٩٦/٥ و ٣٠٣ و ٣٠٩).. شێخی گەورەش ئەلبانی رەحمەتی بە سەحیحی داناوە بڕوانـە: صـحيح النسـائي (١ / ١٦، ٧٣) وصـحيح ابـن ماجـه (٣٦٧) وإرواء الغليـل(١٧٣) وصحيح الجامع (٢٤٣٧).

[2] بوخاری (٥٤/١)، موسلیم (١٨٢/٣) نەسائی (٥٢/١) مەسنەدی ئەحمەد (٤٦٠/٢) سونەنی بەیهیقی (٢٤٠/١ و ٢٥٦)

سَبْعَ مَرَّاتٍ، أُولاهُنَّ بِالتُّرَابِ)[١] واتە: ئەگـەر سـەگێك دەمـی خسـتە نـاو دەفـر (قاپ) ی یەكێتانەوە، با حەوت جار بیشـواتەوەو، یەكەمجارەكـەیان، بـا بـە گڵ بێت.

بـۆ ئـەم زەمانـەی ئێمـەو، لـە هەنـدێ وڵات و ناوچـەی وەكـو شـارە سەرەكییەكانی ڕۆژئاوا، موسوڵمان زۆر زەحمەتە گڵی دەست كـەوێت، بۆیـە دەتوانێـت بـە سابون بیشـواتەوە، ئومێـد هەیـە، حـوكمی گڵاویەكـەی پـێ لاچێت، ئەمەش مەزهەبی مالیكیە.

★ ★ ★

[١] موسلیم(٢٣٤/١ ژمارە ٩١)، ئەبوداود (١٧/١) ئەحمەد (٤٢٧/٢) بەیهیقی (٢٤٠/١).

# باسی دووەم

# جۆرەكان و ئەحكامی پیـــسیی

- جۆرەكانی پیسی.
- توێژینەوەی پاكێتی مەنی.
- شلەو شێی عەورەتی ئافرەت.
- پاكی شەڕاب.
- حوكمی خوێن.
- ڕشانەوە.
- فەرمودەی مێشەكە.

## باسی دووەم

# پیســـــی

**پاكژیی بەرجەستە (حەقیقی):** بریتیە لە پاك ڕاگرتنی جەستەو، پۆشاك و، جێگا، لەوانەی بە پێناسەی شەرع پیسن، ئەو شتانەی، كە ئەگەر موسوڵمان بەشێكی لێیان بەركەوت، دەبێت ڕایدات و بیشوات، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ﴾ المدثر/٤ واتە پۆشاكت پاكەرەوە، هەروەها: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلۡمُتَطَهِّرِينَ﴾ البقرە/٢٢٢ واتە خوای گەورە، تۆبەكاران و پاكژەوانانی خۆش دەوێت.. پێغەمبەری خواش صلى الله عليه وسلم، دەفەرموێ: (الطُهورُ شَطرُ الإيمانِ)[١] واتە: پاكژیی نیوەی باوەڕە. ئەمەش چەندین جۆرە:

### جۆرەكانی پیسیی

ئەو شتانەی، كە بەڵگەی شەرعی، بە پیسی داناون ئەمانەن:

**١ و ٢ . پیسایی و میزی مرۆڤ:** بە كۆڕای شەرعناسانی ئیسلام، هەردووكیان پیسن:

**پیسایی:** لەبەر ئەوەیە، كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: (إذا وطئَ أحدُكم بنعلِهِ الأذى فإنَّ التُرابَ لَهُ طَهورٌ)[٢] واتە:

---

[١] موسلیم (٢٠٣/١ ژمارە ١)، ترمزی (٣٥١٧)، الدارمی (٦٥٩)، مەسنەدی ئەحمەد (٢٥٠/٤ و ٣٤٢/٥)..

[٢] ئەبو داود بە ژمارەی ٣٨٥، هەروەها ئیبنو حیببان بە سەحیحیان داناوە، ئەلبانی ڕەحمەتیش لە سەحیحی سونەنی ئەبوداود ژمارە(٨٣٤) لە ڕیزی سەحیحدا هێناوێتیەوە.

ئەگەر یەكێكتان بـە نەعلەكـەی، پێـی بـە پیساییەكدا نـا، بـا بزانێت، كـە خۆڵ پاكی دەكاتەوە.. واتـە بـە خـۆڵ پاككردنەوەكـەی بەسـە، بـۆ حـوكمی پاكژێتی. بەڵگەی تریش زۆرن، وەكو ئەو فەرمودانەی، فـەرمان بـە تـارەت گـرتن و، خۆپاككردنـەوەی دوای دەس بـەئاو گەیانـدن دەكـەن، كـە دواتـر باسیان دەكەین، إن شاء الله..

**میز: پیسە،** بە بەڵگەی ئـەو فـەرمودەی، لای سـەیدنا ئەنەسـە، خـوا لێی ڕازی بێت، كە دەڵێ: (أنَّ أعْرَابِيًّا بَالَ فِي الْمَسْجِدِ فَقَامَ إِلَيْهِ بَعْضُ الْقَوْمِ ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ: " دَعُوهُ، لا تُزْرِمُـوهُ ". قَـالَ: فَلَمَّا فَرَغَ دَعَا بِدَلْوٍ مِنْ مَاءٍ فَصَبَّهُ عَلَيْهِ) [١] واتە: دەشتەكیەك هاتە ناو مزگـەوت و، میـزی كـرد، كۆمەڵـە كەسـێك پـەلاماریان دا نـەهێڵن، بـەڵام پێغەمبـەر صلی الله علیه وسلم فەرموی: لێی گەڕێن، مەیشڵەژێنن (تا میزكردنەكـەی پـێ نـەبڕن)، كـە تـەواو بـو، پێغەمبـەر صـلی الله علیـە وسـلم فەرمانیـدا، دۆلكەیەك ئاویان هێناو، كردی بە شوێن میزەكەیدا.

**٣ ـ مەزی:** مەزی كە شلەمەنیەكی لینجەو ڕەنگ ئاوییە لە هۆرمـۆنی كۆپەرز دروست دەبێت، لە كاتی دەستبازی، یان بـیر كردنـەوە لـە جوتبـون (جیماع)، لە عەورەت دێتە دەرەوە، بە ژن و پیاودا دێـت، بـەڵام لـە ژنانـدا زۆرترو ڕونترە[٢]هیچ لەزەتێكی پێوە نیەو، بە شـێوەی هـەڵقوڵانیش نایـەت و، خاوبونـەوەی لەشیشـی بـە دودا نایـەت، ئەمـە بـە كـۆڕای شەرعناسـان

---

[١] متفق علیه: بوخاری (٦٠٢٥)، موسلیم (٢٨٤).

[٢] فتح الباري ٣٧٩/١ و شرح مسلم (٥٩٩/١ و ٢١٣/٣).

پیسە[١] بۆیە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمانی داوە، بە شوشتنەوەی عەورەت لێی.

- کە پرسیاریان لێ کردوە، فەرمویەتی: (يَغسِلُ ذكَرَهُ وَيَتوَضَّأ)[٢] واتە: زەکەری دەشواتەوەو دەستنوێژ دەگرێت..

- هەروەها ریوایەتەکەی سەیدنا عەلی کوڕی ئەبو تالیب - ڕوگەش بێت - گوتی: بە میقدادی کوڕی ئەسوەدم وت، دەربارەی مەزی، بۆم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بپرسێت، (عَنِ الْمِقْدَادِ بْنِ الْأَسْوَدِ: أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ أَمَرَ أَنْ يَسْأَلَ لَهُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ أَحَدِنَا يَخْرُجُ مِنْهُ الْمَذْيُ مَاذَا عَلَيْهِ ؟ فَإِنَّ عِنْدِي ابْنَتَهُ وَأَنَا اسْتَحْيِي أَنْ أَسْأَلَهُ، قَالَ الْمِقْدَادُ: فَسَأَلْتُهُ فَقَالَ: إِذَا وَجَدَ أَحَدُكُمْ ذَلِكَ فَلْيَغْسِلْ فَرْجَهُ وَلْيَتَوَضَّأْ وُضُوءَهُ لِلصَّلَاةِ )[٣] واتە: زۆرم مەزی لێ دەهات، شەرمیشم دەکرد لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بپرسم (چونکە کچەکەی خۆی خێزانمە) بۆیە بە میقدادی کوڕی ئەسوەدم وت، لێی بپرسێت، کە لێی پرسی، وەڵامی دایەوە فەرموی: زەکەری دەشواتەوەو دەستنوێژ دەگرێت وەکو کە بۆ نوێژ دەستنوێژ دەگرێت..

**٤- وەدی:** ئەمیان ئاوێکی خەستی لینجە، دوای میز کردن دێتە دەرەوە، ئەمیش بە کۆڕای شەرعناسان پیسە.. ئیبنو عەبباس، خوا لێیان

---

[١] النوي: المجموع (٦/٢)، ابن قدامة: المغني (١٦٨/١).

[٢] بوخاری (٢٦٩)، موسلیم (٣٠٣)، نەسائی (١٥٢)، ئەحمەد (١٣٥/١)

[٣] بوخاری (٢٦٩)، نەسائی (١٥٢)، ئەحمەد (١٣٥/١) بەیهیقی (١١٥/١)، شێخی ئەلبانی لە صحيح أبي داود (١٩٠) دا دەڵێ: سەحیحە..

ڕازی بێت، گوتی: غوسڵ دەرکردن، لە هاتنە دەرەوەی مەنیە، ئـەمما وەدی ومەزی، زەکەریان لێ بشۆرەوەو، دەستنوێژت وەکو بۆ نوێژ بگرە[١]..

**٥ . خوێنی حەیز (عادەی مانگانەی ژنان):** ئەمیش پیسەو بێ نوێژییە، چونکە ئەسمائی کچی ئەبوبەکری سددیق، خوا لێیان ڕازی بێت، گوتی: (جاءَتْ امْرَأَةٌ إلى النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم فقالَتْ: إحدانا يُصيبُ ثوبُها مِنْ دَمِ الحَيضِ كيفَ تصنَعُ بِهِ ؟ فقال: (تحُتُّهُ ثُمَّ تقْرِضُهُ بالماءِ، ثُمَّ تنْضِحُهُ ثمَّ تصَلِّي فِيهِ)[٢] واتە: ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبەر صلى الله عليه وسلمو لێی پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا، جاری وا هەیە یەكێكمان، خوێنی حەیز بەر پۆشاكەكانی دەكەوێت، چی بكات ؟ فەرموی: لایدە، پاشان لەگەڵ ئاو پێدا كردنیدا دەستی لێ بخشێنێە (هەڵیگلۆفە)، پاشان ئاوی تری پێدا بپرژێنە، ئینجا نوێژی پێوە بكە..

**٦. تەرسی ئەو ئاژەڵانەی گۆشتیان ناخورێت:** ئیبنو مەسعود خوا لێی ڕازی بێت فەرموی: (أتى النَّبيُّ صلى الله عليه وسلم الغائِطَ، فأَمَرَنِي أنْ آتِيهِ بثَلَاثَةِ أحْجَارٍ، فوَجَدْتُ حَجَرَيْنِ والْتمَسْتُ الثالِثَ فلَمْ أجِدْهُ، فأَخَذْتُ رَوْثةً فأَتيتهُ بهَا، فأَخَذَ الحَجَرَيْنِ وألْقَى الرَّوْثةَ، وَقَالَ: هذا رِكْسٌ)[٣] واتە: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ویستی دەست بە ئاو بگەیێنێت، فەرموی: سێ بەردوچكەم بۆ بێنە، منیش دوو بەردوچكەو، تەرسێكی

---

[١] سنن البيهقي (١/١١٥) ئەلبانی لە سەحیحی سنن ابی داود ژمارە (١٩٠) و لە بەیهیقی (١/١١٥) بە سەحیحی داناوە..

[٢] متفق عليه: بوخاری (٢٢٧)، موسلیم (٢٩١).

[٣] ـ بوخاری (١٥٦)، ترمزی (١٧)، نەسائی (٤٢)، ئیبنو خوزەیمە، زیادەی باسی گوێژدرێژەكە لای ئەمە، ئەلبانیش لە سەحیحی ئیبنو ماجە (٢٥٣) وسەحیحی ئیبنو خوزەیمە (١/٣٩ و١/٧٠) بە سەحیحی ناساندوە..

گوێدرێژ (پیسایی گوێدرێژە، کە وشك بوبێتەوە)م بۆ هێنا، دوو بەردەکەی وەرگـرتو، تەرسـەکەی فڕێـدا فـەرموی: ئـەویان پیسـە. کـەوابو ئەمـە بەلگەیە لەسەر ئەوەی، کە تەرسی هـەمو ئاژەلێـك، کـە گۆشـتی نـەخورێت پیسە..

**٧ . لیکی سەگ:** هەر چەندە لە شوێنی تـردا باسمان کـردوە، بـەلام لێرەدا مەبەست ڕیزبەندییەتی، لەگەلٚ ئەوانی تردا، لیکی سـەگ بێگومـان پیسە، چونکە پێغەمبـەر، صلی الله علیـه وسـلم، فەرمویـەتی: (طَهورُ إنـاءِ أحَـدِكُمْ إذَا وَلَـغَ فيـه الْكَلـبُ أنْ يَغْسِلَهُ سَبْعَ مَـرَّاتٍ أُولاهُـنَّ بـالتُرَابِ)[١] واتـە: ئەگەر سەگێك دەمی خستە ناو دەفر (قاپ)ی یەکێکتانەوە، با حەوت جار بیشواتەوە، یەکەمجارەکەیان، با بە گلٚ بێت.

**٨ . گـلاوی سـەگ:** یـەکێك لـە کێشـەی ئـەو موسـولٚمانانەی لەگـەلٚ ڕۆژئاواییەکان و هاونەریتیاندا دەژین، کێشەی سەگەکانیانە، ئەوان، کە بە سـابون و شـامپۆ دەیانشـۆن و، وەك منـدالێك بایـەخی پـێ دەدەن، زۆر نارەحەت دەبن لە هاوڕێ و دراوسێ موسولٚمانەکانیان، کە هەر بە گلاویـان دەزانـن !! بێگومـان ئـەوان سـەیری ئـەوە ناکـەن، کـە ئێمـەی موسـولٚمان، سـەیری حوکمـە شـەرعیەکە دەکـەین، بـەلام لـە هـەمان کاتیشـدا بـۆ موسولٚمانانی ئەو کۆمەلگانەش، هەر کێشەیە، چونکە جاری وا هەیـە، لـە پاسدا، لە شەمەندەفەردا، کەسانێك سوار دەبـن، سـەگیان پێیـەو، جـاری وا هەیە لە تەنیشت کابرای موسلمانەوە، جێیـان بـۆی دەست دەکـەوێت، لـەم جـێ و ڕێیانـەدا موسـولٚمان بـۆی هەیـە، ئەوەنـدە سـلٚ نەکاتـەوە، چـونکە جـاری وا هەیـە سـەگەکان (بـە تایبـەتی هـی پـۆلیس) ڕاهێنـراون لەسـەر

---

[١] موسلیم (١/٢٣٤ ژمارە ٩١ و ٢٧٩) ئەلبانی لە صحیح الجامع الصغیر ژمارە (٣٩٣٣)..

پەلاماردانی ئەو کەسەی، کـە سلّیان زۆر لـێ دەکاتـەوەو، لێیـان دەترسـێت، بۆیە، ئەگەر سەگێك بـەر موسـوڵمانێك کـەوت (لەشـیان)، مـادام هـەر دولا وشك بن، گلاو نابێت، لەوەش دڵنیا بە، کە زۆرجار سەگ دەمیت لێ نزیك دەکاتەوە، بەڵام هەر بۆنت دەکات، بۆیە ئەگەر زانیت لوتی تەڕ نەبوە، یان لیکیت بەر نەکەوتوە، مەکەوە وەسوەسەوەو، هـەر وا حسـێب بکـەیت گلاو بویت، ئەگەر سەگەکە، یان موسوڵمانەکە تەڕ بـو، گلاو دەبێـت، بێگومـان، ئەگەر لیکی، یان میزو پیسایی سـەگ بـەر موسـوڵمان بکـەوێت، مەعلومـە، کە گلاو دەبێـت. بـە دەردی کـورد دەڵـێ: (( بـۆ بیسـمیل کردنیشـی، (واتـە گلاو دەرکردنی) دەبێت حەوت جار بیشوێیت))، گـەر گڵت دەست کـەوت، ئەوە یەکەمین جاریان بە قوڕاوەکـەی، ئـەمما ئەگـەر گڵ و خۆڵـت دەسـت نەدەکەوت، وەکو ئەوانەی لە شارە سەرەکیەکان دەژیـن، یەکەمجارەکـەیان ـ لەســەر مەزهــەبی مــالیکی ـ بــە ســابون بیشــۆ، ئومێــدە ان شــاء اللــە گلاوییەکەی دەرچو بێت. فەتوای ئەنجومەنی ئیسلامی ئەورووپاش، (کـە۳۲ شەرعناسن) لەسەر ئەوەیە.

٩ ـ **گۆشـتی بـەراز:** ئەمـەش بـە کۆڕای شەرعناسـان پیسـە. چـونکە ئایــەتی راشــکاو دەربــارەی دەفــەرموێ: ﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُۥ رِجْسٌ ﴾ الانعام/١٤٥ واتە: بلێ: من لەوەدا، کە وەحیم بـۆ هـاتوە، خواردنێـك نـابینم کە حەرام کرابێت، مەگەر ئەوەی، کە مردارەوەبـو بێـت، هـەروەها خـوێنی ڕژاو گۆشـتی بـەراز، چـونکە ئەمانـە پیسـن.. جێـی خەمـە، کـە دەبینیـت موسوڵمان لە چێشتخانەیەکی بەراز فرۆشیدا کار دەکـات و، ڕۆژانـە دەسـت

لـە گۆشـتەكە دەدات بـێ ئـەوەی ئـەم بەربەسـتە دەرونیـەی لا مابێـت ! بێگومان ئەوە كارێكە هەم حەرامەو، هەم پیسە..

**١٠ـ مردارەوەبـو:** ئـەو گیانلەبەرانـەن، كـە هـەر لـە خـۆوە مـردار بونەتەوەو، سەرنەبڕراون، ئەمیش هەر پیسە بە بەڵگەی ئایەتەكەی پێشو (الانعـام/١٤٥) و ئـەو فـەرمودەی پێغەمبـەر صـلى الله عليـه وسـلم، كـە دەفەرموێ: (إذا دُبغَ الإهابُ فَقَدْ طَهُرَ)[1] واتە: ئەگەر پێستە خۆش كرا، ئەوە بێگومان پاك بۆتەوە، كەوابو پێستەی مردارەوە بـو، پـێش خـۆش كردنـی پیسە.

ئەم حوكمەی مردارەوە بو ئەمانەی خوارەوە ناگرێتەوە:

**ا . مردارەوەبوی دەریا:** ماسی بێت، یان گیانلەبەری دیكـە. چـونكە پێغەمبەر صلى الله عليـه وسـلم فـەرموی: (أُحِـلَّ لَنـا ميتتـانِ ودَمـانِ ؛ أمَّـا الميتتــانِ فــالحوتُ والجَــرَادُ، وأمَّــا الــدَّمَانِ فالكَبَــدُ والطِّحَــالُ)[2] واتــە: دوومـردارەوەبـو و، دووخوێنمـان بـۆ حـەڵاڵ كـراوە، دوو مردارەوەبوەكـە، ماسی و كوللەن، دوو خوێنەكەش، جگەرو سپڵن..

**ب . كولله:** پاكەو خواردنیشی جائیزە، بە پێی ئەو فەرمودەی پێشو.

**ج . مردارەوەبوی ئەو حەشـەراتانەی خوێنی شـلەیان تێـدا نیـە:** ئەمـە بـە پێناسـەی شەرعناسـانی پێشـینە، ئـەگینا خوێنیشـیان تێدایەو، شلەشە، بەڵام لـە جێـی هیمۆگلۆبین، كـە خوێنەكـە سـور دەكـات،

---

[1] موسليم (٢٧٧/١ ژمارە ٣٦٦ )، وئەبو داود لە عون المعبود (١٨١/١١ ژمارە ٤١٠٥)، و ئەلبانی لە (صحيح الجامع الصغير(٥١/١)..

[2] ئیبنو ماجه (٣٢١٨ و ٣٣١٤)، ئیمامی ئەحمەد (٩٧/٢ بە سەنەدی سەحیح) هەروەها ئیمامی بەیهیقی (٢٥٤/١)، ئەلبانی لە (صحيح الجامع الصغير ٢١٠)..

هیمۆسـیانینیان تێدایـە، كـە خوێنەكـەیان زەرد دەكـات، وەكـو هـەنگ و مێرولـەو، مـێش و، مێشولە، ئەمانـە بـە زینـدویی و بـە مردویـی پـاكن.. پێغەمبەری نازدار صلی الله علیـه وسلم، دەفـەرموێ: (إذا وَقـعَ الـذُّبابُ فِـي إنَاءِ أحَدِكُمْ فَلْيَغْمِسْهُ كُلُّهُ ثـمَّ لِيَطْرَحَـهُ، فَإنَّ فِي أحَدِ جَنَاحَيـهِ شِفَاءٌ وفِـي الآخَرِ داءٌ )[١] واتە ئەگەر مێش كەوتـە قـاپی یەكێكتانـەوە، بـا هـەمو لەشـی تێدا نقوم كـات، ئنجا فرێـی دات، چونكە نەخۆشـی بـە باڵێكیەوەیـەتی و، چارەسـەر بـە باڵەكـەی تریەوەیـەتی.. ئەمـە یەكێكـە لـە موعجیزەكـانی پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم مەزن، كە ئەوەی فەرموە، چونكە ئـەمرۆ پزیشكیی دەریخسـتوە، كـە بـاڵێكی مـێش میكـرۆب هەڵـدەگرێت، باڵەكـەی تریشی جۆرە دژە بەكتریایـەكی تێدایـە، كـە پێـی دەوترێت (باكتریۆفـاج)، واتە هەڵلوشی بەكتریا، كە زۆر گچكەیەو درێژیەكەی وا لـە نێـوان ٢٠ ـ ٢٥ میلی میكرۆندا، لەبەر ئەوەی نازانرێت مێشەكە، بـە چ باڵێكیـدا كەوتۆتـە شـلەمەنیەكەوە، بۆیـە نقـوم كردنـی هـەمو گیـانی مێشـەكە، وا دەكـات باكتریۆفاجەكە، خێرا برژێت و، هەمو میكرۆبەكان لەناو بەرێت.[٢]

## د . ئێسك و قۆچ و نینۆك وچرنوك و پەرو موی مردارەوەبو:

ئەمانـەو، هەرچـی وەكـو ئەمانـە، هـەموی پـاكن، هـیچ بەڵگەیـەك لەسـەر پیسییان نـەهاتوە.

---

[١] بوخاری ( ٣٣٢٠)، ئەلبانی: صحیح الجامع الصغیر(٨٣٧)..

[٢] دكتـــۆر ئـــەمین ڕەزا مامۆســـتای شـــكاویی ئێســـك، لـــە كـــۆلیجی پزیشـــكی زانكـــۆی ئەسكەندەرییەی میسر، باسێكی جوان و دورودرێژی ئەوەی، بـە شـێوەیەكی زۆر زانسـتیانە لەسـەر ئـەم مەسـەلەیە كـردوە، كـە چـۆن پـێش سـاڵانی سـیەكانی چـەرخی رابـوردو پـێش كەشف كردنی سلفا چارەسەری شكاوی و برینی گەنیویان بە مێش دەكرد..

ـ ئیمام بوخاری لە سەحیحەكەی خۆیدا،[١] ئەوەی نەقڵ كردوە، كە ئیمام زوهری، دەربارەی ئێسكی مردارەوە بوی، وەكو فیل و ئەوانە فەرموی: (زۆرم لە شەرعناسانی سەلەف بینی، كە بێ خەمانە سەریان بە شانەیەك دادەهێنا، كە لە ئێسكی فیل دروست كرابو، یان خۆیان بە رۆنی لەشی چەور دەكردو هیچ مەناعەتیشیان لێی نەبو..

ـ هەروەها ئەوەی، كە ئیبنو عەبباس خوا لێیان ڕازی بێت گێڕاوێتیەوە، كە بزنێكیان بە خێر دا، بە كەنیزەكێكی خاتو مەیمونەی، خێزانی پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم، بەڵام دوایی مردار بۆوەو، فڕێیاندا، پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم لەوێوە تێپەڕی، فەرموی: (لولا أَخَذْتمْ إهابَها، فَدَبَغْتمُوهُ، فانْتَفَعْتمْ بهِ) واتە ئەدی بۆچی نەتانگرت، تا پێستەكەی لێكەنەوە؟ وتیان: ئاخر مردار بوبۆوە، فەرموی: (إنَّمَا حَرَّمَ أَكْلُهَا) [٢]واتە ئێ خۆ خواردنی حەرام كراوە، ئیبنو عەبباسیش ئایەتەكەی ١٤٥ ی سورەتی ئەنعامی بۆ خوێندنەوە.. كەوابو پێستەكەی حەرام نەبوە..

## هـ . فرۆو شیرو ئەوی لە ریخۆڵەی مردارەوەبودا بوە:

ئەمانەش زاهیرەن، پاك و حەڵاڵن، چونكە كاتێك موسوڵمانان عێراقیان ئازاد كرد، پەنیری فارسیان بۆ دەهات و دەیانخوارد، كە ئاشكرایە ئەوانە مەجوسی بون و، سەربڕاویشیان، وەكو مردارەوەبو حسێب كراوە، پەنیرەكەشیان بەو فرۆیە دەمەیاند، كە لە ریخۆڵەی ئاژەڵەكانیان، دوای سەربڕین، یان مرداربونەوەیان، دەریان دەهێنان، چونكە، كە دەربارەی

---

[١] بوخاری (١/٣٤٢).

[٢] بوخاری(٤/١٠)، موسلیم (١/٢٧٦ ژمارە ١٠٠)، ئەبو داود (٤/٣٦٥ و ٣٦٦ ژمارە ٤١٢٠)، نەسائی (٧/١٧٢ ژمارە ٤٢٣٥)، ترمزی (٤/٢٢٠ ژمارە ١٧٢٧)، ئیبنو ماجە (٢/١١٩٣ ژمارە ٣٦١٠) دارەقوتنی لە سنن (١/٤٧).

پەنیرو ڕۆن و فرۆیان، لە سەلمانی فارسی پرسیبو، خوا لێی ڕازی بێت، کە ئەو کاتە ئەو، والی سەییدنا عومەری کوڕی خەتتاب بو، خوا لێی ڕازی بێت، لە عێراق گوتبوی: (حەڵاڵ ئەوەیە، کە خوای گەورە لە کتێبەکەیدا حەڵاڵی کردوەو، حەرامیش ئەوەیە، کە خوای گەورە لە کتێبەکەیدا حەرامی کردوە، ئەوەی، کە لێی بێ دەنگ بوە ئەوەیە، کە عەفوی لێ دراوە)..[1]..

**١١ــ ئەو پارچە گۆشتەی لە گیانلەبەرێکی زیندو دەکرێتەوە:** هەر حوکمی مردارەوەبوی هەیەو پیسە. چونکە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: (ما قُطِعَ مِن البَهِيمَةِ وَهِيَ حَيَّةٌ فَهوَ مَيتةٌ)[2] واتە: ئەو پارچە گۆشتەی لە گیانلەبەرێکی زیندو دەکرێتەوە، هەر مردارەوە بوە .

**١٢. بەرماوەی ئەو گیانلەبەرانەی گۆشتیان ناخورێت:** ئەگەر لە دوو قوللە کەمتربو (٢٠٠ کلگم لە ئاوی شیرین)، وەکو ئەوەی دوای خواردنەوەی ئەو گیانلەبەرانە، لە قاپێکدا ماوەتەوەو، کەمە، ئەسڵیش لەمەدا فەرمودەی قوللەتەینەکەیە، کە فەرموی: (إذا كانَ الماءُ قُلَّتينِ، لَمْ يَحمِلْ الخبَثَ)[3] واتە: ئەگەر ئاو گەیشتە بڕی دوو قوللە، ئیتر هەرچی تێکەوێت، پیسی ناکات..

---

[1] سيد سابق: فقه السنة (٢٤/١).

[2] ترمزی (١٤٨٠)، ئەبو داود (٢٨٥٨)، ئیبنو ماجە (٣٢١٦) ..

[3] ئەبو داود (١٧/١)، نەسائی (٤٦/١)، ترمزی ژمارە (٦٧) ئەحمەد (٣١٤/١)، دارەقوتنی (١٨٧/١) حاکم لە مستەدرەکیدا (١٣٣/١) بە سەحیحیشی ناساندوە ، هەروەها شێخی ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٧٥٨) دا..

**١٣. گۆشتی ئەو گیانلەبەرانەی گۆشتیان ناخورێت:** چونکە ئەنەس خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: ڕۆژی غەزای خەیبەر، گۆشتی کەرمان دەست کەوت، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بانگی کرد، فەرموی: (إنَّ اللهَ ورسولَهُ يَنهاكُمْ عَنْ لحُومِ الحُمُرِ فإنَّهَا رِجْسٌ أو نَجْس)[1] واتە: خواو پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، بەرهەڵستی خواردنی گۆشتی کەرتان لێ دەکەن، چونکە پیسە. هەروەها فەرمودەکەی سەلەمەی کوڕی ئەکوەع، کە لە ڕۆژی غەزای خەیبەردا ئێوارەیان بەسەردا هاتبو، ئیتر ئاگرێکی زۆر کرابۆوە، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لێی پرسیبو: (ما هذهِ النّارُ على أيِّ شَئٍ توقِدونَ) واتە: ئەو ئاگرانە چین و چیان لەسەرە ؟ فەرموی: گۆشتیان لەسەرە، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموی: (عَلَى أيِّ لحَمٍ) واتە: گۆشتی چی؟! فەرموی: گۆشتی گوێدرێژ (کەر)ی خۆماڵی، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموی: (أهْرِيقُوهَا واكْسِرُوها) واتە: بیرێژن و بیشکێنن، یەکێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، بیشیرێژین و، بیشیشکێنین ؟! فەرموی: (أو ذاكَ)[2]واتە: یان هەر ئەویان .. ئەم فەرمودانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی، کە گۆشتی گوێدرێژی خۆماڵی پیسە، چونکە فەرمودەی یەکەم، ڕاشکاوانە فەرموی پیسە، دووەمیشی هەر فەرموی، بیرێژن و مەنجەڵەکانیش بشکێنن، بەڵام دواتر ڕێیدا، مەنجەڵەکانیان بشۆنەوەو هەڵیگرنەوە..

* * *

[1] حەدیسێکی سەحیحە، ئەحمەد (٣٠٣/٥) و خاوەن سونەنەکان بڕوانە ئەلبانی: ارواء الغليل (١٧٣).

[2] موسلیم (١٨٠٢)..

## چەند توێژینەوەیەك:

### توێژینەوەیەك لەسەر
### پاكێتی مەنیی

ئیمام زەرکەشی (شافیعییە) دەڵێ: ئەوەی لە لەشی مرۆڤ دێتە دەرەوە سێ جۆرە:

١- جۆرێکیان، شەرعناسان لەسەر پاکێتیەکەی ڕێکن، وەکو فرمێسك و، چڵم و لیك و، بەڵغەم و، ئارەقی لەش..

٢- جۆرێکیان، شەرعناسان لەسەر پیسێتیەکەی ڕێکن، وەکو پیسایی و، میزو، وەدی و، مەزی و، خوێن..

٣ـ لەسەر پاك و پیسێتی مەنی ڕاجیان، چونکە بە جێی میزدا دێت..

مەنی: ئەو شلە سپی و خەستەیە، کە لە کاتی ڕەحەت بونی پیاودا، بە شێوەی هەڵقوڵین لەگەڵ هەست بە ڕەحەت بون لە زەکەر دێتە دەرەوەو خاوبونەوەی لەشی بەدوادا دێت، بۆنی بە تەڕی وەکو هەویری ترشاوە، کە وشك دەبێتەوە، بۆنی وەکو سپێنەی هێلکەی وشك بووەوە وایە، شێوەشی وەکو وشك بونەوەی ماستە، بەسەر پەڕۆوە، بە تایبەتی خام و کودەری..

**<u>شەرعناسانی لە حوکمی پاکی و پیسی مەنیدا دوو ڕان:</u>**

**<u>یەکەم: ئەو شەرعناسانەی پێیان وایە مەنی پیسە:</u>** وەکو ئیمام سوفیانی سەوری و، ئیمام ئەبو حەنیفەو، ئیمام مالیك و، ئیمام ئەحمەد (لە یەکێك لە ریوایەتەکانیدا) بەڵگەی هەموشیان، ئەو

فــەرمودەی عائیشــەخانە، خــوا لێــی ڕازی بێــت، کــە دەربــارەی مــەنی پرسـیاریان لێکـرد، کـە بـەر پۆشـاکی کەسێك دەکـەوێت، فـەرموی: (كُنْتُ أَغْسِلُهُ مِنْ ثَوبِ رسولِ اللهِ صلى الله عليه وسلم فَيَخْرُجُ الى الصَّلاةِ وأثَرُ الغَسْلِ فِي ثوبِهِ بُقَعُ المَاءِ)[1] واتە: کە بـەر پۆشـاکی پێغەمبـەر صـلى الله علیـه وسلم دەکەوت، شـوێنەکەیم دەشوشـتەوە، کـە دەچـوە مزگـەوت، ئاسـەواری شوشتنەوەکەی پەڵە ئاوی پێوە دیاربو. ئـەو شەرعناسـە بەڕێزانـە دەڵێن: دیارە، کە شوشتنەوەی پۆشاکەکەی لەبەر پیسێتی مەنیەکە بوە.

هـەروەها دەڵێن: لەبـەر ئـەوەی بـە شـوێنی میـزو مەزیـدا دێـت و، لـە خۆراکەوە پەیدا بوە، کەوابو حوکمیشی، وەکو میزو پیساییە..

**دووەم: ئەو شەرعناسانەی پێیان وایە پاکە:** وەکو سـەعیدی کــوڕی موســەییەب و، عــەتاء و، ئیمــام شــافیعی و، داودی زاهیریــی و، ڕیوایەتێکی بەهێزتری ئیمام ئەحمەد و، ئیسحاق و، ئیبنـول مـونزیر، کە دەیبەنەوە سەر سەیدنا ئیبنو عومەرو، سەعدی کوڕی ئەبو وەققـاس خـوا لێیان ڕازی بێت. بەڵگەی ئەمانیش، فـەرمودەیێکی تـری پێغەمبـەرە، صلى الله علیه وسلم، کە هەر عائیشـەخان دەگێڕێتـەوەو دەڵـێ: کـە بـە پۆشاکی پێغەمبەرەوە صلى الله علیه وسلم وشك دەبـۆوە، هەرمدەمپوروانـد[2] ئیبنـو عـەبباس دەیگوت: حـوکمی وەکـو حـوکمی، بەڵغـەم و چڵمە و، سڕینیشی بەسـە.. ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی، کـە ئەگـەر پـیس بوایـە، بـە پرواندن کۆتایی پـێ نـەدەهات، هـەر وەکو، کـە نەبیسـتراوە، پیسییەك بـە پرواندن پاك بوبێتەوە..

---

[1] متفق علیه: بوخاری (٢٣٠) و موسلیم (٢٨٩).

[2] موسلیم (٢٨٨) و خاوەن سوننەکان ..

دیسان لەوەی، كە مەنیەكە بە پۆشاكەوە ماوەتەوە، تا وشك بۆتەوە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، كە بە پیس دانەنراوە، ئەگینا زۆرتر ئیحتیات دەكراو، هەر ئەو كاتی، كە دەهاتە دەرەوە، ئەوە جێ بایەخ دەبو بەر هیچ شتێك نەكەوێت، هەر وەكو ئەو ئیحتیاتە زۆرەی، بۆ دڵۆپێك میز، یان پریشكەكەی كراوە، هەر وەكو بۆ میزی كابرای ئەعرابی كرا، كە لە مزگەوتەكەدا (كە زەمینەی مزگەوتەكە لم بو هیچی تێدا ڕانەخرابو) میزی كرد، یان پاككردنەوەی شوێنەواری میزی ئەو منداڵەی، لە باوەشی پێغەمبەری نازداردا صلی الله علیه وسلم میزی كرد...

منیش پێم وایە مەنی پاكەو، بە تەڕی وەكو چڵم و بەڵغەم سەیر دەكرێت و، دەسڕێت و، شوێنەكەی بۆ پاك و خاوێنی و، دیمەنی جوانتر دەشۆڕێت كە وشكیش بوبۆوە دەپروێنرێت. چونكە ئەو ریوایەتانەی دەچنەوە لای عائیشەخان و، لای ئیبنو عەبباس خوا، لێیان ڕازی بێت، دەمانبەنەوە ئەم ئەنجامە، كە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، خۆشی ئاوا ڕەفتاری لەگەڵ مەنی سەر پۆشاكی خۆی كردوە، وەكو ئەو فەرمودەی لای دارەقوتنی و، بەیهیقی و، تەحاوی لە ئیبنو عەبباسەوە، كە دەڵێ: (سُئِلَ النبيُّ صلى الله عليه وسلم عن المني يُصيبُ الثوبَ ؟ فقال: إنّمَا هو بمنزلَةِ المُخاطِ والبُصاقِ، وإنّمَا يَكفيكَ أنْ تمْسَحَهُ بخِرْقَةٍ)[1] واتە: دەربارەی مەنی لە پێغەمبەریان صلى الله علیه وسلم پرسی كە بەر پۆشاك دەكەوێت، ئەویش فەرموی: وەكو چڵم و بەڵغەم وایە، بەوەندەی بە پەڕۆیەك بیسڕیت بەسە..

---

[1] ئەلبانی لە ارواء الغليل (١/١٩٧) بە سەحیحی داناوە..

ئەم شەرعناسە بەڕێزانەی پۆلی دووەم، وەڵامی شەرعناسانی پۆلی یەکەمیشیان داوەتـەوەو، بەڵگەهێنانەوەکـەیان، بـە فەرمودەکـەی یەکـەمی دایکـە عائیشـەخان خـوا لێـی ڕازی بێـت، لاواز کردۆتـەوە بـەوەی، کـە گوتوویـان: کـە عائیشـەخان دەڵـێ بـە تـەڕی بـە چـوکڵە چیلکەیەك (لـە هەندێك فەرمودەدا بە ناوی إذخر هاتوە، کە چیلکەی ڕوەکێکـە) رام دەداو بـە وشـکی دەمپرواند، باسـی شـێوەی لابردنـی مەنیەکـە دەکات و، نابێتـە بەڵگەی پیسێتی مەنیەکە، چونکە خۆ پۆشاك لە چڵم و بەڵغەم و پەڵەش پـاك دەکرێنـەوەو، پیسـیش نـین.. کـەوابو، بۆچـونەکەی ئیمـام نـەوەوی، ڕەحمەتی لە شەرحی ئەو فەرمودەی موسلیمدا بەهێزترە، کـە گوتویـەتی: کارەکەی عائیشەخان لە لایەنی پاکوخاوێنیەوە بـوە، نـەك لەبـەر پیسـێتی مەنی. ئەمـە ئیختیـاری ئیمـام ئیبنـو تەیمییەشـە، وەك دەڵـێ: بەڵگـەکانی پاکی مەنیی، زیاترو بەهێزترن، ئەوەش بەهێزتریان دەکات، کـە حەتمـەن ئـەو سـەحابە بەڕێزانـە، ئیحتـیلام دەبـون و، مـەنی، بـەر پۆشـاکەکانیان دەکەوت و، بۆیان دەبوە ڕوداوی گشتی ڕۆژانە، ئەگەر حوکمی مـەنی پـیس بوایە، هەر دەبـو وەکـو حـوکمی تـارەت گـرتن و، خۆپاککردنـەوە لـە میـزو پیسـایی، لـەو بەڕێزانـەوە نـەقڵ بکرایـا، کـە ئەمـە نـەبوە، دیـارە کـەوا ڕەفتاریان کردوە، کە مەنی پاکە[١]..

کـەوابو مـەنی پاکە، گـەر بـە پۆشـاکی کەسـێکەوە بـو، دەتوانێـت لێـی کاتەوەو، شوێنەکەی هەر بۆ پاکوخاێنی و، دیمەنی جوانتر بیشوات، ئەگـەر نەیشوشـت و نوێـژی پێـوە کـرد، پاشـان بـیری کەوتـەوە، یـان کەوتـەوە

---

[١] ابن تيمية: مجموع الفتاوى (٦٠٤/٢١).

بەرچاوی هیچ ئیشکالێك لە نوێژەکەیدا نیە، ئەو ساتە مەنیەکە لە پۆشاکەکی بکاتەوە..

**زیادەیەك:** ئیمام نەوەوی، ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێ: ڕای شەرعناسان دەربارەی تۆوی گیانلەبەران، بە گشتی سێ ڕایە:

١ـ تۆوی ئاژەڵ و گیانلەبەران (جگە لە سەگ و بەراز) پاکەو، لەوەدا وەکو حوکمی مەنی ژن و پیاو، کافر بن، یان موسوڵمان، هەر پاکە..

٢ـ هەندێکی تر گوتویانە: تۆوی هەمو گیانلەبەرێك پیسە.

٣ـ هەندێکی تر گوتویانە تۆوی ئەو گیانلەبارانە پاکن، کە گۆشتیان دەخورێ و، ئەوی گۆشتی ناخورێت، مەنیەکەشی پیسە..

★ ★ ★

# توێژینەوەیەك لەسەر
# شلەو شێی عەورەتی ئافرەت

## حوکمی ئەو شلەمەنیانەی لە عەورەتی ئافرەت دێتە دەرەوە:

ڕای شەرعناسان لەسەر شێی عەورەتی ئافرەت، لە دوو بۆچوندایە:

**یەکەم: ئەوانەی گوتویانە پیسە:** لەبەر ئەوەی لە فەرجەوە دێت، کەوابو وەکو مەزیی پیاوان وایەو، بێ نوێژییە.. بەڵگەیان:

١ ـ ئەو فەرمودەیەی، کە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی، لە سەیدنا عوسمانی کوڕی عەففان، خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، کە خۆی لە پێغەمبەری نازداری صلى الله عليه وسلم بیستوە: (أخْـرَجَ الْبُخَارِيُّ فِي صَحِيحِهِ مِنْ طَرِيقِ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ أَنَّهُ سَأَلَ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ فَقَالَ: أَرَأَيْتَ إِذَا جَامَعَ الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ فَلَمْ يُمْنِ فَقَالَ عُثْمَانُ يَتَوَضَّأُ كَمَا يَتَوَضَّأُ لِلصَّلَاةِ وَيَغْسِلُ ذَكَرَهُ، وَقَالَ عُثْمَانُ سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَأَلْتُ عَنْ ذَلِكَ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ وَالزُّبَيْرَ بْنَ الْعَوَّامِ وَطَلْحَةَ بْنَ عُبَيْدِ اللَّهِ وَأُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ فَأَمَرُوهُ بِذَلِكَ )[١] زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی پرسیاری کرد: ئەگەر پیاوێك چوە لای خێزانەکەی و، لەگەڵیدا جوت بو، بەلام ئاویان نەهاتەوە، ئایا غوسلیان لەسەر نابێت ؟ سەیدنا عوسمان گوتی: دەستنوێژ دەگرێت، هەر وەکو، کە بۆ نوێژی دەگرێت، زەکەری دەشوات و بەس.. دەڵێ: من خۆم ئەوەم لە پێغەمبەری خوا

---

[١] بوخاری (٢٨٨ و٢٨٩) موسلیم (٣٤٧).

صلى الله عليه وسلم بیستوه و، پاشان پرسیارم دەربارەی، لە عەلی کوڕی ئەبو تالیب و، زوبێری کوڕی عەوام و، تەلحەی کوڕی عوبەیدوالله ئوبەی کوڕی کەعب، خوا لێیان ڕازی بێت کردوە، هەمو هەر وایان گوتوە..

٢ ـ ئەو فەرمودەی کە ئوبەی کوڕی کەعب گێڕاوێتیەوە، کە دەڵێ: (عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِذَا جَامَعَ أَحَدُنَا فَأَكْسَلَ ؟ فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لِيَغْسِلْ مَا مَسَّ الْمَرْأَةَ مِنْهُ وَلْيَتَوَضَّأْ ثُمَّ لِيُصَلِّ )[١] لە پێغەمبەرم صلى الله عليه وسلم پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەگەر پیاوەکە جیماعی لەگەڵ خێزانیدا کردو، ئاوی نەهاتەوە، ئایا غوسڵی دەکەوێتە سەر؟ فەرموی: ئەو شوێنەی دەشواتەوە، کە بەر ئافرەتەکە کەوتوە، پاشان دەستنوێژ دەشوات و، نوێژی خۆی دەکات.

بۆ شیکردنەوەو حوکمی یەکجارەکی و پەسەند دەربارەی ئەوەی، ئایا خۆشوشتن دەکەوێتە سەر ژن و پیاوەکە، ئەوا، بڕوانە: بابەتی چە غوسڵ پێویست دەکات؟! لە خاڵی دووەم: بە بەرکەوتنی جێ خەتەنەی پیاو ژن، با ئاویشیان نەهاتبێتەوە.

٣ ـ ئەم شەرعناسە بەڕێزانەی، کە ئەمە بۆچونیانە، ئەوەشیان گوتوە، کە دیسان حوکمی پیسیەکە وەردەگرێت، مادام لە یەکێك لەو دوو ڕێیەی، پاش و پێشەوە، دێت، چونکە ڕێسا شەرعیەکە دەڵێ: (هەرچی شتێك لە دوو ڕێی پاش و پێشەوە، جگە لە مەنی هات، پیسە)..

---

[١] بوخاری (٢٣٩) و مسلم (٣٤٦).

هـەروەها گوتویانــە: فـەرمان کـردن بــە شــتنەوەی زەکـەری پیــاو، بەڵگەیە لەسەر پیسێتی شێی عەورەتی ئافرەت..

**دووەم: ئەوانــەی گوتویانــە پاکــە:**[1] ئــەو شەرعناســە بەڕێزانــەی گوتویانـە ئـەو شـێیەی لـە عـەورەتی ئافرەتـەوە دێـت پاکـە، پشـتیان بـەم بەڵگانە بەستوە:

١ ـ گوتویانـە: ئـەم فەرمودانـەی کردوتـانن بـە بەڵگەی پیسێتی ئەو شێیە، نەسخ بونەتەوە (سڕاونەتەوە) وحوکمیان نەماوە[2]. بـەو فەرمودانــەی تـر نەسـخ بونەتــەوە، کـە لـە حاڵـەتی وادا فـەرمانی ڕاشکاو بە غوسڵ دەرکردن دەدەن.

٢ ـ عائیشــەخان خـوا لێـی ڕازی بێـت، هـەمو جارێـك مـەنیی پێغەمبــەری، صـلی الله علیــه وسـلم، لـە پۆشـاکەکانی دەپروانـد، ئاشـکرایە، کـە ئـەو مەنییـە سەرەنجامی جیمـاع بـوە، چـونکە هـیچ پێغەمبـەرێك ئیحتـیلام نـەبوە[3]. ئـەو مەنییـەش بـە هـەمان جێـدا هاتوە، کە شێی پێوەیە، مـادام حـوکمی مەنیەکە پاکە، کـەوابو ئـەو شێیەش پاکە، بەمەش دەگەینە ئەوەی، کە هەر جۆرە شلەو شێیەك لە عەورەتی ئافرەتەوە دێت پاکە..

٣ ـ ئاشکرایە، کە ئەم جۆرە شلەو شێیەی، بـە عـەورەتی ئـافرەتی ئەم سەردەمەدا دێت، خۆ هەر ئەو شلەو شـێیەیە، کـە بـە عـەورەتی

---

[1] الشيخ مصطفى بن عدوي: جامع أحكام النساء (٦٨/١).
[2] فتح الباري (٤٧٣/١).
[3] ابن قدامة: المغني (٨٨/٢).

ئافرەتـانی سـەردەمی یاوەرانـدا هـاتوە، دیاردەیـەکی رۆژانـەی هـەمو ئافرەتێکیشـە، دەی بۆچـی لـە پێغەمبـەری خـواوە، صـلی الله علیـە وسلم، یان لە یاوەرێکیەوە نەبیستراو، نەقڵ نەکراوە کە فەرمانی بە شوشتنەوەی، یان بە دەستنوێژ لێگرتنەوەی دابێت ؟!

٤ ـ دەرچـەی ئـەم شـلەو شـێیە، هـەمان دەرچـەی میـز نیـە، تـا حـوکمی پیسـیی ئـەو وەرگرێـت. زانسـتی پزیشـکی ئێسـتاش ئـەوە دەسەلمێنێت..

٤ـ ئەو رێسایەی شەرعناسان دایاننـاوە: (هەرچـی شـتێك لـە دوو رێـی پـاش و پێشـەوە، جگـە لـە مـەنی هـات پیسـە) خـۆ ئایـەت وفەرمودە نیە، کۆڕا(ئیجماع)ی وشەرعناسانی لەسەر نیە، مەرج نیە ئـەوە ئـاوا بـە شـێوەیەکی رەهـا بێـت، خـۆ خـوێنی جـاری داوێـنی ئافرەتـان (ئیسـتیحازە)، هـەر لـەوێوە دێـت و، کەسـیش نـەیگوتوە پیسە.

## پوختەی حوکمەکە بە لامەوە ئەوەیە کە:

ـ ئەگەر سەرەنجامی دەسبازی ژن، شلە لە عەورەتی هاتـە دەرەوە، ئـەوە حوکمی وەکو مەزی پیاو وایەو، هەم دەستنوێژ دەشکێنێت و هەم پیسە.

ـ ئەگەر سەرەنجامی ماندو بون، یـان دوگیـانی (حـەمل) بـە بـێ ئاگـایی ئافرەتەکـە هاتـە دەرێ، ئـەوە پـیس نیـە، چـونکە بەڵگـەی پیسـێتیمان لەسەری نیە، کەوابو لەسەر ئەسڵی پاکێتی دەمێنێتەوە.. والله اعلم .

* * *

# توێژینەوەیەك لەسەر پاکی شەراب

ئــەو شــەرابەی، کــە ســەرخۆش دەکــات، جۆرێکــە لــە دوازدە جــۆر ئەلکهۆڵ، ئەمە جۆری ئیسانۆلە ($C_2H_5OH$) کە رادەی ٦٠ ـ ٩٠٪ ئیسانۆلی تێدایە، کە بە هۆیەوە هەندێ شەرعناس بە پیسیان داناوە، کورد پێی دەڵێن ئیسپرتۆو، لە نەخۆشخانەکاندا بۆ پاکژیی پزیشکی (تەعقیم) بەکاری دەهێنن، ئەمەیە کە بە ئینگلیزی (Spirit) و، بە فەرەنسی (Espirit) و، بە ئیتالی (Spirito) یە، کە بە مانایی رۆحی شەرابەکەیە، جۆرەکانی تری وەکو میسانۆل ($CH_3OH$) و، بریبانۆ ($C_3H_7OH$) مەست ناکەن، بۆیە ئەو شەرعناسانە لە بە پیس دانانی ئەمانە، خۆیان بواردوە.

زۆرینەی شەرعناسانی ئیسلام، بە شێوەیەکی گشتی، شەڕابیان بە پیس داناوە، بەڵام هەندێك لە شەرعناسانی کۆن ونوێ، بە پیسیان دانەناوە:

**پـۆلی یەکەم کە دەڵێن: شـەڕاب پیسـە:** ئـەو بەڕێزانـەی کـە شەراب بە پیس دەزانن، لەوانیش چوار ئیمامە بەڕێزەکەو، ئیبنو حەزم و ئیبنو تەیمییە، بەڵگەشیان ئەوەیە، کە:

**یەکـەم:** خـوای پـەروەدگار فەرمویـەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾ المائـدة /٩٠ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، شەڕاب و قومارو یانسیب و قومار بەزار پیسن، کاری شەیتانن، توخنیان مەکەون، تا سەرفراز بن..

(رجس) لـە ئایەتەكـەدا هـەر (نجس)ە.. لای ئـەم شەرعناسـە بەڕێزانـە شـەڕاب پیسـە، ئەگـەر بـەر شـوێنێك كـەوت، دەبـێ بشـۆرێتەوە، تـا پـاك دەبێتەوە[1].

دووەم: فەرمودەی سەحیحیش لەسەر پیسێتی خوێن هاتوە وەكو:

١ ـ فەرمودەكـەی ئـەبو سـەعلەبەی خوشـەنی خـوا لێـی ڕازی بێـت، كـە دەڵێ: لە پێغەمبەریان پرسی صلی الله علیه وسلم، كە كاتێك دەچنە سـەر شوێنی كافرەكان و، مەنجەڵ و قاپ و كەوچكیان هەڵدەگرنـەوە ئاسـەواری گۆشـتی بـەرازو شـەرابیان تێـدا مـاوە، ئایـا چـی لـەو كەلوپەلانـە بكـەن ؟ فەرموی: (إنْ وَجَدْتمْ غَيرَها فكُلوا منهـا واشـرَبوا وإنْ لم تجدُوا فاحْضُورها بالماءِ)[2] واتە: ئەگەر هی ترتان بەردەست كەوت لەودا بخۆن، ئەگـەر نـا، بـە ئاو بیانشۆنەوەو، بەكاریان بهێنن..

لەمـەوە ئیمـام خـەتتابی[3] و، ئیبنـو دەقیـق العییـد[4] (كـە شـافیعین) و، زەیلەعی[5] و، ئیبنـو الهوممام (كـە حەنـەفین)و، ئیمـام مەجدالـدین ئیبنـو تەیمیـەی (بـاپیری ئیبنـو تەیمییـەی بـەناوبانگ)[6]دا فـەتوای پیسـێتی شەڕابیان داوە..

---

[1] ابن مودود الحنفي: الاختيار (٣٣/١)، المرداوي: الانصاف (٣٧٨/١ ، النووي: المجموع (٥٦٩/٢)، ابن حزم: المحلى (١٦١/١).

[2] ئەبو داود: سنن (٣٦٣/٣) و ترمزیش لە سێ شوێنی سوننەكەی خۆی هێناویێتیەوەو بە سەحیحی داناوە، ئەسڵی حەدیسەكەش لە هەردووسەحیحی بوخاری و موسلیمدا هەیە..

[3] معالم السنن ٢٥٧/٤ كە شەرحی سنن ابی داودە..

[4] لە كتێبی (الإمام في أحاديث الكلام).

[5] الزيلعي: نصب الراية في تخريج أحاديث الهداية (٩٥/١)، ابن الهمام: فتح القدير ٥١/١

[6] لە كتێبی (منتقى الاخبار).

## پۆلی دووەم کە دەڵێن: شەراب پیس نیە:

**یەکەم:** ئایەتەکە بەڵگە نیە لەسەر پیسێتی شەراب، چونکە:

١ ـ سیانە باسکراوەکەی تر، لە خۆیاندا پیس نین، نە قومارو، نە یانسیب و، نە زارهەڵدان بۆ قومارو پارە بردنەوە، هیچیان پیس نین، ناشکرێت (خبر)ی موبتەداکە، کە (رجس)ە، تایبەت بکرێت بە خمرەکەوەو بەس، چونکە (خبَر)ی هەر چوار موبتەداکەیە، جگە لەوەش ئەسڵ لە شتدا پاکی و حەڵاڵیە، هەر کەس حوکمی شتێك بدات، کە پیسە، دەبێ بەڵگەی بەهێزی هەبێت.. ئەمەش ڕای ڕەبیعەو، لەیس و، موزەنی و، داودی زاهیری و، شەوکانی و، سەنعانی و، ئەلبانی و، سید سابق و، ئال بەسسام و، ئیبن عوسێمین و ئەوانەن[1]..

٢ ـ وشەی (رجس) مانای تریشی زۆرە، وەکو: پیسایی، حەرام کراو، ناشیرین، سزا، لەعنەت و نەفرین، کوفر، خراپەکاریی، تاوان و گوناح، پیسی.. ئیتر بۆچی تایبەتتان کردوە بە مانای پیسییەوە[2].

**دووەم:** وشەی رجس، لە سێ شوێنی تری قورئاندا، جگە لەم ئایەتە هاتوە، هیچیان بە مانای نجس نەهاتوە، بۆ نمونە:

ـ لە الانعام / ١٣٥: ﴿كَذَٰلِكَ يَجْعَلُ ٱللَّهُ ٱلرِّجْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ واتە: ئەئاواهی خوای گەورە، سزا بۆ ئەو کەسانە دادەنێ، کە باوەڕ ناهێنن.. کەوابو رجس، بە مانای سزا هاتوە.

---

[1] بۆ تەفسیلی ڕای ئەمانیش: المجموع (٢/٥٦٩) و الدراري المضيئة (١/٢٨) و فقه السنة (١/ ٢٨).

[2] تەفسیلی وا لە کتێبی (النهايه)ی ئیبنو ئەسیر ولسان العرب ومختار الصحاح .

ـ لـه التوبـة/ ٩٥: ﴿ سَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمْ إِذَا ٱنقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُواْ عَنْهُمْ فَأَعْرِضُواْ عَنْهُمْ إِنَّهُمْ رِجْسٌ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴾ واته: ئەوانـه، کـه ئێـوه دەگەڕێنـەوە، شـار سـوێندتان بـۆ دەخـۆن، تـا وازيـان لـێ بهێـنن، لێيـان گـەڕێن و رويـان مـەدەنێ، ئەوانـه بەڕاسـتی پيسـن، واتـه کردەوەيان بەدەو، حەتمەن له سزای ئەو کارانەياندا، که دەيان کرد، شوێن هەواريان دۆزەخ دەبێت !!

ـ هەروەها له سـوڕەتی الحـج / ٣٠: ﴿فَٱجْتَنِبُواْ ٱلرِّجْسَ مِنَ ٱلْأَوْثَٰنِ ﴾ واته: توخنی بته پيسەکان مەکەون.. بتەکان پيسن، چونکه دەبنـه مايـەی سزاو ئەشکەنجەی دوايی، نەك خۆيان پيس بن وەکو پيسايی، چونکه بەرد خۆی پيس نيه..

سێيەم: له کەسێکی سەلەفەوە هيچمان پێ نەگەيشتوە، که ياوەرێك، يـان تابعينێکيان رجسی لەو ئايەتەدا بـه مانـای (نجس)، واتـه پيسـی لێـك دابێتـەوە، بەڵکو ئيبنو عەبباس، خوا لێيان ڕازی بێت، دەيگوت: رجس، واتــه مايــەی رق هەســتان، ئيبنــو زەيــديش دەيگــوت: رجــس واتــه خراپەکاريی.

چـوارەم: هـاتنی وشـەی شـەراب، لـه ريـزی قومـارو ئـەوانی تـردا، لـەو ئايەتـەدا، بەڵگەيـه لەسـەر ئـەوەی، کـه مانـای پيسێتی مەبەسـت نيـه، بـەڵکو مەبەسـتی پيسـێتی مەعنەوييـه، ئەمـەش وەکـو ئـەو ئايەتـەی ديکەيه، کـه دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ ﴾ التوبـة/٢٨ واتـه: ئـەی ئـەو کەسـانەی باوەڕتـان هێنـاوە، موشـريکەکان

پیسن.. بەڵگەش لەسەر ئەوە زۆرە، کە موشریکەکان لەبەر شیرکیان نیە، کە پیسن.

**پێنجەم:** حەرام کردنی شەراب پیسێتی بونی ناگەێنێت، بەڵام پیسێتی خۆی، حەرامی لە خۆدا هەلگرتوە، خۆ کەس نەیگوت: پۆشینی ئاوریشم (حەریر)، یان ئاڵتون بۆ پیاوی موسوڵمان حەرامە، یان بڵێ: ئاوریشم و ئاڵتون پیسن ! هەردووکیان بە پێی شەریعەتی ئیسلام و، بە کۆڕای شەرعناسان پاکن..

**شەشەم:** ئەو رجسە لەو ئایەتەدا، پەیوەست کراوەتەوە بەوەوە، کە کاری شەیتانە، بۆیە وا پیسە، کەوابو پیسییەکی کردەوەییە، بە مانای ناشیرین و بەدو ناهەموار، نەك بە مانای پیسێتی زاتی خۆی..

**حەوتەم:** لەو فەرمودە سەحیحەی ئەنەسدا، خوا لێی ڕازی بێت، کە باسی چۆنیەتی حەرام کردنی شەراب دەکات، دەڵێ: (فأمَرَ رسولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم منادِياً يُنادي: ألا إنَّ الخمرَ قدْ حُرِّمَت ... قال: فخَرَجْتُ فأهرَقْتُها فجَرَتْ في سِكَكِ المدينةِ)[1] واتە: کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمانی دا بە کەسێك، جاڕ بدا، کە: هۆ خەڵکینە! شەراب حەرام کرا.. خێرا چومە دەرەوەو ڕشتم، تا بە کۆڵانی مەدینەدا بڵاو بۆوە.. ئەگەر شەراب پیس بوایە، نەدەبو ئاوا بیرێژنە کوچەو کۆڵان، کە ئیحتیمالی زۆر هەیە، بەر برێژەکان و، بەر خەڵکی تریش بکەوێت..

---

[1] بوخاری (٢٣٣٢)، موسلیم (١٩٨٠).

**هەشتەم:** کابرایەك، کە هاتە خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم و دوو جەوەنـدە (کونـدە: مەشـکە) شـەرابی بـە دیـاری بـۆ هێنـابو، کـە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ڕەفـزی کـرد لێـی وەرگرێـت و فـەرموی: حەڕامە، یەکێك بە کابرای وت، بڕۆ بیانفرۆشەوە، پێغەمبـەر صـلی الله علیه وسلم فەرموی: (إنَّ اللهَ الذي حَرَّمَ شُرْبَها حَرَّمَ بَيعَها، فَفَتَحَ الرَّجُلُ المزادَتينِ حَتَّى ذَهَبَ مَا فيهما)[١] واتە ئەو خوایـەی خواردنـەوەی حـەڕام کـردوە، فرۆشتنیشـی حـەڕام کـردوە، ئـیتر کـابرا دەمـی هـەردوو وجەوەندەکەی کردەوە، تا هـەمو ئـەوەی تێیانـدابو ڕژا. ئەگـەر شـەڕاب پیس بوایە، پێغەمبـەر صلی الله علیه وسلم فـەرمانی دەکـرد، کـە ئـاوی پێـدا کـەن، هـەروەکو، کـە فەرمانیـدا ئـاو بکـەن بـە میـزی کـابرای ئەعرابیدا، کە لـە مزگەوتەکە میـزی کـرد، یـان فـەرمانی بـەو یـاوەرە عەزیزانەی دەکرد، کە ئاگاداربن پرپشکیتان بەر نەکەوێت !

**نۆیەم:** مـادام لـە دیـدی شـەرعەوە ئەسڵی شت پاکژیی و، ئـەوا پاکییـەو دەربارەی پیسێتی شەڕابیش، بەڵگەیەکی بنبڕمان دەسنەکەوت..
شێخ ئیبنو عوسێمین دەڵێ وا نابینم شەڕاب پـیس بێـت، بۆیـە پـێم وایـە ئەلکهۆڵ پاکەو، حەرەجیش لەوەدا نابینم، کە لە کاتی پێویسـتی، وەکـو تـەعقیم کردنـی برینێکـدا بـەکاری بهێـنم.. کـەوابو هـەمو ئـەوەی ئەلکهۆلیشیان تێدا بەکار دێت، هەر پاکن.. دەرمان بن یـان، کەرەسـتەی تەعقیم، یان قۆلۆنیاو عەترو بۆنی شلەمەنی .
کەوابو ڕای ئەو شەرعناسانە پەسەندە، کە گوتویانە شەڕاب پاکە..

★ ★ ★

---

[١] مسلم (١٢٠٦) و ئیمامی مالیك لە موطأ (١٥٤٣).

# توێژینەوەیەك لەسەر
# حوکمی خوێن

خوێن چەند جۆرێکە:

**١. خوێنی حەیز:** ئەمیان بە کۆڕای شەرعناسان پیسە و، پێشتر باسمان لە بەڵگەکانی کرد.

**٢ . خوێنی مرۆڤ:** ڕا لەسەر ئەمیان جیاوازە، شەرعناسان بە شێوەیەکی گشتی، ڕایان لەسەر پیسێتیەتی، لەبەر ئەوەی حوکمی حەڕام بونی، لە قورئانی پیرۆزدا هەیە، ئەمانیش وای بۆ چون، کە پیس بێت، حوکمی ئەمیش لای زۆرێك لەو بەڕێزانە، وەکو شەڕابی لێ هاتوە .. کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُۥ رِجْسٌ﴾ الانعام/١٤٥ واتە: بڵێ: لەو وەحیەی، کە بۆم هاتوە، شتێکی وا نابینم، کە حەڕام کرابێت، غەیری مردارەوەبو و، خوێنی ڕژاو و، گۆشتی بەراز، کە ئەمانە هەمویان پیسن.. ئەو شەرعناسە بەڕێزانە، گوتویانە، کە مادام رجسە، واتە پیسە.. چوار ئیمامە بەڕێزەکەو، ئەهلی تەفسیرو، زۆرێك لە فەرمودەوانان و، شەرعناسان، گوتویانە: کۆڕا (ئیجماع) لەسەر پیسێتی خوێن هەیە. هەمو ئەوە باس دەکەن، کە خوێن پیسە ! شەرعناسانی پێشینی تابعین و، ئەوانی دوای ئەوانیش، ڕایان هەر وایە..

## ئەوانەی پێیان وایە خوێن پیسە:

١ـ مەزهەبی حەنەفی، لەسەر پیسێتی و دەستنوێژ پێشکانیشی، رێکن، ئـــەوەی لای ئـــەوان عـــەفوی لێـــدراوە، بڕێکـــی کەمـــە بـــە قـــەبارەی، درهەمێکی کۆن[١]..

٢ـ ئیمام شـافیعی رەحمـەتی خـوای لـێ بێت، هـەر خـوێنی لا پیسـە، بۆیـە دوای باسـی فـەرمودەی ئـەسماء، دەربـارەی خـوێنی حـەیز دەڵـێ: ئەمە بەلگەیە لەسەر پیسێتی خـوێنی حـەیزو، هـەمو جـۆرە خـوێنێکی تر.. شافیعیەکان هەمو لەسەر ئەوە ڕێکن، کە پیسە[٢]..

٣ـ ئیمام مالیکیش گوتویەتی،[٣] کە خوێن پیسە بـێ ئـەوەی تەفسیلی بداتێ.. بەلاّم هەندێك لە شەرعناسانی مالیکی، باسی جۆرو بڕی عـەفو لێدراویان کردوە[٤]..

٤ـ مەزهەبی ئیمام ئەحمەد لە پیسێتی خوێندا زۆر ڕونە[٥].

٥ـ هەروەها ئیبنو حەزم ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێ[٦]: شەرعناسان لەسەر ئەوە کۆن، کە خوێن پیسە..ئیبنو روشدیش هـەر پێـی وایـە کـە پیسە[٧]

---

[١] مجمع الانهر (٥٢/١) یان ئیبنو نوجەیم: البحر الرائق (٢٠/١ )..

[٢] ئیمامی شافیعی: الام (٦٧/١ )، ابو اسحق الشیرازي: المهذب (٥١١/٢).

[٣] وەکو لە المدونة (٣٨/١) ی ئیمامی مالیك خۆیدا هاتوە.

[٤] لە کتێبی الزرقاني: حاشیة الرهوني (٧٣/١) و الآبي الازهري: جواهر الاکلیل (٩/١).

[٥] تەنانەت لە کتێبەکانی: القرافي: الفروع (٢٥٣/١) و ابن عبدالبر: الکافي (١١٠/١) کۆڕای هەرچوار ئیمامە بەڕێزەکەش نەقڵ دەکەن..

[٦] لە ابن حزم: المحلی (١٠٢/١) و کتێبی ابن حزم: مراتب الاجماع (ل ١٩).١

[٧] ابن رشد: بدایة المجتهد ١٧٥/٢..

٦ـ ئیمامـەکی بەرجەسـتەی وەکـو، ئیمـام ئەحمـەد بـن حەنبـەل رەحمـەتی خـوای لـێ بێت، کە یەکێکە لـە چوار کـەس لـە ئوممـەتی موسـوڵمانان، کـە بـڕی شـەش سـەد هـەزار فـەرمودەی لەبـەر بـوەو، ئیمامەکی گەورەی ئەهلی سوننەتە، لە ئیمام ئیبنـو حەزمـەوە ئیجماع نەقڵ دەکات، کە خوێن پیسە. ئەمەش بۆچونی ئیمامانی تری بـەڕێزی وەکو، ئیمام ئیبنـول قـەییمی جەوزییەشـە[1]، بـاس لـە فـەتواکانی ئیمـام ئەحمەد دەکات و، پشتیوانیان لێ دەکات، دەڵێ: لـە ئەحمـەدیان پرسـی: حوکمی خوێن و کێم لـە لات وەکو یـەکن ؟! فـەرموی: نـا، خـەڵکی لـە پیسـی خوێنـدا، ڕایـان جیـاواز نـەبوە (مەبەسـتی لـە خـەڵکی شەرعناسانە..) جارێکی تریش گوتی : خوێن وکێم وزوخاوێك، کە لـە برین دێن، وەکو خوێن نین[2]..

٧ـ ئیمام ئیبنـو حەجـەری عەسـقەلانی، کۆڕای شەرعناسـانی لەسـەر پیسێتی خوێن، باس کردوە[3].

٨ـ ئیبنـو عەبـدولبیڕ گوتویـەتی: حـوکمی شـەرعی هـەمو خوێنێـك، وەکـو حـوکمی خـوێنی حـەیزە، بـڕی کـەمی عـەفوی لێـدراوە، چـونکە خـوای گـەورە، کـە فەرمویـەتی (رجـس)ە، رجسـیش هـەر (نجـس)ە و نەجیسیش پیسییە[4]..

---

[1] ابن القيم الجوزية: اغاثة اللهفان (٢٤٠/١).
[2] ابن تيمية: شرح العمدة (١٠٥/١).
[3] فتح الباري (٣٥٢/١ و ٤٢٠).. هەروەها شاریحەکانی تری بوخاری وەکو العینی لە البناية (٧٣٧/١)، و عمدة القاري (١٤١/٣)..
[4] ابن عبدالبر: التمهيد (٢٣٠/٢٢).

٩ـ ئیبنول عەرەبی دەڵێ: شەرعناسان لەبەر ئەوە کۆن، کە خوێن هەم حەرامەو، هەم پیسە، نە دەخورێت، نە سودی لێ وەردەگیرێت، خوای گەورە بە گشتی حوکمی پیسێتیەکەی داوە، هەرچەندە لە سورەتی الانعامدا، تایبەتی کردوە بە خوێنی رژاوەوە، بەڵام شەرعناسان گوتویانە، گشتیەکە حوکمی تایبەتیەکە وەردەگرێتەوە[1]..

١٠ ـ ئیمام نەوەوی گوتویەتی: بەڵگە لەسەر پیسێتی خوێن بەهێزە، لە ریزی شەرعناساندا، کەسم نەدیوە بە پێچەوانەوە فەتوای دابێت، هەمو پێیان پیس بوە، مەگەر خاوەنی کتێبی (الحاوي) کە لە موتەکەللیمینەوە رای پێچەوانە نەقڵ دەکات، کە وتویانە: گوایە پاکە، قسەی ئەوانیش، نە کۆڕای پێ دادەمەزرێت، نەکۆڕا هەڵدەوەشێنێتەوە[2].

ئیمام قورتوبی لە تەفسیرەکەیدا[3]، کۆڕای شەرعناسان لەسەر ئەوە نەقڵ دەکات، کە خوێن پیسە..

## پۆلی دووەم کە پێیان وایە خوێن پاکە:

هەندێك لە توێژەرەوە گەورەکانی وەکو، شەوکانی و سددیق خان و، ئەلبانی و، بن عوسێمین[4] لەبەر ئەوەی لای ئەمان، کۆڕای شەرعناسانی پێشینی لەسەر پێك نەهاتوە بەلایانەوە خوێن کەم بێت، یان زۆر، جاری بێت یان وشك، هەر پیس نیە.. بۆ بەهێز کردنی رای خۆیا،ن پشتیان بەم

---

[1] ابن العربي: احكام القران (١/ ٧٩).
[2] النوي: شرح مسلم (٣/٢٠٠) و النوي: المجموع (٢/٥٧٦)
[3] القرطبي: الجامع لاحكام القران (٢/٢٢١).
[4] القنوجي: الروضة الندية شرح الدرر البهية (١/٨١) الالباني: تمام المنة (ل ٥٢)، ابن عثيمين: الشرح المتع (١/٢٦٠)

بەڵگانە بەستوە:

١ـ ئەسڵی هەمو شتێك پاكییە، تا بەڵگەیەك لەسەر پیسێتیەكەی دەردەكەوێت، ئەوەی لە پێغەمبەری نازداریشەوە، صلی الله علیه وسلم گێڕراوەتەوە ئەوەیە، كە فەرمانی بە شوشتنی غەیری شوێنی خوێنی حەیز نەفەرموە، لە كاتێكدا ئەویش و ئەو یاوەرە بەڕێزانەی، لە خزمەتیدابون، سەدان جار خوێنیان بە لەش وپۆشاكی خۆیانەوە دەبینی.. جا ئەگەر خوێنیان بە پیس بزانیایە، حەتمەن فەرمودەی زۆریان دەربارەی نەقڵ دەكرد، چونكە هەم خۆیان پێویستیان پێی دەبو، هەم ئەوانی پاش ئەوانیش، كە بونەوە بە قوتابی یاوەران..

٢ـ یاوەران بە درێژایی مێژوی جیهادی خۆیان، بە خوێنەوە نوێژیان كردوە، هەیانبوە، خوێنی لێ تكاوەو نوێژەكەی پێوە كردوە، لە كەسیشیانەوە ریوایەتێك نیە، كە پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم، فەرمانی بە شوشتنەوەی برین و، پۆشاكە خوێناویەكانیان دابێتەوە.. دیسان لە خۆشیانەوە شتێكی وا نەگێڕراوەتەوە، كە زۆر لێی بە حەزەر بوبن و، خۆیان لێ پاراستبێت.. ئەلحەسەن دەڵێ: موسوڵمانان هەر بە خوێنەوە نوێژەكانیان دەكردو، هیچ گرێ و كۆڵێكیشیان بەرامبەری لا دروست نەدەبو[1].

٣ـ فەرمودەی ترمان هەیە، كە ئەو یاوەرە بەڕێزەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، كە لە ئەنسار بو، دەیگێڕێتەوە كە لە شەونوێژدا بو، موشریكێك تیرێكی تێگرت و، لە پەراسوی هەڵچەقی، پاشان هەر لە

---

[1] سەنەدی سەحیحەو لای بوخاری موعەللەقە (٣٣٦/١) وئیبنوئەبو شەیبە بە سەنەدی راست و پەیوەستەوە گەیاندوێتیەوە: فتح الباري (٣٣٧/١)..

نوێژەکەیدا دەریهێنایەوە، دیسان موشریکەکە، تیرێکی تری پێوەناو، ئەویشی لە جەستە رۆچو، ئەویشی دەرهێنایەوەو، نوێژەکەی نەبڕی، بۆ سێیەمجار، کابرای موشریك تیرێکی تری تێگرت، ئەویش لە جەستەی خواناسی چەقی و، هەر نوێژەکەی نەبڕی! بەڵام نەیتوانی هەر بە پێوە بێت و، چوە رکوع و سوژدەو، هەر بەردەوام بو لەسەر نوێژەکەی، لە کاتێکدا خوێنی لەشی جاری بو بو !! (ئیسنادی سەحیحەو لای بوخاری موعەللەقەو، ئیمام ئەحمەد بە سەنەدی ڕاست و پەیوەستەوە، گەیاندوێتیەوە بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم)..

شێخی ئەلبانی رەحمەتی دەڵێ: ئەمە لە حوکمی مەرفوعدایە، ڕاستە ئەو ئیحتیمالە هەیە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نەیدیبێت، بەڵام، خۆ ئەگەر یاوەران بیانزانیایە، ئیشکالێك لەسەر ئەو خوێن لێ چۆڕینە لە نوێژدا هەیە، حەتمەن پرسیاریان لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەربارەی دەکرد، خۆ ئەگەر ئەویش صلی الله علیه، وسلم ئاگادار نەبوایا و، یاوەرەکەش نەیپرسیایە خۆ لای خوای گەورە ئاشکراو زانراو بو، حەتمەن خوای پەروەردگار بۆ پێغەمبەرەکەی خۆی صلی الله علیه وسلم، ڕون دەکردەوە.. چونکە رون کردنەوەی حوکمی شەرعی، وەکو لە زانستی ئوسوڵدا هەیە، نابێت لە کاتی پێویست تێپەڕێت.. ئەگەر ئەو خوێنەی لەش، کە ئاوا لە جەستەی ئەو یاوەرانە ڕۆیشتوە، پیس بوایە، حەتمەن خوای گەورە، لە حاڵەتێکیاندا بە وەحی بۆ پێغەمبەرەکەی خۆی صلی الله علیه وسلم، ڕون دەکردەوە.. ئەمەش بەڵگەنەویستێکەو، لە کەس شاراوە نابێت[1]..

---

[1] الالباني: تمام المنة (٥١)..

٤. دیسان ئەو ریوایەتە بەناوبانگەی، کە عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێت، کە لە کاتی نوێـژدا شمشێری لێدرا، نوێژەکەی هەر تـەواو کرد، لە کاتێکدا، کە خوێن لە برینی دەڕۆیشت[١] .

٥. فەرمودەکەی عائیشەخان، خوا لێی ڕازی بێت، کە دەربارەی مردنی سەعدی کوڕی مەعاز خوا لێی ڕازی بێت، فەرموی: (کە سەعدی کوڕی مەعاز، لە شەڕەکەی خەندەقدا پێکرا، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، چادرێکی لە مزگەوت بۆ هەڵدا، تا زو زو بچێتە سەردانی.. شەوێك کە ئەو، لەو حاڵەتەدا بو، کونێکی برینەکەی پچڕایەوەو، خوێنی لە بن چادرەکەوە هاتە دەرێ، لە دەرەوە هاواریان کرد: ئەرێ چادرەوانان ئەو خوێنە چیە، کە سەیریان کرد، زامەکەی سەعدە تەقیوەتەوەو، خوێنی لێ دەچۆڕێت، ئاواش کۆچی دوایی کرد[٢]... هیچ ریوایەتێك لەبەر دەستدا نیە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، فەرمانی بە شوشتنەوەی جێی خوێنەکە، کە مزگەوت بو کردبێت ، یان لانی کەم نەیفەرمو، دۆلکەیەك ئاوی پێدا کەن، وەکو بۆ میزی کابرای ئەعرابی، کە لە مزگەوتدا کردی، فەرموی لێی گەڕێن و، دۆلکەیەك ئاو بکەن بە شوێنی میزەکەیدا.. جا ئەگەر خوێن پیس بوایە، چۆن پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لی دەگەڕا لێی گەڕێن، نەخوازەلا لە مزگەوتیشدا..

---

[١] ئیمامی مالیك (٨٢) و بەیهیقی (٣٥٧/١) فەرمودەوانی دیکەش هەن، کە گێڕاویانەتەوەو بە سەحیحیان ناساندوە، کەمال السەید سالم لە صحیح فقە السنة (٧٨/١) دا دەڵێ: سەنەدەکەی سەحیحە..

[٢] کەمال السەید سالم لە صحیح فقە السنة(٧٩/١) دا دەڵێ: سەحیحە، ئەبو داود بەکورتی گێڕاوێتیەوە(٣١٠٠) و تەبەرانیش لە (الکبیر ٧/٦) بە سەحیحی داناوە.

٦ـ هەنـدێك لـە شەرعناسـان، وەكـو ئیبنـو روشـد دوای ئـەوەی، راجـوێیی شەرعناسانی دەربـارەی خـوێن بـاس كـرد دەڵـێ: گوتویانـە، كـە خـوێنی ماسی پاكە، چونكە ماسی بـە مـردارەوە بـویی پاكـە، خـۆ مـرۆڤیش بـە مردویـی پاكـە، ئـیتر بۆچـی خوێنەكـەی بـە پـیس دادەنـێن ؟! دوای موناقەشەی راوبۆچونەكان، دەڵـێ: خـوێنی حـەیز بۆیـە پیسـە، چـونكە بەڵگەمان لەسەری هەیە، ئـەمما خـوێنی تـر، مـادام بەڵگـەمان لەسـەری نیـە، هـەر دەبێـت لەسـەر ئەسـڵی خـۆی، كـە پاكێتیـە بمێنێتـەوە، هـەر كەسێكیش بڵێ پیسە، دەبێ بەڵگەی دەقێكمان بۆ بهێنێتەوە..

كە دەڵێن بۆچی خوێنی تر، وەكو خوێنی حەیز بە پیس دانانێن ؟ دەڵێین: ئاخر جیاوازی لـە نێوانیانـدا هەیـە، بۆیـە وا ناكـەین.. خـوێنی حــەیز، خــوێنێكی سروشــتی جەســتەی ئافرەتــەو، دەكرێتــە دەرەوە، خەست ترەو، بۆنێكی ناخۆشی لـێ دێـت، بۆیـە حـوكمی، وەكو حـوكمی میزو پیسایی لێ هاتوە، ئەمە وەكو ئەو خوێنە نیە، كە لـە ئەنـدامێكی بڕراوی لەشەوە دێتە دەرەوە.. ئەوە نیـە پێغەمبـەریش صـلی الله علیـە وسـلم دەفـەرموێ: (إنَّ هـذا شـئٌ كَتبَـهُ اللهُ علَـى بَنَـاتِ آدمَ)[١] واتـە ئەمـە شتێكە، خوای گەورە لەسەر كچانی ئادەمی نوسیوە) دەربـارەی خـوێنی جـاری داوێـن، كـە پێـی دەوترێـت: (ئیسـتیحازە) دەفـەرموێ: (إنـهُ دَمُ عِرقٍ) ئەمە خوێنێكی دەمارە.

٧ـ بەڵگەی تریش هەیە، كە هەمو ئەم بۆچونە بـەهێزتر دەكـەن، وەكـو ئـەو فـەرمودەی، كـە ئیبنـو ئـەبو شـەیبە گێڕاوێتیـەوەو، بـەیهیقی لـە (السـنن ١٤١/١) دا هێناوێتیـەوە، بـە سـەنەدی سـەحیحەوە كـە ئیبنـو

---

[١] بوخاری (٢٩٤) موسلیم (١٢١١).

عومەر خوا لێیـان ڕازی بێـت، دومـەڵێکی لـە دەم و چـاو هـاتبو، گوشـی (دەری کرد) خوێنیشی لێ هات، هەر سڕی و نوێژیشی کرد، بـێ ئـەوەی بیشوات، یان دەستنوێژی بۆ بگرێتەوە..

٨ـ یـان ئـەو فـەرمودەی لـە ڕێـی سـوفیانی سـەوری و، سـوفیانی کـوڕی عویەینەوە لە عەتائەوە هاتوە، کە گوتی: عبداللەی کوڕی ئوبەیم بینی تفی دەکردەوە، خوێنی پێوە بو، نە دەستنوێژی شوشتەوەو، نە دەمی[١].

٩ـ لـە فـەرمودەیکی تـردا، کـە بـە کـۆی ریوایەتـەکانی بـەهێزتر دەبێـت، ئیبنو ئەبو شەیبە (١٢٨/١) لە ڕێی شوعبەی کوڕی غەیلانەوە، لە جامع لە مەیمونی کوڕی مەهرانەوە گێڕاوێتیەوە، کە دەڵێ: یەکێك، کە خـۆی ئەبو هورەیرەی بینیبو، وتی: ئەبو هـورەیرەم بـینی پەنجـەی بـە کونـە لوتیـدا کـرد، خـوێنی لـێ هـات سـڕی و نەیشوشـتەوە، دەستنوێژیشـی نەگرتەوە.

١٠ ـ دیسـان بەڵگـەی تـر هەیـە، کـە ئیبنـو مەسعود خـوا لێـی ڕازی بێـت، نوێژی دەکردو خوێنی ئاژەڵی سەربڕراو، بە عاستی بەر ورگیەوە بو، لە دەستنوێژیدا نەیشوشتبۆوە[٢]..

ئەوەش بزانین، کە شەرعناسان، هەنـدێکیان ڕەدیـان لـەم ڕەفتـارەی ئیبنـو مەسـعود بـەوە داوەتـەوە، کـە ئیبنـو مەسـعود، پـاکی جەسـتە و، پۆشـاکی بـە مـەرجی نوێـژ وەرنـەگرتبو، ئـەو، خـوا لێـی ڕازی بێـت،

---

[١] عبدالرزاق: المصنف (١٤٨/١)

[٢] عبدالرزاق: المصنف (٢٥/١) و ئیبنو ئەبو شەیبە: المصنف (٣٩٢/١). کەمال السەید سالم لە صحيح فقه السنة(٧٩/١) دا دەفەرموێ: ئیسنادەکەی سەحیحە و لە

دەیگوت: پاکی جەستە و پۆشاك (لە پیسی)، مەرجی سەلامەتی نوێژ نین.. هەر پێی وابون شتێکی باشترە پاك بن..

١١ ـ ئەو شەرعناسە بەڕێزانەی خوێنیان بە پاك داناوە، ئەوەشیان هێناوەتەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم شەهیدانی ئوحودی بەو خوێنەوە ناشت کە بە لەش و پۆشاکیانەوە بو، نەیشوشتن و ناشتنی.. بە درێژایی مێژوی موسوڵمانانیش، کوژراوی شەڕی ئیسلامی و کوفر، کە شەهید بە خوێنی خۆیەوە، کە بە لەش و پۆشاکیەوەیە، دەنێژران، پیسیش شتێکی زەق و دیارەو، وەسفێك نیە مەعنەوی بێت، وەکو لەش پیسی، کە حوکمێکی شەرعیە، لە شەرعیشدا جیاوازی ناخرێتە نێوان دوو شتی لێکچووەوە، ئیتر جیاوازی نێوان خوێنی شەهیدو، خوێنی کەسێکی تر چیە ؟!

١٢ ـ عائیشەخان خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، کە هەندێك لە خێزانەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، لە مزگەوت بۆ ئیعتیکاف دەمانەوە، لە کاتێکدا، کە لە خوێنی جاری داوێن (ئیستیحازە) شدا بون، کە هەڵدەستان خوێنیان لە پاش جێ دەما، هەیانبو ناچار دەبو، تەشت دانێ و تێیدا دانیشێت[١].. بەڵام هیچ ریوایەتێك نەهاتوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، فەرمانی بە شوشتنەوەی جێگاکانیان دابێت.. ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە خوێنەکەیانی وەکو، خوێنی حەیزەکەیان، بە پیس نەزانیوە..

١٣ـ ئاشکرایە، کە ئەو ئافرەتەی لە خوێنی جاری داوێن (ئیستیحازە) دایە، ڕێ لە مێردی ناگیرێت بۆ کاری سەرجێیی (جیماع) لەگەڵ کردنی، جا

---

[١] بوخاری (٣٠٩).

ئەگەر حوکمی ئەو خوێنی ئیستیحازەیە، وەکو خوێنی حەیزەکە پیس بوایە دەبو رێ لە سەرجێیی لەگەڵ کردنی ئەو ئافرەتانە بگیرایە، چونکە خوای گەورە دەربارەی خوێن و، کات وشوێنی حەیز دەفەرموێ: ﴿فَٱعۡتَزِلُواْ ٱلنِّسَآءَ فِي ٱلۡمَحِيضِ﴾ البقرة/٢٢٢ واتە: لە کاتی حەیزدا لە ژنان دورەپەرێز بن..

١٤- ئەوەی ئەو شەرعناسە بەرێزانەی پێشو گوتویانە، ئیجماعی لەسەرە، ئەم شەرعناسانەی لایەنی دیکە گوتویانە، ئێوە هەر خۆتان ئیختیلافی یاوەرانتان نەقڵ کردوە، کە نوێژیان کردوەو خوێنیان لێ جاری بوە، یان پێوە بوە، ئیتر ئیجماع چۆن دامەزراوە ؟! دیسان دەپرسنەوە: ئەگەر وایە، بۆچی یەك دانە فەرمودەمان لەسەر پیسێتی خوێن و، شوشتنەوەی ئاسەواری پێنەگەیشتوە ؟! لە قبوڵ نەکردنی رای ئەو شەرعناسانەدا، کە پێیان وایە خوێن پیسە ئیمام شەوکانی دەڵێ: (ئەو کەسەی، کە ئەحکامانێکی بێ بەڵگە، دەکاتە حوکمی شەرع، گوناهی کەمترنیە لەوەی، کە بەڵگەی حوکمێك رەت دەکاتەوە. ئەو دوو کەسە هەردوو کیان قسەیان بە دەم خواوە کردوە !

١٥- ناکرێت ئەم خوێنە، بە خوێنی حەیز قیاس کەین، چونکە خوێنی حەیز دەقی فەرمودەی پێغەمبەری صلی الله علیە وسلم لەسەرە، کە پیسە[1].. ئیجماعێکی بنبڕ، لەسەر پیسی خوێنی حەیز هەیە. بەڵام بۆ خوێنی دیکە، ئەو ئیجماعە نیە.

---

[1] حەدیسەکەی ئەسما کە لە بوخاری (٢٢٧) و موسلیم (٢٩١) دایە.

## ٣. خوێنی ئاژەڵ كە گۆشتی دەخورێت:

فەتوا لەسەر ئەمیش لەو ڕووەوە، كـە بەڵگەیـەك لەسـەر پیسـێتیەكەی نیە، وەكو فەتوای خوێنی مرۆڤ وایە، ئەسڵی ئەمیش پاكێتیە..

ئـەوەی بەڵگـەی پـاكێتی ئەمیشـە، فەرمودەكـەی ئیبنـو مەسـعودە كـە دەڵێ: پێغەمبـەر صلی الله علیـه وسـلم، لـە پـەنا كەعبـەدا نوێـژی دەكـرد، ئەبو جەهل و هاوڕێكانی لەو لاوە دانیشتبون، یەكێكیان وتی: ئـەرێ ئـەوە كەسێك نیە، بچێت ئەو ڕیخۆڵەو پیسایی، ئەو ئاژەڵەی ماڵی فلان سـەریان بڕیـوە، بهێنێـت و بیـدا بەسـەر محمـددا ؟! نەگبـەتێكیان چـو، ڕیخۆڵـەو پیسایی و، خوێنی ئاژەڵە سەربڕاوەكەی هێناو، لەو ساتەدا، كە پێغەمبەری نازدرا صلی الله علیه وسـلم لـە سـوجدەدا بـو، هـەموی خسـتە سـەر سـەرو، ناوشانی پیرۆزی ! ئیتر هەمویان كەوتنە پێكەنین[١]...

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، كە ئەگەر خـوێنی ئـاژەڵی گۆشـت خـوراو پـیس بوایـە، پێغەمبـەر صـلی الله علیـه وسـلم، یـان نوێژەكـەی دەبـڕی و تەواوی دەكرد، یان عەباكـەی سـەر شـان و ملـی پـیرۆزی، دادەكەنـدو دوری دەخستەوە، بەڵام كە هیچیان نەكردوە، مانای وایە بە لایەوە پیس نەبوە.

★ ★ ★

## پوختەی توێژینەوەكە:

ئــەوەی لــە توێژینــەوەی حــوكمی شــەرعی، پــاكو پیســی خــوێن دەردەكەوێت، ئەوەیە، كـە خـوێن دەبـێ بـە دوو بەشـەوە: خـوێنی مـرۆڤ و خوێنی ئاژەڵ:

---

[١] بوخاری (٢٤٠) و موسلیم (٧٩/١).

یەکەم: خوێنی مرۆڤ: ئەمیش دوو جۆرە:

١. خوێنی حەیزو نیفاس.

٢. خوێنی تری مرۆڤ (جگە لە خوێنی حەیز).

دووەم: خوێنی ئاژەڵ: ئەمیش دەبێت بە چەند بەشێکەوە:

١. ئەو ئاژەڵانەی گۆشتیان دەخورێت.

٢. ئەو ئاژەڵانەی گۆشتیان ناخورێت.

٣. ئەو گیانلەبەرانەی خوێنی شلەیان تێدا نیـە. ئەوانـەی، کـە خوێنەکەیان سور نیە.

٤. خوێنی وشکبۆوە.

هەر یەکێکیش لەم جۆرانە حوکمی شەرعی خۆیان هەیە..

## یەکەم: خوێنی مرۆڤ:

١. خوێنی حەیزو نیفاس: ئەوەن کە لە پێشی ئافرەتـان دێـت. ئەمـەش کـۆڕای شەرعناسـانیان لەسـەرە، کـە پیسـە.. ئـەمما خـوێنی جـاری داوێـن (ئیسـتیحازە)، ئـەوە ئـەو شەرعناسـانەی، خسـتویانەتە گـەڵ خـوێنی تـری ئاسـایی، بـە پاکیـان زانیـوەو، ئـەوانی تـریش بـە پـیس، چـونکە حـوکمی خوێنی حەیزو نیفاس و، خوێنی جاری داوێـن (ئیسـتیحازە)یان پـێ، وەك یەك وایەو، بەلایانەوە پیسە.

٢ـ خـوێنی تـری مـرۆڤ: (غـەیری خـوێنی حـەیزو نیفـاس): ئەمـەش ئەوەیـە، کـە زۆرینـەی شەرعناسـانی پێشـو، لەسـەر پیسـێتی راکـۆن و، هەندێك لە شەرعناسان وشەرعناسانی دوایـی و، سـەردەم پێیـان وایـە، کـە پاکـە، بۆیـە هـەر خوێنێـك، لـە بـرینی مرۆڤـەوە بێـت، بەلایانـەوە پاکـە..

هەردوو لاشیان ئەو خوێنەیان پێ پیسە، کە لە پاش و پێشی مرۆڤ دێتە دەرەوە، چونکە بەر پیسی کەوتوە..

**دووەم: خوێنی ئاژەڵ:**

**١ـ خوێنی ئەو ئاژەڵانەی گۆشتیان دەخورێت:** هەندێك لە شەرعناسان گوتویانە، وەکو خوێنی مرۆڤەو پاکە، چونکە هیچ بەڵگەیەکمان لەسەر پیسێتیەکەی نیە..ئەمە جگە لەو خوێنەی، کە لەکاتی سەربڕینی ئاژەڵدا فیچقە دەکات و دێتە دەرەوە، ئەمەیان هەمو لایەك لەسەری ڕێکەوتون، کە پیسە، چونکە ئایەتی لەسەرە.. بەڵام ئەو خوێنەی، کە بە گۆشتەکەوە ماوە، یان دوای لێنانی لە دەماردا ماوە، یان بە مەنجەڵەکەوەیە، ئەمانە عەفو لێدراون و پاکن.. چونکە ئەمە بە پێی ڕیوایەتی عائیشەخان خوا لێی ڕازی بێت، لە سەردەمی پێغەمبەریشدا صلی الله علیه وسلم، هەر وابوەو، ئیشکالێکیان تێدا نەبینیوە..

**٢ . خوێنی ئەو ئاژەڵانەی گۆشتیان ناخورێت:** گۆشت و خوێنی هەمویان پیسە، جگە لە خوێنی پشیلە، چونکە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، دەرهەقی فەرمویەتی: قەیدی نیە، چونکە پشیلە پیس نیە، پشیلە لەوانەیە، کە دەستەمۆن و، بەردەوام دێنە لاتان (إنّهَا ليستْ بنَجَسٍ، إنّها مِن الطَّوَّافينَ علَيكُم والطَّوَّافات)[١].

---

[١] ترمزی (٩٢) و خاوەن سونەنەکانی تر، کەمال السەید سالم لە صحیح فقه السنة (٧٩/١) دا دەفەرموێ: حەسەن، سەحیحە ..

**٣. خوێنی ئەو گیانلەبەرانەی شەرعناسانی پێشین فەرموویانە خوێنی شلیان تێدا نیە:** کە ئێستا دەوترێت ئەوی خوێنەکەی، سور نیەو زەردباوە، کە بە هۆی نەبونی هیمۆگلۆبینەوەیە لە خوێنیاندا، ئەمانەش خوێنیان پاکە، بۆ نمونە، خوێنی مێش..

**٤. خوێنی ئاژەڵی مردارەوە بو:** ئەو ئاژەڵانەی، کە بێ سەربڕینی شەرعی مردار بونەتەوە.. ئەوی ئەم حوکمە نایگرێتەوە، خوێنی ماسی و کوللەیە، چونکە فەرمودەی سەحیحیان لەسەرە، وەکو ئەو فەرمودەیە، کە ئەلبانی بە سەحیحی داناوە ((أحِلَّتْ لَنَا مَيْتَتَانِ وَدَمَانِ، فَأَمَّا الْمَيْتَتَانِ فَالْحُوتُ وَالْجَرَاد، وَأَمَّا الدَّمَانِ فَالْكَبِدُ وَالطِّحَالُ))[١]..

دوای ئەم توێژینەوە دەڵێم: کورتە ڕای ئەو شەرعناسانەم پێ پەسەندترە، کە دەڵێن، خوێن پاکە (جگە لەوانەی کۆڕایان لەسەرە، وەکو خوێنی حەیز، کە پیسە)، چونکە بەڵگەکانیان بەهێزترە، وەك لەوەی تەنها، لە شەرعناسانی پێشینەوە نەقڵ کرێت، کە کۆڕایان لەسەر ئەوە بێت، کە خوێن پیسە.. هەرچەندە شەرعناسانی موعتەبەری ئەم ئوممەتەشن، بەڵام دیارە، کە ڕایان لەسەر پیسی خوێن جەم نیە و، بەڵگەکانیشیان لە بەڵگەی شەرعناسانی بەرامبەریان بەهێزتر نیە.. والله اعلم..

مـن نەمویست موناقەشەی مەسەلەی ئیجماعەکە بکەم، کە ئایا مەبەستی ئەو شەرعناسانە، ئەگەر ئیجماعی یاوەرانی پێغەمبەرە صلى الله

---

[١] موسلیم (٢٧٧/١ ژمارە ٣٦٦ )، وئەبو داود لە عون المعبود (١٨١/١١ ژمارە ٤١٠٥)، و ئەلبانی لە (صحيح الجامع الصغير ٥١/١)..

علیه وسلم، ئـەوە وا نیـە، ئەگـەر شەرعناسـانی تـابعین و، دوای ئەوانیشـە، ئەوە مەسەلەکە، ئیحتیمـالی دوو بۆچـون هەڵدەگرێت.. دەشـێت بوترێـت، کێشەیەکی ئیختیلافیەو، فەتوا لەسەر هەردوو و بۆچونەکە دەدرێت و، بـا کەسیش بەرهەڵستی فەتوای لایەنەکەی تر نەکات ..

★ ★ ★

# توێژینەوەیەك لەسەر
# حوکمی ڕشانەوە

وەك بەردەوام وەبیر دەهێنینەوە، کە ئەسڵ ئەوەیە، هەمو شتێك پاکە، ئـەوی لـە پـاکێتی دەریـدەهێنێت، بەڵگـەی ڕاسـت و دروسـتی شـەرعە، بەڵگەیەکی وا، کە پێچەوانەی نـەبێت، یـان بەرامبـەرێکی نـەبێت، ئـەویان پەسەندتر بێت، یان وەکو ئەم وابێـت.. ئەگـەر بەڵگـەی وامـان دەسـکەوت، کە پشتی پێ ببەسـترێت ئـەوە حوکمەکـە ڕۆشـنە، ئەگـەر نـا، ئـەوە بۆمـان نیە، بە بێ بەڵگەیەکی بەهێز، پاکێتی شتێك بکەین بە پیسیی و، حـوکمی پیسێتی بەسـەردا بـدەین، ئەگـەر شـتێکمان بـە پـیس ناسـاند، واتـە خـوای گەورە لەسـەر موسـوڵمانانی فـەرز کـردوە، خـۆی لـێ بـەدور بگـرن، ئەگـەر بەریشیان کەوت، دەبێ خێرا بیشۆنەوە، یان پیس بوەکە لابدەن و، نوێـژی پێوە نەکـەن.. بـۆ مەسـەلەی پـاك و پیسـێتی ڕشـانەوەش، دەبێـت بـە دوی بەڵگەیەکدا بگەڕێین، تـا حـوکمی پیسـێتیەکەیمان بـۆ ڕون کاتـەوە، ئەگـەر چنگمان نەکەوت، یـان چـنگمان کـەوت، بـەڵام هێنـدە لاواز بـو، کـە نابێتـە حوججە، ئەوە مانای وایە، ڕشـانەوە پاکـە.. چـونکە ئەسـڵی هـەمو شـتێك، ئەوەیە، کە پاکە.. بۆ نمونە، ئـەو فـەرمودەی عـەمماری کـوڕی یاسـر، خـوا لێیان ڕازی بێت، کە دەڵـێ: (إِنَّمَا تغْسِلُ ثوبَكَ مِن البَولِ و الغَـائِطِ والقَـئ والدَّمِ و الْمَنِي) واتـە: پۆشاکەکەت لـە میـزو پیسایی و ڕشـانەوەو خـوێن و مەنی دەشـۆیتەوە، لەبـەر ئـەوەی فەرمودەیـەکی لاوازە (ضـعیف)ە، نابێتـە بەڵگەیـەکی شـەرعی، حـوکمی ئـەو پێـنج نـاوبراوە وا بـدات، کـە پیسـن ..چونکە فەرمودەی تری سەحیح هەیە، کە لە ئەبوددەردائـەوە، خـوا لێـی

ڕازی بێت، گێڕراوەتەوە، کە گوتویەتی: (أنَّ النَّبيَّ صلى الله عليه وسلمَ قاءَ فـأفْطرَ فتوَضَّـأ)[١] واتـە: پێغەمبـەر صـلى الله عليـه وسـلم، کـە ڕشـایەوە، ڕۆژوەکەشـی شـکاندو، دەستنوێژیشـی گرتـەوە.. ئـەم فەرمودەیـە بەڵگـەی ئەوە نیە کە ڕشانەوە پیسە، بەڵگەش نیـە بـۆ ئـەوەی دەبێت دەسـتنوێژی لێ بگیرێتەوە، بەڵگەی ئەوەش نیە، کـە بـە ڕشـانەوە دەسـتنوێژ دەشـکێت، بەڵکو دەسـتنوێژگرتنەوە، لـە دوای ڕشـانەوە، بـە کـارێکی بـاش دادەنێـت.. هەر ئەوەندە، چونکە کارێك، کە پێغەمبەری نـازدار صـلى الله عليـه وسـلم کردویەتی، ئەو کارە پێویست ناکات، ئەوەش ڕێسایە..

لـە لایـەکی تریشـەوە ئـەوە بـزانین، کـە هەرچـی دەسـتنوێژ بـەتاڵ دەکاتەوە، مەرج نیە پیسیش بێت، هـەردوو ئیمـام ئیبنـو حـەزم و ئیبنـو تەیمییە، بە تەفسیل باسیان لێوە کردوە..

کەوابو ڕشانەوە پیس نیە..

★ ★ ★

[١] ئەبو داود (٢٣٨١) و ترمزی (٨٧) و ئەحمەد (٤٤٣/٦) و فەرمودەوانی تریش. کەمال ئیبنو السەید سالم لە صحیح فقه السنة(٨٢/١) دا دەفەرموێ: سەحیحە.

# توێژینەوەیەك لەسەر
# فەرمودەی مێشەكە

ئــەم فەرمودەیــەی، كــە بــە فــەرمودەی مێشــەكە (حــديث الذبابــة) بەناوبانگــە، هــەر لــە كۆنــەوە وتوێــژێكی لــە نێــوان لایــەنگران و، بەرهەڵستكارانیدا دروست كـردوە، ئـەوی قەناعـەتی پێـی بـوەو زانیـوێتی، ئەمـە ڕاسـتەو، لـە پێغەمبـەری ڕاسـتگۆوە صـلى الله عليـه وسـلم هـاتوە، تەسـلیمی بـوەو بـە قەناعەتـەوە وەریگرتـوەو، كاریشـی پـێ كـردوە، ئـەوی قەناعەتی پێی نـەبوە، ویسـتوێتی لـە سـەنەد، یـان لـە دەقەكـەی بـدات، تـا بیخاتە خانەی فەرمودەی زەعیفەوە، ئەوی بێ لایەن ماوەتەوە ! خۆی لـێ كـڕ كـردوەو وتـوێتی، ئەمـە جـارێ هـی ئـەوە نیـە، پـێش چـاوی خـەڵكی بخرێت، بـۆ ئـەوەی لـە دینەكـە ڕانەكـەن !! ئـەم سـێ هەڵوێسـتە وای كـرد، منیش ئەم توێژینەوەیە بخەمەڕو، تـا هەڵوێستەكان لـە حەقیقـەت نزیـك كەینەوە:

## یەكەم: سەنەد و دەقی فەرمودەكە:

دكتـۆر خـەلیل ئیـبراهیم سـەلام خـاتر، بـە تەفسـیل لـە سـەنەدو دەقـی فەرمودەكە كۆڵیوەتەوەو، زۆری بە دودا چوە، كە پێویست ناكات، ئێمـەش هەمان ڕەنـج بدەینـەوە، بـە تایبـەتی، كـە ئـەو خـۆی پسـپۆڕی پزیشـكیەو، شـارەزاییەكی باشیشـی لـە شەرعناسـی هەیـەو، كتێبێكـی دانـاوە بـە نـاوی (الإصابة في حديث الذبابة) كە لە دار القبلەی سعودیە لە ١٤٠٥ ك / ١٩٨٥ دا چاپ بوە.. كە ئێمەش بایەخی زۆرتری پێ دەدەین و ئیعتیمـادی دەكەینـە سەر..

ـ ئیمام بوخاری لە سەحیحەکەی خۆی و ئیبنو ماجە لە سونەنەکەیدا لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، هەروەها البەززارو، تەبریزی، لە (مشكاة المصابيح) و ئیبنو حەجەر لە (تلخيص الحبير) دا هێناویانەتەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (إذا وَقَعَ الذُّبابُ في شَرابِ أحَدِكمْ فلْيَغْمِسْهُ ثمَّ لِيَنْزِعْهُ، فإنَّ في أحَدِ جَناحَيهِ داءً وفي الآخَرِ شِفاءً) واتە: ئەگەر مێش کەوتە خواردنەوەی یەکێکتانەوە، با نقومی کات و، پاشان فڕێیدا، چونکە لە باڵێکیدا نەخۆشی هەیە، لە باڵەکەی تریدا چارەسەر هەیە..

ـ هەر بوخاری لە سەحیحەکەیداو، ئیبنو ماجە لە سونەنەکەیداو، ئیمام ئەحمەد لە مەسنەدەکەیدا و، هەر لە ئەبو هورەیرەوە، بە شێوازێکی تر گێڕاویانەتەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموی: (إذا وَقَعَ الذبابُ في شَرابِ أحدِكم فلْيَغْمِسْهُ - كُلَّهُ - ثمَّ لِيَنْزِعْهُ، فإنَّ في أحَدِ جَناحيه داءً وفي الآخَرِ شفاءً) واتە: ئەگەر مێش کەوتە خواردنەوەی یەکێکتانەوە، با هەموی لە ناویدا نقوم کات و، پاشان فڕێیدا، چونکە لە یەکێك لە باڵەکانیدا، نەخۆشی هەیەو، لە باڵەکەی تریدا چارەسەر هەیە.

ڕیوایەتێکی تری بوخاری دەفەرموێ: (إذا وقعَ الذبابُ في إناءِ أحدِكم فامْقِلُوهُ، فإنَّ في أحَدِ جَناحيهِ داءً وفي الآخَرِ شفاءً) واتە: ئەگەر مێش کەوتە دەفر (قاپ) ی یەکێکتانەوە، با لە دەفرەکەیدا نقومی کات، چونکە لە یەکێك لە باڵەکانیدا نەخۆشی هەیەو لە باڵەکەی تریدا چارەسەر هەیە

ـ دیسان ڕیوایەتی تری بوخاری هەیە، کە لە قوتەیبە، ئەویش لە ئیسماعیلی کوڕی جەعفەرو، ئەویش لە عوتبەی کوڕی موسلیم، مەولای بەنی تەیم، ئەویش لە عوبەیدی کوڕی حونەین مەولای بەنی زریق، لە

ئەبو هورەیرەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم گێڕایەوە کە فەرموی: (إذا وقع الذباب في إناء أحدكم فليغمسه كله ثم يَطْرَحْهُ، فإن في أحد جناحيه شفاء وفي الآخر داء) واتە با نقومی کات، پاشان فڕێیدا..

ـ نەسائی و ئیبنو ماجە، لە سونەنیدا لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموی: (أحَدُ جَنَاحَيْ الذبابِ سُمٌ والآخَرُ شِفاءُ، فإذا وَقَعَ في الطَّعامِ، فامقلوهُ، فإنَّهُ يُقَدِّمُ السُّمَّ ويُؤخِّرُ الشِّفَاءَ) واتە:یەکێك لە باڵەکانی مێش ژەهرەو، ئەوی تریان چارەسەرە، جا ئەگەر کەوتە خۆراکی یەکێکتانەوە، با تێیدا نقومی کات، چونکە مێشەکە، ژەهرەکە پێشتر دەخات، وەك لە چارەسەرەکەی، کە دوای دەخات..

ئەحمەدی ئەبوبەکری بوسەیری، لە (مصباح الزجاجة في زوائد ابن ماجة) بە توێژینەوەی موسا محمد عەلی و، عزەت عەلی عەتییە، فەرمودەیکی تری کورتی، لە نەسائیەوە لە سونەنەکەیدا نەقڵ کردوە، کە لە عەمری کوڕی عەلی، ئەوش لە یەحیای کوڕی سەعید القطان و، ئەویش لە ابن و أبي ذئب گێڕاویێتیەوە، دەفەرموێ: (إذا وَقَعَ الذُّبابُ في إنَاءِ أحَدِكُمْ فَلْيَمْقُلْهُ) واتە: ئەگەر مێش کەوتە دەفری یەکێکتانەوە، با تێیدا نقومی کات..

ـ ئیمام ئەحمەدیش لە مەسنەدەکەیدا، لە وەکیعی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی فەزڵەوە، ئەویش لە سەعیدی کوڕی ئەبو سەعیدو، ئەویش لە ئەبوهورەیرەوە، فەرمودەکە بەم ڕیوایەتە دەگێڕێتەوە: (إذا وَقَعَ الذُّبَابُ في طَعَامِ أحَدِكُمْ أو شَرَابِهِ فَلْيَغْمِسْهُ (با نقومی کات) ثمَّ يُخرجْهُ، فإنَّ في أحدِ جناحيهِ داءٌ وفي الآخَرِ شفاءٌ، وإنَّهُ يقدِّمُ الداءَ)..

ـ ئیمام دارمی لە سونەنەكەیدا، لە سولەیمانی كوڕی حەرب و، ئەو لە حەممادی كوڕی سەلەمەو، ئەویش لە سومامەی كوڕی عبداللەی كوڕی ئەنەسەوە، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم دەگێڕنەوە، كە فەرمووی: (إنَّ الذبابَ في أحَدِ جَناحيهِ داءٌ وفي الآخر شفاءٌ، فإذا وقع في إناء أحدكم فلْيَغْمِسْهُ، فإنه يَتقى بالذي فيه الداءُ، ثم يُخرجُهُ) واتە: لە یەكێك لە باڵەكانی مێشدا نەخۆشی هەیەو، لەوی تریاندا چارەسەر، جا ئەگەر كەوتە دەفری یەكێكتانەوە، با یەكجاری تێیدا نقومی كات، بەمەش خۆی بە باڵە شیفادارەكەی، لە باڵە نەخۆشیدارەكەی دەپارێزێت..

بە هەر حاڵ دكتۆر خەلیل، لە دوو ڕێگای سەنەدەكانی لای بوخاری پێنج ڕێگای لای ئەبو داودو ئیبنو ماجەو، لە دە ڕێگای لای ئیمام ئەحمەدو، دوو ڕێگای لای دارمی و، سێ ڕێگای لای بەیهیقی و، هەر یەك لە یەك ڕێگای ئیبنو خوزەیمەو، ئیبنو حیببان و ئیبن الجارود و، شەش ڕێگاكەی لای تەحاوی و، سێ ڕێگای لای بەغەوی و، یەك ڕێگای ئیبنو السسەكەن و، ئیبنو عەبدولبەڕ و، هی تریش كۆڵیوەتەوەو، زۆر بە وردی بە دوای هەموویاندا چوە، تا سەرجەم گەیشتونەتە سێ وچوار ڕێگای گێڕانەوەی تایبەت و، چل و دوو ڕێگای گشتی (كە لە گەڵ بڕگە باسی تردا هاتوە)! تا گەیشتۆتە ئەوەی، كە سەنەدی ئەم فەرمودە، نەك هەر هیچ جۆرە گومانێكی تێدا نیە، بەڵكو لە بەرزترین ڕێگای گێڕانەوەی فەرمودە، چونكە لە زیاتر، لە پەنجا ڕێگاوە ڕیوایەت كراوە! كێش لێی بە گومانە، ئەوە ئەرزو ئەوە گەز بۆمان بسەلمێنێت !!

وەرن دوای توێژینەوەی زانستی، بزانین دەگەینە ئەو ئەنجامەی، كە ئەم فەرمودە پیرۆزە، چەندین لایەنی زانستی سەردەمی، وەكو فیزیاو،

پزیشـكی و، دەرمانسـازی و، مایكرۆبـایۆلۆجی لـە خـۆ گرتـوە، جگـە لـە ئامۆژگاریە دینیەكەی و، ڕەوانبێژیە زمانەوانیەكەی..

## دووەم: باڵی مێش و جۆری میكرۆبەكانی:

١ـ نۆ جۆر بەكتریا لە باڵی مێشدا دەژی، هەنـدێكیان بـە سالب (نێگـەتیف) و، هەندێك بە موجب (پۆزەتیف) دەناسرێن، هەرە بەهێزەكـەیان، پێـی دەوترێت (كایركولانس B.Circulans)، كە لە جۆری موجەبەكانە، كە لە هەموان زیاتر، تەحەمولی گـەرمای بـەرزو، زۆری سـەرماو، تیشك و كارو كارتێكردنی كیمیایی هەیـە، كـە بـڕی ٥ ملگـم/ملـل.ی ئـەم جـۆرە بەكتریایـە بەسـە بـۆ كوشـتنی هـەمو جۆرەكـانی تـری، بـەكتریای بـن هـەردوو بـاڵی مێشـەكە، وەكو جـۆری (B.subtilis و S.aureus )، كـە دەبنە هـۆی نەخۆشـی چـاو ئاوسـان و، دومـەڵ و ئاوسـانی میزەڵدان و، كلێنچـكەو دەرچـەی كـۆم و، دەزگـای میـز، هـەروەها پـیس كردنـی خۆراك.. بەڵام سەرسوڕمان لەوەدایە، كە جۆری بەكتریا كوشندەكە (كە ئێمـە بـە بـەكتریا دڵسـۆزەكە نـاوی دەبـەین)، هـەر ئـەو بەكتریایانـە ناكوژێـت، كـە بـاڵی بەكتریاویـە خراپەكـە لـەخۆی گرتـون، بـەڵكو ئەوانەش، كە بە قاچ و قول و شوێنی تری مێشەكەوەن، بۆیـە لـە نقـوم كردنی مێشەكەدا ئەوانی تریش دەفەوتێنێت..

٢ــ لـە روی زانسـتی بەكتریۆلۆژیـەوە سـەلمێنراوە، كـە تەنانـەت بـەكتریا دڵسۆزەكە، لە ناو زگ و ریخۆڵەشدا بێـت، ڕۆڵـی خـۆی دەبینێـت و، ئـەو بەكتریا زیانبەخشانە دەفـەوتێنێت !! واتـە ئەگـەر بخۆرەكە، كەوچكە چێشت، یـان قـومی لـەو شـوێنەوە لـە خواردنەوەكەیـدا، كـە مێشـەكەی تێكەوتبو، گەر هێشـتا كـاتی تـەفاعول كردنـی، بـەكتریا دڵسـۆزەكە دژی

بـەكتریا زیانبەخشـەكان مابێـت، لـە نـاو ریخۆڵەكانیشـدا بێـت، جـەنگی پیرۆزی خۆی، هەر ئەنجام دەدات !!

٣ـ شـێوازی كـاركردنی بـەكتریا دڵسـۆزەكە ئەوەیـە، كـە هـەر بەوەنـدەی شلەمەنیەكەی دەگاتێ، گەرم بێت، یان سارد، هـەڵی دەمـژێ و، بـە پێـی فشارو تینێكـی زانسـتی، كـە پێـی دەڵێن: (فشـاری ئیسمۆزیی) دەیكاتـە مایەی تەقاندنەوەی خۆی، كە وەكـو نـارنجۆك خێـرا دەتەقێتـەوەو، بـۆ مەسافەی دوو میللیمەتر، كاریگـەریی چارەسـەرەكەی خـۆی دەهاوێـت!! بەمەش هیچ بەكتریایەكی خراپـی بـن بـاڵی مێشـەكە، كـە زیانبەخشـن قوتار نابن !!

٤ـ لەبەر ئەوەی بەكتریا دڵسۆزەكە، لـە پلـەی زۆر بـەرزی گەرمیشـدا دەژی، لـە شـلەیەكی زۆر گەرمـدا بێـت، لەبـەر ڕونـاكی، یـان لـە شـوێنێكی زۆر سـاردا بێـت، لەبـەر تـاریكی، كـاری خـۆی هـەر دەكـات.. لـە هـەمو بارودۆخێكی ئاوادا، دەتوانێت بـڕی ٥ ملگم/ملل بەرهـەم بهێنێت، كـە دەتوانێت ١٠٠٠ لیتر شیر، یان شلەمەنیەكی تر تەعقیم كات !!

٥ـ ئـەم میكرۆبـە دڵسـۆزە، دەڵێـی دینـداری موجاهیـدە، لەگـەڵ پەیـدابونی سـەرەتای هێرشـی بـەكتریا خراپـەكان و، ئیعـازدان بـەم، هێرشـێكی بەرفراوانی كەوانەیی، بۆ گەمارۆدان و لـەناوبردنی بـەكتریا خراپـەكان دەكات و، تا نـەشیان فەوتێنێت، كۆڵ نادات!! سبحان الله..

٦ـ تەقینەوەی بـەكتریا دڵسۆزەكە، توانایـەكی كاریگـەری تـری بـۆ دروسـت دەبێـت، كـە هەرچـی میكرۆبـی تـر هـەبێت، لەوانـەی خـەڵك توشـی نەخۆشی تر دەكەن دەكوژێت، وەكو میكرۆبەكانی گەندە پشكۆ (الجمـرة الخبیثـة) و، تیفۆئیـد(گرانــەتا) و، پاراتیفۆئیـدو، دیـزانتری (میـزی

خوێنـاوی) و، تـەراخومای چـاو نەخۆشـی تـری کۆئەنـدامی هەناسـەو هەرس.

٧ ـ لە دنیادا بڕی ٦٤٠٠٠ جۆر مێش هەیە، ئەوەی، کە لای ئێمـە ناسـراوە، مێشـی ئاسـایی و مـۆزو کرۆمـۆزە، کـە لـە لادێکانـدا ناسـراوە، چـونکە هەندێك شوێن پێی دەڵێن، مێشی گەورو ئـاخورِ. بـەڵام سـەیر ئەوەیـە، کە ئەم هەمو جۆرە مێشە، هـەر جـۆرە بەکتریایـەك، لـە هـەر شـوێنێك لـەباڵی چـەپی خۆیانـدا هـەلگرن، چارەسـەری دژی ئـەو بەکتریانـە، لـە باڵەکەی ترەوە هەلگیراوە، بەرهەم دەهێنێت !!

## سێیەم: هەندێ خاڵی تر بۆ سەرنجدان:

١ـ پێغەمبـەر صـلی الله علیـه وسـلم پـیتی فـائی بـۆ نقـوم کردنـی مێشـەکە بەکار هێناوە کـە بـۆ خێرایـی و پەلـە کـردن و یەکسـەرییە، کەچـی بـۆ دەرهێنانـەوەی مێشـەکە (ثـمَّ) ی بـەکار هێنـاوە، کە بـۆ سسـتی و پەلـە نەکردن و، دوایی ئەنجامدانە!! چونکە ئەگەر مێشەکە، بە باڵی بەکتریا زیانبەخشـــەکەیدا کەوتبێتـــە نـــاو خۆراکەکـــەوە، بـــە خێـــرا نقـــوم کردنەکـەی، چارەسـەرێکی خێـراش دروسـت دەبێـت، چـونکە وتمـان، هەڵمژینی بەکتریا دڵسۆزەکە، بە پێی تـینی ئیسـموزیی، دەبێتـە مایـەی تەقینەوەیـەکی زۆر بـەرفراوان، کـە وەك خولگـەی تەقینـەوەی ئـەتۆم بازنە دەکێشێت و، بۆ ماوەی دوو میللیمەتر کاریگەر دەبێت !!

٢ـ ئەو قسەیەی دکتۆر یوسف القەرەزاوی زۆر ڕاستە، کە لە کتـێبی (السـنن النبویـة مصـدرا للمعرفـة و الحضـارة) دەکـەی خۆیـدا دەڵـێ: نابێـت فـەرمودەی نقـوم کردنـی مێشـەکە، بـە بەرپەرچـدانەوەو گومـان

لێکردنەوە وەرگرین، تەنها لەبەر ئەوەی زۆر ناچێت بە ژیریماندا !! چونکە جگە لەوەی، کە پابەندین بە وەرگرتنیەوە، چونکە فەرمودەی پێغەمبەرەکەمانە صلی الله علیه وسلم، لە توێژینەوەی زانستیانەشەوە بۆمان، دەردەکەوێت، کە رەفتارێکی رەواو حەقیقەتێکی زانستیە..

٣ـ فەرمودەکە، رێ لە تەندروستی باش ناگرێت، رێ لە بەکارهێنانی خۆپاراستن و چارەسەری نەخۆشی ناگرێت، نافەرموێ بیگرن و بیخەنە ناو خواردنەوە، یان چێشتتانەوە !! ناشفەرموێ، پورە مێش، وەکو پورەی هەنگ راگرن ! بەڵکو دەفەرموێ: (باڵێکی نەخۆشی تێدایەو، باڵەکەی تریشی چارەسەر) رێ لە لێکۆڵینەوەی پزیشکان ناگرێت، ئەمەش قابیلی موناقەشەو، لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی زانستی پزیشکیە، چ ئیشکالێکیش لە توێژینەوەدا هەیە بە تایبەتی، کە زانستی تەجریبی (ئەزمون و تاقی کردنەوە) یەکێك بوە، لە سیمای شارستانێتی ئیسلامی ! پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم، دەیەوێت ئەم جۆرە حەقیقەتانە بدۆزرێنەوەو، بۆ سودی مرۆڤایەتی سودی لێ وەرگیرێت، ئەمەیە، کە ئەو پێش هەزارو چوار سەد ساڵ فەرمویەتی، دیارە هەر لە خۆیەوە نەدواوە بۆیە قورئان دەرهەقی دەفەرموێ ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ۝٣ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴾ النجم/٣ـ ٤ واتە خۆ لە هەواو هەوەسی خۆیەوە نادوێت، ئەمە وەحیەو بۆی هاتوە.. ئەمە هاندانە بۆ بە دواداچون و سۆراخ کردن، بۆ دۆزینەوەی هۆکاری نەخۆشی و، رێی چارەسەری، تا زوترو ئاسانترو، بگەنە دەرمانی نەخۆشان!

★ ★ ★

## ئەو برە پیسییەی چاوپۆشی لێکراوە

شەرعناسان زۆر لەم باسەدا راجوێ بون[١]، لە جۆرو بڕی پیسییەك، کە دەبێ عەفوی لێبدرێت، من پێم وایە مادام بەلگەیەکمان لەسەر جۆرو بڕیی نیە، دەمێنێتەوە سەر زەرورەتی لابردنی و، ئەو رەنجەی بۆ لابردنی دەدرێت، ئەگەر پیسیەکە لەو جۆرە بێت، کە خەلکێك پێوەی موبتەلا دەبن، یان برەکەی ئەوەندە زۆرە، یان هەولی لابردن و پاککردنەوەی شوێنەکەی دراوە، بەلام ئاسەواری ماوە، ئەگەر هەمو ئەمانە ئیعتیبار کراو، لە کاتی لادانی پیسیەکەو ئاسەواریدا رەچاو کرا، مانای وایە تەکلیفە شەرعیەکە جێبەجێ کراوەو، نایەوێت خەلکانێك بخەینە سەر وەسوەسە..

★ ★ ★

[١] بڕوانە: وهبة الزحيلي: الفقه الاسلامي وأدلته (١٦٩ ـ ١٧٧).

# باسی سێیـــەم

# تـارەت گرتن

- تارەت گرتن بە چی دەبێت ؟.
- با لێ بەربون تارەت نەگرتنەوەی.
- ئادابی چونەسەر ئاو.
- لە ئادابی تارەت گرتن.
- میزەچرکێ.
- میزكردن بە پێوە.
- دەستنوێژ لە تەوالێتدا.

## باسی سێیەم

## تارەت گرتن (الاستنجاء)

**ماناو حوكمی تارەت گرتن:** ئەمەی لە زمانی كوردیدا پێی دەوترێت تارەت، هەر (طَهَارة) ی زمانی عەرەبییەو، بۆتە زاراوەیەك، بە مانای خۆپاككردنەوەی دوای دەست بەئاو گەیاندن (میز یان پیسایی كردن).. بەلآم ئەسڵە عەرەبیەكەی پێی دەوترێت (الإسْتِنجَاءُ):

**الاستنجاء:** لەسەر كێشی استفعالی كرداری رابوردوی (نَجَوتُ) ە.

- **لە ڕوی زمانەوانییەوە**، بە مانای بڕیمەوە دێت، وەك دەوترێت: (نجوتُ الشجرة) واتە درەختەكەم بڕییەوە.
- **لە ڕوی زاراوەییەوە:** بریتیە لە لابردنی هەرچی شتێك، لە كونی پاش و پێشەوەی مرۆڤ هاتبێت، جا بە ئاو رادرێت، یان بە بەرد و دەسڕی كاغەز (كلینێكس)، یان هاوشێوەیان لابرێت..

لە عەرەبییدا (الاستجمار) یشی بۆ بەكار دەهێنن، كە بە مانای بەكارهێنانی بەردوچكەیە، چونكە (الجمَار) بەردی بچكۆلەیە. هەروەها زاراوەی (الإستِطابَة)، كە بە مانای بۆن خۆش كردنە، وەكو ئەوەی كابرا بە لابردنی شتێك لە خۆی، كە مایەی بۆنی ناخۆشە، خۆی بۆن خۆش كردوە[1].

**حوكمی تارەتگرتن:** مەزهەبەكان، جگە لە حەنەفی، تارەت گرتن لەلایان فەرزە لەسەر هەر كەسێك، كە میزو پیسایی و مەزی و، ئەوی لە حوكمیاندایە، لێ هاتبێتە دەرەوە، چونكە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه

---

[1] ابن قدامة: المغني (١/٢٠٥).

وسلم دەرهەقی دەفەرموێ: (إذَا ذَهَبَ أحَدُكُمْ إلَى الْغَائِطِ فَلْيَسْتَطِبْ بثَلَاثَةِ أحْجَارٍ فإنّهَا تجْزِي عَنَهُ ) حسن[1]واتە ئەگەر كەسێكتان چوە سەرئاو، با بە سێ بەرد تارەت بگرێت، چونكە سێ بەرد بەسە.. ئەمە فەرمانەو، فەرمانیش بۆ واجب بونە، كەوابو تارەت گرتن فەرزە،كە دەشفەرموێ سێ بەردەكە بەسە، فەرزێتیەكەی زیاتر پێ دەچەسپێت.. لە فەرمودەیەكی تردا دەفەرموێ: (لا يَسْتَنجي أحَدُكُمْ بدُونِ ثلاثةِ أحْجَارٍ)[2] واتە: كەستان بە سێ بەرد كەمتر تارەت نەگرێت..

ئیمام ئەبو حەنیفە پێی وایە، تارەت گرتن فەرز نیەو سوننەت، ئەو لە بۆچونەكەی خۆیدا ئیعتیمادی كردۆتە سەر فەرمودەیەك، كە زەعیفە ئەویش ئەمەیە: (مَنْ اسْتجْمَرَ فَلْيُوتِرْ مَنْ فَعَلَ فَقَدْ أحْسَنَ وَمَنْ لا فَلا حَرَجَ)[3] واتە: ئەوی تارەتی گرت، با وتر بێت (سێ بەرد) ئەگەر وای كرد ئەوە چاكی كردوە، ئەگەر نا، ئەوە نارەحەتی تێدا نیە.

## تارەت گرتن بە چی دەبێت ؟

تارەت گرتن بە یەكێك لەمانەی خوارەوە دەبێت:

**یەكەم: بەردو دارو هاوشێوەی جگە لە ئێسك و تەرس و تەپاڵەو ئەوی وەك ئەوانە:** هەروەها بە گەڵاو كاغەزو شتی وا، چونكە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: (إذَا ذَهَبَ أحَدُكُمْ إلَى الْغَائِطِ

---

[1] ابو داود (٤٠) والنسائي (١٨/١) وأحمد (١٠٨/٦ ـ ١٣٣) سەنەدەكەی زەعیفە، بەڵام ئەلبانی لە ارواو الغليلدا دەڵێ: بە یەكتری بەهێز دەبن و دەبنە حسن (الارواء (٤٤) كەمال السەید سالم لە صحيح فقه السنة (٨٨/١) دا دەڵێ: حسن لشواهدە،

[2] مسلم (٢٦٢) والنسائي (١٦/١) والترمذي (١٦).

[3] ئەلبانی لە ضعيف الجامع الصغير ژمارە (٥٤٦٨) بە زەعیفی داناوە..

فلْيَسْتطِبْ بثلَاثةِ أحْجَارٍ فإنّهَا تجْزِي عَنـهُ )[١] واتـە ئەگـەر کەسـێکتان چـوە سەر ئاو، با بە سێ بەرد تارەت بگرێت، چونکە سێ بەرد بەسە..

کـەوابو، تـارەت گـرتن بـە سـێ بەردوچـکە کـەمتر نابێـت. بەڵگـەی ئەوەش:

١ـ فەرمودەکەی لای سەیدنا سەلمانە، خوا لێـی ڕازی بێـت، کـە دەڵـێ: (نَهَانا أنْ نَستقْبلَ القِبْلَةَ لِغَائِطٍ أو بَولِ، أو نَستَتجيَ باليَمِينِ، أو نَستَتجيَ بأقَـلَّ مِـن ثلاثَـةِ أحْجَـارٍ، أو أنْ نَسْـتَتجيَ برَجِيـعٍ أو عَظْـمٍ)[٢]واتــە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەرهەڵستی ئەوەی لێکردوین، کـە لە دەست بە ئاو گەیاندندا (پیسایی کردن بێت، یان هەر میزکردن) ڕو لە قیبلە بکەین، یان بە دەستی ڕاست تارەت بگرین، یـان بـە کـەمتر لـە سێ بەردوچکە خۆمان پاك کەینەوە، یان بـە تـەرس و تەپاڵەوئێسقان، خۆمان پاك کەینەوە.

٢ ـ فەرمودەکـەی لای جـابر خـوا لێـی ڕازی بێـت، کـە فـەرموی: پێغەمبـەری خـوا صلـی الله علیـە وسـلم فـەرموی: (إذا إسْتجْمَرَ أحَدُكُمْ فلْيَسْـتجْمِرْ ثلَاثـاً)[٣] واتـە: ئەگـەر کەسـێکتان تـارەتی گـرت، بـا بـە سـێ بەردوچکە بیگرێت..

---

[١] لە پەراوێزی ژمارە ٧٣ دا وترا: حسن لشواهده، أخرجه ابو داود (٤٠) والنسائي (١٨/١) وأحمد (١٠٨/٦ ـ ١٣٣) سەنەدەکەی زەعیفە، بەڵام شێخی ئەلبانی ڕەحمەتی لە ارواو الغليلدا دەڵێ: بە یەکتری بەهێز دەبن و، دەگەنە پلەی حسن (الارواء (٤٤).

[٢] موسلیم (٢٦٢) و نەسائی (١٦/١) وترمزی (١٦).

[٣] ئەحمەدو ئیبنو ئەبی شەیبەو ئیبنو خوزەیمە هێناویانەتەوەو، بە ڕاستیان زانیوە. الحويني: بذل الاحسان (٣٥١/١) بسند صحيح.

٣ ـ فەرمودەکـەی خـەلالی کـوڕی سـائیب، کـە لـە باوکیـەوە (بـە مەرفوعی) گێڕاوێتیەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیـه وسلم فـەرموی: (إذا دَخَلَ أحَدُكُمْ الْخَلَاءَ فَلْيَتَمَسَّحْ بِثَلَاثَةِ أحْجَارٍ)[١] واتە: ئەگەر یەکێکیتان چوە سەر ئاو، با بە سێ بەردوچکە خۆی پاك کاتەوە..

بێگومان ئەمە مانای وا نیە، لانی زۆری، دەبێت سێ بەردوچکە بێت، چونکە ئەگەر بە سێ بەردوچکە پاك نەبۆوە، دەبێت زیاتر لـە سـێ بـەکار بهێنێت..

فەرمودەکانی سەرەوە، ئاماژەی ئەوەیان تێدا بو، کە تـارەت گـرتن بـە ئێسقان و تەرس و تەپاڵەو شتی وا نابێت.. فـەرمودەی تـریش لـەو بـارەوە هەیـە، وەکو فەرمودەکـەی لای ئیبنـو مەسـعود، خـوا لێـی ڕازی بێـت، کـە دەڵێ: پێغەمبـەر صـلی الله علیـه وسـلم فـەرموی: (لا تَسْتَنْجَوا بِـالرَّوْثِ ولا بالْعِظَامِ فانَّهُ زادُ إخْوانِكُمْ مِنَ الْجِنِّ)[٢]واتە: تارەت بـە تـەرس و تەپاڵـە، یـان بە ئێسقان مەگرن، چونکە ئەوانە خۆراکی برا جنۆکەکانتانن.

لە ئیبنو مەسعودیشەوە گێڕراوەتەوە، کە دەڵـێ: (أتـى النَّبـيُّ صـلى الله عليـه وسـلم الغـائِطَ، فـأمَرَنِي أنْ آتِيـهِ بِثَلَاثَـةِ أحْجَـارٍ، فَوَجَـدْتُ حَجَـرَيْنِ والْتمَسْتُ الثَّالِثَ فَلَمْ أجِدْهُ، فأخَذْتُ رَوْثَةً فَأتَيتهُ بهَا، فأخَذَ الحَجَـرَيْنِ وألْقَـى الرَّوْثَةَ، وَقَالَ: هذا رِكْسٌ)[٣] واتـە: پێغەمبـەر صـلی الله علیـه وسـلم، ویسـتی دەست بە ئـاو بگـەیەنێت، فـەرموی سـێ بەردوچـکەم بـۆ بێنـە، منـیش دوو

[١] ئیمامی ئەحمەد و ئیبنو ئەبی شەیبە و ئیبنو خوزەیمە گێڕاوێتیانەوەو شێخ حوەینی لەکتێبی(بذل الاحسان ٣٥١/١)ەکەی خۆیدا گوتویەتی: سەنەدەکەی سەحیحە.

[٢] موسلیم (٦٨٢)، ترمزی (١٨)، ئەحمەد (٤٣٦/١).

[٣] (بوخاری(١٥٦)، ترمزی(١٧)، نەسائی(٤٢)، ئیبنو خوزەیمە، زیادەی باسی گوێدرێژەکە لای ئەلبانیش، لە سەحیحی ئیبنو ماجە (٢٥٣) و سەحیحی ئیبنو خوزەیمە (٣٩/١ و٧٠/١) بە سەحیحی ناساندوە..

بەردوچـکەو تەرسـێکی گوێدرێـژم بـۆ هێنـا، دوو بەردەکـەی وەرگـرت و، تەرسەکەی فڕێدا، فەرموی: ئەویان پیسە.

**دووەم: تارەت گرتن بە ئاو:** لەبەر ئـەوەی پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیه وسلم، ئەوەندەی دەستی بکەوتایـە، ئـاوی بـەکار دەهێنـا، ئەنـەس خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدْخُلُ الْخَلَاءَ فَأَحْمِلُ أَنَا وَغُلَامٌ نَحْوِي إِدَاوَةً وَعَنَزَةً فَيَسْتَنْجِي بِالْمَاءِ )[1] واتە: کە پێغەمبـەر صلی الله علیه وسلم دەچوە دەست بە ئـاو گەیانـدن، مـن و مێردمنـداڵێکی تر، جەوەندەی ئاوەکەمان بۆ هەڵدەگرت، کە تارەتی پێ دەگرت[2].

بێگومان تارەت گرتن بە ئاو باشترە، وەك لە بەرد، چونکە وەکـو ئـەبو هـورەیرە خـوا لێـی ڕازی بێـت گێڕاوێتیـەوە[3]: خـوای گـەورە مـەتحی ئـەو کەسـانەی فـەرموە، کـە پاکـژ بـون و، هەمیشـە تارەتیـان بـە ئـاو دەگـرت، ئەوەش هۆکاری هاتنە خـوارەوەی ئـەم ئایەتـە بـوە: ﴿فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُطَّهِّرِينَ﴾ التوبـە/١٠٨ واتـە: ئـەو مزگەوتانـەی، کـە پیاوانێکی تێدایە، کە حەز دەکەن پاك بن، خواش پاکژانی خـۆش دەوێـت.

---

[1] بوخاری (١٥١) و موسلیم (٢٧٠، ٢٧١) فەرمودەوانانی تریش.

[2] دواة: وەکو مەسینە وابوەو لە چەرم دروست کراوە، عَنَزَة: دارێك بوە لە ڕم کورتر و زۆر جار نوکی ڕم، یان سێلکیان پێوە کردوە، ئیمامی بوخاری دەڵێ: دەستەواژەی (فیستنجي بالماء) قەولی ئەنەس نیە، قەولی ئەبو الولیدە، کە یەکێکە لە پیاوانی سەنەدەکە

[3] کەمال السەید سالم لە صحيح فقه السنةدا دەڵێ: ئەبو داود (٤٤) و ترمزی (٣١٠٠) و ئیبنوماجە (٣٥٧) بە سەنەدێکی زەعیف، بەڵام شێخی ئەلبانی دەڵێ: سەنەدەکانی تر فەرمودەکە دەگەێننە پلەی حەسەن. الالباني: ارواء الغليل (٤٥).

ئــەوەش ڕای ســوفیانی ســەوری و، عبداللــەی کــوڕی موبــارەك و، ئیمــام شافیعی و، ئیمام ئەحمەدو، ئیسحاقە[1]..

## تـارەت لە بـا لـێ بەربون ناگیرێت:

هەر کەسێك بـای لـێ بـەربو، یـان لەخـەو هەسـتاو، پێویسـتی بەچـونە سـەر ئـاو نـەبو، دەتوانێـت دەسـتنوێژ بشـوات، بـێ ئـەوەی تـارەت بگرێـت، ئیبنوقودامە دەڵێ: وانازانم ڕاجوێیی لەم مەسەلەیەدا هەبێت، بۆیە ئیمام ئەحمەد دەیگوت: نە لە قورئاندا، نە لە سوننەتدا بەڵگەیەك لەسـەر ئـەوە نیـە، کە تـارەت لەسـەر بـا لـێ بەربونـەوە هـەبێت. زەیـدی کـوڕی ئەسـلەم، ڕەحمەتی خوای لێ بێت، دەیفەرمو: خوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ﴾ المائدە/٦ واتە: کـە هەسـتان بـۆ نوێـژ، بـڕۆن دەستنوێژ بشۆن.. مەبەستی ئەو کاتەیە، کە لە خەو هەڵدەستن..

## تـارەت مەرج نیە بۆ دەستنوێژ:

زۆر کەس وا دەزانن تارەت و دەستنوێژ، لازم و مەلزومی یـەکن، بـەڵام ئەمە وا نیە، هەر یەکەیان لەوی تریان جودایە، ئەسڵی تارەت گرتنەکەش، بۆ لادانی پیساییە، لەم حاڵەتەدا پیسایی نیە، تا لابرێت[2] هیچ ریوایـەتێك لـە پێغەمبـەری پێشـەواوە، صـلى الله علیـه وسـلم نـەهاتوە، کـە بـۆ هـەمو دەستنوێژێکی چوبێتە سەرئاو، کەوابو، کە لە سـوننەتدا نـەبێت، ئـەوە لـە ئایەتیشدا فەرز نەکراوە..

---

[1] ترمذي (٣١/١).
[2] ابن قدامه: المغنى ٢٠٦/١..

## هەندێك لە ئادابی چونە سەر ئاو ( تارەت گرتن )

هەندێك رەفتار هەن، دەبێت موسوڵمان لە چونە سەر ئاویدا، بۆ میـز كردن، یان پیسایی ڕەچاویان بكات، لەوانە:

١ . **دەرنەكـەوتن و دور كەوتنـەوە لـە بینـینی خـەڵكی:** ئەسـڵ ئەوەیـە، كـە موسـوڵمان لـە ئاودەسـتدا دەسـت بـەئاو بگـەیێنێت، بـەڵام ئەگەر لە سەفەر بو، یان دەوار نشین بو، لە دەشت و چۆڵیدا، پێویستە ئەوەنـدە دور كەوێتـەوە، كـە لەبەرچاوان دیـار نـەمێنێت، وەك ئـەوەی بچـێتە چـاڵێك یـان كەنــدەلانێك، یــان نەدیوێكــەوە، یــان زۆر دور كەوێتـەوە، چـونكە پێغەمبـەری پێشـەوامان صـلی الله علیـە وسـلم وای دەكرد.. سەیدنا جابری كوڕی عبداللە خوا لێـی ڕازی بێـت دەڵـێ: لـە سەفەرێكدا لە خزمەت پێغەمبەری خـوادا صلی الله علیـە وسـلم بـوین، كە دەیویست تارەت بگرێت، ئەوەندە دور دەكەوتەوە نەدەبینرا.[1].

٢ . **هیچ شتێك نەباتە سەرئاو كە ناوی خوای پێوە بێت:** وەكو ملوانكـەو زنجـیرو مسـتیلە[2] چـونكە لەگـەڵ بەمـەزن دانـانی خـوای پەروەردگاردا ناگونجێت، بەڵام ئەگەر لە گیرفانیدابو، یان ملوانكـە، یـان

---

[1] ئەبو داود (٢)، ئیبنوماجە (٣٣٥) ئەمەش لەفزی ئەمیانەو سەحیحە.

[2] كەمال السەید سالم لە صحیح فقه السنة (٩٢/١) دا دەفەرموێ: ئەو فەرمودەیە، كە دەگێرڕێتەوە، كە پێغەمبەری نازدار مستیلەیەكی لە پەنجەی پیرۆزیدا بو، ناوی خوای لەسەر بو، كە دەچوە سەر ئاو لە پەنجەی پیرۆزی دادەماڵی، هەرچەندە ئیمامانی بەرێزی وەكو ئەبوداودو ترمزی و نەسائی و ئیبنو ماجە ریوایەتیان كردوە، ئەلبانی رەحمەتی دەڵێ: زەعیفە.مەبەست ریوایەتی داماڵینی مستیلەكەیە نەك هەبونی مستیلەكەی، ریوایەتی هەبونی مستیلەكە، كە لێی نوسرابو محمد رسول الله متفق علیە.. بوخاری (٥٨٧٢) و موسلیم (٢٠٩٢).

زنجیرەکـە لـە ملیدایـە، یـان قورئانـەو کیفـی هەیـە، ناکرێـت لـە دەرێ دانـرێن، یـان بەدەسـتەوە بگیرێـن، جائیزە پێیانـەوە بچێتە سـەر ئـاو، لەبـەر زەرورەتـی. حاڵەتەکـەی ئیمـام ئەحمـەد دەربـارەی مسـتیلەی وا دەیگوت: دەتوانێـت لـە مشتی گرێـت، بـەڵام لـەو حاڵەتەشدا، لەوانەیـە مەترسـی کەوتنـە نـاو ئاودەسـتەکەی هـەبێت، بـە تایبـەتی ئاودەسـتی مزگـەوت و، شـوێنی گشـتی ئـەم سـەردەمە.. مـن خـۆم دکتـۆر عبداللـە عەززامی رەحمەتیم دی، کە قورئانی قەبارە بچوکی پێبو، پێیەوە چوە ئاودەسـت، لـێم پرسـی: گـوتی: ئەگـەر کیفـی هـەبو، زنجـیری پێوەبـو، ئیشکالی نیە..

٣ . **خوێندنی زیکرەکانی تایبەت بە چونەسـەرئاو:** کەسێك، کە دەچـێتە ئاودەسـت، باشـتر وایـە ئـەو زیکرانـە بخوێنێـت، کـە ریوایـەت کـراون، وەکـو وتـنی بسـم اللـە لەگـەڵ چـونە ژورەوەیـدا. چـونکە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفـەرموێ: (سِـترُ مَـا بَـينَ الْجِـنِّ وَعَـوْرَاتِ بَـنِي آدَمَ إِذَا دَخَـلَ أَحَـدُهُمْ الْخَلَـاءَ أَنْ يَقُـولَ: بِسْـمِ اللهِ)[١] واتـە: پەردەی نێـوان جنۆکـەو مـرۆڤ، کـە چوە سـەر ئـاو ئەوەیـە، بڵـێ: بسـم اللـە.. یـان دەتوانێـت، کـە چـوە سـەر ئـاو، لـەو کاتـەی پـێ دەنێتـە نـاو ئاودەستەکە، یان پۆشاکی دادەنێ، یان بـەرز دەکاتـەوە، بڵـێ: (أللَّهُـمَّ إنِّـي أعُوذُ بِكَ مِنْ الْخُبْـثِ و الْخَبَائِـثِ)[٢] واتـە: خوایـە پـەنا دەگـرم بـە تـۆ، لـە نێرو مێیی جنۆکە..

---

[١] ترمزی وئیبنوماجە گێڕاویانەتەوەو سەحیحە بڕوانە: الالباني: صحيح الجامع (٣٦١١).
[٢] بوخاری (١٤٢) و موسلیم (٣٧٥).

**٤ . چونە ئاودەست بە پێی چەپ و هاتنە دەروە لێی بە پێی راست:** هەرچەندە بەڵگەیەكی تایبەت لەسەر ئەوە نیە، كە پێغەمبەری نازدار صلى الله عليه وسلم، پێی چەپی پیرۆزی، بۆ چونە ئاودەست پێش خستبێت و، پێی ڕاستی پیرۆزی لە هاتنە دەرەوەدا پێش خستبێت، بەڵام ئیمام شەوكانی باسی لەمە كردووەو، بە شێوەی گشتی بە سوننەتی داناوە[1]، چونكە پێغەمبەری نازدار صلى الله عليه وسلم، لە هەمو شتێكدا، دەست و پێی ڕاستی، پێش چەپەكانی دەخست..

**٥ . ڕو یان، پشت نەكردنە قیبلە، لە كاتی دانیشتنی سەرئاودا:** لەبەر ئەوەی پێغەمبەری نازدار بەرهەڵستی لەوە كردوە.. فەرمودەی (متفق عليه)یە، كە سەیدنا ئەبو ئەیوبی ئەنساری، خوا لێی ڕازی بێت، دەگێڕێتەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، فەرموی: (إذَا أتيْتمُ الغَائِطَ فلَا تسْتقْبلُوا القِبْلَةَ ولَا تسْتدْبرُوها، ولَكِنْ شرِّقُوا أو غرِّبُوا)[2] واتە: ئەگەر چونە دەست بەئاو گەیاندن، نە ڕو، نە پشت، لە قیبلە مەكەن، ڕو لە ڕۆژهەڵات، یان ڕۆژئاوا بكەن.. ئەبو ئەیوب دەڵێ: كە هاتینە شام، بینیمان ئاودەست ڕوەو كەعبە دروست كراوە، ئێمە لە بەكارهێنانیدا خۆمان خوار دەكردەوەو، داوای لێبوردنمان لە خوای گەورە دەكرد..

شەرعناسان لەم باسەدا، ڕاجوێ بون، چونكە فەرمودەی تر هەیە، كە شیاوێتی ئەم كارە دەگەێنێت.. ئیبنو عومەر، خوا لێیان ڕازی بێت،

---

[1] الشوكاني: السيل الجرار ٦٤/١

[2] بوخاری (٣٩٤)، موسلیم (٢٦٤)، ئەوانی تریش..

دەگێڕێتەوە، دەڵێ: شەوێك لەسەربان ڕاکشابوم، پێغەمبەری نازدارم بینی صلى الله عليه وسلم بۆ دەست بەئاو گەیاندن لەسەر دوو خشت دانیشتوە، ڕوی لە بەیتولمەقدیس بو. ئەوەش، چونکە لە مەدینە بو، واتە پشتی لە مەککە بوە..

ئیمام ئیبنو حەجەری عەسقەلانی و، ئیمام نەوەوی توێژینەوەیەکی دورودرێژیان لەم مەسەلەیەدا کردوەو، ڕای زۆر لە شەرعناسانیان نەقڵ کردوە[١] کە کورتەکەی ئەمەیە:

**یەکەم: ئەو شەرعناسانەی گوتویانە: بەرهەڵستیەکە گشتیەو روکردن یان پشت کردن قیبلەکە دەگرێتەوە لە ماڵدا بێت یان لە دەرەوە:** ئەمەش ڕای ئیمام ئەبو حەنیفەو، ئەحمەدو، ئیبنو حەزمەو، ئیبنوتەیمییە ئەمەیانی هەڵبژاردوە، ئیبنو حەزمی رەحمەتی، ڕیوایەتەکانی بردۆتەوە سەر ڕای ئەبو هورەیرەو، ئەبوئەیوبی ئەنساری و، ئیبنو مەسعودو، سوراقەی کوڕی مالیك خوا لێیان ڕازی بێت، لە تابعینیش، ئەمە ڕای عەتاء و، نەخەعی و، سەوری و، ئەوزاعی و، ئەبو سەورە، بەڵگەی هەموشیان فەرمودەکەی لای ئەبوئەیوبی ئەنسارییە، کە پێشتر هێنامانەوە..

**دووەم: ئەوانەی گوتویانە: بەرهەڵستیەکە تەنها دەشت دەگرێتەوە:** ئەمەش بۆچونی ئیمام شافیعی و، ڕیوایەتی ڕاستی ئیمام ئەحمەدو، ئیسحاقە .

---

[١] ئیبنو حەجەری عەسقەلانی: فتح الباري(١/٢٩٦)، وئیمامی نەوەوی: المجموع(٢/٨٢).

**سێیەم: ئەوانەی گوتویانە: دەشێت ڕوت لە قیبلە بێت، نەك پشت:** ئەمەش بۆچونێکی تری، ئیمام ئەبو حەنیفەو، ئیمام ئەحمەدە، هەردوو کیشیان، ئیعتیمادیان کردۆتە سەر، فەرمودەکەی لای ئیبنو عومەرو، ئەوەی ئەبوئەییوبی ئەنساری، کە پێشتر هێنامانەوە..

**چوارەم: ڕوکردن و پشت کردنە قیبلە هەردوو کیان جائیزە:** ئەمەش بۆچونی دایکە عائیشەخانەو عورووەی کوڕی زوبەیرو ڕەبیعەو داودە. دەڵێن: مادام فەرمودەکان تێکەڵن و، پێچەوانەی یەکتری دەوەستنەوە، کەوابو هیچیان وەرناگیرێت و، دەچینەوە سەر ئەسڵەکە، کە جائیز بونی هەمو شێوەکانی، دەستبەئاو گەیاندن..

ئەوەی من پێم پەسەندە ڕای یەکەمە، کە بەڵگەکەی بەهێزتر دەبینم، ڕوکردن، یان پشت کردنە قیبلە، لە کاتی دەست بەئاو گەیاندندا، لە ماڵ بێت، یان لە دەشت، حەڕامە. والله اعلم..

**٦ . خۆگرتنەوە لە قسەکردن، مەگەر بۆ زەرورەت:** ئیبنو عومەر خوا لێیان ڕازی بێت، دەگێڕێتەوە کە جارێك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، دەستی بەئاو دەگەیاند کابرایەك لەوێوە تێپەڕی و، سەلامی لێکرد، بەڵام پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وەڵامی نەدایەوە[١]..

وەڵامدانەوەی سڵاو فەرزە، بەڵام، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وەڵامی سەلامی کابرای نەدابێتەوە، بەڵگەی ئەوەیە، کە قسە کردن لە کاتی دەست بە ئاو گەیاندندا، حەڕامە، بە تایبەتی زیکری

---

[١] موسلیم (٣٧٠)، ئەبوداود (١٦)، نەسائی (١/١٥) و ئیبنو ماجە (٣٥٣).

خوای گەورە، کە ئاشکرایە سڵاو کردن، یان وەڵامدانەوەی زیکری خوای گەورەن..

بەڵام ئەمـە ڕێ لـە کـاری زەروری ناگرێت، وەکو داواکردنـی ئـاو، یـان ڕێنیشاندانی کوێرێك، یان ئەوی لەو جۆرە حوکمەدان..

**٧ . خۆپاراستن لـە دەست بـەئاو گەیاندن لەسـەرە ڕێ و سـەر کـانی و ئـاو سێبەرو شـوێنی گشـتی خـەڵکی:** ئـەبو هـورەیرە خـوا لێـی ڕازی بێـت دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم، فەرموی: (إتقُوا اللَّعَّانَيْنِ، قَالُوا: وَمَا اللَّعَّانَانِ يَا رَسُولَ اللَّهِ ؟ قَالَ: الَّذِي يَتَخَلَّى فِي طَرِيقِ النَّاسِ أَوْ فِي ظِلِّهِمْ )[1] واتە: خۆ لەو دوو لەعنەتکارانـە بپارێزن، فەرمویان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو دوو لەعنەتکارانە چـین ؟! فــەرموی: دەســت بــە ئــاو گەیانــدن، لــە ســەرەڕێی خــەڵکی و بەرسێبەرەکانیان..

**٨ . میز نەکاتـە هـەمان شـوێنەوە، کـە خـۆی تێـدا دەشـوات:** بـە تایبەتی شوێنێك، کە ئاوەکەی تێدا کۆببێتـەوە، وەکو تەشت و بـانیۆو شـتی وا. چـونکە پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسلم، بەرهەڵسـتی موسـوڵمانانی لـە کـاری وا کـردوە.. وەکو لـەو فەرمودەیـەدا هـاتوە، کـە سەیدنا عبداللەی کوڕی موغەففەل گێڕاوێتیەوە، کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فـەرموی: ( لَا يَبُولَنَّ أَحَدُكُمْ فِي مُسْتَحَمِّهِ)[2]

---

[1] موسلیم (٦٨) و ئەبوداود (٢٥).

[2] خاوەن سونەنەکان (ئەبو داود (٢٧)، نەسائی (٣٦)، ترمزی (٢١)، ئیبنو ماجه (٣٠٤) و ئیمامی ئەحمەد (٥٦/٥) هەر پێنجیان ریوایەتیان کردوە، کەمال السسەید سالم لە صحیح فقه السنةدا دەڵێ: سەحیحە.

واتە: کەستان لەو شوێنەدا میز نەکات، کە خۆی لێ دەشوات ..

**٩ . میز نەکردنە ناو ئاوەوە:**

**. ئاوی ڕاوەستاو:** وەکو ئەستێڵکی بچوك و حەوزو، شتی وا. چونکە جابری کوڕی عبدالله، خوا لێیان ڕازی بێت، دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم (نَهَى أنْ يُبَالَ فِي المَاءِ الرَّاكِدِ)[1] واتە: بەرهەڵستی کردوە، لە میز کردنە ناو ئاوی ڕاوەستاوەوە..

**. ئاوی جاری (لێڕواو):** هەر لە سەیدنا جابری کوڕی عبداللەوە، خوا لێیان ڕازی بێت دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، بەرهەڵستی لەوەش کردوە، کە میز بکرێتە ناو ئاوی جارییەوە[2]..

**١٠ . هەڵبـژاردنی جێگـای فشـەڵ و لـوس بـۆ میـز کـردن:** خـۆ دورخستنەوە لە جێی ڕەق، کە مەترسی ئەوە هەیە پرژی پێ هەڵپرژێتەوە.. سەیدنا ئەبو موسای ئەشعەری، خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم (أَنَّهُ مَالَ إِلَى دَمْثٍ مِنَ الْأَرْضِ فَبَالَ فِيهِ )[3] واتە: لایدایە شوێنێکی تەختی فشەڵ و، میزی لێ کرد..

**١١ . نەیکاتە کونی زەوی و درزی تاوێرو کلۆری درەخت و شوێنی واوە:** لەبەر ئەوەی قەتادە لە عبداللەی کوڕی سەرجەس،

---

[1] موسلیم (٢٨١)، نەسائی (٣٥)، ئیبنو ماجە (٣٤٣)، ئەحمەد (٣٥٠/٥).

[2] الطبراني: الاوسط (١٧٧٠)، مجمع الزوائد (٢٠٤/١). ورجاله ثقات.

[3] ئەبوداود ((٣)، ئەحمەد (٤١٤/٤).. شێخی ئەلبانی دەفەرموێ لە سەنەدەکەیدا مەجهولێك هەیە بۆیە زەعیفە، بەڵام دیارە کە ماناکەی ڕاستەو وایە..

خـوا لێـی ڕازی بێـت دەگێڕێتـەوە، كـە (نَهَـى رَسُـولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيـهِ وَسَلَّمَ أنْ يُبَالَ فِي الْجُحْرِ)[1] واتە: پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليـه وسـلم، بەرهەڵستی كردوە لە میزكردن لە كون و درزەوە، لە قـەتادەیان پرسـی بۆچی بەرهەڵسـتی لـێ كـردوە؟! فـەرموی: لەبـەر ئـەوەی ئـەو شـوێنانەماڵی جنۆكەیە. بێگومان لەبەر ئەوەشە، كە نەبادا گیانلەبـەرییان تێـدا بێـت و، ئازاریـان پـێ بگـەیێنێت، ئـەوانیش بێنـە دەرەوەو، زیـان بـەم بگەیێننەوە..

**١٢ . كە تەواو بێت بڵێ: غُفْرَانَكَ:** چونكە لـە دایكـە عائیشـەخانەوە، خوا لێی ڕازی بێت هاتوە، كە دەڵێ: كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليـه وسلم، لە دەست بەئاو گەیاندن، دەهاتە دەرەوەی، دەیفەرمو: (غُفْرَانَكَ)[2] واتە: داوای لێبوردنت لێ دەكەم، خوایە..

**١٣ . پابەنـد بـون بـە ئـادابی تـارەت گرتنـەوە:** كـە دواتـر باسـیان دێت..

★ ★ ★

---

[1] ئەبوداود (٢٩)، نەسائی (٣٤)، ئەحمەد (٨٢/٥)، حاكم (١٨٦/١)، بەیهیقی (السنن الكبرى ٩٩/١).ئەوانیش و ئیبنو خوزەیمەش بە سەحیحیان داناوە.. سید سابق: فقه السنة (ل ٣٦) چاپی یەك بەرگیەكەی.

[2] ترمزی (٧)، ئەبوداود (٣٠)، ئەحمەد (١٥٥/٦)، كەمال السسەید سالم لە صحیح فقه السنة(٩٥/١) دا دەڵێ: حسن لغيره .

## لە ئادابی تارەت گرتن

ئەمەش هەنـدێك ئـادابی تـری تـارەت گـرتنن، کـە پێویستـە موسوڵمان پێیانەوە پابەند بێت:

**١ . بە دەستی راستی تارەت نـەگرێت:** لەبەر ئـەو فەرمودەیـەی، کە ئەبو قـەتادە خـوا لێـی ڕازی بێـت گێڕاوێتیـەوە، کـە پێغەمبـەری خـوا، صلى الله عليه وسلم فەرمویـەتی: (لَا يُمْسِكَنَّ أَحَدُكُمْ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ وَهُوَ يَبُولُ وَلَا يَتَمَسَّحْ مِنَ الْخَلَاءِ بِيَمِينِهِ وَلَا يَتَنَفَّسْ فِي الْإِنَاءِ )[١] واتـە: کەسـتان کاتێك میز دەکات، بە دەستی راستی زەکەری، نەگرێت، خۆشـی بـە دەسـتی ڕاستی پـاك نەکاتـەوە (چـەپ بـەکار بهێنێـت بـۆ تـارەت گـرتنی)، لـە کـاتی ئاوخواردنەوەشـدا، هەناسـەکەی نەخاتـەوە نـاو ئـەو شـتەی، کـە ئاوەکـەی تێدایە..

هەروەها، کە سەلمانی فارسی خوا لێی ڕازی بێت، دەڵێ: کابرایەك پێی وتم: هاوڕێکەتان (مەبەسـتی پێغەمبـەری خـوا بـو، صـلى الله عليـه وسـلم) هەمو شتێکتان فێر دەکات، تەنانەت دەست بە ئاو گەیاندنیش، وتم: ئەرێ وەڵا، بەرهەڵستی لەوە کردوە، کە یەکێکمان لە کاتی میز کرن، یان پیسایی کردندا، پشت کەینە قیبلە، یان بـە دەسـتی ڕاسـت خۆمـان، پـاك کەینـەوە، یان کەمتر لە سێ بەردوچکە بەکار بهێنین[٢] !

---

[١] بوخاری (١٥٣)، موسلیم (٢٦٧)، هەروەها هەندێك لە خاوەن سونەنەکان..
[٢] موسلیم (٢٦٢)، ئەبوداود (٧)، ترمزی (١٦)، نەسائی (١٦/١).

٢ . عـەورەتی بـە دەسـتی راسـت نـەگرێت: بەلگـەمان هـەر فەرمودەکەی پێشوی ئەبو قەتادەیە خوا لێی ڕازی بێت..

٣ . پـاش و پێشـی خـۆی بـە تـەواوی پـاك كاتـەوە: ئەمـەش واجبە، جا بە ئاو پاکی دەکاتـەوە، یـان بـە بـەرد، یـان بـە دەسڕی کاغـەزو هاوشێوەی، ڕێ لەوە ناگیرێت بـەرد، یـان دەسڕی کاغـەز بـەکار بهێنێت و، پاشـان بیشـوات.. گـرنگ ئەوەیـە، هـیچ پیسـاییەکیان پێـوە نـەمێنێت.. هەڕەشەی سەخت لەسەر ئەوانەیە، کە خۆیان پـاك ناکەنـەوە.. وەکو ئـەو فەرمودەیـەی، کـە ئیبنـو عـەبباس خـوا لێیـان ڕازی بێـت، لـە پێغەمبـەری خواوە صلی الله علیه وسلم، ڕیوایەتی دەکـات: (عَـنْ ابْـنِ عَبَّـاسٍ قَـالَ خَـرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ بَعْضِ حِيطَانِ الْمَدِينَةِ فَسَمِعَ صَوْتَ إِنْسَانَيْنِ يُعَذَّبَانِ فِي قُبُورِهِمَا فَقَـالَ يُعَـذَّبَانِ وَمَـا يُعَـذَّبَانِ فِـي كَـبِيرٍ وَإِنَّـهُ لَكَـبِيرٌ كَـانَ أَحَدُهُمَا لَا يَسْتَتِرُ مِنْ الْبَوْلِ وَكَانَ الْآخَرُ يَمْشِي بِالنَّمِيمَـةِ ثُـمَّ دَعَـا بِجَرِيـدَةٍ فَكَسَرَهَا بِكِسْرَتَيْنِ أَوْ ثِنْتَيْنِ فَجَعَلَ كِسْرَةً فِي قَبْرِ هَذَا وَكِسْـرَةً فِـي قَبْـرِ هَـذَا فَقَالَ لَعَلَّهُ يُخَفَّفُ عَنْهُمَا مَـا لَـمْ يَيْبَسَـا )[١] واتـە: پێغەمبـەری خـوا، صـلی الله علیه وسلم، بە لای باخاتێکی شاردا تێپەڕی و، گوێی لەزریکەو نالەی دوو کەس بو، کە لە گۆڕەکانیاندا، لە تاو ئازارو ئەشـکەنجەی خۆیـان، هاواریـان دەکـرد، فـەرموی: لـەژێر ئەشـکەنجەدان، لەبـەر شـتێکی گـەورەش نیـە! یەکێکیان لەبەر ئەوەیە، کە خۆی لە دوای میز کردنی پـاك نـەدەکردەوەو، ئـەوی تریشـیان دوزمـانی لـە نێـوان خەلکیـدا دەکـرد.. پاشـان داوای لقـە دارێکی خورمای کرد و، کردی بە دوو چلەوە، هەر یەکەیانی خستە سەر

---

[١] بوخاری (٢١٦)، موسلیم (٢٩٢)، ئەبو داود (٢٠)، ترمزی (٧٠)، نەسائی (٣١)

گـۆڕی یـەکێکیان و، فـەرموی: بـەڵکو تـا ئـەو سـاتەی سـەوز بمێـنن، ئەشکەنجەیان لەسەر کەم بکەنەوە..

**٤ . دوای تـارەت دەسـتی بـە سـابون بشـوات:** دوای تـارەت گرتنەکە، ئەگەر سابونی دەسکەوت، با دەستی پـێ بشوات، ئەگەر هیچی دەست نەکەوت، با خۆڵ لە دەستەکانی هەڵسوێت، یان لە زەوی بخشێنێت و پاکی کاتـەوە.. ئـەبو هورەیرە، خـوا لێـی ڕازی بێـت، دەڵـێ: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَتَى الْخَلَاءَ أَتَيْتُهُ بِمَاءٍ فِي تَوْرٍ أَوْ رَكْوَةٍ فَاسْتَنْجَى ، ثُمَّ مَسَحَ يَدَهُ عَلَى الْأَرْضِ ثُمَّ أَتَيْتُهُ بِإِنَاءٍ آخَرَ فَتَوَضَّأَ)[١] واتـە: کـە پێغەمبـەری خـوا، صـلى الله عليـه وسـلم، تـارەتی دەگـرت، مـن ئـاوم لـە قۆریـەك، یـان لـە کیتەڵەیـەکی بچوکدا بـۆ دەهێنـاو، ئـەویش تـارەتی پـێ دەگرت، پاشان دەستی بە زەوی پاك دەکردەوە، ئینجا ئاوی ترم بۆ دەهێناو دەستنوێژی دەگرت..

ـ هەروەها ئەو فەرمودەیـەی، کـە مەیمونـەخان ریوایـەتی کـردوە: (عَنْ مَيْمُونَةَ قَالَتْ سَتَرْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يَغْتَسِلُ مِنْ الْجَنَابَةِ فَغَسَلَ يَدَيْهِ ثُمَّ صَبَّ بِيَمِينِهِ عَلَى شِمَالِهِ فَغَسَلَ فَرْجَهُ وَمَا أَصَابَهُ ثُمَّ مَسَحَ بِيَدِهِ عَلَى الْحَائِطِ أَوْ الْأَرْضِ ثُمَّ تَوَضَّأَ وُضُوءَهُ لِلصَّلَاةِ ) واتـە: پێغەمبـەری خوا، صـلى الله عليـه وسـلم ويسـتی غوسـڵ دەرکـات، پەردەیـەکم بـۆ ڕایـەڵ کرد، تا لە چاوان دیار نەبێت، ئیتر غوسـڵەکەی دەرکـرد، سـەرەتا ئاوەکـەی ڕشاند بەسەر زەکەریداو، بـە دەسـتی چـەپی هـەڵیگلۆفت وشوشـتی، پاشـان

---

[١] ئەبو داود (٤٥)، ترمزی (٤٥)، ئیبنو ماجە (٣٥٨)، نەسائی (٤٥/١) بەیهیقی (١٠٦/١)، مشكاة المصابيح (٣٦٠). حسن لغيره

دەستی بە زەوی سڕی و شتیەوەو، پاشان دەستنوێژی گرت، وەکو، کە بۆ نوێژی دەگرت.[1]

لەم سەردەمەی ئێمەدا ئاسانترە، کە خەڵکی دوای تارەت گرتن دەستیان بە سابون، یان شلەمەنی سابونی بشۆن، یان بە دەسڕی تەعقیم کراو پاك بکەنەوە.. ئەمە لە ئیسلامدا زۆر جەختی لێکراوەتەوە، کە دیارە سودەکەشی پاراستنی، تەندروستیی و لەش ساغیی کەسایەتی و، پاراستنی کەشی گشتیە..

## ٥ . رشاندنی کەمێك ئاو بە عەورەتدا بۆ لابردنی وەسوەسە:

ئیبنو عەبباس، خوا لێیان ڕازی بێت گێڕایەوە، کە جارێکیان پێغەمبەری نازدار، صلى الله عليه وسلم، کە دەستنوێژی گرت، عەورەتی بە کەمێك ئاو ڕشاند[2]..

★ ★ ★

---

[1] بوخاری (٢٦٦)، موسلیم (٣١٧).

[2] ئەبو داود (١٦٦)، نەسائی (١٣٥)، ئیبنوماجە (٤٦١)، ئەحمەد (٣/ ٤١٠)، دارمی (٧١١)، بەیهیقی (١٦١/١) ، ئەلبانی رەحمەتی لە کتێبی (تمام المنة ل ٦٦) دا دەفەرموێ: وسنده صحيح على شرط الشيخين..

## مەسەلەی میزەچڕكێ

هەر كەسێك دوچاری میزە چڕكێ بوبێت، دەبێت بۆ هەمو نوێژێك، دەستنوێژی تایبەت بەو نوێژە بگرێت، ئەو كاتەی، كە دەزانێت نوێژ بوە (كە گوێی لە بانگ دەبێت، یان بە سەعاتدا دەزانێت، یان پێی دەڵێن) بچێت تارەت بگرێت و، كەمێك تین بداتە خۆی، دەست بە دەمارەكانی بن زەكەریدا بهێنێت و، دەستنوێژەكەی بگرێت، ئەگەر دوای ئەوە، دڵۆپە میزی لێ چۆڕی، گوێی نەداتێ و نوێژی خۆی بكات !! چونكە زاهیرەن ئەمە، لەسەر قەولی ئیمامانی بەرێزی وەكو، ئیمام ئەبو حەنیفەو، شافیعی و، ئەحمەدو، ئیسحاق و، ئەبو سەورو، ئەوانە، بە حوكمی خوێنی جاری داوێن (ئیستیحازە) ی ژنان قیاس دەكرێت، كە پێغەمبەری نازدار، صلى الله عليه وسلم لە حوكمیدا بە ژنەكەی فەرمو: (إِنَّمَا ذَلِكِ عِرْقٌ وَلَيْسَ بِالْحَيْضَةِ فَإِذَا أَقْبَلَتِ الْحَيْضَةُ فَاتْرُكِي الصَّلَاةَ فَإِذَا ذَهَبَ قَدْرُهَا فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ وَصَلِّي)[1] واتە: ئەوە دەمارە، حەیز نیە (واتە خوێنێكی سروشتیەو، جێ مەترسی نیە و پاكە) ئەگەر خوێنی حەیز هات واز لە نوێژەكان بهێنەو، مەیانكە، تا دوای ماوەی خۆی، پاك دەبیتەوە، ئینجا جێی خوێنی ئەمیان بشۆو، نوێژی خۆت بكە. تەكمیلەی تری لای بوخاری دەفەرموێ: (ثُمَّ تَوَضَّئِي لِكُلِّ صَلَاةٍ، حَتَّى يَجِيءَ ذَلِكَ الْوَقْتُ)[2] واتە: پاشان دەستنوێژ بۆ هەر نوێژێك، بە تایبەت بگرە، تا كاتی نوێژەكەی تر دێت..

---

[1] بوخاری (٢٢٨)، موسلیم (٣٣٣)، نەسائی (١/١٨٥ ) و بەیهیقی (١/٣٢٧)..

[2] كەمال السسەید سالم لە صحیح فقه السنة(١ / ٩١)دا دەفەرموێ: هەندێك لە فەرمودەوانانی وەكو ئیمامی ئیبنو حەجەری عەسقەلانی گوتویانە: ئەم زیادەیەی

ئەو شەرعناسانەی، كە زیادەكەی بوخاری بە قەولی سەیدنا عوروە لێك دەدەنەوە، گوتویانە، كە بۆ هەمو نوێژێك دەستنوێژی تایبەتی ناوێت، بەڵام هەمو ئەوانی تر گوتویانە، كە هەر پیاوێك میزە چڕكەی بێت، یان ژنێك، كە خوێنی جاری داوێن (ئیستیحازە) ی هەبێت، دەبێت بۆ هەمو نوێژێك دەستنوێژێكی تایبەتی بۆ بگرن و، دەستنوێژەكەش، تا نوێژەكەی تر حسێبە.. ئەمەش لای من ڕای پەسەندترە..

★ ★ ★

---

بوخاری قەولی عوروەی كوڕی زوبەیرە خوا لێیان ڕازی بێت، كە فەرمودەكەی لە دایكە عائیشەوە گێڕاوەتەوە كە پورێتی.. ابن حجر: فتح الباري ٣٣٢/١.

## مەسەلەی میز کردن بە پێوە

ئەم باسە پێنج فەرمودەی لەسەرە، کە دوانیان زەعیفن و، سیانەکەی تریان سەحیحن، دوو زەعیفەکە:

١ ـ ئیبنو عومەر خوا، لێیان ڕازی بێت گێڕایەوە، کە سەیدنا عومەری باوکی گێڕاوێتیەوەو، گویەتی: کە جارێکیان بە پێوە میزی کردوەو، پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم بینیوێتی، پێی فەرموە: (يا عُمَرُ، لا تبُلْ قَائِماً)[1] واتە: ئەی عومەر، میز بە پێوە مەکە.. منیش لەو کاتەوە میزم بە پێوە نەکردوە..

٢ ـ بورەیدە، خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (ثَلَاثٌ مِنَ الْجَفَاءِ: أَنْ يَبُولَ الرَّجُلُ قَائِمًا، أَوْ يَمْسَحَ جَبْهَتَهُ قَبْلَ أَنْ يَفْرُغَ مِنْ صَلَاتِهِ، أَوْ يَنْفُخَ فِي سُجُودِهِ )[2] واتە: سێ شت لە ڕەفتاری زبرن: پیاو، کە بە پێوە میز بکات، پیاو، کە ناوچەوانی بسڕێت پێش ئەوەی لە نوێژەکەی ببێتەوە، فو لە شوێن سوجدەکەی بکات..

---

[1] ئیبنو ماجە (٣٠٨)، بەیهیقی (٢٠٢/١)، حاکم (١٨٥/١) ترمزی دەڵێ: بەلامەوە زەعیفە، چونکە عبدالکەریمی کوڕی ئەبو المەخاریقی تێدایەو، یەکسەر بە مەرفوعی گێراوێتیەوە، فەرمودە گێڕانەوەی ئەم پیاوە، لای فەرمودەوانان زەعیفە.. بڕوانە تحفة الاحوذي في شرح سنن الترمذي (٣٣٣/١).

[2] مونکەرە، بوخاری لە (التاريخ ٤٩٦) دا ڕیوایەتی کردوە، ئەلبەززار (٥٤٧/١) ، بوخاری ڕەحمەتی خوای لێ بێت، بە مونکەری داناوەو، ئەویش و ترمزیش گوتویانە: قەولی ئیبنو مەسعودە.. مونکەر: لە سەنەدەکەیدا ڕاویەك هەیە، کە هەڵەی زۆرە، یان فسقی لێوە دەرکەوتوە، یان گێلە.. بڕوانە محمود الطحان: تيسير مصطلح الحديث ل ٩٥

ئەمما سێ فەرمودە سەحیحەكە:

١ ـ عائیشەخان، خوا لێی ڕازی بێت، دەڵێ: (مَنْ حَدَّثَكُمْ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَبُولُ قَائِماً فَلا تصَدِّقُوهُ مَا كَانَ يَبُولُ إلا قَاعِداً)[١] واتە: هەر كەسێك پێی وتن، كە پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم، بە پێوە میزی كردوە، بە ڕاستی مەزانن، چونكە بە دانیشتنانەوە نەبێت، میزی نەكردوە..

٢ ـ حوزەیفەی كوڕی یەمان، خوای لێ ڕازی بێت دەڵێ: (عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ أَتى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُبَاطَةَ قَوْمٍ فَبَالَ قَائِمًا ثُمَّ دَعَا بِمَاءٍ فَجِئْتُهُ بِمَاءٍ فَتَوَضَّأَ)[٢] واتە: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بوم صلى الله عليه وسلم، كە گەیشتە سەر سەرەنگوێلك (زبڵدان) ی گوندێك، بە پێوە میزی كرد.. دوایی دەستنوێژی گرت. واتە مەبەستی بو، كە حوزەیفە ببینێت، كە بە پێوە میز دەكات..

٣ ـ فەرمودەی عبدالرحمانی كوڕی حەسەن كە دەڵێ: (خَرَجَ عَلَيْنَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَفِي يَدِهِ كَهَيْئَةِ الدَّرَقَةِ قَالَ فَوَضَعَهَا ثُمَّ جَلَسَ فَبَالَ إِلَيْهَا)[٣] واتە: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، لێمان دەركەوت، شتێكی بە دەستەوە بو، وەكو چەرمی قەڵغان وابو، دایناو لە تەنیشتیەوە دانیشت و، میزی كرد.

---

[١] ترمزی (١٢)، نەسائی (٢٦/١)، ئیبنو ماجە (٣٠٧)، ئەحمەد (١٩٦/٦) كەمال السسەید سالم لە صحيح فقه السنة(٩٦/١) دا دەفەرموێ: صحيح لغيره.

[٢] بوخاری (٢٢٦)، موسلیم (٢٢٧٣) و خاوەن سونەنەكانیش..

[٣] ئەبوداود (٢٢) نەسائی (٢٧/١) ئیبنو ماجە (٣٤٦) ئەحمەد (١٩٦/٤)، كەمال السەید سالم لە صحيح فقه السنة(٩٦/١) دا دەفەرموێ: سەحیحە..

لەبـەر هـەبونی ئـەم فەرمودانـە، شەرعناسان دەربـارەی حـوكمی میـز كردن بە پێوە، ڕاجوێ بون، ڕاكانیان لە سێ بۆچوندایە:

**یەكەمیان:** ئەوانەی گوتویانە: هـەر كەسـێك عـوزری نـەبێت، بـۆی شـیاو نیە بە پێوە میز كات.. ئەمەش ڕای عائیشەخان و، ئیبنو مەسعودو، سـەیدنا عومـەرو، ئـەبو موسـای ئەشـعەری و، لـە تـابعینیش، ئیمـام شەعبی و، سوفیانی كـوڕی عویەینـەو، ئیمـام ئـەبو حەنیفـەو ئیمـام شافیعیە..

**دووەمیـان:** ئەوانـەی فەرمویانـە: جـائیزە.. ئەمەشـیان لـە ریوایـەتێكی تری سەیدنا عومەردا هاتوە، هەروەها ڕای سـەیدنا عـەلی و، زەیـدی كوڕی سـابیت و، ئینـو عومـەرو، سـەهلی كـوڕی سـەعدو، ئەنـەس و، ئەبو هورەیرەو، حوزەیفـەی كـوڕی یەمانـە.. مەزهـەبی حەنبـەلیش ئەمەیە..

**سـێیەمیان:** ئەگـەر ئـەو شـوێنەی میـزی لـێ دەكـات فشـەڵ بێـت، كـە پرپشـكی بـۆ نەیاتـەوە، جـائیزە، ئەگـەر نـا، جـائیز نیـە.. ئەمـەش مەزهەبی ئیمام مالیكەو، ئیبنولونزیریش بە راستترینی داناوە..

من پێم وایە میز كردن بە پێوە جائیزە.. واللە اعلم. چونكە:

١ ـ هیچ حوكمێكی سەحیح، لەسەر رێ لێگرتنی بەدەستەوە نیە..

٢ ـ ریوایەتـەكان، كـە دەسـەلمێنن، كـە میـزی بـە پێـوە كـردوە، ڕێ لـەوە ناگرن، كە بە كردنی بە پێوەش جائیز بێت.

٣ ـ بەڵگەی میز کردنی بە پێوە بەهێزەو، سەلمێنراوەو، پێنج لە خاوەن سوحاحەکان ڕیوایەتیان کردوە، لەوانیش بوخاری و موسلیم..

٤ ـ نکوڵی کردنی دایکە عائیشەخان لەبەر ئەوە بوە، کە خۆی نەیدیوە، چونکە ئەو جارەی، کە میزی بە پێوە کردوە (ڕیوایەتەکەی حوزەیفە) لە دەشت و سەفەردا بوە، حوزەیفەی لە خزمەتتدا بوە، نەك عائیشەخان، خوا لێی ڕازی بێت، کە لە ماڵدا بینیویێتی و لەو سەفەرانەشدا، کە لە خزمەتیدا بوە، تەنها نەبون..

٥ـ دیارە لە مەرجی سەرەکی میز کردن ئەوەیە، کە پڕیشکی پێ هەڵنەپڕژێت، جا بە دانیشتنانەوە بێت، یان بە پێوە، هەر کاتێك ئەم مەرجەش مسۆگەر بو، ئیتر میز کردن بە پێوە جائیزە، وەکو ئەوەی شوێنەکە فشەڵ بێت، وەکو کێڵگەو کادێن و شوێنی پوش و بن گەڵا، یان بۆیەکراوی زەیتی و، شکڵی ئەم ئاودەستانەی لەم سەردەمەدا هەن..

٦ ـ زۆر لە شەرعناسان لە لایەنی کۆمەڵایەتیەوە، بۆ ڕێگرتن لەم ڕەفتارە چون، بۆیە گوتویانە: میز کردن بە پێوە، بای دەنگدار دروست دەکات، وەکو ئەوە نیە کابرا دانیشتبێت و، بای لێبوبێتەوە، ئەمەشیان بۆ پاراستنی کەسایەتی، زیاتر خستۆتەوە بەرچاو..

## كورتە باسێك
## دەستنوێژ لە تەوالێتدا

یـەكێك لـەو موناقەشـانەی لـە نـاو موسـوڵمانانـدا دروسـت دەبێـت، مەسەلەی دەستنوێژگرتنە لە تەوالێتدا، كە دەوترێت، نابێت زیكری خوا لەوێدا بكرێت، ئەی چۆن هەر لەوێدا دەستنوێژ دەگیرێت، كـە تەوالێتەكـە (گـونجی میـزو پیسـایی كردنەكـە) دەسشـۆر (مەغسـەل)، یـان دوشـی ئاوەكەش، هەر لە ناو ژوری حەمامەكەدایە ؟!

با ئەوە بزانرێت، كە تەنها گونجی تەوالێتەكە بـە ئاودەسـت حسێبەو، ناشێت نـاو زیكـری خـوای تێدا بهێنرێـت، نـەك ژوری حەمامەكـە، ئەگـەر كەسـێك چـوە سـەر گـونجی تەوالێتەكـەو، پۆشـاكەكەی هەڵدایـەوە، یـان داكەند، تا لە دەست بە ئاو گەیاندنەكەی دەبێتەوە، بۆی نیـە زیكـر بكـات، پـاش پۆشـاك هەڵكێشـانەوەی، یـان دادانـەوەی كـراس و دشداشـەكەی، دەتوانێت زیكرەكان بخوێنێت، وەك ئـەوەی دەپـژمێت و دەڵێ: الحمـد للـە، یان لەسەر مەغسەلەكە، بۆ دەسپێكی دەستنوێژ، بسم الله بكات..

★ ★ ★

# باسی چوارەم

# پاککردنەوە

ـ پاککردنەوەی ئەوانەی پیسییان بەر کەوتوە:

پۆشاك لە خوێنی حەیز،
پۆشاك لە میزی منداڵ،
پۆشاك لە مەزی،
داوێنی پۆشاك،
بنی پێڵاو لە پیسایی،
قاپ لە لیکی سەگ،
پێستە خۆش کردن،
تەنەکە رۆن و دۆشاو لە ئاسەواری مشك .

ـ پا کردنەوە مەرج نیە هەر بە ئاو بێت.

## باسی چوارەم

## چۆنیەتی پاككردنەوەی ئەوانەی پیسیان بەركەوتوە

### ١ـ پاككردنەوەی پۆشاك لە خوێنی حەیز:

دەســتپێداهێنان و، گوشــینی بەســەری پەنجــەكان، بەســە بــۆ ئــەوەی خوێنەكــەی لــێ بێتــە دەرەوە، پاشــان ئــاوی پێــدا دەكرێــت و، حــوكمی پاكبونــەوە وەردەگرێــت.. ئەگــەر بــە پۆشــاك و جێگــاوە بــو، دەكرێــت بكرێنرێت، یان بـە پەنجـە رادرێـت.. چـونكە ئـەسمائی كچـی ئەبوبـەكری سدديق، خوا لێیان ڕازی بێت گوتی: (عَنْ أَسْمَاءَ قَالَتْ جَاءَتْ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ إِحْدَانَا يُصِيبُ ثَوْبَهَا مِنْ دَمِ الْحَيْضَةِ كَيْفَ تَصْنَعُ بِهِ قَالَ تَحُتُّهُ ثُمَّ تَقْرُصُهُ بِالْمَاءِ ثُمَّ تَنْضَحُهُ ثُمَّ تُصَلِّي) [١] واتـە: ئافرەتێـك هاتـە خزمـەت پێغەمبـەری خـوا، صـلى الله عليـه وسـلم و، لێـی پرسی: ئەی پێغەمبەری خـوا، ئێمـەی ئافرەتـان هـی وامـان هەیـە، خـوێنی حەیزەكەی بەر پۆشاكەكانی دەكەوێت، چـی بكـات ؟! پێغەمبـەر، صـلى الله عليـه وسـلم فـەرموی: دەیپروێنێـت، پاشـان ئـاوی بەسـەردا دەرێـژێت و، هەڵیدەگلۆفێت، پاشان نوێژی پێوە دەكات..

دیـارە كـە یەكـەمجار دەیپروێنێـت، زۆرینـەی پیسـیەكە دەڕوات، بـە تایبـەتی، كـە وشـك بوبێتـەوە، پاشـان كـە ئـاوی بەسـەردا دەكات و، جـوان هەڵیدەگلۆفێت بۆ ئەوەیە، كە ئاسەواری پیسیەكەشی لێ كاتەوە.. ئاوا لێـی دڵنیا دەبێتەوە، نەك هەر بە ئاوپێداكردنی.. ئەگەر پیسـیەكە هێشـتا تـەڕ

---

[١] بوخاری (٢٢٧)، موسلیم (٢٩١).

بو، دەشێت بە چیلکەیەك، یان شتێکی وەکو ئەو بیکرێنێت و، پیسیەکە لادات، پاشان بیشوات، مەرجە ئاسەواری پیسیەکە ئەوەندەی بۆی دەکرێت لابدات  بێگومان بۆ لابردنی پیسی، سێ جار شوشتن، یان بەکارهێنانی سابون، زیاتر دڵنیایی دەبەخشێت.. چونکە ئوم قەیسی کچی میحسەن گوتی: (عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ قَالَتْ سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ دَمِ الْحَيْضِ يُصِيبُ الثَّوْبَ فَقَالَ اغْسِلِيهِ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ وَحُكِّيهِ بِضِلَعٍ )[١] واتە: دەربارەی خوێنی حەیز، کە بە پۆشاکەوە بێت، پرسیارم لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کرد، فەرموی: بە شتێك ڕایدەو پاشان بە ئاو سیدر[٢] بیشۆ.

## ٢ـ پاککردنەوەی پۆشاك لە میزی منداڵ:

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: (بَولُ الغُلامِ الرَّضِيعِ يُنْضَحُ وبَولُ الجَارِيَةِ يُغسَلُ)[٣] واتە: بۆ پاککردنەوەی شت، لە میزی کوڕی بچکۆلە، ئاو ڕژاندنی بەسەردا بەسەو، لە میزی کچی بچکۆلەش دەشۆرێتەوە. ئەمە بۆ ئەو کۆرپانەن، کە شیرەخۆرەن، کە گەیشتنە خۆراك خواردن (واتە

---

[١] ئەبوداود (٣٦٣) ونەسائی (١/١٩٥) وئیبنوماجە (٦٢٨) کەمال السسەید سالم لە صحیح فقە السنة (١/٨٤) دا دەفەرموێ: حديث حسن..

[٢] سیدر گەڵایەکی بۆندارەو کەف دەکات، لە یەمەن زۆرە.

[٣] ئیمامی ئەحمەد گێڕاوێتیەوەو، شێخی ئەلبانی بە سەحیحی ناساندوە. حەدیسی دیکە لەم بابەتەدا زۆرن، لەوانە (يُغسَلُ من بَولِ الجاريَةِ ويُرَشُ مِن بَولِ الغلامِ) کە زانایان دەربارەی گوتویانە (صحيح لغيره: أخرجه ابوداود (٣٧٦) والنسائي (١/١٥٨) وابن ماجه (٥٢٦) وله شواهد.  هەروەها: وعن عائشة ـ رضى الله عنها ـ قالت: (أتى رسول الله صلى الله عليه وسلم بصبي يُحَنِّكُهُ فبَالَ عليهِ فأتبَعَهُ الماءَ). (رواه البخاري وكذلك أحمد وابن ماجه وزاد "ولم يَغسِلهُ"، ولمسلم: كانَ يُؤتى بالصِّبيانِ فيُبَرِّكُ عليهم وَيُحَنِّكُهُم فأتِيَ بصَبيٍّ فبَالَ عليهِ فدَعَا بمَاءٍ فأتبَعَهُ بَولهُ ولمْ يَغسِلهُ).

غـەیری شـیر)، ئـەوە وەکـو قـەتادە دەڵـێ: شـوێن میـزی هـەردووکیان دەشۆرێتەوە، ئیمام ترمزی دەڵێ: ئەمە ڕای زۆرێـك لـە یـاوەران و، تـابعین و، شەرعناسی گەورەی وەکو، ئیمام ئەحمەدو ئیسحاقە، شەوکانی لـە (نیـل الاوطـار) دا دەڵـێ: ئـەوە ڕای ئـەوزاعی و، مالیـك و، شافیعیشـە.. ئیبنـو عوسێمین رحمەالله دەڵێ: ئاوپڕژاندن، کە لـە فەرمودەکـەدا هـاتوە، بـریتی نیە بەسەردا پڕژاندنی، بەڵکو بەسەردا کردنی، تـەنها ئەوەنـدە هەیـە، کـە شوشتن و، هەڵگلۆفتنی مەرج نیـە.[١].

### ٣ـ پاككردنەوەی پۆشاك لە مەزی:

مــەزی زۆرجــار دێتــە خــوارێ و، خاوەنەکــەی هەســتی پــێ ناکــات، خــەڵکانێکیش پێـوەی موبتــەلا دەبـن، بۆیــە حــوکمی پاككردنــەوەی لــە شەرعدا، ئاسان کراوە، پاككردنەوە لە مەزی، ئاو بەسەردا کردنـی لوێچێك ئاوی بەسـە، سـەهلی کوڕی حـەنیف دەڵـێ لەوانـە بـوم، کـە زۆر لـە هاتنـە خوارەوەی مەزیم، نارەحەت بوبوم، لە پێغەمبەری پێشەوام صلى الله عليه وسلم پرسی: چۆن پۆشاکەکەم لە مەزی پاك کەمەوە، کە بەری دەکەوێت؟ فەرموی: (يَكْفِيكَ أنْ تأخذَ كفّاً مِن ماءٍ فتنتضحَ بهِ ثوبَكَ حَيثُ ترَى أنّهُ قدْ أصَابَ منْهُ)[٢] واتە: لوێچێك ئاوت بەسە، بیرژێنیت بەسەر ئەو شوێنەدا، کە وادەزانیت بەری کەوتوە.

---

[١] ابن دقيق العيد: شرح عمدة الاحكام ل ٣٧ .

[٢] حسن: أخرجه ابوداود (٢١٠) الترمذي وابن ماجه (٥٠٦).

## ٤ـ پاككردنەوەی داوێنی پۆشاك:

لەبەر ئەوەی داوێنی پۆشاك، لەبەر زۆر درێژییان، یان لـە چـەمانەوەدا بـەر زەوی دەكـەوێت و، ئیحتیمـالی ئـەوە زۆرە پیسـی بـەر بكـەوێت و، خاوەنەكەی نەزانێت، بۆیە شـەرع وای دانـاوە، كـە ئەگـەر پیسیش بوبێت بەر زەوی كەوتنەوەی دواتری، بۆتە مایـەی پاككردنـەوەی.. ئافرەتێـك لـە ئوم سەلەمەی خێزانی پێغەمبەری صلى الله عليه وسلم پرسـی، خـوا لێـی ڕازی بێت، وتی: من ئافرەتێكم دایمـە كراسـەكەم درێـژەو، دەچـمە شـوێنی پیسەوە، خاتو ئوم سەلەمە گوتی: (يُطَهِّرُهُ مَا بَعْدَهُ) صحیح[1]، واتـە: هـەر زەویەكە پاشتر پاكی دەكاتەوە..

## ٥ـ پاككردنەوەی بنی پێڵاو:

ئەبوسەعیدی خودری، خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموی: (إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلْيَقْلِبْ نَعْلَيْهِ، ثُمَّ لِيَنْظُر فِيهِمَا فَإِنْ رَأَى خَبَثًا فَلْيَمْسَحْهُ بِالْأَرْضِ، ثُمَّ لِيُصَلِّ فِيهِمَا)[2] واتە: كە دێن بۆ مزگەوت، هەر كەسەتان، با نەعلەكانی هەڵگێڕێتەوەو، سەیری بنی بكات، ئەگەر پیسایی پێوە بو، با بە زەویەكەی بسڕێت، پاشان نوێژی پێوە بكات..

---

[1] صحيح: أخرجه ابوداود (٣٨٣) الترمذي (١٤٣) وابن ماجه (٥٣١).

[2] ابو داود (٦٤٦)، الحاكم: المستدرك على الشيخين (٩٩٤) كەمال السەید سالم لە صحیح فقە السنة(٨٥/١) دا دەفەرموێ: صحیح.

### ٦- پاککردنەوەی قاپێك کە سەگ دەمی تێنابێت:

ئەبو هورەیرە خوا لێی، ڕازی بێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (إذا وَلَغَ الكَلبُ فِي إنَاءِ أحَدِكُمْ فَلْيَرِقْهُ ثمَّ لِيَغْسِلْهُ سَبْعَ مَرَّاتٍ أُولاهُنَّ بالتُّرَابِ)[1]واتە: ئەگەر سەگ دەمی خستە ناو دەفری کەسێکتانەوە، با ئەوی تێیدایە بیڕێژێت و، پاشان حەوت جار بیشواتەوە، یەکەمینجار، با بەگڵ بێت. ئەمەش یەکێکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەری سەروەرمان، صلى الله عليه وسلم، زانستی پزیشکی سەلماندی، کە میکرۆبی ناو لیکی سەگ، بە شێوەی دەزو بە قاپەکەوە دەنوسێت و، گڵیش باشترین پاکەرەوەی خۆی و، فەوتێنەری هێلکەکانێتی، چونکە دوو مادەی (تیتراکسلین) و (تەتارالێت)ی تێدایە، کە ئێستا بۆ تەعقیم لە نەخۆشخانەکاندا بەرهەم دەهێنرێن..

### ٧- پاککردنەوەی پێستە بە خۆشکردنی:

پێغەمبـەری نـازدار، صـلى الله عليـه وسـلم دەفـەرموێ: (إذا دُبـغَ الإهَـابُ فَقَدْ طَهُرَ) واتە: کە پێستە خۆش کـرا، پـاك دەبێتـەوە. لـە ڕیوایـەتی هـەر چـوار ئیمامـانی، خـاوەن سونەنەکاندا هـاتوە، کـە (أيُّمَـا إهَـابٍ دُبـغَ فَقَـدْ طَهُرَ)[2]پێستەی هەر ئاژەڵێك خۆش کرا، ئەوە پاك بۆتەوە..

بەشێك لە شەرعناسانی فەرمودە، ڕایان وایە ئەم حوکمە، تەنها ئەوانە دەگرێتەوە، کە گۆشتیان دەخورێت، چونکە پێیان وایە وشەی

---

[1] مسلم (٢٧٩)، ابوداود (٧١).

[2] ئەحمەدو ترمزی و نەسائی و ئیبنو ماجە لە ئیبنوعەبباسیان گێڕاوەتەوە، ئەلبانی بە سەحیحی داناوە (غايه المرام ٢٨) هەروەها لە صحيح الجامع الصغير(٢٧١١) وعند أبي داود: صحيح الجامع (٥١١) سنن الترمذي (١٦٥٠).

(إهاب) بۆ ئەوانەیە[١] ! ئیمام ئەبو حەنیفە ڕای وایە تەنها پێستەی بەرازە کە بە خۆش کردنیش پاك نابێتەوە، ئیمام ئەبو یوسف قوتابی ئیمام ئەبو حەنیفە، پێی وایە پێستەی هەمو گیانلەبەرێك، تەنانەت بەرازیش بە خۆش کردن پاك دەبێتەوە[٢]. ئیمام شافیعی پێی وایە، پێستەی سەگیش، هەر ئەو حوکمەی هەیەو، بە خۆشکردنی پاك نابێتەوە[٣]. ئەوەش ڕای مالیکیەکانە[٤]، ئیبنو عەبدولبەڕ دەڵێ: زۆرینەی سەلەف ڕایان وایە، کە پێستەی بەراز بە خۆشکردنیش، پاك نابێتەوە، چونکە حوکمی پیسێتیەکەی گشتیەو، هەمو بەشێکی بە زیندویی دەگرێتەوە، کەوابو بە مردوویش هەر ئەو حوکمەی دەبێت[٥]، بەڵام بۆچونی ئەو شەرعناسە بەرێزانەی دیکەش، جێی سەرنجە، کە گوتویانە بە خۆشکردن پاك دەبێتەوە، وەکو ئیمام شەعبی و ئەبو یوسف و سەحنون و زاهیریەکان[٦]، وا دیارە ئەم ڕایەش بەهێز بێت، چونکە فەرمودەکە، کە دەفەرموێ: (أيّما) واتە: هەر ئاژەڵێك.. من لە دوای توێژینەوەی باسەکە، ئەم بۆچونەی دواییم پێ پەسەندە، کە پەسەندکراوی زۆرێك لە شەرعناسانە، لە وڵاتانی

---

[١] ئیمامانێکی دیکە ئەوەیان ڕەت کردۆتەوە، چونکە لە لایەنی زمانەوانیەوە، بەڵگەی نیە بڕوانە: الخطابي / معالم السنن ٤/ ٢٧٤، و ابن عبدالبر / التمهيد ٤/ ١٧٠)

[٢] السرخسي: المبسوط ٢٠٢/١، و الكاساني: بدائع الصنائع ٨٦/١، وابن نجيم: البحر الرائق ١٠٥/١، وعبدالرحمن ابن الشيخ: مجمع الأنهر ٣٢/١.

[٣] السيوطي: الحاوي للفتاوى (٥٧/١)، والنوي: المجموع (٢٦٧/١)، وزكريا الانصاري: أسنى المطالب ١٨/١.

[٤] ابن المنذر: الإشراف ١١٢/١، وابن عبدالبر: الكافي ١٦٣/١، وابن الجزي: القوانين الفقهية ص ٣٣، والقرافي ( الذخيرة ١٦٦/١).

[٥] ابن عبدالبر (التمهيد ١٧٨/٤).

[٦] السرخسي: المبسوط ٢٠٢/١، و الكاساني: بدائع الصنائع ٨٦/١، و ابن نجيم: البحر الرائق ١٠٦/١، حاشية ابن عابدين ٢٠٤/١،ا بن حزم: المحلى ١٢٨/١.

ئەوروپا، کە پێیان وایە خۆشکردن، پێستەی بەراز پاکی دەکاتەوە، ئەمەش واقیعی موسوڵمانانی ڕۆژئاوایە، کە ڕۆژانە دەست لە پێستەی خۆشکراوی بەراز دەدەن، کە کراوە بە قەمسەڵەو ئێلەگ و پاڵتۆ، بەڵام ئەمە ئەو حوکمەیان لەسەر لانابات کە بەکار هێنانیان شیاو نیە.. والله اعلم.

### ٨ـ پاککردنەوەی زەوی لە میزو شتی وا :

ئەمیش بە ئاو ڕشتن دەبێت بەسەریدا، سەیدنا ئەنەس، خوا لێی ڕازی بێت گێڕایەوە: (جاء أعرابي فبَالَ في طائِفَةِ المسجدِ فزَجَرَهُ الناسُ، فنَهَاهُمُ النبيُّ صلى الله عليه وسلم فلَمَا أقْضَى بَوْلَهُ أمَرَ النبي صلى الله عليه وسلم بذَنوبٍ من ماء فأُهريقَ عليهِ)[1] واتە: دەشتەکیەك هاتە ناو مزگەوت و، لە کەنارێکەوە میزی کرد! خەڵکەکە لێی ڕاست بونەوەو، سەرزەنشتیان کرد، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، بەرهەڵستی لێ کردن، کە کابرا تەواو بو، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمانی بە یاوەران دا، کە دۆلکە ئاوێك بهێنن، هێنایان و کرا بەسەر میزەکەدا! دیارە، کە پێغەمبەری پێشەوا، صلى الله عليه وسلم، مەبەستی بو، کە زو شوێنەکە پاك بکرێتەوە، دەنا دەیزانی، کە ئەگەر هەر واش لێی گەڕێن، وشك دەبێتەوە، بەوەش شوێنەکە دیسان پاك دەبێتەوە..

### ٩ـ پاککردنەوەی بیرو تەنەکە ڕۆن ودۆشاو شتی وا کە پیسی تێکەوتبێت :

پاککردنەوەی ئەمانە، بە لابردنی خودی پیسییەکەو، دەوروبەری دەبێت، ئیتر ئەوەی دیکەی پاکە، چونکە فەرمودەکەی ئیبنو عەبباس، خوا لێیان ڕازی بێت، دەڵێ: لە پێغەمبەری خوایان، صلى الله عليه وسلم

---

[1] بوخاری (٢١٩)، موسلیم (٢٨٤).

پرسی، کە ئەگەر مشکێك کەوتە ڕۆنەوە، چی بکەن؟ فەرموی: (أَلْقُوهَا، وَمَا حَوْلَهَا فَاطْرَحُوهُ وَكُلُوا سَمْنَكُمْ)[١] واتە: مشکەکە فڕێدەن و، ئەوی دەوروبەریشی ، ڕامالْن و ڕادەن، ئەوجا ڕۆنی خۆتان بخۆن..

★ ★ ★

---

[١] بوخاری / الذبائح ( باب ٣٤)..

## ئایا پاککردنەوە هەر دەبێت بە ئاو بێت؟
## یان بە شلەمەنی دیکەش دەبێت؟

ڕای شەرعناسان لەمەشدا جوێیە:

**یەکەم: ئەو شەرعناسانەی دەڵێن: پاککردنەوە هەر دەبێت بە ئاو بێت:**

دەڵێن: هەر کەسێك غەیری ئاویشی پێ ڕاست بێت، دەبێت بەڵگەی لەسەر بهێنێتەوە.. ئەمەش ڕای زانراوی ئیمام مالیك و ئەحمەدەو، ڕای نوێی ئیمام شافیعییە، شەوکانی و ئەوانەشی کە هاوڕای ئەون،[1]ئەم ڕایەیان پەسەند کردوە، بەڵگەشیان:

١- فەرمایشتی خوای گەورە، کە دەفەرموێ: ﴿وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ﴾الانفال/١١ واتە: خوای گەورەیە، کە لە ئاسمانەوە ئاو دەبارێنێت، تا پاکتان کاتەوە پێی.. هەروەها ئایەتەکانی تریش، کە لەسەر پاکژی ئاوی بارانن، هەر بەڵگەی ئەم بەرێزانەن..

٢- فەرمانەکەی پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم، کە لە ڕەفتاری کابرای، کە لە مزگەوتەکەدا میزی کرد فەرمووی ئاو بێنن و بیکەن بە جێ میزەکەیدا[2].. ئەو شەرعناسانە گوتویانە، ئەوە

---

[1] بدایة المجتهد (٩٩/١) وئیمامی شافیعی الام (٤٩/١) والشوکانی: السیل الجرار (٤٩/١).
[2] متفق علیه (بوخاری (٦٠٢٥) و موسلیم (٢٨٤).

فەرمان بوە، فەرمانیش بۆ واجب بونە، فەرمانی لابردنی پیسیەکەی بە غەیری ئاو نەکردوە !

٣ـ فەرمودەکەی لای ئەبو سەعلەبە کە گوتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمانیدا، کە قاپی ئەهلی کیتاب بە ئاو بشۆرێتەوە[1].

٤ ـ شەوکانی دەڵێ: (ئاو ئەسڵی پاککردنەوەی پیسییە، چونکە شەرع باسی لێوە کردوە، کە پاکەو پاککەرەوەیە، بۆیە ناشێت شلەیەکی تر بەکاربهێنرێت، مەگەر بە بەڵگەیەکی تری شەرعی، دەنا نابێت، چونکە لادانە لە زانراوێك، کە پاکەرەوەیە بۆ نەزانراوێك، کە ئایا پاکەرەوەیە، یان نا، ئەمەش لادانە لە ئاسانکاریەکانی شەرع).

**دووەم: ئەو شەرعناسانەی پێیان وایە پاککردنەوە مەرج نیە هەر بە ئاو بێت:** ئەمەش مەزهەبی ئیمام ئەبو حەنیفەیەو، ریوایەتێکی ئیمام مالیك و، ئیمام ئەحمەدو، قەولی قەدیمی ئیمام شافیعی و، رای ئیمام ئیبنو حەزم و شێخولئیسلام ئیبنو تەیمیەو ئیبنو عوسێمینیشە[2].. ئەمیش پەسەندترە، چونکە:

١ـ ئاو کە پاك و پاکەرەوەیە، رێ لەوە ناگرێت شلەی دیکەش هەبێت، کە هەمان وەسفی هەبێت، چونکە لەوانەیە هۆ کاریگەرەکە شتێکی تر بێت، ئەمەش لە مەسەلەی پیسێتیدا دیارە[3].

---

[1] متفق عليه (بوخاری (٥١٧٠) و موسليم (١٩٣٠).

[2] الكاساني: البدائع ( ٨٣/١) و ابن الهمام:فتح القدير (٢٠٠/١) و ابن تيمية: مجموع الفتاوى ٤٧٥/٢١ و ابن حزم: المحلى ٩٢/١ ـ ٩٤ و ابن عثيمين: الشرح الممتع ٣٦١/١ ـ ٣٦٣.

[3] الشرح الممتع ٣٦٢/١.

دەڵـێین: خـۆ ئاشـکرایە، کـە هەنـدێك کەرەسـتەی شـلەو، تـۆزی سەناعی تاقیم کردن هەیە، لە ئاویش باشتر پیسیی رادەدات و پاکژ دەکاتەوە..

٢- شەرع لە هەندێك بابەتدا فەرمانی کردوە، کە پیسێتی بە ئاو لا بدرێت، ئەمەش حوکمێکی گشتی نیە بۆ هەمو پاککردنەوەیەك.

٣- شەرع رێی داوە هەندێك پیسیی، بە غەیری ئاو پاك بکرێتەوە، وەکو تارەت گرتن و، خۆ پاککردنەوە لە میزو پیسایی بە بەرد، یان پاککردنەوەی نەعل بە خۆڵ، یان پاککردنەوەی داوێنی پۆشاك بە زەوی..

٤- لابردنی پیسیی لە لایەنی فەرمانەوە نیە، بەڵکو لە لایەنی خۆ لادانە لە رێپێنەدراو، بە هەر هۆیەك ئەنجام بدرێت، حوکمە شەرعیەکەی پێ دەچەسپێت، لابردنی پیسیی نیەتی ناوێت، بەڵام ئەگەر موسوڵمانێك، بە نیەتی خواویستی لایبرد، پاداشتی لەسەر وەردەگرێت، ئەمما ئەگەر پیسییەکە، هەر لە خۆوە لاچو بێ، ئەوەی نیەتی ئەو رەنجی ئەوی تێدا بوبێت، پیسیەکە لاچوەو، ئەویش پاداشت و سزای لەسەر نابێت.. بۆ نمونە موسوڵمانان لەسەر ئەوە رێکن، کە ئەگەر شەراب لە خۆوە بو بە سرکە، پاك دەبێتەوە (ئەمە لای ئەوانەی کە شەرابیان پێ پیسە).

ئەوەی پێم پەسەندترە ئەوەیە، کە پیسیی ئەگەر بە غەیری ئاو پاك کرایەوە، حوکمەکەی پاك بونەوەیەو تەواوە..

## چەند خاڵێکی تری بەسود:

١ـ ئەگەر کەسێك پیسایی بە پۆشاکیەوە بو، توانی بە کەرەستەیەکی پاکەرەوەی سەناعی لایدات، ئەوە حوکمی پاکی وەرگرتوەو، مەرج نیە دوای ئەوە، هەر بە ئاو بیشوات..

٢ـ ئیمام ئیبنو تەیمییە دەڵێ: ناشێت خۆراك و خواردنەوە، بۆ لادانی پیسی بەکار بهێنێت، چونکە ئیسراف و پارە بە فیڕۆ دانە[١].

٣ـ ئەو پیسییانەی بە کەرەستەی تری، جگە لە ئاو پاك دەبنەوە، پیسیی حەقیقەتن و، بە لەش و پۆشاك و جێگاوەن، ئەگینا پاك بونەوە لە پیسیی، حوکمی واتایی (غوسڵ دەرکردن لە لەش پیسیی)، هەر دەبێ بە ئاو بێت.. چونکە غەیری ئاو، ئەو حوکمەی پێ جێبەجێ ناکرێت..

★ ★ ★

---

[١] مجموع الفتاوى (٢١/٤٧٥).

# باسی پێنجەم

# سوننەتە سروشتیەكان

- سوننەتە سروشتیەكان چین و چەندن ؟.
- خەتەنە كردن.
- ریش هێشتنەوە.
- سیواك.
- سوننەتە سروشتیەكان و ماوەیان.

# باسی پێنجەم

## سوننەتە سروشتیەکان

### مەبەست لە سوننەتە سروشتیەکان:

سوننەتە گشتیەکان، ئەو رەفتارانەن، کە هەر کەسێك بیانکات، بە خاوەن ئەو سروشتە دەزانرێت، کە خوای گەورە مرۆڤی لەسەر دروست کردوە، ئەو رەفتارانەش ئەوانەن، کە خوای گەورە خۆشی دەوێن و، کردوێتی بە سیمای هەمو پێغەمبەرانی خۆی، سەلامی خوایان لێ بێت، تا بە سیفاتی نمونەییەوە دەرکەون، ئەم سیفەتانە، هەر لە کۆنەوە یاساو تەعلیماتی دینییان، دەربارە بۆ دارێژراوە، تا بونەتە سیفەتی سروشتی کەسایەتی دیندار.[١]

پابەندبون بەم سوننەتە سروشتیانەوە، هێنانەدی بەرژەوەندی دین و دنیایە، لەوانە جوانی سیماو روالەت و، پاکژیی جەستەو، دیمەنی دەرەوەی مرۆڤ[٢].

### هەندێك لەو سوننەتە سروشتیانە کە لە فەرمودەی جیاوازدا هاتون:

١ـ ئەبو هورەیرە، خوا لێی ڕازی بێت، دەڵێ، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموی: (الْفِطْرَةُ خَمْسٌ: الْخِتَانُ، وَالِاسْتِحْدَادُ، وَقَصُّ الشَّارِبِ، وَتَقْلِيمُ الْأَظْفَارِ، وَنَتْفُ الْإِبْطِ)[٣] واتە: سوننەتە سروشتیەکان

---

[١] الشوكاني: نيل الاوطار (١٠٩/١)، العيني: عمدة القاري ٤٥/٢٢.
[٢] المناوي: فيض القدير (٣٨/١)
[٣] بوخاری (٥٨٩١)، موسلیم (٢٥٧).

پێنجن: خەتەنـەكردن، بەرتاشـین، سمێڵ كـورت كردنـەوە، نینـۆك كـردن، هەڵكەندنی موی بن باڵ.

٢ ـ عائیشـەخان خـوا لێـی ڕازی بێـت دەڵـێ: پێغەمبـەر صـلی الله علیـه وسلم فـەرموی: (عَشْرٌ مِـنْ الْفِطْـرَةِ: قَـصُ الشَّـارِبِ وَإِعْفَـاءُ اللِّحْيَـةِ وَالسِّوَاكُ وَاسْتِنْشَاقُ الْمَاءِ وَقَـصُ الْأَظْفَـارِ وَغَسْلُ الْبَـرَاجِمِ وَحَلْقُ الْعَانَـةِ وَنَتْـفُ الْإِبْطِ وَانْتِقَاصُ الْمَـاءِ وَنَسِيتُ الْعَاشِـرَةَ إِلَّـا أَنْ تَكُونَ الْمَضْمَضَـةَ ) واتـە: دە ڕەفتـار هەن، لە سوننەتە سروشتیەكانن: سمێڵ كورت كردنەوە، ریـش هێشـتنەوە، سـیواك كـردن، ئـاو لـەدەم رادان، نینـۆك كـردن، شوشـتنی چرچولۆچـی جەستە، هەڵكەندنی موی بن باڵ، بەرتاشـین، بـەكارهێنانی ئـاو بـۆ تـارەت گـرتن)، موسـعەب دەڵـێ (یەكێكـە لـە پیـاوانی سـەنەدی فەرمودەكـە) دەیەمیانم بیرچۆتەوە، ئەگەر ئاوله لوت رادان نەبێت..

لەم دوو فەرمودە پیرۆزەوە، ڕون دەبێتەوە، كە سوننەتە سروشـتیەكان زۆرن و، مەرجیش نیە هەر ئەم دەیـە بـن، كـە لێـرەدا هـاتون بـەڵام ئـەوە هەیە كە ئەمانە لەوانن:

١ ـ خەتەنە كردن ٢ ـ تارەت گرتن بە ئاو. ٣ ـ سیواك كردن.

٤ ـ نینۆك كردن. ٥ ـ بەرسمێڵ كردن. ٦ ـ ریش هێشتنەوە ؟

٧ ـ بەرتاشین. ٨ ـ هەڵكەندنی موی بن باڵ.

٩ ـ شـتنی چرچولۆچـی هەنـدێك شـوێنی پێست، وەكـو سـەر پەنجـەو گوێچكەو ئەوانە..

١٠ ـ ئاو لە دەم و لوت رادان..

★ ★ ★

# خەتەنە کردن

**خەتەنـە:** وشـەیەکی عەرەبیـە ئەسـڵەکەی (خَـتنَ) یـە، کـە لـە ڕوی زمانەوانیەوە، کرداری رابوردوە، بە مانای (بڕی).. لە زاراوەشدا بریتیە لە لێکردنـەوەی ئـەو پێسـتەی، بەسـەر گۆپکـەی زەکـەری نێرینـەو، سـەری میتکەی مێیینەوەیە[١].

شەرعناسان سێ ڕایان لەسەر خەتەنە هەبوەو هەیە:

١- ئەوانەی گوتویانە: لەسەر نێرینەو مێیینە فەرزە.

٢- ئەوانەی گوتویانە: بۆ نێرینەو مێیینە سوننەتە.

٣- ئەوانەی گوتویانە: لەسەر نێرینە فەرزەو، بۆ مێیینە پەسەندە..

ئیبنو قودامەی مەقدیسی، کە حەنبەلیە دەڵێ: خەتەنە کردن لەسەر پیاوان فەرزە، لەسەر ژنان فەرز نیە، هەر جێ ڕێزێکە بۆیان، ئەمەش ڕای زۆرینەی ئەهلی عیلمە[٢]..

ئیمام نەوەوی دەڵێ: ڕای ڕاست ئەوەیە، کە ئیمام شافیعی، فەتوای لەسەر داوەو، جمهوری شەرعناسان گوتویانە، کە لەسەر پیاو ژن فەرزە[٣]..

ئـەوەی گەیشـتوینێ ئەوەیـە، واللـه اعلـم، کـە تـەنها خەتەنـە کردنـی نێرینە فەرزە:

١- چونکە دروشمێکی ناسینەوەی موسوڵمانانە، کە لەسـەر سوننەتی سـەیدنا ئیبراهیمـی بـاپیرەی خۆیـان دەڕۆن، کـە لـە دیـان و جولەکـەو،

---

[١] ابن القيم : تحفة الودود (ل ١٠٦ و ٣٠٢)، النوي: المجموع ( ٣١٠/١ )..
[٢] ابن قدامة: المغني (٨٥/١ )
[٣] النوي: المجموع (٣٠١/١)

شوێنكەوتوی دینەكانی تریان جوێ دەكاتـەوە.. لـە فـەرمودەی سـەحیحدا، لە ئەبو هورەیرەوە، خوا لێی ڕازی بێت هاتوە، كە (إخْتتنَ ابـراهیمُ خلیلُ الـرحمنِ بَعْـدَ مَـا أتـتْ علیـه ثمـانونَ سـنةً)[١] واتـە: ئیبراهیمی دۆسـتی خـوا، تەمەنی بو بو بە هەشتا ساڵ، كە خەتەنە كرا.. خوای گەورەش فـەرمانی بە پێغەمبـەری پێشـەوامان صـلی الله علیـه وسـلم كـردوە، كـە شـوێن پێـی سـەیدنا ئیبراهیم علیـه السلام هـەڵگرێت، وەك دەفـەرموێ: ﴿ ثُمَّ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ أَنِ ٱتَّبِعۡ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفًا﴾ النحـل/ ١٢٣ واتـە: پاشـان وەحیمـان بـۆ تـۆ نارد، كە بە هەقخوازی شوێن میللەتی ئیبراهیم بكەوە..

٢- كابرایەك هاتـە خزمـەت پێغەمبـەری خـوا، صـلی الله علیـه وسـلم و، موسوڵمان بو، پێی فـەرمو: (ألْـقِ عَنـكَ شَعْرَ الكفـرِ وَاخْتـتِنْ)[٢] واتـە: مـوی كوفر لەخۆت بكەرەوەو، خۆت خەتەنە كە..

٣- لێكردنەوەی پارچەیەك لە جەستە حەرامە، ئەوی حەڵاڵیشی دەكات دەبێت لە حوكمی فەرزدا بێت..

مەزهـەبی ئیمـام مالیـك و، شـافیعی و، ئەحمـەد ئاوایـە، بـەڵام ئیمـام مالیـك توندوتیـژ تـرە، تەنانـەت ئـەو گوتویـەتی، هـەر پیاوێـك خەتەنـە

---

[١] بوخاری (٦٢٩٨)، موسلیم (٣٧٠).

[٢] ئـەبو داود (٣٥٦) و البـەیهیقی (١٧٢/١) بـەڵام كـەمال السسـەید سـالم لـە صـحیح فقـە السـنة(٩٩/١) دا دەڵـێ: لـە سـەنەدەكەیاندا دوو كەسـی نەناسـی تێدایـە و، ئاڵقەیـەكی سەنەدەكەش پساوە، بۆیە ئیمامان نەوەوی و شەوكانی ڕەحمـەتیان لـێ بێـت، بـە زەعیفیـان داناوە، بەڵام شێخی ئەلبانی ڕەحمەتی بە هۆی ڕیوایاتی تریەوە لە سەحیحی ئەبو داودا بـە (حەسەن)ی داناوە، هەروەها لە كتێبی إرواء الغلیل) ٧٩) دكەشیدا بە حەسەن هێناوێتیەوە.

نەکرابێت، ئیمامەتی نوێژ کردنیشی جائیز نیەو، بە شاهێدیش ناشێت، بۆیە مالیکیەکان دەڵێن: هەر کەس نەیکات گوناهبار دەبێت[١]..

## خەتەنەکردنی کچان:

خەتەنە کردنی مێیینە کارێکی شیاوە، واتە حەرام نیە، ئەگینا، نە فەرزەو، نە سوننەت! چونکە، کە لە فەرمودەی سەحیحدا هاتوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (إذا الْتِقَى الخِتانانِ وَجَبَ الغُسْلُ)[٢] واتە: ئەگەر شوێنی خەتەنە کردن، بەر یەکتری کەوتن، غوسڵ دەرکردن فەرز دەبێت..

ئەو فەرمودانەی تر، کە داوای خەتەنە کردنی کچان دەکەن، زەعیفن‌و حوکمی شەرعیان پێ دەرناکرێت، لەوانە فەرمودەکەی ئوم عەتییە، کە دەڵێ: ئافرەتێك لە مەدینە هەبو، کچانی خەتەنە دەکرد، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێی فەرمو: (لا تَنْهِكِي، فإنَّ ذلكَ أحْظى للمرأةِ وأحَبُّ الى البَعْلِ)[٣] واتە: زۆری لێ نەبڕی، چونکە هەبونی ئەوە بۆ ئافرەت خۆشترە و، مێردیش پێی خۆشە. لە ریوایەتێکی تردا دەفەرموێ: (إذا خَفَضْتِ

---

[١] ابن القيم: تحفة الودود / ل ١١٣.

[٢] ئیبنو ماجە (٦١١) سەحیحە، ئەسڵەکەشی لە سەحیحەیندایە، کە دەڵێ: (وَمَسَّ الْخِتَانُ الْخِتَانَ فَقَدْ وَجَبَ الْغُسْلُ). واتە ئەگەر شوێنی خەتەنە کردنی پیاوەکە بەر شوێنی خەتەنەکردنی ئافرەتەکە، کەوت غوسڵ کردنیان واجب دەبێت.. ئەم جێ خەتەنە کراوەش لای عەرەبەکانی سەردەمی پێغەمبەر، صلى الله عليه وسلم زانراو بوە، کە گۆپکەی زەکەری پیاو و میتکەی ئافرەت بوە.. ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە خەتەنەکردنی کچان باو بوە..

[٣] ـ کەمال السسەید سالم لە صحيح فقه السنة(٩٩/١) دا دەڵێ: ئەبو داود گێڕاوێتیەوە (٥٢٧١) و بە زەعیفیشی داناوە..

فأشِمّي لا تنهكي ؛ فإنَّ ذلكَ أنْظرُ للوَجْهِ وأحظى عندَ الزوجِ)[١] واتـە: ئەگـەر بڕیت، زۆری لێ مەگرە، چونکە مانەوەی مایەی ڕوگەشیی ژنەو، خۆشیی مێردەکەیە..

ئـەو فەرمودەشـیان، کـە هەنـدێك لـە شەرعناسـی مەزهەبـەکان، بـە تایبەتی شافیعی، ئیعتیمادیان، کردۆتە سەر، کە دەفـەرموێ: (الخِتـانُ سُنّةٌ للرِّجَالِ مَكْرُمَةٌ للنّساءِ) واتە خەتەنە کردن بۆ پیـاوان سوننەتەو، ڕێزیشـە (پەسەندیشـە) بـۆ ژنـان، کـە ئیمـام ئەحمـەد گێڕاوێتیـەوە، فـەرمودەیێکی زەعیفـەو نابێتـە بەلگـە.. گـەر سـەحیح بوایـە، دەبـوە فەرمایشتی بنـبڕی موناقەشەو، زۆر لەسەر چونی نەدەهێشت..

لـە ئـەنجامی ئـەم توێژینەوەیـەوە، بۆمـان دەردەکـەوێت، کـە حـوکمی شـەرعی خەتەنـە کـردن، بـۆ ژن و پیـاو وەکـو یـەك نیـە، خەتەنـە کـردن لەسەر پیاوان فەرزەو، بۆ ئافرەتان هیچ پابەندیەك، نـە بـە فـەرز، نـە بـە سونـنەت پێویست ناکات.. ئەو بۆچونەی شێخ ئیبنو عوسێمین، رحمه الله،

---

[١] ئەبو داود لە (السنن ٣٦٨/٤ و ٥٢٧١) گێڕاوێتیەوە، لەویشەوە البەیهیقی لـە (السـنن الکبری ٣٢٤/٨ ) و ئیبنو عەدی لە (الکامل ٢١٧/٦) والبەیهیقی هەر لەوەو لە (شـعب الایمـان ٣٩٦/٦ و ٨٦٤٥) و دیسـان هـەر البـەیهیقی لـە (السـنن الکـبری ٨٣٢٤) گێڕاویانەتـەوە و، هەموشـیان بـە زەعیفیان داناوە.. خەتیبی بەغدادی دەرهەقی دەڵێ: مونکەرە، بڕوانـە (التـاریخ ٣٢٧/٥) و (جامع أحكام النساء ١٩/١).

بە فەزڵی خوای گەورە بۆم لوا، کە سەیری ریوایەتی ئەنەسی کوڕی مالیك و، عەلی کوڕی ئەبو تالیب و، ئوم عەتییەو، ئیبنو عومەر لە زیاتر لە بیست سەرچاوەی حـەدیس بکـەم و، بگەڕێمەوە سەر رەنجی دەیان توێژەرەوەی بـەڕێزی، وەکو بوخـاری و موسـلیم و ئەحمـەدو ئـەبو زەرعـە (کـە هـەر یەکـەیان بـڕی شـەش سـەد هـەزار حەدیسـیان لەبـەر بـوە)، یـان توێژەرەوەی گەورەی وەکو شەوکانی و ئەلبانی، لە هەر هەموویان ئەوەم بۆ رون دەبۆوە، کە حەدیسەکان زەعیفن و، حوکمی شەرعیان پێ فەرز ناکرێت، هەر وەکو، شـێخی ئـەلبانی لـە (سلسلة الاحاديث الصحيحة ٧٢٢) دا فەرمویەتی. سوپاس بۆ خوای گەورە لەسەر رێنمایی..

كە لە گەورە شەرعناسانی حیجاز بو، ڕاستەو زیاتر جێبایەخ نەبونی خەتەنەی كچان، لە ئیسلامدا دەخاتە ڕو، كە دەڵێ: خەتەنە كردنی پیاوان، بەرژەوەندی پیاوەكانی تێدایە، چونكە بە نەبڕینی ئەو پێستەی سەر گۆپكەی زەكەریان، مەرجێكی نوێژ نایاتە دی، كە بریتیە لە پاكژیی ئەندامانی لەش، چونكە لە كاتی هەبونی ئەو پێستەدا، میزی تێدا كۆدەبێتەوە، بەڵام بۆ ئافرەتان وا نیە[١]..

دیسان لە توێژینەوەی وردی ئەم مەسەلەیەوە، ئەوەم بۆ دەركەوت، كە وەكو خو نەریتێكی عەرەبەكانی پێش ئیسلام باو بوە، بەڵام پێغەمبەر، صلى الله علیه و سلم، بە شێوەیەكی زۆر دانایانە، وەسف و چارەسەری ئەو دیاردەیەی ئاوا كردوە، ئەگەر پێی ڕەوا بوایە، زیاتری جەخت لێ دەكردەوە، چونكە خۆ ئەوە مەسەلەیەكە، هەمو ماڵە سەحابەیەك ڕوەو ڕوی دەبونەوە، گەر فەرز، یان سوننەتی موئەككەدە بوایە، حەتمەن ڕیوایاتی زۆری دەبو..

ئەوەش بخەینەوە یاد، كە شێوەی خەتەنە كردنی فیرعەونی، زۆر خەتەر بوە، كە تا ئەو كاتانەو دواتریش، لە ناو غەیرە موسوڵمانەكاندا باو بوە، كە بریتیە لە بڕینی هەمو میتكەكە! بە داخەوە ئەم نەریتە جاهیلییە ئێستاش لە زۆر شوێنی ئەفریقادا هەیە! بۆیە كەناڵی سی ئێن ئێنی ئەمریكایی، لەسەر موسوڵمانان و دینەكەیان كردیە پەڵەیەكی گەورە، كە واش نیە، لە كاتێكدا زیاتر لە شەش سەد ملیۆن موسوڵمان حەنەفین هەر نازانن خەتەنەكردنی كچان واتە چی..

---

[١] ابن عثیمین: الشرح الممتع (١/١٣٤).

داواشم لە موسوڵمانان، بە تایبەتی مامۆستایانی ئیسلام و، فەقێکانی ئەوەیـە، کـە بـە ڕاسـتی ئیسـلامەکەوە پابەنـد بـن و، ئـەم توێژینەوەیـە ڕەچاوکەن.. خوای گەورەش هەمومان سەرکەوتو بکات.. ئامین..

★ ★ ★

## ڕیش هێشتنەوە

**حوکمی ڕیش هێشتنەوە:**

ڕیش هێشتنـەوە، یـان ردێـن بەردانـەوە، فـەڕزە، چـونکە ئـەو بەڵگانـەی لەسەری هەن، بە واجبی دەناسێنن، لەوانە:

**یەکـەم:** پێغەمبەری پێشەوا، صلی الله علیه وسلم، فەرمانی بە پیـاوان داوە، کـە ڕیـش بهێڵنـەوەو، سمێڵیـان کـورت کەنـەوە، ئەمـەش فەرمانـەو، فـەرمانیش واجـب بونـە، ئەگـەر لـەفزێك هـاوڕێی فەرمانەکـە نـەبو، لـە واجبێتی بخات بە فەرزی دەیهێڵێتـەوە، فەرمانـەکانی پێغەمبـەری خـواش، صلی الله علیـه وسلم، کـە لەسـەر ڕیـش هێشـتنەوەن، هـیچ لـەفزێك، یـان مانایەکی تریان لێ نافامرێتەوە، کە بە فەرمانی نەمابن.. وەکو:

١ ـ ( خَالِفُوا الْمُشْرِكِينَ وَفِّرُوا اللِّحَى وَأَحْفُوا الشَّوَارِبَ)[1] واتە: پێچـەوانەی موشریکان بن، ڕیش بهێڵنەوەو، سمێڵ کورت کەنەوە..

---

[1] بوخاری (٥٨٩٢)، موسلیم (٢٥٩).

هەروەها: (جُزُّوا الشَّوَارِبَ وَأَرْخُوا اللِّحَى خَالِفُوا الْمَجُوسَ )[١] واتە: سمێڵ کورت کەنەوەو ڕیش بەردەنەوە، پێچەوانەی ڕەفتاری مەجوسیەکان بکەن..

٢ـ ئەو دوو فەرمودەو، ئەوانی تری ئەم باسە، ئەوە دەسەلمێنن، کە ریش تاشین شوبهاندنە بەکافران.

٣ـ ریش تاشین، لە گۆڕینی خەڵقی خوایەو، گوێڕایەڵی کردنی شەیتان و، جێبەجێ کردنی فەرمانی ئەوە، ئەو فەرمانەی، کە وەکو بەڵێن بە خوای کردگاریدا، کە وتی: ﴿وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ اللَّهِ﴾ النساء/١١٩ واتە: فەرمانیان پێدەکەم، تا خەڵقی خوا بگۆڕن..

٤ ـ ڕیش تاشین، لێچواندنی ڕوی پیاوە، بە ڕوی ئافرەتان، پێغەمبەری خواش صلى الله عليه وسلم، لەعنەتی کردوە (دوعای دورخستنەوە لە بەزەیی خوای گەورە) لەو پیاوانەی خۆیان بە ژنان دەچوێنن[٢]..

لەبەر ئەم بەلگانەیە، کە ئیمام ئیبنوتەیمییە دەڵێ: ریش تاشین حەرامە، ئیبنو حەزمیش کۆڕا (ئیجماع)ی شەرعناسانی نەقڵ کردوە، کە هێشتنەوەی فەرزەو تاشینی حەرامە[٣] ..

## ئایا دەشێت ڕیش لە قەبزە زیاتری ببڕێت ؟!

هەندێك لە شەرعناسان ڕایان وایە، کە ئەگەر کابرایەکی ڕیشدار، ڕیشی خۆی بە قولەمشتی گرت، چی لە خوارەوە زیادە بو، بۆی هەیە

---

[١] موسلیم (٢٦٠).

[٢] بوخاری (٥٨٨٥)، ترمزي (٢٩٣٥).

[٣] علاء الدين البعلي: الاختيارات الفقهية (ل ١٠)، ابن مفلح: الفروع (٢٩١/١)، ابن عابدين: رد المحتار (١١٦/٢)..

بیبڕێت.. ئەمەیە، کە پێی دەوترێت قەبزە... بەلگەشیان ئەوەیە، کە ئیبنو عومەر، خوا لێیان ڕازی بێت، لە کاتی حەجدا، یان عەمرەیدا، ڕیشی خۆی گرت و هەرچیەکی لە قەبزە زیاتر بوبڕی[1].. ئەو پۆلە شەرعناسانەی ئەمە ڕایانە، دەڵێن، ئەوی فەرمودەی (ڕیش بهێڵنەوە)ەکەی ڕیوایەت کردوە، هەر ئیبنو عومەرخۆیەتی، کەوابو جەنابیان شەرعناسترن بەوەی ڕیوایەتیان کردوە... بەلام ئەمە لای شەرعناسانی دیکە، نەبۆتە بەلگەی بەهێز، چونکە:

١ ـ ئەمەی ئیبنو عومەر کردویێتی، بە هۆی کۆتایی هێنانی ئیحرامی حەج، یان عەمرەکەیەوەیەتی، ئەمەش بەلای ئەوانەوە جائیز بوە..

٢ ـ ئەم ڕەفتارەی ئیبنو عومەر لێکدانەوەو جێبەجێ کردنی ئایەتەکەی حەجە، کە دەفەرموێ: ﴿مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ﴾ الفتح/ ٢٧ واتە: کاتێك دەچنە حەج، سەرتان تاشیوەو، ڕیشتان کورتکردۆتەوە.. ئەمەش لە خواپەرستیەکدایە، کە بەلای ئەو شەرعناسانەوە جائیزە[2]..

٣ ـ ئەگەر یاوەرێك بە پێچەوانەی ئەوەی، ڕیوایەتی کردوە ڕەفتاری کرد، حوکمی شەرعی لە ڕیوایەتەکەیەوە وەردەگیرێت، نەك لە تێگەیشتنی، یان لە ڕەفتاریەوە، چونکە وەرگرتنی حوکمی شەرعی ئەوەیە، کە لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم وەرگیرا بێت..

---

[1] بوخاری (٥٨٩٢)، موسلیم (٢٥٩).
[2] بڕوانە: شرح الكرماني على البخاري (١١١/٢١).

لــەم توێژینــەوە دەردەکــەوێت، کــە هێشــتنەوەی ڕیــش بــۆ پیــاوی موســوڵمان فــەرزەو، تاشــینی حەرامــە[١]، پێویســتە پیــاوی موســوڵمان ڕیشــی بەرداتەوە، چونکە فـەرمودەکانی پێغەمبـەری خـوا، صـلی الله علیـه وسـلم لەم بارەوە، هەموی فەرمانن وەکو: (أعفوا.. ارخوا.. وفروا.. أوفوا..) ئەمـەش ڕای زۆرینەی شەرعناسانە.. والله اعلم..

★ ★ ★

---

١ـ زانایان دەربارەی ڕیش هێشتنەوە سێ ڕایان هەیە:
١ـ ڕایەك دەڵێ: ڕیش هێشتنەوە فەرزە، کە حەرامە تاشینی.
٢ـ ڕای دووەم دەڵێ: ڕیش هێشتنەوە سوننەتە، کە تاشینی مەکروهو ناپەسندە.
٣ـ ڕای سێیەم: ڕیش هێشتنەوە، ڕێپێدراوە و موباحە.
لە وانەی دەڵێن: سوننەت (ندب)ە، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و شەوکانی و نەوەویە.
هەروەها لە هاوچەرخانیش، کە گوتویەتی: ڕیش هێشتنەوە سوننەتە. دکتۆر یوسف قەرزاوییە، ئەوزانایانەش، کە پێی موباحە قازی ئەبو بەکر ئبنولعەرەبی و قورتوبیە.
ئەوانەش، کە دەڵێن: فەرزە، ئیبن حەزم و ئیبن تەیمییەیە.
جا ئەمە مەسەلەیەکی جیاڕاییە لە نێوان زانایان، موسڵمانا بۆی هەیە کامە ڕای بەلاوە پەسندە و قەناعەتی پێی هەیە، ئەوەیان وەربگرێ و، نەکرێتە گیروگرفت و کێشەو موجادەلەو دڵ ڕەنجاندنی یەکتری.
ئەوانەش دەڵێن: چوارشەرعناسەکە: مالك ئەبو حەنیفە و شافعی و ئەحمەد، لە سەر فەرزێتی ڕیش هێشتنەوە کۆڕان ئیجماعیان لە سەر هەیە، ئەمە وانیە و خەیاڵ و تەحریفە، ئەوان کوڕانین، یان ڕاستر بڵێن: هیچ یەکێکیان بە ڕەهایی نەیگوتوە فەرزە.
لە کتێبە فیقهیەکانیشدا شتی وا نەبینراوە، باشترین بەڵگەش لە سەر ئەمە ئەوەیە، کە قوتابیەکانیان وەك: نەوەوی و ئیبن قودامە و ئیبن هومام و شەوکانی و قازی عیاز و زەرقانی و کەسانی دیکەش نەیانگوتوە فەرزە. هەرکەسێکیش بڵێ: شافعی، یان ئەحمەدوکەسانی دیکە وایان گوتوەپێویستە بەڵگەی قسەکەی بسەلمێنێ، تا توشی توبەتباری وقسە هەڵبەستن نەبێت، خوا پەنامان بدات.
کەواتە، دەرکەوت ڕیش هێشتنەوە فەرز نیەو تاشینی حەڕام نیە.
بۆ زیاتر شارەزابون لەم بابەتە بڕوانە: کتێبی: (الخلاص واختلاف الناس) محمد الشویکی ـ القدس ـ ١٤٠٨ـ ١٩٨٨.

(نوسینگەی تەفسیر)

## ســـیواك

**سیواك:** كە هەندێك كورد پێی دەڵێ: سیواوك، لە كرداری (سَاكَ) دەوە هاتوە بە مانای لێ خشاند. لە روی زاراوەییەوە بریتیە لە: هێنان و بردنی چیلكەیەك یان هاوشێوەی بەسەر دانەكاندا بۆ پاك راگرتنی، نەبادا زەردایی لێ بنیشێت[1].. عەرەبەكان لە پێش ئیسلامیشەوە داری ئەراكیان بۆ سیواك كردن بەكار دەهێنا كە ئێستا سەلمێنراوە كە نەخۆشیەكانی كلۆری دان ناهێڵێت و پارێزگاری مینای سەر ددانەكان دەكات و پوك لە ئاوسان و هەو كردن دەپارێزێت،، لە لایەكی ترەوە لەبەر ئەوەی شتێكەو، دەكەوێتە ناو دەم و سەر زمان، مێشك ئاڕاستە دەداتە زمان، كە لیك و هۆرمۆنی تر بڕێژێت، بەمەش بەردەوام سەر دانەكان تەڕ دەمێننەوە ، ئاشكراشە، كە وشكبونی ددان، هۆكاری سەرەكی ڕزین و هەڵوەرینێتی.. ئەگەر كەسێك داری ئەراكی دەست نەكەوت، دەشێت دارێكی تر بكاتە سیواك، یان هەر فڵچەیەك بەكار بهێنێت، ئەگەر هەر نەبو، پەنجەی خۆی..

سیواك كردن لە هەمو كاتەكانی شەوڕۆژدا، شتێكی باشە، چونكە پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم لە وەسفیدا دەیفەرمو: (السُّواكُ مُطَهِّرَةٌ لِلْفَمِ، مَرْضَاةٌ لِلرَّبِّ)[2] واتە: سیواك پاكژكەرەوەی دەمەو، مایەی رەزامەندی خوای گەورەیە..

---

[1] الشوكاني: نيل الاوطار ١٠٢/١.

[2] نەسائی (٥٠/١). ئەحمەد (٤٧/٦، ٦٢) پلەی سەحیحە: صحيح فقه السنة (١٠٠/١).

**لـە هەنـدێك كاتـدا زیـاتر تەئكیـد لـە بـەكارهێنانی سـیواك كراوەتەوە، وەكو:**

١ . **كـاتی دەسـتنوێژگرتن:** لەبــەر فەرمودەكــەی لای ئەبوهورەیرە، خوا لێی ڕازی بێت، كە دەڵێ: پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیــه وســلم، فەرمویــەتی: (لَوْلَـا أَنْ أَشُـقَّ عَلَـى أُمَّتِـي لَـأَمَرْتُهُمْ بِالسِّـوَاكِ مَـعَ الْوُضُـوءِ)[1] واتـە: ئەگـەر لەسـەر ئوممەتەكـەم سـەخت نەبوایــە، فــەرمانم پــێ دەدان، كــە ســیواك لــە كــاتی هــەمو دەستنوێژێكدا، بەكار بهێنن..

٢ . **كـاتی نوێـژكردن:** لەبـەر ئـەو فەرمودەیـەی تـری لای ئەبوهورەیرە، خوا لێی ڕازی بێت، كە دەگێڕێتـەوە، كـە پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم ،دەفـەرموێ: (لَوْلَـا أَنْ أَشُـقَّ عَلَـى أُمَّتِـي لَـأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ عِنْـدَ كُـلِّ صَلَاةٍ)[2] واتـە: ئەگـەر سـەخت نەبوایـە لەسەر ئوممەتەكەم، فەرمانم پێ دەدان، كـە سیواك لـە كاتی هـەمو نوێژێكدا، بەكار بهێنن..

٣ . **كـاتی قورئـان خوێنـدن:** لەبـەر ئـەو فەرمودەیـەی لای سـەیدنا عـەلی كوڕی ئـەبو تالیبـە، خـوا لێـی ڕازی بێـت، كـە دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم، فـەرمانی پێكردبـوین، كـە سیواك بەكار بهێنین، چونكە: (إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا قَامَ يُصَلِّي أَتَاهُ مَلَكٌ فَقَامَ خَلْفَهُ يَسْتَمِعُ الْقُرْآنَ وَيَدْنُو، فَلَا يَـزَالُ يَسْـتَمِعُ وَيَـدْنُو حَتَّـى يَضَعَ فَاهُ

---

[1] ئیمامی ئەحمەد، لە (صحیح الجامع) دایەو ژمارە (٥٣١٦) یە.

[2] بوخاری (٦٨١٣)، موسلیم (٢٥٢).

عَلَى فِيهِ، فَلَا يَقْرَأُ آيَةً إِلَّا كَانَتْ فِي جَوفِ المَلَكِ)[1] واتە: لەو کاتەی بەندەیەکی خوا بۆ نوێژ هەڵدەستێت، فریشتەیەك دێتە پشتیەوەو، گوێ لە قورئانەکە دەگرێت و، زیاتر لێی نزیك دەبێتەوە، ئیتر هەر وا گوێ دەگرێت و، نزیکتر دەبێتەوە، تا دەمی دەخاتە سەر دەمی ئەو، ئیتر ئەم هەر ئایەتێك بخوێنێتەوە، دەچێتە بۆشایی سینەی فریشتەکەوە.

**٤ . کاتی چونەماڵەوە:** چونکە میقدامی کوڕی شورەیح، خوا لێیان ڕازی بێت، لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لە عائیشەخانم پرسی، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، کە دەهاتەوە ماڵەوە، بە چی دەستی بە ڕەفتاری خۆی دەکرد؟! گوتی: بە سیواك کردن[2]..

**٥ . کاتی شەونوێژ:** سەیدنا حوزەیفە، خوا لێی ڕازی بێت، گوتی: (كَانَ إِذَا قَامَ لِلتَهَجُدِ مِنَ اللَّيْلِ يَشُوصُ فَاهُ بِالسِّوَاكِ)[3] واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، کە بۆ شەونوێژ هەڵدەستا، سیواکی بە دەم و ددانیدا دەهێنا..

**٦ . بێگومان کاتی ناخۆشی تامی دەم و کاتی زیادبونی زەردایی سەر ددانەکان** و پێش تێکەڵاوبونی خەڵکی لە ڕۆژانی هەینی و بۆنەکان.

---

[1] بەیهیقی (٣٨/١) ئەلبانی لە سلسلة الاحاديث الصحيحة ژمارە (١٢١٣) بە سەحیحی داناوە.
[2] خاوەن سوحاحی ستتە گێڕاویانەتەوە، جگە لە بوخاری و ترمزی..
[3] بوخاری (٢٤٦)، موسلیم (٢٥٥).

ئیمام ئیبنولقەییم، رحمه الله دەڵێ: سیواك: دەم بۆن خۆش دەكات، گەدە دەحەوێنێتەوە، دەنگ ساف دەكات، یارمەتی هەرس كردنی خۆراك دەدات، دەزولەكانی دەنگ پاك دەكاتەوە، چالاكی قورئان خوێندن و زیكرو نوێژەكان زیاتر دەكات، جێ سەرسامیی فریشتەیە، مایەی زیادبونی چاكەیە، لەسەر هەموشیانەوە، جێی ڕەزامەندی خوای گەورەیە..

## چۆنیەتی بەكارهێنانی:

١- سیواكەكە، پێش و پاش بەكارهێنانی بشۆ.

٢- بەیانیان بەشە بەكارهاتوەكەی سەرەوەی، ببڕەو لایدەو، بەشێكی نوێ (سانتیمەترێك زیاتر بێت) بەكار بهێنە، بەوەی، كە توێكڵەكەی سەرووەی لا ببەیت.

٣ - لە راستەوە بۆ چەپ، هەروەها لە خوارەوە بۆ سەرەوە، بەسەر ددانەكانتیدا بهێنە.

٤ - لە كۆتا بەكارهێناندا بە زمانتیدا بهێنە، چونكە ٧٥٪ ی بۆنی دەم لە زمانەوە دێت، نەك لە ددان و بۆشایی گەرو..

٥ - جارێكی تری، پاش بەكارهێنان بشۆرەوە..

★ ★ ★

## سوننەتە سروشتیەکان و ماوەیان

**ئایا نینـۆك كـردن و سمێـڵ كورت كردنـەوەو مـوی بـن بـاڵ هەڵكێشـان و بەرتاشـین پەیوەنـدییان بـە كاتـەوە هەیـە؟! ئایـا كاتیان بۆ دیاری كراوە كە دەبێت لەو ماوەیەدا بكرێن؟!**

وەڵام: كردنی ئەمانە بە پلـەی سـەرەكی، ئیعتیمـاد دەكاتـە سـەر رادەی پێویستی ئەو كەسـە، بـە كردنیـان، هەیـە توكنـەو، پێویست دەكات زو زو مـوی بكـات، هەیـە نەشـونمای زۆرتـرەو، نینـۆكی زوتـر زیـاد دەبێتـەوەو، دەبێت بیانكات.. بەڵام ئەوە بزانرێت، كە نابێـت هـیچ یـەكێك لەمانـە، لـە چل رۆژ زیاتر بخایەنێت.. چونكە ئەنەسـی كوڕی مالیـك، خـوا لێـی ڕازی بێـت دەگێڕێتـەوە، كـە بـۆ كـورت كردنـەوەی سمێـڵ و، نینـۆك كـردن و، هەڵكێشانی مـوی بـن بـاڵ و، بـەركردن، پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسلم، ڕێی نەداوە لە چل رۆژ زیاتر تێپەڕن..

★ ★ ★

# باسی شەشەم

# دەستنوێژ

- گەورەیی دەستنوێژ. - کورتەی چۆنیەتی دەستنوێژ.
- نییەت مەرجی دەستنوێژ - ئەرکانەکانی دەستنوێژ.
- سوننەتەکانی دەستنوێژ. - دەستنوێژ شکان.
- هەندێك باسی تری دەستنوێژ:
- دەستنوێژو دەستدان لە عەورەت، لە دەرچەی کۆم .
- لەوانەی دەستنوێژ ناشکێنن. - دەستنوێژی ژن و مێرد.
- خوێن بەربون و دەستنوێژ. - رشانەوەو دەستنوێژ ؟
- قاقای پێکەنین و دەستنوێژ.
- دەستنوێژ بۆ هەڵگرتنی جەنازەی مردو.
- دەستنوێژ بۆ هەمو نوێژێك.
- ئەو حاڵەتانەی باشترە دەستنوێژ هەبێت.
- دەستنوێژ بۆ تەوافی کەعبە.
- دەستنوێژ بۆ قورئان خوێندن.

# باسی پێنجەم

## دەستنوێژ

**پێناسـەی:** دەسـتنوێژ لـە كوردیـدا، وەكـو زاراوەیـەك بەرامبـەر بـە، (الوضـوء)ی عـەرەبی دانـراوە، كـە ئاماژەی تێدایـە بـۆ شوشـتنی دەسـت و، ئەندامـە دیـاری كراوەكـانی تـری لـەش، وەك پێشـەكی نوێـژ.. بـەڵام ئەسڵەكەی لە زمانەوانی عەرەبیدا، لە چاوگی (الوَضاءَة)ەوە هاتوە، كە بـە مانای پاكوخاوێنی و، تەڕو پاراوییە. (الوُضوء) بـە هـەبونی بـۆر (ضَمَّة)، لەسەر واوەكەی، بە مانای كرداری دەستنوێژ گرتنەكەیە، بە هەبونی سـەر (فتحَـة) لەسـەر واوەكـەی (الوَضـوء)، مانـای ئـەو ئـاوە دەگـەیێنێت، كـە دەستنوێژەكەی پێ دەگیرێت[١]..

لـە ڕوی زاراوەییشـەوە، بریتیـە لـە بـەكارهێنانی ئـاو، بـۆ هەنـدێك ئەنـدامی لـەش (دەسـت و دەموچـاو سـەرو پـێ)، تـا ڕێـی نوێـژكردن و، خواپەرستنی تری پێ بكرێتەوە..

دەسـتنوێژ گـرتن ڕەفتـارێكی شـەرعیە، چونكە بەڵگـەی لـە قورئـان و سوننەت و، كۆڕای شەرعناساندا هەیە:

ـ خوای گەورە لە قورئاندا دەفـەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِ﴾ المائدە/٦ واتە: ئەی ئـەو كەسانەی باوەڕتـان هێنـاوە، ئەگـەر بـۆ نوێـژ هەسـتان، بـا دەموچـاو دەسـتان، تـا ئانیشـك شوشـتبێت و، مەسـحی

---

[١] الفيروزآبادي: القاموس (٣٣/١)، الرازي: مختار الصحاح (٥٧٥)، المجموع (٣٥٥/١).

سەرتان کردبێت و، پێیەکانیشتان، تا قولەپێ شوشتبێت..

- وەکو سوننەتیش: فەرمودەی زۆر هەیە، کە گرتنی دەستنوێژ بۆ نوێژ کردن، بە فەرز دەناسێنن، وەکو:

١ - ئەبوهورەیرە خوا لێی ڕازی بێت، دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیـه وسـلم، فـەرموی: (لا تقْبَـلُ صَـلاةُ أحَـدِكُمْ إذا أحْـدَثَ وَلَـمْ يَتوَضَّـأ)[١] واتــە: نوێــژی هــیچ کەســێکتان قبــوڵ نابێــت، ئەگــەر دەستنوێژی شکابێت و، نەیگرتبێتەوە..

٢ - ئیبنوعومــەر خوالێیــان ڕازی بێــت، دەڵــێ: گــوێم لێبــو پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم، دەیفەرمو: (لا يَقْبَلُ اللهُ صَلاةً بغَيرِ طَهُورٍ)[٢] واتە: خوای گەورە، نوێژ لـە هیچتان، بـەبێ دەسـتنوێژ قبوڵ ناکات..

٣ - ئیبنو عەبباس خوا لێیان ڕازی بێت، دەڵێ: پێغەمبـەری خـوا صلى الله عليه وسلم، فەرمویەتی: (إنَّمَا أُمِرْتُ بالوُضُوءِ إذا قُمْتُ الَـى الصَّلَاةِ)[٣]واتە: فەرمانی ئەوەم پێکراوە، کە هەسـتام بـۆ نوێـژ، دەبێـت دەستنوێژم هەبێت..

٤ - ئــەبو ســەعیدی خــودری، خــوا لێــی ڕازی بێــت، دەڵــێ: پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليـه وسـلم، فـەرموی: (مِفْتـاحُ الصَّلَاة

---

[١] بوخاری (١٣٥)، موسلیم (٢٢٥).
[٢] موسلیم (١/١٦٠ ژمارە ٢٢٤).
[٣] ترمزی _ ١٨٤٨)، ئەبو داود (٣٧٦٠)، نەسائی (١/٧٣) بڕوانە: الالبانی: صحیح الجامع ژمارە (٢٣٣٣).

الطُهُـورُ، وَتحْرِيمُهَـا التكْـبِيرُ، وَتحْلِيلُهَـا التسْـلِيمُ)[١] واتـە: کلیلـی نوێـژ دەستنوێژە، سەرەتای حەرامبونی قسە تێیدا، تـەکبیری دەسـپێکیتی، ڕێدانەوە بە قسە، دوای سەلام دانەوەیەتی..

ـ ئەمما کۆڕا (ئیجماع) ی شەرعناسان، ئەوە بەناوبانگە، کە شەرعناسان گوتویانە: نوێژ بە بێ دەستنوێژ نابێت، مەگەر کەسێك بە هیچ کلۆجێك، نەتوانێت بیگرێت، یان تەیەممومی بۆ نەکرێت[٢]..

## گەورەیی دەستنوێژ

**١ . دەستنوێژ نیوەی باوەڕە:** ئەبو مالیکی ئەشعەری، خوا لێی ڕازی بێت، دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرموی: (الطُهُورُ شَطرُ الايمانِ) واتە: دەستنوێژ نیوەی باوەڕە..

**٢ . گوناحە گچکەکان ڕادەدات:**

★ ئەبوهورەیرە خوا لێی ڕازی بێت، دەڵێ: پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم، فەرموی: (إذَا توَضأ الْعَبْدُ الْمُسْلِمُ أوْ الْمُؤْمِنُ فغَسَلَ وَجْهَهُ خَرَجَ مِنْ وَجْهِهِ كلُّ خَطِيئةٍ نظرَ إليْهَا بعَيْنيْهِ مَعَ الْمَاءِ أوْ مَعَ آخِرِ قِطْرِ الْمَاءِ، وَإذَا غَسَلَ يَدَيْهِ خَرَجَ مِنْ يَدَيْهِ كلُّ خَطِيئةٍ بَطشَتهَا يَدَاهُ مَعَ الْمَاءِ أوْ مَعَ آخِرِ قِطْرِ الْمَاءِ، فإذَا غَسَلَ رِجْليْهِ خَرَجَتْ كلُّ خَطِيئةٍ مَشَتهَا رِجْلاهُ مَعَ الْمَاءِ أوْ مَعَ آخِرِ قِطْرِ الْمَاءِ حَتى يَخْرُجَ نقِيًّا مِنْ الذنُوبِ )[٣]

---

[١] الترمذي (١٨٤٨)، ابوداود (٦٠)، ابن ماجة (٢٧٥)، شێخی ئەلبانیش لە صحیح الجامع (٥٧٦١) بە سەحیحی داناوە.

[٢] ابن المنذر: الاوسط (١/١٠٧).

[٣] موسلیم (١/١٥١، ژمارە ٢٤٤) وئەوانی تریش.

واتە: کە موسوڵمانێك (یان ئیمانداریێك) دەستنوێژ دەگرێت، ئەو ساتەی دەموچاوی دەشوات، لەگەڵ دڵۆپە ئاوەکاندا (یان لەگەڵ کۆتا دڵۆپەدا)، ئەو گوناحانەی هەڵدەوەرێن، کە بە چاو ڕوی کردونی.. ئەو ساتەی دەستی دەشوات، لەگەڵ دڵۆپە ئاوەکاندا (یان لەگەڵ کۆتا دڵۆپەدا)، ئەو گوناحانەی هەڵدەوەرێن، کە بە دەستی کردونی، ئەو ساتەی پێیەکانی دەشوات، لەگەڵ دڵۆپە ئاوەکاندا (یان لەگەڵ کۆتا دڵۆپەدا) ئەو گوناحانەی هەڵدەوەرێن، کە بە پێ بۆیان چوەو کردونی، ئاوا، تا لە گوناح پاك دەبێتەوە..

★ سەیدنا عوسمانی کوڕی عەففان خوا لێی ڕازی بێت، دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستنوێژی دەشوشت، پاشان فەرموی: (مَنْ تَوَضَّأَ هَكَذَا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَكَانَتْ صَلَاتُهُ وَمَشْيُهُ إِلَى الْمَسْجِدِ نَافِلَةً)[١] واتە: هەر کەسێك ئاوا دەستنوێژ بشوات، لە گوناحی بەرو دوای دەبورێت، نوێژو چونە مزگەوتی، بۆ دبێتە سونەت..

★- ئەم پاداشتە گەورەیە زیاتر دەچەسپێت، کە دوو ڕکات نوێژیشی لەگەڵدا بێت، وەکو لە فەرمودەیەکی تری سەیدنا عوسماندا هاتوە، خوا لێی ڕازی بێت، پێغەمبەری نازدار، صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: (مَنْ تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي هَذَا ثُمَّ قَامَ فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ، لَا يُحَدِّثُ فِيهِمَا نَفْسَهُ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ)[٢] واتە: هەر کەسێك وەك ئەم دەستنوێژەی

---

[١] موسلیم (٢٢٩) وئەوانی تریش.
[٢] بوخاری (٦٤٣٣)، موسلیم (٢٢٦).

من بگرێت و، پاشان دوو رکات نوێژی بەدوادا بکات و، بەدوی قسەی نەفسی خۆیدا نەڕوات[١]، خوای گەورە لە گوناحەکانی پێشوی دەبورێت.

★ ئیبنو عومەر، خوا لێیان ڕازی بێت، دەڵێ: پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم، فەرموی: (إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الْمَسْجِدِ لَا يَنْزِعُهُ إِلَّا الصَّلَاةُ لَمْ تَزَلْ رِجْلُهُ الْيُسْرَى تَمْحُو عَنْهُ سَيِّئَةً وَتَكْتُبُ لَهُ الْيُمْنَى حَسَنَةً حَتَى يَدْخُلَ الْمَسْجِدَ)[٢] واتە: ئەگەر کەسێکتان دەستنوێژێکی راست و دروستی گرت و، تەنها لەبەر خاتری خوا، بۆ نوێژ بەرەو مزگەوت کەوتە ڕێ، بە هەر هەنگاوێکی قاچی چەپی، گوناحێکی لێ هەڵدەوەرێت و، بە هەر هەنگاوێکی پێی ڕاستی، چاکەیەکی بۆ دەنوسرێت، تا دەگاتە ناو مزگەوتەکە..

★ سەیدنا عوسمانی کوڕی عەففان، خوا لێی ڕازی بێت، دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم، فەرموی: (مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الوُضُوءَ، خَرَجَتْ خَطاياهُ مِنْ جَسَدِهِ حَتَى تَخْرُجَ مِنْ تَحْتِ أَظفَارِهِ)[٣] واتە: هەر کەسێك بە ڕاست ودروستی دەستنوێژ بگرێت، گوناحەکانی لە جەستەی دەچنە دەرێ، تا وای لێدێت لە بن نینۆکەکانیشیەوە، گوناح دەڕواتە دەرەوە..

**٣ . دەستنوێژ پلەوپایەی خاوەنەکەی بەرز دەکاتەوە:** ئەبو هورەیرە، خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم

---

[١] هۆش و گۆشی نەڕوات و نەکەوێتە زۆر بلێیی.

[٢] تەبەرانی گێڕاوێتیەوە و شێخی ئەلبانی لە (صحيح الجامع ژمارە ٤٥٤) دا بە سەحیحی داناوەو ئەسڵەکەی ریوایەتی ئەبوهورەیرەیە خوا لێی ڕازی بێت لە بوخاری وموسلیمدایە..

[٣] موسلیم (١٣٣/٣). ئەوانی تریش.

فەرموی: (أَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى مَا يَمْحُو اللَّهُ بِهِ الْخَطَايَا وَيَرْفَعُ بِهِ الدَّرَجَاتِ قَالُوا بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ عَلَى الْمَكَارِهِ وَكَثْرَةُ الْخُطَا إِلَى الْمَسَاجِدِ وَانْتِظَارُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الصَّلَاةِ فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ، فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ، فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ)[1] واتە: ئەرێ شتێکتان پێ ڕانەگەیێنم، کە گوناح دەسڕێتەوەو، پلەوپایە بەرز دەکاتەوە؟! وتیان: بەدی ئەی پێغەمبەری خوا، فەرموی: دەستنوێژ شوشتن لە کاتی نارەحەتیدا، زۆر هەنگاو هەڵهێنانەوەی چونە مزگەوت، دوای نوێژ کردن، چاوەڕوانی نوێژی داهاتو، ئا ئەوە سەنگەر نشینیە، ئا ئەوە سەنگەر نشینیە، ئا ئەوە سەنگەر نشینیە..

## ٤ . دەستنوێژ ڕێی چونە بەهەشتە:

★ئەبو هورەیرە، خوا لێی ڕازی بێت، دەڵێ: پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم، بە بیلالی حەبەشی فەرمو: (يَا بِلَالُ حَدِّثْنِي بِأَرْجَى عَمَلٍ عَمِلْتَهُ فِي الْإِسْلَامِ، فَإِنِّي سَمِعْتُ دَفَّ نَعْلَيْكَ بَيْنَ يَدَيَّ فِي الْجَنَّةِ، قَالَ: مَا عَمِلْتُ عَمَلًا أَرْجَى عِنْدِي أَنِّي لَمْ أَتَطَهَّرْ طَهُورًا فِي سَاعَةٍ مِنْ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ إِلَّا صَلَّيْتُ بِذَلِكَ الطُّهُورِ مَا كُتِبَ لِي أَنْ أُصَلِّيَ)[2] واتە: ئەرێ بیلال، چ کردارێکت هەیە، کە لە هەمو کارەکانتدا، ئومێدی زیاترت بەو هەیە، چونکە لە بەهەشتدا لە پێش خۆمەوە، گوێم لە خشپەی نەعلەکانت بو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، کارێکی وام نیە ئەوەندەی ئومێدی پێوە ببەستمەوە، مەگەر ئەوەی، کە هەمو جارێك شەو بێت، یان ڕۆژ، کە دەستنوێژ دەشۆم، پاشان چەندم بۆ نوسرا بێت، نوێژی پێوە دەکەم..

---

[1] موسلیم (٢٥١).

[2] بوخاری (١١٤٩)، موسلیم (٢٤٥٨).

★عوقبەی كوڕی عامر، خوا لێی ڕازی بێت، دەڵێ: گوێم لێبو پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم، دەیفەرمو: (مَا مِنْكُمْ مِنْ أحَدٍ يَتوَضَّأُ فيُسْبِغُ الْوُضُوءَ ثمَّ يقُومُ فيَرْكعُ رَكْعَتيْنِ يُقْبلُ علَيْهمَا بقلْبهِ وجْههِ إلَّا وَجبَتْ لهُ الْجَنَّةُ )[١] واتە: هەر كەسێك بە ڕێكوپێكی دەستنوێژی گرت و، پاشان دوو ركات نوێژی كرد، كە دڵ و هۆشی لێیان بێت، بەهەشتی مسۆگەرە..

## ٥ . دەستنوێژ نیشانەی ناسینەوەی ئەم ئوممەتەیە:

ئەبو هورەیرە، خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم، چوە سەر گۆڕستانێك و فەرموی: (السَّلامُ عليكُم دارَ قَومٍ مُؤمنينَ، وإنَّا إنْ شاءَ اللهُ بكُمْ عنْ قَريبٍ لاحِقُونَ، وَدِدْتُ لَو أنَّا قدْ رَأينا إخوانَنا، قالوا: ألسْنا إخْوَانَكَ يَا رَسُولَ اللهِ ؟ قالَ: أنْتم أصْحَابي، وَإخوانُنا الذينَ لمْ يَأتوا بَعْدُ، فقَالُوا: كَيفَ تعْرِفُ مَنْ لَمْ يأتِ بَعْدُ مِنْ أُمَّتِكَ يَا رسولَ اللهَ ؟ فقالَ: أرَأيْتَ لَو أنَّ رَجُلاً لَهُ خَيلٌ غُرٌّ مُحَجَّلَةٌ بَينَ ظَهْرَي خَيلٍ دُهْمٍ بُهْمٍ ألَا يَعْرِفُ خَيْلَهُ قَالُوا بَلَى يا رسُولَ اللهِ، قالَ: فَإنَّهُمْ يَأتونَ غُراًّ مُحَجَّلِينَ مِنْ الوُضوءِ وأنَا فرَطُهُمْ عَلَى الحَوضِ، ألَا لَيُذَادَنَّ رِجَالٌ عَنْ حَوضِي كَمَا يُذَادُ الْبَعيرُ الضَّالُ، أنَاديهم ألَا هَلُمَّ، فيُقَالُ إنَّهُمْ قدْ بَدَّلُوا بَعْدَكَ، فأقُولُ سُحْقاً سُحْقاً)[٢] واتە: سڵاوی خواتان لێ بێت، ئەی خەڵكی موسوڵمانی ناوچە، ئێمەش ئەگەر خوا حەز كات، بەم نزیكانە پێتان دەگەین.. حەزم دەكرد براكانی خۆمانمان ببینیایە، پرسییان: ئەدی ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە برات

---

[١] موسلیم (٢٣٤) ، نەسائی (٨٠/١) و ئەوانی تریش، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ژمارە ٦٠٦٢) دا دەفەرموێ: سەحیحە..

[٢] موسلیم (٢٤٩).

نین؟! فەرموی: ئێوە یاوەرانی منن، برایانمان ئەوانەن، کە دوای ئێمە دێن، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، جەنابت چۆن تاك تاكی ئوممەتەكەی خۆت، كە هێشتا نەهاتون دەناسیتەوە ؟! فەرموی: باشە، ئەگەر كابرایەك ئەسپی قەشانی، لولاق سپی، لە ناو ئەسپی رەشدا هەبێت، نایانناسێتەوە ؟! وتیان: بەدی ئەی پێغەمبەری خوا، ئینجا فەرموی: (شوێن كەوتوانی من، كە لە قیامەتدا دێنە پێش) ناوچەوان و دەست و بازویان، لە ئاسەواری دەستنوێژگرتنیان سپیە، من خۆم پێش ئەوان دەچمە سەر حەوزەكە، ئەوجا هەر وەكو، كە لە دنیادا حوشتری وێڵ ئاراستە دەكرێت، پیاوانێك دەبینرێن، هەوڵ دەدەن بێن و، رێنیشاندەری بكرێن و، تا بێنە سەر حەوزەكە، منیش بانگیان دەكەم: كورە بەرەو لای من وەرن، بەڵام رێیان لێ دەگیرێت، ئینجا دەوترێت: ئەوانە پاش جەنابت زۆر گۆڕان و، لە رێ دەرچون، منیش دەڵێم: دەی هەر با دور خرێنەوە، با دور خرێنەوە.

ئیمام نەوەی رەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێ: (الغرّة) قەشانی رەنگی موی سپیە، كە بە ناوچەوانی ئاژەڵەوەیە، (التحْجيل): سپێتی موەكانە، كە بە سێ لولاقی هەندێ ئەسپەوە دەبێت.. مەبەستی پێغەمبەری نازدار، صلى الله عليه وسلم ئەوەیە، كە ئاسەواری دەستنوێژ، بۆ موسوڵمانانی ئوممەتەكەی، بۆتە نوری ناوچەوانیان، دەست و پێشیان، نوریان لێ دەدرەوشێتەوە[1].

## ٦ . دەستنوێژ لە رۆژی قیامەتدا دەبێتە مایەی نورانێتی موسوڵمان:

ئەبو هورەیرە، خوا لێی ڕازی بێت، دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموی: (تَبلُغ الحِلْيَةُ مِنْ المؤمِنينَ حَيْثُ يَبْلُغ

---

[1] النوي: شرح مسلم (٣/١٠٠).

الوَضوءُ)[١] واتە: نوری دەموچاو دەستی موسوڵمان، دەگاتە ئەو شوێنانەی، کە ئاوی دەستنوێژی بەرکەوتوە..

**٧ . دەستنوێژ گرێ کوێرەی شەیتان دەکاتەوە:** ئەبو هورەیرە، خوا لێی ڕازی بێت، دەڵێ: پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: ( يَعْقِدُ الشَّيْطَانُ عَلَى قَافِيَةِ رَأْسِ أَحَدِكُمْ إِذَا هُوَ نَامَ ثَلَاثَ عُقَدٍ يَضْرِبُ كُلَّ عُقْدَةٍ عَلَيْكَ لَيْلٌ طَوِيلٌ فَارْقُدْ فَإِنْ اسْتَيْقَظَ فَذَكَرَ اللَّهَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ فَإِنْ تَوَضَّأَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ فَإِنْ صَلَّى انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ فَأَصْبَحَ نَشِيطًا طَيِّبَ النَّفْسِ وَإِلَّا أَصْبَحَ خَبِيثَ النَّفْسِ كَسْلَانَ)[٢] واتە: هەر یەکێکتان، کە دەخەوێت، شەیتان لە پشت سەریەوە، سێ گرێ دەدات، لەگەڵ هەر گرێیەکیاندا دەڵێت: برۆ ڕاکشێ، شەوێکی تولانیت بەسەردا بێت[٣]، ئەگەر کابرا خەبەری بۆوەو، زیکری خوای کرد، گرێیەکیان دەکرێتەوە، ئەگەر دەستنوێژی گرت، گرێیەکی تریشیان دەکرێتەوە، ئەگەر نوێژی کرد، ئەوا گرێی سێیەمیش دەکرێتەوە، ئیتر گورجوگۆڵ و دەرون ئاسودە دەبێت، ئەگەر نا، ئەوە ئیتر دەرون ئاڵۆزو، تەمبەڵ و تەوەزەل دەبێت..

★ ★ ★

---

[١] موسلیم (٢٥٠)، نەسائی (٨١/١).
[٢] بوخاری (١١٤٢)، موسلیم (٧٧٦).
[٣] یەعنی خەوت قورس بێت و بۆ خێرێك هەڵنەسیتەوە.

# کورتەی چۆنیەتی دەستنوێژگرتن

حومرانی خزمەتکاری سەیدنا عوسمانی کوڕی عەففان، خوا لێیان ڕازی بێت، گێڕایەوە، کە: (أَنَّهُ رَأَى عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ دَعَا بِوَضُوءٍ فَأَفْرَغَ عَلَى يَدَيْهِ مِنْ إِنَائِهِ فَغَسَلَهُمَا ثَلَاثَ مَرَّاتٍ ثُمَّ أَدْخَلَ يَمِينَهُ فِي الْوَضُوءِ ثُمَّ تَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ وَاسْتَنْثَرَ ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثًا وَيَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ ثَلَاثًا ثُمَّ مَسَحَ بِرَأْسِهِ ثُمَّ غَسَلَ كُلَّ رِجْلٍ ثَلَاثًا ثُمَّ قَالَ رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَوَضَّأُ نَحْوَ وُضُوئِي هَذَا وَقَالَ مَنْ تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي هَذَا ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ لَا يُحَدِّثُ فِيهِمَا نَفْسَهُ غَفَرَ اللَّهُ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ)[١] واتە: سەیدنا عوسمانی بینی، کە داوای جامێك ئاوی دەستنوێژی کرد، سێ جاران ئاوی لە جامەکەوە بەسەر دەستیدا کرد وشوشتنی، پاشان دەستی ڕاستی کرد بە ئاوەکەداو، لوێچە ئاوی دەرهێناو دەم و لوتی پێ ڕادا، پاشان سێ جاران دەموچاوی شت، هەروەها سێ جار دەستەکانی، تا ئانیشکەکانی شوشت، پاشان مەسحی سەری کرد، ئینجا سێ جاران پێیەکانی تا قولەپێ شت، پاشان گوتی: پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: هەر کەسێك ئاوا ئەم دەستنوێژەی من بگرێت، پاشان دوو رکات نوێژ بکات و، نەکەوێتە قسەی زیادەوە، ئەوە لە هەمو گوناحەکانی پێشوی دەبوررێت..

لەم فەرمودەو ئەوانی دیکەی، کە وەکو ئەمن (کە دواتر دەیاهێنینەوە) دەتوانین بە شێوەیەکی گشتی، کورتەی چۆنیەتی دەستنوێژ، بەم شێوەیەی خوارەوە دیاری بکەین:

١ ـ نیەتی دەستنوێژ دەهێنێت، کە دەیەوێت بێ نوێژێتی خۆی لادات.

---

[١] بوخاری (١٥٨، و ٦٤٣٣)، موسلیم (٢٢٦).

٢ ـ بسم الله دەكات.

٣ ـ سێ جار دەستەكانی دەشوات.

٤ ـ بە دەستی راستی و، بە یەك لوێچ ئاو، لەدەم و لوتی پێكەوە را دەدات، پاشان تفی دەكاتەوەو فم دەكات..

٥ ـ سێ جار بە دەستی چەپی فم (یان فن) دەكات.

٦ ـ سێ جار دەموچاوی دەشوات و، ڕیشی هەڵدەگڵۆفێت.

٧ ـ دەستی ڕاستی، پاشان دەستی چەپی، تا ئانیشكی دەشوات، هەر بە پەنجەكانی، دەست بە نێوان پەنجەكانیدا دەهێنێت.

٨ ـ بە دەستی تەڕ مەسحی سەری دەكات، بەوەی یەكجار، دەستی بە پێشەوەی سەریدا، دەباتە پشت سەری و، دەیهێنێتەوە..

٩ ـ مەسحی ناوەوەو دەرەوەی گوێچكەكانی دەكات.

١٠ ـ پێیەكانی تا قولەپێ دەشوات، پێی راستی پێش چەپی، لەگەڵ دەست وەردان لە نێوان پەنجەكانی پێی..

★ ★ ★

## نییەت مەرجی دروستی دەستنوێژە

ئیمام مالیك و، شافیعی و، ئەحمەدو، ئەبو سەورو، داود دەڵێن: بۆ ڕاستی و دروستی دەستنوێژ، نییەت مەرجە[١]،[٢]..

نییەت ویست و ئیرادەی دڵە، كە خاوەنەكەی نیازی وایەو، دەیەوێت ئەم خواپەرستیە بهێنێتە دی، كە دەستنوێژ گرتنە، چونكە ئەمە لە هەمو خواپەرستیەكدا داواكراوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ﴾ البينة/٥. واتە: فەرمانی ئەوەیان پێدرابو، كە تەنها خوای پاك و تاك، بە سەر ڕاستانە بپەرستن..

پێغەمبەری پێشەواش، صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: (إنّمَا الاعْمَالُ بالنّيَّاتِ وإنّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى)[٣] واتە: هەمو كردەوەیەك، بە پێی نیەتە، نیەتی هەر كەس چۆن بو، هەر ئاوای بەردەكەوێت..

بەڵام ئیمام ئەبو حەنیفە، نیەت ناكاتە مەرجی نوێژ[٤]، چونكە بە لایەوە دەستنوێژ خواپەرستیەكە، بە ژێریی پەی پێ براوەو، خۆی لە خۆیدا مەبەست نیە، هەر وەك تارەت گرتنەكە وایە..

بۆچونی جمهور[١]ڕاسترە، چونكە دەقە پیرۆزەكان، لەسەر چەسپاندنی پاداشتی هەمو دەستنوێژێكن، ڕای شەرعناسانیش لەسەر ئەوە كۆیە، كە

---

[١] ابن رشد: بداية المجتهد (٦/١) و المجموع (٣٧٤/١) وابن عبدالبر: التمهيد (١٠٠/٢٢).

[٢] مەرج: بریتیە لە هۆكارێك، كە ئەگەر نەهاتە دی، مەرج لەسەر كراوەكەشی نایەتە دی، مەرج پێش مەرجكراوەكەیە، بۆ نمونە، دەستنوێژ مەرجی نوێژە، ئەگەر كەسێك دەستنوێژی نەبو، نوێژیش بكات لێی قبوڵ ناكرێت و، وەك ئەوەیە، كە نەیكردبێت..

[٣] بوخاری (١)، موسلیم (١٩٠٧).

[٤] بدائع الصنائع (١٩/١).

پاداشت بۆ کارێکە کە نیەتی خواویستی تێدابوبێت.. هەر کارێکیش، کە نیەتی خواویستی تێدا بێت دەبێتە خواپەرستی[٢]..

نیەت هێنان لە دڵدایەو بە لەفز ناوترێت:

ئیمام ئیبنو تەیمییە، رحمه الله دەڵێ: هەمو پێشەوایانی شەرع لەسەر ئەوە رێکن، کە شوێنی نییەت دڵەو، بە زوبان هیچی بۆ ناوترێت، ئەمەش بۆ هەمو خواپەرستیەکان وەکو یەکە، بۆ نوێژو، زەکات و، رۆژو، حەج و، ئازادکردنی کۆیلەو، جیهادو ئەوانی تریش[٣]..

کەوابو نیەت بە لەفز ناوترێت، هەر کەسێك بە لەفزو، بە دەنگی بەرز وتی، بیدعەیەکی داهێناوەو، سەری لە خەڵکی تر شێواندوە، بۆیە هەندێك لە شەرعناسان گوتویانە: هەر کەسێك ڕاهاتبێت، کە بە لەفز بیڵێت، دەبێت پێی بوترێت، کە وازی لێ بهێنێت، ئەگەر هەر بەردەوام بو، دەبێ سزا بدرێت، تا تەرکی دەکات، چونکە ئەوی بە دەنگی بەرز نییەت دەهێنێت، کاری خراپە دەکات، ئەگەر لە ڕوی دینیشەوە وا بزانێت ئەمە جائیزە، ئەوە خاوەن بیدعەیە.. پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم و، یاوەرانی، کەسیان نیەتیان بە لەفزی زمان نەهێناوەو، هیچ ریوایەتێکیان لێوە نەگێڕراوەتەوە بسەلمێنێت کە تاکە کەسێکیشیان، نیەتی بە زوبان هێنابێت.. ئەگەر ڕەفتارێکی جائیز بوایە، هەر دەبو پێغەمبەری پێشەوا، صلی الله علیه وسلم، ڕونی بکاتەوە، ئەگەر ڕونیشی بکردایاتەوە، حەتمەن لە یاوەرێکی بەڕێزەوە، بە موسوڵمانانی دیکە دەگەیشت.. بۆیە قەولەکەی

---

[١] لە باسەکانی شەرع و بەراوردی مەزهەبەکاندا، کە دەوترێت (جمهور) مەبەست لە سێ ئیمامە لەو چوار ئیمامە بەڕێزە: ئەبو حەنیفەو مالیك و شافیعی و ئەحمەد.. ڕەحمەتی خوایان لێ بێت..

[٢] ابن مفلح: الفروع (١/٢٤٣).

[٣] ابن تيمية: مجموعة الرسائل الكبرى (١/٢٤٣).

ئیمام ئیبنولقەییم لە جێی خۆیدایە، کە دەڵێ: کەس پێویستی بەوە نیە، بە لەفز نییەتی خواپەرستیەکان بهێنێت[1]..

ئەمە نیەتی دەستنوێژو، نوێژو، ڕۆژو و، خواپەرستیەکانی تریشە، کە لە مزگەوتی کوردەواریدا، لە ڕەمەزاندا هاواری بۆ دەکەن و دەڵێن: نیەتی ڕۆژوی سبەینێ بە فەرز بهێنن، ئینجا هەر کەس بە دەنگی بەرز، نیەتی ڕۆژوبونی سبەینێی دەهێنێت !

★ ★ ★

## لەفزی پێچەوانەی نیەتی دڵ:

هەرچەندە نییەت هێنان بە لەفزی زوبان بیدعەیە، بەڵام ڕێ لەوە ناگرێت، هەندێك حوکمی شەرعی، لەسەری ڕون کەینەوە:

١ـ ئیبنوتەیمییە دەڵێ[2]: ئەگەر کەسێك بە زوبان، نیەتێکی غەیری ئەوەی دڵی هێنا، حوکمی شەرعی لەسەر ویستی دڵێتی، نەك لەسەر ئەوەی بە زوبان وتوێتی.. وەکو ئەوەی نیازی وایە نوێژی عیشا بکات، بەڵام بە لەفزی زوبان وتی: نێتمە دوو ڕکاتی نوێژی وتر دەکەم.

٢ـ ئەگەر بە لەفز نێتی خواپەرستی هێنا، بەڵام لە ناخیدا نیازی نەبو بیکات، حوکم لەسەر نیازەکەی دڵی دەبێت نەك لەسەر لەفزەکەی، کە وتوێتی. چونکە نییەتی دڵ، لە توخمی ویست و ئیرادەیە[3]..

---

[1] ابن القیم لە هەر سێ کتێبی: زاد المعاد (١/١٩٦)، إغاثة اللهفان (١/١٣٤)، بدائع الفوائد (٣/١٨٦)، ابن مفلح: الفروع (١/١١١) وابن عثیمین: الشرح الممتع (١/١٥٩)..

[2] ئیبنو تەیمییە رحمه الله زۆر شێوەی ئەم راجوێییەی نێوان زانایانی لە کتێبی المجموع (١/٣٨٥) دا باس کردوە..

[3] ابن تیمیة: مجموعة الرسائل الکبری (١/٢٤٣).

٣ـ ئەگەر چەند هۆکارێکی دەستنوێژ شکان روبدات، نیەتی لابردنی بێ دەستنوێژیەکە بۆ هەمویان بەسە. بۆ نمونە، کەسێك میزی کرد، پاشان پیسایی کرد، پاشان خەوت، ئەمە هەر سێکیان هۆکاری دەستنوێژ شکانن، ئەگەر ویستی دەستنوێژ لە یەکێکیان بگرێت، دەستنوێژەکەی بۆ هەر سێ هۆکارەکەیە.. چونکە با هۆکارەکانیش جودا بن، بەلام دەستنوێژەکە جەبرانی هەر سێکیان دەکاتەوە[١]..

---

[١] النوی: المجموع (١/٣٨٥)، ابن عثیمین: الشرح الممتع (١/١٦٥).

## ئەرکانەکانی دەستنوێژ

ئەرکانی شتێك، واتە پێکهاتەکەی، ئەوەی دەبێتە مایەی هەبونی، ئەرکانی دەستنوێژ بریتیە لەو رەفتارانەی، کە بە هەمویان حەقیقەتی دەستنوێژەکە پێك دەهێنن، ئەگەر یەکێکیان ئەنجام نەدرا، دەستنوێژەکە بەتاڵ دەبێت.. ئەرکانەکانی دەستنوێژیش ئەمانەن:

**یەکەم: شتنی هەمو دەموچاو:**

دەموچاو، واتە: ڕوو، کەبەوە وتراوە، کە لە ڕوبەڕوبونەوەدا دەردەکەوێت، کە بریتیە: لە باری پانایی لە گوچێکەوە بۆ گوێچکە و، لە باری درێژیی، لە بنجی موەکانی سەر ناوچەوانەوە، بۆ کەسانی ئاسایی تا چەناگە، یان لەو شوێنەوە، کە ئیتر تەختی ناوچەوان، بەرەو تەوقی سەر کۆتایی پێدێت، تا چەناگە.

شوشتنی دەموچاو، ڕوکنێکە لە روکنەکانی دەستنوێژ و، دەستنوێژ بێ ئەم ڕوکنە باتڵە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ﴾ المائدە/٦ واتە: کە هەستان بۆ نوێژ، بڕۆن دەموچاوتان بشۆن (واتە دەستنوێژ بشۆن، کە دەموچاو شتنەکە ڕوکنەکەیەتی). هەر کەسێکیش چۆنیەتی دەستنوێژ گرتنی پێغەمبەری خوای، صلى الله عليه وسلم، گێڕاوەتەوە ئەوەی باس کردوە، بۆیە کۆڕای شەرعناسانیش لەسەر ئەو بۆچونەیە..

**ئاو لەدەمولوت رادان واجبە:**

ئاو رادان لە دەم: بریتیە لەوەی بڕێك ئاو بخرێتە دەمەوەو، لەدەمدا هاتو چۆی وەك غەرغەرەی پێ بکرێت.

ئاو لە لوت رادان: کە لە عەرەبیدا دوو رەفتارە: یەکەمیان گەیاندنی ئاوەکەیە بە ناو لوت و هەڵمژینی، ئەمە پێی دەوترێت: (الإسْتِنْشاق). دووەمیان فم (یان فن) کردنەوەی ئاوەکەیە (واتە: فڕێدانە دەرەوەی بە تین و فشارەوە)، ئەمەیان لە عەرەبیدا پێی دەوترێت: (الإسْتِنْثار) زۆر لە شەرعناسان ئەم دوو رەفتارە لە دەستنوێژدا بە واجب دەزانن، چونکە:

١ ـ خوای پەروەردگار فەرمانی لە دەستنوێژدا بە شوشتنی دەموچاو داوە، دەم و لوتیش بەشێکن لەو دەموچاوە، هیچ پێویستیش ناکات فەرمانێکی تایبەتی بۆ شوشتنی دیوی دەرەوەیان دەرچێت[١] .

٢ ـ خوای گەورە کە فەرمانی بە شوشتنی دەموچاوەکە دا، پێغەمبەری پێشەوا، صلى الله عليه وسلم بە کردەوە لەبەرچاوی یاوەراندا، نواندی تا بۆیان ڕون کاتەوەو فێریان کات.. لە هەمو دەستنوێژگرتنێکیدا، ئەمانەی کردوە، قەت جارێك لێی نەبینراوە، دەستنوێژی گرتبێت و نەیکردبن.. کەوابو ئەنجامدانیان واجبە[٢].

٣ ـ پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم، فەرمانی تایبەتی بە ئەنجامدانی ئەم دوو رەفتارە داوە، کە فەرمویەتی:

ـ (مَنْ توَضَّأ فلْيَسْتنْثِرْ) واتە: هەر کەسێك دەستنوێژی گرت، با ئاو لە لوتی ڕادات، لە ریوایەتێکی تردا دەفەرموێ: (إذا توَضَّأ أحَدُكُمْ فلْيَجْعَلْ فِي

---

[١] الشوكاني: نيل الاوطار (١٧٤/١)، ابن العربي: أحكام القران (٥٦٣/٢).
[٢] ابن تيمية: شرح العمدة (١٧٨/١)، ابن عبدالبر: التمهيد (٣٦/٤).

أَنْفِهِ مَاءً ثُمَّ لِيَسْتَنْثِرْ)[١] واتە: ئەگەر یەكێكتان دەستنوێژی گرت، با ئاو لە لوتی ڕاداو، فم (یان فن) كاتەوە..

ـ (إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْتَنْشِقْ..)[٢] واتە: ئەگەر یەكێكتان دەستنوێژی گرت، با ئاو لە لوتی ڕادا..

ـ (.. وَبَالِغْ فِي الإِسْتِنْشَاقِ إِلَّا أَنْ تَكُونَ صَائِمَاً)[٣] واتە: زۆر ئاو لە لوتت ڕادە، مەگەر بەڕۆژو بیت، (كە بەڕۆژو بویت زۆر وا مەكە)..

ئیمام ئیبنو تەیمییە دەڵێ: جەخت كردنەوەی پێغەمبەری خوا، صلى الله علیه وسلم لەسەر ئاو لە لوت ڕادان، لەبەر ئەوەی نیە، كە گرنگتر بێت لە پاك ڕاگرتنی دەم، كە بەڕێزترەو جێی زیگری خواو، خوێندنی قورئانەو، زۆرتربە هۆی ڕۆژو گرتنەوە، بۆنی دێت، بەڵكو والله اعلم، لەبەر ئەوەیە، كە دەم بە بەكارهێنانی سیواك و شوشتنی دوای نان خواردن و(بە پێی هەندێك بەڵگە) پێش نان خواردنیش، بە جۆرێك لە جۆرەكان جێ بایەخ دەبێت و، هەرچۆنێك بێت، هەر بە پاكژیی دەمێنێتەوە، بەڵام لوت پاككردنەوە، ئەگەر ئەو جەختەی لێ نەكرێتەوە، لەوانەیە، فەرامۆش (إهمال) بكرێت[٤]..

٤ ـ فـەرمودەی تایبـەت بـە ئـاو لـەدەم ڕادان هەیـە، وەك ئـەوەی، كـە لەقیتی كوڕی سـەبرە، خـوا لێـی ڕازی بێـت دەگێڕێتـەوە، كـە پێغەمبـەری

---

[١] هەردوكیان سەحیحن و لە بوخاریدا ژمارە (١٦١) و لە موسلیمدا ژمارە (٢٣٧) ن.
[٢] موسلیم (٢٣٧).
[٣] ئەبو داود (١٤٢)، نەسائی (٦٦/١)، ئیبنوماجە (٤٠٧)، ئەحمەد (٣٣/٤).
كەمال ئیبنو السسەید لە صحیح فقه السنة (١٢٣/١) دا دەفەرموێ: سەحیحە..
[٤] ابن تیمیة: شرح العمدة (١٧٩/١).

خوا، صلى الله عليه وسلم، فەرمووی: (إذا توَضَّأتَ فمَضْمِضْ)[1] واتە: ئەگەر دەستنوێژت شت، ئاو لەدەمت وەردە..

لە بەرامبەر ئەم بەڵگانەدا، بەڵگەی تریش هەن، کە هەندێك شەرعناسی تر پشتیان پێ بەستون و، رایان لەسەر واجب بونی ئاو، لە دەم و لوت ڕادان نەداوەو، بە جائیزیان زانیوەو بەس، لەوانە: ئەو فەرمودەی، کە بە (حَديثُ المُسيءِ صَلَاتهُ فەرمودەی کابرای، کە نوێژەکەی بە خراپی کرد) بەناوبانگە، کە پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم بە کابرای فەرمو: (لا تتِمُّ صَلاةُ أحَدِكُمْ حَتّى يُسْبِغَ الْوُضُوءَ كَمَا أمَرَهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ، فَيَغْسِلَ وَجْهَهُ، وَيَدَيْهِ إلَى الْمِرْفَقَيْنِ، وَيَمْسَحَ برَأسِهِ وَرِجْلَيْهِ إلَى الْكَعْبَيْنِ)[2] واتە: نوێژی کەستان قبوڵ نابێت، تا دەستنوێژەکەی بە جوانی، بەو شێوەیەی، کە خوای گەورە فەرمانی پێداوە نەشوات، دەموچاو دەستی، تا ئانیشکی دەشوات و، مەسحی سەری دەکات و، هەردووپێی، تا قولەپێی دەشوات..

ئەو شەرعناسە بەڕێزانە دەڵێن: ئەمە هەمو شەرحی دەستنوێژەکەی تێدایە، بێ ئەوەی ئاماژەیەك بە ئاو لە دەم و لوت ڕادان بدات، بۆیە ئەم شەرعناسە بەڕێزانە دەڵێن: ئەگەر واجب بوایە، پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم، بە تایبەت باسی دەفەرمو.. ئەمەش راو بۆچونێکەو جێی

---

[1] ئەبو داود (١٤٠)، ترمزی (٣٨)، نەسائی (٦٦/١)، ئیبنوماجە (٤٤٨).
کەمال ئیبنو السسەید لە صحيح فقه السنة (١١٤/١) دا دەڵێ: سەحیحە..

[2] ئەبو داود (٨٥٩)، ترمزی (٣٠٢)، نەسائی (٢/٢٠، ١٩٣)، ئیبنوماجە (٤٦٠).
کەمال ئیبنو السسەید لە صحيح فقه السنة (١١٥/١) دا دەڵێ: سەحیحە..

تێبینیە.. بە هەر حاڵ شەرعناسان لە حوكمی ئاو لەدەم و لوت رادانـدا چوار پۆلن[١]:

**پۆلی یەكەم: ئەوانەی گوتویانە: ئاو لە دەم و لوت ڕادان لە غوسڵ دەركردندا واجبە نەك لە دەستنوێژدا:** ئەمەش رای ئیمام ئەبو حەنیفەو، سەوری و، شەرعناسانی مەدرەسەی ڕەئیە.

**پۆلی دووەم: ئەوانەی گوتویانە: هەردووكیان لە غوسڵ و دەستنوێژدا سوننەتن:** ئەمەش رای ئیمام مالیك و، شافیعی و، لەیس و، ئەوزاعیە.

**پۆلی سێیەم: ئەوانەی گوتویانە: هەردووكیان لە غوسڵ و دەستنوێژدا واجبن:** ئەمەش رای عەتاء و، ئیبنو جورەیج و، ئیبنول موبارەك و، ئیسحاق و، قەولێكی ئیمام ئەحمەدەو، بە لای مەزهەبی حەنبەلیەوە هەردووكیان واجبە.

**پۆلی چوارەم: ئەوانەی گوتویانە: ئاو لە دەم وەردانەكە لە هەردووكیاندا سوننەتەو ئاو لە لوت رادان لە هەردووكیاندا واجبە:** ئەمەش قەولێكی تری ئیمام ئەحمەدەو، ڕای ئەبو عوبەیدو، ئەبو سەورو، كۆمەڵێك فەرمودەوانە و، ئیبنولمونزیریش ئەمەیانی پەسەند كردوە.

---

[١] المروزي: اختلاف العلماء (ل ٢٣)، ابن عبدالبر: التمهيد (٣٤/٤)، ابن المنذر: الاوسط (٣٧٩/١)، ابن الجوزي: التحقيق (١٤٣/١)، ابن حزم: المحلى (٥٠/٢).

پوختەی حوکمەکە: لەبەر بەهێزی بەڵگەی واجب بـون، پـێم وایـە ئـاو لەدەم و لوت ڕادان لە غوسڵ و دەستنوێژدا واجبە.. والله اعلم.

## شتنی ریش و برۆی پڕ:

ئەگەر کەسێك ڕیشی، یان برۆکانی پڕ بن، دەبێت لەگەڵ شڵپ پێدانی ئاوی دەستنوێژدا، دەستیان تێخات، تا ئاو بگاتە بن موەکان، ئەگەر زۆر پڕ بون، مەرج نیە، تەنها تەڕ بونی دەرەوەیان بەسە..

خودی ڕیش، ئەگەر درێـژ بوبێتـەوە، بـە رای ئیمام ئـەبو حەنیفـەو، قەولێکی کۆنی ئیمام ئەحمەد، مەرج نیـە بشـۆرێت، چـونکە بـە دەموچـاو حسێب نین.. بەڵام ڕای ئیمام شافیعی و، قەولێکی بەهێزی ئیمام ئەحمـەد هەیــە، کــە دەڵــێ: دەبێــت بشــۆرێت، چــونکە جگــە لــەوەی موەکــان لــە جێیەکەوە هاتون کە شوشـتنی فـەرزە، ڕیشـەکەش حـوکمی دەموچـاوەکەی وەرگرتوە[1].. ئەمەش پەسەندترە.. والله اعلم.

## دووەم: شوشتنی دەستەکان تا ئانیشك:

خــوای گــەورە دەفــەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ﴾ المائدە / ٦ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، ئەگەر بۆ نوێژ هەستان، با دەموچاو دەستان، تـا ئانیشـك شوشتبێت. لەبەر ئەم بەڵگەیە، کە شەرعناسان لەسەر ئەوە یەکڕان، کـە دەست شوشتن لە دەستنوێژدا واجبە..

---

[1] ابن الهمام: فتح القدير (١٢/١)، ابن قدامة: المغني (٨٧/١)، النوي: المجموع (٣٨٠/١).

پیتی (الى) کە لە ئایەتەکەدا (وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ ) هاتوە، بە مانای (مَعَ)یە واتە: لەگەڵیدا.. هەر وەکو ئەو ئایەتەی ترە، کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَهُمْ إِلَىٰٓ أَمْوَٰلِكُمْ﴾ النساء/٢ واتە: سەروەت و سامانی هەتیوان، مەخەنە گەڵ سەروەت و سامانی خۆتان و بیخۆن.. یان: ﴿وَيَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمْ﴾ هود/٥٢ واتە: هێزێکی تریشتان، لەگەڵ هێزەکەی خۆتاندا پێ دەبەخشێت..

موبەڕیدی زمانەوان، ڕەحمەتی خوای لێ بێت، دەڵێ: ئەگەر سنور لە توخمی دیاری کراوەکە بێت، دەچێتە ڕیزیەوە.

لەبەر ئەمانەیە، کە مەزهەبی جمهور (چوار مەزهەبەکە جگە لە مالیکی) گوتویانە: ئانیشکەکانیش دەبێت بشۆررێن[١]..

کرداری پێغەمبەری نازداریش، صلی الله علیه وسلم، بەڵگەیەکی ترە، کە نوعەیمی کوڕی عبداللەی موجمیر دەگێڕێتەوە، کە سەیدنا ئەبو هورەیرەی بینیوە، خوا لێی ڕازی بێت، دەستنوێژی ئاوا گرتوە: (فَغَسَلَ وَجْهَهُ فَأَسْبَغَ الْوُضُوءَ ثُمَّ غَسَلَ يَدَهُ الْيُمْنَى حَتَّى أَشْرَعَ فِي الْعَضُدِ ثُمَّ يَدَهُ الْيُسْرَى حَتَّى أَشْرَعَ فِي الْعَضُدِ ثُمَّ مَسَحَ رَأْسَهُ .. قَالَ هَكَذَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَوَضَّأُ)[٢] واتە: دەموچاوی شوشت، ئینجا دەست و بازوی ڕاستی، تا ئانیشکی شوشت، ئینجا دەست و بازوی چەپی، تا ئانیشکی، پاشان مەسحی سەری کرد.. پاشان فەرموی: ئاوا پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم دەبینی، کە دەستنوێژی دەشوشت..

---

[١] السرخسي: المبسوط (٦/١)، ابن رشد: بداية المجتهد (١١/١)، النوي: المجموع (٣٨٩/١) ، ابن قدامة: المغني (٩٠/١).

[٢] موسليم (٢٤٦).

ئـەو ڕێسایەش ئـەم بەڵگانـە بـەهێزتر دەکـات، کـە دەڵـێ: (مَـا لا يَـتِمُ الواجِبُ الّا بِـهِ فَهوَ واجِبٌ) واتـە: ئـەوەی، کـە فـەرزی پـێ تـەواو دەکرێـت، خۆشـی فـەرز دەبێـت.. لـە شوشـتنی بازوشـدا، لـە دەسـتنوێژدا نازانرێـت، سنوری بازوەکە بە تەواوی دیاری بکرێت، کە شۆراوە، یان نا، بەڵام ئەگەر ئانیشکی لەگەڵدا شۆرا، دڵنیابونی شتنی بازوەکە مسۆگەر دەبێت[١]..

**سێیەم: مەسحی سەر:**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِ﴾ المائدە/٦ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، ئەگەر بۆ نوێژ هەستان، با دەموچاو دەستان، تا ئانیشك شوشتبێت و مەسحی سەرتان کردبێت و، پێیەکانیشتان تا قولەپێ شوشتبێت..

شەرعناسان لەسەر ئەوە کۆن، کە مەسحی سەر فەرزە، بەڵام لە بڕو ڕادەیدا ڕا جوێ بون. بە پێی بۆچونیان سێ پۆلن:

**پۆلی یەکەم: ئەوانەی گوتویانە: مەسحی هەمو سەر بۆ ژن و پیاو فەرزە:** ئەمە مەزهەبی ئیمام مالیك و، قەولی بەهێزی حەنبەلیەکان و، زۆرینەی یاوەرانی ئیمام ئەحمەدو، ئەبو عوبەیدو، ئیبنول مونزیرەو، ئیمام ئیبنوتەیمییەش، ئەمەی بە پەسەندتر ناساندوە[٢] بەڵگەشیان:

---

[١] الغامدي: إختيارات ابن قدامة (١٦٤/١).

[٢] ئیمامی مالیك: المدونة (١٦/١)، ابن قدامة: المغني (٩٢/١)، ابن المنذر: الاوسط (٣٩٩/١) و ابن تيمية: مجموع الفتاوى (١٢٣/٢١).

١- ئەو بائەی لە ئایەتەکەی سورەتی المائدە/٦ دایە: ﴿فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ﴾ بۆ پێوەلکان (الإلصَاق)ە، بۆیە تەقدیرەکەی دەبێتە: (وامْسَحُوا رُؤوسَكُم). بەوەش وەکو مەسحی تەیەمومی لێ دێت بۆ دەموچاو، هەردووکیاشیان (سەر لە دەستنوێژو دەموچاو لە تەیەمومدا) لە قورئاندا بە لەفزێکی هاوبەش هاتون: ﴿فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم مِّنۡهُ﴾ المائدە/٦ واتە: ئەگەر ئاوتان دەست نەکەوت، هەر بەوەی لەسەر زەمیندا بەرز بۆتەوە (لە خاك ولم و بەرد) مەسحی دەموچاوتان بکەن. واتە هەمو دەموچاوتان.

٢- سوننەت ئەمەی بە رونی لێکداوەتەوەو، یاوەران بینیویانە، کە پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم، لە دەستنوێژیداهەمو سەری پیرۆزی مەسح کردوە.. عبداللەی کوڕی زەید، خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: (أَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَخْرَجْنَا لَهُ مَاءً فِي تَوْرٍ مِنْ صُفْرٍ، فَتَوَضَّأَ فَغَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثاً وَيَدَيْهِ مَرَّتَينِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ وَمَسَحَ بِرَأْسَهُ فَأَقْبَلَ بِهِ وَأَدْبَرَ وَغَسَلَ رِجْلَيْهِ)[١] واتە: پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم، تەشریفی هێنایە لامان، ئاومان لە دەفرێك (قاپێك) ی مسدا بۆ هێنا، دەستنوێژی گرت: سێ جاران دەموچاوی شوشت، دەستیشی دووجاران، تا ئانیشکی، پاشان مەسحی سەری کرد بەوەی، کە دەستی بە پاش و پێشی سەریدا هێنا، ئینجا پێیەکانی شوشت. لە ڕیوایەتێکی دیکەدا هاتوە، کە (وَمَسَحَ رَأسَهُ كُلَّهَا) واتە: هەمو سەری مەسح کرد..

---

[١] بوخاری (١٨٥)، موسلیم (٢٣٥).

٣ ـ فەرمودەكەی موغیرەی كوڕی شوعبە، خوا لێی ڕازی بێت، كە دەڵێ: (أنَّ النَّبيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ توَضَّأ فمَسَحَ عَلَى خُفَّيهِ، وَمُقَدَّمَ رَأسِهِ وَعَلَى عِمَامَتِهِ)[1] واتە: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، دەستنوێژی شت، ئینجا مەسحی سەر خوففەكانی كرد، هەروەها پێشە سەری و، مەسحی هەمو سەری، بەسەر عەمامەكەیەوە كرد.

ئەم پۆلە شەرعناسانە دەڵێن: ئەگەر مەسحی پێشە سەری بەس بوایە، هەمو سەری پیرۆزی، بەسەر عەمامەكەشەوە مەسح نەدەكرد، كەوابو مەسحی هەمو سەر فەرزە..

## پـۆلی دووەم: ئەوانـەی گوتویانـە: مەسـحی بەشـێكی سـەر بەسە:

ئەمەش مەزهەبی ئەبو حەنیفەو شافیعیە[2]، بەڵام ئەمانیش لەوەدا ڕاجوێن، كە بڕی ئەو بەشە چەندە؟! هەندێك دەڵێن: سێ تاڵە مو بگرێتەوە بەسە، هەندێكی تریش دەڵێن: چارەك، یان نیوەی سەر بگرێتەوە.. هەندێك لە بەڵگەی ئەمانیش ئەمانەن:

١ـ ئەو بائەی بە (وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ) دوەیە بۆ هەندێكی (لِلتبْعِيض)ە، نەك بۆ پێوە لكان (الأَلْتِصَاق).

٢ـ بەڵگەش لەسەر ئەوە هەیە، كە پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم، مەسحی پێشە سەری كردوەو بەس بوە..

---

[1] موسلیم (٢٧٥)، ئەبو داود (١٥٠)، ترمزی (١٠٠) قسەیەكیشی لەسەر كردوە.

[2] السَّرَخْسِي: المبسوط (٨/١)، النوي: المجموع (٣٩٩/١)، ابن قدامة: المغني (٩٢/١)

## پۆلی سێیەم: ئەوانەی گوتویانە: مەسحی هەمو سەر بۆ پیاوانە نەك بۆ ژنان:

ئەمەش ریوایەتێکی لای ئیمام ئەحمەدە، کە دەڵێ: ئومێدەوارم، کە مەسحی سەر بۆ ژنان ئاسانتر بێت.. بۆیە ئەمەی دەگوت، چونکە ئەو فەرمودەیەی لا ڕاست بو، کە عائیشەخان، خوا لێی ڕازی بێت، لە دەستنوێژیدا تەنها، پێشە سەری مەسح دەکرد، بۆیە ئیبنو قودامەش، کە حەنبەلیە دەڵێ: ئیمام ئەحمەد لە فەرمودەوانانە، روداوێکی وا دەکاتە بەلگە[1]..

ئەوەی زیاتر دەسەلمێت ئەوەیە، کە پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم، بەردەوام مەسحی هەمو سەری کردوە، دەستی تەڕی بە پێشەسەریدا، بەرەو پشتە سەری پیرۆزی هێناوەو، بردوە، ئەو جارانەی، کە پێشە سەری پیرۆزی مەسح کردوە، لەگەڵ ئەوەشدا، کە دەگمەنن، لە هەمان کاتیشدا، مەسحی هەمو سەری پیرۆزی، بە سەر عەمامەکەیدا، هەر کردوە، دیارە ئەوەشی، وەکو تەکمیلە کردنی مەسحەکەی بوە..

لە هیچ رێگایەکەوە ریوایەتێك نەسەلمێنراوە، کە پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم، بۆ یەك جاریش بێت، تەنها پێشەسەری مەسح کردبێت و بەس.. ئەوەش بەلگەی ئەو شەرعناسانە بەهێز دەکات، کە دەڵێن: مەسحی هەمو سەر فەرزە..

ئەو شەرعناسە بەرێزانەی، موناقەشەی بائی (وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ) یان کردوە، گوتویانە: کەس لە زمانەوانان نەیوتوە، ئەو بائە بۆ پێوە لکانە!

---

[1] ابن قدامة: المغني (٩٣/١).

تەنانەت ئیبنو بورهان دەڵێ: هەر کەسێك بڵێت، ئەو بائە بۆ پێوە لکانە، ئەوە شتێکی خستۆتە سەر زمانی عەرەبی، کە زمانەوانان نەیانزانیوە[١]!!

## سەربەخەنەو مەسحی سەری:

ئەگەر کەسێك خەنە، یان هاوشێوەی لەسەر گرتبو، کە عادەتەن ئەو کەسە سەری دادەپۆشێت، مەسحی سەری ئەم کەسە، بەسەر سەرپۆشەکەوە، یان بەسەر سەربەستەکەوە دەکرێت و، پێویست ناکات سەربەستەکەی لادات.. واللە اعلم.. چونکە وەکو ان شاء الله لە باسی حەجدا دێت، دەسەلمێت، کە پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم، لە حەجدا لە ئیحرامدا بو، سەری پیرۆزی بەستبو، لە دەستنوێژیدا سەربەستەکەی نەدەکردەوە..

لەبەر ئەم بەڵگانە، ئەوەی لای من دەسەلمێت ئەوەیە، کە: مەسحی هەمو سەر لە دەستنوێژدا، بۆ پیاوان فەرزە، نەك بۆ ژنان.. والله اعلم.

## چوارەم: مەسحی هەردووگوێچکە:

مەسحی گوێچکەکانیش فەرزە، چونکە بەسەرەوەن و، وەکو پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: (الأُذُنَانِ مِنَ الرَّأسِ)[٢] واتە: گوێچکەکان بەشێکن لە سەر، مەبەستی ئەوەیە، کە حوکمی ئەو

---

[١] الشوكاني: نيل الاوطار (١/١٥٥)، ابن قدامة: المغني (١/٧٨).

[٢] ئەم فەرمودە لای ئیبنو عومەر، خوا لێیان ڕازی بێت، سەلمێنراوە، دارەقوتنی (١/٩٨) و ئیبنو ئەبی شەیبە (١/٢٨) هێناویانەتەوە، فەرمودەکە یەکێکە لەو فەرمودانەی، لە نێوان شێخی ئەلبانی و فەرمودەوانانی تری سەردەمدا جێی ڕاجوێییە، ئەلبانی ڕەحمەتی لە (سلسلة الاحاديث الصحيحة (١/٥٥) بە سەحیحی داناوە، بەڵام شێخ مەشهور حەسەن لە پەڕاوێزی کتێبی (الخلافيات) ی بەیهیقی، کە بە توێژینەوەی خۆیەتی، دوای بەحسێکی وردەکارانە بە زەعیفی داناوە.

وەردەگرن.. زۆر فەرمودەی تریش هەن، کە ئەم حوکمە بەهێزتر دەکەن و دەسەلمێنن، کە پێغەمبەری پێشەوا، صلی الله علیه وسلم، بەردەوام لە دەستنوێژیدا، کە سەری پیرۆزی مەسح کردوە، پاشان گوێچکەکانیشی مەسح کردوە، وەکو ئەو فەرمودەی ئیبنو عەبباس، خوا لێیان ڕازی بێت دەیگێڕێتەوە، کە: (أنَّ النَّبيَّ مَسَحَ رَأسَهُ وَأُذُنَيهِ مَرَّةً وَاحِدَةً)[1] واتە: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، مەسحی سەری کردو، مەسحی گوێچکەی جارێك کرد.. نەك سێ جار..

سەنعانی دەڵێ: ڕیوایەتەکان لەسەر مەسحی گوێچکە زۆرن، لە عەلی کوڕی ئەبو تالیب و، ئیبنو عەبباس و، روبەیع و، عوسمانی کوڕی عەففانەوە، خوا لێیان ڕازی بێت گێڕراونەتەوە، هەموشیان ئەوە دەسەلمێنن، کە یەکجار مەسحی گوێچکەی دەکرد، واتە بە یەکجار ئاو بەکارهێنان[2]..

ئەگەر کەسێك، ئاوی نوێی بۆ مەسحی گوێچکەی بەکار هێنا، نابێت بە ئیسراف و زێدەڕۆیی، چونکە سەلمێنراوە، کە ئیبنو عومەر، خوا لێیان ڕازی بێت وای دەکرد[3]..

## مەسحی پشت مل و گەردن:

هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە، کە بە سوننەتیش هەژمارد بکرێت[1]..

---

[1] ئەبو داود (١٣٣)، ترمزی (٣٦)، نەسائی (٧٤/١)، ئیبنو ماجە (٤٣٩) و فەرمودەوانانی تریش هێناویانەتەوە.. ئەسڵی ئەم فەرمودەیە لە بوخاریدایە (١٥٧)، هاوشێوەی ئەویش هەیە کە فەرمودەکەی ڕەبیعی کچی موعەویزە لای ئەبوداود (١٢٦) و ئیبنو ماجەیە (٤١٨)..

[2] الصنعاني: سبل السلام (٤٩/١).

[3] بەیهیقی (٦٥/١)، عبدالرزاق: المصنّف (٢٩).. کەمال ئیبنو السەید لە صحیح فقه السنة (١١٩/١) دا دەڵێ: سەنەدەکەی سەحیحە..

**پێنجەم: شوشتنی پێیەکان تا قولە پێ:**

لای جمهوری ئەهلی سوننەت شوشتنی پێەکان، تا قولە پێ لە دەستنوێژدا فەرزە، چونکە خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِ﴾ المائدە/٦ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، ئەگەر بۆ نوێژ هەستان، با دەموچاو دەستان، تا ئانیشك شوشتبێت و مەسحی سەرتان کردبێت وپێیەکانیشتان، تا قولەپێ شوشتبێت..

هەروەها هەر کەسێك لە یاوەران، باسی چۆنیەتی دەستنوێژی پێغەمبەری خوای، صلی الله علیە وسلم گێڕابێتەوە، هەر باسی لە شوشتنی پێی پیرۆزی کردوە، کە تا قولەپێکانی شوشتونی.. وەکو ریوایەتەکەی سەیدنا عوسمان[٢]..

قولە پێ لە حوکمی شوشتنەکەدایە، چونکە هەر سنورێك بەشێك بێت لە توخمی شتەکە، ئەویش لە حوکمەکەدا بەشدار دەبێت.. بەڵگەی تریش هەن ئەمە دەسەلمێنن، وەکو ئەو فەرمودەی، کە ئیبنو عومەر خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، کە دەڵێ: (تَخَلَّفَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنَّا فِي سَفْرَةٍ سَافَرْنَاهَا فَأَدْرَكَنَا وَقَدْ أَرْهَقْنَا الْعَصْرَ فَجَعَلْنَا نَتَوَضَّأُ وَنَمْسَحُ عَلَى أَرْجُلِنَا فَنَادَى بِأَعْلَى صَوْتِهِ وَيْلٌ لِلْأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ مَرَّتَيْنِ، أَوْ ثَلَاثًا)[٣]

---

[١] ابن تيمية: مجموع الفتاوى (٥٦/١)، ابن القيم: زاد المعاد (٤٩/١)، الالباني: سلسلة الاحاديث الصحيحة (٦٩ ـ ٧٤٤).

[٢] پەراوێزی ژمارە ١٩٢.

[٣] بوخاری (١٦١)، موسلیم (٢٤١).

جارێکیان لە سـەفەر بـوین و، پێغەمبـەری خوامـان، صـلى الله عليـه وسـلم کەمێك لێ دواکەوت، ئێمەش هێندەمان بـە عەسـرەوە نەهێشت و، هێشـتا نوێــژەکانمان نــەکردبو، بۆیــە خێــرا دەســتنوێژمان گــرت و، مەســحی پێیەکانمان کرد، کە پێغەمبەرمان صلى الله عليه وسلم گەیشتێ، دوو جار سێ جار بە دەنگی بەرز هاواری کرد: سزای وەیل بۆ ئەو کەسانەی، پاژنـە پێیان ناشۆن !!

ئەمە بەڵگەیەکی گەورەیە، لەسەر هەر کەسێك، کە وەکو شیعە لە دەستنوێژدا مەسحی پێیەکان، بە ڕوتی بە شەرع بزانێت، چونکە ئەمە تەئکید لەوە دەکاتەوە، کە پێیەکان دەبێ بشۆرێن و، مەسح کردنیان جائیز نیە، سەیر ئەوەیە لای شیعەکان مەسحەکەش، کە دەیکەن پاژنە پێ ناگرێتەوە !!

لای ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئەوە رۆشنە، کە مەسحی پێ کاتێك دەکرێت، کە خوففی پێوە بێت، نەك بە ڕوتی.. عبدالرحمانی ئەبو لەیلا دەڵێ: هەمو یاوەرانی پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم، لەسەر ئەوەن، کە پێیەکان دەبێ بشۆررێن[١]..

## پەنجەوەردان لە نێوانی پەنجەکانی پێ:

پێویستە لە کاتی دەستنوێژو، شوشتنی پێیەکاندا، موسوڵمان بە پەنجەکانی دەستی، نێوان پەنجەکانی پێی بشوات و، بەردەوام دەستیان پێدا بهێنێت.. تا تەڕ بن، چونکە ئەوانیش بەشێکن لە پێیەکان و، لە حوکمی شوشتنەکەدان..

---

[١] ابن حجر: فتح الباري (١/٢٣٦)، ابن قدامة: المغني (١/١٢٠).

**شەشەم: ریزبەندی رەفتارەکانی دەستنوێژ فەرزە:**

واتە: شوشتن و مەسحی ئەندامەکان، یەك لەدوای یەك بەو، ریزبەندییەی لە ئایەتەکەدا هاتوە، بێ ئەوەی پاش و پێش بخرێن، شوشتنی دەموچاو، پاشان دەستەکان، پاشان مەسحی سەر، پاشان شوشتنی پێیەکان.. ئەم ریزبەندییە، بە رای زۆرینەی شەرعناسان فەرزە، ئەمە بۆچونی مەزهەبی شافیعی و، حەنبەلی و، ئەبو سەورو، زاهیریەکانە[١].. بەلگەشیان ئەمانەیە:

١ـ خوای گەورە لە ئایەتەکەی مائدە/٦ دا فەرزەکانی دەستنوێژی یەك لە دوای یەك بەو ریزبەندییە باس فەرموە..

٢ـ هەر کەسێك چۆنیەتی دەستنوێژی پێغەمبەری خوای، صلی الله علیە وسلم گێڕاوەتەوە، بە وردی ئەو ریزبەندییەی دەستنوێژی باس کردوە. زیاتر لە بیست یاوەر، شێوەی دەستنوێژی پێغەمبەری خۆشەویستیان، صلی الله علیە وسلم گێڕاوەتەوە، هەمویان وەکو یەك گێڕاویانەتەوە، جگە لە دوانیان، کە فەرمودەکانیان موناقەشەی حەسەن و زەعیفیان لەسەرە[٢]، کرداری پێغەمبەری خواش، صلی الله علیە وسلم، رون کردنەوەو لێکدانەوەو، شەرحی ئایەتی قورئانە..

---

[١] النوي: المجموع (٤٣٣/١)، ابن قدامة: المغني (١٠٠/١)، ابن حزم: المحلى (٦٦/٢).

[٢] یەکێکیان فەرمودەی میقدامی کوڕی مەعدی کەربە، کە لای ئیمامی ئەحمەدو ئەبوداود هەیە، یەکێکە لەو فەرمودانەی، کە لە نێوان شێخی ئەلبانی و فەرمودەوانانی کۆن و نوێدا، موناقەشەی لەسەرە، شێخ ئەم دوو فەرمودەیەی ئاماژەم پێکردوە، بە بۆچونی ئیبنو حەجەرو، نەوەوی، بە حەسەن دەزانێت (تمام المنة ل ٨٨) لە کاتێکدا ئەوانی دیکە، وەکو ئیبنولقەییم لە کۆنەکان و، سەید سابق لە نوێیەکان، تەسلیم بە توێژینەوەو حوکمەکەی نابن، واشم بۆ رون بۆوە، رای جمهوری توێژەرەوان لەمەدا، لە بۆچونی ئەلبانی بەهێزتر

ئیمام مالیك و، سەوری و، ئەهلی مەدرەسەی ڕەئی، دەڵێن: ڕیزبەنـدیی دەستنوێژ سوننەتە، نەك فەرز[١].. بەڵگەی ئەوانیش:

١ـ ئەو ڕیزبەندیەی لە ئایەتەكدا هاتوە، بەڵگە نیـە لەسـەر فـەرزبونی ڕیزبەندیی، ڕوكنەكانی دەستنوێژ.. (ڕەدی ئەمە درایەوە).

٢ــ ئــەو ڕیوایەتــەی لــە ســەیدنا عــەلی كــوڕی ئــەبو تالیــب و، ئیبنومەسـعودەوە گێڕراوەتـەوە، كـە گوتویانـە: لام گـرنگ نیـە بـە هـەر ئەندامێك دەست پێ بكەم[٢]..

٣ ـ ئـەوەی كـە ئیمـام ئەحمـەد گوتویـەتی لام گـرنگ نیـە، كـە ئایا بـە دەستی ڕاست دەست پێ دەكات، یان بە دەستی چەپ، چونكە لە ئایەتەكەدا جیـاوازی نەخسـتۆتە نێوانیانــەوە.. ئەمـە ڕاسـتە، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی پێغەمبـەری خـوا، صلی الله علیـه وسـلم، هەمیشـە ڕاسـتی پـێش خسـتوە، لەمیشدا ڕاست پێش خرێت، پێكانی سوننەت و پابەندبونە پێوەی..

بەڵگەی ئەو شەرعناسانەمان پێ بەهێزترە، كە گوتویانە:

ڕیزبەندی ڕەفتارەكانی دەستنوێژ فەرزە..

---

بێت، چونكە ئەلبانی ڕەحمەتی لەو كتێبەدا توێژینەوەی نەكردوە، هەر وەكو عەزو گوتویەتی: (فأقول: إنَّ النوي والحافظ ابن حجر حَسَّنا إسنادَهُ)..

[١] ئیمامی مالیك: المدونة: (١٤/١)، السرخسي: المبسوط (٥٥/١)، ابن الهمام: شرح فتح القدیر (٣٠/١).

[٢] ریوایەتی سەیدنا عەلی لای ئیمامی ئەحمەد لە (العلل ٢٠٥/١) دا هێناوێتیەوەو فەرمویەتی زەعیفە، هەروەها دارەقوتنیش (٨٨/١) هەر بە زەعیفی داناوە.. ئەوەی ئیبنو مەسعودیش ئەسڵەكەی لای بوخاری لە (التاریخ (١٦٥٠) لای ئەبو عوبەید لە الطهور: (٣٢٥) ە كە سەنەدی حەسەنە..

**حەوتەم: یەکسەری و یەك لە دوای یەك ( الموالاة ):**

واتە بەجێهێنانی رەفتارەکانی دەستنوێژ یەکسەر، یەك لـە دوای یـەك، بـێ ئـەوەی ماوەیـەکی وا بکەوێتـە نێوانیانـەوە، کـە ئەنـدامی پێشـو وشـك ببێتەوە.. ئەمە بەلای زۆر لە شەرعناسانەوە فەرزە، وەکو ئیمـام شـافیعی لـە قـەولی کۆنیـداو، ئیمـام ئەحمـەد لـە ڕای بـەناوبانگی و، ئیمـام مالیـك، بەلام ئەم دەڵێ، ئەگەر ناچاربو قەیدی نیـە.. ئیبنـو تەیمییـەش، ئەمـەی ئیمام مالیکی پێ پەسەندتر بوە[1]..

دەشێت ئەوەش ببێتە بەڵگە، کە سەیدنا عومەری کوڕی خەتتاب، خوا لێی ڕازی بێت، ڕۆژێك دەستنوێژی شوشت، بەقەدەر نینۆکێك، بە پێیەوە، وشکایی دیار بو، پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم، کە بینی فـەرموی: (إِرْجِعْ فَأَحْسِنْ وُضوءَكَ)[2] واتە بگەڕێرەوە، دەستنوێژەکەت بە باشـی بگـرە، ئەویش گەڕایەوە دەستنوێژەکەی گرتەوەو، پاشان نوێژەکەی کرد..

دیسـان ڕیوایـەتێکی تـریش هەیـە، کـە یـاوەران (وەکـو خالیـدی کـوڕی مەعدان) دیویانە، پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم، کەسێکی بینیـوە لە پشتی پێیەوە، سپییایەك بەقـەدەر درهـەمێك دەرەوشـاوەتەوە کـە جێـی نەشوشـتنی بـوە، پێـی فـەرموە کـە دەسـتنوێژەکەی بشـواتەوەو، ئینجـا نوێژەکەی بکات[3]..

---

[1] ئیمامی شافیعي: الام (١/ ٣٠)، المجموع (١/٤٥١)، البهوتي: کشاف القناع (١/٩٣)، ئیمامی مالیك: المدونة (١/١٥)، ابن عبدالبر: الاستذکار (١/٢٦٧)، مجموع الفتاوی (٢١ / ١٣٥)

[2] موسلیم (٢٣٢)، ئیبنو ماجه (٦٦٦)، ئەحمەد (١/٢١) ، ئیمامی ئەحمەد هەندێك قسەی لەسەر کردوە، بەلام شێخی ئەلبانی دەڵێ: ریوایاتی تری هەیەو بە هەموان پلەی حەسەن وەردەگرێت، بڕوانە: الارواء (٨٦)، ابن حجر: التلخیص (١/٩٥).

[3] ئەبوداود(١٧٥)، ئەحمەد(٣/٤٢٤)، شێخی الالبانی لەارواءالغلیل(٨٦) بەسەحیحی داناوە

ئیمام ئەبو حەنیفەو، ئیمام شافیعی، لە قەولێکی نوێیدا گوتویانە: یەکسەری فەرز نیە، ئەمە ڕیوایەتێکی ئیمام ئەحمەدو، مەزهەبی ئیبنو حەزمیشە[١]، بەلگەشیان:

١ـ خوای گەورە فەرمانی بە شوشتنی ئەندامەکان کردوە، هەر کەسێك بە هەر شێوەیەك شوشتنی یەکسەر، یان ماوەی خستبێتە نێوانیانەوە، ئەوە فەرمانەکەی خوای گەورەی بەجێهێناوە.

٢ ـ نافیع، ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەگێڕێتەوە، کە ئیبنو عومەر، خوا لێیان ڕازی بێت، لە ناو بازاڕدا دەستنوێژی دەشوشت، دەموچاو دەستی شوشت و مەسحی سەری کردو، لەو کاتەدا هاواریان کردێ، کە جەنازەیەك هات، ئەویش چوە مزگەوت و، لەوێ مەسحی سەر خوففەکانی کردو نوێژی کرد[٢].. دیارە ئەم حاڵەتەی ئیبنو عومەر، خوا لێیان ڕازی بێت، ناچارییەو، نابێتە بەلگە..

٣ ـ ئەو فەرمودانەیان بە زەعیف ناساندوە، کە فەرمان بە دەستنوێژ شوشتنەوەو، نوێژکردنەوە دەکات..

٤ـ ئەو فەرمودەی پێغەمبەری خوایان، صلى الله عليه وسلم، کە دەفەرموێ: (إرْجعْ فَأحْسِنْ وُضَوءَكَ) وا لێکداوەتەوە، کە دەستنوێژەکەت بە تەواوی نەگرتوە، مادام ئاوت بەسەر پێیەکانتدا نەڕژاندوە..

---

[١] السرخسي: المبسوط(٥٦/١)، ئیمامی شافیعی: الام(٣٠/١)، النوي: المجموع(٤٥١/١)، ابن حزم: المحلى (٧٠/٢)..

[٢] ئیمامی مالیك هێناویتیەوە (٤٨) و ئیمامی شافیعیش لەوی وەرگرتوە (١٦) و بەیهیقیش لە المعرفه (٩٩) دا هێناویتیەوە

**پوختەی حوکم: پێم وایە** ئەوی داوەری ڕاجوێیی ئەم شەرعناسە بەڕێزانە دەکات، فەرمودەکەی خالیدی کوڕی مەعدانە، کە پێغەمبەری پێشەوا، صلى الله عليه وسلم، کابرای ناردەوە دەستنوێژەکەی بشواتەوەو، نوێژەکەشی بکاتەوە، چونکە بە قەدەر درهەمێك، پەڵەی وشکیی بە پێیەوە بوە.. وا دەزانم ئەمە هەمو ڕاجوێییەکان یەکلادەکاتەوە و حەسمی دەکات.. والله اعلم..

★ ★ ★

## سوننەتەكانی دەستنوێژ

**١. سیواك كردن:** پێشتر لە سوننەتە سروشتیەكاندا باسمان كرد.

**٢. دەسپێكردن بە بسم اللّه:** دەسپێك بە بەسمەلە (وتنی بسم الله) لـە هـەمو كـارو كاتێكـدا، شـتێكی باشـە، بـەلاَم كـە بویسـترێت لـە خواپەرستیەكدا بچەسپێنرێت، دەبێ بەڵگەی شەرعێتیەكەی هەبێت.. ئەو فەرمودانـەی لەسـەر وتـنی (بسـم الله) لـە دەسـتنوێژدا هـاتون، وا دیـارە زەعـیفن.. ئیمـام ئەحمـەد، ڕەحمـەتی خـوای لـێ بێـت، دەڵـێ: وا نـازانم فەرمودەیـەك لەسـەر ئـەم بابەتـە هـەبێت، كـە سـەنەدەكەی بـاش بێـت[١]. هەرچەندە وەكو زۆر بابەتی دیكە ڕاجوێیی لەسەرە، لەوانە بـۆ نمونـە: (لا وُضُوءَ لِمَنْ لَمْ يَـذْكُرِ اسْـمَ اللهِ عَلَيْـهِ)[٢] واتـە: هـەر كـەس (بسـم اللـه) نـەكات دەستنوێژەكەی بۆ حسێب نابێت..

ئەمـە ڕای ئیمـام سـەوری و، مالیـك و، شـافیعی و، ڕیوایـەتێكی ئیمـام ئەحمـەدو، مەدرەسـەی ڕەئییـە[٣]، بەڵگەی هەموانیش ئەوەیـە، كـە دەڵێن: ئەگـەر واجـب بوایـە، دەبـو یاوەرێـك لـە وەسـفی دەسـتنوێژی پێغەمبـەری خـوادا، صـلی الله علیـە وسـلم ئاماژەیـەكیان پـێ بكردایـا، بـەلاَم، كـە نەیانكردوە دیارە فەرز نیە.

---

[١] كمال بن السيد: صحيح فقه السنة (١/١٢٢).

[٢] ئەبو داود (١٠١) ترمزی (٢٥)، ئەحمەد (٢/٤١٨) و بە زەعیفیان داناوە، بەلاَم شێخی ئەلبانی لە الارواو (١/١٢٢) دا بە حەسەنی داناوە..

[٣] ابن الهمام: فتح القدير (١/٢٢)، حطاب: مواهب الجليل (١/٢٦٦)، ابن تيمية: مجموع الفتاوى (١/٣٨٥)،المرداوي: الانصاف (١/١٢٨).

**٣ . شوشتنی لەپ و پشتی دەست هەر لە سەرەتاوە:** لەبەر ئەو فەرمودەی، کە سەیدنا عوسمان گێڕاوێتیەوە، کە گوتی: پێغەمبەری خوا، صلی الله علیە وسلم، لە دەستنوێژەکەیدا، سێ جاری ئاو کرد بە دەستیداو شوشتنی[١].

**٤ . ئاو لەدەم و لوت رادان بە لوێچی دەستێك:** وەکو لەو فەرمودەدا هاتبو، کە عبداللەی کوڕی زەید گێڕایەوە، کە گوتی: پێغەمبەر، صلی الله علیە وسلم، بۆ فێرکردنی یاوەران، ئاوی لەدەم و لوتی بە لوێچێك رادا، سێ جاریش وای کرد[٢]..

**٥ . زۆر ئاو لە دەم ولوت رادان بۆ کەسێك کە بەڕۆژو نەبێت:** بەڵگەی ئەمیش، فەرمودەکەی لەقیتی کوڕی سەبرەیە، خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا، صلی الله علیە وسلم فەرموی: (.. وَبَالِغْ فِي الإِسْتِنْشَاقِ إلَّا أنْ تَكُونَ صَائِماً)[٣] واتە: زۆر ئاو لە لوتت رادە، مەگەر بەڕۆژو بیت (کە بەڕۆژو بویت زۆر وا مەکە) ..

**٦ . پێش خستنی ئەندامە راستەکان پێش ئەندامە چەپەکان:** لە فەرمودەیەکی لای ئیبنو عەبباسدا، خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە، کە لە وەسفی چۆنیەتی دەستنوێژی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیە وسلم دەفەرموێ: ( ثمَّ أخَذَ غَرْفَةً مِنْ مَاءٍ فَغَسَلَ بهَا يَدَهُ الْيُمْنَى ثمَّ

---

[١] بوخاری (١٥٩)، موسلیم (٢٢٦).

[٢] موسلیم (٢٣٥)، ترمزی (٢٨)، ئیبنو ماجە (٤٥).

[٣] ئەبو داود (١٤٢)، نەسائی (٦٦/١)، ئیبنوماجە (٤٠٧)، ئەحمەد (٣٣/٤). کەمال ئیبنو السەید لە صحیح فقه السنة (١٣٣/١) دا دەفەرموێ: سەحیحە..

أخَذَ غَرْفَةً مِنْ مَاءٍ فغَسَلَ بهَا يَدَهُ الْيُسْرَى ثـمَّ مَسَحَ برَأسِهِ ثـمَّ أخَـذَ غَرْفَـةً مِنْ مَاءٍ فرَشَّ عَلَى رِجْلِهِ الْيُمْنَى حَتَّى غَسَلَهَا ثـمَّ أخَـذَ غَرْفَـةً أُخْـرَى فغَسَلَ بهَا رِجْلَهُ يَعْنِـي الْيُسْرَى) واتـە: پاشـان لوێچـێك ئـاوی هـەڵگرت و، دەسـتی راستی پێ شوشت، ئینجا لوێچێکی تری ئـاو هـەڵگرت و دەسـتی چـەپی پـێ شوشت، پاشان مەسحی سەری کرد، پاشان لوێچـێك ئـاوی تـری هـەڵگرت و، ڕشتی بەسەر پێی راستیدا، تا شوشتی، ئینجا لوێچێکی تر ئاوی هەڵگرت و، ڕشتی بەسەر پێی چەپیداو شوشتی..

عائیشـەخان، خـوا لێـی ڕازی بێـت دەگێڕێتـەوە، کـە پێغەمبـەری خـوا، صـلی الله علیـە وسـلم، هـەردەم ئەندامـە ڕاسـتەکانی لەشـی، پێشـتر بـەکار دەهێنا لە پێڵاو لە پێکردنیدا، لە دەستنوێژیدا، لە هەمو کاروبارەکانیدا[١]..

٧ . شوشتنی ئەندامەکان سێ جار: چونکە ئەوە لە پێغەمبەری خواوە، صلی الله علیه وسلم سەلمێنراوە کە ئەندامانی دەستنوێژی سێ جار دەشوشـت[٢]. وەکـو فەرمودەکـەی لای سـەیدنا عوسمـانی کـوڕی عـەففان[٣]، هـەروەها فەرمودەکـەی لای عبداللـەی کـوڕی زەیـد[٤] و، ئـەوەی لای ئیبنـو عەبباس، خوا لێیان ڕازی بێت، کە لە بوخاریدایە[٥].

بـەڵام ئـەم سـێ جارانـە، مەسـحی سـەر ناگرێتـەوە: چـونکە هـیچ ریوایەتێك نەسەلمێنراوە، کە باس لە سێ جار مەسحی سەر بکات، ئـەوەش کە باس لـە دوو جار دەفـەرموێ، وەکو ئیبنـو عبـدالبیر دەڵـێ: هـەر بـەوە

---

[١] بوخاری (١٦٨)، موسلیم (٢٦٨).
[٢] بوخاری ١٥٦
[٣] لە پەراوێزی ژمارە (١٩٣).
[٤] پەراوێزی ژمارە (٢١٩).
[٥] بوخاری (١٥٦).

لێکدراوەتەوە کە دەستی پیرۆزی بەسەریدا هێناوەو بردوە[١]، چونکە دوو جار واتە دەست تەڕ کردنەوەو، پێداهێنانەوەی.. ئەو دوو بارە کردنەوەی، لە هەندێك فەرمودەدا هاتوە، بۆ شوشتنەکانن، نەك بۆ مەسح. بەهێزترین بەڵگەی ئەمەش، ئەو فەرمودەیە، کە دەڵێ: ئەعرابیەك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم و پرسیاری دەستنوێژی لێکرد، پێغەمبەریش، صلى الله عليه وسلم بۆی شەرح دەکردو، سێ جار سێ جار نیشانی دەدات، کە چۆن دەبێت، پاشان فەرموی: (هَذا الوُضُوءُ، فَمَنْ زَادَ عَلَى هَذا فَقَدْ أَسَاءَ وَتَعَدَّى وَظَلَمَ)[٢] واتە: ئەمە دەستنوێژە، هەر کەسێك لەمە زیاتر بکات، ئەوە خراپەی کردوە، لەسنور دەرچوەو ستەمی کردوە..

ئیمام ئیبنو حەجەری عەسقەلانی، دەڵێ[٣]: ریوایەتی سەعیدی کوڕی مەنسور (مامۆستای ئیمام موسلیمە) ڕون و ئاشکراو ڕاشکاوە، کە مەسحی سەر، یەکجارەو زیاتر لە یەکجار، شتێکی باش نیە.. هەر ڕیوایەتێکیش باس لە سێ جارەیی بفەرموێت، دەبێت مەبەستەکەی تەواو کردنی مەسحەکە بێت، بە هەمو سەردا، نەك بەوەی، کە سێ جاران مەسح کردنی سەرە.. ئەمەش گونجاندنی بەڵگەکانە..

ریوایەتی یەکجار مەسح بەهێزترە، بۆیە بۆتە بەڵگەی جمهور (ئیمام ئەبو حەنیفەو مالیك و رای پەسەندی ئیمام ئەحمەد)، بە پێچەوانەی

---

[١] / البيهيقى: الخلافيات (٣٣٦/١)، بە توێژینەوەی شێخ مەشهور حەسەن..
هەروەها ابو عبيد: الطهور (ل ٣٥٩).

[٢] نەسائی (٨٨/١)، ئیبنو ماجە (٤٢٢)، ئەحمەد (١٨٠/٢)..
کەمال ئیبنو السەید لە صحيح فقه السنة (١٢٤/١) دا دەڵێ: سەحیحە..

[٣] ابن حجر العسقلاني: فتح الباري (٢٩٨/١)..

رای ئیمام شافیعین، ڕەحمەتی خوا لە هەموویان[١].

**زیاتر لە سێ جاریش زێدەڕۆییە (ئیسرافە):** هەر کەسێك سێ جاری تەواو، ئەندامانی دەستنوێژی خۆی شوشت، ئیتر فەرمانەکەی خوای گەورەی، بە ڕاست و دروستی تەواو کردوە، ئیتر هیچ پێویستی بە زیاتر کردنیان نیە.. بۆ ئەوەی ئەو هەڕەشە سەختە نەیگرێتەوە، کە لەو فەرمودەی سەرەوەدا هاتبو: (هَذا الوُضُوءُ، فَمَنْ زَادَ عَلَى هَذا فَقَدْ أَسَاءَ وَتَعَدَّى وَظَلَمَ) واتە: ئەمە دەستنوێژە، هەر کەسێك لەمە زیاتر بکات، ئەوە خراپەی کردوە، لەسنور دەرچوەو ستەمی کردوە..

کەس لە شەرعناسان نابینیت، لایەنگری لە سێ جار زیاتر بوبێت، چونکە ئەوە جێی راجوێیی نەبوە[٢]..

**٨ . دەستوەردان لە ریشی پڕ:** پێشتر باسمان لەوە کرد، کە هەر کەسێك ریشی پڕ بێت، دەبێت لە کاتی دەستنوێژ شوشتندا، پەنجەکانی بە ناو دەرەوەی ڕیشیدا بهێنێت، لەبەر ئەو فەرمودەیەی، کە ئەنەس خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم، کاتێك دەستنوێژی دەگرت، مشتێك، یان لوێچێك ئاوی هەڵدەگرت و، دەیگەیاندە بن چەناگەی، تا ریشی پێ تەڕ کات، ئینجا پەنجەکانی بە نێوان ڕیشیدا دەهێناو دەبرد، دەشیفەرمو: (هَكَذا أَمَرَنِي رَبِّي)[٣] واتە: پەروەردگاری خۆم، وا فەرمانی پێداوم..

---

[١] السرخسي: المبسوط (٥/١)، حاشية الدسوقي (٩٨/١)، المغني (١٣٧/١) الام: (٢٦/١).

[٢] ابن عبدالبر: التمهيد (١١٧/٢٠).

[٣] ئەبو داود (١٤٥)، بەیهیقی (٥٤/١)، حاکم (١٤٩/١) شێخی ئەلبانی لە ارواء الغليل (٩٢) دا دەڵێ سەحیحە..

**٩ . دەست خشاندن لە ئەندامانی دەستنوێژ:** هەر كەسێك، كە دەســتنوێژ دەگرێــت، دەبێــت، كــە ئاوەكــە دەكــات بەســەر ئەنــدامانی دەستنوێژیدا، دەستیشیان لێ بخشێنێت. چونكە عبداللەی كوڕی زەید، خوا لێـی ڕازی بێـت دەگێڕێتـەوە، كـە پێغەمبـەری خـوام بـینی صلى الله عليـه وسـلم دەسـتنوێژی دەشوشـت، دەسـتی بەسـەر قـۆڵ و باسـكیدا دەهێنـاو دەبرد[1]..

**١٠ . دەسـت هێنـان بـە نێـوان پەنجـەكانی دەسـت و پێـدا:**

پێغەمبەری خوا، صلى الله عليـه وسـلم دەفـەرموێ: (أَسْبِغْ الْوُضُوءَ، وخَلّلْ بينَ الأصَابعِ، وبَالِغْ فِي الاسْتِنْشَاقِ إلّا أنْ تكُونَ صَائِماً)[2] واتـە: دەسـتنوێژت ڕاست و دروست بگـرە، پەنجـە بـە نێـوان پەنجەكانـدا بهێنـە، ئـاو زیـاد لـە لوتت وەردە، مەگەر بەڕۆژو بیت

**١١ . شوشتنی زیاتر لە جێی دەستنوێژەكە:** ئەمـە باشـترە، كە دەموچاوی دەشوات، كەمێك زیاتر لە سەرو ناوچەوانیەوە بشوات، یـان لـە پشت ئانیشك و قولەپێیەوە، چونكە ئەم شوێنانە، لە قیامەتدا نوریـان لـێ دەبارێت و، دەبنە هۆی ناسینەوەی موسوڵمان.

ـ پێغەمبەری خوا، صلى الله عليـه وسـلم دەفـەرموێ: (إنَّ أُمَّتِـي يُـدْعَوْنَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ غُرًّا مُحَجَّلِينَ مِـنْ آثَـارِ الْوُضُـوءِ فَمَـنِ اسْـتطاع مِـنْكُمْ أنْ يُطِيـلَ

---

[1] سەحیحی ئیبنو حیببان (١٠٨٢)، بەیهیقی (١٩٦/١)، كەمال ئیبنو السەید لە صحیح فقه السنة (١٢٥/١) دا دەڵێ: سەحیحە..

[2] ترمزی (٧٨٨)، ئەبو داود (١٤٢)، نەسائی (٦٦/١ ـ ژمارە٨٧) ئیبنو ماجه (٤٠٧) ئەحمەد (٢١٠/٤)، دارمی (٧٠٥). ساڵح بن عبدالعەزیز ئال شێخ، لە شەرحی بلوغ المرامەكەی / كتاب الطهارة / باب الوضوء دا دەڵێ: ئیبنو خوزەیمە بە سحیحی داناوە، كەمال ئیبنو السەید لە صحیح فقه السنة (١٣٣/١) دا دەڵێ: سەحیحە..

غُرَّتـهُ وَتحْجيلَهُ فلْيَفْعَلْ)[١] واتـه: ئوممەتەكـەی مـن لـه قیامەتـدا، كـه دێـن ناوچـەوانیان نورانیـەو قـۆڵ و باسكیشـیان سـپیەو نوریـان لـێ دەبارێـت، هەموی له ئاسەواری دەستنوێژه، جا ئەوی دەتوانێـت ناوچـەوان (الْغـرُ) و، قۆڵ و، باسكی (التحْجيل) زیاتر تەڕ كات، با بیكات..

ــ ئـەبو هـورەیرەش خـوا لێـی ڕازی بێـت: دەسـتنوێژی شوشـت، دەستەكانی، تـا ئانیشكەكانی شوشـت، پێیـەكانی تـا قولـەپێی شـت، گـوتی: (هكَذا رأيتُ رَسولَ اللهِ صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ يَتوَضَّأ)[٢] ئاوا پێغەمبەری خـوام صلى الله عليه وسلم بینی، كه دەست نوێژی دەشوشت..

ـ هەر ئەو دەڵێ: گوێم لێبو خۆشەویستم، صلى الله عليه وسلم دەیفەرمو: (تبْلُغ الحِلْيَةُ مِنْ المؤمِنينَ حَيْثُ يَبْلُغ الوَضوءُ)[٣] واته: نوری دەموچاوو، دەستی موسوڵمان، دەگاته ئەو شوێنانەی، كه ئاوی دەستنوێژی بەركەوتوە..

## ١٢ ـ ئاو كەم بەكار هێنان:

لەبەر ئەو فەرمودەی، كه ئەنـەس خـوا لێی ڕازی بێت دەیگێڕێتەوە: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيـه وَسَلَّمَ يَغْتسِلُ بالصَّاعِ الى خَمْسَةِ أمْدَادٍ، وَيَتوَضَّأ بالْمُدِّ)[٤] واتـه: پێغەمبـەری خـوا، صـلى الله عليه وسلم به ساعێك، بۆ پێنـج مودد، دەستنوێژی دەشت[٥].

---

[١] بوخاری (٣٦)، موسلیم (٢٤٦).

[٢] موسلیم (٢٤٦).

[٣] موسلیم (٢٥٠)، نەسائی (٨١/١).

[٤] بوخاری (١٩٨)، موسلیم (٣٢٥).

[٥] یەعنی له نێوان ٢ ـ ٥ر٢ لیتر، چونكه ساعێك چوار موددە، موددێكیش نیو لیترە.

**١٣. دوعای دوای دەستنوێژ:** سەیدنا عومەر، خوا لێی ڕازی بێت، دەڵێ: پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم دەیفەرمو: (مَا مِنْكُمْ مِنْ أحَدٍ يَتوَضَّأْ فيُسْبِغْ الْوُضُوءَ، ثمَّ يَقُولُ: أَشْهَدُ أنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ إِلَّا فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيَةِ، يَدْخُلُ مِنْ أَيُّهَا شَاءَ )[1] واتە: هەر كەسێكتان دەستنوێژێكی پاك و پوخت بگرێت و، پاشان بڵێ شایەتی دەدەم، كە هیچ خوایەك نیە شایانی پەرستن بێت، جگە لە خوای گەورە، كە هاوەڵی نیە، شایەتی دەدەم، كە محمد صلى الله علیە وسلم، بەندەو نێرراوی خوایە، ئەوە هەر هەشت دەرگاكەی بەهەشتی بۆ دەكرێتەوەو، لە كامیانەوە حەز بكات، دەڕواتە ژورەوە..

ـ هەروەها سەیدنا سەعیدی خودری، خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (مَنْ تَوَضَّأَ وَقَالَ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتوبُ إِلَيْكَ، كُتِبَ فِي رَقٍّ ثمَّ طُبِعَ بِطَابَعٍ فَلَمْ يُفْتَحْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ)[2] واتە: هەر كەسێك دسنوێژ بشوات و، پاشان بڵێ: خوایە پاك و بێ خەوشی (بێ عەیبی) بۆ تۆو، سوپاس و ستایش قابیلی تۆیە، شایەتی دەدەم، كە هیچ خوایەك نیە، شایانی پەرستن بێت، جگە لە تۆ، داوای لێبوردنت لێ دەكەم و، پەشیمانم و، بەرەو لای تۆ گەڕاومەتەوە، لەسەر لەوحێك دەنوسرێت و مۆر دەكرێت، ئیتر تا ڕۆژی قیامەت ناشێكت، واتە: ناكرێتەوە، تا ئەو ڕۆژە..

---

[1] موسلیم (٢٣٤).

[2] نەسائی لە: الكبرى (٩٩٠٩)، الحاكم (٥٦٤/١) لە المجموعی ئیمامی نەوەویـەوە نـەقڵم كـردوە (٤٨٢/١).

**١٤ـ کردنی دوو ڕکات نوێژ لە دوای دەستنوێژ:** لەبەر ئەو فەرمودەی لای سەیدنا عوسمان، خوا لێی ڕازی بێت، کە حومران لێوەی دەگێڕێتەوە: (.. وَقَالَ مَنْ تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي هَذَا ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ لَا يُحَدِّثُ فِيهِمَا نَفْسَهُ غَفَرَ اللَّهُ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ)[1] واتە:... پاشان فەرموی: پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: هەر کەسێك ئاوا ئەم دەستنوێژەی من بگرێت، پاشان دوو ركات نوێژ بكات و، نەکەوێتە قسەی زیادەوە، ئەوە لە هەمو گوناحەکانی پێشوی دەبوررێت..

ـ فەرمودەکەی لای سەیدنا بیلالی حەبەشیش، خوا لێی ڕازی بێت ئاشکرایە، کە باس لەو نوێژانە دەکات کە سەیدنا بیلال خوی پێوە گرتبون، کە دوای دەستنوێژ گرتن دەیکردن، کە بوە مایەی ئەوەی، پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم لێی بپرسێت: ( يَا بِلَالُ حَدِّثْنِي بِأَرْجَى عَمَلٍ عَمِلْتَه فِي الْإِسْلَامِ، فَإِنِّي سَمِعْتُ دَفَّ نَعْلَيْكَ بَيْنَ يَدَيَّ فِي الْجَنَّةِ، قَالَ: مَا عَمِلْتُ عَمَلًا أَرْجَى عِنْدِي أَنِّي لَمْ أَتَطَهَّرْ طُهُورًا فِي سَاعَةٍ مِنْ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ إِلَّا صَلَّيْتُ بِذَلِكَ الطُّهُورِ مَا كُتِبَ لِي أَنْ أُصَلِّيَ )[2] واتە: ئەرێ بیلال، چ کردارێکت هەیە، کە لە هەمو کارەکانتدا ئومێدی زیاترت بەو هەیە، چونکە لە بەهەشتدا لە پێش خۆمەوە، گوێم لە خشپەی نەعلەکانت بو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، کارێکی وام نیە ئەوەندەی ئومێدی پێوە ببەستمەوە، مەگەر ئەوەی، کە هەمو جارێك شەو بێت، یان ڕۆژ، کە دەستنوێژ دەشۆم، پاشان چەندم بۆ نوسرا بێت، نوێژی پێوە دەکەم..

---

[1] بوخاری (٦٤٣٣)، موسلیم (٢٢٦) هەمو فەرمودەکە وا لە پەراوێزی ژمارە ١٩٣ دا.

[2] بوخاری (١١٤٩)، موسلیم (٢٤٥٨).

## وشك كردنەوەی دوای دەستنوێژ:

هیچ حوكمێك لەبەر دەستدا نیە، رێ لە وشك كردنەوەی تەڕێتی ئەندامەكانی دەستنوێژ بگرێت.. ئەگەر بوترێت: ئەدی ئەو رەفتارەی پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم چی لێ دەكەن، كە ریوایەتەكەی لە بوخاریدایەو دەڵێ: پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم دەستنوێژی شوشت، مەیمونە خانی خێزانی، دەستەسڕێكی هێنایە خزمەتی، تا تەڕێتی دەستنوێژەكەی پێ وشك كاتەوە، بەڵام وەری نەگرت و، لەولاوە دەستی دەتەكاند[1].. لە وەڵامدا دەوترێت:

١ـ هەر ئەوە بەڵگەیە، كە پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم عادەتی بوە، كە دوای دەستنوێژ گرتنی، ئەندامانی دەستنوێژی وشك كاتەوە. نەك ببێتە مایەی بەرهەڵستی كردنی..

٢ ـ لەوانەیە نەیویستبێت دەستەسڕەكە تەڕبكات..

٣ ـ لەوانەیە دەستەسڕەكەی پێ پیس بوبێت..

بەڵام خۆ ئەوەش سەلمێنراوە، كە پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم دەستنوێژی گرت، پاشان بە بەرگی ناوەوەی جبە خوریەكەی، دەموچاوی وشك كردەوە[2]..

ئیمام ترمزی دەڵێ: كۆمەڵێك لە شەرعناسانی ناو یاوەران و، شەرعناسانی دوای ئەوان، ڕایان لەسەر  ئەوەیە، كە دەستەسڕ بەكار بێت، بۆ وشك كردنەوەی ئەندامانی دەستنوێژ، ئەوەش هیچ كاریگەرییەكی لەسەر كەم كردنەوەی پاداشت نیە.. هەر كەسێك كە وتبێتی پێم خۆش

---

[1] بوخاری (٢٧٠).

[2] ئیبنو ماجە (٤٦٨، ٣٥٦٤) كەمال ئیبنو السەید لە صحيح فقه السنة (١٣٧/١) دا دەڵێ: سەنەدەكەشی نزیكە لە حەسەن..

نیە وشکی کەمەوە، لەبەر ئەوەی بوە، کە پێی وا بوە لە پاداشتەکەی کەم دەبێتەوە، بەڵام بەڵگەیەك لەبەر دەستدا نیە، ئەوە بسەلمێنێت[1]..

## دەستنوێژو بۆیەی نینۆك:

زۆرینەی ئەم بۆیە، کە بۆ رەنگ کردنی نینۆك بەکار دێن، رێ لە تەڕ بونی نینۆك دەگرن، بۆیە حوکمی شەرعییان ئەوەیە، کە دەستنوێژ بەسەریاندا بە تاڵە، دەشێت لە کاتی بێ دەستنوێژیدا بەکار بێن.. ڕەنگێك،کە ڕێ لە ئاوی دەستنوێژ نەگرێت، وەکو خەنەو شتی وا، ئەوە ڕێپێدراوەو، دەشێت پاش و پێشی دەستنوێژ، بەکار بهێنرێن.. هەرچەندە ئیبنو عەبباس، خوا لێیان ڕازی بێت، دەیگوت: خێزانەکانمان باشترین خەنە لە دەستیان دەدەن، دوای عیشا بەکاری دەهێنن و، پێش نوێژی بەیانی لێی دەکەنەوە[2]..

★ ★ ★

---

[1] ترمزی (٢٦).

[2] ابن ابي شيبة (١٢٠/١).

# دەستنوێژ شکان

دەستنوێژ شکان، واتە نەمانی دەستنوێژ، ئەویش بـە یـەکێك لەمانـەی خوارەوە دەبێت:

**<u>یەکەم: هاتنـە دەرەوەی میـزو پیسـایی یـان بـا لـە یـەکێك لـە دەرچەکانیانەوە:</u>** لەبەر ئـەوەی خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿أَوۡ جَآءَ أَحَدٞ مِّنكُم مِّنَ ٱلۡغَآئِطِ﴾ المائـدە / ٦ واتـە: ئەگـەر کەسـێکتان لـە دەسـت بـە ئـاو گەیاندنەوە هاتەوە.. چۆن لـە کوردیـدا دەسـت بـە ئـاو گـرتن، مانـای میـز کـردن، یـان پیسـایی کردنـی هەیـە، لـە عەرەبیشـدا (الغـائِط) وایـە.. ڕای شەرعناسان لەسەر ئەوە کۆیە، کە هەر کەسێك میز، یان پیسایی، یان بای لـە ڕێـی ئاسـایی خۆیانـەوە (لـە پـێش یـان لـە پـاش) هاتـە دەرەوە ئـەوە، دەستنوێژی شکاوە[١].. بـەڵام هاتنـە دەرەوەیـان لـە غـەیری ئـەو دوو شـوێنە ئاساییانەوە، وەکو ئەوەی برینێك لە میزەڵدانـدا هـەبێت، یـان لـە گـەدەدا، ئەوە موناقەشەی شەرعناسانی لەسەرە..

ئیمـام ئـەبو حەنیفـەو، سـەوری و، ئیمـام ئەحمـەدو، ئیبنـو حـەزم گوتویانـە: هـەر نەجاسـەتێك، کـە لـە جەسـتەوە بێتـە دەرەوە، دەسـتنوێژ دەشـکێنێت.. کـەوابو یەکـەم: دەبێـت تـوخمی نەجاسـەت بێـت. دووەم: لـە هەر کوێیەکی جەستەوە بێتـە دەرەوە، گـرنگ نیـەو دەسـتنوێژی هـەر پـێ دەشکێت..

بەڵام ئیمام شافیعی گوتویەتی: بۆ دەستنوێژ شکان، مەرجە شـتێك لـە

---

[١] ابن المنذر: الاجماع (ل ١٧) و ابن المنذر: الاوسط (١٤٧/١).

شــوێنی ئاســاییەوە هاتبێــت، بــا نەجاســەتیش نــەبوبێت، بــۆ نمونــە بەردوچکەیەکی لێ بێتە دەرەوە[1].

بەڵام با لێبونەوە دەنگدار بێت، یان بـێ دەنـگ دەسـتنوێژ دەشـکێنێت، چونکە پێغەمبـەری خـوا، صلى الله عليـه وسلم دەفـەرموێ: (لا يَقْبَـلُ اللّهُ صَلاةَ أحَدِكُمْ إذَا أحْدَثَ حَتَى يَتَوَضَأ)[2] واتە: خوای گەورە نوێژی ئەو کەسە قبوڵ ناکات، کە دەستنوێژی دەشکێت، تا دەستنوێژ نەگرێتەوە، کابرایەکی خـەڵکی حەزرەمـەوت (باشـوری یەمـەن) پرسـی: ئـەرێ ئـەبو هـورەیرە، دەستنوێژ شکان چیە؟! گوتی: تس یان تڕ کەندنە[3]..

**ئەگەر کەسێك بای لە پێشەوە لێ بۆوە:** جمهور (سێ لە چوار ئیمامەکە) دەڵن: دەستنوێژی پـێ دەشـکێت. بـەڵام ئیمـام ئـەبو حەنیفـەو، ئیبنـو حـەزم، دەڵـێن: پێـی ناشـکێت، چـونکە زاراوەی (تـس و تـڕ) بـۆ بایەکن، کە لە پاش هاتبنە دەرەوە، نەك لە شوێنی تـرەوە[4]..

من پێم وایە، ئەگەر کون لە سك، یان ریخۆڵەی کرابو، با لـەوێوە هـات دەستنوێژ دەشـکێنێت، چونکە هـەمان پێکهاتـەی بایەکـەی دەبێـت، بـەڵام ئەگەر کونێك لە پشتیەوە بۆ سەر سـیەکانی، یـان بـۆڕی هەناسـەی کرابـو، ئەمە چ پەیوەندیەکی بە حوکمی دەستنوێژەوە نابێت. والله اعلم.

**رون کردنەوەیەك:** ئافرەت جاری وا هەیە هەست دەکات، وەکو با لە پێشی دێتـە دەرەوە، ئەمـە لـە حاڵـەتی ئاساییدا بـە بـا لێبونـەوە حسێب ناکرێت و، دەستنوێژی پێ ناشێکت، چونکە حوکمی وەکو قرقێنەیە، بەڵام

---

[1] ابن حزم: المحلى (٢٣٢/١)، ابن رشد: بداية المجتهد (٤٠/١)، الاوسط (١٣٧/١).
[2] متفق عليه بوخاری (١٣٥)، موسليم (٢٢٥).
[3] بوخاری (١٣٥) موسليم (٢٢٥) بەڵام بە بێ شەرحەکەی ئەبو هورەیەرە..
[4] ابن حزم: المحلى (٢٣٢/١)، السرخسي: المبسوط: (٨٣/١).

ئەگەر ئافرەتێك كونی پێش و پاشەوەی بو بە یەك (وەكو حاڵەتی عەمەلیات) و، هەستی بە با لێبونەوە لە پێشەوە كرد، دەبێت لە ڕوی ئیحتیاتەوە وا حسێب كات، كە دەستنوێژەكەی شكاوە..

**دووەم: <u>هاتنە دەرەوەی مەنی و وەدی و مەزی</u>:** بە كۆڕا (ئیجماع) ی شەرعناسان، هاتنە دەرەوەی هەر یەكێك لە مەنی و وەدی و مەزی، دەستنوێژ دەشكێنێت[١]..

ـ مەنی ئەوە ئاشكرایە، كە هەرچی شتێك غوسڵ پێویست بكات، دەستنوێژیش دەشكێنێت..

ـ مەزی، بەڵگە، ئەو ریوایەتەی سەیدنا عەلی كوڕی ئەبو تالیبە، كە فەرموی: (كُنتُ رَجُلاً مَذَّاءً فأمَرْتُ رَجُلاً أنْ يَسْألَ النَّبيَّ صلى الله عليه وسلم لِمَكَانِ ابْنَتِهِ فَسَألَ فَقَالَ : تَوَضَّأْ وَاغْسِلْ ذَكَرَكَ) كەسێك بوم مەزیم زۆر بو، شەرمم دەكرد لە پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم بپرسم، لەبەر كچەكەی (زاوای بو)، بە كابرایەكم وت: بۆم بپرسە لێی، بۆی پرسیم، پێغەمبەر، صلى الله عليه وسلم فەرموی: زەكەرت بشۆو دەستنوێژ بگرە.

ـ وەدیش هەر ئەو حوكمەی هەیە، بۆ ئەویش هەر زەكەری دەشوات و، دەستنوێژەكەی دەگرێت. ئیبنو عەبباس، خوا لێیان ڕازی بێت، دەربارەی هەرسێكیان دەڵێ: ئەمما مەنی: ئەوە غوسڵی لەسەرە، ئەمما وەدی و مەزی، ئەوە هەر زەكەرتیان لێ بشۆرەوەو، دەستنوێژی خۆت بۆ نوێژ بگرە[٢].

---

[١] ابن هبيرة: الافصاح (١/٧٨)، ابن المنذر: الاجماع (ل ٣١).

[٢] بەیهیقی (١/١١٥) كەمال ئیبنو السید لە صحيح فقه السنة (١/١٢٩) دا دەڵێ: إسناده صحيح.

حوکمی ئەو کەسەی، کە با لێبونەوەی زۆرە، یان ئـەوی مـەزی زۆرەو، بەردەوام لێی دێت، هەر وەکو حوکمی میزەچرکێ و خـوێنی جاری داوێـن (ئیسـتیحازە) ی ژنانــە. پیســە، بــەڵام لــەش پــیس ناکــات، شــوێنەکەی دەشۆرێت و، دەستنوێژی نوێ، بۆ هەر نوێژێك دەگیرێتەوە..

**سێیەم: خـەوێك بـێ هۆشـی دروسـت کردبێـت:** ئـەو بەڵگانـەی بـاس لـە مەسـەلەی خـەوی دەسـتنوێژدار دەکـەن، کـەمێك تێکـەڵاوییان تێدایە، بۆیە رای شەرعناسانیش دەربارەیان زۆر بوە.. شەرعناسان بون بە دوو پـۆلی سـەرەکی: پۆلێکیـان پێیـان وایـە، خـەوتن کاریگـەری لەسـەر دەسـتنوێژ هـەر نیـە! پـۆلی دووەمیـان پێیـان وایـە، خـەوتن هۆکـاری دەسـتنوێژ شـکانە.. ئـەمانیش بونەتـەوە بـە دوو پـۆلی تـر: هەنـدێکیان دەڵێن: خودی خەوتنەکە، هۆکاری دەسـتنوێژ شکانەکەیە، ئـەوانی تریـان دەڵێن: نا، خەوتنەکە بێ هۆشی دروست کردوەو، بێ هۆشیەکە ئیحتیمـالی بـا لێبونـەوەی هێناوەتـە پـێش.. کـەوابو راو بۆچـونی شەرعناسـان لـەم مەسەلەیەدا سێ پۆلن، بەڵام هەشت قەولیان هەیە[1]:

**یەکەم: ئەوانەی پێیان وایـە خـەوتن دەسـتنوێژ ناشـکێنێت:**

ئەمـە لـە کۆمـەڵێك یـاوەری پێغەمبـەری نـازدارەوە، صـلى الله عليـه وسـلم ریوایـەت کـراوە، لەوانـە: ئیبنـو عومـەرو، ئـەبو موسـای ئەشـعەری، لـە تـابعینیش ئەمـە، رای سـەعیدی کـوڕی جوبـەیرو مـەکحول و، عوبەیـدەی سەلمانی و، ئەوزاعی و، هەندێکی ترە.. بەڵگەشیان:

---

[1] ابن حجر: فتح الباري (٣٧٦/١)، النوي: شرح مسلم (٣٧٠/٢)، ابن حزم: المحلى (٢٢٢/١)، ابن عبدالبر: الاستذكار (١٩١/١)، ابن المنذر: (الاوسط (١٤٢/١)، الشوكاني: نيل الاوطار (٢٤١/١) الالباني: تمام المنة (ل ١٠٠).

١ ـ ئیبنو عەبباس، خوا لێیان ڕازی بێت دەگێڕێتـەوە، دەڵـێ: (بِتُّ عِنْدَ خَالَتِي مَيْمُونَةَ لَيْلَةً فَقَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ اللَّيْلِ فَلَمَّا كَانَ فِي بَعْضِ اللَّيْلِ قَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَتَوَضَّأَ مِنْ شَنٍّ مُعَلَّقٍ وُضُوءًا خَفِيفًا، وَقَامَ يُصَلِّي فَتَوَضَّأْتُ نَحْوًا مِمَّا تَوَضَّأَ ثُمَّ جِئْتُ فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ وَرُبَّمَا قَالَ سُفْيَانُ عَنْ شِمَالِهِ فَحَوَّلَنِي فَجَعَلَنِي عَنْ يَمِينِهِ ثُمَّ صَلَّى مَا شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ اضْطَجَعَ فَنَامَ حَتَّى نَفَخَ ثُمَّ أَتَاهُ الْمُنَادِي فَآذَنَهُ بِالصَّلَاةِ فَقَامَ مَعَهُ إِلَى الصَّلَاةِ فَصَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ)[1]. واتە: شەوێك لای پورە مەیمونـە خـان (كـە خێزانی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) مابومەوە، كە هەندێك لە شـەو ڕۆیشـت، پێغەمبـەری خـوا، صـلى الله علیـه وسـلم هەسـتا، دەسـتنوێژێكی سوكەڵەی لە جەوەنەیەك گرت، كە هەڵواسرابو، ئینجا كەوتە نوێژ كـردن، منیش هەستام وەكو ئـەو، دەسـتنوێژەكەم گـرت و لای چـەپیەوە وەسـتام، دەستی گرتم و ڕایكێشامە لای ڕاستیەوە، پاشان چەندی حـەز كـرد نوێـژی كرد، ئینجا ڕاكشا، پاشان نوست، پرخە پرخـی دەهات، پاشـان كەسـێك بـۆ نوێژی بەیانی بانگی كـرد، ئـیتر هەسـتاو چـو، نوێژەكـەی كـرد بـێ ئـەوەی دەستنوێژ بشواتەوە..

٢ـ فەرمودەكـەی لای ئەنـەس، خـوا لێـی ڕازی بێـت، كـە دەڵـێ: (أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ وَرَجُلٌ يُنَاجِي رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَمَا زَالَ يُنَاجِيهِ حَتَّى نَامَ أَصْحَابُهُ ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى)[2] واتـە: قامـەتی نوێـژ كـراو پێغەمبـەری خـوا، صـلى الله علیـه وسـلم، كابرایـەكی بـانگ دەكـرد، بـەردەوام بـانگی دەكـرد

---

[1] بوخاری (١١٧ و ١٣٥)، موسلیم (١٨٤)، احمد (٣٤١/١).

[2] بوخاری (٦١٩٢)، موسلیم (٣٧٦).

(پێـوەی مەشـغوڵ بـو)، تـا یاوەرەکـانی خـەوتن، پاشـان تەشـریفی هێنـاو نوێژەکەی بۆ کردن..

٣ـ قەتادە دەڵێ: گوێم لە سەیدنا مالیك بو، خوا لێـی ڕازی بێـت گـوتی: یـاوەرانی پێغەمبـەر، صـلی الله علیـه وسـلم، دەخـەوتن و، هەڵدەسـتانەوە نوێژەکەیان دەکرد، بێ ئـەوەی دەستنوێژەکەیان بگرنـەوە.. لـە قـەتادەیان پرسی: خۆت گوێت لێ بو ئەنەس وا بڵێ؟! گوتی: ئەرێ بە خوا[1]..

## دووەم: ئەوانەی پێیان وایە هـەمو بـڕە خـەوتنێك دەستنوێژ دەشـکێنێت:

بـێ ئـەوەی جیـاوازی هـەبێت لـە نێـوان خـەوی زۆر، یـان خەوی کەمدا.. ئەمەش ڕای ئەبو هـورەیرەو ئـەبورافیع و، عـورووەی کـوڕی زوبـەیرو، عـەتاء و، حەسـەنی بەسـری و، سـەعیدی کـوڕی موسـەییب و، زوهری و، موزەنی و، ئیبنول مونزیرو، ئیبنو حەزمەو، شـێخی ئـەلبانیش ئەمەیانی پێ پەسەندتر بوە، بەڵگەی ئەمانیش:

١ ـ سەفوانی کوڕی عەسسال، خوا لێی ڕازی بێت، دەڵـێ: (کَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيـهِ وَسَـلَّمَ يَأمُرُنَـا إذَا كُنَّـا مُسَـافِرِينَ أنْ نَمْسَـحَ عَلَـى خِفَافِنَـا، وَلا نَنْزَعَهَا ثَلاثَةَ أيَّامٍ مِنْ غَائِطٍ وَبَولٍ وَنَومٍ إلَّا مِنْ جَنَابَـةٍ)[2] واتـە: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم فـەرمانی پـێ دەکـردین، کـە لـە سـەفەردابوین، مەسح لەسەر خوففـەکانمان بکـەین و، تـا سـێ ڕۆژ لەبـەر چونە سـەر ئـاو (میز کردن و پیسایی کـردن)، یـان لەبـەر خـەوتن، لـە پێیـان نەکەینـەوە، مەگەر لە لەشگرانی (جەنابەت: لەش پیسی).. ئـەم شەرعناسـە بەڕێزانـە

---

[1] موسلیم (٣٧٦)، ترمزي (٧٨).

[2] نەسائی (٣٢/١)، ترمزی (٣٥٣٥)، ئیبنو ماجە (٤٧٨)، شێخی ئەلبانی رحمه الله لە ارواو الغليل (١٠٤) دا دەڵێ: حەسەنە..

دەڵـێن: ئـەوەتا پێغەمبـەری خـوا، صـلی الله علیـه وسـلم خـەوتنی بـە شێوەیەکی گشتی باس فەرموە، بێ ئەوەی جیاوازی بخاتە نێوان کەمی، یان زۆرییەوە، هەروەها بێ ئەوەی جیاوازی بخاتە نێوان، خەوتن و، میز کردن و، پیسایی کردنەوە..

٢ ـ عائیشە خان، خوا لێی ڕازی بێت دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا، صلی الله علیه وسلم دەیفەرمو: ( إِذَا نَعَسَ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاتِهِ فَلْيَرْقُـدْ حَتَـى يَـذْهَبَ عَنْهُ النَّوْمُ فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا صَلَّى وَهُوَ نَـاعِسٌ لَـا يَـدْرِي لَعَلَّـهُ يَـذْهَبُ يَسْتَغْفِرُ فَيَسُبَّ نَفْسَـهُ)[١] واتـە: ئەگـەر کەسـێکتان لـە نوێژەکەیـدا وەنـەوزی دا، بـا ڕاکشێت، تا خەوەکەی دەڕوات، چونکە لەوانەیە یەکێکتان خەواڵوانە نوێژ بکات، نەزانێت چی دەڵێ ؟! لەوانەیە جنێـو بـە خـۆی بـدات و، هۆشـی لـێ نەبێت..

ئەمە بەڵگەیەکی ئیمام بوخارییە بۆ دەستنوێژ شوشتنەوە لە خەوتن، بـەڵام شەرعناسـانی بەرامبـەر، ڕەددیـان لـەم بەڵگە داوەتـەوە بـەوەی، کـە بەڵگەی خۆیانـە، چونکە ڕێـدانی پێغەمبـەری، خـوا صلی الله علیـه وسـلم بەوەی کابرا، نوێژەکەی واز لێ بهێنێـت و بـڕوات ڕاکشـێت، لەبـەر ئەوەیـە قسە بـە خـۆی نـەڵێت، یـان هەڵـەی خەتـەری بەدەمـدا نـەیات، یـان لەبـەر ئەوەی خشوع و، ملکەچیی نوێژەکـەی نامێنێـت.. ئەمـە چ پەیوەندیـەکی بە خەوتن و، دەستنوێژ شکانەکەوە نیە..

٣ ـ ئەم بەڕێزانە دەڵێن: کۆڕا لەسەر ئەوە هەیە، کە لـەهۆش خـۆ چـون و، سەرخۆش بون، دەستنوێژ دەشکێنێت، هۆکاری ئەم دوانە هۆش لـە خـۆ

---

[١] بوخاری (٢١٢)، موسلیم (٢٢٢).

ئەمانە، ئێ خەوتنیش وایە، هەمو کەسێك بە خەوتن، هۆشی لە خۆی نامێنێت.. کەوابو خەوتن هۆکاری دەستنوێژ شکانە..

**سـێیەم: ئەوانـەی پێیـان وایـە خـەوتنی زۆر دەسـتنوێژ دەشـکێنێت نـەك کـەم:** ئەمـەش ڕای ئیمـام مالیـك و، قـەولێکی ئیمـام ئەحمـەدو، زوهـری و، ڕەبیعەیـەو، ئـەو خەوتنـەی یاوەرانیـان (کـە لـە فەرمودەکەی لای ئەنەسدا هاتوە) بە خەوتنی زۆر لێکداوەتەوە..

**چـوارەم: ئەوانـەی پێیـان وایـە خـەوتن بـە شـان دادان و ڕاکشانەوە دەستنوێژ دەشکێنێت:** ئەم پۆلە شەرعناسە دەڵێن: هەر کەسێك لە یەکێك لەشێوەکانی نوێـژدا خـەوی لـێ کـەوت، وەکو کـاتی بـە پێوە بون، یان ڕکوع، یان سجود، یان دانیشـتنی تـەحیات، لـە نوێـژدا بێـت، یان لە غەیری نوێـژدا، ئـەوە دەسـتنوێژەکەی ناشـکێت. ئەمـەش ڕای ئـەبو حەنیفەو، حەممادو، سەوری و، داودو، قەولێکی ئیمـام شـافیعیە.. بەڵگـەی ئەمانیش:

١ ـ عـەمری کـوڕی شـوعەیب لـە باوکیـەوە، ئـەویش لـە باپیریـەوە دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبـەری خـوا، صلى الله عليه وسلم فـەرموی: (لَـيسَ عَلَى مَنْ نَامَ جَالِساً وُضُوءٌ حَتَّى يَضَعَ جَنْبَـهُ)[١] واتـە: دەسـتنوێژ لەسـەر ئـەو کەسە فەرز نابێتەوە، کـە بـە دانیشـتنانەوە خـەوی لـێ دەکـەوێت، تـا ئـەو کاتەی دەکەوێتە سەر لا..

٢ ـ ئەنەسـی کـوڕی مالیـك، خـوا لێـی ڕازی بێـت دەگێڕێتـەوە، کـە پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم فەرموی: (إِذَا نَـامَ الْعَبْـدُ فِـي سُجُودِهِ

[١] دارەقوتنی (١/١٦٠)، ئیبنو عەدی لە الكامل (٦/٢٤٥٩) بەڵام فەرمودەوانان گوتویانە حەدیسێکی زەعیفەو جۆری مونکەرە..

بَاهَى اللهُ تعَالَى بِهِ المَلائِكَةَ يَقُولُ: أنظُرُوا الَى عَبْدِي رُوحُهُ عِنْدِي وَجَسَدُهُ فِي طاعَتِي)[١] واتە: کاتێك عەبدێکی خوا لە نوێژکردنیدا، خەوی لێ دەکەوێت، خوای گەورە، لای فریشتەکان شانازی پێوە دەکات، دەفەرموێ: بڕواننە ئەو عەبدەی من، ڕۆحی لای منەو، جەستەشی لە ملکەچی مندایە.. ئیمام بەیهیقی دەڵێ: ئەمە ئەگەر وەکو فەرمودە بسەلمێنرێت، نابێتە بەڵگەی مانەوەی دەستنوێژ بە خەوتن، چونکە ئەمە هەر مەتحی ئەو عەبدە چاکانەیە، کە بەردەوامم لەسەر ملکەچیی و، گوێڕایەڵی فەرمانی خوای گەورەن تا ئەو ساتەی خەو دەیانباتەوە..

**پێنجەم: ئەوانەی پێیان وایە خەوتن لە رکوع و سجوددا دەستنوێژ دەشکێنێت:** ئیمام نەوەوی دەڵێ: ئەمە رای ئیمام ئەحمەدە.. لەوانەیە لەبەر ئەوە بێت، کە ئەو دوو شێوەیە، ئیحتیمالی با لێبونەوە زیاترە.

**شەشەم: ئەوانەی پێیان وایە خەوتن تەنها لە سجوددا دەستنوێژ دەشکێنێت:** ئەمیش قەولێکی تری ئیمام ئەحمەدە..

**حەوتەم: ئەوانەی پێیان وایە خەوتن لە نوێژدا دەستنوێژ هەر ناشکێنێت:** ئەمە رای ئیمام ئەبو حەنیفەیە، کە پێی وایە دەستنوێژ بە خەوتن، تەنها لە دەرەوەی نوێژدا دەشکێت.. ئەمە هەر وەکو قەولی چوارەمی وایە..

---

[١] زەعیفە بڕوانە: الالباني: سلسلة الاحاديث الضعيفة (٩٥٣).

**هەشـتەم: ئەوانـەی پێیـان وایـە خـەوتن بـە دانیشـتنانی مەحكەمەوە دەستنوێژ ناشكێنێت:** خـەوتن بـەو مەرجـەی سمت و دەرچەی كۆمی لـەزەوی، یـان لەسـەر ئەوشـتەی لەسـەری دانیشتوە، قایم كردبێـت، زیـانی بـۆ دەسـتنوێژ نابێـت، چ لـە نوێـژدا بێـت، چ لـە دەرەوەی نوێژ.. ئەمەش ڕای ئیمام شافیعیە.. چونكە بە ڕای ئـەم ئیمامـە بـەڕێزە، خەوتن خۆی لە خۆیدا، هۆكاری دەستنوێژ شكان نیە، بەڵام لەبـەر ئـەوەی ئیحتیمالی، یا لێبونـەوەی زیـاترە، بۆتـە هـۆی دەسـتنوێژ شـكانەكە.. بۆیـە دەڵێ: ئەو كەسەی بە دانیشتنانەوە خەوی لێ كەوتوەو، بـەو شـتەوە قایم بوە، كە لەسەری دانیشتوە، ئەگەر بایەكی لێ بێتـەوە، هەسـتی پـێ دەكـات، بۆیە دەستنوێژەكەی سەلامەتە.. شەوكانی بەرگری لەمەی ئیمـام شـافیعی كردوەو، پێی پەسەندتر بوە. چونكە لە فەرمودەكەی ئەنەسدا هـاتوە، كـە یـاوەران لـە چـاوەڕوانی پێغەمبـەری خـوادا، صـلى الله علیـە وسـلم بـۆ نوێـژكردنیان دەخـەوتن، ئـەم شەرعناسـانە دەڵـێن: كـاتی چـاوەڕوان كردنەكـەیان دانیشـتو بـون.. بـەڵام ئیمـام ئیبنوحەجـەری عەسـقەلانی، ڕەددیـان لـێ دەداتـەوە[١]و دەڵـێ: نـەخێر، فـەرمودەی تـری سـەحیح، لـە مەسـنەدی بـەززاردا هـاتوە، كـە دەڵـێ: ئـەو یاوەرانـەی چاوەڕوانی هـاتنی پێغەمبەری خوایان، صلى الله علیە وسلم بـۆ نوێـژ دەكـرد، تێیانـدا بـو بـە خەوتویی كەوتبوە سەر تەنیشت و، هـەیانبو بـە تـەواوی خـەوتبو، پاشـان هەمو هەڵدەستان بۆ نوێژ[٢]..

---

[١] ابن حجر العسقلاني: فتح الباري (١/٢٥١).

[٢] ئەبو داودیش لە كتێبی (مسائل أحمد ل ٣١٨) دا هێناویێتیەوەو، ئەلبانیش دەڵێ: سەنەدی لەسەر مەرجی هەردووشەیخیەن سەحیحە، بڕوانە الالباني: تمام المنة (ل ١٠٠).

**پوختەی بۆچونەکان:** ئـەو خـەوتنـە دەسـتنوێژ دەشـکێنێت، **کە هۆشی لەگەڵدا نەمابێت**، کە بۆ نمونە خاوەنەکەی لیك بە دەمیدا هاتبێتە خوارەوەو، هەستی پـێ نـەکردبێت، یـان لـە قسـەی دەوروبەرەکـەی تێنەگەیشـتبێت، یـان شـتێکی بـە دەسـتەوە بوبێـت و، لێـی کەوتبێتـە خـوارەوەو نـەیزانیبێت.. چـونکە هـەمو ئەمانـە ئیحتیمـالی دەسـتنوێژ شکانیان هەیـە، ئـیتر دەستنوێژەوان لـە ڕکوعـدا بێـت، یـان لـە سـوجدەدا، دانیشتبێت، یان بە پێوە بێت، شانی دادابێت، یـان ڕاکشـابێت گـرنگ نیـە.. چونکە وا دیارە ئـەوی یـاوەران لـە چاوەڕوانی پێغەمبـەری خۆشەویستدا، صلی الله علیه وسلم توشیان دەبو، یان ئـەوەی ئیبنـو عـەبباس خـوا لێیـان ڕازی بێت لە ناو نوێژەکەدا، کە لە خزمەت پێغەمبەری بەڕێزدا، صـلی الله علیـە وسـلم بـو، توشـی دەهـات، هـەموی هـەر خەوەنوچـکە بـوە، بۆیـە کاریگەری لەسەر دەستنوێژیان نەبوە.. ئەمەش وا دەزانم کۆکردنەوەیەکی تەقریبی بەڵگەکانە.. والله اعلم.

**گومـان کـردن لـە دەسـتنوێژی خەوەنوچـکە:** ئەگـەر کەسـێك دەستنوێژی هەبو، بەڵام خەو بردیەوەو، هۆشی لە خـۆی و دەروبـەری مـا، پێویست ناکات خۆی بخاتە سەر گومانی ئەوەی، کە گوایـە دەسـتنوێژەکەی نەماوە.. چونکە لە ئەسڵدا، ئەو دەستنوێژی هەبوە، بە پێی ئەو ڕێسایەی دەڵێ: (اليَقينُ لا يَزولُ بالشَّكِّ) واتە: دڵنیابون بـە گومـان لاناچـێت، گومـان کردنەکـەی ئەسـڵەکە لانـادات، کـە دڵنیـابون (یـەقین) بـوە لـە هـەبونی دەستنوێژ، ئەمـە بۆچـونی ئیمـام ئیبنـو تەیمییەیـە، ڕەحمـەتی خـوای لـێ بێت[1].

---

[1] ابن تيمية: مجموع الفتاوى (٢١/٢٣).

**چوارەم: لە هۆش خۆ چون بە شێتبون یان سەرخۆشی یان بورانەوە:** ئەمانە هەموی بە کۆڕا (ئیجماع) ی شەرعناسان[1]، دەستنوێژ دەشکێنن..

**پێنجەم: دەستدان لە عەورەت بە روتی:** ڕای شەرعناسان لە مەسەلەی دەستدان لە زەکەردا، چوار پۆلە:

**پۆلی یەکەم: ئەوانەی گوتویانە: دەستدان لە زەکەر دەستنوێژ ناشێکنێت:** ئەمەش ڕای ئیمام ئەبو حەنیفەو، قەولێکی ئیمام مالیك و، کۆمەڵێك لە یاوەرانێتی[2]. بەڵگەشیان:

١. فەرمودەکەی قەیسی کوڕی تەڵقی کوڕی عەلی، خوا لێی ڕازی بێت، کە بە فەرمودەی تەڵق ناسراوە، دەگێڕێتەوە، کە کەسێك (لەوە دەچو ئەعرابی بێت) پرسیاری لە پێغەمبەری خوا کرد، صلی الله علیه وسلم، دەربارەی کەسێك، کە دوای ئەوەی دەستنوێژی گرت، دەست لە زەکەری بدات، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموی: (هَلْ هُوَ إلا بِضْعَةٌ مِنْكَ)[3] واتە: مەگەر هەر بەشێك نیە لە خۆت؟! لە لەفزێکی تردا دەڵێ: کابرا پرسی: لەو کاتەی من لە نوێژدام، ڕانم دەخورێنم، دەستم بەر زەکەرم بکەوێت؟! فەرموی:(إنَّمَا هُوَ مِنْكَ)[4] واتە: ئەویش بەشێکە لەخۆت.

---

[1] ابن المنذر: الاوسط (١٥٥/١).

[2] الکاساني: البدائع (٣٠/١)، ابن الهمام: شرح فتح القدیر (٣٧/١)، ئیمامی مالیك: المدونة (٨/١)، ابن المنذر: الاستذکار (٣٠٨/١).

[3] ئەبو داود (١٨٢)، ترمزی (٨٥)، نەسائی(١٠١/١) زۆر لە فەرمودەوانان بە زەعیفیان داناوە، بەڵام شێخی ئەلبانی ڕەحمەتی بە سەحیحی داناوە..

[4] ئەبو داود (١٨٣)، ئەحمەد (٢٣/٤)، بەیهیقی (١٣٥/١).. کەمال ئیبنو السەید لە صحیح فقه السنة (٣٣/١) دەڵێ إسناده ضعیف..

٢ ـ ئەم شەرعناسە بەڕێزانە دەڵێن: کە کەس گومانی لەوەدا نیە، کە ئەگەر زەکەر بەر ڕان بکەوێت، دەستنوێژ ناشکێنێت، کەوابو جیاوازی دەست و ڕان چیە؟! هیچ جیاوازیەك نیە، بۆیە دەستنوێژ بە دەستدان لە زەکەر ناشکێت..

قسەشیان لەسەر ئەو فەرمودانە هەیە، کە باس لە شکانی دەستنوێژ بە دەستدان لە زەکەر دەکەن.. وەکو فەرمودەی بوسرە، کە دواتر دێت[1]..

**پۆلی دووەم: ئەوانەی گوتویانە: دەستدان لە زەکەر دەستنوێژ دەشکێنێت:** ئەمە مەزهەبی زانراوی ئیمام مالیك و، شافیعی و، ئەحمەدو، ئیبنو حەزمە، کە لە زۆر لە یاوەرانەوە گێڕراوەتەوە، بەڵگەشیان:

١ـ فەرمودەکەی بوسرەی کچی سەفوان، کە دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم فەرموی: (مَنْ مَسَّ ذَكَرَهُ فَلْيَتَوَضَّأْ وُضُوءَهُ لِلصَّلَاةِ)[2] واتە: هەر کەسێك دەستی لە زەکەریدا، با دەستنوێژ بشواتەوە، وەکو، کە بۆ نوێژ دەیشواتەوە..

٢ ـ فەرمودەکەی لای ئوم حەبیبە، کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموی: (مَنْ مَسَّ ذَكَرَهُ فَلْيَتَوَضَّأْ)[3] واتە: هەر کەسێك دەستی لە زەکەری دا، با دەستنوێژ بگرێتەوە ..

---

[1] ابن عبدالبر: الاستذكار (١/٢٠٣)، الطحاوي: شرح معاني الآثار (١/٧١).

[2] ئەحمەد: الجامع في العلل ژمارە (٣٦٣)، ئەبو داود (١٨١)، نەسائی (١/١٠٠)، ئیبنو حیببان (١١١٢).

[3] ئیبنو ماجە (٤٨١)، ئەبویەعلا (٧١٤٤)، بەیهیقی (١/١٣٠) شێخی ئەلبانی بە سەحیحی داناوە، بڕوانە الارواو (١١٧).

٣ـ فەرمودەکـەی لای ئـەبو هـورەیرە، خـوا لێـی ڕازی بێـت، کـە دەڵـێ: پێغەمبەری خـوا فەرمویـەتی: (إذَا أفْضَـى أحَـدُكُمْ بيَـدِهِ إلَـى فَرْجِـهِ وَلَـيسَ بَيْنَــهُ وَبَيْنَهَــا حِجَــابٌ وَلا سِــتْرٌ فَقَــدْ وَجَــبَ عَلَيــهِ الْوُضُــوءُ)[1] واتــە: هــەر کەسـێکتان دەسـتی بـەر عـەورەتی خـۆی کـەوت، بـێ ئـەوەی بەربەسـتێك (پەردەیەك) لە نێوانیاندا هەبێت، ئەوە دەستنوێژی لەسەر فەرز بوە..

٣. فەرمودەی تریش بە هەمان مانا، لە سەیدنا ئەبو هورەیرەو، ئەروای کچی ئونـەیس و، عائیشـەخان و، جـابری کـوڕی عبداللـه و، زەیـدی کـوڕی خالیـدو، عبداللـەی کـوڕی عـەمرەوە، ڕیوایـەت کـراوە.. ئیبنـو قودامـەی مەقدیسی، لە کتێبی (المُغني) یەکەی خۆیدا دەڵێ: زیاتر لـە پـازدە یـاوەری پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم، ئەم فەرمودانەیان ڕیوایەت کـردوە، کە دەستنوێژ لە دەستدان لە عەورەت دەشکێت..

ئەم پۆلە شەرعناسە گوتویانە، فەرمودەکەی لای بوسرە بەهێزترە لە فەرمودەکەی تەڵق، لە زۆر لایەنەوە، لەوانە:

أـ فەرمودەکـەی لای تـەڵق، زیـاتر قسـەی لەسـەر کـراوە، تەنانـەت هـەر لەوەی ڕاویەکە، قەیسی کوڕی تەڵقە، یـان تـەڵقی کـوڕی عـەلی خۆیـەتی؟! ئەوانــەی قســەیان لەســەر کــردوە، پێشــەوایانی فــەرمودەوانین[2] تەنانــەت توێژەرەوەی، وەکو ئیمام نەوەی دەڵێ: کۆڕای فـەرمودەوانانی لەسـەرە، کـە زەعیفە[3]

---

[1] الحاكم (١٣٨/١)، شێخی ئەلبانی دەڵێ سەحیحە بڕوانە (صحيح الجامع ٣٥٩).

[2] وەکو ئیمامی ئەبو زەرعە، کە شەش سەد هەزار فەرمودەی لەبەر بوە، ئیبنو قودامە لە (المغنى)دا هێناویێتیەوە: ئەبو زەرعە دەربارەی تەڵق دەفەرموێ: (قَيس مِمَن لا تقومُ بروايته حُجَّةٌ)

[3] النوي: المجموع (٤٢/٢).

ب ـ فەرمودەی لای تەڵق، لەسەر ئەسڵەکەی ماوە، بەڵام فەرمودەکەی لای بوسرە نەقڵی کردوە، نەقڵ کردنیش لە پێشترە، چونکە ئەحکامی شەرع بریتیە لە نەقڵ کردن لە پێغەمبەری خواوە، صلى الله عليه وسلم.

ج ـ ئەوانەی ریوایەتی حوکمی دەستنوێژ شکانیان، بە دەستدان لە زەکەر کردوە، زۆرترن و، فەرمودەکانی لایان بەناوبانگترن..

د ـ فەرمودەکەی لای تەڵق وا لێك دەدرێتەوە، کە لە نوێژدا بوە.. واتە عەورەتی داپۆشیوە، بەڵام، کە ڕانی خورانـدوە دەستی بەر زەکەری کەوتوە.

هـ ـ قیاس لەسەر ئەوەی، کە زەکەریش وەکو ئەندامێکی تری لەش وایە، ئەمە بەو رەهاییە نیە، چونکە هەندێك ئەحکامی شەرع هەیە، زەکەر دەگرێتەوە، بەڵام هیچ ئەندامێکی تری جەستە وا ناگرێتەوە، وەکو ئەحکامی غوسڵ ومارەیی وحەددو شتی وا.. حوکمی کەسێك پەنجەیەك، بکات بە عەورەتێکدا، چۆن وەك ئەوە دەبێت، کە زەکەری پێدا کردبێت؟!

<u>**پۆلی سێیەم: ئەوانەی گوتویانە: دەستدان لە زەکەر بە چێژەوە دەستنوێژ دەشکێنێت:**</u> ئەمەش قەولێکی ئیمام مالیکەو، شێخی ئەلبانیش، ئەمەیانی بە پەسەندتر داناوە[١].. ئەمان بۆ گونجاندنی دوو فەرمودەکەی تەڵق و بوسرەیە، گوتویانە: فەرمودەکەی تەڵق (هَلْ هُوَ إلّا بِضْعَةٌ مِنْكَ) بۆ ئەو کەسەیە، کە بە چێژەوە دەست لە زەکەری نادات، ئەوە دەستنوێژەکەی ناشکێت، چونکە وەکو ئەوەیە، کە دەست لە شوێنێکی تری لەشی بدات.. ئەمما فەرمودەکەی بوسرە (مَنْ مَسَّ ذَكَرَهُ

---

[١] الالباني: تمام المنة (ل ١٠٣).

فَلْيَتَوَضَّأْ) بـۆ ئەوەیـە، کـە بـە چێژەوە، دەسـت لـە زەکـەری دەدات، ئـەوە حەتمـەن دەسـتنوێژەکەی دەشـکێنێت.. ئەمـەش بۆچـونی ئیمـام ئیبنـو تەیمییەیە.. بەرامبەرەکانیان دەپرسن: ئایا زانینی چێژ بە چ پێوەرێکە ؟ هەر بەوەندەی ئاهێکی پێدا هات، یـان بەوەنـدەی جولاّ، یـان بـەوەی، کـە مەزی بێتە دەرێ؟!

**پـۆلی چـوارەم: ئەوانـەی گوتویانـە: دەسـتنوێژگرتنەوە لـە دەسـتدان لـە زەکـەر واجـب نیـە:** ئەمـەش ڕای ئیمـام ئەحمـەدەو، پەسەندکراوی ئیمام ئیبنو تەیمیەیە، ئیبنو عوسێمینی ڕەحمەتیش، زیاتر بەلای ئەم ڕایەدا چوە.. ئەمە مەزهـەبی حەنبەلیـە، ئـەم بەڕێزانـە پێیـان وایـە، ئەگـەر دەست لێدانەکـە بـە چـێژەوە نـەبو، دەسـتنوێژ بگرێتـەوە باشترە، دەنا لەسەری فەرز نیـە[1]. بەرامبـەرەکانی ئـەمانیش دەڵێن: بۆچـی ئەم حوکمەتان وەکو حـوکمی، بـا لێبونـەوەو هۆکارەکـانی تـری دەسـتنوێژ شکان لێ نەکردوە ؟![2]

**پوختەی حوکم بە لامەوە: هەر کەسێك دەستی بەر زەکەری کەوت، بـە ئەنقەست، یان لـە ناغافڵ، بـە چێژ یـان بـێ چێژ، حەتمـەن دەسـتنوێژی شکاوە.. والله اعلم.***

★ ★ ★

---

[1] ابن تيمية: مجموع الفتاوى (٢٤١/٢١)، ابن عثيمين: الشرح الممتع (٢٣٣/١).

[2] ابن المنذر: الاوسط (٢٠٧/١).

[*] ئێمە وەکو لیژنەی نوسینگەی تەفسیر، ڕای ئیمام ئەحمەدو ئیبن تەیمیمیەو(إبن العثيمين) و مەزهەبی حەنبەلی، بە پەسەندو واقیعانە دەزانین، کە ڕایان وایە دەستنوێژگرتنەوە لە دەستدان لە زەکەر واجب نیە و دەستنوێژی پێ ناشکێ.

# هەندێك باسی تر لەسەر دەستنوێژ

## دەست لە عەورەت دان

**١. ئەگەر ئافرەت دەستی بەر عەورەتی خۆی کەوت، ئەوە دەستنوێژەکەی شکاوە:** چونکە فەرمودە لەو بارەوە زۆرن.. عائیشەخان، خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: ئەگەر ئافرەتێك دەستی لە عەورەتی خۆیدا، پێویستە دەستنوێژ بگرێتەوە[1] ؟؟

هەروەها فەرمودەکەی لای عەمری کوڕی شوعەیب، کە لە باوکیەوە، ئەویش لە باپیریەوە گێڕایەوە، کە پێغەمبەری خۆشەویست، صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (مَنْ مَسَّ ذَكَرَهُ فَلْيَتَوَضَّأْ، وَأَيُّمَا إِمْرَأَةٍ مَسَّتْ فَرْجَهَا فَلْتَتَوَضَّأْ)[2] واتە: هەر کەسێك دەستی لە زەکەریدا، با دەستنوێژ بگرێتەوە، هەر ژنێکیش دەستی لە عەورەتی خۆی دا با دەستنوێژ بکرێتەوە..

**٢ . هەر کەسێك دەستی بەر عەورەتی کەسێکی تر کەوت:** لەسەر ڕای ئیمام مالیك و، ئیمام شافیعی، دەستنوێژەکەی دەشکێت[3]، لە مەزهەبی شافیعیدا دەستنوێژی دەشکێت، مادام لەپی دەستی لە زەکەری خۆی، یان زەکەری کەسێکی تر، منداڵ بێت، یان گەورە، زیندو بێت، یان مردو، ئەنقەست، یان بە هەر لە خۆوە بەری کەوتبێت، تەنانەت، ئەگەر

---

[1] ئیمامی شافیعی: المسند(٩٠)، بەیهیقی(١٣٣/١) حاکمیش بە سەحیحی داناوە (١٣٨/١).

[2] ئەحمەد (٢٢٣/٢)، بەیهیقی (١٣٢/١)، فەرمودەکەش کەمال ئەبو السەید لە صحیح فقه السنة (١٣٥/١) دا دەڵێ: صحیح لغیره..

[3] حطاب: مواهب الجلیل (٣٩٦/١)، ئیمامی شافیعی: الام (٢٠/١).

بە زەکەرێکی بڕراویش بێت..[1]. ئەمە دیارە، کە سەختیەکی بێ بەڵگەیە. سەختە، چونکە ئافرەت ڕۆژانە لە گۆڕینی پۆشاك و پەڕۆو حەففازەی منداڵدا، دوچاری ئەمە دەبێتەوە، سەختیەکیشە، کە هیچ بەڵگەیەکی تایبەتی لەسەر نیە.. ئەوەش ئاشکرایە، کە ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەری نازدار، صلى الله عليه وسلم، کە کۆچی دوایی کرد، ئافرەتان شوشتیان، حەتمەن دەستیشیان بەر عەورەتی کەوتوە..

چ بەڵگەیەکمان لەبەر دەستدایە، کە بسەلمێنێت دەستدان لە عەورەتی مردو، کە پێوەی مابێت، چ جای ئەوەی لێکرابێتەوە!! دەستنوێژی پێدەشکێت؟! ئەگەر هەر لەبەر ئەوە بێت، کە عەورەتە، خۆ شەرعناسان لە تەفسیلاتی ئەم باسەدا، جەختیان لە چێژ کردنی کردۆتەوە.. عەورەتی ساردو سڕی مردو، مایەی چێژ نیە، مەگەر لای نامۆیان.. ئەوەش نابێتە ڕێسا.. جا، ئەگەر وا بێت، لە زەکەری سەناعیش، دەبێت بشکێت!! هیچ شەرعناسێکیش ئەمەی نەگوتوە..

پێم وایە دەستدان لە عەورەتی منداڵ و مردو، دەستنوێژ ناشکێنێت، مەگەر بۆ چێژو لەزەت، بەڵام دەستدان لە عەورەتی خۆو، عەورەتی کەسێکی باڵغی زیندو، دەستنوێژ دەشکێنێت.. والله اعلم.

**٣ . دەستدان لە عەورەت بە ئەنقەست و بەرکەوتنی یەك حوکمی هەیە**[2]: ئەمەش ڕای ئیمام ئەوزاعی و، شافیعی و، ئیسحاق و، ئەحمەدە.. هەندێك شەرعناسی تری، وەکو مەکحول و، جابری کوڕی زەیدو، سەعیدی کوڕی جوبەیر، دەڵێن: ئەگەر بە ئەنقەست دەستی لێدا

---

[1] ابو اسحاق الشيرازي: المهذب (٩١/١).

[2] ابن حزم: المحلى (٢٤١/١)، ابن المنذر: الاوسط (٢٠٥/١).

دەشــکێت، مەزهــەبی ئیبنــو حــەزمیش ئاوایــە، چــونکە خــوای گــەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ﴾ الاحزاب / ٥ واتە: لەوەی بە هەڵە دەیکەن گوناحبـار نـابن، بـەڵکو لـەوەدا، کە ئیرادەو ویستی دڵتانی لەگەڵدایە.. ئیبنول مونزیر لـە ڕەددیانـدا دەڵێ: ئـەو کەسـەی، کـە دەسـتدانی لـە عـەورەت خسـتۆتە ڕیـزی هۆکارەکـانی دەستنوێژ شکانەوە، دەبو ئەنقەست و هەڵەی وەکو یـەك حسـێب کردایـە، وەکو هۆکارەکانی تر.. کەسێك بە ئەنقەست، یان بە هەڵە بای لێ بێتـەوە، دەســتنوێژەکەی دەشــکێت، ئــیتر بۆچــی جیــاوازی خراوەتــە نێــوان بــە ئەنقەست و، بە هەڵە دەستدان لە عەورەتەوە ؟! خۆ حوکمی شـەرعی، کـە لەسەر مەرج و ڕوکنەکان دادەمەزرێت، لەسەر  هەردووکیان، وەکو یەکـە.. بە هەڵەداچون گوناهباری لا دەبات، نەك حوکمە شەرعیەکە..

٤ . دەسـتدان لـە عـەورەت بەسـەر پۆشـاکەوە دەسـتنوێژ ناشکێنێت: چونکە پێی ناوترێت دەست لێدان.. فەرمودەکەی لای ئـەبو هورەیرەش، خوا لێی ڕازی بێت، ئەوە زیاتر رون دەکاتەوە، کە پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم فەرمویـەتی: (إِذَا أَفْضَى أَحَدُكُمْ بِيَدِهِ إِلَى ذَكَرِهِ لَيسَ بَيْنَهَا شَئٌ فَلْيَتَوَضَّأ)[١] واتە: هـەر کەسـێکتان دەسـتی لـە زەکەریـدا، کـە هیچ بەربەستێکیان لە نێواندا نەبێت، با دەستنوێژەکەی بگرێتەوە..

٥ . دەستدان لە دەرچەی کۆم دەستنوێژ ناشکێنێت: لەبـەر ئـەوەی بـە دەرچـەی کـۆم ناوترێـت عـەورەت، هـیچ بەڵگەیەکیشی لەسـەر

---

[١] دارەقوتنی (١٤٧/١)، بەیهیقی (١٣٣/١) شێخی ئەلبانیش لە (سلسلة الاحاديث الصحيحة (١٢٣٥) دا هێناویێتیەوە.

نەهاتوەو، قیاس کردنیشی لەسەر زەکەر ناشێت، چونکە خاڵی هاوبەشی لێکچواندنیان لە نێواندا نیە.. ئەگەر بوترێت: بەڵام شوێنی پیساییە، ئەوە نابێتە بەڵگە، چونکە دەستدان لە خودی پیسایی، دەستنوێژ ناشکێنێت، تا دەرچەکەی بیشکێنێت.. ئەمەش ڕای ئیمام مالیك و، سەوری و، شوێنکەوتوانی مەدرەسەی ڕەئیە، کە پێچەوانەی ڕای ئیمام شافیعیە[١].. کەوابو دەستدان لە سمت و نێوانیان و، دەرچەی کۆم و، بەرو، ئەملاولای عەورەتی ئافرەت دەستنوێژ ناشکێنێت.. والله اعلم.

## خواردنی گۆشتی حوشتر دەستنوێژ دەشکێنێت:

ڕەنگە لە بەر ئەوەی حوشتر لە ناو کوردا نیە، بە لامانەوە شتێکی سەیر بێت، کە خواردنی گۆشتی حوشتر، بە کاڵی و، بە کوڵاوی و، بە برژاوی، دەستنوێژ دەشکێنێت.. بەڵام ئەمە حوکمی شەرعیە.. چونکە جابری کوڕی سەمورە دەگێڕێتەوە، کە کابرایەك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا کرد، صلى الله عليه وسلم: ئەرێ دەستنوێژ لە خواردنی گۆشتی مەڕ بگرینەوە ؟! فەرموی: (إنْ شِئتَ توَضَّأ، وَإنْ شِئتَ فلا تتوَضَّأ) واتە: ئەگەر حەز دەکەیت بیگرەوە، ئەگەر حەزیش ناکەیت مەیگرەوە.. ئینجا پرسی: ئەدی دەستنوێژ لە گۆشتی حوشتر بگرینەوە ؟! فەرموی: (نعَمْ، توَضَّأ مِنْ لُحُومِ الإبلِ)[٢] واتە: بەڵێ، دەستنوێژ لە گۆشتی حوشتر بگرەوە..

بەرائی کوڕی عازیب، خوا لێی ڕازی بێت گوتی: پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم فەرموی: (توَضَّأوَا مِنْ لُحُومِ الإبلِ وَلا توَضَّأوا مِنْ لُحُومِ

---

[١] ابن حزم: المحلى (٢٣٨/١)، ابن المنذر: الاوسط (٢١٢/١).
[٢] موسلیم (٣٦٠)، ئیبنو ماجە (٤٩٥).

الْغَنَمِ)[1] واتە دەستنوێژ لە گۆشتی حوشتر بگرنەوە، بەڵام دەستنوێژ لە گۆشتی مەڕ مەگرنەوە..

ئەمە مەزهەبی ئیمام ئەحمەدو، ئیسحاق و، ئەبو خەیسەمەو، ئیبنول مونزیرو، ئیبنو حەزمەو، قەولێکی ئیمام شافیعیشە، ئیمام ئیبنو تەیمییەش، ئەمەی پێ پەسەندتر بوە، ئەم فەرمودەیە، لە ئیبنو عومەرو، جابری کوڕی سەمورەوە، خوا لێیان ڕازی بێت گێڕراوەتەوە.. بەڵام جمهوری شەرعناسان، ئیمام ئەبو حەنیفەو، مالیك و، شافیعی و، سەوری و، کۆمەڵێك لە سەلەف گوتویانە، دەستنوێژ شتنەوەلە خواردنی گۆشتی حوشتر واجب نیە، بەڵکو شتێکی باشە[2]. چونکە فەرمودەیەکی تر لای سەیدنا جابر هەیە، خوا لێی ڕازی بێت، کە دەڵێ: ئاخرین هەڵوێستی پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم، لە گۆشت ئەوە بو، کە دەستنوێژ لەوە نەگیرێتەوە، کە ئاگری بەر کەوتوە[3].. ئەمەش دیارە، کە گۆشتی حوشتریش دەگرێتەوە..

وەڵامی ئەمە لە دوو خاڵدایە:

**یەکەم:** فەرمودەکەی لای جابر گشتیەو، ئەو فەرمودەیەی گۆشتی حوشتر باس دەکات، تایبەتە، بە پێی ڕێساکانی ئوسوڵی فیقە، گشتی

---

[1] ئەبو داود (١٨٤)، ترمزی (٨١)، ئیبنوماجە (٤٩٤)، کەمال ئیبنو السەید لە صحیح فقە السنة (١٣٧/١) دا دەڵێ: سەحیحە.

[2] السرخسي: الميسوط (٨٠/١)، حطاب: مواهب الجليل (٣٠٢/١)، المجموع (٥٧/١)، ابن قدامة: المغني (١٣٨/١)، ابن حزم: المحلى (٢٤١/١)، ابن المنذر: الاوسط (١٣٨/١)..

[3] ئەبو داود (١٩٢)، ترمزی ٠ ٨)، نەسائی (١٠٨/١)، کەمال ئەبو السەید لە صحیح فقە السنة (١٣٧/١) دا دەڵێ: سەحیحە .

لەگـەڵ تایبەتـدا دەسـازێنرێت، ئـەم دوو فەرموودەیـەش، توانـای پێکـەوە سازاندنیان هەیە، بۆیە حوکمی ناسخ و مەنسوخیش نایانگرێتەوە..

**دووەم:** ئەو فەرموودەیەی، کە باس لە گرتنـەوەی دەسـتنوێژ لـە گۆشـتی حوشـتر دەکات، فەرمانـەو هـەمو حاڵـەتێکی گۆشـتی حوشـتر دەگرێتـەوە، ئاگری بەرکەوتبێت، یان نا..

هەنـدێك لـە شەرعناسـان گوتویانـە: مەبەسـت لـەو دەسـتنوێژە لـەو فەرمودەدا، دەست شوشتنە نەك دەستنوێژ[1] ! ئەمـەش بۆچـونێکی سـەیرە. چونکە دەسـتنوێژ، لـە هـەمو فەرمودەیـەکی پێغەمبـەری خـوادا، صلی الله علیـە وسلم، کـە هـاتوە، هـەر بـە مانـای خـودی دەسـتنوێژ بـوە، کـەس لـە یاوەران وا لێی حاڵی نەبوە، کە دەست شوشتن بێت..

ئیمـام نـەوەوی دەڵـێ: لـە هـەمو بۆچـونێك بـەهێزتر ئەوەیـە، کـە گوتویـــەتی: دەســـتنوێژ لـــە گۆشـــتی حوشـــتر دەگیرێتـــەوە، هەرچـــەندە پێچەوانەی بۆچـونی جمهوری شەرعناسانیشـە، بۆیـە وا دەزانم دەسـتنوێژ گرتنەوە لە خواردنی گۆشتی حوشتر واجبە[2].. *

منـیش، ئـەم رایـەی ئیمـام نـەوەوی ڕەحمـەتیم پـێ پەسـەندترینە، چـونکە توێژینەوەیـەکی لـە هـەموان وردەکارانـەتری لەسـەر کـردوە.. ڕەحمەتی خوای لێ بێت..

---

[1] لە مجموعی فەتاوای ئیمامی ئیبنو تەیمیە (٢١/٢٦٠) دا هاتوە..

[2] النوي: شرح صحيح مسلم (١/٣٢٨).

* ئێمە وەکو لیژنەی نوسینگەی تەفسیر رامان لەگەڵ رای جمهوری شەرعناسان و کۆمـەڵێك لە سەلەفە، کـە گوتویانـە دەسـتنوێژ شوشـتنەوە لـە خـواردنی گۆشـتی حوشـتر واجـب نیـە، بەڵکو شتێکی باشە.

**دوو ڕونکردنـــەوە:** ئیمـام نـەووی دەڵـێ: لـە خولـەفای راشـیدینەوە، بەلگەیەك نەهاتوە، کە دەستنوێژیان لە گۆشتی حوشتر گرتبێتەوە[١]..

بەڵام ئیمام ئیبنو تەیمییە ڕەد لەمە دەداتەوەو دەڵێ: ئەو کەسەی، کە بڵـێ بەلگـە لـە خولـەفای راشـیدین و جمهـوری یـاوەرانی تـرەوە، لەسـەر دەستنوێژ گرتنەوە لە گۆشتی حوشتر نـەهاتوە، بـە هەڵەدا چوە، چونکە بەلگە لەسەر ئەوە زۆرە[٢]..

**چــیرۆکێکی نەســەلمێنراو:** زۆر جـار لـە کـۆڕی فـەقێ و مامۆسـتایاندا دەگێڕنەوە، کە جارێك پێغەمبەری خوا، تەشریفی هێناوەتە لای کۆمەڵێك لە یاوەرانی و، بۆنی با لێبونەوەی لێیانەوە کـردوە، شـەرمی کـردوە پێیـان بفەرموێت، کێتان بوە، با هەستێت و بچێت دەستنوێژ بشواتەوە، بۆیە، کە زانیوێتی هەمویان گۆشتی حوشتریان خواردوە، فەرمویـەتی: هـەر کەسـێك گۆشـتی حوشـتری خـواردوە، بـا بچـێت دەسـتنوێژ بگرێتـەوە.. ئـیتر کۆمـەڵێکیان هەسـتاون و چـون دەسـتنوێژیان گرتۆتـەوە. شـێخی ئـەلبانی، ڕەحمەتی خوا لێ بێـت دەڵـێ: ئەمـە زەعیفـە، شـێخ مەشـهور حەسـەنیش، دەڵێ: ئەسڵ و ئەساسی نیە[٣] ..

★ ★ ★

---

[١] النوي: شرح صحيح مسلم (٣٢٨/١).

[٢] ابن تيمية: القواعد النورانية (ل ٩) له تمام المنة (١٠٥).

[٣] سلسلة الاحاديث الضعيفة (١١٣٢)، مشهور حسن: قصص لا تثبت (ل ١٠٥).

## لەوانەی دەستنوێژ ناشکێنن

هەندێك مەسەلە هەن لە باسی دەستنوێژدا، کە راجوێییان لەسەرە، کە ئایا دەستنوێژیان لێ دەشکێت، یان نا؟ بەڵام دوای توێژینەوە دەردەکەوێت، کە دەستنوێژیان لێ ناشکێت، لەوانە:

### یەکەم: ژن و پیاو دەستنوێژیان لە یەکتری ناشکێت:

شەرعناسان لە مەسەلەی دەستنوێژی ژن و پیاودا، سێ پۆلن:

**یەکەم: هەر پیاوێك دەستی بە روتی بەر خێزانی کەوت، جگە لە ددان و موی، دەستنوێژەکەی دەشکێت..** ئەمە ڕای ئیمام شافیعیەو، ئیمام ئیبنو حەزمیش لایەنگرێتی.. لە سەرچاوەشدا دەگەڕێتەوە بۆ ئیبنو مەسعود و، ئیبنو عومەر، خوا لێیان ڕازی بێت[1]..

**دووەم: دەستنوێژ لە هاوسەر ناشکێت:** ئەمەش مەزهەبی ئیمام ئەبو حەنیفەو، محمەدی کوڕی حەسەنی شەیبانیەو، لە سەرچاوەشیدا دەگەڕێتەوە سەر طاوس و، حەسەنی بەسری و، عەتاء و، ئیبنو عەبباس، شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمییەش، ئەمەی بە پەسەندتر داناوە[2]..

**سێیەم: دەست لێدان بە چێژەوە دەستنوێژ دەشکێنێت:**

ئەمەش مەزهەبی ئیمام مالیك و، ڕای بەناوبانگی ئەحمەدە[3].. بەڵام وەکو وتمان، پێوەرێکی گونجاو بۆ زانینی چێژ نیە، دەرکردنی حوکمێکی ئاواش، ڕەنگە زۆر کەس بخاتە سەر وەسوەسەیەك، کە پێویست نیە..

---

[1] ئیمامی شافیعی: الام (١٥/١)، النوي: المجموع (٣٢/٢)، ابن حزم: المحلى (٢٤٤/١).

[2] السرخسي: المبسوط / (٦٨/١)، البدائع (٣٠/١)، ابن المنذر: الاوسط (١٣٦/١)، ابن تيمية: مجموع الفتاوى (٤١٠/٢١).

[3] الامام مالك: المدونة (١٣/١)، ابن عرفة الدسوقي: حاشية الدسوقي (١١٩/١)، ابن قدامة: المغني (١٩٢/١)، البهوتي: كشاف القناع (١٤٥/١).

# توێژینەوەیەك
## لەسەر حوکمی دەستنوێژ دوای دەست بەرکەوتنی ژن و پیاو

ئەوەی شەرعناسانی بەڕێزی لەم مەسەلەیەدا راجویٚ کردوە:

یەکەم ئایەتەکەی سورەتی مائیدەیە ﴿أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ المائدە / ٦.

دووەم: ریوایاتی فەرمودەکانن. کە دەبیٚ زیاتر رونیان کەینەوە:

**١ . ئایەتەکەی مائیدە:** ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ وَٱمْسَحُواْ بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِۚ وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَٱطَّهَّرُواْۚ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُواْ مَآءً فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم مِّنْهُۚ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ المائدە/٦ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، ئەگەر بۆ نوێژ هەستان، با دەموچاو دەستان، تا ئانیشك شوشتبێت و، مەسحی سەرتان کردبێت و، پێیەکانیشتان، تا قولەپیٚ شتبێت، ئەگەر لەش گران بون (لە جەنابەتدا بون)، دەبیٚ خۆتان بە شوشتنی لەشتان پاك کەنەوە، ئەگەر نەخۆش بون، یان لە سەفەردا بون، یان لە دەستبەئاو گەیاندن هاتنەوە، یان بەر ئافرەت کەوتبون و، ئاوتان دەس نەکەوت، بە شتی پاکی سەر ڕوی زەوی (گلٚ، یان لم، یان بەرد) تەیمموم بکەن، مەسحی دەموچاو دەستانی پیٚ بکەن، خوای گەورە نایەوێت، هیچ سەختیی و گریٚ و گۆلٚییەکتان، لە دینداریدا

بهێنێتە ڕێ، بەڵکو دەیەوێت پاکتان کاتەوەو، نیعمەتەکانی خۆی بەسەرتاندا تەواوکات، تا ئێوەش سوپاسگوزاریی بکەن..

ئەو شەرعناسە بەڕێزانەی گوتویانە، دەستنوێژ لە بەرکەوتنی ژن و پیاودا دەشکێت، ڕاوبۆچوونییان لەو ئایەتەوە وەرگرتوە، کە دەفەرموێ: ﴿أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءً﴾ واتە: بەر ئافرەت کەوتبون و ئاوتان دەس نەکەوت.. ئیبنو مەسعودو، ئیبنو عومەر خوا لێیان ڕازی بێت، گوتویانە: (انَّ الْمَسَّ مَا دونَ الجمَاع) واتە: بەرکەوتن هەمو شتێکە، جگە لە کاری سەرجێیی (جیماع)[1]. بەڵام ئیبنو عەبباس، بە پێچەوانەوە گوتویەتی: (الْمَسُّ واللَّمْسُ والْمُبَاشَرَةُ: الجماع، ولكِنَّ اللهَ يُكَنِي مَا يَشاءُ بمَا شَاءَ)[2] واتە: ئەو وشانە هەمویان، بە مانای کاری سەرجێیی ژن و پیاون.. بەڵام ئیتر خوای گەورە، مەیلی خۆیەتی، چ زاراوەیەك بەکار دەهێنێت..

ئیبنو عوسێمینی ڕەحمەتی دەڵێ[3]: تەفسیری ئیبنو عەبباس باشترە وەربگیرێت، چونکە حیبری ئەم ئوممەتەیەو، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دوعای بۆ کردوە، کە لە دین تێی گەیێنێت و، فێری لێکدانەوەی قورئانی بکات[4].. بەڵام هەر دەبێ موناقەشەی بەڵگەی ئەوانی تریش بکرێت.

---

[1] تفسير الطبري (٥٠٢/١) کەمال ئیبنو السەید لە صحيح فقه السنة (١٣٩/١) دا دەڵێ: سەنەدەکەی سەحیحە.

[2] الطبري (٩٥٨١)، ابن ابي شيبة (١٦٦/١).

[3] لە الشرح الممتع (١٨٦/١) چاپی دار ابن المدینی جەزائیر، هەروەها ابن المنذر: الاوسط (١٢٨/١).

[4] أحمد (٢٦٦/١، ٣١٤، ٣٢٨)، الطبراني لە الكبير (١٠٥٨٧)، الحاكم (٥٣٤/٣).

کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِ﴾ المائدە/٦ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، ئەگەر بۆ نوێژ هەستان، با دەموچاو دەستان، تا ئانیشك شوشتبێت و، مەسحی سەرتان کردبێت و پێیەکانیشتان، تا قولەپێ شوشتبێت، ئەمە هەموی باسی دەستنوێژە بە ئاو، پاشان دەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُمۡ جُنُبٗا فَٱطَّهَّرُواْ﴾ واتە: ئەگەر لەش گران بون (لە جەنابەتدا بون)، دەبێ خۆتان بە شوشتنی، لەشتان پاك کەنەوە، ئەمەش باسی جەنابەت (لەش پیسیی)ە. ئەمەش باسی غوسڵ دەرکردنە بە ئاو.. پاشان دەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُم مَّرۡضَىٰٓ أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوۡ جَآءَ أَحَدٞ مِّنكُم مِّنَ ٱلۡغَآئِطِ أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ﴾ واتە: ئەگەر نەخۆش بون، یان لە سەفەردا بون، یان لە دەستبەئاو گەیاندن هاتنەوە، یان بەر ئافرەت کەوتبون و، ئاوتان دەس نەکەوت، بە شتی پاکی سەر ڕوی زەوی (گڵ، یان لم، یان بەرد) تەیمموم بکەن.. ئەمەش حوکمی تەیەممومە، کە بەدیلی ئاوەکەیە، بەڵام باس لە دوو حاڵەت دەکات: یەکەمیان: ﴿جَآءَ أَحَدٞ مِّنكُم مِّنَ ٱلۡغَآئِطِ﴾، کە باسی هۆکاری نەبونی دەستنوێژە، دووەمیان: ﴿لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ کە باسی هۆکاری جەنابەتە..

ئەگەر هەردوو هۆکارەکە بکەین بە یەك و، بڵێین: هەردوو لەفزەکە بە مانای دەست بەرکەوتنن، واتە دوو هۆکاری دەستنوێژ شکان باس بکات و، هۆکاری جەنابەت باس نەکات، لە کاتێکدا دەشفەرموێ: (وَإِن كُنتُمۡ جُنُبٗا فَٱطَّهَّرُواْ) واتە: ئەگەر لەش گران بون (لە جەنابەتدا بون)، دەبێ

خۆتان بە شوشتنی لەشتان پاك کەنەوە.. ئەم شێوازە لاوازەی تەعبیر، پێچەوانەی شێوازی ڕەوانبێژیی قورئانە.. بەڵام ئەگەر وەکو زۆرینەی موفەسسیران وتمان: ﴿لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾، مانای کاری جوت بون و سەرجێییە، ماناکان بە ڕەوانبێژییە بەهێزەکەوە، دەخەینەوە ڕوو. واتە هەردوو هۆکاری پاك بونەوە، لە بێ دەستنوێژیی و، لە لەش گرانی بە ئاو، ئەگەر نەبو، بە تەیەمموم، کە هەردووکیانی پێ دەکرێت..

## ٢ . فەرمودەکان:

ـ عائیشەخان خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: (فَقَدْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَاتَ لَيْلَةٍ فِي فِرَاشِي، فَلَمْ أُصِبْهُ، فَالْتَمَسْتُهُ، فَوَقَعَتْ يَدِي عَلَى أَخْمَصِ قَدَمِهِ وَهُوَ سَاجِدٌ، يَقُولُ: أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ وَأَعُوذُ بِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْكَ)[١] واتە: شەوێکیان پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم لەسەر جێگاکە لە لاوە نەما، دەستم گێڕا، تا دەستم بەر بنی پێی کەوت، کە لە سوجدەدا بو، ڕاستی کردبونەوەو، دەپاڕایەوەو دەیفەرمو: خوایە پەنا دەگرم بە ڕەزامەندیت لە توڕەبونت، پەنا دەگرم بە لێبوردەییت لە سزات، پەنا دەگرم بە خۆت لە خۆت.

ئەمە ئەوە دەسەلمێنێت، کە عائیشەخان، خوا لێی ڕازی بێت دەیزانی، کە دەستنوێژ بە دەست لێدانی پێستی ڕوتی پێغەمبەری خوا، صلى الله

---

[١] موسلیم (٢٢٢)، ئەبو داود (٨٦٥)، ترمزی (٣٨١٩). ئیبنو ئەبو شەیبە ریوایاتی تری دەهێنێت، وەکو (فَقَدْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَاتَ لَيْلَةٍ مِنَ الْفِرَاشِ فَالْتَمَسْتُهُ ، فَوَقَعَتْ يَدِي عَلَى بَطْنِ قَدَمَيْهِ وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ وَهُمَا مَنْصُوبَتَانِ وَهُوَ يَقُولُ: إِنِّي أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ ، وَبِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْكَ ، لَا أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ ، أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ) دەرهەق سەنەدەکەی دەڵێ: (إسناده متصل، رجاله ثقات، على شرط الإمام مسلم، رجاله رجال الإمام البخاري) ابن ابي شيبة: المصنف (ژماره ٢٨٥٦٤)..

علیه وسلم، کە مێردێتی دەستنوێژی هیچیان ناشکێنێت، ئەگەر ئەویش ئەم حوکمەی نەزانیایە (کە شتێکی دورە) خۆ پێغەمبەری نازدار، صلی الله علیه وسلم خۆی نوێژەکەی بەتاڵ دەکردەوەو، هەڵوێستەکەشی بۆ ڕاست دەکردەوە..

ـ هەر عائیشەخان خوا لێی ڕازی بێت، دەگێڕێتەوەو دەڵێ: (كُنْتُ أَنَامُ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَرِجْلَايَ فِي قِبْلَتِهِ إِذَا سَجَدَ غَمَزَنِي، فَقَبَضْتُ رِجْلَيَّ. فَإِذَا قَامَ بَسَطْتُهُمَا. وَالْبُيُوتُ يَوْمَئِذٍ لَيْسَ فِيهَا مَصَابِيحُ )[1]واتە: لەبەر دەستی پێغەمبەری خوادا، صلی الله علیه وسلم ڕاکشابوم و، قاچم ئاڕاستەی جێ سوجدەی کردبو، کە چوە سوجدە دەستێکی لێدام، قاچم کۆکردەوە، کە هەستایەوە قاچم ڕاکێشایەوە، ئەو سەردەمە چرا لە ماڵاندا نەبو .. لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێ: (فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يُوتِرَ مَسَّنِي بِرِجْلِهِ ) [2] کە ویستی وترەکەی بکات، پێیەکی گەیاندمێ.. واتە: پێی پیرۆزی دەنا بە قاچیدا..

ـ عائیشەخان، خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، کە: (كَانَ يُقَبِّلُ بَعْضَ أَزْوَاجِهِ وَهُوَ صَائِمٌ) واتە: پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم، لەو کاتەی، کە بەڕۆژو بوەو، دەستنوێژی هەبوە، ماچی کردوە. ڕیوایەتی تری لای عوروەی خوشکەزای دەڵێ: (كَانَ يُقَبِّلُ بَعْضَ أَزْوَاجِهِ وَهُوَ صَائِمٌ، ثُمَّ ضَحِكَتْ ) لە ڕیوایەتی تریدا گوتویەتی: (أَهْوَى إِلَيَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِيُقَبِّلَنِي، فَقُلْتُ: إِنِّي صَائِمَةٌ. فَقَالَ: وَأَنَا صَائِمٌ، فَقَبَّلَنِي) واتە: پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم داهاتەوە ماچم کات، وتم: بەڕۆژوم،

---

[1] بوخاری (٣٨٢)، موسلیم (٢٧٢)..
[2] بوخاری (٣٨٢)، موسلیم (٥١٢).

فەرموی: منیش بەڕۆژوم، ئیتر ماچی كردم.. لە ڕیوایەتی تردا ئاماژە بەوە دەكات، كە ماچ كردن نە دەستنوێژ دەشكێنێت و، نە ڕۆژوش بەتاڵ دەكاتەوە، چونكە وەكو ئاو لە دەم رادان وایە، بۆ ڕۆژووەوان (قَوْلُهُ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِلسَّائِلِ عَنْهَا: أَرَأَيْتَ لَوْ تَمَضْمَضْتَ)[١] چۆن ئەویان دەسپێكی ئاو خواردنەوەو ڕۆژو شكاندن، یان بەتاڵ بونەوەیە، ئەمیشیان دەسپێكی دەسبازیی و سەرجێییە، بەڵام كاریگەریی ماچ كردنەكە، نە لەسەر ڕۆژوەكە هەیە، نە لەسەر دەستنوێژەكە..

ـ ئەو هەمو یاوەر بەڕێزە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا، صلى الله علیه وسلم بون، شەو ڕۆژ هۆگری بون، هەمو ڕەفتارێكی تایبەتی ناو ماڵەكانیشیان نەقڵ كردوە، یەكێكیان جارێك شتێكی وای لێ نەگێڕاوەتەوە، كە دەستنوێژی بە هۆی دەستدانی، لە یەكێك لە خێزانە بەڕێزەكانی گرتبێتەوە.. یان یاوەران و شوێن كەوتوانیان، بە درێژایی مێژو، ڕۆژانە دەستیان بەر دەستی خێزانەكانیان كەوتوە، بەڵام لە كەسیانەوە نەبیسترا، یان نەگێڕرایەوە، كە دەستنوێژیان لە دەستدان لە خێزانەكانیان گرتبێتەوە..

پێم وایە دەستنوێژ لە بەر كەوتنی ژن و پیاو ناشكێت.. نە ژن و مێرد، نە غەیرە، نە لە كاتی دان و وەرگرتندا، نە لە سەوداو مامەڵەو بازاڕدا، نە لە ناو پاس و شەمەندەفەرو شتی وادا..

---

[١] ئیمامی ئیبنو حەجەر توێژینەوەی لەسەر هەمو سەنەدەكان كردوەو بە سەحیحی داناون، بۆ بەدواداچونیان بڕۆرە فتح الباري / كتاب الصوم (١٩٠/٤ ژمارە١٨٢٧).

### دووەم: خوێن بەربون لە غەیری شوێنی ئاسایی، دەستنوێژ ناشکێنێت:

لە برینەوە بێت، یان بە هۆی کەڵەشاخ گرتن و، شتی واوە بێت، کەم بێت، یان زۆر دەستنوێژ ناشکێنێت، ئەمەش مەزهەبی ئیمام ئەحمەدو، شافیعیە، ئیمام ئەبو حەنیفە دەڵێ: ئەگەر خوێنەکە زۆر بو، دەستنوێژ دەشکێنێت.. بەڵام بۆچونی یەکەم بەهێزترە، چونکە:

١ ـ ئەو فەرمودانەی، فەرمانیان بە گرتنەوەی دەستنوێژ، لە خوێن لێ ڕۆیشتن کردوە، زەعیفن و، نابنە بەڵگەی فەرز بونی خواپەرستی.

٢ ـ ئەسڵ ئەوەیە، کە کابرای دەستنوێژەوان دڵنیایە، کە پاکەو دەستنوێژی هەیە، ئەوی ئەم حوکمەی دەگۆڕێت، دەبێت پشت ئەستور بێت بە ئایەتێك، یان فەرمودەیەکی سەحیح، یان کۆڕای یاوەران..

٣ ـ کە سەیدنا عومەری کوڕی خەتتاب، خوا لێی ڕازی بێت، لە ئیمامەتی نوێژی بەیانیدا بریندار کرا، هەر لەسەر نوێژەکەی بەردەوام بو، برینەکەشی خوێنی لێ دەتکا[1]. ئەگەر خوێن لەبەرڕۆیشتن، دەستنوێژی بشکاندایە، نە سەیدنا عومەر، نە یاوەرانی تر بێ ئاگا نەدەبون..

٤ ـ ڕیوایاتی تر زۆر زۆرە، لەسەر نوێژی موجاهیدانی ڕێی خواویستی، هەر لە یاوەران و تابعینەوە، بۆ نەوەکانی ئەم ئوممەتە، کە بریندار دەبون، خوێنیان لێ دەچۆڕاو، پۆشاکیان خوێناوی دەبو، لەگەڵ ئەوەشدا هەر نوێژیان پێوە دەکرد، هیچ کەسێکیش لە یاوەران و تابعین، بەڵگەیەکی وایان نەقڵ نەکردوە، کە یەکێکیان نوێژی کردبێت و بڕیبێتی، لەبەر ئەوەی بریندار بوە، یان خۆی بە دەستنوێژ شکاو زانیبێت، لەبەر

---

[1] الشوکاني: السیل الجرار (٩٩/١).

خوێن لەبەر ڕۆیشتنی.. بۆیە حەسەنی بەسری، ڕەحمەتی خوای لێ بێت، دەیگوت: موسوڵمانان هەر بە خوێنی لەشیانەوە، نوێژیان کردوە[١].

٥ ـ فەرمودەکەی لای سەیدنا جابری کوڕی عبدالله، خوا لێیان ڕازی بێت، کە باس لە غەزای زاتولرریقاع دەکات، بەڵگەیەکی بەهێزە بۆ دەستنوێژ نەشکان، لە خوێن لەبەر ڕۆیشتن.. کە تێیدا گوتی: کابرایەك لە موهاجیرانی مەککە و، کابرایەك لە پشتیوانانی مەدینە) پاسەوان بون، کابرای موهاجیر ڕاکشاو خەوت، ئەنساریەکەش، کەوتە نوێژ کردن، لەو کاتەی ئەم بە پێوە بو، کابرایەکی نەیار تیرێکی پێوە نا، تیرەی تێ هەڵچەقی، بەڵام ئەم دەری هێنایەوە (نوێژەکەی نەبڕی)، کابرای نەیار تیری دووەمی پێوە نا، ئینجا تیری سێیەمی پێوە نا، ئەنساریەکە سێیەمیانی لە لەشی خۆی بۆ دەرنەهاتەوەو، ناچار چوە ڕکوع، پاشان سوجدەی بردو، هاوڕێ موهاجیرەکەی لێ ئاگادار کردەوە! کابرای نەیاریش، کە زانی دەیگرن هەڵات.. کە کابرای موهاجیر ئەنساریەکەی ئاوا بە خوێنەوە بینی، وتی: سوبحانەالله، بۆچی لە یەکەمین تیر خەبەرت نەکردمەوە ؟! کابرای ئەنساری وتی: ئاخر سورەتێکی قورئانم دەخوێند، پێم خۆش نەبو پێش تەواو کردنی بیبڕم[٢]..

---

[١] بوخاری لە موعەللەقاتی سەحیحەکەیدا هێناویەتیەوە (١/٢٨٠)، ئیمامی ئیبنو حەجەر لە فەتح الباری (١/٢٨١) دا گوتویەتی کە ئیبنو ئەبی شەیبە، سەنەدەکەی گەیاندۆتەوە. واتە: سەنەدی، تا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم پەیوەستە..

[٢] ئەحمەد (٣/٣٤٣)، ئیبنو حیببان (١٠٩)، الحاكم (١/٥٦!)، دارەقوتنی (١/٢٢٣) ئەسڵەکەی موعەللەق لای بوخارییەو، ئەلبانی دەڵێ: سەحیحە، صحيح أبي داود (١٩٣)

## سێیەم: ڕشانەوە دەستنوێژ ناشکێنێت:

بۆچونی شەرعناسان، لە حوکمی ڕشانەوەدا، وەکو بۆچونیانە لە حوکمی خوێندا، لەمیشدا وەکو ئەو ڕاجوێن و، هەمان دوو پۆلە شەرعناس بەرامبەرن، ئیمام ئەبو حەنیفەو، سەوری و، ئەوزاعی و، ئیسحاق و، ئیبنو سیرین و، ئیبنوئەبی لەیلاو، زوفەر، کە سەرچاوەی بۆچونیان دەبەنەوە سەر، سەیدنا عومەرو، سەیدنا عەلی دەڵێن: ڕشانەوە دەستنوێژ دەشکێنێت، بەڵگەیان ئەوەیە، کە پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم (قَاءَ فَأفْطَرَ فَتوَضَأ)[1] واتە: ڕشایەوە، هەم ڕۆژووەکەی شکاند، هەم دەستنوێژی گرتەوە..

ئیمام مالیك و، ئیمام شافیعی، ئیمام ئەحمەدو، پێش ئەوانیش حەوت شەرعناسەکە[2]، هەموویان بۆچونیان دەبەنەوە سەر ئیبنو عومەرو، ئیبنوعەبباس و، تاوس و، عەتاء و، مەکحول و، ڕەبیعەو، ئەبوسەورو، داود.. دەڵێن: ڕشانەوە دەستنوێژ ناشکێنێت. بەغەوی دەڵێ: ئەوە بۆچونی زۆرینەی یاوەران و تابعینە[3].. ئەو پۆلە شەرعناسە دەڵێن: ئەو ڕەفتارەی پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم لەو جارەدا، کە کردوێتی جگە

---

[1] ترمزی (٨٧)، ئەبو داود (٢٣٨١)، ئەحمەد (٤/٤٤٩)، الطبراني لە الکبیر (١٤٤٠)، شێخی ئەلبانیش لە ارواو الغلیل (١١١) دا بە سەحیحی داناوە..

[2] هەروا بە(حەوت شەرعناسەکە) بەناوبانگن، کە بریتین لە: سەعیدی کوڕی موسەییب و، قاسمی کوڕی محمدی کوڕی ئەبو بەکری سددیق و، عوروەی کوڕی زوبەیری کوڕی عەوام و، خاریجەی کوڕی زەیدو، سولەیمانی کوڕی یەسارو، عوبەیدواللەی کوڕی عوتبەو، ئەبوبەکری کوڕی عبدالرحمان..کە شیعریان پێدا هەڵداون و وتراوە:

إذا قيل مَنْ في العِلمِ سَبْعَةُ أبْحُرٍ .... رِوايَتهم فِي العِلم لَيسَتْ خَارِجَة ؟!

فَقُلْ هُم: عُبيدُاللهِ، عُرْوَة، قَاسِم.... سعيد، أبوبكر، سليمان، خارِجة

[3] پەراوێزی المهذب (١/٩١)

لەوەی، کە قسە لەسەر سەحیحیی و زەعیفیی هەیە، فەرمانی نە بەرۆژو گرتنەوە، نە بە دەستنوێژ گرتنەوەی تێدا نیە.. بەڵکو بۆ ئەوەیە تا بزانرێت: ئەوە جائیزە..

ئەوەش هەیە، کە پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم لە کاتی بەڕۆژو بونیدا، کەڵەشاخی گرتوە، نە رۆژوەکەی پێ شکاندوە، نە دەستنوێژ[1] واتە خوێنی لەبەر رۆیشتوە.

پێم وایە، کە ڕشانەوە دەستنوێژ ناشکێنێت.. والله اعلم.

## چوارەم: قاقای پێکەنین لە نوێژو دەرەوەی نوێژدا دەستنوێژ ناشکێنێت:

کۆڕا (ئیجماع)ی شەرعناسان لەسەر ئەوەیە، کە قاقای پێکەنین لە غەیری نوێژدا، دەستنوێژ ناشکێنێت، بەڵام بۆچونیان لەسەر قاقای پێکەنین لە ناو نوێژدا جیاوازە.. ئیمام ئەبو حەنیفەو، مەدرەسەی رەئی و، سەوری و، حەسەنی بەسری و، نەخەعی دەڵێن: قاقای پێکەنین لە نوێژدا، دەستنوێژ دەشکێنێت، بەلگەیان فەرمودەیەکی زەعیفە، کە ناسەلمێنرێت، ئەویش فەرمودەکەی لای ئەبول عالیەیە، کە دەڵێ: لەو کاتەی پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم، لە مزگەوت بە ئیمامەت نوێژی دەکرد، کابرایەکی کوێر دەهاتە خزمەتی، بەڵام کەوتە چاڵێکەوە، هەندێك لە نوێژەکەدا پێکەنین، کە پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم لە نوێژ بوەوە، فەرموی: هەر کەسێك پێکەنیوە، با دەستنوێژەکەی بگرێتەوە[2]..

---

[1] الدارقطني (١/١٥٧)، البيهقي (١/١٤١). نەوەوی بە زەعیفی داناوە (المجموع ٢/٦٣)

[2] دارەقوتنی (١/١٦٢)، ئیبنو عەدی (٢/٧١٦) کەمال ئەبو السەید لە صحيح فقه السنة (١/١٤٢) دەڵێ: إسناده ضعيف جدا..

ئیمام مالیك و، شافیعی و، ئەحمەد و، ئیسحاق و، ئەبو سەور دەڵێن: پێکەنین لە ناو نوێژو، لە دەرەوەی نوێژدا، دەستنوێژ بەتاڵ ناکاتەوە[١]..

لـــە جیـــاتی ئەوفـــەرمودە زەعیفـــەی بەرامبـــەرەکانیش، ئـــەمان فەرمودەیەکی تری مـەوقوف[٢] دەهێننـەوە، کـە بـە مانایـەکی پێچەوانەیە، ئەویش فەرمودەکەی لای جابرە.. پرسـیاری پێکـەنینی نـاو نوێـژیان، لـە جابری کوڕی عبدالله کرد، خوا لێی ڕازی بێـت، گـوتی: دەبێـت نوێژەکـەی بکاتەوە، بەڵام دەستنوێژ ناگرێتـەوە[٣]؟! بۆیـە پـێم وایـە، قاقـای پێکـەنینی نـاو نوێـژ، نوێژەکـە بـەتاڵ دەکاتـەوە، بـەڵام دەسـتنوێژ ناشـکێنێت.. والله اعلم.

## پێنجەم: شوشتن و هەڵگرتنی مردو دەستنوێژ ناشکێنێت:

هەر کەسێك مردویەکی شوشت، یان دەستی لێدا، یان هەڵیگرت، دەستنوێژی ناشکێت.. بەڵام هەندێك لە شەرعناسان پێیان وا یەچاکتر بوە، کە هەر کەسێك مردویەکی شوشت، غوسڵ دەرکات، ئەوی هەڵیشی دەگرێت دەستنوێژی هەبێت.. بەڵگەشیان فەرمودەیەکە، کە ئەبو هورەیرە، خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم فەرموی: (مَنْ غَسَلَ مَيِّتاً فَلْيَغْتَسِلْ وَمَنْ حَمَلَهُ فَلْيَتَوَضَأْ)[٤] واتە:

---

[١] المجموع(٢/٦١)، ابن عبدالبر: الكافي(١/١٥١)، المغني(١/١١٧)، ابن المنذر: الاوسط(١/٢٢٧).

[٢] فەرمودەی مەوقوف، کە هەندێك لە فەرمودەوانان پێی دەڵێن: (الاثر) کردارێکە، یان گوفتارێکە، کە لە یاوەرێك دەگێڕرێتەوە، بێ ئەوەی بوترێت، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وای فەرمو، یان وای کرد.. بڕوانە: السیوطي: تدریب الراوي (ل ١٦٦) چاپی دارالفکری لوبنان ٢٠٠٠ ز .

[٣] بوخاری لە موعەللەقاتەکانی سەحیحەکەیدا هێناویەتیەوەو، بەیهیقی سەنەدەکەی گەیاندۆتەوە (١/١٤٤)، هەروەها تەبەرانی (١/١٧٢٠)..

[٤] ئەبو داود (٣١٦٢)، ترمزی (٩٩٣)، ئبنو ماجە (١٤٦٣)، ئەحمەد ٢/٤٣٣).

هەر کەسێك مردوی شوشت، با غوسڵ دەرکات، هەر کەسێك مردوی هەڵگرت با دەستنوێژ بشوات..

خەتیبی بەغدادی، رحمە اللە دەگێڕێتەوەو، ئیبنو حەجەری عەسقەلانی بە سەحیحی دەسەلمێنێت، کە ئیبنو عومەر خوا، لێیان ڕازی بێت گوتی: ئێمە، کە مردومان دەشوت، هەمانبو غوسڵی دەردەکرد، هەشمان بو دەری نەدەکرد..

شەرەفولحەق محمد ئەشرەف، کە شەرحی عون المعبودی، لەسەر سنن ابي داودی کردوە دەڵێ: خەتتابی گوتویەتی: وا نازانم هیچ یەکێك لە شەرعناسان، غوسڵی بە واجب زانیبێت، لەسەر کەسێك، کە مردوی شتبێت..

پێم وایە غوسڵ دەرکردن لە مردو شوشتن، سوننەتە، ئەمما دەستنوێژ گرتن لە هەڵگرتنی مردو هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە.. واللە اعلم..

### شەشەم: گومانی دەستنوێژەوان لە شکانی دەستنوێژی:

هەر کەسێك دەستنوێژی تەواوی گرتبو، پاشان کەوتە سەر گومانی، ئەوەی کە ئایا دەستنوێژی شکاوە، یان نا، با وا حسێب کات، کە

---

ترمزی و ئەلبانی بە حەسەنیان داناوە، بڕوانە: الارواو: ١٧٤/١). دارەقوتنی و ئبنو ئەبی حاتەم گوتویانە، ئەمە فەرمودەیەکی نەسەلمێنراوە، ئیمامی نەوەویش رەددی لەوە داوەتەوە، کە ترمزی بە حەسەنی زانیوە، فەرمودەوانان زۆر لەسەر ئەم فەرمودەیە دواون و، ئەو بۆچونەیان لاواز کردۆتەوە، کە زەعیف بێت، ئیمامی ئیبنو حەجەری عەسقەلانی دەڵێت: کەمترین ئاستی ئەوەیە، کە حەسەن بێت.. ئیمامی ئیبنو تەیمییە لە شرحی (العمدة) دا دەڵێ (إسناده على شرط مسلم) شەوکانی لە الدراري المضيئةدا زۆر بە دورودرێژی سەنەدی سەحیحی ئەم فەرمودەی سەلماندوە، تەنانەت ماوەردی، کە هەر شافیعی مەزهەبە دەڵێ: هەندێك فەرمودەوان لە رێی سەدو بیست سەنەدەوە، ئەم فەرمودەیان سەلماندوە.. کەوابو سەنەدی فەرمودەکە جێی گومان نیە.

دەستنوێژی نەشکاوە، چونکە ئەو لە هەبونی دەستنوێژی دڵنیابوە، گومانی لە شکاندنی بۆ پەیدا بوە.. کەوابو ئەسڵەکە دەمێنێتەوە، کە هەبونی دەستنوێژەکەیە، تا بۆی دەسەلمێت، کە دەستنوێژی نەماوە.. لە نوێژیشدا هەر وا دەکات، ئەگەر لە نوێژدا کەوتە سەر گومانی ئەوەی، کە ڕەنگە دەستنوێژی نەما بێت، نوێژەکە نابڕێت، تا لە دڵی خۆیدا ئەوە یەکلا دەکاتەوە، کە ئایا لەوە دڵنیایە، کە دەستنوێژەکەی شکاوە ؟!

عبداللەی کوڕی زەید گوتویەتی: باسی کابرایەك بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کرا، کە لە ناو نوێژەکەدا گومانی بۆ دروست دەبێت، کە ئایا دەستنوێژەکەی شکاوە، یان نا، گوتی: (شُكِيَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الرَّجُلُ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ وَهُوَ فِي الصَّلَاةِ أَنَّهُ يَجِدُ الشَّيْءَ، قَالَ: لَا يَنْصَرِفُ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتًا أَوْ يَجِدَ رِيحًا )[1] واتە: نوێژەکەی نەبڕێت، تا گوێی لە دەنگێك دەبێت، یان هەست بە بایەك دەکات. (لێی بێتە دەرەوە)..

بەغەوی دەڵێ: مەبەست لەوەیە، کە گوێی لە دەنگی با لێبونەوەی خۆی ببێت، یان هەستی پێ بکات، چونکە ئەمە مەرجە بۆ دەستنوێژ شکانەکەی[2]..

**دەستنوێژ هەر بۆ نوێژ کردن فەرزە:** بەڵگەنەویستە، کە کەس بۆی نیە بێ دەستنوێژ، نوێژ بکات، جا نوێژی فەرز بێت، یان سوننەت..

---

[1] متفق علیه: بوخاری (٤٣،٥٢/١ ٥/٣)، موسلیم (٢٧٦/١ ژمارە (٣٦١) ، ئەحمەد (٣٩/٤، ٤٠)، ئەبوداود (١٢٢/١ ژمارە (١٧٦) ، نەسائی ٩٩/١ ژمارە (١٦٠)، ئیبنوماجە ١٧١/١ ژمارە (٥١٣)، عبدالرزاق (١٤٠/١ ژمارە (٥٣٤) ، ئیبنو خوزەیمە (١٧/١، ١٠٨/٢ ژمارە (٢٥، ١٠١٨)، ئەبوعەوانە (٢٣٨/١، ٢٦٧)، بەیهیقی (١١٤/١، ١٦١، ٢٥٤/٢، ٣٦٤/٧.. ئەمەش لەفزی بوخارییە (١٣٧).

[2] البغوي: شرح السنة: ٣٥٣/١).

چونکە گیرا نابێت.. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ وَٱمْسَحُواْ بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِ﴾ المائدة/٦ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، ئەگەر بۆ نوێژ هەستان، با دەموچاو دەستان، تا ئانیشك شوشتبێت و، مەسحی سەرتان کردبێت و، پێیەکانیشتان، تا قولەپێ شوشتبێت..

ـ ئیبنو عومەر، خوا لێیان ڕازی بێت، دەڵێ: گوێم لێبو پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم دەیفەرمو: (لا يَقْبَلُ اللهُ صَلاةً بغَيرِ طُهُورٍ)[١] واتە: خوای گەورە، نوێژ لە هیچتان بە بێ دەستنوێژ، قبوڵ ناکات..

## ئەو حاڵەتانەی باشترە دەستنوێژت هەبێت

١ ـ **کاتی زیکر کردنی خوای گەورە:** هەمو جۆرە زیکرەکان، لە وێردو سەڵاوات و، خوێندنی قورئان و، تەواوفی کەعبەو، خواپەرستی تر.. چونکە موهاجیری کوڕی قونفوز، خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، کە سڵاوی لە پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم کردوە، لەو کاتەدا، کە دەستنوێژی دەشت، وەڵامی نەدابۆوە، تا دەستنوێژەکەی گرتبو، ئەوسا وەڵامی دابۆوە، پاشان پێی فەرموە: (إنّهُ لَمْ يَمْنَعْنِي أنْ أرُدَّ عَلَيكَ إلَّا أنّي كَرِهْتُ أنْ أذْكُرَ اللهَ إلَّا عَلَى الطَّهَارَةِ)[٢] واتە ئەوەی ڕێی لێ گرتم، کە وەڵامت

---

[١] موسلیم (١/١٦٠ ژمارە ٢٢٤).

[٢] ئەبو داود (١٧)، نەسائی (١/١٦)، ئیبنوماجە (٣٥٠)، داریمی (٢/٢٨٧)، ئەحمەد (٥/٨٠)سەحیحەو لە سلسلة الاحاديث الصحيحة (٤٨٣)ی شێخی ئەلبانیدایە.

بدەمەوە، نەبونی دەستنوێژ بو، چونكە حەزم نەكرد، زیكری خوا بكەم و، دەشنوێژم نەبێت[١]..

ئەمە مانای ئەوە نیە، كە دەستنوێژ بۆ وەڵامدانەوەی سڵاو، یان زیكری تر فەرز بێت، چونكە فەرمودەیەكی تری، لای عائیشەخان هەیە خوا لێی ڕازی بێت، كە دەڵێ: (عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَذْكُرُ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى كُلِّ أَحْيَانِهِ )[٢] واتە: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، زیكری خوای لە هەمو حاڵەتەكانیدا دەكرد..

**٢ . كاتی خەوتن:** سەیدنا بەڕائی كوڕی عازیب، خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، كە پێغەمبەری خوا فەرموی: (إِذَا أَتَيْتَ مَضْجَعَكَ فَتَوَضَّأْ وُضُوءَكَ لِلصَّلَاةِ ثُمَّ اضْطَجِعْ عَلَى شِقِّكَ الْأَيْمَنِ ثُمَّ قُلْ اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْلَمْتُ نَفْسِي إِلَيْكَ)[٣] واتە: پێش ئەوەی بچیتە سەر پێخەفەكەت، دەستنوێژی تەواوت وەكو بۆ نوێژ بێت، بگرە، ئینجا لەسەر لاتەنیشتی ڕاستت ڕاكشێ و بڵێ: خوایە، وا خۆم تەسلیم بە تۆ كرد..

**٣ . لەشگران ئەگەر ویستی بخوات، یان بخواتەوە، یان دیسان سەرجێیی بكاتەوە:** عائیشەخان خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: (عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَنَامَ وَهُوَ جُنُبٌ تَوَضَّأَ وُضُوءَهُ لِلصَّلَاةِ)[٤] واتە: پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم، كە لەشی گران بوایەو، بیویستایە بخەوێت، دەستنوێژی دەگرت، هەر وەكو،

---

[١] چونكە وەڵامدانەوەی سڵاویش، زیكری خوایە.

[٢] موسلیم (٤/٦٨) ئەبو داود (١٨).

[٣] متفق علیه: بوخاری (٢٤٧)، موسلیم (٢٧١٠).

[٤] بوخاری (٢٨٨)، موسلیم (٣٠٥) ئەبو داود (٢٢٢)، ترمزی (١١٨)، نەسائی (١/١٣٨)..

كە بۆ نوێژ دەیگرت.

هەروەها ئەبو سەعیدی خودری، خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، كە پێغەمبەری خوا، صلى الله علیه وسلم دەیفەرموو: (إِذَا أَتَى أَحَدُكُمْ أَهْلَهُ ثُمَّ أَرَادَ أَنْ يَعُودَ فَلْيَتَوَضَّأْ)[١] واتە: ئەگەر كەسێكتان ویستی، دیسانەوە بۆ سەرجێیی بچێتەوە لای خێزانی، با دەستنوێژ بگرێت..

٤ . **پێش غوسڵ دەركردن:** عائیشەخان، خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە: (عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا اغْتَسَلَ مِنَ الْجَنَابَةِ يَبْدَأُ فَيَغْسِلُ يَدَيْهِ ثُمَّ يَتَوَضَّأُ كَمَا يَتَوَضَّأُ لِلصَّلَاةِ )[٢] واتە: كە پێغەمبەری خوا، صلى الله علیه وسلم، غوسڵی لەشگرانی خۆی دەربكردایە، هەردوو دەستی دەشوشت، ئینجا بە دەستی ڕاستی ئاوی دەكرد بەسەر دەستی چەپیدا، پاشان دەستنوێژی دەگرت وەكو، كە دەستنوێژ بۆ نوێژ بگرێت..

٥ . **پێش خواردنی گۆشتی برژاو و كوڵاو:** لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا، صلى الله علیه وسلم، فەرمویەتی: (تَوَضَّأُوامِمَّا مَسَّتِ النَّارُ)[٣] واتە: دەستنوێژ بگرنەوە لە هەرچیەك، كە ئاگری بەركەوتبێت.. ئەم فەرمانە لێرەدا سوننەتە، نەك فەرز، سوننەتەكەش نەسخ بۆتەوە.. چونكە فەرمودەی تر هەیە، كە عەمری كوڕی ئومەییەی زەمری، خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، دەڵێ: (أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَحْتَزُّ

---

[١] موسلیم (٢١٧/٣)، ئەبوداود (٢١٧)، ترمزی (١٤١)، نەسائی (٤٢/١) كەمال ئەبو السید لە صحیح فقه السنة (١٤٧/١) دا دەڵێ: سەحیحە..

[٢] بوخاری (٢٤٨)، موسلیم (٣١٦).

[٣] موسلیم (٣٥١)، ئەبوداود (١٩٢)، ترمزی (٧٩)، نەسائی (١٠٥/١)، ئیبنوماجە (٤٨٥).

مِنْ كَتِفِ شَاةٍ فِي يَدِهِ فَدُعِيَ إِلَى الصَّلَاةِ فَأَلْقَاهَا وَالسِّكِّينَ الَّتِي يَحْتَزُّ بِهَا ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ )[١]واتە: پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بینی، کە لە گۆشتی لاشانی بەرخێکی دەخوارد، پاشان، کە بانگ درا، چەقۆکەی داناو، هەستا بۆ نوێژ، بێ ئەوەی دەستنوێژ بشواتەوە..

ئیمام نەوەوی، ڕەحمەتی خوای لێ بێت، دەڵێ[٢]: ڕای شەرعناسان لەم مەسەلەدا دوو جۆرە:

**ـ ئەوانـەی گوتویانـە دەسـتنوێژ لـە خـواردنی گۆشـتێك کـە ئاگری بەرکەوتبێت ناگیرێتەوە:** ئیمامان: ئەبو حەنیفـەو، مالیـك و، شـافیعی و، ئەحمـەدو، ئیسـحاق و، ئـەبو سـەورو، یـەحیای کـوڕی یـەحیاو، ئەبو خەیسەمەن، ڕای ئەمانیش، دەگەڕێتەوە بۆ زۆرینـەی یـاوەران، وەکو ئەبوبەکری سددیق و، عومەری کوڕی خەتتاب و، عوسمانی کوڕی عـەففان و، عـەلی کـوڕی ئـەبو تالیـب و، ئـەبوددەرداء و، ئیبنوعـەبباس و، ئیبنـو عومـەرو، ئیبنـو مەسـعودو، ئەنەسـی کـوڕی مالیـك و، جـابری کـوڕی سـەمورەو، زەیـدی کـوڕی سـابیت و، ئـەبو موسـای ئەشـعەری و، ئـەبوهورەیرەو، ئوبـەی کـوڕی کـەعب و، ئـەبو تەلحـەو، ئەبوئومامـەو، عائیشەخان، خوا لێیان ڕازی بێت..

**. ئەوانەی گوتویانە دەبێت دەستنوێژی لێ بگیرێتەوە:** وەکو عومەری کوڕی عبدالعەزیزو، حەسەنی بەسری و، زوهری و، ئەبو قەللابەو، ئەبوموجلیزن.. پاشان ئیمام نەوەوی دەڵێ: موسلیم سەرەتا ئەو فەرمودانەی هێناونەوە، کە دەستنوێژ لە خواردنی گۆشتی کوڵاو فەرز

---

[١] بوخاری (٥٠/١)، شرح موسلیم (٤٥/٤)، ئیبنوماجە (٤٩٠).
[٢] النوي: شرح صحيح مسلم (٣٥/٢).

دەکەن، پاشان ئەو فەرمودانەی، کە باس لە دەستنوێژ گرتنەوە لێی ناکەن، چونکە ئەوە عادەتی فەرمودەوانانە، کە سەرەتا ئەو فەرمودانە دێننەوە، کە نەسخ بونەتەوەو، حوکمیان نەماوە، ئینجا ئەو فەرمودانە دێننەوە، کە ئەوانەی پێشویان نەسخ کردۆتەوە..

پاشان دەڵێ: بەڵگەکان ئەوە دەسەلمێنن، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، لە سەرەتادا دەستنوێژی دەگرتەوە، بەڵام ڕای شەرعناسان لەسەر ئەوە کۆیە، کە دواتر دەستنوێژی لە خواردنی گۆشتێك نەگرتۆتەوە، کە ئاگری بەر کەوتبێت.. ئەمەش ڕای پەسەندترە، والله اعلم.

**٦ . بۆ هەمو نوێژێك:** دەستنوێژ گرتنەوە بۆ هەمو نوێژێك، سوننەتە. بورەیدە خوا لێی ڕازی بێت، دەڵێ: (عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ ، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَتَوَضَّأُ لِكُلِّ صَلَاةٍ، فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ فَتْحِ مَكَّةَ صَلَّى الصَّلَوَاتِ كُلَّهَا بِوَضُوءٍ وَاحِدٍ)[1] واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بۆ هەمو نوێژێك دەستنوێژی دەگرتەوە، بەڵام ئەو ڕۆژەی فەتحی مەککە کرا، هەمو نوێژەکانی ئەو ڕۆژەی هەریەك دەستنوێژە کرد.

**٧ . دوای هەمو جۆرە دەستنوێژ شکانێك:** لەبەر ئەو فەرمودەیەی، کە پێغەمبەری خوا بە بیلالی حەبەشی فەرمو: ( يَا بِلَالُ حَدِّثْنِي بِأَرْجَى عَمَلٍ عَمِلْتَه فِي الْإِسْلَامِ، فَإِنِّي سَمِعْتُ دَفَّ نَعْلَيْكَ بَيْنَ يَدَيَّ فِي الْجَنَّةِ، قَالَ: مَا عَمِلْتُ عَمَلًا أَرْجَى عِنْدِي أَنِّي لَمْ أَتَطَهَّرْ طُهُورًا فِي سَاعَةٍ مِنْ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ إِلَّا صَلَّيْتُ بِذَلِكَ الطُّهُورِ مَا كُتِبَ لِي أَنْ أُصَلِّيَ )[2] واتە: ئەری

---

[1] موسلیم (٢٧٧)، ئەبو داود (١٧١)، ترمزی (٦١)، نەسائی (١/٨٩) ئیبنوماجە (٥١٠).
[2] بوخاری (١١٤٩)، موسلیم (٢٤٥٨).

بیلال، چ کردارێکت هەیە، کە لە هەمو کارەکانتدا، ئومێدی زیاترت بەو هەیە، چونکە لە بەهەشتدا، لە پێش خۆمەوە، گوێم لە خشپەی نەعلەکانت بو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، کارێکی وام نیە ئەوەندەی ئومێدی پێوە ببەستمەوە، مەگەر ئەوەی، کە هەمو جارێك شەو بێت، یان ڕۆژ، کە دەستنوێژ دەشۆم، پاشان چەندم بۆ نوسرا بێت، نوێژی پێوە دەکەم..

لە ریوایەتێکی تریدا دەڵێ: کە فەرموی: (بِمَ سَبَقْتَنِي إِلَيها)؟ بەچی وا پێشم کەوتبویت؟ گوتی: هەر کاتێك بانگی دابێت، دوو ڕکات نوێژم کردوە، هەر کاتێك دەستنوێژم شکا بێت، یەکسەر گرتومەتەوە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، فەرموی: (لِهَذَا)[1]: دەی وا دیارە بەم کارەتە.

**٨ . دوای ڕشانەوە:** لەبەر ئەو فەرمودەیەیە، کە مەعدانی کوڕی ئەبو تەڵحە، لە سەیدنا ئەبو دەردائی دەگێڕێتەوە، خوا لێی ڕازی بێت: (أنَّ النَّبيَّ صلى الله عليه وسلمَ قاءَ فَأفْطرَ فتوَضَّأ)[2] واتە: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، کە ڕشایەوە، ڕۆژوەکەشی شکاندو، دەستنوێژیشی گرتەوە.. مەعدان دەڵێ: لە مزگەوتی دیمەشق، سەوەبانم بینی خوا لێی ڕازی بێت، فەرمودەکەم بۆ باس کرد، گوتی: ڕاست دەکات منیش ئاوم بە دەستدا کرد[3]..

---

[1] ترمزی (٣٦٨٩)، ئەبوداود (٣٠٥٥)، ئەحمەد (٢١٩٦٢) ئەسڵەکەشی لە سەحیحەیندایە و، کەمال ئەبو السید لە صحیح فقه السنة (١٤٧/١) دا دەڵێ: سەحیحە.

[2] ئەبو داود (٢٣٨١) و ترمزی (٨٧) و ئەحمەد (٤٤٣/٦) و فەرموداەوانی تریش.
کەمال ئیبنو السەید سالم لە صحیح فقه السنة (٨١/١) دا دەڵێ: سەحیحە.

[3] ترمزی (٨٧)، ئەبو داود (٢٣٨١) کەمال ئەبو السید لە صحیح فقه السنة (١٤٨/١) دا دەڵێ: سەحیحە..

# توێژینەوەیەك لەسەر
# دەستنوێژ بۆ تەوافی کەعبەدا

بەڵگەیەکی دروست لەبەر دەستدا نیە، کە تەواڤی کەعبە دەستنوێژی بوێت، نە وەکو فەرز، نەوەکو سوننەت.. دیارە ئەگەر حوکمێك لەسەر گرتنی هەبوایە، لە پێغەمبەری خواوە، صلى الله عليه وسلم، یان لە یاوەرانی بەڕێزو تابعینەوە، ڕیوایەت دەکرا، چونکە تەواڤی کەعبە، کارێك نەبووەو، یەکجار کرابێت، یان کۆمەڵێك یاوەر، ئەنجامیان دابێت و بەس.. بەڵکو لەو زەمانەوە، هەزاران یاوەرو تابیعی و، ملیۆنەها شەرعناس تەوافیان کردوە، ئەگەر بەڵگەیەك لەسەر دەستنوێژ گرتن، بۆ تەواڤی کەعبە هەبوایە، حەتمەن دەیانخستە بەر باس و لێکۆڵینەوە.. بە تایبەتی، کە ئیحتیمالی دەستنوێژ شکان، لە جێ و کاتی تەوافدا زۆرە، تەواف بە تایبەتی لە کاتی تەواڤی هاتن وئیفازەدا، ماوەیەکی وای دەوێت، کە هەندێ کەس لەوانەیە پێویستی بە دەستنوێژ گرتنەوە هەبێت تێیدا..

لەبەر هەبونی ئەو فەرمودەیەی، کە ئیبنو عەبباس خوا لێیان ڕازی بێت، بە مەوقوڤ و مەرفوعی گێڕاوێتیەوە، کە دەڵێ : (الطَّوَافُ بِالْبَيْتِ صَلَاةٌ، إِلَّا أَنَّ اللَّهَ أَبَاحَ فِيهِ الْكَلَامَ )[١] واتە: تەواف کردن بە دەوری کەعبەدا نوێژە، بەڵام ئەوەندە هەیە، کە خوای گەورە ڕێی قسەکردنی تێدا داوە..

---

[١] یەکێکە لەو فەرمودانەی موناقەشەیەکی زۆری لەسەرە.. ترمزی و نەسائی و الحاکم گێڕاویانەتەوەو گوتویانە: زەعیفە، شێخی عەدەوی لە جامع أحكام النساء (٢/٥١٥)دا گوتویەتی: مەوقوفە، شێخی ئەلبانی لە ارواء الغليل(١/١٥٦) گوتویەتی: مەرفوعە.

مەرفوع: ئەو گوفتار، یان ڕەفتار، یان سیفەت، یان بڕیارەیە، کە خراوەتە پاڵ پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم.. مەرفوع: ئەو گوفتار، یان ڕەفتار، یان سیفەت، یان بڕیارەیە، کە

هەندێك لە شەرعناسان گوتویانە: مادام تەواف نوێژ بێت، کەوابو دەستنوێژ بۆ گرتنی فەرزە.. بەڵام ئەمە لە دوو لاوە ڕەت کراوەتەوە:

یەکەم: فەرمودەکە زەعیفەو، بە مەرفوعیش جەدەلی لەسەرە.. واش پێدەچێت ئەوانە پێکابێتیان، کە گوتویانە: ئەوە قەولی ئیبنو عەبباس خوا لێیان ڕازی بێت خۆیەتی، ئەمەشە ئەنجامی توێژینەوەی ترمزی و، بەیهیقی و، ئیبنو تەیمیەو، ئیبنو حەجەرو، هەندێك فەرمودەوانی تر..

دووەم: گریمان فەرمودەکە سەحیح بو، هەر ئەوە ناگەێنێت، کە لە هەمو ڕویەکەوە، تەوافی کەعبە وەکو نوێژە، کە بە تەحریم (تەکبیری دەسپێکی نوێژ) دەست پێ دەکات و، بە تەسلیم (سەلام دانەوە) کۆتایی دێت، تا ئەوانەی مەرجی نوێژن، بکرێنە مەرجی تەوافەکە[١]..

ئیمام ئیبنو تەیمییە دەڵێ: وا دیارە دەستنوێژ بۆ تەوافی کەعبە، نە فەرزەو، نە سوننەت، هەرچەندە باشتر وایە دەستنوێژی هەبێت[٢].. ئەمە ڕای ئیبنو حەزمیشە، ڕەحمەتی خوای لێ بێت[٣]..

<u>من ئەو بۆچونەم پێ پەسەندترە، کە دەستنوێژ بۆ تەوافی کەعبە مەرج نیە.. والله اعلم.</u>

---

خراوەتە پاڵ یەکێك لە یاوەرانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم.. بڕوانە: محمود الطحان: تيسير مصطلح الحديث ل ١٢٨ ـ ١٣١.

[١] ئیبنوتەیمییە: مجموع الفتاوى (٨٩/٢٦)، جامع أحكام النساء (٥٢٢/٢) کە ١١ خاڵی جیاوازی نێوان نوێژو تەوافیان دەرخستوە.

[٢] ئیمامی ئیبنو تەیمییە، ڕەحمەتی خوای لێ بێت، موناقەشەی تەواوی ئەم مەسەلەی، لە مجموع الفتاوى (٨٩/٢٦) دا کردوە، ئینجا گەیشتۆتە ئەو بۆچونەی..

[٣] المحلى (١٧٩/٧).

# توێژینەوەیەك لەسەر
# دەستنوێژ بۆ قورئان خوێندن

ئیمام مالیك و، شافیعی و، ئەحمەد وزۆرینەی شەرعناسان دەڵێن: ئەوی دەستنوێژی نیە نابێت، دەست لە قورئان بدات[١]..

بەڵگەشیان دوو شتە:

١ـ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ ﴾ الواقعه/٧٩ واتە: تەنها ئەو کەسانە دەستی لێدەدەن، کە پاکن..

٢ـ فەرمودەکەی لای عەمری کوڕی حەزم دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نامەیەکی بۆ خەڵکی یەمەن نوسی، تێیدا هاتبو: (لا يَمَسُّ الْقُرْآنَ إلا طَاهِرٌ)[٢] واتە: تەنها کەسی پاك، دەست لە قورئان دەدات.

بەڵام بەرامبەرەکانیان، کە ئیمام ئەبو حەنیفەو، ئیبنو حەزم و، ئیبنولقەییم و، کۆمەڵێکی زۆری شەرعناسان، وەڵامی هەردوو بەڵگەکەیان داوەتەوەو، گوتویانە:

**یەکەم: ئایەتەکە ناکرێتە بەڵگەی هەبونی دەستنوێژ یان لەش پاکی** بۆ دەست لە قورئاندان و، هەڵگرتنی، چ جای خوێندنی! چونکە لەوە دڵنیا نەبون، کە ئەو هائی ڕاناوەی (يَمَسُّهُ) دەگەڕێتەوە بۆ قورئان:

---

[١] المغني (١٤٧/١)، المجموع (١٧/١)، ابن المنذر: الاوسط (١٠/٨).

[٢] شێخی ئەلبانی ڕەحمەتی لە (الارواو ١٥٨/١) بە صحیح لغیره داناوە.

- ئەوەی زۆرینەی ئەهلی تەفسیری لەسەرە ئەوەیە، كە ئەو هائە لەوێدا، دەگەڕێتەوە بۆ (كِتَٰبٍ مَّكۡنُونٍ)، كە كتێبێكی نادیاری پارێزراوە، ئەوەش حەتمەن لە ئاسمانە، كە بریتیە لە لەوحە پارێزراوە، كە (اللَّوحُ المَحفوظ)ە، ئەو پاكانەش، كە دەستی لێدەدەن فریشتەن.. ئەوەش لە زاهیری ئایەتەكان دەفامرێتەوە: ﴿إِنَّهُۥ لَقُرۡءَانٞ كَرِيمٞ ٧٧ فِي كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ ٧٨ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ﴾ الواقعه/٧٧- ٧٩ واتە: ئەمە قورئانێكی (كتێبێكی خوێندنەوەی) پیرۆزە، لە نوسراوێكی پارێزراودایە، جگە لە پاكەكان، كەس دەستی لێ نادات..

- هەروەها: ﴿فِي صُحُفٖ مُّكَرَّمَةٖ ١٣ مَّرۡفُوعَةٖ مُّطَهَّرَةِۭ ١٤ بِأَيۡدِي سَفَرَةٖ ١٥ كِرَامِۭ بَرَرَةٖ﴾ عبس/١٣ - ١٦ واتە: ئەم ئایەتانەی بۆمان ناردویتە خوارەوە، هەموی لە لاپەڕە كتێبی پیرۆزدایە، بەرزو بڵندو پاكژن، وان لەبەر دەستی فریشتەی نوێنەرو، ڕاسپێرراوی خوادا، كە هەمو ڕێزدارو پیاوچاكن..

- خوای گەورە لە ئایەتی تردا جیاوازی خستۆتە نێوان پاكەكان - كە فریشتەن - و ئەوانەوە، كە خۆیان پاك دەكەنەوە - كە موسوڵمانانن - بۆیە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلۡمُتَطَهِّرِينَ﴾ البقرە/٢٢٢ واتە: خوای گەورە تۆبەكارانی خۆش دەوێت، هەروەها ئەوانەی، خۆ پاك دەكەنەوە.. كەوابو ئەوانەی، كە خۆیان پاكن فریشتەكانن و، ئەوانەی خۆیان پاك دەكەنەوە مرۆڤەكانن..

- ئایەتەكە هەواڵدانە، نەك فەرمان كردن، ئەگەر فەرمانی بە خۆ پاككردنەوە بدایە، بە جەزم دەیفەرمو (لا يمْسَسْهُ)، بەڵام ئێستا لەفزو

مانای هەواڵدان دەبەخشێت..

- سوێند خواردنی خوای گەورە بە کتێبێك، کە لەبەر دەستی خەڵکیدایە، ڕەوانبێژیی و گرنگیەکی زۆری تێدا نیە، چونکە ئەوەی بەردەستی خەڵکی، کە کتێبێکی نوسراوەیە، دەشێت زۆر پارێزراو نەبێت، بەڵام ئەوەی لە ئاسمانەو، لای فریشتەیە، حەتمەن سەلامەتترە..

لەوەڵامی ئەو بۆچونەشدا، کە دەڵێ هائی (يَمَسُّهُ) بۆ قورئانەکە دەگەڕێتەوە، شەرعناسان گوتویانە: وشەی (طاهِر) واتە: پاك، وشەیەکی هاوبەشی نێوان زۆر واتایە.. لە بەرامبەر کافردا، کە پێی دەوترێت: (نَجَس: واتە پیس)، بە موسوڵمان دەوترێت: (طاهِر)، لە بەرامبەر لەش گراندا، بە لەش پاك دەوترێت: (طاهِر)، لەبەرامبەر کەسی بێ دەستنوێژدا، بە دەستنوێژەوان دەوترێت: (طاهِر)، لەبەرامبەر کەسێکدا، کە پیسییەك بە پۆشاکیەوە بێت، بە کەسێکی تر، کە پۆشاکی پاکو خاوێنە، دەوترێت: (طاهِر).. لەبەر ئەمە ئوسوڵیەکان و، ئەهلی تەفسیرو، شەرعناسان لە لێکدانەوەو، تایبەت کردنی مانای ئەم وشەیەدا، ڕاجوێ بون: هەیانە بە گشتگیریی، واتاکانی لێکداوەتەوەو،گوتویەتی: لەبەر ئەوەی خوای گەورە لە قورئاندا، موشریکانی وا وەسف کردوە، کە پیسن: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ﴾ التوبە/٢٨، لە بەرامبەریشدا سەلمێنراوە، کە پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (إنَّ المؤمِنَ لا يَنْجُسُ)[١] واتە: موسوڵمان پیس نابێت.. کەوابو موسوڵمان پاکە، لە جەنابەتیشدا

---

[١] (رواه الجماعة: بوخاری (١/٧٩ و ٨٠)، موسلیم (١/٢٨٢ ژمارە ١١٥)، ئەبوداود (١/٥٢)، نەسائی (١/١٤٥)، ترمزی (١/٢٠٧ و ٢٠٨ ژمارە ١٣١)، ئیبنو ماجە (١ / ٧٨ ژمارە ٥٣٤)، ومسند أحمد (٢/ ٢٣٥) .

بێت، هەر پاکە، دەستنوێژی هەبێت، یان نەبێت، هەر پاکە ..

لە وەڵامی ئەمانیشدا شەرعناسانی جمهور، گوتویانە: ڕاستە وشەی (طاهِر) گشتگیرە، بەڵام لەو فەرمودەدا، کە موغیرەی کوڕی شوعبە، خوا لێیان ڕازی بێت، لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە، کە گوتی: لە سەفەرێکدا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا، صلی الله علیه وسلم بوم، کە دەستنوێژی گرت، ویستم خوففەکانی لە پێ دانێم، فەرموی: (دَعْهُمَا فإِنّي أدْخَلْتهُمَا طَاهِرَتيْنِ)[١] واتە: نا، لێیان گەڕێ، بە پاکی لەپێم کردون.. ئەمە بەڵگەیە لەسەر تایبەت کردنی مانای پاکێتیەکە، بە هەبونی دەستنوێژ.. هەروەها، کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُواْ﴾ المائدە/٦ واتە: ئەگەر لەشگران بون، خۆتان پاك بکەنەوە.. ئەمەش بەڵگەی تایبەت کردنێتی، بە پاك بونەوەیەك، کە بەرامبەرەکەی جەنابەتە..

شەرعناسانی بەرامبەر، دیسان گوتویانە: ئەگەر ئەم بەڵگەیەشتان قبوڵ بێت، دەبێت بوترێت، کە بەڵگەی لەش پاکییە لە جەنابەت، نەك بەڵگەی فەرزێتی دەستنوێژ..

ئیمام ئیبنولقەییم، دوای باسێکی وردەکارانەی ئایەتەکان، دەڵێ: سورەتە مەککیەکان، هەمو جەخت لەسەر تەوحیدو، پێغەمبەرێتی و، قیامەت و، کردگارێتی دەکەن و، بەرپەرچی کافران دەدەنەوە، ئەم ئایەتانەش، کە وەسفی بەرزی قورئان و، پاکی ئەوانە دەکەن، کە دەستی لێ دەدەن، حەتمەن ئەو مانایە زیاتر سەر دەخەن، کە مەبەست لەو پاکانە فریشتەکانن.. پاشان دەڵێ: هەر هاتنە خوارەوەی ئایەتەکە، کە لە

---

[١] متفق علیه: بوخاری (١/٤٠٩)، موسلیم (٢/١٧٠).

مەککەیە، زیاتر ئەوە دەچەسپێنێت، وەك لە حوكمی لقە باسێکی فقهی، کە دەستدانە لە قورئان[1].

**دووەم: فەرمودەکەی لای عەمری کوڕی حەزم خوا لێی ڕازی بێت زەعیفە،** ئەوەی، کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نامەیەکی بۆ خەڵکی یەمەن نوسی، تێیدا هاتبو: (لا يَمَسُ القُرآنَ إلا طَاهِرٌ)[2] واتە: تەنها کەسی پاك، دەست لە قورئان دەدات. وا دیارە ئەوەندە زەعیفە، ناکرێتە بەڵگەی فەرز کردنی خواپەرستی..

**توێژینەوەیەکی خێرای فەرمودەکە:**

- شێخی ئەلبانی ڕەحمەتی، لەدوای بە زەعیف دانانی سەنەدی ڕیوایەتەکانی ئەو فەرمودەیە، لە ارواء الغليل (١/١٥٨) دا گوتی: بە کۆی هەموان وەردەگیرێت[3] .
- ئیمام ئیبنو حەجەر، لە التلخيص الحبير(ل٤٨) دا دوای باسەکەی نەوەوی گوتویەتی: (وإِسْنَادُهُ لَا بَأسَ بِهِ، ذَكَرَ الْأَثرَمُ أَنَّ أَحْمَدَ احْتَجَّ بِهِ).
- ئیمام مالیك لە (المدونة ٩١/١)دا گوتویەتی: مورسەلە.[4]
- فەرمودەوانانی تر، گوتویانە: موسەحەففە[1].

---

[1] محمد أويس الندوي: تفسير ابن القيم / تحقيق محمد حامد الفقي ل ٤٨٢.

[2] شێخی ئەلبانی ڕەحمەتی لە (الارواء ١/١٥٨) بە صحيح لغيره داناوە..

[3] دەڵێ: وجملة القول: إن الحديث طرقه كلها لا تخلو من ضعف، ولكنه ضعف يسير إذ ليس في شيء منها من اتهم بكذب، وإنما العلة الإرسال أو سوء الحفظ، ومن المقرر في علم المصطلح أن الطرق يقوي بعضها بعضاً إذا لم يكن فيها متهم كما قرره النوي في تقريبه ثم السيوطي في شرحه، وعليه فالنفس تطمئن لصحة هذا الحديث، لاسيما وقد احتج به إمام السنة أحمد بن حنبل كما سبق، وصححه أيضاً صاحبه الإمام إسحق بن راهويه" (إرواء الغليل ١/١٦٠-١٦٢).

[4] مورسەل:جۆرێکی زەعیفە، ئەویش ئەوەیە، کە یاوەر لەئاڵقەی سەنەدەکەیدا نەماوە.

ـ ئیمام نەوەویش لە (المجموع ٢/٧٨) دا بە زەعیفی داناوە..

ـ ئیمام ئیبنو حەزم، ڕەحمەتی خوای لێ بێت، لە المحلى (٩٧/١) هیچ یەكێك لە سەنەدەكان، بە ساغی ناهێڵێتەوە، بۆیە دەڵێ: ئەمما دەستدان لە قورئان، هەرچی ئەو بەڵگانەی پشتیان پێ بەستراوە، كە گوایە، نابێت بێ دەستنوێژ دەستی لێ بدرێت، هیچیان نابنە بەڵگە، چونكە یان مورسەلن، یان موسەححەفن[1]، یان مەجهولن، یان زەعیف، لە غەیری ئێرەشدا ئەم بەدواداچونەمان كردوە..

ـ ئیمام بەیهیقی لە (الخلافیات)[2]دا دەڵێ، كە هەمو ڕیوایات و، سەنەدەكانی ئەو فەرمودەیە هیچ كامێكیان نیە، كە قسەی لەسەر نەكرابێت، یەك یەكی سەنەدەكان زەعیفن.. ئیتر باس لە یەك یەكیشیان دەكات..

كەوابو فەرمودەكە لای ئەم بەڕێزانە زەعیفەو، ناگاتە بەڵگەی حوكمی شەرعی، والله اعلم. بە تایبەتی، كە ئەوەندە گومان ڕو لە سەنەدەكەی دەكات، ڕێسای ئوسوڵیش دەڵێ: (والدَّليلُ إذا تطرَّقَ إليهِ الاحتمالُ، بَطَلَ به الاستدلالُ) واتە: هەر بەڵگەیەك، كە گومان ڕوی تێكرد، بۆ پشت پێبەستن ناشێت..

ڕای ئیمـام ئـەبو حەنیفـەو، داودو، ئیبنـو حـەزم ئەوەیـە، كـە پـاكێتی لەشیش، مەرج نیە بۆ دەستدان لە قورئان و، هەڵگرتنی چ جای خوێندنی، ئـەم بۆچـونەش دەبەنـەوە سـەر ئیبنـو عـەبباس، خـوا لێیـان ڕازی بێـت،

---

[1] موسەححەف: ئەوەیە، كە وشەیەكی تێدایە، یان سڕراوەتەوە، یان وشەیەكی تری ناسازی هاتۆتە جێ، كە لەگەڵ ڕیوایەتەكانی تردا، یەك ناگرنەوە (بڕوانە: محمود الطحان: تیسیر مصطلح الحديث ل ١١٤)

[2] البيهقي: الخلافيات / توێژینەوەی مەشهور حەسەن (٥١٧/١).

هەروەها سەر کۆمەڵێکی سەلەف، ئیبنولمونزیریش، ئەم ڕایەی گرتۆتە بەر.. هەروەها ئەمە ڕای ئەلبانی و، شەوکانی و، ئیبنو عوسێمینە، ڕەحمەتیان لێ بێت هەمو گوتویانە، کە دەستنوێژ مەرج نیە بۆ قورئان هەلگرتن و، دەست لێدان و خوێندنی[١]..

پێم و ایە ئەو ئایەتە پیرۆزە ﴿وَإِن كُنتُمۡ جُنُبًا فَٱطَّهَّرُواْ﴾ المائدە/٦ واتە: ئەگەر لەشگران بون خۆتان پاك کەنەوە، دەمانگەیێنێتە:

پوختەی حوکم بە لامەوە ئەوەیە، کە: لەش پاکیی، مەرجە بۆ دەستدان لە قورئان و هەلگرتنی، بەلام بۆ دەست لێدان و هەلگرتن و خوێندنی، دەستنوێژ مەرج نیە.. ئافرەتیش، کە لە حەیزدا بێت، یان زەیستان بێت، دەتوانێت قورئان بخوێنێت، بێ ئەوەی دەستی لێ بدات.. والله اعلم..

★ ★ ★

---

[١] البدائع (٣٣/١)، حاشية ابن عابدين (١٧/١) المحلى(٨١/١)، الاوسط (١٠٣/٢)، نيل الاوطار (٢٦٠/١)، الشرح الممتع على زاد /المستقنع (٢٦٦/١).

# باسی حەوتەم

# مەســـح كـــردن

- مەسحی سەر خوفف.
- مەسحی گۆرەوی و پێڵاو.
- مەسحی عەمامەو، سەرپۆش.
- مەسحی سەر گەچی شكاویی.

## باسی حەوتەم

## مەسحی سەر بەربەستەكان

### یەكەم: مەسحی سەر خوفف

**. پێناسەی خوفف:** گۆرەویەكی چەرمینە، تا قولەپێ دادەپۆشێت[1].

**. مەسح:** هێنانی دەستی تەڕە بەسەر شتێكدا.

**. مەسحی خوفف:** هێنانی دەستی تەڕە بەسەر شوێنی دیاری كراوی خوففدا، لە كاتی دیاری كراویدا، تا بكەوێتە بری دەستنوێژ[2]..

*** مەسحی خوفف جائیزە:**

ڕای شەرعناسان لەسەر ئەوە كۆیە، كە هەر كەسێك دەستنوێژەكەی بە ڕاست و دروستی گرت و، پاشان خوففی لە پێ كرد، دوای ئەوە، كە دەستنوێژەكەی دەشكێت، بۆی هەیە لە دەستنوێژ گرتنەوەیدا، لە جیاتی شوشتنی پێیەكانی مەسحی سەر خوففەكانی بكات[3].

عبداللەی كوڕی موبارەك دەڵێ: شەرعناسان لە حوكمی مەسحی خوففدا، ڕاجوێییان تێدا نیە..

---

[1] نيل الاوطار (٢٤١/١).

[2] الدر المختار (١٧٤/١).

[3] ابن المنذر: الاجماع (٢٠)، الاوسط (٤٣٤/١).

زیاتر لـە حـەفتا فـەرمودە لەسـەر مەسـحی خوفف هەیـە، هـەر ئیمـام ئەحمـەد دەڵـێ : چـل فـەرمودەم لەســەر خوفـف لەبــەرە، نــە مــەرفوعی تێدایە، نە مەوقوف [١]..

ـ لە فەرمودە بەناوبانگەکانی مەسح، فەرمودەکەی هوممامە، کە گوتی: جەریرم بینی خوا لێی ڕازی بێت، میزی کرد، پاشان دەستنوێژی گرتـەوە، خوففـەکانی مەسـح کـرد، پێیـان وت: وا دەکـەیت؟! فـەرموی: بـەڵێ ( إِنـّي رَأَيْت رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَالَ، ثُمَّ تَوَضَّأَ، وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْـهِ ) [٢] واتە: پێغەمبەری خوام صلی الله علیـه وسـلم بینیـوە، کـە میـزی کـردوەو، پاشــان دەســتنوێژی گرتۆتــەوەو، خوففــەکانی مەســح کــردوە.. ئەعمــەش دەڵێ: ئیبراهیم گوتی: شەرعناسان ئەم فەرمودەیان زۆر بەلاوە خـۆش بـو، چــونکە دوای هاتنــە خــوارەوەی ســورەتی مائیــدە بــو.. کــە ئــەحکامی دەستنوێژو تەیەمومی تێدایە..

*** حوکمی مەسحی خوفف:**

ڕای جمهوری شەرعناسان ئەوەیە، کـە مەسـحی خوفـف جـائیزە، بـەڵام شوشــتنی پێیــەکان باشــترە.. لای حەنبەلیــەکان مەســح کردنەکــە باشــترە، چونکە وەرگرتنی مۆڵەتی شەرعە [٣]..

ئیمام ئیبنو تەیمییە دەڵێ: کامیانی بۆ ئاسان بو، ئـەویان بکـات، ئـەوی پێـی ڕوتـە، نەچـێت بگـەڕێ بـە دوای خوففـدا، تـا مەسـحیان کـات، ئـەوی

---

[١] المغني (١ / ١٧٤).
[٢] بوخاری (٣٨٧)، موسلیم (١٥٦٨).
[٣] فتح القدير (١/١٢٦)، الشرح الصغير (١/٢٢٧)، المجموع (١/٥٠٢) منتهى الارادات (١/٢٣).

تــریش، کــە خــوففی لــە پێدایــە، لــە مــاوە دیــاری کراوەکــەی خۆیــدا، دایناکەنێت بۆ ئەوەی پێی بشوات[1]..

**ماوەی مەسح:**

ئەوی لە سەفەردایە، بۆی هەیە سێ شەو سێ ڕۆژ، خوففەکانی مەسح بکات، ئەوی نیشتەجێشە، بۆی هەیە شەوڕۆژێك مەسحیان کات.. ئەمەش بۆچونی جمهوری شەرعناسانی، مەزهەبی حەنەفی و، مالیکی و، قەولی نوێی شافیعی و، زاهیریەکانە[2]. بەلگەشیان ئەمانەیە:

١ ـ سەیدنا عەلی کوڕی ئەبو تالیب، خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: (جَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ وَلَيَالِيهِنَّ لِلْمُسَافِرِ وَيَوْمًا وَلَيْلَةً لِلْمُقِيمِ) [3] واتە: پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم، ڕێیداوە گەشتەوان (موسافیر)، سێ شەو سێ ڕۆژ، مەسحی سەر خوفف بکات، شەو ڕۆژێکیش بۆ ئەو کەسەی، کە نیشتەجێیە ..

٢ـ عەوف کوڕی مالیکی ئەشجەعی، خوا لێی ڕازی بێت گێڕایەوە، کە (أنَّ النَّبيَّ صَلَّى اللهُ عليه وَسَلَّمَ أمَرَ بالمَسْحِ عَلَى الخُفَّينِ فِي غَزْوَةِ تبوك ثلاثةَ أيَّامٍ وَ لَيالِيهِنَّ لِلْمُسَافِرِ وَيَوماً لِلْمُقِيم) [4] واتە: پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم لە غەزای تەبوکدا فەرمانیدا، کە گەشتەوان، تا سێ شەو سێ ڕۆژ، مەسحی خوف بکات و، ئەوی نیشتەجێشە شەو ڕۆژێك.

---

[1] ابن تيمية: الاختيارات (١٣).

[2] المبسوط (٩٨/١)، الام (٣٤/١)، المغني (٢٠٩/١)، المحلى (٨٠/٢).

[3] موسلیم (٢٧٦)، نەسائی (٨٤/١).

[4] ئیمامی ئەحمەد (٦/ ٢٧) بە سەنەدی سەحیحەوەو لای ئیبنو ماجە (٥٥٦) ریوایەتی تری لە ئەبوبەکرەوە هەیە.

٣ـ سـەفوانی کـوڕی عەسسـال، خـوا لێـی ڕازی بێـت دەگێڕێتـەوە، دەڵـێ: (كَـانَ رَسُولُ اللَّـهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ يَأْمُرُنَـا إِذَا كُنَّـا سَفَرًا أَنْ لَـا نَنْـزِعَ خِفَافَنَا ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ وَلَيَالِيَهَا، إِلَّا عَنْ جَنَابَةٍ، وَلَكِـنْ مِـنْ بَـوْلٍ أَوْ غَـائِطٍ أَوْ نَـوْمٍ)[1] واتـە: کـە لـە سـەفەر دەبـوین، پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليـه وسـلم، فەرمانی پێ دەکردین، کە تا سێ شەو سێ ڕۆژ، خوففەکانمان لە دەستنوێژ شکان، لە میزو پیسایی و خـەوتن دانەکـەنین، تـەنها لـە غوسـڵ دەرکـردن نەبێت..

ئەمە ڕای زۆرینەی شەرعناسانە، بەڵام ئیمام مالیك و، ئیمام شـافیعی، لـە قـەولێکی قـەدیمی زەعیفیـدا، (وەکـو ئیمـام نـەوەوی دەڵـێ[2]) هـەروەها لەیسی کوڕی سەعد دەڵێن[3]: کات بۆ مەسحی خوفف دیاری ناکرێت!! کە لە پێی کرد، چەند ڕۆژ لە پێیدا بێت، گرنگ نیە، مادام غوسڵی نەکەوتبێتـە سەر.. ئەو بەڵگانەی ئەم بەرێزانە پشتیان پێ بەستوە، زەعیفن، لەوانە:

١ـ ئوبەیی کوڕی عومارە، خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: (يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَمْسَحُ عَلَى الْخُفَّيْنِ ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: يَوْمًا يَا رَسُولَ اللَّهِ ؟ قَالَ: نَعَمْ، وَيَوْمَيْنِ، قَالَ: وَيَوْمَيْنِ يَا رَسُولَ اللَّهِ ؟ قَالَ: نَعَمْ، وَثَلَاثًا، قَالَ: وَثَلَاثًا يَا رَسُولَ اللَّـهِ ؟ قَـالَ: نَعَـمْ، وَمَـا شِـئْتَ)[4] لـە پێغەمبـەری خـوام صـلى الله عليـه وسـلم پرسـی: خوففەکانم مەسح کەم ؟! فەرموی: بەڵێ، وتم: ڕۆژێك ؟ فەرموی: ڕۆژێك،

---

[1] ئیمامی ئیبنو حەجەری عەسقەلانی لە نصب الراية في تخريج أحاديث الهداية (٢٦١/١) دەڵێ: ترمزی و نەسائی و ئیبنو ماجە گێڕاویانەتەوەو، ترمزی دەڵێ: حسن صحيح

[2] النوي: شرح صحيح مسلم (٣م١٧٩).

[3] الصنعاني: سبل السلام (٦٧/١).

[4] ئەبو داود (١٥٨) دەشڵێت: بەهێز نیە.. ئیمامی ئەحمەدیش دەڵێ: پیاوانی سەنەدەکەی ناسراو نین.. بەڵام ئیبنو عەبدولبەڕ دەڵێ: فەرمودەیەکە خۆ ناگرێت، هیچ سەنەدێکی ڕاستی نیە، ئیبنولجەوزی هەر لە ریزی مەوزوعاتی داناوە..

وتم: دوو رۆژیــش ؟ فــەرموی: دوو رۆژیــش، وتم: بــەڵێ، ســێ رۆژیــش ؟ فەرموی: واتە: چەند رۆژ حەز دەکەیت..

٢ـ خوزەیمـەی کـوڕی سـابیت، خـوا لێـی ڕازی بێـت لـە باسـی ڕێـدانی پێغەمبەری پێشەوادا، بـۆ مەسحی سـەر خوففـەکانیان، گـوتی: (جَعَـلَ لَنـا رَسـولُ اللهِ صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ ثلاثـاً، وَلَـو اسْـتَزَدْنَاهُ زَادَنَـا)[١] واتــە: پێغەمبەری خوا، صلى الله عليـه وسلم، سـێ شـەو سـێ ڕۆژی بـۆ دانـاوین، ئەگـەر زیاترمـان لـێ داوا کردایـە، زیـاتری ڕێ دەدایـن.. واتـە بـۆ مەسـح کردنی خوففەکانمان.. ئەمە ئەگەر راستیش بێت، نابێتـە بەڵگـە، چـونکە گومانی یاوەر نابێتە بەڵگە.. ئەم شەرعناسە بەڕێزانە، کە ئەم فەرمودەیە دەکەنە بەڵگەی ڕەوایی بۆچونی خۆیان، دەڵێن: ئـەم یـاوەرە بـەڕێزە، خـوا لێـی ڕازی بێـت دەڵـێ: ئەگـەر داوای زیاترمـان لـێ بکردایـە، بـۆی زیـاتر دەکردین، ئێ ئەمە گومانە.. خواپەرستی ئێمەش لەسەر گومـانی یاوەرێـك دانامەزرێت..

٣ـ لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە، خـوا لێـی ڕازی بێـت دەگێڕنـەوە، کـە فەرمویـەتی: (إذا تَوَضَّـأ أحَـدُكُم، وَلَـبِسَ خُفَّيْـهِ، فَلْيَمْسَـحْ عَليهِمَـا، وَلْيُصَـلِّ فيهِمَا، ولا يَخْلَعْهُمَا إنْ شَاءَ إلَّا مِنْ جَنَابَةٍ)[٢] واتە: هـەر کەسـێکتان دەسـتنوێژی گرت و خوففەکانی لە پێ کرد، با نوێژیان پێوە بکات، چـەندی حـەز کـرد با لە پێیدا بن و، دایان نەکەنێتەوە، مەگەر لە لەشگرانیدا..

---

[١] ئەبو داود (١٥٧)، ئیبنوماجە (٥٥٣) ئیبنو دەقیق العید(١٩١/٢) دەڵێ: (ضَعَّفَ حديثَهُ هذا أحمد والبخاري وأبوداود والدارقطني).

[٢] بەیهیقی (٢٨٠/١)، حاکمیش بە سەحیحی داناوە، بەڵام فەرمودەوانان گوتویانە سەحیح کراوی حاکم، دەبێت زەهەبی لایەنگیریی بوبێت، دەنا هەر وا وەرناگیرێت. کەمال ئیبنو السید لە صحیح فقه السنة (١٥١/١) دا بە زەعیفی داناوە..

٤ـ عوقبەی کوڕی عامر، خوا لێـی ڕازی بێـت دەگێڕێتـەوە: لـە شـامەوە بەرەو مەدینە کەوتمە ڕێ، کە لە شام دەرچوم هەینی بو، کە گەیشتیشـمە مەدینـە هـەر هـەینی بـو، چومە خزمـەت عومـەری کـوڕی خـەتتاب، لێـی پرسیم: کەی خوففەکانت لە پێ کردوە ؟وتم: ڕۆژی هەینی، فـەرموی: دات نەکەندوە ؟! وتم: نەخێر، گوتی: چاکت کرد، تەواوە[1].. ئیمام بەیهیقی، کە ئەم فەرمودەیەی گێڕاوەتەوە دەڵێ: زەعیفە، ئینجا دەڵێ: ئێمـە ڕیوایـەتی ترمان لە سەیدنا عومەرەوە هێنایەوە، کە بۆچونی لەسـەر دیـاری کردنـی کـاتی خوففـە[2]، جـا ئەگـەر ئـەم فەرمودەیـە سـەحیحیش بێـت، ئـەوە هـەر دەبـێ قـەولی دیـاری کردنەکـەی، دوای ئـەم فەرمودەیـە بخرێتـەوە پـێش، چونکە ڕیواتەکەی تر، لەگەڵ هەڵوێستی یاوەرانی تردا گونجاوە..

ئیبنـو حـەزم دەڵـێ: کـەس لـە یـاوەران، جگـە لـە ئیبنـو عومـەر، ڕای جیاوازی لەسەر ماوەی مەسح، لەسەر خوفف نیە[3]..

پێم وایە، ڕاستتر ئەوەیە، کە مەسحی خوفف، بۆ گەشـتیار مـاوەی سـێ شەو سێ ڕۆژەو، بۆ نیشتەجێش شەو ڕۆژێکە.. والله اعلم.

**سەرەتای ماوەی مەسح:**

دوای ئەوەی ماوەی مەسحی خوففمان ڕون کردەوە، ئـەوە دێتـە پـێش، کـە ئایـا سـەرەتای دەسـپێکی مـاوەی مەسـحی خوفـف کەیـە؟! ئەمـەش ڕاجوێیی نێوان شەرعناسانی لەسەرەو، تێیدا چەند پۆلێکن:

---

[1] البيهيقي (٢٨٠/١)، الطحاوي (٤٨/١)، الدارقطني (٧٢). کەمال ئیبنو السيد لە صحيح فقه السنة (١٥١/١) دا بە زەعیفی داناوە

[2] مەبەستی دیاری کردنی مەسحە لەسەر خوفف، کە سێ شەو سێ ڕۆژە بۆ گەشتیاران و، شەوڕۆژێکیش بۆ نیشتەجێیان..

[3] المحلى (٩٣/٢).

**پۆلی یەکەم: دەڵێن: لە کاتی دەستنوێژ شکانی یەکەمی دوای لە پێ کردنێتی:** ئەمە بۆچونی ئیمام ئەبو حەنیفەو، سوفیانی سەوری و، شافیعی و، ڕای زانراوی حەنبەلیەکانە[1]، هەنجەتیشیان ئەوەیە، کە دەڵێن: دوای دەستنوێژ شکانەکە، کاتێکە، کە دەشێت دەستنوێژی تێدا بگیرێتەوەو، مەسحیشی تێدا بکرێت .. بۆ نمونە: ئەگەر موسوڵمانێکی نیشتەجێ دەستنوێژی لە سەعات دوازدەی نیوەڕۆدا گرت و، خوففی لە پێ کرد، بەڵام لە سەعات سێی دوای نیوەڕۆدا، دەستنوێژەکەی شکاند، دەتوانێت تا سبەینێ سەعات سێی دوای نیوەڕۆ، مەسح کاتەوە.. کە دەکاتە بیستوحەوت سەعات..

**پۆلی دووەم: دەڵێن: لەو کاتەوە دەست پێ دەکات کە خوففەکانی لە پێ کردوە:** واتە لە سەعات دوازدەی نیوەڕۆوە، بۆ سەعات دوازدەی سبەینێ.. ئەمەش ڕای شێخ حەسەنی بەسری ڕەحمەتیە[2]..

**پۆلی سێیەم: ماوەی پازدە نوێژ بۆ گەشتیارو پێنج نوێژ بۆ نیشتەجێ:** ئەمە ڕای شەعبی و، ئیسحاق و، ئەبوسەورو هەندێك شەرعناسی ترە[1]..

**پۆلی چوارەم: لەو کاتەوە دەست پێ دەکات کە بۆی هەیە مەسح کات:** جا ئیتر مەسحەکەی کردبێت، یان نا.. بۆ نمونە گەشتیارەو

---

[1] المبسوط (٩٩/١)، المجموع (٤٧٠/١)، المغني (٢٩١/١)، الاوسط (٤٤٣/١).

[2] الشيخ وحيد عبدالسلام: الاكليل شرح منار السبيل (١٣٦/١).

[1] المجموع (٤٦٦/١)، المغني (٢٩١/١)، الاوسط (٤٤٤/١).

لە ڕۆژی دووەمدا ویستی مەسحی خوفف بكات، بۆی هەیە، تا دوو ڕۆژ بیكات، نەك سێ ڕۆژ، چونكە ڕۆژێكی مۆڵەتە شەرعیەكەی خۆی لە دەست داوە. ئەمەش ڕای ئیبنو حەزمە، كە لە هەمویان زیاتر بەرگریی لە ڕاكەی خۆی كردوەو، ڕای ئەوانی دیكەی ڕەت كردۆتەوە[1] !!

**پۆلی پێنجەم: لە یەكەمین لە پێ كردنی خوففەكانەوە دەست پێ دەكات:** ئەمەش ڕای ئیمام ئەحمەدو، ئەوزاعیەو، ئیمام نەوەوی و، ئیبنول مونزیرو، ئیبنو عوسێمین بە پەسەندترینیان زانیوە[2]..

من پێم وایە ئەمیان و، ڕای پۆلی یەكەم پەسەندترینن، كە مادام بەڵگەیەكمان بە دەستەوە نیە، كاتی دەسپێكی مەسحی خوفف حسێب بكات، پێم و ایە بە ڕای پۆلی یەكەم بكەین باشترە، چونكە بۆچونی زۆرینەی پێشەوای شەرعناسانە..

پێم وایە: دەسپێكی مەسحی خوفف، لە كاتی دەستنوێژ شكانی یەكەمی دوای، لە پێ كردنیەوەیە.. والله اعلم..

## نیشتەجێیەك مەسحی كرد بەڵام سەفەری هاتە پێش:

كابرا نیشتەجێیەو بۆ ماوەی شەورۆژێك بۆی هەیە مەسح كات، كردی، بەڵام پێش تەواوبونی كاتەكەی، سەفەرێكی هاتە پێش، شەرعناسان: لە حوكمی ئەم حاڵەتەدا دوو پۆلن:

**یەكەمیان:** بەو كاتەوە، كە بەكاریهێناوە، تا سێ شەو سێ ڕۆژ مەسح دەكات.. ئەمەش ڕای سوفیانی سەوری و، ئیمام ئەبو حەنیفەو، قەولێكی ئیمام ئەحمەدەو، ئیبنو حەزمیش، هەمان ڕای هەیە[1]..

---

[1] المحلى (٢/٩٥).
[2] ابو داود: مسائل أحمد (١٠)، المحلى (٢/٩٥)..

**دووەمیان**: دەبێت شەوڕۆژەکەی خۆی تەواو کات، ئینجا پێی دەشوات و، لەوێوە سێ شەو سێ ڕۆژەکەی حسێب دەکات.. ئەمەش ڕای ئیمام شافیعی و، ئەحمەدو ئیسحاقە[٢]..

ئەم بۆچونەی دووەمیانم پێ پەسەندترە.. چونکە پێناسەی کابرا بە پێ شوشتنەکەی، لە نیشتەجێوە دەبێتە گەشتیارو، حوکمی ئەمیان وەردەگرێت، والله أعلم..

## گەشتیارێك مەسحی دەکرد بەڵام سەفەرەکەی کۆتایی هات و بووەوە بە نیشتەجێ:

کابرا لە سەفەردایە، دوو شەو دوڕۆژە مەسحی خوفف دەکات، بەڵام سەفەرەکەی تەواو کردو، نیشتەجێ بۆوە، ئایا، تا سێ ڕۆژەکەی تەواو دەکات، لەسەر مەسح کردنی خوففەکانی بەردەوام دەبێت، یا دەسبەجێ کۆتایی بە مەسحی خوفف دەهێنێت؟!

ئەگەر مەسحی خوففی لە یەك شەوڕۆژ کەمتر کردبو، دەتوانێت، تا شەوڕۆژەکە تەواو دەکات، مەسح کات، ئەگەر زیاتر لە شەو ڕۆژێکی بەکار هێنابو، ئیتر سیفەتی گەشتیاری پێوە نامێنێت و، دەبێت خوففەکانی داکەنێت و پێی بشوات.. والله اعلم..

---

[١] المروزي: اختلاف العلماء (ل ٣١)، المغني (٢٩٩/١)، المحلى (١٠٩/٢).

[٢] الام (٣٥/١)، المروزي: اختلاف العلماء (ل ٣١)، ابن المنذر: الاوسط (٤٤٦/١).

### مەرجی مەسحی خوفف:

مەرجی مەسحی خوفف ئەوەیە، کە لەسەر دەستنوێژەوە لەپێی کردبن، فەرمودەکەی لای موغیرە خوا لێی ڕازی بێت، ئەوەی ڕون کردۆتەوە:

- موغیرەی کوڕی شوعبە، خوا لێیان ڕازی بێت، لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە، کە گوتی: (قَالَ كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَاتَ لَيْلَةٍ فِي سَفَرٍ فَقَالَ أَمَعَكَ مَاءٌ قُلْتُ نَعَمْ فَنَزَلَ عَنْ رَاحِلَتِهِ فَمَشَى حَتَّى تَوَارَى عَنِّي فِي سَوَادِ اللَّيْلِ ثُمَّ جَاءَ فَأَفْرَغْتُ عَلَيْهِ الْإِدَاوَةَ فَغَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ وَعَلَيْهِ جُبَّةٌ مِنْ صُوفٍ فَلَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يُخْرِجَ ذِرَاعَيْهِ مِنْهَا حَتَّى أَخْرَجَهُمَا مِنْ أَسْفَلِ الْجُبَّةِ فَغَسَلَ ذِرَاعَيْهِ ثُمَّ مَسَحَ بِرَأْسِهِ ثُمَّ أَهْوَيْتُ لِأَنْزِعَ خُفَّيْهِ فَقَالَ دَعْهُمَا فَإِنِّي أَدْخَلْتُهُمَا طَاهِرَتَيْنِ فَمَسَحَ عَلَيْهِمَا) [١] واتە: لە سەفەرێکدا، لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بوم، شەو لێی پرسیم: ئاوت پێیە؟! عەرزم کرد: بەڵێ، لە سواریەکەی دابەزی و، دوور کەوتەوە، تا لەبەر تاریکیەکە دیار نەما، پاشان تەشریفی هێنایەوە، منیش ئاوم کرد بە دەستیدا ، دەموچاو دەستی شوشت، جوببەیەکی خوریی لەبەردابو، ویستی قۆڵی لێ بهێنێتە دەرێ، نەیتوانی، ئینجا لەژێرەوە هێنانیە دەرێ و، باسکەکانی شوشت و، مەسحی سەری کرد، خۆم نزم کردەوە، ویستم خوففەکانی لە پێ دانێم، فەرموی: نا لێیان گەڕێ بە پاکی لەپێم کردون، ئینجا مەسحی کردن..

کەوابو دەستنوێژەکە، مەرجە بۆ لە پێکردنی خوفف، تا مەرجیش نەیەتە دی، مەرج بۆ کراو نایەتە دی[١]..

---

[١] متفق علیه: بوخاری (٤٠٩/١)، موسلیم (١٧٠/٣).

[١] الموطأ (٤٦/١)، الام (٣٣/١)، المغني (٢٨٢/١).

**لە پێکردنی تاکەخوفف پێش تەواوبونی دەستنوێژ:** ئەمە یەکێکە لەو بابەتە، کە وردەکارانەی شەرعناسان باسیان لێوەکردوە! گوتویانە: کەسێك دەستنوێژ دەشوات، پێی ڕاستی شوشت و تاکە خوففێکی لە پێ کرد، ئینجا پێی چەپی شوشت و تاکە خوففەکەی تری لە پێ کرد، ئایا ئەم مەسحە تەواوە؟! ئیمام مالیك و، شافیعی و، ئەحمەد دەڵێن: ئەگەر دەستنوێژی شکا، بۆی نیە مەسحیان بکاتەوە! چونکە پێش ئەوەی دەستنوێژەکە بگرێت، خوففەکەی لە پێ کردوە.. ئیمام ئەبو حەنیفەو، قەولێکی تری ئیمام ئەحمەدو، ئیبنو حەزم و، ئیبنول مونزیرو، ئیبنو تەیمییە دەڵێن: دەستنوێژو مەسحەکەی تەواوەو دەتوانێت، کە دەستنوێژی شکا جارێکی تر مەسحیان لەسەر بکاتەوە، چونکە ئەو وەسفەی بەسەردا دەچەسپێت، کە بە دەستنوێژەوە لەپێی کردون[1].. منیش ئەمەم پێ پەسەندترە، چونکە بە دەستنوێژەوە لە پێی کردون..

**حوکمی خوففی دڕاو:** هەمو شەرعناسان، ئەوەیان بە مەرجی خوفف حسێب کردوە، کە دەبێت وا بێت شوێنەکانی پێ، کە لە دەستنوێژدا دەشۆرێن، تا قولە پێ داپۆشێت، بۆیە کۆمەڵێکیان پێیان دروست نەبوە، کە مەسحی خوففی دڕاو بکرێت، چونکە شوێنی شوشتنی دەستنوێژەکەی لێوە دیار دەبێت، بەوەش شوشتن و مەسح کۆ دەبنەوە، حوکمی شوشتنەکەش حوکمی مەسحەکە دەسڕێتەوە.. ئەمەش ڕای ئیمام شافیعی و، ئەحمەدە[1]..

---

[1] المبسوط (٩٩/١)، مجموع الفتاوى (٢٠٩/٢١)، المحلى (١٠٠/٢)، الاوسط (٤٤٢/١).

[1] الام (٢٨/١)، ابن هانئ: مسائل أحمد (١٨/١)، المغني (٢٨٧/١).

ئیمام ئەبو حەنیفەو، مالیك دەڵێن: مەسحی خوففی دڕاو جائیزە، بەو مەرجەی بتوانرێت پێوەی بڕوات و، ناوی خوففی پێوەمابێت[١].. ئەمە بۆچونی ئەبو سەورو، سوفیانی سەوری و، ئیسحاقە، ئیبنوحەزم و، ئیبنول مونزیرو، ئیبنو تەیمییەش، ئەمەیان هەڵبژاردوە.. وادیارە ئەمەش پەسەندتر بێت، چونکە وا پێناچێت، ئەو هەمو یاوەرەی دەوری پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم، کە زۆرینەیان هەژارو دەسکورت بون، هەمویان هەر خوففی نوێ وساغیان لە پێدا بوبێت، حەتمەن دڕاویی و، دورینەوە، یان کون و، درزی ئاسایی، نەبونەتە ڕێگری مەسح کردنی خوفف، ئەگینا ڕیوایەتێکمان هەر پێ دەگەیشت.. بۆیە سوفیانی سەوری دەیگوت: بڕۆ هەر خوففەکان بە پێتەوە بوەستن، حوکمی خوففی ساغیان هەیە[٢] !!

من پێم وایە، کە مەسح لەسەر خوففی دڕاویش جائیزە.. والله اعلم..

★ ★ ★

## هەر سەرەوەی خوفف مەسح دەکرێت:

مەسح کردنی خوفف، بریتیە لە یەکجار هێنانی دەستی تەڕ، بە دیوی دەرەوەی خوففەکەدا.. چونکە سەیدنا عەلی کوڕی ئەبو تالیب، خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: (لَوْ كَانَ الدِّينُ بِالرَّأْيِ لَكَانَ أَسْفَلُ الْخُفِّ أَوْلَى بِالْمَسْحِ مِنْ

---

[١] المدونة (٤٤/١)، المبسوط (١٠٠/١)، الاوسط (٤٤٩/١)، المحلى (١٠٠/٢)، مجموع الفتاوى (١٧٣/٢١).

[٢] عبدالرزاق: المصنف (ل ٧٥٣)، البيهيقي (٢٨٣/١).

ظَاهِرِهِ، وَقَدْ رَأَيْت رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَمْسَحُ ظَاهِرَ خُفَّيْهِ )[١]
واتە: ئەگەر دین بە ڕەئی بوایە، دەبو مەسحی بنی پێ بكرایە، نەك سەرەوەی، پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینیوە، كە تەنها سەرەوەی خوففەكانی مەسح دەكرد... ئەمەش ڕای ئەوزاعی و، سەوری و، ئەحمەدو، ئەبو حەنیفەو، یاوەرانێتی.. بەڵام ئیمام مالیك و، شافیعی دەڵێن: مەسحی سەرو خواری دەكات، چونكە فەرمودەی موغیرەیە، كە دەڵێ: ( رَأَيْت رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَمْسَحُ عَلَى الْخُفَّيْنِ عَلَى ظَاهِرِهِمَا)[٢] واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستنوێژی گرت، مەسحی سەرو خواری خوففەكانی كرد..

ئیمام ئیبنول قەییم، لە (زاد المعاد) بەرگی یەكەمیدا دەڵێ: (وَكَانَ يَمْسَحُ ظَاهِرَ الْخُفَّيْنِ وَلَمْ يَصِحّ عَنْهُ مَسْحُ أَسْفَلِهِمَا إلَّا فِي حَدِيثٍ مُنْقَطِعٍ. وَالْأَحَادِيثُ الصَّحِيحَةُ عَلَى خِلَافِهِ) واتە: پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم، هەمیشە مەسحی سەرەوەی خوففەكانی دەكرد، هەر فەرمودەیەك باسی لە مەسحی ژێرەوەی خوفف كردبێت زەعیفە.

بەیهیقی لە موغیرەی كوڕی شوعبەوە، خوا لێی ڕازی بێت، دەگێڕێتەوە كە چۆن پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم مەسحی خوففەكانی كردوە: لە سەری پەنجەكانیەوە، دەستی ڕاستی بە تەڕی هێناوەتەوە بۆ سەرەوە، بەرەو لولاقی، پاشان دەستی چەپی بە تەڕی، لە پەنجەكانیەوە هێناوەتەوە بەرەو سەرەوە، بۆ لولاقی.. ئەمە ڕاستترین شێوەیەو، هەمو پێناسەی مەسحی بەسەردا دەچەسپێت.. شەرعناسی وا

---

[١] ئەبوداود (١٦٢)، دارەقوتنی (٧٣)، بەیهیقی (١١١/٢)، ئەلبانیش لە ارواو الغلیل (١٠٣) دا دەڵێ سەحیحە..

[٢] ئەبو داود (١٦١)، ترمزی (٩٨) دەرهەقیشی دەڵێ: حسن صحيح.. المغنی (١٨٣/١).

هەیە، گوتویەتی: دەتوانێت بە پەڕۆیەكی تەڕ، سەرەوەی خوفەكانی مەسح كات!! ئیمام نەوەوی دەڵێ: ئەگەر دڵۆپە ئاوێك بتكێنێتە سەر خوففەكانی، بە مەسح حسێبە[1]!!

ئیبنوروشد دەڵێ: ئەو شەرعناسانەی قەولەكەی سەیدنا عەلییان بە راستر داناوە، گوتویانە، تەنها سەرەوەی خوفف مەسح دەكرێت، ئەوانەش، كە ریوایەتەكەی لای سەیدنا موغیرەیان بە ڕاستر زانیوە، گوتیانە،: سەرو خواری مەسح دەكرێت، قیاسیان لەسەر غوسڵ كردوە[2]..

بە هەر حاڵ وا دەزانم بەڵگەی ئەو زانایانە بەهێزترە، كە گوتویانە: هەر سەرەوەی خوفف مەسح دەكرێت.. بۆیە منیش:

پێم و ایە تەنها سەرەوەی خوفف مەسح دەكرێت.. والله اعلم..

★ ★ ★

## چی مەسحی خوفف بەتاڵ دەكاتەوە ؟:

فەرمودەكەی لای سەفوانی كوڕی عەسساڵ، خوا لێی ڕازی بێت هێنایەوە، كە باس لە بەتاڵ بونەوەی مەسح دەكات، كە دەڵێ: (كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ يَأمُرُنَا إذَا كُنَّا مُسَافِرِينَ أنْ نَمْسَحَ عَلَى خِفَافِنَا، وَلا نَنْزِعَهَا ثَلاثَةَ أيَّامٍ مِنْ غَائِطٍ وَبَولٍ وَنَومٍ إلَّا مِنْ جَنَابَةٍ)[1] واتە: پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێ دەكردین، كە لە سەفەردابوین، مەسح لەسەر خوففەكانمان بكەین و، تا سێ ڕۆژ لەبەر چونە سەر ئاو (میزكردن و پیسایی كردن)، یان لەبەر خەوتن لە پێیان نەكەینەوە،

---

[1] النوي: روضة الطالبيين (١ / ١١٧).

[2] ابن رشد: بدايه المجتهد چاپی دووەمی ساڵی ٢٠٠٤ (یەك بەرگیە ل ٢٦).

[1] نەسائی (٣٢/١)، ترمزی (٣٥٣٥)، ئیبنو ماجە (٤٧٨)، شێخی ئەلبانی رحمه الله لە ارواو الغليل (١٠٤) دا دەڵێ: حەسەنە..

مەگەر لە جەنابەت (لەش پیسی).. کەوابو ئەوەی مەسحی خوفف بەتاڵ دەکاتەوە، یەکێك لەمانەیە:

١ ـ لەش گران بون و، ئەوی لە حوکمی ئەودایە، وەکو حەیزو زەیستانی، کە پێویست بە غوسڵ دەرکردن دەکەن.. لە غوسڵیشدا دەبێت خوففەکان داکەندرێن..

٢ ـ تەواوبونی ماوەی مەسحەکە.

٣ ـ داکەندنی خوففەکە..

٤ ـ دەستنوێژ شکان پێش لەپێ کردنی خوففەکە..

ئەگەر خوففەکەی داکەندو، دەستنوێژی شکاند، ناتوانێت لە پێی کاتەوەو، مەسحی لەسەر بکات، بەڵکو حوکمی مەسحەکەی تەواو بوەو، دەبێت پێی بشواتەوە، تا بە پاکی پێی بکاتەوە ناو خوففەکانی..

**بەتاڵ بونەوەی مەسحی خوفف بەتاڵ بونەوەی دەستنوێژ نیە:** ئەگەر کەسێك خوففەکانی دانا، بێ ئەوەی دەستنوێژی شکاندبێت، شەرعناسان لەسەر حوکمەکەی چوار پۆلن:

**پۆلی یەکەم: دەبێت دەستنوێژەکەی بگرێتەوە:** ئەمە ڕای ئەوزاعی و، نەخەعی و، ئەحمەدو، ئیسحاق و، شافیعییە (لە قەولی قەدیمیدا)، چونکە بە ڕای ئەم بەڕێزانە، مەسحەکەی لە شوێنی شوشتن بوە، جا کە مەسحەکەی بەتاڵ کردۆتەوە، حەتمەن دەستنوێژی پێیەکانیشی بەتاڵ بونەتەوە، بەمەش هەمو دەستنوێژەکە بەتاڵ بۆتەوە[1]..

---

[1] اختلاف العلماء (ل ٣١)، ابن هانئ: مسائل أحمد (١٩/١)، المجموع (٢٥١/٤).

**پۆلی دووەم: دەبێت پێیەکانی بشواتەوە:** ئەمەش ڕای ئیمام ئەبو حەنیفەو، سەوری و، ئەبو سەورو، قەولی نوێی ئیمام شافیعیە[١]..

**پۆلی سێیەم: ئەو کاتەی خوففەکە دادەکەنێت دەبێت پێیەکانی بشواتەوە:** ئەگەر دوا کەوت، دەبێت هەمو دەستنوێژەکە بگرێتەوە.. ئەمەش مەزهەبی مالیك و، لەیسی کوڕی سەعدە[٢]..

**پۆلی چوارەم: نە پێیەکانی دەشوات و نە دەستنوێژی دەشواتەوە:** ئەمەش ڕیوایەتی نەخەعیە، لە حەسەنی بەسری و، عەتائەوە هاتوە، دیسان ڕای ئیبنو حەزم و، ئیمام نەوەوی و، ئیبنولمونزیرو، ئیبنوتەیمییەشە[٣].

پێم وایە : ئەوی خوففی بەسەر دەستنوێژدا لە پێ کردوە، کە خوففەکانی دانا، دەستنوێژی هەر دەمێنێت مادام نەشکابێت، چونکە بەڵگەیەکی وامان لەبەر دەستدا نیە، کە دەستنوێژەکەی شکا بێت، بە پێچەوانەوە، ڕیوایەتێك هەیە، کە ئەبو زوبیان، خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، کە سەیدنا عەلی بینی، خوا لێی ڕازی بێت، کە میزی بە پێوە کرد، پاشان داوای ئاوی کردو، دەستنوێژی گرتەوە، بۆ پێیەکانیشی هەر مەسحی سەر نەعلەکانی کرد، ئینجا چوە مزگەوت نەعلەکانی داناو نوێژی کرد[١]..

---

[١] اختلاف العلماء (ل ٣١)، الاوسط (٤٥٨/١).

[٢] ئیمامی مالیك: المدونة (٤١/١).

[٣] المحلى (١٠٥/٢)، الاوسط (٤٦٠/١)، المجموع (٥٥٨/١)، الاختيارات (ل ١٥).

[١] بەیهیقی (٢٨٨/١)، تەحاوی (٥٨/١)، ئەلبانی لە تمام المنة (ل ١٥) دا دەڵێ: إسناده صحيح..

ئەمە وەکو کەسێکە، کە سەری مەسح کردووە، پاشان قژی تاشیوە، کەس ناڵێت، دەبێ مەسحەکەی بکاتەوە، یان دەستنوێژەکەی بگرێتەوە.. کەوابو ئەگەر کەسێك خوففەکەی داکەندو، دەستنوێژەکەی نەشکاند، بۆی هەیە نوێژی پێوە بکات.. والله اعلم..

★ ★ ★

**خوفف لەسەر خوفف :**

کەسێك جوتێك خوفف لە پێ دەکات، پاشان ئەگەر جوتێك خوففی تری بەسەردا لە پێ کرد ؟! یان جوتێك گۆرەوی لە پێ کردووەو جوتێك خوففی بەسەردا لەپێ کرد، یان دوو جوت گۆرەوی لە پێ کرد.. ئایا دروستە ؟ ئایا لە دەستنوێژیدا کامیان مەسح دەکات ؟!

لەبەر کردنی دوو جوت خوفف، یان دوو جوت گۆرەوی کاریگەر نیە، ئەوی گرنگ و کاریگەرە لەسەر حوکمە شەرعیەکە ئەوەیە، کە بە دەستنوێژەوە لە پێی کردبن.. شەرعناسان ڕایان لەم مەسەلەیەدا، بە پێی حاڵەتەکان جیاوازەو چەند پۆلێکن:

**پۆلی یەکەم:** دەڵێن: ئەگەر دوو جوتی خوفف، یان گۆرەوی پێکەوە لەپێکرد، بۆ مەسح کردنەوەیان، بۆی هەیە ئەوەی سەرەوەیان مەسح کات.. ئەمەش ڕای حەنەفیەکان و، ڕای بەهێزی مالیکیەکان و، حەنبەلیەکانەو، قەولێکی کۆنی ئیمام شافیعیشە، بەڵام قەولی نوێی پێچەوانەی ئەوەیە[١]..

**پۆلی دووەم:** گوتویانە: ئەگەر جوتەکەی سەرەوەی مەسح کردبو، پاشان دایکەندەوە، دواتر ئەوەی ژێرەوەیان بمێنێتەوەو، لە دەستنوێژی

---

[١] حاشية ابن عابدين (١/١٧٩)، جواهر الاكليل (١/٢٤)، روضة الطالبين (١/١٢٧).

تردا مەسحی لەسەر بکات، جائیزە، چونکە پێیەکانی بە دەستنوێژەوە خستۆتە ناو خوفف، یان گۆرەوەیەکانیەوە..

**پۆلی سێیەم:** دەستنوێژی دروستی گرت و، جوتێکی لە پێکرد، بێ ئەوەی دەستنوێژی بشکێت، دواتر جوتێکی تری بەسەردا لە پێکرد، ئەمەش جائیزەو، شەرعناسان دەڵێن: سەرپشکە لەوەی کام جوتەیان مەسح دەکات.. ئەمەش ڕای حەنبەلیەکانە[1]..

**پۆلی چوارەم:** ئەگەر دەستنوێژی گرت و، جوتێك خوف، یان گۆرەوی لە پێکرد و مەسحی کرد، ئینجا جوتێکی تری بەسەردا لە پێکرد، بۆی هەیە مەسحی ئەوەی سەرەوەیانی بکات، چونکە پێیەکانی بە دەستنویژەوە خستۆتە ناویانەوە.. بەڵام ئەگەر جوتی یەکەمیانی لە پێکرد، پاشان دەستنوێژی شکاند، ئینجا جوتێکی تری بەسەر جوتی یەکەمدا لە پێکرد، بۆی نیە ئەو جوتەی سەرەوەیان مەسح کات، بەڵکو هەر دەبێت ئەوەی ژێرەوەیانی مەسح کات.. چونکە ئەویانی بە دەستنوێژەوە لە پێ کردوە[2]..

پێم وایە ئەگەر بە دەستنوێژەوە خوفف، یان گۆرەوی لە پێکرد، پاشان خوفف، یان گۆرەوی تری بەسەردا لە پێکرد، بۆی هەیە مەسحی ئەوەی سەرەوەیان بکات، چونکە هەردووکیان بونەتە یەك پارچە.. ئەگەر ئەوەی سەرەوەشی دانایەوە، بۆی هەیە مەسحی ئەوەی ژێرەوەیان بکاتەوە.. والله اعلم..

★★★

---

[1] کشاف القناع (١/١١٧).

[2] کشاف القناع (١/١١٨).

## دووەم: مەسحی گۆرەوی

ـ **مەسحی گۆرەوی:** ڕای شەرعناسان دەربارەی گۆرەوی، خوری بێت، یان لۆکە، یان کەتان و، کەرەستەی تر، سێ پۆلە:

**پـۆلی یەکـەم:** مەسـحی گـۆرەوی جائیزنیـە، مەگـەر بـنی بەچـەرم داپۆشـرابێت.. ئەمـەش قـەولی کـۆنی ئیمـام ئـەبو حەنیفەیـە، کـە لێشـی گەڕاوەتەوە، هەروەها ڕای ئیمام شافیعی و ئەحمەدە[1].. گوتویانە: گۆرەوی خوفف نیە، تا حوکمی ئەو وەرگرێت، ئینجا گوتویانە: فەرمودەمان لەسەر مەسحی گۆرەوی چنگ نەکەوتوە..

**پۆلی دووەم:** مەسحی گۆرەوی جائیزە، بەو مەرجەی شوێنی فـەرزی شوشتنی پێ بگرێتەوەو بە پێوە بنوسێت.. ئەمـەش ڕای ئیمـام ئەحمـەدو، حەســەنی بەســری و، ئیبنــول موســەییەب و، شەرعناســانی حەنــەفی و، شافیعی و، حەنبەلیەکانە[2]..

**پـۆلی سـێیەم:** مەسـحی گـۆرەوی جـائیزە، ئەگـەر تـەنکیش **بێـت..** ئەمەش مەزهەبی ئیبنو حەزم و، ئیبنـو تەیمییەیـەو، ڕای شـێخی ئـەلبانی و، ئیبنـو عوسـێمین و، شـەنقیتیە[1].. ئـەبو داود دەڵـێ: ئەمـە ڕاو بۆچـونی سـەیدنا عومـەرو، عـەلی و، ئیبنـو عـەبباس و، ئیبنـو مەسـعودو،

---

[1] المبسوط (١٠٢/١)، المدونة (٤٠/١)، الاوسط (٤٦٥/١)، الام (٣٣/١).

[2] ابن هانئ: مسائل أحمد (٢١/١)، الاوسط (٤٦٤/١)، المجموع (٥٤٠/١)، فتح القدير (١٥٧/١).

[1] المحلى (٨٦/٢)، ابن تيمية: المسائل الماردينية (ل ٥٨٠)، مجموع الفتاوى (١٨٤/٢١)، الالباني: تمام المنة (ل ١١٣)، الشرح الممتع (١٩٠/١)، الشنقيطي: أضواء البيان (١٨/٢).

بـەرائی کـوڕی مالیـك و، ئەنــەس و، ئـەبو موســای ئەشـعەریی و، ئــەبو ئومامەو، سـەهلی کـوڕی سـەعدو، عـەمری کـوڕی حورەیسـە.. ئەمـەش لـە یازدە یاوەرەوە گێڕراوەتەوە..

بەڵگەی بەهێزیش لای ئەمانە، لەوانە:

١ ـ موغیرەی کوڕی شوعبە، خوا لێی ڕازی بێت گێڕایەوە، کە: (أنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ تَوَضَّأَ وَ مَسَحَ عَلَى الجْورَبَينِ وَالنَّعْلَينِ)[١] واتـە: پێغەمبـەری خـوا، صـلی اللە علیـە وسـلم دەسـتنوێژی گـرت، گـۆرەوی و نەعلەکانی مەسح کرد..

٢ ـ ئـەزرەقی کـوڕی قـەیس دەڵـێ: ئەنەسـی کـوڕی مـالیکم بـینی، دەسـتنوێژی شـکاند، پاشـان دەسـت ودەموچـاوی شوشـت و، گۆرەویـەکانی مەسح کرد، کە لە خوری بـون، لـێم پرسـی: مەسـحیان دەکـەیت ؟! گوتی: خوففن، بەڵام لە خورین[٢]..

ئەنەس خوا لێی ڕازی بێت، کە خۆی یەکێکە لە زمانـەوانانی یـاوەران، دەزانێت، کە وترا خوفف، لە خوففی چەرمین گشتگیرتر بەکار دێت، بۆیە گۆرەویەکانی خۆشی، لە ڕیزی خوففدا حسێب کردوە..

٣ـ لە سەردەمی یاوەراندا، گۆرەوی وەکو سەردەمانی ئێستای ئێمـە، ئـاوا تـەنك نـەبو، یـاوەران گۆرەویـان، وەکـو خوفـف تەماشـا دەکـرد، بـەڵام شەرعناسانی دوای یـاوەران، کـە گۆرەوی تـەنك داهـات، ئـەو ڕاجوێییـەیان

---

[١] ئەبوداود (١٥٩)، ترمزی (٩٩)، ئەحمەد (٤ / ٢٥٢) قسەشی لەسەر کردوە، بەڵام شێخی ئەلبانی لە ارواو الغليل (١٠١) دەڵێ: سەحیحە..

[٢] الدولابي: الكنى (١/١٨١) ئەحمەد شاکری فەرمودەوانی میسری، کە وەکو شێخی ئەلبانیە بە سەحیحی داناوە.. صحيح فقه السنة (١/١٥٧).

تێکەوت، کە ئایا هەمان حوکمی خوففی دەمێنێت، یان نا.. بەڵام گۆرەوی، هەرچەند تەنك بێت، هەر لە خوففی دڕاو باشترە..

حوکمی لەفاف کە لە پێوە دەئاڵێنرێت: هەر وەکو حوکمی گۆرەوی و خوففە: چونکە کردنەوەی ئەمیان لە پێ، لە داکەندنی گۆرەوی و خوفف زەحمەتترە، بۆیە بۆی هەیە مەسحیان بکات[1]..

★ ★ ★

## مەسحی نەعل و پێڵاو

پێشتر فەرمودەیەك و، ڕەفتارێکی سەیدنا عەلیمان، لەسەر مەسحی سەر نەعل هێنایەوە، کە بریتین لە:

١ ـ موغیرەی کوڕی شوعبە، خوا لێی ڕازی بێت گێڕایەوە، کە: (أنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ تَوَضَّأَ وَ مَسَحَ عَلَى الجَوْرَبَينِ وَالنَّعْلَينِ)[2] واتە: پێغەمبەری خوا، صلى الله علیه وسلم دەستنوێژی گرت، گۆرەوی و نەعلەکانی مەسح کرد..

ئەمە دوو مانای لێ دەفامرێتەوە:

١ ـ گۆرەوییان لە پێدا بوەو، بەسەر ئەودا نەعلیان لە پێدا بوەو، مەسحی سەر هەردووکیانی کردوە، بەمەش حوکمی هەردووکیان دەبێتە یەك، کە جائیزە مەسحی گۆرەوی و نەعل بکرێت، کە وەکو ئەوەیە کەسێك جوتێك خوفف، بەسەر جوتێك خوففی تردا لەپێکات، یان دوو

---

[1] ابن تيمية: الاختيارات (ل ١٣).

[2] ئەبوداود (١٥٩)، ترمزی (٩٩)، ئەحمەد (٤ / ٢٥٢) قسەشی لەسەر کردوە، بەڵام شێخی ئەلبانی لە ارواو الغليل (١٠١) دەڵێ: سەحیحە..

جوت گۆرەوی بەسەر یەكدا، یان گۆرەویەك و، پاشان خوففێكی بەسەردا لەپێ كات..

٢ ـ ئەگەری ئەوە دادەنرێت، كە سەیدنا موغیرە، پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم بینیبێت، جارێك مەسحی گۆرەویەكانی كردبێت و، جارێكی تر مەسحی نەعلەكانی كردبێت، ئەمەش ئەوە دەگەیێنێت، كە دەشێت مەسحی نەعل بكرێت، بێ ئەوەی مەسحی گۆرەوی بكرێت.. بۆ نمونە سەربازێك دەتوانێت مەسحی پۆستاڵەكانی بكات، یان وەرزشەوانێك، یان كەسێك، كە لە كاردایەو پێڵاوەكانی قەیتانـدارن و، ئاسان بۆی ناكرێنەوە، هەمویان دەتوانن مەسحی سەر پێڵاوەكانیان بكەن.. ئەوەی لایەنگری ئەمیش دەبێت، ئەو ڕەفتارەیە، كە لە سەیدنا عەلی كوڕی ئەبوتالیبەوە، خوا لێی ڕازی بێت گێڕراوەتەوە، كە بریتیە لە:

٣ـ ئەبو زوبیان، خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، كە سەیدنا عەلی بینی، خوا لێی ڕازی بێت، كە میزی بە پێوە كرد، پاشان داوای ئاوی كردو، دەستنوێژی گرتەوە، بۆ پێیەكانیشی هەر مەسحی سەر نەعلەكانی كرد، ئینجا چوە مزگەوت، نەعلەكانی داناو نوێژی كرد[١]..

ئەمە باسی گۆرەوی تێدا نیە، مەسحە بەسەر نەعلدا..

ئەوەش بێنینەوە یاد، كە دەوترێت نەعل (واتە دەمپایی) مانای ئەوە نیە، كە وەكو نەعلی ئەم زەمانە بوبن، لاسكێكیان هەبێت بۆ نێوان دوو پەنجەی پێ و، تەواو.. نا، نەعلی ئەو سەردەمە بۆ دەشت و كێو لە پێ دەكرا..

<u>كەوابو مەسحی سەر گۆرەوی و، پێڵاو جائیزە.. والله اعلم.</u>

---

[١] بەیهیقی (٢٨٨/١)، تەحاوی (٥٨/١)، ئەلبانی لە تمام المنة (ل ١٥) دا دەفەرموێ: إسناده صحيح..

## سێیەم: مەسحی عەمامەو سەرپۆش

یەكەم: مەسحی عەمامە: عەمامەیـەك، كـە لكـی بـە بـن چـەناگەدا هاتبێتەوەو، داكەندن و بەستنەوەی قـورس بێـت، دەشـێت لـە دەسـتنوێژدا لـە جیـاتی سـەر، مەسـحی بكرێـت.. ئەمـەش مەزهـەبی ئیمـام ئەحمـەدو، ئیسحاق و، ئەبو سەورو، ئەوزاعی و، ئیبنو حـەزم و، ئیبنوتەیمییەیـە، كـە لە سەیدنا ئەبوبەكرو، عومـەرو، ئەنـەس و، یـاوەری تـرەوە[١] گێڕراوەتـەوە. چونكە لە پێغەمبەری خواوە، صلی الله علیه وسلم سەلمێنراوە، كە:

١ـ عەمری كوڕی ئومەییەی زەمری گێڕایەوەو، گوتی: (رَأَيتُ رَسولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ مَسَحَ عَلَى الْخُفَّينِ وَالْعِمَامَةِ) [٢] واتە: پێغەمبەری خـوام بینی، صلی الله علیه وسلم مەسحی خوفف و عەمامەكەی كرد..

٢ـ فەرمودەكـەی لای مـوغیرەی كـوڕی شـوعبەمان هێنایـەوە، خـوا لێـی ڕازی بێـت، كـە گـوتی: (أنَّ النَّبيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيـهِ وَسَلَّمَ تَوَضَّأَ فَمَسَحَ عَلَى خُفَّيهِ، وَمُقَدَّمَ رَأسِهِ وَعَلَى عِمَامَتِهِ)[١] واتە: پێغەمبەر صلی الله علیـه وسـلم، دەستنوێژی شوشت، ئینجا مەسحی سەر خوففەكانی كـرد، هـەروەها پێشـە سەری و، مەسحی هەمو سەری بەسەر عەمامەكەیەوە كرد.

---

[١] مسائل أبي داود (٨)، المغني (١/٣٠٠)، المجموع (١/٤٠٦)، الاوسط (١/٤٦٨)، المحلى (٢/٥٨)، مجموع الفتاوى (٢١/١٨٤)..

[٢] بوخاری (٢٠٥).

[١] موسلیم (٢٧٥)، ئەبو داود (١٥٠)، ترمزی (١٠٠) قسەیەكیشی لەسەر كردوە، بەڵام شێخی ئەلبانی ڕەحمەتی بە سەحیحی داناوە..

٣ ـ بیلالی حەبەشی، خوا لێی ڕازی بێت، دەڵـێ: (رَأَيتُ رَسولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ مَسَحَ عَلَى الْخُفَّينِ وَالْخِمارِ) [١] واتـە: پێغەمبـەری خـوام بـینی صلى الله عليه وسلم مەسحی خوففەکان و عەمامەکەی کرد..

ئیمـام ئـەبو حەنیفـەو، یـاوەرانی، هـەروەها ئیمـام مالیـك و، ئیمـام شافیعی [٢] دەڵێن: نابێت بە تـەنها بەسـەر عەمامـەدا مەسـح بکرێـت، بـەڵکو لەگەڵ پێشە ناوچەواندا دەبێت، ئەو کاتەش مەسحی پێشە ناوچەوانە، کە هێنانەدی فەرزەکەیەو، مەسحی سەر عەمامەکە زیادەی سوننەتە [٣].. بـەڵام ئیمـام شـافیعی گوتویـەتی: ئەگـەر فەرمودەکـە سـەلمێنرا، دیـارە ئـەوە، حوکمەکەی لەسەر ئەو بینا دەکرێت.. الحمد للـه فەرمودەکـەش پێشـەوای فـەرمودەوانانی، وەکـو ئیمـام موسـلیم، لـە دوای ئیمـام شـافیعی هـاتون و، سەلماندویانە..

ئەو پۆلە شەرعناسانەی، کـە ڕێ لـە مەسـحی عەمامـە دەگـرن، دەڵێن: فەرمودەکـەی سـەیدنا جـابری کـوڕی عبداللـە، خـوا لێـی ڕازی بێـت، بەڵگەمانە، کـە گـوتی: (أنَّ النَّبيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيـهِ وَسَلَّمَ تَوَضَّأَ فمَسَحَ عَلَى خُفَّيهِ، وَمُقَدَّمَ رَأْسِهِ وَعَلَى عِمَامَتِهِ) [١] واتە: پێغەمبەر صلى الله عليـه وسـلم، دەستنوێژی شوشت، ئینجا مەسحی سەر خوففەکانی کـرد، هـەروەها پێشـە سەری و، مەسحی هەمو سەری بەسەر عەمامەکەیەوە کرد.

---

[١] موسلیم (٢٨٥).

[٢] حاشیە ابن عابدین (١/ ١٨١)، حاشیە الدسوقی (١/١٦٤)، المجموع (١/٤٠٧)..

[٣] خۆی لە مەزهەبی هەردووئەو ئیمامە بەرێزانەدا، مەسحی کەمێکی سەر، فەرزی مەسح دێنێتە دی، بۆیە واشیان گوتوە..

[١] موسلیم (٢٧٥)، ئەبو داود (١٥٠)، ترمزی (١٠٠) قسەیەکیشی لەسەر کردوە، بەڵام شێخی ئەلبانی ڕەحمەتی بە سەحیحی داناوە..

ئەمما ئەو فەرمودەیەی تـر، کـە هەنـدێکیان کردویانـە بـە بەڵگە، کـە سەیدنا موغیرە خوا لێی ڕازی بێت، کە دەڵێ: (رَأيتُ النَّبيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ حَسَرَ الْعِمَامَةَ عَنْ رأسِهِ وَمَسَحَ عَلَى نَاصِيَتِهِ)[1] واتە: پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم، بـینی سـەری ڕوت کـردو، مەسـحی پێشـە ناوچەوانی کرد.

بە هەر حاڵ هەردوو لا بەڵگەیان بە دەستەوەیە، بەڵام، پێم وانیە ئەو شەرعناسە بەرِێزانەی، گوتویانە: مەسحی سەر عەمامە، بـە تـەنها فـەرزی مەسحی سەر ناهێنێتە دی، بەڵگەی بەهێزیان بـە دەسـتەوە بێـت، چـونکە ئەوەش سەلمێنـراوە، کە پێغەمبەری پێشەوا، صلى الله عليـه وسلم مەسـحی سەری پیرۆزی، بەسەر عەمامەکەوە کردوە..

پێم وایە مەسحی سەر عەمامە، فەرزێتی مەسحی سەر دەهێنێتـە دی، بەڵام بۆ ئەوەی لە ڕاجوێیی دەرچین، دەشێت پێشە ناوچەوانیشی، ئەگـەر مومکین بو لەگەڵدا مەسـح بکرێـت، ئەگـەر، نـا، مەسـحی سـەر عەمامەکە بەسە.. والله اعلم.

**دووەم: مەســحی سەرپۆشــی ئافرەتــان:** ئیمـام ئیبنوتەیمییـە دەڵێ: ئەگەر ئافرەتێك ترسـی سـەرماو شـتی وای هـەبو، دەتوانێـت بەسـەر سەرپۆشەکەیدا، مەسحی سەری بکات، چونکە خاتو ئوم سەلەمە، خوا لێـی ڕازی بێــت، مەســحی ســەری لەســەر سەرپۆشــەکەیەوە دەکــرد.. بــەڵام پێویستیشە لەگـەڵ ئەمـەدا، چـەند تاڵـە مویـەکی سەریشـی مەسـح کـات،

---

[1] پێم سەیر بو، کە شێخ کەمال ئیبنو السەید لە صحیح فقه السنة (١/١٥٩)دا نوسیوێتی: (بە سنەدەوە نەمدیوە) منیش زۆری بۆ گەڕام کەمم بینی و هەموشیم هەر بێ سەنەد دەبینی!! ئیتر نازانم چۆن دەبێتە بەڵگەی حوکمی شەرعی لای هەندێك کەس..

ئەگـەر هـیچ هۆیـەکی مەسـح کردنـی بەسـەر سەرپۆشـەوە نـەبو، ئـەوە ڕاجوێییەك، لە نێوان شەرعناساندا هەیە، کە ئایا جائیزە یان نا.[١]..

ئیمـام ئـەبو حەنیفـەو، مالیـك و، شـافیعی و، قـەولێکی حەنبەلیـەکان[٢] پێچەوانەی ئەمەیە، پێیان وایە، کە مەسحی سەرپۆش نابێت.. بـەڵام ڕای حەســەنی بەســری و، بۆچــونی پەســەندکراوی مەزهــەبی حەنبــەلی، جـائیزبونێتی بـەو مەرجـەی سەرپۆشـەکە وا بێـت، لـە لای ملیـەوە قـایم کرابێت.

ئەمما ئەو ڕیوایەتـەی، کـە لـە خـاتو عائیشـەخانەوە دەگێڕرێتـەوە، کـە دەستی بردۆتە ژێر سەرپۆشەکەیەوەو، مەسحی سەری کردوەو، گوتویەتی: بەم شێوەیە پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم فـەرمانی پـێ کـردوم[٣].. بێگومـان ئـەو ئافرەتانـەی، کـە مەترسـی دەرکـەوتنی قـژیان لای پیـاوانی نامەحرەم هەیـە، یـان سەرپۆشـەکانیان وا بەسـتوە، کردنـەوەی زەحمەتـە، هەروەها ئەو ئافرەتانەی، سەریان لە خەنە گرتـوە، زیـاتر موحتـاجی ئـەم فەتوایەن..

لەبـەر نـەبونی بەڵگـەی بەربەسـت و، قیـاس لەسـەر عەمامـەی پیـاوان، پێم وایە مەسحی سەر بـە سـەر سەرپۆشـەوە، بـۆ کـاتی پێویسـت جـائیزە، بەو مەرجەی هەندێك تاڵە موی سەریشی پێوە تەڕ ببێت. والله اعلم.

---

[١] مجموع الفتاوى (٢١/٢١٨).

[٢] المدونة (٤٢/١٠)، الام (٢٦/١)، البدائع (٥/١)، المغني (٣٠٥/١).

[٣] کاسانی حەنەفی لە البدائع (٥/١) هێناویێتیەوە، بەڵام لە هیچ سەرچاوەیەکی فەرمودەدا، نەمدۆزیەوە، ئەگەر بسەلمێنرێت، چارەسەری ڕاجوێیی دەکات..

## دووەم: مەسحی كڵاو:

لای جمهوری شەرعناسان، مەسحی سەر كڵاو لە دەستنوێژدا جائیز نیە، چونكە وەكو عەمامە نیە، لە لایەكەوە فەرمودەی لەسەر بێت و، لە لایەكی ترەوە كردنەوەو بەستنەوەی گران بێت.. بەڵام ئیمام ئیبنو حەزم و، ئیبنو تەیمییە بەلایانەوە جائیزەو دەڵێن: كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم، مەسحی عەمامەی كردوەو، تەڕێتی دەستی نەگەیشتۆتە مووەكانی سەری، لە حاڵەتی مەسحی كڵاوەكەشدا، هەمان دیاردە دووپات دەبێتەوەو، تەڕێتیەكە ناگاتە مووەكان، ئیتر چ جیاوازیەكیان هەیە ؟!

پێم وایە مەسحی سەر كڵاو، جائیز نیە، چونكە بەرزكردنەوەو، لابردنی كڵاو، وەكو كردنەوەو بەستنەوەی عەمامە نیەو، ئاسانە..والله اعلم.

★ ★ ★

## چوارەم: مەسحی گەچی شكاویی

گەچی شكاویی چیە ؟: ئێمە مەبەستمان لەم زاراوە (جەبیرە)ی زمانی عەرەبیە، جەبیرە بریتیە لە دوو پارچە دار، یان تەختە، كە بۆ ڕاست كردنەوەی شكاویی دەپێچرانە پەلە شكاوەكە، كە ئێستا لەم سەردەمەی ئێمەدا، كەرەستەی تری تێدەگرن، كە كورد پێی دەڵێ: گەچ..

هەر كەسێك پەلێكی شكاوی وەك بازو لولاق، یان لە جێچوی وەكو، ئانیشك و پێ، یان لەبەر هەر پێویستیەكی تر، گرتبێتە گەچ، بۆی هەیە

لە دەستنوێژدا لە جیاتی شوشتنیان مەسحیان بکات.. ئەمەش ڕای چوار ئیمامە بەرێزەکەو، شەرعناسانی ترە[1]، بەلگەشیان:

١ ـ ئیبنو عومەر، خوا لێیان ڕازی بێت، دەڵێ: هەر کەسێك شوێنێکی بریندار بو بێت و، بەستبێتی، لە کاتی دەستنوێژدا، شوێنە بەستراوەکەی مەسح دەکات و، دەوروبەری دەشوات[2]. شەرعناسان گوتویانە: لە نێوان یاوەراندا کەس پێچەوانەی ئەم بۆچونەی ئیبنو عومەر نەبوە

٢ـ قیاس لەسەر مەسحی گۆرەوی، کە لە حاڵەتی پێویستی نەبونیشدا، جائیزە مەسح بکرێن، چ جای گەچ، کە پێویستە..

## چەند خاڵێکی پێویست:

### ١ . مەسحی سەر گەچ بۆ دەستنوێژو غوسڵ دەرکردنیشە:

واتە، ئەگەر کەسێك لەشگران (توشی جەنابەت) بو، ئەو شوێنانەی بشوات، کە دەتوانێت، پاشان مەسحێکی سەر گەچەکەی بکات.

**٢ . مەسحی سەر گەچ مەرجەکانی خوففی نیە:** وەك ئەوەی دەبێت لەسەر هەبونی دەستنوێژ تێی گیرابێت، یان کاتی بۆ دیاری کرابێت، چونکە لە لایەکەوە هیچ دەقێك لەبەر دەستدا نیە، لە لایەکی تریشەوە، جاری وا هەیە دەستنوێژ گرتن، لە پێش گەچ تێگرتنەکەدا مومکین نیە، کابرای دەست شکاو، دەچێتە لای پزیشك، یان حەکیمێك و دەسبەجێ بۆی دەگرێتە گەچ، لەوانەیە ڕێی دەستنوێژگرتنی نەبێت، هەروەها کاتی بۆ دیاری نەکراوە، وەك ئەوەی بۆ خوفف دیاری کراوە..

---

[1] شرح فتح القدير: ١/١٤٠)، المدونة (٢٣/١)، المغني (٢٠٣/١)، المجموع (٢ / ٣٢٧).

[2] ئیبنو ئەبی شەیبە (٢٣٦)، بەیهیقی (٢٢٨/١). کەمالی ئیبنو السەید لە صحیح فقه السنة (١٦١/١) دا دەڵێ: إسناده صحيح.

## حوکمی پێچان و لەفاف

هەر هەمان حـوکمی گەچیان هەیـەو، ئەندامـە پێچـراوەکان، لـە کـاتی دەستنوێژو غوسڵ دەرکردندا مەسـح دەکـرێن.. توێژینـەوەی وردەکارانـەی ئەمەش، لای ئیمام ئیبنو تەیمییەیە[١]..

★ ★ ★

---

[١] مجموع الفتاوى (٢١/١٨٥).

# باسی هەشتەم

# غوســــــڵ

- چی غوسڵ پێویست دەکات ؟
- غوسڵی سوننەت.
- ڕوکنەکانی غوسڵ.
- سوننەتەکانی غوسڵ .
- دوو بیر خستنەوە.
- غوسڵی ئافرەت.
- خۆ وشك كردنەوە.
- هەندێك مەسەلەی تر.
- بابەتی تری لەشگرانی

# باسی هەشتەم

## غوســڵ

**پێناسـەی غوسـڵ**: لـە زمانەوانیـدا: غوسـڵ: شوشـتنە. لـە زاراوەدا: غوسـڵ: خۆشوشـتنە، کـە بریتیـە لـە ڕۆیشـتنی ئـاوی پـاك، بەسـەر هـەمو جەستەدا[١].

## چی غوسڵ پێویست دەکات ؟!

واتە ئەو ڕەفتارانەی، کە غوسڵی شەرعی فەرز دەکەن، کە بریتیە لە:

**یەکەم: هاتنە دەرەوەی مەنی لە کاتی خەو بێداریی تەندروستدا :**

١ـ چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُمۡ جُنُبٗا فَٱطَّهَّرُواْ﴾ المائدە/٦ واتـە: ئەگـەر لـەش گـران بـون (لـە جەنابەتـدا بـون)، دەبـێ خۆتـان بـە شوشتنی لەشتان پاك کەنەوە. هـەروەها دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا

---

[١] ابن حجر العسقلاني: التلخيص الحبير في تخريج أحاديث الرافعي الكبير / كتاب الطهارة / الغسل / مسألة ١٧٩: دوای باس کردنی ڕاجوێیی، هەر لە بەیهیقیەوە نەقڵ دەکات و، دەفەرموێ: (إِنَّمَا الْمَاءُ مِنْ الْمَاءِ) كَرَّرَهُ فِي مَوْضِعٍ آخَرَ مِنْهُ، وَقَدْ رَوَاهُ مُسْلِمٌ مِنْ حَدِيثِ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ مُطَوَّلًا، وَفِيهِ قِصَّةُ عِتْبَانَ بْنِ مَالِكٍ، وَاقْتَصَرَ الْبُخَارِيُّ عَلَى الْقِصَّةِ، دُونَ قَوْلِهِ: { الْمَاءُ مِنْ الْمَاءِ }، وَرَوَاهُ أَبُو دَاوُد وَابْنُ خُزَيْمَةَ وَابْنُ حِبَّانَ، بِلَفْظِ الْبَابِ، وَرَوَاهُ أَحْمَدُ وَالنَّسَائِيُّ وَابْنُ مَاجَهْ وَالطَّبَرَانِيُّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي أَيُّوبَ وَرَوَاهُ أَحْمَدُ، مِنْ حَدِيثِ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ، وَمِنْ حَدِيثِ عِتْبَانَ بْنِ مَالِكٍ، وَالطَّحَاوِيُّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنُ شَاهِينَ فِي نَاسِخِهِ، مِنْ حَدِيثِ أَنَسٍ، وَقَدْ جَمَعَ طُرُقَهُ الْحَازِمِيُّ، وَقَبْلَهُ ابْنُ شَاهِينَ

تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغۡتَسِلُواْ﴾النساء/٤٣ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، لەو کاتانـەدا، کـە سەرخۆشـن تـوخنی نوێـژ نەکەونـەوە، تـا بـزانن چـی دەڵـێن، لـەو کاتانەش، کە لەشگرانن (لە جەنابەتدان)، تا خۆتان دەشۆن، مەگەر ڕێبوار بن.

٢ــ ئـەبو سـەعیدی خـودری، خـوا لێـی ڕازی بێـت دەگێڕێتـەوە، کـە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، فەرموی: (إنّمَا المـاءُ مِـن المـاءِ)[1] واتـە: ئـاو بـەخۆدا کـردن، کـە غوسـڵ دەرکردنـە، بـە هـۆی هاتنـەوەی ئـاوەوە (مەنی)یە.

ـ پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم بـە سـەیدنا عـەلی فـەرمو: (إذا فضَحْتِ الماءُ فاغْتسِلْ)[2]. واتە: ئەگەر ئاو (مەنی)، بە شێوەی هەڵقوڵین هاتە دەرێ، خۆت بشۆ.. ئەمەش دیارە، کە بە ئارەزووەوەیە، چونکە خوای گەورە لـە باسـی دروسـت بـونی مرۆڤـدا دەفـەرموێ: ﴿خُلِقَ مِن مَّآءٍ دَافِقٍ﴾ طارق/٦ واتە: لە ئاوێکی هەڵقوڵاو دروست کراوە..

٣ ـ خاتو ئوم سەلەمە، خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، کە ئوم سولیمی ژنی ئەبو تەلحە، خـوا لێیـان ڕازی بێـت، هاتـە خزمـەت پێغەمبـەری خـوا، صلى الله عليه وسلم و فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا، خوای گەورە شـەرم لە باسکردنی هەق ناکات، ئایا ئەگـەر ئـافرەت شـەیتانی بـو (لـە خەونیـدا لەگەڵ پیاودا جوت بو) غوسڵی دەکەوێتە سەر؟! پێغەمبەری خوا صلى الله

---

[1] موسلیم (٣٤٣)، ئەبو داود (٢١٤).

[2] ئەبو داود (٢٠٦)، نەسائی (١٩٣)، ئەحمەد (١/٢٤٧). ئەسڵەکەشی لە سەحیحەیندایە

علیه وسلم فەرموی: (نَعَمْ، إذَا رَأَتِ المَاءَ)[١] واتـە: بـەڵێ، ئەگـەر ئـاوی بـینی.. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بینین و، هەست پێکردنـی هاتنـەدەرەوەی مـەنی، بە شێوەی هەڵقوڵین..

ئەگەر مەنی بە دەرپێکەیـەوە بـینی، غوسـڵی لەسـەر فـەرز دەبێـت، با شـەیتانیش نـەبوبێت، چـونکە دەشـێت خـراپ خـەوتبێت.. بـەڵام، ئەگـەر خــەونی بــینی و، ئــاوی نەهاتــەوە، غوســڵی ناکەوێتــە ســەر.. چــونکە عائیشـەخان خـوا لێـی ڕازی بێـت، دەڵـێ: پرسـیاریان لـە پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیه وسلم کرد، کە کابرا، کە لـە خـەو هەڵدەسـتێت، تـەڕێتی بـە خۆیەوە دەبینێت، ئەگەرچی خەونیشی نـەدیوە، فـەرموی: (يَغْتَسِلُ) واتـە خۆی دەشوات.. پرسیاریان کردەوە: ئەدی ئەگەر کـابرا خـەونی شـەیتانیی بینی، بەڵام تەڕێتی بە خۆیەوە نەدی، ئایـا غوسـڵی لەسـەرە؟! فـەرموی (لا غُسْلَ عَلَيهِ)[٢] واتە: غوسڵی لەسەر نیە..

ـ حوکمی ژن و پیاو لەم مەسەلەیەدا وەکو یەکە..

ـ هەر کەسێك مـەنی، بـە هـۆی سـەرماو نەخۆشـیەوە لـێ بێتـە دەرەوە، غوسڵی ناکەوێتە سەر، چونکە وەکو باسـکرا، مـەرجی فـەرز بـونی غوسـڵ هاتنــە دەرەوەی مەنییــە، بــە شــێوەی هــەڵقوڵین، ئەمــە ڕای جمهــوری شەرعناسانە، جگە لە ئیمام شافیعی و ئیبنو حەزم..

---

[١] بوخاری (٢٨٢)، موسلیم (٣١٣).

[٢] ترمزی (١١٣)، ئەبوداود (٢٣٣)، کەمال ئیبنو السەید لە صحیح فقه السنة (١/ ١٦٣)دا دەڵێ: سەحیحە..

شەرعناسان ڕایان لەسەر ئـەوە کۆیـە، کـە هـەر کەسـێك لـە بێدارییـدا، مەنیی بەچێژەوە لێ هاتـە دەرەوە، یـان لـە کـاتی خەوتنیـدا هاتـە دەرەوە، ئەوە غوسڵی لەسەرە[1]..

ئەوەی، کە ئیبراهیمی نەخەعی گوتویەتی، کە گوایە لەم حوکمـەدا ژن وەکو پیاو نیەو، بە خەونی شەیتانیی بون، غوسڵی لەسەر فەرز نابێت، بێ بەڵگەیـە.. ئیمـام شـەوکانی لـە بەرپەرچدانەوەیدا دەڵـێ: وا نـازانم، هـەر ڕیوایەتەکـە لـە ئیبراهیمـی نەخەعیـەوە ڕاسـت بێـت، چـونکە ئەگـەر وای گوتبێت، ئەوە پێچەوانەی موسوڵمانانی پێش و پاش خۆی کردوە[2]..

**دووەم: بە بەرکەوتنی جێ خەتەنەی پیاو ژن، با ئاویشیان نەهاتبێتەوە:**

ئەگـەر گۆپکـەی زەکـەری پیـاو، لـە عـەورەتی ئافرەتێکـدا بـزر ببێـت، ئاویان بێتەوە، یان نا، غوسڵ لەسەر هەردووکیان فەرزدەبێت؟؟ چونکە:

ـ ئەبوهورەیرە خوا لێی ڕازی بێت گێڕاوێتیـەوە، کـە پێغەمبـەری خـوا، صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (إِذَا جَلَسَ بَيْنَ شُعَبِهَا الْأَرْبَعِ، ثـمَّ جَهَـدَهَا، فَقَـدْ وَجَبَ الْغُسْلُ (وَإِنْ لَـمْ يُنْـزِلْ )[3] واتـە: ئەگـەر لـە نێـوان چوار پەلیـدا دانیشـت و، سـەرجێیی لەگـەڵ کـرد[4]، ئـاو بێتـەوە، یـان نەیاتـەوە غوسـڵی لەسەر فەرزە.

---

[1] المجموع (١/١٣٩)، بداية المجتهد (١/٥٨).
[2] الشوكاني: السيل الجرار (١/١٠٤).
[3] بوخاری (٢٩١)، موسلیم (٣٤٨).
[4] شەرعناسان لە لێکدانەوەی وشەکانی ئەم فەرمودەدا زۆر لق و پۆپیان لێ کردۆتەوە، کە مەبەست لە شعبها الاربع چیەو، مەبەست لە جهدها چیە.. ئایا ئەمانە هەموی کینایەن بۆ

ـ عائیشەخان خوا لێی ڕازی بێت، گێڕاویێتیەوە: (أنَّ رَجُلًا سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ الرَّجُلِ يُجَامِعُ أَهْلَهُ ثُمَّ يُكْسِلُ هَلْ تَرَى عَلَيْهِ مِنْ غُسْلٍ ؟ وَعَائِشَةُ جَالِسَةٌ فَقَالَ عَلَيْهِ السَّلَامُ: إِنِّي لَأَفْعَلُ ذَلِكَ أَنَا وَهَذِهِ ثُمَّ نَغْتَسِلُ )[١] واتە: كابرایەك لە پێغەمبەری خوای پرسی، صلی الله علیه وسلم: ئەگەر كەسێك لەو كاتی سەرجێیی، لەگەڵ خێزانی دەكات و، پاشان خاوبێتەوە (سیس بێتەوەو جیماعەكە تەواو نەكات)، ئایا غوسڵی دەكەوێتە سەر؟! پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم لەو كاتە، كە خاتو عائیشەخانیش لەوێ بو فەرموی: من و ئەمە وا دەكەین و، پاشان غوسڵی خۆمان دەردەكەین.

ئیمام نەوەوی دەڵێ: كاتی یاوەران و تابعین هەندێك، ڕاجوێیی لەم مەسەلەیەدا هەبو، بەڵام ئێستا ڕاجوێیی نەماوەو، كۆڕا (ئیجماع) لەسەر ئەمەیە، كە باسمان كرد.. كە غوسڵ بە كاری سەرجێیی، فەرز دەبێت، با هەردووكیان، یان یەكێكیشیان ڕەحەت نەبوبێت..

ئەمەی ئیمام نەوەوی ڕونی كردەوە، كۆڕای شەرعناسانە، بەڵام داودی زاهیری كاری پێ ناكات، چونكە بەلایەوە ئەو سەرجێییەی، كە ئاویانی تێدا نەهاتبێتەوە، غوسڵیان ناخاتە سەر، چونكە پێغەمبەری خوا فەرمویەتی (إِنَّمَا الْمَاءُ مِنَ الْمَاءِ)[٢] واتە: ئاو بە خۆدا كردن، كە غوسڵ دەركردنە بە هۆی هاتنەوەی ئاوەوە (مەنی)یە.. بەڵام شەرعناسان ئەمەیان ڕەت كردۆتەوە، ئیمام ترمزی لە توێژینەوەی خۆیدا رونی

---

خودی سەرجێییەكە، بەڵێ دەشێت وا بێت، بەڵام ئیمامی خەتتابی دەڵێ: جهد خۆی بە مانای سەرجێیی (جیماع) كردن دێت.. ئیتر چ پێویست بەو هەمو لێكدانەوەیە ؟!

[١] موسلیم (٣٥٠).

[٢] موسلیم (٣٤٣)، ئەبو داود (٢١٤).

كردۆتەوە،[١] كە ئەو حوكمە لـە سـەرەتادا وابـوە، كـە غوسـڵیان لەسـەر فـەرز نەبوە، بەڵام دواتر، یاوەرانیش ڕایان هاتۆتـە سـەر فـەرزبونی غوسـڵەكەی، ئەوەش ڕای ئوبەی كوڕی كەعب و، ڕافیعی كوڕی خەدیجە خوا لێیان ڕازی بێت، كە یاوەرانی پێغەمبەرن، صلى الله عليه وسلم [٢]..

من پێم وایە، ئەگەر زەكەری پیاوەكە، لـە عـەورەتی ژنەكـەدا بـزر بـو، غوسڵەكەیان دەكەوێتە سەر، ئاویان هاتبێتەوە، یان نا..

## چەند خاڵێكی تر:

١ ـ ئەگەر زەكـەری كـابرا بـەر عـەورەتی ئافرەتەكـە كـەوت، بـێ ئـەوەی بچێتە ژورەوە، پاشان كابرا ڕەحەت بو (ئاوی هاتەوە)، غوسڵ هـەر لەسـەر كابرایە، نەك لەسەر ژنەش..

٢ـ ئەگـەر زەكـەری كـابرا كەوتـە بـەر عـەورەتی ژنـە، بـەڵام گۆپكـەی زەكەری نەچوە ژورەوەو، مەنی پیاوەكە ڕژایە عەورەتی ژنەكەوە، یان ژنە بە دەمی بـۆی مـژی و، بـە ئەنقەسـت مەنییەكـەی ڕژانـدە عـەورەتی، یـان كـونی دواوەی خۆیـەوە، پاشـان لێـوەی هاتـەوە دەرەوە، غوسـڵ لەسـەر ژنـە نیە.. غوسڵەكە تەنها لەسەر كابرایە..

ئیمام نەوەوی ڕەحمەتی خوای لێ بێت ـ كە ژنیشـی نـەهێناوە ـ دەڵـێ: ئەگەر ئافرەتەكە مەنی پیاوەكەی ڕژانـدە پێشـی، یـان پاشـی خـۆی و، لێـی

---

[١] ترمزي (١/١٨٥)،

[٢] تەفسیلی توێژینەوەكان وا لە كتێبی: ابو عمير الاثري: شفاء العيي بتحقيق مسند الشافعي (ل ١٠٠).

هاتەوە دەرەوە، غوسڵی ناکەوێتە سەر.. ئەمەش ئەو ڕایە دروستەیە، کە جمهوری شەرعناسانی لەسەرە[1]..

٣ ـ ئەگەر کابرا سەرجێیی لەگەڵ ئافرەتە کردو ڕەحەت بو، مەنیەکەی ڕژابوە ئافرەتەکەوە، پاشان ئافرەتە غوسڵی دەرکرد، بەڵام دوایی مەنیی کابرای لێ هاتە دەرەوە، غوسڵی لەسەر نیە.. بەڵام بە ڕای جمهوری شەرعناسان، دەستنوێژی شکاوە، دەبێت بیگرێتەوە، چونکە شتێك، با پاکیش بێت لە عەورەتی هاتۆتە دەرەوە..

ئیمام ئیبنوحەزم دەڵێ دەستنوێژیشی نەشکاوە، چونکە مەنی کابرا، کە پاکە چۆتە شوێنێکی پاکەوەو، لێوەی هاتۆتەوە دەرەوە، لە بۆڕی میزیشیەوە نەهاتوە، تا بە شوێنی پیسدا هاتبێت.. مەگەر سڵ لەوە بکرێتەوە، کە تێکەڵ بە مەزیی ئافرەتەکە بوبێت، کە پیسە.. لەبەر ئەمەیە، کە هەندێك لە شەرعناسان، هەردوو ڕایەکانیان پێکەوە سازاندوەو، گوتویانە: لە بەر ئەگەری تێکەڵ بونی مەنیە پاکەکە، بە مەزیی ئافرەتەکە، دەستنوێژ گرتنەوەکەی باشترە[2].. منیش ئەمەم پێ پەسەندترە.

٤ ـ ئەگەر ئافرەتەکە منداڵ بو، هێشتا نەکەوتبوە حەیزەوە، یان نێرینەکە منداڵ بو، باڵغ نەبوبو، غوسڵ لەسەر هەردوولایان فەرز دەبێت.. ئەمەش ڕای ئیمام ئەحمەدە[3]..

---

[1] المجموع (٢/١٥١)، المحلى (٢/٧).
[2] صحيح فقه السنة (١/ ١٦٥).
[3] المغني (١/٢٠٦).

٥ ـ ئەگەر کابرا داوای سەرجێیی لە ژنەکەی کرد، بۆی نیە ـ بەو بەهانەی کە ئاویان بەشی غوسڵ دەرکردن نیە ـ رەفزی کات.. ئیمام ئیبنوتەیمییە ـ کە ئەمیش خۆی ژنی نەهێناوە ـ دەڵێ: ئافرەت بۆی نیە ڕەفزی داوای مێردەکەی بەو بەهانەیە بکاتەوە، کە ئاوی خۆشوشتنیان نیە، نابێت، با کاری سەرجێیی خۆیان بکەن، ئەگەر ئاویان دەسکەوت غوسڵەکە دەردەکات، ئەگەر نەبو، تەیەمموم بکات[1]..

### سێیەم و چوارەم: حەیزو زەیستانی:

حەیز (سوڕی مانگانە) و زەیستانی، هەردووکیان هۆی واجب بونی غوسڵن، بەڵام ئەو کاتە فەرز دەبن، کە کاتیان تەواو بوبێت.. عائیشەخان، خوا لێی ڕازی بێت دەگێرێتەوە، کە پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم، بە فاتیمەی کچی ئەبو جەحشی فەرمو: (إِذَا أَقْبَلَتِ الْحَيْضَةُ فَدَعِي الصَّلَاةَ وَإِذَا أَدْبَرَتْ فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ وَصَلِّي)[2] واتە: ئەگەر کەوتیتە حەیزەوە، واز لە نوێژەکان بهێنە، ئەگەر تەواو بو، غوسڵ دەرکەو، نوێژەکانت بکە.

حوکمی زەیستانیش کۆڕای شەرعناسانی لەسەرە، کە وەکو حوکمی حەیزە، باسی دورودرێژی ئەم مەسەلەیە دواتر دێت. ان شاء الله..

### پێنجەم: موسوڵمان بونی کافر:

شەرعناسان لەسەر حوکمی غوسڵی، ئەو کافرەی موسوڵمان دەبێت، سێ پۆلە ڕاوبۆچونیان هەیە:

---

[1] مجموع الفتاوى (٢١/٤٥٤).
[2] بوخاری (٣٢٤)

**یەکەم: ئەگەر کافر موسوڵمان ببێت، دەبێ غوسڵی خۆی دەرکات:** ئەمە مەزهەبی مالیك و، ئەحمەدو، ئەبو سەورو، ئیبنو حەزمەو، ئیبنول مونزیرو، خەتتابیش بە پەسەندترینیان داناوە[١].. بەڵگەشیان:

١ ـ قەیسی کوڕی عاسم، خوا لێی ڕازی بێت، دەگێڕێتەوە، کاتێك، کە موسوڵمان بوە، پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم، فەرمانی پێدا (أنْ يَغْتَسِلَ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ) [٢] کە خۆی بە ئاو سیدر بشوات.. فەرمانیش بۆ فەرز بونە.. کەوابو غوسڵ دەرکردنی کافر فەرزە..

٢ ـ ئەبو هورەیرە، خوا لێی ڕازی بێت، دەڵێ: کە سومامەی کوڕی ئەسسال (ثمامة بن أثال) موسوڵمان بو، پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم، فەرمانی کرد: (إذْهَبُوا بِهِ الَى حَائِطِ بَنِي فُلانٍ فَمُرُوْهُ أنْ يَغْتَسِلَ)[٣] کە بیبەنە باخی تیرەی فلانی، با لەوێ غوسڵ دەرکات..

٣ ـ بەسەرهاتی موسوڵمان بونی، ئوسەیدی کوڕی حوزەیر، خوا لێی ڕازی بێت، کە ویستی موسوڵمان ببێت، لە موسعەبی کوڕی عومەیرو، ئەسعەدی کوڕی زورارەی، پرسی خوا لێیان ڕازی بێت: ئەگەر ویستتان

---

[١] مواهب الجليل (٣١١/١)، المغني (١٥٢/١)، المجموع (١٧٥/٢)، المحلى (٤/٢).

[٢] ئەبوداود (٣٥٥)، ترمزی (٦٠٥)، نەسائی (١٠٩/١) ، سەحیحە.. سیدر: گەڵایەکی بۆن خۆش بوەو بۆ پاکژیی بەکار هاتوە..

[٣] ئەحمەد (٣٠٤/٢)، ئیبنوخوزەیمە (٢٥٢)، ئەسڵەکەشی لە سەحیحەیندایەو ئەلبانیش لە ارواو الغليل (١٢٨) دا دەڵێ: سەحیحە.

بچنە ئەم دینەوە، چی دەکەن؟! گوتی: غوسڵ دەردەکەیت و، پۆشاکەکانت پاك دەکەیتەوەو، شایەتمان دێنێت و، نوێژ دەکەیت[١]..

**دووەم: ئەگـەر کـافر موسـوڵمان بـبیٚ باشـتر وایـە غوسـڵ دەرکات لەبەر لەشگرانی پێشوی:** ئەمەش مەزهەبی ئیمام شافیعی و، قەولێکی ئیمام ئەبو حەنیفەیە[٢]..

**سێیەم: ئەگـەر کـافر موسـوڵمان بـبیٚ غوسـڵی لەسـەر نیـە:** ئەمەش مەزهەبی ئیمام ئەبو حەنیفەیە[٣].. بەڵگەشیان:

١ ـ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَنتَهُواْ يُغۡفَرۡ لَهُم مَّا قَدۡ سَلَفَ ﴾ الانفال/٣٨ واتە: بە کافرەکان بڵێ: ئەگـەر کۆتـایی بهێـنن، ئـەوا لە رابوردویان دەبوورڕێت..

٢ ـ فەرمودەیەکی مەرفوع، لـە عـەمری کـوڕی عاسـەوە، خـوا لێـی ڕازی بێت هاتوە، کە دەڵێ: (الاسلامُ يَهْدِمُ مَا قَبْلَهُ)[٤] واتە: موسـوڵمان بـون، ئـەوی پێش خۆی دەسڕێتەوە..

ئیمام نەوەوی دەڵێ: پشت بەستن بـەم ئایـەت و فەرمودەیـە، وەکـو دوو بەڵگە بۆ ئەو بۆچونەی، کە دەڵێ غوسڵ لەسەر کافر واجب نابێت کاتێـك، کـە موسـوڵمان بـونی ڕادەگـەیێنێت، پێدەچـێت لاواز بێـت، چـونکە هەردووکیان باس لە سڕینەوەی تاوان و گوناح دەکەن، ئـەگینا خۆ ئەگـەر

---

[١] تەبەری لە تاریخ (٥٦٠/١)، ابن هشام لە: السیره (٢٨٥/٢) و کەمال ئیبنو السەید لە صحیح فقه السنة (١٦٧/١) دا دەڵێ: إسناده صحيح ..

[٢] المجموع (١٧٤/١)، الام (٣٨/١)، ابن عابدين (١٦٧/١).

[٣] شرح فتح القدير (٥٩/١).

[٤] موسلیم (١٢١).

کـابرای کـافر پـێش ئـەوەی موسـوڵمان ببێـت و، قـەرزی لەسـەر بێـت، یـان تۆڵە، بە موسوڵمان بونەکەی لەسـەری لاناچـن و، هـەر لەسـەری دەمێـنن.. غوسڵ دەرکردنەکە مەرجێکە بـۆ پـاك بونـەوە لـە لەشـگرانی، موسـوڵمان بونەکەی لەشگرانیەکەی‌س لەسەر لا نابات[1]..

٣ ـ خـەڵکانێکی زۆر لـە پیـاو ژن موسـوڵمان بـون و نەسـەلمێنراوە، کـە پێغەمبـەری خـوا، صـلی الله علیـە وسـلم فـەرمانی غوسـڵ دەرکردنـی پێکردبن..

ئەگەر ئەوە فەرز بوایە، حەتمەن پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم فەرمانی بە هەر هەمویان دەکرد..

ئیمـام شـەوکانی، لـە ڕەتکردنـەوەی ئـەم بۆچـون وبەڵگانـەدا دەڵـێ: وا دیـارە فـەرمانی غوسـڵ دەرکردنەکـە، بـۆ نەوموسـوڵمان سـەلمێنراوە، کـە واجبە، ئەوە ناکرێتە بەڵگە، کە بە کەسـانی تـری نەفـەرمو بێـت، چـونکە (عَدمُ العلمِ بذلكَ ليسَ عِلْماً بالعَدَمِ) واتە: نەزانینی ئەوە نابێت، بە زانینی نـەبو. ئـەوەی ڕون دەبێتـەوە ئەوەیـە، کـە غوسـڵ دەرکـردن لەسـەر کـافرو هەڵگەڕاوە (مورتەدد)، کە موسـوڵمان دەبـن پێویسـتە[2].. فـەرمودەکانی لای ئەبو هورەیرە[3]و، ئوسەیدی کوڕی خوزەیر[4]، بەڵگەن.. والله اعلم.

پێم وایە کافر، کە موسـوڵمان دەبێت پێویسـتە غوسـڵ دەرکـات.. والله اعلم

---

[1] المجموع (١٧٤/٢).
[2] نیل الاوطار (٢٨١/١).
[3] موسلیم (٢٤٩١)، ئەحمد (٧٩١١).
[4] حاشیەی ٤٥٦.

**شەشەم: نوێژی هەینی ( جومعە ):**

ڕاستترین قەولی شەرعناسان ئەوەیە، كە غوسڵی ڕۆژی هەینی فەرزەو، نەكردنی تاوانە، ئەوەش ڕای ئەبوهورەیرەو، عەمماری كوڕی یاسرو، ئەبو سەعیدی خودری و، پاشان حەسەنی بەسری و، ڕیوایەتی ئیمام مالیك و، ئەحمەدو، بۆچونی ئیبنو حەزمیشە[1].. بەڵگەشیان:

١ ـ ئەبو سەعیدی خودری، خوا لێی ڕازی بێت، دەڵێ: پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم، فەرموی: (غُسْلُ يَومِ الجُمُعَةِ واجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ) واتە: دەركردنی غوسڵی هەینی، لەسەر هەمو كەسێكی باڵغ فەرزە..

٢ ـ ئیبنو عومەر، خوا لێیان ڕازی بێت، دەڵێ: پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم فەرموی: (مَنْ جَاءَ مِنْكُمْ الَى الجُمُعَةِ فَلْيَغْتَسِلْ)[2] واتە: هەر كەسێك لە ئێوە هات بۆ نوێژی هەینی، با غوسڵ دەركات..

٣ ـ ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێت، دەڵێ: پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم فەرموی: (حَقٌّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ أنْ يَغْتَسِلَ فِي كُلِّ سَبْعَةِ أيَّامٍ يَوماً، يَغْسِلُ رَأْسَهُ وَجَسَدَهُ)[3] واتە: لەسەر هەمو موسوڵمانێك واجبە، كە لە حەوت ڕۆژدا ڕۆژێكیان تەرخان كات، كە غوسڵی تێدا دەركات، سەرو جەستەی بشوات..

٤ ـ سەوەبان خوا لێی ڕازی بێت، دەڵێ: پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم فەرموی: (حَقٌّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ السُّوَاكُ، وَغَسْلُ يَومِ الْجُمُعَةِ، وَأنْ يَمَسَّ

---

[1] المحلی (١٢/٢)، الاوسط (٣٤/٤).
[2] بوخاری (٦/٢)، موسلیم (٨٤٤).
[3] بوخاری (٣١٨/٢)، موسلیم (٨٤٩).

مِـنْ طِيـبِ أهْلِـهِ إنْ كَـانَ)[1] واتـە: سـيواك كـردن، واجبـە لەسـەر هـەمو موسوڵمانێك، هەروەها غوسڵی هەینی، ئەوەش، کە ئەگەر بۆنی خۆشـی لـە ماڵدا هەبو، بەکاری بهێنێت..

٥ ـ حەفسەخان خوا لێی ڕازی بێت، دەڵێ: پێغەمبـەری خـوا، صـلى الله عليه وسلم فەرموی: (عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ رَوَاحُ الجُمُعَةِ، وَعَلَـى مَـنْ رَاحَ الجمعـة أنْ يَغْتَسِلَ)[2] واتـە: چونە مزگـەوت، لـە ڕۆژانـی هەینیـدا، لەسـەر کەسانی باڵغ فـەرزە، هـەر کەسـێکیش چـوە نوێـژی هـەینی، فـەرزە غوسـڵی هـەینی دەرکات..

٦ ـ ئیبنو عومەر، خوا لێیـان ڕازی بێـت، دەڵێ: پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليه وسلم فەرمانی پێ کردین، کە ڕۆژانی هەینی غوسڵ دەرکەین[3] ..

ئەم فەرمودانـە بـە وشـەکانی (واجبٌ، فَلْيَغْتَسِـلْ، حَـقٌّ عَلَـى، عَلَـى كُـلِّ، أمَرَنَا) ئەوە ڕون دەکەنەوە، کە غوسڵی هەینی، لەسەر هەمو موسوڵمانێکی باڵغ فەرزە، کە بچێتە نوێژی هـەینی.. کەچـی لەگـەڵ ئەمەشـدا، جمهوری شەرعناسـان دەڵـێن: غوسـڵی هـەینی سـوننەتە، نـەك فـەرز! سەرچـاوەی بۆچونیشیان، دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵێك یاوەری پێغەمبەری خـوا، صـلى الله عليه وسلم، وەکو ئیبنو مەسعودو، ئیبنو عەبباس.. بەڵگەی ئەمانیش:

١ ـ فەرمودە مەرفوعەکەی سـەمورەی کـوڕی جونـدوب، کـە دەفـەرموێ: (مَنْ تَوَضَّأَ يَومَ الجمُعَةِ فَبِهَا وَنِعْمَتْ وَمَنْ اغْتَسَلَ فَالغُسْلُ أفضَلُ)[1] واتـە: هـەر

---

[1] ئەحمەد (٣٤/٤)، ئەلبانی: سلسلة الاحاديث الصحيحة (١٧٩٦).

[2] ئەبو داود (٣٣٨)، نەسائی (٨٩/٣)، ئەحمەد ٦٥/٣)، کەمال ئیبنو السەید لە صحيح فقه السنة (١٦٨/١) دا دەفەرموێ: سەحیحە.

[3] ابوبكر المروزي: الجمعة و فضائلها.. فەرموشیەتی: إسناده حسن..

كەسـێك دسـنوێژ بـۆ هـەینی بگـرێ، ئـەوە چـاكی كـردوە، ئـەوی غوسـڵی دەركردوە، چاكتری كردوە..

٢ـ فـەرمودە مەرفوعەكـەی ئـەبو هـورەیرە، خـوا لێـی ڕازی بێـت، كـە دەفەرموێ: (مَـنْ توَضَّـأ فَأحْسَـنَ الوضُـوءَ، ثـمَّ أتـى الجمُعـةَ فَاسْـتمَعَ وَأنْصَـتَ غُفِرَ لَهُ مَا بينَ الجمعَةِ إلَى الجمعَةِ وَزيادَةُ ثلاثةِ أيَّامٍ)[2]واتە: هەر كەسێك بە ڕێكوپێكی دەستنوێژی بگرێت و، بێـت بـۆ نوێـژی هـەینی، گوێ بگرێـت و خامۆش بێت، خـوای گـەورە لـە گوناحـەكانی ئـەو هەفتـە، بـۆ هەفتەكـەی تری خۆش دەبێت و، زیادەی سێ ڕۆژیشی بۆ دەخاتە سەر..

ئەم پۆلە شەرعناسە بەڕێزە دەڵێن: ئەگەر غوسڵی جومعە فەرز بوایە، نەیدەفەرمو دەستنوێژ بگرێت، بەڵام ئیمام ئیبنو حەجـەری عەسـقەلانی، وەڵامی ئەمانەی داوەتەوە و دەڵێ[3]: ئەمـە نـەفی غوسـڵەكەی تێـدا نیـە، لـە شوێنی تریشدا، بە لەفزی ڕاشكاو هاتوە، كـە دەفـەرموێ: (مَـنِ اغْتسَـلَ) هـەر كەسێك غوسڵ دەركات، كـە لەوانەیـە لەبـەر ئـەوە بێـت، كـە پێشـتر باسـی غوسڵ دەركردنی، پێش چونە مزگەوت كردبێت، بۆیـە باسـی دەسـتنوێژی دوبارە كردۆتەوە..

لەوانەیە فەرز كردنی غوسڵی هـەینی، لـە سـەرەتاوە بوبێـت، تـا هـەمو ئەو یاوەرانەی، كە زۆریـان نـەو موسـوڵمان بـون، فێـری ئـەو پاكوخاوێنیـە

---

[1] ئەبوداود (٣٥٤)، نەسائی (٣/٩٤)، ترمزی (٤٩٧) هەندێك لە فەرمودەوانان بە زەعیفیان داناوەو، ترمزی بە هۆی زۆر بونی سەنەدیەوەو، شێخی ئەلبانیش لە صحيح الجامع (٦١٨٠)دا بە حەسەنی داناوە..

[2] موسلیم (٨٥٧)، ترمزی (٤٩٨) و سەحیحە..

[3] فتح الباري (٢/٤٢٢).

بـبن، کـە مزگـەوت و، جومعـەو، جەماعـەت دەیخوازێـت، دواتـر، کـە لێـی ڕاهاتن، لەسەری سوکتر کردبن..

به هەر حالّ هەردوولا موناقەشەی بەلگەکانی یـەکتریان کـردوە، مـن پێم وایە بەلگەی واجب بونەکە بەهێزترە، بۆیە پێم وایە:

غوسلّی هەینی بۆ هەر کەسێك، کە دەچێتە نوێـژی هـەینی ـ ژن بێـت، یان پیاو ـ و لە توانایدایە، فەرزە.. والله اعلم..

**حەوتەم: مردن:**

ئەمیش هۆیەکە بـۆ واجب بـونی غوسـلّ، بـەلاّم بێگومـان غوسـڵەکە، لەســەر مردوەکــە خــۆی نیــە، بــەڵکو، لەســەر موســوڵمانانی زینــدوی دەوروبەرێتی.. باسی دورودرێژی ئەمە، دواتر لـە ئەحکامـەکانی جـەنازەدا دێت.. إن شاء الله..

★ ★ ★

## غوسڵی سوننەت

**١ . غوسـڵی جەژنـەکان:** زازان (زاذان)، ڕەحمـەتی خـوای لـێ بێـت، دەگێڕێتەوە، کە کابرایەك دەربـارەی غوسـڵی، لـە سـەیدنا عـەلی خـوا لێـی ڕازی بێت پرسـی: گـوتی: حـەز دەکـەیت هـەمو ڕۆژێـك خـۆت بشـۆ. کـابرا وتـی: نـا دەربـارەی غوسـڵ دەپرسـم، گـوتی: ڕۆژی هـەینی، ڕۆژی عارفـە، جەژنـی قوربان، جەژنی ڕەمەزان[1]..

هەروەها لە نافیعەوە هـاتوە، کـە ئیبنـو عومـەر خـوا لێیـان ڕازی بێـت، پێش ئەوەی بچێت بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان، غوسڵی دەردەکرد[2]..

**٢ . غوسڵ دوای هۆش هاتنەوە:** چـونکە پێغەمبـەری خـوا، صـلی الله علیه وسلم، لە کاتی نەخۆشیەکەی کۆتایی تەمەنی پیرۆزیدا فەرموی:: (إغْتَسِلْ مِنْ الاغْمَاءِ)[3] واتە: بە هۆی لەهۆش خـۆ چـونەوە، غوسـڵ دەرکـە.. شەرعناسان، حـوکمی شێتیشـیان خسـتۆتە ڕیـزی، لـەهۆش خـۆ چـونەوەو، گوتویانە: کەسێك، کە بە هۆش خۆی هاتەوە، سوننەتە غوسڵ دەرکات.

**٣ . غوسـڵی حـەج و عـەمرە:** سـەیدنا زەیدی کوڕی سابیت، خـوا لێـی ڕازی بێت، دەڵێ: (رَأَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَجَرَّدَ لِإِهْلَالِهِ، وَاغْتَسَلَ) [4]

---

[1] ئیمامی شافیعی لە(المسند/ل١١٤)ی خۆیدا هێناویەتیەوەو بەیهیقی لە السن(٣/٢٧٨).

[2] ئیمامی مالیك (٤٢٦)، ئیمامی شافیعی لە الام (١/٢٣١).

[3] بوخاری (٦٨٧)، موسلیم (٤١٨).

[4] ترمزی (٨٣١) دەفەرموێ حسن غریب، بەڵام ئەلبانی لە: الارواو (١٤٩) دەفەرموێ: حەسەنە..

واتە: پێغەمبەری خوام بینی صلى الله علیە وسلم لە دەسپێکی حەجدا، پۆشاکی داکەندو غوسڵی دەرکرد..

ئافرەتیش لەو کاتەدا، دەتوانێت غوسڵەکە هەر دەربکات، ئەگەر لە حەیزو زەیستانییشدا بێت. چونکە پێغەمبەری خوا صلى الله علیە وسلم، فەرمانی بە ئەسمائی کچی عومەیس دا، کە لە کاتی حەجدا، محمدی کوڕی سەیدنا ئەبوبەکری سددیقی بو، خوا لێیان ڕازی بێت، غوسڵ دەرکات: (عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ عَنْ أَبِيهِ عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ عُمَيْسٍ أَنَّهَا وَلَدَتْ مُحَمَّدَ بْنَ أَبِي بَكْرٍ بِالْبَيْدَاءِ فَذَكَرَ ذَلِكَ أَبُو بَكْرٍ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ مُرْهَا فَلْتَغْتَسِلْ ثُمَّ لِتُهِلَّ) [1].. لە باسی حەجدا باسی دێتەوە. إن شاء الله..

**٤ . غوسڵی چونە مەککە:** چونکە ئیبنو عومەر خوا لێیان ڕازی بێت، کە دەچو بۆ مەککە، شەو لە ناوچەی (زی توا) دەمایەوەو، سبەی غوسڵی دەردەکردو، بە ڕۆژ دەچوە ناو مەککەوە.. دەیفەرمو: پێغەمبەری خوام صلى الله علیە وسلم دیوە، ئاوای کردوە: (عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ بَاتَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِذِي طُوًى حَتَّى أَصْبَحَ ثُمَّ دَخَلَ مَكَّةَ وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَفْعَلُهُ )[2]..

**٥ . غوسڵ دوای هەر سەرجێییەك، ئەگەر ویستی دیسان بیکاتەوە:** ئەبو رافیع خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَافَ عَلَى نِسَائِهِ أَجْمَعَ، فَاغْتَسَلَ عِنْدَ كُلِّ امْرَأَةٍ مِنْهُنَّ غُسْلا، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَوْ جَعَلْتَهُ غُسْلا وَاحِدًا، فَقَالَ: " هَذَا أَزْكَى وَأَطْهَرُ

---

[1] موسلیم (١٢١٨)

[2] بوخاری (١٥٧٣)، موسلیم (١٢٥٩).

وَأطيَـبُ)[1] واتـه: شـەوێك پێغەمبـەری خـوا، صـلى الله عليـه وسـلم بەسـەر خێزانەکانیـدا گـەڕا، لای ئـەمیان غوسـڵێکی دەردەکـرد، دەچـوە لای ئـەوی تریان، غوسڵێکی تری دەردەکرد.. عەرزم کرد(پێم وت): ئەی پێغەمبـەری خــوا، بۆچــی هــەمو غوســڵەکان ناکــەیت بــە یــەك؟! فــەرموی: (ئــاوا پاکترو‌جوانترو خاوێنترە..

**٦. دوای مـردو شوشتن:** ئـەبو هورەیرە خـوا، لێـی ڕازی بێـت، بـە مەرفوعی دەڵێ: (مَنْ غَسَّلَ مَيِّتاً فَلْيَغْتَسِلْ)[2] واتە: هەر کەسـێك مـردویـەکی شوشت با غوسڵ دەرکات..

**٧ . غوسـڵی نوێژانـەی ژنـانی خـاوەن خـوێنی جـاری:** ئـەو ئافرەتانـەی بـەردەوام خوێنیـان لـێ دێـت، کـە بـە عـارەبی پێـی دەوترێـت (موستەحازە)، بۆیان سوننەتە، ئەگـەر بتـوانن بـۆ هـەر نوێـژێك غوسـڵێك دەرکـەن.. عائیشـەخان خـوا لێـی ڕازی بێـت دەگێڕێتـەوە: (أنَّ أمَّ حَبيبَـةَ اسْتَحِيضَتْ سَبْعَ سِنِينَ، فَسَألَتْ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ عَـنْ ذلِـكَ، فَأمَرَهَا أنْ تَغْتَسِلَ، فَقَالَ: هَذا عِرْقٌ فَكَانَتْ تَغْتَسِلُ لِكُلِّ صَلَاةٍ)[3] واتـە: خـاتو ئوم حەبیبەی خێزانی پێغەمبەری نازدار، صلى الله عليه وسلم، بۆ مـاوەی حـەوت سـاڵی ڕەبـەق، خـوێنی بـەردەوامی هـەبو، بـۆ هـەمو نوێـژێکیش

---

[1] ئەبو داود (٢١٦)، ئیبنوماجە (٥٦٠). کەمال ئیبنو السەيد لە صحيح فقه السنة (١٧٠/١) دا دەڵێ: حەسەنە.

[2] ئەبوداود (٣١٦٢)، ترمزی (٩٩٣) ئیبنو ماجە (١٤٦١)، ترمزی و ئیبنو حەجەرو ئەلبانی بە حەسەنیان ناساندوە.. الارواو (١٧٤/١).

[3] بوخاری (٣٢٧)، موسلیم (٣٣٤).

غوسڵێكی دەردەكرد.. چونكە، كە لە پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم پرسی، فەرمانی پێدا، كە بۆ هەمو نوێژێك غوسڵێك دەركات..

ئیمام شافیعی دەڵێ: گومانی تێدا نیە، كە پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم غوسڵی لەسەر فەرز نەكردوە، بەڵكو غوسڵ دەركردنەكەی، إن شاء الله كارێكی زیادەخێری خۆی بوە[1] ..

ئیمام ئیبنو حەجەری عەسقەلانی، دەڵێ: ئەم فەرمانە هەر وا بە ڕەهایی هاتوەو، مانای دوبارە بونەوەی تێدا نیە، ئەگەرەكە ئەوەیە، كە ئوم حەبیبە خوا لێی ڕازی بێت، خۆی وا لێی تێگەیشتوە، بۆیە ئیتر غوسڵی بۆ هەمو نوێژێكی دەركردوە[2]..

ئەمە كارێك بوە شەوڕۆژی پێنج جار دوپات بۆتەوە، ناشێت، كە لەم ماوە زۆرەدا، جەنابی پێغەمبەری پێشەوا، صلی الله علیه وسلم، كە مێردی ئوم حەبیبەیە، بۆی ڕون نەكردبێتەوە، وەكو، كە ناشێت ئوم حەبیبەی بەڕێزیش، خۆی جارێك نەیپرسیبێت.. ئەگەر غوسڵ لەسەر ئەو ئافرەتانەی، بەردەوام خوێنیان لێ دێت فەرز بوایە ، دەبو ئافرەتانی تری یاوەرانیش، ئەو حوكمەیان پێ بگەیشتایە، خۆ هەر ئوم حەبیبە وا نەبوە.. كە حوكمەكە لە هیچ یاوەرێكی ترەوە نەهاتوە، دیارە فەرمانەكەی پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم بۆ ئوم حەبیبە غوسڵەكەی لەسەر فەرز نەكردوە.. والله اعلم.

جمهوری پێشین و دوایین (سەلەف و خەلەف) ی شەرعناسان، لەسەر ئەوە كۆن، كە ئافرەتی خاوەن خوێنی بەردەوام، غوسڵی بۆ هەمو نوێژێك

---

[1] سنن البیهقي (٣٤٩/١).
[2] فتح الباري (٥٠٩/١).

لەسەر فەرز نیە.. چونکە هەمو ئەو فەرمودانەی لەم بارەوە هەن، (جگـە لـەوەی عائیشـەخان باسـی ئـوم حەبیبـە خـان دەکـات) هـەمو ئـەوانی تـر زەعیفن و، حوکمی فەرز بونی غوسڵیان، لەسـەر ئـەو ئافرەتانـە پـێ فـەرز نابێت، کە خوێنی جارییان هەیە..

★ ★ ★

## ڕوکنەکانی غوسڵ

**یەکەم: نییەت:** لەبەر ئەوەی غوسڵ دەرکـردن خواپەرسـتییە، نیـەت پاکی مەرج و، ڕوکنێکی سەرەکییە تێیـدا، ئـەو کەسـەی غوسـڵ دەردەکـات، دەبێـت مەبەسـتی خواپەرسـتی بێـت و، تایبەتیشـی بکـات بـە خـوای گـەورەوەو، نـەهێڵێت ڕیـای تێکـەوێت، چـونکە خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ ﴾ البینـــە/ ٥ واتـــە: فـــەرمانی ئەوەیان پێدرابو، کە تەنها خـوای پـاك و تـاك بـە سەرڕاسـتانە بپەرسـتن.. پێغەمبەری خواش، صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: (إنّمَا الاعمَالُ بالنّيَّاتِ وإنّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى)[1] واتە: هەمو کردەوەیـەك بـە پێـی نیەتـە، نیـەتی هـەر کـەس چـۆن بـو، هـەر ئـاوای بەردەکـەوێت[2].. غوسـڵ دەرکـردنیش کردەوەیە، بۆیە پێویستە نیەتی کردنی، بۆ خوا تەرخان کرێت..

**دووەم: ئاو بەسەر هەمو جەستەدا بڕێژێت:** حەقیقەتی غوسـڵ دەرکردن، بریتیە لە ڕژاندنی ئاوی پاك بەسـەر هـەمو لەشـدا، گەیشـتنێتی

---

[1] بوخاری (١)، موسلیم (١٩٠٧).
[2] بدایه المجتهد (٦/١) و المجموع (٣٧٤/١) و التمهید (١٠٠/٢٢).

بە سەرو بنی پێست و مو.. هەمو ئەو فەرمودانەی، کە باس لـە چۆنیەتی غوسڵی پێغەمبەری پێشەوا، صلى الله عليه وسلم دەکەن، جەخت لەمە دەکەنەوە، لەوانە:

١ ـ جوبەیری کوڕی موتعیم، خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم فەرموی: (أمَّا أنا فآخذُ مِلْءَ كَفّي ثلاثاً فأصُبُّ عَلَى رَأسِي، ثمَّ أفيضُ بَعْدَ ذَلِكَ عَلَى سَائِرِ جَسَدِي) [1] واتە: ئەمما من، سێ جاران پڕ بە مشتی خۆم، ئاو هەڵدەگرم و، دەیکەم بەسەرمدا، پاشان ئاو دەڕێژم بەسەر هەمو جەستەمدا..

٢ـ ئوم سەلەمەخان، خوا لێی ڕازی بێت، کە خێزانی پێغەمبەری خۆشەویستە، صلى الله عليه وسلم دەڵێ: (قُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ إنّي امْرَأةٌ أشُدُّ ضُفْرَ رَأسِي فأنْقُضَهُ لِغَسْلِ الْجَنَابَةِ فَقَالَ إنَّمَا يَكْفِيكِ أنْ تحثِينَ عَلَى رَأسَكِ ثلاثَ حَثِيَاتٍ مِنْ مَاءٍ ثمَّ تفِيضينَ عَلَيكِ المَاءَ فتطهُرِينَ) [2] واتە: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، من قژم دەکەمە پرچ (کەزی)، ئایا لە کاتی غوسڵ دەرکردندا بیکەمەوە ؟ فەرموی: سێ مشت ئاوت بەسە، سەرەتا بیکەیت بەسەر سەرتدا، پاشان ئاو بکەیت بەسەر هەمو جەستەدا، ئاوا پاك دەبیتەوە..

ئیمام ئیبنو حەجەر دەڵێ: هەمو فەرمودەکان جەخت لەوە دەکەنەوە، کە دەبێت ئاو بەسەر هەمو جەستەدا بڕژێت[3]..

---

[1] ئەحمەد (٨١/٤) بوخاری (٢٥٤)، موسلیم (٣٢٧) بە کورت کراوەیی.
[2] موسلیم (٣٣٠)، ئەبوداود (٢٥١)، نەسائی (١٣١/١)، ترمزی (١٠٥)، ئیبنوماجە (٦٠٣)
[3] الفتح (٣٦١/١).

## سوننەتەکانی غوسڵ

سەرچـاوەی ئاراسـتەی ئـەم باسـە، دوو فـەرمودەی پێغەمبـەری خـوان، صلی الله علیە وسلم، کە بریتین لە:

١ـ فەرمودەی لای خاتو عائیشەخان، خـوا لێـی ڕازی بێـت، کـە لـە باسـی دەستنوێژی پێغەمبەری خوادا، صلی الله علیە وسلم دەڵێ: (كَانَ إِذَا اغْتَسَلَ مِـنَ الْجَنَابَـةِ بَـدَأَ فَغَسَلَ يَدَيْـهِ، ثـمَّ يَتَوَضَّأُ كَمَا يَتَوَضَّأُ لِلصَّلاَةِ، ثـمَّ يُـدْخِلُ أَصَابِعَهُ فِي الْمَاءِ، فَيُخَلِّلُ بِهَا أُصُولَ شَعَرِهِ (حَتَّى إِذَا ظَنَّ أَنَّهُ قَدْ أَرْوَى بَشَـرَتَهُ أَفَاضَ) ثمَّ يَصُبُّ عَلَى رَأْسِهِ ثَلاَثَ غُرَفٍ بِيَدَيْهِ، ثمَّ يُفِيضُ الْمَاءَ عَلَى جِلْدِهِ كُلِّهِ)[١] واتە: کاتێك بیویستایە غوسڵی لەشگرانی خۆی دەرکات، سـەرەتا بـە شوشتنی دەستەکانی دەستی پێ دەکـرد، ئینجا دەسـتنوێژی دەگـرت وەکو، کە بۆ نوێژی بگرێت، پاشان پەنجەکانی دەکرد بە ناو ئاوەکەداو، دەیهێنـان بە ناو ڕیشیدا (لە ڕیوایەتەکەی ناو کەوانەکەدا هاتوە، کە (کاتێك دەیزانی وا بـە تـەواوی ئـاو گەیشـتۆتە بـن موەکـان) ئینجا سـێ مشتی بەسـەریدا دەکرد، پاشان ئاوی دەکرد بەسەر هەمو پێستیدا..

٢ـ فەرمودەی لای خـاتو مەیمونـە، خـوا لێـی ڕازی بێـت، کـە خێزانێکـی تری پێغەمبەری خوایە، صلی الله علیە وسلم، گوتی: (وَضَعْتُ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَاءً لِلْغُسْلِ (وَسَتَرْتُهُ) فَغَسَلَ يَدَيْهِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا ثـمَّ أَفْـرَغَ (بِيَمِينِهِ) عَلَى شِمَالِهِ فَغَسَلَ مَذَاكِيرَهُ (فَرْجَهُ وَمَا أَصَابَهُ مِنَ الأَذَى) ثـمَّ دَلَـكَ يَدَهُ بِالْأَرْضِ (أو بِالحَائِطِ، ثمَّ غَسَلَهَا) ثـمَّ مَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ وَغَسَـلَ وَجْهَـهُ

---

[١] بوخاری (٢٤٨)، موسلیم (٣١٦).

وَيَدَيْهِ ثمَّ صَبَّ عَلَى جَسَدِهِ ثمَّ تَنَحَّى فَغَسَلَ قَدَمَيْهِ ، فَنَاوَلْتُهُ خِرْقَةً فقَالَ بِيَدِهِ هَكَذا وَلَمْ يُرِدْهَا)[١]واتە: ئاوم بۆ غوسڵ دەركردنی پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم داناو، پەردەیەكم بۆ بەست، دەستەكانی دووجار، یان سێ جار شوشت، پاشان بە دەستی ڕاستی، كردی بەسەر دەستی چەپیدا، ئینجا زەكەری شوشت و ئەوی پێوەی بو، لێی كردەوە، پاشان دەستی بە زەوی، یان بە دیوارەكە سڕی، پاشان شوشتیەوە، ئینجا ئاوی لە دەمو لوتی وەرداو فمی كرد، ئینجا دەموچاوی شوشت، پاشان دەستی، ئینجا سەری شوشت، پاشان ئاوی بەسەر هەمو لەشیدا كرد، پاشان كەمێك كەنار كەوت و، پێیەكانی شوشت، پارچە پەڕۆیەكم دایێ، خۆی پێ وشك كاتەوە، ئاماژەی كردو نەیویست..

ئەوی لەم دوو فەرمودەوە دەردەكەوێت، كە هەر كەسێك ویستی غوسڵی لەشگرانی خۆی دەركات، دوای نیەت هێنانی دەبێ:

١ . **دەستی سێ جار بشوات** پێش ئەوەی بە ئاوەكەیدا بكات.

٢ . **بە دەستی چەپی عەورەتی بشوات و هەڵیگلۆفێت**، تا هەر پیسییەكی پێوە بێت لێی كاتەوە.. نابێت دەستی ڕاستی بەكار بهێنێت، چونكە پێغەمبەری خوا، لە فەرمودەیەكیدا دەفەرموێ: (إذا بَالَ أحَدُكُم فلَا يَأخُذَنَّ ذَكَرَهُ بيَمِينِهِ ولَا يَسْتَنجِي بيَمِينِهِ وَلا يَتَنَفَّسُ فِي الإنَاءِ)[٢] واتە: ئەگەر كەسێكتان میزی كرد، نەكات بە دەستی ڕاست زەكەری بگرێت، یان بە دەستی ڕاست تارەت بگرێت (خۆی پاك كاتەوە)، هەناسەش لە دەفرەكەدا نەداتەوە. مەبەستی لەو ساتەیە، كە ئاوەكە دەخواتەوە..

---

[١] بوخاری (٢٦٦)، موسلیم (٣١٧).
[٢] بوخاری (١٥٤)، موسلیم (٢٦٧).

**٣ـ دەسـتی دوای شوشـتنی عـەورەتی بشـواتەوە:** ئەمـە لـە فەرمودەکانەوە دیارە، کـە جێ بایـەخی پێغەمبـەری خـوا، صـلی الله علیـه وسـلم بـوە، ڕیوایـەتی تـری لای مەیمونـە خـان هەیـە، کـە دەڵـێ: (أَدْنَيْتُ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غُسْلَهُ مِنَ الْجَنَابَةِ فَغَسَلَ كَفَّيْهِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي الْإِنَاءِ، ثُمَّ أَفْرَغَ عَلَى فَرْجِهِ وَغَسَلَهُ بِشِمَالِهِ، ثُمَّ ضَرَبَ بِشِمَالِهِ الْأَرْضَ فَدَلَكَهَا دَلْكًا شَدِيدًا، ثُمَّ تَوَضَّأَ وُضُوءَهُ لِلصَّلَاةِ)[١] واتـە: دەستی چەپی بـە خـۆڵ پـاك دەکـردەوەو، زۆر بـە قـایم دەیپـرواند.. بۆیـە دەبێـت ئـەو موسـوڵمانەی، بـۆی دەلوێـت، هـەوڵ بـدا بـە سـابون دەسـتی بشواتەوە..

ئیمام نـەوەوی دەڵێ: شـتێکی باشـە، کـە هـەر کەسـێك تـارەتی بـە ئـاو گرت، کە تەواو بو، دەستی بـە گڵ، یـان بـە ئەشـنان (وەکـو سـابون وابـوە) بشواتەوە، یان زۆر لە زەوی، یـان لـە دیـوار بخشـێنێت، تـا ئەگـەر پیسـییان پێوە بێت لێی بێتەوە[٢]. .

**٤ . دەستنوێژێك بە تەواوی بگرێت وەکو کـە بـۆ نوێـژکردنی دەگرێـت:** ئەمـەش لـە هەردووفەرمودەکـەدا بـاس کـراوە، ئیمـام ئیبنـو حەجـەر دەڵـێ: لەوانەیـە دەسـتنوێژ گـرتن پـێش غوسـڵ دەرکـردن سوننەتێکی سـەربەخۆ بێـت، چـونکە لـە غوسـڵ دەرکردنیشـدا هـەمو ئـەو ئەندامانەی دەستنوێژ پێویستە بشۆرێن، کەوابو هەر لە سـەرەتاوە نیـەتی غوسـڵ هێنانەکـە پێویسـتە.. پاشـان دەڵـێ: دیـارە لەبـەر ڕێزلێنـانی ئـەو

---

[١] لە ریوایەتەکەی موسلیم (٣١٧) دایە..

[٢] شرح مسلم (٢٣١/٣). دیارە، کە دەستیان بە دیوار سڕیوە، لەبەر ئەوە بوە، دیوارەکەش وەکو دیواری خانوی لادێی خۆمان، گڵ بوە..

ئەندامانــەی دەســتنوێژە کــە ویســتویەتی حــوکمی لەشــگرانی و بــێ دەستنوێژیشیان لەسەر لادات[١]..

دەسـتنوێژ گـرتنی پـێش غوسـڵ دەرکـردن، لای زۆرینـەی هـەرە زۆری شەرعناسان سوننەتە، جگە لە ئەبو سەورو داودی زاهیریی..

★ ★ ★

## دوو بیر خستنەوەی گرنگ

### یەکەم: حوکمی ئاو لە دەمو لوت ڕادان وفم (یان فن) کردن لە کاتی غوسڵ دەرکردندا:

لـە باسـی دەسـتنوێژدا، باسمـان لـە چـوار بۆچـونی شەرعناسـان کـرد، لەسەر مەسەلەی ئاو لـە دەمولـوت ڕادان، ئـەوەشمان پـێ بـەهێزتر بـو، کـە هـەردووکیان لـە دەسـتنوێژدا واجـبن.. بـەڵام ئایـا لـە غوسڵیشـدا هـەمان حوکمیان هەیە ؟!

شەرعناسان، لە بۆچونیان بۆ ئەم حوکمە شەرعیە، دوو پۆلن:

<u>پـۆلی یەکـەم</u>: ئیمـام ئـەبو حەنیفـەو، سـەوری و، زانـراوی مەزهـەبی ئەحمەدو، عەتائی کوڕی ئـەبو ڕەبـاح و، عبداللـەی کـوڕی موبـارەك هـەمو گوتویانە، ئاو لە دەم وەردان و، ئاو لە لوت ڕادان و، فم (یان فن) کردن، لە غوسڵیشدا واجبە.. بەڵگەشیان:

---

[١] فتح الباري (٤٢٩/١)..

١ـ فەرمودەیـەکی مـەوزوع (هەڵبەسـتراو) یـان هێناوەتـەوە، کـە دەڵـێ: (الْمَضْمَضَةُ و الإسْتِنْشاقُ ثَلَاثاً لِلْجُنُبِ فَرِيضَةٌ)[١] واتـە سـێ جـاران ئـاو لـەدەم وەردان و، ئاو لە لوت ڕادان و، فم کردنەوەی لەسەر لەشگران فەرزە..

٢ـ فەرمودەیەکی تری مەرفوع، کە دەفەرموێ: (مَنْ تَـرَكَ مَوْضِعَ شَعْرَةٍ مِنْ جَسَدِهِ مِنْ جَنَابَةٍ لَمْ يَغْسِلْهَا فُعِلَ بِهِ كَذَا وَكَذَا مِـنَ النَّـارِ )[٢] واتـە: هـەر کەسێك لـە کـاتی غوسـڵ دەرکردنـدا، جێ مویـەکی لەشـی جـێ بهێڵێـت و، نەیشوات، لە دۆزەخدا ئاواو ئاوای پـێ دەکرێـت.. لـەم ریوایەتـە زەعیفـەدا هـاتوە، کـە زازان دەڵـێ: عـەلی کـوڕی ئـەبو تالیـب، خـوا لێـی ڕازی بێـت دەیگـوت: لـەوەتای ئـەو فـەرمودەم بـەر گـوێ کـەوتوە، مـوی لەشـم هـەمو لابردوە!![٣]

٣ ـ فەرمودەیەکی تری مـەرفوعی، لای ئـەبو ئـەییوبی ئەنساری هەیـە، خوا لێی ڕازی بێت، کە دەفەرموێ: (أَدَاءُ الامَانَةِ غَسْلُ الجنَابَـةِ، وَتحْتَ كُلِّ

---

[١] دارەقوتنی (١١٥/١) بە مورسەلی گێڕاویەتەوە، فەرمودەوانی تر بە مەوزوعیان داناوە، بڕوانە: نصب الراية في تخريج أحاديث الهداية(٧٨/١)، صحيح فقه السنة (١٧٠/١)..

[٢] ئەبو داود (٢٤٩)، ئیبنوماجە (٥٩٩)، ئەحمەد (٩٤/١)، ئەلبانی لە: سلسلة الاحاديث الضعيفة (٩٣٠) دا دەفەرموێ زەعیفە.

[٣] عبدالرزاق: المصنف (١٢٣/١) ئەمە خۆی دیارە کە قسەیەکی بێ جێیەو خراوەتە پاڵ سەیدنا عەلی، چۆن دەشێت بوترێت موی هەمو لەشی لابردوە.. موی سەر سنگ و رانی هەر چەند پڕ بوبن هەر نەگەیشتونەتە موی بن باڵ و ریشی.. موی بن باڵیشی بە پێی سوننەت هەڵکەندوەو موی ریشیشی هێشتۆتەوە، بە پێی ئەم فەرمودە مەوزوعە بێت موە تەنکەکانی تاشیوەو موە پڕەکانی واز لێ هێناوە ؟!

شَعْرَةٍ جَنَابَةٌ)[١] واتـە: غوسـڵ دەركـردن لـە لەشـگرانی، لـە گەیاندنـەوەی راسپاردەیە، لەژێر هەر مویەكیشدا لەشگرانیەك هەیە..

وا پێناچێت ئەم فەرمودە زەعیفانە، بۆ بەڵگە بشـێن، بۆیـە وا نـازانم حوكمی خواپەرستییان پێ بچەسپێت.. والله اعلم..

٤ ـ لـە زاهـیری فەرمودەكـەی مەیمونـە خانـدا، خـوا لێـی ڕازی بێـت، هەروەها لە باسی دەستنوێژەكەی پێغەمبەری خوادا، صلى الله عليه وسلم، لە فەرمودەكەی لای عائیشەخاندا، خوا لێی ڕازی بێت ئاشكرا دەبێـت، كـە ئـەو ڕەفتـارە، ڕون كردنــەوەو چەسـپاندنی ئایـەتی (وَإِن كُنـتمْ جُنُبًـا فَاطَّهَّرُواْ)دەكەیە، واتە: ئەگەر لەش گران بـون (لـە جەنابەتـدا بـون)، دەبـێ خۆتان بە شوشتنی لەشتان پاك كەنەوە..

٥ ـ شوشـتنی هـەمو جەسـتە، لـە غوسـڵ دەركردنـدا واجبـە، دەموچـاو بەشـێكە لـە جەسـتە، دەمولـوتیش بەشـێكن لـە دەموچـاو، كـەوابو لـە غوسڵیشدا وەكو دەستنوێژ، ئاو لـە دەم وەردان و، ئـاو لـە لـوت ڕادان و، فـم كردن واجبە..

**پۆلی دووەم:** ئیمام مالیك و، ئیمام شافیعی و، لەیس و، ئەوزاعی، كە جمهوری شەرعناسانن، دەڵێن: ئاو لە دەمولوت ڕادان و، فم كردن لە غوسڵ دەركردندا، سوننەتە.. بەڵگەشیان:

١ـ دەستنوێژ بۆ غوسڵ دەركردن فەرز نیە، ئاو لە دەم وەردان و، ئاو لـە لوت ڕادان و، فم كردنیش، ڕەفتاری دەسـتنوێژن، كـە دەسـتنوێژ نـەگیرێت، ئەوانیش ناكرێن[١]..

---

[١] ئیبنو ماجە (٥٩٨) گوتوشیەتی: سەنەدەكەی زەعیفە، هەروەها بۆ حوكمی زەعیفی فەرمودەكە، بڕوانە: ابن حجر العسقلاني: تلخيص الحبير (١٤٢/١)..

٢ـ ئاو لەدەم وەردان و، ئاو لە لوت ڕادان و، فم کردنی پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم، پێش دەرکردنی غوسڵ، لە خۆیانەوە نابنە فەرمان، تا واجب بن، بەڵام دەشێت ببنە سوننەت. شتێك واجب دەبێت، کە واجب بونی شتێکی دیکەی، لەسەر وەستا بێت.. ئەمەش لێرەدا وا نیە[٢]..

٣ـ ئەو فەرمودەی پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم، کە وەڵامی ئەبو زەڕی دایەوە، دەربارەی لەش گرانی کەسێك، کە ئاوی دەست نەکەوێت، کە فەرموی: (الصَّعِيدُ الطَّيِّبُ وَضُوءُ الْمُسْلِمِ وَإِنْ لَمْ يَجِدِ الْمَاءَ عَشْرَ سِنِينَ ، فإذَا وَجَدَ الماءَ فَلْيَمَسَّهُ بِبَشَرَتِهِ)[٣]واتە: گڵ و لم و بەردوخوێ و، کەرەستەی تر، کە لەسەر زەمیندایەو پاکە، ئاوی دەستنوێژی موسوڵمانن، ئەگەر دەیان ساڵیش ئاوی دەس نەکەوێت.. کە ئاویشی دەست کەوت، ئەوە دەتوانێت بەسەر بەدەنی خۆیدا بکات.. ئاو لەدەم وەردان و ئاو لە لوت ڕادان و، فم کردن ناکەوێتە ئەم حوکمەوە..

٤ ـ فەرمودەکەی لای جوبەیری کوڕی موتعیم، خوا لێی ڕازی بێت، کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموی: (أَمَّا أَنَا فَآخُذُ مِلْءَ كَفِّي ثَلاثاً فأَصُبُّ عَلَى رَأْسِي، ثُمَّ أُفِيضُ بَعْدَ ذَلِكَ عَلَى سَائِرِ جَسَدِي) [٤] واتە: ئەمما من، سێ جاران پڕ بە مشتی خۆم ئاو هەڵدەگرم و، دەیکەمە بەسەرمدا، پاشان ئاو دەڕێژم بەسەر هەمو جەستەمدا..

---

[١] فتح الباري (١/٤٣٣).
[٢] فتح الباري (١/٤٣٢).
[٣] ترمزی (١٢٤)، ئەبوداود (٢٣٣)، نەسائی (١/١٧١)، لە ئەبو زەڕەوە، خوا لێی ڕازی بێت بە مەرفوعی دەگێڕێتەوە، بەڵام شێخی ئەلبانی ڕەحمەتی لە الارواو (١٥٣) دا لە ئەبو هورەیرەوە، خوا لێی ڕازی بێت بە سەنەدی سەحیحەوە هێناویتیەوە..
[٤] ئەحمەد (٤/٨١) بوخاری (٢٥٤)، موسلیم (٣٢٧) بە کورت کراوەیی.

٥ ـ پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم بە ئوم سەلەمەی خێزانی فەرمو: (إنَّمَا يَكْفِيكِ أنْ تحثِينَ عَلَى رَأسَكِ ثلاثَ حَثِياتٍ مِنْ مَاءٍ ثمَّ تفِيضينَ عَلَيكِ الماءَ فتطهُرِينَ)[١] واتە: فەرموی: سێ مشت ئاوت بەسە، سەرەتا بیکەیت بەسەر سەرتدا، پاشان ئاو بکەیت بەسەر هەمو جەستەتدا، ئاوا پاك دەبیتەوە..

ئەم فەرمودەیەی لای ئوم سەلەمە خان، زیاتر ئەوە دەسەلمێنێت، کە ئاو لە دەم وەردان و، ئاو لە لوت ڕادان و، فم کردن فەرز نین، ئەگەر فەرز بونایە، دەبو باس دەکران، بەڵام دیارە باسیان وەکو سونەت وا، لە دەستەواژەی (ثمَّ تفِيضينَ عَلَيكِ الماءَ): ئاو بکەیت بەسەر هەمو جەستەتدا..

ئەوەی لەم توێژینەوەدا بۆم رون بۆتەوە ئەوەیە، کە:

ئاو لە دەم وەردان و، ئاو لە لوت ڕادان و، فم کردن لە غوسڵ دەرکردندا، سونەتن، نەك فەرز.. والله اعلم.

★ ★ ★

## دووەم: شوشتنی پێیەکان لە کاتی غوسڵ دەرکردندا کەی دەبێت ؟:

لە فەرمودەکەی لای خاتو مەیمونەدا، خوا لێی ڕازی بێت، ئەوە رون دەبێتەوە، کە پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم، شوشتنی پێیەکانی لە غوسڵدا دوا دەخست، بۆ دوای تەواو بون لە غوسڵەکە.. لە ڕیوایەتی بوخاریدا هاتوە، کە: (فَلَمَّا فرَغَ مِنْ غَسْلِهِ غَسَلَ رِجْلَيهِ)[٢] واتە: کە لە غوسڵ کردنەکەی تەواو بو، ئەوسا پێیەکانی شوشت..

---

[١] موسلیم (٣٣٠)، ئەبوداود (٢٥١)، نەسائی (١٣١/١)، ترمزی (١٠٥)، ئیبنوماجە (٦٠٣)
[٢] بوخاری (٢٦٠).

فەرمودەکەی لای عائیشەخانیش، خوا لێی ڕازی بێت، هەر ئەوەندە باس دەکات، کە پێش غوسڵ دەرکردن دەستنوێژی دەگرت[١]..

بۆچونی شەرعناسان لە باسی شوشتنی پێیەکاندا، لە کاتی غوسڵ دەرکردندا بوە بە چوار پۆلەوە[٢]:

**پۆلی یەکەم:** باشتر وایە شوشتنی پێیەکان لە غوسڵدا، دوا بخرێت بۆ ئاخر ئەندام، کە دەشۆرێت، لەبەر ئەو چۆنیەتیەی، لە فەرمودەکەی لای مەیمونە خاندا هاتبو..

**پۆلی دووەم:** پێش غوسڵ دەرکردنەکە، دەستنوێژی تەواو دەگرێت وەکو، کە بۆ نوێژی دەگرێت.. ئەمیش لەبەر ئەو چۆنیەتیەی، لە فەرمودەکەی لای عائیشەخاندا هاتوە، ئەمەش مەزهەبی ئیمام مالیك و، ئیمام شافیعی و، ئیمام ئەحمەدە.

**پۆلی سێیەم:** خۆی لە شوشتنی پێیەکانیدا سەرپشکە، دەتوانێت لەگەڵ دەستنوێژەکەیدا پێشی خات، هەر وەکو، کە دەتوانێت دوای بخات، بۆ کۆتایی غوسڵ دەرکردنەکەی.. ئەمە قەولێکی تری ئیمام ئەحمەدە..

**پۆلی چوارەم:** ئەگەر لە شوێنێکدا غوسڵی دەردەکرد، کە زۆر پاك نەبو دەتوانێت شوشتنی پێیەکانی دوابخات، ئەگەر نا، هەر لەگەڵ دەستنوێژەکەیدا، پێشیان دەخات و دەیانشوات، ئەمەش ڕای ئیمام مالیکە..

---

[١] لە ریوایەتی ئیمامی موسلیمدا (٣١٦) هاتوە: (ثمَّ أفَاضَ عَلَى سَائِرِ جَسَدِهِ، ثمَّ غَسَلَ رِجْلَيهِ). هەروەها بڕوانە الهروی: علل مسلم (٦٩) و فتح الباري (٢٣٤/١).

[٢] فتح الباري (٣٦٢/١)، المغني (٢٨٨/١)، شرح العمدة (٣٧١/١)، البيهيقي: الخلافيات (٤٢٥/٢).

وا دیارە ئەم بۆچونەی ئیمام مالیك لە هەموان پەسەندتر بێت.. والله اعلم..

**٥ . سێ جار بە مشتێ ئاو بەسەریدا دەکات**، وا بێت ئاوەکە بگاتە بنجی موەکان و، پێستی سەری..

**٦ . لای ڕاستی سەری، یەکەمجار تەڕ دەکات**، پاشان لای چەپی..

**٧ــ دەست دەخاتە ناو موەکانی سەری و، هەڵیان دەگلۆفێت**. چونکە لە فەرمودەکەی لای عائیشەخاندا هاتبو، کە (حَتَّى إِذَا ظَنَّ أَنَّهُ قَدْ أَرْوَى بَشَرَتَهُ أَفَاضَ) ثُمَّ يَصُبُّ عَلَى رَأْسِهِ ثَلَاثَ غُرَفٍ بِيَدَيْهِ، ثُمَّ يُفِيضُ الْمَاءَ عَلَى جِلْدِهِ كُلِّهِ)[١] واتە: پاشان پەنجەکانی دەکرد بە ناو ئاوەکەداو، دەیهێنان بە ناو موەکاندا کاتێك دەیزانی وا بە تەواوی، ئاو گەیشتۆتە بن موەکان، ئینجا سێ مشتی بەسەریدا دەکرد، پاشان ئاوی دەکرد بەسەر هەمو پێستیدا..

ڕیوایەتێکی تری عائیشەخان، خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا اغْتَسَلَ مِنَ الْجَنَابَةِ دَعَا بِشَيْءٍ نَحْوِ الْحِلَابِ، فَأَخَذَ بِكَفَّيْهِ، ثُمَّ بَدَأَ بِشِقِّ رَأْسِهِ الْأَيْمَنِ، ثُمَّ الْأَيْسَرِ، ثُمَّ أَخَذَ بِكَفَّيْهِ فَقَالَ بِهِمَا عَلَى رَأْسِهِ)[٢] واتە: کاتێك پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم دەیویست غوسڵی لەش گرانی خۆی دەرکات، شتێکی وەکو جامێکی قوڵی

---

[١] بوخاری (٢٤٨)، موسلیم (٣١٦).
[٢] بوخاری (٢٥٨)، موسلیم (٣١٨).

شیردۆشینی[١] داوا دەكرد، ئینجا لوێچێكی لێ هەڵدەهێنجاو، دەیكرد بە لای ڕاستی سەریدا، پاشان لای چەپی سەری، پاشان بە هەردوودەستی، دەیكرد بە سەریدا..

دیسان ڕیوایەتێكی تریش، هەر لەوەوە خوا لێی ڕازی بێت هەیە، كە دەیگوت: (كُنَّا إِذَا أَصَابَتْ إِحْدَانَا جَنَابَةٌ، أَخَذَتْ بِيَدَيْهَا ثَلاَثًا فَوْقَ رَأْسِهَا، ثُمَّ تَأْخُذُ بِيَدِهَا عَلَى شِقِّهَا الأَيْمَنِ، وَبِيَدِهَا الأُخْرَى عَلَى شِقِّهَا الأَيْسَرِ)[٢] واتە: كە یەكێكمان (لە خێزانەكانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم) توشی لەشگرانی دەبوین، بە لوێچ سێ جار ئاوی دەكرد بە سەریدا، ئینجا دەستی ڕاستی دەهێنا بە لاڕاستی سەریدا، دەستی چەپیشی بە لاچەپی سەریدا دەهێنا.

## ئایا هەڵگلۆفین (دەست خستنە نێوان موەكان)ی ریش لە غوسڵدا واجبە؟

جمهوری شەرعناسان، ئیمام ئەبو حەنیفەو، مالیك و، شافیعی و، ئیبنو حەزم[٣] دەڵێن: هەڵگلۆفینی ڕیش لە غوسڵ دەركردندا واجب نیە، بەڵام باشتر وایە بیكات.. دیارە ئەمە بۆ كەسێكە، كە ڕیشی تەنك، یان ئاساییە، بەڵام كەسێك، كە ڕیشی زۆر پڕ بێت، دیارە واجبە، چونكە تەنها ئاو پێدا كردن بە تایبەتی، كە ئاوەكەش بە لوێچ بەكار بهێنێت، ڕەنگە بەس نەبێت.. بە تایبەتی، كە فەرمودەكەی لای عائیشەخان خوا لێی ڕازی بێت، ڕاشكاوانە دەڵێ: (فَيُخَلِّلُ بِهَا أُصُولَ شَعَرِهِ (حَتَّى إِذَا ظَنَّ أَنَّهُ قَدْ أَرْوَى بَشَرَتَهُ أَفَاضَ) ثُمَّ يَصُبُّ عَلَى رَأْسِهِ ثَلاَثَ غُرَفٍ بِيَدَيْهِ، ثُمَّ يُفِيضُ الْمَاءَ

---

[١] ئیمامی خەتتابی لە (معالم السنن الكبرى ٦٩/١) دا دەڵێ: حلاب جامێكی قوڵ بوە، بەقەدەر جارێك شیردۆشینی حوشتری گرتوە..

[٢] بوخاری (٢٧٧).

[٣] المحلى (٣٣/٢)، الاوسط (١٣٧/٢)، ابن عبدالبر التمهيد (٩٥/٢٢).

عَلَى جِلْدِهِ كُلِّهِ)[١] واتە: پەنجەکانی دەکرد بە ناو ئاوەکەداو، دەیهێنان بە ناو ڕیشیدا (کاتێك دەیزانی وا بە تەواوی ئاو گەیشتۆتە بن مووەکان) ئینجا سێ مشتی بەسەریدا دەکرد. واتە دڵنیا دەبو، کە ئاو گەیشتۆتە پێستی..

**٨ . ئاو بەسەر هەمو جەستەیدا دەڕێژێت:** ئاو ڕشتن بەسەر هەمو جەستەدا، لە هەمو فەرمودەکاندا هاتوە، کە باس لە چۆنیەتی غوسڵ دەرکردنی پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم دەکەن..

**٩ـ بەلای ڕاستی دەست پێ دەکات، پاشان لای چەپی:**
لەبەر ئەو فەرمودەیەی، کە عائیشەخان، خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە: (كَانَ يُعْجِبُهُ التَّيَمُّنُ فِي تَنَعُّلِهِ وَتَرَجُّلِهِ وطُهُورِهِ وَفِي شَأْنِهِ كُلِّهِ )[٢] واتە: پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم، هەمیشە دەسپێکردنی بە لایەنی ڕاستی پێخۆش بو، لە پێڵاو لە پێ کردنیدا، لە پیادەییدا، لە دەستنوێژو غوسڵیدا، لە هەمو کاروبارێکیدا..

★ ★ ★

**دوو بیرخستنەوەی تر:**

**یەکەم: ئاو بەسەر جەستەدا کردن بۆ یەك جارە:** ئەمە لە هەردوو فەرمودەکەی لای خاتو مەیمونەو، خاتو، عائیشەخاندا دەردەکەوێت، لە هەردووکیاندا سێ جاری بۆ دەست شوشتن و سەر شوشتن بو، ئەمما هەمو جەستە، ئەوە فەرمودەکەی لای عائیشەخان، باس دەکات، کە یەکجار بوە: (ثُمَّ يُفِيضُ الْمَاءَ عَلَى جِلْدِهِ كُلِّهِ)[٣] واتە: پاشان

---

[١] بوخاری (٢٤٨)، موسلیم (٣١٦).
[٢] بوخاری (١٦٨)، موسلیم (٢٦٨).
[٣] بوخاری (٢٤٨)، موسلیم (٣١٦).

ئاوی بەسەر هەمو پێستیدا دەکرد.. خـاتو مەیمونـەش دەڵـێ: ( ثـمَّ صَبَّ عَلَى جَسَدِهِ قَدَمَيْهِ)[١] واتە: پاشان ئاوی بەسەر هەمو لەشیدا کرد..

ئیبنوبـەتتال (مامۆسـتای ئیمـام بوخارییـە) دەڵـێ: لەبـەر ئـەوەی ژمارێەکی دیاری کراوی، دیار نەکردوە، پابەندبون بە کەمترین ژمارەیـەوە دەبێت، کە یەك جارە، چونکە ئەسڵ یـەك جارییـەو، زیـاتر پێویستی بـە بەڵگەیە[٢]..

ئەمـە بۆچـونی ئیمـام ئەحمـەدو، یـاوەرانی ئیمـام مالیکـەو، ئیبنـو تەیمییەش ئەمەی پەسەندتر کردوە[٣]..

**دووەم: حـوکمی دەسـت لـە لـەش خشـاندن لـە کـاتی غوسـڵ دەرکردندا** : شەرعناسان لە وەڵامی ئەوەدا ڕاجوێن، کـە ئەگـەر کەسێك بۆ غوسڵ دەرکردن ئـاوی بەسـەر جەسـتەیدا ڕشـت، بـێ ئـەوەی دەسـت لـە جەستەی بخشێنێت، ئایا غوسڵی دەردەچێت؟ یان حەتمەن دەبێت دەست بەجەستەیدا بهێنێت ؟[٤]

جمهـوری شەرعناسـان، جگـە لـە ئیمـام مالیـك و، مـوزەنی شـافیعیی دەڵێن: لە کاتی غوسڵ دەرکردندا، دوای ئاو بە جەستەدا کردن، دەست لـە جەسـتە خشـاندن واجـب نییـە.. ئەگـەر کەسـێك ئـاوی بەسـەر هـەمو جەسـتەیدا ڕشـت، کـە ئـاو هـەمو جەسـتەی بگرێتـەوە، یـان بچێتە ژێـر

---

[١] بوخاری (٢٦٦)، موسلیم (٣١٧).
[٢] فتح الباري (١/٤٣٩).
[٣] صحيح فقه السنة (١/١٧٦).
[٤] المحلى (٢/٣٠)، الاستذكار (٣/٦٣)، المغني (١/٢٩٠)، بداية المجتهد (١/٥٥)، السيل الجرار (١/١١٣).

دوشێك، یان خۆی لە بانێو حەوزی ئـاو روبـاردا نقـوم بكـات، ئـەوە فـەرزە خواییەكەی هێناوەتە دی، ئیتر بۆچی زیاتری لەسەر فەرز بكرێت ؟!

بەڵگەی هـەردوولایان، هـەر ئـەو بەڵگانەیـە، كـە هـەردوولا، لـە سـاغ كردنەوەی بۆچونی خۆیاندا، لە باسی دەستنوێژدا پشتی پێ دەبەستن..

پــێم وایــە بەڵگــەی جمهــور بــەهێزتر بێــت، بۆیــە وانــازانم دەســت لێخشاندن لە جەستە لـە كـاتی غوسـڵ دەركردنـدا واجب بێت، پـێم وایـە سوننەتە.. والله اعلم.

★ ★ ★

## غوسڵی ئافرەت

چــۆنیەتی دەركردنــی غوســڵی ئــافرەت، لــە لەشــگرانی، هــەر وەكــو چۆنیەتی غوسڵ دەركردنـی پیاوانـە.. ئـەو ئافرەتانـەی پـرچ (كـەزی) یـان هەیە، مەرج نیە لە كاتی غوسڵ دەركردنیاندا بیكەنەوە، مەرج ئەوەیە ئاو بگەیێنێتە بنجی موەكانی.. چونكە:

١ ـ فەرمودەكەی لای خاتو ئوم سەلەمە، دەڵـێ: (قُلْتُ يَـا رَسُولَ اللهِ إِنّـي امْرَأَةٌ أَشُدُّ ضُفْرَ رَأْسِي فَأَنْقُضَهُ لِغَسْلِ الْجَنَابَـةِ فَقَـالَ إِنّمَـا يَكْفِيـكِ أَنْ تَحثِينَ عَلَى رَأْسَكِ ثَلاثَ حَثَيـاتٍ مِنْ مَاءٍ ثُـمَّ تُفِيضِـينَ عَلَيـكِ المَـاءَ فَتَطْهُـرِينَ)[١] واتـە: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، من قـژم دەكەمـە پـرچ (كـەزی)، ئایـا لـە كـاتی غوسڵ دەركردندا بیكەمـەوە ؟ فـەرموی: سـێ مشـت ئـاوت بەسـە بیكـەیت بەســەر ســەرتدا، پاشـان ئـاو بكـەیت بەسـەر هـەمو جەسـتەدا، ئـاوا پـاك دەبیتەوە..

---

[١] موسلیم (٣٣٠)، ئەبوداود (٢٥١)، نەسائی (١٣١/١)، ترمزی (١٠٥)، ئیبنوماجە (٦٠٣)

٢ـ خاتو عائیشەخانیش، خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: (كُنّا نَغْتَسِلُ وَعَلَينا الضَّمَادُ وَنَحْنُ مَعَ رَسولِ اللهِ صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّمَ)[١] واتە: لەگەڵ پێغەمبەری خـوادا بـوین، صـلى الله علیـه وسـلم، غوسـڵمان دەردەکـرد و، شـتی لیـنج بەسەرمانەوە بو.. مەبەستی ئەوەیە، کە ئەو لینجیە قژیانی تۆپەڵ تۆپەڵ دەکـرد، یـان وەکـو پـرچ (کـەزی) لـێ دەکـردو، نەیدەهێشـت موەکـان شـی ببنەوەو، ئاسان ئاویان بچێتە نێوانەوە، نە خۆیان بە ناشـیاوی شـەرعییان دەزانی، نە پێغەمبەری خواش، صلى الله علیه وسلم فەرمانی پێ دەکـردن، کە سوربن لەسەر ڕادانی..

٣ـ ئەو هەڵوێستەش بەناوبانگە، کە ئیبنو عومەر خوا لێیان ڕازی بێت، گوتی: دەبێت ژنان لە کاتی غوسـڵ دەرکردنیانـدا، پـرچ (کـەزی) یـەکانیان بکەنەوە، تا ئاو بچێتە نێوان موەکانەوە، خاتو عائیشەخان، زۆر بە توندی ڕەددی دایەوەو، گوتی: (أفلَا أمَرَهُنَّ أنْ يَحْلِقْنَ رُؤوسَهُنَّ؟! لَقَـدْ كُنْـتُ أغْتَسِـلُ أنَا وَرَسُولُ اللهِ صَلّى اللهُ عليهِ وَسَلّمَ مِـنْ إنَـاءٍ واحِـدٍ، فَمَـا أزِيـدُ عَلَـى أنْ أُفْـرِغَ عَلَى رَأسِي ثلاثَ إفْرَاغَاتٍ )[٢] واتە: ئا ها، جا یەکجاری بۆچی فـەرمانیان پـێ ناکات، سەریان بتاشن؟! خۆ من و پێغەمبەری خوا، صـلى الله علیـه وسـلم، غوسڵی خۆمان، لە تەشـتێکدا دەردەکـرد، تـەنها سـێ مشـت ئاویشـم دەکـرد بەســـەرمداو بـــەس.. لـــە ڕیوایـــاتی تریـــدا هـــاتوە، کـــە لـــە کـــاتی غوســـڵ دەرکرنەکەیدا، پرچی نەدەکردوە..

---

[١] ئەبو داود (٢٥٤)، بەیهیقی (١٨٢/٢)
کەمال ئیبنوالسەید لە صحیح فقه السنة (١/ ١٧٨) دا دەفەرموێ: سەحیحە

[٢] موسلیم (٣٣١)، نەسائی (٢٠٣/١) ئیبنو ماجە ٠ ٦٠٤).
کەمال ئیبنو السەید لە صحیح فقه السنة (١/ ١٧٨)دا دەفەرموێ: سەحیحە

★ ★ ★

### غوسڵی ئافرەتان لە حەیزو زەیستانی

چۆنیەتی دەرکردنی غوسڵی ئافرەت، لە حەیزو زەیستانی (نیفاس)، هەر وەکو غوسڵ دەرکردنە لە لەشگرانی، بەڵام چەند شتێکی تر هەیە، کە پێویستە لەمیاندا ڕەچاو بکرێت:

**١ـ بەکارهێنانی سابون و شامپۆو شتی وا باشترە**: چونکە خاتو عائیشەخان، خوا لێی ڕازی بێت گێڕایەوە، کە پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم بە ژنانی دەفەرمو: (تأْخُذُ إِحْدَاكُنَّ مَاءَهَا وَسِدْرَتَهَا فتطَهَّرُ فتحْسِنُ الطُّهُورَ، ثمَّ تصُبُّ علَى رَأسِهَا فتدْلُكُهُ دَلْكًا شَدِيدًا حَتَّى تبْلُغَ شُؤُونَ رَأسِهَا، ثـمَّ تصُبَّ عَلَيْهَا الْمَاءَ، ثـمَّ تأْخُذُ فِرْصَةً فتطَهَّرِ بِهَا فقَالَتْ أسْمَاءُ:كَيْفَ أتطَهَّرُ ؟ قَالَ: سُبْحَانَ اللهِ تطَهَّرِي بِهَا، قَالَتْ كَيْفَ ؟! قَالَ سُبْحَانَ اللَّهِ تطَهَّرِي، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَاجْتَبَذْتهَا إِلَيَّ فَقُلْتُ: تتبَّعِي بِهَا أَثَرَ الدَّمِ)[١] واتە: هەر یەکەتان ئاو سیدری خۆی (گەڵایەك بوە وەکو سابون بۆن خۆش و کەفی کردوە) هەڵگرێت و، خۆی پێ پاك بکاتەوە، دەستنوێژێکی باش بشوات، پاشان ئاو بکات بەسەر قژیداو باش هەڵیگلۆفێت، تا ئاو بگاتە بنجی پێستی سەری و، موەکانی، پاشان ئاوی پێداکات، ئینجا بە پارچە لۆکەیەك، شوێنەکان پاك کاتەوە، ئەسماء (ئەسمائی کچی شەکەل) پرسی: چۆن پاکی بکاتەوە؟! فەرموی: سوبحانەالله خۆی پێ پاك دەکەیتەوە، دیسان پرسی: چۆن خۆی پاك دەکاتەوە، ئینجا عائیشەخان ـ وەکو بیەوێت باسەکە بە خێرایی لادات ـ فەرموی: رامکێشایە ئەملاوەو پێم وت: بیبە بە شوێن دڵۆپە خوێنەکاندا..

---

[١] بوخاری (٣١٤)، موسلیم (٣٣٢). ئەمەش لەفزی موسلیمە.

## ٢ . پێویستە پرچەكانی لە كاتی دەركردنی غوسڵی حەیزو زەیستانیدا بكاتەوە:

شەرعناسان لەم مەسەلەیەدا بون بە دوو پۆلەوە:

**پـۆلی یەكـەم:** ئیمـام ئـەبو حەنیفـەو، مالیـك و، شـافیعی دەڵـێن: سـوننەتە نـەك واجـب[١] ئـافرەت لـە كـاتی دەركردنـی غوسـڵی حـەیزو زەیستانیدا، پرچ (كەزی)یەكانی بكاتەوە،، بەڵگەشیان:

١ ـ فەرمودەكەی لای خاتو عائیشەخان.

٢ ـ فەرمودەیەكی تری لای عائیشەخان هەیـە، كـە باسـی حـەجی خـۆی لە خزمەت پێغەمبەری خوادا، صلی الله علیـه وسـلم دەگێڕێتـەوەو، دەڵـێ: (فَأَدْرَكَنِي يَوْمُ عَرَفَةَ وَأَنَا حَائِضٌ، فَشَكَوْتُ إِلَـى النَّبِـيِّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ فَقَالَ: دَعِي عُمْرَتَكِ وَانْقُضِـي رَأْسَـكِ وَامْتَشِـطِي وَأَهِلِّـي بِـالْحَجِّ )[٢]واتـە: ڕۆژی عارفەمان بەسەردا هات و، منیش لـە حـەیزدا بـوم، بـۆ پێغەمبـەری خـوام صلی الله علیـە وسـلم بـاس كـرد، فـەرموی: لـە عەمرەكـەت گـەڕێ و، قـژت بكەرەوەو شانەی كەو، نیەتی حەج بهێنە..

٣ـ ئەو ئینكار كردنەی عائیشەخان، خوا لێی ڕازی بێت، لە بۆچونەكەی ئیبنـو عومـەر، كـە گـوتی: (أَفَلَا أَمَـرَهُنَّ أَنْ يَحْلِقْـنَ رُؤوسَـهُنَّ؟!)[٣] واتـە: جـا یەكجاری، بۆچی فەرمانیان پێ ناكات سەریان بتاشن ؟!

---

[١] المغني (١/٢٢٧)، المحلى (٢/٣٨)، نيل الاوطار (١/٣١١)، تهذيب السنن مع العون المعبود (١/٢٩٣).

[٢] بوخاری (٣١٧)، موسلیم (١٢١١).

[٣] موسلیم (٣٣١)، نەسائی (١/٢٠٣) ئیبنو ماجە ٦٠٤ .

كەمال ئیبنو السەید لە صحیح فقە السنة (١/ ١٧٨)دا دەڵێ: سەحیحە

پۆلی دووەم: ئیمام ئەحمەدو، حەسەنی بەسری و، تاوس ڕایان وایە، کە ئافرەت لە کاتی دەرکردنی غوسڵی حەیزو زەیستانیدا، واجبە پرچی بکاتەوە ئیمام ئیبنول قەییم بەدواداچونێکی وردی کردووە، لەم مەسەلەیەدا چۆتە ڕیزی شەرعناسانی پۆلی دووەم و، بەرپەرچی بەڵگەکانی جمهوری داوەتەوەو، دەڵێ[١]:

١ـ هەر ئەم فەرمودەیەی لای عائیشەخان، کە گوتی: (ثـمَّ تصُبُّ علَى رَأسِهَا فتدْلُكُهُ دَلْكًا شَدِيدًا حَتَّى تبْلُغَ شُؤونَ رَأسِهَا) واتە: پاشان ئاو بکات بەسەر قژیداو، باش هەڵیگلۆفێت، تا ئاو بگاتە بنجی پێستی سەری و، موەکانی. دیارە، کە هەر ئەوەندەی داوا نەکردوە، کە ئاو بڕژێنن بەسەر قژیاندا، وەکو، کە لە غوسڵی لەشگرانیدا دەیفەرمو، بەڵکو جەخت لەوەش دەکاتەوە کە قژیان هەڵگلۆفن و دڵنیابن، کە ئاو گەیشتۆتە پێستیان. ئەمە یەکێکە لەو جیاوازیە وردانەی، وا لە نێوان غوسڵی لەشگرانی و، غوسڵی حەیزو زەیستانیدا..

٢ـ فەرمودەکەی لای عائیشەخان و، باسی حەجەکە (پەراوێزی ٥٨٧): لەوێدا جەخت لە دەرکردنی غوسڵی حەیز، زیاتر لە غوسڵی تر کراوە، پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم، زیاتر فەرمانی بەخێرایی و باشتڕێتی غوسڵ دەرکردن، لە حەیز دەکرد، لێرەش لەبەر غوسڵی حەیزەکەیە، کە فەرمانی بە عائیشەخان کردوە، پرچەکانی بکاتەوە.

٣ـ هەڵوێستی تورە بونەکەی خاتو عائیشەخان، لە ئیبنو عومەر خوا لێیان ڕازی بێت، کە گوتی: جا بۆچی یەکجاری فەرمانیان پێ ناکات

---

[١] ابن القيم: تهذيب السنن (١/١٦٥). مەبەست سونەنی ئەبو داودە رحمه الله.

سەریان بتاشن؟! لەبەر ئەوەیە، كە باسەكە: كردنـەوەی پرچـی ژنـان بـوە، لە غوسڵی لەشگرانیدا، نەك لە غوسڵی حەیزدا..

شەرعناسی تر هەن گوتویانە: لەوانەیە لەبەر ئـەوەی قـژی خـاتو ئـوم سەلەمە، تەنك بو بێت و، قـژی خـاتو عائیشـەخان پڕتـر، بۆیـە فـەرمانی كردنەوەی پرچی، بە خاتو ئوم سەلەمە نەكردبێت...

هەنـدێكی تـر دەڵێن: لەوانەیـە حسـابی ئـەوەی بـۆ ئافرەتـانی تـر كردبێت، كە ئافرەتێـك شـەش حـەوت ڕۆژ قـژی بـڕو تێكـەڵ بمێنێتـەوەو، خۆی نەشوات، پاشـان هـەر بەوەنـدەی ئـاو بەسـەر جەسـتەیدا بڕێـژێت و، غوسڵەكەی دەركات، بەس بێت، پێدەچێت كەمێك بـۆ ئافرەتـان خۆیـان و، پیاوەكانیـان زەحمـەت بێـت.. چونكە دەبێتـە مایـەی بایـەخ پـێ نـەدان و، دورەپەرێزكردنیان، ئەمەش لەگەڵ دادو ماف و جوانكاریی ئیسلامدا، زۆر یەك ناگرێتەوە.. بۆیە من پێم وایە:

ئافرەتـان پێویستە، لـە كـاتی دەركردنـی غوسـڵی حـەیزو زەیسـتانیدا، پرچیان بكەنەوەو بیشۆن.. والله اعلم..

## ٣ . پاككردنـەوەی پەڵـە خـوێن و سـڕینەوەی ئاسـەواری:

هەرچەندە لەم سەردەمەدا، جۆرەها سـانتی تایبـەت بـە ئافرەتـان دروسـت دەكرێت، بەڵام بۆ ئافرەت باشتر وایە، كە غوسڵی حـەیزو زەیسـتانی خـۆی دەركرد، پارچە لۆكەیەك، یان دەسرێكی كاغەز، یـان قوماشـێكی نـەرم، بـە كەرەستەیەكی پاكژیی (تەعقیم) تەڕ كات و، بە عەورەتی خۆیدا بهێنێـت، هەروەها بەو شوێنانەدا، كە گومان دەكـات خـوێنی بەركـەوتبێت.. چـونكە ئەمە هەم واجبە وەكو، كە لە فەرمودەكەی لای عائیشەخاندا هـاتوە، هـەم لە ڕوی تەندروستی و، دەرونیشەوە پێویستە..

★ ★ ★

## خۆ وشك كردنەوەی دوای غوسڵ

فەرمودەكەی لای خاتو مەیمونە، خوا لێی ڕازی بێت، كە گوتی: (وَضَعْتُ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَاءً لِلْغُسْلِ (وَسَتَرْتُهُ) فَغَسَلَ يَدَيْهِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا ثُمَّ أَفْرَغَ (بِيَمِينِهِ) عَلَى شِمَالِهِ فَغَسَلَ مَذَاكِيرَهُ (فَرْجَهُ وَمَا أَصَابَهُ مِنْ الأَذَى) ثُمَّ دَلَكَ يَدَهُ بِالْأَرْضِ (أو بِالحَائِطِ، ثُمَّ غَسَلَهَا) ثُمَّ مَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ وَغَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ ثُمَّ صَبَّ عَلَى جَسَدِهِ ثُمَّ تَنَحَّى فَغَسَلَ قَدَمَيْهِ ، فَنَاوَلْتُهُ خِرْقَةً فَقَالَ بِيَدِهِ هَكَذَا وَلَمْ يُرِدْهَا)[١] واتە: ئاوم بۆ غوسڵ دەركردنی پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم داناو، پەردەیەكم بۆ ڕایەڵ كرد، دەستەكانی دووجار یان سێ جار شوشت، پاشان بە دەستی ڕاستی، كردی بەسەر دەستی چەپیدا، ئینجا زەكەری شوشت و ئەوی، پێوەی بو لێی كردەوە، پاشان دەستی بە زەوی، یان بە دیوارەكە سڕی، پاشان شوشتیەوە، ئینجا ئاوی لە دەمو لوتی وەرداو، فمی كرد، ئینجا دەموچاوی شوشت، پاشان دەستی، ئینجا سەری شوشت، پاشان ئاوی بەسەر هەمو لەشیدا كرد، پاشان كەمێك كەنار كەوت و، پێیەكانی شوشت، پارچە پەڕۆیەكم دایێ خۆی پێ وشك بكاتەوە، ئاماژەی كردو نەیویست..

ئیبنو قودامەی مەقدیسی، لە (المغنی)دا بابێكی هەیە، بە ناوی (فصل: تنشیف الأعضاء بعد الوضوء ) تێیدا هاتوە: هەندێك لە شەرعناسان وەك عبدالرحمانی كوڕی مەهدی، كە سەرچاوەی بۆچونەكەی دەباتەوە سەر، سەیدنا جابری كوڕی عبدالله، خوا لێی ڕازی بێت، ئەم فەرمودەیان كردوە بە بەڵگەی ئەوە، كە خۆ وشك كردنەوە، لە دوای غوسڵ باش نیە.. بەڵام

---

[١] بوخاری (٢٦٦)، موسلیم (٣١٧).

زۆرینەی زۆری شەرعناسان، ئەمەیان ڕەت کردۆتەوە، چونکە فەرمودەی زۆر هەیە، دەیسەلێنێت، کە سەیدنا عوسمان و، ئەنەس و، حەسەنی کوڕی عەلی، خوا لێیان ڕازی بێت، هەمو خۆیان وشك کردۆتەوە..

هەردووتوێــژەرەوەی ئوممــەتیش: ئیمــام ئیبنــو حەجــەرو، ئیمــام نەوەوی، ئەو بۆچونەیان پێ پەسەندتر بوە[1] بۆیە گوتویانە:

١ـ پێغەمبەری خوا، کە ئەو پارچە پەڕۆیەی وەرنەگرتوە، تا خۆی پێ وشك بکاتەوە، لەوانەیە پەیوەندی بە پەڕۆکەوە هەبوبێت، وەکو ئەوەی بە پاکی نەزانیبێت، یان خۆی پەلەی بوبێت.

٢ـ فەرمودەکە خۆی بەڵگەی ئەوەیە، کە پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم عادەتی وا بوە، کە دوای دەستنوێژو غوسڵ دەرکردن، خۆی وشك بکاتەوە، بۆیە خاتو مەیمونەش ئەو پەڕۆیەی بۆ گرتوە.

٣ـ تەکاندنی تەڕێتی دەستەکانی، بەڵگەن لەسەر جائیز بونی وشك کردنەوەیان، چونکە مەبەستەکە لە ڕاتەکاندن و وشك کردنەوەکە، هەر یەکە، مەبەست لە هەردووکیان، هەر لابردنی تەڕێتیەکەیانە..

دەبێ ئەوەش ڕەچاو بکرێت، کە غوسڵ دەرکردنێك، لە هاوینی ناوچەی گەرمەسێردا، زۆر جار هەر بۆ خۆ فێنك کردنەوە ئەنجام دەدرێت و، کەس خۆی لێ وشك ناکاتەوە، ئەمە لە کوێ و غوسڵ دەرکرنێك لە ناوچەی کوێستان لە کوێ ؟! کەوابو:

وشك کردنەوەی ئەندامانی لەش، دوای غوسڵ جائیزە.. والله اعلم..

★ ★ ★

[1] الفتح: (٤٣٢/١)، المجموع (٤٥٩/١).

## هەندێك مەسەلەی تری غوسڵ

**. دەستنوێژ گرتن دوای غوسڵ پێویست نیە:** هەر کەسێکی بە شێوەیەکی ڕاست و دروستی شەرعیانە، غوسڵەکەی دەرکرد، ئەگەر پێش غوسڵەکەش دەستنوێژی نەگرتبێت، پێویستی بە گرتنی دەستنوێژ نابێت، چونکە پاکژیی غوسڵ دەرکردنەکە، بۆی دەبێتە دەستنوێژ..

ـ عائیشەخان خوا لێی ڕازی بێت، دەگێڕێتەوە: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم لاَ يَتَوَضَّأُ بَعْدَ الْغُسْلِ) [1] واتە: پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم، دوای غوسڵ دەرکردنی، لە لەشگرانی دەستنوێژی نەدەگرت..

ـ لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێ: (يَغْتَسِلُ وَيُصَلِّي رَكْعَتَينِ، وَلا أَرَاهُ يُحْدِثُ وُضُوءاً بَعْدَ الغُسْلِ) [2] واتە: غوسڵەکە دەردەکات و دوو رکات نوێژ دەکات، وانازانم دوای غوسڵەکە پێویستی بە دەستنوێژ بێت..

ـ ئیبنو عومەر، خوا لێیان ڕازی بێت، دەڵێ: ئەگەر دوای غوسڵ دەرکردن، دەستت لە عەورەتت نەدابێت، ئیتر چ دەستنوێژێك لە غوسڵ دەرکردن ڕێکوپێکترە [3] ؟!

ئەمە ئەوەش دەگەێنێت، کە ئەو کەسەی غوسڵ دەردەکات، مەرج نیە نییەتی دەستنوێژ گرتنیشی بهێنێت.. ئەمەش ڕای جمهوری شەرعناسانە.

---

[1] ترمزی (١٠٧)، نەسائی (١٣٧/١) ئیبنوماجە (٥٧٩) کەمال ئیبنو السەید لە صحيح فقه السنة (١/ ١٨١)دا دەڵێ: صحيح لغيره.

[2] ئەبو داود (٣٥٠)، ئەحمەد (١١٩/٦)، الحاكم: المستدرك على الصحيحين / كتاب الطهارة (٥٦٢) دەربارەی دەڵێ: صحيح على شرط الشيخين و لم يخرجاه.

[3] هەمان سەرچاوەو ژمارە

ئیمام ئیبنوتەیمییەش بە پەسەندتری داناوە[1]، بەڵام حەنبەلیەکان دەڵێن: نەخێر، ئەگەر نیەتی هەردووکیانی نەهێنابێت، هەر نیەتی غوسڵەکەی بۆ حسێب دەبێت و، دەستنوێژەکەی جائیز نابێت. بەڵام دیارە، کە بۆچونی جمهوری شەرعناسان بەهێزترە.. فەتواش لەسەر ئەوەیە.. والله اعلم..

- **ئەگەر دوو هۆی غوسڵ کۆبونەوە:** هەر کەسێك دوو هۆی لەشگرانی لەسەر کۆبۆوە، وەکو ئەو پیاوەی غوسڵی لەشگرانی و، غوسڵی نوێژی هەینی کەوتۆتە سەر، یان ئەو ئافرەتەی لە حەیزدایەو، غوسڵی لەشگرانی کەوتۆتە سەر، ئیمام نەوەوی و، ئیبنو قودامەی مەقدیسی دەڵێن[2]: زۆرینەی شەرعناسان دەڵێن: ئەگەر نیەتی هەردووکیانی پێکەوە هێناو غوسڵی دەرکرد، ئەوە لە هەردووکیان پاك بۆتەوە.. ئیبنو قودامە دەڵێ: پێچەوانەی ئەمەم نەدیوە، ئەمەشە، کە لە ئیبنو عومەرو، موجاهیدو، مەکحول و، مالیك و، سەوری و، ئەوزاعی و، شافیعی و، ئەبو سەورەوە ڕیوایەت کراوە.

بەڵام ئیبنو حەزم و، هەندێك لە شەرعناسان پێچەوانەی ئەم بۆچونەن و، دەڵێن: دەبێت هەر یەکەیان بە جیا غوسڵی بۆ دەرکرێت.. ئەوە ڕای شێخی ئەلبانیشە، کە زۆری بەرگری لێ کردوەو، گوتوشیەتی، کە ئەوە بۆچونی جابری کوڕی زەیدو، قەتادەو، ئیبراهیمی نەخەعی و، تاوس

---

[1] مجموع الفتاوى (٢١/٣٩٧)، المبسوط (١/٤٤)، ابن احمد الدردير: الشرح الصغير (١/٦٥) الام (١/٣٦)، المحلى (٢/٤٤).

[2] المجموع (١/٤٨٧)، المغني (١/٢٩٢)..

و، عــەتــاء و، زوهــری و، عــەمری کــوڕی شــوعەیب و، مــەیمونی کــوڕی مەهرانە.[1]..

پێم وایە، کە مادام نیەتی غوسڵی هەردووکیانی هێنابێت، غوسڵی هەردووکیانی دەردەچێت.. والله اعلم.

**. ئەگەر ئافرەت پێش دەرکردنی غوسڵی لەشگرانی، کەوتە حەیزەوە** : لە ڕاسترین قەولی شەرعناسان ئەوەیە، کە پێویست ناکات غوسڵی لەشگرانی دەرکات، دەشێت چاوەڕوان بێت، تا ماوەی حەیزەکەی تەواو دەبێت و، هەردوو غوسڵەکە دەکات بە یەك، مەرجە نیەتی هەردووکیان بهێنێت. ئەمەش ڕاوبۆچونی ئیمام ئەحمەدە[2]، بەڵام هەندێك لە شەرعناسانی تری وەکو حەسەنی بەسری و، عەتاء و نەخەعی، دەڵێن: نا، دەبێت غوسڵی لەشگرانیەکەی دەرکات و، کە لە حەیزیش پاك بۆوە، غوسڵی حەیزەکەشی دەردەکات..

**. غوسڵی ژن و مێرد پێکەوە:** دەشێت ژن و مێرد لە یەك کاتدا، لە شوێنێکدا غوسڵ دەرکەن، بۆ نمونە پێکەوە دەچنە حەوزێکەوە، یان بانیۆیەکەوە، یان ژێر دوشێکەوەو، غوسڵیان دەردەکەن، هەر وەکو، کە دەشێت یەکێکیان پێش ئەوی تریان بکەوێت و، ئەوی تریان دواتر بچێتە ناوی، ئەمە حوکمی بەکارهێنانی ئاوەکەش دەسەلمێنێت، کە بەکارهێنانی ئاوی غوسڵی یەکێکیان، بۆغوسڵ دەرکردنی ئەوی تریان جائیزە.. بەڵگەی ئەمەشمان پێشتر لە باسی ئەحکامی ئاودا هێنایەوە، کە:

---

[1] تمام المنة (ل ١٣٦ ـ ١٣٠).

[2] ابن رجب: القواعد (٣٦/١).

ـ فەرمودەکەی لای عائیشەخانە، خوا لێی ڕازی بێت، کە گوتی: (لَقَدْ كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَرَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عليهِ وَسَلَّمَ مِنْ إِنَاءٍ واحِدٍ، فَمَا أَزِيدُ عَلَى أَنْ أُفْرِغَ عَلَى رَأْسِي ثَلاثَ إِفْرَاغَاتٍ )[1] واتە: من و پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم، غوسڵی خۆمان لە تەشتێکدا دەردەکرد، تەنها سێ مشت ئاویشم دەکرد بەسەرمداو بەس..

ـ یان ئەو فەرمودەیەی، کە ئوم هانی دەیگێڕێتەوە: (أنَّ النبيَّ صلى الله عليه وسلم اغْتَسَلَ، هُوَ وميمونَةُ، مِن إناءٍ واحدٍ. قَصْعَةٌ فِيها أَثَرُ الْعَجِينِ)[2] واتە: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و، مەیمونەی خێزانی، لە تەشتێکدا پێکەوە خۆیان شوشت، کە هەویری کۆنی پێوە بو.

ـ <u>غوسڵ دەرکردن بە ڕوتی لەبەر چاوان حەرامە:</u> دەشێت بە ڕوتی غوسڵ دەرکات، بەو مەرجەی کەس نەیبینێت، وەکو ئەوەی پەردەیەك بە دەوری خۆیدا ڕاهێڵ کات، چونکە:

ـ فەرمودەی لای خاتو مەیمونەیە، خوا لێی ڕازی بێت، کە دەڵێ: (<u>وَضَعْتُ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَاءً لِلْغُسْلِ وَسَتَرْتُهُ</u>)[3] واتە: ئاوم بۆ غوسڵ دەرکردنی پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم داناو، پەردەیەکم بۆ ڕایەڵ کرد

---

[1] موسلیم (٣٢١)، نەسائی (١/٢٠٣) ئیبنو ماجە ٠ ٦٠٤).
کەمال ئیبنو السەید لە صحیح فقه السنة (١/ ١٧٨)دا دەڵێ: سەحیحە

[2] رواه احمد والنسائي وابن خزيمة نەسائی ١/٢٠٢ ئیبنوماجە ١/١٣٤ ژمارە ٣٧٨ ئەحمەد ٣٤٢/٦ شێخی ئەلبانی بە سەحیحی داناوە، بڕوانە: صحيح النسائي (١ / ٥١) وصحيح ابن ماجه (٣٧٨) ومشكاة المصابيح/٤٨٥ وإرواء الغليل (١ / ٦٤).

[3] بوخاری (٢٦٦)، موسلیم (٣١٧).

ـ ئەوەش لە پێغەمبەری خواوە، صلی الله علیه وسلم سەلمێنراوە، کە سەیدنا موسا[١]و، سەیدنا ئەیوب[٢] سەلامی خوایان لێ بێت، بە ڕوتی خۆیان دەشوشت..

**ـ کەسێك لە کاتی غوسلْ دەرکردندا دەستنوێژی بشکێت:**

ئەو کاتەی لەشگرانێك خۆی دەشوات، ئەگەر پێش تەواوبونی غوسڵەکەی دەستنوێژی شکا، با گوێ نەداتێ و، لە غوسلْ دەرکردنی خۆی بەردەوام بێت، چونکە ئەوە ڕێ لە غوسڵەکەی ناگرێت، بەڵام لەسەر قەولی زۆرینەی شەرعناسانی وەکو عەتاء و، سوفیانی سەوری و، ئیمام شافیعی، دەبێت دەستنوێژ بگرێت.. ئیبنو قودامەو، ئیبنول مونزیریش ئەوەیان بە پەسەندتر زانیوە[٣] ..

★ ★ ★

## هەندێك بابەتی پەیوەندیدار بە لەشگرانی

**ـ لەشگران بۆی هەیە غوسلْ دەرکردنی دواخات:** مەرج نیە هەر ئەو کاتەی لەشگران دەبێت، غوسلْ دەرکات، چونکە ئەبو هورەیرە، خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە: (أنَّ النَّبيَّ صلى الله عليه وسلم لَقِيَهُ في بَعْضِ طُرُقِ المدينَةِ وهُو جنُبٌ، فانْخَنَسَ مِنْهُ، فذَهَبَ، فاغْتَسَلَ، ثمَّ جَاءَ، فقالَ: أينَ كُنْتَ يا أبا هُريرَةَ؟ فقالَ: كُنْتُ جُنُباً فكَرِهْتُ أنْ أُجَالِسَكَ وأنا علَى

---

[١] بوخاری (٢٧٨)، موسلیم (٣٣٩).
[٢] بوخاری (٢٧٩).
[٣] المغني (١/٢٩٠)، الاوسط (٢/١١٢).

غَـيرِ طَهَـارَةٍ. فقـالَ: سُـبْحَانَ اللهِ، إنَّ المـؤمِنَ لا يَـتجُسُ)[1] واتـە: جارێـك لـە کۆڵانێکی مەدینەدا، پێغەمبەری بینی صلی الله علیە وسلم، بەڵام لەبەر ئەوەی لەشی گران بو (لە جەنابەتدا بو) نەهاتە خزمەت پێغەمبەر، صلی الله علیـە وسـلم، پاشـان ـ دوای غوسـڵ دەرکـردن ـ هاتـەوە خزمـەتی، پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم، لێی پرسی: ئـەرێ ئـەبو هورەیرە لـە کوێ بویت؟ ئەویش گوتی: لـە جەنابەتـدا بـوم، بۆیـە حـەزم نـەکرد بـە لەشـی پیسەوە، لە خزمەتتدا بم. ئەویش فەرموی: پـاك و بـێ خەوشـی بـۆ خـوا، موسوڵمان پیس نابێت.

هەروەها ئەو فەرمودەیەی لای ئەنەسـی کوڕی مالیـك، خـوا لێـی ڕازی بێت، کە گوتی: (أنَّ نَبيَّ اللّهِ صَلَى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَطُوفُ عَلَى نِسَائِهِ فِي اللَّيْلَةِ الْوَاحِدَةِ وَلَهُ يَوْمَئِذٍ تِسْعُ نِسْوَةٍ )[2] واتە: پێغەمبەری خوا، صلی الله علیە وسلم، لە شەوێکدا، بەسەر هەمو خێزانەکانیدا دەگەڕا، کە نۆ ژنیشی هەبو..

کەوابو مانەوەی موسوڵمان، بـە لەشـگرانی، هـیچ کاریگەرییـەکی نیـە، مەگەر ببێتە هۆی دواخستنی نوێژەکانی.. ئەوەش حوکمێکی تری هەیە.

ئەو قسەیەی ناو کوردەواریش، ڕاسـت نیـە، کـە دەڵـێ: زەوی هـاوارێتی لـەوەی، لەشـگرانێك بەسـەریدا دەڕوات و، خۆزگـە دەخوازێـت زو غوسـڵ دەرکات..

---

[1] بوخاری (٧٩/١ و ٨٠)، موسلیم (٢٨٢/١ ژمارە ١١٥)، ئەبوداود (٥٢/١)، نەسائی (١٤٥/١)، ترمزی (٢٠٧/١ و ٢٠٨ ژمارە ١٢١) دەربارەشی دەڵێ: (حديث حسن صحيح)، ئیبنو ماجە (١ / ٧٨ ژمارە ٥٣٤)، ومسند أحمد (٢/ ٢٣٥) .

[2] بوخاری (٢٨٤)، موسلیم (٣٠٩).

**ـ لەشـگران بـۆی هەیـە پـێش غوسـڵ دەرکـردن بخەوێتـەوە:**

لەبەر ئەوەی عائیشەخان، خوا لێی ڕازی بێت، دەڵێ: (إِذَا أَرَادَ أَنْ يَنَـامَ وَهُـوَ جُنُبٌ، غَسَلَ فَرْجَـهُ، وَتَوَضَّـأَ لِلصَّلاَةِ)[1] واتـە: ئـەو کاتـەی پێغەمبـەری خـوا، صـلى الله عليـە وسـلم لەشـگران بوایـەو، بیویسـتیایە بخەوێتـەوە، دەچـو عەورەتی دەشوشت و، دەستنوێژی دەگـرت وەکو، کـە بـۆ نوێـژی دەگـرت.. ئینجا دەخەوت..

عبداللەی کوڕی قەیس، خوا لێی ڕازی بێت، لە عائیشەخان، خوا لێـی ڕازی بێـت پرسـی: (كَيْـفَ كَانَ نَـوْمُ رَسُولِ اللَّـهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ فِـي الْجَنَابَةِ أَيَغْتَسِلُ قَبْلَ أَنْ يَنَامَ أَوْ يَنَامُ قَبْلَ أَنْ يَغْتَسِلَ قَالَتْ كُلُّ ذَلِـكَ قَـدْ كَانَ يَفْعَلُ رُبَّمَا اغْتَسَلَ فَنَـامَ وَرُبَّمَـا تَوَضَّـأَ فَنَـامَ) فَقَـالَ: الحَمْـدُ للهِ الـذي جَعَـلَ في الأمْـرِ سَـعَةً)[2] واتـە: پێغەمبـەری خـوا، صـلى الله عليـە وسـلم، لـە کـاتی لەشگرانیدا چۆن بو؟! ئایا غوسڵی دەردەکرد، پێش ئەوەی بخەوێتەوە، یان دەخەوتـەوەو، پـێش ئـەوەی غوسـڵ دەربکـات؟! فـەرموی: هـەردووکیانی دەکرد.. جـاری وا هـەبو غوسـڵی دەردەکـردو دەخـەوت، جـاری واش هـەبو، دەسـتنوێژێکی دەگـرت و دەخـەوت.. عبداللـە گـوتی: سـوپاس بـۆ ئـەو خوایەی، کە ئاسانکاری لەمەدا کردوە..

**ـ لەشـگران بـۆی هەیـە قورئـان بخوێنێـت:** پێشـتر لـە باسـی دەسـتنوێژدا، ئەمـە ڕون کرایـەوەو، لـە پوختەکەیـدا وتم: لـەش پـاکیی مەرجە بۆ دەستدان لە قورئـان و هـەڵگرتنی، بـەڵام دەسـتنوێژ بـۆ دەسـت لێـدان و، هـەڵگرتن و، خوێنـدنی، مـەرج نیـە.. ئـافرەتیش کـە لـە حـەیزدا

---

[1] بوخاری (٢٨٨)، موسلیم (٣٠٥).

[2] موسلیم (٣٠٧).

بێت یان زەیستان بێت دەتوانێت قورئان بخوێنێت، بـێ ئـەوەی دەسـتی لـێ بدات.. والله اعلم..

**. لەشگران و حەیزدار بۆیـان هەیـە لـە مزگەوتـدا بمێننـەوە:**

ئەمە یەکێکە لەو باسانەی، کە راجوێییەکی زۆری لەسەرەو، هەر لایەنەش بەرگریی بەردەوام، لە بۆچونی خۆی دەکات.. لـە کاتێکـدا، کـە هـەر چـوار ئیمامـە بەرێزەکـە و، جمهـوری شەرعناسـان رایـان وایـە، کـە لەشـگران و ئـافرەتی حـەیزدارو زەیسـتان، بۆیـان نیـە لـە مزگەوتـدا بمێننـەوە، ئـەم بەرێزانـە نـاو دەنـێم (بەرهەڵسـتکاران)، ئەوانـەش، کـە دەڵـێن: رێ بـە لەشـگران و، حـەیزدارو، زەیسـتان بـدرێت بێنـە مزگـەوت، نـاو دەنـێم (رێدەران).. با بەڵگەی هەردوولایان بخەینە بەردەست:

**بەرهەڵســتکاران گوتویانــە: نابێــت لەشــگران وحــەیزدارو زەیستان لە مزگەوتدا بمێننەوە:**

١ ـ خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغۡتَسِلُواْ ﴾ النســـــاء/٤٣ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەرتـان هێنـاوە، لـەو کاتانـەدا، کـە سەرخۆشـن، توخنی نوێژ نەکەونەوە، تا بزانن چی دەڵێن، لەو کاتانەش، کە لەشگرانن (لە جەنابەتدان)، تا خۆتان دەشۆن، مەگـەر رێبـوار بـن و، پێیـدا تێپـەرن، یان، تا ئەو ساتەی تەیەمموم دەکەن..

ئەم شەرعناسە بەرهەڵستکارانە دەڵێن: لێرەدا مەبەست لە نوێژ شوێنی نوێژ کردنەکەیـە، کـە مزگەوتـە، ئایەتەکـەش رێ لـە مانـەوەی لەشـگرانان دەگرێت، لە مزگەوت دا بن، مەگەر رێبوار بن..

ئینجا ئەم بەڕێزانە، حوکمی حەیزدارو زەیستانیشیان، وەکو حوکمی لەشگران لێکردوە..

شەرعناســـە ڕێـــدەرەکانیش دەڵـــێن: ئەمـــەی ئێـــوە، یەکێکـــە لـــە لێکدانەوەکانی سەلەف بۆ ئایەتەکە، لێکدانەوەکەی تریان، دەڵێ: مەبەست خودی نوێژەکەیە، نەك جێگای نوێژەکە، کەوابو حوکمەکە ئەوەیە، کە لەشگران توخنی خودی نوێژ نەکەوێت، نەك شوێنی نوێژ..

بـۆ قیـاس کردنـی حـەیزدارو، زەیسـتانیش بـە لەشـگران، دەڵـێن: لێـك ناچن، چونکە لەشگران، کاتی غوسڵ دەرکردنـی لەدەست خۆیدایـە، بـەڵام ئافرەتـــەکان خـــاوەن عـــوزرن، چـــونکە پابەنـــدن بـــە مـــاوەی، حـــەیزو زەیستانیەکەوە، تا لە خوێن پـاك نەبنـەوە، نـاتوانن غوسـڵ دەرکـەن.. خـۆ کە غوسڵیان دەرنەکردوە، بە دەست خۆیان نیە..

٢ ـ فەرمودەکەی جسـرەی کچـی دەجاجـە، خـوا لێـی ڕازی بێـت، کـە لـە عائیشـەخانەوە، خـوا لێـی ڕازی بێـت دەگێڕێتـەوە، کـە پێغەمبـەری خـوا، صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (إِنّي لَا أُحِلُّ الْمَسْجِدَ لِحَائِضٍ وَلَـا جُنُـبٍ )[١] واتە: من مزگەوت بۆ حەیزدارو لەشگرانان، حەڵاڵ ناکەم..

ڕێدەران گوتویانە: فەرمودەکە زەعیفـەو، نابێتـە بەڵگـە، قسـە لەسـەر سـەنەدی هەیـەو، تـەنها لـە ڕێـی جسـرەوە هـاتوە، لـە کەسـی تـرەوە نەگێڕراوەتەوە..

٣ ـ فەرمودەکەی لای ئـوم عەتییـە، خـوا لێـی ڕازی بێـت، کـە دەربـارەی ئامـادەبونی ئافرەتـان بـۆ نوێـژی جـەژن و، ئاهەنگەکـەی، لـە پێغەمبـەری

---

[١] ئەبوداود (٢٣٢)، بەیهیقی (٢/٤٤٢)، ئیبنو خوزەیمە (٢/٢٨٤)، شێخی ئەلبانی لە ارواء (١٩٣) دا دەڵێ: زەعیفە..

پێشـەواوە، صـلی اللە علیـە وسـلم دەگێڕێتـەوە كـە فەرمویـەتی: (لِتخْـرُجِ الْعَوَاتِقُ وَذَوَاتُ الْخُدُورِ وَالْحُـيَّضُ فَيَشْهَدْنَ الْخَيْـرَ وَدَعْـوَةَ الْمُسْلِمِينَ وَتعْتَـزِلِ الْحُـيَّضُ الْمُصَـلَّى)[١] واتــە: بـا كچـانی پێگەیشـتو و، ژنـی بـە مێـرد و، حەیزدارانیش ئامادە بن، با بەشداری خێرات ودوعـای موسـوڵمانان بـبن، بـەڵام، بـا حـەیزدارەكان لـە نوێژگاكـە كـەنارگیر بـن.. ئـەم شەرعناسـە بەڕێزانە دەڵێن جا، كە حـەیزدار لـە ساحەی نوێـژ خوێنـدن دورەپـەرێز بێت، حەتمەن مزگەوت لە پێشترە، كە نابێت بچێتە ناویەوە.

ڕێدەران دەڵێن: مەبەست لە (مُصَلَّى) خـودی نوێژەكەیـە، نـەك شـوێن نوێژەكە، خۆ هەمویان هەر لە شوێنی نوێژەكە بون، هەمو شوێنێكی سـەر زەمینــیش، بـۆ موسـوڵمان شـوێن نوێـژە، كـەوابو ناشـێت مزگـەوت، لـە موسوڵمان بگیرێت، بە تایبەتی، كە لەشگران پیس نیە.. ئەمە جگە لەوەی هـەر ئـەو فەرمودەیـە، لـە ڕیوایـەتی تـری لای موسـلیمدا هـاتوە، كـە دەفەرموێ: (فَأمَّا الحُيَّضُ فَيَعْتَزِلْنَ الصَّلَاةَ) واتە: ئەوانەی لـە حـەیزدان، بـا توخنی نوێژەكە نەكەونەوە..

٤ ـ ئەو فەرمودەیەش، كە لای عائیشەخانە، خوا لێـی ڕازی بێـت ، بـاس لە قژ داهێنانی پێغەمبەری خوا، صلی اللە علیە وسلم و، شت دانـە دەسـتی دەكات، كە دەڵێ: (كَانَ النَّبِيُّ صـلی اللە علیـە وسـلم يُصْغِي إِلَـيَّ رَأْسَـهُ وَهْوَ مُجَاوِرٌ فِـي الْمَسْجِدِ فَأُرَجِّلُـهُ وَأنَـا حَـائِضٌ)[٢] واتـە: لـەو دیـوی مزگەوتـەوە، سەری لار دەكردەوە بە لامدا و، منیش هەرچەندە لە حەیزدابوم، قژم بـۆ شـانە دەكـرد.. بەرهەلسـتكاران دەڵـێن: ئەگـەر جـائیز بوایـە، ئـافرەتی حەیزدار بچێتە مزگەوتـەوە، دەبـو عائیشـەخان لـەو دیـوی مزگەوتەكـەوە

---

[١] بوخاری (٣٢٤)، موسلیم (٨٩٠).
[٢] بوخاری (٢٠٢٩).

بوایەو، سەری بۆ شانە بكردایە..

بەڵام بەرامبەرە ڕێدەرەكانیان دەڵێن: لەوانەیە لەبەر هۆیەكی تر بێت، كە عایشەخان نەچۆتە ئەو دیوی مزگەوتەكە، وەك ئەوەی مزگەوتەكە پیاوی لێ بوبێت..

<u>شەرعناسە ڕێدەرەكان دەڵێن:</u> قسەمان لەسەر هەمو ئەو بەڵگانە هەیە، كە بەرهەڵستكاران هێناویانەتەوە، ئێمە پێمان وایە، كە لەشگران و، حەیزدارو، زەیستان بۆیان هەیە بچنە مزگەوتەوەو، تێشیدا بمێننەوە، بە بەڵگەی:

١ ـ ئەسڵ پاكێتیە: مادام بە ڕاشكاوی، ڕێگرتنێكی شەرعی لەبەر دەستدا نیە، كەوابو دەگەڕێینەوە سەر ئەسڵەكە، كە موسوڵمان ڕێدراوە لە هەر شوێنێكدا بێت ببێت، لە كوێ دەیەوێت نوێژ بكات، بۆی هەیە بیكات..

٢ـ سەلمێنراوە، كە موشریك چونەتە مزگەوتەوەو، پێغەمبەری خواش لە مزگەوتدا هێشتونیەوە، لە كاتێكدا خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُواْ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَٰذَا﴾ التوبە/٢٨ واتە: موشریكەكان پیسن، با لە دوای ئەمساڵیانەوە، نزیك كەعبە نەكەونەوە. خۆ ئەوەش سەلمێنراوە، كە موسوڵمان پیس نابێت، چونكە پێغەمبەری خوا، صلى الله علیه وسلم دەفەرموێ: (إنَّ المؤمِنَ لا يَنْجُسُ)[١] واتە: موسوڵمان پیس نابێت. چۆن دەگونجێت ڕێ بە موشریكی پیس درابێت، بچێتە مزگەوتەوەو، ئێوە ڕێی لە موسوڵمانی پاك دەگرن؟!

---

[١] بوخاری (١/٧٩ و ٨٠)، موسلیم (١/٢٨٢ ژمارە ١١٥)، ئەبوداود (١/٥٢)، نەسائی (١/١٤٥)، ترمزی (١/٢٠٧ و ٢٠٨ ژمارە ١٢١) دەربارەشی دەڵێ: (حديث حسن صحيح)، ئیبنو ماجە (١ / ٧٨ ژمارە ٥٣٤)، ومسند أحمد (٢/ ٢٣٥) .

بەرهەڵستکاران لە وەڵامی ئەماندا دەڵێن: هەر شەرع ئەو جیاوازییەی خستۆتە نێوان کافرو موسوڵمانەوەو، ئەو دوو حوکمە جیاوازەشی دەرکردوە، کە رێی داوە ئەو موشریکانە بچنە مزگەوت و، بە پێی بەڵگەی شەرعی، رێشی لە لەشگران و، حەیزدارو، زەیستان گرتوە!! ئەوانیش لە وەڵامیاندا دەڵێن: ئاخر بەڵگەکانتان ئەوەندە بەهێز نین، حوکمێکی وایان پێ بگۆررێت.. ئەگەر دەقەکانتان بسەلمێنن، ئێمەش تەسلیمیان دەبین..

٣ ـ فەرمودەی (متفق علیە)یە، کە عائیشەخان، خوا لێی رازی بێت دەگێرێتەوە، کە ئافرەتێکی قولەرەش، کە سەر بە یەکێك لە تیرەکانی عەرەب بو، ئازادیان کردبو، کەسی نەبو، موسوڵمان بوبو، لە گۆشەیەکی مزگەوتدا خێمەیەکی هەڵدابو، لەوێ دەژیاو، جارجارە دەچوە خزمەت عائیشە، خوا لێی رازی بێت.[١] .. خۆ ئەمە ئافرەتەو لە مزگەوت ژیاوە، خۆ حەتمەن کەوتۆتە حەیزەوە، بەڵام کەس رێی لێ نەگرتوە[٢]..

---

[١] بوخاری (٤٣٩): (وَعَنْ عَائِشَةَ أَنَّ (وَلِيدَةً الْوَلِيدَةُ الْأَمَةُ) سَوْدَاءَ كَانَ لَهَا خِبَاءٌ فِي الْمَسْجِدِ فَكَانَتْ تَأْتِينِي فَتَحَدَّثُ عِنْدِي - الْحَدِيثَ. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَالْحَدِيثُ بِرُمَّتِهِ فِي الْبُخَارِيِّ عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ وَلِيدَةً سَوْدَاءَ كَانَتْ لِحَيٍّ مِنَ الْعَرَبِ فَأَعْتَقُوهَا فَكَانَتْ مَعَهُمْ فَخَرَجَتْ صَبِيَّةٌ لَهُمْ عَلَيْهَا وِشَاحٌ أَحْمَرُ مِنْ سُيُورٍ، قَالَتْ فَوَضَعَتْهُ أَوْ وَقَعَ مِنْهَا فَمَرَّتْ حِدَأَةٌ وَهُوَ مُلْقًى فَحَسِبَتْهُ لَحْمًا فَخَطَفَتْهُ. قَالَتْ: فَالْتَمَسُوهُ فَلَمْ يَجِدُوهُ فَاتَّهَمُونِي بِهِ فَجَعَلُوا يُفَتِّشُونِي حَتَّى فَتَّشُوا قُبُلَهَا قَالَتْ: وَاللَّهِ إِنِّي لَقَائِمَةٌ مَعَهُمْ إِذْ مَرَّتْ الْحِدَأَةُ فَأَلْقَتْهُ قَالَتْ: فَوَقَعَ بَيْنَهُمْ، فَقُلْت هَذَا الَّذِي اتَّهَمْتُمُونِي بِهِ زَعَمْتُمْ وَأَنَا بَرِيئَةٌ مِنْهُ وَهَا هُوَ ذَا، قَالَتْ: فَجَاءَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَسْلَمَتْ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَكَانَ لَهَا خِبَاءٌ فِي الْمَسْجِدِ أَوْ حِفْشٌ فَكَانَتْ تَأْتِينِي فَتَحَدَّثُ عِنْدِي، قَالَتْ فَلَا تَجْلِسُ إلَّا قَالَتْ: وَيَوْمَ الْوِشَاحِ مِنْ تَعَاجِيبِ رَبِّنَا أَلَا إنَّهُ مِنْ دَارَةِ الْكُفْرِ نَجَانِي قَالَتْ عَائِشَةُ: قُلْت لَهَا: مَا شَأْنُك لَا تَقْعُدِينَ إلَّا قُلْت هَذَا ؟ فَحَدَّثَتْنِي بِهَذَا الْحَدِيثِ ).

[٢] ئیمامی سەنعانی لە سبل السلام (٢٤٤/١) دا باسێکی تەرخان کردوە، بۆ توێژینەوەی ئەمەو لە کۆتاییەکەیدا دەڵێ: (إبَاحَةِ الْمَبِيتِ وَالْمَقِيلِ فِي الْمَسْجِدِ لِمَنْ لَيْسَ لَهُ مَسْكَنٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ رَجُلًا كَانَ أَوْ امْرَأَةً عِنْدَ أَمْنِ الْفِتْنَةِ).

بەرهەڵستکاران دەڵێن: ئەو ئافرەتە نەکەسی هەبوە، نە ماڵ و مەنزڵ.. کەوابو حاڵەتێکی ناچاریی بوە، ناشێت بکرێتە قیاس بۆ کەسانی تر..

٤ ـ ئەبو هورەیرە، خوا لێی ڕازی بێت، باسی ئافرەتێکی تر دەگێڕێتەوە: (أنَّ امْرَأةً سَوْدَاءَ كَانَتْ تقُمُّ الْمَسْجِدَ، فَفَقَدَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَأَلَ عَنْهَا بَعْدَ أَيَّامٍ فَقِيلَ لَهُ إِنَّهَا مَاتَتْ قَالَ فَهَلَّا آذَنْتُمُونِي، فَأَتَى قَبْرَهَا فَصَلَّى عَلَيْهَا )[1] واتە ئافرەتێکی ڕەش، مجێوری مزگەوت بو، ماوەیەك بو نەکەوتە بەرچاوی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، بۆیە پرسیاری دەربارە کرد، وتیان: کۆچی دوایی کردوە، فەرموی: ئەدی بۆچی بانگتان نەکردم (بۆ مەراسیمی کفن و دفنی)، ئیتر چوە سەر گۆڕەکەی و نوێژی لەسەر کرد.. ڕێدەران دەڵێن: خۆ ئەم ئافرەتەیان ناچار نەبو لە مزگەوت بمێنێتەوە؟! مجێور بوە، سەرپەرشتی مزگەوتەکەی بەردەوام کردوە، بەردەوام لەوێش ماوەتەوە، حەتمەن کەوتۆتە حەیزەوەو، هەر بەردەوامیش بوە، لەسەر کاری خۆی، کەسیش داوای لێ نەکرد، کەنارگیر بێت و، نزیکی مزگەوت نەبێت..

٥ ـ ئەوەش سەلمێنراوە، کە ئیبنو عومەر خوا لێیان ڕازی بێت، گەنجێکی بێ ژن و ماڵ بو، لە مزگەوت دەخەوت! حەتمەن وەکو هەر گەنجێکی تر، لەشگران بوەو بەو حاڵەشیەوە، لە مزگەوتدا ماوەتەوە..

بەرهەڵستکاران دەڵێن: نازانین، کە پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم بینیبێتی و، ڕێی پێدا بێت!

---

[1] بوخاری (٤٥٨)، موسلیم (٩٥٦) بەیهیقی (٤٨/٤) زیاتر جەخت لەوە دەکاتەوە ە ئافرەت بو..

ڕێدەران لە وەڵامدا دەڵێن: ئێ خۆ خوای گەورە دەیبینی..

بەرهەڵستكاران دەڵێن: خۆ بۆ هەر هەڵەی یاوەرێك، وەحی نەهاتۆتە خوارەوە..

٦ ـ كە عائیشەخان، خوا لێی ڕازی بێت، لە حەجدا كەوتە حەیزەوە، پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم، تەنها ڕێی تەواف كەعبەی لێ گرت، دەنا مەراسیمەكانی تری خواپەرستی، لەگەڵ موسوڵمانانندا ئەنجام دەدا، كەوابو حەیزدار، ڕێدراوە بچێتە مزگەوت و، تێیدا بمێنێتەوە..

بەرهەڵستكاران دەڵێن: ئەوەی پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم بۆ ئەوە بوە، كە عائیشەخان فێر كات، كە دەتوانێت هەمو خواپەرستیەكانی حەج، جگە لە تەواف كەعبە بكات !! قابیلە ڕێ بە ئافرەتێكی تری حەیزدار بدرێت، كە نوێژەكانی بكات؟!

٧ ـ فەرمودەیەكی تر لای عائیشەخان هەیە، كە دەڵێ: پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم فەرموی: (نَاوِلِينِي الْخُمْرَةَ مِنَ الْمَسْجِدِ، فَقُلْتُ إِنِّي حَائِضٌ، فَقَالَ: " إِنَّ حَيْضَتَكِ لَيْسَ بِيَدِكِ)[1] واتە: ئەو خومرەیەم[2] بدەرێ كە وا لە مزگەوتە، عائیشەخان گوتی: ئاخر من لە حەیزدام، فەرموی: حەیزەكەت لە دەست خۆتدا نیە.. ئەمە ئەوە دەگەێنێت، كە خومرەكە لە ناو مزگەوتەكە بوەو، عائیشەخان نەیویستوە بێتە ناو مزگەوتەكەوە،

---

[1] موسلیم (٢٩٨)، ئەبوداود (٢٦١)، ترمزی (١٣٤) نەسائی (١٩٢/٢).

[2] پارچە قوماشێكی چنراوبوە، وەكو بەرماڵ و جاجم، هەندێك عەرەبی گەوجی عارەبی نەزان، خومرەكەیان بە خەمر (شەراب) لێكداوەتەوەو، مەقالەیان لەسەر نوسیوە، كە گوایە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم داوای شەڕابی لە عائیشەخان كردوە !! حاشای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم..

بەڵام پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم، هەر سور بوە لەسەر ئەوەی، کە ئەو بێتە ناو مزگەوتەکەوە..

بەرهەڵستکاران دەڵێن: فەرمودەکە بە شێوەی تریش ریوایەت کراوە، کە دەفەرموێ: (يَا عَائِشَةُ نَاوِلِينِي الثَّوبَ، فَقَالَتْ: إِنِّي حَائِضٌ، فَقَالَ: إِنَّ حَيْضَتَكِ لَيْسَتْ فِي يَدِكِ)[١] واتە: ئەرێ عائیشە، ئادەی ئەو پۆشاکەم بدەرێ، گوتی: من لە حەیزدام، فەرموی: قەیدی نیە، خۆ حەیزەکەت بە دەست خۆت نیە.. ئەمە ڕون و ئاشکرایە، کە پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم لە مزگەوتەکەدا بوەو، عائیشەخان و خومرەکە لە دەرەوەی، بۆیە فەرمانی پێکرد، تا بە دەستی خۆی بۆی بهێنێتە ژورەوە

دوای ئەم ڕەدو بەدەلەی شەرعناسان و بەڵگەکانیان، کە زۆر زیاترە لەوەی، من لێرەدا هەندێکیانم هێنایەوە، گەیشتمە ئەوەی، کە ڕاستە جمهوری شەرعناسان و، لە پێشیانەوە پێشەوایانی چوار مەزهەبەکە بۆچونیان ئەوەیە، کە لەشگران و، حەیزدارو، زەیستان، بۆیان نیە لە مزگەوتدا بمێننەوە، بەڵام بەڵگەی بەرامبەرەکانیان بەهێزترە.. بۆیە:

پێم وایە لەشگران و، حەیزدارو، زەیستان بۆیان، هەیە لە مزگەوتدا بمێننەوە.. والله اعلم..

* * *

---

[١] موسلیم (٢٩٩)، نەسائی (١٩٢/١).

# باسی نۆیەم

# تەیەممووم

ـ تەیەممووم لە جیاتی چیە ؟

ـ ئەو حاڵەتانەی کە تەیەممومی تێدا جائیزە.

ـ ئاوی پێیەو:

١ ـ بەشی ناکات. ٢ ـ دەترسێت. ٣ ـ نەخۆشەو ناوێرێت بەکاری بهێنێت.

ـ صەعید چیە، کە تەیەممومی پێ دەکرێت ؟.

ـ حوکمی ئەو کەسەی نە ئاوی دەست دەکەوێ نەصەعید. ـ بابەتی تری پەیوەندیدار.

ـ چۆنیەتی تەیەممومی دروست.

ـ بەتاڵ بونەوەی تەیەممووم.

ـ ئەو کەسەی دوای تەیەممووم نوێژ ئاوی دەست کەوت.

## باسی نۆیەم

## تەیەممــوم

### پێناسەی تەیەمموم:

- **لە زمانەوانیدا:** تەیەمموم واتە مەبەست و ئاراستە.. دەوترێت: (تيَمَّمْتُ فلاناً، ويَمَّمْتُهُ، وتأمَّمْتُهُ، وأمَّمْتُهُ: أي قصَدْتُهُ) خوای گەورەش دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَيَمَّمُوا۟ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ﴾ البقره/٢٦٧ واتە: مەبەستتان دەسختنی پارەی حەرام نەبێت، تا لەویان لە پێناوی خوادا ببەخشن.

- **لە زاراوەییدا:** تەیەمموم: بەكارهێنانی صەعیدە (هەمو شتێكی پاكە، كە لەسەر روی زەوی هەیە) لە جیاتی ئاو بۆ دەستنوێژو غوسڵ، تا هەرچی ئەو دوانە رێی پێ دەدەن، ئەمیش رێی پێ بدات..

### تەیەمموم جائیزە:

شیاوێتی تەیەمموم، بە بەڵگەی قورئان و سوننەت و كۆڕایە:

١ . **لە قورئاندا هاتوە:** ﴿فَلَمْ تَجِدُوا۟ مَآءً فَتَيَمَّمُوا۟ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمْسَحُوا۟ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم مِّنْهُ﴾ المائده/٦ واتە: ئەگەر ئاوتان دەست نەكەوت، هەر بەوەی لەسەر زەمیندا بەرز بۆتەوە (لە خاك و خوێ ولم و بەردو قسڵ و هتد) مەسحی دەموچاو و دەستانی پێ بكەن.

## ٢ . له سوننەتدا:

★ پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: (...ٍ وَجُعِلَتْ لِي الْأَرْضُ مَسْجِدًا وَطَهُورًا فَأَيُّمَا رَجُلٍ مِنْ أُمَّتِي أَدْرَكَتْهُ الصَّلَاةُ فَلْيُصَلِّ)[١] واتە: هەمو زەوی، بۆ خۆم و ئوممەتەکەم، جێ نوێـژەو پاکە، هەر کەسێك لە ئوممەتەکەم لە هەر شوێنێك کاتی نوێـژی گەیشتێ، ئەوە ئەو شوێنەی مزگەوتەو پاکە. دەتوانێت نوێژەکەی لێ بکات..

★ عەمرانی کوڕی حەسسین، خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: (... وَنُودِيَ بِالصَّلَاةِ فَصَلَّى بِالنَّاسِ، فَلَمَّا انْفَتَلَ مِنْ صَلَاتِهِ إِذَا هُوَ بِرَجُلٍ مُعْتَزِلٍ لَمْ يُصَلِّ مَعَ الْقَوْمِ قَالَ: مَا مَنَعَكَ يَا فُلَانُ أَنْ تُصَلِّيَ مَعَ الْقَوْمِ . قَالَ أَصَابَتْنِي جَنَابَةٌ وَلَا مَاءَ. قَالَ: عَلَيْكَ بِالصَّعِيدِ، فَإِنَّهُ يَكْفِيكَ)[٢] واتە: پاشان ،کە بانگ درا، پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم، نوێژەکەی بە ئیمامەت بۆ خەڵکەکە کرد، کە لە نوێژ تەواو بو، کابرایەکی بینی گۆشەگیرەو، لەگەڵ خەڵکەکە نوێژی نەکرد، پێی فەرمو: ئەرێ فلان، چی ڕێی لێ گرتیت، تا نوێژەکە لەگەڵ ئەو خەڵکە نەکەیت؟! گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، توشی لەشگرانی بوبوم و، ئاویشم دەست نەکەوت، فەرموی: دەتوانیت صەعید بەکار بهێنیت، ئەویشت بەسە.. دواتر کە ئاویان هێنا، دەفرێکی لێ دایە کابراو فەرموی: بڕۆ خۆتی پێ بشۆ..

**٣ . کۆڕا (ئیجماع):** ئیبنو قودامەی مەقدیسی، دەڵێ: هەمو ئوممەت لەسەر ئەوە کۆن، کە بە شێوەیەکی گشتی تەیەمموم جائیزە[٣].

---

[١] بوخاری (٣٢٣)، ئەحمەد (٢٢٢/٢ ژمارە ٢٠٣٣٧).
[٢] بوخاری (٣٤٨)، موسلیم (١٥٣٥).
[٣] المغني (١٤٨/١).

## تەیەمموم لە جیاتی چیە؟

تەیەمموم لە جیاتی دەستنوێژو غوسڵە، ئەمیش لە کاتێکدایە، کە ئاو دەست نەکەوێت یان بەکارهێنانی زەحمەت بێت، ئیمام نەوەوی دەڵێ: ئەمە مەزهەبی ئێمەیەو، هەمو شەرعناسان لە یاوەران و تابعین و، شەرعناسانی دواتر، وایان گوتوە، جگە لە سەیدنا عومەرو، ئیبنو مەسعود خوا لێیان ڕازی بێت، هەروەها ئیبراهیمی نەخەعی لە تابیعین.. ئەوان پێیان وایە، تەیەمموم بۆ غوسڵ دەرکردن ناشێت.. ئیبنو سەبباغ دەڵێ سەیدنا عومەرو، ئیبنو مەسعود، لەو بۆچونەیان گەڕاونەتەوە..

لە بوخاری و موسلیمدا[1] هاتوە، کە ئەبو موسای ئەشعەری خوا لێی ڕازی بێت، موناقەشەی سەیدنا ئیبنو مەسعودی کرد و، بەلگەی ئەو ئایەتەی سەرەوەی بۆ هێنایەوە، بەڵام وا دیارە ئیبنو مەسعود لەسەر ڕای خۆی مایەوە، چونکە وەکو تەبەری ڕیوایەتی کردوە، ئیبنو مەسعود ئایەتی ﴿أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ المائدە/٦ واتە: (یان بەر ئافرەت کەوتبون)ی هەر بە سەرجێیی (جیماع) لێك دەدایەوە[2]..

هەروەها ئیمام نەوەوی دەڵێ: بەلگەی یاوەرانی ئێمەو جمهور، ئەو ئایەتەیە، کە دەفەرموێ: ﴿إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِۚ وَإِن كُنتُمۡ جُنُبٗا فَٱطَّهَّرُواْۚ وَإِن كُنتُم مَّرۡضَىٰٓ أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوۡ جَآءَ أَحَدٞ مِّنكُم مِّنَ ٱلۡغَآئِطِ أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا﴾ المائدە/٦ واتە: ئەی ئەو

---

[1] بوخاری (٣٤٥)، موسلیم (٧٩٦).

[2] تفسیر الطبري (٩٥٨٣) بە سەنەدی سەحیحیەوە هێناوێتیەوە..

کەسانەی باوەڕتان هێناوە، ئەگەر بۆ نوێژ هەستان با دەموچاو دەستان تا ئانیشك شوشتبێت و مەسحی سەرتان کردبێت و، پێیەکانیشتان، تا قولەپێ شوشتبێت، ئەگەر لەش گران بون (لە جەنابەتدا بون)، دەبێ خۆتان بە شوشتنی لەشتان پاك کەنەوە، ئەگەر نەخۆش بون، یان لە سەفەردا بون، یان لە دەستبەئاو گەیاندن هاتنەوە، یان بەر ئافرەت کەوتبون و، ئاوتان دەست نەکەوت، بە شتی پاکی سەر ڕوی زەوی (گڵ، یان لم، یان بەرد) تەیمموم بکەن.. ئەمە بۆ دەستنوێژو غوسڵیشە[1]..

ـ ئەگەر ئایەتەکە، بە بۆچونی سەیدنا ئیبنو مەسعودو، ئیمام ئەبو حەنیفەو، هاوڕایانیشیان لێکدرێتەوە، کە پێیان وایە، ئەو بەرکەوتنەی ژنان (أَوۡ لَـٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ ) بریتیە لە سەرجێیی، ئایەتەکە هەر دەبێتە بەڵگەی شیاوێتی، تەیەمموم لە جیاتی غوسڵ دەرکردن..

کۆمەڵێك بەڵگەی تر هەن، کە فەرمودەی سەحیحن و، لە پێغەمبەری خواوە، صلی الله علیه وسلم بیستراون، هەمو ئەوە دەسەلمێنن، کە تەیەمموم غوسڵیشی پێ دەردەچێت. ئێمە لێرەدا زۆرپێویستمان بە بەڵگە پێ هێنانەوەیان نەماوە، وەکو فەرمودەکەی لای سەیدنا عەمماری کوڕی یاسر، خوا لێیان خۆش بێت، کە گوتویەتی: (فأَجْنَبْتُ فلَمْ أجد الْمَاءَ فتمَرَّغْتُ فِي الصَّعِيدِ كمَا تمَرَّغُ الدَّابَّةُ فذكَرْتُ ذلِكَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فقَالَ إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيكَ أنْ تصْنَعَ هَكَذَا فضَرَبَ بكَفِّهِ ضَرْبَةً عَلَى الْأَرْضِ ثمَّ نَفَضَهَا ثمَّ مَسَحَ بهِمَا ظَهْرَ كَفِّهِ بشِمَالِهِ أَوْ ظَهْرَ شِمَالِهِ بكَفِّهِ ثمَّ مَسَحَ بهِمَا وَجْهَ)[2] واتە: لەشگران بوم، ئاوم دەست نەکەوت، ئیتر خۆم لە

---

[1] المجموع (٢/٢٤٠).
[2] بوخاری (٣٣٨)، موسلیم (٧٩٨).

خۆڵەکە وەردا، وەکو، کە ئاژەڵ خۆی لە خۆڵ دەگەوزێنێت، کە بۆ پێغەمبەری خوام باس کرد، فەرموی: هەر ئاوات بەس بو، هەردوو دەستی دا بە زەویداو، پاشان تەکاندی، ئینجا پشتە دەستی پێ مەسح کرد، یان پشتە دەستی چەپی پێ مەسح کرد، ئینجا مەسحی دەموچاوی کرد..

### ئەو حاڵەتانەی کە تەیەمموم تێیاندا جائیزە

لە دوو حاڵەتدا تەیەمموم شیاوە:

**یەکەم: کە ئاو دەست نەکەوێت:** لە سەفەر بێت، یان لە نیشتەجێیی.

**دووەم: کاتێک ئاو هەبێت، بەڵام بەکارهێنانی زەحمەت بێت:** ئەمەش چەندین حاڵەتی تری هەیە، کە باسیان دێت.. إن شاء الله:

ئەو سەفەرەی، کە تەیەمومی تێدا، بۆ گەشتیار جائیز دەبێت، مەرج نیە درێژ بێت:

ئەگەر گەشتیارێك ئاوی دەست نەکەوت و، ویستی تەیەمموم بکات، گەشتەکەی درێژ بێت، یان کورت، بۆی هەیە بیکات، چونکە ئەو پێناسەی سەفەرەی بەسەردا بڕاوە، کە ئایەتەکە ئاماژەی بۆ دەکات.. ئەمەش ڕاسترین بۆچونی شەرعناسانە.. بەڵگەشیان:

١ ـ عائیشەخان دەڵێ: (كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالْبَيْدَاءِ أَوْ بِذَاتِ الْجَيْشِ انْقَطَعَ عِقْدٌ لِي، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الْتِمَاسِهِ، وَأَقَامَ النَّاسُ مَعَهُ، وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ وَلَيْسَ عِنْدَهُمْ مَاءٌ، فَأَتَى النَّاسُ أَبَا بَكْرٍ، فَقَالُوا: أَلا تَرَى إِلَى عَائِشَةَ حَبَسَتِ النَّاسَ عَلَى غَيْرِ مَاءٍ، فَجَاءَ أَبُو بَكْرٍ وَقَالَ: مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ طَعَنَ بِيَدِهِ عَلَى

خَاصِرَتِي فَمَا مَنَعَنِي مِنَ التَّحَرُّكِ إِلا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ وَاضِعًا رَأْسَهُ عَلَى فَخِذِي فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى أَصْبَحَ عَلَى غَيْرِ مَاءٍ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ آيَةَ التَّيَمُّمِ فَبَعَثْتُ الْبَعِيرَ الَّذِي كُنْتُ عَلَيْهِ، فَوَجَدْنَا الْعِقْدَ تَحْتَهُ)[١] واتە: لە سەفەرێكدا، لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بوین، صلى الله عليه وسلم، لەو دەشتە ملوانكەیەكم لێ پسا، (یان لە گەردنم داكەوت) پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم، بۆی دەگەڕاو خەڵكیش، لە خزمەتیدا دەگەڕان، نە ئاویان دەست دەكەوت، نە لاشیان بو، خەڵكەكە (بۆ گلەیی) هاتنە لای ئەبوبەكر، (باوكی خاتو عائیشەخانیە) پێیان دەوت: نابینیت چۆن عائیشەخان، ئەو خەڵكەی، بەم بێ ئاویە مەحتەل كردوە؟! ئەبوبەكریش هاتە لامەوەو گوتی: ماشەڵڵا، سیخورمەیەكی لە كەلەكەم كوتا، نەمتوانی هیچ بجوڵێم، چونكە سەری پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم لەسەر ڕانم بو، دواتر پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، لەو بێ ئاویەدا هەستا، هەر لەوێ خوای گەورە، ئایەتی تەیەممومی ناردە خوارەوە، ئیتر ناردم بە شوێن ئەو حوشترەدا، كە سواری بوبوم، كە هەڵیانساند، ملوانكەكەم لەژێر ئەودا بو ! مەبەستی ئایەتی شەشەمی مائیدەیە..

٢ ـ لە ئیبنو عومەرەوە، خوا لێیان ڕازی بێت گێڕراوەتەوە، كە لە جورفەوە (ئیمام شافیعی دەڵێ: ناوچەیەكە نزیكی مەدینەیە) بۆ مەدینە هاتۆتەوە، لە ناوچەی میربەد تەیەممومی كردوە، دەموچاو دەستی پێ مەسح كردوەو، نوێژی عەسرەكەی كردوە، كە گەیشتۆتەوە مەدینە،

---

[١] بوخاری (٣٣٤)، موسلیم (٧٦٤).

هێشتا خۆر بڵندبووەو، نوێژەكەشی نەكردۆتەوە. واتە ڕۆژ، ئاوا نەبووەو، كاتی نوێژی عەسر ماوە، بەڵام ئەو نەیكردۆتەوە[١].

**مەرج نیە سەفەری تەیەمموم خواز سەفەری خوا پەرستی بێت:**

ئەو كەسەی لە سەفەردایەو، كاتی نوێژێتی و ئاوی دەستنوێژی نیە، یان هەیەتی ولە بەكارهێنانیدا عوزری هەیە، بۆی هەیە تەیەممومەكەی بكات، ئەمە پەیوەندی بە سەفەرەكەیەوە نیە، كە ئایا بۆ خواپەرستیە، یان بۆ گوناح كردن و تاوان. چونكە تەیەمموم عەزیمەتەو، وەكو مۆڵەتەكان نیە، موسوڵمان تێیدا سەرپشك بێت، تەیەمموم حوكمێكی شەرعیەو، پەیوەندی بە سەفەرو نەبونی ئاوەوە هەیە، ئەم حوكمە، وەكو حوكمی مەسح وایە، پەیوەستە بە خودی سەفەرو بێ ئاویەوە، پەیوەندی بە هۆكارو پاڵنەری سەفەرەكە نیە؛ كە بۆ خواپەرستیە، یان بۆ ئەنجامدانی تاوان[٢]. كابرا لە هەر جۆرە سەفەرێك بێت، فەرزی نوێژی لەسەر لا ناچێت، نوێژەكەشی بێ دەستنوێژ نابێت، تەیەممومیش لە جیاتی دەستنوێژەكەیەتی، كەوابو تەیەممومەكەی، مەرجە بۆ ئەنجامدانی مەرج بۆ دانراوەكەی، كە نوێژەكەیە..

★ ★ ★

---

[١] ئیمامی مالیك لە: الطهارة (ل ٧٣)، بەیهیقی (١/٢٢٤)
كەمال ئیبنو السەید لە صحيح فقه السنة (١/ ١٩١)دا دەڵێ: إسناده صحيح.

[٢] المغني (١/١٤٨)، المحلى (٢/١١٦).

# ئەوی ئاوی لایەو بەکاری ناهێنێت

## یەکەم: ئەو کەسەی ئاوی پێیە بەڵام:

### بەشی دەستنوێژەکەی ناکات

شەرعناسان لە حوکمی ئەم حاڵەتەدا، دوو پۆلە بۆچونن:

**پــۆلی یەکــەم: ئەوەنــدەی بەشــی دەکــات دەیشــوات و تەیەمموم بۆ ئەوانی تری دەکات:** ئەمە قەولێکی ئیمام شافیعی و، بۆچونی ئیمام ئەحمەدەو، ئیبنو حەزمیش ڕای وایە، بەڵگەشیان:

١ ـ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ﴾ التغابن / ١٦ واتە: ئەوەندەی دەتوانن، تەقوا زیاتر بکەن.

٢ ـ پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: (إذا أمَرتكُمْ بأمْرٍ فأتوا مِنهُ ما استطعْتمْ)[1] واتە: هەر فەرمانێکم پێکردن، ئەوەندەی دەتوانن لێی ئەنجام بدەن..

ئیبنوحەزم دەڵێ: ئەوەندەی لە توانادا هەیە.. هەندێك ئەندامی دەستنوێژ، یان غوسڵی پێ دەشۆرێت و، ئەوانی تری پێ ناشۆرێت، هەرچیەکی نەتوانی تەیەممومیان بۆ دەکات، مادام ئاوی دەست ناکەوێت بیانشوات پێی، ئەوە بە گڵەکە تەواوی دەکات[2]..

**پۆلی دووەم: هەر لەسەرەتاوە تەیەمموم دەکات:** ئەمە مەزهەبی ئیمام ئەبو حەنیفەو، مالیك و، ئەحمەدو، قەولێکی ئیمام

---

[1] بوخاری (٧٢٨٨)، موسلیم (٣١٩٩)

[2] المحلى (٢/١٣٧).

شافیعیە و، کۆمەڵێك لە شەرعناسانی سەلەفیش وای بۆ چون[١].. ئەم شەرعناسە بەڕێزانە دەڵێن: نابێت بەشێکی دەستنوێژەکە بە ئاو بگرێت و، بەشەکەی تری بە گڵ.. بەڵام ئیبنول مونزیر، ڕەدی ئەمەی داوەتەوەو دەڵێ: کە خوای گەورە دەفەرموێ: (وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُوا) واتە: ئەگەر لەش گران بون (لە جەنابەتدا بون)، خۆتان پاك کەنەوە.. سەرەتا ئەوەی فەرز کردوە، کە دەبێت بە ئاو خۆ پاك کەنەوە، ئەگەر ئاویان دەست نەکەوت، ئینجا تەیەممومم بکەن.. ئەو کەسەی زیهاری کردوە، خوای گەورە ئازاد کردنی کۆیلەیەکی لەسەر فەرز کردوە، ئەگەر نەیبو ئەوجا دەبێت دوو مانگ بەرۆژو بێت، ئەو کەسەی، کە پارەی هەیە، بەڵام بەشی کڕینی کۆیلەیەك ناکات، لە حوکمی ئەوەدایە نیەتی بۆیە حوکمی رۆژو گرتنەکەی دەکەوێتە سەر.. ئێ ئەمەش هەر وایە، ئەو کەسەی ئاوی تەواوی لا نیە، دەستنوێژ، یان غوسڵی پێ دەرکات، لە حوکمی ئەو کەسەدایە، کە ئاوی لا نیە، بۆیە دەبێت تەیەمموم بکات.. ئەوی لە حەجەو پارەی قوربانیەکی بە تەواوی پێ نیە، یان ئەو کەسەی سوێندی لێ کەوتوەو، پارەی تەواوی پێ نیە، بیداتە دە هەژار.. هەمو لە حوکمی نەداریدان.. ئەمما دوو فەرزیان بەسەردا بدرێت، (لێرەدا ئاو تەیەمموم) ئەوە جائیز نیە[٢]..

<u>پێم وایە کە مادام ئاوی تەواوی بۆ دەستنوێژ یان غوسڵ لا نیە، تەنها تەیەمموم دەکات.. والله اعلم.</u>

★ ★ ★

---

[١] المجموع (٢/٢١٣)، مجموع الفتاوى (٢١/٤٥٣).

[٢] ابن المنذر: الاوسط (٢/٣٤).

**دووەم: ئەو کەسەی ئاوی پێیە بەڵام:**

## دەترسێت دواتر خۆی یان هاوڕێکەی یان ئاژەڵەکەی تینوی بێت

ئیبنـول مـونزیر دەڵـێ: هـەمو ئـەو شەرعناسـانەی زانسـتیمان لـێ وەرگرتون، گوتویانە: هەر کەسێك لە سەفەردابو، ئاوی کەمی پێ بو، لەوە دەترسا ئەگەر بۆ دەستنوێژ یان غوسڵ بەکاری بهێنێت دوایی تینوی ببێت، ئاوەکە هەڵدەگرێت و تەیەمموم دەکات[1].

ئیبنو قودامەش دەڵێ: ئەو کەسەی لە تینو بونی، مەڕو ماڵاتەکەی دەترسێت، یان دەترسێت سامانەکەی بدزرێت، وەك ئەوەی دەترسێت، ئەگەر بچێتە سەر کانیاوێك، دزو جەردە سامانەکەی بدزن، یان دڕندەیەك پەلاماری خۆی، یان ماڵاتەکەی بدات، یان سامانەکەی بفەوتێنێت، یان تینویەکی لەگەڵدایەو دەترسێت تینی بۆ بێت، دەتوانێت ئاو بۆ دەستنوێژو غوسڵی، بەکار نەهێنێت وتەیەمموم بکات[2].

★ ★ ★

---

[1] ابن المنذر: الاوسط (٢/٢٨).
[2] المغني (١/١٦٥)، المجموع (٢/٢٨١).

## سێیەم: ئەو کەسەی ئاوی پێیە بەڵام:

## لەبەر نەخۆشیەکەی بەکاری ناهێنێت

جمهوری شەرعناسان (ئیمام ئەبو حەنیفەو، شافیعی و، ئەحمەدو، ئیبنو حەزم و، هەندێکی تر) گوتویانە: هەر نەخۆشێك لەوەی ترسا ئاو بەکار بهێنێت، توشی دەردەداریی دەکات، بۆی هەیە ئاو بەکار نەهێنێت و، تەیەمموم بکات، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُم مَّرۡضَىٰٓ أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوۡ جَآءَ أَحَدٞ مِّنكُم مِّنَ ٱلۡغَآئِطِ أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا﴾ المائدە/٦ واتە: ئەگەر نەخۆش بون یان لە سەفەردا بون، یان لە دەست بەئاو گەیاندن هاتنەوە، یان بەر ئافرەت کەوتبون و، ئاوتان دەس نەکەوت، بە شتی پاکی سەر ڕوی زەوی (گڵ، یان لم، یان بەرد) تەیمموم بکەن..

موجاهید لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا دەڵێ: ئەمە بۆ ئەو نەخۆشانەیە، کە توشی لەشگرانی دێن و، ناوێرن ئاو بۆ غوسڵ دەرکردنیان بەکار بهێنن، بۆیە ڕێی تەیەممومەکەیان بۆ کراوەتەوە، ئەم نەخۆشانە هەر وەکو ئەو گەشتیارانەن، کە ئاویان دەست ناکەوێت[١]. بەڵام عەتائی کوڕی ئەبو ڕەباح و، حەسەنی بەسری ڕێیان لە نەخۆش گرتوە، کە تەیەمموم بکات[٢] مەگەر ئاوی دەست نەکەوێت. گوتویانە، چونکە زاهیری ئایەتەکە دەفەرموێ: ئەگەر ئاوتان دەست نەکەوت.. بەڵام ئیمام نەوەوی دەڵێ:

---

[١] کەمال ئیبنو السەید لە صحیح فقه السنة (١/ ١٩٤)دا لە: المصنف عبدالرزاقەوە وەریگرتوەو دەفەرموێ: سەحیحە.

[٢] عبدالرزاق: المصنف (٨٦١) بە سەنەدی سەحیحەوە..

ئەمە بەڵگەی ئێمەیە، نەك هی ئەوان، چونکە مانای ئایەتەکە دەبێتە: ئەگەر نەخۆش بون و، لە تواناتاندا نەبو، یان ترسان لەبەرکار هێنانی ئاو، یان ئەگەر لە سەفەردا بون و ئاوتان دەست نەکەوت، تەیەممومبکەن[١]..

## ئەگەر نەخۆش ترسا کە بە بەکارهێنانی ئاو نەخۆشیەکەی زیاتر دەکات یان چاك بونەوەی دوا دەخات، ئایا بۆی هەیە تەیەمموم بکات ؟!

جمهوری پێشەوایان وەکو ئیمام ئەبو حەنیفەو، مالیك و، قەولێکی ئیمام شافیعی و، ئیبنو حەزم دەڵێن: نەخۆش مەرج نیە تا نەگاتە مەترسی مەرگ، بۆی نەبێت تەیەمموم بکات، نا، ئەگەر مەترسی ئەوەی هەبو، کە ئاوبەکارهێنان نەخۆشیەکەی زیاتر دەکات، یان چاکبونەوەی دوا دەخات، بۆی هەیە تەیەمموم بکات، چونکە مانای ئایەتەکە گشتییە، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ﴾ البقرە/١٨٥ واتە: خوای گەورە دەیەوێت ئاسانکاریتان بۆ بکات، نەك سەختگیریی..

ئیبنوحەزم دەڵێ: هەر بەوەندی بترسێت لەوەی نەخۆشیەکەی پێ زیاتر ببێت، ئەمە سەختگیریی و ناڕەحەتییە[٢]..

---

[١] المجموع (٣٣٠/٢).

[٢] المبسوط (١٢١/١)، المجموع (٣٣١/٢)، المحلى (١١٦/٢)، الاوسط (٢٦/٢)، مجموع الفتاوى (٣٩٩/٢١).

## ئەوی زامداره چی دەكات ؟

ئیمام ئەبو حەنیفەو، مالیك دەڵێن: ئەگەر زام (برین)ەكە، زۆرینەی لەشی گرتبۆوە، خۆی تەڕ ناكات و، تەیەمموم دەكات، ئەگەر زۆرینەی لەشی ساغ بو، ئەو شوێنانە دەشوات، كە ساغن، جێ زامەكانیش واز لێ دەهێنێت[1]! ئیمام شافیعی و، ئەحمەد دەڵێن: ئەو شوێنانەی ساغن دەیانشوات و، تەیەممومیش بۆ ئەو شوێنانەی دەكات، كە زامدارن و نایانشوات.. ئەمە پەسەندترین ڕای لای، ئیبنو تەیمییەشە[2]..

پێشتر باسمان لەم دوو بۆچونە كردو وتیشمان، كە بۆچونی یەكەم بەهێزترە، بە تایبەتی، كە بەڵگەیەكی وا لە پێغەمبەری خواوە، صلى الله عليه وسلم نەگەیشتوە، ڕای دووەمی پێ پەسەندتر بكرێت.. ئەوانەی، كە ڕیوایەت كراون و، كراونەتە بەڵگە، پێدەچێت زەعیف بن و، نەشێن بۆ دەركردنی حوكمی شەرعی لە خواپەرستیدا، وەكو:

١ ـ سەیدنا جابر دەڵێ: (خَرَجْنَا فِي سَفَرٍ فَأَصَابَ رَجُلًا مِنَّا حَجَرٌ، فَشَجَّهُ فِي رَأْسِهِ، ثُمَّ احْتَلَمَ، فَسَأَلَ أَصْحَابَهُ فَقَالَ: هَلْ تَجِدُونَ لِي رُخْصَةً فِي التَّيَمُّمِ ؟ قَالُوا: مَا نَجِدُ لَكَ رُخْصَةً، وَأَنْتَ تَقْدِرُ عَلَى الْمَاءِ، فَاغْتَسَلَ، فَمَاتَ، فَلَمَّا قَدِمْنَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ أُخْبِرَ بِذَلِكَ، فَقَالَ: قَتَلُوهُ قَتَلَهُمُ اللَّهُ أَلَا سَأَلُوا إِذَا لَمْ يَعْلَمُوا ؟ فَإِنَّمَا شِفَاءُ الْعِيِّ السُّؤَالُ إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيهِ أَنْ يَتَيَمَّمَ (وَيَعْصِرَ - أَوْ يَعْصِبَ - عَلَى جُرْحِهِ خِرْقَةً ثُمَّ يَمْسَحُ عَلَيْهَا، وَيَغْسِلُ سَائِرَ جَسَدِهِ)[3] واتە:

---

[1] المبسوط (١/١١٢)، المجموع (٢/٣٣٣).

[2] المجموع (١/١٦٢)، المغني (١/١٦٢)، مجموع الفتاوى (٢١/٤٦٦).

[3] ئەبوداود (٣٣٦)، دارەقوتنی (١/١٩٠)، بەیهیقی (١/٢٣٧)، گوتویانە، كە سەنەدەكەی مونقەتیعە، واتە: پسان لە زنجیرەی سەنەدەكەیدا هەیە، ئەمە مورسەل و موعەززەل و موعەللەق نیە (بڕوانە: محمود الطحان: تیسیر مصطلح الحدیث ل ٧٧). هەرچەندە

لـە سـەفەرێکدابوین، کابرایـەکمان بـەردێکی بـەر سـەری کـەوت و، درزی تێکـرد، پاشـان، کـە خـەوت، خـەونی بینیبـو، بـە لەشـگرانی هەسـتا، لـە هاوڕێکـانی پرسـی: وا دەزانـن مۆڵـەتی تەیـەممومم هـەبێت ؟ وتیـان: نـا، چونکە توانای بەکارهێنانی ئاوت هەیە، غوسڵی بە ئاو دەرکردو مرد! کە هاتینەوە خزمەت پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم و، هەواڵەکەیان پێدا، فەرموی: کوشتیان، خوا بیانکوژێت، ئاخر باشە بۆچی پرسیارێکیان نـەدەکرد، مەگـەر نـازانن، کـە چارەسـەری نـەزانین پرسـیار کردنـە، تەیەممومی بکردایە بەس بو.. لە ڕیوایەتێکی تردا: پارچە پەڕۆیـەکی بـە برینەکەیـەوە ببەسـتایەو، مەسـحی سـەرەوەی دەکـردو، بـاقی شـوێنەکانی تری جەستەی دەشوشت..

ئیمام بەیهیقی و، ئیبنـو حـەزم و، فـەرمودەوانانی تـر، فەرمودەکە بـە زەعیف دەناسێنن..

٢ ـ لـە ئیبنـو عومـەرەوە خـوا لێیـان ڕازی بێـت هـاتوە، کـە گوتویـەتی: ئەگـەر هـیچ بەسـەر برینەکەیـەوە نـەبو (نەبەسـترابو)، ئەملاولاکـەی دەشوات و بەس[١]..

٣ ـ ڕیوایـەتی سـەحیح هەیـە، کـە دەربـارەی کابرایـەکیان لـە عوبەیدی کـوڕی عومـەیر پرسـیبو، کـە بـرینی پێوەیـەو، توشـی لەشـگرانی هـاتوە؟ فەرمویـەتی: دەوروبـەری برینەکـەی بشـوات و، ئـاو نزیکـی برینەکـەی نەکاتەوە[٢]..

---

ئەلبانیش لە ڕێی ئیبنو عەبباسەوە لای ئەبو داود (٣٣٧) و لای ئیبنوماجە (٥٧٢) بە حەسەنی داناوە، بەڵام دیارە لای ئەوانی تر مونقەتیعە..

[١] بەیهیقی (١/٢٢٨)، کەمال ئیبنو السەید لە صحيح فقه السنة (١/ ١٩٥)دا دەڵێ: زەعیفە.

[٢] عبدالرزاق: المصنف (٨٦٥) سەحیحە..

ئەمەش نزیکە لە بۆچونەکەی ئیمام ئەبوحەنیفەو ئیمام مالیك کە پێمان پەسەندتر بو..

پێم و ایە نەخۆش، یان زامدار، ئەو شوێنانەی دەشوات، کە ساغن و تەیەمموم بۆ ئەو شوێنانەی دەکات، کە زامدارن ونایانشوات.. والله اعلم

## چوارەم: ئەو کەسەی ئاوی پێیە بەڵام:

### لەبەر سەرما ناوێرێت ئاو بەکار بهێنێت، تەیەمموم دەکات ؟

بـەڵێ، ئـەو کەسـەی لـە ترسـی سـەرما، ناوێرێـت ئـاو بـەکار بهێنێـت، دەتوانێـت تەیــەمموم بکــات، ئەمــەش بۆچــونی جمهــوری شەرعناســانە، بەلگەشیان ئەوەیە کە:

١ ـ خــوای گــەورە دەفــەرموێ: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾ النساء/٢٩ واتە: خۆتان مەکوژن، خوا بەرامبەرتان بە بەزەییە..

٢ ـ عەمری کوڕی عاس، خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، کە ئەو کاتەی لـە غـەزای (ذات السلاسل)دا کرابـوە ئـەمیری جەنگاوەران، شـەوەکەی زۆر ساردبوەو، شەو خەوی دیوەو، بۆ بەیانی لەشگران بوە، دەڵێ: بـەزەییم بـە خۆمدا هاتەوە، وتم: غوسڵ دەرکەم دەمرم، ئیتر تەیـەمومم کـردو، پـێش نوێژی بەیانیم بە یاوەرانم کرد، کە هاتینەوە خزمەت پێغەمبەری خوا و، بۆیـان گێڕایـەوە، فـەرموی: هـا، عـەمر، ئـەوە بـە لەشـی گرانـەوە، پـێش نوێژیت بۆ یاوەرانت کردوە؟! عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، صلی الله علیە وسلم ئەو ئایەتەم کەوتەوە یاد، کە خـوای گەورە تێیـدا دەفـەرموێ: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾ ئیتر منـیش تەیـەمومم کـردو، نوێژەکەم بۆ کردن.. ئیتر پێغەمبەری خوا، صلی الله علیە وسلم پێکەنیو، هیچی نەفەرمو[1]..

---

[1] ئەبوداود (٣٣٤)، ئەحمەد (٤/٢٠٣)، دارەقوتنی (١/١٧٨)، حاکم (١/١٧٧)، بەیهیقی (١/٢٢٥)، سەنەدو دەقی بە زەعیف داناوە، بەڵام شێخی ئەلبانی لە الارواو (١/١٨٢) دا بە سەحیحی داناوە..

هەرچـــەندە فەرمودەکـــە، لـــە ڕوی ســـەنەدو، دەقیـــەوە قســـەی فـەرمودەوانانی لەسـەرە، بـەڵام لەگـەڵ ڕێسا گشـتیەکانی شـەرعدا سـازاوە، خـوای پــەروەردگاریش، دوای باسـی تەیـەمموم دەفـەرموێ: ﴿مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٖ﴾ المائدە/ ٦ واتە: خوای گەورە نایـەوێت، هـیچ سەختی وگرێ وگۆڵییەکتان لە دینداریدا بهێنێتە ڕێ.. مەبەستەکە دیارە: تەیەممومتان بۆ دانراوە، تـا نارِەحـەتیتان لـە خواپەرسـتیدا نەیەتـە ڕێ.. ئاو بەکارهێنانتان، لە کاتی سەرماو سۆڵەدا، بۆ دەستنوێژو غوسڵ دەکردن، بێگومان مایەی نارِەحەتیە، بۆیە دەتوانن تەیەمموم کەن..

بـەڵام گومـان لـەوەدا نیـە، کـە کاتێـك تەیەممومەکـە جـائیزە، کـە نەتوانرێت ئاو گەرم بکرێت و، بەکار بهێنرێت..

پێم وایە ئەوی لەبەر سەرما نەتوانێ، ئاو بۆ دەستنوێژو غوسڵی بـەکار بهێنێت، تەیەممومێك بۆ هەردووکیان دەکات.. والله اعلم.

★ ★ ★

## ئایا بۆ ئەوەی نوێژەکەی فریا خات، تەیەممومم بکات ؟

چونکە نوێژ کاتێکی کەمی ماوەو، بۆ بەکارهێنانی ئاو نابێت

بۆچونی شەرعناسان لەم حوکمەدا دوو پۆلن:

**پۆلی یەکەم: نابێت تەیەممومم بکات ئەگەرچی نوێژەکەشی بچێت:** ئەمەش بۆچونی شافیعیەکان و، حەنبەلیەکان و، ئیمام ئەبو یوسفە[1] بەلگەشیان:

١ ـ خوای گەورە نەبونی ئاوی، کردۆتە مەرجی جائیزێتی تەیەممومم. بۆیە دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ .... فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ﴾ المائدە/٦ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، ئەگەر بۆ نوێژ هەستان، با دەموچاوتان شوشتبێت، ئەگەر لەش گران بون (لە جەنابەتدا بون)، دەبێ خۆتان بە شتنی لەشتان، پاك بکەنەوە... ئەگەر ئاوتان دەس نەکەوت، بە شتی پاکی سەر ڕوی زەوی (گڵ، یان لم، یان بەرد) تەیممومم بکەن..

٢ ـ فەرمودە مەرفوعەکەی، لای ئەبوهورەیرە خوا لێی ڕازی بێت، کە دەفەرموێ: (لا يَقْبَلُ اللهُ صَلاةَ أحَدِكُمْ إذَا أحْدَثَ حَتّى يَتوَضَّأ)[2] واتە: خوای گەورە نوێژی ئەو کەسە قبوڵ ناکات کە دەستنوێژی دەشکێت تا دەستنوێژ نەگرێتەوە..

---

[1] المغني (١٦٦/١)، المجموع (٢٨٠/٢)، ابن المنذر: الاستذكار (١٧١/٣)، تمام المنة (ل ١٣٢)

[2] متفق عليه بوخاری (١٣٥)، موسليم (٢٢٥).

٣ ـ فەرمودە مەرفوعەكەی لای ئیبنو عومەر خـوا لێیـان ڕازی بێت كـە دەفەرموێ: (لا تقْبَلُ الصَّلاةُ بِغَيرِ طَهُورٍ)[1] واتە نوێژی بێ دەست نوێژ قبوڵ نابێت.

**پۆلی دووەم: دەبێت تەیەممووم بكات و نوێژەكەی فریاخات پێش بەسەرچوونی كاتەكە:** ئەمەش بۆچوونی ئەهلی ڕەئی و، ئەوزاعی و، مالیك و، ئیبنـو حەزمـەو ئیبنـو تەیمییـەش بـە پەسـەندتری زانیـوە[2].. بەڵگەشیان:

١ ـ ئەبو جوهەیمی ئەنساری، خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: (أَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ - صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - مِنْ نَحْوِ بِئْرِ جَمَلٍ، فَلَقِيَـهُ رَجُـلٌ فَسَلَّمَ عَلَيْـهِ، فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ السَّلَامَ حَتَّى أَقْبَلَ عَلَى الْجِدَارِ، فَمَسَحَ بِوَجْهِهِ وَيَدَيْـهِ، ثُـمَّ إِنَّـهُ رَدَّ - عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ - السَّلَامَ )[3] واتە: پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسـلم لە لای بیری وشترەوە دەهاتەوە، كابرایەكی موسوڵمانی پێ گەیشت، سڵاوی لـێ كـرد، پێغەمبـەر صلی الله علیـه وسلم، وەڵامـی نەدایـەوە، ڕۆیشـت تـا گەیشتە دیوارێك مەسحی دەموچاو دەستی كرد و، پاشان سەلامی خوای لێ بێت، وەڵامی سەلامەكەی دایەوە..

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، كە نابێت فەرز دواخرێت، بەڵكو دەبێت خێرا تەیەمموومی بۆ بكرێت، نەبادا كاتەكەی بەسەر چێت..

٢ ـ ئیبنو عەبدالبەڕ دەڵێ: ئەو كەسـەی نەخۆشـە، یـان لـە سـەفەردایە،

---

[1] موسلیم (٢٢٤)، ترمزی (١)، ئیبنوماجە (٢٧٢)..

[2] ابن قدامة: المغني (١٦٦/١)، ابن حزم: المحلى (١١٧/٢)، ابن تيمية: مجموع الفتاوى (٤٣٩/٢١، ٤٥٦)، ابن المنذر: الاوسط (٣٠/٢)..

[3] بوخاری (٣٣٧)، موسلیم (٨٠٠).

بە پێی دەق تەیەمموم دەکات، ئەو کەسەی، کە ساغ و سەلیمە، بە حوکمی ماناکە.. والله تعالى اعلم[1]..

پـێم وایـە هـەر کاتێـك، ترسـی نـەمانی کـاتی پەرسـتنێکی هـەبو، تەیەمموم بکات ڕاستترە، وەك نەکردن و فەوتاندنیان.. والله اعلم.

★ ★ ★

## ئایا بۆ ئەوەی نوێژەکەی فریا خات، تەیەمموم بکات ؟ چونکە لەخەو هەستاوەو کاتی نوێژ کەمی ماوە

ئەمیش وەکو مەسەلەی پێشو، دوو بۆچونی جیاوازی لەسەر هەیە[2]

**یەکـەم: تەیــەمموم بکــات و خێــرا نوێژەکــەی فریاخــات:**

ئەمەش بۆچونی ئیمام مالیك و، ئەوزاعی و، سەوری و، ئیبنو حەزمە.

**دووەم: غوسـڵ دەرکـات و نوێژەکـەی بکـات بـا کاتەکـەش بەسەر بچێت:** ئەمەش بۆچونی جمهوری شەرعناسانە، ڕای ئیمام ئـەبو حەنیفەو، شافیعی و، ئەحمەدو، فەولێکی ئیمام مالیکە و، ئیبنوتەیمییەش بە پەسەندتری داناوە.. ئەمەش ڕاستترە، چونکە کاتی خەوتو، لەو کاتەوە دەست پێ دەکات، کە خەبەری دەبێتەوە، نابینیت پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: (أَمَا إِنَّـهُ لَـيْسَ فِـي النَّـوْمِ تَفْـرِيطٌ إِنَّمَا التَّفْـرِيطُ عَلَى مَنْ لَمْ يُصَلِّ الصَّلَاةَ حَتَّى يَجِيءَ وَقْتُ الصَّلَاةِ الْأُخْرَى، فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ فَلْيُصَلِّهَا حِينَ يَنْتَبِهُ لَهَا.. )[3] واتـە: بـەڵام ئـەوە هەیـە، کـە لـە خەوتنـدا

---

[1] ابن عبدالبر: الاستذكار (٣/١٧١).

[2] الاوسط (٢/٣٠)، المحلى (٢/١١٧)، مجموع الفتاوى (٢٢/٣٥).

[3] موسليم (١٥٣٢)، ئەبوداود (٤٣٧)..

کەمتەرخەمی نیە، کەمتەرخەمیەکە لەو کەسەدایە، کە نوێژەکەی ناکات، تا کاتی نوێژەکەی تری دێت، ئەوی وای کرد، با کە کەوتەوە یادی زو بیکات..

ئیمام ئیبنو تەیمییە دەڵێ: ئەگەر بەیانی پێش خۆر هەڵهاتن، خەبەری بۆوە، بەڵام نەیتوانی غوسڵ دەرکات و، نوێژەکەی بکات، ئیللا دوای خۆر هەڵهاتن نەبێت، ئەوە نوێژەکەی لە کاتی خۆیدا کردوەو، نەیفەوتاندوە، بە پێچەوانەی ئەو کەسەوەیە، کە لە سەرەتای کاتی نوێژی بەیانیدا خەبەری بۆتەوە، ئەمیان واجبێتی، کە پێش خۆر هەڵهاتن، فریای نوێژەکەی بکەوێت[1]..

من پێم و ایە، چونکە لەخەو هەستاوەو کاتی نوێژ کەمی ماوە، دەبێت خێرا تەیەمموم بکات و نوێژەکەی فریاخات.. والله اعلم.

★ ★ ★

**ـ ئەگەر ئاو نەبو تەیەمموم بۆ مردو دەکرێت ؟!**

بەڵێ، ئەگەر ئاو نەبو تەیەمموم بۆ مردو دەکرێت، وەکو، کە بۆ زیندو دەکرێت، چونکە شوشتنی مردو فەڕزە، صەعیدیش پاك و پاك کەرەوەیە، ئەگەر ئاوی دەست نەکەوت، بۆی صەعید بەکار دێت.. ڕاجوێیی لەوەدا نیە،[2] کە غوسڵ دەرکردن بە ئاو بێت، یان بە تەیەمموم پاك بونەوەیە، ئەم پاك بونەوە بە تەیەممومەش، بۆ هەمو پاکژییەکە، کە واجب بێت..

---

[1] مجموع الفتاوى (٢٢/٣٥).

[2] المغني (١/١٤٨)، المحلى (٢/١١٦).

## ناوکۆییەك: ئەگەر مردویەك و، لەشگرانێك و، حەیزدارێك و، جەستە پیسێك هەبو، ئاوە کەمەکە بدرێتە کێ؟!

١ ـ ئەگەر ئاوەکە مولّکی یەکێکیان بێت، ئەوە ئەو شایانترە بەکاری بهێنێت. ئەمەش بۆچونی جمهوری شەرعناسانە[1].

٢ ـ ئەگەر ماڤ بەکارهێنانی ئاوەکە، بۆ هەموان وەکو یەك بێت:

ا ـ ئیمام شافیعی و، ئیمام ئەحمەد دەڵێن: مردوەکە شایانترە زوتر بۆی بەکار بهێنرێت، لەبەر دوو هۆ:

ـ مردوەکە کۆتایی بە تەمەنی دنیای هاتوەو، باشترین پاکژیی بۆ ئەو دیاری کراوە، زیندوەکانیش ئاو هەر دەدۆزنەوە.

ـ مەبەست لە شوشتنی مردو، پاککردنەوەیەتی لە پیسی، ئەوەش بە تەیەمموم نایەتە دی، پاکژی زیندوەکان، شتێکی واتایی (مەعنەویی)یەو، بە تەیەممومەکە دێتە دی..

ب ـ ئەوی پیسیی پێوەیە شایانترە، ئاوەکە بەکار بهێنێت، وەك لە لەشگرانەکە، ئەمەش ڕای شافیعی و، حەنبەلیەکانە[2]. ئیمام نەوەوی دەڵێ: چونکە چارێکی تری، غەیری لابردنی پیسیەکەی نیە.

ج ـ حەیزدارەکەش، شایانترە وەك لە لەشگرانەکە، چونکە ئەرکی لەشگرانی ئەم قورسترە، ئەم ماڤی خوای گەورەی، وەکو لەشگرانەکە کەوتۆتە سەر، مافێکی زیادەی تریشی لەسەرە، کە ماڤ مێردەکەیەتی بێتە لای.. بۆیە دەبێت زوتر پاك ببێتەوە..

---

[1] المجموع (٣١٦/٢)، المغني (١٧٠/١).

[2] المجموع (١٧١/١)، المغني (٣١٩/٢).

ئەمە بە گشتی ڕای شافیعی و، حەنبەلیەکانە، هەرچەندە شافیعیەکان لە ناو خۆیاندا ڕای تریشیان هەیە، کە دەڵێ: هەموویان وەکو یەك خاوەن مافن، لەبەکار هێنانی ئاوەکەدا، بۆیە دەبێت قورعەیان بۆ بکرێت، هەر کەس ناوی دەرچو، ئەوە شایانترە ئاوەکە بەکار بهێنێت[1] !!

بەڕاستی ئەمەیان بۆچونێکی سەیرە، چۆن ئەو هەنجەتە بەهێزەی یەکەمی ئیمام شافیعی و، ئیمام ئەحمەدی پێ دەگۆڕرێت ؟!

د ـ ئەگەر بێ دەستنوێژو لەشگرانێك کەوتنە یەك، ئەگەر ئاوەکە بەشی غوسڵ دەرکردنی دەکرد، ئەوە لەشگرانەکە شایانترە بەکاری بهێنێت، ئەگەر نا، ئەوە بۆ دەستنوێژی کەسی دووەمە[2]..

هـ ـ ئەگەر مردویەك و کەسێکی تر هەبو، کە پیسی بە جەستەیەوە هەبێت، ئەمە ڕاجوێیی زیاتری لەسەرە[3]، بەڵام ئەوانەی، کە مردویان لەپێشتر داناوە، مردووەکەیان بە شایانتر داناوە، کە ئاوەکەی بۆ بەکار بێت، ئەوانەی لابردنی پیسییان بەلاوە پێویسترە، ئەمیان لە مردووەکە لە پێشتر داناوە، کە ئاوەکە بەکار بهێنێت و، پیسی جەستەی پێ لابدات..

★ ★ ★

---

[1] المجموع (١/١٧١)، المغني (٢/٣١٩).

[2] هەمان سەرچاوەو جێی.

[3] هەمان سەرچاوەو جێی.

## سەعید ( صَعید ) چیە کە تەیەممومی پێ دەکرێت ؟

شەرعناسان دوو پێناسەیان بۆ ئەم زاراوە هەیە:

**یەکەمیان: هەرچی بە روی زەویەوە دیارە، لە گڵ و لم و چەو زیخ و شتی وا:**

ئەمە بۆچونی ئیمام ئەبو حەنیفەو، ئەبویوسف و، ئیمام مالیکەو، ئیبنو تەیمییەش پێی پەسەندترینە، هەروەها ئیبنو حەزم،بەلاّم ئەوەی بە مەرج داناوە، کە دەبێت بە زەویەوە چەسپاو بن[1].. بەلگەی ئەم بەرِێزانە:

١ ـ فەرمایشتی خوای گەورە، کە دەفەرموێ: ﴿صَعِيدًا جُرُزًا﴾ الكهف/٨ واتە: رەقەن وبەردەلاَن. هەروەها: ﴿صَعِيدًا زَلَقًا﴾ الكهف/ ٤٠ واتە: خلیسك و بێ پیت ولوس، کە هیچیان روەکیان تێدا نارِوێت !

٢ ـ پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: (وَجُعِلَتْ لِي الْأَرْضُ كُلُّهَا لِي وَلِأُمَّتِي مَسْجِدًا وَطَهُورًا)[2] واتە: هەمو زەوی بۆ خۆم و، ئوممەتەکەم جێ نوێژەو، پاکەُ.

٣ ـ پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: (يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ القِيامَةِ عَلَى صَعِيدٍ وَاحِدٍ)[3] واتە: هەمو خەلکی، لە رِۆژی قیامەتدا، لە سەر یەك پارچە زەوی کۆ دەکرێنەوە..

---

[1] الاستذكار (٣/١٥٧)، المبسوط (١/١٠٨)، مجموع الفتاوى (٢١/٣٦٤)، المحلى (٢/١٥٨)
[2] ئەحمەد (٢/٢٢٢)، لە صحيح فقه السنة (١/ ١٨٨)دا دەڵێ: حەسەنە.
[3] بوخاری (٤٧١٢)، موسلیم (٤٧٢).

٤ ـ پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: (وَجُعِلَتْ لِي الْأَرْضُ كُلُّهَا لِي وَلِأُمَّتِي مَسْجِدًا وَطَهُورًا فَأَيُّمَا أَدْرَكَتْ رَجُلاً مِنْ أُمَّتِي الصَّلَاةُ فَعِنْدَهُ مَسْجِدُهُ وَعِنْدَهُ طَهُورُهُ)[1] واتە: هەمو زەوی بۆ خۆم و، ئوممەتەکەم جێ نوێژەو، پاکە، هەر کەسێك لە ئوممەتەکەم، لە هەر شوێنێك کاتی نوێژی گەیشتێ، ئەوە ئەو شوێنەی مزگەوتەو پاکە. دەتوانێت نوێژەکەی لێ بکات..

٥ ـ فەرمودەکەی لای ئەبو جوهەیمی ئەنساری، خوا لێی ڕازی بێت، کە دەڵێ: (أَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ نَحْوِ بِئْرِ جَمَلٍ، فَلَقِيَهُ رَجُلٌ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ السَّلَامَ حَتَّى أَقْبَلَ عَلَى الْجِدَارِ، فَمَسَحَ بِوَجْهِهِ وَيَدَيْهِ، ثُمَّ إِنَّهُ رَدَّ عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ السَّلَامَ )[2] واتە: پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم، لە لای بیری وشترەوە دەهاتەوە، کابرایەکی موسوڵمانی پێ گەیشت، سڵاوی لێ کرد، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، وەڵامی نەدایەوە، ڕۆیشت، تا گەیشتە دیوارێك مەسحی دەموچاو دەستی کرد و، پاشان سەلامی خوای لێ بێت، وەڵامی سەلامەکەی دایەوە..

### دووەمیان: صەعید هەر گڵ و خۆڵەو هیچ تر:

ئەمەش بۆچونی ئیمام شافیعی و، حەنبەلیەکان و، ئەبوسەورەو، ئیبنول مونزیریش وای بۆ چوە[3]، بەڵگەشیان:

١ ـ فەرمودەی (وَجُعِلَتْ لِي الْأَرْضُ مَسْجِدًا)[1] لە ڕیوایەتی تردا، زیادەی تری هەیە، کە دەفەرموێ: (وَجُعِلَتْ تُرْبَتُهَا لِي طَهُورًا)[2] واتە: حوکمی گڵ و

---

[1] بوخاری (٣٢٣)، ئەحمەد (٢/٢٢٢).
[2] بوخاری (٣٣٧)، موسلیم (٨٠٠).
[3] المغني (١/١٥٥)، المجموع (٢/٢٤٦)، الاستذكار (٣/١٥٩)، الاوسط (٢/٤٣).

خۆڵەكەشیمان بۆ پاكە. بە ڕای ئەم شەرعناسە بەڕێزانە، ئەم زیادەیە حوكمە گشتیەكەی پێشو، تایبەت دەكات، كە مەبەست لە صەعیدەكە گڵەكەیەتی، نەك شتی تر..

٢ ـ لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم هاتوە، كە فەرمویەتی: (أُعْطِيت مَا لَمْ يُعْطَ أَحَدٌ مِنَ الْأَنْبِيَاءِ، قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا هُوَ ؟ قَالَ: نُصِرْت بِالرُّعْبِ، وَأُعْطِيت مَفَاتِيحَ الْأَرْضِ وَسُمِّيت أَحْمَدَ وَجُعِلَ لِي التُّرَابُ طَهُورًا وَجُعِلَتْ أُمَّتِي خَيْرَ الْأُمَمِ)[٢] واتە: ئەوەی بە من بەخشراوە، بە هیچ پێغەمبەرێكی پێشو نەبەخشراوە، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوانە چین؟ فەرموی: ترس و تۆقین مایەی سەركەوتنمە، كلیلی زەمینیم دراوەتێ، ناو نراوم ئەحمەد، گڵم بە پاك بۆ حسێب كراوە، ئوممەتەكەشم بە باشترین ئوممەت دانراوە..

بەڵگەكانی پۆلی دووەمی شەرعناسان، وەكو دەردەكەوێت زەعیفەو لە ڕوی سەنەدیانەوە قسەیان لەسەرە.. لە لایەكی تریشەوە، گێڕدانی ماناكانی صەعید لە گڵدا، جێی سەرنجە.. چونكە ئیبنو مەنزور لە فەرهەنگی (لسان العرب)دا، ئەو فەرمودەیە دەهێنێتەوە، كە پێغەمبەری خوا

---

[١] ئەحمەد (٢/٢٢٢)، لە صحيح فقه السنة (١/ ١٨٨)دا دەڵێ: حەسەنە.

[٢] موسلیم (٥٢٢)، ئیبنو حیببان (١٦٩٧)، دارەقوتنی (١/١٧٥)، بەیهیقی (١/٢١٣)

[٣] ئەحمەد (١/٩٨)، بەیهیقی (١/٢١٣) كەمال ئیبنو السهید لە صحيح فقه السنة (١/ ٢٠٠)دا دەڵێ: مونكەرە.. مونكەر لە فەرمودەوانیدا، جۆرێكە لە فەرمودەی زەعیف، پێناسەشی ئەوەیە، كە: لە سەنەدەكەیدا ڕاویەك هەیە، كە هەڵەی زۆرە، یان فسقی لێوە دەركەوتوە، یان گێلە.. بڕوانە: محمود الطحان: تيسير مصطلح الحديث ل ٩٥. بەڵام ئەم فەرمودەیە، چەندین ڕیوایەتی تری سەحیحی هەیە..

دەفـەرموێ: (خَلَقَ اللهُ التربَةَ يَومَ السَّبْتِ) واتـە: خـوای گـەورە لـە ڕۆژی شەممەدا زەوی دروست كردوە، دەڵێت: التربة: الارض..

وا دیارە ڕای شەرعناسانی پۆلی یەكەم بەهێزترە، بۆیە

من پێم وایە، هەرچی بە ڕوی زەویەوە دیارە، لە گڵ و لم و چەو زیخ و شتی وا تەیەمومی پێ دەكرێت.. والله اعلم..

★ ★ ★

## حوكمی ئەو كەسەی كە نە ئاو نە صەعیدی دەست دەكەوێت ( فاقِدُ الطَّهورَين ):

ڕای ڕاستترینی شەرعناسان ئەوەیـە، كـە ئـەو كەسـەی، كـە نـە ئـاو نـە صـەعیدی دەسـكەوت بـۆ دەسـتنوێژو غوسـڵی، هـەر بـەو حاڵەتەیـەوە، كـە تێیدایـە، نوێژەكـەی خـۆی دەكـات.. دواتـر ئەگـەر ئـاو، یـان صـەعیدی دەسـكەوت نوێـژەكان ناكاتـەوە.. ئەمـە ڕای ئیمـام شـافیعی و، ئەحمـەدو یاوەرانیـان و، ئیبنـو حەزمـەو، ئیمـام ئیبنـو تەیمییـەش ئەمـەی پـێ پەسەندترینە[1].. بەڵگەیان:

١ ـ خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ ﴾ التغـابن / ١٦ واتـە: ئەوەندەی دەتوانن، تەقوا زیاتر بكەن.

٢ ـ هـەروەها دەفـەرموێ: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴾ البقـرە/٢٨٦ واتـە: هـەر كـەس بـە گـوێرەی توانـای خـۆی، خـوای گـەورە بەرپرسـێتی دەخاتە سەر شان..

---

[1] المغني (١/١٥٧)، المجموع (٢/٣٢١)، المحلى (٢/١٣٨)، مجموع الفتاوى (٢١/٤٦٧).

٣ ـ پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: (إذا أمَـرْتكُمْ بـأمْرٍ فأتوا مِنْهُ مَا اسْتطَعْتمْ)[١] واتە: هەر فەرمانێکم پێکردن، ئەوەندەی دەتوانن لێـی ئـەنجام بـدەن.. ئینجا ئـەم بەرێزانـە دەڵێن: کـابرا، کـە نـە ئـاو، نـە صـەعیدی دەسـت کـەوتوە، چـی بکـات، هـەر ئەوەنـدەو ئـاوای توانیـوە، خواپەرستیەکەی ئەنجام بدات.. ئەوەی لە توانایدا نیە (کـە پەیدا کردنـی ئـاو، یـان صـەعیدەکەیە) خـاوەن عـوزرە تێیـدا.. هەرچـۆنێکیش ئـەو نوێژانەی کرد، بەر لۆمە ناکەوێت و، نوێژەکانیشی ناکاتەوە..

بەڵام ئیمام ئەبو حەنیفـەو، شەرعناسـانی مەدرەسـەی ڕەئـی و، ئیمـام مالیـك و ئـەوزاعی دەڵـێن: نوێـژەکانی ناکـات، تـا ئـەو کاتـەی دەتوانێـت دەستنوێژ بگرێت یان تەیەمموم بکات[٢]..

ئەمـە بۆچـونێکی زۆر سـەیرە. لـەویش سـەیرترو نـامۆتر، بۆچـونی حەنەفیەکانە، دەربارەی نوێژەکان لەو شوێنانەدا، کە کاتیان تێدا نیە، کـە دەڵێن: نوێژیان تێدا هەڵدەگیرێت، چـونکە خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا﴾ النساء/١٠٣ واتە: خوای گەورە بە گوێرەی کاتی دیاری کراو، نوێژی لەسەر فەرز کـردون.. ئـەمانیش دەڵێن: مادام کاتی شەورۆژ دیـاری کـراو نیـە، کـەوابو نوێـژەکانیش نـاکرێن!! بـەم بۆچونە بێت، ئەو کەسانەی لە باکوری نەرویج دەژیـن (کـە زیـاتر لـە دوو هـــەزار کوردیشـــی لێیـــە)، نـــە نوێـــژیان لەســـەرە و، نـــە ڕۆژو، نـــە دەستنوێژیشـیان دەبێـت و، نـە غوسـڵ دەردەکـەن!! چـونکە شـەو شـەش مانگەو رۆژیش شەش، بەفری پێنج هەزار ساڵیش نەچۆتەوە !!

---

[١] بوخاری (٧٢٨٨)، موسلیم (٣١٩٩)

[٢] الاوسط (٢/٤٥)، الاستذكار (٣/١٥٠)، المحلى (٢/١٣٩).

## هەندێك بابەت كە پەیوەندییان بە نییەتی تەیمومەوە هەیە

### * تەیەممومم لە جیاتی دەستنوێژە:

هەرچی جائیز بێت بە دەستنوێژەوە بکرێت، بە تەیەممومیشەوە جائزە بکرێت، وەکو نوێژو تەواف کەعبەو، قورئان خوێندن و، دەستدان لە قورئان و خواپەرستی تر.. ئەو حوکمە دەمێنێت، تا تەیەممومەکە بەتاڵ دەبێتەوە.. هەروەها دەکرێت بە تەیەمموم نوێژی فەرزو سوننەتەکان بکرێن، ئەگەر تەیەممومەکە بۆ سوننەت کرابو، دەشێت نوێژی فەرزیشی پێ بکرێت، هەروەها بە پێچەوانەوە.. ئەمەش بۆچونی زۆرینەی ئەهلی عیلمە، جگە لە ئیمام مالیك و هەندێك لە شافیعیەکان[1]..

ئیمام ئیبنو تەیمییە دەڵێ: ئەم بۆچونە ڕاستترە، بەڵگەی زۆرتری قورئان و سوننەت لایەنگرێتی.. لە لایەکەوە قورئانی پیرۆز، تەیەممومی بە پاکەرەوەداناوە، وەکو کە ئاوی بە پاك کرەوە داناوە، وەك دەفەرموێ: ﴿فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم مِّنۡهُۚ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٍ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمۡ وَلِيُتِمَّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾ المائدە / ٦ واتە: بە شتی پاکی سەر روی زەوی (گڵ، یان لم، یان قسڵ و بەرد، یان زیخ و چەو، یان شتی تر) تەیەمموم بکەن، مەسحی دەموچاو دەستانی پێ بکەن، خوای گەورە نایەوێت هیچ سەختیی و، گرێ و گۆڵییەکتان، لە دینداریدا بهێنێتە ڕێ، بەڵکو دەیەوێت پاکتان کاتەوەو، نیعمەتەکانی خۆی بەسەرتاندا تەواوکات، تا ئێوەش

---

[1] المغني (١/١٥٨)، المجموع (٢/٢٥٥)، المبسوط (١/١١٧)، مجموع الفتاوى (١٢/٤٣٦)

سوپاسگوزاریی بکەن.. هەر کەسێك بڵێ گڵ تەیەمومی پێ ناکرێت، ئـەوە پێچەوانەی قورئان و سوننەتی وتـوە، ئەگـەر بڵـێ: بـەڵێ تەیـەمومی پـێ دەکرێت، ئەوە بێ دەستنوێژی نامێنێت، بەڵام بە شـێوەیەکی کـاتیی کـاری پـێ دەکرێـت، تـا ئـەو کاتـەی ئـاو دەسـت دەکـەوێت و، لـە توانـادا دەبێـت بەکاری بهێنێت..

پـێم و ایـە هـەر کەسـێك تەیـەمومی کـردو، نیـەتی لابردنـی بـێ دەسـتنوێژی خـۆی بـو، ئـەوە حـوکمی ئەوەیـە، کـە دەسـتنوێژی هەیـەو دەتوانێت، هەمو ئەو خواپەرستیانە بکات، کە بە دەستنوێژ دەیانکات..

★ ★ ★

## ئەوی تەیەمموم دەکات بە نیەتی لابردنی حوکمی لەشگرانی، ئایا بە دەستنوێژ گرتن بۆی حسێبە ؟!

لەسـەر قـەولی ئیمـام ئـەبو حەنیفـەو، ئیمـام شـافیعی، بـەڵێ، ئەمـەش لەبەر دوو هۆیە:

١ ـ پاك بونەوە لە هەردووکیان یەکە، بە ئەنجامدانی یەکێکیان، ئـەوی تریش نامێنێت، وەکو خۆ پاککردنەوە لە میزو پیسایی..

٢ ـ تەیـەمموم لـە جیـاتی بـەکارهێنانی ئـاوە، کـەوابو حـوکمی ئاویشـی وەرگرتوە، ئەوەش وەکو غوسڵ دەرکردنەکەیە، کە دەستنوێژگرتنیشی پـێ دادەمەزرێت..

ئەمما کەسێك بڵێ: تەیەمموم دەکەم، بە نیـەتی لابردنـی حـوکمی بـێ دەسـتنوێژی لـە خـۆم، بـەڵام دەشمـەوێت، حـوکمی لەشگرانیشـمی پـێ دابمــەزرێت، ئــەوە جــێ ســەرنجەو، دەبێــت ئــەوە بــزانین، کــە ئــەو شەرعناسانەی تەیەممومەکەیان لە جێی ئـاو دانـاوە، دەڵێن: ئـەوە نابێت،

چونکە ئەو تەیەممومەکەی، وەکو ئاوی دەستنوێژ بەکار هێناوەو بۆی نابێتە ئاوی غوسڵ دەرکردن.. شەرعناسانی تر گوتویانە: بەڵێ بۆی دەبێتە حوکمی لابردنی هەردووکیان (بێ دەستنوێژیی و غوسڵ)، چونکە هەردووکیان بە تەیەممومێك لادەچن..

ئیمام مالیك و، ئەبوسەورو، حەنبەلیەکان و، ئیبنو حەزم گوتویانە[١] هەردووکیان بە یەك نییەت نابێت، چونکە دوو خواپەرستین و، هەر یەکەیان نییەتی خۆی دەوێت، چونکە دەقە گشتیەکە دەفەرموێ: (إنَّمَا الاعْمَالُ بالنّيَّاتِ وإنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى)[٢] واتە: هەمو کردەوەیەك بە پێی نیەتە، نیەتی هەر کەس چۆن بو، هەر ئاوای بەردەکەوێت.

★ ★ ★

## چۆنیەتی تەیەممومی دروست ؟!

شەرعناسان دوو شێوەی تەیەممومکردن دەگێڕنەوە، کە دوو پۆلە خاوەن بۆچونەکان، کە هەر یەکەیان بەڵگە بۆ ڕاست و دروستی، ڕیوایەتی خۆی دەهێنێتەوە.. پێویستە بۆچون و بەڵگەی هەردوولا بخەینە ڕوو:

**یەکەم: ئەو شێوە تەیەممومەی یەکجار لەپی دەستەکانی بە سەعید دەکێشێت:**

( هەردوولەپی دەست، یەکجار بە صەعیدەکە دەکێشێت، پاشان بەرزیان دەکاتەوەو فویان لێ دەکات، ئینجا دەموچاو دەستەکانی، پێ

---

[١] المغني (١/١٥٩)، المحلى (٢/١٣٨)

[٢] بوخاری (١)، موسلیم (١٩٠٧).

مەسح دەكات) ئەمە مەزهەبی حەنبەلی و ڕای ئیبنو حەزمە، كە ڕای كۆمەڵێكی سەلەفەو ئیبنو تەیمییەش پێی پەسەندترینە[١]..

ئەوەی ئەم بۆچونە بەهێز دەكات، فەرمودەكەی لای سەیدنا عەمماری كوڕی یاسرە، خوا لێیان ڕازی بێت، كە پێغەمبەری خوا، صلی الله علیە وسلم پێی، فەرمو: (إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيكَ أَنْ تَصْنَعَ هَكَذَا فَضَرَبَ بِكَفِّهِ ضَرْبَةً عَلَى الْأَرْضِ ثُمَّ نَفَضَهَا ثُمَّ مَسَحَ بِهِمَا وَجْهَهُ وَكَفَّهِ بِكَفَّيْهِ)[٢] واتە: هەر ئاوات بەس بو، هەردوودەستی دا بە زەویداو، پاشان تەكاندی، ئینجا مەسحی دەموچاو دەستەكانی پێ كرد..

## دووەم: ئەو شێوە تەیەممومەی دوجار لەپی دەستەكانی بە صەعید دەكێشێت:

(دەبێت دوو جار هەردوولەپی دەستەكان، بدرێن بە صەعیدەكەدا، یەكێكیان بۆ دەموچاو، ئەوی تریان، بۆ دەستەكان، كە دەبێت، تا ئانیشكەكانیان پێ مەسح بكرێت) ئەمەش مەزهەبی حەنەفی و، مالیكی و، شافیعی و، سەوری و، لەیسی كوڕی سەعدو، شەعبی و، حەسەنی بەسرییەو، دەچێتەوە سەر ئیبنو عومەر، خوا لێیان ڕازی بێت.. بەڵگەشیان:

١ ـ فەرمودەكەی لای ئیبنو عومەر، خوا لێیان ڕازی بێت، كە دەڵێ: پێغەمبەری خوا، صلی الله علیە وسلم فەرمویەتی: (التَّيَمُّمُ ضَرْبَتَانِ: ضَرْبَةٌ لِلْوَجْهِ، وَضَرْبَةٌ لِلْيَدَيْنِ الَى الْمِرْفَقَيْنِ)[٣] واتە: تەیەمموم دوو

---

[١] المغني (١/١٥٩)، المحلى (٢/١٤٦)، مجموع الفتاوى (٢١/٤٢٢).

[٢] بوخاری (٣٣٨)، موسلیم (٧٩٨).

[٣] الحاكم (١/١٧٩)، بەیهیقی (١/٣٠٧) بە زەعیفیشی ناساندوە.. كەمال ئیبنو السەید لە صحيح فقه السنة (١/ ٢٠٣)دا دەڵێ: زەعیفە.

زەربەیە، یەكیان بۆ مەسحی دەموچاو بەكار دێتەوەو، ئەوی تریان بۆ مەسحی دەستەكان، تا ئانیشكەكان..

٢ ـ فەرمودەكەی لای ئەبو جوهەیم، خوا لێی ڕازی بێت، كە باس لە كابرا دەكات، كە دەڵێ: (أَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ نَحْوِ بِئْرِ جَمَلٍ، فَلَقِيَهُ رَجُلٌ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ السَّلَامَ حَتَّى أَقْبَلَ عَلَى الْجِدَارِ، فَمَسَحَ بِوَجْهِهِ وَيَدَيْهِ، ثُمَّ إِنَّهُ رَدَّ عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ السَّلَامَ )[1] واتە: پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم، لە لای بیری وشترەوە دەهاتەوە، كابرایەكی موسوڵمانی پێ گەیشت، سڵاوی لێ كرد، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، وەڵامی نەدایەوە، ڕۆیشت، تا گەیشتە دیوارێك مەسحی دەموچاو دەستی كرد و، پاشان سەلامی خوای لێ بێت، وەڵامی سەلامەكەی دایەوە..

ریوایەتێكی تری هەیە كە ئەم پۆلە شەرعناسە بەرێزە، وەك بەڵگەی بۆچونی خۆیان، لە مەسەلەی چۆنیەتی تەیەمموم كردندا، پشتی پێ دەبەستن، كە دەڵێ: (حتّى قامَ الى جدارٍ فحَتّهُ بعَصًا كانَتْ معَهُ ثمَّ وَضَعَ يَدَيهِ علَى الجدَارِ فمَسَحَ وَجْهَهُ وَذِرَاعَيهِ ثمَّ رَدَّ السَّلام)[2] واتە: تا گەیشتە لای دیوارێك و، بەو گۆچانەی پێی بو دیوارەكەی كڕاند، پاشان دەستی بە دیوارەكەدا هێناو، مەسحی دەموچاو قۆڵەكانی كردو، پاشان وەڵامی سەلامی كابرای دایەوە..

---

[1] بوخاری (٣٣٧)، موسلیم (٨٠٠).

[2] ئیمامی شافیعی لە المسند(١٣٠) هێناوێتیەوە، هەروەها بەیهیقی (٢٠٥/١) بەڵام فەرمودەوانان دەڵێن مونكەرە، چونكە پێچەوانەی فەرمودە سەحیحەكەی پێشتری دەكات، كە بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوەو، سەحیحە.. صحيح فقه السنة (١/ ٢٠٣).

٣ ـ فەرمودەیەكی تر لە سەیدنا عەمماری كوڕی یاسرەوە، خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە، كە باس لە یەكەمین تەیەمموم دەكات، دەڵێ، كە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بون، صلی الله علیه وسلم، مەسحی صەعیدیان بۆ نوێژی بەیانی كردوەو لەپی دەستیان، جارێك بە زەوی كێشاوە بۆ دەموچاویان، ئینجا جارێكی تر بۆ هەمو دەست وبازویان، لە ناو دەستیانەوە، تا شان وبن باڵیان: (فقَامَ الْمُسْلِمُونَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَضَرَبُوا بِأَيْدِيهِمْ الْأَرْضَ ثُمَّ رَفَعُوا أَيْدِيَهُمْ وَلَمْ يَقْبِضُوا مِنْ التُّرَابِ شَيْئًا فَمَسَحُوا بِهَا وُجُوهَهُمْ وَأَيْدِيَهُمْ إِلَى الْمَنَاكِبِ وَمِنْ بُطُونِ أَيْدِيهِمْ إِلَى الْآبَاطِ) [1]

پۆلە شەرعناسی دووەم، ئەگەرچی پێشەوایانی گەورەی ئوممەتن، بەڵام وا پێدەچێت بەڵگەكانیان زەعیف بن، تەنانەت فەرمودەیەكیان بە مەرفوعیش نەسەلمێنراوە !! لە لایەكی تریشەوە، ئەوەی دەسەلمێت ئەوەیە، كە تەیەمموم وەكو دەستی دز، پەیوەندی بە قۆڵ و بازووەوە نیە، تەنها دەستەكان مەسح دەكرێن، بۆیە سەیدنا ئیبنو عەبباس، خوا لێیان ڕازی بێت دەیگوت: دەستی دز دەبڕرێت، بەڵام لە مەچەكەوە، نەك لە قۆڵەوە، بەڵگەشی ئەم ئایەتە بو، كە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم مِّنۡهُۚ﴾ المائدة/٦ واتە: ئەگەر ئاوتان دەست نەكەوت، هەر بەوەی لەسەر زەمیندا بەرز بۆتەوە، (لە خاك ولم و بەرد) مەسحی

---

[1] ئەبو داود (٨٤/١)، ئیبنو ماجە (٥٧١)، نەسائی (١٦٨/١)، بەیهیقی (٢٠٨/١). كەمال ئیبنو السەید لە صحیح فقە السنة (١/ ١٦٣)دا دەڵێ: موزتەریبە (شێواو)..

موزتەریب (مُضطرِب): شێواو: جۆرێكی فەرمودەی زەعیفە، بریتیە لەو فەرمودەیەی لە چەند ڕێیەكەوە گێڕراوەتەوە، كە جیاوازیان لەگەڵ یەكتر هەیەو، هیچیان لەوانی تر بەهێزتر نین.. بڕوانە: محمود الطحان: تیسیر مصطلح الحدیث ل ١١٢.

دەموچاوتان و دەستەكانتانی پێ بكەن. بۆیە پێم وایە، كە تەیەممومی دروست ئەوەیە، لە بۆچونی پۆلە شەرعناسی یەكەمدایە.. والله اعلم..

★ ★ ★

## بەتاڵ بونەوەی تەیەمموم ؟!

هەرچی شتێك دەستنوێژ بشكێنێت تەیەممویش بەتاڵ دەكاتەوە.. ئەمە بەڵگەنەویستێكە، پێچەوانەی لە ناو ئەهلی ئیسلامدا نیە[1]..

★ ★ ★

## هەندێك بابەتی تری تەیەمموم

### ئایا نوێژ بە تەیەمموم جائیزە، ئەگەر پێش نوێژ دابەستن ئاوی دەسكەوت؟!

هەر كەسێك هەوڵی پەیدا كردنی ئاوی داو، دەستی نەكەوت، پاشان تەیەممومی كرد، بەڵام پێش نوێژ دابەستنی، ئاوی دەسكەوت، تەیەممومەكەی بەتاڵ دەبێتەوەو، نابێت نوێژی پێوە بكات، ئەگەر كردیشی نوێژەكەی بەتاڵە، چونكە گەڕاوەتەوە سەر حاڵەتی یەكەمینجاریی، كە دەستنوێژی نەبوە[2]..

---

[1] المحلی (٢/١٢٢).
[2] الاستذكار (٣/١٦٧).

**تەیەممومی کرد، نوێژی دابەست، ئینجا ئاوی دەسکەوت، ئایا نوێژەکەی دەبڕێت ؟!**

شەرعناسان لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دوو بۆچونن:

**یەکـەمیان: نوێژەکـە دەبڕێـت ودەسـتنوێژ دەشـوات ولـە سەرەتاوە نوێژ دەست پێ دەکاتەوە:**

ئەمە ڕای ئیمام ئەبو حەنیفەو، ئەحمەدو، سەوری و، ئیبنـو حەزمـە، بەلگەشیان:

١ ـ ئەو فەرمودەی پێغەمبەری خوایە، صلی الله علیه وسلم، کە وەڵامـی ئـەبو زەڕی دایـەوە، دەربـارەی لـەش گرانـی کەسـێك، کـە ئـاوی دەسـت نەکەوێت، کە فـەرمووی: (الصَّعِيدُ الطَّيِّبُ وَضُوءُ المُسْلِمِ وَإِنْ لَمْ يَجِدِ المَاءَ عَشْرَ سِنِينَ ، فَـإِذَا وَجَـدَ المَـاءَ فَلْيَمَسَّـهُ بِبَشَـرَتِهِ)[١]واتـە: گـڵ و لم و بـەردوخوێ و کەرەستەی تر، کە لەسەر زەمیندایەو پاکە، ئاوی دەستنوێژی موسـوڵمانن، ئەگـەر دەیـان ساڵیش ئـاوی دەس نەکـەوێت، دەتوانێـت هـەر، کـە یـەکێك لەمانەی دەست، کەوت پێستی خۆیان تێ هەڵسوێت.. ئەمە بۆ کەسێکە، کە ئاوی دەست نەکەوێت، بەڵام ئەم کابرایە لەمەڕ ئێمە وا دەستی کەوت !

٢ ـ بە پەیدابونی ئاوەکەو، توانـای بـەکارهێنانی، تەیەممومەکـە بـەتاڵ دەبێتەوە، ئەمەش وەکو ئەو کەسە وایە، کە نوێژەکەی دەبڕێت..

٣ ـ تەیمموم لەبەر زەرورەت، کە نەبونی ئـاوە بۆتـە بـەدیل، کە ئاوەکە پەیدابو، واتە ئەسڵەکە هاتەوەو، بەدیلەکەی لاچو.. ئەمەش وەکو نـەمانی

---

[١] ترمزی (١٢٤)، ئەبوداود (٢٣٣)، نەسائی (١٧١/١)، لە ئەبو زەڕەوە، خوا لێی ڕازی بێت بە مەرفوعی دەگێڕێتەوە، شێخی ئەلبانی رەحمەتیش لە الارواء (١٥٣)دا لە ئەبو هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت بە سەنەدی سەحیحەوە هێناوێتیەوە..

خوێنی ئیستیحازەیە (خوێنی جاری داوێنی ئافرەت)..

## دووەمیان: نوێژەكە نابڕێت و بەردەوام دەبێت:

ئەمــە ڕای ئیمــام مالیــك و، ئیمــام شــافیعی و، ئــەبو ســەورو، داودو، ئیبنــول مــونزیرەو، ڕیوایــەتی دووەمــی ئیمــام ئەحمــەدە، هەرچــەندە دەوترێت، كە ئەم بۆچونەی گۆڕیوە[١].. بەڵگەیان:

١ ـ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُبْطِلُوٓا۟ أَعْمَـٰلَكُمْ﴾ سورەتی محمد/٣٣ واتە: كارو كردەوەكانتان بەتاڵ مەكەنەوە.. كەوابو نابێت ئـەو نوێـژەش بـەتاڵ بكرێتەوە..

٢ ـ پاكـژی كاتێكی دیـاری كـراوی هەیـەو، نوێـژیش هـەروەها، ئـەم بـە تـەكبیرەی ئیحرامــی نوێژەكــە،كاتی پاكژییەكـەی بڕیــوەو، چــۆتە كــاتی نوێژەكـەوە، كــاتی پاكژیەكــەش بەسەرچــوەو، ناشــێت بــەتاڵ بكرێتــەوە، نوێژەكەش خۆی لە خۆیـدا دروست دامـەزراوە، چ پێویسـتی بـە بڕینـە ؟! ئەوی بڕینی پێ واجب دەبێت بەڵگەیەك لە قورئان، یان لە سـوننەت، یـان لە كۆڕا (ئیجماع)ەوە بهێنێت..

هیچ بەڵگەیەك لەبەر دەستدا نیـە، ناچاری كات نوێژەكەی ببڕێـت.. پێم وایە ئەگەر تەیەممومی كرد، نوێژی دابەست، ئینجا ئـاوی دەسـكەوت، نوێژەكەی نابڕێت و لە سەری بەردەوام دەبێت.. والله اعلم.

ئـەم حاڵەتـە وەكو ڕۆژووەوانـی كـەفارەت وایـە، كـە كۆیلەیـەكی دەست نەكـەوتوەو، بڕیـاری داوە بـەڕۆژو بێـت، بـەڵام لـە نیـوەڕۆدا كۆیلەیـەكی بەردەست كەوتوەو، دەتوانێت بیكڕێـت وئـازادی كـات، بـەڵام نایكـات.. خـۆ ڕۆژووەكەی نابڕێت !!

---

[١] الاستذكار (١٦٩/٣)، المجموع ٢٠ (٣٥٧/٢)، الاوسط (٦٥/٢).

## نوێژی بە تەیەمموم كردوە، دوایی ئاوی دەست كەوتووە هێشتا كاتی نوێژەكە ماوە:

هەر كەسێك ئاوی دەست نەكەوت و، تەیەمموومی كردو نوێژەكەی پـێ كرد، پاشان ئاوی دەسكەوت، كە هێشتا كاتی نوێژەكە ماوە، ئایا نوێژەكەی دەكاتەوە ؟!

نەخێر، ئەمەش ڕای ئیمام مالیـك و، سـەوری و، ئـەوزاعی و، مـوزەنی و، تەحاوی و، قەولێكی ئیمام ئەحمـەدو، بۆچونی ئیبنـو حەزمـە[١].. بـەڵام ئیمام ئەبوحەنیفەو ئیمام شافیعی دەڵێن[٢]: مـادام دەتوانێت ئاوەكـە بـەكار بهێنێت، دەبێت نوێژەكەی بكاتەوە..

ئیبنـو حـەزم ڕەدیـان لـێ دەداتـەوەو دەڵـێ: بۆچـونی ئەبوحەنیفـەو، شافیعی دیارە، كە چەوتە!! یان دەبێت ئەو نوێژەی ئەم دوانـە، فـەرمانیان بە كابرا كردوە بیكاتەوە، ئەو نوێژە بێت، كە خوای گەورە فەرزی كـردوە، یان نوێژێكی ترەو، خوا فەرزی نەكردوە! ئەگـەر نوێژەكـەی خوایـە، ئـەوە كابرا لە كاتی خۆیدا ئەدای كردوە، ئیتر بۆچی دوبارەی بكاتەوە ؟! ئەگـەر نوێژێكی تریشەو، خوای گەورە فـەرزی نـەكردوە، ئـەوە دیـارە دەیانـەوێت پابەندی كەن بە شتێكەوە، كە پێوەی پابەند نابێت.. ئەوەش هەڵەیە..

بەڵگەیەكی تریش، ئەو فەرمودەیە، كـە ئـەبو سـەعیدی خـودری، خـوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، كە (خَـرَجَ رَجُلانِ فِـي سَفَرٍ، فَحَضَـرَتِ الصَّلاةُ وَلَيسَ مَعَهُمَا مَاءٌ، فَتَيَمَّمَا صَعِيداً طَيِّبـاً فصَلَّيَا، ثـمَّ وَجَـدَا المَـاءَ فِـي الوَقْـتِ، فَأعَادَ أحَدُهُمَا الصَّلاةَ وَالوُضوءَ، وَلَمْ يُعِدِ الآخِرُ، ثمَّ أتيَا رَسـولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّمَ فـذَكَرَا ذلِكَ لَـهُ، فقَالَ لِلَّذِي لَـمْ يُعِـدْ: أَصَبْتَ السُّنَّةَ، وَأجْزَأَتـكَ

---

[١] المحلى (٢/١٣٩)، المجموع (٢/٣٥٣).

[٢] المجموع (٢/٣٥٣).

صَلَاتكَ، وَقَالَ لِلَّذِي توَضَّأ وَأعَادَ: لَكَ الأجْرُ مَرَّتينِ)[١] واته: دوو کەس پێکەوە سەفەریان کرد، کاتی نوێژیان هات و، ئاویان پێ نەبو، بۆیە تەیـەممومیان کـردو، نوێـژەکانیان کـرد، پـاش ماوەیـەك ئاویـان دەسـکەوت، یـەکێکیان نوێژەکەی کردەوەو، دەستنوێژەکەی گرتەوە، ئەوی تریان نەیکردنەوە، کە هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم، حاڵەتەکـەیان عـەرز کرد (بۆیان گێڕایەوە)، بەوەیانی فەرمو، کە نوێژەکەی نەکردەوە: بە پێـی سوننەت ڕەفتارت کردوە، نوێژەکەت ئەدا کردوە، بەوی تریشیانی فـەرمو، کە دەستنوێژو نوێژەکەی کردەوە: تۆ دوو پاداشتت هەیە..

ئەوەی لەمەشدا بۆم دەرکەوتوە ئەوەیە کە:

هەر کەس تەیەممومی کردو نوێژی پێ کـرد، پاشـان ئـاوی دەسـکەوت و، دەیتوانی بەکاری بهێنێت، ئەو نوێژانەی ناکاتەوە، کە بە تەیەمومەکە کردونی.. والله اعلم.

★ ★ ★

---

[١] ئەبو داود (٣٣٤)، نەسائی (٢١٣/١) شێخی ئەلبانیش، لە صحیح أبي داود (٣٣٨) دا بە سەحیحی داناوە.

# باسی دەیــەم

# حــەیــزو زەیســـتانی

- خوێنی حەیز:

چی لە حەیزدار حەرامە؟ سنوری دەسبازی ژن ومێرد.

چی بۆ حەیزدار جائیزە ؟

- خوێنی زەیستانی.
- خوێنی جاری داوێن (الإسْتِحَاضَة).

## باسی دەیەم

## حەیزو زەیستانی

ئەمە باسێكی شەرعی و كۆمەڵایەتیە، كە پیاوان تێیدا زۆر بێ ئاگان و، ژنانیش تێیدا ڕاڕان، شەرعناسانیش جۆرەها ڕایان، لەسەر حاڵەتەكانی هەیە، چونكە حاڵەتەكانی زۆرەو، زۆر بێ یاساشن.. لەبەر ئەوەی ڕژانی خوێنی حەیز، پەیوەندی بە پارسەنگی، دەرونەوە هەیە، ئەویشە كاریگەریی لەسەر پارسەنگی یان لاسەنگی هۆرمۆنەكانی ئەم خوێنەوە هەیە.. جاری وا هەیە، ئافرەتێك سوڕی مانگانەی دیارەو، عادەتەن مانگی شەش ڕۆژ وای لێ دێت، بەڵام بە هۆی خەم و پەژارەیەكی كاتییەوە، كاتەكانی هەموی دەشێوێت، جگە لەوەی پاش و پێش دەكات، زیادو كەمیش دەبێت.. یەكێكی تر مێردی بە توندی لێی توڕە دەبێت، هەر ئەو ساتە دەكەوێتە حەیزەوە!! بۆیە زۆر پێویستە هەردوو توخمەكە، ئەوانەی هاوسەرێتییان كردوەو ئەوانەش، كە نەیانكردوە، زانیاریەكی سەرەتاییان لەسەر باسەكانی حەیز هەبێت.. كچان پێویستیانە، تا بزانن، كە شو دەكەن چۆن لەگەڵ مێردیان ڕەفتار دەكەن، كوڕان پێویستە بزانن، تا سەری لێ دەركەن و، بزانن چۆن ڕەفتاری مێردانەی مەسئولانە دەكەن، كوڕان زانیارییان كەمترە، چونكە ئەمە شتێك نیە، ئەوان لە دایكیانەوە فێربوبن، ئەگەر خوشكیشیان هەبو بێت، لەبەر شەرم و نەزانین و، سروشتی خانەوادەیی كوردی، هیچ شتێك لەسەر حەیز، لەوانەوە فێر نەبون و نابن، سروشتی ئەم باسەش وا نیە، خەڵك زۆر ڕوی بێت دەربارەی بپرسێت، بۆیە جاری وا هەیە، خاوەن پرسیارێك ڕوی نایەت، لە

مـەلای گـەنجیش بپرسـێت، کـە پرسـیار لێکردنـی مـەلا، دەربـارەی هـەمو شتێکی ژیان واجبە !

بە هەر حاڵ بێینە سەر باسەکە:

★ ★ ★

ئەو خوێنە سروشتیەی لە ئافرەت دێتە دەرێ سێ جۆرە:

١ ـ خوێنی حەیز (سوڕی مانگانە).

٢ ـ خوێنی زەیستانی (نیفاس).

٣ ـ خوێنی جاری داوێن (ئیستیحازە).

## خوێنی حەیز

حـەیز: (الحَـيض) وشـەیەکی عەرەبیـە و، زاراوەی تریشـی بـۆ دانـراوە وەك: (الطَمْث، العِراك، الضَحِك، الإكْبار)[1]..

خـوێنی حـەیز: خـوێنێکی ڕەشـی خەسـتە، بـۆنی ناخۆشـە، لـە جێگایەکی دیاری کراوی ئافرەت و، لە کاتێکی دیاری کراودا، دێتە دەرەوە.

حەیز شتێکە وەکو پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم دەفـەرموێ: (إنَّ هـذا شـئٌ كَتَبَـهُ اللهُ علـى بَنَـاتِ آدمَ)[2] واتـە ئەمـە شـتێکە، خـوای گـەورە لەسەر کچانی ئادەمی نوسیوە..

حافز ئیبنو حەجەری عەسقەلانی، ڕەحمەتی خوای لێ بێت، لە حاکم و، ئیبنـــول مـــونزیرەوە، بـــە ســـەنەدی ســـەحیح، ڕیوایـــەتێك لـــە

---

[1] ابو اسحق الشيرازي: المهذب (٣٤١/١).

[2] بوخاری (٢٩٤) موسلیم (١٢١١).

ئیبنوعەبباسەوە، خوا لێیان ڕازی بێت دەگێڕێتـەوە، کـە فەرمویـەتی: (إنَّ ابْتِدَاءَ الحَيضِ كَانَ عَلَى حَوَّاءَ بَعْدَ أنْ أُهْبِطَتْ مِنَ الْجَنَّةِ) [1] واتـە: سـەرەتای حەیز لە حەواوە، کە دەستی پێکرد، دوای ئەوە بو، کە هێنرایـە خـوارەوە بۆ سەر زەمین..

خـوێنی حـەیز سـنوری زۆری وکـەمی نیـە، بـە پێـی داب و عـادەتی مانگانەی ئافرەتەکان دەناسرێتەوە، بە تایبەتی، کە فەرمودەیەکی تایبەت، لـە پێغەمبـەری خـواوە، صـلى الله عليـه وسـلم نەسـەلمێنراوە، ئـەوە ڕون بکاتەوە، کە زۆری بڕو ڕادەی، یان کەمی، یان زۆرو کەمی ماوەی چەندە.. هەر لەبەر ئەوەشە ئەم باسە ڕاجوێییەکی زۆری لەسەرە..

ئیمـام ئیبنـو تەیمییـە دەڵـێ: ئەوانـەی، کـە دەڵێن: زۆرینـەی مـاوەی حەیز، پازدە ڕۆژەو، کەمییەکەی یەك ڕۆژە ـ وەکو ئیمام شافیعی و، ئیمـام ئەحمـەد دەڵێن ـ یـان ئەوانـەی دەڵێن: مـاوەی دیـاری کـراوی نیـە ـ وەکو ئیمـام مالیـك ـ هـەمویان هـەر دەڵـێن، حـوکمێکی سـەلمێنراومان لـە پێغەمبەری خواوە، صلى الله عليه وسلم پێ نەگەیشتووە، دەبێت ئیعتیماد بکرێتە سەر داب و نەریت و عادەتی کۆمەڵگەکە [2]..

## هاتن و کۆتـایی حەیز:

١ ـ سەرەتای هاتنی حەیز ئەو کاتەیە، کە دڵۆپە خوێنی ڕەش و خەست و بۆگەن لە کاتی سوڕی مانگانەیدا دەردەکەوێت.

٢ ـ کۆتایی حەیزئەو کاتەیە، کە خـوێن و ئـاوە زەردبـاوە لێڵەکـەی، کـە پێیدا دێت، وەستابێتەوە، ئەمەش بە دوو نیشانەدا دەزانرێت:

---

[1] فتح الباري (١/٤٠٠).

[2] مجموع الفتاوى (٢١/٦٢٣)، المحلى (٢/١٩١)، المغني ٠ ١/٣٠٨).

ـ **وشـك بونـەوە:** بـۆ نمونـە، ئەگـەر دەسـڕێکی کاغـەز، یـان پارچـە قوماشێکی وشك، بخاتە سەر جێگاکەی، هەر بە وشکی دەمێنێتەوە..

. **هاتنی ئاوە سپیەکە:** ئەوەی، کـە دوای تـەواوبونی خـوێنی حـەیز، لە ڕەحمەوە دێت. لە کارەکەرەکەی عائیشەخانەوە، خـوا لێیـان ڕازی بێـت هاتوە، کە دەیگوت: ئافرەتان لۆکەی تەڕی خۆیان، بە شلەمەنی داوێن (کـە زەردباو بو)، لە پارچە قوماشێکدا، دەنـاردە خزمـەت عائیشـەخان، تـا ڕای خۆیان لەسەر دەربڕێت، تا بزانن داخۆ نوێژەکانیان دەست پـێ بکەنـەوە، یان نا، پێی دەگوتن: پەلە مەکەن، تـا ئـەو کاتـەی ئـاوە سـپیەکە دەبیـنن.. مەبەستی پاك بونەوەیان بو، لە حەیز[١]..

**حوکمی شلە زەردباو لێڵەکەی کە دوای پاکبونەوە لە حەیز دێت:**

ئەمە ئـاوێکی زەردبـاوە، لـە کـێم و جەراعـەتی بـرین دەچـێت، ئەگـەر ئـافرەت ئەمـەی لـە دوای وشـك بونـەوەو، پـاك بونـەوەی، لـە حـەیز بـینی هـیچ ئیعتیبـارێکی بـۆ دانانێـت، نوێـژو ڕۆژوی خـۆی و، کـاری سـەرجێیی پیاوەکەی دەکات.. چونکە ئوم عەتییە، خـوا لێـی ڕازی بێـت دەگێڕێتـەوە: (كُنَّا لَا نَعُدُّ الْكُدْرَةَ وَالصُّفْرَةَ بَعْدَ الطُّهْرِ شَيْئًا)[٢] واتە: هیچ حسـێبێکمان بـۆ ئەو ئاوە زەردباو لێڵەی دوای پاکبونەوە نەدەکرد..

هەندێك بیرخستنەوە:

---

[١] بوخاری بە موعەللەقی (٤٢٠/١)، ئیمامی مالیك (٥٩)، عبدالرزاق: المصنف (٣٠٢/١) بەسەنەدێکی زەعیفەوە، بەڵام وەکو کەمال ئیبنو السەید لە صحیح فقه السنة (٢٠٧/١)دا دەڵێ پاڵپشتی تری هەیە بە ڕیوایەتەکەی لای دارمی (٢١٤/١)، و بەیهیقی (٣٣٧/١) بۆیە دەچێتە ئاستی سەحیح، والله اعلم.

[٢] ئەبو داود (٣٠٧)، نەسائی (١٨٦/١)، ئیبنوماجە (٦٤٧)، لای بوخاری (بَعدَ الطُّهر) ەکەی تێدا نیە..

**١ . ئەگەر ئافرەت لە حەیز پاك بۆوەو ئاوی دەست نەکەوت غوسڵی دەرکات:**

تەیـەممووم دەکـات و، لەگـەڵ مێـردی خـۆی دەخـەوێت.. ئەمـە ڕای زۆرینەی شەرعناسانە[١]..

**٢ . ئەگەر خوێنی لە عادەتی خۆی زیاتر بو:**

بۆ نمونە مانگی، شەش ڕۆژ دەکەوێتە حەیزەوە، بەڵام ئەمجارە بـو بـە حەوت، یان هەشت ڕۆژ، ئەم ئافرەتە لە دوو حاڵەت بەدەر نیە:

**یەکـەم: خـۆی خـوێنی حـەیز دەناسـێت ولـە خـوێنی تـری جـویَ دەکاتـەوە:** ئەمـە تەماشـای جـۆری خوێنەکـە دەکـات: ئەگـەر سروشت و ڕەنگ و بۆنی، وەکو خـوێنی حـەیز بـو، بـەوی حسـێب دەکات، نوێژو ڕۆژو کاری سەرجێیی ـ جیماع) ناکات، ئەگـەر خوێنەکـەش خـوێنی حەیز نەبو، ئەوە خۆی دەشوات و ،نوێژو ڕۆژو، سەرجێیی خۆی دەکات..

**دووەم: خۆی خوێنی حەیز ناناسێت ولە خوێنی تری جویَ ناکاتـەوە:** زۆر ئـافرەت هەیـە وایـە بـە تایبـەتی لـە گەنجەکانـدا، ئـەم ئافرەتە لەم حاڵەتەیدا نوێژ و ڕۆژو، سەرجێیی ناکات، تـا پـاك دەبێتـەوە، چونکە سنوری ئەوسەری پاك بونەوە دیار نیە..

---

[١] مجموع الفتاوى (٦٢٥/٢١)، المحلى (١٧١/٢)، شرح مسلم (٥٩٣/١).

### ٣. ئەگەر خوێنی حەیزی لە عادەتی خۆیدا دوو ڕۆژ هات و ڕۆژێـــك وەســـتا، پاشـــان دوای دوو ڕۆژی تـــر هاتـــەوە وە هەروەها:

ئەو ڕۆژانەی دەكەونە نێوان ڕۆژانی سوڕی مانگانـەوە هـەر بـە حـەیز حسێبن، ئافرەت، با لە خوێنیش پاك بێت، بەڵام هـەر نابێـت نوێـژو ڕۆژو سەرجێیی بكات، تا ئەو كاتەی ئاوە سپیەكە دەبینیت[١].

### ٤. ئایا ئافرەتی دوگیان (حامیلە) دەكەوێتە حەیزەوە ؟!

زۆرینــەی شەرعناســان گوتویانــە: نــا، ئــافرەتی حامیلــە ناكەوێتــە حەیزەوە، بەڵگەشیان فەرمودەكەی لای ئەبو سەعیدی خودرییە خـوا لێـی ڕازی بێت، كە فەرموی: ( لَا توطأ حَامِلٌ حَتَّى تضَعَ، وَلَا غَيْـرُ حَامِلٍ حَتَّـى تحِيضَ حَيْضَـةً )[٢] واتـە: ئـافرەتی حامیلـە مـارە ناكرێـت، تـا حەملەكـەی دانـەنێت، غـەیری حامیلـەش، دوای ئـەوەی جارێـك دەكەوێتـە حـەیزەوە. شەرعناسـان گوتویانـە: دانـانی حەملەكـە، بۆتـە نیشانەی پـاك بونـەوەی ڕەحمی حامیلەكە، كەوابو ئافرەتی حامیلە ناكەوێتە حەیزەوە..

هەنـدێك شەرعناسـی تـر، وەكـو ئیمـام شـافیعی گوتویـەتی: حامیلـەش دەكەوێتە حەیزەوە..

ڕاستتر ئەوەیە، كە بـە شـێوەیەكی گشـتی، ئـافرەتی حامیلـە ناكەوێتـە حـەیزەوە، بـەڵام ئەگـەر شـتێكی وا ڕویـداو، ژنـە زانـی، كـە ئەمـە خـوێنی

---

[١] ابن عثيمين: فتاوى المرأة (ل ٢٦)

[٢] ئەبو داود (٢١٥٧)، ئەحمەد (٦٢/٣)، الزّيلعي: نصب الراية (١٤٦/٦)، الحاكم لە المستدركدا فەرمویەتی: صحيح على شرط الشيخين و لم يخرجاه.. بە كۆی سەنەدەكان دەچێتە ئاستی حەسەن..

حەیزە، بێگومان، دەبێت واز لە نوێژو، ڕۆژو سەرجێیی خۆی بهێنێت، تا پاك دەبێتەوە لێی..ئەگەر زانیشی کە خوێنی حەیز نیە، ئەوە بە خوێنی بەردەوامی داوێنی حسێب دەکات، دەیشواتەوەو نوژێو رۆژو سەرجێیی خۆی دەکات..

★ ★ ★

## چی لە حەیزدارو زەیستان حەڕامە ؟!

یەکەم: نوێژ کردن: شەرعناسان لەسەر ئەوە کۆن، کە ئافرەتی حەیزدارو، زەیستان بە هیچ شێوەیەك نوێژی لەسەر نیە، نە فەرزە، نە سوننەتی، کە پاکیش بۆوە، نوێژەکانی ناگێڕێتەوە[1]..

ـ ئەبو سەعیدی خودری، خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم فەرموی: (أَلَيْسَ إِذَا حَاضَتْ لَمْ تُصَلِّ وَلَمْ تَصُمْ فَذَلِكَ نُقْصَانُ دِينِهَا)[2] واتە: مەگەر ئەوە نیە، کە کەوتە حەیزەوە، نوێژەکانی ناکات و، بەڕۆژو نابێت، دەی ئا ئەوە نوقسانێتی دینەکەیەتی..

ـ (عَنْ مُعَاذَةَ قَالَتْ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا فَقَالَتْ: مَا بَالُ الْحَائِضِ تَقْضِي الصَّوْمَ، وَلَا تَقْضِي الصَّلَاةَ ؟ فَقَالَتْ: أَحَرُورِيَّةٌ أَنْتِ ؟ فَقُلْتُ: لَسْتُ بِحَرُورِيَّةٍ، وَلَكِنِّي أَسْأَلُ. فَقَالَتْ: كَانَ يُصِيبُنَا ذَلِكَ، فَنُؤْمَرُ بِقَضَاءِ

[1] المجموع (٢/٣٥١)، المحلى (٢/١٧٥).
[2] بوخاری (١٩٥١)، موسلیم (٨٠).

الصَّـوْمِ، وَلَـا نُـؤْمَرُ بِقَضَـاءِ الصَّـلَاةِ )[١] واتــه: موعــاده (نــاوی ئافرەتێکــه) دەگێڕێتــەوە دەڵــێ: لــه عائیشــەخانم پرسـی، خـوا لێـی ڕازی بێـت: ئـەرێ بۆچی حەیزدار ڕۆژووەکانی دەگرێتـەوەو، نوێـژەکانی ناکاتـەوە؟! فـەرمویٖ: چما تۆ حەروریت[٢]؟ وتم: نا حەروری نـیم، بـەڵام هـەر دەمـەوێت پرسـیار بکـەم؟! فـەرموی: ئێمـه، کـه ئـەوەمان دەهاتـه ڕێ، فـەرمانمان پـێ دەکـرا ڕۆژووەکانمان بگرینەوەو، نوێژەکانمان نەکەینەوە. له ریوایەتێکی تردا: (له سەردەمی پێغەمبەری خوادا، صلی الله علیـه وسـلم دەکەوتینـه حـەیزەوە، فەرمانی وای پێ نەدەکردین  یان نەماندەکردەوە) مەبەستی نوێژەکانه..

## کورته باسی پێویست:

### ١. ئەگەر ئافرەتێك پێش عەسر کەوته حەیزەوە، کە هێشتا نوێـــژی نیـــوەڕۆی نـــەکردبو، ئایـــا کـــە پـــاك بـــۆوە نوێـــژی نیوەڕۆکەی قەرزارەو دەبێت بیگێڕێتەوە ؟!

بـەڵێ، بـه ڕای زۆرینـەی شەرعناسـان ـ جگـه لـه ئیمـام ئـەبو حەنیفـەو مالیك ـ قەرزارەو دەبێت بیگێڕێتەوە، بەو مەرجەی پاك بوبێت و، ئەگـەر بیکردایـه فریـای ڕکـاتێکی نوێـژی نیوەرۆکـەی بکەوتایـه. چـونکه خـوای

---

[١] بوخاري (٣٢١)، موسلیم (٢٦٥).

[٢] حەروری، نەسەب گەڕاندنەوەیه بۆ ناوچەی حەرەوراء، که نزیکی کوفەیه، له باشوری عێراق، له سەردەمی سەیدنا عەلی کوڕی ئەبو تالیبدا، خوا لێی ڕازی بێت خەواریجەکان لەوێ کۆبونەوە، ئیتر وای لێهات، هەر کەسێك فیکرو دیدو بۆچون و هەڵوێستی ئەوانی هەبوایه، پێیان دەوت: حەروری، ئەمانه ڕایان وابو: دەبێت ئافرەتی حەیزدار، که پاك بۆوە نوێژەکانی بکاتەوە.. ئەوە بۆیه عائیشه خانیش به سەرسامیەوە دەپرسێت: چما تۆ حەروریت؟!

گــــــەورە دەفـــــــەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا﴾ النساء/١٠٣ واتە: خوای گەورە بە گوێرەی کاتی دیاری کراو، نوێـژی لەسـەر فەرز کردون.فەرزی ئەم کاتـەش ئـەو نوێـژە بـوە، کـە نـەیکردوە قـەرزاری بوە. منیش پێم وایە دەبێ بیگێڕێتەوە.

بەڵام بـەڕای هەنـدێك شەرعناسـی تـری وەکو، ئیمام ئـەبو حەنیفـەو ئیمام مالیك نوێژەکەی ناگێڕێتەوە.. ئیمام ئیبنو تەیمییـەش ئـەم ڕایـەی پـێ پەسـندترە، بۆیـە دەڵـێ: بەڵگـەکان زیـاتر پشـتیوانی مەزهـەبی ئـەبو حەنیفەو، مالیك دەکەن، چونکە بەڵگەی گێڕانەوەی نوێژەکە، دەبێـت بـە فەرمانێکی نوێ بێت، کە لێرەدا لەبەر دەستدا نیە. دیسان دواخستنی ئـەو نوێـژە ڕێپێـدراو بـوە، ئەگەرچـی دوای خسـتوە. کـەوابو قـەرزار نیـەو نوێژەکە ناکاتەوە[١]..

## ٢. ئەگەر ئافرەتێك پـێش عەسـر لـە حـەیز پاك بـۆوە نوێـژی نیـوەڕۆی نـەکردبو، بـەڵام تـا غوسـڵی دەرکـرد کـاتی نوێـژی عەسر بەسەردا هات، ئایا نوێژی نیوەڕۆکەی قەرزارە ؟!

بەڵێ، ئەگەر پێش خۆرئاوا بون لە حەیز، یان لە زەیستانیی پاك بـۆوە، دەبێت نوێژی نیوەڕۆو عەسر پێکەوە بکات، ئەگەر پێش خۆر هـەڵهاتنیش پاك بۆوە، دەبێت نوێژی شێوان و خەوتنان (مەغریب و عیشا) ی بکات !

ئەمــە پەســەندترە، چــونکە ئــەنجامی توێژینــەوەی ئیمــام ئیبنــو تەیمییەیە، کە دەڵێ: ئەمـە ڕیوایـەتی لای سـەیدنا، عبـدالرحمانی کوڕی عەوف و، ئەبوهورەیرەو، ئیبنـو عەبباسـە، خـوا لێیـان ڕازی بێـت، چونکە

---

[١] مجموع الفتاوى: (٢٣/٢٣٥).

کاتەکە لە کاتی هەبونی عوزردا ـ وەکو سەفەر ـ هاوبەشی نێوان هەردوو نوێژەکانە[1]..

**دووەم: ڕۆژو گرتن:** کۆڕای شەرعناسان، لەسەر ئەوەیە، کە ئافرەتی حەیزدارو زەیستان ڕۆژو ناگرێت، دوای ڕەمەزان، کە پاك بۆوە، دەیانگرێتەوە.. بەلگەی ئەوەش فەرمودەکەی عائیشەخانە، کە بە موعادەی گوت: (كَانَ يُصِيبُنَا ذَلِكَ، فَنُؤمَرُ بِقَضَاءِ الصَّوْمِ، وَلَا نُؤمَرُ بِقَضَاءِ الصَّلَاةِ )[2] واتە: موعادە (ناوی ئافرەتێکە) دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لە عائیشەخانم پرسی خوا لێی ڕازی بێت: ئەرێ بۆچی حەیزدار ڕۆژوەکانی دەگرێتەوەو، نوێژەکانی ناکاتەوە؟! .... گوتی: ئێمە، کە ئەوەمان دەهاتە ڕێ فەرمانمان پێ دەکرا، ڕۆژوەکانمان بگرینەوەو، نوێژەکانمان نەکەینەوە.

## کورتەباسی تر:

### ١ـ ئەگەر حەیزدار پێش سپێدە پاك بۆوەو، غوسلی دەرنەکرد، ئایا بەڕۆژو دەبێت؟!

جمهوری شەرعناسان دەڵێن: ئەگەر ئافرەتی حەیزدار، پێش سپێدەی بەیانی پاك بۆوەو، نییەتی هێنا سبەینێ بەڕۆژو بێت، ڕۆژوەکەی دروستە، چونکە دروستی و، نادروستی ڕۆژو لەسەر کردن و، نەکردنی غوسل نەوەستاوە، ڕۆژو وەکو نوێژ نیە، کە بە بێ غوسل دەرکردن نەشێت[3]..

---

[1] الفتاوی (٢٣/٣٣٤).
[2] بوخاری (٣٢١)، موسلیم (٢٦٥).
[3] فتح الباري (١/١٩٢).

## ٢ . ئەگەر حەیزدار پێش خۆرئاوابون پاك بۆوە، ئایا بەڕۆژو دەبێت؟!

نا، ئەو، کە لەسەرەتای ڕۆژوەکەوە، بەڕۆژو نەبوەو، ڕۆژەکە قەرزار بوە، دەتوانێت هەروا بێ ڕۆژو بمێنێتەوە.. ناچار نیە ڕۆژو لەو ساتە وەختەوە بگرێت.. ئیبنو جورەیج دەڵێ: لە عەتائم پرسی: ئافرەتێکی حەیزدار، کە لە بەشێکی ڕۆژی ڕەمەزاندا پاك دەبێتەوە، ئایا دەبێت ئەو باقی ڕۆژەی بەڕۆژو بێت؟ گوتی: نا، خۆ هەر قەرزارەو، دەبێت بیگرێتەوە[1]..

## سێیەم: سەرجێیی حەیزدارو زەیستان حەرامە:

★ سەرجێیی (جیماع کردن لەگەڵ ئافرەت لە دەرچەی پێشەوەی) حەیزدارو زەیستان ، بە کۆڕای هەمو شەرعناسان حەرامە[2].. چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَٱعۡتَزِلُواْ ٱلنِّسَآءَ فِي ٱلۡمَحِيضِ﴾ البقرە/ ٢٢٢ واتە: ئەو ساتانەی ئافرەت لە حەیزدایە، توخنیان مەکەون.. مەبەست لەوەیە، کە کاری سەرجێییان لەگەڵدا مەکەن، ئەم لێکدانەوەیەش لە ڕون کردنەوەکەی پێغەمبەری خواوە، صلى الله عليه وسلم هاتوە، کە دەفەرموێ: (إصْنَعُوا كُلَّ شَيْءٍ إلَّا النِّكَاحَ)[3] واتە: هەمو شتێکیان لەگەڵدا بکەن، جگە لە سەرجێیی کردن.. شێخولئیسلام ئیمام ئیبنو تەیمییە دەڵێ: بە کۆڕای شەرعناسان، سەرجێیی زەیستان، وەکو سەرجێیی

---

[1] عبدالرزاق: المصنف (١٢٩٢) بە سەنەدی سەحیحەوە،
کەمال ئیبنو السەید لە صحیح فقه السنة (١/ ٢١١)دا دەڵێ: سەحیحە
[2] مجموع الفتاوى (٢١/٦٢٤)، المحلى (٢/١٦٢)، تفسير الطبري (٤/٣٧٨).
[3] موسلیم (٣٠٢)، هەروەها هەر چوار خاوەن سونەنەکان .

حەیزدارەو، لەگەڵ هەردووکیاندا حەرامە[١]..

★ هـەر موسـوڵمانێك پێـی وا بێـت، کـە سـەرجێیی ئافرتێـك، کـە لـە حەیزدا بێ، یان زەیستان بێت حەڵاڵە، پێی کافر دەبێت و، حوکمی لە دین هەڵگەڕاوەی دەکەوێت بەسەردا.. بەڵام ئەگەر کەسێك ئـەو کارەی کـردو، دەیزانـی حەرامـە، یـان بـیری چـو بـو، یـان نەیـدەزانی ئافرەتەکـە لـە حەیزدایە، یان زەیستانە، یان نەیدەزانی سـەرجێیی کردنـی حەرامـە، یـان ناچار کرابو بیکات، گوناهبار نابێت و کەفارەتیشی ناکەوێتە سەر..

بـەڵام هـەر کەسێك بـە سەربەسـتی خـۆی وبـە ئەنقەسـت، سـەرجێیی لەگەڵ ئافرەتێك کرد کە دەیزانی لە حەیزدایە، یان زەیستانەو، دەشـیزانی ئەم کارە حەرامە، ئەوە تاوانێکی گەورەی لە جۆری کـەبائیرەکان کـردوەو، دەبێت تۆبەی لێ بکات[٢]..

## ئایـا ئەگـەر جیمـاعی لەگـەڵ حـەیزدار یـان زەیسـتان کـرد کەفارەتی ناکەوێتە سەر؟!

جمهوری پێشەوای چوار مەزهەبەکە (سیان لە چواریان) دەڵێن: هیچی غەیری تۆبە کردنەکەی لەسەر نیە.. چونکە بەڵگە لەسەر ئەوەیە:

١ـ لـە سوننەت و سیرەی پێغەمبـەری پێشـەوادا، صـلی اللە علیـە وسـلم هاتوە، کە: (كَانَ إِذَا أَرَادَ مِنَ الحَائِضِ شَيئاً أَلْقَى عَلَى فَرْجِهَا ثَوباً)[٣] واتـە: ئەگەر بیویستایە لەگەڵ خێزانێکیدا، کـە لـە حـەیزدا بوایـە شـتێك بکـات، قوماشێکی بەسەر عەورەتیدا دەدا..

---

[١] الفتاوى (٢١/٦٢٤).

[٢] شرح صحيح مسلم (٢٠٤/٣).

[٣] ئەبو داود (٢٧٢) سەنەدەکەی سەحیحە..

٢ ـ مەسروق دەگێڕێتەوە: (قُلْتُ لِعَائِشَةَ: إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَسْأَلَكَ عَن شَئٍ وَأَنَا أَسْتَحِي! فَقَالَتْ: إِنَّمَا أَنَا أُمُّكَ وَأَنْتَ ابْنِي، فَقَالَ: مَا لِلرَّجُلِ مِنْ امْرَأَتِهِ وَهِيَ حَائِضٌ ؟ قَالَتْ: لَهُ كُلُّ شَئٍ إِلَّا فَرْجَهَا)[1] واتە: بە عائیشەخانم وت: دەمەوێت پرسیارێکت لێ بکەم و، شەرم دەکەم بیکەم! گوتی: من دایکتم و تۆش کوڕمی، پرسیم: چی بۆ پیاو لە ژنەکەی حەڵاڵە لەو کاتانەیدا، کە لە حەیزدایە ؟ گوتی: هەمو شتێك، جگە لە عەورەتی.

بەڵام ئیمام ئەحمەدو هەندێك شەرعناسی تر دەڵێن: ئەوی لە کاتی حەیزو زەیستانیدا دەچێتە لای ئافرەت، کەفارەتی لەسەرە.. چونکە ئیبنو عەبباس، خوا لێیان ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم، دەربارەی ئەو کەسەی سەرجێیی لەگەڵ خێزانیدا، لە کاتی حەیزدا دەکات، گوتویەتی: (يَتَصَدَّقُ بِدِينَارٍ أَو نِصْفِ دِينَارٍ)[2] واتە: دینارێك، یان نیو دینار دەکات بە خێر.. جمهور وەڵامیان داونەتەوە، کە بەڵگەکەتان زەعیفە.

ئەوانەی گوتویانە: دەبێت کەفارەت بدات، ڕاجوێییەکی زۆریان لە مەسەلەی کەفارەتەکەش تێکەوتوە..

بە هەر حاڵ من پێم وایە:

هەر کەسێك لە کاتی حەیزو زەیستانییدا چوە لای ئافرەتێك، گوناحی گەورەی کردوە، بەڵام کەفارەتی لەسەر نیە..

---

[1] تەبەری لە تەفسیرەکەیدا (٣٧٨/٤) هێناویەتیەوەو گوتویەتی: سەنەدی سەحیحە، هەروەها کەمال ئیبنو السەید لە صحیح فقه السنة (١/ ٢١٢)دا دەڵێ: سەحیحە

[2] ئەبو داود (٢٦٤)، نەسائی (١/١٥٣)، ئیبنوماجە (٦٤٠). کەمال ئیبنو السەید لە صحیح فقه السنة (١/ ٢١٢)دا دەڵێ: زەعیفە. زۆرینەی هەرە زۆری فەرمودەوانان بە مەرفوعی ئیبنوعەبباسیان ناساندوە.. خوا ئاسانی کرد سەیری سیوحەوت زنجیرەی سەنەدی ئەم فەرمودەیەم کرد، لە غەیری زەعیفیم بۆ دەرنەکەوت.

### سنوری دەسبازی ژن و مێرد لە کاتی حەیزو زەیستانیدا

ئاساییە کە شەرعناسان لە حوکمی ئەم مەسەلەیەدا دوو پۆل بن:

**پـۆلی یەکـەم: ئەوانـەی، کـە گوتویانـە: لـەو کاتانـەدا، کـە ئـافرەت لـە حەیزدایـە، یـان زەیسـتانە، مێردەکـەی بـۆی نیـە لەزەت لە مەسافەی نێوان ناوکی، تا ئەژنۆی وەرگرێت:**

خۆ ڕەحەتکردنی پیاو لەو مەسافەدا حەرامە، ئەمەش ڕای ئیمام ئەبو حەنیفـەو، ئیمـام مالیـك و، ئیمـام شـافیعییە.. لـە بەرامبەریانـدا ئیمـام ئەحمــەدو، هەنــدێك شەرعناســانی حەنــەفی و، شــافیعی، لەوانــە ئیمــام نەوەوی، کە دەڵێ بەڵگەی ئەحمەد بەهێزترەو، بۆچونی ئـەویش پەسـەند دەکات[1]. دەڵێن: چێژوەرگرتنی پیاو لە خێزانی حـەیزداری، یـان زەیستانی لەو مەسافەدا، جگە لە عـەورەت و کـۆمی هیچی لەسـەر نیـە. لـە بەڵگـەی ئەم بەڕێزانە:

١ ـ لە سەیدنا مەعازی کوڕی جەبەلەوە، خوا لێی ڕازی بێت هاتوە، کـە دەڵێ: ( سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَمَّا يَحِلُّ لِلرَّجُلِ مِـنْ امْرَأَتِـهِ وَهِيَ حَائِضٌ ؟ فَقَـالَ: مَـا فَـوْقَ الإِزَارِ، وَالتَّعَفُّـفُ عَـنْ ذَلِـكَ أَفْضَـلُ)[2] واتـە: لـە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسـلم پرسـی، کـە چـی بـۆ پیـاو جـائیزە، لەگەڵ خێزانیـدا بیکـات، لـەو کاتانـەی لـە حەیزدایـە؟! فـەرموی: لەسـەرو وزرەوە (سەرو پشتێنە)، ئەگەر لەوەشدا خۆی بگرێتەوە باشترە..

---

[1] المغني (٤١٤/١).

[2] ئەبو داود (٢١٣). ئەبو داود خۆی دەڤڵێ: زەعیفەو، لە پێغەمبەری خواوە، صلی الله علیه وسلم نەسەلمێنراوە، شێخی ئەلبانیش لە ضعیف أبي داود (٣٦) دەڵێ: زەعیفە..

٢ ـ دیسان هەر وا لە سەیدنا عومەری کوڕی خەتتابەوە، خوا لێـی ڕازی بێت گێڕراوەتەوە، کە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم کرد: (مَا يَصْلُحُ للرَّجُلِ مِنْ امْرَأَتِهِ إذَا كَانَتْ حَائِضًا ؟ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا فَوْقَ الإِزَارِ)[١] واتە: چی بۆ پیاو جائیزە لەگەڵ خێزانیدا بیکات، لـەو کاتانـەی، لـە حەیزدایـە ؟ فـەرموی: لەسـەرو ویـزرەوە (سـەرو پشتێنـەی).

٣ ـ فەرمودەیەکی تر هەر، بە هەمان شێوەو مانـا، لـە سـەیدنا حـەرامی کـوڕی حەکیمـەوە، لـە مامیـەوە خـوا لێیـان ڕازی بێـت، گێڕراوەتـەوە، کـە ئەویش بە هەمان شێوە پرسیاری کردوە: (سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ مَا يَحِلُّ لِي مِنْ امْرَأَتِي وَهِيَ حَائِضٌ ؟ قَالَ: لَكَ مَـا فَـوْقَ الإِزَارِ)[٢] واتـە: پرسیاری لە پێغەمبـەری خـوا، صـلى الله عليـه وسـلم کـرد: چـی بـۆ پیـاو جائیزە لەگـەڵ خێزانیـدا بیکـات، لـەو کاتانـەی لـە حەیزدایـە ؟ فـەرموی: لەسەرو ویزرەوە.

ئـەو پۆلـە بـەڕێزەی بەرامبـەریان وەڵامیـان داوەتـەوەو گوتویانـە[٣]: لـە وردبونەوە لە وشەی (المَحِيض)، کـە لـە ئایەتەکـەدا هاتوە: ﴿فَٱعۡتَزِلُواْ ٱلنِّسَآءَ فِي ٱلۡمَحِيضِ﴾ البقره/٢٢٢ واتە لـە ژنـان لـە حـەیزدا دورەپـەرێز بـن.. بـە

---

[١] ئیمامی ئەحمەد (٨٧)، توێژەرەوەی گەورەی فەرمودەوانی میسری ئەحمەد شاکر (کە وەکو شێخی ئەلبانیە) دەڵێ: (إسناده ضعيف لانقطاعه).

[٢] ئەبو داود (٢١٢). ئیمامی ئیبول قەییم لە تهذيب سنن ابي داود دا دەڵێ: زەعیفە، شێخی ئەلبانی لە صحيح أبي داود (١٩٧) دا دەفەرموێ: سەحیحە.. ئەم دوو حوکمە لەسەر ئەم ریوایەتە کۆنەو پێشتریش بە هەمان شێوە فەرمودەوانانی تر حوکمیان بەو دوو جۆرە لەسەر داوە، کە ئێرە شوێنی تەفسیلی نیە..

[٣] الشرح الممتع (٤١٦/١).

مانـای کـات و شـوێنی حـەیزە، واتـە: ئـەو شـوێنە کـە حەڵاڵـە لـەو کاتـەدا حەرام دەبێت..

ئیبنوقودامە دەڵێ: دیاریکردنی شوێنی خوێنەکە بە توخن نەکەوتن و گۆشەگیربون لێی، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە شوێنەکانی تر حەڵاڵن[1]..

ئینجـا ئـەمان، کـە ڕێـدەرانی چـێژی ئـەو مەسـافەیەن، بـە بەرامبەرەکانیان دەڵێن:

١ ـ زۆرینەی فەرمودەکان، کە هێناوتاننەوە ناسەلمێنرێن.

٢ ـ ئەوی سەلمێنراوە، بە ڕاشکاوی حەرامی نەکردوە،

٣ ـ ئەگەر لاکەین بە لای ڕاکەتانەوە دەڵێین: ئـەو هۆشـدان (ئیـنـزار)ەی لە فـەرمودە سـەحیحەکەدا هـاتوە (ئـەوەی ئـەلبانی: ئـەبو داود ٢١٢) ئـەوە رون دەکاتەوە، کە دورکەوتنەوە لەو شوێنەی دیاری کراوە، چاکترە وەك لە نزیك کەوتنەوەی.. بـە تایبـەتی کـە ئەمـە حـوکمێکی گشـتیەو، بـۆ هـەمو کەسێکە، نەبادا کەسانی وا هەبن ئەوەندە نزیك بکەونەوەو، دوایی خۆیان نەگرن و، لە پێشەوە، یان لە پاشەوە بکەونە گوناحی کەبیرەیەوە..

## پۆلی دووەم: ئەوانەی گوتویانـە: ئـەو نێوانـەش (جگـە لـە عـەورەت و دەرچـەی کـۆم) هـیچ ئیشـکالێکی نیـەو پیـاو دەتوانێت ئارەزوی خۆی لێ بشکێنێت:

ئەوەش ڕای ئیمام ئەحمەدو، کۆمەڵێك شەرعناسی ترە، ئەمان، کە لـە جیمـاع کردنەکەیـدا دەڵـێن: کـەفارەتی لەسـەر نیـە، بێگومـان لـە چـێژ وەرگـرتن لـەو مەسـافەدا ئاسـانکارترن.. وردبونـەوە لـە بەڵگـەی ئـەمان

---

[1] المغني (١/٤١٥).

دەسەلمێنێت، کە لە بەلگەی بەرامبەرەکانیان بەهێزترە، لەوانە ئەو وەسفەی، کە بۆ پێغەمبەری پێشەوا، صلى الله عليه وسلم هاتوە:

١ـ: (كَانَ إِذَا أَرَادَ مِنْ الحَائِضِ شَيئاً أَلقَى عَلَى فَرْجِهَا ثوباً)[١] واتە: ئەگەر پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، بیویستایە لەگەڵ خێزانێکیدا، کە لە حەیزدا بوایە شتێك بکات، قوماشێکی بەسەر عەورەتیدا دەدا.. ئەمە وەکو ئەوەیە، کە ژنە دەرپێیەك لە پێکا..

٢ ـ ریوایەتەکەی مەسروق: (قُلْتُ لِعَائِشَةَ: إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَسْأَلَكَ عَنْ شَيْءٍ وَأَنَا أَسْتَحِي! فَقَالَتْ: إِنَّمَا أَنَا أُمُّكَ وَأَنْتَ ابْنِي، فَقَالَ: مَا لِلرَّجُلِ مِنْ امْرَأَتِهِ وَهِيَ حَائِضٌ ؟ قَالَتْ: لَهُ كُلُّ شَيْءٍ إِلَّا فَرْجَهَا)[٢] واتە: بە عائیشەخانم وت: دەمەوێت پرسیارێکت لێ بکەم و، شەرم دەکەم بیکەم! فەرمووی: من دایکتم و تۆش کوڕمی، پرسیم: چی بۆ پیاو لە ژنەکەی حەڵاڵە، لەو کاتانەیدا، کە لە حەیزدایە؟ فەرمووی: هەموو شتێك، جگە لە عەورەتی.

٣ ـ سەیدنا ئەنەسی کوڕی مالیك، خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە: (أَنَّ الْيَهُودَ كَانُوا إِذَا حَاضَتِ الْمَرْأَةُ فِيهِمْ لَمْ يُؤَاكِلُوهَا وَلَمْ يُجَامِعُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ فَسَأَلَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (وَيَسْأَلُونَكَ عَنْ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ... إِلَى آخِرِ الآيَةِ) فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اصْنَعُوا كُلَّ شَيْءٍ إِلا النِّكَاحَ )[٣] واتە: جولەکەکانی مەدینە عادەتیان وابو، کە ئافرەتیان دەکەوتە حەیزەوە، نە لەگەڵیدا نانیان دەخوارد، نە لە ماڵدا

---

[١] ئەبو داود (٢٧٢) سەنەدەکەی سەحیحە..

[٢] تەبەری لە تەفسیرەکەیدا (٣٧٨/٤) هێناویێتیەوەو گوتویەتی: سەنەدی سەحیحیە، هەروەها کەمال ئیبنو السەید لە صحيح فقه السنة (١/ ٢١٢)دا دەڵێ: سەحیحە

[٣] موسلیم (٣٠٢).

لەگـەڵی دادەنیشـتن (ئەمـە تەفسیری ئیمـام نەووویـە) یـاوەران دەربـارەی ئەمـە، لـە پێغەمبـەری خوایـان صـلی اللە علیـه وسـلم پرسـی: ئـیتر خـوای گەورە ئەو ئایەتـەی نـاردە خـوارەوە، کـە ماناکـەی دەفـەرموێ: (دەربـارەی کات و شوێنی حەیز لێت دەپرسن، بڵـێ: ئـەوە کـاتی ئـازارو پیسـییە، لـەو کاتانەدا لە ئافرەتان دورکەونەوە.. تا کۆتایی ئایەتەکە).. پێغەمبەری خوا صلی اللە علیه وسلم فەرموی: هـەمو شـتێك(یـان لەگەڵـدا) بکـەن جگـە لـە سەرجێیی..

٤ ـ لـە فـەتواکانی لیژنـەی هەمیشـەیی بانگـەوازو فـەتوادان و رێنمـایی سعودیەدا (اللجنة الدائمة للدعوة والافتاء والارشاد ٣٩٥/٥) هـاتوە: حەرامـە بۆ پیاو سەرجێیی لەگەڵ خێزانیدا لە پێشەوە بکات، لە کاتی حەیزیدا، لە غەیری ئەو جێیە بۆی هەیە خۆی رەحەت کات..

پێم وایە پیاو بۆی هەیە هەمو چێژێك لە خێزانی خۆی لەو کاتانەدا، کە لە حەیزو زەیستانییدایە وەرگرێت، بەو مەرجەی بە زەکـەری تـوخنی پاش و پێشی نەکەوێت.. واللە اعلم.

## مێـرد بـۆی نیـە سـەرجێیی لەگـەڵ خێزانیـدا بکـات پـێش دەردەکردنی غوسڵی حەیزی:

ئەگـەر ئافرەتـە پـاك بـۆوە، بـەڵام هێشـتا غوسـڵی دەرنـەکردبو، بـۆ پیاوەکـەی جـائیز نیـە سـەرجێیی لەگەڵـدا بکـات.. چـونکە خـوای گـەورە دەفـــەرموێ: ﴿وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ۖ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللَّهُ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ﴾ البقـره / ٢٢٢ واتـە: تـوخنی ژنـەکانتان مەکەونـەوە، کـە لـە حـەیزدابون، تـا ئـەو سـاتەی پـاك دەبنـەوە، کـە پـاك

بونەوە، وا بچنە لایان، كە خوای گەورە فەرمانی پێ كردون، خوای گەورە تۆبەكاران و پاكژەوانانی خۆش دەوێت..

موجاهید دەڵێ: ئافرەتان دوو جۆر پاكژییان هەیە:

ـ یەكەمیان: ئەوەیە كە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ﴾ واتە: تا پاك دەبنەوە. واتە، تا خۆیان دەشۆن، تا ئەو كاتەش بۆ مێردەكانیان جائیز نیە، سەرجێییان لەگەڵدا بكەن..

ـ دووەمیان: ﴿فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللَّهُ﴾ وا بچنە لایان، كە خوای گەورە فەرمانی چۆنیەتیەكەی پێ كردون، كە بریتیە لە چونە لای لە پێشەوە، لە شوێنی خوێنیەوە.. هەر كەسێك بەم چۆنیەتەی نەكرد، ئەوە نە لە ڕیزی تۆبەكاراندایە و، نە لە ریزی پاكژەواناندایە..

بەڵام ئیبنو حەزم پێی وایە، كە پاك بۆوە ـ پێش ئەوەش، كە غوسڵ دەركات ـ مێردەكەی بۆی هەیە بچێتە لای و، سەرجێیی لەگەڵدا بكات.. وانازانم ئەم بۆچونەی ئیبنو حەزم زۆر پێكابێتی..*

## ئەگەر پیاوێك ژنەكەی ئەهلی كیتاب بێت، ئایا ناچاری غوسڵ دەكرێت؟!

بەڵێ، چونكە بە پێی ئایەتەكە نابێت مێردە موسوڵمانەكەی توخنی كەوێت، تا غوسڵ دەردەكات.. چونكە ئایەتەكە جیاوازی نەخستۆتە نێوان ئافرەتی موسوڵمان و، غەیرە موسوڵمان[١]..

---

*ـ جگە لە (إبن حزم)، (أوزاع)یش ڕای، ئەگەر ژن لە خوێنی حەیز پاك بۆوەو داوێنی شوشت، مێردەی دەتوانێ لەگەڵی جوت بێ، هەروەها ئەبوحەنیفە و هاورێكانی، هەمان ڕایان هەیە، بۆیەئێمە پێمان وایە ڕای (إبن حزم) و(أوزاعی) و(أبو حنیفة)و هاوڕیانی پەسندترەو پێكاویەتی. بڕوانە: (المفصل في أحكام المرأة وبيت المسلم) دكتور عبدالكريم الزيدان(١/١٦٥) الطبعة الثانية هـ ١٤٢٠ـ ٢٠٠٠م نوسینگەی تەفسیر

ئـەو ئافرەتـەی پیاوەكـەی زۆری لـێ دەكـات تـا لـە حـەیزدا سـەرجێیی لەگەڵدا بكات، پێویستە خۆی تەسلیم نـەكات، بـەڵام ئەگـەر هـەر ناچاری كرد، گوناحبار نابێت..

كابراش توشی كەبیرە دەبێت، پێویستە تۆبەی لێ بكات..

★ ★ ★

**چـوارەم: تـەواف كـەعبـە:** لەوانـەی لـە حـەیزدار قەدەغەیـە، تـەواف كەعبەیە، ئەمـەش بـە كۆڕای شەرعناسـانە.. چونكە عائیشـەخان، كـە لـە كاتی حەج كردنیدا كەوتە حەیزەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێـی فـەرمو: (افْعَلِـي مَـا يَفْعَـلُ الْحَـاجُّ غَيْـرَ أنْ لَـا تطُـوفِي بِالْبَيْـتِ حَتَّـى تطْهُرِي)[2] واتە: هەرچی حاجی دەیكات تۆش بیكە، بەڵام تـەواف مەكـە، تـا پاك دەبیتەوە..

لە باسی حەجدا ان شاء الله زیاتر ئەمە ڕون دەكرێتەوە..

---

[1] تفسیر الطبري (٣/٩٠).

[2] بوخاری (١٦٥٠).

## چی بۆ حەیزدار جائیزە ؟

**١ . زیكری خوای گەورەو قورئان خوێندن:** پێشتر باس كرا، كە حەیزدارو زەیستان، بۆیان هەیە زیكری خوای گەورە بكەن و، قورئانیش بخوێنن، ئەمە بۆچونی ئیمام ئەبو حەنیفەو، ڕای ناسراوی مەزهەبی شافیعی و، ئیمام ئەحمەدە[١]، ئەوەش ڕاستترینە.

ئیبنوحەزم دەڵێ: قورئان خوێندن و، سوجدە بردن و، دەستدان لە قورئان و هەڵگرتنی، هەروەها زیكرەكانی خوای گەورەو، خوێندنی ویردەكان، هەمو كردەوەی چاكەن، ئەو كەسەی دەیانكات، پاداشتی بەر دەكەوێت، هەر كەسێك ڕێ لە كەسانی تر بگرێت، كە لە هەندێك حاڵەتیاندا نابێت بیكەن، بەرپرسێتیەكی خستۆتە سەر شانی، كە دەبێت بەڵگەی شەرعی بهێنێت، كە ئەو حوكمەی ڕاستە[٢]..

كەوابو قورئان خوێندنی ئافرەت لە كاتی حەیزیدا جائیزە.

**٢ . سوجدە بردن كە ئایەتی سوجدەی گوێ لێبو:** هیچ بەڵگەیەك لەبەر دەستدا نیە، كە ڕێ لە ئافرەتی حەیزدار بگرێت، بۆ سوجدە بردنی بۆ خوا، لەو كاتانەدا، كە گوێی لە ئایەتەكانی سوجدە دەبێت، چونكە سوجدە بردن بە نوێژ حسێب ناكرێت و، پاكژیی مەرجی سوجدە بردن نیە..

---

[١] ئیبنوتەیمییە لە مجموع الفتاوی (٤٥٩/٢١) دا را جیاوازەكان و بەڵگەكانی هەردوولای هێناوەتەوە.

[٢] المحلی (٧٧/١).

سەلمێنراوە، کە پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم سورەتی نـەجمی دەخوێند، کە گەیشتە ئایەتی سوجدە، سوجدەی بردو، موسـولْمانانیش بـە دوایدا سوجدەیان برد[1]. کەسیش ناتوانێت بلْێ: هەمو ئەوانەی سـوجدەیان برد، دەستنوێژیان هەبوە..

**٣ـ قورئـان هـەڵگرتن:** هـیچ بەلگەیـەکی وامـان نیـە، کـە ڕێ لـە حـەیزدار بگرێـت، کـە دەسـت لـە قورئـان بـدات، هەرچـەندە زۆرینـەی شەرعناسان ڕایان وایە، کە بێ دەستنوێژ دەتوانێت دەستی لێ بدات، بـەڵام کاتێك لە حەیزدایە، ناتوانێت[2]..

**٤ـ کـابرا سـەری لەسـەر رانـی ژنەکەیـەتی کـە لـە حـەیزدایـەو قورئـانیش دەخوێنێـت:** بەلگە ریوایەتەکـەی خـاتو عائیشـەخانە، کـە فەرموی: (كَانَ النَّبِـيُّ يَقْـرَأُ القُـرْآنَ وَرَأسُـهُ فِـي حِجْـرِي وأنَـا حَـائِضٌ)[3] واتـە: پێغەمبەری خوا سەری لەسەر کۆشـم بـو، قورئـانی دەخوێنـدو، منـیش لـە حەیزدابوم..

**٥. ئامادەبونی نوێژی جەژنەکان:** نـەك ڕێگری تێـدا نیـە، بـەڵکو هاندراویشە، پێغەمبەری خوا، صلى الله عليه وسلم هـەمو ئافرەتـانی هـان دەدا، کــە ئامــادەی نوێــژی جەژنــەکان بــن و، لــە ئاهــەنگ وخۆشــیی موسـولْمانانـدا بەشـدار بـن، دەیفـەرمو: (يَخْـرُجُ الْعَوَاتِـقُ وَذَوَاتُ الْخُـدُورِ أَوْ

---

[1] بوخاری (٤٨٦٢).

[2] راوبۆچونی هەردوولامان بە دورو درێژی، لە (توێژینەوەیەك لەسەر دەستنوێژ بۆ قورئان خوێندن ) دا باس کرد..

[3] بوخاری (٧٥٤٩)، موسلیم (٢٤٦).

الْعَوَاتِقُ ذَوَاتُ الْخُدُورِ وَالْحُيَّضُ وَلْيَشْهَدْنَ الْخَيْـرَ وَدَعْوَةَ الْمُؤْمِنِينَ وَيَعْتَـزِلُ الْحُـيَّضُ الْمُصَـلَّى)[١] واتــە: بــا کچــانی پێگەیشــتو و، ژنــی بــە مێــردو، حەیزدارانیش ئامادە بن، بـا بەشـداری خێـرات ودوعـای موسـوڵمانان بـبن، بەڵام با حەیزدارەکان، لە نوێژگاکە کەنارگیر بن ..

**٦. چونە مزگەوت:** لە باسی غوسڵدا، ڕاجوێیی شەرعناسانمان لەسەر ئەم مەسەلەیە هێنایەوەو، بەڵگەی بەرهەڵستکاران و، ڕێدەران خستەڕو. وتیشـمان بەڵگەیـەکی ئاشـکراو ڕاشـکاوی وا نیـە، ڕێـی چـونە مزگـەوت و مانەوە، لە لەشگران و حەیزدار بگرێت..

**٧ـ تێکـەڵاوی مێـردو ژنــی حــەیزدار:** خــواردن و دانیشــتن و تێکەڵاوی مێردوژنـی حـەیزدار، ئەمانـەو هاوشـێوەیان، هـەموی ڕەفتـاری سروشتییەو، حوکمیـان شـیاوێتی پێکەوەبونـە.. لـە پێغەمبـەری پێشـەوای تاك و سەروەرمانەوە صلی الله علیه وسلم، لـەوەش زیـاتر ڕیوایـەت کـراوە، لە سەردەمانێکدا، کە جولەکە (کە ئەهلی کیتاب بون و ڕۆشـنبیری دیـنی و دنیــایی ئــەو ســەردەمە بــون)، هــیچ شــتێکیان لەمانــە، لەگــەڵ ئــافرەتی حــەیزداری خۆیانــدا نــەدەکرد! عائیشــەخان، خــوا لێــی ڕازی بێــت دەگێڕێتەوە: ( كُنْتُ أَشْرَبُ وَأَنَا حَائِضٌ فَأُنَاوِلُهُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَيَضَعُ فَاهُ عَلَى مَوْضِعِ فِي فَيَشْرَبُ،وَأَتَعَرَّقُ الْعَرْقَ وَأَنَا حَـائِضٌ فَأُنَاوِلُـهُ النَّبِـيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَيَضَـعُ فَـاهُ عَلَـى مَوْضِـعِ فِـي )[٢] واتـە: لـە حـەیزدابوم، ئاوم بە دەفرێك دەخواردەوەو، دەمدایە دەست پێغەمبـەری خـوا صـلی الله

---

[١] بوخاری (٣٢٤)، موسلیم (٨٩٠).
[٢] موسلیم (٣٠٠)، ئەبو داود (٢٥٩)، نەسائی (١/٥٦)، ئیبنوماجە (٦٤٣).

علیـه وسـلم، ئـەویش دەمـی دەنـا، بـە شـوێنی دەمـی منـەوەو، ئاوەكـەی دەخـواردەوە.. لـە حـەیزدابوم، كـە قـەپاڵم لـە پارچـە گۆشـتێك دەگـرت و، دەمدایە دەست پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم، ئـەویش گـازی لـەو شوێنە دەگرت، كە من دەمم پێوەنابو..

**٨ . خزمـەتكردنی مێـردی:** ئـەو فەرمودەیـەمان هێنایـەوە، كـە عائیشـەخان خـوا لێـی ڕازی بێـت، دەیگـوت: (كُنْـتُ أُرَجِّـلُ رَأْسَ رَسُـولِ اللَّـهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا حَائِضٌ)[١] واتە: لەو كاتانەی لە حەیزدابوم، سەری پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم، شانە دەكرد..

**٩ . حەیزدارو مێردەكەی لەسەر پێخەفێك دەخەون و دەچنە ژێر پۆشـاكێكەوە:** ئوم سەلەمەخان خوا لێی ڕازی بێت، دەڵێ: (بَيْنَا أَنَا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُضْطَجِعَةٌ فِـي خَمِيصَـةٍ إِذْ حِضْتُ فَانْسَلَلْتُ فَأَخَذْتُ ثِيَابَ حِيضَتِي قَالَ أَنُفِسْتِ[٢] قُلْتُ نَعَمْ فَدَعَانِي فَاضْطَجَعْتُ مَعَهُ فِي الْخَمِيلَـةِ )[٣] واتــە: لــەو كاتــەی لەگــەڵ پێغەمبــەری خــوادا لــە ژێــر خەمیسەیەكدا (جاجمێكی خوری ڕەشە) ڕاكشابوم، كەوتمـە حـەیزەوە، بـە هێواشی لەژێر خەمیسەكە هاتمە دەرێ و، جلوبەرگەكانی تایبەت، بە كاتی حەیزی خۆم كۆكردەوە، پێغەمبەر صلی الله علیـه وسـلم پرسـی: كەوتیتـە حەیزەوە ؟! وتم: بەڵێ، بانگی كردمەوە، ئیتر چومەوە ژێرلێفەكە..

---

[١] بوخاری (٢٩٥)، موسلیم (٢٩٧).

[٢] نُفِسْتِ بە مانای كەوتنە حەیزەوە، نَفِسْتِ بە مانای كەوتە زەیستانیەوە.. فتح الباری / شەرحی فەرمودەی ژمارە (٢٩٤)..

[٣] بوخاری (٢٩٨)، موسلیم (٢٩٦).

ئیمام نەوەوی دەڵێ: بەڵگەی ئەوەیە، کە ڕاکشان و خەوتن لەگەڵ حەیزداردا، لەژێر یەك لێفەدا جائیزە[1]..

★ ★ ★

## خوێنی زەیستانی

**زەیستان:** ئەو ئافرەتەیە، کە منداڵی بوە.

**خوێنی زەیستانی:** بە پێناسەی مەزهەبی حەنەفی وشافیعی: ئەو خوێنەیە، کە لە دوای منداڵ بون، لە پێشی ئافرەت دێت.. بەڵام بە پێناسەی مەزهەبی حەنبەلی: ئەو خوێنەیە بە هۆی منداڵبونەوە، لە پێشی ئافرەت دێت.. بە پێی مەزهەبی مالیکی، ئەو خوێنەیە، کە هاوکات، یان دوای لەدایکبونی منداڵەکە، لە پێشی ئافرەت دێتە دەرەوە[2].

### ١ . کاتی زەیستانی:

### * زەیستانیش وەکو حەیز کاتی دیاری کراوی نیە:

ڕای شەرعناسان لەسەر ئەوە کۆیە،[3] کە هەر کاتێك زەیستان هەستی بە پاك بونەوەی کرد، ئەگەرچی بە ڕۆژێك پێش چلەشی بێت، دەبێت غوسڵ دەرکات و، نوێژو ڕۆژو سەرجێیی خۆی بکات..

---

[1] شرح مسلم (٩٥٤/١).

[2] پێناسەکە کاریگەری لەسەر ئەحکامەکان هەیە، بۆ نمونە: حوکمی ئەو خوێنەی دوو ڕۆژ پێش لە دایکبونی منداڵەکە، لەگەڵ شلەمەنی تردا دێتە دەرەوە، ئایا خوێنی زەیستانییە، یان جۆری ترە.. هەر کامێکیشیان بێت حوکمێکی تایبەتی خۆی هەیە..

[3] ترمزی (٤٢٩/١) نەقڵی کردوە.

كۆتا ماوەیەك، كە زەیستان بۆ پاك بونەوەی، چاوەڕوانی دەكات، چل ڕۆژە، لەبەر ئەمەشە كوردەواری بەو ماوەیان وتوە چلە.. كە چلەی چو، ئیتر غوسڵ دەردەكات و، نوێژو ڕۆژو سەرجێیی خۆی ئاسایی دەكاتەوە.. بەڵگەی ئەمە، ئەو فەرمودەیەی لای ئوم سەلەمە خانە، كە دەڵێ: (كَانَتِ النُّفَسَاءُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عليهِ وَسَلَّمَ تقْعُدُ بَعْدَ نِفَاسِهَا أرْبَعينَ يَوماً أو أرْبَعينَ لَيلَةً)[1] واتە: زەیستانان لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا، صلى الله عليه وسلم بۆ ماوەی چل ڕۆژ، یان چل شەو، چاوەڕێی پاك بونەوەیان دەكرد..

## ٢ . حوكمی زەیستانی وەكو حوكمی حەیزە:

ڕای شەرعناسان لەسەر ئەوەش كۆیە، كە لە هەمو ڕویەكەوە حوكمی شەرعی زەیستانی، وەكو حوكمی شەرعی حەیزە[2]، لە هەرچی حەڵاڵە، یان حەرام، جائیزە، یان مەكروهـ..

★ ★ ★

# خوێنی جاری داوێن ( الإسْتِحَاضَة)

**١ . خوێنی جاری داوێن (ئیستیحازە):** بریتیە لە بەردەوام لێ ڕۆیشتنی خوێن، لە عەورەتی ئافرەتەوە، جگە لە خوێنی حەیزو زەیستانی.. پێی وتراوە جاری، واتە: بەردەوام، چونكە هەر وا بەردەوام دەبێت، تا خاوەنەكەی چاك دەبێتەوە.. دەشێت ئەم جۆرە خوێنە، لەگەڵ

---

[1] ئەبو داود (٣٠٧)، ترمزی (١٣٩)، ئیبنو ماجە، هەندێك لە فەرمودەوانان بە زەعیفیان داناوەو، هەندێكی تریان بە حەسەن، بەڵام فەتوا لەسەر ئەم چلەیەیە..

[2] نیل الاوطار (٢٨٦/١).

حەیزو زەیستانیەکەدا بێت، یان لەوان جودا.. ئەمە خوێنێکی سروشتی، یـان عـادەتی هـەمو ئافرەتـان نیـە، بـەڵکو بـە هـۆی حاڵـەتێکی پشـێوی هۆرمۆنەکانەوەیە..

ئەمە هەر ئەوەیە، کە شەرعناسانی کۆن لە پێناسەیدا گوتویانە: (إنّمَا هو عِرْقٌ) واتە: نەزیفەو بە هۆی دەمارێکەوەیە.

**٢ . حوکمی شەرعی خوێنی جاری داوێن:** کۆڕای شەرعناسانی لەسەرە کە پاکەو رێ لە نوێژو رۆژو سەرجێیی ناگرێت..

**٣ . کاتەکانی خوێنی جاری داوێن (ئیستیحازە):**

**. ئەگەر لە کاتێکی غەیری کاتی حەیزو زەیستانیدا هات:** ئەوە ئاساییەو حوکمە شەرعیەکەی، وەکو حوکمی شەرعی مەزییە، کە لە زەکەری پیاو دێتە دەرەوە، پیسەو شوشتنی دەوێت، نەك غوسڵ دەرکردن.

**ـ ئەگـەر کـاتی دەرکەوتنەکـەی لەگـەڵ کـاتی حـەیز یـان زەیستانیدا تێکەڵ بـو:** ئافرەت لەم دۆخەیدا لـە چوار حاڵەت بـەدەر نیە:

***: سـوڕی حـەیزی مانگانـەی خـۆی دەزانێـت و دەزانێـت چەند رۆژی پێ دەچێت:** ئەمە بە قەدەر ئەو ڕۆژانە چاوەڕوان دەکات ، کە تەواو بو، خۆی بـە پـاك حسێب دەکات، پاشـان غوسـڵ دەردەکات و، دەکەوێتـەوە نوێـژو ڕۆژوو، سـەرجێیی خـۆی، هـەر خوێنێکی لـەوە زیـاتر بینی، بە جـاری داوێـنی حسێب دەکات، نـەك بـە حـەیز.. بەڵگەی ئەمـە، فـەرمودەی سـەحیحی لای عائیشـەخانە، خـوا لێـی ڕازی بێـت، کـە دەگێڕێتـەوە: (إنَّ أمَّ حَبِيبَـةَ سَـأَلَتِ النَّبِـيَّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ عَـنِ الـدَّمِ

فَقَالَتْ عَائِشَةُ فَرَأَيْتُ مِرْكَنَهَا مَلْآنَ دَمًا فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ امْكُثِي قَدْرَ مَا كَانَتْ تَحْبِسُكِ حَيْضَتُكِ ثُمَّ اغْتَسِلِي )[١] واتە: ئوم حەبیبە خوا لێی ڕازی بێت، پرسیاری خوێنی، لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کرد: پێخەفەکەیم بینی پڕ بوە لە خوێن ! پێغەمبەری خواصلی الله علیه وسلم فەرموی: بەقەدەر ئەو ڕۆژانەی حەیزی پێشوت چاوەڕوان کەو، پاشان غوسڵت دەرکەو، نوێژی خۆت بکە..

***: یـان سـوڕی حـەیزی مانگانـەی خـۆی نازانێـت، بـەڵام خوێنی حەیز لە جۆری تر جیا دەکاتەوە:** ئەمـە هـەر، کـە دڵنیـابو خـوێنی حـەیزی وەسـتاوەتەوە، غوسـڵی خـۆی دەردەکـات و، نوێـژی خـۆی دەسـت پـێ دەکاتـەوەو، ئـەو خوێنـە زیـادەی تـر، کـە دەیبینێـت و دەیناسـێتەوە، کـە خـوێنی حـەیز نیـە، بـە خـوێنی جاری داوێـن حسـێب دەکات.. بەڵگەی ئەمیش ئەو فەرمودەیە، کە عائیشەخان خوا لێـی ڕازی بێت، گێڕاویتیەوە: (أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ أَبِي حُبَيْشٍ جَاءَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ إِنِّي امْرَأَةٌ أُسْتَحَاضُ فَلَا أَطْهُرُ أَفَأَدَعُ الصَّلَاةَ قَالَ إِنَّمَا ذَلِكَ عِرْقٌ وَلَيْسَتْ بِالْحَيْضَةِ فَإِذَا أَقْبَلَتِ الْحَيْضَةُ فَدَعِي الصَّلَاةَ وَإِذَا أَدْبَرَتْ فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ ثُمَّ صَلِّي )[٢] واتە: فاتیمەی کچی ئەبو حوبەیش، خـوا لێـی ڕازی بێـت، هاتـە خزمـەت پێغەمبـەری خـوا و، پرسـیاری لێکـرد، وتـی: ئـەی پێغەمبەری خوا، من ئافرەتێکم خوێنی جاری داوێنم هەیە، غوسڵیشی بـۆ دەرناکەم، ئایا واز لە نوێژەکان بهێنم بۆی ؟ فەرموی: نـا، ئـەوە دەمارێکی تـری خوێنـەو، پەیوەنـدی بـە حـەیزەوە نیـە، ئەگـەر حەیزەکـەت هـات،

---

[١] موسلیم (محمد فؤاد عبدلباقی ل ٣٦٤)، ئەبو داود (٢٧٩)، نەسائی (١/١١٩).
[٢] بوخاري (٣٢٧)، موسلیم (٣٦٢).

نوێژەكان مەكە، كە حەیزەكەشت تەواو بو، غوسڵت دەركەو ئاسەواری خوێنەكەت بشۆو، پاشان نوێژەكانت بكە..

*: **یان یەكەمجارە سوڕی حەیزی مانگانەی خۆی دەبینێت و خوێنی حەیز لە جۆری تر جیا ناكاتەوە:** حوكمی ئەمە ئەوەیە، كە بە ئافرەتانی تر قیاس بكرێت، بە تایبەتی خزمانی خۆی، ئەگەر ئەوان لە مانگێكدا بە شێوەیەكی گشتی شەش ،بۆ حەوت ڕۆژ دەكەونە حەیزەوە، ئەوا ئەمیش ئەوەندە حسێب دەكات و، باقیەكەی تری خۆی بە پاك دادەنێت ، غوسڵی خۆی دەردەكات و، نوێژەكانی دەكات.. بەڵگەی ئەمیشیان ئەو فەرمودەیە، كە لە پێغەمبەری خواوە، صلى الله عليه وسلم ڕیوایەت كراوە، كە فاتیمەی كچی جەحش، خوا لێی ڕازی بێت هاتە خزمەتی و، سكاڵای زۆری خوێنی جاری داوێنی خۆی كرد پێی فەرمو: (... إِنَّمَا هَذِهِ رَكْضَةٌ مِنْ رَكَضَاتِ الشَّيْطَانِ ، قَالَ: فَتَحِيضِي سِتَّةَ أَيَّامٍ أَوْ سَبْعَةً فِي عِلْمِ اللَّهِ ثُمَّ اغْتَسِلِي حَتَّى إِذَا رَأَيْتِ أَنَّكِ قَدْ طَهُرْتِ وَاسْتَيْقَنْتِ فَصَلِّي أَرْبَعَةً وَعِشْرِينَ لَيْلَةً وَأَيَّامَهَا وَصُومِي، فَإِنَّ ذَلِكَ يُجْزِيكِ ، وَكَذَلِكَ فَافْعَلِي فِي كُلِّ شَهْرٍ كَمَا تَحِيضُ النِّسَاءُ وَيَطْهُرْنَ لِمِيقَاتِ حَيْضِهِنَّ وَطُهْرِهِنَّ ...)[١] واتە: ئەوە یەكێكە لە تین و فشارەكانی شەیتان، هەر كە هات، تۆ شەش ڕۆژ، یان حەوت شەوی لێ حسێب كە، پاشان غوسڵت دەركەو، كە دڵنیابویت، بیست و چوار شەو حسێب كە، كە نوێژو ڕۆژوی خۆتی تێدا دەكەیت، ئەوەندەشت بەسە، ئیتر هەمو مانگێك هەر وا بكە، هەر وەكو،

---

[١] ئەبو داود (٢٨٧)، ئیمامی شافیعی لە الأم (٥١/١) ئیبنو ماجە (٦٢٢) ترمزی (باب ٩٥) عبدالرزاق (المصنف ١١٢٨) دەشفەرموێ: (إسناده ضعيف ويحسن إذا توبع)، بەڵام شێخی ئەلبانی لە ارواو الغليل (٢٠٥) دا بە حەسەنی ناساندوە.

کە ئافرەتان دەکەونە حەیزەوەو، پاك دەبنەوە، ئاوا بۆحەیزو پاکی خۆیان دەکەن..

***: یان ئافرەت ڕادەو بڕی سوڕی حەیزی مانگانەی خۆی بیرچـوّتەوە و خـوێنی حـەیز لـە خـوێنی جـاری داوێـن جیـا ناکاتـەوە:** شەرعناسـان لـە حـوکمی ئەمـەدا ڕاجـوێن، پەسـەندترینیان ئەوەیە، کە دەڵێن: حوکمی وەکو حوکمی ئەو ئافرەتەیـە، کـە یـەکمجارێتی و تـازە دەکەوێتـە حـەیزەوەو، جۆری خوێنـەکان لێـك ناکاتـەوە.. قیاسـی لەسەر ئافرەتانی دەوروبەری بۆ دەکرێت..

★ ★ ★

## ٤ . ئەحکامەکانی خوێنی جاری داوێن (ئیستیحازە):

١ـ ئەو ئافرەتەی خوێنی جاری داوێنی هەیە، وەکو ئافرەتی تـر پاکـەو، هـیچ حـوکمێکی حـەیزدارو زەیستانی بەسـەردا نادرێـت، وەك لـێ حـەڕام کردن و ڕێ نەدان..

٢ ـ ئەو ئافرەتەی خوێنی جاری داوێـنی هەیـە، بـە کـۆڕای شەرعناسـان وەکو ئافرەتی تر پاکەو، نوێژو ڕۆژوی خۆی دەکات و، قورئـان دەخوێنێـت و، هەڵیدەگرێت و، سوجدەی تیلاوەت و، سوپاسکردن (شوکر) دەبات..

٣ ـ ئـەو ئافرەتـەی خـوێنی جـاری داوێـنی هەیـە، مـەرج نیـە بـۆ هـەمو نوێـژێك، دەسـتنوێژی نـوێ بگرێتـەوە، مـادام دەسـتنوێژی بـە هۆکـاری تـر نەشکا بێت. چونکە وا پێناچێت ئەو حوکمانەی، لەسەر دەستنوێژ گـرتنی

بۆ هەمو نوێژێك هاتوە بەهێز بن و، حوکمی شەرعییان پێ دەرکرێت[١].. بەڵام بۆ ئەوەی لە ڕاجوێیی و جیدالی دەرچێت، باشتر وایە، کە بۆ هەر نوێژێك دەستنوێژ بگرێتەوە.. خۆ ئوم حەبیبەخان خوا لێی ڕازی بێت، خوێنی جاری داوێنی هەبوەو، لە ماڵی پێغەمبەری نازداردا، صلی الله علیه وسلم صلی بوەو، وەکو عائیشەخان دەگێڕێتەوە: حەوت ساڵ بۆ هەر نوێژێك غوسڵێکی دەرکردوە: (أنَّ أمَّ حَبيبَةَ اسْتحِيضَتْ سَبْعَ سِنِينَ.... فكَانَتْ تغْتسِلُ لِكُلِّ صَلَاةٍ)[٢] !! بەڵام وتمان ئەمە، فەرمانێك نیەو بەسەر ئافرەتانەدا درا بێت، کە خوێنی جاری داوێنیان هەیە..

٤ ـ زۆرینەی شەرعناسان[٣] گوتویانە، ئەو ئافرەتەی خوێنی جاری داوێنی هەیە، مێردەکەی دەتوانێت لە غەیری کاتی حەیزو نیفاسیدا، سەرجێیی لەگەڵدا بکات، با خوێنی داوێنیشی بەردەوام بێت..

٥ ـ ئەو ئافرەتەی خوێنی جاری داوێنی هەیە، بۆ ئیعتیکاف بێت، یان بۆ غەیری ئیعتیکاف، دەتوانێت لە مزگەوتدا بمێنێتەوە، بەڵگەش ئەوەیە، کە عائیشەخان خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە: (إعْتكَفَتْ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ امْرَأَةٌ مِنْ أَزْوَاجِهِ مُسْتحَاضَةٌ فكَانَتْ ترَى الْحُمْرَةَ وَالصُّفْرَةَ فرُبَّمَا وَضَعْنا الطَّسْتَ تحْتهَا وَهِيَ تصَلِّي)[٤] واتە: یەکێك لە خێزانە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا، صلی الله علیه وسلم لە مزگەوت، لە خزمەتیدا ئیعتیکافی کردبو، لە ناو تەشتەکەی ژێری (لە شوێنی مانەوەی

---

[١] لە کتێبی شێخ مستەفا العەدەوی: جامع أحكام النساء (٢٣/١) دا توێژینەوە لەسەر زۆرینەیان کراوەو ڕون کراونەتەوە کە بۆچی زەعیفن..
[٢] بوخاری (٣٢٧)، موسلیم (٢٦٣).
[٣] المجموع (٣٧٢/٢)، المغني (٣٣٩/١).
[٤] بوخاری (١٩٣٢).

ئەو خێزانە بەڕێزە، لە ناو مزگەوتەکەدا) خـوێن و زەردبـاویی دەبینـرا..
واتە: ئەوەندەی خوێن لە ژێرەوە لێ دەچۆڕایە ناو تەشتەکەوە !!

ئیمـام نـەوەوی دەڵـێ: کـۆڕای شەرعناسـان لەسـەر ئەوەیـە کـە ئـەو ئافرەتـەی خـوێنی جـاری داوێـنی هەیـەو، لـە ئیعتیکافدایـە، هـەر وەکـو ئافرەتی ترەو پاکە[١]..

★ ★ ★

لێرەدا بە یارمەتی خوای پەروەردگار بەشی پاکژی ـ کە دە بەش بو ـ
کۆتایی هات و بەشی دوایی باسەکانی نوێژە

**إن شاء الله**

---

[١] شرح صحيح مسلم (٦٣١/١).

# لیستی فەرموودەکان

که له بەشی پاکژییدا هاتون به گوێرەی پیتی یەکەمیان ڕێك خراون

(أ) لاپەڕە



(إ) لاپەڕە

(ب) لاپەڕە



(ت) لاپەڕە

(ق) لاپەڕە



(ك) لاپەڕە

(ل) لاپەڕە

(م) لاپەڕە

★ ★ ★

# هەندێك لە سەرچاوەكان

سەرچاوەکانی ئایاتی ئەحکام:
ـ أحكام القرآن، محمد بن عبدالله الاندلسي (ابن العربي) دار الكتب العلميـة ط١ (٤ جزء).
ـ الجامع لأحكام القـرآن، لأبـي عبـدالله محمـد بـن احمـد الانصاري القـرطبي / دار الحديث ـ القاهرة ط٢ ١٤١٦ هـ/١٩٩٦ (١٠ جزء).
ـ تفسير الطبري: جامع البيان عن تأويل لآي القرآن، لأبي جعفـر محمـد بـن جريـر الطبري / مؤسسة الرسالة ط١ ١٤١٥ هـ/ ١٩٩٤ (٢٠ جزء).
ـ تفسـير القيـم لابـن القـيم، جمعـه محمـد أويـس النـدوي / دار الكتـب العلميـة (١ جزء).
ـ أضواء البيان في إيضاح القرآن بالقرآن، محمد أمـين بـن محمـد بـن المختـار الجكـني الشنقيطي / دار الفكر ـ بيروت ١٤١٥ هـ/ ١٩٩٥ (٩ جزء).

سەرچاوەکانی فەرمودەی ئەحکام:
ـ إرواء الغليل في تخريج أحاديث منار السبيل، محمد ناصر الدين الالبـاني / المكتـب الاسلامي لبنان ١٩٨٧ (٩ جزء).
ـ التلخيص الحبيرفي تخريج أحاديث الرافعي الكبير، احمـد بـن علي محمـد الكتـاني العسقلاني/ مؤسسة قرطبة ١٤١٦ هـ/ ١٩٩٥ ط١ (٤ جزء).
ـ تمام المنة في التعليق على فقه السنة، الشيخ محمد ناصرالدين الالباني: دار الرايـة ـ الرياض ط٥ ١٤١٩هـ/ ١٩٩٨ (١ جزء).
ـ توضيح الاحكام من بلوغ المرام، عبدالله بن عبدالرحمن البسّام / مكتبـة النهضة الحديثة ـ مكة المكرمة ط٣ ١٤١٧ هـ/ ١٩٩٧ (٦ جزء).
ـ سبل السلام شرح بلوغ المرام، محمـد بـن اسماعيـل الامـير الـيمني الصـنعاني / دار الفكر ١٤٢٣ هـ/٢٠٠٣ (٤ جزء).
ـ شرح معاني الآثار، ابو جعفر احمد بن محمد بن سلامة الازدي الطحـاوي / عـالم الكتب ـ دار الكتب العلمية بيروت ط١ ١٣٩٩ (٤ جزء).
ـ نصب الراية في تخريج أحاديث الهداية، جمال الدين عبدالله بن يوسـف الزيلعـي / دار الحديث ١٤١٥ هـ / ١٩٩٥ (٦ جزء).

ـ نيل الاوطار، محمد بن علي الشوكاني / دار الحديث ١٤١٣ هـ / ١٩٩٣ ط١ (٨ جزء).
ـ الوجيز في فقه السنة و الكتاب العزيز، عبدالعظيم بن بدوي / دار ابن رجب للنشر القاهرة ط٣ ١٤٢١هـ/٢٠٠١ (١ جزء).

فەرمودەو شەرحەكانی فەرمودە:

ـ تحفة الاحوذي في شرح سنن الترمذي، محمد بن عبدالرحمن بن عبدالرحيم المباركفوري / دار الكتب العلمية (١٠ جزء).
ـ سلسلة الاحاديث الصحيحة و شئ من فقهها و فوائدها، محمد ناصر الدين الألباني/ مكتبة المعارف – الرياض (٧ جزء).
ـ سلسلة الاحاديث الضعيفة، محمد ناصر الدين الالباني / مكتبة المعارف ـ الرياض (١١ جزء).
ـ سنن ابن ماجة، لأبي عبدالله محمد بن يزيد القزويني، المطبوع مع شرح السندي و مصباح الزجاجة للبوصيري ـ تحقيق خليل مأمون شيحا / دار المعرفة ط١ ١٤١٦هـ/ ١٩٩٦.
ـ سنن أبي داود، سليمان بن الاشعث السجستاني الأزدي، ومعه كتاب معالم السنن للخطابي / إعداد عزت عبيد دعّاس وعادل السيد / دار الحديث ط١ ١٣٩٣ هـ/١٩٧٣.
ـ سنن الترمذي (الجامع الصحيح)، أبي عيسى محمد بن عيسى بن سورة ـ تحقيق أحمد محمد شاكر / دار الكتب العلمية.
ـ سنن الدارقطني، علي بن عمر تخريج مجدي بن منصور بن سيد الشورى / دار الكتب العلمية ط١ ١٤٠٧ هـ/ ١٩٩٦.
ـ سنن الدارمي، أبي محمد عبدالله بن عبدالرحمن بن الفضل / دار إحياء السنة النبوية..
ـ السنن الكبرى، لأبي بكر أحمد بن الحسين بن علي البيهيقي وبذيله: الجوهر النقي لعلاء الدين بن علي الشهير بابن التركماني / دار الفكر.
ـ السنن الكبرى، لأبي عبدالرحمن أحمد بن شعيب بن علي النسائي ـ تحقيق الدكتور عبدالغفار سليمان البنداري وسيد كسروي حسن / دار الكتب العلمية ط١ ١٤١١ هـ/ ١٩٩١.

ـ سنن النسائي، أحمد بن شعيب بن علي مطبوع بشرح الحافظ جلال الدين السيوطي ومعه حاشية الإمام السندي ـ تحقيق مكتب تحقيق التراث الاسلامي / دار المعرفة ط٣ ١٤١٤ هـ/١٩٩٤.

ـ شرح صحيح مسلم، لمحي الدين يحيى بن شرف بن مري النوي / مؤسسة قرطبة ط٣ ١٤١٤ هـ/١٩٩٤.

ـ شرح معاني الآثار، لأبي جعفر أحمد بن محمد بن سلامة الطحاوي، ومعه: أماني الأخبار بشرح معاني الآثار ـ تحقيق محمد زهري النجار / دار الكتب العلمية ط٣ ١٤١٦ هـ/١٩٩٦.

ـ صحيح ابن حبان بترتيب ابن بلبان، محمد بن حبان بن أحمد أبو حاتم التميمي البستي ـ تحقيق شعيب الأرنؤوط / مؤسسة الرسالة – بيروت ط٢ ١٤١٤ – ١٩٩٣ (١٨ جزء) .

ـ صحيح ابن خزيمة، للإمام أبي بكر محمد بن اسحق بن خزيمة السلمي النيسابوري ـ تحقيق محمد مصطفى الاعظمي / المكتب الاسلامي ١٤٠٠ هـ/١٩٨٠.

ـ صحيح البخاري (الجامع الصحيح المسند من حديث رسول الله صلى الله عليه وسلم وسننه وأيامه)، أبو عبد الله محمد بن إسماعيل بن إبراهيم بن المغيرة بن بردزبه الجعفي، البخاري / دار الكتب العلمية ط١ ١٤١٢هـ/١٩٩٢.

ـ صحيح الجامع الصغير و زيادته، محمد ناصر الدين الالباني / المكتب الاسلامي ط٣ ١٤٠٨ هـ/١٩٨٨ .

ـ صحيح سنن ابن ماجه، محمد ناصر الدين الالباني / مكتب التربية العربي لدول الخليج الأولى ١٤٠٧هـ

ـ صحيح سنن أبي داود، محمد ناصر الدين الالباني / المكتب الاسلامي ط١ ١٤٠٩هـ / ١٩٨٩.

ـ صحيح سنن الترمذي، محمد ناصر الدين الالباني / مكتب التربية العربي لدول الخليج الأولى ١٤٠٩هـ

ـ صحيح سنن النسائي، محمد ناصر الدين الالباني / مكتب التربية العربي لدول الخليج الأولى ١٤٠٩هـ

ـ صحيح مسلم، ابن الحجاج بن مسليم القشيري النيسابوري ـ تحقيق محمد فؤاد عبدالباقي / دار الحديث ط١ ١٤١٢ هـ/١٩٩١.

ـ ضعيف الجامع الصغير و زيادته، محمد ناصر الدين الالباني / المكتب الاسلامي ط٣ ١٤١٠ هـ/١٩٩٠.

ـ ضعيف سنن ابن ماجه، محمد ناصر الدين الالباني / المكتب الاسلامي ط١ ١٤١٠ هـ/١٩٩٠.

ـ ضعيف سنن أبي داود، محمد ناصر الدين الالباني / المكتب الإسلامي الأولى ١٤١٢هـ / ١٩٩١.

ـ ضعيف سنن الترمذي، محمد ناصر الدين الالباني / المكتب الإسلامي الأولى ١٤١١هـ/ ١٩٩١.

ـ ضعيف سنن النسائي، محمد ناصر الدين الالباني / المكتب الإسلامي الأولى ١٤١١هـ/١٩٩٠.

ـ عمدة القاري شرح صحيح البخاري، بدرالدين العيني / دار الكتب العلمية ـ ٢٠٠٩ (٢٥ جزء).

ـ فتح الباري شرح صحيح البخاري، احمد بن علي بن حجر العسقلاني / دار الكتب العلمية ١٤١٠ هـ/ ١٩٨٩ (١٣ جزء).

ـ شرح السنة، الامام عبدالله بن محمد بن عبدالعزيز بن المرزبان البغوي ـ تحقيق شعيب الارناؤوط / المكتب الاسلامي ـ دمشق ط٢ ١٤١٩٣ هـ/ ١٩٨٣ (١٥ جزء).

ـ شرح النوي على صحيح مسلم، يحيى بن شرف الدين ابو زكريا النوي / دار الخير ١٤١٦ هـ/ ١٩٩٦ (٦ جزء).

ـ عون المعبود في شرح سنن أبي داود، محمد شمس الحق العظيم آبادي/ دار الفكر ١٤١٥هـ/ ١٩٩٥ (١٤ جزء).

ـ فتح الباري بشرح صحيح البخاري، للحافظ أحمد بن علي بن حجر العسقلاني / دار الفكر ط١ ١٤١١ هـ/ ١٩٩٠ (١٤ جزء).

ـ مجمع الزوائد و منبع الفوائد، للحافظ نورالدين علي بن أبي بكر الهيثمي، الحافظ العراقي و ابن حجر / دار الكتاب ط٢ ١٩٦٧.

ـ مسائل الإمام أحمد برواية ابنه عبدالله بن أحمد ـ تحقيق الدكتور علي سليمان المهنا / مكتبة الدار ط١ ١٤٠٦هـ/١٩٨٦.

ـ المستدرك على الصحيحين، للحافظ أبي عبدالله محمد بن عبدالله الحاكم / دار الحرمين للطباعة ط١ ١٤١٧ هـ/١٩٩٧.

ـ مسند الإمام أحمد بن حنبل الشيباني ـ تحقيق الشيخ أحمد شاكر / المكتب الاسلامي ١٤١٦ هـ/١٩٩٥ (٥٠ جزء).

ـ مسند الشافعي، لعبدالرحمن بن سليمان (١٩٧٥ حديثا يرويه عن شيخه الامام الشافعي).

مشكاة المصابيح، البغوي والتبريزي ـ تحقيق الشيخ الالباني / المكتب الاسلامي ط٣ ١٤١٥ هـ/ ١٩٨٥ (٣ جزء).
ـ المصنف، للحافظ أبي بكر عبدالرزاق بن همام الصنعاني ـ تحقيق حبيب الرحمن الاعظمي / المكتب الاسلامي ١٤٠٣ هـ/ ١٩٨٣ (١١ جزء).
ـ المصنف، (الكتاب المصنف في الأحاديث والآثار) للحافظ عبدالله بن محمد ابن ابي شيبة ابو بكر ـ تحقيق عامر العمري الاعظمي / دار الفكر ١٤١٤هـ/ ١٩٩٤ (٨ جزء).
ـ معالم السنن شرح سنن أبي داود، لأبي سليمان حمد بن محمد الخطابي البستي ـ تحقيق عبدالسلام عبدالشافي محمد / دار الكتب العلمية ط١ ١٤١١ هـ/١٩٩١.
ـ معجم الطبراني الكبير، ابو القاسم سليمان بن أحمد بن أيوب / دار المعرفة (٢٠ جزء).
الموطأ، للإمام مالك بن أنس ـ تحقيق و تخريج خليل مأمون شيحا / دار المعرفة ط١ ١٤١٨ هـ/ ١٩٩٨.

مەزهەبی حەنەفی:
الاختيار لتقليل المحتار، عبدالله بن محمود بن مودود الحنفي / دار المعرفة للطباعة ط٢ ٢٠٠٢ (١ جزء).
ـ البحر الرائق شرح كنز الدقائق، زين الدين بن ابراهيم (ابن نجيم) / دار الكتاب الاسلامي ط٢ (٨ جزء).
ـ بدائع الصنائع في ترتيب الشرائع، ابوبكر مسعود احمد الكاساني / دار الكتب العلمية ١٤٠٦ هـم ١٩٨٦ ط٢ (٧ جزء).
ـ البناية شرح الهداية، بدرالدين العيني / دار الكتب العلمية ـ ٢٠٠٠ (١٣جزء)
ـ رد المحتار على الدر المختار، محمد امين بن عمر بن عابدين / دار الكتب العلمية ١٤١٢ هـ/ ١٩٩٢ (٦ جزء).
ـ فتح القدير، كمال الدين بن عبدالواحد بن الهمام / دار الفكر (١٠ جزء).
ـ المبسوط، لشمس الدين أبي بكر محمد بن أحمد بت أبي سهل السَرَخسِي / دار الكتب العلمية ط١ ١٤١٤ هـ/١٩٩٣.
ـ مجمع الانهر في شرح ملتقى الابحر، عبدالرحمن بن الشيخ محمد بن سليمان؛ (ملتقى الابحر، ابراهيم بن محمد الحلبي الحنفي (دەقی کورتە بۆ لەبەر کردن) تحقيق خليل عمران المنصور / دار الكتب العلمية ١٤١٩ هـ/ ١٩٩٨ (٤ جزء).

مەزهەبی مالیکی:

- جواهر الاكليل شرح مختصر الخليل، صالح الآبي الازهري / المكتبة الثقافية ط٢ ١٩٩٧ (٢ جزء).

- حاشية الدسوقي على الشرح الكبير، لشمس الدين محمد بن عرفة الدسوقي / دار الفكر..

- حاشية الرهوني على شرح الزرقاني المختصر، محمد بن عبدالباقي الزرقاني / دار الفكر ط١ (٨ جزء).

- الذخيرة، لشهاب الدين أحمد بن إدريس القرافي - تحقيق سعيد أعراب / دارالغرب الاسلامي.

- القوانين الفقهية، ابن الجزي الكلبي الغرناطي / دار الفكر.

- الكافي في فقه أهل المدينة، ابن عبدالبر المالكي / دار الكتب العلمية ١٩٨٨ (١جزء).

- المدونة الكبرى، للإمام مالك بن أنس الاشجعي، رواية سحنون بن سعيد التنوخي - تحقيق أحمد بن عبدالسلام / دار الكتب العلمية ١٤١٥ هـ/ ١٩٩٥ ط١٨ (٤ جزء).

- منح الجليل شرح مختصر العلامة خليل، محمد بن احمد بن محمد (عليش) / دارالفكر ١٤٠٩هـ / ١٩٨٩ (٩ جزء).

- مواهب الجليل في شرح مختصر خليل، محمد بن محمد بن عبدالرحمن (حطاب) / دارالفكر ط٢ ١٤١٢ هـ/ ١٩٩٢ (٦ جزء).

- حاشية الدسوقي على الشرح الكبير، محمد بن احمد بن عرفة الدسوقي / دار احياء الكتب العربية (٤ جزء).

مەزهەبی شافیعی:

- الأم، لأبي عبدالله محمد بن إدريس الشافعي - تحقيق محمد مطرجي / دار الكتب العلمية ط١ ١٤١٣ هـ/١٩٩٩ (٨ جزء).

- أسنى المطالب شرح روض الطالب، زكريا بن محمد بن زكريا الأنصاري، زين الدين أبو يحيى السنيكي (المتوفى: ٩٢٦هـ).

- تحفة المحتاج في شرح المنهاج، احمد بن محمد بن علي بن حجر الهيتمي / دار احياء التراث العربي (١٠ جزء).

- الطهور، ابن عبيد القاسم بن سلام الهروي - تحقيق محمد حسن اسماعيل الشافعي / دار الكتب العلمية ١٩٩٦ (١ جزء).

ـ المجموع شرح المهذب، لأبي زكريا يحيى بن شرف النوي ـ تحقيق محمد نجيب المطيعي / مطبعة المنيرية (١١ جزء)..

ـ معرفةالسنن والآثار عن الامام أبي عبدالله محمد بن إدريس الشافعي، لأبي بكر أحمد بن الحسين بن علي البيهيقي ـ تحقيق سيد كسروي حسن / دار الكتب العلمية ط١ ١٤١٢ هـ/١٩٩١. (٩ جزء).

ـ مغني المحتاج الى معرفة ألفاظ المنهاج، للشيخ محمد بن أحمد الخطيب الشربيني / دار الفكر ١٣٩٨ هـ/ ١٩٩٢. (٤ جزء).

ـ المهذب في فقه الامام الشافعي، ابو اسحق ابراهيم بن علي الشيرازي ـ تحقيق عادل أحمد عبدالموجود والشيخ علي محمد عوض / دار المعرفة ط١ ١٤٢٤ هـ/٢٠٠٣ (٣ جزء).

ـ نهاية المحتاج الى شرح المنهاج، محمد بن شهاب الدين الرملي / دار الفكر ١٤٠٣ هـ / ١٩٨٤ (٨ جزء).

مەزهەبی حەنبەلی:

ـ الإنصاف في معرفة الراجح من الخلاف على مذهب المبجل أحمد بن حنبل، علي بن سليمان المرداوي/ دار إحياء التراث العربي بلا تاريخ (١٢ جزء).

ـ الفروع، محمد بن مفلح بن محمد المقدسي / عالم الكتب ١٤٠٥ هـ/ ١٩٨٥ ط٤ (٦ جزء).

ـ كشاف القناع عن متن الاقناع، منصور بن يونس البهوتي ـ تحقيق ابراهيم بن أحمد بن عبدالحميد / دار الفكر ١٤٠٢ هـ / ١٩٨٢ (٦ جزء).

ـ الشرح الممتع على زاد المستقنع، محمد بن صالح العثيمين / دار ابن المديني / الجزائر ط١ ١٤٢٦ هـ/ ٢٠٠٥..(٦ جزء).

ـ شرح منتهى الارادات ، منصور بن يونس البهوتي / عالم الكتب (٣ جزء).

مەزهەبی زاهیری:

ـ المحلى بالآثار، علي بن احمد بن سعيد بن حزم الانلسي الظاهري / دار الفكر (١٢ جزء).

سەرچاوەكانی بەراوردی مەزهەبەكان:

ـ الإجماع، لأبي بكر محمد بن ابراهيم بن المنذر النيسابوري ت ٣١٨ هـ، تحقيق أبي حماد صغير أحمد بن محمد حنيف /ط دار طيبة، الاولى ١٤٠٢ هـ / ١٩٨٢ م.

- الاختيارات الفقهية من فتاوى شيخ الاسلام ابن تيمية، لعلاءالدين أبي الحسن علي بن محمد بن عباس البعلي الدمشقي - تحقيق محمد حامد الفقي / مطبعة السنة المحمدية ١٣٦٩هـ/ ١٩٥٠.
- الاستذكار الجامع لمذاهب فقهاء الامصار، ابو عمر يوسف بن عبدالله بن محمد بن عبدالبر / دار قتيبة / دار الوعي ١٤١٤ هـ/ ١٩٩٣ (٣٠ جزء).
- الإشراف على مذاهب العلماء، ابن المنذر / تحقيق الدكتور أبو حماد صغير أحمد الانصاري / دار المدينة للطباعة و النشر ط١ ١٤٢٥ هـ/ ٢٠٠٤.
- البحر الزخار الجامع لمذاهب علماء الامصار، صالح بن مهدي المقبلب / مؤسسة الرسالة (اليمن) ١٤٠٨ هـ/ ١٩٨٨.
- بداية المجتهد و نهاية المقتصد، ابو الوليد محمد بن احمد بن محمد بن رشد القرطبي / دار ابن حزم ١٤١٠ هـ/١٩٩٠ (١ جزء).
- زاد المعاد في هدي خير العباد، لشمس الدين محمد بن أبي بكر الشهير بابن القيم الجوزية - تحقيق شعيب الارناؤوط / مؤسسة الرسالة ط٣ ١٤١٨هـ/ ١٩٩٨ (٦ جزء).
- الروضة الندية شرح الدرر البهية، صديق حسن خان القنوجي - تحقيق أحمد شمس الدين / دار الكتب العلمية (٢ جزء)..
- السيل الجرار المتدفق على حدائق الأزهار، محمد بن علي الشوكاني - تحقيق محمود ابراهيم زايد / دار الكتب العلمية ط١ ١٤٠٥ هـ / ١٩٨٥ (٤ جزء).
- شرح العمدة في الفقه، تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم بن تيمية الحراني / مكتبة العبيكان — الرياض ط١ ١٤١٣.
- صحيح فقه السنة وأدلته و توضيح مذاهب الائمة، ابو مالك كمال بن السيد سالم / المكتبة التوفيقية - القاهرة (٤ جزء).
- الفقه الاسلامي و أدلته، الدكتور وهبة الزحيلي، مؤسسة الرسالة - دمشق ط١٢ (١٠ جزء).
- فقه السنة، السيد سابق / الفتح للاعلام العربي ط١ - ١٤٢٥هـ/٢٠٠٤ (١ جزء ١١٣٤ صفحة).
- فقه العبادات، الدكتور علي أحمد القليصي / مكتبة الارشاد - اليمن ط٣ ١٤١٤هـ/١٩٩٤ (١ جزء).
- المجموع، محي الدين بن شرف النوي / دار النشر: دار الفكر، بيروت، ١٩٩٦-١٤١٧، الطبعة: الأولى (٢٠ جزء).

ـ مراتب الاجماع، علي بن احمد بن سعيد بن حزم الاندلسي / دار الكتب العلمية ـ بيروت.
ـ المُغني، موفق الدين عبدالله بن احمد بن قدامة المقدسي / دار احياء التراث العربي ١٤٠٥ هـ / ١٩٨٥ طا (١٠ جزء).

سەرچاوەکانی فەتوا:
ـ الفتاوى الكبرى، تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم بن تيمية الحراني ـ تحقيق محمد عبدالقادر عطا - مصطفى عبدالقادر عطا / دار الكتب العلمية طا ١٤٠٨هـ - ١٩٨٧ (٦ جزء).
ـ مجموع الفتاوى، تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم بن تيمية / مجمع الملك فهد ١٤١٦ هـ/ ١٩٩٥ (٣٧ جزء).

ئوسوڵی فیقهـ:
ـ شرح الكوكب المنير، تقي الدين ابو البقاء الفتوحي / السنة المحمدية (١ جزء).
ـ القواعد النورانية الفقهية، تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم بن تيمية الحراني ـ تحقيق محمد حامد الفقي / مكتبة السنة المحمدية ـ القاهرة طا ١٣٧٠هـ/١٩٥١م (١ جزء).
ـ المستصفى، محمد بن محمد بن محمد بن حامد الغزالي / دار الكتب العلمية ١٤١٣ هـ/ ١٩٩٣ طا (١ جزء).

ڕێساکا فیقهیەکان:
ـ الاشباه و النظائر، عبدالرحمن بن أبي بكر بن محمد السيوطي / دار الكتب العلمية ١٤٠٣هـ/ ١٩٨٣ طا (١ جزء).
ـ قواعد الأحكام في مصالح الانام، عزالدين عبدالعزيز بن عبدالسلام / دار الكتب العلمية (٢ جزء).

سەرچاوەی بابەتی گشتی:
ـ الآداب، لأبي بكر أحمد بن الحسين بن علي البيهيقي ت ٤٥٩ هـ تحقيق محمد عبدالقادر احمد عطا ـ ط دار الكتب العلمية، الاولى ١٤٠٦ هـ / ١٩٨٦ م.

ـ الآداب الشرعية والمنح المرعية، لشمس الدين أبي عبدالله محمد بن مفلح المقدسي الحنبلي ت ٧٦٣ هـ، تخريج و تعليق أبي معاذ أيمن بن عارف الدمشقي / ط دار الكتب العلمية، الاولى ١٤١٧ هـ / ١٩٩٦م.

سەرچاوەکانی زمانی عەرەبی

ـ لسان العرب، لأبي الفضل جمال الدين محمد بن مكرم ابن منظور الافريقي المصري / دار الفكر١٤١٤هـ/١٩٩٤ (١٥ جزء).

ـ معجم مقاييس اللغة،لأبي الحسين أحمد بن فارس بن زكريا / دار الجيل (٦ جزء).

ـ القاموس المحيط، مجدالدين محمد بن يعقوب الفيروزابادي / مؤسسة الرسالة ١٤٠٧ هـ/ ١٩٨٧ (١ جزء).

# باسی یەکەم

# گرنگی نوێژو حوکمی نوێژنەکەر

- بابەتی یەکەم: گرنگی نوێژ
- بابەتی دووەم: حوکمی نوێژنەکەر
  - ⋆ حوکمی دنیایی نوێژنەکەر
  - ⋆ نوێژ لەسەر کێ فەرزە؟

# بابەتی یەکەم

## گرنگی نوێژ (أهمية الصَّلاة)

**نوێـژ:** نوێـژ زاراوەیـەکی کوردیـە کـە بەرامبـەر (الصلاة) ی عـەرەبی دانراوە. (الصلاة) لە زمانەوانی عارەبیدا بە مانای دوعا بـۆ کـردن و نـزاو پاڕانەوەیـە، خـوای گـەورە بـەو مانایـە دەفـەرموێ: ﴿وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ﴾ التوبـە/١٠٣ واتـە: دوعایـان بـۆ بکـەو بۆیـان بپـاڕێرەوە چـونکە دوعاو پاڕانەوەکەی تۆ سوکناییان دەدات..

نوێژ لە هەردوو زمانەکەدا لە رووی شەرعییەوە: بریتیە لـە پەرسـتنی خوای گەورە بە چـەند مـەرجێك و بـە چـەند گوفتـارو رەفتارێـك کـە بـە تەکبیرەی ئیحرام[١] دەست پێ دەکەن و بە سەلام دانەوە کۆتاییان پـێ دێـت، ئەمە لەگەڵ نییەت هێناندا دەبن..

**پلەو پایەی نوێژ:** نوێژ لە دوای شایەتمان (أشْهَدُ أنْ لا إلَهَ إلا اللهُ و أشهَدُ أنَّ مُحَمَّدَاً رَسولُ اللهِ) گـەورەترین و گـرنگترین سـیمای ئیسـلامەتیە، یەکێکـە لـە روکنـەکانی ئیسـلام، پایـەی هـەرە سـەرەکی ئیسـلامە، ئـەوی جێبەجێی ناکات ئەو پایە سەرەکیەی بەسەر خۆیدا رماندووە!

١ ـ ئیبنو عومەر خوا لێیان رازی بێـت دەگێڕێتـەوە کـە پێغەمبـەری خوا صلى الله عليه و سلم فەرموویەتی: (بُنِيَ الإِسْلاَمُ عَلَى خَمْسٍ شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدَاً رَسُولُ اللَّهِ وَإِقَامِ الصَّلاَةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ وَالْحَـجِّ

---

[١] تەکبیرەی ئیحرام: واتە: ووتنی الله الكبر لە سەرەتای دەسپێکردنی نوێژەکە..

وَصَوْمِ رَمَضَانَ)[١] واتە: ئیسلام لەسەر پێنج پایە دامەزراوە: شایەتیدان كە تەنها الله خوایەو شایانی پەرستنە، وە شایەتی دان كە محمد صلی الله علیه و سلم نێرراوی خوای گەورەیە، هەروەها نوێژ كردن و زەكات دان و رۆژوو گرتن و حەج كردن..

٢ ـ تەلحەی كوڕی عوبەیدوالله دەگێڕێتەوە كە (جاءَ رَجُلٌ إلى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عليهِ وَسلَّمَ يَسأَلُ عَنْ الإسلامِ، فَقَالَ رَسولُ الله صَلَّى اللهُ عليهِ وَسلَّمَ: خَمْسُ صَلَواتٍ فِي الْيَومِ وَاللَّيلَةِ، فَقَالَ هَلْ عَلَيَّ غَيرُهُنَّ؟ قَالَ لا، إلا أنْ تَطوَّعَ وَصِيامُ شَهْرِ رمضانَ فقالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيرُهُ؟ فقالَ: لا إلا أنْ تَطوَّعَ وَذَكَرَ لَهُ رَسولُ الله صَلَّى اللهُ عليهِ وَسلَّمَ الزَّكَاةَ فقَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيرُهَا؟ قَالَ لا إلا أنْ تَطوَّعَ، قَالَ فأَدْبَرَ الرَّجُلُ وَهوَ يَقولُ: واللهِ لا أَزِيدُ عَلَى هذَا وَلا أَنْقِصُ مِنْهُ فَقَالَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عليهِ وَسلَّمَ: أَفلَحَ إنْ صَدَقَ) هەر شەش زاناكانی حەدیس جگە لە ترمزی گێڕاویانەتەوە[٢].

واتە: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و پرسی:

---

[١] بوخاري (٨)، موسليم (١٦).

[٢] حەدیسەكە لە بوخاریدا لە / كتاب الايمانه ژمارە (٤٤) و لە موسلیمشدا بەم شێوەیە: عَنْ أَنَسِ بنِ مالِكٍ قَالَ: نُهِينَا أنْ نَسْأَلَ رَسولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ عَنْ شَيءٍ فَكَانَ يُعْجِبُنَا أنْ يَجِيءَ الرَّجُلُ مِنْ أَهْلِ البَادِيَةِ الْعَاقِلُ فَيَسْأَلُهُ وَنَحْنُ نَسْمَعُ فَجَاءَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ البَادِيَةِ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ أَتَانَا رَسُولُكَ فَزَعَمَ لَنَا أَنَّكَ تَزْعَمُ أَنَّ اللهَ أَرْسَلَكَ قَالَ: صَدَقَ قَالَ: فَمَنْ خَلَقَ السَّمَاءَ؟ قَالَ: اللهُ، قَالَ: فَمَنْ خَلَقَ الأَرْضَ؟ قَالَ اللهُ، قَالَ: فَمَنْ نَصَبَ هذهِ الْجِبَالَ وَجَعَلَ فِيهَا مَا جَعَلَ؟ قَالَ: اللهُ، قَالَ: فَبِالَّذِي خَلَقَ السَّمَاءَ وَخَلَقَ الأَرْضَ وَنَصَبَ هذهِ الْجِبَالَ آللهُ أَرْسَلَكَ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: وَزَعَمَ رَسُولُكَ أَنَّ عَلَيْنَا خَمْسُ صَلَواتٍ فِي يَومِنَا وَلَيلَتِنَا. قَالَ: صَدَقَ، قَالَ: فَبِالَّذِي أَرْسَلَكَ آللهُ أَمَرَكَ بِهَذَا؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: وَزَعَمَ رَسُولُكَ أَنَّ عَلَيْنَا زَكَاةً فِي أَمْوالِنَا. قَالَ: صَدَقَ. قَالَ: فَبِالذي أَرْسَلَكَ آللهُ أَمَرَكَ بِهَذَا؟ قَالَ: نَعَم. قَالَ: وَزَعَمَ رَسُولُكَ أَنَّ عَلَيْنَا صَومَ شَهْرِ رَمَضَانَ فِي سَنَتِنَا. قَالَ: صَدَقَ. قَالَ: فَبِالَّذِي أَرْسَلَكَ آللهُ أَمَرَكَ بِهَذا؟ قَالَ: نَعَم. قَالَ: وَزَعَمَ رَسُولُكَ أَنَّ عَلَيْنَا حَجُّ الْبَيتِ مَنْ اسْتَطَاعَ إِلَيهِ سَبيلاً. قَالَ: صَدَقَ. قَالَ: ثُمَّ وَلَّى. قَالَ: وَالَّذي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لا أَزِيدُ عَلَيهِنَّ وَلا أَنْقُصُ مِنْهُ. فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ: (لَئِنْ صَدَقَ لَيَدْخُلَنَّ الْجَنَّةَ).

ئیسلام چییە؟ ئەویش فەرمووی: ئیسلام بریتییە لە پێنج نوێژ لە شەوو رۆژێکدا. کابرا ووتی: غەیری ئەوە هیچی ترم لەسەر نییە؟ فەرمووی : نا، مەگەر خۆت لە زیادە هی تر بکەیت. ئیتر کابرا رۆیشت، بە دەم رۆیشتنەوە هەر دەیووت: نە لەوە زیاتر دەکەم نە لێشی کەم دەکەم. پێغەمبەریش صلی الله علیە وسلم فەرمووی: ئەگەر راست بکات سەرکەوتوو دەبێت، یان ئەگەر راست بکات دەچێتە بەهەشتەوە یان گەر راست کات خۆی وباوکیشی سەرکەوتوو دەبن.. کەوابوو ئەمە وەکو حافز ئیبنو حەجەر لە شەرحیدا دەڵێ: (بەلگەی فەرزبوونی ئەو نوێژانەیە..) ئەم پێنج نوێژەکە خوای گەورە فەرزی کردوون وازلێهێنانیان نیە، ئەوی وازیان لێ دەهێنێت ئیسلامەتی پێوە نامێنێت..

٣ ـ ئیسلام زۆر دژی نوێژنەکەر وەستاوەتەوە، تەنانەت پێغەمبەری بەبەزەیی صلی الله علیە و سلم دەربارەی نوێژنەکەر فەرموویەتی: (إنَّ بَينَ الرَّجُلِ وَبَينَ الشّرْكِ والكُفْرِ تـرْكُ الصَّلاةِ)[١] واتە: لە نێوان کابراو شیرك و کوفردا هەر وەل کردنی نوێژەکان هەیە.. هەر کەسێك نوێژەکانی واز لێهێنا ئەوە چۆتە ریزی موشریکان و کافران.. بۆیە لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ: (العَهْدُ الذي بَيْنَنا و بَينَهُمْ الصَّلاةُ، فَمَنْ تركَهَا فقَدْ كفَرَ)[٢] واتە: ئەو پەیمانەی نێوان ئێمەو ئەوان نوێژە، هەر کەسێك نوێژی واز لێ هێنا ئەوە کافرە..

عبداللەی کوڕی شەقیق کە یەکێکە لە پێشەوایانی تابعین و

---

[١] موسلیم (٩٨٧)، ئەبو داوود (١٦٥٨) نەسائی (٢٣١/١).

[٢] ترمزی (٢٦٢١)، نەسائی (٢٣١)، ئیبنوماجە (١٠٧٩)..

قوتابیــانی یــاوەرانی پێغەمبــەر صــلی الله علیــه و ســلم دەیفــەرموو: یاوەران هیچ شتێکیان وەکو وازلێهێنانی نوێژ بە کوفر نەدەزانی[1]..

٣ ـ نوێـژ کۆڵەکـەی دینـە، بـەو نـەبێت دینەکـە راناگیرێـت. لەبـەر راگرتنی کۆشکی دینەکەشە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیـه و سـلم نوێژەکەی بە کۆڵەکە چوواندووە وەك دەفەرموێ: (رَأسُ الـأَمْرِ الإِسـْلَامُ، وَعَمُـودُهُ الصَّـلَاةُ، وَذِرْوَةُ سَـنَامِهِ الْجِهَـادُ فِـي سَـبِيلِ اللهِ)[2] واتــە: رۆحـی کاروبـار ئیسـلامەکەیە، کۆڵەکـەی ئـەویش نوێـژە، جیهـاد لـە پێنـاوی خواشدا لوتکەی هەرە بەرزێتی..

٤ ـ نوێـژ یەکـەمین فەرمانێکـە کـە خـوای گـەورە لـە رۆژی دواییـدا موسوڵمانی لەسەر موحاسەبە دەکات.. پێغەمبەری خوا صلی الله علیـه و سلم دەفەرموێ: (أَوَّلُ مَـا يُحَاسَـبُ بـِهِ الْعَبْـدُ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ الصـَلَاةُ، فَـإِنْ صَلَحَتْ فَقَدْ أَفْلَحَ وَنَجَحَ، وَإِنْ فَسَدَتْ فَقَدْ خَابَ وَخَسِرَ)[3] واتە: یەکەم شت لە رۆژی قیامەتـدا عەبـدی لەسـەر موحاسـەبە دەکرێـت نوێـژە، ئەگـەر نوێـژەکانی بـاش بـوون، ئـەوە هـەموو کـارو کردەوەکـانی تریشـی بـاش دەبن، ئەگەر نوێژەکانی خراپ بوون، ئەوە داماوو هەناسەساردەو زیانی لـێ کـەوتووە.. ریوایـەتی تـری ئـەم فەرموودەیـە دەفـەرموێ: (أَوَّلُ مَـا يُحَاسَبُ عَليهِ الْعَبْدُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ الصَلَاةُ، فَإِنْ صَلَحَتْ صَلُحَ سـائِرُ عَمَلِـهِ، و

---

[1] ترمزی گێڕاوێتیەوە (٢٦٢٢)، هەروەها ئیبنونەسر لەکتێبی (تعظیم قدر الصلاة/ ل ٩٤٨) بە توێژینەوەی کەمال ئیبنوالسەید سالم.

[2] ترمزی (٢٦١٦)، ئیبنو ماجە (٢٩٧٣) هەروەها الحاکم لە (المستدرك علی الصحیحین /٢٤٥٥) دەربارەشی فەرموویەتی: (هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ وَلَمْ يُخَرِجاهُ).

[3] ترمزی (السنن ٤١٣)، نەسائی (السنن ٤٦٦). بەیهیقی لە السُنن الکبری (٣٩٠٧)، الحاکم لە: المستدرك علی الصحیحین (١٠٠٤).. شێخی ئەلبانی لە صحیح سنن الترمذي (٤١٣) بە سەحیحی داناوە.

إنْ فَسَدَتْ فَسَدَ سائِرُ عَمَلِهِ)[١] واتە: یەکەم شت لە ڕۆژی قیامەتدا عەبدی لەسەر موحاسەبە دەکرێت نوێژە، ئەگەر نوێژەکانی باش بوون، ئەوە هەموو کارو کردەوەکانی تریشی باش دەبن، ئەگەر نوێژەکانی خراپ بوون، ئەوە هەموو کاروکردەوەکانی تریشی خراپ دەبن..

٥ ـ نوێژ مایەی چاوڕۆشنی پێغەمبەری خوا بووە صلی الله علیه و سلم، وەك دەفەرموێ: (وَجُعِلَتْ قُرَّةُ عَينِي فِي الصَّلاةِ)[٢] واتە: چاوڕۆشنیم بە نوێژەکانەوە بەستراوەتەوە..

٦ ـ نوێژ لە کۆتا وەسێتی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه و سلم لە ساتی ئەخیری ژیانی دونیایدا هەر دەیفەرموو: نوێژەکانتان، نوێژەکانتان. وەکو لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە: (الصَّلاَةَ الصَّلاَةَ وما مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ)[٣] واتە نوێژ نوێژ، هەروەها ئەوانەی خراونەتە بەر دەستتان.

---

[١] تەبەرانی لە ڕێی ئەنەسەوە گێڕاوێتیەوە خوا لێی ڕازی بێت، شێخی ئەلبانی ڕەحمەتی لە تمام المنة‌ا (ل ١٣٧) بە سەحیحی داناوە هەروەها لە توێژینەوەی معجم الاوسط / للطبراني (١٠٠/٢) هەروەها لە سلسلة الاحاديث الصحيحة (١٣٥٨).

[٢] نەسائی بە شەرحی سیوتی (٣٩٣٩)، الحاكم لە: المستدرك على الصحيحين (٢٧٢٣) فەرموشیەتی: (هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ). تەبەرانی لە ڕێی موغیرەی کوڕی شوعبەوە خوا لێی ڕازی بێت، شێخی ئەلبانی بە سەحیحی داناوە، بڕوانە (صحيح الجامع الصغير (٣٠٩٨).

[٣] ئەحمەد (١١٧/٣)، ئەبوداود (٥١٥٦)، ئیبنوماجە (٢٦٩٨). لە فەرموودەی سەیدنا عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە خوا لێی ڕازی بێت، هەروەها زیائی مەقدیسی لە الأحاديث المختارة (١٥٨/٦) هێناوێتیەوەو، بوسەیری لە الزوائد (٥٥/٢) دا دەفەرموێ (هذا إسناد صحيح على شرط الشيخين). حافز ئیبنو حەجەریش لە الفتح (٣٦١/٥) ە، وئەلبانی لە (ارواء الغليل ٢١٧٨)بە سەحیحیان ناساندووە.

٧ ـ نوێژ تەنها خواپەرستیەكە كە نابێ موسوڵمان لە هیچ شوێن و كات و بارودۆخێكدا وازی لێ بهێنێت، نە لە كاتی لەش ساغیی و نە لە كاتی نەخۆشیدا، نە لە كاتی سەفەرو نە لە نیشتەجێییدا، نە لە كاتی هێمنی و نە لە كاتی ترس و بیمدا.. دەبێ لە ماوەی هەر هەموو ژیانیدا ئاوا پێوەی پابەند بێت، تەنانەت ئەگەر بە پێوە پێی نەكرا بە دانیشتنانەوە دەیكات، ئەگەر نەیتوانی بە ركشانەوە، ئەگەر نەیتوانی هەر بە قسە، ئەگەر نەیتوانی بە ئاماژە، ئەگەر نەیتوانی دەبێ لە دڵی خۆیدا هەر بیخوێنێت!!

٨ ـ لە قورئانی پیرۆزدا دەبینیت كە نوێژ بەردەوام لەگەڵ پەرستنەكانی تردا هاوشانە، وەكو زەكاتدان: ﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ البقره/١١٠ لەگەڵ زیكری خوا: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ﴾ طه/١٤ واتە: نوێژەكانت بۆ یادكردنی بەردەوامی من بكە. یان لەگەڵ سەبرگرتن: ﴿وَٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِ﴾ البقرة/٤٥ واتە خۆتان بە نوێژو ئارامگریی بەهێز كەن.. دەیان مەیدانی تر.

٩ ـ ئەوەندە بەسە بۆ دژواریی نوێژو قەدرو رێزی لای خوای گەورە كە دۆڵی وەیلی ناو دۆزەخ بكاتە سزای ئەو كەسانەی لە نوێژەكانیان غافڵن! وەك دەفەرموێ: ﴿فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ ٤ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ﴾ الماعون/٤ـ٥ واتە: وەیل بۆ ئەو كەسانەی لە نوێژەكانیان غافڵن..

١٠ ـ نوێژ هەندێك سیفەت و ئیمتیازی تایبەتی هەیە كە لە خواپەرستیەكانی تردا نین.. وەكو:

أ ـ نوێژ خوای گەورە خۆی لە شەوی میعراجدا لەسەر پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم وئوممەتەكەی فەرزی كردووە.

ب ـ نوێژ لە هەموو فەرزێكی تر زیاتر لە قورئاندا باس كراوە.

ج ـ نوێژ یەكەمین خواپەرستی بوو كەلەسەر موسوڵمانان فەرز كرا.

د ـ نوێژ فەرزێكە دەبێت لە شەووڕۆژێكدا پێنج جار بكرێت، هیچ خواپەرستیەكی تر وا نیە..

## نوێژ دوو بەشە: نوێژی فەرزو نوێژی سووننەت:

ـ **یەكەم: نوێژی فەرز:** ئەو نوێژەیە ئەگەر موسوڵمانێك بە ئەنقەست نەیكرد ئەوە لەسەری تاوانبار دەبێت، چونكە سەرپێچی فەرمانی خوای گەورەی تێدا كردووە.. ئەمیش دوو جۆرە:

* **نوێژی فەرزی عەین:** ئەو نوێژەیە كە لەسەر تاك تاكی موسوڵمانی باڵغ وژیر فەرزە، نێرینە بێت یا مێیینە، سەربەست بێت یا كۆیلە.. كەس بۆی نیە لە بری كەسی تر بیكات.. وەكو پێنج نوێژ فەرزەكە.

* **نوێژی فەرزی كیفایە:** ئەو نوێژەیە كە ئەگەر هەندێك موسوڵمان كردیان فەرزێتیەكەی لەسەر موسوڵمانانی تر لا دەچێت، وەكو نوێژی جەنازە (نوێژی سەر مردوو).

ـ **دووەم: نوێژی سووننەت:** ئەو نوێژەیە كە ئەوی وازی لێ هێناوەو نەیكردووە گوناحبار نەبووە پێی، وەكو سووننەتی راتبەی پێش و پاشی نوێژە فەرزەكان یان نوێژی وتر.. بەڵام باشتر وایە بكرێن نەك نەكرێن.. باسی ئەمانە دواتر بە تەفسیل دەكرێت ان شاء الله..

## حوکمی نوێژنەکەر

نوێژنەکەر دوو حاڵەتی هەیە، یان لەبەر ئەوە وازی لە نوێژەکانی هێناوە چونکە باوەڕی بە فەرزێتی نوێژ نیەو نکووڵی لێ دەکات، یان باوەڕی بە فەرزێتی نوێژ هەیە بەڵام لەبەر تەمبەڵی نایانکات..

### ئەو کەسەی لەبەر نکووڵی لە فەرزێتی نوێژ، نوێژ ناکات:

ئەمە تەماشای حاڵی دەکرێت: ئەگەر لە ناو موسوڵماناندا گەورە بووبوو ئەوە بە کۆڕای زانایان و شەرعناسان کافرەو لە دین هەڵگەڕاوەیە، شەرعناسان دەرهەقی فەرموویانە کە دەبێت خەلیفە (یان وەکیلی ئەو) داوای تۆبەی لێ بکات، ئەگەر تۆبەی نەکرد ئەوە دەکوژرێت و هەموو ئەحکامەکانی مورتەددی لەسەر جێبەجێ دەکرێت[١].. مەگەر نەوموسوڵمان بێت یان لە شوێنێك دوور لە موسوڵمانان گەورە بووبێت کە دەشیا پەی بەو حوکمە شەرعیە نەبردبێت و بۆی روون نەبووبێتەوە کە نوێژکردن فەرزە، ئەوە بە مورتەدد دانانرێت، بەڵکو دەبێت بۆی روون بکرێتەوەو بۆی بسەلمێنرێت کە نوێژ فەرزەو نکوڵی لێکردنی پاشگەزبوونەوەیە لە دین، پاش ئەوە ئەگەر نکووڵی لێ کردەوەو ووتی کە بە فەرزی نازانێت ئیتر حوکمی مورتەدد دەیگرێتەوە

### ئەو کەسەی لەبەر تەمبەڵی نوێژ ناکات:

زانایان لەوەدا راکۆکن کە هەر کەس نوێژە فەرزەکانی نەکردو بە بێ هەبوونی هەنجەتی شەرعی وەلی کردن (وازی لێهێنان)، گوناحی گەورەی

---

[١] النووي: المجموع (٣/١٦).

خستۆتە گەردنی خۆی، چونکە یەکێك لە هەر گەورەترین تاوانی ئەنجامداوە کە نەکردنی نوێژە کە لە تاوانی قەتڵ و دزی وزیناو شەراب خواردنەوە خراپترە! شایانی سزای سەختی خوایەو ئەگەر هەر وا بەردەوام بێت، دەکەوێتە بەر غەزەبی خوا [١]..

★ ★ ★

## بەدواداچوونی بەڵگەکانی هەردوولا:

### پۆلی یەکەم: ئەوانەی فەرموویانە:

### نوێژنەکەر کافرەو لە دین و ئوممەت دەرچووە

ئەمە بۆچوونی سەعیدی کوڕی جوبەیرو شەعبی و نەخەعی و ئەوزاعی و ئیبنول موبارەك وئیسحاق وریوایەتێکی ئیمامی ئەحمەدو قەولێکی ئیمامی شافیعیشە [٢]. ئیبنوحەزم دەڵێ: ئەمە بۆچوونی سەیدنا عومەری کوڕی خەتتاب ومەعازی کوڕی جەبەل و عبدالرحمانی کوڕی عەوف و ئەبو هورەیرەو یاوەری تریشە [٣]..

ئەم پۆلە شەرعناسە بەرێزە پشتیان بە کۆمەڵێك بەڵگە بەستووە کە دەشێت ئاوا تەوەرەیان کەین:

---

[١] ابن القيم الجوزية: الصلاة و حكم تاركها (ل ٦)..

[٢] تەفسیری ئیبنو کەسیر (١٢١/٣)، هەروەها ئیمامی ئیبولقەییمیش لە کتێبی (الصلاة)ی خۆیدا لە تەحاویەوە هەمان بۆچوونی ئیمامی شافیعی نەقڵ کردووە.

[٣] مقدمات ابن رشد (٦٤/١)، المقنع (٣٠٧/١)، الانصاف (٤٠٢/١)، مجموع الفتاوى (٤٨/٢٢)، ابن القيم: الصلاة..

## یەكـەم: ئـەو فەرموودانـەی مانـای ڕۆشـنی تـەكفیر كردنـی نوێژنەكەر دەدەن:

ئـەم پۆلـە بـەڕێزەی شەرعناسان دەڵێن: مانـای بـەكافر دانـانی نوێـژ نەكەر لە دەقەكانی قورئـان و حەدیسـدا ڕۆشـنەو مانـای تـر هـەڵناگرێت.. ڕاشكاوانە دەفەرموێت كافرە، وەكو:

١ ـ جابری كوڕی عبدالله خوا لێیان ڕازی بێت لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیـه و سـلم دەگێڕێتـەوە كـە فەرموویـەتی: (إنَّ بَـينَ الرَّجُـلِ وَبَـينَ الشِّـرْكِ والكُفْـرِ تـرْكُ الصَّـلاة)[1] واتـە: لـە نێـوان كـابراو شـیرك و كوفردا هەر وەل كردنی نوێژەكان هەیە..

٢ ـ بورەیدەی كوڕی حوسەیب دەڵێ: گـوێم لێبـوو پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیه و سلم دەیفـەرموو: (العَهْدُ الـذي بَينَنـا و بَيـنَهُمْ الصَّلاةُ، فمَنْ ترَكَهَا فقَدْ كَفَرَ)[2] واتە: ئەو پەیمانەی نێـوان ئێمـەو ئـەوان نوێـژە، هەر كەسێك نوێژی واز لێ هێنا ئەوە كافرە..

٣ ـ لە ئەنەسەوە خـوا لێـی ڕازی بێـت بـە مـەرفووعی هـاتووە: (مَـنْ تـرَكَ الصَّلاةَ مُتعَمِّداً فقَدْ كفَرَ جهَاراً)[3] واتە: هەر كەسێك بـە ئەنقەسـت واز لە نوێژ بهێنێت ئەوە بە ئاشكرا كافر بووە..

٤ ـ فەرموودەكـەی ئیبنوعـەبباس خـوا لێیـان ڕازی بێـت كـە دەڵـێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم فەرمووی: (عُرَى الإسلامِ وَقَواعِدُ الدِّينِ ثلاثةٌ، عَلَيهِنَّ أُسُسُ الإسلامِ ؛ مَنْ تـرَكَ وَاحِـدَةً مِـنْهُنَّ ؛ فَهـوَ كَـافِرٌ

---

[1] موسلیم (٩٨٧)، ئەبو داوود (١٦٥٨) نەسائی (٢٣١/١).

[2] ترمزی (٢٦٢١)، نەسائی (٢٣١)، ئیبنوماجە (١٠٧٩)..

[3] تەبەرانی لە ئەوسەتدا هێناویّتیەوە بەلام ئەلبانی لە (ضعيف الجامع ٥٥٣٠) دا دەفەرموێ زەعیفە.

حَلالُ الدَّمِ: شَهادةُ أنْ لا إلهَ إلا اللهُ، وَالصَّلاةُ المكْتوبةُ، وَصَومُ رَمَضَانَ)[١] واتـە: بنـەمای ئیسلام وریێسای دیـن سـێن، کـە بناغـەی ئیسلامەتییان لەسەر وەستاوە، هـەر کەسـێك یـەکیان واز لـێ بهێنێـت کـافرەو خـوێنی حەڵاڵـە: شـایەتمان (ووتـنی لا الـە الا الله)، نوێـژە فـەرزەکان، ڕۆژووی ڕەمەزان..

## دووەم: ئـەو بەڵگانـەی مانـای تـەکفیر کردنـی نوێژنەکـەر دەگەیێنن: وەکو:

٥ ـ خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ﴾ التوبە/١١ واتـە: ئەگـەر پەشـیمان بوونـەوەو نوێژیان کردو زەکاتەکەیان دا ئەوە برای دینیتانن..

تـەکفیریانی نوێژنەکـەر فەرموویانـە: ئـەوەی کـردووە بـە مـەرجی برایەتی نێوان موسوڵمانان و موشریکان کە پەشیمان ببنەوە (تۆبە بکەن) و نوێژەکان بکەن و زەکات بدەن، ئەگەر یـەکێك لـەم مەرجانـەیان ئـەنجام نـــەدا برایەتیەکـــە دانامـــەزرێت، دیـــارە برایـــەتی دیـــنی بـــە فسـق هەڵناوەشـێتەوە، بـەڵکو بـەکافربوون. لێرەشـدا نوێژنەکردنەکـە بـووە بـە سیمای کافربوونێك کە ڕێی لە برایەتیەکە گرت.

پۆلە شەرعناسانی بەرامبەر فەرموویانـە: ئایەتەکـە بـاس لـە برایـەتی تەواوو برایەتی نوقسان دەکات ، ئایەتەکـە دەخوازێـت ئـەوە ڕوون کاتـەوە کە بەو سـێ مەرجـە برایەتیەکـە پتـەو دەبێـت، بـەڵام بـە نـەکردنی نوێـژ

---

[١] ئەبو یەعلاو هەیسەمی گێڕاویانەتەوە، شێخی ئەلبانی لە (سلسلة الاحاديث الضعيفة ٩٤)دا دەفەرموێ زەعیفە، لە تمام المنه (ل ١٣٨) شدا دەربارەی دەفەرموێ: گومانێکی زۆرم لە سەلمێنراوی ئەم فەرموودەیە هەیە کە لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه و سلم هاتبێت..

برایەتیەکـە هەڵناوەشـێتەوە، هـەر وەکـو کـە بـە نـەدانی زەکاتەکـە برایەتیەکە هەڵناوەشێتەوە.. چونکە لە فەرموودەی تردا پێغەمبەری خوا صلى الله عليـه و سلم فـەرمووی: (مَـا مِـنْ صَـاحِبِ كَنْـزٍ لا يُـؤَدِّي زَكَاتَـهُ إلا أُحْمِيَ عَلَيه فِي نَارِ جَهَنَّمَ فيُجْعَلَ صَفَائِحَ فيُكْوَى بِهَا جَنْبَاهُ وَجَبِينُـهُ حَتَّـى يَحْكُمَ اللهُ بينَ عِبَادِهِ فِي يَومٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلفَ سَنَةٍ ثمَّ يُـرَى سَـبِيلُهُ إمَّـا إلى الجنَّـةِ وإمَّـا إلى النَّـارِ)[1] واتـە: هـەر خـاوەن گەنجینـەو سـامانێك کـە زەکـاتی لـێ دەرناکـات، لـە ڕۆژی قیامەتـدا ئـەو سـەروەت و سـامانەی دەهێنرێتە پێشێ و لە ئاگری دۆزەخدا دەتوێندرێتـەوەو دەکرێتـە لـەوحی پـان و سـوور دەکرێتـەوەو لا تەنیشـت و ناوچـەوانی خاوەنەکـەی پـێ داخ دەکرێـت، ئەمـە ئـاوا لـەو ڕۆژەدا بـەردەوام دەبێـت کـە درێژیەکـەی پـەنجا هەزار ساڵە.. وا دەمێننەوە تا ئەو سـاتەی خـوای گـەورە داوەری لـە نێـوان بەندەکانیدا دەکـات، ئـیتر چارەنووسـی ئـەویش یـان بـۆ بەهەشـتە یـان بـۆ دۆزەخ..

مادام کە زەکاتیشی نەداوەو لەوانەشە بچێتە بەهەشتەوە، دەی یـەعنی موســوڵمان مــاوە.. ئەمــە بــە هــۆی زەکاتەکەوەیــە کــە هــەر لــەو فەرموودەیەدایـەو ئێـوە کردووتانەتـە مـەرج! ئیـدی جیـاوازی زەکـات و نوێژەکە چیە؟! بۆچی جیاوازیتان خستە نێوان نوێژو زەکاتەکەوە؟

٦ ـ خوای گەورە دەفـەرموێ: ﴿ فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا ﴿٥٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ﴾ مـــریم/٥٩ــــ٦٠ واتە: نەوەیەکیان لە پاش هات کە نوێژەکانیان فەوتاندو کەوتنە شوێن هەواو هەوەس و حەزی خۆیان، ئەوانـە لـە دواییـدا بـە هیلاك دەچن،

[1] موسلیم (٩٨٧).

مەگەر ئەوانەی کە پەشیمان دەبنەوەو تۆبە دەکەن و دەکەونەوە سەر کردەوەی چاك..

دەڵێن: کە دەفەرموێ ﴿إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا﴾ مەگەر ئەوانەی کە پەشیمان دەبنەوەو تۆبە دەکەن.. بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پێشتر (ئەو زەمانەی نوێژیان فەوتاندبوو) موسوڵمان نەمابوون..

ئەمانیش لە وەڵامیاندا دەڵێن: ووشەی (آمَنَ) لەوێدا مانای تەواو کردنەوەی باوەڕو دینداریێتیە نەك دامەزراندنەوەی ئیمان. یەعنی کە تۆبەی کردووە ئیتر کەوتۆتەوە نوێژەکانی تا باوەڕەکەی تەکمیلە بکاتەوە..

٧ ـ خوای گەورە دەربارەی دانیشتوانی دۆزەخ دەفەرموێ: ﴿مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ (٤٢) قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ (٤٣) وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ الْمِسْكِينَ (٤٤) وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ الْخَائِضِينَ (٤٥) وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ الدِّينِ﴾ المدثر/٤٢ـ٤٣ واتە: ئەوە بۆچی سەقەر (کە شوێنێکە لە دۆزەخ) بۆتە چارەنووستان؟! دەڵێن: لەبەر ئەوەی لە ریزی نوێژخوێنان نەبووین. یارمەتیدەری خۆراکدانی هەژاران نەبووین. هەر گوێمان لە قسەی ناڕەوا دەگرت و بەدوویدا دەچووین. هەموو باسێکی رۆژی قیامەتمان بە درۆ دەخستەوە.

تەکفیریانی نوێژنەکەر دەڵێن: ئایەتەکە باس لەوە دەکات کە هۆی چوونە دۆزەخیان نوێژنەکردنەکەیانە، هەرچەندە دەشێت ئەوانی تریش لەگەڵ نوێژنەکردنەکەدا هۆکاری سزاکەیان بن، چونکە هەر یەکەیان بە تەنیا هۆکارێکە بۆ بە تاوانبار دەرچوون..

شەرعناسانی بەرامبەر دەڵێن:

ـ یەكەم: باسی چوونە دۆزەخـی تێدایـە بـەڵام بـاس لـە مانـەوەی هەتا هەتاییان ناكات. كەوابوو بە قەدەر تـاوانی نوێژنەكردنەكـەیان سـزا وەردەگـرن و دواتـر وەكـو تاوانبـارانی تـر پـاك دەبنـەوەو دێنـە دەرەوە..

ـ دووەم: ئیعـتیراف كردنیانـە بـەوەی نوێـژیان نـەدەكرد، چونكە باوەڕیان پێی نەبوو، بە بەڵگەی ئـەوەی كـە تاوانـەكانی تـریش لـەو ئاستەدان، بە ریزبەنـدیش لـە نوێژنەكردنەكـەوە دەڕۆن تـا دەگەنـە بە درۆ خستنەوەی باسی رۆژی دوایـی.. ئـەوەی ئـەم بۆچـوونەشمان بەهێزتـر دەكات، ئەوەیە كە ئایەتەكان باس لە (موجریمێتی) دەكەن كە سیماو سیفەتی بەرەی بەرامبەر موسوڵمانانە، وەك خوای گەورە دەفـەرموێ: ﴿أَفَنَجۡعَلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ كَٱلۡمُجۡرِمِينَ﴾ القلـم/٣٥ واتـە: چـما دەبێـت موسوڵمانەكان و موجریمەكان وەكو یەك دانێین؟!

٨ ـ فەرموودەكـەی پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه و سـلم كـە دەفـەرموێ: (مَـنْ صَـلَّى صَـلاتَنَا وَاسْـتَقْبَلَ قِبْلَتَنَـا وَأَكَـلَ ذَبِيحَتَنَـا فَهُـوَ الْمُسْلِمُ، لَهُ مَا لَنَا وَعَلَيْهِ مَا عَلَيْنَا)[١] واتە: هەر كەس نوێـژی وەك نوێـژی ئێمە كردو رووی لە قیبلەی ئێمە كردو سـەربڕراوی دەسـتی خـواردین، ئەوە موسوڵمانە، ئەو مافەی هەیـە كـە ئێمـە هەمانـەو ئـەو ئەركانـەی لەسەرە كە لە ئێمە لەسەرمانە..

٩ ـ فەرموودەكـەی میحجـەنی كـوڕی ئـەدروعی ئەسـلەمی كـە گێڕاوێتیەوە: (كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَذَّنَ بِالصَّلاةِ، فَقَامَ

---

[١] بوخاری (٣٩١)، ترمزی (٢٦٠٨)، نەسائی (٣٩٦٦) .

فصَلَّى، ثمَّ رَجَعَ إِلَى مَجْلِسٍ، فرَآنِي فِي مَجْلِسِهِ، فقَالَ: " يَا مِحْجَنُ، مَا مَنَعَكَ أَنْ تصَلِّيَ، أَلَسْتَ بِرَجُلٍ مُسْلِمٍ؟ " قُلْتُ: بَلَى، وَلَكِنْ صَلَّيْتُ فِي أَهْلِي. قَالَ: " فَإِذَا جِئْتَ فَصَلِّ مَعَ النَّاسِ وَإِنْ كُنْتَ قَدْ صَلَّيْتَ فِي أَهْلِكَ)[1] واتـە: لە کۆڕی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه و سلم بـووە، کـە بـانگی داوە پێغەمبەری خوا تەشریفی بردووە، پاشـان گەڕاوەتـەوەو بـە میحجەنـی فـەرمووە: چـی رێـی لـێ گرتیـت لەگەڵمانـدا نوێـژ نەکـەیت؟ مەگـەر موســوڵمان نیــت؟! فــەرمووی: بــەدی، بــەڵام مــن نوێــژم لەگــەڵ کەســوکارەکەی خــۆم کــرد، پێغەمبــەری خــوا صــلى الله عليــە و ســلم فەرمووی: هەر کاتێك هاتیت نوێژەکەی لەگەڵ خەڵکەکە هەر بکە با نوێژیشت کردبێت..

١٠ ـ فـەرمووده مەرفووعەکـەی مـەعاز خـوا لێـی رازی بێـت کـە دەفەرموێ: (مَنْ تـرَكَ صَلَاةً مُتعَمِّدًا فقَدْ بَرِئتْ مِنْهُ ذِمَّـةُ اللَّـهِ وَرَسُولِهِ)[2] واتـە: هـەر کەسێك نوێژەکانی بـە ئەنقەسـت بفـەوتێنێت ئـەوە خـواو پێغەمبەری خوای لێ بێ بەری بووە!

---

[1] نەسائی (٨٥٧)، ئەحمەد (١٥٨٠٠) بەیهیقی (٢/٣٠٠) هەروەها ئیمامی مالیك و ئیبنوحیببان کە فەرموویەتی سەحیحە، بەڵام باقی فەرموودەوانان فەرموویانە زەعیفە چونکە خالیدی کوڕی یوسفی سەمتی تێدایە کە ریوایەتی زەعیفە..

[2] ئیمامی ئەحمەد لە موسنەدەکەی خۆیدا لە مەکحوولەوە ئەویش یەکسەر لە ئوم ئەیمەنەوە هێناویێتیەوە بەڵام فەرموودەوانان لەوانە بەیهیقی و ئەرنائووتی توێژەرەوەی مەسنەدی ئەحمەد خۆی کە قوتابی ئەلبانیە فەرموویانە زەعیفە، چونکە مونقەتیعە.. واتە یەکێك لە زنجیرەی سەنەدەکەی پساوە.. چونکە کەسێك لە نێوان مەکحوول و ئەم ئەیمەندا ناونەبراوە.. شێخی ئەلبانی بە حەسەنی داناوە (صحيح الترغيب و الترهيب)

## سێیەم: ئەو بەڵگانەی خوێنی نوێژنەکەر بە حەڵاڵ دەزانن:

## وەکو:

١١ ـ فەرموودەکەی ئەبو سەعیدی خودری خوا لێی رازی بێت کە باس لەو کابرایە دەکات کە بە پێغەمبەری خوای صلی الله علیه و سلم ووت لەخوا بترسە، خالیدی کوڕی وەلیدیش خوا لێی رازی بێت فەرمووی: (يا رَسُولَ اللهِ، ألا أضْرِبُ عُنُقَهُ ؟ قالَ: لَعَلَّهُ يُصَلِّي)[1] واتە: ئەی پێغەمبەری خوا لە گەردنی نەدەم؟ فەرمووی: نا، لەوانەیە نوێژ بکات کەوابوو کە یاوەران وویستیان لەبەر ئەو قسەیەی بیکوژن کە پێیان وابوو کافر بوونێتی، ئیحتیمالی نوێژ کردنەکەی رێی لە کوشتنی گرت بەڵام بەرامبەرەکان وەڵامیان داوەتەوەو فەرموویانە: لەوانەیە کوشتنەکەی سزا بووبێت نەك لەبەر ئەوەی کافر بووبێتەوە.. ئەمانیش وەڵامیان داونەتەوە: ئاخر پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم سێ هۆی دیاری کردووە کە خەڵکی لەسەر بکوژرێت: (لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ أنْ لَا إلَهَ إلَّا اللَّهُ وَأنِّي رَسُولُ اللَّه إلَّا بِإحْدَى ثَلَاثٍ الثَّيِّبُ الزَّانِي، وَالنَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ)[2] واتە: ئەو موسوڵمانەی دەڵێ (لا اله الا الله ومحمد رسول الله) نابێت بکوژرێت مەگەر بێوەژنی زیناکار بێت یان قاتڵ یان ئەو کەسەی کە وازی لە دینەکەی هێناوەو لە کۆمەڵەکەی جودا بۆتەوە.. نوێژنەکەر نە زیناکارە نە قاتڵ، کەوابوو دەبێت سێیەمیان بێت کە کوشتنی جائیزە!

---

[1] بوخاری (٤٣٥١)، موسلیم (١٠٦٤).

[2] بوخاری ٦٨٧٨)، موسلیم (١٦٧٦).

## چوارەم: ئەو بەڵگانەی رێ لە شۆڕش كردن دژی حاكمی موسوڵمان دەگرن مادام نوێژ بكەن:

١٢ ـ فەرموودەكەی ئوم سەلەمەخان خوا لێی رازی بێت كە دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم فەرمووی: (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ سَتَكُونُ أُمَرَاءُ فَتَعْرِفُونَ وَتُنْكِرُونَ فَمَنْ عَرَفَ بَرِئَ وَمَنْ أَنْكَرَ سَلِمَ وَلَكِنْ مَنْ رَضِيَ وَتَابَعَ قَالُوا أَفَلَا نُقَاتِلُهُمْ قَالَ لَا مَا صَلَّوْا )[1] واتە: حاكم و دەسەڵاتدارتان بەسەردا دەسەپێنرێت، چاكەو خراپەكانیانتان لا رۆشن دەبێت، هەر كەسێك خراپەكانیان ببوغزێنێت ئەوە لێیان بەرییە، هەر كەسێك نكووڵییان لێ بكات ئەوە قوتاربووە، بەڵام هەر كەسێك پێیان رازی بێت وشوێنیان كەوێت[2]، ووتیان: ئەدی جەنگ لە دژیان بەرپا نەكەین؟! فەرمووی: نا مادام نوێژەكانیان بكەن. كەوابوو كە نوێژیان نەكرد كافر دەبن و شۆڕش كردنەكە بەرامبەریان جائیز دەبێت. شۆڕش كردنیش دەبێت دژی حاكمی كافر بێت كە كوفری ئاشكرای لێ وەدەركەوتبێت، چونكە عوبادەی كوڕی سامیت خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم دەفەرموێ: (فِيمَا أَخَذَ عَلَيْنَا أَنْ بَايَعَنَا عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ فِي مَنْشَطِنَا وَمَكْرَهِنَا وَعُسْرِنَا وَيُسْرِنَا وَأَثَرَةً عَلَيْنَا وَأَنْ لَا نُنَازِعَ الْأَمْرَ أَهْلَهُ إِلَّا أَنْ تَرَوْا كُفْرًا بَوَاحًا عِنْدَكُمْ مِنْ اللَّهِ فِيهِ بُرْهَانٌ)[3] واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم بەیعەتی لێ وەرگرتین كە لە چوستی ولە سستیماندا، لە هەبوونی ولە نەداریماندا ملكەچی و

---

[1] موسلیم (١٨٥٤)، ترمزی (٢٢٦٦)، ئەبو داوود (٤٧٦٠).
[2] یەعنی واوەیلا بە حاڵی كە چۆتە ریزیانەوە..
[3] بوخاری (٧٠٥٦).

گوێڕایەڵی دەربڕین، نەشکەوینە مونافەسەو شەڕە پاڵی دەسەڵاتەوە..
مەگـەر کـوفرێکی ئاشـکراو راشـکاوتان لـە دەسـەڵاتداران ببیـنین کـە بەڵگەی شەرعیتان بە دەستەوە بێت (لەسەر کافربوونی)..

## پێنجەم: بە کافردانانی نوێژنەکەر رای زۆرینەی یاوەرانەو تا رادەیەکی کۆڕایان لەسەریێتی:

١٣ ـ عبداللەی کوڕی شەقیق کە یەکێکە لە تابعین دەیفەرموو: یاوەران هیچ شتێکیان وەکو وازلێهێنانی نوێژ بە کوفر نەدەزانی[1]..

ـ سەیدنا عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی رازی بێت دەیفەرموو: ئەو کەسەی واز لە نوێژەکان دەهێنێت هیچ پشکێکی ئیسلامەتی بۆ نامێنێتەوە. ئەمەش بۆچوونی سەیدنا عەلی و سەیدنا مەعازو ئەبوددەرداء و عوبادەی کوڕی سامیت و ئیبنو مەسعوودە[2] ..

شەرعناسانی بەرامبەر وەڵامیان داوەتەوە کە مادام کۆڕای یاوەران لەسەری نیە، ناتوانین بڵێین ئەوە رای هەموانە.. وەکو هەموو مەسەلەکانی تر بۆچوونی یاوەران دەبێتەوە بە دوو پۆل.. ئەگەر تەرجیح بە بۆچوونی لایەکیان نەدرا دەبێت بسازێنرێن..

* * *

---

[1] ترمزی گێڕاوێتیەوە (٢٦٢٢)، هەروەها ئیبنونەسر لەکتێبی (تعظیم قدر الصلاة/ ل ٩٤٨) بە توێژینەوەی کەمال ئیبنوالسەید سالم.هەروەها شێخی ئەلبانی لە: صحیح الترغیب و الترهیب (٥٦٤).

[2] شێخی ئەلبانی لە: صحیح الترغیب و الترهیب (٥٧٣)

## پۆلی دووەم: ئەوانەی فەرموویانە:

## نوێژ نەکەر فاسقە

## چونکە گوناحی گەورەی کردووە

ئەمـــە رای زۆرینـــەی زانایـــان و شەرعناســـانە، بۆچـــوونی ســـوفیانی سەوری‌و جمهوری پێشەوایانە (ئیمامان ئەبو حەنیفەو مالیك و شافیعی)و یەکێك لە ریوایەتەکانی ئیمامی ئەحمەدیشە[1]..

ئەمان تەکفیری ناکەن دەڵێن: کابرا کە موسوڵمانەو هاتۆتە ناو بازنەی ئیسـلامەوە، چـۆن دەتـوانین بـێ دڵنیـابوون لـە کـافربوونی لـە ئیسـلام بیکەینە دەرەوە؟! ئەمانەش دەکەنە بەڵگەی خۆیان:

### یەکەم: خوای گەورە لە هەموو گوناهێك . جگە لە شیرك . خۆش دەبێت:

١ ـ ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴾ النسـاء/٤٨

واتە: خوای گەوەر لەوە خۆش نابێت شیرکی بـۆ بڕیـار بـدرێت، بـەڵام لەو کەمتر خۆش دەبێت.. نوێژنەکردنیش تاوانێکە لە شیرك کەمترەو کەوتۆتـە بـەر حـەز (مەشـیئەت)ەکـەی خـوای گـەورە بۆیـە قـابیلی خۆشبوونە.. کەوابوو بە نوێژنەکردن کافر نەبووە.

شەرعناسـانی بەرامبـەر وەڵامیـان داوەتـەوە کـە ئایەتەکـە نـەفی کـافر بوونی نوێژنەکەری تێدا نیە.. کە پێغەمبەری خوا صـلی الله علیـە و سـلم

---

[1] حاشية ابن عابدين (١٦/٣)، الفتاوى الهندية (٥٠/١)، حاشية الدسوقي (١٨٩/١)، مواهب الجليل (٤٢٠/١) مغني المحتاج (٣٢٧/١)، المجموع (١٦/٣)..

فـەرمووی: (إنَّ بَـينَ الرَّجُـلِ وَبَـينَ الشِّرْكِ والكُفْـرِ تـرْكُ الصَّلاةِ)[١] واتـە: لـە نێوان كابراو شیرك و كوفردا هەر وەل كردنی نوێژەكان هەیە.. كابرای بـە كافر داناوە، كـە مـادام وایـە نوێژنـەكـەر بـەر حـوكمی نـاوەرۆكی ئایەتەكـە دەكــەوێت كــە كــافرە (بــە پێــی فەرموودەكــە) ئــیتر لێخۆشــبوونەكە نایگرێتەوە..

## دووەم: هەر كەسێك بڵێت لا اله الا الله دەچێتە بەهەشتەوە با نوێژیشی نەكردبێت:

٢ ـ مەعازی كوڕی جەبەل خوا لێی رازی بێت دەڵێ: پێغەمبـەری خوا صلی الله علیه و سلم فەرمووی: (مَنْ شَهِدَ أنْ لا إِلَهَ إلا اللّهُ مُخْلِصًا بِهَا عَلَى ذَلِـكَ حَرَّمَـهُ اللّـهُ عَلَـى النَّـارِ)[٢] واتـە: هـەر بەندەیـەكی خـوا شایەتی ئەوە بدات كە هیچ خوایەك نیە شایانی پەرستن بێت جگە لە خوای گەورە، هـەروەها شـایەتی بـدات كـە محمـد صـلی الله علیـه و سـلم نێـرراوی خوایـە حەتمـەن خـوای گـەورە بـەر ئـاگری دۆزەخـی ناخات.

٣ ـ فەرموودەكەی عوبادەی كوڕی سـامیت خـوا لێـی رازی بێـت كـە فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیـە و سـلم فەرموویـەتی (مَـنْ شَهِدَ أنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ وَأنَّ مُحَمَّدًا عَبْـدُهُ وَرَسُولُهُ وَأنَّ عِيسَى عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ وَكَلِمَتُـهُ أَلْقَاهَا إِلَـى مَـرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْـهُ وَالْجَنَّـةُ حَقٌّ وَالنَّارُ حَقٌّ أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ عَلَى مَا كَـانَ مِـنْ الْعَمَـلِ)[٣] واتـە: هـەر

---

[١] موسلیم (٩٨٧)، ئەبو داوود (١٦٥٨) نەسائی (٢٣١/١).
[٢] بوخاری (١٢٨)، موسلیم (٣٢).
[٣] بوخاری (٣٤٣٥)، موسلیم (٢٨).

کەسێك شایەتی ئەوە بدات کە خوای گەورەر شایانی پەرستنەو هیچ شەریکێکی بۆ نیەو محمد صلی الله علیە و سلم بەندەو نێرراوی ئەوە، هەروەها شایەتی بدات کە عیسا بەندەو نێرراوی خوایە، عیسا ئەو ووشە و گیانەیە کە لە خواوە خراوەتە مەریەمەوە، دیسان شایەتی بدات کە بەهەشت راستەو دۆزەخ راستە، ئەوە حەتمەن کارو کردەوەی هەر چەندو چۆنێك بێت، خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە.

٤ ـ فەرموودەکەی مەعازی کوڕی جەبەل خوا لێی رازی بێت کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم فەرموویەتی: (مَنْ كَانَ آخِرُ كَلامِهِ: لا اله الا الله دَخَلَ الجَنَّةَ)[١] واتە: هەر کەسێك کۆتا قسەی لا اله الا الله بێت دەچێتە بەهەشتەوە..

٥ ـ فەرموودەکەی عوتبانی کوڕی مالیك خوا لێی رازی بێت کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم فەرمووی: (إنَّ اللهَ حَرَّمَ عَلَى النَّارَ مَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ يَبْتَغِي بِذَلِكَ وَجْهَ اللَّهِ)[٢] واتە: هەر کەسێك لەبەر خاتری خوا بڵێ لا اله الا الله، حەتمەن خوای گەورە ناهێڵێت ئاگری دۆزەخی بەر کەوێت.. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم لێرەدا نوێژی نەکردووە بە مەرجی قوتاربوون لە ئاگری دۆزەخ و چوونە بەهەشت..

بەرامبەرەکانیان وەڵامی ئەمەیان داوەتەوە بەوەی کە ئەم دەقانە دوو جۆر مانا دەبەخشن: یەکەمیان گشتییەو بەو فەرموودانە تایبەت کراوە

---

[١] ئەبو داوود (٣١١٦).
[٢] بوخاری (٤٢٥)، موسلیم (٣٣).

کە تەکفیری نوێژنەکەر دەکەن، یان ڕەها (مطلق)ەو ڕێ بە نوێژنەکردن نادات، چونکە ووتنی لا اله الا الله کە مەرجە کە (يَبْتَغِي بِذَلِكَ وَجْهَ اللَّهِ) و (صِدْقاً مِنْ قَلْبِهِ) لەبەر خاتری خوا بێت ولە دڵەوە بێت.. کەسێك لەبەر خاتری خوا شایەتمان بهێنێت و پڕ بە دڵ قەناعەت کات و بڕیاری ئاشکرای لەسەر بدات، چۆن دەشێت نوێژێك نەکات کە هەر ئەو خوا خۆشەویستە لەسەری فەرز کردووە؟![1].

## سێیەم: کەسانێك لە دۆزەخ دێنە دەرەوە کە کردەوەی چاکەیان هەر نەبووە!

٦ ـ ئـەبو سـەعیدی خـودری خـوا لێـی ڕازی بێـت فەرمووددەیـەك دەگێڕێتەوە کە بە فەرموودەی دۆزەخیەکان (الجهنـميين) بەناوبانگە کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فـەرمووی: (إِذَا خَلَصَ الْمُؤْمِنُونَ مِنَ النَّارِ وَأَمِنُوا فـ (وَالَّـذِي نَفْسِـي بِيَـدِهِ) مَـا مُجَادَلَـةُ أَحَـدِكُمْ لِصَاحِبِهِ فِـي الْحَـقِّ يَكُـونُ لَـهُ فِـي الـدُّنْيَا بِأَشَـدَّ مِـنْ مُجَادَلَـةِ الْمُـؤْمِنِينَ لِرَبِّهِمْ لِأَخْوَانِهِمْ الَّذِينَ أُدْخِلُوا النَّـارَ، قَـالَ: يَقُولُـونَ رَبَّنَـا إِخْوَانُنَـا كَـانُوا يُصَـلُّونَ مَعَنَـا وَيَصُـومُونَ مَعَنَـا وَيَحُجُّـونَ مَعَنَـا (وَ يُجَاهِـدُونَ مَعَنَـا) فَـأَدْخَلْتَهُمْ النَّـارَ، قَـالَ: فَيَقُـولُ: اذْهَبُـوا فَـأَخْرِجُوا مَـنْ عَـرَفْتُمْ مِـنْهُمْ، فَيَـأْتُونَهُمْ، فَيَعْرِفُـونَهُمْ بِصُـوَرِهِمْ، لا تَأْكُـلُ النَّـارُ صُـوَرَهُمْ فَمِـنْهُمْ مَـنْ أَخَذَتْـهُ النَّـارُ إِلَـى أَنْصَـافِ سَـاقَيْهِ، وَمِـنْهُمْ مَـنْ أَخَذَتْـهُ الَـى كَعْبَيْـهِ، (فَيُخْرِجُونَ مِنْهَا بَشَرًا كَثِيرًا) فَيَقُولُونَ رَبَّنَا قَدْ أَخْرَجْنَا مَنْ أَمَرْتَنَا، ثُمَّ يَقُولُ ارْجِعُوا فَمَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ وَزْنَ نِصْفِ دِينَـارٍ مِـنْ خَيْـرٍ فَـأَخْرِجُوهُ فَيُخْرِجُونَ خَلْقًا كَثِيرًا ثُمَّ يَقُولُونَ رَبَّنَا لَمْ نَذَرْ فِيهَا أَحَـدًا مِمَّـنْ أَمَرْتَنَـا

---

[1] ابن عثيمين: حكم تارك الصلاة..

بهِ حتى يَقُولُ أخْرِجُوا مَنْ كَانَ في قَلْبهِ مِثقَالَ ذرَةٍ (فَيُخرِجُونَ خَلْقًا كَثِيرًا) قَالَ أبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ: إنْ لَمْ تصَدِّقُوني بهَذَا الْحَدِيثِ فاقْرَءُوا إنْ شِـئْتُمْ ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ ۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَٰعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾[1] قَالَ فيَقُولُون: رَبَّنَا أخْرَجْنَا مَنْ أمَرْتنَا، فلَمْ يَبْقَ فِي النَّارِ أحَدٌ فِيهِ خَيرٌ! قَالَ: ثمَّ يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: شَفَعَتِ الْمَلَائِكَةُ، وَشَفَعَتِ الأنْبِيَاءُ، وَشَفَعَ الْمُؤْمِنُونَ، وَبَقِيَ أرْحَمُ الرَّاحِمِينَ، قَالَ: فَيَقْبِضُ قَبْضَةً مِنَ النَّارِ، أو قَالَ قَبْضَتيْنِ، فَيُخْرِجُ مِنْهَا قَوْمًا لَمْ يَعْمَلُوا خَيْرًا قَطُّ قَدْ احْتَرَقُوا حَتّى صَارُوا حُمَمًا، قال: فيقال لهم: ادخلوا الجنة، فما تمنيتم و رأيتم من شئ فهو لكم (ومثله معه) فيقال أهل الجنة: هؤلاء عتقاء الرحمن، أدخلهم الجنة بغير عمل عملوه و لا خير قدموه)[2] واتە: دوای ئەوەی موسوڵمانەكان لە مەترسی چارەنووسی دۆزەخ قوتار دەبن، دەكەونە موناقەشەی كەسانی دیكە، قەسەم بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە بەرگریی كردن و موناقەشە كردنتان لەسەر ماف هاوڕێكانتان لە دنیادا گەورەترو گرنگتر نابێت وەك لەوەی لە قیامەتدا دەتانبێت لە خزمەت خوای پەروەردگاردا لە بەرگری كردنتان لەوانەی خراونەتە دۆزەخەوە، ئینجا ئەو موسوڵمانانە (ئەوانەی موناقەشەو بەرگریەكە لە موسوڵمانەكانی تریان دەكەن كە خراونەتە ناو دۆزەخەوە عەرزی خوای گەورە دەكەن: خوایە خۆ ئەوانە لەگەڵماندا بوون، نوێژیان دەكرد

---

[1] النساء / ٤٠

[2] ئەم فەرموودەیە لای بوخاری (٦٥٦٠) و موسلیم (١٨٣) و ئیمامی ئەحمەدو خاوەن سوننەكانیش هەیە، لەگەڵ جیاوازی هەندێك ووشەو رستە، شێخی ئەلبانی رەحمەتی توێژینەوەی لەسەر كردووەو بە سەحیحی داناوە. بڕوانە (الالباني: حكم تارك الصلاة ل٧).

لەگەڵماندا، رۆژوویان دەگرت لەگەڵماندا، زەکاتیان دەدا لەگەڵماندا، جیهادیان دەکرد لەگەڵماندا، کەچی تۆ خستووتنە ناو ئاگری دۆزەخەوە! خوای گەورە دەفەرموێ: بڕۆن هەرچی دەناسن دەریان بهێننەوە. دەچن و هەرچیەك بە دەموچاوو رەنگ و رووياندا دەناسن دەريان دەهێننەوە، کەسیان ئاگر دەموچاوی نەسوتاندوون، هەر لە ئاگردان، هەیە ئاگر تا ناوەندی لولاقی هاتووەو هەیانە تا قولەپێی هاتووە، ئیتر خەڵکێکی زۆریان لێ دەهێننە دەرەوەو دەڵێن: خوایە هەرچی فەرمانت پێکردبووین بیانهێنینە دەرەوە هێناومانەتە دەرەوە، کەس لە دۆزەخدا نەماوە خێرێکی پێوە مابێت (یەعنی کردەوەیەکی چاکی کردبێت) ئینجا خوای گەورە دەفەرموێ: فریشتە شەفاعەتیان کرد، پێغەمبەران شەفاعەتیان کرد، موسوڵمانان شەفاعەتیان کرد، بەزەییترینی خاوەن بەزەییەکان (ئەرحەموڕاحمین) ماوە، ئینجا چنگێك لەو خەڵکە تاو دەداتێ و لە ئاگر دەریان دەهێنێت کە بە هیچ شێوەیەك کردەوەیەکی چاکیان لەبەر خاتری خوا نەکردووە هەموویان داپلوخاون و بوون بە خەڵووز، دەهێنرێن بەرەو ئاوێك کە پێی دەوترێت ئاوی ژیان، ئەو ئاوەیان بەسەردا دەکرێت، هەر هەموویان وەکو دانەوێڵەی گوێ روبار دەڕوێنەوە..

ئەم پۆلە شەرعناسە دەڵێن: ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە نوێژنەکەر کافر نیە، بۆیە سەرەنجام لە ریزی موسوڵمانە یاخیەکاندا حسێب کراوەو لە دۆزەخ هێنراوەتە دەرەوە..

بەرامبەرەکانیان وەڵامیان داونەتەوە کە نوێژ ناکەوێتە ناو دەستەواژەی (لَمْ يَعْمَلُوا خَيراً قَطّ)، چۆن تەسەور دەکرێت کە نوێژنەکەر

خرابێتە ریزی ئەوانـەوەو لەگـەڵ ئەوانـدا بـە فـەتارەت چـووبێت؟! خـوای گــەورە دەفــەرموێ: ﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ ۝٤٢ خَٰشِعَةً أَبْصَٰرُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ۖ وَقَدْ كَانُوا۟ يُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ وَهُمْ سَٰلِمُونَ﴾ القلم /٤٢-٤٣ واتـە: ئـەو رۆژەی لاق دەردەخرێـت، داوایـان لـێ دەکرێـت سـوجدە بـۆ خـوا ببـەن، ناتوانن. چاویان زەق کردۆتەوەو زەلیلێتی ماندووی کردوون، ئاخر کـە لـە دنیادا کە ساغ و سەلیم بوون داوایان لێ دەکرا سوجدە ببەن، نەیاندەبرد!! فــەرموودە ســەحیحەکان ئــەوە دەســەلمێنن کــە هــەر کەســێك کــە یەکخواپەرسـت (موحـد) بێـت لـە دۆزەخ دەهێنرێتـە دەرەوە، ئـەویش بـە نیشانەو ئاسەواری دەستنوێژەکانیاندا دەناسرێنەوە..

٧ ـ لە فەرموودەیەکی مەرفووعدا کە ئەبو هورەیرە دەیگێڕێتـەوە دەفـەرموێ: (... حَتـى إِذَا فَـرَغَ اللّـهُ مِـنْ الْقَضَـاءِ بَـيْنَ عِبَـادِهِ وَأَرَادَ أَنْ يُخْرِجَ (برَحْمَتِهِ)مِنْ النّارِ مَنْ أَرَادَ أَنْ يُخْرِجَ مِمَّنْ كَانَ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللّهُ أَمَرَ الْمَلَائِكَةَ أَنْ يُخْرِجُوهُمْ فَيَعْرِفُونَهُمْ بِعَلَامَةِ آثَارِ السُّجُودِ وَحَـرَّمَ اللّـهُ عَلَـى النّـارِ أَنْ تَأْكُـلَ مِـنْ ابْـنِ آدَمَ أَثَـرَ السُّـجُودِ فَيُخْرِجُـونَهُمْ قَـدْ امْتَحِشُوا فَيُصَبُّ عَلَيْهِمْ مَاءُ الْحَيَاةِ .... وَيَبْقَى رَجُلٌ مِنْهُمْ مُقْبِلٌ بِوَجْهِهِ عَلَى النّارِ... فَيَصْرِفُ وَجْهَهُ عَـنْ النّـارِ) قَـالَ أَبُـو هُرَيْـرَةَ وَذَلِـكَ الرَّجُـلُ آخِرُ أَهْلِ الْجَنّةِ دُخُولًا)[١] واتە: ئیتر کە خوای گەورە لـە داوەری کردنـی نێـوان عەبـدەکانی بـووەوەو وویسـتی بـە رەحمـەت و بـەزەیی خـۆی هەنــدێك لەوانــە بهێنێتــە دەرەوە کــە دەیــانووت لا الــە الا اللــە و دەیوویست بیانهێنێتە دەرەوە، ئیتر فەرمان بـە فریشـتەکان دەکـات کـە بیانهێنـنــە دەرەوە، ئــەوانیش کــە دەچــنە لایــان بــە ئاســەواری

[١] بوخاری (٦٥٧٣ و ٧٤٣٧)، موسلیم (١٨٢).

سوجدەبردنیاندا دەیانناسنەوە، چونکە خـوای گـەورە رێـی لـە ئـاگری دۆزەخ گرتووە کە شوێنێکی لەشی عەبدێك بسوتێنێت کـە سـوجدەی بـۆ خـوا بردبێـت، ئـیتر دەریـان دەهێـنن، پێست و گۆشـتیان هـەموو سـوتاوەو ئێسـقانیان رەش داگـەڕاوە، پاشـان ئـاوی ژیانیـان بەسـەردا دەکەنەوە... کابرایەکی تر دەمێنێت کـە رووی لـە ئـاگری دۆزەخـە... خوای گەورە رووی ئەویش لە ئاگرەکە وەردەچەرخێنێت..

ئەم پۆلە شەرعناسە دەڵێن: فەرموودەکە ئەوە دەسەمێنێ کە ئەوانەی فریشتە لە دۆزەخ دەیانهێننە دەرەوە ئاسەواری سوجدەیان پێوەیـە کـە بـۆ خوایـان بـردووە، کـەوابوو گومـانی تێـدا نیـە ئەمانـە ئـەهلی نوێـژ بـوون، کەوابوو ئەوەی ئەهلی نوێژ نەبێت ناهێنرێتە دەرەوە..

٨ ـ تاریقی ئەشـجەعی دەگێڕێتـەوە کـە پێغەمبـەری خـوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (مَنْ قَالَ لا اله الا اللّهُ وَكَفَرَ بِمَا يُعْبَدُ مِنْ دُونِ اللهِ حَرُمَ مَالُهُ وَدَمُهُ، وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ عَزَّوَجَلَّ)[1] واتـە: هـەر کەسـێك بڵێ لا اله الا الله و تەکفیری ئەوانە بکات کە لـە جیـاتی خـوای گـەورە دەپەرسـترێن، سـامان و خـوێنی حـەرام دەبێـت و حسـاباتب پاداشـت دانەوەی) لای خوای گەورە دەبێت..

٩ ـ هەروەها فەرموودەکەی سەیدنا ئەنەس خوا لێی رازی بێت کـە لـە بوخاریـدا هـاتووەو دەڵـێ: (عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ يَخْرُجُ مِنْ النَّارِ مَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَفِي قَلْبِهِ وَزْنُ شَعِيرَةٍ مِنْ خَيْرٍ وَيَخْرُجُ مِنْ النَّارِ مَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَفِي قَلْبِهِ وَزْنُ بُرَّةٍ مِنْ خَيْرٍ وَيَخْرُجُ مِنْ النَّارِ مَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَفِي قَلْبِهِ وَزْنُ ذَرَّةٍ مِنْ خَيْرٍ)[2]

---

[1] بوخاری (٥٨٢٧) موسلیم (٩٤).
[2] بوخاری (٤٤).

واتـه: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم فەرموویـەتی: هـەر کەسێك ووتبێتی لا اله الا الله و بەقەدەر دەنکە جۆیەك خێـر (بـاوەڕ) لە دڵیدا هەبێت لە دۆزەخ دێتـه دەرەوە، هـەر کەسـێکیش ووتبـێتی لا اله الا الله و بەقەدەر دەنکە گەنمێك خێر (باوەڕ) لە دڵیدا هـەبێت لـه دۆزەخ دێتـه دەرەوە، هـەر کەسـێك ووتبـێتی لا الـه الا الله و بەقـەدەر گەردێك خێر (باوەڕ) لە دڵیدا هەبێت لە دۆزەخ دێتە دەرەوە.

## چوارەم: ئەو فەرموودانەی کە نوێژنەکەر لە ئوممەت نابەنە دەرەوە، لەوانە:

١٠ ـ عوبـادەی کـوڕی سابیت دەڵـێ: گـوێم لێبـوو پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (خَمْسُ صَلَوَاتٍ افْتَرَضَهُنَّ اللَّهُ عَلَى عِبَادِهِ، فَمَنْ جَاءَ بِهِنَّ لَمْ يَنْتَقِصْ مِنْهُنَّ شَيْئًا اسْتِخْفَافًا بِهِنَّ، فَإِنَّ اللَّهَ جَاعِلٌ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَهْدًا أَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، وَمَنْ جَاءَ بِهِنَّ وَقَدْ نَقَصَ مِنْهُنَّ شَيْئًا، لَمْ يَكُنْ لَهُ عِنْدَ اللَّهِ عَهْدٌ، إِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ، وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُ)[١]
واتە: پێنـج فەرز نوێژ هەن کـە خـوای گـەورە لەسـەر بەنـدەی خـۆیی فـەرز کـردوون، هـەر کەسـێك وا بـە خـوا بگـات کـە هـەمووی بـە ڕێکـوپێکی ئەنجامـدا بـن و هیچـی نەفەوتانـدبن و سـوکایەتی پـێ نـەکردبن، ئـەوە پـەیمانی لای خوایـە کـە بیخاتـە بەهەشـتەوە، هـەر کەسێکیش بە خوای خۆی بگات و لێی کەم کردبنـەوە یـان سـوکایەتی

---

[١] ئیمامی مالیك لە الموطأ (١/٢٥٤-٢٥٥) ئیمامی ئەحمەد لە (المسند ٥/٣١٥) ئەبو داوود (١/١١٥)، و ئیبنوماجە (١/٤٤٨)، شێخی ئەلبانیش لە: صحيح الترغيب و الترهيب (٣٦٦) بە سەحیحی داناوە..

پێ كردبن، ئەوە هیچ پەیمانێكی لای خوا نیە  ئەگەر خوا حەزكات سزای دەدات وئەگەر حەزكات لێی خۆش دەبێت..

ئەم پۆلە شەرعناسە دەڵێن: ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە وەل كردنی هەندێك نوێژ كافر ناكات و خاوەنەكەی دەباتەوە بەر مەشیئەتی خوای گەورە..

تەكفیرانی نوێژنەكەر لە وەڵامیاندا دەڵێن: ناشێت فەرموودەكە بكرێتە بەڵگەی ئەوە كە دەشێت چاوپۆشی لە نەكردنی هەندێك نوێژ بكرێت.. فەرموودەكە باس لەوە دەكات كە كابرا نوێژخوێن بووە بەڵام هەندێك نوێژی بە نوقسانی كردووە یان كەمتەرخەمی لە هەندێكیاندا كردووە، چونكە دەفەرموێ: (وَمَنْ جَاءَ بِهِنَّ وَقَدْ نَقَصَ مِنْهُنَّ شَيْئًا).

١١ ـ ئەبو هورەیرە خوا لێی رازی بێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم دەفەرموێ: (إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ النَّاسُ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ أَعْمَالِهِمْ الصَّلَاةُ قَالَ يَقُولُ رَبُّنَا جَلَّ وَعَزَّ لِمَلَائِكَتِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ انْظُرُوا فِي صَلَاةِ عَبْدِي أَتَمَّهَا أَمْ نَقَصَهَا فَإِنْ كَانَتْ تَامَّةً كُتِبَتْ لَهُ تَامَّةً وَإِنْ كَانَ انْتَقَصَ مِنْهَا شَيْئًا قَالَ انْظُرُوا هَلْ لِعَبْدِي مِنْ تَطَوُّعٍ فَإِنْ كَانَ لَهُ تَطَوُّعٌ قَالَ أَتِمُّوا لِعَبْدِي فَرِيضَتَهُ مِنْ تَطَوُّعِهِ ثُمَّ تُؤْخَذُ الْأَعْمَالُ عَلَى ذَاكُمْ)[1] واتە: لە رۆژی دواییدا یەكەمین شت لە كردەوەی بەندە كە خوای گەورە موحاسەبەی لەسەر دەكات نوێژە، خوای گەورە بە فریشتەكانی دەفەرموێ ـ بۆ خۆشی دەزانێت ـ سەیرێكی نوێژی بەندەكەمم بۆ بكەن، بزانن داخۆ بە تەواوی كردوونی یان كەم و كورتییان تێدایە، ئەگەر بە تەواوی كردبوونی، بۆی دەنوسرێت كە

---

[1] ئەبو داود (٨٦٤)، شێخی ئەلبانی دەفەرموێ سەحیحە:  صحيح أبي داود (٧٧٣) و صحيح الجامع (٢٥٧١).

تەواوە، ئەگەر نوقسانی تێدابوو، دەفەرموێ: سەیر کەن بزانن داخۆ ئەو بەندەیەم نوێژی سوونەتی کردووە، ئەگەر نوێژی سوونەتی کردبوو، نوێژە فەرزەکانی لەوان بۆ تەواو دەکەن، پاشان کارو کردەوەکان لە روانگەی ئەوەوە هەڵدەسەنگێندرێن..

تەکفیرانی نوێژنەکەر دەڵێن: فەرموودەکە مەرفووعەو لە رێی زەعیفەوە گێڕراوەتەوە، پاشان ئەوەی کە کەمێك خۆی بەهێزتر دەگرێت ئەوەیە کە دەفەرموێ: (أَوَّلُ مَا يُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ الصَلَاةُ فَإِنْ صَلَحَتْ فَقَدْ أَفْلَحَ وَنَجَحَ، وَإِنْ فَسَدَتْ فَقَدْ خَابَ وَخَسِرَ)[1] واتە: یەکەم شت لە رۆژی قیامەتدا عەبدی لەسەر موحاسەبە دەکرێت نوێژە، ئەگەر نوێژەکانی باش بوون، ئەوە هەموو کارو کردەوەکانی تریشی باش دەبن، ئەگەر نوێژەکانی خراپ بوون، ئەوە داماوو هەناسەساردەو زیانی لێ کەوتووە.. ئەمە ئەوە دەگەێنێت کە نوقسانیەکانی لە ئەرکان و مەرجی نوێژەکە پێ تەواو دەکرێت نەك نوێژی فەرزەکان بە تەواوی.. بۆیە بۆ بەڵگە ناشێن![2].

---

[1] ترمزی (السنن ٤١٣)، نەسائی (السنن ٤٦٦). بەیهیقی لە السُنن الكبری (٣٩٠٧)، الحاكم لە: المستدرك على الصحيحين (١٠٠٤).. شێخی ئەلبانی لە صحيح سنن الترمذي (٤١٣) بە سەحیحی داناوە.

[2] لە هەردوو لاوە هەنجەتی ئەم ئیستیدلالەی تەکفیرانی نوێژنەکەر لاواز دەرچووە:

یەکەم: فەرموودەکان بە توێژینەوەی شێخی ئەلبانی (کە لەو پۆلەیە کە تەکفیری نوێژنەکەر دەکات) سەحیحە.

دووەم: فەرموودەکە راشکاوانە دەفەرموێ بە سوننەتەکان فەرزەکان تەواو دەکرێت، یەکەمین مانا کە لێی دەفامرێتەوە تەواو کردنی ژمارەی نوێژە نەك نوقسانی روکن و مەرج والله اعلم.. ئیمامی ئەحمەد لە المسند (٢٤/٥)، ئیبنو ئەبی شەیبە لە المسند (٥٣٧/٩)، شێخی ئەلبانی بە سەحیحی داناوە لە: الثمر المستطاب (٥١/١).

١٢ ـ فەرموودەکەی نەسری کوڕی عاسمی لەیسی خوا لێی رازی بێت کە دەڵێ: (عَنْ رَجُلٍ مِنْهُمْ أَنَّهُ أَتى النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ فأَسْلَمَ عَلَى أَنَّهُ لاَيُصَلِّي إِلاَّ صَلاَتَيْنِ، فَقَبِلَ ذَلِكَ مِنْهُ)[١] واتە: پیاوێکی لای ئێمە چووە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم وعەرزی کرد، ئەی پێغەمبەری خوا موسوڵمان دەبم بەڵام هەر دوو نوێژ دەکەم، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم لێی قبووڵ کرد..

ئەم شەرعناسە بەڕێزانە دەڵێن: ئەمە هەر لە ئەساسەوە نوێژ بە نوقسانی دەکات و پێغەمبەری خواش صلى الله عليه و سلم قبووڵێتی..

پۆلە شەرعناسانی بەرامبەر کە نوێژنەکەر بە کافر دەزانن دەڵێن: بەڵگەمان نیە کە ئەو کاتە نوێژ پێنج فەرز بووە!! لەوانەیە ئەو کاتە نوێژ دوو فەرز بووبێت! یان لەبەر ئەوەیە کە بە مەرجی فاسیدیش موسوڵمان بوونەکەی لێ قبووڵ کردووە.. ئەمەش مەزهەبی ئیمامی ئەحمەدە.. ئینجا دەڵێن: ئەمە تایبەت بووە بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم وبۆمان نیە لەمەدا ئیقتیدا بە پێغەمبەری خوا بکەین!![٢]

## پێنجەم: ئەو فەرموودانەی کە نوێژنەکەر بە کافر دادەنێن، باسی کوفری بچوکن:

هەر وەك چۆن ووشەی کوفر کە لە چەندین فەرموودەی تردا هەیەو وا لێکدراونەتەوە کە باس لە کوفری بچووك دەکەن، کە خاوەنەکەی لە

---

[١] ئەحمەد (٢٤/٥)، ئیبنو ئەبی شەیبە (٥٣٧/٩)، شێخی ئەلبانی لە: الثمر المستطاب في فقه السنة و الكتاب (٥١/١) بە سەحیحی داناوە و دەفەرموێ: صحيح على شرط مسلم.

[٢] ئەمە هەڵاتنە لە وەڵام و تەسلیم بوون..

دین وئوممەت ناباتە دەرەوە، ئەم فەرمووودانەی باس لە کافربوونی نوێژنەکەریش دەکەن هەر باس لە کوفری بچووکی دەکەن. بۆ نموونە:

ـ فەرموودەی (سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ، وَقِتَالُهُ كُفْرٌ)[1] واتە جنێودان بە موسوڵمان گوناحی فیسقەو کوشتاریشی کوفرە..

ـ (اثنَتَانِ فِي النَّاسِ هُمَا بِهِمْ كُفْرٌ الطَّعْنُ فِي النَّسَبِ وَالنِّيَاحَةُ عَلَى الْمَيِّتِ)[2] واتە دوو شت هەن کە خەڵکیان پێ کافر دەبێت: تـوانج گرتنە نەسەبی خەڵکی و شینوشەپۆڕ لەسەر مردووە..

ـ ئەو فەرموودانەی دەفەرموێ: (لیس منا من..) واتە: ئەو کەسەی وا بکات لە ئێمە نیە.. کە زۆریشن و سەحیحیشن..

تەکفیریانی نوێژنەکەر لە وەڵامیاندا دەڵێن: ئەمانەی هێناتاننەوە هیچیان ناشێت بکرێنە بەڵگە، چونکە:

یەکەم: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم نوێژەکەی کردۆتە سنوری نێوان کافرو موسوڵمان، سنوریش بۆ جوێکردنەوەیە، لێرەشدا کوفر و ئیمان جیاوازن و لێك جودا کراونەتەوە.

دووەم: نوێژ روکنێکی ئیسلامە، ئەو کەسەی کە نایکات بە کافر ناسێنراوە، کەوابوو لە دین و ئوممەتی موسوڵمانان نەماوە، چونکە روکنێکی دینەکەی خۆی رماندووە.. بە پێچەوانەی ئەوانەوەیە کە وەسفی تری کوفریان بەسەردا هاتووە، لەبەر ئەوەی کارێك یان رەفتارێکی کوفرینیان کردووە..

---

[1] بوخاری (٤٦)، موسلیم (١١٧).

[2] موسلیم(٥٨/١)، بەیهیقی(٦٣/٤) رێگای تریشی لە ئەبوهورەیرەوە خوا لێی رازی بێت زۆرە.

سێیەم: دەقەکانی فەرمووده لەسەر کافربوونی نوێژ نەکەر زۆرن و راشکاون، بۆیە دەبێت حوکمیان وا لێوە وەرگیرێت وەکو ئەوەی لێیان دەفامرێتەوە..

چوارەم: ووشەی کوفر کە لە بەڵگەکانی ئێوەدا هاتووە یان کرداره، یان بە شێوەی نەناس (نەکیرە) هاتووە، ئەوانەی ئێمە بە شێوەی ناسراو (مەعریفە) هاتووەو ئەلف و لامی پێوەیە کە واتای خودی کوفر دەگەیێنێت و بوار بۆ لێکدانەوەی تر ناهێڵێتەوە..

## شەشەم: ئەو فەرموودانەی نوێژنەکەر بە کافر دادەنێن، باسی نکوڵی کردنی نوێژ دەکەن:

تەکفیریانی نوێژنەکەر وەڵامیان داونەتەوەو فەرموویانە: ئەمە دوو ئیشکالی تێدایە:

یەکەم: ئەم قسەیە ئیلغا کردنەوەی مەناتی حوکمەکەیە (هۆکاری هاتنی حوکمە شەرعیەکە) کە وەل کرن و واز لێ هێنانی نوێژەکەیە..

دووەم: داهێنانی وەسفێکی ترو خستنە جێی حوکمە شەرعیەکە.. چونکە نکووڵی کردن تایبەت نیە بە نوێژەوە.. کابرا ئەگەر نکووڵی لە هەر حوکمێکی شەرعی سەلمێنراوو چەسپێنراو کرد، پێی کافر دەبێت.. کەوابوو راکێشانی ووشەی فەرموودەکە بۆ کێشەی نکووڵی لێ کردن لە جێی خۆیدا نیە[1]..

---

[1] ابن عثيمين: رسالة في حكم تارك الصلاة (ل ١٢).

## حەوتەم: لە هیچ سەردەمێكی مێژووی موسوڵماناندا نەمانبیستووە نوێژنەكەرێك حوكمی مورتەددی لەسەر چەسپێنرابێت :

ئەم بەڕێزانەو لە پێش هەموویانەوە ئیبنو قودامەی مەقدیسی[1] دەڵێن: لە هەموو مێژووی موسوڵماناندا جارێك رووی نەداوە حاكمێك یان دادگایەك یان پێشەوایەكی كاریگەر نوێژنەكەرێكی هێنابێتە ژێر حوكمی مورتەددەوەو ئەحكامە شەرعیەكانی لەسەر تەتبیق كردبێت، وەك: كوشتنی، یان ماڵ و منداڵ لێ سەندنەوەی، یان نەشتن و كفن نەكردنی بە شێوەی موسوڵمانانە، یان نەناشتنی لە گۆڕستانی موسوڵماناندا، یان میرات لێ سەندنەوەی و خستنیە ناو بەیتول ماڵەوە.. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە ئەم ئوممەتە كۆڕای لەسەر ئەوە بووە كە نوێژنەكەر كافر نیە..

لەبەر ئەمانەیە كە یەكێكی وەكو ئیمامی نەوەوی دەڵێ: پێشتر مەزهەبی خۆمانم لەم مەسەلەیەدا روون كردەوە كە بریتیە لە تەكفیر نەكردنی نوێژنەكەر، كەوابوو سزای كوشتن دەیگرێتەوە وەك سەرپێچی شەرع نەك وەكو كافربوونەوە، ئەو كاتەش دەشۆرێت و كفن و دەفنی وەكو موسوڵمان بۆ دەكرێت. ئەمەش بۆچوونی مالیك و زۆرینەی سەلەف و خەلەفە، هەرچەندە كۆمەڵێك لە شەرعناسان لەوانە قەولێكی راستی ئیمامی ئەحمەدو عبداللەی كوڕی موبارەك و ئیسحاقی كوڕی راهەوەی رایان وایە كە نوێژنەكەر كافرە.. بۆچوونی ئیمامی ئەبو حەنیفەو

---

[1] النووي: المجموع (٣/٤٧) و ابن قدامة: المغني (٢/٤٤٦) ئیبنوقودامە كە حەنبەلیەو ئەو راوبۆچوونە سەر دەخات كە نوێژنەكەر كافر نیە.

یاوەرانی و كۆمەڵێك لە ئەهلی كوفەو موزەنی و سوفیانی سەوری و ئەوان رایان وایە كە كافر نابێت، بەڵكو زیندان دەكرێت تا ناچار دەبێت بیكات[1]..

**خاڵێكی گرنگ:** دەبێ ئەوە بخەینەوە بەرچاو كە موناقەشەی ئەم دوو پۆلە شەرعناسە بەڕێزە لەسەر ئەو كەسە نیە كە ماوەیەك نوێژ دەكات و وازی لێ دەهێنێت و دواتر دەست پێ دەكاتەوە، وەكو ڕەمەزانەنوێژەكانی كۆمەڵگای كوردی، نا، ئەمانە هەردوو پۆلە زاناكان لەسەر ئەوەن كە پارێزكاری نوێژ نیە بۆیە بە لایانەوە كافر نیەو دەكەوێتە بەر مەشیئەتی خوای گەورە، ئەگەر وویستی لێی خۆش دەبێت و ئەگەر نەشیوویست سزای دەدات[2].

موناقەشەی هەردوولایان لەسەر ئەو كەسەیە كە دەڵێ باوەڕم بە فەرزێتی نوێژ هەیەو ناشیكەم، لەسەر ئەوەش سوورە كە نەیكات.. یەعنی وازلێهێنانی هەمیشەیی گرتۆتە بەر نەك كاتیی.. ئەمەیە كە كەوتۆتە بەر حوكمی ئەو ئایەتەی دەفەرموێ: ﴿فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ ﴿٣١﴾ وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ﴾ القيامة / ٣١-٣٢ واتە: نە پێغەمبەری خوای صلى الله عليه و سلم بە ڕاست زانی، نە نوێژەكانیشی كرد، بەڵكو هەر بەدرۆی خستەوەو پشتی هەڵكردو گوێی نەدایێ..

ئەمما ئەو كەسەی كە ماوە ماوە نوێژی دەچێت، یان لێدەچێتەوەو تێ هەڵدەچێتەوە، ئەوە لای هەردوو پۆلی شەرعناسان بە گشتی بە كافر دانانرێت[1]..

---

[1] النووي: المجموع: (٣/١٦).

[2] ئیمامان ئیبنو تەیمیە لە مجموع الفتاوى (٢٢/٤٨) و ئیبنول قەییم لە الصلاة (ل ٤١) زۆر موناقەشەی ئەمەیان كردووە..

[1] القرني: ضوابط التكفير (ل ١٥٩).

## پوختەی توێژینەوەکە:

١ ـ دەبینین کە بەڵگەی پۆلی یەکەمی شەرعناسان کە حەنبەلیەکانن بەهێزترە، هەرچەندە ئەو هەموو بەڵگەی جمهوری شەرعناسان و زانایانی ئیسلامیش جێی بەهەند وەرگرتنن، بە تایبەتی ئەو بەڵگانەی کە باس لەوە دەکەن کە هەموو گوناحباران (لە ناویشیاندا نوێژنەکەران) لە دۆزەخدا نامێننەوەو دێنە دەرەوە، ئەوەش یەعنی بە موسوڵمان حسێب کردنیان، چونکە ئەگەر کافر بوونایە نەدەبوو بهێنرێنە دەرەوە، وەکو حوکمی خوای پەروەردگار دەرهەق کافران دەرچووە..

٢ ـ لە لایەکی تریشەوە کە دەبینین جمهوری شەرعناسان بە درێژایی مێژووی موسوڵمانان ئەوەیان وەرنەگرتووە، یان لە سەردەمانێك کە یاوەران مابوون نەچەسپێنراوە، دەگەینە ئەو قەناعەتەی کە لەم سەردەمەدا لە ناو خانەوادەکانی خۆشماندا بۆمان ناچەسپێندرێت! بە تایبەتی کە ئیمامی ئەحمەد بۆ یەك نوێژیش دەڵێ: ئەگەر چاوەڕوانی لێکرا نوێژەکەی بکات وتا کاتی نوێژەکە تەواو بوو نەیکرد دەکوژرێت[١]!! ئەو لەسەردەمی خۆیدا نەیدیووە ئەم حوکمەی چەسپێنرابێت، ئیتر لەم سەردەمانەی غەریبی ئیسلامدا چۆن دەچەسپێت؟! یا لەم سەردەمەدا بە خەیاڵ تەسەوری پارچە خاکێکی سەر زەوی بکەین کە کۆمەڵگەیەکی موسوڵمانی تێدا دەژی و ئەم حوکمەی لێ دەچەسپێت؟! تەنانەت لە شاری مەککەی پیرۆز نەك هەر نوێژنەکەر هەزاران مولحیدو بێ دین هەیە.. دژی ئیسلام لە رۆژنامەکانیاندا دەنووسن، بۆچی گەورە زانایانی

---

[١] نیل الاوطار (١/٢٩٣).

حەرەمەین وەکو ئیبنو عوسێمینی ڕەحمەتی و ئەوانەش کە ئێستا هەن نەیانتوانیووە ئەم حوکمە لەسەر کەسێك بچەسپێنن..

٣ ـ هیچ بەڵگەیەك لەبەر دەستدا نیە کە لە ناو یاوەراندا هەبووبێت نوێژی ڕۆژێکی چوو بێت چ جای نوێژنەکەر، بۆیە ئەو بەڕێزانەی دەڵێن کۆڕای یاوەرانی لەسەرە، ڕاستە وایە، بەڵام ئەمە بەڵگەی هیچ لایەکیان نیە، ئەمە نابێتە بەڵگەی بەهێزی ئەو شەرعناسانەی دەڵێن نوێژنەکەر کافرە، چونکە هەموو موناقەشەو ڕاجوێییەکە لە زەمانی دوای یاوەرانەوە دروست بووە، کە خەڵکانێکی وا پەیدابوون ئیسلامیان قبووڵ بووەو ڕۆژوویان گرتووەو زەکاتیان داوە بەڵام نوێژیان نەکردووە!! شتی وا لە سەردەمی یاوەراندا ڕووی نەداوە، بەڵام کە دواتر ڕوویداوە شەرعناسانی کردووە بەو دوو پۆلەوە..

٤ ـ من پێم وایە ئەم حوکمە پڕاوپڕ شیاوی دۆخی کۆمەڵگەی یاوەران بوو، چونکە هەموویان لەبەر ڕۆشنایی وەحی بەردەوام و ئاڕاستەی ئەو پێغەمبەرە پێشەوایەدا صلی الله علیه و سلم پەروەردە بووبوون، هەبوونی یەك نوێژنەکەر وەك گای قەشان لە دوورەوە دەردەکەوت، زەحمەتیش بوو کەسێك بیوێرایە نوێژ نەکات، بۆیە زیاتر لە سێ سەد مونافیقی پیاوو حەفتا مونافیقەی ژن هەبوون، هەموویان نەك هەر نوێژەکانیان دەکرد بەڵکو زەکاتیشیان دەداو دەشچوونە غەزا!! ئەمە تاکە ئەحکامی شەرعی نیە کە بواری چەسپاندنی کەم دەبێتەوە، خۆ سەرفترە بە پێی بەڵگەی فەرموودەو بۆچوونی جمهوری پێشەوایانی مەزهەب (مالیك و شافیعی و ئەحمەد) بە پارە نابێت، بەڵام ئیمامی ئەبو حەنیفە هەر لەو سەردەمەی خۆیدا کە یاوەران مابوون فەرموویەتی بە پارەش دەبێت.. ئێستا لەم سەردەمەی ئێمەدا سەرفترە هەر بە پارە جێبەجێ دەکرێت،

مەگەر تاك و تەرای خەڵکی بتوانن گەنم یان جۆ یان زوڕات یان خورما بدەن.. ئاخر کەسێك لە بەریتانیایەو دەیەوێت سەرفترەکەی بدات، کەس لە بەریتانیا دوو کیلۆ گونم یان جۆی لێ وەرناگرێت، ئەگەر بشیەوێت بیگەێنێتەوە بە داماوێکی کوردستان، چۆن دەیگەێنێت؟! بەڵام ئەگەر بە پارە بوو بە تەلەفۆن و حەواڵە لە ماوەی شەووڕۆژێکدا دەگاتە شوێنی مەخسەد.[1]

٥ ـ دەبێ ئەوە لەبەرچاو بگرین کە بەکافر دانانی نوێژنەکەر کۆمەڵێك ئەحکامی تری بەدوادا دێت، لەوانە:

ـ کەوتنی تەڵاقی لە ژنەکانی، هیچ ئافرەتێکی موسوڵمانیش بۆی نیە شووی پێ بکات..

ـ نەمانی وەلایەتی، یەعنی بۆی نیە منداڵە بچووکەکانی لای خۆی بمێنێت یان کچەکانی خۆی بەشوود بدات..

ـ خواردن و سوود لێوەرگرتنی هەرچی گیانلەبەرێك کە ئەو سەری دەبڕێت حەرامە، چونکە گۆشتی سەربڕاوی کافران حەڵاڵ نیە..

٦ ـ ئەگەر ئێمە وەکو موسوڵمانی ئەم سەردەمەی کورد بمانەوێت ئەم حوکمەیان وەرگرین (جگە لە کوشتنەکەش)، ئایا دەتوانین ژنان لە

---

[1] عومەری کوڕی عبدالعەزیز ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێت ـ قوتابی حەسەنی بەسری بوو، حەسەنی بەسری قوتابی ئەبو هورەیرەیە خوا لێی ڕازی بێت، کە لە ساڵی ٩٩ ك بوو بە خەلیفە سیستمی خیلافەتی هەموو گێڕایەوە سەر سیرەی خولەفای ڕاشیدین بۆیە پێی دەڵێن پێنجەم خەلیفەی ڕاشیدی، ئیبنو کەسیر دەربارەی دەفەرموێ: شەرعناسێکی گەورەبوو، سەیری ئەم خەلیفە شەرعناسە لەم کێشەی نوێژنەکردنەدا بۆچوونی وابوو کە نوێژنەکەر نەك کافر نیە، بەڵکو موسوڵمانەو ناشکوژرێت.. جا سەیری ئەو شەرعناسین و واقیع زانینە لە سەردەمێکدا کە هێشتا یاوەری وەکو ئەبو توفەیل عامری کوڕی واسیلەی لەیسی خوا لێی ڕازی بێت مابوو..

پیاوانی نوێژنەكەر بسێنینەوە؟! ئەگەر وامان كرد كۆڵی چەند هەزار بێوەژن و هەتیومان دەكەوێتە سەر شان؟! ئایا ئەمە قابیلی تەتبیق كردنە؟! نا، بە هیچ شێوەیەك بواری تەتبیق كردنی تەنانەت لە گوندێكیشدا نیە.. بۆیە:

من پێم وایە: ئەو كەسەی لەبەر تەمبەڵی و سستی و مەشغەڵەتی دنیایی نوێژەكانی ناكات هەر موسوڵمان دەمێنێت بە مەرجێك باوەڕی بە فەرزێتی نوێژەكان مابێت.. والله اعلم.

* * *

## حوكمی دنیایی نوێژنەكەر

ئەمــەی رابــورد حــوكمی رۆژی دوایــی نوێژنەكــەرە، ئــەمما حــوكمی دنیایی ئەو، ئەوە هەر یەك لەم دوو پۆلە شەرعناسە بەڕێزە لە دیدی خۆیانەوە بۆ بەڵگە شەرعیەكان حوكمی شەرعی دنیایی نوێژنەكەریان دیاری كردووە:

**یەكەم: ئەوانەی دەڵێن: <u>نوێژنەكەر كافرە</u>:** ئەم بەڕێزانە دەڵێن كە نوێژنەكەر مورتەدد بۆتەوەو دەبێت هەمان حوكمی هەڵگەڕاوە لە دینی بەسەردا دەدرێت.. واتە:

١ ـ نەمانی وەلایەتی بەسەر ماڵ و منداڵەكانیەوە.

٢ ـ نەمیرات وەردەگرێت ونەماڵ وسامانی خۆی دەبێتە میراتی كەس. هەموو سامانی دەخرێتە سەر بەیتولمال. چونكە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم فەرموویەتی: (لَـا يَـرِثُ الْمُسْلِمُ الْكَافِرَ، وَلَـا الْكَافِرُ الْمُسْلِمَ)[1] واتە: میراتی كافر نادرێت بە موسوڵمان و میراتی كافریش نادرێت بە موسوڵمان..

٣ ـ بۆی نابێت بچێتە شاری مەككەی پیرۆز، چونكە كافران بۆیان نیە بچنە مەككەوە..

٤ ـ گۆشتی سەربڕراوی دەستی ناخورێت، چونكە ئەم نەموسوڵمان ماوە نە ئەهلی كیتابیشە.

٥ ـ نوێژ لەسەر جەنازەكەی ناكرێت و دوعاشی بۆ ناكرێت..

---

[1] بوخاری (٤٢٨٣)، موسلیم (١٦١٤).

٦ ـ بۆی نیە ئـافرەتێکی تـری موسـوڵمان مـارە بکـات چـونکە کـافر بووە، هەروەها ژنـی نوێژنەکـەر کـە کـافر بـووە بـۆ پیـاوی موسـوڵمان جائیز نیە بیهێنێت.. چوار پێشـەواکە لەسـەر ئـەوەش کـۆن کـە هـەر یــەکێك لــە هاوســەران کــافر بــۆوە، گرێبەســتی مارەکرنەکــەیان هەڵدەوەشێتەوە..

پاشـان ئـەم شەرعناسـە بەرێزانـە دەڵـێن: حـاکمی ئـەو شـوێنە ئـەو نوێژنەکـەر یـان نوێژنەکەرانـە بـانگ دەکـات و پێیـان دەڵێـت کـە ئەگـەر نوێژەکە نەکەن دەکوژرێن، ئەگـەر نـەیانکرد دەکـوژرێن.. ئەمـەش مـاف و ئـەرکی حـاکمی موسـوڵمانە نـەك هـەر کـەس لای خۆیـەوە بیکاتـە مـاف و ئەرکی خۆی..

**دووەم: ئەوانەی دەڵێن نوێژنەکەر کافر نیە:** لای ئـەم بەرێزانـە نوێژنەکەر فاسقەو لـە دیـن وئوممـەت نەچۆتە دەرەوە، نوێژنەکـەر وەکو هەر تاوانبارێکی ترە، وەکو ئەوەیە کە قەتڵی کردووە، یان زینـای کـردووە، یان دزی کردووە، سزای خۆی وەردەگرێت و پێی پاك دەبێتـەوە.. حـوکمی ئیسلامەتیەکەشـی هـەر دەمێنێـت.. ئـەم شەرعناسـە بەرێزانـە لـە نـاو خۆیانـدا لەسـەر جـۆری سـزاو چـۆنیەتی راپەڕانـدنی حـوکمی نوێژنەکـەر راجوێن:

**١ . بە پێی سزا دەکوژرێت:** ئەمە رای مالیکیـەکان و شـافیعیەکانە کە دەڵێن: دەبێ سەرەتا داوای تۆبەی لێ بکرێت، پێی دەوترێت کە ئەگـەر کاتی نوێژەکە تەواو بوو تۆش نوێژەکەت تێدا نـەکرد دەکوژرێیـت، ئەگـەر نەیکرد دەکوژرێت.. هەندێك لە شەرعناسان فەرموویانە تا سێ رۆژ بواری دەدرێت، لە کاتی هەموو نوێژەکانیشدا وەبیر دەهێنرێتەوە کە ئەگەر نوێژ

نەکات دەکوژرێت، ئەگەر لەو سێ ڕۆژەدا نوێژی نەکرد دەکوژرێت، چونکە دیارە باوەڕی بە فەرزێتی نوێژ نیە..

بۆ چۆنیەتی کوشتنیشی فەرموویانە بە شمشێر دەکوژرێت، پاشان رەفتاری جەنازەی موسوڵمان لەگەڵ جەنازەیدا دەکرێت ولە گۆڕستانی موسوڵمانان دەنێژرێت..

**٢ . ناکوژرێت بەڵکو تەمێ دەکرێت، زیندانی دەکرێت، تا دەمرێت یان تۆبە دەکات:** ئەمە بۆچوونی زوهری وئیبنول موسەییب وعومەری کوڕی عبدالعەزیز و ئەبو حەنیفەو دادوودی زاهیری و موزەنی یاوەری ئیمامی شافیعی و ئیبنو حەزمە.. بەڵگەی ئەمان لەو بۆچوونەدا ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم فەرموویەتی: (لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثٍ الثَّيِّبُ الزَّانِي، وَالنَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ)[١] واتە: ئەو موسوڵمانەی دەڵێ (لا اله الا الله ومحمد رسول الله) نابێت بکوژرێت مەگەر بێوەژنی زیناکار بێت یان قاتڵ یان ئەو کەسەی کە وازی لە دینەکەی هێناوەو لە کۆمەڵەکەی جودا بۆتەوە.. نوێژنەکەیش یەکێك نیە لەمانە..

★ ★ ★

---

[١] بوخاری (٦٨٧٨)، موسلیم (١٦٧٦).

## نوێژ لەسەر کێ فەرزە؟

نوێژ لەسەر هەموو کەسێکی ژیری باڵغ فەرزە، نێرینە بێت یان مێیینە، سەربەست بێت یان کۆیلە..

١ . ژیریی: مەرجە، چونکە بە کۆڕای شەرعناسان نوێژ لەسەر شێت فەرز نیە، پێغەمبەری پێشەوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: (رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثٍ: عَنْ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ وَعَنْ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ وَعَنْ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ)[1] واتە: حوکمی شەرع سێ پۆلە خەڵکی نایانگرێتەوە: خەوتوو تا وەخەبەر دێت، منداڵ تا باڵغ دەبێت (نیشانەکەی ئەوەیە کە شەیتانی دەبێت)، شێتیش تا ژیر دەبێتەوە.

شەرعناسان لە حوکمی ئەو کەسەدا راجوێ بوون کە بە هۆی شتێکی تایبەتەوە هۆشی نەماوە، وەکو: بورانەوەی نەخۆشیەك، یان خواردنەوەی دەرمانێك کە بێ هۆشی کردووە، کە ئایا ئەو حوکمە شەرعیە کە تەکلیف لەسەر بێ هۆش نامێنێت، ئەم جۆرە کەسانەش دەگرێتەوە، یان نا؟!

شەرعناسان دوو پۆلن: حەنبەلیەکان دەڵێن: چۆتە ریزی ئەو کەسانەی ژیرییان نەماوە، بۆیە حوکمی شەرع ئەمیش ناگرێتەوەو فەرزەکانی لەسەر نیە.. یەعنی ئەگەر هۆش خۆی هاتەوەو نوێژی چووبوون، نایانکاتەوە.. باقی مەزهەبەکانی تر دەڵێن: دەبێت بیانگێڕێتەوە[2]..

---

[1] ئەبو داوود (٤٣٩٨)، نەسائی (٤٥٦/٦)، ئیبنوماجە (٢٠٤١) غەیری ئەمانیش، هەموو بە سەحیحیان ناساندووە..

[2] حاشية الدسوقي (١٨٤/١)، مغني المحتاج (١٣١/١)، المحلى (٢٢٣/٢).

ئەوی شەرابی خواردۆتەوەو سەرخۆش بووە، بێ گومان نوێژی لەسەر نیە، چونكە ئەمیان ئایەتی قورئان دەیگرێتەوە كە دەفەرموێ: ﴿لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ﴾ النساء/٤٣ واتە: توخنی نوێژ مەكەونەوە لەو كاتانەدا كە سەرخۆشن، تا بزانن چی دەڵێن.. بەڵام كە بەریداو هۆشی هاتەوە دەبێت نوێژەكانی بكاتەوە..

هەروەها ئەو كەسەی بە هۆی خەوتن یان بیرچوونەوەوە نوێژەكەی دەچێت، دەبێت كە هەستا یان كە بیری كەوتەوە دەسبەجێ بیكات. چونكە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: (اذَا نَسِيَ أحَدُكُمْ صَلَاةً أو نَامَ عَنها فَلْيُصَلِّهَا إذَا ذَكَرَهَا)[١] (وَإِذَا اسْتَيْقَظَ) واتە: هەر كەسێكتان نوێژێكی بیرچوو، یان لە كاتیدا خەوی لێ كەوت، با ئەو كاتەی بیری دەكەوێتەوە بیكات، خەوتووش ئەو كاتەی كە خەبەری دەبێتەوە. شێخ ئیبنو عوسێمین دەڵێ: ئەگەر لە هۆش خۆ چوونەكەی بە دەستی ئەنقەستی خۆی نەبوو، نوێژەكانی ئەو ساتانەی بێ هۆش بووە ناكاتەوە، بەڵام ئەگەر خۆی دەستی لە سەرخۆشیەكەیدا هەبوو، وەكو ئەوەی شەرابی خواردبێتەوە، دەبێت نوێژەكانی بكاتەوە[٢]..

١ ـ **بالّغ بوون:** ئەمیشیان بە رای هەموو شەرعناسان مەرجە، بۆیە نوێژ لەسەر منداڵ فەرز نابێت تا گەورە (بالّغ) دەبێت. چونكە فەرموودەكەی پێشتر هێنامانەوە بە راشكاوی دەفەرموێت (وَعَنْ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ) لەسەر منداڵ فەرز نیە تا نەگاتە قۆناغی شەیتانی بوون..

---

[١] موسلیم (٦٨٤) زیادەكەش سەحیحیە لە عبدالرزاق: المصنف (٥٠٩) وەرگیراوە..

[٢] الشرح الممتع (١٨/٢).

**فەرمان کردن بە منداڵ بۆ نوێژکردن و فێرکردنی:** منداڵ هەرچەندە تا باڵغ نەبێت نوێژەکانی لەسەر فەرز نیە، بەڵام دەبێت سەرپەرشتیارەکانی لە تەمەنی حەوت ساڵیەوە فێری نوێژی بکەن و هەوڵی لەگەڵدا بدەن تا رایبهێنن لەسەری و هانی بدەن تا پێوەی پابەند بێت.. دەبێ لە دە ساڵیدا لەسەری بکەنە فەرمانێکی جیددیتر.. ئەگەر پێوەی پابەند نەبوو دەتوانرێت ـ بۆ بە ئەدەب کردنی ـ لێی بدرێت.. پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: (مُرُوا الصَّبِيَّ بِالصَّلَاةِ إِذَا بَلَغَ سَبْعَ سِنِينَ، وَإِذَا بَلَغَ عَشْرَ سِنِينَ فَاضْرِبُوهُ عَلَيْهَا )[1] واتە: لە حەوت ساڵییدا فەرمان بە منداڵەکانتان بکەن با نوێژەکان بکەن، کە بوونە دە ساڵان لێیاندەن لەسەری.. ئەمەش بۆچوونی جمهوری شەرعناسانە: حەنەفی و شافیعی و حەنبەلی.. بەڵام مالیکی دەڵێن: ئەوە هەر بۆ هاندانەکەیە لەسەر ئاراستە کردنی منداڵەکەو هاندانی سەرپەرشتیارانیانە، ئەگینا خۆ ئەگەر نوێژەکەشی چوو پێی گوناحبار نابێت، خۆ خودی لێدانەکە مەبەست نیە..

شەرعناسان دەڵێن: نوێژ لەسەر کافری ئەسڵی فەرز نیە[2]..

* * *

[1] ئەبو داوود (٤٩٤)، ترمزی (٤٠٧)، ئەحمەد (٦٧٥٦)، ئیبنو ئەبی شەیبە (٣٥٠٠)، تەبەرانی: الكبير (٦٥٤٨) لە سیرەی کوڕی مەعبەدو لە عبداللەی کوڕی عەمرو لە دوو ڕێی تریشەوە هاتووە. شێخی ئەلبانی بە سەحیحی داناوە: صحيح سنن أبي داود (٤٦٥)

[2] الخطيب الشربيني: مغني المحتاج (١/١٣٠)، البهوتي: كشاف القناع (١/٢٢٢).

## چەند نوێژ فەرزە؟

لە شەوو رۆژێکدا پێنج نوێژ فەرزن: نیوەڕۆ، عەسر، شێوان، خەوتنان، سپێدەی بەیانی[١]..

بەڵگەی فەرزێتی ئەم نوێژانە وا لە قورئان و فەرموودەو کۆڕا (ئیجماع) ی شەرعناساندا.. فەرزێتی ئەم نوێژانە بەڵگەنەوویستی ئیسلامەتین، بۆیە هەر کەسێك نکووڵییان لێ بکات یان بە فەرزیان نەزانێت پێی کافر دەبێت[٢]:

١ ـ ئەبو روزەین دەڵێ: نافیعی کوڕی ئەزرەق کەوتە موناقەشەی ئیبنو عەبباسەوە خوا لە هەموویان رازی بێت لەسەر فەرزێتی نوێژەکان: نافیع پرسی: کوا بەڵگەت لە قورئاندا هەیە، کە نوێژە فەرزەکان پێنجن؟! فەرمووی: بەڵێ، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ فَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ ﴿١٧﴾ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ ﴾ الروم/١٧ـ١٨ واتە: پاك و بێ خەوشی بۆ خوای پەروەردگار لەو کاتەی ئێوارەتان بەسەردا دێت و ئەو کاتەی بەیانیتان بەسەر دا دێت، سوپاس و ستایش لە ئاسمانەکان و زەویدا هەر بۆ ئەوە، ئەو کاتانەش کە دەکەونە شێوان و نیوەڕۆوە.. فەرمووی: (حِينَ تُمْسُونَ): ئەوە نوێژی شێوان: (مەغریب)ە، (وَحِينَ تُصْبِحُونَ ): ئەوە نوێژی سپێدەیە، (وَعَشِيًّا): ئەمەش کاتی عەسرە،

---

[١] ئەمە پێناسەی جمهورەو ئیمامی ئەبو حەنیفە دەفەرموێت: وتریش واجیبەو لەگەڵ فەرزەکانە.. لە جێی خۆیدا باسی ئەمە دێت ان شاء الله..

[٢] البدائع (٩١/١)، الفواکه الدواني (١٩٢/١)، مغني المحتاج (١٢١/١)، المغني (٣٧٠/١).

(وَحِينَ تُظْهِرُونَ ): ئەمەش کاتی نیوەڕۆیە[١]..

٢ ـ تەڵحەی کوڕی عوبەیدوالله خوا لێی رازی بێت دەڵێ: (جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ... فَإِذَا هُوَ يَسْأَلُ عَنْ الْإِسْلَامِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَمْسُ صَلَوَاتٍ فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ فَقَالَ هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهَا قَالَ لَا إِلَّا أَنْ تَطَوَّعَ)[٢] واتە: ئەعرابیەك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ولە ئیسلامەتی پرسی پێغەمبەری خوا فەرمووی: لە شەووڕۆژێکدا پێنج نوێژن، پرسی: هی ترم لەسەرە؟! فەرمووی: نا مەگەر خۆت زیاتری بکەیت..

٣ ـ ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی رازی بێت دەڵێ: (فُرِضَتْ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِهِ الصَّلَوَاتُ خَمْسِينَ ثُمَّ نُقِصَتْ حَتَّى جُعِلَتْ خَمْسًا ثُمَّ نُودِيَ يَا مُحَمَّدُ إِنَّهُ لَا يُبَدَّلُ الْقَوْلُ لَدَيَّ وَإِنَّ لَكَ بِهَذِهِ الْخَمْسِ خَمْسِينَ)[٣] واتە: شەوی ئیسرا نوێژەکان لەسەر پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کە فەرز کران، پەنجا نوێژ بوون، پاشان کەم کرانەوە بۆ پێنج، ئینجا لە لای خوای گەورەوە قاسیدێك[٤] هاواری کرد: هۆ موحەممەد، قسەی لای من گۆڕانی بەسەردا نایات، تۆش بە کردنی ئەم پێنج نوێژە پاداشتی پەنجا نوێژت هەیە..

---

[١] الطبري (٢١/٢٠)، ابن المنذر: الاوسط (٣٢٢/٢)، البيهقي: السنن الكبرى (٣٥٩/١)، الطبراني: الكبير (٣٠٤/١٠). سەنەکەی حەسەنە..

[٢] بوخاری (٤٦)، موسلیم (١٦٢).

[٣] بوخاری (٣٤٩)، موسلیم (١٦٢) بە دووردرێژتر..

[٤] ئەوی هاواری شتێك دەكات.

## نوێژی فەرز چەند ركاتە؟

ئیبنول مونزیر دەڵێ: ئەهلی زانست و شەرعناسیی رایان لەسەر ئەوە جەمە كە نوێژی نیوەڕۆ چوار ركاتەو بە ئەسپایی (دەنگی نزم) قورئانی تێدا دەخوێندرێت، دوو دانیشتنی تێدایە، هەردوو ركات دانیشتنێكی بۆ تەحیات خوێندن تێدایە.. ژمارەی ركاتەكانی نوێژی عەسریش چوار ركاتەو وەكو نوێژی نیوەڕۆ دەكرێن، نابێت دەنگیان تێدا بەرز كرێتەوە، لەمیشدا دوو دانیشتن هەیە، هەردوو ركات دانیشتنێكی بۆ تەحیات خوێندن تێدایە.. ژمارەی ركاتی فەرزی نوێژی شێوان (مەغریب) سێ ركاتە: دوو ركاتی یەكەم بەدەنگی بەرز قورئانیان تێدا دەخوێندرێت، سێیەمیان بە بێ دەنگ، لە دوو ركاتی یەكەمدا دانیشتنێكی تێدایەو لە ركاتی كۆتاییشدا دانیشتنێك.. ژمارەی ركاتەكانی نوێژی خەوتنان (عیشا) چوار ركاتەو، دەبێت قورئان خوێندن لە دوو ركاتی یەكەمدا بە دەنگیان بەرز بێت، لە دوانەكەی تریاندا بێ دەنگ دەخوێندرێت، لەمیشدا دوو دانیشتن هەیە، هەردوو ركات دانیشتنێكی بۆ تەحیات خوێندن تێدایە.. ژمارەی ركاتی فەرزی بەیانی (سپێدە: فەجر) دوو ركاتە: لە هەردوو ركاتەكەدا قورئان بەدەنگی بەرز دەخوێندرێت، دانیشتنێكی بۆ تەحیات خوێندن تێدایە.. ئەمە لەسەر نیشتەجێ فەرزە، ئەمما گەشتیار، ئەوە لە هەر نوێژێكدا دوو ركاتی لەسەر فەرز دەمێنێت - جگە لە نوێژی شێوان - كە وەكو موسوڵمانی نیشتەجێ دەبێت هەر سێ ركاتەكەی بكات[١]..

★ ★ ★

---

[١] ابن المنذر: الاوسط (٢/٣١٨).

# باسی دووەم

# مەرجەكانی نوێژ

مەرجی یەكەم: لە كاتی خۆیدا بێت:

- باسی یەكەم: كاتەكانی نوێژ.
- باسی دووەم: نوێژگێڕانەوە.
- ئەو كاتانەی نوێژكردن تێیاندا باش نیە.
- بانگ و قامەت.

مەرجی دووەم: پاكژی

مەرجی سێیەم: داپۆشینی عەورەت.

مەرجی چوارەم: رووكردنە قیبلە.

مەرجی پێنجەم: نیەت هێنان.

# بەڵگەیەکی سەرچاوەیی گرنگ

## ( خاوەن نوێژە هەڵەکە )

فەرموودەیەك بە چەند ریوایـەتێك هەیـە کـە بـە فـەرموودەی (المُسِيْءُ صَلاتَهُ) واتـە خـاوەن نوێژەهەڵەکـە بەناوبانگـە[1]، بـە درێـژایی باسـی نوێـژ پێوویستمان بە پشت پێ بەستن و بیرخستنەوەی دەبێت، بۆیە باشتر وایـە دوو ریوایـەتیمان لەبـەر دەسـتدا بێـت، تـا کـە پێویسـتمان بـوو ئامـاژە بـە ژمارەی پەراوێزەکەی بکەین.. پێشم باش بـوو هـەر لەسـەرەتای دەسـپێکی باسی مەرج و روکنەکانی نوێژەوە تۆماری کەم:

### - ریوایەتی یەکەم:

(أنَّ رَجُلاً دَخَلَ الْمَسْجِدَ يُصَلِّي، وَرَسُولُ اللَّـهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ فِي نَاحِيَةِ الْمَسْجِدِ، فَجَاءَ فَسَلَّمَ عَلَيهِ، فَقَالَ لَهُ: وَعَلَيْكَ السَّلامُ، ارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ، فَرَجَعَ فَصَلَّى، ثُمَّ سَلَّمَ، فَقَالَ: وَعَلَيْكَ السَّلامُ، ارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَـمْ تُصَلِّ فَقَالَ فِي الثَالِثَةِ: فَعَلِّمْنِي، قَال: إذَا قُمْتَ الَى الصَّلاةِ فَأَسْبِغْ الوُضُوءَ، ثُمَّ اسْتَقْبِلْ الْقِبْلَةَ، فَكَبِّرْ وَاقْرأْ مَا تَيَسَّرَ مَعَكَ مِنْ الْقُرآنِ، ثُمَّ ارْكَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ رَاكِعاً ثُمَّ ارْفَعْ رَأْسَكَ حَتَّى تَعْتَدِلَ قَائِماً، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِداً، ثُـمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَسْتَوِيَ وَتَطْمَئِنَّ جَالِساً، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِداً ثُـمَّ ارْفَـعْ حَتَّى تَسْتَوِيَ قَائِماً ثُمَّ افْعَلْ ذَلِكَ فِي صَلاتِكَ كُلِّهَا)[2] واتـە: کابرایـەك هاتـە

---

[1] الالباني: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (١/٥٥ - ٥٧).

[2] فەرموودەیەکی لای سەیدنا ئەبو هورەیرە خوا لێی رازی بێت دەیگێڕێتەوە، بوخاری (٣١/١١، ٤٦٧)، موسلیم (١٠/٢) ئیبنوماجە (٣٢٧/١)، بەیهیقی (١٥/٢، ٣٧٢) لە رێی عوبەیدوڵڵای کوڕی عومەر لە سەعیدی ئبنو ئەبی سەعیدەوە.. هەروەها ئەبوداوود

مزگەوتەوەو نوێژی دابەست، پێغەمبەری خواش صلی الله علیە وسلم لە کەناری مزگەوتەکەدا بوو، دوای تەواوبوونی نوێژەکەی هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم و سەلامی لێ کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرمووی: وە علیك السلام، بگەڕێرەوە نوێژەکەت بکە، چونکە تۆ نوێژت نەکرد.. ئەویش گەڕایەوەو نوێژەکەی کردەوە، پاشان هاتەوە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم و سەلامی لێ کردەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەوە: وە علیك السلام، بگەڕێرەوە نوێژەکەت بکە، چونکە تۆ نوێژت نەکرد.. لە سێیەمین جاردا کابرا فەرمووی: دەی سا فێرم کە، پێغەمبەری خواش صلی الله علیە وسلم فەرمووی: کە هەستایت بۆ نوێژ، دەستنوێژت بە چاکی بگرە، پاشان روو بکەرە قیبلەو تەکبیرەی ئیحرام بکەو نوێژ دابەستە، پاشان لەو قورئانەی لەبەرتە چەندت بۆ ئاسان بوو بیخوێنە، پاشان بچۆرە رکووع و بمێنەرەوە تا جەستەت دەسرەوێت و ئۆقرە دەگریت، پاشان هەستەرەوە سەر پێیان و رێك و راست راوەستە تا جەستەت دەسرەوێت و ئۆقرە دەگریت، پاشان بچۆرە سوجدەو بمێنەرەوە تا جەستەت دەسرەوێت و ئۆقرە دەگریت، ئینجا سەرت بەرز کەرەوەو دانیشە، ئاواش بمێنەرەوە تا جەستەت دەسرەوێت و ئۆقرە دەگریت، پاشان بچۆرەوە بۆ سوجدەو بمێنەرەوە تا جەستەت دەسرەوێت و ئۆقرە دەگریت، پاشان هەستەرەوە سەر پێ و راوەستەوە، لە هەموو نوێژەکانتدا ئاوا بکە..

---

(١٣٦/١)، نەسائی (٤١)، ترمزی (١٠٣/٢)، ئیمامی ئەحمەد (٤٣٧/٢) لە رێیەکی ترەوە، دیسان بوخاری (١٩١/٢، ٢١٩، ٢٢٢)، بەیهیقی (٣٧/٢، ٦٢، ٣٧٢).

## ـ ریوایەتی دووەم:

ـ عَلِيُّ بْنُ يَحْيَى بْنِ خَلادٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَمِّهِ رِفَاعَةَ بْنِ رَافِعٍ: أَنَّهُ كَانَ جَالِسًا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذْ جَاءَ رَجُلٌ فَدَخَلَ الْمَسْجِدَ فَصَلَّى، فَلَمَّا قَضَى صَلَاتَهُ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعَلَى الْقَوْمِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَعَلَيْكَ، ارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ، قَالَ: فَرَجَعَ فَصَلَّى، فَجَعَلْنَا نَرْمُقُ صَلَاتَهُ لَا نَدْرِي مَا يَعِيبُ فِيهَا، فَلَمَّا قَضَى صَلَاتَهُ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعَلَى الْقَوْمِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَعَلَيْكَ، ارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ . فَذَكَرَ ذَلِكَ إِمَّا مَرَّتَيْنِ وَإِمَّا ثَلَاثًا، فَقَالَ الرَّجُلُ: لَا أَدْرِي مَا عِبْتَ عَلَيَّ مِنْ صَلَاتِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّهَا لَا تَتِمُّ صَلَاةُ أَحَدِكُمْ حَتَّى يُسْبِغَ الْوُضُوءَ كَمَا أَمَرَهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ، فَيَغْسِلَ وَجْهَهُ، وَيَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ، وَيَمْسَحَ بِرَأْسِهِ وَرِجْلَيْهِ إِلَى الْكَعْبَيْنِ، ثُمَّ يُكَبِّرَ اللَّهَ وَيَحْمَدَهُ وَيُمَجِّدَهُ، وَيَقْرَأَ مِنَ الْقُرْآنِ مَا أَذِنَ اللَّهُ لَهُ فِيهِ وَتَيَسَّرَ، ثُمَّ يُكَبِّرَ فَيَرْكَعَ، فَيَضَعَ كَفَّيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ حَتَّى تَطْمَئِنَّ مَفَاصِلُهُ وَتَسْتَرْخِيَ، ثُمَّ يَقُولُ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، وَيَسْتَوِيَ قَائِمًا حَتَّى يَأْخُذَ كُلُّ عُضْوٍ مَأْخَذَهُ، وَيُقِيمَ صُلْبَهُ، ثُمَّ يُكَبِّرَ فَيَسْجُدَ، وَيُمَكِّنَ جَبْهَتَهُ مِنَ الْأَرْضِ حَتَّى تَطْمَئِنَّ مَفَاصِلُهُ وَتَسْتَرْخِيَ، ثُمَّ يُكَبِّرَ فَيَرْفَعَ رَأْسَهُ فَيَسْتَوِيَ قَاعِدًا عَلَى مَقْعَدَتِهِ وَيُقِيمَ صُلْبَهُ، فَوَصَفَ الصَّلَاةَ هَكَذَا حَتَّى فَرَغَ، ثُمَّ قَالَ: لَا تَتِمُّ صَلَاةُ أَحَدِكُمْ حَتَّى يَفْعَلَ ذَلِكَ)[1] واتە: عەلی کوڕی یەحیای کوڕی خەلاد لە باوکیەوە،

---

[1] بوخاری / بەشی قیرائەت (١١ ـ ١٢)، نەسائی (١/١٩٤)، حاکم (١/٢٤٢) لە ڕێی داوودی کوڕی قەیسەوە. هەروەها: بوخاری و نەسائی (١٦١ و ١٩٣)، شافیعی لە: الام (١/٨٨) دا، بەیهیقی (٢/٣٧٢)، ئیمامی ئەحمەد (٤/٣٤٠) لە ڕێی محمدی کوڕی عەجلانەوە، هەروەها: ئەبوداوود (١/١٣٧) لە ڕێی محمدی کوڕی عەمرەوە، ئەوانیش لە عەلی کوڕی یەحیای کوڕی خەلادەوە..

ئـەمیش لـە ریفاعـەی کـوڕی رافیعـی مامیـەوە دەگێڕێتـەوە کـە دەڵـێ: لـە خزمــەت پێغەمبــەری خــوادا صــلی الله علیــە وســلم دانیشــتبووین کــە کابرایەك هاتە مزگەوت و نوێـژی کـرد، کـە نوێژەکـەی تـەواو کـرد، هاتـە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و سەلامی لەوو لە حازریـان کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وەڵامی دایەوە سەلامی خـوا لـە تۆش، بگـەڕێرەوە نوێژەکـەت بکـەرەوە، چونکە تـۆ نوێـژت نـەکرد، دەڵـێ: گەڕایەوە نوێژەکەی کردەوە، بە تیلەی چاو دیقەتمان لە پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیه وسلم دەداو سەیری کابرامان دەکرد، نەمانـدەزانی نوقسانی نوێژەکـەی چـی بـوو.. کـە نوێژەکـەی تـەواو کـرد، هاتـەوە خزمـەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و سەلامی لەوو لە حازریان کـردەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیـه وسـلم دیسـان فـەرمووی: سـەلامی خـوا لـە تۆش، بگەڕێرەوە نوێژەکەت بکە، چونکە تۆ نوێژت نـەکرد.. دووجـار بـوو یان سێ جار ئەوەی پێ فەرموو، کابرا ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا، نـازانم چ عەیبێکت لە نوێژەکـەم گـرت؟! پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم فەرمووی: نوێژی کەستان تەواو نابێت هەتا بەو شێوەی کـە خـوای گـەورە فەرمانی پێداوە، دەسـتنوێژ بـە رێکـوپێکی نـەگرێت، دەموچـاوی نەشـوات، ئینجـا دووباسـکی تـا ئانیشـکی بشـوات، پاشـان مەسـحی سـەری بکـات و پێیەکانی بشوات، ئینجا الله اکبر بکات و نوێـژ دابەسـتێ، ئینجا سـوپاس و ستایشی خوا گەورە بکات و ئەوەندەی خوای گەورە رێی پـێ دەدات و بـۆی ئاسـانە قورئـانی تێـدا بخوێنێـت، پاشـان تـەکبیر بکـات و بچـێتە رکـووع،

---

ئەلبانی دەفەرموێ: پیاوانی سەنەدەکان پیاوانی راوی بوخارین و سەنەدەکانیش سەحیحن.. ئیمامی ئیبنو حەجەری عەسقەلانی چەندین رێی تری باس فەرمووە لە فتح الباری دا لە بابەکانی: (التکبیر) و (الاستفتاح) ، (القراءة) دا..

هـەردوو لـەپی دەسـتی لەسـەر هـەردوو كەڵكـەی ئـەژنۆكانی دابنێـت، ئـاوا بمێنێتەوە تا ئەندامـەكانی لەشـی ئـۆقرە دەگـرن و جەسـتەی دەسـرەوێت، پاشان سەر بەرز كاتەوە، كە قامـەتی راسـت بـۆوەو رێـك راوەسـتاو هـەموو ئەندامەكانی لەشی جێی خۆیـان گرتـەوە، بڵـێ سمع اللـه لمـن حمـده، واتـە خوا ئەو كەسـە دەبیسـتێت كـە سـوپاس و ستایشـی دەكـات، پاشـان تـەكبیر دەكات و دەچێتە سوجدە، ناوچـەوانی بـە تـەواوی دەخاتـە سـەر زەوی ووا دەمێنێتـەوە تـا جومگـەكانی ئـۆقرە دەگـرن جەسـتەی دەسـرەوێ، پاشـان تـەكبیر دەكـات و سـەری بـەرز دەكاتـەوە، تـا بـە تـەواوی لەسـەر سمـتی دادەنیشێت و و لەشـی رێـك دەكاتـەوە.. ئـاوا نوێـژی تـا تـەواو كـردن بـاس فەرموو،پاشان فەرمووی: نوێژی كەستان تەواو نابێت هەتا ئاوا نەكات..

*    *    *

## مەرجەکانی دروستی نوێژ

مەرج ئەوەیە کە بە نەبوونی (مەرج بۆکراو)یش نابێت، بەڵام هەبوونی مەرج، نابێتە بەڵگەی هەبوون یان نەبوونی مەرج بۆ کراو.. بۆ نموونە: نەبوونی دەستنوێژ دەبێتە هۆی نەبوونی نوێژ، بەڵام هەبوونی دەستنوێژ نابێتە هۆی هەبوونی نوێژ.. چونکە لەوانەیە دەستنوێژەکە بۆ تەواف کردن گیرابێت..

مەرجی یەکەم هاتنی کاتی نوێژەکەیە، پێش باس کردنی ئەم مەرجە پێویستە سەرەتاو کۆتایی کاتەکان روون بکرێنەوە :

### مەرجی یەکەم

### لە کاتی خۆیدا بێت

## باسی یەکەم : کاتی نوێژەکان

مەرجی یەکەم زانینی هاتن و مانی کاتی نوێژەکەیە.. ئەمـە مەرجـە، چونکە خوای پەروەردگار دەفـەرموێ ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا﴾ النساء/١٠٣ واتە: نوێژ کردن بە گوێرەی کـاتی دیـاریکراو لەسـەر موسوڵمانان فەرزە.. هەروەها سوونـنەتی پێغەمبەری خواش صلی الله علیه وسلم سەرەتاو کۆتایی کـاتی هـەر یـەکێك لـە پێـنج فەرزەکـەی نوێـژی بـۆ موسـوڵمانان روون کردۆتـەوە.. نوێـژیش خواپەرسـتیەکە کـە دەبێـت لـە کاتێکی دیاری کراودا بکرێت، بـە کـۆڕای شەرعناسـان ناشـێت پـێش هـاتنی

کاتەکەی بکرێت، بە بۆچوونی هەندێك لە شەرعناسان نابێت دوای تـەواو بوونی کاتەکەی بکرێت،مەگەر عوزرێك هەبێت.. شەرعناسان فەرموویانە: مـەرج نیـە زۆر ووردەکارانـە بزانێـت کـە کـاتی نوێژەکـەی بـوو یـان نـان، بەسەرچوو یان نا، ئەوەندەی بەسە کە گومانی زیاتری بۆ ئەوە بچێت کە کاتی نوێژەکە هاتووە یان ماوە[١]..

موسوڵمانان لەسەر ئەوە رێکن کە کاتـەکانی نوێـژی فـەرز پێـنج کـاتی دیاری کراون، بەڵگەی سـەرەتاییان ئـەو ئایەتەیـە کـە خـوای گـەورە تێیـدا فەرموویـــەتی: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا﴾ النســـاء/ ١٠٣ واتە: نوێژ کردن بە گوێرەی کاتی دیاری کراو لەسەر موسوڵمانان فـەرزە.. ئەمەش روون کردنەوەی چۆنیەتی دیاری کردنی کاتەکانیان:

### یەکەم: نوێژی نیوەڕۆ:

دیارە لە کوردیدا یەعنی نیوەی رۆژ، پیرەکانی باشووری کوردستان دەڵێن زەوال، کە عارەبیەو یەعنی لار بوونەوەی خۆر لە ناوەندی ئاسمانەوە بەرەو خۆرئاوابوونی خۆی.. کەوابوو سەرەتای دەسپێکی کاتی نوێژی نیوەڕۆ ئەو ساتەیە کە خۆر لە ناوەندی ئاسمانەوە بەرەو خۆرئاوا بوون چووە[٢].. نیوەڕۆ یەکەمین نوێژە، لەبەر ئەوەی یەکەمین نوێژ بوو کە جوبرەئیل هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و چۆنیەتیەکەی فێر کرد تا بیکات.. پێشی دەوترێت (هەجیرە): ئەبو بەرزە خوا لێی رازی بێت دەڵێ: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي

---

[١] ابن عابدين (٢٤٧/١)، الدسوقي (١٨١/١)، مغني المحتاج (١٨٤/١)، كشاف القناع (١٥٧/١).
[٢] النووي: المجموع (٢٤/٣)، ابن قدامة: المغني (٣٧٢/١).

الْهَجِيرَةَ الَّتِي يَدْعُونَهَا الْأُولَى حِينَ تَدْحَضُ الشَّمْسُ أَو تزولُ )[١] واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم ئەو كاتە نوێژی هەجیرەی دەكرد ـ كە پێی دەڵێن یەكەم ـ كە خۆر لە چەقی ئاسمانەوە بەرەو خۆرئاوابوون لار دەبۆوە..

<u>دەسپێكی كاتی نیوەڕۆ:</u> لەو كاتەوە دەست پێ دەكات كە خۆر لە چەقی ناوەندی ئاسمانەوە بەرەو خۆرئاوابوون لار دەبێتەوە.. ئەمە كۆڕای شەرعناسانی سلەسەرە چونكە فەرموودەی پێغەمبەری خوای صلی الله علیە وسلم لەسەرە، وەك فەرموودەكەی پێشووی ئەبوبەرزەو فەرموودەكەی عبداللەی كوڕی عەمر خوا لێیان ڕازی بێت كە دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرمووی: (وَقْتُ الظُّهْرِ إِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ، وَكَانَ ظِلُّ الرَّجُلِ كَطُولِهِ، مَا لَمْ يَحْضُرِ الْعَصْرُ، وَوَقْتُ الْعَصْرِ مَا لَمْ تَصْفَرَّ الشَّمْسُ. وَوَقْتُ صَلَاةِ الْمَغْرِبِ مَا لَمْ يَغِبِ الشَّفَقُ، وَوَقْتُ صَلَاةِ الْعِشَاءِ إِلَى نِصْفِ اللَّيْلِ الْأَوْسَطِ. وَوَقْتُ صَلَاةِ الصُّبْحِ مِنْ طُلُوعِ الْفَجْرِ مَا لَمْ تَطْلُعِ الشَّمْسُ، فَإِذَا طَلَعَتِ الشَّمْسُ فَأَمْسِكْ عَنِ الصَّلَاةِ؟ فَإِنَّهَا بَيْنَ قَرْنَي الشَّيْطَانِ)[٢] واتە: كاتی نیوەڕۆ لەو ساتەوەیە كە خۆر لار دەبێتەوە، تا ئەو ساتەی سێبەری كابرا بەقەدەر باڵای خۆی لێ دێت، پێش ئەوەی عەسر دابێت.. كاتی عەسریش تائەو كاتەیە كە خۆر زەرد نەبووە.. كاتی نوێژی شێوان تا پێش دیار نەمانی شەفەقە (زەردایییەكەی كەناری ئاسمان).. كاتی نوێژی خەوتنان (عیشا) تا نیوەی ناوەندی شەوە.. كاتی نوێژی بەیانی لە دەركەوتنی سپێدەوەیە تا خۆر هەڵدێت، كە خۆر هەڵهات هیچ نوێژێك

---

[١] بوخاری (٥٤١).
[٢] موسلیم (٦١٢).

لەو ساتەدا مەکە چونکە لەو ساتەدا خۆر وا لە نوێان دوو قۆچی شەیتاندا..

**کۆتایی کاتی نیوەڕۆ:** شەرعناسان لە دیاری کردنی کۆتایی کاتی نوێژی نیوەڕۆدا کەمێك راجوێ بوون، پەسەندترینیان رای جمهوری پێشەوایانە کە دەڵێن تا ئەو ساتەیە کە سێبەری شتێك لە رادەی درێژی خۆی زیاتر دەبێت.. بەڵام ئیمامی ئەبو حەنیفە دەڵێ: ئەو ساتە کۆتاییەتی کە سێبەری شت دوو ئەوەندەی خۆی لێ هاتبێت[١]! جمهوری پێشەوایان ئەمانە دەکەنە بەڵگەی خۆیان:

١ ـ فەرموودەکەی پێشووی ئیبنو عومەر کە لەسەرەوە هێنامانەوە کە راشکاوانە دەڵێ: (وَكَانَ ظِلُّ الرَّجُلِ كَطُولِهِ، مَا لَمْ يَحْضُرِ الْعَصْرُ).

٢ ـ فەرموودەکەی سەیدنا جابری کوڕی عبدالله خوا لێیان رازی بێت کە دەڵێ: (خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَصَلَّى الظُّهْرَ حِينَ زَالَتْ الشَّمْسُ وَكَانَ الْفَيْءُ قَدْرَ الشِّرَاكِ ثُمَّ صَلَّى الْعَصْرَ حِينَ كَانَ الْفَيْءُ قَدْرَ الشِّرَاكِ وَظِلِّ الرَّجُلِ ثُمَّ صَلَّى الْمَغْرِبَ حِينَ غَابَتْ الشَّمْسُ ثُمَّ صَلَّى الْعِشَاءَ حِينَ غَابَ الشَّفَقُ ثُمَّ صَلَّى الْفَجْرَ حِينَ طَلَعَ الْفَجْرُ ثُمَّ صَلَّى مِنْ الْغَدِ الظُّهْرَ حِينَ كَانَ الظِّلُّ طُولَ الرَّجُلِ ثُمَّ صَلَّى الْعَصْرَ حِينَ كَانَ ظِلُّ الرَّجُلِ مِثْلَيْهِ قَدْرَ مَا يَسِيرُ الرَّاكِبُ سَيْرَ الْعَنَقِ إِلَى ذِي الْحُلَيْفَةِ ثُمَّ صَلَّى الْمَغْرِبَ حِينَ غَابَتْ الشَّمْسُ ثُمَّ صَلَّى الْعِشَاءَ إِلَى ثُلُثِ اللَّيْلِ أَوْ نِصْفِ اللَّيْلِ شَكَّ زَيْدٌ ثُمَّ صَلَّى الْفَجْرَ فَأَسْفَرَ)[٢] واتە:

---

[١] مواهب الجليل (٣٨٢/١)، مغني المحتاج (١٢١/١)، المغني (٣٧١/١)، ابن المنذر: الاوسط (٣٢٧/٢)، بدائع الصنائع (١٢٣/١).

[٢] نەسائی (٥٢٤ ـ ٢٦١/١) شێخی ئەلبانی لە إرواء (٢٧٠/١) بە سەحیحی ناساندووە..

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم تەشریفی بردە دەرەوە، کە خۆر لە نێوەندی ئاسمان بەرەو خۆرئاوابوون لار بۆوە نوێژی نیوەڕۆی کرد، سێبەریش بەقەدەر لاسکی نەعلێك بوو[١]، پاشان کە سێبەرەکە لە لاسکی نەعل و بەدەنی پیاوێك تێپەڕی نوێژی عەسری کرد، کە خۆریش ئاوا بوو نوێژی شێوانی کرد، کە زەردو سوریی ئاسۆش نەما نوێژی خەوتنانی کرد.. کە سپێدەش دەرکەوت نوێژی بەیانی کرد. بۆ سبەینێ کە نوێژی نیوەڕۆی کرد، لەو ساتەدا کردی کە سێبەری پیاو بەقەدەر بالآی خۆی لێهاتبوو، پاشان نوێژی عەسری ساتێك کرد کە سێبەری پیاو دوو ئەوەندەی بالآی خۆی لێهاتبوو، ماوەی ئەوەندەی کە کەسێك بە کاوەخۆ (لەسەرخۆو هێدیانە) بڕوات تا دەگاتە ناوچەی زیل حەلیفە.. پاشان کە خۆر ئاوا بوو نوێژی شێوانی کرد، پاشان نوێژی عیشای کاتێك کرد کە سێیەکی شەو یان نیوەی شەو[٢] ڕۆیشتبوو. کە دنیاش روناك بۆوە نوێژی بەیانی کرد..

لەم فەرموودەدا دوو کاتی جیاوازی نوێژی نیوەڕۆو عەسر هەیە، هۆیەکەشی ئەوەیە کە وویستوێتی سەرەتاو کۆتایی کاتی نوێژەکان بۆ موسوڵمانان دیاری بکات، چونکە یەکەمین ڕۆژ لەسەرەتای دەسپێکی کاتەکانەوە نوێژەکانی کردووە،لە دووەم ڕۆژدا لە کۆتایی کاتەکانەوە کردوێتی.. نابینیت نوێژی نیوەڕۆی لە ڕۆژی دووەمدا ئەو کاتە کرد کە

---

[١] قدر الشراك: بەقەدەر ئەو لاسکە چەرمەی کە ئاغزونەیان پێوە دەکردو پاژنەی نەعلیان بە پێشەوەی دەبەستەوە، یان بەقەدەر ئەو زمانە چەرمیەی لەسەرو پەنجەکانەوە بەرەو لولاق هەڵدەکشا کە پەتی قایمکردنی نەعلی پێدا گوزەر دەکرا، کە وەکو زمانەی پێڵاوی وەرزشی ئەم سەردەمە بووە کە قەیتانەکانی پێدا تێدەپەڕێنرێت..

[٢] ئەمە گومانی زەیدە کە یەکێکە لە پیاوانی سەنەدی گێڕانەوەی فەرموودەکە..

ئیتر سەرەتای نوێژی عەسر بوو كە سێبەری شت دوو ئەوەندەی بەرزایی ئەو شتەی لێ هاتبوو[١]..

٣ ـ فەرموودەكەی ئیبنو عەبباس خوا لێیان رازی بێت دەربارەی پێش نوێژیەكەی جیبریل سەلامی خوای لێ بێت كە بۆ پێغەمبەری خوای صلى الله عليه وسلم كرد كە دەربارەی دەفەرموێ: (أمَّنِي جِبْرِيلُ عِنْدَ البيتِ مَرَّتينِ، فصَلَّى بيَ حِينَ زَالَتْ الشَّمْسُ، وَكَانَتْ قَدْرَ الشِّرَاكَ، وَصَلَّى بي العَصْرَ حِينَ، كَانَ ظِل ُالشَّيءِ مِثلهُ، وَصَلَّى بي المَغْرِبَ حِينَ أفْطَرَ الصَّائِمُ، وَصَلَّى بي العِشَاءَ حينَ غابَ الشَّفَقُ ، وَصَلَّى بي الفَجْرَ حينَ حَرُمَ الطعامُ والشَّرَابُ علَى الصَّائِمِ، فلَمَّا كانَ الْغَدُ صَلَّى لِي الظهرَ حينَ كانَ ظِلُّ الشَّيءِ مِثْلَهُ ، وَصَلَّى بي الْعَصْرَ حينَ كانَ ظِلُّ الشيءِ مِثْلَيهِ، وَصَلَّى بي الْمَغْرِبَ حينَ أفْطرَ الصَّائِمُ. وَصَلَّى بي الْعِشَاءَ إلى ثُلْثِ الليلِ ، وَصَلَّى بي الْفَجْرَ فأسْفرَ. ثمَّ الْتفَتَ إلَيَّ وقالَ: يَا مُحَمَّدُ: هذا وَقْتُ الأنبياءِ مِنْ قَبْلِكَ ، وَالوقْتُ مَا بينَ هذينِ الوقتينِ)[٢] واتە: جوبرەئیل لە ماڵی خوا لە كەعبە دوو جاری پێش نوێژی بۆ كردم: كە خۆر لە ناوەندی ئاسمانەوە بەقەدەر لاسكی نەعلێك بەرەو خۆرئاوا ترازا نوێژێكی پێ كردم، ئەو كاتەی سێبەری شتێك بەقەدەر شتەكە خۆی دەبوو نوێژی عەسری پێ كردم، ئەو كاتەی رۆژووەوان رۆژووەكەی دەشكێنێت نوێژی شێوانی پێ كردم، ئەو كاتەش كە زەردوسووری شەفەق ئاوابوو نوێژی خەوتنان (هیشا)ی پێ كردم، بەیانی لەو كاتەدا كە خواردن و خواردنەوە لە رۆژووەوان حەرام دەبێت نوێژی سپێدەی پێ كردم..

---

[١] الشوكاني: نيل الاوطار (٣٧٤/١).

[٢] الألباني: صحيح أبي داود (٣٧٧).

بۆ سبەینێ نوێژی نیوەڕۆی کاتێك بۆ کردم کە سێبەری هەموو شتێك بەقەدەر شتەکە خۆی دەبوو، نوێژی عەسریشی کاتێك پێ کردم کە سێبەری هەموو شتێك بەقەدەر دوو ئەوەندەی شتەکە خۆی دەبوو، کاتێکیش نوێژی شێوانی پێکردم کە کاتی ڕۆژوو شکاندنی ڕۆژووەوان بوو، کاتێکیش نوێژی خەوتنانی پێ کردم کە سێیەکی شەو ڕۆیشتبوو، نوێژی بەیانیشی ئەو کاتە پێکردم کە فەجر سپێدەی دابوو.. پاشان لای کرد بە لامەوەو فەرمووی: ئەی موحەممەد، ئا ئەوە کاتی خواپەرستی پێغەمبەرانی پێش تۆیەو کاتەکانی تریش وان لەو نێوانەدا..

کەوابوو لەوکاتەدا کە سێبەری شتێك بەقەدەر بالأی خۆی دەبێت کۆتایی نوێژی نیوەڕۆو سەرەتای کاتی نوێژی عەسرە، واتە لەو کاتەدا دەشێت بواری چوار رکات نوێژ بۆ هەردوو نوێژەکە حسێب بکرێت.. بۆ نموونە کەسێك نوێژی نیوەڕۆی نەکردووەو گەیشتۆتە ئەو ساتە، دەکرێت پێی بوترێت خێرا نوێژەکەت بکە، کە سەلامی دایەوە دەتوانێت نوێژی عەسرەکەشی بکات[١]..

ئەم حسابات کردنە بۆ ناوەڕاستی گۆی زەوی دەبێت، هەروەها بۆ کوردستان، نەك بۆ شوێنێکی وەکو سویدو نەرویج کە خۆر هەر نایاتە ناوەڕاستی ئاسمان.. لەو دوو وولأتە شوێنی وا هەیە کە بە چەندین مانگ خۆر تەنها بە پێنج یەکی ئاسماندا دەڕوات، هەر کەوانەیەك بەرامبەرت دروست دەکات و بەس! بۆیە دەبێت هەر بە سەعات بێت..

---

[١] ئیمامی نەوەوی لە شەرحی سەحیحی موسلیمدا ئەم نموونەیە دەباتەوە سەر ئیمامی مالیك، هەروەها ئیبنو روشد لە بدایە المجتهد (١٢٥/١)، بەلأم ئیبنول مونزیر دەفەرموێ (٣٢٧/٢): ئەو ساتە نوێژی نیوەڕۆکەی تێدا نامێنێت..

ئێستا دیاری کردنی کاتی نوێژەکان لە هەموو جیهاندا ئاسان بووە. لە هەموو شارو وولاتێك دەتوانیت ساتی خۆر هەڵهاتن و ساتی خۆر ئاوا بوون دیاری بکەیت، بۆیە ئاسان دەتوانیت پێش خۆر هەڵهاتن بە سەعاتو نیوێك بکەیتە دەسپێکی نوێژی بەیانی و سەعات و نیوێك پاش خۆرئاوابوون بکەیتە نوێژی خەوتنان (عیشا).. بۆ نیوەڕۆش دەتوانیت ناوەندی ساتەوەختی خۆرهەڵهاتن وخۆرئاوابوونەکە دیاری بکەیت و بڵێیت ئەمە نیوەڕۆیە، لەو ساتی نیوەڕۆیەشەوە تا خۆرئاوابوونەکە دەکرێت بکەیت بە دوو بەشی ترەوە (وەك ئەوەیە کە ڕۆژەکەت کردبێت بە چوار بەشەوە) سەرەتای بەشی دووەمیان (چوارەمین چارەکی ڕۆژەکە) بکەیتە سەرەتای کاتی نوێژی عەسر..

- سوونەتە ئەگەر هەواو خۆش بوو زوو نوێژی نیوەڕۆ بکرێت، ئەگەر گەرما بوو دوا بخرێت، چونکە سەیدنا جابری کوڕی عبدالله خوا لێیان ڕازی بێت دەڵێ: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ إِذَا اشْتَدَّ الْبَرْدُ بَكَّرَ بِالصَّلَاةِ، وَإِذَا اشْتَدَّ الْحَرُّ أَبْرَدَ بِالصَّلَاةِ)[١] واتە: ئەو کاتانەی کە دنیا فێنك دەبوو پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم نوێژی نیوەڕۆکەی زوو دەکرد، ئەو کاتانەش کە گەرم دەبوو نوێژی نیوەڕۆی دواتر دەخست..

- سەیدنا ئەبو زەڕی غیففاری خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە: لە گەشتێکدا لە خزمەت پێغەمبەری خوا دا بووین صلى الله علیه وسلم، بانگدەرەکە وویستی بانگ بۆ نوێژی نیوەڕۆ بدات، پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم فەرمووی: دوای خە، دواتر بانگدەرەکە وویستی بانگ بدات، دوو جار، سێ جار فەرمووی: دوای خە.. پاشان فەرمووی: (أَبْرِدُوا

---

[١] بوخاری (٥٣٤)، موسلیم (٦١٥).

بالصَّلَاةِ فَإِنَّ شِدَّةَ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ)[١] واته: نوێژەکه دواتر خەن، چونکه زۆربەتینێتی گەرما له هەڵم و هەڵاوی دۆزەخەوەیه..

**دووەم: نوێژی عەسر:**

عەسر: ئەو ماوەکاتەیه که نیوەی دووەمی نێوان نیوەڕۆو خۆرئاوابوونه، که کۆتا ساتەکانی ڕۆژه، نوێژی عەسریش لەم کاتەدا فەرزه، نوێژەکەش به ناوی کاتەکەوەیەو پێی دەوترێت: نوێژی عەسر.. نوێژی ناوەند (صلاةُ الوُسْطَى) یشی پێ دەوترێت.

**دەسپێکی کاتی عەسر:** به پێی بۆچوونی جمهوری پێشەوایانی شەرعنتسیی، سەرەتای دەسپێکی کاتی نوێژی عەسر ئەو کاتەیه که سێبەری هەموو شتێك لەقەدەر باڵای خۆی زیاتر بووه.. بەڵام لای ئیمامی ئەبو حەنیفه مەرجه که سێبەرەکه دووبەرامبەری باڵای شتەکەی لێ هاتبێت ئینجا سەرەتای کاتی نوێژی عەسره!! بەڵگەی بۆچوونی جمهور بەهێزتره[٢]..

**کۆتایی کاتی عەسر:** ڕاوبۆچوونەکان له دیاری کردنی کۆتایی کاتی نوێژی عەسردا جیاوازن، چونکه ئاماژەی ناو بەڵگەکان جوێن:

- فەرموودە مەوقووفەکەی سەیدنا عبداللەی کوڕی عەمر خوا لێی ڕازی بێت (وَوَقْتُ الْعَصْرِ مَا لَمْ تَصْفَرَّ الشَّمْسُ)[٣] واته: کاتی

---

[١] بوخاری (٥٣٩)، موسلیم (٦١٦)

[٢] جواهر الاكليل (٣٢/١)، مغني المحتاج (١٣١/١)، المغني (٣٧٥/١)، فتح القدير (١٩٥/١).

[٣] موسلیم (٦١٢).

عەسریش تا ئەو كاتەیە كە خۆر زەرد نەبووە.. ئەمەش بۆچوونی ئیمامی ئەحمەدو ئەبوسەورو ریوایەتێكی ئیمامی مالیكە[1].

ـ فەرموودەكەی سەیدنا ئەبو موسا خوا لێی رازی بێت كە كابرا پرسیاری دەربارەی كاتی نوێژەكان كرد، كە تێیدا هاتبوو: (أنَّ النَّبيَّ صَلَّى اللهُ عليه وَسَلَّمَ صَلَّى فِي اليومِ الأوَّلِ الْعَصْرَ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ، وَفِي الْيَومِ الثاني أخَّرَ العَصْرَ فانْصَرَفَ مِنْهَا والقَائِلُ يقولُ: احْمَرَّتْ الشَّمْسُ..)[2] واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە رۆژی یەكەمدا نوێژی عەسری لە ساتێكدا كرد كە خۆر هێشتا بڵند بوو، كە تەواو بوو تەشریفی برد، خەڵكیش دەیانووت: خۆر سوور بووە..

ـ سەیدنا ئەبوهورەیرە خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (مَنْ أدْرَكَ رَكْعَةً مِنْ الْعَصْرِ قَبْلَ أنْ تغرِبَ الشَّمْسُ فقَدْ أدْرَكَ الْعَصْرَ)[3] واتە: هەر كەسێك پێش خۆر ئاوابوون فریای ركاتێكی نوێژی عەسر بكەوێت، ئەوە بە تەئكید فریای هەموو نوێژی عەسرەكەی كەوتووە.. ئیمامی ئیسحاق و ئەهلی زاهیر دەڵێن: كۆتا كاتی عەسر پێش خۆرئاوابوونە بە ركاتێك[4]..

لەو فەرموودانەی لەسەر دیاری كردنی كاتەكانی نوێژ گێڕراونەتەوە دەردەكەوێت كە فەرموودەكەی سەیدنا ئیبنو عەمر بۆ جائیزێتی دواخستنی نوێژەو فەرموودەكەی سەیدنا ئەبو هورەیرە بۆ كاتی

---

[1] بداية المجتهد (١/١٢٦)، ابن قدامة: المغني (١/٣٧٦)، ابن المنذر: الاوسط (٢/٣٢١).
[2] موسلیم (٦١٤) ئەبوداوود (٣٩٥)، نەسائی (١/٢٦٠).
[3] بوخاری (٥٧٩)، موسلیم (١٦٣، ٦٠٨).
[4] ابن رشد: بداية المجتهد (١/١٢٦)، الاوسط (٢/٣٣٢).

ناچارییە.. چونکە دواخستنی نوێژی عەسر بۆ درەنگانی کات شتێکی ناپەسەندە.. سەیدنا ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە دەڵێ: گوێم لێبوو کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو: (تِلْكَ صَلاةُ الْمُنَافِقِ يَجْلِسُ يَرْقُبُ الشَّمْسَ حَتى إِذَا كَانَتْ بَيْنَ قَرْنَي الشَّيطانِ قَامَ فَنَقَرَهَا أَرْبَعاً لا يَذْكُرِ اللهَ فِيهَا إِلَّا قَلِيلاً)[1] واتە: ئەوە نوێژی دووڕووە، کە دادەنیشێت و موراقەبەی خۆر دەکات، تا ئەو ساتەی وا ئیتر لە نوێان قۆچەکانی شەیتانەوە دەڕوات و ئاوا دەبێت، ئەوسا هەڵدەستێت خێرا چوار دەنووك لە زەوی دەدات، کەمێك نەبێت زیکری خوا ناکات..

کەوابوو بزانین کە نوێژی عەسر تا خۆر ئاوابوون دەمێنێت کاتی بەڵام نابێت دوا بخرێت، مەگەر بە ناچاری..

**<u>باشترە نوێژی عەسر زوو بکرێت:</u>** لەبەر ئەو فەرموودەیەی سەیدنا ئەنەس خوا لێی ڕازی بێت کە دەڵێ: (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّي الْعَصْرَ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ حَيَّةٌ، فَيَذْهَبُ الذَّاهِبُ إِلَى الْعَوَالِي، فَيَأْتِيهَا وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ)[2] واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی عەسری دەکردو خۆریش زرپ و زیندوو بوو، کەسێك دەیتوانی بچێت بۆ عەوالی[3] و بێتەوەو هێشتا هەر خۆر بەرز دەمایەوە..

هەروەها لەبەر ئەو حەدیسەی کە سەیدنا ڕافیعی کوڕی خەدیج خوا لێی ڕازی بێت دەیگێڕێتەوە: (كُنَّا نُصَلِّي الْعَصْرَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ تُنْحَرُ الْجَزُورُ، فَتُقْسَمُ عَشَرَ قِسَمٍ، ثُمَّ تُطْبَخُ فَنَأْكُلُ لَحْمًا

---

[1] موسليم (٦٢٢) ئەبوداوود (٤٠٩)، ترمزی (١٦٠) نەسائی (١/٢٥٤).

[2] بوخاری (٥٥٠)، موسليم (٦٢١).

[3] عەوالی ناوچەیەکە چوار کیلۆمەتر لە خوار مەدینەوەیە..

نَضِيجًا، قَبْلَ مَغِيبِ الشَّمْسِ)[1] واته: له خزمەت پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم نوێژی عەسرمان دەکرد، پاشان ووشترمان سەردەبڕی، دەمانکرد بە دە پارچەوە، پاشان دەمانکولاند، پێ دەگەیشت هێشتا خۆر ئاوا دەدەبوو..

مەبەستی ئەوەیە کە لەسەرەتای دەسپێکی کاتی نوێژی عەسردا نوێژەکەیان دەکرد ئیتر ئەو هەموو کاتەشیان سەرف دەکرد هێشتا خۆر ئاوا نەدەبوو..

**لـە رۆژی هـەوردا نوێـژی عەسـر زووتـر دەکرێـت:** چـونکە لەوانەیە کاتەکان تێکەڵ ببن یان بە هۆی کەمتەرخەمیـەوە هەر پەلـەی لێ نەکرێت و ناکرێت تا کاتێك دەزانرێت خۆر زەرد بووە! ئەبول مولـەیح دەڵـێ: لە غەزایەکدا رۆژێکی هـەور بـوو، لـە خزمـەت بورەیـدەدا بـووین، فـەرمووی: نوێـژی عەسـر زوو بکـەن، چـونکە پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليه و سلم دەیفەرموو: (مَنْ تركَ صلَاةَ الْعَصْرِ فَقَدْ حَبَطَ عَمَلَهُ)[2] واتـە: هـەر کەسـێك نوێـژی عەسـری دواخسـت ئـەوە کـاروکردەوەی پووچـەڵ کردۆتەوە..

## هاندانی کردنی نوێژی عەسر و هەڕەشەی چواندنی:

١- خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ﴾ البقره/٢٣٨ واته: نوێژەکان بپارێزن، نوێژی ناوەندیش هەروەها ملکەچانەش بۆ خوا لێبڕێن.. نوێژی ناوەند

---

[1] بوخاری (٢٤٨٥)، موسلیم (٦٢٥).

[2] بوخاری (٥٥٣)، نەسائی (٨٣/١)، ئەحمەد (٣٤٩/٥). الالباني: صحيح الجامع (٦١٤٦)

نوێژی عەسرە، چونكە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە ڕۆژی غەزای ئەحزابدا فەرمووی: (شَغَلُونَا عَنِ الصَّلاَةِ الْوُسْطَى صَلاَةِ الْعَصْرِ، حَتَّى غَابَتِ الشَّمْسُ، مَلأَ اللَّهُ بُطُونَهُمْ وَقُبُورَهُمْ نَارًا)[1] واتە: بە خۆخەریك كردنیان نوێژی ناوەند، نوێژی عەسریان بیر بردینەوە تا خۆر ئاوا بوو، خوا دڵ و گۆڕیان پڕ كات لە ئاگر..

٢. ئەبو بەسرەی غیفاری خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە: (صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْعَصْرَ بِالْمُخَمَّصِ، فَقَالَ: إِنَّ هَذِهِ الصَّلاَةَ عُرِضَتْ عَلَى مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ فَضَيَّعُوهَا، فَمَنْ حَافَظَ عَلَيْهَا كَانَ لَهُ أَجْرُهُ مَرَّتَيْنِ، وَلا صَلاَةَ بَعْدَهَا حَتَّى يَطْلُعَ الشَّاهِدُ)[2] واتە: ئەم نوێژانە خرایە پێش چاوی ئەو قەومانەی پێش ئێوە، فەوتاندیانن، هەر كەسێك ئەم نوێژانە بپارێزێت ئەوە دووقات (دوو بەرابەر) پاداشتی دەبێت، ئەم نوێژە هیچ نوێژێكی تری بەدوادا نایات تا ئەستێرە هەڵدێت..

٣. عومارەی كوڕی ڕوئەیبە خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (لَنْ يَلِجَ النَّارَ أَحَدٌ صَلَّى قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا) واتە: هیچ كەسێك لەوانەی پێش هەڵهاتنی خۆرو دوای ئاوابوونی نوێژیان كردووە ناچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە.. زۆر لە زانایان ئەوەیان وا لێكداوەتەوە كە كردنی نوێژی بەیانی و نوێژی عەسرە..

---

[1] بوخاری (٢٩٣١)، موسلیم (٦٢٧).
[2] موسلیم (٨٣٠).

٤ـ هەروەها فەرموودە مەرفووعەکەی بورەیدە کە فەرمووی: (مَنْ ترَكَ صَلَاةَ الْعَصْرِ فَقَدْ حَبَطَ عَمَلُهُ)[١] واتە: هەر کەسێك نوێژی عەسری دواخست ئەوە کاروکردەوەی پووچەڵ کردۆتەوە..

ئیبنول قەییم دەڵێ: ئەوەی لەو فەرموودەدا دەردەکەوێت ـ هەر چەندە خواش بە مەبەستی پێغەمبەرە نازدارەکەی صلى الله عليه وسلم ئاگادارترە ـ ئەوەیە کە وازهێنان لە نوێژ دوو جۆرە: یەکێکیان ئەوەیە هەر بە کوللی وازی لێ دەهێنێت و نایانکات، ئەمە کاروکردەوەی مایەپووچ بووەو ئیفلاسی کردووە، ئەوی تریان ئەوەیە کە نوێژی عەسری ئەو رۆژەی نەکردووە، ئەمیان کاروکردەوەی ئەو رۆژەیانی مایەپووچ کردووە.. پووچەڵ بوونەوەی گشتی بەرامبەر بە وازلێهێنانی گشتیەو پووچەڵ بوونەوەی بەشێکی دیاری کراویش بەرامبەر واز لێهێنانی نوێژێکی دیاری کراوە..

ئەگەر بووترێت: ئایا بێ هەڵگەڕانەوە لە دین کاروکردەوە مایەپووچ دەبێت؟! دەڵێین: بەڵێ چونکە لە قورئان و سووننەت و سیرەی یاوەڕاندا هاتووە کە خراپە چاکە دەخوات و چاکەش خراپە دەخوات.. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبۡطِلُواْ صَدَقَٰتِكُم بِٱلۡمَنِّ وَٱلۡأَذَىٰ ﴾ البقرة/٢٦٤ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە خێرو خێراتەکانتان بە منەتکاریی بەسەر خەڵکیدا بەتاڵ مەکەنەوە، هەروەها دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ فَوۡقَ صَوۡتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجۡهَرُواْ لَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ كَجَهۡرِ بَعۡضِكُمۡ لِبَعۡضٍ أَن تَحۡبَطَ أَعۡمَٰلُكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ ﴾ الحجرات/٢ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، دەنگتان بەسەر دەنگی پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم

---

[١] بوخاری (٥٥٣)، نەسائی (٨٣/١)، ئەحمەد (٣٤٩/٥).

بەرز مەکەنەوەو ئەوەندە زەق و ئاشکرا قسەی بۆ مەکەن، وەکو کە لە ناو خۆتاندا دەیکەن، نەبادا بێ ئەوەی بەخۆتان بزانن کاروکردەوەکانتان پووچەڵ ببێتەوە..

٥- سەیدنا ئیبنو عومەر خوا لێیان رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (الَّذِي تفُوتهُ صَلاةُ الْعَصْرِ فَكَأَنَّمَا وُتِرَ أَهْلَهُ وَمَالَهُ)[1] واتە: ئەو کەسەی نوێژی عەسری دەچێت، وەکو ئەو کەسەیە کە کەسوکارو ماڵ و سامانەکەی فەوتابێت. یەعنی وەکو کەسێك کە لە کەسوکارو سامانی خۆی دایانرنیببێت و تاك و رووت کەوتبێتە ئەو گۆڕە!! ئەمەش وێنای کەسێکە کە بە تەواوی موفلیس بووەو رووت و رەجاڵ کەوتووە[2]..

هەروەها دەشێت مەبەستەکە لەوە بێت کە هۆشت لێی بێت وەکو کە هۆشت لە ماڵ و منداڵ و سامانەکەتە، وەك ناهێڵێت ئەمانە هیچیان بفەوتێت مەشهێڵە نوێژی عەسرەکەت بفەوتێت.. ئەمەشیان نزیکترە لە بەزەیی خوای میهرەبان و رێنمایی پێغەمبەری پێشەواوە صلى الله عليه وسلم.. والله اعلم..

### سێیەم: نوێژی شێوان:

مەغریب: لە کوردەواریدا کە بە ئێوارە دەڵێن: شێوان، لەوانەیە لەبەر ئەوە بووبێت کە لە عورفیاندا ئێوارە کاتی خواردنی شێو (چێشت) بوو بێت، لە عەرەبییشدا دیارە کە مەغریب لە غرووبەوە هاتووە کە بریتیە

---

[1] شێخی ئەلبانی لە صحيح الجامعدا (٥٤٩١) دەفەرموێ سەحیحە..
[2] ابن القيم: الصلاة (ل ٤٤).

لە کات و شوێنی ئاوابوونی خۆر، کەوابوو کە دەوترێت مەغریب واتە کات و شوێن و نوێژی شێوان[1]..

لە هەندێك زارگۆتن(لەهجە)ی عەرەبیدا جاری وا هەیە بە شێوان دەوترێت عیشا، بەڵام پێغەمبەری نازدار صلی الله علیه وسلم بەرهەڵستی لەوە کردووە، فەرموویەتی: (لَا تَغْلِبَنَّكُمْ الْأَعْرَابُ عَلَى اسْمِ صَلَاتِكُمْ الْمَغْرِبُ)[2]واتە: مەهێڵن ئەعراب ناوی نوێژی مەغریبەکەتان لێ بگۆڕن. چونکە هەیانبوو دەیووت العَتمَة..

**سەرەتای کاتی شێوان:** بە پێی کۆڕای شەرعناسان ئەگەر خەپلەی خۆر بە تەواوی ئاوابوو، دیار نەما، ئەوە سەرەتای دەسپێکی کاتی نوێژی شێوانە، ئەمە لە بیابان و دەشت و دەردا دیاردەیەکی ئاشکرایە، بەڵام لە شارەکاندا دەبێت سەیری لوتکەی چیاکانی دەوروبەر بکرێت، ئەگەر نەبوو دەبێ سەیری خودی ئاسمان بکرێت کە لە تەرەفی خۆرهەڵاتەوە دنیا تاریك بووبێت و تاك و تەرا ئەستێرە دەرکەوتبن[3]..

**کۆتایی کاتی شێوان:** شەرعناسان لە دیاری کردنی کۆتایی کاتی نوێژی شێواندا دوو بۆچوونن:

**یەکەم: سەرەتاو کۆتایی نیە:** بەڵکو هەموو کاتەکە هەر ئەوەندەیە تا بانگێك دەدرێت و دەستنوێژێك دەشوات و پۆشاکی لەبەر دەکات و قامەت دەکات.. ئەوەش بۆچوونی ئیمامی مالیك و ئەوزاعی و

---

[1] البهوتي: كشاف القناع (١/٢٥٣).
[2] الالبانی: صحيح ابن ماجه (٥٧٨).
[3] البدائع (١/١٢٣)، ابن قدامة: المغني ٠ ١/٣٨١)، الشوكاني: نيل الاوطار (٢/٥).

شافیعیه[١]، بەڵگەشیان فەرموودەی پێشنوێژی کردنەکەی جوبرەئیله سەلامی خوای لێ بێت بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم،[٢] کە لە ڕۆژی یەکەم و دووەمدا هەر لەو سات و کاتەدا نوێژەکەی کرد، نەك وەك نوێژەکانی تر لە دوو کاتدا بێت کە یەکەمیان ئاماژە بێت بۆ سەرەتای کاتەکەی و دووەمیان ئاماژە بێت بۆ کۆتایی کاتەکەی.. هەروەها سوەیدی کوڕی غەفله لە سەیدنا عومەری گێڕاوەتەوە خوا لێیان ڕازی بێت کە فەرموویەتی: (صَلُوا هذِهِ الصَّلاة وَالفِجَاجُ مُسْفِرَةٌ)[٣] واتە: ئەم نوێژە (شێوان: مەغریب) کاتێك بکەن ڕەنگی شەفەق مابێت.

**دووەم: کۆتاییەکەی لە ئاوابوونی شەفەقدایە:** واتە کۆتایی نوێژی شێوان بە دیارنەمانی زەردو سووری کەناری ئاسمانە. ئەمە بۆچوونی سوفیانی سەوری و ئیمامی ئەحمەدو ئیسحاق و ئەبو سەورو ئەهلی مەدرەسەی ڕەئی و یاوەرانی ئیمامی شافیعییەو ئیمامی نەوەوی ڕەحمەتی و ئیبنول مونزیریش رحمەالله ئەمەیان پێ پەسەندتر بووە. بەڵگەشیان:

١- فەرموودە مەرفووعەکەی سەیدنا ئیبنو هەمر خوا لێیان ڕازی بێت کە فەرمووی: (وَوَقْتُ صَلَاةِ الْمَغْرِبِ مَا لَمْ يَغِبِ الشَّفَقُ)[٤] واتە: کاتی نوێژی شێوان تا پێش دیار نەمانی زەردایيەکەی کەناری ئاسمانە..

---

[١] ابن رشد: بداية المجتهد (١٣٦/١)، النووي: المجموع (٢٨/٣)، الاوسط (٣٣٥/٢).
[٢] پەراوێزی ژمارە ٨٢
[٣] عبدالرزاق (٢٠٩٢)، ابن و أبي شيبة (٣٢٩/١) کەمال ابن السيد لە صحيح فقه السنة(٢٤٣/١) دا دەفەرموێ: سەنەدەکەی حەسەنە..
[٤] موسليم (٦١٢).

٢ـ سەیدنا زەیدی کوڕی سابیت خوا لێی رازی بێت بە مەروانی کوڕی حەکەمی فەرموو: بۆچی لە نوێژی شێوانان‌دا سورەتە کورتە مام ناوەندیەکان دەخوێنیت؟! خۆ پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم: (قَدْ كَانَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عليه وَسَلَّمَ يَقْرأُ بطُولَي الطُّولَيَينِ)[١] واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم درێژترینی دوو سورەتە درێژەکەی تێدا دەخوێندن، کە دەکاتە سورەتی الاعراف!

جا ئەگەر ئەوەش بزانین کە پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم لە نوێژدا قورئانی زۆر لەسەرخۆ دەخوێند، لە کۆتایی ئایەتەکان‌دا دەوەستا، لەسەر هەر ووشەیەك کە زیکر بوایە زیکری دەکرد، هەموو پیتەکانی بە راشکاوی دەردەبڕی.. جا ئەگەر خەیاڵ کەین کە سورەتی ئەعراف لە نوێژێکی شێواندا خوێندبێت دەبێت چەندی پێ چوو بێت.. گومان لەوەدا نیە کە نزیکەی سەعاتێکی بە کاتی ئێمە خایاندووە.. دەی سا حەتمەن کاتی نوێژی شێوان ئەوەندەی بەدەمەوە هەبووە کە جەنابیان سورەتێکی وا دوورودرێژ بەو لەسەرخۆییەی خۆی صلى الله علیه وسلم بخوێنێت..

٣ـ سەیدنا ئەنەس خوا لێی رازی بێت لە پێغەمبەری خواوە صلى الله علیه و سلم دەگێڕێتەوە کە کاتێك نانی ئێوارە دادەنرا دەیفەرموو: (إِذَا قُدِّمَ الْعَشَاءُ فَابْدَءُوا بِهِ قَبْلَ أَنْ تصَلُّوا صَلَاةَ الْمَغْرِبِ، وَلَا تعْجَلُوا عَنْ عَشَائِكُمْ)[٢] واتە: ئەگەر چێشتی ئێوارە دانرا ئەو پێش نوێژی شێوان بخەن، پەلەش لە خواردنەکە مەکەن..لە ریوایەتێکی تری خاتوو عائیشەدا دەڵێ: (إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ، وَحَضَرَ الْعَشَاءُ، فَابْدَءُوا

---

[١] بوخاری (٧٦٤)، نەسائی (٢/١٧٠)، ئەحمەد (١٨٨/٥).
[٢] بوخاری (٦٧٢)، موسلیم (٥٥٧).

بالْعَشَاءِ)[١] واتە: ئەگەر كاتی نوێژ هات و چێشتی ئێوارە ئامادە بوو، خواردنی چێشتەكە پێش نوێژەكە بخەن.. ئەمە بەڵگەیەكی ڕۆشنە كە كاتی نوێژی شێوان ئەوەندەی بەبەرەوە هەیە تا نانیش بخورێت هەر بمێنێت، بەڵگەی جائیزێتی دواخستنیشیەتی..

٤. ئەوەش سەلمێنراوە كە سەیدنا مەعاز خوا لێی ڕازی بێت نوێژی شێوانی لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم دەكردو دەشگەڕایەوە بۆماڵێ پێش نوێژی نوێژێكی تری شێوانی بۆ كەسوكارەكەی دەكردەوە[٢]..

<u>پەلەكردن لە نوێژی شێوان:</u> لەگەڵ هەبوونی كاتی تەواویشدا پێویستە پەلەكردنێك لە نوێژی شێواندا بكرێت، چونكە كاتەكەی هەر چۆنێك بێت لەچاو نوێژی نیوەڕۆو عەسردا یان لە چاو كاتی نوێژی عیشادا كەمە.. بەڵگەش لەسەر ئەوە هەیە كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم موسوڵمانانی لەسەر زوو كردنی هان دەداو هەڕەشەی دواخستنیشی لێ دەكردن، وەكو:

١. سەیدنا ڕافیعی كوڕی خەدیج خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: (كُنَّا نُصَلِّي الْمَغْرِبَ مَعَ رَسولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ فَيَنْصَرِفُ أحَدُنَا وإنَّهُ لَيَبْصُرُ مَوَاقِعَ نَبْلِهِ)[٣] واتە: نوێژی شێوانمان لە خزمەت پێغەمبەری خوادا دەكرد، كە دەڕۆیشتینە دەرێ دەمانتوانی شوێن تیری خۆمان ببینین.. یەعنی شتمان لە مەسافەی تیرهاویشتنەوە دەبینی..

---

[١] بوخاری (٦٧١).
[٢] بوخاری (٧١١)، موسلیم (٤٦٥).
[٣] بوخاری (٥٥٩)، موسلیم (٦٣٧).

٢. سەیدنا عوقبەی کوڕی عامر خوا لێی رازی بێت گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لا تَزَالُ أُمَّتِي بِخَيرٍ ـ أو عَلَى الفِطرَةِ ـ مَا لَمْ يُؤَخِّرُوا الْمَغْرِبَ حَتَّى تَشْتَبِكَ النُّجُومُ)[١] واتە: ئوممەتەکەم هەر لە خێرو خۆشیدا دەبێت ـ یان هەر لەسەر سروشتی پاکیاندا دەبن ـ تا ئەو کاتەی کە نوێژی شێوانیان ئەوەندە دواناخەن تا ئەستێرە تێك دەچڕژێن..

### چوارەم: نوێژی خەوتنان (عیشا):

کورد پێی دەڵێ: نوێژی خەوتنان، چونکە کۆتا نوێژی شەووڕۆژەکەیەو عادەتەن دوای کردنی خەوتوون.. لە عەرەبیشدا پێی دەوترێت عیشا چونکە سەرەتایەکە بۆ تاریکی.. جاری وا هەیە بە نوێژی عیشا دەوترێت (صلاةُ العِشَاء الآخِرَة) واتە نوێژی عیشادواییینەکە، چونکە هەندێك کەس لەسەرەتادابە نوێژی شێوانیان دەووت: (صلاةُ العِشَاء الأُولى) واتە: نوێژی عیشای یەکەمین. بۆیە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (أَيُّمَا امْرَأَةٍ أَصَابَتْ بَخُورًا فَلَا تَشْهَدْ مَعَنَا الْعِشَاءَ الْآخِرَةَ)[٢] واتە: هەر ئافرەتێك بۆنی خۆشی لە خۆیدا با بۆ نوێژی خەوتنان نەیات..

ئەم کات و نوێژە پێشی دەوترێت (العَتَمَة) چونکە لە فەرموودەیەکی پێغەمبەری پێشەوادا هاتووە کە دەفەرموێ: (وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي الْعَتَمَةِ وَالصُّبْحِ لَأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا)[٣] واتە: ئەگەر دەیانزانی چ خێرێك لە نوێژی

---

[١] ئەبو داوود (٤١٤)، ئەحمەد (١٤٧/٤)، ئیبنو ماجە (٦٨٩)، شێخی ئەلبانی رەحمەتی لە صحيح أبي داود (٤٤٤) بە سەحیحی داناوە..

[٢] موسلیم (٤٤٤)، ئەبوداوود (٤١٧٥)، نەسائی ٥١٢٨).

[٣] بوخاری (٦١٥، ٧٢١)، موسلیم (٤٣٧).

خەوتن و سپێدەدا هەیە، ئەگەر بە گاگۆڵکێش بوایە، دەهاتنە نوێژی جەماعەتەکەی..

بەڵام وەکو باسمان کرد پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم حەزی بە بەکارهێنانی ئەو ناوە نەکردووە، وەکو لە فەرموودەکەی ئیبنو عومەردا هاتووە، خوا لێیان رازی بێت: (لَا تَغْلِبَنَّكُمْ الْأَعْرَابُ عَلَى اسْمِ صَلَاتِكُمْ الْمَغْرِبُ)[1] واتە: مەهێڵن ئەعراب ناوی نوێژی مەغریبەکەتان لێ بگۆڕن.

**سەرەتای کاتی نوێژی خەوتنان:** شەرعناسان بە گشتی جگە لە کەمێکی نامۆ، هەموو فەرموویانە کە کاتی دەسپێکی نوێژی خەوتنان (عیشا) بە ئاوابوونی زەردو سوورییایەکەی کەناری ئاسمان (شەفەق) ە. بەڵام لە لە دیاری کردنی سنوری شەفەقەکەشدا راجوێییان هەیە[2].. جمهور دەڵێن: دیار نەمانی سوراییی کەناری ئاسمانە، کەچی ئیمامی ئەبوحەنیفە دەڵێ: دیارنەمانی سپێتیەکەی دوای سوراییەکەیە.. لێکۆڵینەوەی دەیان توێژەرەوەی وەکو ئیمامی شەوکانی هەموو ئەوە روون دەکەنەوە کە بە تەئکید شەفەق سوورییایەکەی کەناری ئاسمانە نەك سپێتیەکەی کە لە هەندێك وولاتدا تا سێیەکی شەو هەر دەمێنێت[3].. ئەوەشمان باس کرد کە سەلمێنراوە کە پێغەمبەری نازدار صلی الله علیه وسلم و یاوەران بە دیارنەمانی سورایەتیەکەی کەناری ئاسمان نوێژی خەوتنانی کرد[4]..

---

[1] الالباني: صحيح ابن ماجة (٥٧٨).

[2] المجموع (٤٤/٣)، الاوسط (٣٣٩/٢).

[3] بە پێی ئەو پێناسەی ئیمامی ئەبو حەنیفە بێت هاوینان لە ئەوروپا بە تایبەتی لە سویدو نەرویج و فنلەندا نوێژی عیشا ناکرێت، چونکە ئەو خەتە سپییە هەر دەمێنێت!

[4] بوخاری (٥٦٩)، موسلیم (٢١٨).

**كۆتایی كاتی شێوان:** راو بۆچوونی شەرعناسان لە دیاری كردنی كۆتایی كاتی نوێژی خەوتناندا سێ پۆلە:

**یەكەم: كۆتایی كاتی خەوتنان سەرەتای سپێیەكی كۆتایی شەوە:** ئەمە قەولی نوێی ئیمامی شافیعیە، كە بە كاتی ئاسایی حسێب كردووە.. هەروەها بۆچوونی ئیمامی ئەبو حەنیفەو رای ناسراوی ئیمامی مالیكیشە[1].. بەڵگەشیان ئەو فەرموودەیە كە باسی پێش نوێژیەكەی جوبرەئیل دەكات بۆ پێغەمبەری پێشەوا صلی الله علیه و سلم، كە لە رۆژی دووەمدا دوای تێپەڕ بوونی سێیەكی شەو نوێژی خەوتنانی پێ كرد[2]..

**دووەم: كۆتایی كاتی نوێژی خەوتنان نیوە شەوە:** ئەمەش بۆچوونی سوفیانی سەوری و عبداللەی كوڕی موبارەك و ئیسحاق و ئەبو سەورو ئەهلی مەدرەسەی رەئی و قەولی قەدیمی ئیمامی شافیعیە.. ئەوانەی مەدرسەی رەئی دەڵێن دوای ئەو كاتە كەراهەتی هەیە، ئیمامی شافیعی دەڵێ هەتا كاتی سپێدەی بەیانی هەر شیاوی نوێژی عیشایە، بەڵام باشتر وایە زووتر بیكات.. رای ئیبنو حەزمیش هەر ئاوایە.. بەڵگەشیان فەرموودەكەی عبداللەی كوڕی عەمرە خوا لێیان رازی بێت، كە پێشتر هێنامانەوەو تێیدا فەرمووی: (وَوَقْتُ صَلَاةِ الْعِشَاءِ إِلَى نِصْفِ اللَّيْلِ الْأَوْسَطِ)[3] یان

---

[1] النووي: المجموع (٤٢/٣)، ابن رشد: بداية المجتهد (١٢٨/١)، الاوسط (٣٤٣/٢)، الشافعي: الام (٧٤/١).

[2] پەراوێزی ژمارە (٨٢).

[3] پەراوێزی ژمارە (٧٦).

فەرموودەكەی ئەنەس: (أخَّر النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ صَلاة العِشَاء الى نصْفِ الليلِ)[١] هەر ئەمەشە لە نامەكەی سەیدنا عومەری كوڕی خەتتابدا خوا لێی رازی بێت هاتووە كە بۆ سەیدنا ئەبو موسای ئەشعەری نوسی خوا لێی رازی بێت كە تێیدا هاتبوو: (نوێژی خەوتنانت لە سێیەكی یەكەمی شەودا بكە، ئەگەر دوات خست، تا نیوەی شەو، زیاتری مەكەو مەچۆ ریزی غافلانەوە[٢].

## سێیەم: كۆتایی كاتی نوێژی خەوتنان سپێدەی بەیانی

**نوێیە:** ناچارو غەیرە ناچار وەكو یەكە.. ئەمەش رای عەتاء و عیكرەمەو داوودی زاهیرییە كە لە ئیبنو عەبباس و ئەبوهورەیرەوە گێڕراوەتەوەو ئیبنول مونزیریش ئەمەی پێ پەسەندبووە[٣].. بەڵگەشیان:

١ ـ فەرموودە مەرفوعەكەی سەیدنا ئەبو قەتادە كە دەڵێ: (لَيْسَ فِي النَّومِ تفْرِيطٌ، إنَّمَا التفْرِيطُ عَلَى مَنْ لَمْ يُصَلِّ صَلَاةً حَتَى يَجِئَ وَقْتُ الصَّلَاةِ الاخْرَى)[٤] واتە: كەمتەرخەمی لە خەوتندا نیە (یەعنی ئەگەر كەسێك خەوی لێ كەوتبوو حوكمی كەمتەرخەمی نوێژ بەسەردا نادرێت) بەڵكو كەمتەرخەمی لەو كەسەدایە كە نوێژەكەی نەكردووە تا كاتی نوێژەكەی تری بەسەردا هاتووە..

---

[١] بوخاری (٥٧٢).

[٢] ئیمامی مالیك و ئیبنو حەزم بە سەنەدی سەحیح گێڕاویانەتەوەو شێخی ئەلبانی لە تمام المنة (ل ١٤٢ ) دا دەفەرمویٚ: سەحیحە..

[٣] بداية المجتهد (١٢٨/١)، الاوسط (٣٤٦/٢).

[٤] موسلیم (٦٨١).

٢ ـ فەرموودەکەی عائیشەخان خوا لێی رازی بێت کە فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم شەوێکیان زیاتر لەماڵەوە مایەوە تا کاتێکی زۆری شەو ڕۆیشت، خەڵکی مزگەوت خەوتن، پاشان تەشریفی بردە مزگەوت و فەرمووی: (إِنّهُ لَوَقْتُهَا لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي)[١] واتە: ئێستا کاتێتی، ئەگەر لەسەر ئوممەتەکەم قورس نەبوایە..

٣ ـ لە ریوایەتێکی تردا دەفەرموێ: (لَوْلا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لَأَخَّرْتُ العِشَاءَ إِلَى ثُلُثِ الليلِ)[٢] واتە: ئەگەر لەسەر ئوممەتەکەمم قورستر نەکردایە، فەرمانم پێ دەدان نوێژی خەوتنانیان بخەنە سێیەکی شەو..

کەوابوو بەڵگەی جمهور بەهێزترە لە دیاری کردنی کۆتایی کاتی نوێژی خەوتناندا، کە دیارە تا نیوەی شەو کاتی شیاوی خۆیەتی و لەوەو دواش نوێژ هەر دەمێنێت.. ئەوەش تەرجیح پێدانی ئیمامی شەوکانیە. بەڵام خەمی سستی وخەو لێکەوتنی زیاتر دەبێت. کەسیش لە شەرعناسانمان نەبینی ئەوەی پێ پەسەند بێت کە دوابخرێت بۆ دوای نیوەشەو..

**دواخستنی نوێژی خەوتنان باشترە:** کۆمەڵێك فەرموودەی راست هەن کە دواخستنی نوێژی خەوتنان بۆ دوای تێپەڕبوونی سێیەك و نیوەی شەو بە پەسەندتر دەزانن، بۆیە زۆر لە یاوەران و شەرعناسانی تابیعین بۆچوونیان وایە کە دواخستنی نوێژەکە بۆ درەنگتر چاکە[١].. لەوانە:

---

[١] موسلیم (٢١٩)، نەسائی (١/٢٦٧).

[٢] الالبانی: صحیح الجامع (٥٣١٩).

[١] الزیلعی: تبیین الحقائق (١/٨٤).

١- (لَولا أنْ أشُقَّ عَلَى أمَّتى لأمَرْتهُمْ أنْ يُؤَخِّرُوا الْعِشَاءَ إِلَى ثُلُثِ اللَيلِ أَوْ نِصْفِهِ)[١] واتە: ئەگەر قورس نەبوایە لەسەر ئوممەتەكەم فەرمانم پێ دەكردن نوێژی خەوتنانیان بۆ سێیەكی شەو یان نیوەشەو دواخەن.. حیكمەتی ئەمەش ئاشكرایە كە دواخستنی نوێژی عیشا وەكو فەرمانێك لەسەر ئوممەتەكە زۆر قورس دەبوو، خەو زۆر كەسی ماندووی گێژ دەكرد، جەماعەتی مزگەوتی كەمتر دەكردەوە، بواری خەوو حەوانەوە كەمتر دەبۆوە.

٢- لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەری نازدار كە بینیوێتی یاوەران تا درەنگانێك خۆیان گرتووەو مەحتەلی كردوون و ئینجا تەشریفی بردۆتە مزگەوت و نوێژەكەی بۆ كردوون، كاتی واش هەبووە زووتر بۆی كردوون: (كانَ النَّبيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّمَ يُؤَخِّرُ الْعِشَاءَ أحْيَاناً، وَأحْيَاناً يُعَجِّلُ: إذَا رَآهُمْ اجْتَمَعُوا عَجَّلَ، وإذَا رَآهُمْ أبْطَؤُوا أخَّرَ..)[٢]..

**خەوتن پێش نوێژی خەوتنان باش نیە:** سەیدنا ئەبوبەرزە خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە كە (أنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَكْرَهُ النَّوْمَ قَبْلَ الْعِشَاءِ وَالْحَدِيثَ بَعْدَهَا)[٣] واتە ك پێغەمبەری خوا الله عليه وسلم خەوتنی پێش نوێژی خەوتنانی پێ ناخۆش بوو، هەروەها دانیشتن و شەوارەی دوای نوێژ..

---

[١] ترمزی (١٦٧)، ئیبنوماجە (٦٩١)، ئەحمەد (٢/٢٤٥).
[٢] بوخاری (٥٦٠)، موسلیم (٢٣٣).
[٣] بوخاری (٥٦٨)، موسلیم (٢٣٧).

هۆکاری ئەوەش دیارە لەبەر ئەوە بووە کە نەبادا خەویان قورس ببێت و نوێژەکانیان بچێت، یان خەڵکی بە مۆڵەتی بزانن وبخەون وبۆ نوێژی جەماعەتەکەی کۆنەبنەوە[١]..

**قسەکردن دوای نوێژی خەوتنان پەسەند نیە:** چونکە لەوانەیە قسەی زۆرو بێ سوود ئەوەندە بکرێت کە هەم لەسەر گوناحبار بن، هەم شەوگارەکەی پێوە بڕوات! لەوانەیە کەسێك فێرە شەونوێژ بێت وئەو خواپەرستیە چاکەی لەدەست بچێت.. لەوانەیە ئەوەندە دانیشن وبمێننەوە بۆ نوێژی بەیانی خەبەریان نەبێتەوەو نوێژەکەیان بچێت.. یان بۆ کاری سبەینێیان درەنگ هەستن یان تێیدا کەمتەرخەم بن.. ئەمە بۆ قسەو شەوچەرەی دنیاییە، ئەمما کەسێك یان کەسانێك بۆ دەرس و خوێندنی شەرعی دانیشن، یان خەریکی بانگەواو کاری ئیسلامی بن، یان شتێکی تری بەسوودی گشتی یان تایبەتی، قەیدی نیە.. چونکە:

١ ـ سەیدنا ئیبنو عەبباس خوا لێیان رازی بێت دەگێڕێتەوە: (أنَّ النَّبيَّ صَلَّى اللهُ عليهِ وَسَلَّمَ تحدَّثَ مَعَ أهْلِهِ مَيْمُونَةَ ساعَةً ثمَّ رَقَدَ..)[٢] واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەگەڵ مەیموونە خانی خێزانیدا بۆ ماوەیەکی زۆر قسەیان پێکەوە کرد پاشان راکشا..

٢ ـ (كَانَ النَّبيَّ يَسْمُرُ مَعَ أبي بَكْرٍ وَعُمَرَ فِي أمْرٍ مِنْ أمورِ المسلمين)[٣] واتە: پێغەمبەری خوا جاری وا هەبوو بۆ باس و خواسی کاروباری موسوڵمانان لەگەڵ ئەبوبەکرو عومەردا شەوان دەمایەوە..

---

[١] الشوكاني: نيل الاوطار (٢/١٨)، الفواكه الدواني (١/١٩٧)، تبيين الحقائق (١/٨٤).
[٢] موسلیم (١٩٠).
[٣] ترمزی (١٦٩)، ئەحمەد (١/٢٦). پسانێك لەسەنەدەکەیدا هەیە.

## پێنجەم: نوێژی سپێدە (بەیانی):

سپێدە: دەرکەوتنەوەی سپیاییەتی کەناری ئاسمانە کە پێش خۆر هەڵهاتن دەردەکەوێت، ووشەیەکە زیاتر لە بادینان بەکار دێت.. لە ناوچەی سۆراندا ووشەی (بەیانی) بۆ بەکار دێت، هەردووکیان بەرامبەر ووشەی (فەجر)ی عەرەبی دانراون.. ووشەی بەیانیم لا گشتگیرترە، چونکە بەیانی سپێدەو نزیك خۆرهەڵهاتنیش دەگرێتەوە، بۆیە سپێدەم بۆ نوێژی فەجر بەکارهێنا تا زیاتر تایبەتمەندێتی دەرخات.. فەجر کۆتایی شەوە، وەکو کە شەفەق سەرەتایەتی.. فەجر دووە:

**یەکەم: سپێدەی یەکەم (الفجر الكاذب):** ئەو روناکیە لاکێشیەیە کە لە ئاسۆوە لە ئەتراقی خۆرهەڵاتەوە بۆ ماوەیەکی کەم دەردەکەوێت، چونکە پاش ماوەیەکی کەم دیار نامێنێت و تاریکیەکە دەگەڕێتەوە.. عەرەب پێی دەڵێن کلکی گورگ (ذَنَبُ السِّرْحَان).

**دووەم: سپێدەی راست (الفجر الصادق):** ئەو هێڵە روناکیەیە کە لە کەناری ئاسمانەوە دەردەکەوێت و تەشەنە دەکات، بەردەوام لە رەونەقدایە تا خۆر هەڵدێت.. لە فەرمووودەدا هاتووە: (لا يَمْنَعَنَّكُمْ مِنْ سُحُورِكُمْ أَذَانُ بِلالٍ، وَلا الْفَجْرُ الْمُسْتَطِيلُ، وَلَكِنِ الْفَجْرُ الْمُسْتَطِيرُ فِي الأُفُقِ)[١] واتە: نە بانگی بیلال نە سپێدە لاکێشەکە رێ لە خواردنی پارشێوتان نەگرن (بەردەوام بن بخۆن و بخۆنەوە) تا

---

[١] موسلیم (١٠٩٤)، ترمزی (٧٠٦)، نەسائی (٢١٧١) ئەبوداوود (٢٣٤٦).

سپێدەتان لە ئاسۆ لێ دەردەکەوێت. ئەحکامە شەرعیەکان لەسەر ئەم سپێدەیانن، نەك یەکەمینەکەیان..

نوێژی سپێدە وەکو کە لە کوردیدا ناوی تری هەیە وەکو بەیانی، لە عەرەبیشدا ناوی تری هەیە وەکو الصُبح و الغَداة.. بۆیە ووتراوە سوبح چونکە سورو سپی تێکەڵ بوون، بۆیە بە دەموچاوی جوانیش دەوترێت (وَجهٌ صَبُوحٌ).

**سەرەتای کاتی سپێدە:** هەموو شەرعناسان لەسەر ئەوە رێکن کە سەرەتای کاتی نوێژی سپێدە، دەرکەوتنی سپێدەی راستی (الفجر الصادق)ە..

**کۆتایی کاتی سپێدە:** هەموو شەرعناسان لەسەر ئەوە کۆن کە کۆتایی کاتی نوێژی سپێدە هەڵهاتنی خۆرە..

**باشتر وایە پەلە لە نوێژی سپێدە بکرێت:** جمهوری شەرعناسان مالیك و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاق و ئەبو سەور پێیان وایە کە کردنی نوێژی بەیانی لە تاریك و روونی سپێدەدا باشترە وەك لە دواخستنی بۆ روناکبوونەوە.. ئەمە بۆچوونی خەلیفەکانی راشیدین و ئەبو موساو ئیبنو الزوبەیرو ئیبنو مەسعودیشە خوا لێیان رازی بێت[1].. بەڵگەیان:

**یەکەم: فەرموودەی زۆر لەبەردەستدا هەن:** کە جەخت لەوە دەکەنەوە کە پێغەمبەری خوا نوێژی سپێدەی بە تاریکوڕوونی دەکرد، لەوانە:

---

[1] ابن قدامة: المغني (٥٤٠/١).

١ ـ (كُنَّ نِسَاءُ الْمُؤْمِنَاتِ يَشْهَدْنَ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَاةَ الْفَجْرِ مُتَلَفِّعَاتٍ بِمُرُوطِهِنَّ، ثُمَّ يَنْقَلِبْنَ إِلَى بُيُوتِهِنَّ حِينَ يَقْضِينَ الصَّلَاةَ، مَا يَعْرِفُهُنَّ أَحَدٌ مِنْ الْغَلَسِ)[١] واتە: ژنی موسوڵمانان نوێژی سپێدەیان بە تاریكوڕوونی لە مزگەوت لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم دەكرد، خۆیان دەپێچایەوەو پاش نوێژ كە دەچوونەوە ماڵەوە هێشتا لەبەر تاریكی كەس نەیدەناسینەوە.

٢ ـ سەیدنا ئەبو بەرزەی ئەسلەمی خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە: (كَانَ يُصَلِّي الصُّبْحَ، ثُمَّ يَنْصَرِفُ، وَمَا يَعْرِفُ الرَّجُلُ مِنَّا جَلِيسَهُ، وَكَانَ يَقْرَأُ بِالسِّتِّينَ إِلَى الْمِائَةِ)[٢] واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم كە لە نوێژی سپێدان دەبۆوەو تەشریفی دەبردەوە، كەس لە ئێمە ـ لەبەر تاریكیی ـ هاوڕێكەی تەنیشت خۆی نەدەناسیەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم عادەتەن لە نێوان شەست بۆ سەد ئایەتی دەخوێند..

٣ ـ سەیدنا ئەنەس لە سەیدنا زەیدی كوڕی سابیت خوا لێیان رازی بێت دەگێڕێتەوە: (تَسَحَّرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ قُمْنَا إِلَى الصَّلَاةِ قُلْتُ كَمْ بَيْنَهُمَا قَالَ قَدْرُ قِرَاءَةِ خَمْسِينَ آيَةً)[٣] واتە: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم پارشێومان كرد، پاشان بۆ نوێژ هەستاین، ووتم: ماوەی نێوانیان چەند بوو؟! فەرمووی: بەقەدەر ئەوەندەی پەنجا ئایەت بخوێنیت.. ئەوەش بۆ گرتنەوەی دەستنوێژیان بووە.. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە پێغەمبەری

---

[١] بوخاری (٥٧٨)، موسلیم (٢٣٠).
[٢] بوخاری (٥٤١)، موسلیم (١٠٩٧).
[٣] بوخاری (٥٧٦)، موسلیم (٤٧).

نازدار صلى الله عليه وسلم لە سەرەتای دەسپێکی نوێژی بەیانیدا نوێژەکەی کردووە..

٤ ـ فەرموودەکەی سەیدنا ئەبو مەسعوودی ئەنساری خوا لێی رازی بێت کە دەڵێ: (أنَّ رَسولَ اللهِ صلَّى اللهُ عليهِ وَسَلَّمَ صَلَّى الصُّبْحَ مَرَّةً بغَلَسٍ ثمَّ صَلَّى مَرَّةً أخْرَى فأَسْفَرَ بهَا ثمَّ كَانَتْ صَلاتُهُ بَعْدَ ذلِكَ التَّغْلِيسَ حَتَّى مَاتَ وَلم يَعُدْ إلى أنْ يَسْفَرَ)[١] واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم جارێك نوێژی سپێدەی بە تاریکی کرد، پاشان جارێکی تر بە دنیاروناکی، دوای ئەوە ئیتر هەموو نوێژەکانی سپێدەی هەر بە تاریکی دەکرد تا کۆچی دوایی کرد نەهاتەوە سەر کاتی دنیا روناکیی.

**دووەم: زوو نوێژ کردن حوکمێکی گشتیە:** ئەو بەڵگانەی داوا دەککەن نوێژەکان لە کاتی خۆیاندا بکرێن زۆر زۆرن، حوکمی ئەوانە نوێژی سپێدەش دەگرێتەوە، کە دەبێت زوو بکرێت..

**سێیەم: زوو کردنی نوێژی بەیانی رەفتاری چوار خەلیفەکانە:** سەلمێنراوە کە هەر چواریان خوا لێیان رازی بێت نوێژی سپێدەیان زوو لە تاریکوروونی بەیانیدا دەکرد[٢]..

---

[١] ئەبو داوود (٣٩٤)، ئیبنو حیببان و حاکم و خەتتابی و ئیمامی زەهەبی بە سەحیحیان داناوەو ئەسڵەکەشی لە سەحیحەیندایە، ئەلبانیش لە صحيح أبي داود (٤١٧) دا بە سەحیحی ناساندووە. فەرموودەی ئەم باسە زۆرن و هەندێکیان لە بوخاریدایە (٥٦٠، ٨٧٢) هەندێکی تریان لای موسلیمن (٦٤٥، ٦٤٦)، هەندێکی تریش لای خاوەن سونەنەکانن و شێخی ئەلبانی زۆرینەیانی لە صحيح ابن ماجة دا بە سەحیح ناساندووە.

[٢] ابن المنذر: الاوسط (٢/٣٧٤) لێرەدا ریوایەتی تریش لە سەیدنا عوسمان وعەلییەوە خوا لێیان راوی بێت دەگێڕێتەوە کە بەیانیان لە دنیاروناك بوونەوەدا کردووە

## چوارەم: جیاوازی لێكدانەوەی مانای دنیاڕووناك بوونەوە:

هەندێك لە شەرعناسانی وەكو ئیمامی شافیعی وئیمامی ئەحمەد ووشەی (إسفار) كە لە فەرموودەكاندا هاتوون بە دڵنیابوون لە دەركەوتنی سپێدە لێك دەدەنەوە نەك بە ڕووناكبوونەوەی دنیا. بەڵام ئیمامی ئەبوحەنیفەو یاوەرانی وسوفیانی سەوری دەڵێن: نا ڕووناكبوونەوەی دنیا مەرجە بۆ نوێژكردن بۆیە نوێژی بەیانی درەنگ دەكەن.. بەڵگەشیان:

١ ـ فەرموودەكەی كە سەیدنا ڕافیعی كوڕی خەدیج خوا لێی ڕازی بێت گێڕاوێتیەوە كە پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: (أَسْفِرُوا بِالْفَجْرِ فَإِنَّهُ أَعْظَمُ لِلأَجْرِ)[1] واتە: ڕێبدەن سپێدەی بەیانی دەركەوێت، ئەوەتان خێری زیاتری تێدایە.. پۆلە شەرعناسی بەرامبەر وەڵامی ئەم بەڕێزانەو بەڵگەكەیان وا داوەتەوە، وەكو ئیبنو حیببان دەڵێ: ئەوە لەبەر ئەوەیە كە نەبادا لە شەوانی مانگەشەودا وابزانن روناكیەكەی هی ئەوەیە سپێدەی بەیانی هاتووەو نوێژەكەیانی تێدا بكەن، بۆیە داوای لێكردوون ئارام بگرن تا لە سپێدەی بەیانی دڵنیا دەبن، ئاوا خێری زیاتریان دەگاتێ چونكە لە كاتەكەی دڵنیا بوون[2]..

٢ ـ فەرموودەكەی سەیدنا ئیبنو مەسعوود خوا لێی ڕازی بێت كە باس لە نوێژی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەكات كە لە موزەلیفە كردویتی، كە تێیدا هاتووە: (مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى صَلاةً إِلا لِوَقْتِهَا، إِلا الْعِشَاءَيْنِ فَإِنَّهُ صَلاهُمَا بِجَمْعٍ

---

[1] ئەبوداوود (٤٢٤)، ترمزی (١٥٤)، نەسائی (٢٧٢/١)، ئیبنوماجە (٦٧٢) صحيح لغيره.. صحيح فقه السنة (٢٥٠/١).

[2] صحيح ابن حبان (٣٥٩/٤).

جَمِيعًا، وَصَلَّى الْفَجْرَ يَوْمَئِذٍ قَبْلَ وَقْتِهَا)[١] واتە: پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم هەر وا بینیوە کە نوێژەکانی لە کاتی خۆیدا کردوون، ئەو جارە نەبێت کە هەردوو عیشاکەی (شێوان و خەوتنانی) پێکەوە کرد، نوێژی بەیانیشی پێش کاتی خۆی کرد.. وەڵامی ئەمەشیان وا داوەتەوە کە:

یەکەم: بەڵگەیەکی راشکاوو ئاشکرای وای تێدا نیە کە نوێژکردنی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە کاتی تاریکوڕوونی سپێدەدا عادەتی خۆی نەبووبێت..

دووەم: ئەو نوێژە بە نیسبەت سەیدنا ئیبنو مەسعوودەوە خوا لێی رازی بێت پێش خستنە، چونکە عادەتی خۆی وا بووە کە تا دنیا رووناك نەبووبێتەوە نەیکردووە.. ئەمەش نهێنی ئەوەیە کە دەبینین حەنەفی وا درەنگ نوێژی بەیانیان دەکەن، چونکە ئیمامی ئەبو حەنیفەی پێشەوا قوتابی سەیدنا ئیبنو مەسعوود بووە خوا لێی رازی بێت..

ئیمامی تەحاوی کە خۆشی حەنەفیە هەوڵیداوە هەردوو بۆچوونەکان پێکەوە بسازێنێت بۆیە فەرموویەتی: لە تاریکوڕوونی سپێدەدا دەستی بە نوێژەکە کردووەو کە لێبۆتەوە دنیا رووناك بۆتەوە[٢].. ئەمە هەرچەندە بۆچوونێکی جوانە بەڵام بە تەئکید سەرخستنی مەزهەبی جمهوری پێشەوایانی ترە، بەڵام ئیمامی تەحاوی لەبەر پابەندبوونی مەزهەبیانە نەیتوانیووە راشکاوانە دەسبەرداری بێت.. والله اعلم..

★ ★ ★

---

[١] مسند ابن أبي شيبة (٢٥٢) دەربارەشی دەفەرموێ: (إسناده متصل، رجاله ثقات، على شرط الشيخين البخاري ومسلم).

[٢] الطحاوي: شرح معاني الآثار (١/١٨٤).

# بابەتی تر کە پەیوەندییان بە کاتەکانی نوێژەوە هەیە

(١)

## کات، فەرزی جەخت لێکراوەی نوێژە

- نوێژکردن لە کاتی خۆیدا فەرزە، کاتەکەش بۆ نوێژکردنەکە فەرزێکی نوێژەکەیەو لە هەموو فەرزەکانی تری نوێژ زیاتر تەئکیدی لێ کراوەتەوە، نابینیت خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبًا مَّوۡقُوتًا﴾ النساء/١٠٣ واتە: نوێژ لەسەر موسوڵمانەکان لە کاتی دیاری کراودا فەرز کراوە.. لەبەر ئەمەیە کە ناشێت بە هیچ بەهانەیەك نوێژ لە کاتی خۆی دواخرێت، نە بە بەهانەی لەش گرانی و نەبوونی دەستنوێژ، نە بە نەبوونی ئاو، یان نەبوونی پۆشاکی پاك یان شوێنی پاك یان هەر بەهانەیەکی تر بێت هەر قبووڵ نیەو دەبێت موسوڵمان نوێژەکەی لە کاتی خۆیدا بەو حاڵەتەی تێیدایە بیکات[١]!!

- خوای پەروەردگار ئەو نوێژخوێنانەی لە دەیان شوێنی قورئاندا مەتح کردووە کە لە کاتی خۆیدا نوێژەکانیان دەکەن، دەربارەیان لە سورەتی مەعاریجدا لە دوو شوێندا دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ هُمۡ عَلَىٰ صَلَاتِهِمۡ دَآئِمُونَ﴾ المعارج/٢٣ واتە: هەموو مرۆڤێك شپرزە دەبێت و دەکەوێتە تاڵوکەوە جگە لەو کەسانەی لە نوێژەکانیاندا بەردەوامن.. هەروەها: ﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَلَىٰ صَلَاتِهِمۡ

[١] ئیمامی شافعی: الام (٧٩/١)، الفروع (٢٩٣/١)، النووي: المجموع (١٨٢/١)، ابن تيمية: مجموع الفتاوى (٣٠/٢٢)،

يُحَافِظُونَ ﴾ المعارج/٣٤ واتە: ئەو کەسانەی کە پارێزگاری نوێژەکانیان دەکەن.. بە ئاگالێبوونی کاتەکانی، وەکو ئیبنو مەسعوود دەڵێ[١].

ـ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وەسفی نوێژەکانی وا کردووە کە لە کاتی خۆیاندا ئەنجام بدرێن (باشترین کردەوەی چاکە)ی موسوڵمانە! چاکترین کارێکە کە خوای گەورە لێی رازی بێت! سەیدنا ئیبنو مەسعوود خوا لێی رازی بێت لە پێغەمبەری خوای صلى الله عليه وسلم پرسی: (أيُّ العَمَلِ أحبُّ إلى اللهِ؟ قالَ الصَّلاةُ علَى وَقْتِهَا، قُلْتُ ثمَّ أيُّ؟ قالَ برُّ الوالدَينِ ، قلتُ ثمَّ أيُّ؟ قالَ الجهادُ في سبيلِ اللهِ)[٢] واتە: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کرد کە چ کارو کردەوەیەك لای خوای گەورە خۆشەویسترە؟! فەرمووی: نوێژەکان لە کاتی خۆیاندا، ووتم پاشان چی؟! فەرمووی: چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوکدا، ووتم: پاشان چی؟! فەرمووی: جیهاد لە پێناوی خوادا..

ـ پێغەمبەری پێشەوا صلى الله عليه وسلم هۆشداریی و حەزەری ئەوەی داوەتە ئوممەتەکەی کە ئەگەر کاربەدەست و دەسەڵاتدارانی ووڵات نوێژەکانیان لە کاتی خۆیاندا دواخست!! لەگەڵیاندا مەمێنن[٣].. سەیدنا ئەبوزەڕی غیفاری خوا لێی رازی بێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێمی فەرموو: (كَيْفَ أنتَ إذَاكانَتْ علَيْكَ أُمَرَاءُ يُمِيتُونَ (لە ریوایەتێکی تردا: يُؤَخِّرُونَ الصَّلَاةَ عَنْ وَقْتِهَا)، قُلْتُ فَمَا تَأْمُرُنِي؟ صَلِّ الصَّلَاةَ لِوَقْتِهَا فإنْ أدْرَكْتَها مَعَهُمْ فَصَلِّ، فإنَّهَا لَكَ نَافِلَةٌ)[٤] واتە: ئەو زەمانە

---

[١] تەبەرانی لە المجمع (١٢٩/٧)، ابن المنذر: الاوسط (٣٨٦/٢).
[٢] بوخاری (٥٢٧)، موسلیم (٨٥).
[٣] سەیری ئەو ئاڕاستەو سەیری واقیعی ئێستای موسوڵمانان بکە!!
[٤] موسلیم (٦٤٨)، ترمزی (١٧٦)..

چی دەکەیت کە کاربەدستی واتان بەسەروە دەبێت کە نوێژ دەمرێنن (ریوایەتەکەی تر: کە نوێژەکان لە کاتی خۆیاندا ناکەن)؟! عەرزم کرد: فەرمانی چیم پێ دەکەی بیکەم؟! فەرمووی: نوێژەکەی خۆت لە کاتی خۆیدا بکە، ئەگەر لەگەڵ ئەوانیشدا فریا کەوتیت بیکەوەوە، بۆتۆ بە سووننەت هەژمارد دەکرێت.

ـ سەیدنا ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی رازی بێت ئەوەی روون دەکردەوە کە دواخستنی نوێژەکان لە کاتی خۆیان بەدواوە پێچەوانەی سیرەو سووننەتی پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وسلم، نوێژ فەوتانە.. دین لەدەستدانە! ئیمامی زوهری دەڵێ: لە دیمەشق چوومە خزمەتی ئەنەسی کوڕی مالیك، دیتم دەگری! ووتم بۆچی دەگریت؟! فەرمووی: هیچ شتێکی زەمانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەماوە ئەم نوێژانە نەبێت، وا ئەمیشیان فەوتاند[١]!!

★ ★ ★

---

[١] بوخاری (٥٣٠).

(٢)

## چۆن بزانرێت نوێژەكە لە كاتی خۆیدایە؟!

شەرعناسان لە وەڵامدا دووپۆلن:

**پۆلی یەكەم: تەكبیرەی ئیحرام بكەوێتە كاتەكەوە ئەوە نوێژەكە لە كاتی خۆیدا كراوە:** ئەمەش بۆچوونی ئیمامی ئەبو حەنیفەو شافیعی و رای بەناوبانگی ئیمامی ئەحمەدە[١]، بەڵگەشیان:

١ـ لەبەر ئەوەی نوێژ دابڕ دابڕ ناكرێت، سەرەتاو كۆتایی نوێژەكە وەكو یەكە، تەكبیرەی ئیحرامیش دەسپێكی نوێژەكەیە كەوابوو ئەوی فریای تەكبیرەی ئیحرام كەوت ئەوە نوێژی لە كاتی خۆیدا كردووە[٢].

٢ـ لەبەر ئەو فەرموودەیەی عائیشەخان خوا لێی رازی بێت كە دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (مَنْ أدْرَكَ مِنْ الْعَصْرِ سَجْدَةً قَبْلَ أنْ تغْرُبَ الشَّمْسُ، أو مِنْ الصُّبْحِ قَبْلَ أنْ تطْلُعَ الشَّمْسُ فقَدْ أدْرَكَهَا)[٣] واتە: هەر كەسێك پێش خۆرئاوابوون فریای سوجدەیەكی نوێژی عەسر كەوت، یان فریای سوجدەیەكی نوێژی سپێدە كەوت پێش ئەوەی خۆر هەڵبێت، ئەوە فریای ئەو نوێژە كەوتوە. ئەم شەرعناسە بەرێزانە دەڵێن: سوجدە بەشێكە لە نوێژ كە روكن و فەرزەكانی لێك دانابڕێن، تەكبیرەی ئیحرامیش بەشێكی وەكو سوجدەكەیە، بۆیە هەركەس فریای كەوت ئەوە فریای نوێژ كەوتوە.

---

[١] النووي: المجموع (٤٩/٣)، الاوسط (٣٤٨/٢)، الاكليل (٣٠٤/١).

[٢] المبدع (٣٥٣/١).

[٣] موسلیم (٦٠٩)، ئەحمەد (٧٨/٦) سەحیحە: صحيح فقه السنة (٢٥٢/١).

**پۆلی دووەم: ئەوی فریای یەك ركات نوێژ بكەوێت ئەوە نوێژەكەی لە كاتی خۆیدا كردووە:** ئەمەش بۆچوونی ئیمامی مالیك و ریوایەتێكی ئیمامی ئەحمەدەو ئیمامی ئیبنوتەیمییەش بە پەسەندتری ناساندووە[1]. بەڵگەیان:

١- فەرموودەكەی ئەبو هورەیرە خوا لێی رازی بێت كە دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو: (مَنْ أدْرَكَ رَكْعَةً مِنْ الصَّلاةِ فَقَدْ أدْرَكَ الصَّلَاةَ)[2] واتە: هەر كەسێك فریای ركاتێك نوێژ بكەوێت ئەوە فریای هەموو نوێژەكە كەوتووە..

٢- ئەو فەرموودەیەی پێشوو كە دەفەرموێ: ئەوی فریای سوجدەیەك كەوت مەبەستی فریاكەوتنی ركاتێكە، ئەمە ركاتەو بە ناوی سوجدەوە ناوهێنراوە، جا جارێك فەرموویەتی: ئەوی فریای سوجدەیەك كەوت و جارێكی تر فەرموویەتی: ئەوی فریای ركاتێك كەوت.. نابینیت سەیدنا عومەر خوا لێی رازی بێت دەڵێت: (حَفَظْتُ مِنْ رَسولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ سَجْدَتينِ قَبْلَ الظهرِ وَسَجْدَتينِ بَعْدَهَا)[3] واتە: لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم فێربووم، دوو سوجدە پێش نیوەڕۆ بكەم و دوو سوجدە دوای نیوەڕۆ.. دیارە مەبەستەكەی دوو ركات نوێژی سوونەتە دوای نوێژی فەرز بیكات، نەك سوجدەبردنی تەنها.

---

[1] مواهب الجليل (٤٠٨/١)، الدسوقي (١٨٣/١)، الانصاف (٤٣٩/١).
[2] بوخاری (٥٨٠)، موسلیم (٦٠٧).
[3] بوخاری (١١٧٣).

**كەسێك فریای كاتێكی كەم دەكەوت و لەپڕ عوزری بۆ پەیدابوو:** كەسێك ماوەیەكی كەمی بۆ نوێژ لەبەردەستدا بوو، بەڵام هۆكارێكی ڕێگرتنی بۆ پەیدا بوو، وەك شێتبوون و لەهۆش خۆچوون و كەوتنە حەیزو زەیستانی و شتی واو نەیتوانی نوێژەكە بكات، ئەمەش دوو حاڵەتی هەیە:

١. ئەگەر ماوەكە ئەوەندە كەم بوو بەشی بەشە ركاتێكی فەرزی نەدەكرد، ئەوە بە خاوەن عوزر حسێبەو نوێژەكەی دوای نەمانی هۆكارەكە ناكاتەوە[1].

٢. ئەگەر كاتەكە ئەوەندە بوو بەشی كردنی ركاتێكی دەكرد، شەرعناسان لە حوكمیدا دوو ران:

- یەكیان دەڵێ: دەبێ دوای نەمانی هۆكارەكەی بیكاتەوە.
- دووەمیان دەڵێ: نایكاتەوە. ئەمەشیان ئیختیاری شێخولئیسلام ئیبنو تەیمییەیەو پێدەچێت بەهێزتر بێت[2]. چونكە ئافرەتێك لە نیوەی عەسردا بۆ نموونە بكەوێتە سوڕی مانگانەوەو بۆی جائیز نەبێت بیكات، خۆ كەمتەرخەم نەبووە، ئەو هێشتا كاتی نوێژكردنەكەی بەدەستەوە مابوو.. ئەمە لە لایەك، لە لایەكی ترەوە: نەبیستراوە كە پێغەمبەری خۆشەویست صلى الله عليه وسلم یان یاوەرێكی بەڕێزی فەرمانیان بە ئافرەتێك كردبێت كە نوێژی ئەو كاتە بگێڕێتەوە كە كەوتۆتە سوڕی مانگانەیەوە..

---

[1] النووی: المجموع (٧١/٣).

[2] لە بەرگی یەكەمدا لە حوكمی حەیزو زەیستانیدا باسمان لەمە كرد..

(٣)

## عوزری دواخستنی نوێژ

ئەسڵ ئەوەیە کە دەبێت نوێژەکان لە کاتەکانی خۆیاندا بکرێن، بەڵام بۆ ئاسانکاریی، شەرع هەندێك هۆی قبووڵ کردووە کە ببنە عوزری شەرعی بۆ دواخستنی نوێژ، لەوانە:

١ و ٢ . خەوتن و بیرچوونەوە: هەر کەسێك پێش نوێژ خەوی لێ کەوت یان بیری چوو بیکات تا کاتی بەسەرچوو، ئەوە خاوەن عوزرە. دەبێ کە خەبەر بۆوە یا بیری کەوتەوە دەسبەجێ نوێژەکەی بکاتەوە، چونکە:

ـ سەیدنا ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (مَنْ نَسِيَ صَلَاةً فَلْيُصَلِّ إِذَا ذَكَرَهَا لَا كَفَّارَةَ لَهَا إِلَّا ذَلِكَ )[١] واتە: هەر کەس نوێژێکی بیرچوو با ئەو کاتەی دەکەوێتەوە یادی بیکات، کەفارەتی غەیری ئەوەی نیە..

ـ جارێك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەگەڵ یاوەرانی بەرێزیدا لە سەفەردا بوون، شەو کە خەویان لێ کەوت، گەرمای خۆری سبەینێ کە هەڵهات خەبەری کردنەوە، بۆیە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (لَيْسَ فِي النَّوْمِ تَفْرِيطٌ، وَلَكِنِ التَّفْرِيطَ عَلَى مَنْ لَمْ يُصَلِّ الصَّلَاةَ، حَتَّى تَجِيءَ الصَّلَاةُ الْأُخْرَى، فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ فَلْيُصَلِّهَا حِينَ يَنْتَبِهُ لَهَا، فَإِذَا كَانَ مِنَ الْغَدِ فَلْيُصَلِّهَا عِنْدَ وَقْتِهَا)[٢] واتە:

---

[١] بوخاری (٥٩٧)، موسلیم (٣١٤).
[٢] موسلیم (٦٨١).

کەمتەرخەمی لە خەوتندا نیە (یەعنی ئەگەر کەسێك خەوی لێ کەوتبوو حوکمی کەمتەرخەمی نوێژ بەسەردا نادرێت) بەڵکو کەمتەرخەمی لەو کەسەدایە کە نوێژەکەی نەکردووە تا کاتی نوێژەکەی تری بەسەردا هاتووە.. هەر کەسێك وای کرد با ئەو کاتەی بیری دەکەوێتەوە بیکات، ئەگەر کەوتەوە سبەینێ با لە کاتی خۆیدا بیکات.. ئەمە گێڕانەوەی نوێژەکە نیە، چونکە ئەم کاتە بۆ ئەم کەسە هەر وەکو درێژکراوەی کاتەکەی ترە[1]..

**٣ . ناچارکردن:** هەر کەسێك ناچاری وەلکردنی نوێژ کراو نەیانهێشت بە ئاماژەش بیکات، یان ناچار کرا نوێژێکی تری پێچەوانەی نوێژ بکات، ئەوە خاوەن عوزرە[2]، ئەگەر هۆکاری ناچارکردنەکەی لەسەر نەما نوێژەکانی دەکاتەوە.. ئەم جۆرە ناچار کراوە ئەگەر بتوانێت نوێژەکەی بەسەر جوڵاندن بکات، دەبێت بیکات.. کە بەو شێوەیەش کردی ئیتر دیسان کردنەوەی لەسەر نامێنێت..

**٤ . کۆکردنەوەی نوێژ بۆ ئەو کەسەی ماف هەیە:** هەر کەسێك بۆی هەبوو دوو نوێژ کۆکاتەوەو بە دواخستنیان (جەمع و تەئخیر) کردنی، بۆی هەیە نوێژی یەکەم لە کاتی نوێژی دووەمدا بکات.. وەکو کەسێك کە نوێژی نیوەڕۆی هێناوەتە لای عەسرو پێکەوە کردوونی.. بەڵێ بەمە دەوترێت نوێژی دواخست، بەڵام لە راستیدا دوای نەخستووە، تەنها ئەوەندەیە کە کاتەکانی بۆ کراوە بە یەك..

---

[1] الشوكاني: السيل الجرار (١٨٨/١).

[2] النووي: المجموع (٦٧/٣)، حاشية الدسوقي (٢٠٠/١)، الاشباه و النظائر (٢٠٨).

**٥ . ترس و بیم:** هەر كەسێك كەوتە ترس و بیمێكی واوە كە دڵ و هۆشی لێ بڕێت، هۆشی لەوە نەبێت نوێژەكەی بكات، خاوەن عوزرە، ئەگەر باری دەروونی تا كاتی نوێژ بەسەر دەچێت نەهاتەوە جێی خۆی، بۆی هەیە دواتر نوێژەكەی بكات، چونكە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە غەزای خەندەقدا نوێژی عەسریان بۆ نەكرا تا خۆر ئاوا بوو[١]..

★ ★ ★

---

[١] بوخاری (٥٩٨)، موسلیم (٦٣١)، وەكو توێژینەوەو بەراوردی راو بۆچوونی زانایان بڕوانە الشوكاني: نيل الاوطار (٢/٣٦) و ابن عثيمين: الشرح الممتع (٢/٢٣).

(٤)

## ئەو كەسەی شیاوی نوێژكردن دەبێت
## پێش ئەوەی كاتی نوێژ بەسەرچێت

ئەگەر منداڵێك باڵغ بوو، یا شێتێك چاك بۆوە، یا حەیزدارێك یان زەیستانێك پاك بۆوەو غوسڵی دەركرد، كاتیش بەقەدەر ئەنجامدانی ركاتێك یان كەمێك زیاتری مابوو، نوێژەكەیان لەسەرەو دەبێ زوو فریای خەن.. بەڵام ئایا نوێژی تریش كە بەو نوێژەوە پەیوەست بووە دەبێت هەر ئەو كاتە بكرێت، یان دەشێت دواخرێت؟!:

ئەگەر حەیزدار پێش خۆرئاوا بوون یان پێش سپێدە پاك بۆوە، راو بۆچوونی شەرعناسان دەربارەی حوكمی وا سێ پۆلن:

**یەكەم: ئەگەر پێش خۆرئاوا بوون پاك بۆوە دەبێت نوێژی نیوەڕۆو عەسری بكات:** ئەگەر پێش سپێدەی بەیانی پاك بۆوە دەبێت نوێژی شێوان و خەوتنانی بكات.. ئەمەش ئەوەیە كە لە سەیدنا عبدالرحمانی كوڕی عەوف و ئیبنوعەبباس و ئەبوهورەیرەوە خوا لێیان رازی بێت گێڕراوەتەوە، مەزهەبی جمهوری پێشەوایانی شەرعناسیی، وەكو تاووس وئیبراهیمی نەخەعی وموجاهیدو رەبیعەو ئیمامی مالیك ولەیس وئیمامی شافیعی وئیمامی ئەحمەدو ئەبو سەورو ئیسحاق، هەر وایە[1].. بەڵگەشیان:

---

[1] ابن رشد: بداية المجتهد (١/١٣٣)، الاوسط (٢/٢٤٣)، ابن هانئ: مسائل أحمد (١/١٣١)..

١ ـ ئەو فەرموودەی کە لە سەیدنا عبدالرحمانی کوڕی عەوفەوە خوا لێی رازی بێت گێڕراوەتەوە کە دەفەرموێ: (إذَا طَهُرَتْ الحَائِضُ قَبْلَ غُروبِ الشَّمْسِ صَلَّتْ الظُّهْرَ وَالعَصْرَ، وإذَا طَهُرَتْ قَبْلَ طلوعِ الْفَجْرِ صَلَّتْ الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ)[1] واتە: ئەگەر ئافرەت پێش خۆرئاوابوون لە حەیز پاك بۆوە، نوێژی نیوەڕۆو عەسری دەبێ بکات، ئەگەر پێش دەرکەوتنی سپێدەی بەیانیش پاك بۆوە دەبێ نوێژی شێوان و خەوتنانی بکات..

ئەمە لە سەیدنا ئەبوهورەیرەو سەیدنا ئیبنو عەبباسیشەوە ریوایەت کراوە خوا لێیان رازی بێت[2]..

## دووەم: ئەگەر لە کاتی عەسردا پاك بۆوە هەر نوێژی عەسری دەکەوێتە سەر:

ئەمەش رای حەسەنی بەسری و قەتادەو سوفیانی سەوری و ئیمامی ئەبو حەنیفەیە[3]، بەڵگەشیان:

١ ـ ئەم فەرموودەیە: (مَنْ أدْرَكَ رَكْعَةً مِنْ الصَّلاةِ فَقَدْ أدْرَكَ الصَّلاة)[4] واتە: هەر کەسێك فریای رکاتێك نوێژ بکەوێت ئەوە فریای هەموو نوێژەکە کەوتووە.. فەرموویانە ئەو ئەلف و لامەی سەر (الصلاة) ئەلف و لامی عەهدە، کە گشتیە.. یەعنی هەر کەسێك فریای ئەو نوێژە بکەوێت کە رکاتێکی لە کاتی خۆیدا کراوە، ئەمما ئەوی فریای رکاتێکی نەکەوتوون ئەوە ئەم

---

[1] ابن أبي شيبة (٢/٣٣٦)، ابن المنذر (٢/٢٤٣) عبدالرزاق: المصنف (١٢٨٥)، بۆ تویژینەوەشی بڕوانە: ابن قدامة: المغني (١/٢٣٨).

[2] ابن أبي شيبة (٢/٣٣٧)، ابن المنذر (٢/٢٤٤)، سنن الدارمي (٨٨٩). کەمال ئیبنو السید لە صحيح فقه السنة (١/٢٥٥) دا دەفەرموێ: سەنەدەکەی زەعەیفە.

[3] الاوسط (٢/٢٤٥)، اختلاف العلماء (ل ٣٨٠).

[4] بوخاری (٥٨٠)، موسلیم (٦٠٧).

فەرموودەیە نایگرێتەوە.. چۆن دەبێت کەسێك پابەند کەین بە نوێژی کاتێکەوە کە لەدەستدا نیە؟! کاتێك کە کابرامان لە کاتی خۆیدا بۆ پابەند نەکراوە پێی! کەوابوو تەنها نوێژی عەسرەکەی لەسەرە چونکە فریای رکاتێکی کەوتووە[1]..

٢ ـ راجوێیی لەوەدا نیە کە ئەگەر کەسێك بە ئەنقەست یان بە ئیهمالی و بێ عوزری شەرعی لێگەڕا تا کاتی نوێژی عەسر خەریك بوو کۆتایی پێ دەهات، پەلەی کردو رکاتێکی تێدا فریا خست، بەڵام حەوت رکاتەکەی تری عەسرو نیوەڕۆی لە کاتی نوێژی شێواندا کرد، گوناحی گەیشتۆتێ.. خۆ ناکرێت ئەم کاتەی کە ناچارییە بۆ ئەم کەسە ئیهماڵە بکرێتە کاتێکی ئاسایی[2]؟!

٣ ـ ئێمە دەزانین ئەگەر رکاتێکی نیوەڕۆ فریاکەوت بەڵام رێبەستێکی بۆ پێش هات و نەیتوانی تەواوی کات، ئەمە دواتر هەر ئەو نوێژەی لەسەر بیکاتەوە، ئەمە لە کاتێکدایە کە کاتی نوێژی نیوەڕۆ لە کاتی کۆکردنەوەی نوێژەکاندا کاتی نیوەڕۆو عەسریشە، دەی جیاوازی نێوان ئەم دوو کاتە چیە؟! بۆچی لەمیاندا عەسری پێ ناکەن و لەویاندا نیوەڕۆی پێ دەکەن؟! ئەگەر دەڵێن: لەبەر ئەوە جیاوازیمان خستۆتە نێوانیانەوە چونکە حوکمی یاوەرانمان وا پێ گەیشتووە.. پێیان دەوترێت: باشە ـ ئەگەر ئەو ریوایەتانەش راست بوو ـ دیارە لەبەر ئەوە وا ووتراوە نەبادا رێبەستەکە نەمابێت و بە هۆی ئیهمالیەکی ترەوە نیوەڕۆکە لە کاتی خۆیدا نەکرابێت، یان بە هۆی چاوەڕوان کردنەوە، وەکو پابوونەوە لە

---

[1] ابن عثيمين: الشرح المتع (٢/١٣٠).

[2] ابن المنذر: الاوسط (٣/٢٤٥).

حەیز كە هەر دەبێت ماوەیەكی لێ بوەستێت تا لە پاكبوونەوەی دڵنیادەبێت.. لەبەر ئەم هۆیانەیە كە ئەو یاوەرانە پێیان باشتر بووە كە نیوەڕۆكەش لە بابی ئیحتیاتەوە بكرێتەوە[١]..

**سێیەم: ئەگەر لە كاتی عەسردا پاك بۆوەو كات هەبوو نیوەڕۆو عەسری دەكات، ئەگەر نا: هەر عەسر دەكات:**

ئەمەش رای ئیمامی مالیك و ئەوزاعیە[٢]..

**پوختەی بۆچوونەكان:** هەرچەندە بۆچوونی دووەمم پێ بەهێزترە، بەڵام دەشێت هەموو راو بۆچوونەكان پێكەوە بسازێنرێن، بەوەی كە دووەم وەكو حاڵەتێكی ئیحتیات وسێیەم وەكو حاڵەتی ناچاری سەیر بكرێن.

★ ★ ★

---

[١] ابن عثيمين: الشرح الممتع (١٣٠/٢).

[٢] ابن رشد: بداية المجتهد (١٣٣/١)، الاوسط (٢٤٦/٢).

(٥)

## ئەوی بێ عوزر نوێژەكەی ناكات تا كاتەكەی بەسەر دەچێت

شەرعناسان لە حوكمی گێڕانەوەی ئەم نوێژەدا دوو پۆلن:

**. پێویست ناكات بیگێڕێتەوەو جائزیش نیە:** ئەمە بۆچوونی قاسمی كوڕی محمدو ئیبنوسیریین و عومەری كوڕی عبدالعەزیزو هەندێك لە یاوەرانی ئیمامی شافیعی و جورجانی و ئیبنو بەتتەو داوودی زاهیریی و ئیبنو حەزمە هەروەها رای ئیبنو تەیمییەو ئەلبانی و بن عوسێمینیشە[1] رەحمەتیان لێ بێت.. بەلگەشیان:

**یەكەم: بەڵگە گشتیەكان (ئایەتەكان):** كە باس لە حوكمی نوێژنەكەر دەكەن:

١ ـ (إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَـٰبًا مَّوْقُوتًا ) النساء/ ١٠٣ واتە: نوێژ كردن بە گوێرەی كاتی دیاری كراو لەسەر موسوڵمانان فەرزە.. كەوابوو نوێژی پەیوەست بە كاتەوە كردووە، كاتێك كە ئەمسەرو ئەوسەری دیاری كراوە، جیاوازی نێوان پێش سەرەتاو دوای كۆتاییەكەی نیە.. جا وەكو كە ناشێت پێش هاتنی كاتەكەی بكرێت، ناشبێت دوای تەواوبوونی كاتەكەی بكرێت، مەگەر بە دەقێكی تر كە حوكمێكی تری پێ بێتە دی، وەكو دەقی باسی خەوتوو بیرچووەوەو خاوەن عوزرەكانی دیكە، وەكو حەج و رەمەزان.. لەبەر

---

[1] ابن حزم: المحلى (٢/٢٣٥)، ابن تيمية: مجموع الفتاوى (٢٢/٤٠)، الانصاف (١/٤٤٣)، الشوكاني: نيل الاوطار (٣/٣١)، ابن عثيمين: الشرح الممتع (٢/١٣٣)

ئەمەیە دەڵێن: ئەگەر کابرا نوێژی پێش وەخت کرد نوێژەکەی بەتاڵە، هەروەها ئەگەر نوێژی لە دوای تەواو بوونی کاتی نوێژەکە کرد هەر بەتاڵە!

٢ ـ (فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ ۝٤ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ) الماعون / ٥-٤ واتە: وەیل بۆ ئەو کەسانەی لە نوێژەکانیان غافڵن..

٣ ــ (فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا ۝٥٩ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا) مریم / ٥٩-٦٠ واتـە: نەوەیـەکیان لـە پاش هات کە نوێژەکانیان فەوتاندو کەوتنە شوێن هـەواو هـەوەس و حەزی خۆیان، ئەوانە لە دواییدا بە هیلاك دەچن، مەگـەر ئەوانـەی کـە پەشـیمان دەبنـەوەو تۆبـە دەکـەن و دەکەونـەوە سـەر کـردەوەی چاك..

## دووەم: بەڵگە گشتیەکان (فەرموودەکان): کە

١ ـ (مَنْ نَسِيَ صَلَاةً فَلْيُصَلِّ إِذَا ذَكَرَهَا لَا كَفَّارَةَ لَهَا إِلَّا ذَلِكَ )[١] واتە: هەر کەس نوێژێکی بیرچوو با ئەو کاتەی دەکەوێتەوە یادی بیکات، کەفارەتی غەیری ئەوەی نیە.. ئەم شەرعناسە بەڕێزانە دەڵێن: ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەوی بە ئەنقەست نوێژەکەی نەکرد تا چوو، نوێژەکەی ناکاتەوە، چونکە بیرچوونەوە لەم فەرموودەیەدا مەرجە، مەرجەبۆ کراوەکەش کە نوێژەکەیە پەیوەندە بە مەرجەکەوە، کەوابوو کە بیری چوو دەیکاتەوە، کە بە ئەنقەست نەیکرد نایکاتەوە.

---

[١] بوخاری (٥٩٧)، موسلیم (٣١٤).

٢ ـ ئەو فەرموودەیەی کە دەفەرموێ: (الَّذِي تَفُوتُهُ صَلاةُ الْعَصْرِ فَكَأَنَّمَا وُتِرَ أَهْلُهُ وَمَالُهُ)[١] واتە: ئەو کەسەی نوێژی عەسری دەچێت، وەکو ئەو کەسەیە کە کەسوکارو ماڵ و سامانەکەی فەوتابێت.. کەوابوو ئەو نوێژەی کە فەوتا تازە بواری هێنانەوەی نیە! شەرعناسانی بەرامبەر فەرموویانە: فەرموودەکە نابێتە بەڵگەی ئەو حوکمە چونکە راهێنانی موسوڵمانە لەسەر سووربوونی لەسەر نوێژەکانی، بۆ ئەوەی بزانێت کە ئەگەر نوێژێکی چوو دەبێ جێ خەمی بێت هەر وەکو کە نەمانی کەسوکاری دەبێتە جێ خەمی! خەم خواردن بۆ نوێژ چوون چ پەیوەندی بەوەوە هەیە کە نابێت بیگێڕێتەوە..

## دووەم: بەڵگە گشتیەکان (فەرموودەکان):

١ ـ ئەم شەرعناسە بەڕێزە دەڵێن: ئەم بۆچوونەی ئێمە بۆچوونی یاوەرانێکی وەکو سەیدنا عومەری کوڕی خەتتاب و عبداللەی کوڕی و سەعدی کوڕی ئەبو وەققاس و ئیبنومەسعوودە خوا لێیان رازی بێت..

٢ ـ هەروەها ئەم بەڕێزانە دەڵێن: دەرکردنی حوکم بۆ نوێژگێڕانەوە رەفتارێکی شەرعیە، ئەمەش مافی خواو پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وسلم.. ئەوانیش لە وەڵامدا دەڵێن: ئێمە حوکمەکەمان دەرنەکردووە، هەموو بۆچوونەکەمان ئەوەیە کە نوێژنەکەری ئەنقەستمان قیاس کردووە بە نوێژنەکەری خەوتوو بیرچوو..ئەمەش قیاسێکە بە پێی رێساکانی شەرع کراوە..

---

[١] شێخی ئەلبانی لە صحيح الجامعدا (٥٤٩١) دەفەرموێ سەحیحە..

٣ ـ دیسان دەڵێن: کە دەڵێین نوێژەکەی ناگێڕێتەوە وەنەبێت مەبەستمان بێت تاوانەکەی لەسەر سووك کەین، نا، خۆ کابرا نوێژەکە بکاتەوەو نەکاتەوە گوناحی فەوتانی هەر لە گەردندایە ئیتر کردنەوەی ئەو نوێژە سوودی چیە؟! بە تایبەتی کە وەکو حوکمی بیرچووەوەو خەوتوو دەقێکمان لەبەر دەستدا نیە فەرمانی نوێژکردنەوەکە بەمیش بکاتەوە؟؟ نوێژکردنەوەی بیرچووەو خەوتوو کەفارەتە، خۆ ناشێت حوکمی ئیهمالەکە قیاس کەینەوە لەسەری[1]!!

ـ **دەبێ بیگێڕێتەوە:** ئەمەش بۆچوونی جمهوری پێشەوایانی شەرعە، رای ئیمامی ئەبوحەنیفەو مالیك و شافیعی وئەحمەدو زۆرێك لە شەرعناسانی تری غەیری ئەوانیشە.. تەنانەت ئیمامی نەوەوی دەڵێ کۆڕا (ئیجماع)ی لەسەرە[2].. بەڵگەشیان:

١ ـ ئەو بەڵگانەی کە دەڵێن: هەر کەس بیری چوو نوێژەکەی بکات دەبێت بیگێڕێتەوە، بۆ ئێرەش دەبنەوە بە بەڵگە.. کەسێك بیری چوو بێت نوێژەکەی بکات دەبێت بیکاتەوە، کەوابوو ئەو کەسەی بە ئەنقەست نوێژەکەی چوواندووە لەپێشترە بیگێڕێتەوە..

---

[1] ابن حزم: المحلی (٢/٢٣٧) لێرەدا ئیمامی ئیبنو حەزمی رەحمەتی ووتووێژێکی دوورودرێژ لەسەر باسەکە دەهێنێت و دواتر ئەوە پەسەند دەکات کە نوێژی بە ئەنقەست چوێنراو گێڕانەوەی نیە..

[2] حاشیة الدسوقي (١/٢٦٤)، النووي: المجموع (٣/٧١) الانصاف (١/٤٤٢)، ابن عثیمین: الشرح المتع) ٢/١٣٣). هەر لەبەر ئەوەی پۆلێکی تری شەرعناس هەن پێچەوانەی ئەم بۆچوونەیان هەیە ناتوانرێت بووترێت کۆڕای لەسەرە..

٢ ـ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەربارەی خەوتوو بیرچووەوە کە فەرمووی: (لَا كَفَّارَةَ لَهَا إِلَّا ذَلِكَ)[١] واتە: کەفارەتی غەیری ئەوەی نیە.

دەڵێن: ئەمە حوکمی ئەنقەستیەکەشە، چونکە خۆ ئەمیش وەکو بیرچووەکەیەو نەیکردووە، کە گێڕایەوە جەبرانی دەکاتەوە..

٣ ـ قیاس لەسەر ئەو کەسەی کە ڕۆژووی فەرزی بە ئەنقەست شکاند بێت یان لە ڕۆژی ڕەمەزاندا جیماعی کردبێت، دەبێت بیگرێتەوە. بەڵام بەرامبەرەکانیان وەڵامیان داوەتەوە کە فەرموودەی (گرتنەوەی ڕۆژووی شکاوی ڕەمەزان بە جیماع) زەعیفە[٢]..

---

[١] بوخاری (٥٩٧)، موسلیم (٣١٤).

[٢] مەبەست لەو فەرموودەیە کە سەیدنا ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێت دەیگێڕێتەوەو دەفەرموێ: (جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عليهِ وَسَلَّمَ قَدْ جَامَعَ أَهْلَهُ فِي رَمَضَانَ .. فَذَكَرَ الحديث وَقَالَ فيهِ: فَأُتِيَ بِعِذْقٍ فيهِ تَمْرٌ قَدْرَ خَمْسَةَ عَشَرَ صَاعاً وَفِيهِ قَالَ كُلْهُ أَنْتَ وَأَهْلُ بَيْتِكَ وَصُمْ يَوماً وَاسْتَغْفِرِ اللَّهَ) ئەبوداوود (٢٣٩٣) واتە: کابرایەك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و عەرزی کرد کە لە ڕۆژی ڕەمەزاندا کاری سەرجێیی (جیماع) لەگەڵ خێزانەکەی کردووە تێیدا هاتووە کە پێی فەرموو: فەرمووی: دەبڕۆ خۆت و خێزانت بیخۆو ڕۆژووی ڕۆژێك بگرەرەوەو دوای لێبوردن لە خوای گەورە بکە.. لای ئیبنوماجە زیادەیەکی هەیەو دەفەرموێ: (وَصُمْ يَوماً مَكَانَهُ) ئیبنوماجە (١٦٧١) زاتە: ڕۆژێکیش لە جیاتی بگرەرەوە. ئەم فەرموودەیە لەبەر ئەوەی لە سەنەدەکەیدا عبدالجباری کوڕی عومەری ئیلی تێدایە فەرموویانە فەرموودەکە زەعیفە، لەوانەی وایان فەرمووە: یەحیای کوڕی مەعینی مامۆستای ئیمامی ئەحمەدو ئەبو زەرعەو نەسائی و ئیبنو سەعدو بوخاریش دەفەرموێ: مونکەراتی زۆرە.. مەبەستی لەوەیە فەرموودەی مونکەر کە جۆرێکە لە فەرموودەی زەعیف زۆر دەگێڕێتەوە، نەك کاری خراپەی زۆر بێت.. ووریابە.

٤ ـ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: (فَدَيْنُ اللَّهِ أَحَقُّ أَنْ يُقْضَى)[١] واتە: قەرزی خوا لە پێشترە بدرێتەوە.. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم حەج و رۆژووی ناوناوە قەرز. كابرا كە حەجی نەكردبوو، پاش مردنی بۆی دەكرێتەوە، كە رۆژووی لەسەر بێت بۆی دەگێڕرێتەوە، هەموو ئەمە لەبەر ئەوەی قەرزی خوایەو لەسەریێتی، جا كابرا كە قەرزی خوای لە نوێژدا لەسەر چۆن نابێت بیداتەوە؟! حەتمەن ئەمیش دەبێت بیداتەوە مادام لە ژیانیدا ماوە.. ئەمانی تر وەڵامیان داوەتەوە كە ئەگەر ئەم قیاسەتان راست بێت كەوابوو دەشێت كابرا پێش كات نوێژ بكات چونكە قەرز دەشێت پێش هاتنی كاتی دانەوەی بدرێتەوە!! دواتر ئەمە باس دەكەینەوە ان شاء الله.. من پێم وایە بۆچوونی چوار پێشەوا بەڕێزەكەو ئیمامی نەوەوی ئەوان بەهێزتر بێت، بۆیە:

ئەو كەسەی نوێژەكەی چوو قەرزارەو دەبێت بیگێڕێتەوە.. والله اعلم.

★ ★ ★

---

[١] بوخاری (١٩٥٣) موسلیم (١١٤٨)، ئەبوداوود (٣٣١٠).

## باسی دووەم: نوێژ گێڕانەوە
## (قەزا کردنەوەی نوێژ)

<u>نوێژ گێڕانەوە:</u> مەبەست لە نوێژ گێڕانەوە کردنەوەی ئەو نوێژانەیە کە چوون کە دەبوو لە کاتی رابوردووی خۆیاندا بکرانایە، بەڵام نەکراون. ئەمە نوێژچوون یان نوێژچواندن یان نوێژ فەوتاندنی پێ دەڵێن.. کردنەوەی یان گێڕانەوەی لە عەرەبیدا پێی دەوترێت (قَضَاء) ە، لەبەر ئەوەی مەلای کوردیش (ض) بە (ڵ) دەخوێننەوە فەرموویانە (قەڵا کردنەوە)ی نوێژ، گەنجی نوێش کە لە قوتابخانە ئەو پیتە عەرەبییەی خوێندووە وەکو زۆر لە عەجەمەکان بە (ز) دەیخوێننەوە بۆیە دەڵێن: (قەزا کردنەوە)ی نوێژ، دیارە هەردووڵاش مەبەستیان کردنەوەی ئەو نوێژانەیە کە دەبوو لە کاتی خۆیاندا بکرانایە..

لە باسی ئەحکامی نوێژنەکەردا ووتمان کە شەرعناسان دوو پۆلن: جمهوری شەرعناسان (ئیمامی ئەبو حەنیفەو مالیك و شافیعی) و هاورایانیان دەڵێن کافر نیەو دەبێ هەموو نوێژەکانی کە چوون بگێڕێتەوە، ئیمامی ئەحمەدو هاورایانی لەوانەی سەردەمیش شەوکانی و ئەلبانی و بن عوسێمین دەڵێن کافربووەو پێویستی بە گێڕانەوەی هیچ یەکێك لەو نوێژانەی نیە کە لەسەردەمانی نوێژنەکردنیدا نەیکردوون.. ووتیشمان کە ئێمە رای جمهورمان پێ پەسەندترە. چونکە ئەو کەسەی لەبەر تەمبەڵی و مەشغەڵەتی دنیایی و ئیهمال کردن و شتی وا نوێژەکانی لە ماوەی رابوردوودا نەکردووە، مادام نکووڵی لە هیچ شتێکی دینەکە ناکات هەر موسوڵمانە، بۆیە دەبێ نوێژەکانی بگێڕێتەوە..

**ئایا دەسبەجێ نوێژەکە دەگێڕرێتەوە یان دەشێت دوای ماوەیەك بێت؟** ئەوی بە هەر هۆیەك نوێژی چوو، دەبێت دەسبەجێ بیکاتەوە. چونکە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەربارەی خەوتوو بیرچوو فەرموویی: (اذا نَسِيَ أحَدُكُمْ صَلَاةً أو نَامَ عَنْها فَلْيُصَلِّهَا إذَا ذَكَرَهَا)[١] (وَإِذَا اسْتَيْقَظَ) واتە: هەر کەسێکتان نوێژێکی بیرچوو، یان لە کاتیدا خەوی لێ کەوت، با ئەو کاتەی بیری دەکەوێتەوە بیکات، خەوتووش ئەو کاتەی کە خەبەری دەبێتەوە دەبێ بیکات. مالیکی و حەنبەلیەکان دەڵێن: ئەگەر ئاوا خێرا نوێژەکەی کردەوە گوناحبار نابێت[٢]..

حەنەفی و شافیعیەکان دەڵێن: دەتوانێت دەسبەجێ بیکات و دەشتوانێت دواتر بیگێڕێتەوە[٣].. لەبەر ئەوەی کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و یاوەرانی لەخەو خەبەریان بۆوە، دەسبەجێ نوێژەکەیان نەکردەوە، خستیانە کات و شوێنی دواتر..

- (عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ قَفَلَ مِنْ غَزْوَةِ خَيْبَرَ سَارَ لَيْلَهُ حَتَّى إِذَا أَدْرَكَهُ الْكَرَى عَرَّسَ وَقَالَ لِبِلَالٍ اكْلَأْ لَنَا اللَّيْلَ فَصَلَّى بِلَالٌ مَا قُدِّرَ لَهُ وَنَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَصْحَابُهُ فَلَمَّا تَقَارَبَ الْفَجْرُ اسْتَنَدَ بِلَالٌ إِلَى رَاحِلَتِهِ مُوَاجِهَ الْفَجْرِ فَغَلَبَتْ بِلَالًا عَيْنَاهُ وَهُوَ مُسْتَنِدٌ إِلَى رَاحِلَتِهِ فَلَمْ يَسْتَيْقِظْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَا بِلَالٌ وَلَا أَحَدٌ مِنْ أَصْحَابِهِ حَتَّى ضَرَبَتْهُمُ الشَّمْسُ فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوَّلَهُمْ اسْتِيقَاظًا فَفَزِعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ أَيْ بِلَالُ فَقَالَ بِلَالٌ أَخَذَ بِنَفْسِي الَّذِي أَخَذَ بِأَبِي أَنْتَ

---

[١] موسلیم (٦٨٤) زیادەکەش سەحیحیە لە عبدالرزاق: المصنف (٥٠٩) وەرگیراوە..

[٢] البهوتي: كشاف القناع (٢٦٠/١)، الشرح الصغير (٣٦٦/١)

[٣] النووي: المجموع (٦٩/٣)، حاشية ابن عابدين (٧٤/٢).

وَأُمِّي يَا رَسُولَ اللَّهِ بِنَفْسِكَ قَالَ اقْتَادُوا فَاقْتَادُوا رَوَاحِلَهُمْ شَيْئًا ثُمَّ تَوَضَّأَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَمَرَ بِلَالًا فَأَقَامَ الصَّلَاةَ فَصَلَّى بِهِمْ الصُّبْحَ فَلَمَّا قَضَى الصَّلَاةَ قَالَ مَنْ نَسِيَ الصَّلَاةَ فَلْيُصَلِّهَا إِذَا ذَكَرَهَا فَإِنَّ اللَّهَ قَالَ أَقِمْ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي )[1] واتە: كاتێك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە غەزای خەیبەر گەڕایەوە، شەوێك شەوڕەوێكی زۆر ڕۆیشتن، كە ماندوێتیان گەیشتێ خەوتن، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە بیلالی حەبەشی فەرموو: ئاگات لە شەوەكەمان بێت و پاسەوانی بە، ئەویش كەوتە نوێژ كردن.. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وياوەرانیش خەوتن.. كە كەوتنە نزیكی سپێدەی بەیانی بیلالیش پشتی بە سواریەكەیەوە دابۆوەو ڕووی لە ئاسۆ بوو، بەڵام چاوەكانی خەویان لێ خست، نە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نە بیلال نە هیچ یەكێك لە یاوەران خەبەریان نەبۆوە، تا تینی گەرمای خۆر خەبەری كردنەوە، یەكەم كەس كە بەخەبەر هات پێغەمبەری خوا بوو صلی الله علیه وسلم، زۆر نارەحەت بوو، فەرمووی: ئەرێ بیلال! فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا دایك و باوكم بە قوربانت بێت ئەوی ئەوەی بەسەر هێنام هەر ئەو بوو كە هەمان شتی بەسەر جەنابتدا هێنا، ئیتر پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: بار بكەین با بڕۆین.. ماوەیەك ڕۆیشتن پاشان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستنوێژی گرت و فەرمانی بە بیلال دا كە بانگ بدات، پاشان نوێژی بەیانیەكەی بۆ كردن.. كە نوێژەكەی بۆ گێڕانەوە فەرمووی:

---

[1] موسلیم (٦٨٠)، نەسائی (٨٠/١).

هەر کەسێك بیری چوو نوێژەکەی بکات با ئەو کاتە بیکات کە بیری دەکەوێتەوە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: نوێژ بۆ یادی من بکە..

ئەم پۆلە شەرعناسە بەرێزە دەڵێن: کەوابوو مەرج نیە دەست بەجێ نوێژەکەی بکاتەوە، بەڵکو دەتوانێت بیخاتە شوێن و کاتی تر.. شەرعناسانی بەرامبەر وەڵامی ئەمەشیان وا داوەتەوە کە ریوایەتی تری هەیە هۆی دواخستنی نوێژەکە دەبەستێتەوە بە شوێنەکەوە:

- (عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ عَرَّسْنَا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَاتَ لَيْلَةٍ فَلَمْ نَسْتَيْقِظْ حَتَّى آذَتْنَا الشَّمْسُ فَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لِيَأْخُذْ كُلُّ رَجُلٍ مِنْكُمْ بِرَأْسِ رَاحِلَتِهِ ثُمَّ لِيَتَنَحَّ عَنْ هَذَا الْمَنْزِلِ ثُمَّ دَعَا بِمَاءٍ فَتَوَضَّأَ فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ ثُمَّ أُقِيمَتْ الصَّلَاةُ فَصَلَّى )[١] واتە: سەیدنا ئەبو هورەیرە خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە: شەوێك لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم ماینەوە، بەڵام خەبەرمان نەبۆوە تا تینی گەرمی خۆر عەزێتی داین (خەبەری کردینەوە) پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: هەر کەس سواریی (راحلة)ی خۆی بگرێت و لەم ناوە دوور کەوێتەوە، دواتر ئاوی داواکرد دەستنوێژی شت، پاشان قامەت کراو نوێژەکەی کرد.[٢]

- (أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: عَرَّسْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمْ نَسْتَيْقِظْ حَتَّى طَلَعَتْ الشَّمْسُ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لِيَأْخُذْ

---

[١] عبدالرزاق: المصنف (٥٠٩ ـ ١/٢٨٤)

[٢] هەر لەو سەرچاوەدا عبدالرزاق: المصنف (٥٠٩ ـ ١/٢٨٤) ریوایاتی تریشی هێناوە وەك: (عَنْ الزُّهْرِيِّ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَامَ عَنْ صَلَاةِ الْفَجْرِ حَتَّى طَلَعَتْ الشَّمْسُ فَقَالَ لِأَصْحَابِهِ: تَزَحْزَحُوا عَنْ الْمَكَانِ الَّذِي أَصَابَكُمْ فِيهِ الْغَفْلَةُ فَصَلَّى ثُمَّ قَالَ: وَأَقِمْ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي) . هەروەها ئەبوداوود (٤٣٥).

كُلُّ رَجُلٍ بِرَاسِ رَاحِلَتِهِ، فَإِنَّ هَذَا مَنْزِلٌ حَضَرَنَا فِيهِ الشَّيْطَانُ قَالَ: فَفَعَلْنَا ثُمَّ دَعَا بِالْمَاءِ فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ صَلَّى سَجْدَتَيْنِ ثُمَّ أُقِيمَتْ الصَّلَاةُ فَصَلَّى الْغَدَاةَ)[١] واتە: شەوێك لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم ماینەوە، بەڵام خەبەرمان نەبۆوە تا تینی گەرمی خۆر خەبەری کردینەوە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: هەر کەس سواریی (راحلة)ی خۆی بگرێت، وا دیارە شەیتانمان بۆ گەیشتۆتە ئێرە، فەرمووی: وامان کرد، پاشان داوای ئاوی کرد، دەستنوێژەکەی گرت و دوو رکات نوێژی کرد، پاشان قامەت کراو نوێژی سپێدە (بەیانی) یەکەی کرد.. ئەم پۆلە شەرعناسە دەڵێن: دیارە لەبەر شوێنەکە کردنی نوێژەکەی بەیانی دواخستووە، دەنا دەیکرد.. لەسەر ئەمەوەیە کە فەرموویانە: ئەگەر خەبەری بۆوە، بۆی نیە بخەوێتەوە تا نوێژەکەی دەکات..

پێم وایە: هەر کەس خەبەری بۆوەو کاتی نوێژەکەی بەسەرچوو بوو، دەبێت دەسبەجێ بیکات ئەگەر رێبەستی شەرعی نەبوو.. والله اعلم.

★ ★ ★

## گێڕانەوەی نوێژەکان بە ریز :

سەیدنا جابر خوا لێی رازی بێت دەڵێ: (أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ جَاءَ يَوْمَ الْخَنْدَقِ بَعْدَ مَا غَرَبَتْ الشَّمْسُ فَجَعَلَ يَسُبُّ كُفَّارَ قُرَيْشٍ، وَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا كِدْتُ أُصَلِّي الْعَصْرَ حَتَّى كَادَتْ الشَّمْسُ تَغْرُبُ. فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَاللَّهِ مَا صَلَّيْتُهَا. قَالَ: فَقُمْنَا إِلَى بَطْحَانَ،

---

[١] موسلیم (٩٨٠)، نەسائی (١/٨٠).

فتوَضَّأَ لِلصَّلَاةِ، وَتوَضَّأْنَا لَهَا، فَصَلَّى الْعَصْرَ بَعْدَ مَا غَرَبَتْ الشَّمْسُ. ثمَّ صَلَّى بَعْدَهَا الْمَغْرِبَ)[1] واته: دوای خۆرئاوابوونی رۆژی غەزای خەندەق عومەری کوڕی خەتتاب هات زۆر تووڕە بوو، جنێوی بە کافرانی قوڕەیش دەدا، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا نوێژی عەسرم بۆ نەکرا تا ئەو ساتەی خەریك بوو ئاوا دەبوو، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: بە خوا منیش نەمکردووە! ئیتر خێرا دەستنوێژی گرت و ئێمەش بەدوایدا دەستنوێژمان گرت و نوێژی عەسرەکەی دوای خۆرئاوا بوون کرد پاشان نوێژی شێوانی کرد..

جمهوری پێشەوایان ئەم فەرموودەو فەرموودەی تری هاوشێوەیان کردووە بە بەڵگەی خۆیان کە فەرموویانە[2]: گێڕانەوەی نوێژەکان دەبێت بە تەرتیبی خۆیان بێت، چونکە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وای کردووە، بەڵام ئیمامی شافیعی دەڵێ[3]: تەنها کردنەکەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بەو شێوەیە نایکاتە فەرمان، بۆیە کردنەوەی بەڕیز شیاوە نەك واجب.. ئەمەش پەسەندترە.

---

[1] بوخاری (٥٩٨)، موسلیم (٢٠٩).

[2] ابن قدامة: المغني: ٦٠٧/١) البدائع (١٣١/١)، الشرح الصغير (٣٦٧/١)، الشوكاني: نيل الاوطار (٣٦/٢) .

[3] النووي: روضة الطالبين (٢٦٩/١).

**كەی نوێژەكان بە ریز ناگێڕێتەوە؟**

هەر كەسێك یەكێك لەم عوزرانەی هەبوو دەتوانێت نوێژەكانی بە تەرتیب نەگێڕێتەوە:

**١ . ئەگەر نوێژی حازری كەمی مابێت**[١] : واتە ئەو نوێژەی ئەو ساتە كابرای تێدایە كە دەبێت نوێژەكەی تێدا بكات:

- مەزهەبی ئیمامی ئەبوحەنیفەو ریوایەتێكی ئیمامی ئەحمەدو بۆچوونی سەعیدی كوڕی موسەییب وحەسەنی بەسری وئەوزاعی وسوفیانی سەوری و ئیسحاق ئەوەیە: ئەگەر ئەم نوێژە حازریە كەمی مابێت، ئەمیان پێش دەخات.
- ئیمامی شافیعی بە لایەوە تەرتیب شیاوە نەك پێویست، بۆیە لەم مەسەلەیەدا رای وایە كە كابرا سەرپشكە كام نوێژەیان پێشتر دەكات..
- مالیكیەكان و ریوایەتێكی تری ئیمامی ئەحمەدو عەتاء و لەیسی كوڕی سەعد دەڵێن: ئەگەر كاتی نوێژە حازریەكەشی بچێت، هەر دەبێ بە تەرتیبی خۆیان بیانكات!!

من پێم وایە رای یەكەم پەسەندتر بێت چونكە ناكرێت لێگەڕێ نوێژە حازریەكەشی بچێت.. والله اعلم.

**٢ . ئەگەر بە گێڕانەوەی نوێژەچووەكە، نوێژی جەماعەتی لەدەست دەچوو:** بۆ نموونە كەمێك كات ماوەو نوێژی عەسر بە جەماعەت دەكرێت، خەمی ئەوەیەتی ئەگەر نوێژە چووەكەی

---

[١] ابن قدامة: المغني (٦١٠/١)، البناية (٦٢٨/٢)، الانصاف (٤٤٤/١)، الخرشي (٣٠١/١)، الاوسط (٤١٥/٢).

بگێڕێتەوە جەماعەتی عەسری لەدەست بچێت.. ئەمە خۆی دەگەیێنێتە جەماعەتەكەو نوێژەكەی دەكات پاشان نوێژە چوواوەكەی دەگێڕێتەوە.. ئەمەش بۆچوونی ئیمامی ئەحمەدەو ئیبنوتەیمییەش پەسەندی كردووە. لەسەر رای هەندێك لە شەرعناسانی دیكە دەتوانێت با ئەوانیش نوێژی عەسر بكەن ئەم بە نییەتی نوێژی نیوەڕۆ دەبچێتە جەماعەتەكەیانەوەو پاشان خۆی نوێژی عەسرەكەی دەكات[1].. بەلاّم پێدەچێت هەر بۆچوونی یەكەم پەسەندتر بێت والله اعلم.

**٣ . گێڕانەوەی نوێژێك كە بە تەنها نابێت:** وەكو نوێژی هەینی.. ئەگەر نوێژی هەینیی چوو، ئیتر بۆی بۆتە حوكمی نوێژی نیوەڕۆو دەبێت چوار ركاتی نیوەڕۆكە بكات ئەگەر كاتی نیوەڕۆ مابوو، یان دەبێت زوو بیگێڕێتەوە ئەگەر كاتەكەی بەسەرچوو بوو.. ئەمەش ریوایەتێكی ئیمامی ئەحمەدە[2]..

**٤ . بیرچوونەوە:** ئەگەر بێ ریزبەندی (تەرتیب) نوێژەكانی گێڕانەوە، پاشان بیری كەوتەوە، هیچی لەسەر نیە.. چونكە بیرچوونەوە عوزری شەرعیە..

**٥ . نەزانین:** ئەگەر كەسێك نەیدەزانی نوێژ گێڕانەوە بە پێی ریزی كاتەكانیان پێویستەو هەروا گێڕانیەوە، هیچی لەسەر نیە، چونكە ئەو نەزانینە لەو شوێنەو بۆ ئەو كەسە وەكو بیرچوونەوەیە.. ئەمەش

---

[1] الانصاف (٤٤٥/١)

[2] الانصاف (٤٤٤/١)، ابن عثيمين: الشرح الممتع (١٤١/٢).

بۆچوونی حەنەفیەکان و رای پەسەندی ئیمامی ئەحمەدەو ئیبنو تەیمییەش بە پەسەندتری ناساندووە[1]..

## چۆنیەتی گێڕانەوەی نوێژەکان:

حەنەفی و مالیکی و قەولێکی ئیمامی شافیعی و ئەبو سەورو ئیبنول مونزیر دەڵێن[2]: نوێژە چووەکە لە ئەسڵیدا چۆن بووە ئاوا دەیگێڕێتەوە، بۆ نموونە نوێژی خەوتنان چوار رکاتیەو بە دەنگی بەرز دەخوێندرێت، ئەگەر ئەم لە سەفەردابوو کاتیش عەسرەو دەیەوێت ئەو نوێژە خەوتنانە چووەوە بگێڕێتەوە، نابێت بیکاتە دوو رکاتی و ناشێت بە دەنگی نزم بیخوێنێت، بەڵکو لە ئەسڵدا چۆنە هەر وا دەیگێڕێتەوە.. یان نوێژی عەسری چووەو لە کاتی شێواندا دەیگێڕێتەوە، دەنگ بەرز ناکاتەوە.. یان نوێژی کورت کراوەی سەفەری لەسەرەو ئێستا نیشتەجێیە، بە دوو رکاتی دەیانگێڕێتەوە.. وە هەروەها، بەڵگەش ئەوەیە کە سەیدنا ئەبو سەعیدی خودری خوا لێی رازی بێت دەڵێ: (حُبِسْنَا يَوْمَ الْخَنْدَقِ عَنْ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ حَتَّى كُفِينَا ذَلِكَ وَذَلِكَ قَوْله تعَالَى: وَكَفَى اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ الْقِتَالَ وَكَانَ اللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَمَرَ بِلَالًا فَأَقَامَ الصَّلَاةَ ثُمَّ صَلَّى الظُّهْرَ كَمَا كَانَ يُصَلِّيهَا قَبْلَ ذَلِكَ ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الْعَصْرَ كَمَا كَانَ يُصَلِّيهَا قَبْلَ ذَلِكَ ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الْمَغْرِبَ كَمَا كَانَ يُصَلِّيهَا قَبْلَ ذَلِكَ ثُمَّ أَقَامَ الْعِشَاءَ فَصَلَّاهَا كَمَا كَانَ يُصَلِّيهَا قَبْلَ ذَلِكَ قَبْلَ أَنْ تَنْزِلَ

---

[1] الانصاف (٤٤٥/١)، البناية (٦٢٩/٢).

[2] مجمع الانهر (١٦٤/١)، الشرح الصغير (٣٦٥/١)، روضة الطالبين (٢٦٩/١)، اختلاف العلماء (ل ٦٠).

فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا )[١] واتە: بە هۆی غەزای خەندەقەوە ئەو ڕۆژە نوێژی نیوەڕۆو عەسرو شێوان و خەوتنانمان بۆ نەکرا، تا ئەو کاتەی کە خوای گەورە وەستاندی وەك دەفەرموێ: خوای گەورە لە جیاتی موسوڵمانان جەنگەکەی ئیدارە دا، خوای گەورە بەهێزو دەسەڵاتەو هەموو شتێك لە جێی خۆیدا دەکات. پاشان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی دا بە بیلال کە بانگ بدات، دوای بانگ وقامەت نوێژی نیوەڕۆی کرد هەر وەکو کە لە کاتی خۆیدا دەیکرد، پاشان قامەتی کردو نوێژی عەسری کرد هەر وەکو کە لەوەو پێش دەیکرد، ئینجا قامەتی کردو نوێژی شێوانی کرد هەر وەکو کە لەوەو پێش دەیکرد، ئینجا قامەتی کردو نوێژی خەوتنانی کرد، هەر وەکو کە لەوەو پێش دەیکرد، پێش ئەوەی ئەو ئایەتە بێتە خوارەوە: ئەگەر مەترسیتان هەبوو ئەوە چ پیادە بن چ سواری[٢]..

بەڵام حەنبەلیەکان و پەسەندکراوی لای شافیعیەکان ئەوەیە کە کاتەکە کاریگەریی لەسەر ئەوە هەیە کە کام نوێژەیان پێش دەخرێت..

ـ ئەگەر نیشتەجێ بوو، نوێژەکەی چوو، دوایی چووە سەفەرو بیری کەوتەوە کە نوێژی فلاَن کاتی نەکردووە، لە سەفەرەکەیدا وەکو ئەسڵی نوێژەکە دەیگێڕێتەوە، بۆ نموونە ئەگەر نیوەڕۆ بووە چوار ڕکاتی دەکات.. لەمەدا ئیمامی شافیعی و ئەحمەدیش هاوڕای ئیمامی ئەبو حەنیفەو مالیك و هاوڕایانن، بەڵام لە پێچەوانەیدا نا.. ئیمامی شافیعی و ئیمامی ئەحمەد دەڵێن: ئەگەر نوێژی سەفەری چووبوو، کە نیشتەجێ بۆوە

---

[١] نەسائی (٢٩٧/١)، ئەحمەد (٢٥/٣)، ئیبنوخوزەیمە (٩٩٦)، ئەبویەعلا (١٢٩٦). سەحیحە.. صحيح فقه السنة (٢٦١/١).

[٢] واتە پێش ئەوەی حوکمی نوێژی ترس (صلاة الخوف) بێت..

نوێژی سەفەرەکەی بە تەواوی دەکاتەوە، وەك ئەوەی دوو رکات نوێژی نیوەڕۆو دوو رکات نوێژی عەسری لەسەفەردا چووە، کە هاتەوە شوێنی نیشتەجێ بوونەوەی دەبێت هەر یەك لەو نوێژە چوواوانە بە چوار رکاتی بکاتەوە[١]..

## گێڕانەوەی نوێژی سوونەت:

بۆچوونی زۆرینەی شەرعناسان لەسەر ئەوەیە کە نوێژە سوونەتەکانیش دەشێت بگێڕرێنەوە، ئەمە رای سەیدنا ئیبنو عومەرە خوا لێی رازی بێت، هەروەها بۆچوونی ئەوزاعی وئیمامی شافیعی وئیمامی ئەحمەدو ئیسحاق ومحمدی کوڕی حەسەنی شەیبانی و موزەنی و زانایانێکی ترن[٢]..

## بانگ و قامەت بۆ نوێژگێڕانەوە:

ئەو کەسەی نوێژی چووەو دەیەوێت بیگێڕێتەوە دەشێت بانگی بۆ بدات قامەتی بۆ بکات.. چونکە سەیدنا ئەبو قەتادە خوا لێی رازی بێت گێڕایەوە کە ئەو بەیانیەی کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و یاوەرانی خەویان لێ کەوت و دوای خۆرهەڵهاتن خەبەریان بۆوە، بە بیلالی فەرموو: (قُمْ فَأذِّنْ النَّاسَ بالصَّلاةِ، فَلَمَّا طَلَعَتِ الشَّمْسُ وَابْيَضَّتْ قَامَ فَصَلَّى بِهِمْ رَسولُ اللهِ)[٣] واتە: هەستە بانگەکە بۆ ئەو خەڵکە بدە.. کە خۆر هەڵهات و دنیای سپی داپۆشی پێغەمبەری خوا نوێژەکەی بۆ کردن..

---

[١] الام (١٦١/١)، المجموع (٢٤٩/٤)، المغني (٥٧٠/١)، اختلاف العلماء (ل ٦٠).

[٢] روضة الطالبين (٣٣٧/١)، الانصاف (١٧٨/٢)، نيل الاوطار (٣٣/٣).

[٣] بوخاری (٥٩٥)، ئەبوداوود (٤٣٩)، نەسائی (١٠٥/٢).

لە ریوایەتەکەی ئیبنو مەسعووددا خوا لێی رازی بێت دەڵێ: (فأمَرَ بِلالاً فأذَّنَ، ثمَّ أقامَ فصَلَّى بنا)[١] واتە: فەرمانی بە بیلال کرد بانگی داو پاشان قامەتی کرد، ئەویش هەستا نوێژەکەی پێ کردین.. ئەمەش بۆچوونی جمهوری شەرعناسانە.. والحمد لله..

### ئەوی زۆر نوێژ قەرزارە:

ئەوی نوێژی زۆری لەسەرە، مانگ و دوو مانگ یان ساڵ و دوو ساڵ یان زیاتر، قەرزاری خوای گەورەیەو دەبێت قەرزەکەی بە زووترین کات بداتەوە، باشترین شێوەش ئەوەیە کە تەقدیری بکات کە چەندی لەسەرە پاشان لیستێکیان بۆ بکات ولەگەڵ هەموو نوێژێکی ئێستایدا نوێژێکی چوواوی بگێڕێتەوە.. بەڵگەی گێڕانەوەش هەر بۆچوونی جمهوری پێشەوایانە (جگە لە ئیمامی ئەحمەد) کە فەرموویانە دەبێت بیگێڕێتەوە..

* * *

---

[١] ئەحمەد (١/٤٥٠)، ئیبنوحیببان (١٥٨٠) و فەرموویانە حەسەنە..

# باسی سێیەم
# ئەو كاتانەی نوێژكردن تێیاندا باش نیە

## ١ و ٢ ـ دوای نوێژی بەیانی و دوای نوێژی عەسر:

فەرموودە لەسەر ئەوە هەیە كە نوێژكردن لەو دوو كاتەدا باش نیە بكرێت.. وەكو:

١ ـ فەرموودەی سەیدنا ئیبنوعەبباس خوا لێی رازی بێت: (شَهِدَ عِنْدِي رِجَالٌ مَرْضِيُّونَ، وَأَرْضَاهُمْ عِنْدِي عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ الصَّلَاةِ بَعْدَ الصُّبْحِ، حَتَّى تَشْرِقَ الشَّمْسُ، وَبَعْدَ الْعَصْرِ، حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ)[١] واتە: پیاوانێك كە لێیان رازیم لە هەمووشیان زیاتر عومەری كوڕی خەتتاب خوا لێی رازی بێت شایەتیان لا دام كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەرهەڵستی كرد لەوە كردووە كە نوێژ لە دوای فەرزی سپێدەی بەیانیەوە بكرێت، تا ئەو ساتەی خۆر هەڵدێت، هەروەها دوای فەرزی عەسر تا خۆر ئاوا دەبێت..

١ ـ فەرموودەی سەیدنا ئەبو سەعیدی خودری خوا لێی رازی بێت كە دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لَا صَلَاةَ بَعْدَ الصُّبْحِ حَتَّى تَرْتَفِعَ الشَّمْسُ، وَلَا صَلَاةَ بَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ)[٢] واتە: نوێژ لە دوای نوێژی بەیانیەوە نیە

---

[١] بوخاری (٥٨١)، موسلیم (٨٢٦).
[٢] بوخاری (٥٨٦)، موسلیم (٨٢٧).

تا ئەو ساتەی خۆر بەرز دەبێتەوە، هەروەها نوێژ لە دوای فەرزی عەسرەوە نیە تا ئەو ساتەی خۆر ئاوا دەبێت..

**ناوەڕاستی نیوەڕۆ کە خۆر لە چەقی ئاسماندایە:**

بەڵگەمان فەرموودەکەی سەیدنا عوقبەی کوڕی عامرە خوا لێی رازی بێت کە دەڵێ: (ثلَاثُ ساعَاتٍ كَانَ رَسُولُ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ يَنهَانَا أَنْ نُصَلّيَ فِيهِنّ أَوْ أَنْ نَقْبُرَ فِيهَا مَوْتانَا ؛ حِينَ تطلُعُ الشّمْسُ بَازِغَةً حَتّى ترْتفِعَ، وَحِينَ يَقُومُ قَائِمُ الظّهِيرَةِ حَتّى تمِيلَ، وَحِينَ تضَيّفُ الشّمْسُ لِلْغُرُوبِ حَتّى تغْرُبَ )[1] واتە: لە سێ کاتدا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەرهەڵستی لێ دەکردین کە نوێژیان تێدا بکەین یان مردوومانی تێدا بنێژین: ساتێك خەپلەی خۆر هەڵدەهات تا ئەو کاتەی بڵند دەبۆوە، ساتێك خۆر لە ناوەندی چەقی ئاسماندا دەبوو تا لار دەبۆوە، ساتێك کە خۆر لارو لە ئاوابووندا دەبوو تا ئەو کاتەی تەواو ئاوا دەبوو..

**هۆی بەرهەڵستیەکە:** پێغەمبـەری خـوا صلـى الله عليـه وسلم هـۆی بەرهەڵسـتی کردنـی یـاوەرانی لـە نوێـژکردن لـەو دوو سـێ سـاتەدا روون کردۆتـەوە، وەکـو سـەیدنا عـەمری کـوڕی عەبسـە خـوا لێـی رازی بێـت دەگێڕێتـەوە: (قُلْـتُ يَـا رَسُـولَ اللّـهِ، أَخْبِرْنِـي عَـنْ الصّـلَاةِ. قَـالَ: صَـلّ صَـلَاةَ الصّبْحِ، ثمّ أَقْصِرْ عَنْ الصّلَاةِ حِينَ تطلُعُ الشّمْسُ، حَتّى ترْتفِعَ ؛ فَإِنّهَا تطلُعُ حِينَ تطلُعُ بَيْنَ قَرْنَيْ شَـيْطانٍ، وَحِينَئِـذٍ يَسْجُدُ لَهَا الْكُفّـارُ، ثـمّ صَـلّ ; فَـإِنّ الصّلَاةَ مَحْضُورَةٌ مَشْهُودَةٌ، حَتّى يَسْتقِلّ الظّلّ بِالرّمْحِ، ثمّ أَقْصِرْ عَـنْ الصّـلَاةِ، فَـإِنّ حِينَئِـذٍ تسَـجّرُ جَهَـنّمُ فَـإِذَا أَقْبَـلَ الْفَـيْءُ فصَـلّ، فَـإِنّ الصّـلَاةَ مَشْـهُودَةٌ مَحْضُورَةٌ حَتّى تصَلّيَ الْعَصْرَ، ثمّ أَقْصِرْ عَـنْ الصّـلَاةِ حَتّـى تغْـرُبَ الشّـمْسُ ;

---

[1] موسليم (٨٣١).

فَإِنَّهَا تَغْرُبُ بَيْنَ قَرْنَيْ شَيْطَانٍ، وَحِينَئِذٍ يَسْجُدُ لَهَا الْكُفَّارُ)[١] واته: ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا باسێکی نوێژم بۆ بکە، فەرمووی: نوێژی سپێدەی بەیانیەکەت بکە، پاشان واز لە نوێژکردن بهێنە تا ئەو ساتەی خۆر هەڵدێت و بەرز دەبێتەوە، ئەو ساتەی هەڵدێت لە نێوانی دوو قۆچی شەیتانەوە هەڵدێت، کافرەکان لەو ساتەدا سوجدە بۆ خۆر دەبەن، پاشان نوێژی خۆت بکە، کە فریشتە ئامادەی دەبن، تا ئەو ساتەی خۆر وەك رم لە ئاستی سەرتە، پاشان واز لە نوێژ بهێنە چونکە لەو ساتەدا دۆزەخ کڵپە دەستێنێت، کاتێك سێبەر هات (بەرەو خۆرئاوابوون چوو) نوێژەکەت بکە کە فریشتە ئامادەی دەبن، پاشان نوێژی تر مەکە تا خۆر ئاوا دەبێت، کە ئاوابوو لە نێوان دوو قۆچی شەیتانەوە ئاوا دەبێت، ئەو کاتەش کافرەکان سوجدە بۆ خۆر دەبەن..

## ئەو نوێژانەی کردنیان لەو کاتانەشدا جائیزە

١ . **نوێژی هەینی**: تا ئەو ساتەی خەتیب بۆ ووتاری هەینی دەچێتە سەر مینبەر موسوڵمان بۆی هەیە چەند بخوازێت نوێژ بکات، بەلام کە خەتیب هەستا بۆ سەر مینبەر بچێت ئیتر نوێژکردن باش نیە.. پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو: (لَا يَغْتَسِلُ رَجُلٌ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَيَتَطَهَّرُ مَا اسْتَطَاعَ مِنْ طُهْرٍ وَيَدَّهِنُ مِنْ دُهْنِهِ أَوْ يَمَسُّ مِنْ طِيبِ بَيْتِهِ ثُمَّ يَخْرُجُ فَلَا يُفَرِّقُ بَيْنَ اثْنَيْنِ ثُمَّ يُصَلِّي مَا كُتِبَ لَهُ ثُمَّ يُنْصِتُ إِذَا تَكَلَّمَ الْإِمَامُ إِلَّا غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الْأُخْرَى)[٢] واته: هەر پیاوێك

---

[١] موسلیم (٨٣٢).
[٢] بوخاری (٨٨٣).

غوسڵی هەینی دەرکردو خۆی پاك و پوخت ڕێك خست، ئەوەندەی توانی ڕۆن و بۆنی خۆشی هەر لە ماڵی خۆیەوە لە خۆیدا، پاشان چووە مزگەوت و نەچووە درزی نێوان خەڵکی (خەڵکی ئیزعاج نەکرد بە شان وپاڵ) پاشان ئەوەندەی توانی نوێژی کردو ئینجا بێ دەنگ بۆ گوێ گرتن لە ئیمامەکە دانیشت، ئەوە حەتمەن خوای گەورە لە گوناحی ئەم هەینیە بۆ هەینیەکەی تری خۆشبووە..

ئەمە بۆچوونی ئیمامی شافیعی و حەسەنی بەسری و تاووس و ئیمامی ئەوزاعی و ئەبویوسفە کە ئەم فەرموودەیان کردووە بە بەڵگە هەروەها فەرموودەیەکی تری سەیدنا ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێت کە فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەرهەڵستی کردووە کە نوێژ لە ناوەندی نیوەڕۆدا بکرێت ـ تا ئەو ساتەی خۆر بەرەو خۆرئاوابوون لار دەبێتەوە[١]..

مەزهەبی ئیمامی مالیك و گشتی ئەهلی مەدینە دەڵێن: نوێژکردن لە ناوەندی نیوەڕۆدا هیچ ئیشکالێکی تێدا نیە، لە نیوەڕۆو غەیری نیوەڕۆ.. بەڵام دیارە ئەمە ڕەت دەکرێتەوە چونکە فەرموودەی سەحیحمان لەبەردەستدایە کە ڕێ لە غەیری هەینی دەگرێت..

ئیمامی ئەبو حەنیفەو یاوەرانی، هەروەها قەولێکی ئیمامی ئەحمەد دەڵێن نوێژکردن لە ناوەندی نیوەڕۆدا لە هەینی و غەیری هەینیدا باش

---

[١] ئیبنو عەبدولبیر لە کتێبی الاستذکاری خۆیدا (بـ١ لـ١٠٧) دوای بۆچوونەکانی ئەو شەرعناسە بەڕێزانە دەرهەق فەرموودەکە دەفەرموێ زەعیفە چونکە لە سەنەدەکەیدا ئیبنو ئەبی یەحیاو ئیبنو ئەبی فەروەی تێدایە کە دەرهەق هەردوکیان دەفەرموێ: (وهما متروكانِ ليس فيما يَنقلانهِ ويرويانهِ حُجَّةٌ)

نیە.. بەڵام دیارە رای ئیمامی شافیعی و هاورایانی تری پەسەندترە بۆیە ئیبنولقەییم و ئیبنوتەیمییەش بە پەسەندترینیان ناساندووە[١]..

**٢ . دوو ركاتی تەواف كەعبە:** ئەگەر كردنی دوو ركات نوێژەكەی تەوافی ماڵی خوا كەوتە ئەو ساتانەی بەرهەڵستیەوە، ئیشكالی نیەو دەتوانرێت بكرێت، بەڵگەش بۆ ئەوە زۆرە، لەوانە:

- فەرموودەی سەیدنا جوبەیری كوڕی موتعیم خوا لێی رازی بێت كە دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ لا تَمْنَعُوا أحَدًا طَافَ بِهَذَا الْبَيْتِ أَيَّةَ سَاعَةٍ شَاءَ مِنْ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ)[٢] واتە: ئەی بەنی عەبدومەناف، لە هیچ كاتێكی شەو یان رۆژدا رێ لە كەس نەگرن كە دەیەوێت تەوافی كەعبە بكات..
- سەیدنا ئیبنوعەبباس و سەیدنا حەسەن و حوسەین و هەندێك لە شەرعناسانی سەلەف ئەو دوو ركاتەیان لە قرچەی نیوەڕۆدا كردووە.
- ئەو دوو ركات نوێژە سەر بە خودی تەواوفەكەیە، كە تەواوفەكە لەو كاتەدا جائیز بێت دیارە دەبێت ئەوانەی لەگەڵیشدان جائیز بن..

ئەمەش بۆچوونی ئیمامی شافیعی و ئیمامی ئەحمەدەو لە سەیدنا ئیبنو عومەرو سەیدنا ئیبنوالزوبێرەوە هاتووەو بۆچوونی عەتاء و تاووس و ئەبو سەوریشە[٣]..

**٣ . گێڕانەوەی نوێژەكان لە كاتی بەرهەڵستی لێكراودا:**

شەرعناسان لە گێڕانەوەی نوێژی چواودا لەو كاتانەدا كە بەرهەڵستی نوێژ

---

[١] ابن القيم: زاد المعاد (٣٧٨/١).

[٢] ترمزی (٨٦٩)، نەسائی (٢٩٢٤ ـ ٢٨٤/١)، ئیبنوماجە (١٣٥٤) ئەلبانی لە صحيح جامع الترمذی (٧٩٠٠) دا دەفەرمونێ سەحیحە..

[٣] الام (١٥٠/١)، المجموع (٧٢/٤)، المغنی (٨١/٢).

تێداکردنیان لێ کراوە راجوێن، بە شێوەیەکی گشتی دوو بۆچوونیان هەیە:

یەکەم: ئیمامی ئەبو حەنیفەو یاوەرانی دەڵێن: نوێژگێڕانەوە لەو کاتانەدا نابێت کە بەرهەڵستی نوێژیان تێدا کراوە.. بەڵگەشیان:

١ ـ (النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا نَامَ عَنْ صَلَاةِ الْفَجْرِ حَتَّى طَلَعَتْ الشَّمْسُ، أَخَّرَهَا حَتَّى ابْيَضَّتْ الشَّمْسُ)[١] واتە: کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی بەیانیەکەی چوو، کە خۆر هەڵهات و خەبەری بۆوە نەیکرد تا خۆر زیاتر بەرز بۆوەو دنیای سپی کرد..

٢ ـ ئەمە نوێژە، وەکو سوونەتەکانی تر لەو کاتانەدا ناشێت بکرێت.

٣ ـ لە کوڕەکانی سەیدنا (ئەبوبەکرە) ەوە خوا لێی رازی بێت هاتووە کە: (أَنَّ أَبَا بَكْرَةَ نَامَ فِي دَالِيَةٍ لَهُمْ فَظَنَنَّا أَنَّهُ قَدْ صَلَّى الْعَصْرَ فَاسْتَيْقَظَ عِنْدَ غُرُوبِ الشَّمْسِ قَالَ: فَانْتَظَرَ حَتَّى غَابَتْ الشَّمْسُ ثُمَّ صَلَّى)[٢] واتە: ئەبوبەکرە لەژێر کەپری سەر بیرێکمان خەوی لێ کەوت، وامان زانی نوێژی عەسری کردووە، کەچی کە کاتی خۆرئاوابوون خەبەری بۆوە، چاوەڕوانی کرد تا خۆر ئاوا بوو ئینجا نوێژەکەی کرد..

دووەم: ئیمامی مالیك و شافیعی و ئەحمەدو جمهوری یاوەران و تابعین دەڵێن: کردنی نوێژی فەرز بە حازری یان بە گێڕانەوەی لەو کاتانەدا کە بەرهەڵستی لێکراوە، جائیزە.. بەڵگەشیان:

---

[١] بوخاری (٣٤٤)، موسلیم (٦٨٢).

[٢] ئیبنو ئەبی شەیبە (٢/٦٦)، عبدالرزاق: المصنف (٢٢٥٠). سەحیحە (صحيح فقه السنة (١/٢٦٧).

١ ـ فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە دەفەرموێ: (مَنْ نَسِيَ صَلَاةً فَلْيُصَلِّ إِذَا ذَكَرَهَا لَا كَفَّارَةَ لَهَا إِلَّا ذَلِكَ )[١] واتە: هەر کەس نوێژێکی بیرچوو با ئەو کاتەی دەکەوێتەوە یادی بیکات، کەفارەتی غەیری ئەوەی نیە..

٢ ـ فەرموودە مەرفووعەکەی سەیدنا ئەبو قەتادە خوا لێی رازی بێت: (إِنَّمَا التَّفْرِيطُ عَلَى مَنْ لَمْ يُصَلِّ صَلَاةً حَتَّى يَجِئَ وَقْتُ الصَّلَاةِ الاخْرَى، فَمَنْ فعَلَ ذلِكَ فَلْيُصَلِّهَا حِينَ يَنْتَبِهُ لَهَا)[٢] واتە: کەمتەرخەمی لەو کەسەدایە کە نوێژەکەی نەکردووە تا کاتی نوێژەکەی تری بەسەردا هاتووە، هەر کەسێك وای کرد با ئەو کاتە نوێژەکەی بکات کە بیری دەکەوێتەوە..

دیارە ئەم بەڵگانە فەرمان بە کردنی نوێژەکە دەکەن کاتی بەخەبەر هاتن و بیرکەوتنەوە بێ ئەوەی کاتێك باس بفەرموون کە نابێت تێییاندا بکرێتەوە.. ئەمەش جێی زیاتر پەسەندکردنە.. ئەو بەڵگەی کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژەکەی دواخست تا خۆر بڵندبۆوەو دنیای سپی کرد، دیارە کە هۆیەکەی ئەوە بوو کە فەرمووی: (فَإِنَّ هَذَا مَنْزِلٌ حَضَرَنَا فِيهِ الشَّيْطَانُ )[٣] وا دیارە ئێرە شوێنێکە کە شەیتانی لێ ئامادە بووە..

من پێم وایە گێڕانەوەی نوێژی فەرز لە هەموو کاتێکی شەووڕۆژدا جائیزە، هەروەها نوێژی سوونەتیش وەکو لە خوارەوە باس کراوە..

---

[١] بوخاری (٥٩٧)، موسلیم (٣١٤).
[٢] موسلیم (٦٨١).
[٣] موسلیم (٩٨٠)، نەسائی (٨٠/١).

**٤ . گێڕانەوەی نوێژی سووننەت لە کاتی بەرهەڵستی لێکراودا:** زۆرینەی زۆری شەرعناسان رایان وایە کە گێڕانەوەی نوێژی سووننەتیش لەو کاتانەدا جائیزە کە بەرهەڵستی نوێژکردنی تێدا کراوە، راجوێییەکی وام لە نێوان شەرعناساندا لە سەری نەبینی..

ئەوەی کە هەمووان لەسەر رێکن ئەوەیە کە نوێژی سووننەتی وەکو دوو رکاتی دەستنوێژو نوێژی تری زیادە لەو کاتانەدا نابێت بکرێت.. بەلگەشیان:

١ ـ خاتوو ئوم سەلەمە خوا لێی رازی بێت دەڵێ: پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینی دوو رکات نوێژی دوای عەسر کرد، لێم پرسی کە چیە؟ فەرمووی: (يَا بِنْتَ أَبِي أُمَيَّةَ سَأَلْتِ عَنْ الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعَصْرِ وَإِنَّهُ أَتَانِي نَاسٌ مِنْ عَبْدِ الْقَيْسِ فَشَغَلُونِي عَنْ الرَّكْعَتَيْنِ اللَّتَيْنِ بَعْدَ الظُّهْرِ فَهُمَا هَاتَانِ)[١] واتە: ئەی کچی ئەبو ئومەییە، دەربارەی ئەو دووڕکاتە پرسیت کە دوای نوێژی عەسر کردمن، ئەوە بە هۆی ئەوەوە بوو کە وەفدێکی عەبدولقەیس هاتنە لام و مەشغووڵیان کردم دووڕکاتەکەی دوای نوێژی نیوەڕۆیان بیر بردمەوە، ئەم دوو رکاتە ئەو دوانەن..

٢ ـ لە سەیدنا قەیسی کوڕی عەمرەوە گێڕراوەتەوە کە فەرموویەتی: (رَأَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلًا يُصَلِّي بَعْدَ صَلَاةِ الصُّبْحِ رَكْعَتَيْنِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَصَلَاةُ الصُّبْحِ مَرَّتَيْنِ؟ فَقَالَ الرَّجُلُ: إِنِّي لَمْ أَكُنْ صَلَّيْتُ الرَّكْعَتَيْنِ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، فَصَلَّيْتُهُمَا الْآنَ، فَسَكَتَ

---

[١] بوخاری (١٢٣٣)، موسلیم (٢٩٧).

رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)[١] واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کابرایەکی بینی دوو رکات نوێژی دوای فەرزی سپێدە کردەوە، فەرمووی: چیە؟ دووجار نوێژی سپێدە؟! عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە هەر دوو رکاتەکەی سپێدەی بەیانین بەڵام نەمکردبوون، وا ئێستا کردمن ئەویش صلى الله عليه وسلم لێی بێ دەنگ بوو.. لە ریوایەتێکی تردا دەڵێ: نکوولی لێ نەکرد..

٣ ـ ئیمامی مالیك و ئیمامی شافیعی دەڵێن[٢]: ئەوەش بەڵگەیە کە بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە شێوەیەکی گشتی دەفەرموێ: (اذا نَسِيَ أَحَدُكُمْ صَلَاةً أَو نَامَ عَنْها فَلْيُصَلِّهَا إِذَا ذَكَرَها)[٣] واتە: هەر کەسێکتان نوێژێکی بیرچوو، یان لە کاتەکەیدا خەوی لێ کەوت، با ئەو کاتەی بیری دەکەوێتەوە بیکات.

## ٥ . نوێژی جەنازە لە کاتی بەرهەڵستی لێکراودا جائیزە:

شەرعناسان رایان لەسەر ئەوە کۆیە کە لە دوای نوێژی بەیانی وعەسر جائیزە نوێژی جەنازە بکرێت[٤].. بەڵام راجوێییەکەیان لەسەر نوێژی جەنازەیە لە ساتی خۆر هەڵهاتن و ناوەندی نیوەڕۆو ساتی خۆرئاوابوون:

**١ . نوێژی جەنازە لەو سێ ساتەدا جائیز نیە:** ئەمە رای جمهوری پێشەوایان: ئیمامی ئەبوحەنیفەو مالیك وئەحمەدو

---

[١] ئەبو داوود (١٢٦٧)، ترمزی (٤٢٢)، ئەحمەد (٤٤٧/٥)، الحاكم (٢٧٤/١)، بەیهیقی (٤٨٣/٢) شێخی ئەلبانیش دەفەرموێ سەحیحە: صحيح الترمذي (٣٤٦)..

[٢] الام (١٤٩/١)، بداية المجتهد (١٣٧/١).

[٣] موسلیم (٦٨٤).

[٤] المغني (٨٣/٢).

زۆرینەی شەرعناسانە[١]، چونکە فەرموودەکەی عوقبەی کوڕی عامر راشکاوانە دەڵێ: (ثَلاثُ سَاعَاتٍ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَنْهَانَا أَنْ نُصَلِّيَ فِيهِنَّ أَوْ أَنْ نَقْبُرَ فِيهَا مَوْتَانَا ؛ حِينَ تَطْلُعُ الشَّمْسُ بَازِغَةً حَتَّى تَرْتَفِعَ، وَحِينَ يَقُومُ قَائِمُ الظَّهِيرَةِ حَتَّى تَمِيلَ، وَحِينَ تَضَيَّفُ الشَّمْسُ لِلْغُرُوبِ حَتَّى تَغْرُبَ )[٢] واتە: لە سێ کاتدا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەرهەڵستی لێ دەکردین کە نوێژیان تێدا بکەین یان مردوومانی تێدا بنێژین: ساتێك خەپلەی خۆر هەڵدەهات تا ئەو کاتەی بڵند دەبۆوە، ساتێك خۆر لە ناوەندی چەقی ئاسماندا دەبوو تا لار دەبۆوە، ساتێك کە خۆر لارو لە ئاوابووندا دەبوو تا ئەو کاتەی تەواو ئاوا دەبوو..

## ١ . نوێژی جەنازە لە کاتی بەرهەڵستی کراویشدا

**جائیزە:** ئەمەش بۆچوونی ئیمامی شافیعی و قەولێکی ئیمامی ئەحمەدە، حوججەی ئیمامی شافیعی ئەوەیە کە ئەمە نوێژێکە هۆکاری تایبەتی هەیە، وەکو نوێژەکانی تر نیە.. لەبەر هەبوونی دەقە راشکاوەکان ناتوانین بۆچوونەکەی ئیمامی شافیعی پەسەند کەین، چونکە بەرهەڵستیەکەی پێغەمبەری خوا لە ناشتنی مردوو لەو ساتانەدا حەتمەن نوێژەکەشی دەگرێتەوە، پاشان چاوەڕوانی کردنی ئەو ماوە کورتە تا تەواو دەبێت زیان نە بە مردووەکە نە بە زیندووەکانی دەوروبەری ناگەێنێت..

---

[١] ئیمامی مالیك: المدونة (١/١٩٠)، السرخسي: المبسوط (١/١٥٢)، ابن قدامة: المغني (٢/٨٢)، معالم السنن (١/٣١٣).

[٢] موسلیم (٨٣١).

پێم وایە نوێژی جەنازە لەو سێ ساتە بەرهەڵستکراوەدا جائیز نیە.. والله اعلم.

**٦ . ئەو نوێژانەی هۆی تایبەتیان هەیە:** وەکو دوو رکاتی تەحییەتول مەسجید (تحِيَّةُ الْمَسْجِد) و دوورکاتی دەستنوێژو نوێژی خۆرگیران و هاوشێوەیان، بۆچوونی شەرعناسان لەسەریان دوانە:

**یەکەم: ئەم نوێژانە لە کاتی بەرهەڵستکراودا جائیز نین بکرێن:** ئەمە بۆچوونی ئیمامی ئەبوحەنیفەو قەولی سەلمێنراوی ئیمامی ئەحمەدە[١]..

**دووەم: ئەم نوێژانە لە کاتی بەرهەڵستکراودا جائیزن بکرێن:**

ئەمەش بۆچوونی ئیمامی شافیعی و قەولێکی ئیمامی ئەحمەدە، بەلگەشیان:

١- کردنی دوورکات نوێژەکەی تەواڤی کەعبە لە هەموو کاتێکدا جائیزە کەوابوو ئەمانیش جائیزن.

٢ - سەلمێنراوە کە دوورکات نوێژ یان زیاتر لە دوای دەستنوێژ گرتن دەکرێت، لە هەر کاتێکیشدا بێت جائیزە، وەکو لە فەرموودەکەی سەیدنا بیلالی حەبەشیدا خوا لێی رازی بێت هاتووە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لێی دەپرسێت: ( يَا بِلَالُ حَدِّثْنِي بِأَرْجَى عَمَلٍ عَمِلْته فِي الْإِسْلَامِ، فَإِنِّي سَمِعْتُ دَفَّ نَعْلَيْكَ بَيْنَ يَدَيَّ فِي الْجَنَّةِ، قَالَ: مَا عَمِلْت عَمَلًا أَرْجَى عِنْدِي أَنِّي لَمْ أَتَطَهَّرْ طُهُورًا فِي سَاعَةٍ مِنْ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ إلَّا صَلَّيْتُ بِذَلِكَ الطُّهُورِ مَا

---

[١] البسوط (١٥٢/١)، شرح فتح القدير (٢٠٤/١)، المغني (٩٠/٢).

كُتِبَ لِي أَنْ أُصَلِّيَ )[١] واتە: ئەرێ بیلال، چ کردارێکت هەیە کە لە هەموو کارەکانتدا ئومێدی زیاترت بەو هەیە، چونکە لە بەهەشتدا لە پێش خۆمەوە، گوێم لە خشپەی نەعلەکانت بوو، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا کارێکی وام نیە ئەوەندەی ئومێدە پێوە ببەستمەوە مەگەر ئەوەی کە هەموو جارێك شەو بێت یان رۆژ کە دەستنوێژ دەگرم پاشان چەندم بۆ نوسرا بێت نوێژی پێوە دەکەم..

٣ ـ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە باسی نوێژی خۆرگیران و مانگ گیراندا دەفەرموێ: (إِنَّ كُسُوفَ الشَّمْسِ آيَةٌ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَافْزَعُوا إِلَى الصَّلَاةِ )[٢] واتە: خۆرگیران نیشانەیەکە لە نیشانەکانی خوای گەورە، هەرکە دیتتان پەنابەرنە بەر نوێژ..

٤ ـ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە باسی نوێژی تەحیەتول مەسجیددا فەرموویەتی: (إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمْ الْمَسْجِدَ فَلَا يَجْلِسْ حَتَّى يُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ)[٣] واتە: هەر کەسێکتان چووە مزگەوتەوە با دانەنیشێت تا دوو رکات نوێژ دەکات.

٥ ـ پێشتر ریوایەتی بوخاری و موسلیمان هێنایەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی سوونەتی نیوەڕۆی لە کاتی نوێژی عەسردا کردووە[٤]..

---

[١] بوخاری (١١٤٩)، موسلیم (٢٤٥٨).
[٢] بوخاری (٩٩٩)
[٣] بوخاری (١١٦٧)، موسلیم (٧١٤).
[٤] پەراوێزی ژمارە (٢١٩).

٦ ـ ئەو کۆڕا (ئیجماع) ەی کە شەرعناسان هەیانە لەسەر کردنی نوێژی جەنازە لە دوای نوێژی فەرزی بەیانی و عەسر..

ئەمانە هەمووی نوێژن و لەو کاتانەشدا دەکرێن کە بەرهەڵستی نوێژکردنیان تێدا لێ کراوە..

# باسی چوارەم
# بانگ و قامەت

**پێناسەی بانگ دان:** هاوارکردنە لە کەسێك لە دوورەوە. لە عەرەبیدا: ئاگادارکردنەوەیە، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَذِّن فِي ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَجِّ﴾ الحج/٢٧ واتە: خەڵکی لە حەج ئاگادار بکەرەوە..

لە رووی زاراوەییەوە لە کوردی وعەرەبیدا بریتیە لە: بانگهێشت کردنی موسوڵمانان بۆ مزگەوت بە چەند رستەو دەستەواژەیەکی تایبەت بۆ نوێژ کردن بە کۆمەڵ.. هەروەها بۆ راگەیاندنی هاتنی کاتی نوێژەکانە..

**پێناسەی قامەت:** زاراوەیەکە هەر لە ئیقامەتی عەرەبیەوە وەرگیراوە کە لە کرداری رابوردووی (أقام) ەوە هاتووە، واتە: راستی کردەوە، چەندین مانای تریشی هەیە وەك: جێگیربوو، دەرکەوت، بانگی کرد..

لە رووی زاراوەییەوە بریتیە لە خواپەرستیەك کە بە ووتنی چەند دەستەواژەو رستەیەکی تایبەت ئەنجام دەدرێت..

★ ★ ★

# بانگدان

## پلەو پایەو گەورەیی بانگدان:

١ ـ سەیدنا ئەبو هورەیرە خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (إِذَا نُودِيَ بِالصَّلَاةِ أَدْبَرَ الشَّيْطَانُ وَلَهُ ضُرَاطٌ حَتَّى لَا يَسْمَعَ الْأَذَانَ، فَإِذَا قُضِيَ الْأَذَانُ أَقْبَلَ، فَإِذَا ثُوِّبَ بِهَا أَدْبَرَ، فَإِذَا قُضِيَ التَّثْوِيبُ أَقْبَلَ حَتَّى يَخْطِرَ بَيْنَ الْمَرْءِ وَنَفْسِهِ يَقُولُ: أُذْكُرْ كَذَا أُذْكُرْ كَذَا لِمَا لَمْ يَكُنْ يَذْكُرُ حَتَّى يَضِلَّ الرَّجُلُ إِنْ يَدْرِي كَمْ صَلَّى)[١] واتە: کە بانگ بۆ نوێژ دەدرێت شەیتان پشت هەڵدەکات و هەڵدێت، ئینجا بۆ ئەوەی گوێی لێ نەبێت (و بۆ سوکایەتی پێکردنی بانگەکە) دەکەوێتە جرِت لێدان[٢]، کە بانگ تەواو دەبێت دێتەوە، کە قامەت دەکرێت هەڵدێتەوە، کە وەڵامدانەوەی قامەتیش تەواو بوو، ئینجا دێتەوەو دەکەوێتە غایلە پێکردنی موسوڵمان، بۆ ئەوەی بیخاتە سەر وەسوەسە، پێی دەڵێ بیر لە فلان شت بکەرەوەو فلان شتت لە بیر بێت، تا وای لێ دەکات نازانێت چەند رکاتی کرد!

٢ ـ سەیدنا ئەبو سەعیدی خودری خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە بە ئیبنو ئەبی سەعسەی فەرموو: (إِنِّي أَرَاكَ تحِبُّ الْغَنَمَ وَالْبَادِيَةَ فَإِذَا كُنْتَ فِي غَنَمِكَ أَوْ بَادِيَتِكَ فَأَذَّنْتَ بِالصَّلَاةِ فَارْفَعْ صَوْتَكَ بِالنِّدَاءِ فَإِنَّهُ لَا يَسْمَعُ مَدَى صَوْتِ الْمُؤَذِّنِ جِنٌّ وَلَا إِنْسٌ وَلَا شَيْءٌ إِلَّا شَهِدَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ قَالَ أَبُو

---

[١] بوخاری (٦٠٨)، موسلیم (٣٨٩).

[٢] شەوکانی لە نیل الاوطاردا دەفەرموێ: لە تاواندا دەکەوێتە ترِ لێدان..

سَعِيدٍ سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)[١] واتە: دەبینم حەزت لە مەڕو ماڵات و دەشت نشینییە، دەی مادام وایە هەر کاتێك لای مەڕەکانت بوویت، یان لە دەشت بوویت و بانگت دا، دەنگ زیاتر بەرز کەرەوە چونکە هەتا جنن و مرۆڤی زیاتر بانگەکەت ببیستن، لە رۆژی قیامەتدا پاداشتی زیاترت پێ دەبڕێت.. ئەبو سەعید فەرمووی: خۆم لە پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بیستووە کە وای فەرمووە..

٣ ـ سەیدنا ئەبو هورەیرە خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي النِّدَاءِ وَالصَّفِّ الْأَوَّلِ ثُمَّ لَمْ يَجِدُوا إِلَّا أَنْ يَسْتَهِمُوا عَلَيْهِ لَاسْتَهَمُوا وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي التَّهْجِيرِ لَاسْتَبَقُوا إِلَيْهِ وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي الْعَتَمَةِ وَالصُّبْحِ لَأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا)[٢] واتە: ئەگەر خەڵکی بیانزایە چ خێرێك لە بانگ و ریزی پێشەوەی نوێژدایە، ئەگەر بواری غەیری قورعەکێشیان بۆ نەبوایە، قورعەیان بۆ دەکرد.. ئەگەر بیانزانیایە چ خێرێك لە زوو هاتنە نوێژی هەینیدا هەیە دەکەوتنە کێبڕکێ لەسەری.. ئەگەر بیانزانیایە چ پاداشتێك لە نوێژی خەوتنان و سپێدەی بەیانیدا هەیە بۆیان دەهاتن ئەگەر بە گاگۆڵکێش بوایە!!

٤ ـ لە سەیدنا معاویەی کوڕی ئەبو سوفیانەوە خوا لێیان رازی بێت هاتووە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (الْمُؤَذِّنُونَ أَطْوَلُ النَّاسِ أَعْنَاقًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ)[٣] واتە: بانگدەرەکان لە رۆژی قیامەتدا لە هەموو کەس گەردن بەرزترن..

---

[١] بوخاری (٦٠٩)، موسلیم (١٢/٢).

[٢] بوخاری (٦١٥)، موسلیم (٤٣٧).

[٣] موسلیم (٣٨٧)، ئیمامی ئەحمەد (٩٥/٤)، ئیبنوماجە (٧٢٥).

٥ ـ لە سەیدنا عوقبەی كوڕی عامرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (يَعْجبُ رَبُّكَ مِنْ رَاعي غَنَمٍ فِي رَأسِ شَظِيَةٍ جبَلٍ يُؤَذّنُ بالصَّلاةِ وَيُصَلّي، فَيقُولُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ : أُنْظُرُوا إلَى عَبْدِي هَذا يُؤَذّنُ وَيُقِيمُ الصَّلاةَ يَخَافُ مِنّي، قَدْ غَفَرْتُ لِعَبْدِي وَأَدْخَلْتُهُ الْجَنّةَ)[1] واتە: خوای پەروەردگارتان سەری لەو عەبدە سوڕ دەمێنێت كە بە تیرە شاخێكەوەیەو بانگ دەدات و نوێژەكەی دەكات، خوای گەورە دەفەرموێ: سەیری ئەو بەندەی من كەن كە ترسی منی لەدڵدایەو نوێژ دەكات، دەی وا من لەو بەندەیەم خۆش بووم و خستمە بەهەشتەوە..

٦ ـ سەیدنا ئەبوهورەیرە خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (الْإمَامُ ضَامِنٌ وَالْمُؤَذّنُ مُؤْتمَنٌ، فَأَرْشَدَ اللهُ الْأئِمَّةَ وَغَفَرَ لِلمُؤَذّنِين)[2] واتە: پێشەوا زەمانەت دەكات، بانگدەر ئەمیندارە، دەی خوای گەورە ڕێنمایی پێشەوایان بكات و لە بانگدەرانیش خۆش بێت..

٧ ـ بانگدان باشترە لە ئیماتە كردنی نوێژ: زۆرینەی شەرعناسان فەرموویانە لەبەر ئەو هەموو فەزڵەی كە باسی بانگدەر دەكات، بانگدان باشترە لە ئیمامەتی نوێژ كردن، چونكە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دوعای بۆ بانگدەرەكان بە لێخۆشبوونی خوای گەورە كردووە، بەڵام بۆ پێشەوایان داوای هیدایەتی بۆ كردوون.. لێخۆشبوونیش گەورەترە لە

---

[1] ئەبوداوود (١٢٠٣)، نەسائی (٢٠/٢)، ئەحمەد (٩٥/٤). ئەلبانی لە سلسلة الاحاديث الصحيحة (٤١) دەفەرموێ سەحیحە.

[2] ئەبو داوود (٥١٧)، ترمزی (٢٠٧)، ئەحمەد (٢٨٤/٢) ئەلبانی دەفەرموێ سەحیحە (الارواء ٢٣١/١).

ڕێنمایی و هیدایەتدان، چونکە مسۆگەرترە.. بەڵام کە نابینیت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و خولەفایانی ڕاشیدین بانگیان دابێت لەبەر ئەوەیە کە ئەوان خەلیفە بوون، کە پلەو ئاستی پێشەوایەتی مەزنەو مەشغەڵەتی زیاتری دەوێت کە ناپەڕژێتە سەر ڕێکوپێك ڕاگرتنی کاتەکانی بانگدان.. ئەمەش بۆچوونی ئیمامی شافیعی و قەولی پەسەندکراوی ئیمامی ئەحمەدو مەزهەبی مالیکیەو ئیبنو تەیمییەش بە پەسندتری ناساندووە[١]..

## کەی یەکەمین جار بانگ درا؟

بۆ یەکەمین جار کە بانگ درا لە مەدینە بوو لە ساڵی یەکەمی کۆچیدا بوو، چونکە فەرموودەی سەحیحی سەیدنا ئیبنو عومەر خوا لێیان ڕازی بێت لەسەر کە دەیگێڕێتەوە: (كَانَ الْمُسْلِمُونَ حِينَ قَدِمُوا الْمَدِينَةَ يَجْتَمِعُونَ فَيَتَحَيَّنُونَ الصَّلَوَاتِ وَلَيْسَ يُنَادِي بِهَا أَحَدٌ فَتَكَلَّمُوا يَوْمًا فِي ذَلِكَ فَقَالَ بَعْضُهُمْ اتَّخِذُوا نَاقُوسًا مِثْلَ نَاقُوسِ النَّصَارَى وَقَالَ بَعْضُهُمْ قَرْنًا مِثْلَ قَرْنِ الْيَهُودِ فَقَالَ عُمَرُ أَوَلَا تَبْعَثُونَ رَجُلًا يُنَادِي بِالصَّلَاةِ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَا بِلَالُ قُمْ فَنَادِ بِالصَّلَاةِ)[٢] واتە: موسوڵمانان کە هاتنە مەدینە، بۆ نوێژ کۆدەبوونەوە بێ ئەوەی بانگی بۆ بدرێت، ڕۆژێك لەناو خۆیاندا باسیان کرد، یەکێك فەرمووی: زەنگێك پەیدا کەن وەکو زەنگی مەسیحیەکان و لە کاتی نوێژەکاندا لێی دەن، یەکێکی تر فەرمووی، قۆچێك وەك ئەوەی جولەکە بهێنن و قوولەی تێیدا بکەن.. عومەری کوڕی خەتتاب فەرمووی: بۆچی کابرایەك نانێرن و هاوار لەو خەڵکە

---

[١] المجموع (٧٤/٣)، المغني (٤٠٢/١)، مواهب الجليل (٤٢٢/١)، ابن تيمية: الاختيارات (ل ٣٦)

[٢] بوخاری (٦٠٤)، موسلیم (٣٧٧).

بکات کە کاتی نوێژە، پێغەمبەری خواش صلی الله علیه وسلم فەرمووی: دەی سا بیلال تۆ برۆ بانگ بکە..

## حوکمی بانگدان:

ئوممەتی ئیسلام لەسەر ئەوە کۆن کە بانگدان جائیزە، چونکە لە زەمانی پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم تا ئەمڕۆ موسوڵمانان بێ جیاوازی راوبۆچوون کاریان پێ کردووە.. بەڵام شەرعناسان لەوەدا راجوێ بوون کە ئایا فەرزە یان سووننەتە؟! لەوەدا گومانیان نەهێشتۆتەوە کە بانگدان فەرزی کیفایەیە، ئەگەر کەسێك لە شوێنێکدا بانگی دا فەرزێتیەکەی لەسەر ئەوانی دیکە دەکەوێت، ئەگەر کەس بێ عوزر بانگی نەدا هەموویان پێی گوناحبار دەبن. چونکە:

١ ـ بانگدان لە ئیسلامدا یەکێکە لە دروشمە گرنگ و ئاشکراکانی خواپەرستن، راگەیاندنی راشکاوانەی هەبوونی دینەکەیە لەو شوێنەی بانگی تێدا دەدرێت، هەر لەو رۆژەوە کە بە شەرعی ناسێنراوە تا ئەم زەمانە شەووڕۆژ لە هەموو وولاتانی دنیادا بە ئاشکرا دەدرێت.. شەرعناسێکی جێمتمانە نەیفەرمووە وەلی کەن..

٢ ـ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بانگدانی کردووە بە هێمای ئیسلامەتی شوێنان و نیشانەی موسوڵمانێتی دانیشتوانی.. سەیدنا ئەنەس دەگێڕێتەوە: (أنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا غَزَا بِنَا قَوْمًا لَمْ يَكُنْ يَغْزُو بِنَا حَتَّى يُصْبِحَ وَيَنْظُرَ فَإِنْ سَمِعَ أَذَانًا كَفَّ عَنْهُمْ وَإِنْ لَمْ يَسْمَعْ أَذَانًا أَغَارَ عَلَيْهِمْ)[١] واتە: کە دەیبردینە غەزا، هێرشی پێ نەدەکردین تا سپێدە دەهات، تا بزانێت لەو شوێنە بانگی لێ دەدرێت

---

[١] بوخاری (٦١٠)، موسلیم (٣٨٢).

یان نا، ئەگەر بانگی لێ بدرایە لێیان دەگەڕا، ئەگەر بانگی لێ نەبیستایە هێرشی دەکردە سەریان..

٣ ـ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی بە بانگدان کردووە:

ـ سەیدنا مالیکی کوڕی حوەیریس خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەوو بە هاوڕێکانی ئەوی فەرمووە: (إِذَا حَضَرَتِ الصَّلَاةُ فَلْيُؤَذِّنْ لَكُمْ أَحَدُكُمْ وَلْيَؤُمَّكُمْ أَكْبَرُكُمْ)[1] واتە: ئەگەر کاتی نوێژ هات، با یەکێکتان بانگ بدات و بەتەمەنترین کەستان ئیمامەتیەکەتان بۆ بکات.. ئەمە لەبەر ئەوەیە کە هەر خۆیان لەو ناوچەیەدا بوون..

ـ سەیدنا عوسمانی کوڕی ئەبولعاس خوا لێی ڕازی بێت گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێ کرد کە: ئیمامەتی بۆ هۆزەکەی خۆی بکات و بە پێی لاوازترین کەسیان نوێژ بکات و بانگدەرێك بۆ بانگدان دیاری بکات کە کرێ لەسەر بانگدانەکەی وەرنەگرێت: (عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي الْعَاصِ قَالَ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ اجْعَلْنِي إِمَامَ قَوْمِي فَقَالَ أَنْتَ إِمَامُهُمْ وَاقْتَدِ بِأَضْعَفِهِمْ وَاتَّخِذْ مُؤَذِّنًا لَا يَأْخُذُ عَلَى أَذَانِهِ أَجْرًا)[2]. ئەمیشیان بە هەمان شێوە، ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە پێویستیان بە هەبوونی بانگدەرێکی تایبەت بە خۆیان هەبووە چونکە تەنها خۆیان لەو شوێنەیاندا بوون ، وەکو گوندێکی وولاتی خۆمان کە مزگەوتیان نەبێت، هەر دەبێت ئەم فەرمانەیان پێ بکرێت، بەڵام ئەگەر مزگەوتیان هەبوو،

---

[1] بوخاری (٦٣١)، موسلیم (٦٧٤).

[2] ئەبوداوود (٥٣١)، نەسائی (٦٧٢)، ترمزی (٢٠٩) ئیبنوماجە (٧١٤) شێخی ئەلبانی لە صحيح أبي داود (١/١٤٦ ـ ٥٣١) دەفەرموێ: سەحیحە..

بانگی لێ دەدراو نوێژی کۆمەڵی تێدا دەکرا، بانگدان لەسەر ئەمان فەرز نابێت..

ئیمامی مالیك لە قەولێکیدا بانگدان لەو مزگەوتانەدا کە نوێژی کۆمەڵ و نوێژی هەینییان تێدا دەکرێت بە واجب دەزانێت، هەروەها ئیمامی ئەحمەدو ریوایەتێکی ئیمامی شافیعیش، ئەوە بۆچوونی عەتاء و موجاهیدو ئەوزاعی و داوودو ئیبنو حەزمیشە، ئیبنول مونزیرو ئیبنوتەیمییەش ئەوەیان بە پەسەندتر ناساندووە[1]..

بەڵام ئیمامی ئەبوحەنیفەو یاوەرانی دەڵێن: بانگدان سووننەتی موئەککەدە (جەخت لێکراو) ە. لەگەڵ ئەم بۆچوونەشیاندا دەڵێن: لە حوکمی واجبدایەو ئەگەر نەدرا ئەو موسوڵمانانەی لەوێن و عوزریان نیە گوناحبار دەبن! سەیرە، ئەگەر سووننەتە بۆچی بە وازلێهێنانی گوناحبار دەبن؟!!

<u>من پێم وایە: ئەو مزگەوتانەی نوێژیان بە کۆمەڵ تێدا دەکرێت بانگدان و قامەت کردنیان بۆ نوێژی کۆمەڵ تێدا فەرزە.. بەڵام بە تەنها نا..</u>

ئەگەر کەسێك بە نەزانی یان بە هۆی بیرچوونەوەوە یان بە هەر هۆیەکی تر، بێ بانگ وقامەت لەو مزگەوتە یان لە هەر شوێنێکی تر بێ بانگدان و قامەت کردن نوێژی کرد گوناحبار نابێت لەسەریان و نوێژەکەی دروستە.. ئەمەش فەتوای لیژنەی فەتوای شەرعناسانی حیجازە[2]..

---

[1] مواهب الجليل (٤٢٢/١)، النووي: روضة الطالبين (١٩٥/١)، ابن عابدين (٣٨٤/١)، فتح القدير (٢٤٠/١).

[2] فتاوى اللجنة الدائمة (٥٤/٦).

# چەند بابەتێکی تری بانگدان

**١ـ حوکمی بانگدان لە سەفەردا:**

رای پەسەندتر ئەوەیە کە بانگدان بۆ نوێژی کۆمەڵ فەرزە، ئەگەر کۆمەڵێك کەس لە سەفەردابوون و وویستیان نوێژەکەیان بکەن دەبێت بانگی بۆ بدەن و قامەتیش بکەن، چونکە بەڵگەکان بە گشتی ئەوە دەسەلمێنن کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە سەفەرو نیشتەجێیی، لە شارو دەرەوەی، کە بە کۆمەڵ نوێژی کردبێت، فەرمانی بە بانگدان و قامەت کردن بۆ نوێژ کردووە، وەکو فەرموودەکەی سەیدنا بیلال و سەیدنا مالیکی کوڕی حوەیریس روونیان کردەوە[١].. بەڵام ئەگەر کۆمەڵە کەسێك کە لە سەفەردابوون و نوێژیان چووبوو وویستیان لە ئاوەدانیەك بیگێڕنەوە کە بانگی لێدرابێت، دەتوانن بە بێ بانگ، قامەت بیکەن و نوێژکەیان بگێڕنەوە[٢]..

**٢ـ حوکمی بانگدان بۆ نوێژ گێڕانەوە:**

ئەگەر کۆمەڵێك کەس لەوانەی نوێژیان زۆر چووە بیانەوێت بە کۆمەڵ بیگێڕنەوە، ئایا پێویستە بانگی بۆ بدەن و قامەتی بۆ بکەنەوە؟! وا نازانم، چونکە بەڵگەکان بە شێوەیەکی گشتی ئەو فەرمانەیان تێدا نیە کە بۆ هەر نوێژێك کە بگێڕرێتەوە بانگێکی بۆ بدرێتەوە.. بە تایبەتی کە یەکێك لە حیکمەتی بانگدان ئاگادار کردنەوەی موسوڵمانانە لە کاتی نوێژەکە، کاتی نوێژەکانی ئەمان بەسەرچووە چ پێویستیان بە

---

[١] پەراوێزی ژمارە (٢٠٣) و (٢٤١).

[٢] ابن عثيمين: الشرح الممتع (٤١/٢).

ئاگادارکردنەوەی نوێی ئەو کاتە هەیە؟! بە تایبەتی ئەگەر تەسەور کەین کە پێنج کەس دەیانەوێت لە رەمەزاندا نوێژی مانگێکی چوواوی خۆیان بگێڕنەوە، ئایا دەبێت بۆ هەر نوێژێکیان بانگێکیی بۆ بدەن و قامەتێکی بۆ بکەن؟! نا.. چ بەلگەیەك ئەمە فەرز دەکات؟!

ئەگەر دەوترێت هەر ئەو بەلگانەی خۆت هێناوتەتنەوە دەیسەلمێنن کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بانگی بە سەیدنا بیلال دایەوەو قامەتیشی پێ کرد! دەلێین بەلێ وایە بەلاَم ئەمە بۆ یەك نوێژە، نەك نوێژی چوواوی مانگێك یان سالێك..

پێم و انیە بانگ و قامەت بۆ نوێژگێڕانەوە فەرز بن.. والله اعلم.

### ٣ ـ حوکمی بانگ و قامەت بۆ ئافرەتان:

کۆڕای هەر چوا پێشەوا بەرێزەکەو زاهیریەکان و زۆرینەی شەرعناسانی تر لەسەر ئەوەیە کە نە بانگدان لەسەر ئافرەتانەو نە قامەت کردنیش[1].. لەبەر ئەوەی هیچ ریوایەتێك لەبەر دەستدا نیە کە بیسەلمێنێت لە سەردەمی پێغەمبەری پێشەوا و یاوەران و تابعیندا روویدا بێا ئافرەتێك بانگی بۆ ئەو خەلکە دابێت.. ئەو فەرموودەیەش مەرفووعەش هەیە کە لە ئەسمائی کچی سەیدنا ئەبوبەکرەوە خوا لێیان رازی بێت هاتووە کە دەفەرمویّ: (لَيْسَ عَلَى النِّسَاءِ أَذَانٌ ولا إقَامَةٌ ولا جُمُعَةٌ، ولا اغْتِسالٌ، ولا تقَدِّمُهُنَّ امرأةٌ ولكِنْ تقومُ فِي وَسَطِهِنَّ)[2] واتە: بانگ و قامەت و نوێژی هەینی لەسەر ئافرەتان فەرز نیە.. ئەگەر ئافرەتێکیش

---

[1] المغني (٤٢٢/١)، المجموع (٥٣/٣)، المبسوط (١٣٣/١)، البدائع (١٣٥/١)، ابن الهبيرة: الافصاح (٦٤/١) منح الجليل (١٢٠/١)، الاوسط (٥٣/٣) العدوي: جامع أحكام النساء (٢٩٩/١).

[2] بەیهیقی لە: السنن (٤٠٨/١)، ابن عدي: الكامل (٦٢٠/٢). فەرموودەوانان بە زەعیفیان ناساندووە..

کەوتە پێشیان (بۆ پێش نوێژیی) با لە ناوەڕاستیاندا بوەستێت .. بە شێوەیەکی گشتی رای شەرعناسان لەسەر بنگ و قامەتی ژنان بەم شێوەیە:

**یەکەم: بانگ و قامەتی ژنان کەراهەتی هەیە:** ئەمە رای ئیمامی ئەبو حەنیفەو هەندێك مالیکی و شافیعیەکانە، مالیکیەکان دەڵێن کەراهەتەکەی لای ئێمە رێی لێ دەگرێت، حەنبەلیەکانیش دەڵێن: جائیز نیە.. چونکە سەلمێنراوە کە:

١ ـ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم رێیدا بە ئوم وەرەقەی ئەنساری خوا لێی رازی بێت فەرموو کە بانگدەرێك بۆ خۆی دیاری بکات و خۆشی پێش نوێژی بۆ ژنانی ماڵی خۆیان بکات (عَن أمِّ وَرَقَةَ الأنصارية: أنَّ رَسولَ اللهَ صلى الله عليه وسلم جَعَلَ لَهَا مُؤَذّناً يُؤَذّنُ لَهَا، وَأمَرَهَا أنْ تؤمَّ أهْلَ دَارِهَا)[1].. ئەم شەرعناسە بەڕێزانە دەڵێن: ئەگەر بانگدان بۆ ژنان جائیز بوایە هەر بە خۆی دەفەرموو بانگەکەشیان بۆ بدە، یان ژنێکی تری لە خۆیان بۆ دیاری دەکرد، یان رێی پێدەدان خۆیان دیاری کەن. دیسان ئەگەر وەکو پێش نوێژیەکە پێویست بوایە بۆی دیاری دەکردن، بەڵام ئەو علیە الصلاة والسلام هەر رێی بە پێش نوێژیەکەی دا..

٢ ـ سەیدنا ئیبنو عومەر خوا لێیان رازی بێت فەرموویەتی: (لَيْسَ عَلَى النّسَاءِ أذَانٌ ولا إقَامَةٌ)[2] واتە ژنان نە بانگیان لەسەر نە قامەت کردن..

---

[1] ئەبو داوود (٥٩١)، ئەلبانی بە حەسەنی ناساندووە (ارواء الغليل (٤٩٣).

[2] ابن حجر العسقلاني: التلخيص الحبير (١/٥٢١).

٣ـ عائیشەخان خوا لێی رازی بێت دەڵێ: (كُنَّا نُصَلِّي بِغَيرِ إقَامَةٍ)[١] واتە: نوێژمان بە بێ قامەت دەکرد.. کەوابوو بانگیشیان نەداوە..

٤ـ موعتەمیری کوڕی سولەیمان لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە لە سەیدنا ئەنەسی پرسیووە خوا لێی رازی بێت: ئایا ژنان بانگ و قامەتیان لەسەرە؟ فەرموویەتی: نا، بەڵام ئەگەر کردیشیان خۆ زیکرە: (هَلْ عَلَى النّسَاءِ أذَانٌ وإقَامَةٌ قالَ: لا، وَإنْ فعَلْنَ فهوَ ذِكْرٌ)[٢]..

٥ـ بانگدان بۆ ئاگادار کردنەوەی خەڵکە کە کاتی نوێژ بوو، ئەمەش کارێك نیە بە ئافرەتان سپێررا بێت.

٦ـ نوێژی کۆمەڵ لەسەر ژنان فەرز نیە، تا بانگدانیان لەسەر فەرز بێ.

**دووەم: بانگدانی ژنان کەراهەتی هەیە، نەك قامەت کردنیان:** ئەمەش بۆچوونی ئیمامی مالیك و زۆرینەی شافیعیەکان و قەولێکی ئیمامی ئەحمەدە.. مەزهەبی شافیعی دەڵێ: لەبەر ئەوەی بانگدان زیکری خوایە، بۆ ژنیش جائیزە بانگ بدات بەڵام لای مەحرەمانی خۆی و بەو مەرجەی دەنگی زۆر بەرز نەکاتەوە.. چونکە سەیدنا جابری کوڕی عبدالله خوا لێیان رازی بێت دەربارەی قامەتی ئافرەتان دەفەرموێ: (تقِيمُ المْرأةُ إنْ شَاءَتْ)[٣] واتە: ئەگەر حەز بکات دەتوانێت قامەت بکات. شافیعیەکان دەڵێن: رێ بە قامەت کردنی ژنان دراوە چونکە دەنگ بەرز کردنەوەی زۆری ناوێت، چونکە ئەوانە ئاگادار

---

[١] بەیهیقی: السنن (٢/١٧٠).

[٢] ئیبنو ئەبی شەیبە (١/٢٢٣) ، بەیهیقی (٢/١٧٠) سەحیحە..

[٣] ئیبنوئەبی شەیبە: (١/٢٠٣ ـ ٢٣٢٩)، بەیهیقی (١٧٨١) شێخی ئەلبانی دەفەرموێ: زەعیفە : سلسلة الاحاديث الضعيفة (٢/٢٦٩).

دەكاتەوە بۆ نوێژكردن كە لەو جێیە ئامادەن[1].. بەڵام ئەمە دەشێت وەڵام بدرێتەوە بەوەی بڵێین: ئایا ئەگەر زۆر بە هێواشی بەڵام بە بڵندگۆ قامەتی كرد، دەنگی زیاتر نابێت لە بانگدان بە هەموو هێزی خۆی؟!

**سێیەم: بانگدان و قامەت كردنی ژنان چاكەیەو هیچی لەسەر نیە:** ئەمە بۆچوونێكی تری شافیعیەكان و ریوایەتێكی حەنبەلیەكانە كە تەنها جەختیان لەوەی كردۆتەوە كە بە دەنگی نزم بێت.. ئەمان دەڵێن: لامان سەلمێنراوە كە عائیشەخان خوا لێی رازی بێت (كَانَتْ تؤَذِّنُ وَتقِيمُ، وَتؤمُّ النِّسَاءَ وَتقُومُ وَسْطَهُنَّ)[2] بانگی دەداو قامەتی دەكردو پێش نوێژی ژنانی دەكرد، خۆی لە ناوەڕاستی ریزەكانیانەوە دەوەستا.. بەڵام پێناچێت ئەمە لای فەرموودەوانان بە غەیری زەعیف ناسێنرا بێت.

پێم وایە ئەگەر ژنان هەر خۆیان بوون دەتوانن بانگ بدەن و قامەت بكەن و یەكێكیشیان ببێتە پێشنوێژی نوێژی كۆمەڵیان.. چونكە بانگ و قامەت زیكری خوایەو سەربەخۆیەو ناشێت بە بێ بەڵگەی بەهێز رێی لێ بگیرێت[3].. نابینیت سەیدنا ئیبنوعومەر خوا لێیان رازی بێت كە دەربارەی بانگ و قامەتی ژنان لێیان پرسی، بە سەرسامیەوە دوو جار لەسەر یەك فەرمووی: چما من رێ لە زیكری خوا دەگرم؟!: (سئل ابن عمر عن المرأة تؤذن وتقيم؟ قال: أنا أنهى عن ذكر الله عز وجل؟! أنا أنهى عن ذكر الله عز

---

[1] الخطيب الشربيني / مغني المحتاج (١/١٣٥).
[2] عبد الرزاق: المصنف (٣/١٢٦ ـ ٥٠١٦).
[3] ابن حزم: المحلى (٣/١٢٩)، المغني (١/٤٢٢).

وجل؟!)[١] .. بەڵام دیارە پێشەوایانی شەرع لەسەر ئەوە ڕێکن کە ئافرەت بانگ بۆ پیاوان نادات و پێش نوێژیشیان بۆ ناکات..

## ٤ـ بانگی تاك و بانگی جەماعەتی دووەمی مزگەوت:

هەر کەس بە تەنها لە شوێنێك نوێژ بکات دەبێ بزانێت داخۆ لەو شوێنە بانگ دەدرێت، ئەگەر بانگی لێ دەدرا، ئەوە بانگەکەی ئەوان بۆ ئەمیش دەبێت و پێویست ناکات بانگ بداتەوە، بەڵام ئەگەر بانگی داو قامەتی کرد ئەوە باشترە.. لەبەر ئەو فەرموودەی سەیدنا ئەبو سەعیدی خودری و فەرموودەکەی سەیدنا عوقبەی کوڕی عامر خوا لێیان ڕازی بێت کە لە گەورەیی بانگدا هێنامانەوە[٢]..

هەروەها ئەگەر نوێژەکەی بە جەماعەت لەدەست چووبوو، هاتە مزگەوتێك کە نوێژی ئەو کاتەی بە کۆمەڵ تێدا کرابوو، پێویست ناکات بانگێکی تر بداتەوە.. هەرچەندە بۆی هەیە بانگیش بداتەوەو قامەتیش بکات و جەماعەتی دووەمیش دامەزرێنێتەوە، چونکە ئەبو عوسمان دەگێڕێتەوە: (عَنْ أَنَسٍ ، أَنَّهُ دَخَلَ مَسْجِدًا قَدْ صَلَّوْا فِيهِ، فَأَمَرَ رَجُلًا فَأَذَّنَ وَأَقَامَ، فَصَلَّى بِهِمْ فِي جَمَاعَةٍ)[٣] واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك هاتە لامان لە مزگەوتی سەعلەبە، پرسی: نوێژتان کردووە؟ ووتمان: بەڵێ کردوومانە ـ نوێژی سپێدە بوو ـ بە کابرایەکی فەرموو: بانگێك بدە، کابراش بانگی داو پاشان قامەتی کردو نوێژیان بە کۆمەڵ کرد..

---

[١] شێخی ئەلبانی دەفەرمویٚ: ئەبوداود لە مەسەلەی ٢٩ ی سونەنی خۆیدا ئەمە لە ئیمام ئەحمەدەوە دەگێڕێتەوە، دوای توێژینەوە بینیم ئیبنو ئەبی شەیبەش لە المصنف (١ / ٢٢٣) بە سەنەدێکی باشەوە لە ئیبنو عومەریەوە گێڕاوەتەوە..

[٢] لە پەراوێزی ژمارە (٢٣٣) ، (٢٣٦) دان..

[٣] ئیبنو ئەبی شەیبە (٢٢١/١) سەندەکەشی سەحیحە.. صحيح فقه السنة (٢٧٥/١).

ئەمە بۆچوونی ئیمامی شافیعی و ئیمامی ئەحمەدە كە پێیان وایە دەشێت بانگ و قامەت و جەماعەتی دووەم لە هەمان مزگەوتدا بكرێت كە نوێژی یەكەمی تێدا بە جەماعەت كراوە.. بەڵام ئیمامی مالیك و ئەوزاعی دەڵێن: بانگ نادەنەوە بەڵام بۆیان هەیە قامەت بكەن.. ئیمامی ئەبو حەنیفەو یاوەرانی دەڵێن: نە بانگ دەدەنەوە نە قامەت..

من پێم وایە بۆچوونی ئیمامی مالیك و ئەوزاعی پەسەندتر بێت..

چونكە بانگدانی دووەم سەر لە خەڵكەكە دەشێوێنێت، جگە لەوەی كەسانی تریش دواتر دێن و وادەزانن هەر خۆیان دواكەوتوون و نازانن كە بانگی بۆ دووەمجار لێدراوەو ئەوانیش بانگێكی تر دەدەن!! ئەمە سەرلێشێوانێكی زۆر بۆ خەڵكی دروست دەكات.. بە تایبەتی لەم زەمانەدا كە بە بڵندگۆ بانگ دەدرێت.ناشكرێت بڵێین: ئەمە روو نادات، چونكە دەبێت بیرمان لای گوندنشینانی وولاتێكی وەكو كوردستانی خۆشمان بێت، كە خەڵكی لە كێڵگەكانیانەوە دێنەوە ناو گوندی و هەموو ئاگایان لە جەماعەتی مزگەوت نابێت..

**٥ ـ بانگ بۆ دوو نوێژی كۆكراوە:**

ئەگەر دوو نوێژ لە كاتی یەكێكیاندا كۆكرایەوە، بۆ نموونە كەسێك نیوەڕۆو عەسری لە كێوی عەرەفات كۆكردەوە، یان شێوان و خەوتنانی لە موزدەلیفە كۆكردەوە، یان لە هەر سەفەرێكی تر.. ئەمە هەر بانگێك بۆ هەردوو نوێژە كۆكراوەكانی دەدات، بەڵام بۆ هەر نوێژێك قامەتی خۆیان بۆ دەكات، واتە یەك بانگ و دوو قامەت.. چونكە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە حەجدا وای كردووە ، ئەمەش بۆچوونی جمهوری

پێشەوایانی شەرعە جگە لە بۆچوونی زانراوی مالیكیەكان كە دەڵێن: دەبێ بۆ هەر نوێژێك بانگی خۆی بۆ بدات[1]!

### ٦ ـ ئەو نوێژانەی بانگیان بۆ دەدرێت:

شەرعناسان لەسەر ئەوە كۆن كە بانگ بۆ نوێژە فەرزەكان دەدرێت، بۆ نوێژی تر نادرێت وەك نوێژی جەنازەو جەژنەكان و وترو ئەوانە.. چونكە وەكو ووترا: بانگ بۆ ئاگادار كردنەوەی موسوڵمانانە كە كاتی نوێژەكەتان هات.. نوێژە فەرزەكان پەیوەستن بە كاتی دیاری كراوەوە بۆیە بانگ هەر بۆ ئەوان دەدرێت، نوێژە سوونەتەكانیش هەر سەر بە نوێژە فەرزەكانن، بۆیە بانگی نوێژە فەرزەكان بۆ ئەمانیشن..

ئەمما نوێژی جەنازە لە راستیدا نوێژ نیە، چونكە نە قیرائەتی تێدایە نە ركوع و سوجدە..

## ئەو نوێژانەی بانگیان بۆ نادرێت چۆن خەڵكیان لێ ئاگادار دەكرێتەوە؟!

ئیمامی شافیعی فەرموویەتی بۆ هەر نوێژێك كە قامەت كردنی نەبێت دەشێت بوترێت (الصَّلاةُ جَامِعَةٌ) واتە نوێژ كۆكەروەیە.. حەنبەلیەكانیش بۆ نوێژی جەژن وخۆرگیران ومانگ گیران ونوێژەبارانە ئەم بۆچوونەی ئیمامی شافیعییان قبووڵ بووە، مالیكی وحەنەفیەكان تەنها لە خۆرگیراندا قبووڵیانە[2]..

---

[1] البدائع (١٥٢/١)، المجموع (٨٣/٣)، مواهب الجليل (٤٦٨/١)، الشرح الممتع (٤١/٢).

[2] ابن عابدين (٥٦٥/١)، المجموع (٧٧/٣)، مواهب الجليل (٤٣٥/١)، كشاف القناع (٢١١/١).

لەبەر ئەوەی هیچ بەڵگەیەكی قورئان و سووننەت لەبەر دەستدا نیە ئەمە بسەلمێنێت، پێم وایە ناشێت كەسی پێوە پابەند بكرێت. بە تایبەتی كە كۆڕا (ئیجماع) یشی لەسەر نیە..

## مەرجەكانی بانگ

### ١ ـ هاتنی كاتی ( جگە لە سپێدەی بەیانی ):

مەرجی بانگدان ئەوەیە كە كاتەكەی بووبێت، بانگدان پێش هاتنی كاتی نوێژەكە دروست نیە، مەگەر سپێدەی بەیانی كە دواتر ان شاء الله باسی دەكەین بۆچی وایە.. بانگدان لە سەرەتای دەسپێكی كاتەكەدا باشترە وەك لە دواخستنی، تا خەڵكەكە لە هاتنی كاتی فەرزەكەیان ئاگادار ببنەوەو خۆی بۆ ئامادەكەن.. سەیدنا جابری كوڕی سەمورە خوا لێی رازی بێت دەیگێڕایەوە كە بیلالی حەبەشی خوا لێی رازی بێت، نیوەڕوان لەگەڵ لاربوونەوەی خۆردا بانگی دەدا، بەڵام قامەت كردنەكەی ماوەیەك دوا دەخست، لە سەری كاتەكاندا بانگی دەداو لێی تێنەدەپەڕاندن: (عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، قَالَ: كَانَ يُؤَذِّنُ بِلالٌ بِالظُّهْرِ حِينَ تَدْحَضُ الشَّمْسُ وَيُؤَخِّرُ الإِقَامَةَ شَيْئًا ، وَكَانَ لا يَخْرِمُ فِي الأَذَانِ عَنِ الْوَقْتِ). لە ریوایەتێكی تردا دەفەرموێ: (ثمَّ لا يُقِيمُ حَتَّى يَخْرُجَ اليهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ، فَإِذَا خَرَجَ أقَامَ حِينَ يَرَاهُ)[1] واتە: پاشان قامەتی نەدەكرد تا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تەشریفی دەهێنا، هەر كە دەیبینی وا تەشریف دێنێت قامەتی دەكرد.

---

[1] موسلیم (٦٠٦)، ئەبو داوود (٥٣٧)، ترمزی (٢٠٢)، ئەحمەد (٩١/٥) سەحیحە صحیح فقه السنة (٢٧٦/١).

**بانگی سپێدەی بەیانی:** دەشێت پێش دەركەوتنی سپێدەی راست (الفجر الصادق) بانگی بەیانی بدرێت، ئەمەش بۆچوونی پێشەوایان مالیك و شافیعی وئەحمەدو ئیسحاق و ئەبو سەورو ئەبو یوسف و ئیبنو حەزمە، چونكە سەیدنا ئیبنو عومەر خوا لێیان رازی بێت گێڕایەوە كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (إِنَّ بِلالا يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُنَادِيَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ)[1] واتە: بیلال كە بانگ دەدات هێشتا شەوی ماوە، ئێوە هەر بخۆن و بخۆنەوە تا ئەو ساتەی ئیبنو ئوم مەكتووم بانگ دەفەرموێ.. سەیدنا ئیبنو عومەر خوا لێیان رازی بێت دەڵێ: ئیبنو ئوم مەكتوومیش كوێر بوو تا پێیان دەووت سپێدە هات سپێدە هات بانگی نەدەدا.. كەوابوو ئەمە بانگی یەكەم بوو، بۆ ئەوە دەدرا تا خەوتووەكان وەخەبەر بێن و ئەوی خەریكی شەونوێژێتی كەمێك بحەوێتەوە، یان دەستنوێژی نوێ بكاتەوە، یان ئەوی دەیەویست بەڕۆژوو بێت پارشێوی تێدا دەكرد.. هەروەكو سەیدنا ئیبنو مەسعوود خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (لَا يَمْنَعَنَّكُمْ أَذَانُ بِلَالٍ مِنْ سُحُورِكُمْ، فَإِنَّهُ يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ، لِيُرْجِعَ قَائِمَكُمْ، وَيُوقِظَ نَائِمَكُمْ...)[2] واتە: بانگی بیلال رێی خواردنی پارشێوەكەتان لێ نەگرێت، چونكە ئەو هێشتا شەوە كە بانگ دەدات، مەبەست لە بانگەكەی ئەو ئەوەیە كە ئەو كەسەتان كە لە شەونوێژدایە بحەوێتەوە،ئەوەتان كە خەوتووە بەخەبەر بێت ..

---

[1] بوخاری (٦١٧)، موسلیم (١٠٩٢).
[2] بوخاری (٦٢١)، موسلیم (١٠٩٣).

جمهوری پێشەوایان وایان بە پەسەند زانیووە لەگەڵ دەسپێكی كاتی سپێدەدا بانگی دووەم بدرێت، فەرموشیانە بۆ نوێژ هەر ئەو بانگەشیان بەسە مادام لە كاتی خۆیدا دراوە.. بەڵام ئیمامی ئەبو حەنیفەو سوفیانی سەوری فەرموویانە: یەك بانگەو ئەویش نابێت بدرێت تا سپێدەی راست روون دەبێتەوە[1]..

## ٢ـ نیەتی بانگدان:

لەبەر ئەوەی بانگدانیش خواپەرستیەو سەربەخۆیە، نیەتی تایبەتی خۆی دەوێت، بە تایبەتی كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: (إنَّمَا الاعمالُ بالنِّيَّاتِ)[2] واتە: هەموو كارێك پەیوەستی نیازەكەیەتی. مالیكی و حەنبەلیەكان دەڵێن: ئەگەر كابرایەك زیكری خوای بە تەكبیر دەكرد (دەیووت الله اكبر)، پاشان وویستی بانگ بدات، ناشێت لە دوای ئەو تەكبیرانەیەوە بانگ تەواو كات، چونكە ئەو تەكبیرانەی ناخرێتە ناو بانگەكەوە، بەڵكو دەبێت بانگەكە لە سەرەتایەوە بدات[3].

## ٣ـ بانگ دەبێ بە عەرەبی بێت:

مەزهەبی حەنەفی و حەنبەلی دەڵێن: بانگ بە غەیری زمانی عەرەبی دروست نیە، بەڵام شافیعیەكان دەڵێن: ئەگەر كەسی لێ نەبوو بانگ بە عەرەبی بزانێت، دەشێت بە زمانێكی تر بیدەن[4].. نەمبینی بە لای نەو

---

[1] المحلى (١٦٣/٣)، المجموع (٨٨/٣)، الاوسط (٣٠/٣)، المبسوط (١٣٤/١).
[2] بوخاری (٥٤) موسلیم (١٩٠٧).
[3] منتهى الارادات (١٢٩/١)، مواهب الجليل (٤٢٤/١)..
[4] ابن عابدين (٢٥٦/١)، كشاف القناع (٢١٥/١)، المجموع (١٢٩/٣).

موسوڵمانی ئەوروباو ئەفریقاییشەوە بانگدان ئەوەندە قورس بێت فێری نەبن، بۆیە پێم وایە بانگدان پێویستە بە عەرەبی بێت.

**٤ ـ بانگ نابێ وا بدرێت كە لەفزەكانی بگۆڕرێت:**

وەكو درێژكردنەوەی مەددی هەمزەی تەكبیرەی ئیحرام (وەك ئەوەی بووترێت: ءااااااالله اكبر) چونكە ئەمە دەبێتە پرسیار: ئایا خوا گەورەیە؟ یان (الله ئەكبااااااااار) ئەكبار سیفەتێكە بۆ خوای گەورە ناشێت.. یان مەددی خۆیەتی بەڵام لە سنوری ئاسایی زیاتر درێژ بكرێتەوە.. ئەگەر ووشەكە گۆڕا بانگەكە بەتاڵ دەبێتەوە، ئەگەر ماناشی نەگۆڕا هەر كەراهەتی هەیە ئەوەندە درێژ كرێتەوە[1]..

**٥ ـ ریز بەندی ووشەكانی بانگ[2]:**

دەبێت بانگدەر بانگ بە ریزبەندی ووشەو رستەكانی خۆی بڵێت كە لە سووننەتدا هاتوون، بێ زیادو كەم، بێ پاش و پێش كردن، ئەگەر هەر یەك لەمانەی كرد بە بۆچوونی پێشەوایانی شەرع ـ جگە لە ئیمامی ئەبو حەنیفە ـ بانگەكەی بەتاڵەو دەبێ لە سەرەتاوە دەست پێبكاتەوە.

**٦ ـ نابێ فاسڵ بكەوێتە نێوان ووشەو رستەی بانگەوە[3]:-**

واتە ووشەو رستەكانی بانگ یەك بە دوای یەكداو یەكسەری دەوڵێت بێ ئەوەی فاسڵی قسەیەك یان كردەوەیەك بخاتە نێوانیانەوە،، مەگەر بپژمێت، یان بۆ ماوەیەكی كەم یان چەند جارێك بكۆكێت، ئەمیان بە پێی بۆچوونی جمهوری شەرعناسان جائیزە.. بەڵام ئەگەر توولس كێشا،

---

[1] ابن عابدين (٢٥٩/١)، منتهى الارادات (١٣٠/١)، المجموع (١٠٨/٣)، مواهب الجليل (٤٢٥/١)..

[2] البدائع (١٤٩/١)، مغني المحتاج (١٣٧/١)، منتهى الارادات (١٢٨/١)، مواهب الجليل (٤٢٥/١).

[3] هەمان سەرچاوەكانی پێشوو.

یان کابرای بانگدەر مەشغووڵ بوو، یان شتێکی لێ هات، بانگەکە بەتاڵ دەبێتەوەو یەکێکی تر بۆی نیە لەو شوێنەوە تەواوی کات، بەڵکو دەبێت لە سەرەتاوە دەست پێ بکاتەوە.

### ٧ ـ بانگدەر هەوڵ دەدات زۆرترین کەس گوێیان لە بانگەکەی بێت :

بەوەی دەنگی زۆر بەرز کاتەوە، یان بڵندگۆ بەکار بهێنێت.. تا مەبەستی بانگدانەکە کە ئاگادار کردنەوەی خەڵکیە بێتە دی، بەڵام ئەگەر کابرا بانگی بۆ خۆی دەدا، مەرج نیە دەنگی بەرز کاتەوە مەگەر ئەوەندەی کە ئەوانەی تریش ـ کە دەیانەوێت نوێژەکەی لەگەڵدا بکەن ـ گوێیان لێ بێت. چونکە:

ـ لە فەرموودەکەی سەیدنا ئەبو سەعیدی خودریدا خوا لێی رازی بێت هاتبوو: ( فَإِذَا كُنْتَ فِي غَنَمِكَ أَوْ بَادِيَتِكَ فَأَذَّنْتَ بِالصَّلَاةِ فَارْفَعْ صَوْتَكَ بِالنِّدَاءِ فَإِنَّهُ لَا يَسْمَعُ مَدَى صَوْتِ الْمُؤَذِّنِ جِنٌّ وَلَا إِنْسٌ وَلَا شَيْءٌ إِلَّا شَهِدَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ قَالَ أَبُو سَعِيدٍ سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ )[١] واتە: هەر کاتێك لای مەڕەکانت بوویت، یان لە دەشت بوویت و بانگت دا، دەنگ زیاتر بەرز کەرەوە چونکە هەتا جنن و مرۆڤی زیاتر بانگەکەت ببیستن، لە رۆژی قیامەتدا پاداشتی زیاترت پێ دەبڕێت.. ئەبو سەعید فەرمووی: خۆم لە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بیستووە کە وای فەرمووە..

ـ هەروەها کە سەیدنا عەبدوڵڵای کوڕی زەید خوا لێی رازی بێت، کە بۆ پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم گێڕایەوە کە لە خەودا بانگیان فێرکرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (فَقُمْ مَعَ

---

[١] بوخاری (٦٠٩)، موسلیم (١٢/٢).

بلال فألْقِ علَيهِ ما رأيتَ بهِ، فإنّهُ أنْدَى مِنكَ وأمَدُّ صَوتاً)[١] واتە: هەستە لەگەڵ بیلالدا بڕۆو ئەوەی بینیووتە بۆی بگێڕەرەوە با ئەو بانگەکە بڵێتەوە، چونکە ئەو دەنگی لە تۆ خۆشترەو دەنگی زۆرتر دەڕوات..

ـ لە ریوایەتێکی تردا دەفەرموێ: (قُمْ فَلَقِّنهُ بلالاً فإنّهُ أنْدَى صَوتاً مِنكَ)[٢] واتە: هەستە بیلال فێرکە با بیلێتەوە، ئەو دەنگی لە تۆ خۆشترە..

ئەمە بۆچوونی شافیعیەکان وحەنبەلیەکان وقەولێکی حەنەفیەکانە بەڵام لای مالیکیەکان و قەولی بەهێزی حەنەفیەکان ئەمە سوونەتە..

## ٨ ـ ئایا بانگدان بە رادیۆو تەسجیل و مۆبایل دەبێت لە بڵندگۆوە لێدرێت؟!

نەء، نابێت، چونکە بانگدان خواپەرستیەکی سەربەخۆیەو پێویستە موسوڵمانان جێبەجێی بکەن، ئەگەر کەسیان بانگیان نەدا هەموویان گوناحبار دەبن.. ووتمان کە پاداشتی بانگدان لە پاداشتی پێشنوێژی زیاترە، ئیتر ئەو خەڵکە بۆ واز لەو پاداشتە گەورەیە دەهێنن؟! نا، بۆیان نیە بە بەهانەی ئەوەی کە دەنگی خۆشی بانگدەرێکیان دەسکەوتووە، ئەو بخەنە سەر بڵندگۆی مزگەوت و واز لەو خواپەرستیە بهێنن.. نە بانگدانی تەسجیل کراو جائیزە نە ئیقتیدا بە نوێژی رادیۆو تەلەفزیۆن و تەسجیلکراو[١]..

---

[١] ئەبوداوود (٢٤٤/١) ژمارە (٤٩٩). ئەلبانی لە (صحيح أبي داود(٩٨/١) ژمارە (٤٦٩). هەروەها لە إرواء الغليل (٥٠/١) ژمارە (٢٤٦) بە حەسەنی داناوە.

[٢] ترمزی و ئەحمەدو ئەبوداوودو ئیبنوماجەو ئیبنو خوزەیمە گێڕاویانەتەوە، ترمزی فەرموویەتی حەسەن و سەحیحە، بڕوانە بە سەحیحدانانی شێخی ئەلبانی لە هەر یەك لە (صحيح سنن أبي داود، ١ / ٩٨ ژمارە ٤٦٩، وصحيح ابن ماجه، ١ /١١٨ ژمارە ٧٠٦)

[١] الشرح الممتع (٦١/٢).

## ٩ـ ناوبڕکردنی بانگدان و قامەت کردن بە قسەکردن:

شەرعناسان لە باسی دابڕکردنی بانگ وقامەتدا بە قسەی تر راجوێن:

## ١ . قسە کردنی بانگدەر لە ناو بانگ و قامەتدا جائیزە:

ئەمە بۆچوونی حەسەنی بەسری و عەتاء و قەتادەو ئیمامی ئەحمەدە (بەڵام لە قامەتدا پێی جائیز نیە)، ئەمانیش لە سەیدنا سولەیمانی کوڕی سورەددەوە خوا لێی رازی بێت دەگێڕنەوە، هەروەها لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە کە عادەتەن فەرمووددەو حوکمی شەرعی لە عائیشەخانەوە دەگێڕێتەوە کە پوورێتی.. بەڵگەی ئەمان:

١ـ (عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ أَنَّهُ قَالَ لِمُؤَذِّنِهِ فِي يَوْمٍ مَطِيرٍ: إِذَا قُلْتَ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ، فَلَا تَقُلْ: حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، قُلْ : صَلُّوا فِي بُيُوتِكُمْ، قَالَ: فَكَأَنَّ النَّاسَ اسْتَنْكَرُوا ذَاكَ فَقَالَ: أَتَعْجَبُونَ مِنْ ذَا، قَدْ فَعَلَ ذَا مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنِّي)[1] واتە: سەیدنا ئیبنو عەبباس خوا لێیان رازی بێت لە رۆژێکدا کە باران بوو دوای ئەوەی کە بانگدەرەکەی گەیشتبووە (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ) فەرمانی پێکرد کە لە ناو بانگەدا نەڵێ (حَيَّ عَلَى الصَّلَاة) بەڵکو بڵێ: (الصلاة في الرِّحَال) واتە نوێژەکانتان لە جێی خۆتان بکەن (نەبادا بێن بۆ مزگەوت) ووتیان: ئەوە چیە؟! فەرمووی: لە من چاکتر وای کردووە..

---

[1] بوخاری (٦١٦)، موسلیم (٦٩٩).

٢ ـ (عَنْ مُوسَى بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ يَزِيدَ أَنَّ سُلَيْمَانَ بْنِ صُرَدٍ كَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ كَانَ يُؤَذِّنُ فِي الْعَسْكَرِ وَكَانَ يَأْمُرُ غُلَامَهُ بِالْحَاجَةِ فِي أَذَانِهِ)[١] واتە: سەیدنا سولەیمانی كوڕی سوردەد خوا لێی رازی بێت كە یاوەری پێغەمبەری خوا بوو صلی الله علیه وسلم، لە ناو بانگدانەكەیدا فەرمانی بە خزمەتكارەكەی دەكرد كە پێداویستیەكانی بۆ بكات..

## ٢ . قسە كردنی بانگدەر لە ناو بانگ و قامەتدا جائیز نیە:

ئەمە بۆچوونی نەخەعی و ئیبنوسیرین وسەوری وئیمامی مالیك وئیمامی شافیعی وئیمامی ئەبو حەنیفەیە.

## ٣ . ئەو قسانە جائیزە بانگدەر لە ناو بانگ و قامەتدا بیكات كە بۆ نوێژ پێویستن:

ئەمە بۆچوونی ئیسحاقی كوڕی راهەوەیەو ئیبنول مونزیریش ئەمەیانی بە پەسەندتر بینیووە.. بە بۆچوونی ئەم بەڕێزانە تەنها ووشەو رستەیەك جائیزە لە بانگ و قامەتدا بووترێن كە پەیوەندیان بە نوێژەوە هەبێت، وەكو (صَلُّوا فِي رِحَالِكُم)..

**. قسە لە بانگدا جائیزە، بەڵام لە قامەتدا نابێت:** ئەمەش بۆچوونی ئیمامی زوهریە كە قوتابی سەیدنا ئەبو زەڕی غیففاریە خوا لێی رازی بێت.

---

[١] بوخاری بە موعەللەقی (١١٦/٢ فتح الباری)، ئیبنو ئەبی شەیبە بە سەنەدی پەیوەستەوە (٢١٢/١)، ئیبنولونزیر (٤٤/٣)، ئەبو نوعەیمی شێخی ئیمامی بوخاری بە سەحیحی داناوە (فتح الباری ١١٦/٢).

**ڕای پەسەندتر:** پێم وایە بە پێی بەڵگەی سەلمێنراو دەکرێت قسەیەك لە ناو بانگدا بکرێت کە پەیوەندی بە نوێژەوە هەبێت، غەیری ئەو نابێت، ئەگەر قسەیەك بۆ نوێژو نوێژخوێنان زەرووری بوو دەشێت لە قامەتدا بکرێت بە قیاس لەسەر بانگ کە بەڵگەمان بە دەستەوەیە.. والله اعلم.

## سیفەتی بانگدەر

پێویستە ئەو کەسەی بانگ دەدات ئەم سیفەت و ڕەفتارانەی تێدا بێت:

١ ـ پێویستە نیەتی پاك بێت و لەبەر خاتری خوای گەورە بانگ بدات، نەك بۆ پارەو ناوبانگ، یان بۆ ئەوەی بڵێن دەنگی خۆشە! ئەسڵیش ئەوەیە کە نابێت پارە لەسەر بانگدان وەربگیرێت، چونکە سەیدنا عوسمانی کوڕی ئەبو العاص خوا لێی ڕازی بێت گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (.. وَاتَّخِذْ مُؤَذِّنًا لَا يَأْخُذُ عَلَى أَذَانِهِ أَجْرًا )[١] واتە: بانگدەرێك بۆ بانگدان دیاری بکە کە کرێ لەسەر بانگدانەکەی وەرنەگرێت..

ئەگەر کابرای بانگدەر سەرچاوەی بژێوی نەبوو، بەرپرسانی حکومەت معاشیان بۆ دیاری کرد، بۆی هەیە وەریگرێت، چونکە موسوڵمانان پێویستیان بە دەنگ و بانگی ئەو هەیە..

---

[١] ئەبوداوود (٥٣١)، نەسائی (٦٧٢)، ترمزی (٢٠٩) ئیبنوماجە (٧١٤) شێخی ئەلبانی لە صحیح أبي داود (١٤٦/١ ـ ٥٣١) دەفەرموێ: سەحیحە..

٢ـ پێویستە دەستپاك و ئەمیندار بێت، پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: (وَالْمُؤَذِّنُ مُؤْتَمَنٌ)[١] واتە: بانگدەر كەسێكی ئەمیندارو دەستپاكە، چونكە لە لایەكەوە كاتی نوێژی خەڵكی پێ سپێرراوە، لە لایەكی ترەوە بانگدەر شەوو ڕۆژ چۆتە سەر منارە كە بەرزترین تەلاری گەڕەكەكە بووە تا لەوێوە بانگ بدات، ئەوەش یەعنی بینینی ناوماڵی خەڵكی، لەبەر ئەوەشە كە جمهوری شەرعناسان فەرموویانە بانگدانی فاسق كەراهەتی هەیە.. ئیمامی ئیبنوتەیمییە دەڵێ: بانگی فاسق بەتاڵە چونكە پێچەوانەی ئاڕاستەی پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وسلم، ئەمەش لای حەنبەلیەكان بۆچوونێكی قبووڵە[٢]..

٣ ـ پێویستە دەنگی بڵندو خۆش بێت، لەبەر ئەو فەرموودەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم كە بە عبداللەی كوڕی زەیدی فەرموو: (فَقُمْ مَعَ بلال فَأَلْقِ عَلَيهِ مَا رَأيتَ بِهِ، فَإِنَّهُ أنْدَى مِنكَ وأمَدُّ صَوتاً)[٣] واتە: هەستە لەگەڵ بیلالدا بڕۆو ئەوەی بینیووتە بۆی بگێڕەرەوە با ئەو بانگەكە بڵێتەوە، چونكە ئەو دەنگی لە تۆ خۆشترەو دەنگی زۆرتر دەڕوات..

بەڵام دەشێت لەم سەردەمەدا بڵندی دەنگ زۆر بە گرنگ وەرنەگیرێت، چونكە زۆرینەی شوێن بانگ بە بڵندگۆ دەدەن.. بەڵام

---

[١] ئەبو داوود (٥١٧)، ترمزی (٢٠٧)، ئەحمەد (٢٨٤/٢) ئەلبانی دەفەرموێ سەحیحە (الارواء (٢٣١/١).

[٢] ابن عابدين (٢٦٣/١)، مغني المحتاج (١٣٨/١)، مواهب الجليل (٤٣٦/١)، المغني (٤١٣/١)، الاختيارات (ل ٣٧).

[٣] ئەبوداوود (٢٤٤/١ ژمارە (٤٩٩). ئەلبانی لە (صحيح أبی داود(٩٨/١) ژمارە (٤٦٩). هەروەها لە إرواء الغليل (٥٠/١) ژمارە (٢٤٦) بە حەسەنی داناوە.

پێویست ناکات بانگەکە بکات لە قەتارو ئەڵلاوەیسی زۆری لەرە تێدا بکات و درێژی بکاتەوە..

٤ ـ پێویستە شارەزای کاتەکانی بانگ و گۆڕانەکانیان بێت کە ساڵ دوازدە مانگە بەسەریاندا دێت، بۆ ئەوەی هەموو بانگێك لە دەسپێکی خۆیدا بدات وخۆی وخەڵکیش نەخاتە هەڵەوە.. دەشێت کەسێکی تریش هاوکاری بێت، یان ئامێرو دەزگای بیرهێنانەوە بەکار بهێنێت، چونکە ئەوە سەلێنراوە کە سەیدنا عبداللەی کوڕی ئوم مەکتووم خوا لێی رازی بێت کە بانگدەری دووەمی پێغەمبەری خوا بوو صلی اللە علیە وسلم نابینا بوو، کەسێکی تری هەبوو کە پێی دەوت: وا سپێدە هاتووە: (عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ عَنْ أَبِيهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ إِنَّ بِلَالًا يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُنَادِيَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ ثُمَّ قَالَ وَكَانَ رَجُلًا أَعْمَى لَا يُنَادِي حَتَّى يُقَالَ لَهُ أَصْبَحْتَ أَصْبَحْتَ)[١].

---

[١] بوخاری (٥٩٢).

## سیفەتی بانگ

بانگ لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم بە سێ شێوە گێڕراوەتەوە:

یەکەم: پازدە رستەیی (چوار تەکبیر (ووتنی الله اکبر)، ئینجا هەر رستەیەك دوو جار جگە لە لا اله الا اللهی کۆتایی کە یەك جارە). ئەمەش لە فەرموودەکەی سەیدنا عبداللەی کوڕی زەیدەوە خوا لێی رازی بێت هاتووە: (لمَّا أمَرَ رسولُ اللهَ صلى الله عليه وسلم بالنَّاقُوسِ يُعْمَلُ ليُضْرَبَ بهِ للنَّاسِ لِجَمْعِ الصَّلاةِ طافَ بي وَأنَا نائِمٌ رَجُلٌ يَحْمِلُ ناقُوساً في يَدِهِ فقُلْتُ: يا عَبْدَ اللهِ أتبيعُ النَّاقوسَ؟ قالَ: ومَا تصْنَعُ بهِ؟ فقُلْتُ: نَدْعُو بهِ إلى الصَّلاةِ، قالَ: أفلَا أدُلُّكَ على مَا هوَ خَيرٌ مِنْ ذلكَ؟ فقُلْتُ لهُ: بلَى، قالَ: فقَالَ: تقُولُ: اللهُ أكْبَرُ اللهُ أكبرُ اللهُ أكبرُ اللهُ أكبرُ

أشْهَدُ أنْ لا إلهَ إلا اللهُ أشهدُ أنْ لا إله إلا اللهُ

أشهدُ أنَّ محمَّداً رَسولُ اللهِ أشهدُ أنَّ محمَّداً رسولُ اللهِ

حَيَّ علَى الصَّلَاةِ حيَّ علَى الصَّلاةِ

حَيَّ علَى الفَلاحِ حَيَّ علَى الفَلاحِ

اللهُ أكبرُ اللهُ أكبرُ

لا إله إلا اللهُ

قالَ: ثمَّ استَأخَرَ عنّي غَيرَ بَعيدٍ، ثمَّ قالَ: وَتقولُ إذا أقمْتَ الصَّلاةَ:

اللهُ أكبرُ اللهُ أكبرُ

أشهدُ أنْ لا إله إلا اللهُ أشهدُ أنَّ محمَّداً رسولُ اللهِ

حَيَّ على الصَّلاةِ، حيَّ علَى الفَلاحِ

قدْ قامَتِ الصَّلاةُ قدْ قامَتِ الصَّلاةُ

اللهُ أكبرُ اللهُ أكبرُ

لا إله إلا اللهُ

فَلَمَّا أصبَحَتْ أتيتُ رَسولَ اللهِ صلى اللهُ عليه وسلَّمَ فأخْبَرْتهُ بمَا رَأيتُ فقَالَ: إنّها لَرُؤْيَا حَقّ إنْ شاءَ اللهُ فقُمْ مَعَ بلَال فألْقِ علَيهِ مَا رَأيتَ فلْيُؤَذّنْ بهِ فإنّهُ أنْدَى صَوتاً مِنْكَ، فقُمْتُ مَعَ بلالٍ فجَعَلْتُ ألْقِيهِ علَيهِ وَيُؤذّنُ بهِ قَالَ: فسَمِعَ ذلِكَ عُمَرُ بْنُ الخَطّابِ وَهوَ في بَيتِهِ فخَرَجَ يَجُرُّ رِداءَهُ وَيقولُ والذي بَعَثكَ بالحَقِّ يَا رسولَ اللهِ لَقَدْ رَأيتُ مِثلَ مَا رَأى فقَالَ رسولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم: فللهِ الحَمْدُ)[1] کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە نابەدڵی (لە ریوایاتی تردا وا هاتووە) رازی بوو زەنگی نەسارا بۆ کۆکردنەوەی موسوڵمانان بۆ نوێژ لێبدرێت، پاش ماوەیەك عبداللەی کوڕی زەید ئەم خەوەی بینی کە دەڵێ: لە خەونمدا کابرایەکم بینی دوو زەنگی پێیەو دەگەڕێ، ووتم: زەنگ دەفرۆشیت؟! ووتی: بۆچیتە؟! ووتم: خەڵکی بۆ نوێژ پێ کۆدەکەمەوە، ووتی: ئەدی بۆچی شتێکی باشترت فێر نەکەم؟! ووتم: بۆچی نا؟! ووتی: بلێ: خوا گەورەیە خوا گەورەیە خوا گەورەیە خوا گەورەیە، شایەتی دەدەم کە هیچ خوایەك نیە شایانی پەرستن بێت جگە لە الله هیچ خوایەك نیە شایانی پەرستن بێت جگە لە اللە، شایەتی دەدەم کە محمد نێرراوی خوایە شایەتی دەدەم کە محمد نێرراوی خوایە، وەرن بۆ نوێژ وەرن بۆ نوێژ، وەرن بۆ سەرفرازی وەرن بۆ سەرفرازی، خوا گەورەیە خوا گەورەیە، هیچ خوایەك نیە شایانی پەرستن

---

[1] ئیمامی ئەحمەد (١٥٨٨١)، ترمزی (١٧٤ و١٨٩)، ئیبنوماجە (٦٩٨ و٧٠٦) ئەبوداوود (٤٢١) ئیبنو خوزەیمە بە سەحیحی داناوە (١٨٩/١) هەروەها ئیبنو حیببان (٥٧٢/٤) بەلاّم شێخی ئەلبانی بە حەسەنی داناوە لە: ارواء الغليل (٢٦٤/٢) و تمام المنه (١٤٥). لە صحيح سنن أبي داود (٤٦٩) دا فەرموویەتی حەسەن و سەحیحە.

بێت جگە لە الله.. کە قامەتیشت کرد بڵێ: خـوا گەورەیـە خـوا گەورەیـە، شایەتی دەدەم کە هیچ خوایەك شایانی پەرستن نیە جگە لە الله، شـایەتی دەدەم کە محمد نێرراوی خوایە، وەرن بۆ نوێژ وەرن بـۆ سـەرفرازی، نوێـژ دابەسترا نوێژ دابەسترا، خـوا گەورەیـە خـوا گەورەیـە، هیـچ خوایـەك نیـە شایانی پەرستن بێت جگە لە الله.. بۆ بەیانی هاتمە خزمـەت پێغەمبـەری خوا صلی الله علیه وسلم و خەونەکەم بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: ئەگەر خوا حەزکات ئەم خەونە حەقە، دەی سا لەگەڵ بیلالـدا بـڕۆو ئـەوەی پـێ بڵـێ کە بینیت تا بیکاتە بـانگ و خەڵکەکـەی پـێ بـانگ بکات، ئـەو دەنگـی لـە دەنگی تر خۆشـترو بڵنـدترە.. منـیش بـیلالم فێـر کـردو لەگەڵیـدا چووم، ئـەویش کردیـە بـانگ و دای، کـە عومـەری کـوڕی خـەتتاب لـە ماڵەکـەی خۆیـەوە بیسـتی، بـە هەڵـەداوان هاتـە دەرەوە، عەباکـەی بـەری بـە دوای خۆیدا رادەکێشا، بە پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسـلم فـەرموو: بـەو خوایەی جەنابتی بـە حەقـەوە بـە نێـرراوی خـۆی نـاردووە، منـیش وەکـو ئەمەم لە خەنمدا بینی، پێغەمبەری خوا صـلی الله علیـە وسـلم فـەرمووی: دەی سوپاس بۆ خوا..

ئیمامی ئەبو حەنیفەو ئیمامی ئەحمەد ئەم شێوەیان وەرگرتووە[١].

- لە ریوایەتێکی تردا هاتووە کـە نـۆزدە رسـتە ووشـە بـووەو قامـەتیش حەڤدە ووشە، ئەم دوو رستە زیادەیە ئەوەیە کە پێی دەوترێت (تەرجیع) واتە ووتنی شایەتمان بە دەنگی نزم کە ئامادەبووان گوێیان لێ بێت ئینجا ووتنەوەی بە دەنگی بەرز، یەعنی بانگدەرەکە دوای چوار جار ووتـنی الله اکبر بە دەنگێکی نزم دەڵێ (أشْهَدُ أنْ لا إلـهَ إلا اللهُ) ئینجا بـە دەنگـی بـەرز

---

[١] البدائع (١٤٧/١)، المغني (٤٠٤/١)، الاوسط (١٦/٣).

دەیلێیتەوە، هەروەها بـە دەنگێکـی نـزم دەڵـێ: (أشـهدُ أنَّ محمَّـداً رسـولُ اللهِ) ئینجـا بـە دەنگـی بـەرز دەیلێیتـەوە.. ئەمـە ریوایـەتی سـەیدنا ئـەبو مەحزوورەیە[1] خوا لێی رازی بێت..

ئەمەش مەزهەبی ئیمامی شافیعیە[2].. بەڵام لە ناو کورددا کە شافیعی مەزهەبن کەمتر لەسەر ئەم شێوەیە دەڕۆن..

فەرموودەوانان هەر ئەم دوو ریوایەتەیان بەپەسەند داناون، ریوایـەتی تـر کـە شـێوەی تریـان بـاس فـەرمووە فـەرموودەوانان قسـەیان لەسـەر سەنەدەکانیان کردووەو بە زەعیفیان داناون..

ئەوەی لە کۆنەوە تا ئێستا بۆچوونی زۆرینەی شەرعناسانە ئەوەیە کە تەرجیع زۆر جەخت لێکراو نەبووە، چونکە زانراوە کە ئەوەندەی سەیدنا بیلالی حەبەشی خوا لێی رازی بێت لە خزمـەت پێغەمبـەری خـوادا صلی الله علیـه وسـلم بانگیـداوە نـەیکردووە، ئەگـەر سـوونەتی موئەککـەدەش بوایە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم زیاتر جەختی لـێ دەکـردەوە.. هـەر ئەوەشـە هـۆی ئـەوەی کـە ئێسـتا لـە سەراسـەری جیهانـدا کـە بـانگ دەدرێت کەم بانگدەر هەیە تەرجیعەکە بکات..

ئیمامی ئەحمەد رەحمەتی خوای لێ بێت هەرچەندە شێوازی یەکەمی بە پەسەندتر دانـاوە، بـەڵام دەڵـێ: هـەموو شـێوەکان هـەر جـائیزن، ئەمـە ئیختیاری ئیمامی ئیبنوتەیمییەو شێخ بن بـازی رەحمەتیشـە[3].. پـێم وایـە

---

[1] ئەبو داوود (٥٠٠، ٥٠٣)، ترمزی (١٩٢)، نەسائی (٤/٢)، ئیبنوماجە (٧٠٩). شێخی ئەلبانی دەفەرموێ سەحیحە (صحيح سنن النسائي (٦١٣).

[2] الام (٨٥/١).

[3] ابو داوود: مسائل احمد (٢٧)، المغني (٤٠٤/١)، مجموع الفتاوى (٣٣٦/٢٢)، ابن عثيمين: الشرح الممتع (٥١/٢)، ابن باز: مجموع فتاوى ابن باز (١٣٩/٢٩).

ئـەم شـێوە بانگـەی لـە نـاو کـوردا (بـێ تـەرجیع) دەکرێـت بگیرێتـە بـەرو راجوێیی لەسەر دروست نەکرێت، پەسەندترە.. والله اعلم.

## زیادەکەی بانگی بەیانی ( الصَّلاةُ خَيرٌ مِن النَّوم )

شەرعناسان بەم زیادەیە دەڵێن (التپویب: تەسویب) کە بریتیە لە دوو جار ووتنی (الصَّلاةُ خَيرٌ مِن النَّوم) لە نوێژی بەیانیدا دوای حەیعەلەکان[1].. تەسویب لای جمهوری شەرعناسان سوونەتە، بەڵگەیان فەرموودەکەی ئەبومەحزورە (یان ئەبومەخزورە)یە کە تێیدا هاتووە: (فإنْ كانَ صَلاة الصُبْحِ قُلْتَ: الصَّلاةُ خَيرٌ مِنْ النَّومِ، الصَّلاةُ خيرٌ من النَّوم، اللّهَ اكبرُ اللّهُ اكبرُ، لا اله الا الله)[2] واتە: لە بانگی بەیانیدا بڵێ: نوێژ باشترە لە خەوتن، نوێژ باشترە لە خەوتن.. لە ریوایەتێکی تریدا دەفەرموێ: (فِي الأولَى مِنْ الصُبْحِ) واتە لە بانگی یەکەمی سپێدەدا بیڵێ.

ئەوە سەلمێنراوە کە تەنها لە بانگی یەکەمی سەیدنا بیلالدا خوا لێی رازی بێت تەسویب ووتراوە، نەك لە بانگی دووەمی سەیدنا ئیبنو مەکتوومدا خوا لێی رازی بێت، کە لە سەرەتای دەسپێکی سپێدەی راستەقینەدا داوێتی.. بەڵگە لەسەر ئەمە:

---

[1] واتە کە دوو جار دەوترێت (حي على الصلاة) ، دوو جاریش (حي على الفلاح).. لە عەرەبیدا بە (بسم الله الرحمن الرحيم) دەوترێت بەسمەلەو بە (الحمد لله) دەوترێت حەمدەلەو بە (لا حول ولا قوة الا بالله) دەووترێت: حەوقەلە.. وە هەروەها..

[2] ئەبو داوود (٥٠١)، نەسائی (٢/٨٧)، ئەحمەد (٣/٤٠٨) شێخی ئەلبانیش بە سەحیحی داناوە لە تەخریجی فەرموودەکانی: (مشكاة المصابيح (٦٤٥).

١ـ سەیدنا ئیبنو عومەر خوا لێی رازی بێت دەڵێ (الصَّلاةُ خيرٌ من النَّوم) لە دوای (حيَّ علَى الفَلَاح) دەوترا[١]..

٢ ـ لە ریواتی دووەمی فەرموودەکەی سەیدنا ئەبو مەحزورە (یان ئەبو مەخزورە) دا هاتووە کە دەڵێ: (فِي الأولَى مِنْ الصُّبْحِ) واتە لە بانگی یەکەمی سپێدەدا بیڵێ..

کەوابوو ئێمە لەم سەردەمەدا سوونەتێکمان لەم بانگەدا واز لێ هێناوەو بیدعەیەکمان کردۆتە رێباز:

یەکەم: وازمان لە بانگی یەکەمی بەیانی هێناوە، کە لەوێدا دووجار دەوترێت (الصَّلاةُ خيرٌ من النَّوم)!

دووەم: لە بانگی دووەمدا دەڵێین: (الصَّلاةُ خيرٌ من النَّوم) ئەمەش بیدعەیە.. چونکە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیەو بە زۆر خزێنراوەتە ئەوێوە.. لەمەش بیدعەتر ئەوەیە کە هەندێك لە شەرعناسانی حەنەفی وشافیعی فەرموویانە: دەشێت لە بانگی خەوتنانیشدا بوترێت! چونکە هۆشداری دانە بە خەڵکی کە نوێژ باشترە لە خەوتن!! تەنانەت هەندێك شافیعی مەزهەبی کورتبین فەرموویانە: دەشێت لە هەموو نوێژەکاندا بووترێت! لە کاتێکدا کە سەیدنا عومەری کوڕی خەتتاب گوێی لە یەکێك بوو بانگی نیوەڕۆی دەداو ووتی (الصَّلاةُ خيرٌ من النَّوم) لە ماڵ دەرپەڕی، ووتیان: بۆ کوێ؟! فەرمووی: ئەو بیدعەیە هێنامیە دەرەوە[٢]..

---

[١] بەیهیقی (٤٢٣/١)، الطحاوي: شرح معاني الآثار (٨٢/١) ئیمامی ئیبنو حەجەر لە فەتحدا دەفەرموێ: إسناده حسن..

[٢] ئەبو داوود (٥٣٨)، بەیهیقی (٤٢٤/١)، ئەلبانی لە ارواء الغليل (٢٣٦) بە حەسەنی ناساندووە.

ئەمە جگە لەوەی کە لەو سەردەمەدا دوو یاوەری بەڕێز بانگیان داوە نەك یەك. ئەمەش بۆ خۆی کوێر کردنەوەی سوونەتێکی ترە..

به حساباتی زەمان دەشێت کە بانگی یەکەم بیست بۆ سی دەقیقە پێش بانگی دووەم بدرێت و لەوێدا بووترێت (الصَّلاةُ خيرٌ من النَّوم)..

## چی لە بانگداندا باشە بکرێت؟

### ١ـ هەبوونی دەستنوێژ:

لەبەر ئەوەی بانگدان خواپەرستیە، خواپەرستیش بە شێوەیەکی گشتی باشتر وایە بە دەستنوێژەوە بکرێت، بەڵام ئەگەر بێ دەستنوێژ بانگیدا بە بۆچوونی هەموو شەرعناسان هیچ ئیشکالێکی نیەو بانگەکەی دروستەو خێری خۆی دەسکەوتووە.. تەنانەت ئەگەر لەش پاکیش نەبێت بەڵگەیەکی وا نیە ڕێ لە بانگدانی بگرێت، مەگەر ئەوەی کە هەندێك شەرعناسی وەکو ئیسحاق وئیمامی ئەحمەد ڕێیان لێ گرتووە[١]..

### ٢ـ بانگدان بە پێوە:

شەرعناسان لەوەدا راجوێ نین کە سوونەتە وایە کە بانگ بە پێوە بدرێت، مەگەر کەسێك نەتوانێت، چ بە هۆی نەتوانینی خۆی یان سەختی جێگاکەی یان بە هۆی ترەوە.. ئیمامی مالیك و ئەوزاعی و ئەهلی رەئی بانگدانیان بە دانیشتنانەوە پێ باش نیە[٢]..

---

[١] الاوسط (٢٨/٣).

[٢] الاوسط (٤٦/٣).

ـ ئەوەش سەلمێنراوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە بیلالی فەرموو: هەستە بانگەکە بدە: ( قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَا بِلَالُ قُمْ فَنَادِ بِالصَّلَاةِ )[١].

ـ لە ریوایەتێکی فەرموودەکەی عبداللەی کوڕی زەیددا خوا لێی رازی بێت هاتووە: (رَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ كَانَ رَجُلاً قَائِماً.. فَأَذَّنَ..)[٢]. واتە لە خەونەکەمدا کابرایەکم بینی راوەستاوەو.. پاشان بانگی دا..

### ٣ـ رووکردنە قیبلە :

شەرعناسان هەموو پێیان وایە کە رووکردنە قیبلە لە کاتی بانگداندا سوونەتە[٣].. چەندین فەرموودە لەو بارەوە ریوایەت کراوە بەڵام فەرموودەوانان قسەیان لەسەر زۆرینەیان کردووە.. هەشیانە حەسەن یان سەحیحە، لەوانە:

ـ فەرموودەی ئیبنو زەید خوا لێی رازی بێت کە دەڵێ: (إِنَّ الْمَلَكَ الذي رَآهُ يُؤَذِّنُ، اسْتَقْبَلَ القِبْلَةَ)[٤] واتە: ئەو فریشتەیەی کە بینی بانگی دەدا رووی لە قیبلە کردبوو..

ـ ئەبو داوود لە سونەنەکەیدا / باب الاذان فوق المنارة ریوایەتی کردووە کە سەیدنا بیلال خوا لێی رازی بێت لەسەربانی ماڵێکەوە بانگی دەدا کە بەرزترین وپان وپۆڕترین سەربانی هەبوو چونکە بەرامبەر قیبلە بوو[١]

---

[١] بوخاری (٦٠٤)، موسلیم (٣٧٧).

[٢] ئیمامی ئەحمەد (٢٣٢/٥)، ئیبنو ئەبی شەیبە (٢٠٣/١).

[٣] الاوسط (٢٨/٣).

[٤] ئەبو داوود و فەرموودەوانانی تریش گێڕاویانەتەوەو شێخی ئەلبانی رەحمەتی لە ارواء الغليل (٢٥٠/١ ژمارە ٢٣٢) بە سەحیحی داناوە..

## ٤ـ بانگدەر لە کاتی بانگداندا پەنجەی شایەتمانی دەکاتە گوێچکەیەوە:

ئەمەش لە سەیدنا بیلالەوە سەلمێنراوە، سەیدنا ئەبو جوحەیفە خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە: (رَأَيْتُ بِلالاً يُؤَذِّنُ، أَتَتَبَّعُ فَاهُ، هَاهُنَا وَهَاهُنَا، وَإِصْبَعَاهُ فِي أُذُنَيهِ)[٢] واتە: بیلالم بینی بانگی دەدا، سەرنجی دەمیم دا لای بەملاولایدا دەکرد، دوو پەنجەشی لە هەردوو گوێچکەیدا بوون..

## ٥ ـ بانگدەر لە کاتی ووتنی حەیعەلەکاندا رووی بۆ لای راست وچەپی دەسوڕێنێت:

ریوایەتی تری فەرموودەی ئەبوجوحەیفە هەیە کە دەڵێ: (رَأَيْتُ بِلالاً خَرَجَ إِلَى الأَبْطَحِ فَأَذَّنَ فَلَمَّا بَلَغَ حَيَّ عَلَى الصَّلاةِ حَيَّ عَلَى الفَلاحِ لَوَى عُنُقَهُ يَمِينًا وَشِمَالاً وَلَمْ يَسْتَدِرْ)[٣] واتە: بیلالم بینی کە لە ئەبتەح[٤] بانگی دەدا، کە گەیشتە حەیعەلەکان ملی بەلای راست وچەپدا سوڕاند، بەڵام لەشی نەدەسوڕاند.. ئەمەش بۆچوونی جمهوری شەرعناسانە جگە لە ئیمامی مالیك کە نکووڵی لێکردووە! ئیمامی ئەحمەدو ئیسحاقیش فەرموویانە ئەگەر کابرا لەسەر منارەوە بانگی دەدا، باشتر وایە رووی بۆ لای راست

---

[١] ژمارە (٥١٩) ئەلبانی لە (ارواء الغليل (٢٤٦/١) بە چەندین سەنەدەوە باسی لێوە کردووەو بە حەسەنی ناساندووە..

[٢] ترمزی (١٩٧)، ئەحمەد (٣٠٨/٤)، ئیبنوماجە (٧١١) ئەلبانی دەفەرموێ: سەحیحە (الارواء ٢٣٠). ئەبو داوود (٥٢٠) ئەسڵەکەشی لای بوخاری _ ٦٣٤) و لای موسلیم (٤٠٣) یە..

[٣] ئەبو داوود (٥٢٠) ئەسڵەکەشی لای بوخاری (٦٣٤) و لای موسلیم (٥٠٣) یە..

[٤] ئەبتەح ناوچەیەك بووە لە خواری مەككەوە، بەڵام بە هەموو بیابانێکی تریش دەڵێن کە شیوی بچووکی تێدا بێت کە ئاو دڕیبێتی..

وچەپی خۆی وەرچەرخێنێت[١].. بێ گومان ئەگەر کابرا بە بڵندگۆ بانگی دەدا پێویستی بە وەرچەرخاندنی رووی نامێنێت..

### ٦ ـ بانگدەر دەتوانێت دوو دوو تەکبیرەکان پێکەوە بڵێت:

واتە: دەتوانێت هەر دوو تەکبیرە بە نەفەسێك بڵێت، نەك هەر تەکبیرەو بە جیا، یان هەر چوار تەکبیرەکە بە نەفەسێك، سەیدنا عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (إذَا قَالَ الْمُؤَذِّنُ: اللهُ أكبرُ اللهُ أكبرُ فَقَالَ أحَدُكُمْ اللهُ أكبرُ اللهُ أكبرُ، ثمَّ قالَ: أشهدُ أنْ لا الهَ الا اللهُ، قَالَ أشهدُ أنْ لا الهَ الا اللهُ.. مِنْ قَلْبِهِ دَخَلَ الجَنَّةَ)[٢] واتە: ئەگەر بانگدەر ووتی: (اللهُ أكبرُ اللهُ أكبرُ) کەسێك لە ئێوەش ووتیەوە: (اللهُ أكبرُ اللهُ أكبرُ) پاشان کە ووتی: (أشهدُ أنْ لا الهَ الا اللهُ) ئەویش ووتیەوە: (أشهدُ أنْ لا الهَ الا اللهُ).. ئەگەر لە ناخی دڵیەوە بیڵێتەوە دەچێتە بەهەشتەوە..

بێ گومان وەڵامدەرەوەی بانگەکەش وەکو ئیمامی نەوەوی دەڵێ: هەر ئاوا هەر دوو تەکبیرە پێکەوە دەڵێتەوە[٣]..

---

[١] الاوسط (٢٦/٣).
[٢] موسلیم (٣٨٥)، ئەبوداوود (٥٢٣).
[٣] النووی: شرح مسلم (٧٩/٣).

## چی باشە بۆ وەڵامدەرەوەی بانگ؟

### ١ ـ وەڵامدانەوەی بە دەنگی نزم:

کاتێك موسوڵمان گوێی لە بانگ دەبێت پێویستە بە دەنگێکی نزم لە دوایەوە بیڵێتەوە، چونکە پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: (إذا سَمِعْتمْ النّداءَ فقولوا مِثلَ مَا يَقولُ المُؤذّن)[1] واتە: ئەگەر گوێتان لە بانگ بوو، هەر وەکو ئەوەی بانگدەر دەیلێت بیلێنەوە..

بەڵام کە بانگدەر حەیعەلەکانی ووت، دەوترێت: (لا حَولَ ولا قوَّةَ الَّا باللهِ) وەکو لە فەرموودەکەی سەیدنا عومەری کوڕی خەتتابدا هاتووە: (إذا قَالَ المؤذّنُ اللهُ أكبرُ اللهُ أكبرُ فقَالَ أحَدُكُمْ اللهُ أكبرُ اللهُ أكبرُ ثمَّ قَالَ أشهَدُ أنْ لا إلهَ إلا اللهُ قَالَ أشهدُ أنْ لا إله إلا الله ثمَّ قَالَ أشهَدُ أنَّ مُحَمَّداً رَسولُ اللهِ قَالَ أشهدُ أنَّ محمَّداً رسولُ اللهِ ثمَّ قَالَ حَيَّ عَلَى الصَّلاةِ قَالَ لا حَولَ ولا قوَّةَ إلَّا باللهِ ثمَّ قَالَ حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ قَالَ لا حولَ ولا قوة إلا باللهِ ثمَّ قَالَ اللهُ أكبرُ اللهُ أكبرُ قَالَ اللهُ أكبرُ اللهُ أكبرُ ثمَّ قال لا إله إلا اللهُ قال لا إله إلا الله مِنْ قَلْبِهِ دَخَلَ الْجَنّةَ)[2] واتە: هەر کەسێك کە بانگدەر دەڵێ: (اللهُ أكبرُ اللهُ أكبرُ) ئەمیش بڵێ (اللهُ أكبرُ اللهُ أكبرُ) کە ووتی: (أشهدُ أنْ لا إله إلا الله) ئەمیش بڵێ: (أشهدُ أنْ لا إله إلا الله)، پاشان کە ووتی: (أشهدُ أنَّ محمَّداً رسولُ اللهِ) ئەمیش بڵێ: (أشهدُ أنَّ محمَّداً رسولُ اللهِ)، ئینجا کە ووتی: (حَيَّ عَلَى الصَّلاةِ) ئەمیش بڵێ: (لا حولَ ولا قوة إلا باللهِ)، کە ووتی: (حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ) ئەمیش بڵێ: (لا حولَ ولا قوة إلا باللهِ)، پاشان کە ووتی: (اللهُ أكبرُ

---

[1] بوخاری (٦١١)، موسلیم (٣٨٣)..
[2] موسلیم (٣٨٥)، ئەبو داوود (٥٢٣).

اللهُ أكبرُ) ئەمیش بڵێ: (اللهُ أكبرُ اللهُ أكبرُ)، ئینجا کە ووتی: (لا إله إلا اللهُ)، ئەمیش بڵێ: (لا إله إلا اللهُ) لە ناخی دڵیەوە بیڵێت دەچێتە بەهەشتەوە. فەرموودەکەی سەیدنا ئەبو سەعیدی خودری خوا لێی رازی بێت گشتیە کە دەفەرموێ: وەکو بانگدەر بڵێنەوە.. بەڵام ئەم فەرموودەی سەیدنا عومەر خوا لێی رازی بێت تایبەتی دەکات کە لە حەیعەلەکاندا بووترێت: (لا حولَ ولا قوة إلا باللهِ) چونکە ئەمیان فەرمانە، دەفەرموێ: وەرن بۆ نوێژ، ووتنەوەی وەکو خۆی جێی هیچ ناگرێت..

**جۆرێکی تر:** ریوایەتێك لە سەیدنا معاویەی کوڕی ئەبو سوفیانەوە خوا لێیان رازی بێت هاتووە کە وەڵامی شایەتمانەکانی تەنها بە (وأنا) ، (وأنا أشهد) داوەتەوە، دەڵێ: (عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ قَالَ سَمِعْتُ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ وَهُوَ جَالِسٌ عَلَى الْمِنْبَرِ أَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ قَالَ اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ قَالَ مُعَاوِيَةُ اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ قَالَ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ فَقَالَ مُعَاوِيَةُ وَأَنَا فَقَالَ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ فَقَالَ مُعَاوِيَةُ وَأَنَا فَلَمَّا أَنْ قَضَى التَّأْذِينَ قَالَ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى هَذَا الْمَجْلِسِ حِينَ أَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ يَقُولُ مَا سَمِعْتُمْ مِنِّي مِنْ مَقَالَتِي)[1] واتە: ئەبو ئومامە دەڵێ: گوێم لێبوو لەو کاتەی معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان لەسەر مینبەر دانیشتبوو، بانگی دا، کە بانگدەرەکە فەرمووی: (اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ) ئەویش فەرمووی (اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ) کە بانگدەر فەرمووی: (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) ئەو فەرمووی (وَأَنَا) کە بانگدەر فەرمووی: (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ) معاویە فەرمووی (وَأَنَا)، کە بانگ تەواو بوو فەرمووی: خەڵکینە، خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا بووە صلى الله عليه

---

[1] بوخاری (٩١٤)، نەسائی (٢/٢٤)، ئیمامی ئەحمەد (٤/٩٥).

وسلم كە لە كۆڕی وادابوو كە بانگی دا، وا وەڵامی دایەوە كە لە منتان بیست.

**ئەگەر بانگدەر ووتی (الصَّلاةُ خيرٌ مِنْ النَّوم) ناوترێت (صَدَقْتَ وبَرَرْتَ وَبالصِّدْقِ نَطَقْتَ): چونكە هیچ بەڵگەیەكمان لەبەر** دەستدا نیە.. ئەگەر بانگدەر لە بانگی یەكەمی سپێدەدا ووتی: (الصَّلاةُ خيرٌ مِنْ النَّوم) بە پێی فەرموودەكەی سەیدنا ئەبو سەعیدی خودری لە وەڵامیدا وەكو خۆی دەوترێتەوە، چونكە بەڵگەمان نیە كە ئەو وەڵامەی خەڵكیمان بۆ بچەسپێنێت كە دەڵێن (صَدَقْتَ وَبَرَرْتَ وَبالصِّدْقِ نَطَقْتَ) هەرچەندە هەندێك شەرعناسی بەڕێزی وەكو ئیمامی نەوەوی و كاسانیش ئەوەیان پەسەند كردووە كە وا وەڵامی بدرێتەوە، بەڵام بە بێ بەڵگە ناتوانین ئەو زیكرە بەچەسپێنین..

**٢ـ دوعا بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دوای تەواو بوونی بانگ:**

دوعایەكی تایبەت هەیە كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم داوای لە ئوممەتەكەی كردووە كە هەر كاتێك گوێیان لە بانگ بوو، وەڵامی بانگدەرەكە بدەنەوەو پاشان ئەو دوعایە بە تایبەت بۆ جەنابیان بكەن..

دوعاكەش ئەمەیە: (اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التامَّةِ وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَه)[١] واتە: هانا خوایە، خاوەنی ئەم بانگەوازە تەواوو نوێژە پیادەكراوە، ئەو وەسیلەو گەورەییە بە محمد ببەخشە، خوایە ئەو پلەوپایە ڕێزدارەی بەڵێنت پێیداوە، بۆی بهێنە دی..

---

[١] بوخاری (٥٧٩). ئەلبانی: صحيح الجامع (٦٤٢٣).

ـ سەیدنا عبداللەی کوڕی عەمر خوا لێیان رازی بێت دەگێڕێتەوە کە گوێی لێبووە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (إِذَا سَمِعْتُمُ الْمُؤَذِّنَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ، ثُمَّ صَلُّوا عَلَيَّ، فَإِنَّهُ مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلَاةً صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ عَشْرًا، ثُمَّ سَلُوا لِيَ الْوَسِيلَةَ، فَإِنَّهَا مَنْزِلَةٌ فِي الْجَنَّةِ لَا تَنْبَغِي إِلَّا لِعَبْدٍ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ، وَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَنَا هُوَ، فَمَنْ سَأَلَ الْوَسِيلَةَ حَلَّتْ لَهُ الشَّفَاعَةُ)[1] واتە: کە گوێتان لە بانگدەر بوو، وەکو ئەو بیڵێنەوە، پاشان سەلاواتم لێ بدەن، (داواکەن خوای گەورە درووودی خۆییم بەسەردا ببارێنێت) هەر کەسێك سەلاواتێکی لێدام خوای گەورە دەقات رەحمەتی خۆی بەسەردا دەبارێنێت، پاشان دوعام بۆ بکەن وەسیلەم بە نسیب ببێت، وەسیلە پلەوپایەیەکی بەهەشتە، تەنها بۆ بەندەیەکی لە بەندەکانی خوا دانراوە  منیش ئومێدەوارم ئەو بەندەیەی خوا بم، هەر کەسێك دوعای ئەو وەسیلەم بۆ بکات تا بەنسیبم ببێت، شایانی شەفاعەتم دەبێت..

### ٣ ـ رازی بوون بە خواو بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و بە دینەکەی:

سەیدنا سەعدی کوڕی ئەبو وەققاس خوا لێی رازی بێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ الأَذَانَ: وَأَنَا أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا اللَّهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِالإِسْلامِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهُ)[2] واتە: هەر کەسێك کە گوێی لە بانگ دەبێت و دەڵێ: منیش شایەتی دەدەم کە هیچ خوایەك نیە شایانی پەرستن بێت جگە لە الله، کە تاك و تەنهایەو شەریکی نیە، شایەتی دەدەم کە محمد صلی الله علیه وسلم

---

[1] سەحیحی لای موسلیم (٣٨٤)، ئەبوداوود (٥٢٣)، ترمزی (٣٦٩٤)، نەسائی (٢/٢٥).
[2] سەحیحەو وا لە موسلیم (٣٨٦)، ئەبوداوود (٥٢٥)، ترمزی (٢١٠)، نەسائی (٢/٢٦).

بەندەو نێرراوی خوایە، رازیم بە پەروەردگاریێتی خوا، بە ئیسلام کە بەرنامەیە و بە محمد صلی الله علیه وسلم کە پێغەمبەرە، لە گوناحەکانی دەبورریێت..

**٤ـ دوعاکردن لە نێوان بانگ و قامەتدا:**

کاتی دوای بانگ و پێش قامەت کردن هەلێکە بۆ ئومێدی قبوولّ بوونی دوعا، بۆیە پێویستە موسولّمان بۆ دوعاو پاڕانەوەی خۆیی بەکار بهێنێت.. سەیدنا ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی رازی بێت دەلّێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (الدُّعَاءُ لا يُرَدُّ بَينَ الأذَانِ وَالإقَامَةِ (فَادْعُوا)[1] واتە: دوعای نێوان بانگ و قامەت رەت ناکرێتەوە.. دەی سا دوعای تێدا بکەن..

**٤ـ دوعاکردن لە دوای تەواوبوونی بانگ:**

سەیدنا عبداللەی کوڕی عەمر خوا لێیان رازی بێت دەگێڕێتەوە کە کابرایەك عەرزی پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم کرد: (يَا رَسولَ اللهِ، إنَّ المؤَذّنِينَ يَفضّلُونَنَا، فَقَالَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَليهِ وَسَلَّمَ: قُلْ كَمَا يَقُولُونَ، فَإذَا انْتَهَيْتَ فَسَلْ تعْطَهْ)[2] واتە: ئەی پێغەمبەری خوا بانگدەران لە ئێمە باشترن (پاداشتیان زۆرترە) پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم

---

[1] ئەبو داوود (٥٢١)، ترمزی (٢١٢)، ئیبنوخوزەیمە (٤٢٥)، ئەحمەد (١٥٥/٣ ژمارە ١٢٦٠٦) شێخی ئەلبانی رەحمەتی بە سەحیحی ناساندووە: مشكاة المصابيح (٦٧١) ، صحيح أبي داود (٥٣٤) ، ارواء الغليل (٢٤٤).

[2] ئەبو داوود (٥٢٤)، ئیبنوحیببان (١٦٩٥)، ئەحمەد (١٧٢/٢) شێخی ئەلبانی بە سەحیحی داناوە: صحيح أبی داود (٥٢٤).

فەرمووی: وەكو ئەوان بڵێرەوە، كە تەواو بوویت داواكەو وەڵامت بدرێتەوە..

## نابێت كە بانگ درا مزگەوت جێ بهێڵێت مەگەر عوزری هەبێت:

كە لە مزگەوتێكدا بانگ دەدرێت، موسوڵمان بۆی نییە بڕوات و نوێژی جەماعەتەكە نەكات، مەگەر عوزری هەبێت.. ئەبو شەعساء دەڵێ: لای ئەبو هورەیرە دانیشتبووین، بانگی دا، كابرایەك هەستاو مزگەوتەكەی بەجێهێشت، ئەبو هورەیرە فەرمووی: (أمَّا هذا فقَدْ عَصَى أبَا القاسِمِ)[١] واتە: ئەم كابرایە سەرپێچی لە فەرمانی بابی قاسم (پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم) كرد. ئیمامی نەوەوی دەڵێ: ئەوە بەڵگەی ئەوەیە كە چوونە دەرەوە لە مزگەوت دوای ئەوەی بانگی تێدا دراو پێش ئەوەی نوێژەكە بكرێت كەراهەتی هەیە، مەگەر بۆ كەسێك كە عوزری هەبێت[٢].. عوزر وەكو دەستنوێژگرتنەوە، غوسڵ دەركردن بۆ یەكێك كە بیری چووبێت، یان كەسێك دەستنوێژی گرانە، یان دەرشێتەوە یان شتێكی تری لەو حاڵەتانەی بەسەر دێت.. یان وەكو ئیمامی ئیبنوحەجەر دەڵێ: پێشنوێژی لە مزگەوتێكی تر دەكات[٣].

★ ★ ★

---

[١] موسلیم (٦٥٥)، ئەبوداوود (٥٣٦)، نەسائی (٢/٢٩)، ترمزی (١٣١).
[٢] شرح مسلم (١٥٧/٥)، ترمزی (٣٩٨/١) بە توێژینەوەی شێخ ئەحمەد شاكر رحمه الله.
[٣] فتح الباری (١٤٣/٢).

## هەندێك هەڵەی بانگدەران[1]

بانگدان خواپەرستیە، خواپەرستیش تەوقیفیە، واتە چۆن لە پێغەمبەری خواوە هاتووە پێویستە ئاوا بكرێتەوە، هیچ گوفتارو رەفتارێكی بە بێ بەلگە بۆ زیاد ناكرێت و هیچیشی بە بێ بەلگە لێ كەم ناكرێتەوە.. بەلام بە داخەوە بانگدان و قامەت كردنیش وەكو خواپەرستیەكانی تر هەڵەو پەڵەی زۆری بیدعەو كەم و كورتی كەوتۆتە سەر، لەوانە:

- یەكەم: هەڵەی بانگدەران:

١ـ لەراندنەوەو درێژكردنەوەی پیتەكانی مەدد زیاتر لە سنوری خۆیان

٢ـ زیاد كردنی ووشەی (سیدنا) بۆ پێش ناوی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە شایەتمانەكەدا..

٣ـ تەسبیحات كردنی پێش بانگ و سەڵاو شیعر خوێندنەوە دوای بانگ

٤ـ سەڵاواتدان لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پاش بانگ.

٥ـ فاتیحەدادانی دوای بانگ.

٦ـ پابەند نەبوون بە شێوەو چۆنیەتی شەرعی بانگەكەوە.

٧ـ واز هێنان لە بانگی یەكەمی بەیانی و زیادكردنی تەسویب (ووتنی الصلاة خير من النوم) بۆ بانگی دووەم..

---

[1] عماد زكي: بدع و أخطاء المصلين / التوفيقية للنشر و التوزيع.. لە صحيح فقه السنة وە وەرگیراوە (١/٢٨٨).

**ـ دووەم: هەڵەی گوێگرانی بانگ:**

١ـ پابەند نەبوون بەو گوفتارو رەفتارانەی دەربارەی بانگ باس کران، یان ئیهمال کردن و گوێ پێنەدانیان.

٢ـ ووتنی (لَبَّيْكَ) لەگەڵ بیستنی بانگەکەدا.

٣ـ ماچ کردنی نینۆکە گەورە لە کاتی ووتنی شایەتمانەکەو هێنانیان بەسەر چاوەکاندا!

٤ـ زیاد کردنی (والدَّرَجَةَ الرَّفِيعَةَ العَالِيَةَ) بۆ دوعای وەسیلەکەی دوای بانگدان کە سەنەدی ساغ نەبۆتەوە کە لەو دوعایەدا بێت، ئەمما (إنَّكَ لا تخْلِفُ المِيعَاد) ریوایەتی بەیهیقیەو شەرعناسانێکی کۆن وەك نەوەوی و نوێ وەکو شێخ ئیبنباز بە سەحیحیان ناساندووەو کاریان پێ کردووە.

٥ـ سوێند خواردن بە بانگ و بە هەقی بانگەکە!!

**ـ سێیەم: هەڵەی کاتی قامەت کردن:**

١ـ وەڵام نەدانەوەی گوێگرانی.

٢ـ ووتنی (أقَامَهَا اللهُ وَ أدامهَا مَا دامَتْ السَّمَاوات والارضُ) کە زۆرینەی مەلای کورد دەیڵێن، زیادەیەو ناسەلمێنرێت، موناقەشەی فەرموودەوانان و شەرعناسان لەسەر (أقَامَهَا اللهُ وَ أدامهَا)کەیەتی کە دەرهەق ئەویش فەرمووویانە زەعیفە[1] و نابێتە بەڵگەی چەسپاندنی خواپەرستی ..

---

[1] ئەبو داوود لە سونەنیدا (ژمارە ٥٢٨) فەرموودەیەك لە سەیدنا ئەبو ئومامەوە خوا لێی رازی بێت دەگێرێتەوە کە دەفەرموێ: (أنَّ بِلالًا أخَذَ فِي الإِقَامَةِ، فلمَّا أنْ قَالَ: قَدْ قَامَتْ الصَّلَاةُ، قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : (أَقَامَهَا اللَّهُ وَأَدَامَهَا) ئیمامی نەوەوی لە المجموع

٣ـ ووتنی دوعای وەسیله (اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التامَّةِ وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ)لە دوای قامەت کردن! هەنجەتیشیان ئەوەیە کە مادام بە قامەت ووتراوە بانگ! ئەمانیش بە ڕەوایان زانیووە کە لە پاش قامەت ئەم دوعایە بیڵێنەوە.. ئەمە بەڵگەی لەسەر نیەو بیدعەیە..

٤ـ هەندێك بیدعەوانی تر پێش نوێژ دابەستن دوعایەك دەکەن و دەڵێن: (أللهُمَّ أحْسِنْ وُقوفَنا بَينَ يَدَيكَ) واتە: خوایە ڕاوەستانمان لەبەر دەستتدا چاك کەیت.. هەندێکی تریان زیادەی تریش دەڵێن: (يَومَ الْعَرْضِ علَيكَ) واتە: لەو ڕۆژەدا کە هەموو نیشان جەنابت دەدرێنەوە..

زۆرینەی شەرعناسان وتوێژەرەوەو فەرموودەوانانی کۆن و نوێ لەسەر ئەوەن کە هیچ دوعایەك لە نێوان قامەت و نوێژ دابەستن (تەکبیرەی ئیحرام)دا نەسەلمێنراوە، نە دوعای وەسیلەو نە ئەم دوعایەو نە دوعای تر[١]..

---

(١٢٢/٣) دا دەفەرموێ زەعیفە، هەروەها ئیمامی ئیبنوحەجەر لە التلخيص الحبير (٢١١/١) دا دەفەرموێ: زەعیفە.. شێخی ئەلبانی لە ارواء الغليلدا (٢٤١) دەفەرموێ: لەبەر ئەوەی محمدی کوڕی سابیت کە عوبەیدیە لە سەنەدەکەیدا هەیە، بۆیە فەرموودەکە زۆر زەعیفە..

[١] لە زانایانی سەردەم شێخ بن بازو شێخ عبدالرزاق عەفیفی و شێخ عبدالله بن قەعوود ئەوەیان فەرمووە: فتاوى اللجنة الدائمة (٨٩/٦، ٩٠).

# قامەت کردن

**پێناسەی:** پێشتر ووتمان قامەت ئاگادارکردنەوەی ئەو موسوڵمانانەیە کە ئامادەی نوێژکردنن، ئەمەش بە لەفزی دیاری کراوە کە دەبێت بە شێوەیەکی تایبەتیش بوترێت.

**سیفەتی قامەت:** ئەوەی لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم سەلمێنراوە کە باس لە چۆنیەتی قامەت بکەن، دوو فەرموودەیە:

١ـ قامەت یازدە رستەیە: اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ

أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ

أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ

حَيَّ عَلَى الصَّلَاةْ

حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ

قَدْ قَامَتْ الصَّلَاةْ، قَدْ قَامَتْ الصَّلَاةْ

اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ

لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)[١]

ئەمە ریوایەتی سەیدنا عبداللەی کوڕی زەیدە، کە سەیدنا بیلالی فێر کردو ئەویش بەردەوام لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم دەیفەرمووەوە.. بۆچوونی شەرعناسان وفەرموودەوانان لەسەر ئەمەیان تا رادەیەکی زۆر کۆیە، بەڵام ئیمامی مالیك دەڵێ: یەکجار دەوترێت: (قَدْ قَامَتْ الصَّلَاةْ). ئیمامی ئەبوحەنیفە دەڵێن قامەت حەڤدە رستەیە..

---

[١] بوخاری (٦٠٥)، موسلیم (٣٧٨).

٢ ـ قامەت حەڤدە رستەیە: چوارجار (اللَّهُ أَكْبَرُ) دووجار (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) دووجار (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ) دووجار (حَيَّ عَلَى الصَّلَاةْ) دووجار (حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ) دووجار (قَدْ قَامَتْ الصَّلَاةْ) دووجار (اللَّهُ أَكْبَرُ) یەكجاریش (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ).. ئەمەش لە ریوایەتەكەی سەیدنا ئەبو مەحزوورەدا هاتووە: (أَنَّ أَبَا مَحْذُورَةَ حَدَّثَهُ قَالَ عَلَّمَنِي النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْأَذَانَ تِسْعَ عَشْرَةَ كَلِمَةً وَالْإِقَامَةَ سَبْعَ عَشْرَةَ كَلِمَةً، الْأَذَانُ:..

وَالْإِقَامَةُ: اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ

أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ

أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ

حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ

حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ

قَدْ قَامَتْ الصَّلَاةُ قَدْ قَامَتْ الصَّلَاةُ

اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ

لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)[١]

ئەمــە پەســەندكراوی ئیمــامی ئــەبو حەنیفەیــەو ئێســتا حەنــەفی مەزهەبەكان ئاوا قامەت دەكەن..

ئیمـامی ئیبنوتەیمییـە دەڵـێ: ئیمـامی ئەحمـەد ریوایـەتی بانگەكـەی بیلالی پێ پەسەندتربووە چونكە بەردەوام لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیە وسلم داوێتی، ریوایەتەكەی ئەبومەحزوورەشی بـە پەسـەند زانیووە[٢]..

---

[١] ئەبو داوود (٥٠٢)، ترمزی (١٩٢)، نەسائی (٦٣٢) ئیبنو ماجە (٧٠٩) شێخی ئەلبانی بە سەحیحی داناوە لە صحیح أبی داود (٤٧٤).

[٢] ابن تیمیة: القواعد النورانیة / دار ابن الجوزي ١٤٢٢ ك ل ٤٣.

### ئایا ئەو کەسەی بانگ دەدات هەر دەبێ ئەویش قامەت بکات؟!

بەڵێ وا پەسەندترە، چونکە لە سەردەمانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەیدنا بیلالی حەبەشی بانگی دەداو هەر ئەویش قامەتەکەی دەکرد.. ئەمەش بۆچوونی زۆرینەی شەرعناسانە.. ئەگەر کەسێك بانگی داو کەسێکی تر لە جێی ئەو قامەتی کرد، ئەویش هەر جائیزە..

### بیسەران قامەت لە دوای ئیقامەوانەوە دەڵێنەوە؟!

بەڵێ وەکو ئەو دەڵێنەوە، چونکە فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: (إِذَا سَمِعْتُمْ النِّدَاءَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ الْمُؤَذِّنُ)[1] واتە: ئەگەر گوێتان لە بانگ بوو، هەر وەکو ئەوەی بانگدەر دەیڵێت بیڵێنەوە.. قامەت کردنیش بانگە، چونکە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: (بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلَاةٌ بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلَاةٌ بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلَاةٌ قَالَ فِي الثَّالِثَةِ لِمَنْ شَاءَ )[2] واتە: لە نێوان هەر دوو بانگدا نوێژێك هەیە، لە نێوان هەر دوو بانگدا نوێژێك هەیە، لە سێیەم جاریشدا فەرمووی: لە نێوان هەر دوو بانگدا نوێژێك هەیە بۆ هەر کەسێك حەزکات بیکات..

### وەڵامدەرەوە ( قَدْ قَامَتْ الصَّلاة ) وەکو بانگدەرەکە دەڵێتەوە؟!

کە گوێی لێبوو بانگدەرەکە دوو جار دەڵێ: (قد قامت الصَّلاة قد قامت الصَّلاة) هەر دەبێت وەکو ئەو بڵێتەوە، چونکە مانای فەرموودە گشتیەکە: (إِذَا سَمِعْتُمْ النِّدَاءَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ الْمُؤَذِّنُ)[3] واتە: ئەگەر گوێتان لە

---

[1] بوخاری (٦١١)، موسلیم (٣٨٣)..
[2] بوخاری (٨٣٨).
[3] بوخاری (٦١١)، موسلیم (٣٨٣)..

بانگ بوو، هەر وەکو ئەوەی بانگدەر دەیڵێت بیڵێنەوە.. ئەوەش دەگرێتەوە، نەك لە خۆمانەوە بێ هەبوونی بەڵگە بڵێین: (أقَامَهَا اللهُ وَأدامَهَا) چونکە وەکو شێخی ئەلبانی رەحمەتی دەڵێ: ریوایەتێکی لاوازەو خواپەرستی پێ ناچەسپێنرێت[1]..

### کەی قامەت دەکرێت؟

ئەسڵ ئەوەیە کە بانگدەر ئەو کاتە قامەت دەکات کە پێشنوێژ (ئیمام) ەکەیان بینی وا بۆ ئیمامەتیەکەی هات..

- سەیدنا جابری کوڕی سەمورە خوا لێی رازی بێت دەڵێ: (ثمَّ لا يُقِيمُ حَتَّى يَخْرُجَ اليهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ، فَإذَا خَرَجَ أقَامَ حِينَ يَرَاهُ)[2] واتە: پاشان قامەتی نەدەکرد تا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم تەشریفی دەهێنا، هەر کە دەیبینی وا تەشریفی هێنا قامەتی دەکرد.

- دەشێت پێشتر کە بانگدەر زانی پێشنوێژ دێت قامەت بکات و خەڵکەکە بۆ نوێژ ریز ببن.. چونکە سەیدنا ئەبو هورەیرە خوا لێی رازی بێت دەڵێ کە قامەتی نوێژ بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەکراو خەڵکەکە ریزی نوێژیان دەگرت، پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە شوێنی خۆی هەستێت: (أنَّ الصَّلَاةَ كَانَتْ تقَامُ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَيَأْخُذُ النَّاسُ مَصَافَّهُمْ قَبْلَ أنْ يَأْخُذَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَقَامَهُ)[3] ..

---

[1] ارواء الغليل (٢٤١)

[2] موسلیم (٦٠٦)، ئەبو داوود (٥٣٧)، ترمزی (٢٠٢)، ئەحمەد (٩١/٥) سەحیحە صحيح فقه السنة (٢٧٦/١).

[3] موسلیم (٦٠٥).

ئیمامی ئیبنو حەجەری عەسقەلانی لە شەرحی (بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلَاةٌ)[١] واتە: لە نێوان هەر دوو بانگدا نوێژێك هەیە دەڵێ: دەشێت مەبەستی لە كردنی نوێژێكی سووننەت بێت لە نێوان بانگ و قامەتەكەیدا، هەر وەكو كە دەشێت مەبەستی ئەوە بێت كە: دوای بانگ یەكسەر قامەت نەكرێت، بەڵكو فاسڵی كات بە قەدەر نوێژێكی سووننەت بخرێتە نێوانیان[٢].. ئەمەش ڕەوایە چونكە كە بانگ دەدرێت دەبێت ئەوەندە چاوەڕوانی خەڵكی بكرێت تا دێن بە دەنگەوەو جەماعەتەكەیان دەكەن، خۆ حیكمەتی بانگدانەكە بۆ كۆكردنەوەی خەڵكەكەشە بۆ نوێژی جەماعەتیان..

- حەنەفیەكان دەڵێن: ماوەی خوێندنی بیست ئایەت بۆ نێوان بانگ و قامەتی نوێژی بەیانی و بۆ نێوان بانگ و قامەتی نوێژی نیوەڕۆ ئەوەندەی كە چوار ركات نوێژ بكرێت و لە هەر یەكێكیاندا بڕی دە ئایەتیان تێدا بخوێنێت كاتێكی گونجاوە، كاتی نێوان بانگ و قامەتی عەسریش ئەوەندەی كە لە دوو ركاتدا بڕی دە ئایەت بخوێنێت باشە، بۆ نوێژی شێوان ماوەی خوێندنی سێ ئایەت بەسە، نوێژی خەوتنانیش وەكو نوێژی نیوەڕۆ لێبكات[٣]..

- شافیعیەكان دەڵێن: ئەوەندە چاوەڕوان بكرێت تا خەڵكەكە بۆ نوێژی كۆمەڵ كۆدەبنەوە.. هەندێكی تریان دەڵێن: بەقەدەر ماوەی كردنی نوێژێكی دوو ركاتی[٤]..

---

[١] بوخاری (٨٣٨).
[٢] فتح الباری (١٠٧/٢).
[٣] بدائع الصنائع (١٥٠/١).
[٤] المجموع (١٢٧/٣)، تحفة المحتاج (١٣٨/١).

ـ حەنبەلیەکان دەڵێن: بەقەدەر ماوەی گرتنی دەستنوێژێك و کردنی دوو رکات سوونەت.. هەندێکی تریان فەرموویانە: بەقەدەر ئەوەندەی کەسێك لە خواردن وخواردنەوەی ژەمێك خۆراك ببێتەوە[١] وا دەزانم تەقدیر کردنی ئەو کاتە دەکەوێتە سەر پێشنوێژەکە، ئەو دەبێت رەچاوی بارودۆخی نوێژخوێنەکانی بکات، چونکە ئەگەر مزگەوتەکە لە ناوجەرگەی بازاڕێکدا بێت، جیاوازە وەك لەوەی مزگەوتی گەڕەکێکی کەنار شارە، یان مزگەوتی گوندێکە..

### کەی خەڵکەکە هەڵدەستن بۆ نوێژ؟

ـ ئەگەر پێشنوێژەکەیان لەلا نەبوو، باشتر وایە چاوەڕوانی بکەن، کەی لێیانەوە دەرکەوت ئینجا قامەت بکەن، ئەگەر بانگدەرەکە بێ ئەوەی پێشنوێژەکە ببینن قامەتی کرد، دەتوانن هەڵنەستن تاکو دێت. لەبەر ئەو فەرموودەیەی سەیدنا ئەبو قەتادە کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (إِذَا أُقِيمَتْ الصَّلَاةُ فَلَا تَقُومُوا حَتَّى تَرَوْنِي)[٢]واتە: ئەگەر قامەت کرا، تا من نەبینن هەڵمەستن بۆ نوێژەکە.

ـ ئەگەر پێشنوێژەکەیان لابوو:

* ئیمامی ئەبو حەنیفە دەڵێ: کە بانگدەر ووتی: (حَيَّ عَلَى الصَّلَاة) ئەمانیش هەڵدەستن..
* ئیمامی مالیك دەڵێ: ئەگەر دەستی بە قامەت کرد هەڵدەستن..
* ئیمامی شافیعی و زۆرینەی شەرعناسان دەڵێن: هەڵناستن تا بانگدەر لە قامەتەکەی دەبێتەوە..

---

[١] المغنى (٦٧/٢)، الانصاف (٣٩٢/١)، کشاف القناع (٢٨٨/١)..
[٢] بوخاری (٦٣٧)، موسلیم (٦٠٤).

★ ئیمامی ئەحمەد دەڵێ: کە بانگدەر دەفەرموێ: (قَدْ قَامَتْ الصَّلاة) هەڵدەستن..

پێم وایە کاتێك پێشنوێژ دێتە جێ نوێژی خۆی وبانگدەر دەست دەکات بە قامەت کردن، باشتر وایە خەڵکەکەش بۆ نوێژەکە هەستن.. والله اعلم.

★ ★ ★

## مەرجی دووەمی دروستی نوێژ

## لەش پاكی و هەبوونی دەستنوێژ

لەش پاكی و هەبوونی دەستنوێژ لەو مەرجانەی نوێژ كە نەبوونیان ـ لەگەڵ نەبوونی عوزردا ـ نوێژ بەتاڵ دەكاتەوە:

### لەش پاكی و هەبوونی دەستنوێژ

مەرجە بۆ نوێژ چونكە:

١ـــ خــوای پــەروەردگار دەفــەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ وَٱمْسَحُواْ بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِۚ﴾ المائــدە / ٦ واتــە: ئــەی ئــەو كەســانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر بۆ نوێژ هەستان با دەموچاوو دەستان تا ئانیشك شتبێت و مەسحی سەرتان كردبێت وپێیەكانیشتان تا قولەپێ شتبێت..

٢ـــ هــەروەها دەفــەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقْرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُواْ مَا تَقُولُونَ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُواْ ﴾ النساء/٤٣ واتە: ئەی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە، لەو كاتانەدا كە سەرخۆشــن تــوخنی نوێــژ نەكەونــەوە، تــا بــزانن چــی دەڵــێن، لــەو كاتانەش كە لەشگرانن (لە جەنابەتدان) تا خۆتان دەشۆن، مەگەر ڕێبوار بن.

٣ ـ ســەیدنا ئــەبوهورەیرە خــوا لێــی ڕازی بێــت دەگێڕێتــەوە كــە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فـەرمووی: (لا يَقْبَـلُ اللهُ صَلاةَ

أحَدِكُمْ إذَا أحْدَثَ حَتى يَتوَضَّأ)[1] واتە: خوای گەورە نوێژی ئەو کەسە قبــوول ناکــات کــە دەســتنوێژی دەشــکێت تــا دەســتنوێژی بــۆ نەگرێتەوە..

٤ ـ فەرموودە مەرفووعەکەی لای ئیبنو عومەر خوا لێیان رازی بێت کە دەفەرموێ: (لا تقبَلُ الصَّلاةُ بغَيرِ طَهُورٍ)[2] واتە نوێژی بێ دەست نوێژ قبوول نابێت.

ئەم بەڵگانە راشکاوانە پاکژی دەکەنە مەرجی قبوول بوونی نوێژ، مەگەر کەسێك عوزری هەبێت، وەك ئەوانەی تووشی میزەچرکێ بوون، یان بەردەوام بایان لێ دەبێتەوە، یان وەکو ئەو ئافرەتانەی خوێنی داوێنیان بەردەوامە، ئەمانە نوێژەکانیان دەکەن ئەگەرچی بە زاهیر دەستنوێژیشیان بەوەی بەسەریاندا دێت شکابێت.. هەروەها ئەو کەسەی کە نە ئاوی دەسکەوتووە دەستنوێژی پێ بگرێت، نە سەعیدیشی لایە تەیەممومی پێ بکات (فاقد الطهورین) وەکو ئەوانەی لە زینداندن و رێی دەستنوێژو تەیەممومیان نیە، ئەمانە هەر بەو حاڵەی کە تێیدان نوێژەکەیان دەکەن..

## ئایا پاکی بەدەن و پۆشاك وشوێن پێویستە؟!

**پاکی بەدەن:** بەڵێ، مەرجە بەدەن لە هەموو شتێك پاك بکرێتەوە کە شەرع بە پیسی ناساندبێت.. چونکە:

---

[1] متفق علیە بوخاری (١٣٥)، موسلیم (٢٢٥).
[2] موسلیم (٢٢٤)، ترمزی (١)، ئیبنوماجە (٢٧٢)..

١ ـ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ﴾ المدثر/ ٤ واتە پۆشاکەکانت پاکژ کەرەوە.. کە مادام داوای پاك کردنەوەی پۆشاك بکات، حەتمەن پاك کردنەوەی بەدەن لەپێشترە.

٢ ـ فەرموودەکان کە لە بەرگی یەکەم لە باسی پاکژییدا هێنامانەوە کە باس لە تارات و پاك کردنەوە دەکەن، هەموو بەڵگەن لەسەر مەرجێتی پاکی بەدەن بۆ نوێژکردن..

٣ ـ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانیدا زەکەر لە مەزی بشۆرێتەوە (يَغْسِلُ ذَكَرَهُ وَيَتَوَضَّأُ)[1] واتە: زەکەری دەشواتەوەو دەستنوێژ دەگرێت.. مانای وایە نابێت پیسیی بە هیچ شوێنێکی بەدەنەوە بێت.

٤ ـ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانیدا خۆ لە میز پاك بکرێتەوە فەرمووی ئەوانەی خۆیان لە دوای میزکردن پاك ناکەنەوە لە گۆڕەکەشیاندا ئازار دەدرێن (خَرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ بَعْضِ حِيطَانِ الْمَدِينَةِ فَسَمِعَ صَوْتَ إِنْسَانَيْنِ يُعَذَّبَانِ فِي قُبُورِهِمَا فَقَالَ يُعَذَّبَانِ وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ وَإِنَّهُ لَكَبِيرٌ كَانَ أَحَدُهُمَا لَا يَسْتَتِرُ مِنْ الْبَوْلِ وَكَانَ الْآخَرُ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ)[2] واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە لای باخاتێکی شاردا تێپەڕی و گوێی لەزریکەو ناڵەی دوو کەس بوو کە لە گۆڕەکانیاندا لە تاو ئازارو ئەشکەنجەی خۆیان هاواریان دەکرد، فەرمووی: لەژێر ئەشکەنجەدان، لەبەر شتێکی گەورەش نیە! یەکێکیان لەبەر ئەوەیە

---

[1] بوخاری (٢٦٩)، موسلیم (٣٠٣)، نەسائی (١٥٢)، ئەحمەد (١٢٥/١)

[2] بوخاری (٢١٦)، موسلیم (٢٩٢)، ئەبو داوود (٢٠)، ترمزی (٧٠)، نەسائی (٣١)

کە خۆی لە دوای میز کردنی پاك نەدەکردەوەو ئەوی تریشیان دووزمانی لە نێوان خەڵکیدا دەکرد..

**پاکی پۆشاك:** دەبێت پاك بێت، یان پاك کرابێتەوە، چونکە:

١ـ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ﴾ المدثر/ ٤ واتە پۆشاکەکانت پاکژ کەرەوە..

٢ـ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەرهەق بە خوێنی حەیز کە بەر پۆشاکی ئافرەت دەکەوێت فەرمووی: (جَاءَتْ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ إِحْدَانَا يُصِيبُ ثَوْبَهَا مِنْ دَمِ الْحَيْضَةِ كَيْفَ تَصْنَعُ بِهِ قَالَ تَحُتُّهُ ثُمَّ تَقْرُصُهُ بِالْمَاءِ ثُمَّ تَنْضَحُهُ ثُمَّ تُصَلِّي) [1] واتە: ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و لێی پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمەی ئافرەتان هی وامان هەیە خوێنی حەیزەکەی بەر پۆشاکەکانی دەکەوێت، چی بکات؟! پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: دەیپروێنێت، پاشان ئاوی بەسەردا دەرێژێت و هەڵیدەگلۆفێت، پاشان نوێژی پێوە دەکات..

٢ ـ کە جوبرەئیلی بەرێز سەلامی خوای لێ بێت هەواڵی دایە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کە نەعلەکانی پیساییان پێوەیە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەردوو جووتە نەعلەکەی لە پێ دانا (أَنَّهُ صَلَّى فِي نَعْلِهِ، وَصَلَّى أَصْحَابُهُ فِي نِعَالِهِمْ، فَخَلَعَ نَعْلَيْهِ، فَخَلَعُوا نِعَالَهُمْ، فَلَمَّا سَلَّمَ قَالَ: لِمَ خَلَعْتُمْ نِعَالَكُمْ؟ قَالُوا: رَأَيْنَاكَ خَلَعْتَ نَعْلَيْكَ فَخَلَعْنَا نِعَالَنَا، فَقَالَ: إِنَّ جِبْرِيلَ أَتَانِي فَأَخْبَرَنِي

---

[1] بوخاری (٢٢٧)، موسلیم (٢٩١).

أنَ فِيهِمَا أذَى)[١] واتـە: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم بـە نەعلەكانیـــەوە نوێـــژی كـــرد، یـــاوەرانیش لـــە دوایـــەوە بـــە نەعلەكانیانەوە نوێژیان دابەست،، لە نوێژەكەدا پێغەمبـەری خـوا نەعلەكانی دانا، یاوەرانیش لە دوایەوە نەعلەكانیان دانا، كە سەلامی (كۆتایی نوێژی) دایەوە پێی فـەرموون: بۆچـی نەعلـەكانتان لـە پـێ كـردەوە؟! فـەرموویان: دیمـان جـەنابت نەعلـەكانت دانـا، ئێمـەش دامانـان، فەرمووی: جوبرەئیل هـات و هـەواڵی دامـێ كـە نەعلـەكان پیسییان پێوە بوو..

ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە نابێت پیسایی بە شتێكەوە هـەبێت كـە نوێـژی پێـوە دەكرێـت، دەبێـت ئـەو كاتـەی كـە پێـی دەزانرێـت ـ لـە نوێژیشدا بێ ـ دەبێ خێرا لادرێت..

**پاكی شوێن:** دەبێت ئەو شوێنەی نوێژەكەی لێ دەكرێت پـاك بێـت، ئەمەش مەرجی قبووڵ بوونی نوێژە، چونكە:

١ ــ خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْعَٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ﴾ البقــرة /١٢٥ واتــە: فــەرمانی ئــەوەمان بــە ئیــبراهیم و ئیسـماعیل سـپارد كـە بـە هـەردوكتان ماڵەكەی من (كەعبە) بـۆ ئـەو كەسانەی دێن تـەواف دەكـەن و لێـی دەمێننەوە وخەڵوەت دەكێشن وركـوع و سـوجدەی لـێ دەبـەن، پـاك كەنەوە..

١ ـ پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم فـەرمانی بـە یـاوەران دا كـە شـوێن میـزی كـابرای ئـەعرابی پـاك كەنـەوە كـە لـە مزگەوتەكـەدا

---

[١] الألبانی: ارواء الغلیل (٢٨٤).

میزی کرد: سەیدنا ئەنەس خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە: (أَنَّ أَعْرَابِيًّا بَالَ فِي الْمَسْجِدِ فَقَامَ إِلَيْهِ بَعْضُ الْقَوْمِ ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَعُوهُ، لا تُزْرِمُوهُ. قَالَ: فَلَمَّا فَرَغَ دَعَا بِدَلْوٍ مِنْ مَاءٍ فَصَبَّهُ عَلَيْهِ) [1] واتە: ئەعرابییەك هاتە ناو مزگەوت و میزی کرد، کۆمەڵە کەسێك پەلاماریان دا نەیهێڵن بەڵام پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم فەرمووی: لێی گەڕێن، مەیشڵەژێنن (تا میزکردنەکەی پێ نەبڕن) کە تەواو بوو پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم فەرمانی دا دۆلکەیەك ئاویان هێناو کردی بە شوێن میزەکەیدا.

حوکمی شەرعناسان لە روانگەی ئەم بەڵگە پیرۆزانەوە بووە بە دوو پۆل:

١ ـ ئەمانە مەرجن: ئەمە بۆچوونی جمهوری شەرعناسانە، چونکە بەڵگەکان بە شێوەی فەرمان دەڵێن دەبێت پیسی لادرێت، فەرمان کردنیش بە شتێك یەعنی بەرهەڵستی لە پێچەوانەکەی.. ئەوی نوێژ دەکات مەرجە کە بەدەنی پاك بێت، پۆشاکی پاك بێت، شوێنی نوێژکردنی پاك بێت..

٢ ـ ئەمانە مەرج نین: هەر جۆرە پیسییەك بە هەر یەکێك لەمانەوە بێت (بەدەن، پۆشاك، شوێنی نوێژ) کابرای نوێژخوێن گوناحبار دەکات، بەڵام نوێژەکەی خۆی لە خۆیدا دروستە، بەڵگەکان وەکو مەرجی دەستنوێژ نەبوون نافەرموون نوێژەکەی بەتاڵە، کەوابوو ئەمانە با واجبیش بن، مەرج نین[2]!

---

[1] متفق علیه: بوخاری (٦٠٢٥)، موسلیم (٢٨٤).

[2] ئەوە بۆچوونی هەندێك لە شەرعناسانە کە ئیمامی شەوکانی لە سیل الجرار (١٥٧/١) دا توێژینەوەی لەسەر کردووە..

من پێم وایە بۆچوونی جمهور بەهێزترەو نوێژ بە هەبوونی پیسی بە بەدەنەوە یان بە پۆشاکەوە یان بە شوێنی نوێژەکەوە بە بێ هەبوونی عوزر بۆ لانەبردنی، دەبێتە هۆی دروست نەبوونی نوێژەکە.والله اعلم

**یەکێك پیسی پێوە بوو نوێژی پێوە کرد، دوایی زانی ، نوێژەکەی بکاتەوە؟**

شەرعناسان لە وەڵامی ئەوەدا سێ پۆلە بۆچوونن:

١ـ نوێژەکەی بەتاڵەو دەبێت پیسییەکەی لادات و نوێژەکەی ـ ئەگەر کات مابوو ـ بکاتەوە، ئەگەر کات نەمابوو، نوێژەکە چووەو نایکاتەوە ئەمە بۆچوونی رەبیعەی رەئی وئیمامی مالیك وحەسەنی بەسرییە[١]..

٢ـ نوێژەکەی بەتاڵەو دەبێت بیکاتەوە، با کاتەکەشی بەسەرچوو بێت، ئەمە مەزهەبی ئیمامی شافیعی و قەولێکی ئیمامی ئەحمەدە[٢]، دەڵێن: ئەمە مەرجێکی نوێژەکەی نەهێناوەتە دی کەوابوو مەرج بۆ کراوەکەش نەهاتۆتە دی..

٣ـ نوێژەکەی دروستەو نایکاتەوە، ئەمە بۆچوونی سەیدنا ئیبنو عومەرو عەتاء و سەعیدی کوڕی موسەییەب وموجاهیدو ئەبو سەورو ئیسحاق و شەعبی و نەخەعی وئەوزاعی و قەولێکی تری ئیمامی ئەحمەدەو ئیبنول مونزیریش بە پەسەندترینی داناوە[٣].. بەڵگەشیان ئەوەیە کە:

---

[١] ئیمامی مالیك: المدونة (٢١/١)، الاوسط (١٦٤/٢).

[٢] ئیمامی شافعی: الام (٥٥/١)، المغني (٦٥/٢)، المجموع (١٦٣/٣).

[٣] الاوسط (١٦٣/٢)، المغني (٦٥/٢)، المجموع (١٦٣/٣).

١ ــ ئەمــە نــەیزانیووە کــە پیســی پێوەیــە، خــوای گــەورەش دەفـــەرموێ: ﴿رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا ﴾ البقـــرة/٢٨٦ واتــە: خوایــە مــەمانگرە لەســەر ئــەوەی بیرمــان چــۆتەوە یــان هەڵەمان تێیدا کردووە.. لە فەرموودەی سەحیحیشدا هاتووە کە موسوڵمانان داوای ئەوەیان لە خوای گەورە کـرد، فـەرمووی: (قَدْ فَعَلْتُ)[1] واتە: باشە وا دەکەم. بیرچوونەوەو هەڵەتان بـۆ دەکەمـە عوزر..

٢ـ ئەو فەرموودەی کە سەیدنا ئەبو سەعیدی خودری خوا لێـی رازی بێـت گێڕایـەوە: (أَنَّـهُ صَلَّى فِـي نَعْلِـهِ، وَصَلَّى أَصْحَابُهُ فِـي نِعَـالِهِمْ، فَخَلَـعَ نَعْلَيْـهِ، فَخَلَعُـوا نِعَـالَهُمْ، فَلَمَّـا سَلَّمَ قَـالَ: لِـمَ خَلَعْـتُمْ نِعَـالَكُمْ؟ قَـالُوا: رَأَيْنَـاكَ خَلَعْـتَ نَعْلَيْـكَ فَخَلَعْنَـا نِعَالَنَـا، فَقَـالَ: إِنَّ جِبْرِيلَ أَتَانِي فَأَخْبَرَنِي أَنَّ فِيهِمَا أَذًى)[2] واتە: پێغەمبەری خوا بە نەعلەكانیـــەوە نوێـــژی كـــرد، یـــاوەرانیش لـــە دوایـــەوە بـــە نەعەلەكانیانـەوە نوێـژیان دابەست،، لـە نوێژەكـەدا پێغەمبـەری خوا نەعلەكانی دانا، یاوەرانیش لە دوایەوە نەعلەكانیان دانا، كە ســـەلامی (كۆتـــایی نوێـــژی) دایـــەوە پێـــی فـــەرموون: بۆچـــی نەعلـــەكانتان لـــە پـــێ كـــردەوە؟! فـــەرموویان: دیمـــان جـــەنابت نەعلەكانت دانا، ئێمەش دامانـنـان، فـەرمووی: جوبرەئیـل هـات و هەواڵی دامێ كە نەعلـەكان پیسییان پێـوە بـوو.. ئەمـە بەڵگەیـە لەسەر ئـەوەی كە نوێـژی ئـەو كاتـەی نـەیزانیووە بـۆی حسێبە،

---

[1] موسلیم (١٢٥).
[2] الألبانی: ارواء الغلیل (٢٨٤).

چـونکە پێغەمبـەری خـوا صـلى الله علیـە وسـلم نوێژەکـەی لـە سەرەتایەوە دەست پێ نەکردەوە، بـەڵکو لـەو سـاتەوەی کـە زانـی بەردەوام بووە تا تەواوی کرد..

پێم وایە ئەگەر نوێـژی کـردو نـەیزانی پیسی پێـوە بـووە، نوێژەکـەی دروستە، بـە پێـی بەڵگـەی پۆلـە شەرعناسـانی سێیەم ئەگـەر پێغەمبـەری نازدار صلى الله علیە وسلم بیزانیایە کە نوێژەکـەی خـۆی دروست نابێت دەیکردەوە، هـەر وەکو کـە فـەرمانی بـە خـاوەن نوێژهەڵەکـە کـردەوە کـە نوێژەکەی بکاتەوە.. والله اعلم.

## ئەو شوێنانەی نابێت نوێژیان تێدا بکرێت:

ئەسڵ ئەوەیە کە سەر زەوی هەمووی پاکەو جێ نوێژە، چونکە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: (فُضِّلْتُ على الْأَنْبِيَاءِ بِسِتٍّ:.. وَجُعِلَتْ لِيَ الْأَرْضُ طَهُورًا وَمَسْجِدًا...)[١]واتە: گەورەیی من بە شەش خەلات بەسەر پێغەمبەرانی تردا دراوە:... هەموو سەر زەویم بە پاك بۆ حسێب کراوە.. تا ببێتە جێی نوێژی خۆی و ئوممەتەکەی.. لەگەڵ ئەم حوکمە گشتیەشدا چەندین بەڵگەی ڕاست هەن کە ڕێ دەگرن لە نوێژکردن لە هەندێك شوێن کە دیاری کراون، لەوانە:

١ . **مۆڵگای حوشتر:** مۆڵگا: ئەو شوێنەیە کە ئاژەڵی دوای تێرو تێراوکردن لێ کۆ دەکرێتەوە، دەشێت دارستانێك بێت، یان ئەشکەوت و چەم و دەشتاییەك بێت. نوێژ لەم شوێنانەدا جائیز نیە.. چونکە سەیدنا جابری کوڕی سەمورە خوا لێی ڕازی بێت گێڕایەوە کە کابرایەك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کرد: ئەرێ نوێژلە ئاغەڵی[٢] مەڕدا بکەم؟! فەرمووی: بەڵێ، پرسی: ئەدی نوێژ لە

---

[١] فەرموودەکە بە ڕیوایەتی ڕیوایەتی موسلیم دەفەرموێ بە شەش، ئەوەش هەموو فەرمووده: (فُضِّلْتُ على الْأَنْبِيَاءِ بِسِتٍّ: أُعْطِيتُ جَوَامِعَ الْكَلِمِ، وَنُصِرْتُ بِالرُّعْبِ، وَأُحِلَّتْ لِيَ الْغَنَائِمُ، وَجُعِلَتْ لِيَ الْأَرْضُ طَهُورًا وَمَسْجِدًا، وَأُرْسِلْتُ إِلَى الْخَلْقِ كَافَّةً، وَخُتِمَ بِيَ النَّبِيُّونَ) سەحیحی موسلیم (٣٧١/١ ژمارە ٥٢٣) ڕیوایەتی بوخاریش (١٢٨/١ ـ ژمارە ٣٢٨) ئاوایە: (أُعْطِيتُ خَمْسًا لم يُعْطَهُنَّ أَحَدٌ قَبْلِي: نُصِرْتُ بِالرُّعْبِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ، وَجُعِلَتْ لِي الْأَرْضُ مَسْجِدًا وَطَهُورًا فَأَيُّمَا رَجُلٍ من أُمَّتِي أَدْرَكَتْهُ الصَّلَاةُ فَلْيُصَلِّ، وَأُحِلَّتْ لِي الْمَغَانِمُ ولم تَحِلَّ لِأَحَدٍ قَبْلِي، وَأُعْطِيتُ الشَّفَاعَةَ، وكان النبي يُبْعَثُ إلى قَوْمِهِ خَاصَّةً وَبُعِثْتُ إلى الناس).

[٢] ئاغەڵ: پەچە: شوێنێکە پەرژینی هەیە، دەشێت سەربانیشی هەبێت، جێی کاوێژو حەوانەوەی مەڕە. گەوڕ: هەر ئەو جێیەیە بەڵام بۆ مانگایە. تەویلە: خان: هەر ئەو جێیەیە بەڵام بۆ گوێدرێژو ئەسپ و ئێسترە.

مۆڵگای حوشتردا بکەم؟ فەرمووی: نەء. (وَعَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أُصَلِّي فِي مَرَابِضِ الْغَنَمِ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: أُصَلِّي فِي مَبَارِكِ الْإِبِلِ؟ قَالَ: لَا)[1] .. لەوانەیە لەبەر ئەوە بێت کە مۆڵگای حوشتر شوێنی جنۆکەو شەیتانە، چونکە لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ: (لا تصلُّوا فِي مَبَارِكِ الإبلِ فإنّهَا مِنْ الشَّيَاطِينِ)[2] واتە: نوێژ لە مۆڵگای حوشتردا مەکەن، چونکە شوێنی شەیتانەکانە.. ئەو جارەش لە یاد بێت کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و یاوەران نوێژی سپێدەکەیان چوو، کە بەخەبەر هاتن، یەکسەر فەرمانی پێکردن لەو شوێنە بڕۆن چونکە شەیتانیان بۆ هاتبوو! وەك دەفەرموێ: (فَإِنَّ هَذَا مَنْزِلٌ حَضَرَنَا فِيهِ الشَّيْطَانُ)[3].

## ٢ . گۆڕستان: چونکە:

ـ سەیدنا ئەبو سەعیدی خودری خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (الأَرْضُ كُلُّهَا مَسْجِدٌ إِلَّا الْمَقْبَرَةَ و الحَمَّام)[4] واتە: هەموو شوێنێکی سەر زەوی جێی نوێژە جگە لە گۆڕستان و گەرماو (حەمام).

---

[1] موسلیم (٣٦٠).

[2] ئەبو داوود (٤٩٣)، ئیبنوماجە (٧٦٩)، ئەحمەد (٥/٥٥). سەحیحە: صحيح فقه السنة (٢٩٥/١).

[3] موسلیم (٩٨٠).

[4] ئیمامی شافیعی: المسند (٦٧/١)، ئەبوداوود (٤٩٢)، ترمزی (٢٣٦)، ئیبنوماجە (٧٤٥)، ئیمامی ئەحمەد (١٢١٠٤) ئیبنوخوزەیمە (٧٩٢)، بەیهیقی (٤٣٥/٢) شێخ ئەحمەد شاکری رەحمەتی لە شەرحی ترمزی (١٣٢/٢ ژمارە ١٣٤) دا دەفەرموێ سەحیحە، هەروەها شێخی ئەلبانی رەحمەتی لە إرواء الغليل (٣٢٠/١) دا.

ـ سەیدنا ئەبومەرسەد خوا لێی رازی بێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (لا تجْلِسُوا علَى القُبُورِ ولا تصَلُّوا إلَيهَا)[1] واتە: لەسەر گۆڕ دامەنیشن و نوێژیشی لاوە مەکەن..

ـ عائیشە خان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (لَعَنَ اللهُ اليهودَ وَالنَّصَارَى اتَّخَذُوا قُبُورَ أنْبيائِهِمْ مَسَاجدَ)[2] واتە: نەفرینی خوا لە جولەکەکان، گۆڕی پێغەمبەرانی خۆیان کردە جێی خواپەرستی.

ئەمە حوکمی نوێژە لەسەر گۆڕستان، جیاوازیش نیە لە نێوانی گۆڕستانی موسوڵمانان و گۆڕستانی کافراندا.. رێگرتن لە نوێژ هەردووکیان دەگرێتەوە، مەگەر تەخت بکرێت و گۆڕستان نەمێنێت ئەو کاتە وەکو زەوی تری لێ دێتەوەو نوێژکردن تێیدا جائیز دەبێتەوە..

ئەم رێگرتنە لە نوێژکردن لەسەر گۆڕو گۆڕستان، رێ لە نوێژی جەنازە ناگرێت کە لەوێ لەسەر مردوو بکرێت، مردووەکە نێژرا بێت یان هێشتا لە دارەمەیتەکەیدا بێت.. ئەمەش راجوێییەکی لەسەرە کە لە باسی نوێژی جەنازەدا دێینەوە سەری ان شاء الله.

ـ سەیدنا ئەبوهورەیرە خوا لێی رازی بێت باسی ئەو قولەی گێڕایەوە کە مجێوری مزگەوت بوو، کۆچی دوایی کردبوو، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەواڵی پرسی، ووتیان کۆچی دوایی کردووە! فەرمووی: بۆچی پێتان نەوتووم؟! پاشان تەشریفی بردە سەر گۆڕەکەی و لەوێ نوێژی جەنازەی لەسەر کرد: (عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رَضِيَ

---

[1] موسلیم (٩٧٢).
[2] بوخاری (٤٣٥)، موسلیم (٥٢٩).

اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ أَسْوَدَ رَجُلًا أَوْ امْرَأَةً كَانَ يَكُونُ فِي الْمَسْجِدِ يَقُمُّ الْمَسْجِدَ فَمَاتَ وَلَمْ يَعْلَمْ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَوْتِهِ فَذَكَرَهُ ذَاتَ يَوْمٍ فَقَالَ مَا فَعَلَ ذَلِكَ الْإِنْسَانُ قَالُوا مَاتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ أَفَلَا آذَنْتُمُونِي قَالَ فَدُلُّونِي عَلَى قَبْرِهِ فَأَتَى قَبْرَهُ فَصَلَّى عَلَيْهِ)[١].

**٣ ـ گەرماو (حەمام):** ئەو شوێنەی خۆی لێ دەشۆرێت، نەك ئاودەست (تەوالێت).. نوێژ لەم شوێنەدا جائیز نیەو نابێت لێی بكرێت، چونكە فەرموودەكەی سەیدنا سەعیدی خودری خوا لێی رازی بێت راشكاوانە بەرهەڵستی لە نوێژكردن لە گەرماودا دەكات: (الأَرْضُ كُلُّهَا مَسْجِدٌ إِلَّا الْمَقْبَرَةَ و الحَمَّام)[٢] واتە: هەموو شوێنێكی سەر زەوی جێی نوێژە جگە لە گۆڕستان و گەرماو.

**نوێژ كردن لەسەربانی ئاودەست جائزە:** چونكە سەربانەكە راستە پەیوەستە بە ئاودەستەكەوە بەلام حوكمی ناو ئاودەست نایگرێتەوە، بۆیە نوێژ لێكردنی بەو مەرجەی پاكژ بێت جائیزە..

★ ★ ★

---

[١] بوخاری (١٣٣٧)، موسلیم (٩٥٦).

[٢] ئیمامی شافیعی: المسند (٦٧/١)، ئەبوداوود (٤٩٢)، ترمزی (٢٣٦)، ئیبنوماجە (٧٤٥)، ئیمامی ئەحمەد (١٢١٠٤) شێخی ئەلبانی رەحمەتی لە إرواء الغليل (٣٢٠/١) دا.

## مەرجی سێیەم: داپۆشینی عەورەت بە گوێرەی توانا

زۆرینـەی زۆری شەرعناسـان لـەوەدا راکۆن کـە عـەورەت داپۆشـین بـۆ هەموو خاوەن توانایەك، مەرجە بۆ دروستی نوێژ، چونکە:

١ ـــ خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێ: ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ﴾ الاعراف/٣١ واتە: ئەی نەوەی ئادەم، لە هەموو مزگەوتێکدا جوانی و رازاوەییتان پێوە دیار بێت.. هەنـدێك لـە موفەسسـیران دەڵێن: یەعنی: ئەی موسوڵمانینە، کاتێك دەتانـەوێت نوێـژ بکـەن خۆتـان داپۆشــن.. چــونکە لــە ســەردەمی جاهیلییــەتی پــێش ئیســلامدا عەرەبەکان بـە رووتـی تـەوافیان بـە دەوری کەعبـەدا دەکـرد! ئـەم ئایەتەش وەکو ریوایەتی سەحیحی موسلیم دەڵێ: بۆ رێگـرتن لـەو خووە ناپەسەندە هاتە خوارەوە..

٢ ـ سەیدنا سەلەمەی کوڕی ئەکوەع خوا لێی رازی بێت دەڵێ: (قُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا نَكُونُ فِي الصَّيدِ، أَفَيُصَلِّي أحَـدُنَا فِـي القَمِـيصِ الْوَاحِـدِ؟ قَالَ: نَعَمْ، وَلْيَزْرُرْهُ وَلَو لَمْ يَجِدْ إلا أنْ يَخُلَّهُ بِشَوكَةٍ)[١] واتـە: عـەرزی پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم کـرد: ئێمـە جـاری وا هەیـە لـە راوکـردنین ئایـا جـائیزە بـە یـەك پۆشـاکەوە نوێـژ بکـەین؟ فەرمووی: بەڵێ مادام هیچی تری دەسناکەوێت، کەلێنەکەی داخات با بە دڕکێکیش بێت..

---

[١] ئەبو داوود (٦٣٢)، نەسائی (٢/٧٠).. ئیمامی نەوەوی لە المجموع (٣/١٦٤) و ئەلبانی لە توێژینەوەی فەرموودەکانی مشكاة المصابيح (٧٦٠) دا بە حەسەنیان ناساندووە..

٣ـ عائیشەخان خوا لێی رازی بێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (لا يَقْبَلُ اللهُ صَلاةَ حَائِضٍ إلا بِخِمَارٍ)[1] واتە: خوا نوێژی ئافرەتی باڵغ قبووڵ ناکات ئەگەر سەرپۆشی پێوە نەبێت..

٤ـ فەرموودەکەی سەیدنا جابری کوڕی عبدالله خوا لێی رازی بێت کە باسی نوێژەکەی خۆی کرد کە بە پارچە قوماشێکی گەورەوە لە پەنا پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم کردی، دەڵێ: پێی فەرمووم: (فَإِنْ كَانَ وَاسِعاً فَالْتَحِفْ بِهِ، وَإِنْ كَانَ ضَيِّقاً فَاتَّزِرْ بِهِ)[2] واتە: ئەگەر پانوپۆڕو والأبوو بیدە بەسەر خۆتدا، ئەگەر کورت و تەسکیش بوو وەك پەشتەماڵ لە خۆی پێچە..

پەشتەماڵی پیاوان لە ناوکەوە داپۆشیووە بۆ خوار ئەژنۆ.. کەوابوو ئەم شوێنە دیاری کراوەی لەشی پیاو عەورەتەو پێویستە لە نوێژدا داپۆشرێت. ئەمەش لای زۆرینەی شەرعناسان مەرجی دروستی نوێژە.

٥ـ ئیبنوعەبدولبیرو ئیبنوتەیمییە کۆڕای شەرعناسان نەقڵ دەکەن کە هەر کەسێك بە رووتی نوێژ بکات، لە کاتێکدا توانای خۆداپۆشینی هەبێت، نوێژەکەی قبووڵ نیە.. هەرچەندە هەندێك لە مالیکیەکان و شەوکانی داپۆشینی عەورەت ناکەنە مەرجی قبووڵبوونی نوێژ[1]. بەڵام وا نازانم بەڵگەکانیان لە بەڵگەی جمهور بەهێزتر بێت..

---

[1] ئەبوداوود (٦٤١)، ترمزی (٣٧٧) ئەلبانی بە حەسەنی ناساندووە لە الارواء (٢١٥/١)

[2] بوخاری (٣٦١)، موسلیم (٣٠١٠).

[1] مجموع الفتاوى (١١٧/٢٢)، فتح الباري (٥٥٥/١)، بداية المجتهد (١٥٦/١)، السيل الجرار (١٥٨/١).

٦ـ داپۆشـینی عـەورەت لـە نوێـژدا کـە وەسـتانە لـە خزمـەت خـوای کردگـارو پـەروەردگارو بەدەسـەڵات و مەزنـدا، سـیمایەکی ئـەدەبی بـەرزو رەفتـاری خواناسـانەیە کـە لەگـەڵ گـەورەیی و نـاوەرۆکی نوێژدا دەگونجێت[١]..

## ئەو شوێنانەی عەورەتن و دەبێت لە نوێژدا دا پۆشرێن:

ئیمـامی ئیبنوتەیمییـەی رەحمـەتی دەڵـێ[٢]: بـا لـە سـەرەتاوە ئـەوە کە عەورەتێك کە نابێت سـەیر بکرێت و عـەورەت لـە نوێـژدا جیـاوازن و پەیوەنـدییان بـە یەکـەوە نیـە. تەنانـەت ئـەو زاراوەی عەورەتـە کـە شەرعناسان داپۆشینییان بە مەرجی دروستی نوێژ داناوە، نە لـە قورئانـدا هاتووە نە لە سیرەو سوونەتی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیـه وسـلم.. خـــوای گـــەورە دەرهـــەقی فەرموویـــەتی: ﴿خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ﴾ الاعراف/٣١ واتە: لە هەموو مزگەوتێکدا جـوانی و رازاوەییتـان پێـوە دیـار بێت..

عەورەتی تەماشاکردن بۆ چێژو لەزەتە، ئەمما جوانی وخۆرازاندنـەوە لە مزگەوت لەبـەر خـاتری خوایـەو بـۆ بـەجێهێنانی فەرمانـەکانی ئـەوە.. بۆیە کەس بۆی نیە بە رووتی نوێژ بکات یـان تـەواوف بکـات، بـا بەتـەنها خۆشـی بێـت.. کـەوابوو ئـەم پۆشـاکەی بـۆ مزگـەوت لەبـەر دەکرێـت پەیوەندی بە داپۆشینی عەورەتی نەزەرەوە نیـە.. ئـەمیان شـتێکەو ئـەوی تریان شتێکی تر..

---

[١] البدائع (١١٦/١)، الدسوقي (٢١١/١)، مغني المحتاج (١٨٤/١)، كشاف القناع (٢٦٣/١).

[٢] الفتاوى (٢٢/١١٣ ـ ١٢٠).

چونكە دەشێت ئەوەی نوێژخوێن لە نوێژدا دایدەپۆشێت، لە غەیری نوێژدا نیشانی دا.. بۆ نموونە:

١ـ دەفەی شانی پیاو: لە نوێژدا دادەپۆشرێت، چونكە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەرهەڵستی لێكردووە: (لَا يُصَلِّيَنَّ أَحَدُكُمْ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ لَيْسَ عَلَى عَاتِقِهِ مِنْهُ شَيْءٌ )[١] واتە: كەستان بە یەك پۆشاكەوە نوێژ نەكات كە هیچی بەسەر شانیەوە نەبێت.. بەڵام لە دەرەوەی نوێژدا كابرا دەتوانێت لای پیاوان شانی رووت كات! یان ئافرەت كە لە نوێژدا سەرپۆش دەپۆشێت، بەڵام لە دەرەوەی نوێژەكەدا لەبەر دەم مەحرەمانی خۆیدا قژی رووت دەكات.

پێچەوانەی ئەمیش هەردوو دەست و پێیەكانە، كە بە پێی بۆچوونی پەسەندتر ئافرەت نابێت بۆ پیاوی بێگانەیان دەرخات، بەڵام لە نوێژدا بە پێی بۆچوونی جمهوری پێشەوایانی شەرع فەرز نین لەسەری..

### ئەو شوێنانەی لەش كە دەبێت پیاو لە نوێژیدا دایانپۆشێت:

ـ كە مادام پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەیهێشتووە بە رووتی تەواڤی كەعبە بكرێت: (لَا يَحُجُّ بَعْدَ الْعَامِ مُشْرِكٌ وَلَا يَطُوفُ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ)[٢] واتە: لەم ساڵەوە موشریك نابێ بێتە حەج وكەسیش بۆی نیە تەواف بە رووتی بكات.. بە تەئكید نوێژ كردن هەر نابێت بە رووتی بكرێت..

ـ دەربارەی نوێژكردن بە یەك پۆشاكەوە فەرمووی: (فَإِنْ كَانَ وَاسِعاً فَالْتَحِفْ بِهِ، وَإِنْ كَانَ ضَيِّقاً فَاتَزِرْ بِهِ)[١] واتە: ئەگەر پانوپۆڕو والابوو بیدە

---

[١] بوخاری (٣٥٩)، موسلیم (٥١٦).
[٢] بوخاری (١٥٤٣).
[١] بوخاری (٣٦١)، موسلیم (٣٠١٠).

بەسەر خۆتدا، ئەگەر کورت وتەسك بوو وەك پەشتەماڵ لە خۆی پێچە. کەوابوو ئەوەندەی کە پەشتەماڵەکە دایپۆشیووە لە نوێژدا فەرزە دابپۆشرێت..

- پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە فەرموودەیەکدا عەوەرتی نوێژ دیاری دەکات، دەفەرموێ: (مَا بَينَ السُّرَّةِ و الرُّكْبَةِ عَوْرَةٌ)[1] واتە: نێوان ناوك و ئەژنۆ عەورەتە..

کەوابوو دەبێت پیاوان لە کاتی نوێژ کردنیاندا لە شانیانەوە تا خوار ئەژنۆیان داپۆشن، مەگەر کەسێك پۆشاکەکەی بەش نەکات، ئەو کاتە وەکو پەشتەماڵ لە ناوکیەوە تا خوار ئەژنۆی پێ دادەپۆشێت..

### سیفەتی پۆشاکی نوێژ:

- مەرجە پۆشاکی نوێژ تەنك نەبێت، تەنك ئەوەیە کە رەنگی پێستی لێوە دەرکەوێت کە سپیە یان ئەسمەرە..

- مەرجە ئەگەر پۆشاکی نوێژ ئەستوور بوو، تەسك نەبێت، نەبادا شکڵی بەدەن یان هەندێك شوێنی بەدەن نیشان داتەوە، وەکو تراکسووتی ژێرەوە کە شکڵی عەوەرت نیشان دەداتەوە..

- مەرجە جۆری قوماشی پۆشاکی نوێژ نەرمەلیقە نەبێت (وەکو حەریرو مەلمەل) نەبادا بە لەشەوە بنوسێت..

نوێژ بە پۆشاکێکەوە کە ئەم مەرجانەی تێدا نەبێت دروستە بەڵام شتێکی مەکرووهە..

[1] ئەبو داوود (٤٩٥) وئەوانی تر، ئەلبانی بە حەسەنی داناوە: ارواء الغليل (٢٣٦/١)

## ئەو شوێنانەی لەش كە دەبێت ئافرەت لە نوێژیدا دایانپۆشێت:

١ـ ئەگەر ئافرەت بە ئامادەیی پیاوانی نامەحرەم نوێژی دەكـرد، بـە رای جمهوری پێشەوایانی شەرع دەبێت هەموو گیانی جگە لـە دەسـت و دەموچاوی داپۆشێت[١]..

٢ـ ئەگەر ئافرەت لەو كاتەی پیاوانی نامەحرەمی لایە نوێژی كـردو هەموو لەشی جگە لە دەست و دەموچاوی دانەپۆشیبوو، یـان شـوێنێكی لەشــی لەوانــەی پێویســتە داپپۆشــێت دەركــەوت، بــە رای شەرعناسـان نوێژەكـەی دروسـتە بـەڵام گوناحبـار دەبێـت.. چـونكە بەڵگـەی بـەتاڵ بوونەوەی نوێژكەی لەبەر دەستدا نیە..

٣ ــ ئەگــەر ئافرەتێــك تــەنها بــوو نوێــژی دابەســت، یــان مێــردو مەحرەمانی خۆی لە لا بوو لكی سەرپۆشەكەی كرایەوە یان شل بـۆوەو قژی دەركەوت  یان شوێنێكی تری، پێویستە زوو داپپۆشـێتەوە، ئەگـەر داینەپۆشـیەوەو نوێژەكـەی تـەواو كـرد، نوێژەكـەی بـە پێـی مەزهـەبی ئیمامی ئەبوحەنیفەو ئیمامی ئەحمەد تەواوەو نایكاتـەوە، مەگـەر زۆر لـە قـژی یـان بـەدەنی دەركـەوتبێت، بـەڵام بـە پێـی مەزهـەبی ئیمـامی شـافیعی بەتاڵـەو دەبـێ بیكاتـەوە[١].. بەڵگـەش لایـەنگری بۆچـوونەكەی ئیمــامی شــافیعیە، چــونكە پێغەمبــەری خــوا صــلی الله علیــە وســلم فــەرمووی: (لا يَقْبَـلُ اللهُ صَـلاةَ حَـائِضٍ إلا بِخِمَـارٍ)[٢] واتـە: خـوا نوێـژی ئافرەتی باڵغ قبووڵ ناكات ئەگەر سەرپۆشی پێوە نەبێت..

---

[١] راجوێیی لە نێوان شەرعناسان لەسەر دەست و دەموچاوو پێیی ئافرەت هەیە دواتر لە شوێنی خۆیدا باس دەكرێت، ان شاء الله..

[١] مجموع الفتاوی (١٢٣/٢٢)، المغنی (٦٠١/١).

[٢] ئەبوداوود (٦٤١)، ترمزی (٣٧٧) ئەلبانی بە حەسەنی ناساندووە لە ارواء الغلیل (٢١٥/١).

## داپۆشینی پێی ئافرەت لە نوێژدا فەرز نیە:

ئیمامی شافیعی دەڵێ: هەموو شوێنێکی ئافرەت لە نوێژدا عەورەتە جگە لە دەست و دەموچاوو پشتی پێی[١].. ترمزی ئەوەی لێوە نەقڵ کردووە.. ئیمامی ئەبو حەنیفەش رای وایە، وەکو ئیمامی ئیبنو تەیمییە لە توێژینەوەی ئەم مەسەلەیەدا لێوەی نەقڵ کردووە.. رای ئیمامی ئەحمەدیشی نەقڵ کردووە کە پێی وایە هەر هەموو گیانی ئافرەت عەورەتەو پێویستە دایپۆشێت، تەنانەت نینۆکیشی[٢]! من پێم وایە بۆچوونەکەی ئیمامی شافیعی بەهێزترە..

کەوابوو ئافرەت بۆی هەیە لە نوێژدا دەست و دەموچاوو پێی دانەپۆشێت.. والله اعلم..

٣ـ ئافرەت مادام کەوتۆتە حەیزەوەو باڵغ بووە باشتر وایە لە نوێژدا بە دوو یان سێ پارچە پۆشاك خۆی داپۆشێت: سەرپۆشێکی گەورە کە نێوان شانەکانی داپۆشێت، کراسێکی تری ئاودامان کە لە شانیەوە تا پێیەکانی بگرێتەوە، ئەگەر نا تەنوورەیەکی درێژ کە لە خوار سنگیەوە گرتبێتیەوە تا قولەپێی بەو مەرجەی سەرپۆشەکەی بەسەر تەنوورەکەدا بێتەوە (وەك ئەوەی درێژ بێت تا سەر ناوکی).. وەك ئەو جلەنوێژەی ئێستا لە ناو ئافرەتی موسوڵماندا باوە کە دوو پارچەیەو ئاسان و حازر بەدەستە: سەرپۆشێکی درێژە تا پشتێنەو تەنورەیەکیش لە سەروو پشتێنەوەیە تا سەر پێیەکانی.. ئیمامی شافیعی دەیفەرموو: شەرعناسان بە گشتی لەسەر ئەوەن کە دەبێت ئافرەت لە نوێژیدا لانی

---

[١] الام (٧٧/١).
[٢] مجموع الفتاوى (١٣٣/٢٢).

کـەم سـەرپۆش و جبـە بپۆشـێت[١]، لـەوانیش زیـاتر بپۆشـێت باشـترە.. ئەگـەر بـاڵغ نـەبووبوو دەتوانێـت بـێ سەرپۆشـیش نوێژەکـەی بکـات.. عبدالرزاق لە ئیبنو جورەیجەوە دەگێڕێتەوە کە لە عەتائی کوڕی ئـەبو رەباح کە گەورەترین شەرعناسی مەککە بوو پرسی: ئەو کچەی هێشتا نەکەوتۆتە حەیزەوە مەرجە سەرپۆش بۆ نوێـژ بپۆشـێت؟! فـەرمووی: نا، پۆشاکەکەی بەسە[٢]..

### هەر کەس لە نوێژدا عەورەتی دەرکەوێت، نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە:

جمهوری شەرعناسـان لەسـەر ئـەوەن کـە هـەر کەسـێك لـە ناکـاوو بـێ ئاگایانـــەش لـــە نوێـــژدا عـــەورەتی دەرکـــەوێت، ئەگـــەر دەســـبەجێ داینەپۆشێتەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە..

حەنەفیەکان فەرموویانە: ئەگەر چارەکێکی عەورەتی دەرکەوت ئینجا نوێژەکـەی بەتاڵـە[١]، حەنبەلیـەکان دەڵـێن: ئەگـەر بـۆ ماوەیـەکی کـەم عـەورەتی دەرکـەوێت زیـانی بـۆ نوێژەکـەی نیـە، وەکـو کەسـێك کـە بـا کراسـەکەی هەڵداتـەوە یـان سەرپۆشـەکەی لادات، بـەڵام ئەگـەر کـەمێك عـەورەتی دەرکـەوت بۆماوەیـەکی زۆریـش بێـت زیـانی نابێـت[٢].. چـونکە

---

[١] بە عەرەبی پێیان ووتراوە: الدرع و الخمار، الدرع: وەکو کراسی کوردی یان ماکسی کە ئاودامانە لە شانەوەیە تا قولەپێ.. الخمار: سەرپۆشێکی گەورەیە کە چاڵ و چۆڵی ناو شان و سینەی ئافرەتانی دادەپۆشی.. ئافرەتی وا هەبووە لەسەر ئەمانەوە جلبابی بەکار هێناوە کە وەکو عەبا یان شاڵی سودانی و سۆماڵی لە خۆیەوە پێچاوە.. ئەممەیە کە لە ریوایەتی سەحیحدا لە سەیدنا عومەرو ئیبنو عومەرو ئیبنو سیریین و تابعینی ترەوە هاتووە کە: ئافرەت بە سێ پۆشاکەوە نوێژ دەکات: درع و خمار و جلباب..

[٢] عبدالرزاق: المصنف (١١٣/٣).

[١] ابن عابدین (٢٧٣/١)، المواهب (٤٩٨/١)، المجموع (١٦٦/٣)..

[٢] کشاف القناع (٢٦٩/١).

سەیدنا عەمری کوڕی سەلەمە خوا لێی رازی بێت دەڵێ: (عَنْ عَمْرِو بْنِ سَلَمَةَ الْجَرْمِيِّ قَالَ :انْطَلَقَ أَبِي وَافِدًا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم فِي نَفَرٍ مِنْ قَوْمِهِ , فَعَلَّمَهُمْ الصَّلَاةَ، وَقَالَ: يَؤُمُّكُمْ أَقْرَؤُكُمْ .فَكُنْتُ أَقْرَأَهُمْ فَقَدَّمُونِي، فَكُنْتُ أَؤُمُّهُمْ وَعَلَيَّ بُرْدَةٌ لِي صَفْرَاءُ صَغِيرَةٌ، وَكُنْتُ إِذَا سَجَدْتُ انْكَشَفَتْ عَنِّي ,فَقَالَتْ امْرَأَةٌ مِنْ النِّسَاءِ: وَارُوا عَنَّا عَوْرَةَ قَارِئِكُمْ. فَاشْتَرَوْا لِي قَمِيصًا عُمَانِيًّا ، فَمَا فَرِحْتُ بِشَيْءٍ بَعْدَ الإِسْلامِ فَرَحِي بِهِ.)[1] واتە: لەگەڵ باوکم و پیاوماقوڵانی خزمماندا وەکو وەفدی هۆزەکەمان چووینە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، فێری نوێژی کردن، پاشان فەرمووی: ئەو کەسەتان کە زیاتر قورئانی لەبەرە ببێتە پێشنوێژتان، منیش دەنگم خۆش بوو، قورئانم زیاتر لەوانی تر لەبەر بوو، بۆیە کردیانم بە پێشنوێژ، کە پێشیان خستم، عەبایەکی زەردی کورتم لەبەردا بوو، کە دەچوومە سوجدە لەسەرم لادەچوو گیانم دەردەکەوت، ژنێك لە ژنەکان هاواری کرد: عەورەتی قورئان خوێنەکەتانمان لێ داپۆشن، ئیتر کراسێکی عومانییان بۆ کڕیم کە لە دوای ئیسلامەتی هیچ شتێك نەبوو ئەوەندەی ئەو عەبایە خۆشحاڵم کات..

راستتر ئەوەیە کە هەر کەسێك لە نوێژدا عەورەتی دەرکەوت دەبێ دەسبەجێ دایپۆشێتەوە، ئەگینا نوێژەکەی بەتاڵە.. والله اعلم.

---

[1] بوخاری (٤٣٠٢)، ئەبوداوود (٥٨٥) لەفزکەش هی ئەمە..

## نوێژ بە رووت و قووتی:

جمهوری شەرعناسان لەسەر ئەوە کۆن کە هەر کەسێك پۆشاکی دەست نەکەوێت نوێژەکەی پێوە بکات، نوێژەکەی لەسەر لاناچێت.. بەڵام لە چۆنیەتی نوێژەکەیدا راجوێن:

- جمهور دەڵێن: ئەگەر کابرا پۆشاکی پیس یان حەریری دەسکەوت کە حەرامە دەیپۆشێت ونوێژەکەی پێوە دەکات، ئەگەر هیچی دەستنەکەوت، نوێژەکەی بە رووت و قووتی دەکات، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ﴾ التغابن / ١٦ واتە: ئەوەندەی بۆتان دەکرێت تەقواو دینداریتی بکەن..

- حەنەفی و حەنبەلیەکان دەڵێن: کابرا بۆ نوێژەکەی سەرپشکە کە بە پێوە بیکات، یان بە دانیشتنانەوە.. هەردووڵاشیان پێیان پەسەندترە کە لە جیاتی رکوع و سجود بە سەری ئاماژە بکات چونکە وا مەستوورترە. ئەمەش زیاتر لەگەڵ هەڵوێستە خواپەرستیەکەدا دەگونجێت وەك لەوەی مالکیەکان وشافیعیەکان دەڵێن: بۆی نیە دانیشێت.

پاشان موناقەشەی ئەوەیان کردووە کە ئایا دواتر ئەگەر پۆشاکی دەسکەوت نوێژەکەی دەگێرێتەوە یان نا؟! شافیعیەکان و حەنبەلیەکان دەڵێن: نا نایگێرێتەوە.. ئەمەش پەسەندترە.. والله اعلم.

## خۆ جوان کردن و خۆ رازاندنەوە بۆ نوێژ کردن:

نوێژ بە یەك پارچە پۆشاکەوە جائیزە بکرێت، بەڵام باشتر وایە موسوڵمان ئەگەر هەیبێت زیاتر لە یەك پۆشاك بپۆشێت، سووننەتە جوانپۆش بێ وباش خۆی برازێنێتەوە بە تایبەتی کە بۆ مزگەوت و

جومعـەو جەماعـەت دەچێت. چـونکە خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٍ﴾ الاعـراف/٣١ واتـە: ئـەی نـەوەی ئـادەم، لـە هـەموو مزگەوتێکـدا جـوان بپۆشـن و رازاوەییتـان پێـوە دیـار بێـت.. سـەیدنا ئیبنوعومـەر خـوا لێی رازی بێت دەیفـەرموو: (إذا صَلّى أحَدُكُمْ فَلْيَلْبسْ ثوبَيهِ، فإنَّ اللهَ أحقُّ مَنْ تزَيّنْ لَهُ..)[١]. واته: هەر کەسێکتان نوێـژی کـرد بـا هـەردوو پارچـە پۆشـاکەکەی بپۆشـێت، خـوای گـەورە شـایانترە خـۆی بـۆ برازێننەوە..

## نوێژ بە پۆشاکی زەوت کراوو لەسەر زەوی زەوت کراو:

شەرعناسان لە حوکمی ئەمەو هاوشێوەکانیدا دوو بۆچوونن:

**ـ نوێـژ بـە پۆشـاکی زەوتکـراو، یـان لەسـەر خـاکی زەوتکـراو جائیـز نیـە:** ئەمە رای ئیمامی ئەحمەدو ئیبنوحەزمەو ئیبنوتەیمییە بە پەسـەندتری زانیـووە[٢]. بەڵگەشـیان ئەوەیـە کـە پۆشـاك بەشـێکە لـە ئەنجامدانی نوێژەکەو لێی نابێتەوە بۆیە مەرجە کە بپۆشرێت و حـەڵاڵ بێت، پۆشاك وەکو قاپێکی زێڕین نیە کە کابرا دەسـتنوێژی تێـدا گرتبێـت و نوێـژی کردبێـت، چـونکە قاپەکـە بەشـێك نیـە لـە نوێژەکـە پۆشاکەکە بەشێکە لێی..

**ـ نوێـژ بـە پۆشـاکی زەوت کـراو، یـان لەسـەر خـاکی زەوت کـراو جـائیزە:** ئەمـە رای ئیمـامی ئـەبو حەنیفـەو ئیمـامی مالیـك و ئیمامی شافیعیە[١] کە فەرموویانە نوێژەکەی قبووڵە ئەگەرچی بـە کـردەوە

---

[١] بەیهیقی (٢/٢٣٦)، المجموع (٢/٥٤)

[٢] الانصاف (١/١٩٤)، المحلى (٤/٣٣)، مجموع الفتاوى (٢١/٨٩).

[١] المجموع (٣/١٨٠)، المبسوط (١/٢٠٦)، نيل الاوطار (٢/٩٢).

ناڕەواكەی گوناحبار بووە.. بەڵگەشیان ئەوەیە كە خودی زەوت كردن حەرامە نەك نوێژ كردن بە پۆشاكی زەوت كراوەوە، یان نوێژكردن لەسەر زەوی زەوت كراو. ئەمەش بە پێی ئەو ڕێسا ئوسوڵیەیە كە دەڵێ: (قاعدة انْفِكاكِ الجِهَةِ) واتە هەڵاوێردنی لایەنەكان..

ئەوەی ئەم بۆچوونە بەهێزتر دەكات فەرموودەكەی عوقبەی كوڕی عامرە كە دەڵێ: (عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ أُهْدِيَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرُّوجُ حَرِيرٍ فَلَبِسَهُ فَصَلَّى فِيهِ ثُمَّ انْصَرَفَ فَنَزَعَهُ نَزْعًا شَدِيدًا كَالْكَارِهِ لَهُ وَقَالَ لَا يَنْبَغِي هَذَا لِلْمُتَّقِينَ)[١] واتە: پۆشاكێكی حەریریان پێشكەش بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم كرد، ئەویش لەبەری كردو نوێژی پێوە كرد، پاشان تەشریفی برد.. دوای كەمێك زۆر بە خێرایی دایكەندو وەكو شتێكی بێزراو لە خۆی دوورخستەوەو فەرمووی: ئەمە بۆ دینداران ناشێت.. یەكەمجار كە لەبەری كرد هێشتا حەرام نەكرابوو، بەڵام دوای لەبەر كردنەكەی جوبرەئیل پێی فەرموو كە حەریرپۆشین بۆ پیاوی موسوڵمان حەرامە.. ئەمەش حوكمێكە ناو نوێژو دەرەوەی نوێژەكە دەگرێتەوە.. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەو نوێژەی نەكردەوە كە پێوەی كردبوو.. كەوابوو قبووڵ بوونی نوێژ پەیوەندی بە پۆشاكی حەرامەوە (لەوانە زەوت كراو) نیە..

---

[١] بوخاری (٣٧٥)، موسلیم (٣٠٧٥).

## نوێژ بە نەعل و پێڵاوەوە:

جائیزە، چونکە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بـە پێـی پـەتی و بە نەعل و پێڵاوەوە نوێژی کردووە:

ـ لـەو کاتـەی کـە پێغەمبـەری خـوا صلـی الله علیـە وسـلم بـە پـێڵاوەوە پێشنوێژی بۆ یاوەرانی دەکرد، جوبرەئیلی بەڕێز سـەلامی خـوای لـێ بێـت هەواڵی دایە کە نەعلـەکانی پیسـاییان پێوەیـە، پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیه وسلم هـەردوو جووتـە نەعلەکـەی لـە پـێ دانـا (أنَّـهُ صَلَّى فِي نَعْلِهِ، وَصَلَّى أَصْحَابُهُ فِي نِعَالِهِمْ، فَخَلَعَ نَعْلَيْهِ، فَخَلَعُـوا نِعَـالَهُمْ، فَلَمَّـا سَـلَّمَ قَـالَ: لِـمَ خَلَعْتُمْ نِعَالَكُمْ؟ قَالُوا: رَأَيْنَاكَ خَلَعْتَ نَعْلَيْكَ فَخَلَعْنَا نِعَالَنَا، فَقَالَ: إنَّ جبْرِيـلَ أَتَانِي فَأَخْبَرَنِي أَنَّ فِيهِمَا أَذَى)[١] واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسـلم بە نەعلەکانیەوە نوێژی کرد، یاوەرانیش لە دوایەوە بـە نەعەلەکانیانـەوە نوێـژیان دابەسـت،، لـە نوێژەکـەدا پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم نەعلـەکانی دانـا، یـاوەرانیش لـە دوایـەوە نەعلـەکانیان دانـا، کـە سـەلامی (کۆتـایی نوێـژی) دایـەوە پێـی فـەرموون: بۆچـی نەعلـەکانتان لـە پـێ کردەوە؟! فەرموویان: دیمان جـەنابت نەعلـەکانت دانـا، ئێمـەش دامانـنـان، فەرمووی: جوبرەئیل هـات و هـەواڵی دامـێ کـە نەعلـەکان پیسـییان پێـوە بوو..

نوێژ بە پێڵاوەوە یەکێکە لە جیاوازی نێوان جولەکەو موسوڵمان:

ـ (خَـالِفُوا الْيَهُـودَ فَـإِنَّهُمْ لَـا يُصَـلُّونَ فِـي نِعَـالِهِمْ وَلَـا خِفَـافِهِمْ )[١] واتـە:

---

[١] الألبانی: ارواء الغليل (٢٨٤).

[١] البزار: الزوائد (٥٣) حاکم بە سەحیحی داناوەو زەهەبیش لایەنگری بووە، شێخی ئەلبانی دوای توێژینەوەیەکی زۆری سەنەدەکانی لە أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه وسلم (ل٥٤) ، صحيح الجامع (٣٢١٠) دا بە سەحیحی ناساندووە..

پێچەوانەی جولەكە بكەن، ئەوان نوێژ بە نەعل و خوففەوە ناكەن..

ئەگەر نوێژی جومعەو جەماعەت بوو، یان هەر نوێژێكی تر بوو، لە قەرەباڵغیدا بوو، لە دەشت بوو نەك لە مزگەوتێك كە رایەخی تێدا بێت باشتر وایە هەر بە پێڵاوەكانیەوە بیكات، ئەگەر دایان نابێت بیخاتە لای راستی خۆیەوە، یان لەپێش خۆی داینێت، یان لای چەپی خۆی، چونكە چەپی خۆی بووە بە لای راستی كەسانی تر، بۆیە دەبێت بیخاتە نێوان پێی خۆیەوە.. ئەگەر تەنها بوو، لە دەشت دەیخاتە لای چەپی خۆیەوە:

ـ (إذا صَلَى أحَدُكُمْ فَلْيَلْبسْ نَعْلَيهِ أو لِيَخْلَعْهُمَا بَينَ رِجْلَيهِ وَلا يُؤَذِي بهِمَا غَيرَهُ)[١] واتە: ئەگەر كەسێكتان نوێژی كرد با نەعل (پێڵاو) ەكانی هەر لە پێدابن، یان با دایاننێت وبیانخاتە مابێنی پێی خۆیەوە، تا كەسیان پێ ئیزعاج نەكات.

ئەو رەفەو سندووقانەی ئێستا لە مزگەوتە راقیەكانی هەندێك وولاتی وەكو توركیاو ئێران و مالیزیایدا بۆ پێڵاو دەیكەن، كارێكی زۆر باشە، هەر كەس پێڵاوی خۆی دەخاتە سندووقێكەوەو كلیلەكەی پێ دەبێت تا تەواو دەبێت، یان بۆی پارێزگاری دەكەن.. دەشێت لە جیاتی ئەمەش بە تایبەتی لەو مزگەوتانەدا كە لەناو جەرگەی بازاڕەكاندان، هەر كەس پێڵاوی خۆی بخاتە كیسەیەكی نایلۆنەوەو لە نێوان پێی خۆیدا داینێت، تا بێ خەیاڵ لێیان نوێژی خۆی بكات..

★ ★ ★

---

[١] ریوایەتی سەحیحی زۆرە لای نەسائی وئەبوداوودو ئیبنوخوزەیمە (٣/١١٠/١) شێخی ئەلبانی دەفەرموێ سەنەدەكانیان سەحیحە.. الالباني: صحيح الجامع (٦٥٣).

## مەرجی چوارەم : رووکردنە قیبلە

بە کۆڕای شەرعناسان ئەمیش مەرجی نوێژە، هەرچەندە وەکو شێخی ئــەلبانی دەڵــێ: ئەمــە شــتێکی بنــبڕە، ئەوەنــدەی فــەرمووده لەســەر گێڕراوەتەوە، کە هی ئەوە نەماوە توێژینەوە لەسەر بەڵگەکانی بکرێت بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا باشترە هەندێك بەڵگە بهێنینەوە:

١ ــ خــوای گــەورە دەفــەرموێ: ( قَدۡ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجۡهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبۡلَةٗ تَرۡضَىٰهَاۚ فَوَلِّ وَجۡهَكَ شَطۡرَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ ) البقــــرة/١٤٤
واتــە: دەبیــنین وا چــاو لــە ئاسمــان دەبڕیــت (چــاوەڕوانیت رووت بکەینــەوە کەعبــە) رووت دەکەینــەوە قیبلەیــەك کــە پێــی رازیــت و دڵــت پێوەیــەتی، دەیسا روو بکــەرە مزگــەوتی حــەرام ، کەعبەکــەی خوای گەورە ..

٢ ـ سەیدنا ئیبنو عومەر خوا لێیان رازی بێت فەرمووی: (قَـالَ بَيْنَمَا النَّاسُ بِقُبَاءَ فِي صَلَاةِ الصُّبْحِ جَاءَهُمْ آتٍ فَقَالَ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ أُنْزِلَ عَلَيْهِ اللَّيْلَةَ قُرْآنٌ وَقَدْ أُمِـرَ أَنْ يَسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةَ فَاسْتَقْبِلُوهَا وَكَانَتْ وُجُوهُهُمْ إِلَى الشَّامِ فَاسْتَدَارُوا إِلَـى الْكَعْبَـةِ )[1]
واتە: لەو کاتەی خەڵکی لە مزگەوتی قیبا لە نوێژی سپێدەدا بوون، کابرایەك هات و پێی ووتن: ئەمشەو وەحی بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دابەزیووەو فەرمانی پێکردووە کە لەمەودوا روو بکەنە کەعبە، خەڵکەکە ـ کە روویان لە شام بوو ـ یەکسەر هەر لە نوێژەکەدا روویان بەرەو کەعبە وەرگێڕا..

---

[1] بوخاری (٤٤٩١)، موسلیم (٥٢٦)، نەسائی (٦١/٢).

٣ ــ فـەرموودەی کـابرای خـاوەن نوێژهەڵـە کـە نوێژەکـەی بـە ناتـەواوی کـردو پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليـە وسـلم پێـی دەفـەرموو: نوێژەکـەت نـەکردووە! کـە بـە فـەرموودەی خـاوەن نوێژهەڵە (المسئ صلاته)[١] بەناوبانگە کە فەرمانی پێ دەکات روو بکاتە قیبلە: (إذَا قُمْتَ الَى الصَّلَاةِ فأسْبغ الوُضُوءَ، ثمَّ اسْتَقْبلْ الْقِبْلَـةَ، فَكَبِّرْ)[٢] واتە: کـە هەسـتایت بـۆ نوێـژ، دەسـتنوێژت بـە چاکی بگـرە، پاشان روو بکەرە قیبلەو تەکبیرەی ئیحرام بکەو نوێژ دابەستە..

## نوێژی سووننەت بە سەر سوارییەوە:

ئەگـەر بەسـەر سـوارییەوە بـوو، وویسـتی نوێـژی سـووننەت بکـات، رووشی لە قیبلە نەبێت قەیدی نیـە، چونکە پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليە وسلم کە لە سەفەردا دەبوو زۆر جار سوننەتەکان و وتـری بەسـواری وولاخەکەیەوە دەکرد، چەندین فەرموودە لەو بارەوە هاتوون:

١ ـ فـەرموودەی سـەیدنا ئیبنـو عومـەر خـوا لێـی رازی بێـت کـە: (كَانَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ يُسَبِّحُ عَلَى الرَّاحِلَةِ قِبَلَ أيَّ وَجْهٍ توَجَّهَ، وَيُوتِرُ عَلَيهَا غَيرَ أنَّه لا يُصَلِّي عَلَيهَا الْمَكْتوبَـةِ)[٣] پێغەمبـەری

---

[١] شێخی ئەلبانی لە الارواء (٢٨٩) دا بە سەحیحی ناساندووە، بۆ زیاتر بڕوانە: پەراوێزی ٧٤ و ٧٥..

[٢] بەشێکە لە فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کە سەیدنا ئەبو هورەیرە خوا لێی رازی بێت دەیگێڕێتەوە، شێخی ئەلبانی وەکو بوخاری (٣١/١١، ٤٦٧) و موسلیم (١٠/٢) بە سەحیحی ناساندووە لە أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٥٥/١) و ارواء الغليل (٢٨٩).

[٣] بوخاری (٤٦٠/٢)، موسلیم (١٥٠/٢)، ئەبوداوود (١٩٠/١)، نەسائی (٨٥/١)، بەیهیقی (٤٩١/٢)، تەحاوی (٢٤٩/١)..

خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی سوننەتی (مەبەست لە شەونوێژە)[1] لەسەر سوارییەكە دەكرد، رووی لە هەر كوێیەك بوایە پێی ئاسایی بوو، نوێژی وتریشی بەسەر سوارییەكەیەوە دەكرد، بەڵام نوێژی فەرزی بەسەرەوە نەدەكرد..

ئیمامی نەوەوی لە شەرحی سەحیحی موسلیمدا دەڵێ: جمهوری شەرعناسان، ئیمامی مالیك و شافیعی و ئەحمەدو شەرعناسانی تر فەرموویانە نوێژی وتر بەسەر سوارییشەوە دەكرێت..

ئیبنو بەتتاڵی ئەندەلوسی شاریحی سەحیحی بوخاری دەڵێ[2]: شەرعناسان لەسەر ئەوە كۆن كە كەس بۆی نیە بەسەر سوارییەوە بێت و نوێژی فەرز بكات، مەگەر لە گەرمەی جەنگدا بێت كە بۆی هەیە نوێژی ترس بە سوارییەوە بكات..

٢ ـ فەرموودەی سەیدنا ئیبنو عومەر خوا لێی رازی بێت كە باسی نوێژی جەنگاوەرانی لە گەرمەی جەنگدا كردووە، كە فەرموویەتی: ئەگەر (لە كاتی شەڕو پێكدادانـدا) ترس و بیمی جەنگاوەران زۆر بوو، بۆیان هەیە بە پیادەیی نوێژەكەیان بكەن یان بە سواری، روو لە قیبلە یان لە غەیری قیبلە[3].

---

[1] الالباني: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم صلى الله عليه وسلم (٦٠/١).

[2] أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٦٦/١).

[3] موسلیم (٢١٢/٢)، ئیمامی مالیك له الموطأ (١٩٣/١)، له رێی ئەویشەوە ئیمامی بوخاری (١٦١/٨)، ئیمامی شافیعی له الأم (٨٣/١)، بەیهیقیش لەوەوە (٨/٢)، نافیعی خزمەتكاری ئیبنو عومەر دەفەرموێ: وا دەزانم كە لە فەرموودەیەو لە پێغەمبەری خواوەی صلى الله عليه وسلم ریوایەت كردووە، ئیبنو خوزەیمە دەفەرموێ: گومانی تێدا نیە كە وایە (التلخیص (٢٠٩/٣)، شێخی ئەلبانی لە دوای توێژینەوەی لە ارواء الغلیل (٥٨٨) دا بە سەحیحی ناساندووە..

٣ ـ لە ریوایەتێكی تردا دەڵێ: (كَانَ يُصَلِّي عَلَى رَاحِلَتِهِ فِي السَّفَرِ حَيْثمَا تَوَجَّهَتْ بِهِ)[١] واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی لەسەر سوارییەكەی دەكرد، رووی بۆ هەر شوێنێك پێ بكردایە..

٤ـ ریوایەتەكەی سەعیدی كوڕی یەسار كە دەڵێ: (رَأَيْتُ رَسولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي عَلَى حِمَارٍ وهُوَ مُتوَجِّهٌ الَى خَيْبَرَ)[٢] واتە: پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینی بەسەر گوێدرێژێكەوە بوو، نوێژی دەكردو رووشی لە خەیبەر بوو..

٥ ـ ریوایەتەكەی سەیدنا جابری كوڕی عبدالله خوا لێیان رازی بێ كە دەڵێ: (رَأَيْتُ النَّبيَّ فِي غَزْوَةِ أنْمَارٍ يُصَلِّي عَلَى رَاحِلَتِهِ مُتوَجِّهَاً قِبَلَ الْمَشْرِقِ تطوُّعَاً)[٣] واتە: پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم لە غەزای ئەنماردا بینی بەسەر سوارییەكەوە نوێژی سوونەتی رووەو رۆژهەڵات دەكرد..

سوونەتە ئەگەر بۆی كرا لەو كاتەی نوێژی سوونەت بەسەر سوارییەوە دەكات، رووی پێ بكاتە قیبلەو نییەت بهێنێت، ئیتر ئەگەر سوارییەكە رووی پێ وەرگێڕا بۆ لای تر، كاریگەریی نیە..

---

[١] بوخاری (٤٥٩/٢)، ترمزی (١٨٣/٢)، ئەحمەد (٦٦/٢)، ریوایەتێكی تری ئیمامی بوخاری زیادەیەكی هەیە: (وَيُومِئُ إيمَاءً) واتە ئاماژەی دەكرد..مەبەست لەوەیە كە بۆ سوجدە سەری زیاتر نزمتر دەكرد وەك لە ئاستی ركووعی: (وَيَجْعَلُ السُّجُودَ أخْفَضَ مِنْ الرُّكُوعِ) ئەحمەد (٢٠٢) بەیهیقی) ٤/٢.. ئەلبانی: أصل صفة الصلاة (٥٩/١)..

[٢] مالك (٣٦٥/١)، نەسائی (١٢١/١)، لە ریوایەتێكی تریشدا (قِبَلَ المَشرقِ تطوُّعاً) واتە رووی لە رۆژهەڵات بوو، نوێژی سوننەتیشی دەكرد. الالبانی: أصل صفة الصلاة (٥٩/١).

[٣] بوخاری (٣٤٦/٧)، بەیهیقی (٤/٢) ئیمامی شافیعی (٨٤/١) ئیمامی ئەحمەد (٣٣٢/٢) لە سوفیانی سەورەیەوە گێڕاویێتیەوە..

٦ ـ سەیدنا ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی رازی بێت فەرمووی: (إذَا أرَادَ أنْ يَتطوَّعَ عَلَى نَاقتِهِ اسْتقْبَلَ بهَا الْقِبْلَةَ فكَبَّرَ ثمَّ صَلَّى حَيْثُ وَجَّهَهُ رِكَابُهُ)[١] واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە دەیوویست نوێژی سوونەت لەسەر حوشترەکەی بکات، ڕووی پێ دەکردە قیبلەو نییەتەکەی دەهێناو دەچووە نوێژەکەوە ئیتر با سوارییەکە بۆ هەر لایەکی کە دەوویست بیبردایە.. ئیمامی نەوەوی دەڵێ: لەمەوە شافیعیەکان روو کردنە قیبلەیان لە نوێژی سوونەتدا لەسەر سواریی بە فەرز داناوەبەڵام هەر خۆشی دەڵێ: ئەوە لە کاتێکدایە کە وەستابێت و رووکردنە قیبلەی ئاسان بێت[٢] .. شەرعناسانی تر رەتیان کردۆتەوە کە فەرز بێت..

ئیمامی ئەبو حەنیفە دەڵێ: نابێت نوێژی ووتر بەسەر سوارییەوە بکرێت.. تەحاوی دەڵێ: جگە لەوەی ئەو فەرموودانەی رێیان بە کردنی نوێژی ووتر بەسەر سوارییەوە داوە، نەسخ بوونەتەوە، بەڵگەشیان:

١ـ سەیدنا جابری کوڕی عبداللە خوا لێی رازی بێت کە دەڵێ: (وَكَانَ إذَا أرَادَ أنْ يُصَلِّيَ الْفَرِيضَةَ، نَزَلَ فَاسْتقْبَلَ الْقِبْلَةَ)[٣] واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە بە سواری سوارییەکەوە

---

[١] ئەبو داوود (١٩١/١)، ئیبنو حیببان لە کتێبی: الثقات (١٤/٤)، دارەقوتنی (١٥٢)، بەیهیقی (٥/٢) ئیمامی ئەحمەد (٢٠٣/٣)، ئەلبانی دەفەرموێ: سەنەدەکەی وەکو نەوەوی لە (المجموع (٢٣٤/٣) و حافز ئیبنوحەجەری عەسقەلانی لە بلوغ المرام (١٨٩/١) و ئیبنوسسەکەن وەکو لە:التلخيص (٢١٣/٣) دا هاتووە، فەرموویانە: سەحیحە، بە زەعیف دانانەکەی ئیبنول قەییمیش رەت دەکاتەوە کە لە زاد المعاددا بە زەعیفی داناوە..

[٢] ئیمامی نەوەوی: المجموع (٢٣٤/٣).

[٣] بوخاری (٤٠٠/١)، ئیمامی ئەحمەد (٣٠٥/٣)، بەیهیقی (٦/٢)، داریمی (٣٥٦/١).

دەبـوو، دەیوویسـت نوێـژی فـەرز بکـات، دادەبـەزی و رووی دەکـردە قیبلە.

٢ ـ هەر لـە ریوایەتیـەتێکی تـری سـەیدنا جابردا خـوا لێـی رازی بێت دەڵێ: (كَـانَ رَسُـولُ اللهِ صَلَّـى اللهُ عَلَيـهِ وَسَلَّم عَلَـى رَاحِلَتِـهِ نَحْـوَ الْمَشْرِقِ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يُصَلِّيَ الْمَكْتُوبَـةَ، نَـزَلَ فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَـةَ)[1] واتـە: پێغەمبەری خـوا صلی الله علیـه وسلم بـە سـەر سوارییەوە روو لـە رۆژهەڵات بوو، کە وویستی نوێژی فەرزەکەی بکات، دابـەزی و رووی لە قیبلە کردو کردی..

ئەمـە بەسـەر سـواریی ووڵاخ و حوشـترو گیانلەبـەری تـرەوە، ئـەمما ئەگەر سوارییەکەی سەیارە بوو ئەوە بێ گومان ناتوانێت لەو سەر جادەیە رووی بکاتـە قیبلـەو پاشـان راسـتی کاتـەوەو لێخورێـت، ئەگـەر لـە پـاس و شەمەندەفەرو کەشتی و فرۆکەشدا بوو، ئەوە روو بکاتە هـەر ئاراسـتەیەك دەشـێت، چـونکە خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿فَأَيۡنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجۡهُ ٱللَّهِۚ﴾ البقرة/١١٥ واتە: لە هەر کوێ بـن و رووتـان لـە هـەر کوێیـەك بێـت، خـوای گەورەش لەوێوەیە..

١ـ فـەرموودەش هەیـە کـە نـافیع لـە ئیبنـو عومـەرەوە ریوایـەتی کردووە کە فەرموویەتی: (كَانَ يُصَلِّي عَلَـى رَاحِلَتِـهِ وَيُـوتِر بـالأَرْضِ)[2] واتە سەیدنا ئیبنـو عومـەر خـوا لێـی رازی بێـت نوێـژی سوونـنەتی لەسـەر سوارییەکەی دەکـردو بـۆ نوێـژی وترەکـەی دادەبەزیـە سـەر زەوی دەیکـرد.. شـێخی ئـەلبانی دەربـارەی ئـەم ریوایەتـە دەڵـێ

---

[1] سەرچاوەکانی پێشوو لە: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٦٠/١).
[2] الطحاوي (٢٤٩/١).

ســەحیحە.. بــەڵام دەربــارەی دەڵــێ: نەســخ بوونەوەکــە، وا نیــەو ئەمەش رێ لە جائیز بوونی نوێژی وتر ناگرێت بەسەر سوارییەوە، چونکە ئەوە سەلمێنراوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی ووتری لەسەر سوارییش کردووەو لەسەر زەویش کردوێتی[1] .. بۆیە من پێم وایە هەموو جۆری نوێژە سوننەتەکان دەشێت لەسەر سوارییەوە بکرێت.. والله اعلم.

**رووکردنە قیبلە دوو جۆرە:**

. **ئەو کەسەی چاوی لە کەعبەیە:** دەبێت بە تەواوی رووی لەوێ بێت، ئەگەر لە ناو حەرەمی کەعبەشدا بوو دەشێت روو بکاتە هەر لایەکی..

. **ئەو کەسەی کەعبە نابینێت و رووی تێکردووە:** فەرزە روو بکاتە ئەو ئاست وئاراستەی کە پێی وایە قیبلە لەویوەیە، چونکە ناتوانێت بە دیققەت لەسەر ئەو هێڵە بێت کە راستی کەعبەیە!! بۆیە هەر رووی لەو لایەوە بێت تەواوە، نابینیت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە دەست بەئاو گەیاندندا بەرهەڵستی لەوە کرد روو یان پشت بکرێتە قیبلە، وەك دەیفەرموو: (إذَا أَتَيْتُمْ الغَائِطَ فَلَا تَسْتَقْبِلُوا الْقِبْلَةَ وَلا تَسْتَدْبِرُوهَا، وَلَكِنْ شَرِّقُوا أو غَرِّبُوا)[2] واتە: ئەگەر چوونە دەست بەئاو گەیاندن، نە روو لە قیبلە کەن نە پشت، روو لە رۆژهەڵات یان رۆژئاوا بکەن..

---

[1] الالباني: أصل صفة الصلاة (٦٢/١).

[2] بوخاری (٣٩٤)، موسلیم (٢٦٤)، ئەوانی تریش..

دانیشتوانی هەموو ناوچەیەك ئاڕاستەی قیبلەی خۆی دیاری كردووە لە كوردستانی باشوور دەوترێت خۆرهەلآت بخەرە دەستی چەپت و روو لە باشووركە! ئەوانەی دەچنە مزگەوتەوە دەسبەجێ ئاڕاستەی قیبلە بە میحرابەكەدا دەزانن.. لەم سەردەمەشدا قیبلەنوما ئاسان ئاڕاستەی قیبلە دەدۆزێتەوە لەویش ئاسانتر دۆزینەوەیەتی بەئینتەرنێت كە لێی بێ خەمیت لارو وێری تێدا ناكات و زۆر بە دیققەتە!

## ئەو حاڵەتانەی بێ رووكردنە قیبلە نوێژ دەكرێت:

رووكردنە قیبلە مەرجێكی نوێژە، بەلآم ئەم مەرجە لە هەندێك حاڵەتدا دەشێت نەمێنێت، وەك:

١ . **ئەو كاتەی ناتوانێت روو بكاتە قیبلە:** وەكو نەخۆشێك كە نە خۆی دەتوانێت روو بكاتە قیبلە، نە كەسیشی لە لایە تا رووی پێ وەرگێڕێت، یان زیندانەو بەستراوەتەوە، ئەمە خاوەن عوزرەو بۆی هەیە بێ رووكردنە قیبلە نوێژەكەی بكات.. چونكە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ﴾ التغابن/١٦ واتە: ئەوەندەی بۆتان دەكرێت تەقواو دینداریێتی بكەن.. یان: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَا﴾ البقرە / ٢٨٦ واتە: خوای گەورە ئەرك بە قەدەر توانا فەرز دەكات..

٢ . **ئەوی نەیدەزانی ئاڕاستەی قیبلە لە كوێوەیە:** دوای ئەوەی هەوڵی دا زانیاری خۆی و دەوروبەری بخاتە كار بەلآم هەر بۆی روون نەبۆوە ئاڕاستەی قیبلە لە كوێوەیە، بۆی هەیە رووەو ئەو لایەی كە گومانی زیاتر بۆی دەچێت كە قیبلە لەوێوەیە نوێژەكەی

دابەسـتێت، ئەگـەر لـە نـاو نوێژەکـەدا غایلـەی کـرد کـە قیبلـە لـە ئاڕاسـتەیەکی تـرە دەبێـت بـۆ ئـەو لایـەی دووەمـی بسـوڕێت، چـونکە یاوەرانی بەڕێز کە هەواڵیان پێدرا ئاڕاستەی قیبلـە لـە شـامەوە گۆڕاوە بۆ کەعبە، دەسبەجێ لە ناو نوێژەکەشدا بوون (فَاسْتَدَارُوا إِلَى الْكَعْبَـةِ)[1] یەکسەر هەر لە نوێژەکەدا روویان بەرەو کەعبە وەرگێڕا..

ئەگەر دوای نوێژەکە زانی کە بە هەڵە رووی لە لایەکی تری کردووە، نوێژەکەی تەواوەو پێویست ناکات بیکاتەوە.. چونکە سەیدنا عامری کوڕی رەبیعە خوا لێی رازی بێت فەرمووی: (كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي لَيْلَةٍ مُظْلِمَةٍ فَلَمْ نَدْرِ أَيْنَ الْقِبْلَةُ وَصَلَّى كُلُّ رَجُلٍ عَلَى حِيَالِهِ فَلَمَّا أَصْبَحْنَا ذَكَرْنَا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَنَزَلَ:(فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ ))[2] البقرة/١١٥ واتە: شەوێکی تاریك لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بووین صلى الله عليه وسلم نەماندەزانی ئاڕاستەی قیبلە لە کوێوەیە، بۆیە هەر کەسەمان بە لێکدانەوەی خۆی نوێژەکەی کرد، بۆ سبەی ئەمەمان بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم گێڕایەوە، لەوێدا ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە، کە دەفەرموێ روو لە هەر کوێ کەن رووی خوا لەوێوەیە..

**٣. لە ترساندا:** کەسێك کـە لـە ترسـاندا ناوێرێـت روو لـە قیبلـە بکات، بۆی هەیە روو بکاتە لایەکی تر.. جا ترسەکە لە دوژمن بێت، لە دڕندە بێت بەرامبەری وەستابێت، یان لە جێ مەترسی تر.. بەڵگەش :

---

[1] بوخاری (٤٤٩١)، موسلیم (٥٢٦)، نەسائی (٦١/٢).

[2] ترمزی (٣٤٥)، شێخی ئەلبانی بە حەسەنی ناساندووە: ارواء الغليل (٣٢٣/١).

ـ خـوای گـەورە دەفـەرموێ: (حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلۡوُسۡطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ﴿٢٣٨﴾ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ فَرِجَالًا أَوۡ رُكۡبَانًا ) البقرە / ٢٣٨ـ ٢٣٩ واتـە: پارێزگـاری نوێـژەكانتان بكـەن، نوێـژی ناوەنـدیش بپـارێزن و بـە ملكەچییەوە بۆ نوێژ هەستن. ئەگەر ترسـتان لەسـەر بـوو، بـە سـواریی وپیادەیی بیكەن.

ـ ئەو فەرموودەیەی سەیدنا ئیبنو عومەر خوا لێیان رازی بێت كە دەربـارەی نوێـژی تـرس دەفـەرموێ: (إذا اختَلَطُوا فَإنّمَا هُـو التَّكْـبيرُ والإشَـارَةُ بـالرَّأسِ)[1] واتــە: كـە تێكچــڕژان (جــەنگاوەران لــە كــاتی جەنگەكەدا) ئیتر هەر تەكبیركردن و ئاماژە كردنە بەسەر..

ـ هەر لەوەوە: (فإذا كَانَ خَوفٌ أشَدَّ مِنْ ذلِكَ صَلُّوا عَلَى أقْدَامِهِمْ أو رُكْبَانَاً مُسْتَقْبِلِي القِبْلَةِ أو غَيرَ مُسْتَقْبِلِيهَا)[2] واتـە: كاتێـك ترسـەكە لـەو زیاتر بوو، نوێژەكەیان بە پیادەیی و سواریی كرد، رووەو قیبلەو رووەو لای تر..

## ٤. كاتێك سوارەو لە سەفەردایەو نوێژەكەش سوونەتە:

ووتما كە گەشـتەوان بـۆی هەیـە كاتێـك نوێـژی سـوونەت دەكـات هـەر لەسەر سوارییەكەی بیكات. سواریەكەش جیاوازی نیە كە كەرو ئێسترە، سـەیارەو شـەمەندەفەرە، یـان فڕۆكـەو كەشـتی.. رووكردنـە قیبلـە لـەم حاڵەتەدا بۆ دروستی نوێژەكە مەرج نامێنێت..

---

[1] بەیهیقی (٣/٢٥٥) شێخی ئەلبانی رەحمەتی بە سەحیحی داناوە (أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم ل ٧٦).

[2] بوخاری (٤٥٣٥)، ئیمامی مالیك (٣٩٦).

سەیدنا ئیبنو عومەر خوا لێیان رازی بێت کە لە سەفەردا بوو، شەو بوو، بەسەر سوارییەکەیەوە بوو بێ ئەوەی گوێ بداتە روو کردنە قیبلە نوێژی دەکرد.. دەیفەرموو: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم (يُسَبِّحُ عَلَى الرَّاحِلَةِ قِبَلَ أَيِّ وَجْهٍ تَوَجَّهَ، وَيُوتِرُ عَلَيْهَا غَيْرَ أَنَّهُ لَا يُصَلِّي عَلَيْهَا الْمَكْتُوبَةَ )[١] واتە: نوێژی لەسەر سوارییەکەی دەکرد بە هەر ئاراستەیەك بوایە، بەڵام پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی وتری لەسەر دەکرد، لە نوێژە فەرزەکاندا وای نەدەکرد..

**نوێژی سایەق:** ئەو کەسەی سەیارە لێ دەخوڕێت و بۆ نوێژەکەی بواری دابەزینی نیە، بۆی هەیە بەدەم سەیارە لێخوڕینەکەوە نوێژەکەی بکات، بێ گومان ناشتوانێت روو بکاتە قیبلەو پاشان بێتەوە سەر سایدی خۆی.. بۆیە بێ ئەوەی روو بکاتە قیبلە نوێژەکەی دادەبەستێت و کردنەوەشی لەسەر نیە.

ئەو کەسەش کە لە تەنیشت سایەقەوەیە یان نەفەرەو لە سەیارەو شەمەندەفەر یان لە وەسیلەکانی تری سەفەردایەو ناتوانێت لە کاتی نوێژەکەیدا دابەزێت، هەر لە کورسیەکەی خۆیدا نوێژکەی دەکات. لەم حاڵەتانەشدا نە روو کردنە قیبلە مەرج دەمێنێت نە هەستان و رکوع و سجود چونکە بوار نیە. باسی ئەمە دواتر دێت.. ان شاء الله.

★ ★ ★

---

[١] بوخاری (١٠٩٨)، موسلیم (٧٠٠).

## مەرجی پێنجەم: نییەت هێنان

نییەت کە هەندێك کورد پێی دەڵێت نوێت، بریتیە لە نیازو مەبەست و وویستی ئەنجامدانی خواپەرستی، بەئومێدەی پاداشتی خوای گەورە. نوێژ بە بێ نییەتی خواوویستی نابێت، واتە کردنی لەبەر خاتری خوای گەورە.. نییەت لە هیچ کاتێکدا لەسەر ئەهلی نوێژ لاناچێت، مەگەر کاتی لەدەستدانی ئەقڵ! ئەویش لەبەر ئەوەیە کە هیچ فەرزێکی لەسەر نامێنێت.. کۆڕای شەرعناسان لەسەر ئەوەیە کە نییەتی خواوویستی مەرجێکی نوێژە، چونکە:

ـــ خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ البینە/٥ واتە: فەرمانی ئەوەیان پێدرابوو کە سەرِاستانە دینداریی بۆ خوای گەورە بکەن و تەنها ئەو بپەرستن..

ـ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (إنّمَا الاعمالُ بالنّيَّاتِ)[١] واتە: هەموو کارێك پەیوەستە بە نییەتەوە.

### ئەوەی راجوێیی تێدا نیە:

١ـ نییەت لە خواپەرستیەکاندا لە دڵدایەو بە دەم ناوترێت، نە لە نوێژو نە لە خواپەرستی تردا..

٢ـ ئەگەر بە دەم نیەتێکی هێنا کە بە پێچەوانەی وویستی دڵیەوە بوو، ئەوەی دڵی بۆ حسێبە نەك ئەوەی بە زمانی ووتویێتی، بۆ نموونە: کابرا بە لەفز دەڵێ نیەتم هەیە چوار رکات نوێژی نیوەڕۆ دەکەم

---

[١] بوخاری (٥٤) موسلیم (١٩٠٧).

بەڵام مەبەستی نوێژی عەسر بوو، وویستی دڵی بۆ حسێبە کە نوێژی عەسرەو دەیکات نەك لەفزەکەی..

٣ـ ئەگەر بە دەم نیەتی خواپەرستیەکی هێنا بەڵام لە دڵیدا نیازی نەبوو بیکات، ئەوەی دڵی حسێبەو پاداشتی خواپەرستی بۆ نانوسرێت بۆنموونە: بە زاهیری دەڵێ بەرۆژوو دەبم، بەڵام نیازی نیە سبەینێ بەرۆژوو بێت.. ئەمە نیەتی بۆ ئەو رۆژووە دانەمەزراوە..

٤ـ نیەت هێنان بە دەم (بە لەفز) بیدعەیەو هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە، نە پێغەمبەری پێشەوا صلى الله عليه وسلم و نە یاوەرانی بەرێزو نە یەکێك لە شەرعناسانی تابعین نەیانفەرمووە دەبێت نیەت بە دەم بهێنرێت! کەسیان وەکو ئەهلی ئەم زەمانانە نەیانفەرمووە بیدعەی حەسەنەیە! هەر کەسێك نییەت بە لەفز بهێنێت و بە دەم بڵێ نیەتم هەیە ئەوەندە رکات نوێژی فلانی بۆ خوا دەکەم، یان سبەینێ بەرۆژوو دەبم، پێچەوانەی سوونەتی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و کۆڕای شەرعناسان و چوار پێشەوا بەرێزەکەی ئەهلی سوونەت رەفتاری کردووە.. تەنانەت ئیمامی ئیبنوتەیمییە دەڵێ: هەر کەسێك بڵێ نیەت هێنان بە لەفز (بە دەم) جائیزە، دەبێ داوای تۆبەی لێ بکرێت، ئەگەر نەیکرد دەبێ سزایەکی شیاو بدرێت[١]!!

٥ـ نیەت هێنان بەلەفز بە نهێنیش بێت هەر بیدعەیە وناشێت بهێنرێت، ئیمامی ئیبنوتەیمییە دەڵێ: هیچ موسوڵمانێك لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم نەقڵی نەکردووە کە لە پێش نوێژێکیدا بە لەفز نییەتی هێنابێت، نە خۆی نە یاوەرانی بەرێزی، نە بە نهێنی و نە بە

---

[١] مجموع الفتاوى (٢٢/٢٣٣).

ئاشكرا، نە خۆیان كردوویانەو نە فەرمانیان پێ كردووە.. بۆیە نە لە رووی نەریتەوەو نە لەرووی شەرعەوە ئەوە ناسەلێت كە بووترێت نیەت بە لەفز هێنراوە بەلام بە ئێمە نەگەیشتووە!! گومان لەوەدا نیە ئەگەر بە لەفز بهێنرایە، ئەو یاوەرو شەرعناسە بەرێزانە بۆیان نەقڵ دەكردین، جا كە هیچ شتێكیان لەو مەسەلەیەدا لێوە ریوایەت نەكراوە ئەوە مانای وایە بە هیچ شێوەیەك كەسیان نییەتیان بە لەفز نەهێناوە.. لەبەر ئەوە زیاد كردنی نییەت بە لەفزو شتی تری لەو جۆرە، بیدعەیەو خراوەتە سەر خواپەرستیەكان، ئەمەش وەكو بانگ و قامەت كردنی نوێژی جەژنەكان وایە كە نە ئەسڵیان هەیەو نە فەسڵ[١]!!

٦ـ نیەت هێنان بەلەفز دەنگەدەنگ دروست دەكات و سەر لەوانی تر دەشێوێنێت، ئەمەش حەرامە.. تۆ وا خەیاڵ كە شەش سۆڤ خاوەن وەسوەسەو شەش مەلای كورد لە نوێژێكدا كە تۆ پێشنوێژی دەكەیت، لە دواتەوە نییەت دێنن، دەیكەنە هەرایەك تۆش نوێژەكەت لێ تێك دەچێت، جگە لەوەی كە تۆ لە نوێژ دەبیتەوە هێشتا لەوانەیە سیان لەوان نیەتەكەیان بۆ دانەمەزرابێت!!

٧ـ نیەت هێنان وویست و ئیرادەیە كە دەستی داوەتە ئەو كارە تا بیكات، كابرا بەو بەیانیە لە پێخەفی گەرم هاتۆتە دەرێ و چووە بۆ مزگەوت، غێر بۆ ئەوەیەتی نوێژەكەی سپێدەی بە جەماعەت بكات، ئیتر ئەو نییەت هێنانەی چییە كە دەڵێ: نییەتم هەیە دوو ركات نوێژی بەیانی بە حازری بە جەماعەت بەرەو قیبلە بۆ خوا دەكەم.. یان

---

[١] مجموع الفتاوى (٢٢/٢٣٧).

کابرا لە زستانی کوێستاندا کە بەو زستانە چۆتە نـاو حـەوزێك ئـاوی ساردەوە خۆ بۆ خۆ فێنك کردنەوە نەچۆتە ناوی! غێر لەبـەر غوسـڵ دەرکـردنێتی!! ئـەم داماوە کـە دێشـتە دەرەوە پێـی دەڵێن نیەتەکـەت چۆن هێنا؟! دەڵێ: ووتم: نوێتمە لەش پیسی خـۆم دەردەکـەم!! دەڵێن هەڵەت تێدا کردووە! چونکە  نەتووتووە: نوێتمە غوسڵی لەش پیسـی لە خۆم دەردەکەم!! بـە قسـەیەکی وا بـێ سـەرو جـێ دەینێرنـەوە نـاو ئەو ئاوە ساردەوە!! وایـان لـە پێنجوێنیـەك کردبـوو.. یـان سـەرفترەی داوە، دەڵێن: تۆ نـەتووتووە خۆم تەقلیدی ئیمامی ئەبو حەنیفـە کـرد کە فەرموویەتی پارە لە جێی گـەنم جائیزە بـدرێت! یـان نـەتووتووە ئەمە سەرفترەی سەری خۆم و فلان و فیسارە! دەڵێن دەبـێ جارێکی تر سەرفترەکە بدەیتەوە!! وایان لە باوکم کردبوو، لەبەر ئەوەی نـاوی هەندێك لـە کورِو کچەکانی بیرچووبوو!! دوو جاریـان سـەرفترە بـەو کەم دەرامەتە دابۆوە!!

ئیبنو تەیمییە دەڵێ: نییەت وا لە دوای زانینەوە، کەسێك کە دەزانێت خـەریکی چیە، یـەعنی پێشـتر نییـەتی ئەنجامـدانی ئـەو شـتەی هـەبووە، چونکە خۆ مومکین نیە کارێك بە بێ وویست بکرێت[1]..

## دیاری کردنی ئەو نوێژەی بە تەمایە بیکات:

دەبێ لە کـاتی نوێژدابەسـتندا هـۆش بچێتە سـەر ئـەوەی ئـەو نوێـژەی دەیکات چیەو چۆنە.. ئایا نوێـژی فـەرزە یـان سـوونەتە؟! نیوەڕۆیـە یـان عەسر؟! یەعنی دڵ و هۆشی لای بێت..

---

[1] ابن تیمیه: الاختیارات (ل ٤٩)..

## ساتی نییەت هێنانی نوێژ:

شەرعناسان لەسەر ئەوە رێکن کە:

١ـ باشتر وایە لەگەڵ ووتنی تەکبیرەی ئیحرامدا (اللـه اکبری دەسپێکی نوێـژ) نییەتەکەشی بهێنێت.. ئەگەر نییەتەکەی یەکسەر کەوتە دوای ووتنی تەکبیرەکەشەوە جائیزە..

٢ـ کۆڕای شەرعناسان لەسەر ئەوەیە کە جائیز نیە نییەتی کەسێك بکەوێتە دوای تەکبیرەی ئیحرامیەوە..

٣ـ ئەگەر نییەتی نوێژەکەی هێناو دواتر بیرو خەیاڵاتی مەشغووڵ بوو، نوێژەکەی دروستە.. مادام نەیوویستووە نوێژەکەی ببڕێت[1]..

## گۆڕینی نییەت لە ناو نوێژدا[2]:

گۆڕینی نییەت لە نوێژدا زۆر شێوەی هەیە:

**١ـ نیەتی گۆڕینی نوێژی فەرز بۆ سووننەتی گشتی:** جائیز نیە، وەکو ئەوەی کەسێك نییەتی نوێژی نیوەڕۆی هێناوەو لە رکاتی دووەمیدایە، هەست دەکات وا کەسانێکی تر نوێژی جەماعەت دادەمەزرێنن، بۆ ئەم جائیز نیە بۆ ئەوەی فریای نوێژی جەماعەتەکە بکەوێت، نییەتی نوێژەکەی خۆی کە فەرزە بگۆڕێت بۆ دوو رکات سووونەت و سەلام بداتەوە.

**٢ـ نییەتی گۆڕینی فەرزێك بۆ فەرزێکی تر:** جائیز نیە.. هەردوو فەرزەکە بەتاڵ دەبنەوە، فەرزی یەکەم لەبەر ئەوەیە کە

---

[1] الانصاف (٢٣/١)، الشرح الممتع (٢٩١/٢).

[2] ابن عثيمين: الشرح الممتع (٢٩٤/٢)، الشيخ وحيد بالي: الاكليل (٣٤٨/١)

نییەتەکەی پسا، فەرزی دووەمیان لەبەر ئەوەیە بێ نییەتی پێشتر کراوە.. وەك ئەوەی کەسێك نوێژی عەسری دەکات، لـە نوێژەکـەدا بـیری کەوتـەوە کە نوێژی نیوەڕۆکەی نەکردووە، خێرا نییەتی نوێژە عەسـرەکەی دەکاتـە نییـەتی نوێـژی نیـوەڕۆ! ئەمـە نابێـت، چـونکە نوێژکـەی پێشـووی بـە پساندنی نییەتەکەی بەتاڵ بۆوەو نوێژی دووەمیشی دانەمـەزراوە چونکە پێش دابەستنی نوێژەکە نییەتی بۆ نەهێناوە..

**٣ . نییەتی گۆڕینی نوێژی سووننەت بۆ فەرز:** ئەمیش جـائیز نیە، لەبەر هەمان هۆی پێشوو.

**٤ ـ نییـەتی گـۆڕینی نوێـژی سـووننەتێکی دیـاری کـراو بـۆ نوێـــژێکی تـــری ســـووننەتی گشـــتی:** جـــائیزە، چـــونکە نییـــەتی سوونـنەتە دیاری کراوەکـە نییـەتی سـوونـنەتی گشـتیش لـە خـۆ دەگرێـت، وەك ئەوەی کەسێك دەیەوێت چوار رکات سوونـنەتی پێش فـەرزی نیـوەڕۆ پێکـەوە بکـات، بـەڵام لـە نـاو نوێژەکەیدا بزانێـت وا جەماعـەت دەکرێـت، خێرا نوێژەکەی لە دڵی خۆیدا دەکاتە نوێژێکی سوونـنەتی دوو رکاتی..

**٥ . نییەتی گـۆڕینی نوێـژێکی سوونـنەتی گشـتی بـۆ نوێـژی سـوونـنەتێکی دیـاری کـراو:** جـائیز نیـە، چـونکە نییـەتی نوێـژی یەکەمی پساندوەو نییەتی بۆ نوێژی دووەم نەهێناوە..

**٦ ـ نییـەتی گـۆڕینی نوێـژی سـوونـنەتێکی دیـاری کـراو بـۆ نوێژێکی تری سوونـنەتی دیاری کراو:** جائیز نیـە، وەکو کەسـێك دوو رکات نوێژی تەحییەتولەسجید دەکات، لە نـاو نوێژەکـەدا دەیکـات بـە

دوو رکات سوونەتی پێش سپێدەی بەیانی ئەمە ناشێت، لەبەر هەمان هۆی باسکراو.

٧ . **گۆڕینی نییەتی ئیمام بۆ مەئموومی:** ئەمە جائیزە، چونکە وەکو عائیشەخان خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە سەیدنا ئەبوبەکری باوکی خوا لێی رازی بێت لە کاتی کۆتا نەخۆشی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم پێشنوێژی بە خەڵکەکە کرد، بەڵام کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تەشریفی هێنایە مزگەوتەکەوە سەیدنا ئەبوبەکر هەستی پێکرد، هاتەوە دواوە بۆ ریزی مەئموومەکان، پێغەمبەری خوا ئاماژەی بۆ کرد کە هەر لە شوێنی خۆت بە، سەیدنا ئەبوبەکر گەڕایەوە میحرابەکەوەو پێغەمبەری خواش تەشریفی هێنایە لای چەپی سەیدنا ئەبوبەکرەوەو دانیشت، سەیدنا ئەبوبەکر هەر لە ناو نوێژەکەدا ئیقتیدای بە پێغەمبەری خوا کرد کە پێشنوێژییەکەی بۆ دەکرد، خەڵکەکەش ئیقتیدایان بە سەیدنا ئەبوبەکر دەکرد کە پێشنوێژ بووەو لێیانەوە دیار بووە: (سَمِعَ أَبُو بَكْرٍ حِسَّهُ ذَهَبَ يَتَأَخَّرُ فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قُمْ مَكَانَكَ فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى جَلَسَ عَنْ يَسَارِ أَبِي بَكْرٍ قَالَتْ فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي بِالنَّاسِ جَالِسًا وَأَبُو بَكْرٍ قَائِمًا يَقْتَدِي أَبُو بَكْرٍ بِصَلَاةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَيَقْتَدِي النَّاسُ بِصَلَاةِ أَبِي بَكْرٍ حَدَّثَنَا)[١]..

دیارە ئەمە نییەت گۆڕینی نێوان ئیمامەتی ومەئموومێتی چەندین جار تێدایە.. ئەوەش بەڵگەیە کە جائیزە..

---

[١] بوخاری (٦٦٤)، موسلیم (٤١٨).

**٨ . گۆڕینی نییەتی مەئمووم لە پشت ئیمامێکەوە بۆ پشت ئیمامێکی تر:** جائیزە:

ـ لەبەر ئەو فەرموودەیەی پێشووی خاتوو عائیشە خوا لێی ڕازی بێت کە دیارە خەڵکەکە لە سەرەتای نوێژەکەوە ئیقتیدایان بە سەیدنا ئەبوبەکر کردبوو، دواتر بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم..

ـ کە سەیدنا عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێت لە پێشنوێژیی بەیانیدا پێکرا، سەیدنا عبدالرحمانی کوڕی عەوف خوا لێی ڕازی بێت بووە پێشنوێژو نوێژەکەی بە موسوڵمانان تەواو کرد[١]..

**٩ . گۆڕینی نییەتی مەئمووم بۆ بە ئیمام بوون:** جائیزە، وەك ئەوەی ئیمامەکە لە ناو پێشنوێژیەکەیدا شتێکی لێ بێت و بڕواتە کەنارەوە، دەشێت یەکێك لە مەئموومەکانی پشتیەوە بێتە شوێنی و ببێتە ئیمام.. چونکە لە کاتی لێدانەکەی سەیدنا عومەردا خوا لێی ڕازی بێت وابوو کە خێرا سەیدنا عبدالرحمان خوا لێی ڕازی بێت هاتە شوێنی و بوو بە ئیمام..

**١٠ . گۆڕینی نییەتی نوێژخوێنی تاك بۆ بە ئیمام بوون:**

جائیزە، وەك ئەوەی کەسێك نوێژی خۆی دەکات و یەکێکی تر دێتە لای ڕاستیەوەو یان دوو کەس دێنە پشتیەوەو ئیقتیدای پێ دەکەن و دەیکەنە ئیمام، ئەویش بە نییەتی ئیمامێتی نوێژەکەیان بۆ تەواو دەکات.. سەیدنا ئیبنوعەبباس خوا لێیان ڕازی بێت دەڵێ: (بِتُّ عِنْدَ خَالَتِي فَقَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي مِنْ اللَّيْلِ فَقُمْتُ أُصَلِّي مَعَهُ فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ

---

[١] بوخاری (٢٧٠٠).

فأَخَذَ برَأسِي فأَقامَني عَنْ يَمِينِهِ )[١] شەوێك لای پوورم مابوومەوە[٢]، دیم پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە خەو هەستاو کەوتە نوێژکردن، منیش هەستام و لە خزمەتیدا کەوتمە نوێژ کردن، لای چەپیەوە وەستابووم سەری گرتم و هێنامیە لای راستی خۆیەوە..

ئەمە بەڵگەیە لەسەر گۆڕینی نیەتی تاك بۆ ئیمامێتی، هەر وەك کە بەڵگەیە لەسەر کردنی نوێژی سووننەت بە جەماعەت، لەسەر هەستانی شەو (قيام الليل) بە جەماعەت..

**١١ . گۆڕینی نییەتی نوێژی ئیمام بۆ تاك** : جائیز نیە، وەك ئەوەی کەسێك ئیمامەو یەك مەئمومی هەیە، شتێکی لە مەئموومەکەی قەوماو چووە دەرەوە، ئیمامەکەی بە تەنها جێ هێشت، ئیمامەکە بۆی نیە نییەتی خۆی بکاتەوە بە تاك کەسی.. چونکە دەشێت هەر بە ئیمامەتی بمێنێتەوە، لەوانەیە مەئموومەکەی بێتەوە یان کەسێکی تر بێت.. ئەگەر کەسیش نەهات نوێژەکەی خۆی بە ئیمامەتیەکە دروستە..

**١٢ . گۆڕینی نییەتی نوێژی مەئمووم بۆ تاك** : جائیزە، وەك ئەوەی کەسێك لە نوێژی جەماعەتدایەو زۆری پەلەیەو ئیمامەکەش لە رکاتی یەکەمدا زۆری پێ چوو، یان نەخۆشەو توانای خۆڕاگرتنی نەما، بۆی هەیە جیابێتەوەو خۆی لە مەئموومێتیەوە بکاتە تاك کەسێك.. ئەمە لەسەر رای هەندێك لە شەرعناسان جائیزە، بەڵگەشیان ئەو فەرموودەیە کە دەڵێ: (صَلَّى خَلْفَ مَعاذِ بنِ جَبَلٍ فأَطَالَ مَعَاذُ القِرَاءَةَ فَانْفَرَدَ الرَّجُلُ وَصَلَّى وَحْدَهُ، وَشَكَى إلى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَليهِ وَسَلَّمَ فَلَمْ

---

[١] بوخاری (٦٩٩)، موسلیم (٧٦٣)..

[٢] مەیموونەی کچی الحارث کە خیزانی پێغەمبەری خوا بوو صلی الله علیه وسلم.

يَأمُرهُ بالإعَادَة)[1] واتە: کابرایەك لە دوای سەیدنا مەعازی کوڕی جەبەلەوە خوا لێی رازی بێت نوێژی دەکرد، کە سەیدنا مەعاز قورئان خوێندنەکەی درێژە پێدا، کابرا لە ریزی مەئموومەکان جیابۆوەو بە تەنها نوێژەکەی خۆی کردو دواتر چووە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سکاڵای لە ئیمامەتیەکەی سەیدنا مەعاز کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێ نەکرد کە نوێژەکەی بکاتەوە..

دیارە کە ئەمە کارێکی شیاوە بەڵام ئەوەی هەیە کە پاداشت و خێرەکەی کەمتر دەبێتەوە..

## جیاوازی نییەتی ئیمام و مەئموم:

راجوێیی لەوەدا نیە کە ئەسڵ ئەوەیە کە مەئموم ئیقتیدا بە ئیمامەکەی دەکات و نییەتی هەردووکیان بۆ یەك جۆر نوێژ دەبێت.. ئیتر ئەو نوێژە فەرز بێت یان سوونەت.. بەڵام لەوەوە راجوێییان بۆ دروست دەبێت کە نییەتیان دەگۆڕێت.. ئیمامی شافیعی و ئیبنو حەزم وا نابینن کە جیاوازی نییەتی ئیمام و مەئموم کاریگەریی لەسەر نوێژیان هەبێت[2].. بەڵگەیان هەر فەرموودەی: (إنّمَا الاعمالُ بالنّيَّاتِ وَلِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى)[3] واتە: هەموو کارێك پەیوەندە بە نیەتەکەیەوە، هەموو کەسێکیش بە پێی نییەتی خۆی دەبیێت.

ئیمامی ئیبنوحەزم دەڵێ: فەرموودەکە راشکاوانە دەڵێ کە هەر کەسەو

---

[1] بوخاری (٦١٠٦)، موسلیم (٤٦٥).

[2] الخطيب الشربيني: مغني المحتاج (٥٠٢/١)، ابن حزم: المحلى (٢٢٣/٤)، ابن رشد: بداية المجتهد (١٦٧/١).

[3] بوخاری (٥٤) موسلیم (١٩٠٧).

نییەتێکی هەیە، کەوابوو دەشێت ئیمام نییەتی خۆی هەبێت و مەئموم نییەتی خۆی هەبێت، مەرج نیە نییەتی هەردووکیان یەك بن یان پێکەوە پەیوەست بن..

ئەمما فەرموودەی: (إنَّمَا جَعَلَ الإِمَامُ لِيُتَمَّ بِهِ، فَلا تَخْتَلِفُوا عَلَيهِ)[١] واتە: بۆیە ئیمام دانراوە تا نوێژی لەگەڵدا تەواو کرێت، دەی سا لەسەر ناکۆك مەبن.. واتە لە کارو رەفتارە زاهیریەکاندا پێچەوانەی ئەو نەکرێت، بە بەڵگەی ئەوەی کە لە هەمان فەرموودەدا دەفەرموێ: (فَإذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا وإذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا وإذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا، وإذَا صَلَّى جَالِسَاً فَصَلُّوا جُلُوسَاً أجْمَعِينَ) واتە: ئەگەر چووە رکوع ئێوەش بچنە رکوع، ئەگەر سەری بەرز کردەوەو هەستایەوە ئێوەش هەستنەوە، ئەگەر چووە سوجدە ئێوەش بچنە سوجدە، ئەگەر بە دانیشتنانەوە نوێژی کرد، ئێوەش هەموو بە دانیشتنانەوە بیکەن..

ئەمە پەیوەندی بە رەفتارە بزاوتە زاهیریەکانەوە هەیە نەك بە جیاوازی نییەتەوە. ئەوەی ئەمەش زیاتر جێگیر دەکات، راکۆیی شەرعناسانە لەسەر ئەوەی کە ئەوی نوێژی سووننەت دەکات دەتوانێت ئیقتیدا بەو کەسە بکات کە نوێژی فەرز دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا کە نییەتەکانیان جیاوازە..

**نموونەی جیاوازی نییەتی ئیمام و مەئموم:**

**١ . نوێژی سووننەت لە دوای نوێژی فەرزەوە:** بە بۆچوونی هەرچوار پێشەوا شەرعناسە بەرێزەکەی ئەهلی سووننەت و جەماعەت و غەیری ئەوانیش جائیزە کەسێك کە نوێژی سووننەت دەکات بچێت

---

[١] بوخاری (٦٨٩)، موسلیم (٤١١).

ئیقتیدا بە کەسێکی تر بکات کە فەرز دەکات و بە جەماعەت نوێژەکەیان بکەن، هەر یەکەیان بە نییەتی خۆی.. بەڵگەیان:

ـ فەرموودەکەی سەیدنا ئەبو زەڕ خوا لێی رازی بێت کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا فەرمووی: (كَيْفَ أَنتَ إِذَاكانتْ عَلَيْكَ أُمَرَاءُ يُمِيتونَ (لە ریوایەتێکی تردا: يُؤَخِّرُونَ الصَّلاةَ عَنْ وَقْتِهَا)، قُلْتُ فمَا تَأْمُرُنِي؟ صَلِّ الصَّلاةَ لوَقْتِهَا فإنْ أدْرَكْتهَا مَعَهُمْ فصَلِّ، فإنّهَا لَكَ نَافِلَةٌ)[1] واتە: ئەو زەمانە چی دەکەیت کە کاربەدستی واتان بەسەرەوە دەبێت کە نوێژ دەمرێنن (ریوایەتەکەی تر: کە نوێژەکان لە کاتی خۆیاندا ناکەن)؟! عەرزم کرد: فەرمانی چیم پێ دەکەی بیکەم؟! فەرمووی: نوێژەکەی خۆت لە کاتی خۆیدا بکە، ئەگەر لەگەڵ ئەوانیشدا فریا کەوتیت بیکەوەوە، بۆتۆ بە سووننەت حسێبە.

ـ فەرموودەکەی سەیدنا یەزیدی کوڕی ئەسوەد خوا لێی رازی بێت کە فەرمووی: (شَهِدْت مَعَ النَّبيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَجَّتَهُ، قَالَ: فَصَلَّيْت مَعَهُ صَلَاةَ الصُّبْحِ فِي مَسْجِدِ الْخَيْفِ، فَلَمَّا قَضَى صَلَاتَهُ وَانْحَرَفَ إذَا هُوَ برَجُلَيْنِ فِي آخِرِ الْقَوْمِ لَمْ يُصَلِّيَا مَعَهُ، فَقَالَ: عَلَيَّ بهِمَا، فَأُتِيَ بهِمَا ترْعَدُ فَرَائِصُهُمَا فَقَالَ: مَا مَنَعَكُمَا أنْ تصَلِّيَا مَعَنا؟ قَالَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كُنَّا قَدْ صَلَّيْنَا فِي رِحَالِنَا، قَالَ: فَلَا تفْعَلَا، إذَا صَلَّيْتمَا فِي رِحَالِكُمَا ثمَّ أَتيْتمَا مَسْجِدَ جَمَاعَةٍ فَصَلِّيَا مَعَهُمْ فَإِنَّهَا لَكُمَا نَافِلَةٌ )[2] واتە: لە حەجدا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بووم صلی الله علیه وسلم، لە مزگەوتی خەیف نوێژی بەیانیم لەگەڵدا کرد، کە نوێژەکەی تەواو کردو لای کرد بەلاوە، دوو پیاوی بینی لە کۆتایی خەڵکەکەدا دانیشتبوون، فەرمووی بۆم بانگ کەن،

[1] موسلیم (٦٤٨)، ترمزی (١٧٦)..

[2] موسلیم (٦٤٨)، ئەبوداوود (٤٣١).. کمال ابن السيد: تعظيم قدر الصلاة (١٠٠٨).

هێنایانن، لەشیان لە ترسان دەلەرزی، پێی فەرموون: چی رێی لێ گرتن نوێژەکەمان لەگەڵ نەکەن؟! ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە نوێژمان لای کاروان وبارەکانی خۆمان کردبوو، فەرمووی: وا مەکەن، ئەگەر نوێژیشتان لای کاروان و باری خۆتان کردو هاتنە مزگەوت کە جەماعەتی تێدا بوو ئێوەش نوێژە جەماعەتەکە بکەن، بۆ ئێوە بە نوێژی سووننەت دەژمێررێت..

**٢ . نوێژی فەرز لە دوای نوێژی سووننەتەوە:** ئەمە جائیزە، چونکە:

ـ سەیدنا جابری کوڕی عبدالله خوا لێیان رازی بێت گێڕایەوە کە: (أَنَّ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ كَانَ يُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ يَرْجِعُ فَيُصَلِّي بِهِمْ تِلْكَ الصَّلَاةَ[1](هِيَ لَهُمْ تَطَوُّعٌ وَلَهُمْ فَرِيضَةٌ)[2] واتە: سەیدنا مەعازی کوڕی جەبەل خوا لێی رازی بێت نوێژی خەوتنانی لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم دەکردو دەچووەوە ناو کەسوکارەکەشی هەمان نوێژی بە ئیمامەتی بۆ ئەوانیش دەکردەوە، لە هەندێك ریوایەتدا هاتووە: بۆ ئەم سووننەت بوو بۆ ئەوانیش فەرز..

حافز ئیبنوحەجەر دەڵێ: ئەمە بەڵگەی شەرعناسانە کە ئیقتیدا کردنی خاوەن نوێژی فەرز بە خاوەن نوێژی سووننەت دروستە، چونکە سەیدنا مەعاز نوێژی فەرزی لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم دەکردو نوێژەکەی ماڵەوەشی بە نییەتی سووننەت دەکرد.. ـ لە

---

[1] بوخاری (٧١١)، موسلیم (٤٦٥) لەفزی موسلیمە...

[2] زیادەکەی لای ئیمامی شافیعی: الام (١٧٣/١)، تەحاوی (٤٠٩/١) دارەقوتنی (٢٧٤/١) قسەی لەسەر کردووە کە زەعیف بێت، ئیمامی ئیبنوحەجەر لە فتح الباريدا دەفەرموێ: سەحیحە.

ریوایەتێکی تری سکاڵای ئەو یاوەرە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم کە لە نوێژە درێژەکانی سەیدنا مەعازی کرد، ئەوە هاتووە: (وَإِنَّ مَعَاذاً صَلَّى مَعَكَ الْعِشَاءَ ثُمَّ أَتَى فَافْتَتَحَ بِسورَةِ البَقَرَةِ..)[1] واتە: دوای ئەوەی نوێژی خەوتنانی لە خزمەت جەنابتدا کرد، هاتەوە دەستی بە خوێندنی سورەتی بەقەرە کرد.. یەعنی لە پێش نوێژیەکەیدا! ئەمەش دیارە کە نوێژی یەکەمی سەیدنا مەعاز نوێژە فەرزەکەیەو نوێژەکەی تر کە بۆ خەڵکەکەی خۆی کرد سوونەت بووە.

ـ سەیدنا ئەبوبەکرە خوا لێی رازی بێت دەڵێ: (صَلَّى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي خَوْفٍ الظُّهْرَ فَصَفَّ بَعْضَهُمْ خَلْفَهُ وَبَعْضَهُمْ بِإِزَاءِ الْعَدُوِّ فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ فَانْطَلَقَ الَّذِينَ صَلَّوْا مَعَهُ فَوَقَفُوا مَوْقِفَ أَصْحَابِهِمْ ثُمَّ جَاءَ أُولَئِكَ فَصَلَّوْا خَلْفَهُ فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ فَكَانَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَرْبَعًا وَلِأَصْحَابِهِ رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ)[2] واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نیوەڕۆیەك نوێژی ترسی پێ کردین، هەندێك لە یاوەران لە پشتیەوە ریزبوون و هەندێکی تریان بەرامبەر دوژمن ریز بوون، دوو رکات نوێژی بەوانە کرد کە لە پشتیەوە بوون و سەلامی دایەوە، ئەمان رۆیشتنە شوێنی ئەوان و ئەوان هاتن لە پشت پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم ریز بوون، دوو رکاتی بۆ ئەمانیش کردو سەلامی دایەوە.. بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو بە چوار رکات و بۆ هەر یەك لە یاوەرانیش دوو رکات دوو رکات..

---

[1] بوخاری (٦١٠٦)، موسلیم (٤٦٥).

[2] ئەبو داوود (١٢٤٨)، جامع التحصيل (١٦٣/١)، ئیمامی نەوەوی لە المجموع (١٧٠/٤) دا دەفەرموێ: نەسائی گێڕاویتیەوە: باسناد حسن..

ئیمامی شافیعی دەڵێ: دوو رکاتەکەی دواتریان کە بۆ یاوەرانی وەجبەی دووەم فەرز بووە، بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سوونەت بووە[1]..

لەبەر ئەم بەڵگەو بۆچوونانەیە کە شەرعناسان فەرموویانە: جائیزە کابرا دوای نوێژی خەوتنانی رەمەزان کە دەگاتە مزگەوت، دەبینێ نوێژی تەراویح دەکەن، ئەمیش نوێژی خەوتنانی نەکردووە، بۆی هەیە نییەتی فەرزی نوێژی خەوتنیان لەگەڵ بهێنێت، ئیقتیدا بکات و بچێتە نوێژەکەوە، کە ئیمام سەلامی دایەوە ئەم هەستێتەوەو نوێژە فەرزەکەی خۆی تەواو بکات..

**٣ . نوێژی فەرز لە دوای نوێژی فەرزەوە:** ئەمە سێ حاڵەتی هەیە:

**. ژمارەی رکاتی هەردوو نوێژە فەرزەکەی ئیمام ومەئمووم وەك یەکن:** وەك ئەوەی ئیمامەکە نوێژی خەوتنان دەکات کە چوار رکاتییە، مەئمومیش نوێژی نیوەڕۆ یان عەسری لەگەڵ دەکات کە ئەویش چوار رکاتییە.. ئەمە جائیزەو بەڵگەکانی پێشوو پشتگیریین..

**ـ ژمارەی نوێژە فەرزەکەی مەئمووم لە نوێژە فەرزەکەی ئیمام زیاترە:** وەك ئەوەی مەئمووم نوێژی نیوەڕۆی دەکات لە پشت یەکێکەوە کە نوێژی سپێدەی بەیانی یان شێوانی دەکات.. ئەمەش جائیزە، پێشتر ووتمان کە مەرج نیە نییەتی ئیمام و نییەتی مەئمووم

---

[1] ئیمامی شافیعی: الام (١/١٧٣).

یەك بن.. ئەم نوێژە وەکو نوێژی نیشتەجێ (موقیم) وایە کە لە پشت سەری گەشتیار (موسافیر) دوە بیکات..

**ـ ژمارەی نوێژە فەرزەکەی مەئمووم لە نوێژە فەرزەکەی ئیمام کەمترە:** ئەمە جائیز نیە، وەك ئەوەی نوێژی بەیانی لە دوای یەکێکەوە بکات کە نوێژی نیوەڕۆی دەکات.. یان کەسێك دەیەوێت نوێژی شێوانی بکات و دەیەوێت ئیقتیدا بە ئیمامێك بکات کە نوێژی چوار رکاتیی وەکو نوێژی خەوتنان دەکات، ئەمە جائیز نیە، چونکە پێچەوانەی رەفتاری ئیمامەکەی دەکات.. کە سێ رکاتەکەی خۆی تەواو بوو، ئیمامەکەی هێشتا رکاتێکی دەمێنێت، خۆ ناکرێت رکاتێکی زیادەی لەگەڵدا بکات، ناشکرێت دانیشێت تا ئیمامەکە رکاتی چوارەمی تەواو دەکات و سەلام دەداتەوە، ئەمیش ئەو کاتە سەلام بداتەوە، ئەمە جائیز نیە، چونکە بە ئەنقەست و زانینەوە رکاتێکی زیادەی کردووە.. ناشکرێت نییەتی جیابوونەوە بهێنێت و سەلام بداتەوە، یان دانیشێت تا ئیمامەکەی سەلام دەداتەوە ئەمیش ئەو کاتە سەلام بداتەوە!! ئەمانە نابن..

ئەگەر نوێژی شێوانی دەکردو لەگەڵ ئیمامێك فریا کەوت کە رکاتی یەکەمی نوێژی خەوتنانی کردبوو، ئەمیش و ئیمامەکەش سێ رکاتی هاوبەشیان کرد:

ـ هەندێك لە شەرعناسان دەڵێن جائیزە ، چونکە ئەوەی مەئمووم نییەتی بۆ هێناوە لەگەڵ ئیمامەکەدا کردویێتی، نە زیادی هەیەو نەکەم.. ووتیشمان جیاوازی نییەتی ئیمام و مەئمووم کاریگەریی لەسەر نوێژەکانیان نیە، کەوابوو ئەو نوێژە لەو حاڵەیدا جائیزە..

ـ ئەو شەرعناسە بەرێزانەی پێیان وایە ئیمام بۆ ئەوەیە کە ئیقتیدای پێ بکرێت، فەرموویانە: جائیز نیەو دەبێ چوار رکاتی بکات، چونکە

ئیمامەكەی نوێژی چوار ركاتی دەكات، بەڵام ئەمە بۆ كەسێكە كە بزانێت ئیمامەكە نوێژی چوار ركاتی دەكات، ئەمما ئەوەی نەیزانی و نوێژەكەی خۆی و ئیمامەكەی هاوبەش بوو، ئەوە جائیزە..

ئەمەش جێی ئیجتیهادە چونكە بەڵگەی هەردوولا بەهێزە.. والله اعلم.

**٤ . نوێـژی تـەواوكار لـە دوای نوێـژی كورتكارەوە:** ئەمـەش جائیزە، وەك ئەوەی كەسێك لـە مـاڵی خۆیـەتی و میوانەكـەی گەشـتیارەو نوێـژ كـورت و كـۆ دەكاتـەوە، دەشـێت كـە میوانەكـەی كـردە پێشـنوێژی، ئیقتیدای پێ بكات، كە ئەو دوو ركاتی خۆی كردو سەلامی دایەوە ئەمیش هەسـتێتەوەو بـاقی ركاتـەكانی كـە مـاوێتی تـەواو دەكـات. ئەمـەش كـۆڕای شەرعناسـانە. چـونكە خـاوەن مـاڵ مـادام نیشـتەجێیە هـەر دەبێـت چـوار ركاتیەكەی خۆی بە تەواوی بكات..

### كورت و كۆ كردنەوەی نوێژ، نیيەتی ناوێت:

ئەمــە رای زۆرینــەی شەرعناســانی ســەلەفە، چــونكە لــە پێغەمبــەری خــواوە صـلی الله علیـه وسـلم هـیچ ئاڕاسـتەیەك ریوایـەت نـەكراوە كـە فەرمانی بە یەكێك لە یاوەرانی كردبێت كە ئەگەر وویستیان نوێـژ كـورت و كۆ بكەنەوە دەبێت پێشتر نیيەتیان بۆ هێنابێت.. هەروەها لە یەكێك لە خەلیفــە رێنیشــاندەرە بەڕێزەكانیــەوە شــتێكی وا نــەهاتووە، كەســیان فەرمانیان بەو خەڵكە نـەكردووە كـە نوێـژیان لـە دوایانـەوە كـورت و كـۆ كردۆتەوە كە دەبوایە پێشتر نیيەتی كورت و كۆكردنەوەتان بهێنایـە.. زۆر جار ئـەو یـاوەرە بەڕێزانـەی لـە پشـت پێغەمبـەری خـواوە صـلی الله علیـه وسـلم یـان لـە پشـت یـەكێك لـە خەلیفـە راشـیدینە بەڕێزەكانـەوە نوێژی

کورت و کۆیان دادەبەست نەیانـدەزانی پێشنوێژەکەیان دوورکاتی دەکات یان چوار رکاتیی..

ـ (عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ صَلَّيْتُ الظُّهْرَ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْمَدِينَةِ أَرْبَعًا وَبِذِي الْحُلَيْفَةِ رَكْعَتَيْنِ)[١] واتە: سەیدنا ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە مەدینە دەیوویست بۆ حەج بەڕێ کەوێت، نوێژی نیوەڕۆی بە چوار رکاتی پێ کردن، ئەنەس دەڵێ: نوێژی نیوەڕۆم لە مەدینە لە خزمەتتدا بە چوار رکاتی کرد، بەڵام لە زیلحەلیفە نوێژی عەسر دوو رکاتی بوو.. ئەوانەی لە پشتیەوە نوێژیان کرد بە هەزاران یاوەر بوون، تێیاندا بوو شتێکی لەسەر نییەتی نوێژی سەفەر پێ نەگەیشتووە، تێیاندا بوو هەر نەیدەزانی نوێژی کورت و کۆکراوە چییە؟! چونکە یەکەمین جاری بوو سەفەر بکات، یان نەوموسوڵمان بوو، بە تایبەتی ئافرەتان..

ئەمە رەت کردنەوەی ئەو بۆچوونەیە کە مەلای کورد زۆر بە سەختی گرتویێتی کە دەبێت کابرا پێش ئەوەی بکەوێتە رێ، یان پێش ئەوەی بگاتە مەنزڵ یان نوێژی بەسەردا بێت، نییەتی کورت و کۆ کردنەوەی نوێژەکانی بهێنێت.. دیارە ئەمە بەڵگەیەکی وای لەسەر نیە خەڵکی پێ ناچاری ئەم رەفتارە بکرێت..

ـ هەروەها ئەوەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێش نوێژی کورت و کۆ بە یاوەرانی نەدەفەرموو کە بە تەمایە نوێژەکە کورت و کۆبکاتەوە، فەرموودەی زیلیەدەینە: (عَنْ أَبِي

---

[١] بوخاری (١٠٣٩).

هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ انْصَرَفَ مِنْ اثْنَتَيْنِ فَقَالَ لَهُ ذُو الْيَدَيْنِ أَقَصُرَتْ الصَّلَاةُ أَمْ نَسِيتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَصَدَقَ ذُو الْيَدَيْنِ فَقَالَ النَّاسُ نَعَمْ فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَصَلَّى اثْنَتَيْنِ أُخْرَيَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ ثُمَّ كَبَّرَ فَسَجَدَ مِثْلَ سُجُودِهِ أَوْ أَطْوَلَ) واته: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دوو رکات نوێژی پێ کردن وتەشریفی برد، زولیەدەین خوا لێی رازی بێت لێی پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوە نوێژ کورت بۆتەوە یان جەنابت بیرت چوو؟! پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە خەڵکەکەی پرسی: زولیەدەین راست دەکات؟! ووتیان: بەڵێ، ئیتر گەڕایەوەو دوو رکاتی تری کرد پاشان سەلامی دایەوە، ئینجا سوجدەی بردەوە لە سوجدەکانی تری درێژتر[١]..

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی نەفەرموون: ئەگەر نوێژ کورت بکراباتەوە پێم دەووتن تا نییەتی کورت کردنەوەی نوێژم لەگەڵ بهێنن

سوودی ئەمە ئەوەیە ئەگەر کەسێك گەشتیار بوو، نوێژی لە دوای ئیمامێکەوە کرد کە دەخوازێت نوێژەکە کورت کاتەوە، ئەمیش بۆی هەیە دەسبەجێ نوێژەکەی لەگەڵدا بکات بێ ئەوەی پێشتر نییەتی کورت کردنەوەی نوێژی هێنابێت..

**٥ . نوێژی کورتکار لە دوای نوێژی تەواوکارەوە:** ئەمەش جائیزە، بەڵام دەبێت مەئموومەکەش وەکو ئیمام نوێژەکەی بە تەواوی بکات، یەعنی کورتکاری نوێژ بۆی نیە تەنها دوو رکات لەگەڵ نیشتەجێیەکدا بکات کە چوار رکاتی یان سێ رکاتی دەکات.. با کابرای

---

[١] باسی ئەمە لە سوجدەی سەهوودا دێت ان شاء الله کە دوو سوجدەی بردووە..

کورتکار فریای کەمێك لە نوێژەکەش کەوتبێت.. بۆ نموونە میوانێکی گەشتیار ئیقتیدا بە خاوەنماڵێکی نیشتەجێ دەکات، نوێژی خەوتنانەو میوانەکە تەنها فریای تەحیاتی ئەخیر کەوتووە، دەبێت کە ئیمامەکە ـ کە خاوەن ماڵە نیشتەجێکەیە ـ نوێژی تەواو کرد میوانەکە ـ کە گەشتیارەکەیە ـ هەستێتەوەو چوار رکات نوێژی خەوتنانەکە بە تەواوی بکات.چونکە:

ـ سەیدنا موسای کوڕی سەلەمە خوا لێی رازی بێت دەڵێ: (كُنَّا نُصَلِّي مَعَ ابْنِ عَبَّاسٍ بِمَكَّةَ أَرْبَعًا، فَإِذَا صِرْنَا إِلَى رِحَالِنَا صَلَّيْنَا رَكْعَتَيْنِ، فَقُلْتُ: إِنَّا نُصَلِّي مَعَكُمْ أَرْبَعًا فَإِذَا رَجَعْنَا إِلَى رِحَالِنَا صَلَّيْنَا رَكْعَتَيْنِ. قَالَ: تِلْكَ سُنَّةُ أَبِي الْقَاسِمِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ)[١] واتە: لە مەککە لە خزمەت ئیبنوعەبباسدا بووین، پێم ووت: ئێمە کە لەگەڵ ئێوە دەبین چوار رکاتی دەکەین، کە دەشگەڕێینەوە لای کاروان و بارەکانمان دوو رکاتی دەکەین، فەرمووی: دەی ئەوە سووننەت و رەفتاری ئەبولقاسمە صلى الله عليه وسلم..

ـ سەیدنا ئەبومەجلیز خوا لێی رازی بێت دەڵێ: (قُلْتُ لابْنِ عُمَرَ: الْمُسَافِرُ يُدْرِكُ رَكْعَتَينِ مِنْ صَلاةِ الْقَومِ - يَعْنِي الْمُقِيمِينَ - أَتجْزِيهِ الرَّكْعَتَانِ أو يُصَلِّي بِصَلَاتِهِمْ؟ قَالَ: - فَضَحِكَ – وَقَالَ: يُصَلِّي بِصَلَاتِهِمْ)[٢] واتە: لە ئیبنوعومەرم پرسی: گەشتیار کە فریای دوو رکاتی خەلکە نیشتەجێکان دەکەوێت، بۆی هەیە لەو دوورکاتە زیاتر نەکات؟ یان دەبێت لەگەڵ

---

[١] ئیمامی ئەحمەد (٢١٦/١)، ئیبنوخوزەیمە (٩٥٢)، بەیهیقی (١٥٣/٣) شێخی ئەلبانی فەرموویەتی سەحیحە: الارواء (٢١/٣)..

[٢] بەیهیقی (١٥٧/٣)، ئیبنو ئەبی شەیبە (٣٣٥/١)، شێخی ئەلبانی لە الارواء (٢٢/٣) دا دەفەرموێ: سەحیحە..

ئەواندا نوێژەكە تەواوكات؟! دەڵێ: پێكەنی و فەرمووی: نوێژەكەی لەگەڵ ئەواندا دەكات..

ـ ناشێت كەسێك لە نوێژدا ئیقتیدا بە كەسێكی تر بكات كە دووەمیان نوێژێك دەكات كە لە هەڵسوكەوتیدا لەگەڵ نوێژی یەكەم كەسدا جیاواز بێت، وەك ئەوەی كەسێك نوێژی جەنازە دەكات، یەكێكی تر بیەوێت نوێژی نیوەڕۆی لە دواوە بكات!! ئەمە نابێت..

★ ★ ★

## توێژینەوەیەکی وورد لەسەر
## بیدعەی نییەت هێنان بە دەم

لە هەولێر بووم لە مزگەوت لە دوای مامۆستایەکی بەڕێزەوە نوێژی عەسرمان دەکرد، باوکی ئەو مەلا بەڕێزەش مەلایەکی ناسراوی شار بوو رحمه الله، بەڵام خاوەن وەسوەسەیەکی سەیر بوو، هەرچەندی دەکرد نییەتی نوێژەکەی پێ دانەدەمەزرا، ئێمە رکاتی یەکەم و دووەمیشمان تەواو کرد ئەو هەر دەیفەرموو: نییەتم هەیە... هەر چوار رکاتەکەمان تەواو کرد ئەو هەر دەیفەرموو: نییەتم هەیە.. کە سەلاممان دایەوە، فەرمووی: ئەها دیسان بۆم دانەمەزرا!!

جارێکی تر لە تاران لە ماڵی مامۆستایەکی بەڕێزی پاوەیی بووم، کاتی نوێژی خەوتنان هەستاین بۆ نوێژ، قامەتم بۆ دەکرد فەرمووی: من وا زوو نییەتەکەم بۆ دانامەزرێت، تۆ ببە بە ئیمام، عەرزم کرد: جا من پەلەم چیەو وا لە خزمەتتدام.. لە دوایەوە وەستابووم و هەر دەیفەرموو: نی، نییە.. نییەتم.. نییەتم هەیە.. نییەتم هەیە چوا.. چوار.. نییەتم هەیە چوار.. کە دەگەیشتە وشەکانی دواتر دڵخۆش دەبووم دەمووت: خوایە سەری خەیت.. کەچی لەپڕ نییەتەکەی دەپساو دەهاتەوە سەر: نی.. نییەت، نییەتم، نییەتم هەیە.. بەم شێوەیە حەڤدە دەقیقە لە دوایەوە راوەستام تا نییەتی ئەو نوێژەی هێنا!!

داماوێکی خواناسی کوردی رۆژهەڵات لە تاو وەسوەسەی نییەت هێنانی لەئێرانەوە تەلەفۆنی بۆ کردم، ووتی: لەوەتای بانگی مەغریبی داوە لەسەر بەرماڵم و نییەتم پێ دانامەزرێت و نوێژیش دە دەقیقەی ماوە!!

ئاخر ئەمە ئەشکەنجەدانە یان خواناسی؟! بە خەیاڵ بیری لێ بکەینەوە کە چۆن ئەم داماوە یەك دانە سەعاتە لەسەر بەرماڵەکەی هەر دەڵێ: نی، نییە، نییەت.. نییەتم.. نییەتم هە.. نییەتم هەیە..

شەرعم لای مامۆستایەکی بەڕێز دەخوێند لە باسی نییەتدا تووشی وەسوەسەیەکی کردم، سێ دانە ساڵ رەنجمدا تا لە کۆڵم بۆوە!!

ئەمە روداون و لە مەلامەوە بینیووە!! دەبێت ئەمەیان لە کام بەڵگەوە هێنابێت؟! ئەگەر نییەت هێنانی نوێژ ئەوەندە قورس بوایە ئەو یاوەرە بەڕێزانە کە لە بەرەی شەڕە شمشێردا بەرەو دوژمن دەوەستان چۆن دەیانتوانی نوێژێك دابەستن؟!

ئەمانە هۆکاری سەرەکی ئەم توێژینەوەمە کە ساڵانێکە خۆی لێ لا دەدەم بەڵام وا ئێستا ناچار بووم، کات وشوێن وناوەرۆکی بابەتەکەش شیاوی ئێستایە.. خوا یارمەتیدەرمان بێت..

## پێناسەی نییەت:

نوێت یان نییەت ووشەیەکی عەرەبییە:

ـ لە رووی زمانەوانیەوە لە (نَوَى الشَّئَ يَنْوِيهِ) دوە هاتووە کە وەکو ئیبنو مەنزوور دەڵێ: بریتیە لە: (الإعتزام و التوجُّه والنهوضُ نَحوَ الشئ).. (ابن منظور: لسان العرب: مادة قصد).. کە هەمووی بە مانای وویست ومەبەست ونیازن.. نییەت کە کۆدەکرێتەوە دەوترێت: نییات..

ـ لە رووی زاراوەییەوە: لەبەر ئەوەی مانای نییەت هەر (قصد) ە، شەرعناسانێکی وەکو ئیمامی نەوەوی پێناسە زمانەوانیەکەی کردۆتەوە بە پێناسەی زاراوەیی (المجموع (٣٦٧/١)..

قورافی شەرعناسی مالیکی دەڵێ: نییەت ئەو وویستەیە کە کەسێك لە دڵیدا داناوەو بە تەمایە بیکات.. (الذخیرة ١/١٣٤).

زانایان هەر یەکە بە جیا لە دیدو مەبەستی خۆیەوە پێناسەی زاراوەیی نییەتیان کردووە، بۆیە دەبینیت پێناسەی زمانەوانێك جیاوازە لە پێناسەی شەرعناسێك، پێناسەی شەرعناسێك جیاوازە لە پێناسەی تەزکیەوانێك.. بەلام پێناسەی هەندێك لە شەرعناسە توێژەرەوەکان ووردەکارترە، بەیزاوی دەڵێ: نییەت: بریتیە لە هۆشدانی دڵ بە شتێك کە خاوەنەکەی وا گومان دەبات کە سوودی بۆ دەهێنێت یان زیانی لێ لا دەبات، لە رووی شەرعیشەوە بریتیە لە: وویست وئاراستەی ئەنجامدانی کارێك کە فەرمانی خوای گەورەیەو لەبەر خاتری خوای گەورەش دەکرێت[١]..

ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە ئەو پێناسەیە کە بریتیە لە (وویستنی ئەنجامدانی خواپەرستی لەبەر خاتری خوا) وەکو نوێژو رۆژووە کە لە دڵدایەو کەس ناتوانێت حوکمی بەسەردا بدات..

## نییەت و زانین و کردەوە:

نییەت نیازی دڵە، پاڵنەری ئیرادەیە، پێویستی بە دوو شتە: زانین و کردەوە، زانین دەبێت پێش کردەوەکە کەوتبێت، چونکە کردەوەکە بەرهەمی زانین و وویستەکەیە.. تۆ دەبێت بزانی چی جائیزە تا بیکەیت، چی جائیز نیە تا نەیکەیت، لە هەردووکیشیاندا دەبێ پابەند بیت بە

---

[١] ئەم پێناسە لای زۆرینەی زانایان و شەرعناسان پەسەندە دەیانی وەکو ئیبنو حەجەری عەسقەلانی و مەناوی و سیوتی و کرمانی و سندی و تیبی و شەوکانی.. کرمانی (١/١٨) و العینی (١/٢٣)، یان سیوتی: الاشباە و النظائر (ل ٣٠) نەقڵیان کردووە.

خواوویستی و سنوری شەرعەکەوە، کەسێك نەزانێت سوجدەی تیلاوەتی قورئان چیە، چۆن داوای لێ بکرێت لەبەر خاتری خواو بە گوێرەی شەرع بیکات.. نوێژو رۆژوو باقی خواپەرستیەکانی تریش هەر ئاوان.. ئیمامی غەزالی رەحمەتی ئەوەی جوان لێك داوەتەوە کە نیازو مەبەست پێویستی بە زانین هەیە، دەڵێ: مرۆڤ پێویستی بەوەیە کە شتێك بۆ خۆی بەدەست بهێنێت کە لەگەڵ نەفسی خۆیدا دەگونجێت، شتێکیش لە خۆی دوور دەخاتەوە کە زیانی بۆ نەفسی خۆی هەیە.. ئەم دوو دیدەش پێویستیان بە زانینی پێش وەخت و پێناسەی شتەکان هەیە، پێویستیان بە پەی بردن بە شتی بەسوودو شتی زیانبەخش هەیە، تا ئەویان پەیداکات و ئەمیان لە رێی خۆیدا رادات.. ئەو کەسەی خۆراکێك نابینیت و نازانێت ئەوە خۆراکە چۆن داوای لێ دەکرێت بیخوات؟! ئەو کەسەی نازانێت ئەوە ئاگرەو سوتێنەرە چۆن خۆی لێ دوور دەگرێت؟! ئاخر بۆیە خوای گەورە رێنمایی و زانیاری بەخشیووەو هۆکاری ناسینیانی لە هەستەوەرەکان و پەی پێبردنە نهێنیەکاندا رەخساندووە[١]..

لە جێیەکی تردا گاڵتەی بەو کەسانە دێت کە بە لەفز نییەتی شتێك دێنن و وا دەزانن ئەوە نییەت هێنانە! لەوەش تەئکید دەکاتەوە کە نییەت لەبەر دەستی خاوەنەکەیدایە دەتوانێت نییەتی پاك بێت، دەشتوانێت پیسی نەفس و دنیاوویستی و هەواوهەوەس بە نییەتی خۆیەوە هەڵواسێت، بۆیە شەرعیش حوکمی خۆی لەسەر نییەتی کابرا دامەزراندووە.. ئیمامی غەزالی دەڵێ: ئەوە بزانە کە خەڵکی نەفامی وا هەیە کە دەڵێین دەبێ نییەتی خۆت پاك کەیتەوە، دەڵێ نییەتمە ئەم

---

[١] الغزالي: إحياء علوم الدين (٣٦٥/٤).

دەرسە بۆ خوا دەڵێمەوە، نییەتمە لەبەر خـاتری خـوا دەخـوێم، وا دەزانێـت ئەمـە نییەتـە!! هـەیهوو هـەیهوو.. ئەمـە قسـەی نەفسـە ، ئەمـە ووشـەی سەرزمانە، ئەمە چوونە لە یادێکەوە بۆ یادێکی تر.. نییـەت هـیچ یـەکێك لەمانە نیە.. نییەت: وویست و ئاڕاستەی نەفس و حەزو مەیلێتی بۆ ئەوە دەچێت کە وای لێ حاڵی بووە کە ئێستا یان لە داهاتوودا ئامـانجی دێنێتـە دی.. ئەمەش هەر بەوە نابێت کـە بیـەوێت.. ئـەو وویستنە وەکو ئەوەیـە کەسێك بڵێ: نیازم هەیە حەزم لە خواردن بێت!! نیازم وایە فلانم خـۆش بوێت و شەیدای بم، ڕێزی لێ بگرم و بە مەزنی دانێم.. ئەمە مەحاڵە[1]..

**عادەت و عیبادەت بە نییەت لێك جیا دەکرێنەوە:**

شەرعناسان دەڵێن: ئەوەی کە کیتاب و سوونـنەت فەرمانی بەسەردا داوە، دڵ و دەروونی کابرایە نەك جەستەی.. جەستە ئامێرە.. نییەتەکەش کاری دڵ و دەروونە نەك کارو ڕەفتاری جەستە.. بۆیە نییەت کاریگەری لەسەر حوکم هەیە.. زۆر کارو ڕەفتار هەیە وەکو یەك ئەنجام دەدرێن، تەنها بە نییەتی بکەرەکانیاندا دەزانرێت کە ئایا مەبەست لێی خواپەرستی بووە یان شیرك! وەك ئەوەی دوو کەس دوو مەڕ سەردەبڕن: یەکەمیان بۆ خوای سەر دەبڕێت و ڕەفتارەکەی تەوحیدە، دووەمیان لەبەر پێی سەرۆکدا سەری دەبڕێت و ڕەفتارەکەی شیرکە!!

بە نییەتدا دەزانرێت کارو ڕەفتار خواپەرستیە یان پابەندبوونە بە خوو نەریتی کۆمەڵایەتی[2]؟! وەکو:

---

[1] إحياء علوم الدين (٣٧٣/٤).

[2] القرافي: الذخيرة (٢٣٦/١)، السيوطي: الاشباه والنظائر (ل ١٣)، عزالدين بن عبدالسلام: قواعد الاحكام (٣٠٧/١).

١ـ غوسڵ دەركردن و خۆشتن و خۆ فێنك كردنەوە.. هەر سێكیان هەر خۆ تەڕ كردنن بە ئاو، ئەوەی جیایان دەكاتەوە نییەتی بكەرەكانیانە. كابرا غوسڵی جومعە دەردەكات لەبەر ئەوەی خواپەرستیە، ئەوی تریان خۆی دەشوات چونكە چڵك و چەپەڵی پێوەیە، سێیەمیش گەرمایەتی..

٢ ـ سێ كەس پارەیان داوەتە سێ كەسی هەژار، یەكەمیان لەبەر خاتری خوا زەكاتی دەركردووە، دووەمیان لەبەر زیرەكی قوتابیە هەژارەكە خەڵاتی كردووە، سێیەمیان بە پێی عورفی كۆمەڵگەكەی جەژنانەی داوەتێ.. چی ئەم سێ رەفتاری بەخشینە لە یەكتر جیا دەكاتەوە؟! نییەتی بكەرەكان..

٣ ـ خۆگرتنەوە لە خواردن و خواردنەوە: سێ كەس خۆراك ناخۆن، یەكیان بەرۆژووەو بۆ پاداشتی لای خوای گەورە فەرمانەكەی جێبەجێ دەكات، دووەمیان رێجیم دەكات و دەیەوێت خۆی لەڕتر كات.. سێیەمیان پارێز دەكات، پزیشك پێی ووتووە ئەو خۆراكە نەخوات.. چۆن ئەم كارانە جوێ دەكرێنەوە؟! بێ گومان بە نییەتی بكەرەكانیان.

٤ ـ سێ كەس لە نوێژن لە مزگەوت: یەكێكیان چووە تا نوێژ بە جەماعەت بكات، دووەمیان بۆ جاسووسی چووە، سێیەمیان لەگەڵ هاوڕێیەكی لە تەعزێخانەكە بوو، رووگیر بووە بۆیە چۆتە نوێژ! چۆن ئەمانە جوێ دەكرێنەوە؟! بە نییەتی بكەرەكانیان..

٥ـ سێ كەس سێ مەڕ سەردەبڕن: یەكەمیان قوربانی لەسەرەو دەیكات، دووەمیان مەڕدارەو میوانی زۆری هاتوون، سێیەمیان

دەوڵەمەندێکی ریابازەو پێی شەرمە خەڵك قوربانی دەکەن ئەویش نەیکات!! شەرع حوکمی ئەمانە چۆن دەدات؟! بە پێی نییەتەکانیان..

ئینجا لە ناو بازنەی هەر یەکێکیشیاندا خانەی تر هەیە کە جوێ کردنەوەی تری تێدایەو زەروورییە، وەکو بازنەی نوێژەکان:

١ـ سێ کەس نوێژ دەکەن: یەکیان گەشتیارەو دوو رکات فەرزی نیوەڕۆ دەکات، دووەمیان سوونەتی راتب دەکات، سێیەمیان نوێژی تەحییەتول مەسجید دەکات! حوکمی خۆیان ونوێژەکانیان بە پێی نییەتەکەیانە.

٢ـ دوو پۆل خەڵکی لەو دەشتە وەستاون نوێژ دەکەن، پۆلێکیان نوێژە بارانە دەکات، پۆلەکەی تر نوێژی جەژن.. نوێژەکانیان وەك یەکە بەڵام نییەتەکانیان جوێ کەرەوەیە..

٣ ـ رەمەزان نیەو سێ کەس بەڕۆژوون: یەکەمیان نەزری لەسەرەو دووەمیان قەرزی رەمەزان دەداتەوەو سێیەمیان کەفارەتی قەتڵە.. هەر سێکیشیان فەرزە.. لەو لاوەش سێ کەسی تر بەڕۆژوون: یەکەمیان رۆژە ناڕۆژێك بەڕۆژووە، دووەمیان لەبەر ئەوەی پێنج شەممەیە، سێیەمیان لەبەر ئەوەی پازدەی مانگی عەرەبییە.. رۆژووی هەر سێکیان سوونەتە، ئەوەی جوێیان دەکاتەوە نییەتی رۆژووەوانەکانە..

کەوابوو نییەت کاریگەرە، بەڵام ئەم نییەتە وویستی دڵ و هۆشە نەك رستەی هۆنراوەی زوبان.. نەك وەکو ئەوەی لە مزگەوتەکانی کوردستانی ئێمەدا شەوانی رەمەزان هاوار دەکەن: رەحمەتی خواتان لێ بێت نییەتی رۆژووی سبەینێ بێنن بە فەرز ان شاء اللە تەعالا.. ئینجا هەر یەك بە دەنگی بەرز نییەت دێنێت!!

## نییەت چارەکی زانستە :

زۆر لە پێشەوایان و شەرعناسان و زانایان نییەتیان بە چارەکی زانست یان بە سێیەکی زانست داناوە، لەوانە: ئیمامی شافیعی و ئیمامی ئەحمەدو ئیبنول مەدینی و ئەبو داوودو دارەقوتنی و بەیهیقی.. (الاشباه والنظائر ل٩). چونکە کاریگەرییەکەی هەر لە دنیادا نیە، بەڵکو لە قیامەتدا دەبێتە هۆکاری هەڵاوێردنی چاك و خراپ! لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: (عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، (قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَغْزُو جَيْشٌ الْكَعْبَةَ، فَإِذَا كَانُوا بِبَيْدَاءَ مِنْ الْأَرْضِ، يُخْسَفُ بِأَوَّلِهِمْ وَآخِرِهِمْ،: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ يُخْسَفُ بِأَوَّلِهِمْ وَآخِرِهِمْ، وَفِيهِمْ أَسْوَاقُهُمْ، وَمَنْ لَيْسَ مِنْهُمْ، قَالَ: يُخْسَفُ بِأَوَّلِهِمْ وَآخِرِهِمْ، ثُمَّ يُبْعَثُونَ عَلَى نِيَّاتِهِمْ)[1] بوخاری و موسلیم واتە: عائیشەخان خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا فەرمووی: سوپایەك دێت بۆ ئەوەی کەعبە داگیر کات، بەڵام لەو کاتەی دەگەنە دەشتایی خوای گەورە سەرەتاو کۆتایان بە زەویدا ڕۆ دەبات، عائیشە خاتوون دەڵێ: ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا، سەرەتاو کۆتایان بە زەویدا ڕۆ دەبات لە کاتێکدا خەڵکی بازاڕییان تێدایە، کەسانی وای تێدایە کە لەگەڵیاندا نەبووە، فەرمووی: سەرەتاو کۆتاییان بە زەویدا ڕۆ دەبات، پاشان لەسەر نییەتی خۆی زیندوویان دەکاتەوە..

---

[1] شرح مسلم (٧٠٤/١٨).

## نییەت لە دڵدایە:

ئیمامی ئیبنوتەیمییە دەڵێ: شەرعناسان لەسەر ئەوە کۆن کە شوێنی نییەت دڵە.. (الفتاوی ١٨/٢٦٢).. ئەمما ئەوەی کە هەندێك لە شەرعناسان بە تایبەتی شافیعیەکانی وەکو القەففال[1] بە پێچەوانەی هەموو شەرعناسانەوە پێی وایە هەر کەسێك نییەتی زەکاتی بە لەفز بە دەم هێنا ئەوە جێی نییەتی دڵیشی بۆ دەگرێت!! پاشان هەندێك شەرعناسی تری شافیعی وەکو ئیمامی غەزالی و ئیمامی حەرەمەین فەرموویانە کە ئەوە بۆچوونی ئیمامی شافیعی خۆیەتی[2].. دوای توێژینەوەو بەدواداچوون دەردەکەوێت کە ئەوەی قەففال فەرموویەتی دروست نیە. چونکە ئەوەی ئەو دەڵێ کە لە زەکاتدا دەشێت پشکە زەکاتی سامانی مورتەددێك دەرکرێت لە کاتێکدا کابرای مورتەدد نییەتیشی نەبووەو نییە بیدات.. بەڵام ئەگەر هات و ووتی ئەمە زەکاتەکەمە وەردەگیرێت.. بەڵام ئایا ئەمەی ئەو ئیستیدلالی پێکردووە دەبێتە هۆی پاداشت دانەوەی کابرای مورتەدد؟! ئەمە موناقەشەیەکی زۆرتری دەوێت..

کە دەشفەرموێ لە زەکاتداندا لە جیاتی دان هەیە کە نییەتی دڵی پێویست نیە، وا نیە، خۆ حەج و عەمرە لە جیاتی خەڵکی دەکرێن، بەڵام نییەتی بەکرێگرو بەکرێگیراو تێیاندا فەرزەو کاری هیچیان بێ نییەتی دڵ نابێت ..

---

[1] ئەحمەدی کوڕی محمدی کوڕی حسەینی شاشی قەففال سەرۆکی شافیعیەکانی سەردەمی خۆی لە بەغدا، بەرپرسی مەدرەسەی نیزامییەی بەغدا بوو، ساڵی ٥٠٧ ك کۆچی دوایی کرد.. چەندین کتێبی هەیە وەکو: (حلیة العلماء في معرفة مذاهب الفقهاء)، (المعتمد)، (الشافي في شرح مختصر المزني).. (شذدرات الذهب ٤/١، معجم المؤلفین ٨/٢٥٣).

[2] النووی: المجموع (٦/١٨٥).

ئەمما ئەوەی کە فەرموویانە ئەوە بۆچوونی ئیمامی شافیعیە، ئەوەش بەدواداچوونێکی دەوێت، چونکە ئیمامی شافیعی خۆی دەڵێ: من ووتم کە زەکاتدان بە بێ نییەت نابێت، چونکە کابرا بۆی هەیە سامانێك ببەخشێت ونەزانرێ ئایا زەکاتە یان خێروخێرات! ئەگەر مەبەستی زەکات بووبێت، دەبێت دیاری کات، جا چ بەوەی لەدڵی خۆیدا ساغی کردبێتەوە یان بەوەی بە لەفز بیڵێت[1]..

پاشان دەڵێ: ئەوەی رێی لێگرتم بڵێم نییەتی نوێژیش وەکو زەکاتە ئەوەیە کە نوێژو زەکات لە هەندێك حاڵەتدا جیاوازییان هەیە، مەگەر نابینیت زەکات دەشێت کابرا پێش وەخت بیدات، یان دەشێت دەسەڵاتی ئیسلامی لێی سەنێت بێ ئەوەی خۆی نییەتی بەخشینی هەبێت، لەو حاڵەتەیدا فەرزی زەکاتەکەی لەسەر دەکەوێت، بەڵام ئەمە لە نوێژدا وا نیە.. (ئیمامی شافیعی: الأم ٢/١٩).. هەندێك لە شەرعناسانی مەزهەب ئەمەیان کردووە بە هەنجەتی نییەت بە لەفز هێنان!! لە کاتێکدا کە شەرحەکەی ئیمام خۆی روونی دەکاتەوە کە جیاوازی نێوان نییەت لە زەکات و نییەت لە نوێژیدا دیووە.. لەمەش روونتر ئەوەیە کە خۆی فەرموویەتی: ئەگەر کابرایەك دە درهەمی جیا کردەوەو ووتی: ئەگەر ئەو پارەیەی هەمەو ئێستا لام نیە، بە سەلامەتی بێتەوە دەستم،ئەم دە درهەمە دەخەمە بری زەکاتەکەی یان دەیکەمە خێروخێرات.. ئەگەر پارە غائیبەکەی بە سەلامەت هاتەوە دەست، ئەم دە درهەمەی دەبێتە خێروخێرات نەك زەکات، چونکە نییەتەکەی ساغ نەکردەوە کە ئەوە

---

[1] بە لەفز ووتنەکەی دەبێتە هەواڵدان، چونکە ئەگەر نەڵێ زەکات بووە، دەسەڵاتی ئیسلامی زەکاتەکەی لێ دەستێنێت.. بۆیە لێرەدا نییەت بە لەفزەکە روون کردنەوەیەکە حوکمی تری لەسەر بنیات دەنرێت.. والله اعلم.

زەكاتی ئەو پارەیەیە.. (ئیمامی شافیعی: الأم ١٩/٢).. لەبەر ئا ئەمەیە شافیعیەكان فەرموویانە دەبێت لەو كاتەی نییەتی ئەنجامدانی نوێژێكی هەیە، دەبێت نییەتەكە بە دەمیش بهێنێت!

لە راو بۆچوونی ئەمانیش سەیرتر قەولی هەندێك لە حەنەفیەكانە كە فەرموویانە: ئەگەر كەسێك دەسەڵاتی بەسەر دڵیدا نەبوو بیهێنێتە ژێر بار بۆی هەیە نییەتەكەی بە دەم بیهێنێت.. (ئیبنو نوجەیمی حەنەفی: الاشباه والنظائر (ل٤٥)!! ئاخر ئەمە چ گەرەلاوژێیەكە؟! ئایا مەعقوولە تۆ وویستت لە دڵی خۆتدا بۆ دروست نەبێت كە دەچیت بۆ مزگەوت، ناچار دەبیت بڵێیت: نیەتم هەیە دەچم بۆ مزگەوت؟!

بە هەر حاڵ: وەكو سیوتی دەڵێ: رای ئەو كەسەی پێی وایە دەشێت نییەت بە لەفز بهێنرێت لە جیاتی نیازی دڵ، رایەكی لاوازە.. (سیوتی: الاشباه والنظائر (ل٣٢).. نەك لاوازە، بەڵكو نامۆی ناو شەرعە (شەرحی العەینی لەسەر بوخاری ٣٣/١) و بێ لانەی ناو ئیسلامەكەیە.. ئیبنو تەیمییە دەڵێ: هەموو پێشەوای موسوڵمانان لەسەر ئەو بۆچوونەن كە ئەگەر كابرا بە لەفز نییەت بهێنێت و لە دڵیدا نییەتی نەبووبێت، نییەتی دانەمەزراوە.(ئیبنوتەیمییە: مجموع الفتاوى (٢١٨/٢٢).

## نییەت هێنان بە لەفز بە دەنگی بەرزو نزم بیدعەیەو حەرامە:

زۆرینەی زۆری مەلای شافیعی مەزهەب بە تایبەتی مەلای كورد، لە پێش هەمووشیانەوە مامۆستا مەلا عبدالكەریمی مودەڕیس گۆڕی پڕبێت لە نوور دەڵێن: نییەت هێنان بە لەفز سوونەتە!! بەڵام بە راستی ئەمە سەرخستنێكی دەمارگیرانەی مەزهەبەو هیچی تر.. ئەوەمان نەقڵ كرد كە نییەت بە لەفز هێنان نە فەرزە نە سوونەتە، نە رای یاوەرانە، نە قەولی

شەرعناسانە بە پێچەوانەوە شەرعناسان فەرموویانە: هەر كەسێك نییەت بە لەفز بە دەم بهێنێت و پێی وا بێت ئەوە سوونەتە دەبێ سزا بدرێت!!

ـ قازی جەمالوددینی شافیعی[١] دەیفەرموو: نییەت هێنان بە لەفزو قورئان خوێندن لە دوای ئیمامەوە سوونەت نین، بەڵكو مەكرووهن، ئەگەر دەنگەدەنگی لێ بكەوێتەوە حەرام دەبێت.. هەر كەسێك بڵێ نییەت هێنان بە لەفز سوونەتە بە هەڵەدا چووە، نە بۆ ئەوو نە بۆ كەسی تر جائیز نیە بە بێ زانیاری بە ناوی دینەوە دابهێنن.. (ئیبنو تەیمییە: مجموع الرسائل الكبرى ١/٢٥٤)..

ـ ئەبوعبدالله محمدی كوڕی ئەلقاسمی تونسی مالیكی دەڵێ: نییەت كاری دڵە، ووتنی بە دەم بیدعەیە، تەشویشێكی زۆر لە ناو موسوڵماناندا دروست دەكات..

ـ شێخ عەلائوددین ئیبنول عەتتار دەیفەرموو: دەنگ بەرز كردنەوە بۆ نیەت هێنان، ئەگەر بۆ نوێژخوێنانی تر تەشویش دروست نەكات بیدعەیەكی ناشیرینە، ئەگەر تەشویش دروست كات بە كۆڕای شەرعناسان حەرامە، ئەگەر مەبەستی ریای تێكەوێت لە دوو سەرەوە حەرام دەبێت و دەبێتە گوناحی كەبیرە.. ئەو كەسانە لەسەر هەقن كە دەڵێن سوونەت نیە، هەر كەسێكیش وا بزانێت ئەمە لە دینی خوادایەو ئیعتیقادی وا بێت پێی كافر دەبێت، ئەگەر ئیعتیقادی وا نەبێت هەر گوناحبارەو دەبێت موسوڵمانان بە روویدا بوەستنەوەو رێی لێ بگرن، چونكە كەس ئەمەی لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم یان لە یەكێك لە یاوەرانەوە

---

[١] قازی جەمالوددین ئەبوڕەبیع سولەیمانی كوڕی عومەری شافیعی لە شەرعناسانی شافیعیە، ئەسڵی مەغریبییە بەڵام لە ساڵی (٦٤٥ ك) لە شام لەدایك بووەو لە (٧٣٤ ك) لە میسر كۆچی دوایی كردووە، لە زۆر وولات قازی بووە.. بڕوانە: الزركلي: الاعلام (١٩٤/٣).

ریوایەت نەکردووە، کەس لە کەسێکی وای نەگێڕاوەتەوە لەوانەی دینەکەیان لێ وەردەگیررێت..

یەك کۆمەڵ راو بۆچوونی تری واتوندو تیژم لەبەر دەستدایە لەسەر بە خەتەر ناساندنی ئەم بیدعەی نییەت هێنانە بە دەم.. کە لایەنگری سزاکانیان نیم، بەڵام ئەو توندوتیژییە ئەوە عەکس دەکاتەوە کە ئەو زانایانە چەند دژی ئەو بیدعەیە وەستاونەتەوە، کەچی لە کۆمەڵگەی داماوی کوردەواری ئێمەدا پێش هەموو شتێك ئەوەی فێر دەکەن[١]..

**ئیمامی شافیعی نەیفەرمووە نییەت بە دەم بهێنن:**

کەس لە چوار پێشەوا شەرعناسە بەرێزەکەی ئەهلی سووننەت و غەیری ئەوانیش کە شوێنکەوتووی هەبێت، نەیفەرمووە نییەت بە دەم بهێنرێت، نە بۆ غوسڵ و دەستنوێژ، نە بۆ نوێژو رۆژوو، نە بۆ حەج و خواپەرستی تر.. جەدەلی نییەت هێنان بە دەم زیاتر لە مەزهەبی شافیعیدایە چونکە هەندێك شەرعناسی مەزهەبەکە لە هەندێك عیباراتی ئیمامی شافیعی خۆی کە لە کتێبی (الأمُ بەرگی ٣ / لاپەرە ١٣٢) دا هاتووە وای لێ حاڵی بوون.. کەسانێکی وەکو ئەبوعبداللەی زوبەیری[٢]، ئیمامی شافیعی لە باسی حەجدا لەو کتێبەیدا (لەو بەرگ و لاپەرەیەدا)

---

[١] هاورێیەکمان لە پاکستان ناوی دەرچوو بوو بۆ ئەوروپا بێت، هاتە لامان ووتی: لە منداڵیمەوە مولتەزیمم بە دینەکەوە بەڵام دەمەوێت بچمە ئەوروپا شتێکم فێر کەن، خۆشم سیو پێنج نییەتم نوسیوەتەوە!! دوایی لە ئەوروپا کە کەمێك لە دینەکە حاڵی بوو چووە کۆلیجی شەریعەی دیمەشق و الحمد لله تەواوی کرد.رەنگە زانیبێتی نییەت هێنان بەزمە!

[٢] زوبێری کوڕی ئەحمەدی زوبێری لە نەوەی سەیدنا زوبەیری کوڕی عەووامە، شەرعناسی شافیعیانی بەسرە بوو ساڵی (٣١٧ ك) کۆچی دوایی کردووە رحمە اللە..

دەفەرموێ: (إذَا نَوَى حَجّاً وَعُمْرَةً أجزَأ، وَإنْ لَمْ يَتَلَفَّظْ، وَ لَيسَ كَالصَّلَاةِ لا تَصُحُّ إلا بالنُّطقِ) واتە: ئەگەر نییەتی حەج وعەمرەی پێکەوە هێنا جائیزە، با بە لەفزیش نەیووتبێت، چونکە ئەمە وەکو نوێژ نیە کە بە ووتن نەبێت نابێت. ئیمامی نەوەوی بەرپەرچی هەموویان دەداتەوەو ئەوە روون دەکاتەوە کە ئەوان بە هەڵە لە قەولەکەی ئیمامی شافیعی تێگەیشتوون.. دەڵێ: (قَال أصْحَابُنا: هذا غَلَطُ هذا القَائِلِ، وَلَيسَ مُرَادُ الشَّافِعِيِّ بالنُّطقِ فِي الصَّلاةِ هذا، بَلْ مُرَادُهُ التَّكْبِيرُ (المجموع ٣/٢٤٣) واتە: یاوەرانی ئێمە (پێشەوایانی مەزهەبی شافیعی) فەرموویانە: ئەمە هەڵەی ئەو کەسەیە کە وای ووتووە (وەکو زوبەیری و قەففال نەك ئیمام) مەبەستی شافیعی ئەوە نەبووە (کە نییەت بە دەم بهێنرێت) بەڵکو مەبەستی نوتق کردن بووە بە تەکبیرەی نوێژەکە (ووتنی الله اکبری دەسپێکی نوێژ).. ئیمامی شافیعی لە چەندین شوێنی تریشدا ئەم جۆرە عیبارەتانە بە هاوشێوەیان دووپات دەکاتەوە بۆیە لای ئەو شەرعناسە بەڕێزانەی مەزهەبەکە ئەو تێکەڵییە دروست بووە.. بۆ نموونە کە دەڵێ: (فِيمَا حَكَيْنَا مِنْ أحَادِيث عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ دَلِيلٌ عَلَى أنَّ نِيَّةَ الْمُلَبِّي كَافِيةٌ لَهُ مِنْ أنْ يُظْهِرَ مَا يُحْرِمُ بِهِ، كَمَا تَكونُ نِيَّةُ الْمُصَلِّي مَكْتُوبَةً أو نَافِلَةً أو نَذْرَاً كَافِيةً لَهُ مِنْ إظْهَارِ مَا يَنوي مِنْهَا بأيِّ إحْرَامٍ نَوَى، وَنِيَّةُ الصَّائِمِ كَذلِكَ، وَكَذلكَ لَو اعْتَمَرَ أو حَجَّ عَنْ غَيرِهِ كَفَتهُ نِيَّتُهُ مِنْ أنْ يُسَمِّي أنَّ حَجَّهُ هَذَا عَنْ غَيرِهِ ) .. (الأم ٢/١٣٢) واتە: لەو فەرموودانەی پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم کە گێڕامانەوە بەڵگەی تەواو هەیە کە ئەو کەسەی حەج دەکات، هەر بەوەندەی نیشانەیەکی ئیحرام بەستن بە شتێك دەرخات کە شیاو بێت بۆئیحرام، هەر ئەوە بەسە بۆ نییەت هێنانی، هەر وەکو نییەتی کەسێك کە نوێژ دەکات، نوێژەکەی

فەرز بێت یان سووننەت یان نەزر، بە هەر ئیحرامێك (داخڵی نوێژەکەی بوو) بێت هەر ئەوەندەی بەسە کە لێوەی دەرکەوێت مەبەستی چ نوێژێکە دەیکات نییەت هێنانی ڕۆژووەوانیش وایە، هەروەها ئەگەر کەسێك عەمرە یان حەجی لە جیاتی کەسێکی تر کرد، هەر نییەتەکەی بەسە وەك لەوەی بناسێنێت کە ئەم حەجە بۆ غەیری خۆیەتی..

سەیر ئەوەیە کەسی تر لە شەرعناسانی مەزهەبی ئیمامی شافیعی و مەزهەبەکانی تر نە پێش زوبەیری نە دوای ئەو نەیانفەرمووە نییەت هێنان بە دەم واجبە.. ئەمەش یەعنی دەرچوون لە کۆڕا (ئیجماع) ی شەرعناسان، بۆیە وەرگرتنی بۆچوونەکەی حەرامە..

ئیمامی مالیك و ئیمامی ئەحمەد فەرموویانە نییەت هێنان بە دەم باش نیە.. بە شێوەیەکی گشتی شەرعناسانێکی کەم لە شوێن کەوتووانی مەزهەبی شافیعی و حەنەفی هەن کە فەرموویانە: نییەت هێنان بە دەم شتێکی باشە بە هەنجەتی ئەوەی زیاتر هۆشی لە نییەتەکەی دڵی بێت، بەڵام شەرعناسانی گەورەو موعتەبەریان ڕەتیان کردۆتەوەو فەرموویانە باش نیە.. چونکە کە ووترا باشە، دەبێت بەڵگەی شەرعی هەبێت کە باشە[١]..

سەیرە کە زانایەکی گەورەی وەکو قەستەلانی لە شەرحی سەحیحی بوخاریدا بفەرموێ کە ئەمە سووننەتێکی هەمیشەیی پێغەمبەری خوا بووەو صلی الله علیه وسلم کە بەردەوام کردوێتی.. (إرشاد الساري ١/٥٤)..

---

[١] ابن هبيرة: الافصاح (١/٥٦)، المرداوي: الانصاف (١/١٤٢)، ابن تيمية: مجموع الفتاوى (٢٢/٢٢١)، الهداية (١/١٨٦).

هیچ بەڵگەو ریوایەتێکیشی نەهێناوەتەوە[١].. لە کاتێکدا چەندین فەرموودەی سەحیح هەیە باس لە چۆنیەتی دەسپێکی نوێژی پێغەمبەری پێشەوا دەکەن صلی الله علیه وسلم.. وەك ئەوەی عائیشە خان خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم (يَسْتَفْتِحُ الصَّلاةَ بالتَّكْبِيرِ) [٢] واتە: نوێژی بە تەکبیرەی ئیحرام دادەبەست!

## کاتی نییەت هێنانی نوێژ:

شەرعناسان لەسەر سات و ئانی نییەت هێنانەکە سێ بۆچوونیان هەیە:

**بۆچوونی یەکەم: دەبێت وویستی دڵ هاوکاتی تەکبیرەی ئیحرام بێت:** بۆچوونی ئیمامی مالیك ئەوەیە کە دەبێت نییەت هێنانەکە کە وویستی دڵە لەگەڵ ووتنی الله اکبری دەسپێکی نوێژەکەدا بێ، بێ پاش و پێش کەوتنی[٣]..

بۆچوونی ئیمامی شافیعی ئەوەیە کە: نییەت هێنانەکە دەبێت هاوکاتی تەکبیرەی ئیحرام بێت، پێش و پاش کەوتنی سوودی نابێت[٤]. لە (مختصر المزنی) دا هاتووە: ئیمامی شافیعی فەرموویەتی: ئەگەر کەسێك نییەتی ئیمامەتی هێنا یان بە تەنها

---

[١] ئەمە کاریگەریی ئەو پابەندە ووشکەیە بە ڕێڕەوی مەزهەبەکانەوە.. بۆیە دەبینیت لە پاکستان زانایەکی حەنەفی سەحیحی بوخاری بۆ فەقێکان شەرح دەکات، کەچی کە دەگاتە فەرموودەکانی دەست بەرز کردنەوە لە نوێژدا پێیان دەڵێ: ئێمە ناتوانین ئەم فەرموودانە وەرگرین چونکە پێچەوانەی مەزهەبەکەمانن!! ئەمەی قەستەلانیش هەر وا بووە..

[٢] چەندین فەرموودە لای ئیمامی بوخاری و موسلیم لەسەر ئەمە هەیە، ئەمەیان لای ئیمامی موسلیمە (٤٩٨).. بڕوانە مشكاة المصابيح (٢٤٦/١)..

[٣] المغني (٤١٩/١)، الافصاح (٨٨/١)، الذخيرة (٢٤٣/١).

[٤] الأم (٨٦/١).

بوو نوێژی دەکرد، دەبێت نییەتەکەی لە ئان و ساتی تەکبیرەکەیدا بێت، نابێت نییەتەکەی نە پێش ئەو نە دوای ئەو بهێنێت[١].. ئەمە بۆچوونی ئیبنول مونزیریشە لە حەنەفیەکانیشدا ئەمە بۆچوونی تەحاویشە. بەڵگەی ئەمان ئەوەیە کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ البينة/٥ واتە: فەرمانی ئەوەیان پێدرابوو کە سەرڕاستانە دینداریی بۆ خوای گەورە بکەن و تەنها ئەو بپەرستن.. ئەم پۆلە شەرعناسە بەڕێزە دەڵێن: ئایەتەکە دەفەرموێ: لەو ساتەی کە خواپەرستی دەکەن، وویستیان بۆ خوا پاك کردۆتەوەو خواوویستانە ئەو دەپەرستن! چونکە (مُخْلِصِينَ) حالەو باسی حاڵەتی بکەر (فاعل) دەکەیە لە ساتەوەختی ئەنجامدانی خواپەرستیەکەیدا، ئەو (إخلاص)ەش نییەتەکەیە کە بۆ خوا ساغ بۆتەوە..

٢ ـ هەندێك لە شەرعناسانی شافیعی کەوتوونەتە راجوێییەکی سەیرەوە.. هەندێکیان فەرموویانە: دەبێت نییەت هێنانەکە پێش ووتنی تەکبیرەی ئیحرام بێت، هەندێکی تر فەرموویانە: نابێت ئیللا دەبێت لە سەرەتای هەمزەی تەکبیرەکەوە بێت تا رائی کۆتایی، دەبێت لەو ماوەیەدا نییەتی دڵیشی بهێنێت، کۆمەڵێکی تریان فەرموویانە: هەردوو شێوەکە جائیزە.. ئیمامی حەرەمەینی (ئیمامی جوەینی شافیعی) بۆچوونی هەموانی رەت کردۆتەوەو دەڵێ: ئەمە هەڵەیەکی دیارە کە ئەوانە تێیکەوتوون، چونکە نییەت هێنان ئەوەڵ و ناوەندو کۆتایی نیە، ئەوەی وای لێکردوون ئاوا

---

[١] مختصر المزني (٧٠/١) موزەنی قوتابی ئیمامی شافیعی بووە رحمهما الله..

راجوێ بن ئەوەیە کە لە پێناسەی حەقیقەتی نییەتەکەدا پشێو بوون.. نییەت هێنان لە چرکەساتێکدایە، هی ئەوە نیە ئەوەندە درێژکرێتەوە[١].. ئیمامی نەوەوی و ئیمامی غەزالیش پشتگیریی ئەم بۆچوونەیان کردووە[٢]..

**بۆچوونی دووەم: دەشێت نییەتی دڵ پێش تەکبیرەی ئیحرام بێت:** ئەمەش بۆچوونی ئیمامی ئەبو حەنیفەو ئیمامی ئەحمەدە کە فەرموویانە: دەشێت کابرا بە چرکەساتی کەم نییەتەکەی کە ختوورەی دڵە پێش تەکبیرەی ئیحرامی بکەوێت[٣]. شەرعناسانی دوو مەزهەبی ئەم دوو پێشەوا بەرێزەش لە شەرحیاتی ئەم بۆچوونەدا کەوتوونەتەوە ڕەدوبەدەل و راجوێیی زۆرو ئەمانیش وەکو شەرعناسانی دوایی مەزهەبی شافیعی لق وپۆپی زۆریان لێ کردۆتەوە، وەکو ئەوەی کە نابێت لەو ساتە وەختەدا بە غەیری نوێژەوە خەریك بێت، نابێت نیەتەکەی هەڵوەشێنێتەوە، نابێت هۆشی بڕوات، دەنا نییەتەکەی فریای نوێژەکەی ناکەوێت[٤]. بەڵگەی ئەمان:

١ ـ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: (إنّمَا الاعمالُ بالنّيَّاتِ وَلِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى)[٥] واتە: هەموو کارێك پەیوەندە بە نیەتەکەیەوە، هەموو کەسێکیش بە پێی نییەتی خۆی دەیبێت.. پێش خستنی نییەتەکە مانای ئەوە نیە کە کارەکە بێ نییەت

---

[١] نهاية الأحكام (ل ٣٥ ـ ٣٨).
[٢] المجموع (٢٤٤/٣).
[٣] حاشية ابن عابدين (٣٠٦/١)، الافصاح (٨٨/١)، المجموع (٢٤٤/٣).
[٤] حاشية ابن عابدين (٣٠٦/١)، (البداية (١٨٥/١)، بداية الصنائع (١٢٩/١).
[٥] بوخاری (٥٤) موسلیم (١٩٠٧).

دەکرێت، مانای واش نیە کە کابرا خواوویستی (ئیخلاس) ەکەی بۆ خوا نەبووە، بە بەڵگەی ئەوەی کە ڕۆژووەوان و زەکاتدەر نییەتیان پێش ئەنجامدانی کارەکەیان خستووەو قبووڵیشە، بەڵگەش نیە لەسەر ئەوەی خواوویست نین!

٢ ـ نییەت هێنانی نوێژ وەکو نییەت هێنان ڕۆژوو، نییەت هێنانی حەج وایە، هەموویان هەر خواپەرستیین، ئیتر بۆچی ئەمیان جیاوازی لەگەڵ ئەو دوانەی تریاندا هەبێت؟!

٣ ـ مەرجی هاوساتی نییەت و تەکبیرەی ئیحرام قورس کردنی خواپەرستیەکەیە، دینیش بۆ ئەوە هاتووە ئاسانکاریی بکات، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾ الحج/٧٨.[1]

**بۆچوونی سێیەم: واجبە نییەتی دڵ پێش تەکبیرەی ئیحرام بخرێت:** ئەمەش بۆچوونی زاهیریەکانە، کە پێیان وایە نییەت هێنان دەبێت حەتمەن پێش تەکبیرەی ئیحرام بخرێت. بەڵام دەشفەرموێ کە نابێت فاسڵ بکەوێتە نێوان نییەت و تەکبیرەی ئیحرامەوە، دەبێت کە نییەتەکەی بە دڵدا هات یەکسەر تەکبیرەکەش بکات[2]..

ئەوەی پێم پەسەندترە بۆچوونی دووەمە کە دەڵێ: دەشێت نییەتی دڵ پێش تەکبیرەی ئیحرام بێت، هەر وەکو کە دەشێت هاوکات بن.. والله اعلم..

★ ★ ★

---

[1] بدائع الصنائع (١/١٢٩).

[2] التوضيح) ل ٣٥)، فتح القدير (١/١٨٥).

## سیفەتی نییەت لە نوێژدا:

زۆر لە شەرعناسانی شافیعی و حەنبەلی فەرموویانە تەنها نییەتی ئەنجامدانی نوێژەکە بەس نیە، بەڵکو دەبێ نییەتی ئەوەش ساغ کاتەوە کە ئایا چ نوێژێکە؟ فەرزە یان سووننەتە؟ ئەگەر فەرزە نوێژی کەیە؟ چۆن دەیکات، بە تەنها یان بە جەماعەت یان بە پێشنوێژی؟! هەر یەکێك لەمانەش موناقەشەی مەزهەبەکانی بە دوورودرێژی لەسەرە.. بەڵام هەندێك لە شەرعناسانی دواییی مەزهەبی شافیعی نییەت هێنانی نوێژیان کرد بە مەتەڵی شەولەبان و تیۆری فیساغۆرس. فەرموویان دەبێت ئەو کەسەی نییەتی نوێژ دەهێنێت: هۆشی بچێتە سەر ئەنجامدانی یەك بە یەکی روکنەکانی نوێژ، ئینجا بەشەکانیان وەکو خوێندنی تەحیات، ئەمەش هەمووی لە نوێانی هەمزەی تەکبیرەی ئیحرام و رائەکەی ئەخیرییدا!!

ئینجا بۆ ئەوەی بۆ ئەو خەڵکە داماوەی دوایانەوەی سووك کەن ووتیان نییەت هێنان وەکو ساتی بیرکردنەوەی ژن هێنانە!! کە بیر لە هەموو شتێکی دەکرێتەوە! شەرعناسانی مەزهەبەکانی تر بە تایبەتی حەنەفی رەددیان لەمە دایەوەو فەرموویان: ئەم نموونەیە زۆر لە واقیعی نییەت هێنان دوورە، چونکە لە ژن هێنانەکەدا رازاندنەوەی بوکێی تێدایە کە کۆمەڵێك سیفاتی سەربەخۆی خۆی هەیەو دەردەکەوێت، بەڵام ئەرکانەکانی نوێژ هەموو پێکەوەن، دەستپێکی هەر یەکێکیان بەتاڵ کردنەوەی روکنی رابوردوویەتی: رکوع کۆتایی هاتنە بە خوێندنی فاتیحەو ئایەتی تر، هەستانەوە لە رکوع کۆتایی پێهێنانی رکوعە.. وە هەروەها..

## نیەتی ئەستەم!!

لە هەموو ئەو قەولانەش سەیرتر قەولی قازی ئەبوبەکری شەرعناسی مالیکیە کە نییەت هێنانەکەی وا قورس کردووە کە بێ کارەش پێی ناهێنرێت.. ئەم قازیە دەڵێ: دەبێت لە کاتی نییەت هێناندا کابرا بیر لە خەلق بوونی ئەم گەردوونەش بکاتەوە، هۆشی بچێتە سەر بەڵگەی دروستی دینداران لەسەری، هەروەها هۆشی بچێتە سەر ماهییەتی جەوهەرو ئەعراز و بەڵگەی زانستی و ئەو فەرزانەی خوا لەسەر عەبدی داناوە، لە ریزیشیاندا نوێژو ئینجا ئەم نوێژەی بە دەستیەوەیەتی[١]!!

کە توێژەرەوانی مەزهەب کەوتنە جەنگ و جیدالی بەرگری لە خۆو لە مەزهەبیان، دیتیان ئەمە ئەستەمە کەسێك بتوانێت نییەتی وا بهێنێت، کە لە نێوانی هەمزەو رائی تەکبیرەی ئیحرامدا هۆشی بخاتە سەر کات و ئەرکان و جۆرو چۆنیەتی ئەو تەفسیلاتە داواکراوە.. کە پێیان دەووت: (استحضار القصد والنیة والتعین)، لەبەر ئەوەی باوەڕیشیان وا بوو کە ئیمامی شافیعی نییەتی ئاوا هێناوە، ناچار بوون بڵێن: روتبەی ئیمامی شافیعی لە خواناسییدا بەرز بووە بۆیە توانیویێتی وا نییەت بهێنێت!! وەکو ئیبنو حەجەری هەیتەمی رەحمە اللە وا دەڵێ!! سەیر ئەوەیە کە داواکراوی نییەتەکە سێزدە روکن بوو، ئیبنو حەجەری هەیتەمی لە جیاتی سووکتر کردنی کردنی بە ئیزافە کردنی (استحضار القصد والنیة والتعین) کردنی بە شازدە روکن!! دیارە ئەم زیادە بێ

---

[١] القرافي: الذخیرة (١/٥١٠) قورافی هەر لێرەدا دەفەرموێ: ئیمامی مازەری دەفەرموێ: جارێك نییەتێکم بەو شێوەیە هێنا کە قازی ئەبوبەکر دەفەرموێ، شەو لە خەونمدا بینیم لە دەریایەکی تاریکیدا نقووم بووم، کە خەبەرم بۆوە زانیم ئەمە ئەو گومڕاییەیە کە قازی ئەبوبەکر لە باسی نییەت هێناندا فەرموویەتی..

مانایانەی خراوەتە سەر نییەت هێنان گەڕەلاوژێیەکی شەڕە مەزهەبی بێ جێیە، چونکە:

١ ـ کەس لە باسی نییەت هێنانی رۆژوو حەجدا شتی وای باس نەکردووە، لە کاتێکدا ئەگەر هەموو ئەم تەفسیلاتە بخرێتە سەر نییەت هێنانی رۆژوو حەج ئاسانترە..

٢ ـ هیچ بەڵگەیەکی شەرعی لەسەر ئەم تەفسیلاتە نیە، کەرە مەزهەبیەکان لەبەر ئەوەی قەناعەتیان بە خۆیان کردووە کە ئەوە نییەت هێنانی ئیمامی شافیعی بووە، ئیتر بۆ سەرخستنی بۆچوونەکەی ئەو هەورازەیان خستۆتە بەر ئوممەتی محمدالموستەفا صلی الله علیه وسلم.

٣ ـ بەڵگەیەکی تایبەت لەسەر نییەت هێنانی نوێژ بەو شێوەیە نەبووەو نیە، ئەو بەڵگەیەی کە شەرعناسانی یاوەران و تابعین ئیعتیمادیان کردۆتە سەر هەر فەرمووده‌ی: (إنّمَا الاعمالُ بالنّيَّاتِ)[١] واتە: هەموو کارێك پەیوەستی نیازەکەیەتی.

٣ ـ هیچ کەسێك نەبووەو نیە فێری ئەم جۆرە نییەت هێنانە ببێت و نەکەوێتە سەر ئەو وەسوەسە ناشەرعیەی لە دینی خوادا نیە.. ئەو وەسوەسەیەی کە هەندێك زانا پێی دەڵێن: خەلەلی ژیریی و نوقسانی دین و نەزانینی شەرعە!!

لەبەر ئەمە بوو ئەو مامۆستا بەڕێزەی شەرعم لا خوێند تووشی ئەو وەسوەسەیەی کردم کە بە سێ ساڵ رەنجی بەردەوام لە کۆڵم بۆوە! هۆیەکەی ئائەمە بوو کە شەرعناسانی دواییی مەزهەب خستیانە سەر

---

[١] بوخاری (٥٤) موسلیم (١٩٠٧).

نییەت هێنان.. کە فەرموویانە کابرا کە نییەتی نوێژەکەی دەهێنێت دەبێت، هۆشی بچێتە سەر ئەوەی کە ئەمە نوێژی فەرزە یان سووننەت و کام نوێژەیانە، کە بە جەماعەت یان بە تەنها، رووەو قیبلە بۆ خوای دەکات! مامۆستاکەی منیش دەیفەرموو دەبێت کە هەمزەی تەکبیرەکە دێنێت، واتە دەڵێی (ئە)، لە ئەڵلاهو ئەکبەری دەسپێکی نوێژەکەوە تا (راء) ی ئەکبەرەکە لەو نێوانەدا فریا کەویت بڵێی: (نییەتم هەیە چوار رکاتی نوێژی نیوەڕۆ بە فەرز بە ئیمامەت رووەو قیبلە بۆ خوای تەعالا دەکەم).. منیش لە مزگەوتێکدا پێشنوێژ بووم، وام لێهات کە تەکبیرەی ئیحرامم بۆ دەسپێکی نوێژ دەهێنا ریزی خەڵکی لە دوامەوە بێزار دەبوون، لە درێژکردنەوەی لەفزی ئەڵلاااااااااااااااااهو ئەکبەر سەبریان نەدەما! سەرباری ئەوەش جاری وا هەبوو دە جار دەمووت: ئەڵلاااااااا نا سەبر کەن نییەتم بۆ نەهات.. دەمووتەوە: ئەڵلاااااااااااااهو ئەکبەر.. نییەتیان دەهێناو سەلامم دەدایەوەو دەمووت سەلام بدەنەوە نییەتەکەم تەواو نەبوو.. دیسان دەکەوتمەوە نییەت هێنان..

★ ★ ★

# باسی سێیەم

# روکنەکانی نوێژ

روکنی یەکەم: بە پێوە بوون.

روکنی دووەم: تەکبیرەی ئیحرام (ووتنی الله اکبری دەسپێکی نوێژ).

روکنی سێیەم: قورئان خوێندن.

روکنی چوارەم: چەمانەوەو سرەوتن تێیدا.

روکنی پێنجەم: هەستانەوەو رێکبوونەوە.

روکنی شەشەم: سوجدەبردن.

روکنی حەوتەم: دانیشتنی نێوان دوو سوجدەکان.

روکنی هەشتەم: سوجدەی دووەم.

روکنی نۆیەم: تەحیاتی ئەخیرو تێدا دانیشنی.

روکنی دەیەم: سەڵاواتدان.

روکنی یازدەیەم: سەلامدانەوە.

## روکنەکانی نوێژ

روکنەکانی نوێژ چەند ڕەفتارێکن لە گوفتارو کردار کە بە هەموویان ماهییەتی نوێژ پێك دەهێنن، کە ئەگەر یەکێکیان ئەنجام نەدرا نوێژەکە بەتاڵ دەبێتەوەو لە ڕووی شەرعیەوە بە هەبوو ناژمێردرێت، چونکە بە سوجدەی سەهوو پڕ ناکرێتەوە..

**وازهێنان لە روکنێکی نوێژ**[١]**:** ئەو کەسەی کە روکنێکی نوێژەکەی وازلێدەهێنێت، حاڵەتێکی لەم دوانەی بۆ هاتۆتە پێش:

**١ . بە ئەنقەست وازی لێ هێناوە:** هەر کەسێك روکنێکی نوێژ بە دەستی ئەنقەست وەل کات حەتمەن نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوەو بە کۆڕای شەرعناسان هیچی لەو نوێژە بۆ حسێب ناکرێت..

**٢ . بە نەزانی یان بەهۆی لە بیرچوون وازی لێ هێناوە:** بە پێی کۆڕای شەرعناسان ئەگەر توانی خێرا فریای کەوێت و بیکات، ئەوە قبووڵە، ئەگەر فریای نەکەوت بە پێی مەزهەبی حەنەفی نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، بەڵام لای جمهوری شەرعناسان ئەو رکاتەی لەدەست دەچێت کە روکنەکەی فەوتاوە، جگە لە تەکبیرەی ئیحرام، چونکە ئەمیان هەر دەبێ سەر لە نوێ بهێنرێتەوە، چونکە لە سەرەتاوە داخڵی نوێژەکەی نەبووە..

★ ★ ★

---

[١] ابن عابدين (٢٩٧/١)، الدسوقي (٢٣٩/١)، كشاف القناع (٣٨٥/١).

# روكنی یەكەم: وەستان بۆ نوێژ

ئەم باسانەی خوارەوەی تێدایە:

باسی یەكەم: بەپێوە بوون
باسی دووەم: چۆنیەتی دەست و پێ دانان و جێ روانین
باسی سێیەم: خوێندن
باسی چوارەم: سوترەو ئەحكامەكانی
باسی پێنجەم: تێپەڕبوون بەبەر نوێژدا
باسی شەشەم: نوێژكردن رووەو ڕووی گۆڕ
باسی حەوتەم: نوێژ بە پێڵاوەوە

## روكنەكانی نوێژ

### روكنی یەكەم

### وەستان بۆ نوێژ

## باسی یەكەم: بە پێوە بوون بۆ كەسێك كە بتوانێت

١ ـ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ﴾ البقرە/٢٣٨ واتە: بە ملكەچییەوە بۆ خوا راوەستن.. بۆیە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی فەرزو سوونەتەكانی بە پێوە دەكرد، مەگەر لەبەر نەخۆشی نەیتوانیبێت، وەكو كاتی نەخۆشیەكەی دوایی تەمەنی پیرۆزی كە بە دانیشتنانەوە نوێژەكانی كرد: (وَصَلَّى صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي مَرَضِ مَوْتِهِ جَالِسَاً) [١] یان جارانێكی تر.. علیه الصلاة و السلام..

٢ ـ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە عیمرانی كوڕی حوسسەین (عمران بن حُصَين) خوا لێی رازی بێت فەرمووی: (صَلِّ قَائِمَاً، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَقَاعِدَاً، فَإِنْ لَمْ تَستَطِعْ فعَلَى جَنْبٍ) [٢] واتە: بە پێوە نوێژ بكە، ئەگەر نەتتوانی بە دانیشتنەوە بیكە، ئەگەر هەر نەتتوانی راكشێ ولەسەر لاتەنیشتت بیكە.

---

[١] موسلیم (١٦٤/٢) نەسائی (٢٤٥/١) ترمزی (٢١١/١). الالبانی: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٨٣/١).

[٢] بوخاری (١١١٧) ئەبوداوود (٩٣٩)، ترمزی (٣٦٩).

٣ ـ شەرعناسان لەسەر ئەوەن کە راوەستانی نوێژ بۆ هەر کەسێك کە بتوانێ بە پێوە بوەستێت فەرزە، ئەو کەسەی ناتوانێت (لەبەر نەخۆشی یان لاوازی، یان لەوە دەترسێت ئەگەر بە پێوە بوەستێت نەخۆشیەکەی خراپتر ببێت یان چارەسەرەکەی دوورتر کەوێتەوە) ئەو فەرزەی لەسەر نامێنێت، بۆی هەیە بە دانیشتنانەوە نوێژەکەی بکات.

ـ سەیدنا ئەنەس خوا لێی رازی بێت دەڵێ: (سَقَطَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ فَرَسٍ فَجُحِشَ شِقُّهُ الْأَيْمَنُ فَدَخَلْنَا عَلَيْهِ نَعُودُهُ فَحَضَرَتْ الصَّلَاةُ فَصَلَّى بِنَا قَاعِدًا فَصَلَّيْنَا وَرَاءَهُ قُعُودًا)[1] واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە ئەسپەکەی کەوتە خوارەوە، پێستی لا تەنیشتی راستی داماڵرا، بۆ سەردانی چووینە خزمەتی، کە کاتی نوێژ هات، نوێژەکەی بە دانیشتنانەوە بۆ کردین وئێمەش لە دوایەوە بە دانیشتنانەوە ئیقتیدامان پێکرد..

ئیبنوقودامەی مەقدیسی دەڵێ: دیارە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە تەواوی وا نەبووە کە نەتوانێت هەستێتە سەر پێ، بەڵام کە تێیدا هەستی بە نارەحەتی دەکرد فەرزی بەپێوەبوونەکەی لەسەر نەما، کەوابوو ئەو فەرزە بە هەمان شێوە لەسەر کەسانێکی تریش دەکەوێت کە نەتوانن بە پێوە بوەستن[2]..

---

[1] بوخاری (٤٦٧/٢)، موسلیم (٤١١).
[2] المغنی (٥٧١/٢).

## چەند زانیاریەكی تری گرنگ لەسەر نوێژ بە دانیشتنانەوە:

ـ نوێژی سووننەت لە هەموو جۆرە سەفەرێكدا كورت بێت یان درێژ بەسەر سوارییەوە دەكرێت، بەڵام ئەمە بۆ كەسی نیشتەجێ نابێت.. تەفسیلەكەی لە (مەرجی رووكردنە قیبلە) دا باس كراوە..

ـ دەشێت نوێژی سووننەت بێ عوزر بەدانیشتانەوە بكرێت، بەڵام پاداشتی بە پێوە كردنی زۆرترە، سەلماوە كە پاداشتی نوێژ بە دانیشتنانەوە نیوەی پاداشتی نوێژە بە پێوە..

ـ سەیدنا عیمرانی كوڕی حوسسەین (عمران بن حُصَين)خوا لێی رازی بێت فەرمووی: دەربارەی كەسێك كە نوێژەكەی بە دانیشتنانەوە بكات، پرسیارم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم كرد، فەرمووی: (مَنْ صَلَّى قَائِمًا فَهُوَ أَفْضَلُ وَمَنْ صَلَّى قَاعِدًا فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِ الْقَائِمِ وَمَنْ صَلَّى نَائِمًا فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِ الْقَاعِدِ)[1] واتە: ئەوی نوێژەكە بە پێوە بكات باشترە، ئەوی بە دانیشتنانەوە كردی نیوەی پاداشتی بە پێوەی هەیە، ئەوی بە راكشانەوە كردی نیوەی پاداشتی ئەو كەسەی هەیە كە بە دانیشتنانەوە دەیكات..

خەتتابی دەڵێ: پاداشتی ئەو كەسەی كە بە دانیشتنانەوە نوێژەكەی دەكات بۆتە نیوە تا ئەو نەخۆش و بێ توانایەی كە ئەگەر زۆر بكات لە خۆی دەتوانێت بە پێوە نوێژەكەی بكات، بیكات.. ئیبنو حەجەری عەسقەلانی دەڵێ: لێكدانەوەیەكی جوانە [2]..

---

[1] بوخاری (٢/٤٦٧)، ئەبو داوود (١/١٥٠)، نەسائی (١/٢٤٥)، ترمزی (٢/٢٠٧)، ئیبنوماجە (١/٣٧٠، دارەقوتنی (١٦٢)، بەیهیقی (٢/٤٩١)، ئیمامی ئەحمەد (٤/٤٣٣).

[2] فتح الباری (٢/٥٨٥).

نوێژکردن بە دانیشتنانەوە مەرج نیە هەر لەبەر نەخۆشی بێت، دەشێت لەبەر ماندووبوون بێت، یان لەبەر پیریی، یان قەڵەوی و شتی وا، چونکە جاری وا هەبووە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژە سوونەتەکانی بە دانیشتنانەوە کردووە:

١ ـ خاتوو عائیشە خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە: (لَمَّا بَدَّنَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَثَقُلَ كَانَ أَكْثَرُ صَلَاتِهِ جَالِسًا)[1] واتە: کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قەڵەو و قورس بوو، زۆربەی نوێژەکانی بە دانیشتنانەوە دەکرد..

بەڵام ئەوە سەلمێنراوە کە نوێژکردنی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە دانیشتنانەوە پاداشتی جەنابیانی صلی الله علیه وسلم کەم نەکردۆتەوە.

٢ ـ فەرموودەکەی سەیدنا عبداللەی کوڕی عەمر خوا لێی رازی بێت کە دەڵێ: (حُدِّثْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ صَلَاةُ الرَّجُلِ قَاعِدًا نِصْفُ الصَّلَاةِ فَأَتَيْتُهُ فَوَجَدْتُهُ يُصَلِّي جَالِسًا فَوَضَعْتُ يَدَيَّ عَلَى رَأْسِي فَقَالَ مَا لَكَ يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو قُلْتُ حُدِّثْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَّكَ قُلْتَ صَلَاةُ الرَّجُلِ قَاعِدًا نِصْفُ الصَّلَاةِ وَأَنْتَ تُصَلِّي قَاعِدًا قَالَ أَجَلْ وَلَكِنِّي لَسْتُ كَأَحَدٍ مِنْكُمْ )[2] واتە: ئەوەم بیستبوو کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (صَلاةُ الرَّجُلِ قاعِداً نِصْفُ الصَّلاةِ) واتە نوێژی کەسێك کە بە دانیشتنانەوە دەیکات بە نیوەی نوێژی کەسێك حسێبە کە بە پێوە دەیکات.. جارێکیان هاتمە خزمەت

---

[1] موسلیم (٧٣٢).

[2] موسلیم (٧٣٥)، نەسائی (١٦٥٩)، ئەبو داوود (٩٥٠).

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بینیم بە دانیشتنانەوە نوێژ دەکات، دەستم خستە سەر سەرم، فەرمووی: عبداللەی کوڕی عەمر ئەوە چیتە؟! ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا جەنابت فەرمووتە نوێژی بە دانیشتنانی کەسێکتان بەقەدەر نیوەی نوێژی کەسێکتانە کە بە پێوە دەیکات، ئێستاش دەبینم جەنابت بە دانیشتنانەوە نوێژ دەکەیت! فەرمووی: ئاخر من وەکو هیچ یەکێك لە ئێوە نیم..

٣ ـ عائیشەخان خوا لێی رازی بێت دەڵێ: (اشْتَكَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَدَخَلَ عَلَيهِ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِهِ يَعُودُونَهُ، فَصَلَّى رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَالِساً، فَصَلُّوا بِصَلاتِهِ قِيَاماً، فَأَشَارَ الَيهِمْ أَنْ أجْلِسُوا، فَجَلَسُوا، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: إِنْ كِدْتُمْ آنِفاً لَتَفْعَلُونَ فِعْلَ فَارِسَ والرُّوم، يَقُومُونَ عَلَى مُلُوكِهِمْ وَهُمْ قُعُودٌ، فَلا تَفْعَلُوا، إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وإِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا، وإِذَا صَلَّى جَالِساً فَصَلُّوا جُلُوساً أجْمَعُونَ)[1] واتە: پێغەمبەری خوا کەمێك نەساغ بوو، کۆمەڵێك لە یاوەرانی هاتنە سەردانی، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی بە دانیشتنانەوە کرد، ئەوانیش لە دوایەوە ئیقتیدایان پێ کردو بە پێوە نوێژیان کرد، لە نوێژەکەدا فەرمانی پێکردن کە دانیشن، ئەوانیش دانیشتن، کە نوێژ تەواو بوو، پێی فەرموون: کەمێك لەمەو پێش زۆری نەمابوو ئێوەش وەکو فارس و رۆمتان لێ بێت، کە پاشاکانیان دانیشتوون و ئەوان بە پێوە، وا مەکەن، پێشنوێژ بۆیە دانراوە تا ئیقتیدای پێ بکەن (چی کرد بیکەنەوە) کە چووە رکووع ئێوەش بچن، کە سەری بەرز کردەوە ئێوەش بەرزی کەنەوە،

---

[1] بوخاری (١٣٨/٢)، موسلیم (١٩/٢)، ئیمامی مالك (١٥٥/١)، ئەبوداوود (٩٩/١)، ئیبنوماجە (٣٧٤/١)، بەیهیقی (٢٠٤/٢)، ئیمامی ئەحمەد (٥٧/٦).

ئەگەر بە دانیشتنانەوە نوێژی كرد ئێوەش هەموو بە دانیشتنانەوە بیكەن..

بە نیسبەت نوێژكردن بە راكشانەوە دیارە كە بۆ ناچارییە، چونكە كەس ریوایەتێكی لا نیە بیسەلمێنێت كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم یان یاوەرێكی بەرێزی لەش ساغ بووبن و نوێژیان بە راكشانەوە كردبێت، ئەگەر ئەم شێوە نوێژكردنە لە نوێژی سوونەتیشدا شیاو بوایە، هەر دەبوو جارێك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ فێركردنی شیاوێتیشی بوایە دوو ركاتی بە راكشانەوە بكردایە، دیارە نەیكردووە بۆیە هیچ ریوایەتێكی لەسەر نەقڵ نەكراوە[١]..

## نوێژ بە پێوەو بە دانیشتنانەوە:

ئەو كەسەی كە بە هۆی عوزرێكەوە ناچار بووە بە دانیشتنانەوە نوێژەكەی بكات لە پاداشتەكەی كەم نابێتەوە، چونكە ئەو پێشتر خووی بەوەوە گرتبوو كە هەر بە پێوە بیانكات، بەڵام ئێستا بەربەستی نەخۆشی یان پیریی یان ماندووبوون و شتی وا رێی لێ گرتووە، چونكە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: (مَنْ مَرِضَ أو سَافَرَ كُتِبَ لَهُ مَا كَانَ يَعْمَلُ صَحِيحَاً مُقِيمَاً)[٢] واتە: هەر كەسێك نەخۆش كەوت یان سەفەری كرد، ئەو پاداشتەی هەر بۆ دەنوسرێت كە بە لەش ساغی و نیشتەجێیی پەیدای دەكرد..

شەرعناسان لەسەر ئەوە كۆن كە: دەتوانێت قورئان خوێندنی ناو نوێژەكەی بە دانیشتنانەوە دەست پێ بكات و پاشان بۆ راوەستان هەستێ..

---

[١] ابن تیمیه: مجموع الفتاوى (٢٣/٢٣٥).
[٢] بوخاری (٢٩٩٦).

عائیشەخان خوا لێی رازی بێت دەڵێ: (أنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّي جَالِسًا، فَيَقْرَأُ وَهُوَ جَالِسٌ، فَإِذَا بَقِيَ مِنْ قِرَاءَتِهِ قَدْرَ مَا يَكُونُ ثَلاثِينَ أَوْ أَرْبَعِينَ آيَةً، قَامَ فَقَرَأَ وَهُوَ قَائِمٌ، ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ يَفْعَلُ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ مِثْلَ ذَلِكَ)[١] واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە دانیشتنانەوە نوێژی دادەبەست، قورئانی ناو نوێژەکەشی بە دانیشتنانەوە دەخوێند، کە نزیکەی سی بۆ چل ئایەتی دەما هەڵدەستاو بە پێوە دەیخوێند، پاشان دەچووە رکوع، پاشان سوجدەی دەبرد، لە رکاتی دووەمیشدا هەر وای دەکرد..

پاڵپشت بە فەرموودەکەی پێشوو، نوێژخوێن بۆی هەیە بە پێوە نوێژی سووننەت دابەستێت و پاشان دانیشێت. ئەمە بۆ زۆر کەس پێویستیە بە تایبەتی لە تەراویح و شەونوێژدا.. کەوابوو ئەو کەسەی کە ناتوانێت زۆر بە پێوە بوەستێت دەتوانێت نیەتی نوێژکردنەکەی بە پێوە بهێنێت و دواتر لەسەر کورسی (سەندەلی) یەك دانیشێت یان لەسەر ئەرزەکە دانیشێت..

### چۆنیەتی دانیشتن لە نوێژدا:

بێ گومان باشتر وایە نوێژخوێن کە لە نوێژەکەیدا دادەنیشێت، لەسەر ئەژنۆ (شێوەی دانیشتنی تەحیات خوێندن) دانیشێت.. لەبەر ئەو دوو فەرموودەیەی سەیدنا عیمران و خاتوو عائیشە خوا لێیان رازی بێت باسی دانیشتنەکانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە گشتی دەکەن لە نوێژدا ،، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نیە کە شێوەی تر جائیز نەبێت..

---

[١] بوخاری (١١١٩)، موسلیم (٧٣١).

ریوایەتی تر هەیە دەڵێ چوارمشقی دانیشتووە[١]، هەروەها لە یاوەرانەوە هاتووە كە لە تەحیاتدا چوارمشقی دانیشتوون[٢].. بەڵام ئەو زانایانەی ئەمەیان رەت كردۆتەوە زۆرن ولە موعتەبەرەكانیشن.

ئەمما دانیشتن و قاچ راكێشان، كەس لە شەرعناسان لایەنگری نین، مەگەر رێیان بە نەخۆشێك دابێت..

## نوێژ بە راكشانەوە بۆ ناتوانا جائیزە:

ئەوی كە توانای نەبوو بەو شێوە سوونەتیە بۆ تەحیات دانیشێت، یان هەر بەراكشانەوە دەیتوانی، ئەوە لە نوێژی فەرزدا بێت یان نوێژی سوونەت خاوەن عوزرە، بۆی هەیە بە راكشانەوە نوێژەكەی بكات.. ئەگەر كەسێك بە بێ هەبوونی عوز نوێژی سوونەتی بە راكشانەوە كرد، بە بۆچوونی راستری هەندێك لە توێژەرەوانی شەرع نوێژەكەی قبوولە[٣].. بەڵام كارێكی باشی نەكردووە، چونكە نە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، نە یاوەرانی بەڕێزی نوێژی سوونەتیان بەبێ هۆ بەراكشانەوە نەكردووە

شێوەی راكشان بۆ نوێژكردن: ئەگەر كەسێك ناچاربوو نوێژەكەی بـە راكشـانەوە بكـات، باشـتر وایـە رووەو قیبلـە لەسـەر لاتەنیشـتی راسـتی راكشێت، ئەمە نوستنی سوونەتیانەشـە.. عائیشـەخان خـوا لێـی رازی بـێ دەڵێ: (كَانَ يُعْجِبُهُ التَّيَمُّنُ فِي تَنَعُّلِهِ وَتَرَجُّلِهِ وطُهُورِهِ وَفِي شَأْنِهِ كُلِّهِ)[٤] واتە:

---

[١] نەسائی (٣/٢٢٤)، ئیبنوخوزەیمە (٢/٢٣٦) بەیهیقی (٢/٣٠٥).. شێخی ئەلبانی بە سەحیحی داناوە: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (ل ٨٠).

[٢] ابن ابي شيبة: المصنف (٢/٢٢٠).

[٣] وەكو ئیبنوحەزم (المحلى ٣/٥٦) ئیبنوعوسێمین (الشرح الممتع ٤/١١٣).

[٤] بوخاری (١٦٨)، موسلیم (٢٦٨).

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەمیشە دەسپێکردنی بە لایەنی ڕاستی پێخۆش بوو، لە پێڵاو لە پێ کردنیدا، لە پیادەییدا، لە دەستنوێژو غوسڵیدا، لە هەموو کاروبارێکیدا..

ـ سەیدنا عیمرانی کوڕی حەسسین (حَصين) خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی مایەسییریم بوو، لە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم پرسی فەرمووی: (صَلِّ قائِماً، فَإنْ لَمْ تَستَطِعْ فقَاعِداً، فَإنْ لَمْ تَستَطِعْ فعَلَى جَنْبٍ)[1] واتە: نوێژەکەت بە پێوە بکە، ئەگەر نەتتوانی ئەوە بە دانیشتنانەوە، ئەگەر هەر نەتتوانی ئەوە لەسەر لاتەنیشت..

ئەگەر کەسێك بەو شێوانە نەیتوانی نوێژەکەی بکات، بۆ نموونە بە چیچکانەوە یان بە ڕاکشان لەسەر پشت دەیتوانی بیکات، بۆی هەیە نوێژەکەی بە ئاماژەی دەست و سەر بکات بێ ئەوەی لە پاداشتەکەی کەم بێتەوە چونکە خاوەن عوزرە:

ـ (عَنْ جَابِرٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَادَ مَرِيضًا فَرَآهُ يُصَلِّي عَلَى وِسَادَةٍ، فَأَخَذَهَا فَرَمَى بِهَا، وَقَالَ: صَلِّ بِالْأَرْضِ إِنِ اسْتَطَعْتَ، وَإِلا فَأَوْمِئْ إِيمَاءً وَاجْعَلْ سُجُودَكَ أَخْفَضَ مِنْ رُكُوعِكَ)[2] سەیدنا جابر خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەردانی نەخۆشێکی کرد، بینی نوێژ دەکات، بەڵام سەرینێکی بە بەرزی داناوە تا سەری لە سوجدەدا بخاتە سەر، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم

---

[1] بوخاری (٢/٤٦٩)، ئەبوداوود (١/١٥٠)، ترمزی (٢/٢٠٨)، ئیبنوماجە (١/٣٦٩)، الالبانی: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (١/٩١).

[2] ریوایەتی زۆرە، شێخی ئەلبانی لە زنجیرەی فەرمووده ڕاستەکانیدا (سلسلة الاحاديث الصحيحة (٣٢٣) دەفەرموێ سەحیحە.. هەروەها بڕوانە: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (١/٩٧)

ئەویشی دەست دایەو خستیە لاوە، کابرا دارێکی ئەستووری دەستدایە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەویشی لێوەرگرت و فڕێی دا، پاشان فەرمووی: دانیشەو نوێژەکەت بکە، ئەگەر هەر نەتتوانی بە ئاماژە کردن بیکە، سەرت لە سوجدەبردندا کەمێك زیاتر لە رکووعەکانت دانەوێنە..

ئەمە بۆ نوێژە فەرزەکانە بەڵام ئەگەر لە شەونوێژدا بێت، بۆی هەیە دەست بە دارو دیوارو پایەو ستوونەوە بگرێ، (باسی دێ ان شاء الله).

## نوێژ لە فڕۆکەو پاپۆڕدا:

شەرعناسان لە کتێبەکانیاندا باسی نوێژی ناو کەشتی و بەلەمیان کردووە، چونکە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (صَلِّ فِيهَا قَائِماً، إلا أنْ تخَافَ الغَرَقَ)[١] واتە: نوێژەکەتی بە پێوە تێدا بکە، مەگەر لەو حاڵەتەدا کە دەترسیت نقووم بیت..

ئەمە ترس لە هۆکاری نقووم بوونەکانیش دەگرێتەوە، وەکو ئەوەی کەسێك کە هەستێتە سەر پێ سەری گێژ بخوات، ئەمیش بۆی هەیە بە دانیشتنانەوە نوێژەکەی بکات، چونکە ئیحتیمالی ئەوەی هەیە بە پێوە بێت و بکەوێت!

ئەم مەترسیە لەبەر ئەوە بووە کە کەڵەك وبەلەم و کەشتیەکانیان لە قەدەر حاڵەتی پێشکەوتنی ئەو سەردەمەیان بووە، زۆر جار دەرەقەتی ئەو مۆنجانە نەهاتووە کە لێی داون.. ئاسانیش نەیانتوانیووە بە پێوە خۆی لەسەر بگرن، بەڵام ئێستا پاپۆڕی دوازدە قات هەیەو کە لە ژوورەکەتدایت وا هەست دەکەیت لە ئوتێلێکی راقیدایت، هەست بە لەنجەو بەرزو نزم

---

[١] الالباني: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (ل ٧٩).

بوونەوەی پاپۆڕەکە ناکەیت، پاپۆڕی ئێستا ئینتەرنێتی تێدایەو ئاڕاستەی کەعبەشت نیشان دەدات و دەشتوانیت نوێژی جەماعەتی تێدا بکەیت..

قیاسی فڕۆکەش لەسەر ئەمەیە، مادام خەمی کەوتنە خوارەوەی نیەو دەتوانێت نوێژەکەی بە پێوە بکات، ئەگەر نەیتوانی لەسەر کورسیەکەی خۆی و بە دانیشتنانەوە دەیکات، رووی لە هەر لایەك بێت ئیشکالێکی نیە.. هەرچەندە ئێستا فڕۆکەی دوو قات و سێ قات هەیە، رەنگە لە زۆر هێڵدا نەتوانیت لە غەیری کورسیەکەی خۆت نوێژەکەتی تێدا بکەیت، مەگەر لە فڕۆکەی گەورەی هێڵی ئاسمانی سعودیەو ئێراندا کە ژووریان تایبەت بە نوێژ تێدا کردۆتەوە..

### دەست بە شت گرتن بۆ هەستان و راوەستانی نوێژ:

شەرعناسان لەسەر ئەوە کۆن کە هەر کەسێك نەیتوانی لەسەر قاچ و دەستی خۆی هەستێتە سەر پێ، بۆی هەیە دەست بە دارو دیوار بگرێت و هەستێت.. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ﴾ التغابن / ١٦ واتە: ئەوەندەی بۆتان دەکرێت تەقواو دینداریتی بکەن..

ئیمامی شەوکانی دوای ئەوەی چەند فەرموودەیەك لەم بارەیەوە دەهێنێتەوە، دەڵێ: هەمووی بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە کابرا ئەگەر خاوەن عوزر بوو بۆی هەیە دەست بە دارو دیوار بگرێت، یان گۆچان و عەساو دارشەق بۆ خۆی دانێت و لە هەڵسوکەوتی نوێژەکەدا دەستی پێ بگرێت.. عوزریش وەکو پیری و قەڵەوی و نەخۆشی و لاوازی و شتی وا[1].. بەڵگەی ئەمەش زۆرە، لەوانە:

---

[1] الشوكاني: نيل الاوطار (٢/٢٨٤).

ـ ئومموقەیسی کچی موحسەن خوا لێی رازی بێت فەرمووی: (وَلَمَّا أَسَنَّ صَلَّى اللهُ عليهِ وَسلَّمَ وَكَبُرَ اتَّخَذَ عَمُوداً فِي مُصَلَّاهُ يَعْتَمِدُ عَلَيهِ)[١] واتە: کاتێك کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەساڵدا چوو گۆشتی گرت، لە هەستانیدا دەستی بە کۆڵەکەیەك دەگرت کە لە جێنوێژەکەی بوو..

**ئەگەر ئیمام بە دانیشتنەوە نوێژی کرد مەئموومەکانیش وا دەکەن:**

ئەگەر پێشنوێژ لەبەر هەبوونی عوزر بە دانیشتانەوە پێشنوێژیەکەی کرد، مەئمووکانیشی دەبێت بە دانیشتنانەوە بیکەن.. بەڵگەی ئەمە وا لە پەراوێزی (٤٦٩) دا، دواتر لە باسی نوێژی جەماعەتدا بە تەفسیل دێت ان شاء الله..

★ ★ ★

---

[١] ئەبوداوود (١/١٥٠)، بەیهیقی (٢/٢٨٨)، حاکم (١/٢٦٤) بە سەحیحی داناوەو ئیمامی زەهەبیش لایەنگیریی کردووەو فەرموویەتی بە پێی مەرجەکانی بوخاری و موسلیمە.. شێخی ئەلبانیش بە سەحیحی داناوە: سلسلة الاحاديث الصحيحة (٣١٩).

## باسی دووەم: چۆنیەتی دەست و پێ دانان و جێ روانین

### یەكەم: رەفتاری دەست

شێخی ئەلبانی رەحمەتی لە كتێبە بە نرخەكەی خۆیدا (أصل صفة صلاة النبي ١٩٣/١) هەموو رەفتارەكانی دەستی پیرۆزی پێغەمبەری نازداری صلی الله علیه وسلم باس فەرمووە كە لە كاتی نیەت هێنان و خوێندن و ركوع و رەفتارەكانی تری نوێژدا چۆن ولە كوێدا دەبن.. كە دەڵێ:

*** رەفتاری بەرز كردنەوەی دەستەكان لە كاتی ئیحرامدا:**

**. جاری وا هەبوو لەگەڵ تەكبیری ئیحرامدا دەستی بەرز دەكردەوە:**

١ ـ سەیدنا عبداللەی كوڕی عومەری كوڕی خەتتاب خوا لە خۆی و باوكی رازی بێت دەگێڕێتەوە:(رأيتُ النبيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ افتتحَ التكبيرَ في الصلاةِ، فرَفَعَ يدَيهِ حِينَ يُكَبِّرُ حتى يَجعَلَهُمَا حَذْوَ مَنْكِبَيهِ، وَإذا كبَّرَ للرُّكوعِ فعَلَ مِثلَهُ، وإذا قالَ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ فعَلَ مِثلَهُ وَقالَ: رَبَّنَا وَلَكَ الحَمْدُ، ولا يفعلُ ذلِكَ حِينَ يَرْفَعُ رأسَهُ مِن السُّجُودِ..)[1] واتە: پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینی بە تەكبیرەی ئیحرام نوێژەكەی دەست پێكرد، دەستەكانی بۆ ئاستی سەر شانەكانی

---

[1] بوخاری (١٧٦/٢ ـ ١٤)، نەسائی (١٤٠/١)، بەیهیقی (٢٦/٢)، ئەحمەد (١٤/٢)، دارەقوتنی (١٠٨) زۆری تریش.. موسلیم (١٣/٢)، بەیهیقی (٢٨/٢، ٧١)، ئەحمەد(٣١٧/٤).

بڵند دەکرد، هەروەها لەو کاتەی کە دەچووە رکوع (چەمانەوە) هەر وای دەکرد، ئینجا کە سەری بڵند دەکردو دەیفەرمو (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ) ئەو کاتەش دەستەکانی بڵند دەکردن، بەڵام ئەو کاتەی سەری لە سوجدە بەرز دەکردەوە وای نەدەکرد.

٢ ـ ریوایەتی سەیدنا وائلی کوڕی حوجر کە فەرموویەتی:(أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم رَفَعَ يَدَيهِ حِينَ دَخَلَ فِي الصَّلَاةِ كَبَّرَ حِيالَ أُذُنَيهِ، ثُمَّ الْتحفَ بثوبهِ، ثُمَّ وَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى الْيُسْرَى، فَلَمَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ أَخْرَجَ يَدَيهِ مِنْ الثوب ثُمَّ رَفَعَهُمَا ثُمَّ كَبَّرَ فَرَكَعَ، فَلَمَا قَالَ (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) رَفَعَ يَدَيهِ..)[1] واتە: پێغەمبەری خوای صلى الله عليه وسلم بینی کە بە تەکبیرەی ئیحرام داخڵی نوێژەکەی بوو، دەستەکانی تا ئاستی هەردوو گوێچکەی بەرز کردەوە، پاشان پۆشاکەکەی لە خۆوە پێچاو دەستی راستی خستە سەر دەستی چەپی، کە وویستی بچێتە رکوع دەستی لە پۆشاکەکەیەوە دەرهێناو بەرزی کردنەوە، پاشان تەکبیری کردو چووە رکوع، کە فەرمووی (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) دەستەکانی جارێکی تر بەرز کردەوە.

## ـ جاری وا هەبوو پێش تەکبیری ئیحرام دەستی بەرز دەکردەوە:

ـ ریوایەتێکی تری سەیدنا ئیبنوعومەرە خوا لێیان رازی بێت کە دەڵێ: (كانَ رسولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم إِذَا قَامَ الَى الصَّلَاةِ رَفَعَ يَدَيهِ حَتَى تكونَا حَذْوَ مَنْكِبَيهِ، ثُمَّ كَبَّرَ)[1] واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله

---

[1] موسلیم (١٣/٢)، بەیهیقی (٢٨/٢، ٧١)، ئەحمەد(٣١٧/٤). بوخاری (١٦).

[1] موسلیم (٦/٢ـ٧)، ئەبوداوود (١١٤/١)، نەسائی (١٤٠/١)، بەیهیقی (٢٦/٢و٦٩).

عليه وسلم كە هەڵدەستا بۆ نوێژەكەی دەستی بۆ ئاستی سەرشانەكانی بەرز دەكردەوەو ئینجا تەكبیرەی ئیحرامی دەكرد..

## ـ جاری واش هەبوو دوای تەكبیری ئیحرام دەستی بەرز دەكردەوە:

ـ ریوایەتی ئەم شێوەیەش زۆرە، لەوانە سەیدنا مالیكی كوڕی حوەیریس خوا لێی رازی بێت گێڕاوێتیەوە كە دەڵێ: (أنَّ رسولَ اللهِ صلى الله عليه وسلم كانَ إذَا كَبَّرَ رَفَعَ يَدَيهِ حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا أُذُنَيهِ)[1] واتە: كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم تەكبیرەی ئیحرامی دەكرد (تا بچێتە ناو نوێژەوە) دەستەكای بۆ ئاستی گوێچكەی بەرز دەكردەوە.

## * رەفتاری پەنجەی دەستەكان لە كاتی بەرزكردنەوەیاندا:

ـ ریوایەتی سەیدنا ئەبو هورەیرەیە خوا لێی رازی بێت كە دەڵێ: (كانَ رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليهِ وسَلَّمَ إذَا دَخلَ فِي الصَّلاةِ رَفَعَ يَدَيهِ مَدًّا)[2] واتە: كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەچووە ناو نوێژەكەیەوە، دەستەكانی بە درێژكراوەیی بەرز دەكردەوە.. واتە پەنجەكانی رێك بەرەو ئاسمان دەكرد..

---

[1] بوخاری (٧و٢٣)، موسلیم (٧/٢٠)، ئەبوداوود (١/١١٩)، ئەحمەد (٥/٥٣)، ئیبنوماجە (١/٢٨٢)، بەیهیقی (٢/٢٥).

[2] ئەبوداوود (١/١٢٠)، نەسائی (١/١٤١)، ترمزی (٢/٦)، تەحاوی (١/١١٥)، ئیبنوخوزەیمە (١/٦٤)، الحاكم (١/٢١٥)، ئەحمەد (٢/٤٣٤).. حاكم فەرموویەتی سەحیحیەو ئیمامی زەهەبی لایەنگیریی كردووەو شێخی ئەلبانیش لە (صفة صلاة النبي ١/١٩٩)دا فەرموویەتی (وهو كما قالا) واتە: هەر واشە كە فەرموویانە..

ـ ریوایەتی تریش هەیە كە دەڵێ: پەنجەكانی بە شێوەیەكی ئاسایی بەرەو ئاسمان بەرز دەكردەوە، نە زۆر ڕێكی دەكردن نە دەیچەماندنەوە، نە لێكی بڵاو دەكردنەوەو نە زۆر تێكی دەپەستاندن..

ـ ئەوەی ئیمامی ئیبنولقەییم لە (زاد المعاد ٧١/١) دا باسی پەنجەی پیرۆزی پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم هێناویێتیەوە كە گوایە ڕووی لەپی دەستی دەكردە قیبلەو بە سەحیحیشی ناساندووە، شێخی ئەلبانی ڕەحمەتی دەڵێ: ریوایەتێكی تەبەرانیە كە لە ئەوسەتدا لە سەیدنا ئیبنو عومەرەوە ریوایەتی كردووە، بەڵام لە سەنەدەكەیدا عومەری كوڕی عیمرانی تێدایە كە ریوایاتی زەعیفە، پاشان شێخی ئەلبانی دەڵێ: لەوانەیە لە ڕێی قیاسەوە لای ئیبنولقەییم بەهێز بووبێت.. بۆیە ئەلبانی هیچ ریوایەتێكی لا نەبۆتە بەڵگە كە دەبێت لە تەكبیرەی ئیحرامی نوێژدا ڕووی لەپی دەستت لە قیبلە بێت[١].

ئەلبانی ڕەحمەتی دەربارەی ریوایەتە جیاوازەكانی فەرمووده كە باس لە چۆنیەتی دەست بەرز كردنەوەو ڕادەو بڕو شێوازی دەكەن دەڵێ: فەرموودەكان جەخت لەوە دەكەنەوە كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستەكانی تا ئاستی شانی بەرز دەكردەوە، مەبەست لەوەیە كە لەپی دەستەكان دەگەیشتنە ئاستی شانی، ئەمەش وەكو بەیهیقی ریوایەتی كردووە: ریوایەتی سەیدنا عومەرو عبداللەی كوڕیی و ئەبوهورەیرەیە خوا لێییان ڕازی بێت، ئەمە مەزهەبی شافیعیشە كە لە (الأم ٩٠/١) دا هێناوێتیەوەو یاوەرانیشی لەسەر ئەم بۆچوونەن، ئیمامی نەوەوی دەڵێ[١]:

---

[١] الالباني: صفة صلاة النبي ٢٠١/١..

[١] المجموع ٣٠٧/٣.

ئیبنولمونزیر دەڵێ: ئەمە بۆچوونی ئیمامی مالیك و ئەحمەدو ئیسحاق و زۆرینەی ئەهلی حەدیسیشە.. ئیمامی ئەحمەد دەڵێ: موسوڵمان بە هەموو شێوەكان دەست بەرز كاتەوە چاكترە، چونكە ریوایەتی شێوەیەكیان لە ریوایەتی شێوەیەكی تریان چاكتر نیە..

دەڵێم (شێخی ئەلبانی بەردەوامەو وا دەڵێ): ئەمەی ئەحمەد فەرموویەتی ئەو راست و دروستە، چونكە هەموو شێوەكان هەر سوننەتن، بۆیە زۆرینەی توێژەرەوەكانمان وایان فەرمووە، وەكو عەلی القاری و سیندی حەنەفی[١]..

ئەوەش كە كەسانێك ـ بە تایبەتی حەنەفیەكان ـ لە كاتی تەكبیرەی ئیحرام و نیەت هێناندا دوو پەنجە پانەكەی دەستەكانیان دەگەێننە نەرمەی گوێچكەیان بەڵگەی لەسەر نیەو ئەوی لەسەرێتی شێخی ئەلبانی توێژینەوەی لەسەر كردوون و پێی زەعیف بوون[٢]..

كەوابوو دەست بەرز كردنەوە لە پاش و پێش و كاتی تەكبیرەی ئیحرامدا تا ئاستی گوێچكە دەبێت، سەری پەنجەكان ئاسایی روویان لە ئاسمانەو لەپی دەستەكان روویان لە گوێچكەیە، پەنجەكان ئاسایی دەگیرێن و نە گرمۆڵە دەكرێن و نە لێك بڵاو دەكرێنەوە..

*** رەفتاری دانانی دەستی راست لەسەر چەپ لەسەر سنگ:**

ئەو چۆنیەتیە جیاوازانەی لە دەستدانانی نوێژدا لە نێوان موسوڵماناندا دەبینرێت، هەندێكیان بەڵگەیان هەیە، چونكە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە زۆر شێوە دەستی گرتووە، لەوانە:

---

[١] الالباني: صفة صلاة النبي ١/٢٠٢..

[٢] الالباني: صفة صلاة النبي ١/٢٠٤..

## یەكەم: دەستی راست لەسەر چەپ دەبێت:

١ ـ (وَكَانَ يَضَعُ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى الْيُسْرَى)[١] واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستی راستی دەخستە سەر دەستی چەپی..

٢ ـ دەیفەرموو (إِنَّا مَعْشَرَ الأَنْبِياءِ أُمِرْنَا بِتَعْجِيلِ فِطْرِنَا، وَتَأْخِيرِ سُحُورِنَا، وَأَنْ نَضَعَ أَيْمَانِنَا عَلَى شَمَائِلِنَا فِي الصَّلَاةِ)[٢] واتە: ئێمەی دەستەی پێغەمبەران فەرمان پێ كراوە كە بەربانگ زوو بكەینەوەو پارشێومان دواخەین، هەروەها دەستی راستمان بخەینە سەر دەستی چەپمان..

٣ ـ (مَرَّ بِرَجُلٍ وَهُوَ يُصَلِّي وَقَدْ وَضَعَ يَدَهُ الْيُسْرَى عَلَى الْيُمْنَى، فَانْتَزَعَهَا وَوَضَعَ الْيُمْنَى عَلَى الْيُسْرَى)[١] واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە لای كابرایەكدا تێپەڕی كە نوێژی دەكرد، دیتی دەستی

---

[١] حاكم (٣١٨/٤)، ابن حبان (٤٨٥)، بەیهیقی (٢٨) لە رێی وائیلی كوڕی حوجرەوە گێڕاویێتیەوە.. ئەلبانی لە الارواء (٣٥٢)دا دەفەرموێ: سەحیحە.. لە (أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم ٢٠٩/١) دا توێژینەوەیەكی زۆرتری كردووە و ئاماژەی كردووە بە: ئەبوداوود (١١٥/١)، نەسائی (١٤١/١)، داریمی (٣١٤/١)، ئیبنوخوزەیمە (٢/٥٤/١)، ئیبنوحیببان (٤٨٥)، بەیهیقی (٢٧/٢)، ئەحمەد (٣١٨/٤) دەربارەی سەنەدەكەشی دەفەرموێ كە پەیوەستەو لەسەر مەرجەكانی موسلیمە (وهذا إسناد متصل صحيح على شرط مسلم) ئیمامی ئیبنوحەجەریش لە (فتح الباری٢/١٧٨) بە سەحیحی ناساندووە..

[٢] تەبەرانی لە كەبیر (١١٤٨٥) و ئەوسەت (١/١٠٠) لە سەیدنا ئیبنو عەبباسەوە خوا لێیان رازی بێت  كە ئەلبانی دەرهەقی دەفەرموێ: إسناد رجاله كلهم رجال مسلم. أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٢٠٥/١).

[١] ئیمامی ئەحمەد (٣٨١/٣)، دارەقوتنی (١٠٧)، ئەبوداوود (١/١٢٠)، نەسائی (١٤١/١) ئیبنوماجە (٢٧١/١)،ئیبنوحەزم: المحلى (١١٢/٤) ئیمامی نەوەوی لە المجموع (٣١٢/٣) لە پێناسەی سەنەدەكەیدا دەفەرموێ: صحيح على شرط مسلم، شێخی ئەلبانیش دەفەرموێ وهو كما قال.. أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٢٠٨/١).

چەپی خستۆتە سەر دەستی راستی، دەستی لێك ترازاندن و راستی بۆ خستە سەر چەپی..

## دووەم: دەستی راست لەسەر چەپ و لەسەر سنگ دەبێت:

توێژینەوەکانی شێخی ئەلبانی رەحمەتی بەلگەی هەموو ئەوانەی بڕیووە کە پێیان وایە دەست دانان لەسەر غەیری سنگیش جائیزە.. بە تایبەتی حەنەفیەکان کە سوورن لەسەر ئەوەی دەست لە خوار ناوکەوە بگرن، بۆیە دەڵێ: هەر فەرموودەیەك لەسەر دەست دانان لەسەر غەیری سنگ دەهێنرێتەوە یان زەعیفە یان ئەسڵ و ئەساسی نیە[1]..

١ ـ (كَانَ يَضَعُ الْيُمْنَى عَلَى ظَهْرِ كَفِّهِ الْيُسْرَى وَالرُسْغَ وَالسَّاعِدَ، أَمَرَ بِذَلِكَ أَصْحَابَهُ، وَكَانَ أَحيَاناً يَقْبِضُ بِالْيُمْنَى عَلَى الْيُسْرَى)[2] واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستی راستی دەخستە سەر پشتی دەستی چەپی و (جاری وا هەبوو دەیخستە سەر) مەچەکی و (جاری وا هەبوو دەیخستە سەر) بازووی، فەرمانی بە یاوەرانیشی وا دەکرد، جاری واش هەبوو بە دەستی راستی دەستی چەپی دەگرت..

٢ ـ (وَكَانَ يَضَعُهما عَلَى الصَّدْرِ)[1] واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەردوو دەستەکانی دەخستە سەر سنگی..

---

[1] أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٢١٨/١) و أحكام الجنائز (ل ١١٨).

[2] بوخاری (١٧٨/٢)، ئەبو داوود (١١٥/١)، نەسائی (١٤١/١)، داریمی (٣١٤/١)، ئیبنو خوزەیمە (٢/٥٤/١)، ئیبنوحیببان (٤٨٥)، بەیهیقی (١٣٢/٢)، ئیمامی ئەحمەد (٣١٨/٤) گێڕاویانەتەوەو ئیمامی ئیبنوحەجەر لە فتح (١٧٨/٢) و ئیمامی نەوەوی لە المجموع (٣١٢/٣) و ئیبنولقەییم لە زاد (٨٥/١) هەموو فەرموویانە کە سەحیحە.

[1] ابن خزيمە (٢/٥٤/١)، ئیمامی ئیسحاقی کوڕی راهەوی وەکو المروزی لە: (المسائل ٢٢٢) لێوەی نەقڵ کردووە.. شێخی ئەلبانیش دوای توێژینەوە چەندین ریوایەتی دەفەرموێ: سەحیحە.. أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٢١٦/١).

٣ ـ نابێت دەست بخاتە بەر کەلەکەی، واتە خوار پەراسووەکانیەوە لە لا تەنیشتەوە، وەك هەنگڵی گۆزەو دەسکی سوراحییان لێ بکات، چونکە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەرهەڵستی رەفتاری وای دەکرد: (كَانَ يَنْهَى عَنْ الإِخْتِصَارِ فِي الصَّلاةِ وَهُوَ الصَّلْبُ الَّذي كَانَ صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ يَنْهَى عَنهُ)[١] واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەرهەڵستی دەکرد لەوەی لە کاتی نوێژدا دەست بخرێتە لا قەپرغە (لا کەللەکە)..

لە توێژینەوەو سۆراغی ریوایەتەکاندا دەردەکەوێت کە پێغەمبەری نازدار صلی الله علیه وسلم دەستی راستی دەخستە سەر دەستی چەپی و هەردووکیانی لەسەر سینەی دادەنا، بە دوو پەنجەی پان و شایەتمانی دەستی چەپی دەگرت و سێ پەنجەکەی تری بە بن مەچەکیدا دەهێنایەوە. دیسان توێژینەوەکان ئەوە روون دەکەنەوە کە ریوایەتی مەزهەبی شافیعی لە دەستدانان (لەسەر ناوك) و حەنەفی (لە خوار ناوك) لاوازن و جۆرو شێوەی خواپەرستییان پێ ناچەسپێندرێت.. والله اعلم .

*** رەفتاری پێ دانان:**

پەسەندترین بۆچوون کە دوای بەدواداچوونی رای شەرعناسان پێی گەیشتم ئەوەیە کە لە کاتی راوەستانی نوێژدا باشترە کە پێیەکان مەسافەیەك لێك دوور بن. شەرعناسان لە بۆچوونیاندا لەسەر ئەم مەسەلەیە دوو پۆلن:

---

[١] بوخاری (٣/٦٨)، موسلیم (٢/٧٢)، ئەبوداوود (١/١٥٠)، نەسائی (١/١٤٢)، ترمزی (٢/٢٢٢)، داریمی (١/٣٣٢)، بەیهیقی (٢/٢٨٧)..

. **ئەوانەی پێیان وایە باشترە پێیەکان لێك دووربن:** ئەمە بۆچوونی زۆرینەی شەرعناسانە. بەڵگەشیان ئەو فەرموودانەیە کە دەیسەلمێنن کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە کاتی نوێژدا ئەژنۆو رانەکانی لێك دوور دەخستنەوە، کەوابوو پێیەکانیش کە بەوانەوەن، هەر وەکو ئەوان لێك دوور رادەگیرێن:

ـ سەیدنا ئەبو حەمیدی ساعیدی خوا لێی رازی بێت لە وەسفی نوێژی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم دەڵێ: (وَإِذَا سَجَدَ فَرَّجَ بَينَ فَخِذَيهِ)[1] واتە: کە سوجدەی دەبرد رانەکانی لێك جوێ دەکردەوە..

ئیمامی شافیعی دەیفەرموو: بە قەدەر بستێك پێیەکان لێك دوور خەنەوە. ئەمەش وەکو ئیمامی نەوەوی دەڵێ: بۆچوونی یاوەرانی مەزهەبی شافیعیە[2]..

. **ئەوانەی پێیان وایە باشترە پێیەکان لێك پێکەوە بنوسرێن:** ئەمە بۆچوونی حەنبەلیەکان و زۆرینەی شەرعناسانی حەنەفیەو لە شەرعناسانی سەردەمیش: شێخی ئەلبانی و ئیبنو عوسێمینە.. بەڵگەیان ئەو فەرموودەیە کە عائیشەخان خوا لێی رازی بێت دەڵێ: (فَقَدْتُ رَسولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَكَانَ مَعِي عَلَى فِرَاشِي، فَوَجَدْتُهُ سَاجِداً، رَاصاً عَقِبَيهِ، مُسْتَقْبِلاً بِأَطرافِ أَصَابِعِهِ الْقِبْلَةَ، فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ، وَبِعَفْوِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ)[1] واتە: شەوێك کە

---

[1] ئەبوداوود (٧٣٥).ئیبنوحەجەر: التلخيص الحبير (٢٥٥/١)، ئەلبانی: الارواء (٣٥٨).

[2] المجموع (٤٠٧/٣).

[1] الطحاوي: بيان مشكل الآثار (١٠٤/١)، وابن المنذر: الأوسط (١٤٠١/) وابن خزيمة: (٣٢٨/١)، وابن حبان (٢٦٠/٥)، والحاكم (٣٥٢/١) البيهقي (١٦٧/٢). بە پێی مەرجی بوخاری و موسلیمەو ئیمامی زەهەبیش لایەنگری بووە، بەڵام شێخی ئەلبانی دەفەرموێ: بە پێی

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، لەسەر جێگاکەم بوو، دیار نەما، هەستم کرد وا لە سوجدەدایە، هەردوو پاژنە پێکانی هەڵناوە، پەنجەکانی پێی کردوونەتە قیبلە، گوێم لێبوو دەیفەرموو: خوایە پەنا بە رازی بوونت دەگرم لە تووڕەبوونت پەنا بە لێبوردنت دەگرم لە سزات..

پێم و انیە بەڵگەی شەرعناسانی پۆلی دووەم هێندە بەهێز بێت ببێتە بەڵگەی ئەوەی کە دەبێت پاژنە پێکان لە کاتی وەستاندا بۆ نوێژ پێکەوە بنوسێنرێن.. بۆیە پێم وایە رای جمهوری شەرعناسان پەسەندتر بێت..

کەوابوو لە کاتی راوەستان بۆ نوێژ دەشێت پێیەکان بە گوێرەی پێویست لێك جودا بکرێنەوە، بستێك، یان کەمترو زیاتر، بە شێوەیەك لە عورفی نوێژخوێنانی ناوچەکە دەرنەچێت.. والله اعلم.. نەك وەك ئەوەی هەندێك لە گەنجەکانی خۆمان جاری وا هەیە نیو مەترقاچی دەکاتەوەو دەبێتە هۆی جەنگ و جیدالێکی بێ هۆ..

*** رەفتاری روانین:**

شەرعناسان لەوەدا راجوێ بوون کە ئایا نوێژخوێن لە کاتی نوێژکردنیدا تەماشای کوێ دەکات، بەڵگەی زۆریش لەسەر ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، لە کاتی راوەستانی لە نوێژدا چاوی دەبڕییە شوێنی سوجدەبردنەکەی خۆی.. هەندێك ریوایاتی تریش هەیە کە دەڵێ تەماشای پێش خۆی دەکرد..

---

مەرجەکانی موسلیمە نەك مەرجی هەردووکیان.. أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه وسلم (٢/٧٣٦).

ئیمامی مالیك پێی وایە کە نوێژخوێن ئیمام بێت یان مەئمووم دەبێت لە کاتی نوێژکردندا سەیری پێشەوەی خۆی بکات.. ئیمامی بوخاری لە سەحیحەکەیدا (باب) ێکی بۆ ئەوە بە ناوی (باب رفع البصر الى الأمام في الصلاة)[1] تەرخان کردووە، کە چەند فەرموودەیەکی تێدا هێناوەتەوە ئەوە دەسەلمێنێت کە یاوەران لە کاتی نوێژیاندا لە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، تەماشای ئەویان دەکرد..

ئیمامی شافیعی و کوفییەکان ـ کە پەسەندکراوی حەنەفیەکان نەقڵ دەکەن ـ پێیان وایە کە باشتر ئەوەیە نوێژخوێن لە کاتی وەستانیدا لە نوێژدا چاو ببڕێتە شوێنی سوجدەکەی، چونکە سیماو کرۆکی ملکەچی زیاتر پێوە دیارە.. شێخی ئەلبانیش دەڵێ: ئەمە راسترە، چونکە بەڵگەی فەرموودە زیاتر پاڵپشتێتی..

زانایانی وەکو ئیبنو حەجەری عەسقەلانی دوای توێژینەوە فەرموویەتی: دەشێت بە جیاواز تەماشای ئیمام و مەئمووم بکرێت، دەشێت هەردووکیان تەماشای شوێنی سوجدەکانیان بکەن ، مەگەر مەئمووم پێویستی بە تەماشاکردنی ئیمامەکە بۆ چاودێریی هەبێت، ئەمما ئەو کەسەی بە تەنها نوێژەکەی دەکات ئەوە حوکمی وەکو حوکمی ئیمام وایە..

پاشان ئەلبانی دەڵێ: بەمەش ئەو فەرموودانەی بوخاری هێناونیەوە لەگەڵ ئەو فەرموودانەدا کە دەڵێ سەیری شوێنی سوجدەکەی خۆی دەکرد، پێکەوە دەسازێنرێن. والله اعلم[1].. شەرعناسانی پۆلی دووەم

---

[1] بوخاری (٢/١٨٤).

[1] أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه وسلم (١/٢٣٣).

(ئیمامی شافیعی و هاورایانی) چەند بەڵگەیەکیان بۆ بۆچوونی خۆیان هێناوەتەوە، لەوانە:

١. (كَانَ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ إذَا صَلَّى طَأطَأَ رَأسَهُ وَرَمَى بِبَصَرِهِ نَحْوَ الأرْضِ)[١] واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، کە نوێژی دەکرد سەری نزم دەکردەوەو چاوی دەبڕییە شوێنی سوجدەکەی لەسەر زەوی..

ئەهلی تەفسیر لەسەر ئەوەن کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە لە سەرەتادا نوێژی دەکرد، سەری بەرز دەکردەوەو سەیری ئاسمانی دەکرد ئیتر ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ ﴾ المؤمنون/٢ واتە: ئەو موسوڵمانانە شادمانن کە... ئەوانەش کە لە نوێژەکانیاندا ملکەچن.. ئیتر پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە نوێژدا چاوی دەبڕییە شوێنی سوجدەکەی[١]..

٢. (وَلَمَّا دَخَلَ الْكَعْبَةَ مَا خَلَّفَ بَصَرَهُ مَوْضِعَ سُجُودِهِ حَتَّى خَرَجَ مِنْهَا)[٢] واتە: ئەو کاتەی کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم،

---

[١] حاکم (٣٩٣/٢) فەرمووشیەتی بە پێی مەرجی بوخاری و موسلیم سەحیحە، بەڵام شێخی ئەلبانی دەفەرموێ لەبەر هەبوونی باوکی ئەبو شوعەیب لە سەنەدەکەدا کە لە پیاوی سەنەدەکانی لای بوخاری نیە، هەرچەندە جێمتمانەیەو مامۆستای ئیمامی موسلیم بووە، دەبێ بووترێت بە پێی مەرجەکانی موسلیم سەحیحە.. أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه وسلم (٢٣٦/١).

[١] ابن كثير: تفسير القرآن العظيم (٢٢٥/٣) ، الطبري (٣٤٩/٥)، القرطبي (١١٠/١٢)، الحازمي: الاعتبار (ل ٦٠)

[٢] بەیهیقی (١٥٨/٥) لە حاکمەوە (٤٧٩/١) کە فەرموویەتی: بە پێی مەرجی بوخاری و موسلیم سەحیحە، ئیمامی زەهەبیش لایەنگیریی کردووەو شێخی ئەلبانیش دەفەرموێ: وهو كما قالا.. أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه وسلم (٢٣٢/١).

دەچووە كەعبە بۆ نوێژ چاوی لە شوێن سوجدەكەی بەرز نەدەكردەوە تا لە نوێژكەی تەواو دەبوو..

بۆچوونی شێخی ئەلبانی لە پێكەوە سازاندنی فەرموودەی هەردوولادا پەسەندترە، بۆیە پێم وایە نوێژخوێن دەبێت لە كاتی بەپێوە وەستانی نوێژیدا تەماشای شوێنی سوجدەكەی بكات.. والله اعلم.

★ ★ ★

# باسی سێیەم: خوێندن لە نوێژدا

نوێـژخوێنێك هەسـتاوەتە سـەر پـێ و رووی لـە قیبلـە کـردووەو دەیەوێت نوێژەکەی دەسـپێبکات، یەکـەمین شـتێك کـە دەیڵێت تـەکبیرەی ئیحرامە، واتە ووتنی الله اکبر، بەمەش داخڵی نوێژەکەی دەبێت.. ئینجا چەندین ئایەت و فەرموودە هەن دەبێت بیانخوێنێت، لێرەدا هەنـدێکیان بە ریزبەندی خوێندنیان ان شاء الله دەخەمە بەردەست:

## یەکەم: دوعای دەسپێك (ئیستفتاح)

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دوای ئەوەی بە تەکبیرەی ئیحرام داخڵـی نوێـژ دەبـوو، دوعایـەکی دەخوێنـد کـە بـە دوعـای (ئیسـتیفتاح) ناسراوە، ئەمەش ریوایەتی سەحیحی لەسەرە.. سەیدنا ئەبو هورەیرە خوا لێـی رازی بێـت دەڵـێ: (كـانَ رسـولُ اللهِ صَـلَّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ إذَا كَبَّـرَ في الصَّلَاةِ ؛ سَكَتَ هُنَيَّةً قَبْلَ أنْ يَقْرَأَ. فَقُلْتُ: يـا رسـولَ اللهِ! بـأبِي أنْـتَ وأمِّـي ؛ أرَأَيْـتَ سُـكُوتَكَ بَـينَ التَّكْـبيرِ والْقِـرَاءَةِ ؛ مَـا تقـولُ؟ قـالَ: أقـولُ:...)[1] واتـە: پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليـە وسـلم کـە تـەکبیرەی ئیحرامـی دەکـرد، کەمێك پێش ئەوەی (فاتیحە) بخوێنێت بێدەنگ دەبوو، عەرزم کرد: ئـەی پێغەمبەری خوا، دایکوباوکم بە قوربانت بن، دەبینم لـە نێـوان تـەکبیرەی ئیحـرام و خوێندنەکـەدا بـێ دەنـگ دەبیـت، چـی دەخوێنیـت؟ فـەرمووی: دەڵێم:....

---

[1] بوخاری (٢/١٨٢)، موسلیم (٢/٩٨)، ئیبنوماجە (١/٢٦٩)، ئیبنوئەبی شەیبە (١٢/١١٠/٢)، ئەحمەد (٢/٢٣١).

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەمەشی بە فەرمان بەو کابرایە فەرموو کە نوێژەکەی بە هەڵە دەخوێند، پێی فەرموو: (إِنَّهَا لا تَتِمُّ صَلاةُ أَحَدِكُمْ حَتَّى يُسْبِغَ الْوُضُوءَ كَمَا أَمَرَهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ، فَيَغْسِلَ وَجْهَهُ، وَيَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ، وَيَمْسَحَ بِرَأْسِهِ وَرِجْلَيْهِ إِلَى الْكَعْبَيْنِ، ثُمَّ يُكَبِّرَ اللَّهَ وَيَحْمَدَهُ وَيُمَجِّدَهُ، وَيَقْرَأَ مِنَ الْقُرْآنِ مَا أَذِنَ اللَّهُ لَهُ فِيهِ وَتَيَسَّرَ، ثُمَّ يُكَبِّرَ فَيَرْكَعَ)[1] واتە: نوێژی کەستان تەواو نابێت هەتا بەو شێوەی کە خوای گەورە فەرمانی پێداوە، دەستنوێژ بە رێکوپێکی نەگرێت، دەموچاوی نەشوات، ئینجا دووباسکی تا ئانیشکی بشوات، پاشان مەسحی سەر بکات و پێیەکانی بشوات، ئینجا الله اکبر بکات و نوێژ دابەستێ، ئینجا سوپاس و ستایشی خوا گەورە بکات و ئەوەندەی خوای گەورە رێی پێ دەدات و بۆی ئاسانە قورئانی تێدا بخوێنێت، پاشان تەکبیر بکات و بچێتە رکووع.

خوێندنی دوعای دەسپێك (ئیستیفتاح) کارێکی شەرعیەو سوونەتی موئەککەدەیە، ئەمەش بۆچوونی ئیمامی ئیبنو حەزم و ئیمامی شافیعی و یاوەرانێتی.. ئیمامی نەوەوی دەڵێ: وا پێناچێت غەیری ئیمامی مالیك کەس لە شەرعناسان پێچەوانەی ئەمە بن، ئەو رەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێ: دوای تەکبیرەی ئیحرام یەکسەر (الحمد لله رب العالمين) دەخوێنێت تا سورەتی فاتیحە تەواو دەکات، واش نازانم (ئیمامی نەوەوی دەڵێ)

---

[1] بوخاری / بەشی قیرائەت (١١ ـ ١٢)، نەسائی (١/١٩٤)، حاکم (١/٢٤٢) لە رێی داوودی کوڕی قەیسەوە. هەروەها: بوخاری و نەسائی (١٦١ و ١٩٣)، شافیعی لە: الام (١/٨٨) دا، بەیهیقی (٢/٣٧٢)، ئیمامی ئەحمەد (٤/٣٤٠) لە رێی محمدی کوڕی عەجلانەوە، هەروەها: ئەبوداوود (١/١٣٧) لە رێی محمدی کوڕی عەمرەوە، ئەوانیش لە عەلی کوڕی یەحیای کوڕی خەلادەوە.. ئەلبانی دەفەرموێ: پیاوانی سەنەدەکان پیاوانی راوی بوخارین و سەنەدەکانیش سەحیحن.. ئیمامی ئیبنو حەجەری عەسقەلانی چەندین رێی تری باس فەرمووە لە فتح الباري دا لە بابەکانی: (التكبير) و (الاستفتاح) ، (القراءة) دا.

وەڵامـی یـەکێك لـەم حەدیسـە سـەحیحانەی پـێ بێـت کەلەسـەر دوعـای ئیستیفتاحن[١].. شێخی ئەلبانیش کە ئەمـەی ئیمـامی نـەوەوی هێناوەتـەوە دەڵێ: هەڵوێستەکەی ئیمامی مالیك سێ سـوونـەت رەت دەکاتـەوە: دوعـای ئیستیفتاح، ئیستیعازە، بەسمەلە[٢] ئەمانەش سوننەتی سەلمێنراون و رەنگـە ریوایەتەکانی بـە ئیمـامی مالیـك نەگەیشـتبن، یـان پێـی گەیشـتوون بـەڵام لەبەر هۆیەك وەرینەگرتوون.[٣]..

دوعـای ئیسـتیفتاح چـەندین ریوایـەتی هەیـە کـە چـەندین دوعـای جیاواز لەخۆ دەگرن، خوێندنی هەر یەکەیان سوونەتە، لەوانە:

١- ریوایەتەکەی سەیدنا ئەبو هورەیرە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە وەڵامی پرسیارەکەیدا فەرمووی: (عَنْ أبي هريرة قَـالَ كَـانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا كَبَّرَ فِي الصَّلَاةِ سَكَتَ هُنَيَّـةً قَبْـلَ أَنْ يَقْرَأَ فَقُلْتُ يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ بِـأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي أَرَأَيْتَ سُكُوتَكَ بَـيْنَ التَّكْبِيرِ وَالْقِرَاءَةِ مَا تَقُولُ قَالَ أَقُولُ اللَّهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَـايَ كَمَـا بَاعَـدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ اللَّهُمَّ نَقِّنِي مِنْ خَطَايَايَ كَمَا يُنَقَّـى الثَّـوْبُ الْأَبْيَضُ مِـنْ الـدَّنَسِ اللَّهُـمَّ اغْسِـلْنِي مِـنْ خَطَايَـايَ بِـالثَّلْجِ وَالْمَـاءِ وَالْبَـرَدِ)[٤] واتـە:

---

[١] النووی: المجموع (٣/٣٢١).

[٢] ئیستیعازە: ووتنی (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم)، بەسمەلە: ووتنی (بسم الله الرحمن الرحیم)..

[٣] الالباني: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه وسلم (١/٢٤٠).

[٤] بوخاری (٢/١٨٢)، موسلیم (٢/٩٨)، ئیبنوماجە (١/٢٦٩)، ئیبنوئەبی شەیبە (١٢/١١٠/٢)، ئەحمەد (٢/٢٣١). شێخی ئەلبانی دوای ئەوەی توێژینەوەی ئەم فەرموودەیەی لە (أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه وسلم (١/٢٤٠)) دا کردووە، فەرموویەتی: (وهو أصح أدعية الاستفتاح سندا) پاشان دەفەرموێ: حافز ئیبنوحەجەری عەسقەلانی لە (فتح الباري ٢/١٨٣) دا هێناوێتیەوەو پێش ئەویش شێخی ئیسلام ئیبنوتەیمییەش لە (رسالة تنوع العبادات ل ٨٥)دا.

پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم کە تـەکبیرەی ئیحرامـی دەکـرد، کەمێك پێش ئەوەی (فاتیحە) بخوێنێت بێـدەنگ دەبـوو، عـەرزم کـرد: ئەی پێغەمبەری خوا، دایکوبـاوکم بـە قوربانـت بـن، دەبیـنم لـە نێوان تەکبیرەی ئیحرام و خوێندنەکەدا بێ دەنـگ دەبیـت، چی دەخوێنیـت؟ فەرمووی: دەڵێم: خوایە نێـوان مـن و گوناحـەکانم ئەوەنـدە لێـك دوور خەرەوە، وەك کە نێوانی رۆژهەڵات و رۆژئـاوات لێـك دوور خسـتۆتەوە، خوایە لە گوناحەکانم پاکم کەرەوە، هەر وەکو کە پۆشـاکی سـپی لـە پیسی و چـەپەڵی پـاك دەکرێتـەوە، خوایـە بـە ئـاوو بـەفرو تـەرزە لـە گوناحەکانمم داشۆرە..

٢- ریوایەتی سەیدنا عەلی کوڕی ئەبو تالیب خوا لێی رازی بێـت کـە دەڵێ: (کـانَ رسـولُ اللهِ صـلى الله عليـه وسـلم إذا افْتَـتحَ الصَّلاةَ كَبَّـرَ ثـمَّ قالَ: إنّي وَجَّهْتُ وَجْهِي لِلّذِي فطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالأرْضَ حَنِيفًا وَمَا أنَا مِـنَ الْمُشْـرِكِينَ ، إنَّ صَـلاتي وَنُسُـكِي وَمَحْيَـايَ وَمَمَـاتي لِلّـهِ رَبِّ الْعَـالَمِينَ لا شَرِيكَ لَهُ ، وَبِذَلِكَ أُمِرتُ وَأنَا أوَّلُ الْمُسلِمِين ، اللّهُمَّ مِنْكَ وَلَكَ يَا اللّهُ وَاللّهُ أكْبَرُ، أللهُمَّ أنْتَ الْمَلِكُ لا إلهَ إلا أنْتَ ﴿سُبْحَانَكَ وَبحَمْدِكَ﴾ أنْتَ رَبِّـي وأنـا عَبْـدُكَ ظَلَمْتُ نَفْسِي وَاعْتَرَفْتُ بِـذَنْبِي فَـاغْفِرْ لِـي ذَنْبِـي جَمِيعَـاً إنَّـهُ لا يَغْفِرُالـذّنُوبَ إلا أنْـتَ. واهْـدِنِي لِأحْسَـنِ الأخْـلاقِ لا يَهْـدِي لِأحْسَـنِهَا إلا أنْتَ.وَاصْرِفْ عَنّي سَيِّئَهَا لا يَصْرِفُ عَنّـي سَـيِّئَهَا إلا أنـت. لَبَّيْـكَ وَسَعْدَيْكَ والْخَيرُ كُلُّهُ فِي يَدَيكَ وَالشَّرُّ لَـيسَ إليـكَ ﴿والمَهْـدِيُّ مَـنْ هَـدَيْتَ﴾ أنَـا بِـكَ وإليكَ ﴿لا مَنْجَا ولا مَلْجَأَ مِنْكَ إلا إليـكَ﴾، تَبَارَكْـتَ وَتَعَالَيْـتَ أسْـتَغْفِرُكَ

وأتوب إليكَ)[١] واته: دوای ئەوەی پێغەمبەری خـوا صـلى الله عليـه وسـلم نوێژەكـەی بـه تـەكبیرەی ئیحـرام دەسـت پـێ دەكـرد، دەیفـەرموو: مـن هەڤوویسـتانه رووم كردۆتـه ئـەوەی كـه ئاسمانـەكان و زەوی دروسـت كردووه، من له موشریكان نـیم، مـن نوێـژو پەرسـتنەكانی تـرو ژیـان و مـردنم بـۆ خـوای پـەروەردگاری جیهانیانـه كـه هـیچ شـەریك و هاوبەشـێكی نیـه، بـەوەش فـەرمانم پێـدراوەو منـیش یەكـەمین موسـوڵمانم، خوایـه لـه تۆوەیـەو بـۆ تۆیـه، خـوا گەورەیـه، خوایـه دەسەڵاتدار هەر تۆی، هیچ خوایەك نیه شایانی خوایەتی بێت جگه لـه تۆ، پاك و بێ خەوشـی و سوپاس بـۆ تۆیـه، تـۆ خـوامی و مـن بەنـدەی تـۆم، مـن سـتەمم لـه نەفسـی خـۆم كـردووه، دان بـه گونـاحی خۆمـدا دەنـێم، خوایـه لـه هـەموو گوناحـەكانم خـۆش بـه، كـەس ناتوانێـت گوناحان بسرێتەوه جگه له تۆ، خوایه رێنماییم بكه بـۆ پەسـەندترین رەفتـارو رەوشـت، كەسـیش غـەیری تـۆ ناتوانێـت رێنمـایی بكـات بـۆ باشترین رەوشت، خوایه رەفتارو رەوشتی ناپەسەندم لێ دوور بخـەرەوە، كەسیش ناتوانێت غەیری تـۆ رەوشـتی خراپـه لـه كـەس دوور خاتـەوە، خوایه من وەدەنگ بانگەوازەكەتەوه هاتووم، هەر هـەموو خێـرو چاكه وا لـه دەسـت تـۆدا، هـیچ خراپەیـەك لای تـۆ نیـه، رێنمـایی كـراو ئـەو كەسـەیه كـه تـۆ رێگـات نیشـانداوە، مـن بـه تـۆم و بـۆ تـۆم، هـیچ جـێ حەشـارو پەناگەیـەك نیـه مەگـەر هـەر لای خـۆت، پـاك و پیرۆزیـت،

---

[١] موسلیم (٢/١٨٥)، ئەبوداوود (١/١٢١)، دارەقوتنی (١١١)، ئەحمەد (١/١٠٢)، بەیهیقی (٢/٣٢)، نەسائی (١/١٦٩،١٦١،١٤٢)، ترمزی (٢/٢٥٠) دەربارەشی دەفەرموێ: (حسن صحیح)، ئیمامی شافیعی له كتێبی (الأم١/٩١) شێخی ئەلبانی دەربارەی دەفەرموێ: صحیح علی شرط مسلم.

بەرزی و مەزنی بۆ تۆ، داوای لێبوردنت لێ دەکەم و پەشیمانیم قبـوولّ بفەرموو..

ئیمامی ئیبنولقەییم لە (زاد المعـاد ٧٢/١) دا دەڵێ پێغەمبـەری خـوا صلى الله عليه وسلم ئـەم دوعایـەی لـە شـەونوێژدا دەخوێنـد، نـەك لـە فەرزەکانـدا.. بـەڵام شـێخی ئـەلبانی ئەمـە ڕەت دەکاتـەوەو دەڵێ: هـیچ بەڵگەیـەك بـە دەسـتەوە نیـە ئـەو پسـەیە بسـەلمێنێت، چـونکە ئـەوە سەلمێنراوە کە لە فـەرزو سـووننەتدا وەکو یـەك خوێنـدوونی. ئیمـامی نەوەویش لە (المجموع ٣١٥/٣) دا دەڵێ کـە لەفزەکـە بـە ڕەهـایی هـاتووە نوێژی فەرزو نوێژی سووننەت وەکو یەك دەگرێتەوە[1]..

دیسان شێخی ئەلبانی دەڵێ: زانایان و شەرعناسـان فەرموویانـە کـە خوێنـدنی ئـەم زیکرانـە بـۆ ژن و پیـاو وەکـو یەکـەو جیـاوازی لـە نێوانیاندا نیە[2]..

٣- ڕیوایەتی کۆمەڵێك لە یاوەرانی عەزیزی پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليـه وسـلم، لەوانـە: سـەیدنا ئـەبو سـەعیدی خـودری و خـاتوو عائیشـەو سـەیدنا ئەنـەس و سـەیدنا جابر خـوا لێیـان ڕازی بێـت کـە گێڕاویانەتـەوە کـە پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليـه وسـلم لـە دوعـای ئیستیفتاحدا دەیفەرموێ: (سُبْحَانَكَ وَبِحَمْدِكَ، وَتَبَارَكَ اسْمُكَ وَتَعَالَى جَدُّكَ وَلا إِلَهَ غَيْرُكَ)[3] واتە: پاك و بێ خەوشـی بـۆ تـۆو بـە سوپاسـەوە،

---

[1] الالباني: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه وسلم (٢٤٩/١).

[2] هەمان سەرچاوە (٢٤٧/١).

[3] ئەبوداوود (١٢٤/١)، نەسائی (١٤٣/١)، ترمزی (٩/٢-١٠)، داریمی (٢٨٢/١)، ئیبنوماجە (٢٦٨/١)، تەحاوی لە (شرح معاني الاثار ١١٦/١)، دارەقوتنی (١١٢)، بەیهیقی (٣٤/٢)، ئیمامی ئەحمەد (٥٠/٣). شێخی ئەلبانی دوای توێژینەوەی هەموو ڕیوایەتەکانی ئەم فەرموودەیە دەفەرموێ: ئیبنومیندە بە سەنەدی سەحیح لە (التوحيد ١٢٣/٢) دا ڕیوایەتی کردۆتەوەو

ناوت پیرۆزو بەرزەو مەزنێتیت بڵند رادەگیرێت، هیچ خوایەك نیە شایانی خوایەتی بێت جگە لە خۆت..

## دووەم: ئیستیعازە

ئیستیعازە: ووتنی (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم).. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە هەڵدەستا بۆ نوێژ تەکبیرەی ئیحرامی دەکردە بە ئیستیعازە دەستی بە نوێژخوێندنەکەی دەکرد، کە بە پەنهانی دەیخوێند، ریوایاتی ئەمەش زۆرە، لەوانە:

١ـ ریوایەتی سەیدنا ئوبەی کوڕی کەعب خوا لێی رازی بێت کە لە بوخاریدایە، دەڵێ: (ثمَّ كانَ صلَّى اللَّهُ عليْهِ وَسلَّمَ يَستعيذُ باللهِ تعالَى؛ فيقولُ: أعوذُ باللهِ من الشَّيطانِ الرَّجيمِ ؛ مِن هَمْزِهِ، ونَفْخِهِ، ونَفْثِهِ)[1] واتە: پاشان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پەنای دەگرت بە خوای گەورە لە شەیتانی رەجمکراو، لە دەست لێوەشاندنی، لە فووی وەسوەسەو مشەی لوت بەرزیەکەی،کاریگەریی گومڕاکارییەکەی.. هەندێك لە شەرعناسان پێیان وانیە ئیستیعازە لە نوێژدا هەبێت، بەڵام ئیمامی ئیبنوحەزم و ئیمامی نەوەوی توێژینەوەیەکی ووردیان

---

منیش (واتە ئەلبانی) دواتر لە نەسائیدا (بە ژمارە ٨٤٩ و ٨٥٠) بینیم و لە زنجیرەی سەحیحەدا بە ژمارە (٢٩٣٩) تەخریجم کردەوە.

[1] بوخاری (٢٤٢/١٠).

لەسەر کردووەو ئەمەیان پەسەند کردووە کە ئێمە لێرەدا لە ئەلبانیەوە وەرمان گرتووە[١]..

٢ـ ریوایەتی سەیدنا ئەبو سەعیدی خودری و جوبەیری کوڕی موتعیم و ئیبنومەسعوودو عومەری خوڕی خەتتاب و ئەبو ئومامە خوا لێیان رازی بێت هەیە دەڵێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کە نوێژی دادەبەست یەکسەر دوای تەکبیرەی ئیحرام دەیفەرموو: (أعُوذُ باللهِ السَّمِيعِ الْعليمِ مِنْ الشَّيطانِ الرَّجيمِ) شێخی ئەلبانی لە کتێبی (ارواء الغليل) دا توێژینەوەی لەسەر هەر یەکێك لەو سەنەدانە کردووە کە لای ئەبوداوودو ترمزی و داریمی و دارەقوتنی و تەحاوی و بەیهیقی و ئیمامی ئەحمەدەو فەرموودەکەی بە سەحیح ناساندووە[٢].. ئەلبانی دەڵێ: ریوایەتێکی سەحیحم بۆ ساغ نەبۆتەوە کە تەنها (أعُوذُ باللهِ من الشَّيطانِ الرَّجيمِ) ی فەرموو بێت، هەرچەندە زۆر لە شەرعناسان بە تایبەتی شافیعیەکان فەرموویانە کە مادام خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾ النحل/٩٨ واتە: کە قورئانت خوێند پەنا بە خوا بگرە لە شەیتانی رەجمکراو، کەوابوو ووتنی (أعُوذُ باللهِ من الشَّيطانِ الرَّجيمِ)ەکە فەرمانەکە دێنێتە دی، بەڵام شێخی ئەلبانی رەحمەتی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کەئەو فەتوایە تەنها یەك فەرموودەی مورسەلی هەیە ئەوە بسەلمێنێت، بەڵام فەرموودەی تری سەحیح هەیە کە زیادەکانی دەسەلمێنێت، کەوابوو باشتر وایە ـ بە رای شێخی ئەلبانی بووترێت:

---

[١] ابن حزم: المحلى (٢٤٧/٣)، النووي: المجموع (٣٢٦/٣) الالباني: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه وسلم (٢٧١/١).

[٢] الالباني: ارواء الغليل (٣٤٢).

(أعُوذُ باللهِ السَّمِيعِ الْعَليمِ مِنْ الشَّيطانِ الرَّجيمِ) ئەمە رای هەندێك لە توێژەرەوانی مەزهەبی شافیعیشە وەکو شێخی رافیعی[1]..

منیش پێم وایە بەم زیادەیەوە بڵێین: (أعُوذُ باللهِ السَّمِيعِ الْعَليمِ مِنْ الشَّيطانِ الرَّجيمِ)..

## سێیەم: بەسمەلە

بەسمەلە: ووتنی (بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ)..

ریوایاتی فەرمووده لەسەر ئەوە زۆرە کە دەڵێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە نوێژدا دوای تەکبیرەی ئیحرام و ئیستیعازە یەکسەر بەسمەلەی دەکرد، لەوانە: ریوایەتی سەیدنا ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی رازی بێت کە بە چەندین سەنەد ریوایەت کراوە، یەکێکیان لە رێی شوعبەوە، لە قەتادەوە، لە ئەنەسەوە هاتووە کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و ئەبوبەکری سددیق و عومەری کوڕی خەتتاب کە نوێژیان دادەبەست، بە ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ دەستیان پێ دەکرد.. واتە خەڵکەکە ئەوەیان بە دەنگی بەرز لێ دەبیستن[2]..

---

[1] الرافعي: شرح الوجيز ٣٠٥/٣.

[2] بوخاری (١٨٠/٢)، موسلیم (١٢/٢)، تەحاوی (١١٩/١)، دارەقوتنی (١١٩)، بەیهیقی (٥١/٢)، ئەحمەد (١٧٩/٣، ٢٧٣، ٢٧٥).

### بەسمەلە: بە پەنهانی دەخوێندرێت نەك بە دەنگی بەرز:

بەڵگەی زۆر لەسەر ئەوە كۆن كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و یاوەرانی نزیكی وەكو سەیدنا ئەبوبەكرو عومەرو عوسمان لە هیچ نوێژێكی جەماعەتدا كە ئیمام بوون بەسمەلەیان بە دەنگی بەرز نەخوێندووە.. ئەمەش بۆچوونی پێشەوایانی تابعینە وەكو سوفیانی سەوری و عبداللەی كوڕی موبارەك و ئیمامی ئەحمەدو ئیسحاقی كوڕی راهەوەی.. شێخی ئەلبانی خوا پاداشتی بداتەوە لە توێژینەوەی ئەمەدا بە دوای یازدە ریوایەتدا چۆتەوەو هەمووی ساغ كردۆتەوەو سەلماندویێتی كە بەسمەلە لە نوێژدا دەبێت بە پەنهانی بخوێندرێت[١].. ئەمەش بۆچوونی ئیمامی ئەبوحەنیفەو هەردوو یاوەرەكەیەتی[٢] ، هەروەها ئەمە بۆچوونی زۆرینەی زانایانی فەرموودەوانیشە..

بەڵام ئیمامی شافیعی و یاوەرانی دەڵێن ووتنی بەسمەلە بە دەنگی بەرز سووننەتە.. ئیمامی نەوەوی رەحمەتی فەرموودەی زۆری لەسەر بۆچوونی ئیمامی شافیعی هێناوەتەوە[٣]، بەڵام شێخی ئەلبانی دوای توێژینەوەی فەرموودەو سەنەدەكانیان دەڵێ: هەر كەسێك بە ئینسافەوە تەماشای ئەم فەرموودانە بكات، یەك فەرموودەی سەحیح و سەریحی چنگ ناكەوێت كە پاڵپشتی بۆچوونەكەیان بێت.. ئینجا تەحقیقاتی خۆی و ئیمامی زەیلەعی لە (نصب الراية) و ئیمامی شەوكانی لە (نيل الاوطار) دوە نەقڵ دەكات، كە چۆن هەموویان توێژینەوەی ووردەكارانەیان بۆ هەموو ریوایەتەكانی ئیمامی شافیعی و نەوەوی كردووەو سەرەنجام

---

[١] الالباني: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه وسلم (١/٢٧٧-٢٩٢).

[٢] محمد بن حسن الشيباني: الآثار (١٥-١٦).

[٣] المجموع (٣/٣٣٤-٣٥٦) ،

سەلماندوویانە کە ووتنی بەسمەلە بە پەنهانی سوونئەتە نەك بە دەنگی بەرز..

شێخی ئەلبانی رەحمەتی تەنانەت ئەوەشی رەت کردۆتەوە کە ئیمامی ئیبنولقەییم دەڵێ: (پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەندێك جار بەسمەلەی بە دەنگی بەرز دەفەرموو، زۆرینەی جارەکانیش بە پەنهانی). یان ئەوەی ئیبنوتەیمییە کە دەڵێ: (لەوانەیە خوێندنی بەسمەلەکەی بە دەنگی بەرز پێشتر بووبێت و دواتر وازی لێ هێنابێت، ئەمەش ئیحتیمالە).. بەڵام شێخی ئەلبانی رەحمەتی ئەم ئیحتیمالەشی پێ قبووڵ نەبووە، ئەمەش راسترە[1].

کەوابوو راستر ئەوەیە کە ووتنی (بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ) لە نوێژدا وەکو ئیستیعازە بە بێ دەنگی دەوترێت.. والله اعلم..

## چوارەم: خوێندنی قورئان لە نوێژدا

خاتوو ئوم سەلەمە خان خوا لێی رازی بێت چۆنیەتی قورئان خوێندنی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەگێڕێتەوە،

ـ دەڵێ: (ثمَّ يَقْرأُ الفَاتِحَة، ويُقطعُهَا آيةً آيَةً إلى آخِرِ السُّورَةِ. وَكَذلِكَ كَانَتْ قِرَاءَتهُ كُلُّهَا ؛ يَقِفُ عَلَى رُؤوسِ الآيِ، وَلا يَصِلُها بمَا بَعْدَهَا)[2] واتە

---

[1] ابن القيم: زاد المعاد (٧٣/١)، ابن تيمية: المجموع (٨٧/١)، الالباني: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه وسلم (٢٩٢/١).

[2] ئەبو داوود(١٦٩/٢)، بەیهیقیش لەوەوە (٤٤/٢)، ترمزی (١٥٢/٢)، دارەقوتنی (١١٨)، حاکم (٢٣١/٢) و فەرموویەتی سەحیحە لەسەر مەرجی بوخاری و موسلیم و ئیمامی زەهەبیش لایەنگرێتی ، هەروەها ئیبنوخوزەیمە بە سەحیحی داناوە (لە تەفسیری ئیبنو

پاشان سورەتی فاتیحەی دەخوێند كە ئایەت بە ئایەت لێكی جیا دەكردنەوە.. یەعنی (بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ) دەخوێندو دەوەستا، ئینجا ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ی دەخوێندو دەوەستا، ئینجا ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ دەخوێندو دەوەستاو ئینجا ﴿ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴾ وە هەروەها تا كۆتایی فاتیحە.. قورئان خوێندنی هەر وابوو، لە كۆتایی هەموو ئایەتێك دەوەستاو پەیوەستی نەدەكردەوە بەوەی دوایەوە..

ئەلبانی دەڵێ: ئەمە سوننەتێكە بە داخەوە زۆرینەی قورئان خوێنەكان ـ چ جای خەڵكی تر ـ وەلیان كردووە[1]..

ـ (مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ) و (مَلِكِ يَوْمِ الدِّينِ):

هەروەها دەڵێ: (وَكَانَ تارَةً يَقْرأُهَا (مَلِكِ يَوْمِ الدِّينِ وتارَةً مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ)[2] واتە: جاری وا هەبوو (مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ)ی بە (مَلِكِ يَوْمِ الدِّينِ) دەخوێندەوە. ئەمەش وەكو ئیمامی ئیبنوكەسیر دەڵێ: خوێندنەوەیەكی بەناوبانگی ناو قورئان خوێنەكانە، هەردوو شێوەی خوێندنەوەكە لە قیرائاتی حەوتدا هەیە، هەرچەندە ریوایەتی سەحیح هەیە كە سەیدنا ئەبوبەكرو عومەرو عوسمان و معاویە خوا لێیان

---

كەسیر(١/١٧)ەوە وەرگیراوە، ئیمامی نەوەویش لە (المجموع (٣/٣٣٣) بە سەحیحی ناساندووە، شێخی ئەلبانیش دەفەرموێ: هەر وایە كە فەرموویانە (الالباني: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه وسلم (٢٩٣/١)).. ئیبنو ئەبوداوود لە (المێاحف ٢/٧)، ئەبونوعەیم لە (اخبار أێبهان ١/١٠٤)، حاكم (٢/٢٣١)، فەرمووشیەتی سەحیحەو ئیمامی زەهەبیش لایەنگریی بووە.

[1] الالباني: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه وسلم (٢٩٤/١).

[2] ئیبنو ئەبوداوود لە (المصاحف ٢/٧)، ئەبونوعەیم لە (اخبار أصبهان ١/١٠٤)، حاكم (٢/٢٣١)، فەرموویەتی سەحیحەو ئیمامی زەهەبیش لایەنگریی بووە، بڕوانە (الالباني: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه وسلم (٢٩٨/١).).

رازی بێت هەموو بە (مَالِكِ) دەیانخوێندەوە، بەڵام زەمەخشەری دەڵێ: (مَلِكِ) پەسەندترە چونكە خوێندنەوەی ئەهلی حەرەمەینەو خوای گەورەش دەفەرموێ: (لِّمَنِ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ۖ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ) غافر/١٦.

★ ★ ★

## باسی چوارەم: دانانی سوترە

**سوترە:** ووشەیەکی عەرەبیە بە مانای بەربەست و ناوبڕ. لە شەرعدا بریتیە لە هەر شتێك کە نوێژخوێن لە نێوان خۆی و جێ سوجدەکەیدا دابنێت، کە کۆتایی جێ سوجدەی نوێژ دیاری دەکات، دەشێت پایە یان دیوارێك بێت و لێی نزیك بێتەوە، دەشێت دارێك بێت چەقێنرا بێت، دەشێت گۆزەیەك، تەرمۆزەیەك، کتێبێك بێت بە پێوە راگیرا بێت، گرنگ ئەوەیە بستێك بەرز بێت و سێ باڵ یان سێگەز، یان مەترو نیوێك لە بەرامبەر نوێژخوێنەکە بێت..

### حیکمەت لە هەبوونی سوترە:

شەرعناسان فەرموویانە: بۆ ئەوەیە کە بزانرێت لە نوێژدایەو بە بەر نوێژەکەیدا نەڕۆن.. هەندێکی تر فەرموویانە: لەبەر ئەوەیە کە نوێژخوێن سنورێك بۆ روانین و بینینی خۆی دانێت و هەوڵ بدات لەو سنورە دەرنەچێت .

### فەرزە یان سوننەت؟!

شەرعناسان دوای ئەوەی لە شیاوێتی بوونەتەوە باسیان لە فەرزبوون ونەبوونی کردووە.. هەندێکیان کە فەرموودەکانیان لا سەحیح بووە وەکو ئیبنوخوزەیمەو شەوکانی و ئەلبانی فەرموویانە دانانی سوترە فەرزە. جمهوری شەرعناسانی تر فەرموویانە: لەبەر ئەوەی فەرموودەی تریش هەیە کە دەسەلمێنێت کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی بە

بێ هەبوونی سوترە کردووە، کەوابوو هەبوونی سوترە بۆ نوێژ سوننەتێکی موئەککەدەیە.

**ـ ئەوانــەی فەرموویانــە ســوننەتە:** جمهــوری شەرعناســانن، ئیبنوروشدی مـالیکی دەڵـێ: کـە شەرعناسـان فەرموویانـە هـەبوونی باشـە مەبەستیان لەوەیە کە فەرز نیەو سوونەتە، چونکە ئەگەر نوێژەکەی بـە بێ سوترە کـرد، دروسـتە، چونکە سـوترە لـە تەواوکـەرەکانی نوێـژ نیـە و دروست ونادروستی نوێژ لەسەر ئەو نەوەستاوە[١]. بەڵگەیان ئەو فەرمودەیە کە سـەیدنا ئیبنوعـەبباس خـوا لێـی رازی بێـت دەڵـێ: (قَـالَ: أَقْبَلْـتُ عَلَـى حِمَارٍ أَتَانٍ، وَرَسولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم يُصَلِّي بِالنَّـاسِ بِمِنًـى إِلَـى غَـيرِ جِدَارٍ، فَمَرَرْتُ بَينَ يَدَي بَعْضِ الصَّفِّ، فَنَزَلْتُ وَأَرسَـلْتُ الأَتَـانَ تَرْتَـعُ، وَدَخَلْـتُ الصَّفَّ فَلَمْ يُنْكِرْ ذَلِكَ عَلَي أحَدٌ)[٢] واتە: بە سواری ماکەرێکەوە هاتمـە مینـا، بینیم پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژ دەکات، بێ ئـەوەی رووی لە دیوارێك بێت، منیش بەبـەر ریـزی نوێژخوێنانـدا رۆیشـتم، دابـەزیم و لێگـەڕام ماکەرەکـە بلـەوەڕێت وخۆشـم چـوومە ریـزی نوێـژەوە، کەسـی نکـووڵی ئـەوەی لـێ نـەکردم.. شەرعناسـان دەڵـێن: مەبەسـتی ئەوەیـە بـێ ئەوەی سوترەیەکی بۆ خۆی دانابێت[٣]..

---

[١] ابن رشد: بداية المجتهد (١٢١/١).

[٢] بوخاری (١٩٩/١ ـ ٤٩٣)، موسلیم (١٧٢/٤)، ئیمامی مالك: الموطأ (٣٦٧ ل ١٠٢).

[٣] السرخسی: المبسوط (٤٦/٢)، ئیبنونەجیم: البحر الرائق (٩٥/٤)،ئیبنو عابدین: رد المختار (٤٩٨/٤)، محمد الغەربی: مواهب الجليل لشرح مختصر خليل (١٢٦/٤ رای ئەم بەرێزانەشی تێدایە: ئیبنو عەرەفە، ئیبنوعیاز، ئەلباجی، ئیبنولعەرەبی، ئیبنوعەبدولبیر، ئیبنولحەبیب و ئیبنوروشد)، ئیمامی شافیعی لە: اختلاف الحديث (ل ٩٧) ئیمامی نەوەوی لە روضة الطالبين (٣٩٨/١)، ئیبنوقودامە: المغني ٦/٤)، ئیبنوحەجەر: فتح الباري (٣٩٨/٣)، سەنعانی: سبل السلام (٢٠٢/١)..

ئەمـە راوبۆچـوونی شـێخ بـن بـازو بـن عوسـێمین و سـەید سـابق و شەرعناسانی لیژنەی دائیمی فەتواو ئیرشادی ئیسلامی جەزیرەشە[١].

ئیمـامی ئـەبو حەنیفـە دەڵـێ: ئەگـەر لـەوە دڵنیـابوو كـە كـەس بـە بەرنوێژەكەیدا تێناپەڕێت، بۆی هەیە سوترە دانەنێت[٢]..

ئیمامی شافیعی دەڵێ: خۆی سەرپشكە چەند لە سوترەكەی نزیك دەبێتەوە، چونكە نوێژەكەی بە بێ سوترەش تەواوە، بەبەر نوێژەكەشیدا بڕۆن نوێژەكەی هەر تەواوە، چونكە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لـە كەعبـەدا بـێ سـوترە نوێـژی دەكـردو خـەڵكیش بەبـەر نوێژەكەیـدا دەڕۆیشـتن، ئـەوە نوێـژی تـەنهایی بـوو نـەك پێشـنوێژی جەماعـەت. لـە میـنـاش پێشـنوێژی بـە یـاوەران كـردو سوترەشـی دانـەنابوو.. وەكـو فەرموودەكەی ئیبنوعەبباس روونی دەكاتەوە[٣]..

ئیبنوروشدی مالیكی دەڵێ: شەرعناسـان لەسـەر ئـەوە كۆن كـە دانـانی سوترە لە كاتی نوێژی تاك و كۆمەڵدا شتێكی باشە[٤]..

ئیمامی نەوەوی دەڵێ: باشتر وایە لە كاتی نوێژدا سوترەیەك بۆ خۆی دانێـت، دیوارێـك، كۆڵەكەیـەك، شـتێكی وا كـە بەرامبـەری بوەسـتێت و نوێژەكەی بكات، بە مەرجێك سێ باڵ لێوەی دوورتر نەبێت[٥].

دیارە ئیمامی نەوەوی لەبەر ئەو فەرموودەیەتی كە دەڵێ: (وَكَانَ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم يَقِفُ قَرِيباً مِنْ السُّترَةِ، فَكَانَ بَينَهُ وَبَينَ الْجِدَارِ ثَلاثَةُ أَذرُعٍ،

---

[١] ابن باز: كيفية صلاة النبي (ل ٤)، ابن عثيمين: الشرح الممتع (٣٠٩/٢)، فتاوى اللجنة الدائمة (٢٦١٣)..

[٢] الفتاوى الهندية (٣٤٤/٢).

[٣] ئیمامی شافیعی: اختلاف الحديث (ل ٩٧).

[٤] بداية المجتهد (١٣١/١).

[٥] النووي: روضة الطالبين (٣٩٨/١).

وَبَينَ مَوْضِعِ سُجُودِهِ وَالْجِدَارِ مَمَرُّ شَاةٍ)[١] واتـه: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیه وسلم له نزیك سوترەیەكەوە بۆ نوێژ دەوەستا، مەسافەی سێ باڵ لـه سـوترەكەیەوە دوور دەبــوو، نێــوان شــوێنی ســوجدەكەی و دیوارەكــەی بەرامبەری (ئەوەندە دەمایەوە كه) بەرخێك پێیدا گوزەری دەكرد..

ئیبنورەجەبی حەنبەلی دەڵێ: باشتر وایـه نوێـژ بەرامبـەر سـوترەیەك بكرێـت، ئەمـە لای زۆرینـە واجـب نیـە، لـە نـاو شەرعناسـانی مەزهـەبی ئیمامی ئەحمەددا ئەم بۆچوونە بەناوبانگترە[٢]..

ئیبنوقودامەی مەقدیسی دەڵێ: سوترە مەرجی نوێـژ نیـە، هـەر باشـتر وایە دانرێت[٣]..

شـێخ ئیبنوبـازی رەحمـەتی لەشــەرحی فـەرموودەی ژمـارە (٢٤٤) ی كتێبی (بلوغ المرام)دا دەڵێ: ئـەم فەرموودەیـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی كـە باشترە سوترە دابنرێت ئەگەرچـی تیرێكیش بێـت. هـەروەها دەڵـێ: باشـتر وایـە سـوترە دانێـت و لێـی نزیـك بێتـەوە.. لـە شـوێنێكی تریشـدا[٤] دەڵـێ: نوێژخوێن ئیمام بێت یان مەئمووم، سوونەتە سوترەیەك لە پـێش خـۆی دانێت چونكە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فـەرمانی پێكـردووە.. تەئكیدیش دەكاتەوە كە سـوونەتە نـەك فـەرز، چونكە پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیه وسلم بە بێ سوترەش نوێژی كردووە[٥]..

---

[١] بوخاری (٢/٤٥٥)، موسلیم (٢/٥٩)، بەیهیقی (٢/٢٧٢)..
[٢] ابن حجر: فتح الباري (٣/٣٠٨).
[٣] ابن قدامة: المغني (٤/٦).
[٤] ابن باز: كیفیة صلاة النبي (ل ٤).
[٥] ابن باز: تحفة الاخوان بأجوبة تتعلق باركان الاسلام (ل ٨١).

ـ **ئەوانـەی فەرموویانـە واجبـە:** ریوایـەتێکی ئیمـامی ئەحمـەدە، بـەڵام لـە شـەرحی (واجـب) ێتیەکەیـدا فەرموویانـە: ناشـێت وازی لـێ بهێنرێت، واتە بە مانـای سوونەتی موئەککەدەی لای شەرعناسانی تـرە، بۆیە لای ئەمانیش دانـەنانی سوترە بـە ئەنقەستیش بێـت، نابێتـە هۆی بەتاڵبوونەوەی نوێژ.

بەڵگەی ئەمانیش ئەوەیە کە:

## یەکەم: فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە فەرمانی تێدا بە دانانی سوترە بۆ نوێژ کردووە:

١ـ سـەیدنا ئیبنوعومـەر خـوا لێیـان رازی بێـت گێڕاوێتیـەوە کـە پێغەمبەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم فەرموویـەتی: (لا تصَلِّ إلَّا إلَـى سُترَةٍ، وَلا تدَعْ أحَدْ يَمُرُّ بَينَ يَديكَ ؛ فإنْ أبَى فلْيُقاتِلْهُ، فإنَّ مَعَهُ قَـرِينْ)[1] واتـە: نوێـژ بـەرەو سـوترە نـەبێت مەیکـە، نەشـهێڵێت کـەس بەبـەر نوێژەکەتدا بڕوات، ئەگەر هـەر گوێی نەدایـەو ڕۆیشـت، پـاڵی پێـوەنێ، ئەوە هاوڕێی (پاڵنەری) خراپی لەگەڵدایە.. لە ریوایەتەکانی تردا دەڵێ ئەوە شەیتانی لەگەڵدایە:

٢ـ فەرموودەیەکی تر کە سـەیدنا ئـەبو سـەعیدی خـودری خـوا لێـی رازی بێت دەیگێڕێتەوە دەڵێ: (إذا صَلَّى أحَدُكُمْ فلْيُصَلِّ إلى سُترَةٍ وَلْيَدْنُ

---

[1] موسلیم (٥٠٦) و سەحیحی ئیبنوخوزەیمە ژمارە (٧٩٣).

مِنهَا وَلا يَدَعْ أحَداً يَمُرُّ بَينَهُ وبَينَهَا فإنْ جَاءَ أحَدٌ يَمُرُّ فَليُقَاتِلْهُ فَإنَّهُ شَيطانٌ)[١]..

٣ـ هەروەها فەرموودەکەی سەیدنا سەهلی کوڕی ئەبو حەسمە خوا لێی ڕازی بێت کە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (إذَا صَلَّى أحَدُكُمْ إلَى سُترَةٍ فَلْيَدْنُ مِنهَا لا يَقْطَعُ الشَّيطانُ عَلَيهِ صَلاتَهُ) [٢].. واتە: ئەگەر کەسێکتان نوێژی بەرامبەر سوترەیەك دەکرد با ئەوەندە لێی نزیك ببێتەوە کە ڕێ نەدات شەیتان نوێژەکەی پێ ببڕێت..

٤ـ فەرموودەکەی سەیدنا سەبرەی کوڕی مەعبەدی جەهنی خوا لێی ڕازی بێت کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی داوە کە: (لِيَسْتَتِرْ أحَدُكُمْ وَلَو بِسَهْمٍ)[٣]..ئەگەر کەسێکتان تیرێکیش بچەقێنێت و بیکات بە سوترە با بیکات..

٥ـ هەروەها فەرموودەکەی تری سەیدنا ئیبنو عومەر خوا لێیان ڕازی بێت کە دەڵێ: (كانَ النَّبيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ إذَا خَرَجَ يَومَ العِيدِ

---

[١] ئەبوداوود (١١١/١)، نەسائی (١٢٢/١)، بەیهیقی (٢٧٢/٢) تەحاوی (٢٦٥/١)، حاکم (٢٥١/١)، ئیبنوئەبی شەیبە (٣١٢/١) شێخی ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٦٥١) دا دەفەرموێ سەحیحە: شێخ مەشهوور حەسەن لە (أخطاء المصلین ل٧٦) دا دەفەرموێ حەسەنە.

[٢] ئیبنوئەبی شەیبە لە: (المصنف ٣١٢/١)، ئیمامی ئەحمەد لە المسند / توێژینەوەی شێخ ئەحمەد شاکر کە بە سەحیحی ناساندووە (٤٥٢/١٣ ـ ١٦٠٥٥)، نەسائی (٧٤٥ ) شێخی ئەلبانیش لە (تمام المنة ل ٣٠٤) دا هەر بە سەحیحی ناساندووە ..

[٣] ئیمامی ئەحمەد لە موسنەدەکەی خۆی (١٣٨/١٢ ـ ١٥٢٧٧)، ئیبنو ئەبی شەیبە (٣١١/١)، ئیبنوحەجەری عەسقەلانی لە (بلوغ المرام ل ٦٧ ژمارە ٢٥٤) شێخی ئەلبانیش بە سەحیحی داناوە (مختصر الصحیحة ل ١٠٢ ـ ٥٣٨).

أمَرَ بالحَرْبَةِ فتوضعَ بَينَ يَدَيهِ فيُصَلّي إليهَا)[١] واتە: کە پێغەمبەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم بـۆ نوێـژی جـەژن تەشـریفی دەبـردە دەرەوە فـەرمانی دەکـرد کـە حەربەیـەك (قەمەیـەکی درێـژ یـان شمشـێرێکی کورت) ی لـە پـێش جێ نوێژەکەیـەوە بـۆ بچەقێنرێت،تا بـۆی ببێتـە سوترە.

## دووەم: ڕەفتاری پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە سوترەی بۆ نوێژ داناوە :

١ـ فەرموودەکەی ئەبو جوحەیفە کـە دەڵـێ: (خَـرَجَ عَلَينَـا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ بالهَـاجرَةِ، فـأُتِيَ بوَضُـوءٍ فتوَضَّـأَ فصَلَّـى بنَـا الظُّهْـرَ وَالْعَصْـرَ وَبَـينَ يَدَيـهِ عَنَـزَةٌ وَلاَ يَضُـرُّهُ مَـنْ مَـرَّ وَرَاءَ ذلِـكَ)[٢] واتـە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیـە وسـلم لـە گـەرمای نیـوەڕۆدا تەشـریفی هێنایە لامان، ئاوی دەستنوێژیان بۆ هێنـا، دەسـتنوێژی گـرت و نوێـژی نیوەڕۆو عەسری کرد، عەنەزەیەکیشی[٣] لە پێش خۆی دانابوو، ئەوانەی لەودیوو عەنەزەکەوە تێدەپـەڕین کاریگـەرییان لەسـەر نوێژەکـەی ئـەم نەبوو..

٢ـ لە ریوایەتێکی تردا دەڵێ: (فيَمُرُّ مِنْ وَرَائِهَا الـمَرْأَةُ وَالحِمَـارُ)[٤] واتـە: ژن و کەرسواریش بەوێدا تێدەپەڕین..

---

[١] بوخاری (٤٩٤)، موسلیم (٢٥٤)، ئیمامی ئەحمەد (٤٩٤/٥ ـ ٦٢٨٦).
[٢] بوخاری (٤٦٩)، موسلیم (٢٥٢).
[٣] عەنەزە: دارێك بووە کۆتاییەکەی ئاسنی پێوە قایم کراوە (ئیمامی نەوەوی: شەرحی سەحیحی موسلیم ١٧٤/٤) لە عەسا درێژترو لە رم کورتتر بووە (مختار الصحاح ل ٢٤١).
[٤] موسلیم (٤ / ٢٢٠).

٣ـ هەروەها ریوایەتی سەیدنا ئیبنو عومەر خوا لێیان رازی بێت كە دەڵێ: (أنَّهُ كَانَ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ يَغْدُو إلَى الْمُصَلَّى وَالْعَنَـزَةُ تحْمَلُ وتنْصَبُ بالْمُصَلَّى بَينَ يَدَيهِ فيُصَلِّي إلَيهِ)[1] واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم تەشریفی دەبرد بۆ ساحەی نوێژی جەژن و عەنەزەیەكیشی لەگەڵ خۆی دەبرد، لەوێ بەرامبەر جێنوێژەكەی خۆی دەیچەقاند..

٤ـ سەیدنا سەلەمەی كوڕی ئەكوەع خوا لێی رازی بێت دەڵێ: (أنَّهُ رَأى النَّبيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ يَتحَرَّى الصَّلاةَ عِنْدَ الإسْطوانَةِ)[2] واتە: پێغەمبەری خوای صلى الله عليه وسلم بینی لە كۆڵەكەی مزگەوتەكە نزیك دەبۆوە تا نوێژی بەرامبەر دەكات.. واتە دەیكردە سوترە:..

٥ـ یان كە سوارییەكەی خۆی دەكردە سوترە وەكو سەیدنا ئیبنو عومەر خوا لێیان رازی بێت دەگێڕێتەوە: (أنَّ النَّبيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ كانَ يُعْرِضُ رَاحِلَتهُ فيُصَلِّي إلَيهَا)[3] واتە: پێچی بە سوارییەكەی (حوشتر بووبێت یان ئێسترو گوێدرێژ) دەكردەوەو دەیكردە سوترەو نوێژەكەی دادەبەست.

٦ـ یان حەربەیەكییان بۆ دەچەقاندو ئەویش عليه الصلاة و السلام دەیكردە سوترە، وەكو سەیدنا ئیبنو عومەر خوا لێیان رازی بێت

---

[1] بوخاری كتاب العيدين (٩٧٣ ـ ٢١٤/١)، نەسائی (١٥٦٢)..
[2] بوخاری (٤٥٧/٢ ـ ٥٠٢)، موسلیم (٥٩/٢ ـ ٢٦٤)، بەیهیقی (٢٧٠/٢) ئیمامی ئەحمەد (٤٨/٤).
[3] بوخاری (٤٥٩)، بەیهیقی (٢٦٩/٢)، ئیمامی ئەحمەد (١٢٩/٢) .

دەگێڕێتەوە: (كَانَ تَرَكَّزُ الحَرْبَةُ قُدَّامَهُ يَومَ الفِطرِ وَالنَّحرِ ثمَّ يُصَلِّي)[١].لە ریوایەتێکی تردا: (كَانَ يُرَكَّزُ الحَرْبَةُ يَومَ العِيدِ فيُصَلِّي إِلَيهَا)[٢]..

٧ـ جێ خەوتنی کردۆتە سوترە: عائیشەخان خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە: (لَقَدْ رَأَيْتنِي مُضْطَجِعَةً عَلَى السَّرِيرِ فيَجِيءُ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ فيَتَوَسَّطُ السَّرِيرَ فيُصَلِّي)[٣] دەتبینی من لەسەر پێخەفەکە راکشاوم، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم تەشریفی دەهێنایەوە، لە ئاستی ناوەندی پێخەفەکە نوێژی دەکرد.. یەعنی جێ نووستنەکەی عائیشە خانی دەکردە سوترە، لە کاتێکدا کە ئەویشی لەسەر راکشابوو..

٨ـ سوترەیەکی تر دارو درەختە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی لە بەرامبەریدا کردووە، سەیدنا عەلی خوا لێی رازی بێت دەڵێ: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي إِلَى شَجَرَةٍ)[٤] واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەرامبەر بە درەختێك نوێژەکەی دەکرد، یەعنی دەیکردە سوترەی خۆی..

٩ـ عائیشەخان خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە سوترەیەکی تری پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم حەسیرێکی لوول کراو بووە کە بە رۆژ رایدەخست و بەشەو لوولی دەکردو لە پێش خۆی دایدەنا و دەیکردە سوترەی نوێژی شەوانی: (كَانَ لِرَسولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ حَصِيرٌ يَبْسُطُهَا بالنَّهَارِ وَيَحْتجِرُهَا باللَيلِ فيُصَلِّي إِلَيهَا)[٥].

---

[١] بوخاری (٢/٤٥٤)، موسلیم (٢/٥٥).
[٢] بوخاری (٤٩٨).
[٣] بوخاری (٥٠٨)، موسلیم (٢٧١).
[٤] ئیمامی ئەحمەد (٢/١٦١١٨٨) توێژینەوەی شێخ ئەحمەد شاکر دەفەرموێ: سەحیحە.
[٥] نەسائی (٧٥٩) شێخی ئەلبانی بە سەحیحی ناساندووە: صحيح النسائي (٧٦٢).

## سێیەم: لاواز کردنی حوکمی ریوایەتی فەرموودەی نوێژی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بێ هەبوونی دیوار:

ئـەم شەرعناسـە بەڕێزانـە لـە بەرپەرچـدانەوەی بۆچـوون و بەڵگـەی جمهوری شەرعناساندا کە فەرموودەکەی سەیدنا ئیبنوعەبباسە خـوا لێـی رازی بێت کە فەرمووی: (قَالَ: أَقْبَلْتُ عَلَى حِمَارٍ أَتَانٍ، وَرَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم َيُصَلِّي بِالنَّاسِ بِمِنَـى إِلَى غَـيرِ جِدَارٍ، فَمَـرَرْتُ بَـينَ يَـدَيْ بَعْضِ الصَّفِّ، فَنَزَلْتُ وَأَرْسَلْتُ الأَتَـانَ تَرْتَـعُ، وَدَخَلْتُ الصَّفَّ فَلَـمْ يُنْكِـرْ ذَلِكَ عَلَـي أَحَدٌ)[١] واتە: بە سـواری ماکەرێکـەوە هاتمـە مینـا، بینـیم پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم نوێـژ دەکـات، بـێ ئـەوەی رووی لـە دیوارێـك بێـت، منیش بەبەر ریزی نوێژخوێناندا رۆیشـتم، دابـەزیم و لێگـەڕام ماکەرەکـە بلـەوەڕێت وخۆشـم چـوومە ریـزی نوێـژەوە، کەسـی نکـوولّی ئـەوەی لـێ نەکردم.. شەرعناسان دەڵێن: مەبەستی ئەوەیە بێ ئەوەی سـوترەیەکی بـۆ خۆی دانابێت[٢].. ئەم پۆلـە شەرعناسـە بـەڕێزە دەڵێن: نـەبوونی دیـوار لـە

---

[١] بوخاری (١/١٩٩ ـ ٤٩٣)، موسلیم (٤/١٧٢)، ئیمامی مالك: الموطأ (٣٦٧ ل ١٠٢).

[٢] السرخسی: (المبسوط ٢/٤٦)، ئیبنونوجەیم: (البحر الرائق ٤/٩٥)،ئیبنو عابدین: رد المختار (٤/٤٩٨)، محمد الغەربی: مواهب الجليل لشرح مختصر خليل (٤/١٢٦ رای ئەم بەڕێزانەشی تێدایە: ئیبنو عەرەفە، ئیبنوعیاز، ئەلباجی، ئیبنولعەرەبی، ئیبنوعەبدولبیڕ، ئیبنولحەبیب و ئیبنوروشد)، ئیمامی شافیعی لە: اختلاف الحديث (ل ٩٧) ئیمامی نەوەوی لە روضة الطالبين (١/٣٩٨)، ئیبنوقودامە: المغني ٤/٦)، ئیبنوحەجەر: فتح الباري (٣/٣٩٨)، سەنعانی: سبل السلام (١/٢٠٢)..

بەرامبەر نوێژی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم رێ لـەوە ناگرێـت کە سوترەی دانەنابێت[١]..

ئیبنوحەجـەری هەیتـەمی کـە توێژەرەوەیـەکی گـەورەی مەزهـەبی ئیمامی شافیعیە، خاوەنی کتێبی توحفەیـە کـە مەرجەعییـەتی زۆرینـەی مەلای کوردە، دەڵێ: فەرموودەکان بەڵگەن لەسەر ئـەوەی کـە هـەر دەبێـت سـوترە لەبــەر نوێــژدا دانرێــت، تــا رێ لــە خــەڵکی بگرێــت کــە بەبــەر نوێژەکەیـدا تـێ نەپـەڕن.. دواتـر دەڵـێ: ئـاخر بۆیـە لای هەنـدێك لـە شەرعناسان سوترە دانان واجبە[٢] ..

شەوکانی دەڵێ: ئەو فەرموودەیەی کـە دەڵـێ: (لا تصَلِّ إلا إلَى سُتْرَةٍ)[٣] واتە: نوێژ بـەرەو سوترە نـەبێت نەیکـەیت.. بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە دانانی سوترە واجبە[٤]. لە شوێنێکی تریشدا دەڵـێ: زۆرینـەی فـەرموودەکان لەسەر ئـەوەن کـە دانـانی سـوترەو دیـاری کردنـی لـە پـێش نوێژخوێنـەوە فەرمانەو فەرمانیش بۆ واجب بوونە[٥]..

شێخی ئەلبانی دەڵێ: هەر ئەوەندەی کە بووترێت سـوترە سـوننەتەو دانـانی باشـترە، ئەمـە پێچـەوانەی کۆمـەڵێك فەرموودەیـە کـە هەنـدێکیان بەرهەڵستی لە نوێژی بێ سوترە دەکەن[٦]..

---

[١] ئەمە بۆچوونی ئیبنوحەزمە: المحلى (٨/٤)، ئیبنوحەجەری هەیتەمی: الفتاوى الفقهية الكبرى (٢/٩٠)، الشوکانی: السيل الجرار (١٧٦/١) و نيل لاوطار (٥/٣)، ئەلبانی: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (ل ٨٢) و تمام المنة (ل ٣٠٠) و حجة النبي (ل ٢٠) ..

[٢] الفتاوى الفقهية الكبرى (١٤١/٢).

٣ موسلیم (٥٠٦) و سەحیحی ئیبنوخوزەیمە ژمارە (٧٩٣).

[٤] نيل الاوطار (٥/٣).

[٥] الشوكاني: السيل الجرار (١٧٦/١).

[٦] تمام المنة (ل ٣٠٠).

مــن پــێم وایــە دانــانی ســوترە لــە پــێش نوێــژخوێن ســوونەتی موئەككەدەیەو دانەنانی كاریگەری لەسەر تەواوێتی نوێژەكە نیـە. ئەگـەر وا نەبوایــە حەتمــەن یــاوەران و تــابعین دانــانی ســوترەیان لــە هــەموو نوێژێكیاندا دەكردە رەفتـارێكی چۆنیەتی پەرستن، ئەوسـاتە پێشـەوایانی شەرعناسـییش دانـانی سـوترەیان بـە فـەرزێكی نوێـژ هـەژمارد دەكـرد.. والله اعلم.

★ ★ ★

## كێشانی خەت و قەراغی بەرماڵ بۆ سوترە:

دانانی سوترە سوننەتە بەڵام مەرجە:

- سوترەكە بستێك بەرز بێت.
- سێ باڵ (مەترو نیوێك) لە پێیەكانەوە بە ئاڕاستەی قیبلە دوور بێت.
- سوترەی ئیمام بۆ مەئمومەكانیشە.. بۆیە لە كاتی پێویستدا رۆیشتن بەبەر نوێژی مەئمووكاندا شیاوە.
- ئەگەر لە دەشت بوو، هیچی دەست نەكەوت بیكات بە سوترە، دەشێت لەو دیو جێ سوجدەكەیەوە خەتێك بكێشێت، باشتر وایە خەتەكە بە شێوەی كەوانە یان لاكێشە بێت، تا بزانرێت ئەو لەو شوێنە دیاری كراوەدا نوێژ دەكات..
- داخستنی بەرماڵ بە بیدعە نازانم، سنوری بەرماڵەكەش سوترەیە، چونكە حیكمەتی سوترە ئەوەیە كە بە دەوروبەر راگەیێنرێت كە نوێژ دەكات، راخستنی بەرماڵەكە، هەم راگەیاندنە هەم دیاری كردنی سوترە.

★ ★ ★

## باسی پێنجەم: تێپەڕبوون بەبەر نوێژدا

نوێژ کە دابەسترا نابێت کەس بەبەریدا بڕوات، واتە بە نێوان نوێژخوێن و جێ سوجدەکەیدا، کە لەوانەیە سوترەیەکی لێ دانابێت، بەڵام تێپەڕبوون بەو دیوی سوترەکەدا قەیدی نیەو شیاوە..

### حیکمەتی تێپەڕنەبوون بەبەر نوێژدا:

شەرعناسان لە حیکمەتی ئەمە کۆڵیونەتەوە.. چونکە دیوویانە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەم مەسەلەیەی ئەوەندە بە سەخت و توند گرتووە کە کابرای نوێژخوێن بۆی هەیە شەڕەپاڵ لەگەڵ تێپەڕبوودا بکات و نەهێڵێت بەبەر نوێژەکەیدا تێپەڕێت، وەك دەفەرموێ (إذَا صَلَّى أحَدُكُمْ إلَى شَيْءٍ يَسْتُرُهُ مِنْ النَّاسِ، فَأرَادَ أحَدٌ أنْ يَجْتَازَ بَيْنَ يَدَيْهِ فَلْيَدْفَعْهُ. فَإِنْ أبَى فَلْيُقَاتِلْهُ. فَإنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ)[1] واتە: ئەگەر کەسێکتان نوێژی دەکردو سوترەی لە نێوان خۆی و خەڵکیدا دانابوو، پاشان کەسێك وویستی بەبەر نوێژەکەیدا تێپەڕێت با نەیهێڵێت، ئەگەر کۆڵی نەدا با بە شەڕەپاڵ ڕێی لێ بگرێت، چونکە ئەوە شەیتانە وا دەکات (یان شەیتانە وای پێ دەکات)[2]..

---

[1] بوخاری (٣٦٣/١) موسلیم (٥٠٥). چەندین ریوایەتی تری لە سەیدنا ئەبو سەعیدی خودریەوە خوا لێی رازی بێت هەیە کە شێخی ئەلبانی توێژینەوەی لەسەریان کردووەو بە سەحیحی ناساندوون (صحيح ابي داوود ٦٩٧)، (صحيح ابن ماجه ٧٨٨)، (صحيح الجامع ٦٤١)

[2] ئەمە پاڵپێوەنان و ڕێ لێگرتنێتی نەك وەکو هەندێك لە شەرعناسانی دوایینی مەزهەبی شافیعی لێکیان داوەتەوە کە بە پێی لەفزەکە بۆی هەیە وا لێیدا گەر بیشیکوژێت قەیدی نیە، چونکە خوێنی نیە!! خۆ پاڵ پێوەنان و راکێشانی تێپەڕەکە گەورەترە لە تێپەڕبوونی کابرا بەبەر نوێژەکەیدا.. ئەمەش ڕێ نەدراوە چ جای کوشتار و کوشتنی!!

ـ هەندێك لە شەرعناسان فەرموویانە بۆ ئەوەی نوێژەكەی نەبڕن، چونكە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە كە تێپەڕبوونی ئافرەت و كەرو سەگی رەش[١] بەبەر نوێژدا نوێژەكە بەتاڵ دەكەنەوە: (عَنْ أَبِي ذَرّ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا لَمْ يَكُنْ بَيْنَ يَدَيْهِ مِثْلَ آخِرَةِ الرَّحْلِ فَإِنَّهُ يَقْطَعُ صَلَاتَهُ: الْمَرْأَةُ وَالْحِمَارُ وَالْكَلْبُ الْأَسْوَدُ قَالَ قُلْت: يَا أَبَا ذَرّ ، مَا بَالُ الْكَلْبِ الْأَسْوَدِ مِنْ الْكَلْبِ الْأَحْمَرِ مِنْ الْكَلْبِ الْأَصْفَرِفَقَالَ يَا ابْنَ أَخِي، إِنِّي سَأَلْت رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَمَا سَأَلْتَنِي فَقَالَ الْكَلْبُ الْأَسْوَدُ شَيْطَانٌ )[٢] سەیدنا ئەبوزەڕی غیففاری خوا لێی رازی بێت گێڕایەوە كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: هەر كەسێك كە نوێژی دەكردو سوترەیەكی بە قەدەر تەختەی پشتی كورتان[٣] دانەنابوو، نوێژەكەی دەبڕێت ئەگەر ئافرەت و كەرو سەگی رەش بەبەر نوێژەكەیدا تێپەڕبوون.. بە ئەبو زەڕم ووت: جیاوازی سەگی رەش و سەگی سوور یان سەگی زەرد چیە؟! فەرمووی منیش ئەو پرسیارەم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم كردووە، فەرموویەتی: سەگی رەش شەیتانە.. لە ریوایەتێكی تردا دەفەرموێ (المَرأةُ الحَائِضُ)[٤] واتە ئافرەتی حەیزدار.. مەبەست لە ئافرەتی باڵغە نەك لەو كاتەیدا لە حاڵەتی سووڕی مانگانەیدا بێت، چونكە زانینی ئەوە بۆ نوێژخوێنەكە زەحمەتە..

---

[١] مسلم بشرح النووی ٤/ ١٣٦

[٢] ئیمامی ئەحمەد (٢٠٤١٤) نەسائی (٧٤٢)، ترمزی (٣١٠)، ئیبنوماجە (٩٤٢).

[٣] تەختەیەك بووە كە لە پشتی كورتانی سوارییدا بووە، وەكو هەودج (كورتان) ی حوشتر، كە حوشترسوار پاڵی پێوە دەدایەوە..

[٤] ئیمامی ئەحمەد (٣٠٧١) نەسائی (٧٤٣)، ئەبو داوود (٦٠٣)، ترمزی (٣١٠)، ئیبنوماجە (٩٣٩)

ـ هەندێكی تر فەرموویانە، بۆ ئەوەی تێپەڕەكە گوناحبار نەبێت، چونكە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە كە ئەگەر كابرای تێپەڕ بزانێت چ گوناحێكی دێتە گەردن بە ساڵ دەوەستا تا نوێژەكە تەواو دەبوو: (لَوْ يَعْلَمُ الْمَارُّ بَيْنَ يَدَيْ الْمُصَلِّي مَاذَا عَلَيْهِ لَكَانَ أَنْ يَقِفَ أَرْبَعِينَ خَيْرًا لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ)[1] واتە: ئەگەر تێپەڕبوو بەبەر نوێژی نوێژخوێندا دەیزانی چی دەكەوێتە سەر، تا چل بوەستایە باشتر بوو بۆی وەك لەوەی بەبەر نوێژەكەیدا تێپەڕێت.لە ریوایەتێكی تردا چل پایز بوەستایە[2]!

ـ هەیانە فەرموویەتی: بۆ ئەوەی نوێژخوێنەكە مەشغووڵ نەبێت بە بزاوتی تێپەڕەكەوە، چونكە ئەو لە خواپەرستیدایەو ئەم بە هاتوچۆكەی ئەو مەشغووڵ دەكات.. ئەمەش راستە..

**فەرموودەكان:** ئەم باسە لەسەر كۆمەڵێك فەرموودە دامەزراوە، كە شەرعناسان لە بەرامبەر هەندێكیان راجوێییان هەیە، سەرەتا فەرموودەكان بهێنینەوە، لەگەڵ بۆچوونی شەرعناسان لەسەر سەنەدیان، ئینجا ئەو حوكمەی لێیانەوە دەفامرێتەوە:

١ ـ ئەو فەرموودەی كە عبداللەی كوڕی سامیت خوا لێیان رازی بێت لە سەیدنا ئەبوزەڕی غیفاری خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە: (يَقْطَعُ صَلَاةَ الرَّجُلِ؛ إِذَا لَمْ يَكُنْ بَيْنَ يَدَيْهِ قِيدُ آخِرَةِ الرَّحْلِ الحِمَارُ، وَالكَلْبُ الأَسْوَدُ، وَالمرْأَةُ.فَقُلْتُ: ما بَالُ الأَسْوَدِ، مِنَ الأَحْمَرِ، مِنَ الأَصْفَرِ، مِنَ الأَبْيَضِ؟ قَالَ: يَا ابْنَ أَخِي! سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صلى الله عليه وسلم كَمَا

---

[1] بوخاری (٥١٠) ، موسلیم (٥٠٧).

[2] ریوایەتی بەززارە كە هەیسەمی دەفەرموێ: (رجالها رجال الصحيح).

سَألْتني، فقَال: الكَلْبُ الأسْوَدُ شَيْطانٌ)[١] واتە: ئەگەر لەپێش جێنوێژی كابرادا تەختەیەك وەكو تەختەی كورتانی سواریی دانەنرابێت، گوێدرێژو سەگی رەش و ئافرەت ئەگەر بەبەر نوێژەكەدا تێپەڕن، بەتاڵی دەكەنەوە، عبدالله دەڵێ: ووتم: باشە بۆچی هەر سەگی رەش، سەگی سوورو زەرد بۆ نا؟! فەرمووی برازای خۆم، منیش ئەوەم لە پێغەمبەری خوا پرسی فەرمووی: سەگی رەش شەیتانە..

٢ ـ فەرموودەكەی ئەبوهورەیرە خوا لێی رازی بێت كە دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: (يَقْطَعُ الصَّلاةَ: المرْأةُ وَالحِمَارُ والكَلْبُ، وَيَقِي ذلِكَ مِثْلُ مُؤَخِّرَةِ الرَّحْلِ)[٢] واتە: ئافرەت و گوێدرێژو سەگ نوێژ دەبڕن (بە تێپەڕبوونیان بەبەر نوێژدا) ئەوەی رێیان لێ دەگرێت، شتێكی وەك ئەو تەختەدارەی پشتی كورتانە، كە پاڵی پێوە دەدرێتەوە.

٣ ـ فەرموودەكەی عائیشەخان خوا لێی رازی بێت كە فەرمووی: (أنّهُ ذُكِرَ عِنْدَهَا مَا يَقْطَعُ الصَّلاةَ فقَالُوا يَقْطَعُهَا الْكَلْبُ وَالْحِمَارُ وَالْمَرْأةُ قَالَتْ: لَقَدْ جَعَلْتمُونا كِلاباً! لَقَدْ رَأيْتُ النّبيَّ صَلَّى اللهُ عليهِ وَسَلَّمَ يُصَلّي وَإنّي لَبَيْنَهُ وَبَينَ الْقِبْلَةِ وَأنَا مُضْطَجِعَةٌ عَلَى السَّرِيرِ فَتَكونُ لِي الْحَاجَةُ فأكْرَهُ أنْ أسْتَقْبِلَهُ فَأنْسَلُ إنْسِلالاً)[٣] واتە: كاتێك لای عائیشەخان خوا لێی رازی بێت ئەو فەرمودەیان باس كرد كە بە تێپەڕبوونی ئافرەت و كەرو سەگی رەش بەبەر نوێژدا نوێژەكە بەتاڵ دەبێتەوە، فەرمووی: ئەرێ كردتانین بە سەگ! من خۆم پێغەمبەری خوام صلى الله عليه

---

[١] مسلم (٤/٢٢٨).

[٢] سەحیحی موسلیم بە شەرحی نەوەوی (٣/١٦٩).

[٣] بوخاری (٤٨٩، ٤٩١، ٤٩٢).

وسلم بینیوه كه نوێژی كردووه، من له نێوان ئەوو قیبلەدا بووم، لەسەر پێخەفەكە راكشابووم كه پێویستیەكم بۆ دەهاتە پێش نەمدەخواست رووەو رووی هەستم، بۆیه به ئەسپایی لەولاوه دەكشامە دواوه.

٤ ـ ریوایەتەكەی فەزڵی كوڕی عەبباس خوا لێیان رازی بێت كه فەرمووی: (أتانا رَسولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ وَنَحْنُ فِي بَادِيَةٍ لَنَا، وَمَعَهُ عَبَّاس ؛ فصَلَّى فِي صَحْرَاءَ، لَيسَ بَينَ يَدَيهِ سُتْرَةٌ ؛ وَحِمَارَةٌ لَنَا وَكَلْبَةٌ تعْبَثَانِ بَينَ يَدَيهِ ؛ فَمَا بَالَى ذَلِكَ)[1] واته: ئێمه له دەشت بووین، پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم تەشریفی هێنایه لامان، عەبباسیش له خزمەتیدابوو، لەو بیبانه نوێژی كرد، سوترەی دانەنا، كەرو سەگێكیشمان بوو یاریان لەبەر دەست و لەملاولایەوه دەكردو گوێشی نەدەدانێ..

٥ ـ فەرموودەكەی ئەبو جوحەیفه كه دەڵێ: (خَـرَجَ عَلَينـا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ بِالهَاجِرَةِ، فَـأُتِيَ بِوَضُـوءٍ فَتَوَضَّأَ فَصَلَّى بِنَـا الظُّهْـرَ وَالْعَصْـرَ وَبَـينَ يَدَيـهِ عَنَـزَةٌ وَلاَ يَضُـرُّهُ مَـنْ مَـرَّ وَرَاءَ ذلِـكَ)[2] واتـه: پێغەمبەری خوا صلى الله علیـه وسـلم لـه گـەرمای نیـوەڕۆدا تەشـریفی هێنایه لامان، ئاوی دەستنوێژیان بۆ هێنـا، دەسـتنوێژی گـرت و نوێـژی نیـوەڕۆو عەسـری كـرد، عەنەزەیەكیشـی[3] (گۆچـان) لـه پـێش خـۆی

---

[1] ئەبوداوود (١٩١/١) نەوەوی له ( المجموع ٢٥١/٣) دەفەرموێ: (إسناده حسن) بەڵام شێخی ئەلبانی به زەعیفی ناساندووه (ضعيف سنن أبي داود ص ٦٨) و (ضعيف النسائي ٣٠/٧٥٣).

[2] بوخاری (٤٦٩)، موسلیم (٢٥٢).

[3] عەنەزە: دارێك بووه كۆتاییەكەی ئاسنی پێوه قایم كراوه (ئیمامی نەوەوی: شەرحی سەحیحی موسلیم ١٧٤/٤) له عەسا درێژترو له رم كورتتر بووه (مختار الصحاح ل ٢٤١).

دانابوو، ئەوانەی لەودیوو عەنەزەکەوە تێدەپەڕین کاریگەرییان لەسەر نوێژەکەی ئەم نەبوو..

٦ ـ لە ریوایەتێکی تریدا دەڵێ: (يَمُرُّ مِنْ وَرَائِهَا المرْأَةُ وَالحِمَارُ)[1] واتە: ئافرەت و گوێدرێژ لەو دیوویەوە تێپەڕ دەبن..

٧ ـ لە ریوایەتێکی تریدا دەڵێ: (النَّاسُ وَالدَّوَابُّ يَمُرُّونَ بَيْنَ يَدَيْ العَنَـزَةِ)[2] واتە: خەڵك و گیانلەبەران بەودیوی گۆچانەکەدا دەهاتن و دەچوون.

٨ ـ فەرموودەی سەیدنا ئەبو سەعیدی خودری خوا لێی رازی بێت کە دەڵێ: (قَالَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ لاَ يَقْطَعُ الصَّلاةَ شَيْءٌ، وَادْرَؤُوا مَا اسْتَطَعْتُمْ ؛ فَإِنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ)[3] واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: نوێژ بە هیچ شتێك بەتاڵ نابێتەوە بەڵام ئەگەر کەسێك یان شتێك هاتە پێش نوێژتان مەیهێڵن و تا دەتوانن پاڵی پێوەنێنەوە، چونکە ئەوە شەیتانە. (شەیتان پاڵی پێوە دەنێت تا بێتە بەر نوێژەکە).

٩ ـ فەرموودەکەی ئیبنوعەبباس خوا لێی رازی بێت کە دەڵێ: (أَقْبَلْتُ عَلَى حِمَارٍ أَتَانٍ، وَرَسولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم يُصَلِّي بِالنَّاسِ بِمِنَى إِلَى غَيْرِ جِدَارٍ، فَمَرَرْتُ بَينَ يَدَي بَعْضِ الصَّفِّ، فَنَزَلْتُ وَأَرْسَلْتُ الأَتَانَ تَرْتَعُ، وَدَخَلْتُ الصَّفَّ فَلَمْ يُنْكِرْ ذَلِكَ عَلَيَّ أَحَدٌ)[4] واتە: بە سواری ماکەرێکەوە هاتمە مینا، بینیم پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم

---

[1] بوخاری (٧٥٧/١) ، موسلیم (٢٢١/٤).
[2] بوخاری (٦٣٩/١)، موسلیم (٢٢٠/٤).
[3] ئەبو داوود (١٩١/١)
[4] بوخاری (١٩٩/١ ـ ٤٩٣)، موسلیم (١٧٢/٤)، ئیمامی مالك: الموطأ (٣٦٧ ل ١٠٢).

نوێژ دەکات، بێ ئەوەی رووی لە دیوارێك بێت، منیش بەبەر ریزی نوێژخوێناندا رۆیشتم، دابەزیم و لێگەڕام ماکەرەکە بلەوەڕێت وخۆشم چوومە ریزی نوێژەوە، کەسی نکوولی ئەوەی لێ نەکردم. شەرعناسان دەڵێن: مەبەستی ئەوەیە بێ ئەوەی سوترەیەکی بۆ خۆی دانابێت..

## بەڵگەی ئەوانەی کە دەڵێن نوێژ بە تێپەڕبوونی ئەو سێ توخمە بەتاڵ نابێتەوە :

ئەمە بۆچوونی زۆرینەی جمهوری شەرعناسانە و رایان دەبەنەوە سەر سەیدنا عەلی و سەیدنا عوسمان و سەیدنا ئیبنوعومەر خوا لێیان رازی بێت، هەروەها ئیمامی مالیك و سوفیانی سەوری و ئیمامی شافیعی (کە بەتاڵبوونەوەی نوێژەکەی وا لێکداوەتەوە کە پاداشتەکەی تەواو نابێت) بۆیە کردنەوەی فەرز ناکات.. بۆچوونی مەدرەسەی رەئیش وایە[1].. بەلگەشیان:

**. یەکەم: فەرموودەی سێیەم** (عائیشەخان خوا لێی رازی بێت):

(وَإِنّي عَلَى السَّرِيرِ بَيْنَهُ صلى الله عليه وسلم وَبَيْنَ القِبْلَةِ) واتە: کە نوێژی کردووە صلى الله عليه وسلم من لە نێوان ئەوو قیبلەدا بووم، لەسەر پێخەفەکە راکشابووم..

**رەتکردنەوەی ئەمە:** ئیبنوخوزەیمە لە کتێبەکەی خۆیدا (باب)ێکی کردۆتەوە لەژێر ناونیشانی: (باب: ذكر الدليل على أنَّ هذا

---

[1] بەغەوی: شرح السنّة (٤٦٢/٢)، المحلى (٣٢٣/٢)، صحيح ابن خزيمة (٢٣/٢)، مجموع الفتاوى (١٦/٢١)، زاد المعاد (٧٩/١)، نيل الأوطار (١٦/٣)، تمام المنّة (ل٣٠٧)، بن باز: فتاوى مهمة تتعلق بالصلاة (ل٤٥-٤٦)، الشرح الممتع (٣٩٢/٣).

الخبر – أي: حديث أبي ذر- في ذِكرِ المرأة ليس مضاد خبر عائشة)[١]، دەڵێ: فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم رێ لە نوێژکردن ناگرێت لە بەرامبەر کولانەی سەگ و تەویلەی گوێدرێژو جێ خەوی ئافرەت، تا ئەو فەرموودەیەی عائیشە ببێتە رەت کردنەوەی فەرموودەکانی تر.. فەرموودەکەی عائیشەخانیش رۆشنە کە نافەرموێ بەبەر نوێژەکەیدا تێپەڕ بووم..

ئیبنول قەییم دەڵێ: ئەوە سەلمێنراوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی کە تێپەڕ بوونی ئافرەت و گوێدرێژو سەگی رەش بەبەر نوێژدا بەتاڵی دەکەنەوە.. ئەمە لە ریوایەتەکانی ئەبو زەڕو ئەبوهورەیرەو عبداللەی کوڕی موغەففەلەوە خوا لێیان رازی بێت بە سەنەدی سەحیحەوە هاتووە، ئەوی بەرهەڵستی ئەم فەرموودانە دەکات (صحيح غير صريح أو صريح غير صحيح) سەحیحی غەیرە راشکاوە یان راشکاوی غەیرە سەحیحە! دەشێت کەسێك لە پێشتەوە نوستبێت و نوێژ بکەیت، بەڵام ناشێت ئەو کەسە بەبەر نوێژتدا تێپەڕێت، ئەمەی عائیشەخانیش کە لە پێش نوێژی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم راکشاوە، غەیری تێپەڕبوونە بەبەر نوێژیدا[٢]..

---

[١] صحيح ابن خزيمة (٢/٢١).
[٢] ئیبول قەییم: زاد المعاد (١/٣٠٦).

. دووەم: فەرموودەی چوارەم (سەیدنا فەزڵی کوڕی عەبباس خوا لێی رازی بێت)..

**رەتکردنەوەی ئەمە:** ئەمە لە چەند لایەنێکەوە رەت کراوەتەوە:

١ ـ فەرموودەکە زەعیفە، چونکە فاسڵێك لە سەنەدەکەدا هەیە، عەبباس کوڕی عوبەیدوڵڵەی کوڕی عبداللەی کوڕی عەبباسە و فەزڵ برای باپیرێتی و فاسڵێك لە نێوانیاندا هەیە[١] ..

٢ ـ عەبباس خۆی لە لای فەرموودەوانان نەناسراوەو ریوایەتی تری نیە، ئیبنولقەتتان دەڵێ: حاڵی نەزانراوە[٢]..

٣ ـ لە یەك ریوایەتیدا دەڵێ: (لَيسَ بَينَ يَدَيهِ سُترَةٌ) ئەویش ریوایەتی یەحیای کوڕی ئەییوبە، لە ریوایەتەکانی تردا (ئیبنو جورەیج لە محمدی کوڕی عومەرەوە) ئەو بڕگەیەی نیە.. یەحیاش راستگۆیە، بۆیە ئەم فەرمووده بەو زیادەیەوە بە زەعیف دادەنرێت، پێی دەوترێت مونکەر..

٤ ـ لە گریمانی سەحیحی فەرموودەکەشدا، ئیحتیماڵی ئەوە هەیە کە کەرو سەگەکە بە بڕی سێ باڵ، یان سێ گەز لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم دووربووبن، ئەوەش بڕی دووری پێویستە لە جێ نوێژ[٣].

---

[١] ئیبنوحەزم: المحلى (٣٢٦/٢)، ئیبنوحەجەریش لە (تهذيب التهذيب ١٢٣/٥) دا لایەنگیری حوکمەکەی ئیبنو حەزمی کردووەو ئیبنوقودامەی مەقدیسیش (المغني ٨٢/٢) فەرموویەتی قسە لەسەر سەنەدەکەی هەیە..

[٢] ئیبنوحەجەر: تهذيب التهذيب (١٢٣/٥).

[٣] بوخاری (٧٦٢/١).

٥ ـ فەزڵ رەنگی سەگەكەی باس نەكردووە كە ئایا رەش بووە، رەنگە رەش نەبووبێت چونكە ئەگەر رەش بوایە دەبوو سەرنج راكێشتر بێت و جێ باس بێت، چونكە حوكمی شەرعی بەتاڵبوونەوەی نوێژی پێوەیە.

ـ **سێیەم: فەرموودەی پێنجەم** (سەیدنا ئەبو جوحەیفە خوا لێی رازی بێت): (يَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْهِ الحِمَارُ وَالكَلْبُ لاَ يَمْنَعُ)واتە: گوێدرێژو سەگ لەبەردەستیدا دەهاتن و دەچوون رێیان لێ نەدەگیرا..

**رەتكردنەوەی ئەمە:** ئیمامی نەوەوی لە رەتكردنەوەی ئەمەدا دەڵێ: دەشێت كە لە پشت سوترەوە هاتوچۆیان كردبێت، چونكە ریوایەتەكانی تری ئەو فەرموودەیە روونتر باس لەوە دەكەن، بۆ نموونە: ریوایەتی: (وَرَأَيْتُ النَّاسَ وَالدَّوَابَّ يَمُرُّونَ بَيْنَ يَدَيْ العَنَـزَةِ)[1] یان ریوایەتی: (فَيَمُرُّ مِنْ وَرَائِهَا المَرْأَةُ وَالحِمَار)[2] یان: (وَلاَ يَضُرُّهُ مَنْ مَرَّ وَرَاءَ ذلِكَ)[3]..

ـ **چوارەم: فەرموودەی هەشتەم** (سەیدنا ئەبوسەعیدی خودری خوا لێی رازی بێت): (لاَ يَقْطَعُ الصَّلاَةَ شَيْءٌ)..

**رەتكردنەوەی ئەمە:** فەرموودەیەكی زەعیفە[4]و زۆری ریوایەت كردنی نایگەیێنێتە بەڵگەیەك كە خواپەرستی پێ دامەزرێت..

---

[1] بوخاری (٦٣٩/١)، موسلیم (٢٢٠/٤).

[2] بوخاری (٧٥٧/١)، موسلیم (٢١٦/٤).

[3] شەرحی نەوەوی لەسەر موسلیم (٢٢٠/٤).

[4] ئەوانەی بە زەعیفیان ناساندووە، ئەم فەرموودەوانە بەرێزانەن، ئیبنوحەزم: المحلى (٣٢٦/٢)، ئیبنولجەوزی: التحقيق (٤٢٧/١)، ئیمامی نەوەوی: شرح مسلم (٢٢٧/٤)،

**. پێنجەم: فەرموودەی نۆیەم (سەیدنا ئیبنوعەبباس خوا لێیان رازی بێت): كە بە سواری ماكەرەكەوە چوو بۆ مینا..**

**ڕەتكردنەوەی ئەمە:**

١ ـ لە وەڵامی بەڵگە پێهێنانەوەیدا ئیمامی ئەبو زەرعە دەڵێ: ئەم فەرموودەیەی ئیبنوعەبباس ڕاشكاوانە پێچەوانەی فەرموودەكانی ئەبوهورەیرەو ئەبوزەڕ ناكات، چونكە كە ئیبنوعەبباس دەڵێ: (فَمَرَرْتُ بَيْنَ يَدَيْ بَعْضِ الصَّفِّ) واتە بە نێوان هەندێك لە ڕیزەكاندا ڕۆیشتم.. ئەمە مانای ئەوە نیە كە بەبەر نوێژی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم ڕۆیشتبێت كە ئەگەر سوترەی دانابێت، سوترەكەی جەنابیان سوترەشە بۆ ڕیزەكانی دوای خۆی. هەروەها كە دەڵێ: (إِلَى غَيْرِ جِدَارٍ) هەرچەندە ئیمامی شافیعی[1] بەوەی لێك داوەتەوە كە (سوترەی نەبووە) بەڵام ئەمە پڕاوپڕ ئەوە ناگەیێنێت، چونكە لەوانەیە پێش دیوارەكە سوترەی دانابێت..

٢ ـ ئەوە سەلمێنراوە كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم عەنەزەی پێ بووە (كە وەكو گۆچان و قەڵانگ بووە بەڵام سەرێكی ئاسنی پێوەبووە) كە نوێژی كردووە لە پێش خۆیەوە چەقاندوێتی و كردوێتی بە سوترە، باس نەكردنی سوترەی وا لەو شوێنەدا لە

---

ئیبنوقودامە: المغني (٨٢/٢)، ئیبنوتەیمییە: مجموع الفتاوى (١٦/٢١)، ئیبنوحەجەر: فتح الباري (٧٧٤/١)، شەوكانی: نيل الأوطار (١٦/٣)، ئەلبانی: تمام المنّة (ص٣٠٧).

[1] طرح التثريب (٣٩١/٢)، ابن التركماني: الجوهر النقي (٢٧٣/٢)، نيل الاوطار (١٣/٣).

لایەن ئیبنوعەبباسەوە نەفی هەبوونی سوترە ناكات.. چونكە لەوانەیە ئەو بە ریزەكانی پشتەوەدا رۆیشتبێت و نەیدیبێت..

٣ ـ ئەوەش سەلمێنراوە كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە سەفەریدا یان لە چوونەدەرەوەی بۆ نوێژ لە دەشت، حەربەیەكی لەگەڵ خۆی دەبرد، كە لە پێش جێنوێژەكەی دەیچەقاندو دەیكردە سوترە.. ئەمەش رەفتارێكی بەردەوامی بوو.. ئەمە بووە سوونەت و سیرەی خەلیفەو ئەمیرەكانی دوای خۆی[1]..

**ـ شەشەم: نەسخ بوونەوەی:** هەندێك لە شەرعناسان فەرموویانە ئەو فەرموودانەی كە دەڵێن نوێژی ئەو كەسە بەتاڵ دەبێتەوە كە ئافرەت و گوێدرێژو سەگی رەش بەبەر نوێژەكەیدا تێپەڕ دەبێت، وەك فەرموودەی (يَقْطَعُ الصَّلاة..) نەسخ بۆتەوە بە فەرموودەی (لا يَقْطَعُ الصَّلاة شيءٌ)[2]!

**رەتكردنەوەی ئەمە:** ئیمامی نەوەوی ئەمە رەت دەكاتەوەو دەڵێ: ئەمە قبووڵ نیە.. چونكە كاتێك باسی نەسخ دەكرێت كە لێكدانەوەی فەرموودەكان بگاتە بنبەست و بەرواری هاتنی فەرموودەكان بزانرێت، لەم فەرموودانەشدا كەس نەگەیشتۆتە بنبەست و كەسیش ناتوانێت كاتی هاتنی فەرموودەكان دیاری بكات، كە كامیان پێش كامیانن[3]..

---

[1] بوخاری (٧٥٣/١).
[2] وەكو ئیبنو عبدالبر: التمهيد (١٦٨/٢١).
[3] شرح مسلم (٢٢٧/٤).

. **حەوتەم: پێكەوەسازاندن ولێكدانەوەیان:** هەندێك شەرعناسی تر فەرموویانە: دەشێت فەرموودەی بەتاڵبوونەوەی نوێژەكە بەوە لێكدرێتەوە كە ئەو سیانە دەبنە هۆی كەمبوونەوەی پاداشتی نوێژەكە چونكە بوونە هۆی مەشغووڵ بوونی دڵ و هۆشی نوێژخوێنەكە، لە بەرامبەریشدا فەرموودەی (لا يقطع الصلاة...) بە مانای حەقیقەتی نوێژ بەتاڵ نەبوونەوە لێكدرێتەوە!!

**ڕەتكردنەوەی ئەمە:** ڕەتكردنەوەی ئەمەش بەوەیە كە:

١ ـ فەرموودەی تری مەرفووع هەیە كە راشكاوانە دەفەرموێ: (تعادُ الصَّلاةُ مِنْ مَمَرِّ الحِمَارِ، وَالمرْأةِ، وَالكَلْبِ الأسْوَدِ)[١] واتە: ئەو نوێژەی گوێدرێژو ئافرەت و سەگی رەش بەبەریدا دەڕۆن دەبێ بكرێتەوە..

بەڵگەی نوێژكردنەوەكەی سەیدنا ئیبنوعومەریش خوا لێیان رازی بێت ئەم بەڵگەیە بەهێزتر دەكات، ئەوەی كە توتكەكە بەبەر نوێژەكەیدا رۆیشت و نوێژەكەی كردەوە: (وأعَادَ ابنُ عُمَرَ رَضي اللهُ عَنهُ رَكْعَةَ الصَّلاةِ مِنْ جَرْوٍ مَرَّ بَينَ يَدَيهِ في الصَّلاةِ)[٢]..

٢ ـ هەر شتێك بەبەر نوێژدا بڕوات نوێژخوێن مەشغووڵ دەكات، ئیتر بۆچی ئەو سیانە تایبەتمەندێتییان وەرگرتووە؟! كەوابوو تێپەڕبوونی ئەو سیانە كە دەبنە مایەی بەتاڵبوونەوەی نوێژ، هۆی تری هەیە..

---

[١] سەحیحی ئیبنوخوزەیمە (٢١/٢).

[٢] ئیبنو ئەبی شەیبە: (٢٨٢/١)، ئیبنوحەزمیش بە سەحیحی ناساندووە المحلى (٣٢٣/٢)

٣ ـ ئەم کۆکردنەوەو پێکەوە گونجاندنە هەرچەندە نەسازیشە، هیچ بەڵگەیەکی ئەسەرو نەزەری نیە.. ئەگەر گریمانی سەحیحی بۆ دابنرێ دەبوو لەگەڵ فەرموودەکانی تردا کە سەحیحن و گومانیان بۆ ناچێت هەوڵی پێکەوە گونجاندنێکی دروستی بۆ بدرایە، وەکو شێخی ئەلبانی دەڵێ: دەبوو ئەو فەرموودانەی تر بە گشتی دابنراناپەو ئەمیش بە تایبەتکار. واتە بووترایە: ئەگەر سوترە هەبوو هیچ شتێك نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە مەگەر ئەو سیانە.. خۆ لە ریوایەتەکانیشدا ئەمە راشکاوانە هاتووە کە لە فەرموودەکەی ئەبو زەڕدا (یەکەمیان) دەفەرموێ: (لاَ يَقْطَعُ الصَّلاَةَ شَيْءٌ إِذَا كَانَ بَيْنَ يَدَيْهِ كَآخِرَةِ الرَّحْلِ) هەروەها لە فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەشدا (دووەمیان) کە دەفەرموێ: (يَقْطَعُ الصَّلاَةَ المرْأَةُ...) کە تەحاوی بە سەحیحی ناساندووە.. بەمەش هەموو فەرموودەکان پێکەوە سازاون و دژایەتیان لەگەڵ یەکتریدا نابێت.. کەوابوو تێپەڕبوونی ئەو سیانە بەبەر نوێژدا بەتاڵی دەکاتەوە. ئەمەش رای ئیمامی ئەحمەدەو ئیختیاری ئیبنوتەیمییەشە[١]..

## بەڵگەی ئەوانەی کە دەڵێن نوێژ بە تێپەڕبوونی ئەو سێ توخمە بەتاڵ دەبێتەوە :

ئەمە بۆچوونی سەیدنا ئەنەس و سەیدنا ئیبنو عەبباسە (کە خۆی ریوایەتی سواری ماکەرەکەی گێڕاوەتەوە)، دیسان بۆچوونی حەسەنی بەسری و ئیبنو خوزیمەو ئیبنوحەزم و قەولێکی ئیمامی ئەحمەدو ئیختیاری ئیبنو تەیمییە و ئیبنول قەییمەو لە توێژەرەوەی سەردەمیش

---

[١] الالباني: تمام المنة (ل ٣٠٧).

بۆچوونی شەوکانی وئەلبانی وبن بازو ئیبنو عوسێمینە.. هەموویان پێیان وایە کە دەبێت نوێژەکە بکرێتەوە..[١]..

راو بۆچوون و بەڵگەی ئەم پۆلە شەرعناسە، کە پێیان وایە تێپەڕبوونی ئەو سێ توخمە بەبەر نوێژدا بەتاڵی دەکەنەوە، لە رەتکردنەوەی بەڵگەکانی بەرامبەریاندا دیار بوو، زیاتریش لەو:

١ ـ لە فەرموودەکاندا کە ووشەی (قطع الصلاة) هاتووە، مەبەست لێی بەتاڵبوونەوەی نوێژەکەیە.. زاهیری مەبەستیش داوای کردنەوەی نوێژەکەیە، چونکە لە فەرموودەی لای ئەبو زەڕی غیففاریدا خوا لێی رازی بێت هاتووە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (تعادُ الصَّلاةُ مِنْ مَمَرِّ الحِمَارِ، وَالمرْأَةِ، وَالكَلْبِ الأَسْوَدِ)[٢] واتە: ئەو نوێژەی گوێدرێژو ئافرەت و سەگی رەش بەبەریدا دەڕۆن دەبێ بکرێتەوە..

٢ ـ لەبەر ئەمە بوو کە سەیدنا ئیبنو عومەر خوا لێیان رازی بێت رکاتێکی نوێژی کردبوو، تووتکێك بەبەر نوێژەکەیدا تێپەڕی، رکاتەکەی کردەوە[٣].

٣ ـ هەندێك لە شەرعناسان فەرموویانە: تێپەڕبوونی یەکێك لەم سێ توخمە، نوێژەکە بە تاڵ دەکاتەوە نەك هەبوونی لە ئاستی نوێژخوێنەکەدا.. چونکە ئەوە سەلمێنراوە کە پێغەمبەری خوا صلى

---

[١] بەغەوی: شرح السنّة (٤٦٢/٢)، المحلى (٣٢٣/٢)، صحيح ابن خزيمة (٢٣/٢)، مجموع الفتاوى (١٦/٢١)، زاد المعاد (٧٩/١)، نيل الأوطار (١٦/٣)، تمام المنّة (ل٣٠٧)، بن باز: فتاوى مهمة تتعلق بالصلاة (ل٤٥-٤٦)، الشرح الممتع (٣٩٢/٣).

[٢] سەحیحی ئیبنوخوزەیمە (٢١/٢).

[٣] ئیبنو ئەبی شەیبە (٢٨٢/١)، ئیبنو حەزمیش بە سەحیحی ناساندووە لە المحلى (٣٢٣/٢).

الله علیه وسلم نوێژی دەکردو عائیشەخان لە ئاستی قیبلەکەیدا ڕاکشابوو، یان کە نوێژی لەسەر گوێدرێژ کردووە.. وەکو لە فەرموودەی سەیدنا ئیبنو عومەردا خوا لێیان ڕازی بێت هاتووە: (أنَّ النَّبيَّ صلى الله عليه وسلم صَلَّى عَلَى حِمَارٍ وَهُوَ مُوَجِّهٌ إِلَى خَيْبَر)[١] واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەسەر گوێدرێژێکەوە بوو بەرەو خەیبەر دەچوو، هەر لەسەر گوێدرێژەکە نوێژی کرد..

٣ـ فەرموودەکەی سەیدنا ئەبو هورەیرەو ئەوەی سەیدنا ئەبوزەڕ خوا لێیان ڕازی بێت، ڕاشکاوانە دەڵێن: هەر نوێژێك یەکێك لەو سێ توخمە: ئافرەت و گوێدرێژو سەگ) بەبەریدا تێپەڕێت، بەتاڵ دەبێتەوە.

ـ پۆلێك شەرعناسی تر ڕایان وایە کە تەنها تێپەڕبوونی سەگی ڕەش بەبەر نوێژدا بەتاڵی دەکاتەوە .. ئەمەش بۆچوونی عائیشەخانە خوا لێی ڕازی بێت، هەروەها سەیدنا ئەنەس و سەیدنا ئیبنوعەبباس و سەیدنا ئەبوهورەیرە خوا لێیان ڕازی بێت کە ئیمامی ئیسحاق و موجاهیدو مەکحوول و عیکرەمەش لێیانەوە وەر گرتوون[٢]..

## حوکمی نوێژێك کە بەبەریدا تێپەڕبوون :

شەرعناسان بە هۆی وەرگرتنی بەڵگەکان و چۆنیەتی تێگەیشتن لێیان (لەو ڕوانگەیەوە) لە حوکمی ئەم نوێژەدا کە بەبەریدا گوزەر کراوە ڕاجوێ بوون:

---

[١] موسلیم (٢٠٩/٥).
[٢] شرح السنّة (٤٦٣/٢)، ابن عبدالبر: التمهيد (١٨٧/٢١)، مصنف ابن أبي شيبة (٢٨٠/١).

**. جمهوری شەرعناسان دەڵێن نوێژەکەی تەواوە :** چونکە ئەوەی نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە دەستنوێژ شکانە، ئەمەش بۆچوونی سەیدنا عوسمانی کوڕی عەففان و سەیدنا عەلی کوڕی ئەبو تالیب و سەیدنا ئوبەی کوڕی کەعب و سەیدنا حوزەیفەو عوروەو قاسمی کوڕی محمدو شەعبی وعوبەیدەی سەلمانی وسوفیانی سەوری وسەعیدی کوڕی موسەییبە، ریوایەتێکی زانراوی سەیدنا ئیبنو عومەرو ئیبنوعەبباسەو ئیمامان ئەبو حەنیفەو مالیك و شافیعیش کردوویانە بۆچوونی مەزهەبی خۆیان[1]. بەلگەشیان:

١ ـ (أنَّهُ ذُكِرَ عِنْدَهَا مَا يَقْطَعُ الصَّلاةَ فقَالُوا يَقْطَعُهَا الْكَلْبُ وَالْحِمَارُ وَالْمَرْأَةُ قَالَتْ: لَقَدْ جَعَلْتُمُونَا كِلابًا! لَقَدْ رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي وَإِنِّي لَبَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ وَأَنَا مُضْطَجِعَةٌ عَلَى السَّرِيرِ فَتَكُونُ لِي الْحَاجَةُ فَأَكْرَهُ أَنْ أَسْتَقْبِلَهُ فَأَنْسَلُ إِنْسِلالاً)[2] واتە: کاتێك لای عائیشەخان خوا لێی رازی بێت ئەو فەرمودەیان باس کرد کە بە تێپەڕبوونی ئافرەت و کەرو سەگی رەش بەبەر نوێژدا نوێژەکە بەتاڵ دەبێتەوە، فەرمووی: ئەرێ کردتانین بە سەگ! من خۆم پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینیوە کە نوێژی کردووە، من لە نێوان ئەوو قیبلەدا بووم، لەسەر پێخەفەکە راکشابووم، کە پێویستیەکم بۆ دەهاتە پێش نەمدەخواست رووەو رووی هەستم، بۆیە بە ئەسپایی لەولاوە دەکشامە دواوە.

---

[1] النووی: المجموع (٢/٢٥٠).
[2] بوخاری (٤٨٩، ٤٩١، ٤٩٢).

**شەرعناسانی بەرامبەر فەرموویانە:**

یەکەم: ئەمە تێپەڕبوون نیە بەبەر نوێژدا..

دووەم: عائیشەخان خوا لێی رازی بێت خێزانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بووەو و پێغەمبەری خواش صلی الله علیه وسلم لە هەموو پیاوانێك تر زیاتر ئارەزووی خۆی زەبت کردووە..

سێیەم: ئەوێ ماڵ بووەو شوێنێکی تر دەست نەکەوتووە..

چوارەم: بە پێی سروشتی ماڵانی ئەو سەردەمە تاریك بووە.. چونکە رووداوەکە باسی شەونوێژە، خۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی فەرزی لە ماڵەوە نەکردووە..

٢ ـ فەرموودەکـەی ئیبنوعـەبباس خـوا لێـی رازی بێـت کـە دەڵـێ: (أقْبَلْتُ عَلَى حِمَارٍ أتَانٍ، وَرَسولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيـهِ وَسَلَّم يُصَلِّي بِالنَّاسِ بِمِنَى إلَى غَيرِ جِدَارٍ، فَمَرَرْتُ بَينَ يَدَي بَعْضِ الصَّفِّ، فَنَزَلْتُ وَأرْسَلْتُ الأتَانَ تَرْتَعُ، وَدَخَلْتُ الصَّفَّ فَلَمْ يُنْكِرْ ذَلِكَ عَلَي أحَدٌ)[١] واتـە: بـە سـواری ماکەرێکەوە هاتمە مینا، بینیم پێغەمبـەری خـوا صـلى الله علیـه وسـلم نوێژ دەکات، بێ ئـەوەی رووی لـە دیوارێـك بێـت، منـیش بەبـەر ریـزی نوێژخوێناندا رۆیشتم، دابەزیم و لێگەڕام ماکەرەکە بلەوەڕێت وخۆشم چوومە ریزی نوێژەوە، کەسی نکووڵی ئەوەی لـێ نـەکردم. شەرعناسـان دەڵێن: مەبەستی ئەوەیە بێ ئەوەی سوترەیەکی بۆ خۆی دانابێت..

یـەعنی بـە ماکەرەکـەوە بەبـەر هەنـدێك ریـزی نوێژخوێنانـدا رۆیشتووە، ئەگەر ئەمە ببوایە بە هۆی بەتاڵ بوونـەوەی نوێـژ سـەیدنا ئیبنو عەبباس دەیزانـی، یـان ئـەوانی تـر هاواریـان لـێ دەکـرد، یـان بـۆ

---

[١] بوخاری (١/١٩٩ ـ ٤٩٣)، موسلیم (٤/١٧٢)، ئیمامی مالك: الموطأ (٣٦٧ ل ١٠٢).

پێغەمبەری خوایان صلی الله علیە وسلم دەگێڕایەوە، دیارە کە هیچ لەوانە رووی نەداوە، ئەو کارە رەفتارێکی سروشتی بووە لایان..

٣ ـ ریوایەتەکەی فەزڵی کوڕی عەبباس خوا لێیان رازی بێت کە فەرمووی: (أَتَانَا رَسولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ وَنَحْنُ فِي بَادِيَةٍ لَنَا، وَمَعَهُ عَبَّاس ؛ فَصَلَّى فِي صَحْرَاءَ، لَيسَ بَينَ يَدَيهِ سُترَةٌ ؛ وَحِمَارَةٌ لَنَا وَكَلْبَةٌ تعْبَثَانِ بَينَ يَدَيهِ ؛ فَمَا بَالَى ذَلِكَ)[1] واتە: ئێمە لە دەشت بووین، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تەشریفی هێنایە لامان، عەبباسیش لە خزمەتیدابوو، لەو بیبانە نوێژی کرد، سوترەی دانەنا، کەرو سەگێکیشمان بوو یاریان لەبەر دەست و لەملاولایەوە دەکردو گوێشی نەدەدانێ..

٤ ـ فەرموودەکەی ئەبو ئومامە کە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (لا يَقْطعُ الصَّلاة شَيءٌ)[2] واتە: هیچ شتێك نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە..

<u>من پێم وایە تێپەڕبوونی ئافرەت و گوێدرێژو سەگی رەش بەبەر نوێژدا بەتاڵی دەکەنەوە، ئەوەش پەیوەندی بە هەبوون و هەوڵی شەیتانەوە لەو کاتەدا هەیەو ئەم مەسەلەیەش هیچ پەیوەندی بە بێڕێزکردنی ئافرەتەوە نیە.. والله اعلم.</u>

---

[1] ئەبوداوود (١٩١/١) نەوەوی لە ( المجموع ٢٥١/٣) دەفەرموێ: (إسناده حسن) بەڵام شێخی ئەلبانی بە زەعیفی ناساندووە (ضعیف سنن أبي داود ص ٦٨) و (ضعیف النسائي ٣٠/٧٥٣).

[2] مجمع الزوائد (٦٢/٢) هەیسەمی فەرموویەتی تەبەرانی ریوایەتی کردووەو حەسەنە.

**پێویستە ئەوەش بزانین کە:**

١ ـ فەرموودەکە گشتیەو، هەموو نوێژێکی فەرزو سوونەت دەگرێتەوە. ئیبنوقودامە دەڵێ: لە بۆچوونی ئیمامی ئەحمەددا شتێك هەست دەکرێت کە جیاوازیەك لە بەتاڵبوونەوەی نوێژی فەرزو سوونەتدا هەبێت، کە یەکێك لەو سیانە بەبەر نوێژەکەدا تێپەڕ بووبن، بەڵام دروستیەکەی، یەکسانی هەموو نوێژەکانەو جیاوازی لە نێوان نوێژی فەرزو نوێژی سوونەتدا نیە، چونکە حوکمی فەرموودەکە گشتیە،، ئەوانەی نوێژیش بەتاڵ دەکەنەوە گشتین[1]..

٢ ـ فەرموودەکە حوکمە لەسەر هەموو ئافرەتێك، موسوڵمان بێت یان کافر، گەنج بێت یان پیر، مەگەر کچی بچووك، کە حوکمی گشتی منداڵ دەیگرێتەوە.

٣ ـ سەگی رەش هەموو جۆرێکی توخمی سەگ دەگرێتەوە: دێڵ و گەماڵ توتك وتانجی، بەرەڵاو خوێڕی، هەروەها سەگی پاس ونازداری ماڵ.

ـ مەگەر ئێمەش وەکو ئیمامی ئیبنوخوزەیمە بە سەرسامیەوە بڵێین: باشە کە ئەو فەرموودەیەی دەفەرموێ تێپەڕبوونی ئەو سیانە بەبەر نوێژدا بەتاڵی دەکەنەوە سەحیحەو فەرموودەیەکی تر نیە پێچەوانەی ئەو باس بفەرموێت، ئیتر ئەم قال و قیلە چیە؟! چۆن دەشێت کەسێك راو بۆچوونی خۆی باس کات لە کاتێکدا کە حوکمەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئاشکراو راشکاوە[2]؟!

★ ★ ★

---

[1] ابن قدامة: المغني (٢/٨٣).
[2] سەحیحی ئیبنوخوزەیمە (٢٣/١).

## هاتنی باسی ئافرەت و گوێدرێژو سەگی رەش پێکەوە

هاتنی باسی ئەم سێ توخمە پێکەوە لەو فەرموودانەدا، هیچ ئاماژەیەکی بۆ بێ ڕێزی ئافرەت تێدا نیە، وەکو دوژمنانی ئیسلام دەیانەوێت بیکەنە تەوەرێکی هێرش کردنە سەر ئیسلام. چونکە ئێمە نیوەی دینەکەمان لە ئافرەتێکی وەك عائیشەخانەوە خوا لێی رازی بێت بۆ هاتووە.. فەرموودەی راشکاو هەیە کە دەفەرموێ بەهەشت لەژێر پێی دایکدایە! وەك ئەوەی سەیدنا معاویەی کوڕی جاهیمە دەیگێڕێتەوە کە هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و عەرزی کرد: (جَاء النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ فقَالَ: يَا رَسولَ اللهِ أَرَدْتُ أنْ أغْزوَ وَقَدْ جِئتُ أَسْتَشِيرُكَ؟ فقَالَ: هَلْ لَكَ أمٌّ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَأَلْزِمْهَا فإن الجنة تحت رجليها)[1] ئەی پێغەمبەری خوا وویستم لە خزمەتتاندا بێمە غەزا، هاتووم راوێژێکتان پێ بکەم، فەرمووی: دایکت ماوە؟ ووتم: بەڵێ، فەرمووی: دەی پابەندی بە، چونکە بەهەشت لەژێر پێیەکانیدایە..

هاتنی باسی ئافرەت و گوێدرێژو سەگی رەش لە فەرموودەی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم پەیوەندی بە هەبوون و دەرکەوتن و کاریگەری شەیتان هەیە لە سات و کاتی نوێژکردندا.. فەرموودە زۆرن کە زیاتر ئەمە رۆشن دەکەنەوە.. لەوانە:

---

[1] نەسائی (٢/٥٤)، تەبەرانی (١/٢٢٢٥)، حاکم (٤/١٥١) زەهەبی لایەنگیری کردووە و مونزیریش بەدوایدا چۆتەوەو هەموو بە حەسەنیان ناساندووە شێخی ئەلبانی لە کتێبی سلسلة الاحاديث الضعيفة (٥٩٣) دا دەفەرموێ سەحیحە، لەگەڵ بە زەعیف دانانی (الجَنّةُ تحتَ أقدَامِ الأمَّهَاتِ) دا ئەم فەرموودەی هێناوەتەوە.

## یەكەم: گوێ درێژو سەگی رەش و شەیتان:

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ كە گوێدرێژ دەزەڕێ، ئەوە لەبەر ئەوەیە كە شەیتانی بینیووە، كەوابوو دەشێت گوێدرێژك لەو ساتەی بەبەر نوێژی كەسێكدا دەڕوات شەیتان ببینێت و بزەڕێت:

ـ (عن أبي هريرة رضي الله عنه: أنَّ النَّبيَّ صَلَّى اللهُ عليهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إذا سَمِعْتُمْ صِياحَ الدِّيكَةِ فاسْأَلُوا اللهَ مِنْ فَضْلِهِ، فإنَّهَا رَأَتْ مَلَكًا، وَإذا سَمِعْتُمْ نَهِيقَ الحِمَارِ فتعوَّذُوا باللهِ مِنْ الشَّيطانِ، فإنَّهُ رأَى شَيطانًا)[1].سەیدنا ئەبوهورەیرە خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلمفەرمووی ئەگەر گوێتان لێبوو كەڵەشێر قووقانی، داوای فەزڵ و رەحمەتی خوا بكەن، چونكە فریشتەیەكی دیووە، ئەگەر گوێتان لێبوو گوێدرێژ زەڕی پەنابگرن بە خوای لە شەیتان، ئەوە شەیتانێكی دیووە..

ـ (عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: "إِذَا سَمِعْتُمْ نُبَاحَ الْكَلْبِ وَنُهِيقَ الْحِمَارِ بِاللَّيْلِ فَتَعَوَّذُوا بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ فَإِنَّهُنَّ يَرَيْنَ مَا لَا تَرَوْنَ وَأَقِلُّوا الْخُرُوجَ إِذَا هَدَأَتِ الرِّجْلُ فَإِنَّ اللهَ يَبُثُّ فِي لَيْلِهِ مِنْ خَلْقِهِ مَا يَشَاءُ وَأَجِيفُوا الْأَبْوَابَ وَاذْكُرُوا اسْمَ اللهِ عَلَيْهَا فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَفْتَحُ بَابًا أُجِيفَ وَذُكِرَ اسْمُ اللهِ عَلَيْهِ)[2] سەیدنا جابر خوا لێی رازی بێت دەڵێ گوێی لێبووە كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه

---

[1] بوخاری (٣٣٠٣)، موسلیم (٢٧٢٩).

[2] ئیمامی ئەحمەد (٣٠٦/٣ ـ ١٤٣٣٢)، بوخاری: الادب المفرد (٤٢٣/١ ـ ١٢٣٤)، ئەبوداوود (٢٣٧/٤ ـ ٥١٠٣)، ئیبنوحیببان (٣٢٦/١٢ ـ ٥٥١٧)، حاكم (٣١٦/٤ ـ ٧٧٦٢) فەرمووشیەتی: سەحیحە بە پێی مەرجەكانی موسلیم، زەهەبیش لێی بێ دەنگ بووە.. شێخی ئەلبانیش بە سەحیحی ناساندووە (صحيح الجامع (٦٢٠).

وسلم فەرموویەتی: ئەگەر شەوان گوێتان لە وەڕەی سەگ و زەڕەی کەر بوو، پەنا بگرن بە خوا لە شەیتان، چونکە ئەوان ئەوە دەبینن کە ئێوە نایبینن، لەو کاتانەدا چوونە دەرەوەتان کەم کەنەوە، ئەگەر پێی خەڵکی سرەوت (یەعنی لە هاتوچۆ کەوتن) خوای گەورە رێ بە مەخلووقاتی خۆی دەدات بێنە دەرەوەو بڵاو ببنەوە، (هەر خواش دەزانێ چۆن و چەندن) ئیتر دەرگاکان ناوی خوای لێ بهێنن و دایانخەن، چونکە شەیتان دەرگایەکی بۆ ناکرێتەوە کە ناوی خوای لەسەر هێنرا بێت..

## دووەم: سەگی رەش و شەیتان:

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: (الكَلْبُ الاسودُ شَيطانٌ)[1] واتە سەگی رەش شەیتانە. موناقەشە لە ناو شەرعناساندا هەیە کە مەبەست لەوە ئەوەیە کە شەیتان دەچێتە ناو سەگی رەشەوەو ئاراستەی دەکات..

## سێیەم: ئافرەت و شەیتان:

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: (المَرْأَةُ عَوْرَةٌ، فإذا خَرَجَتْ استَشْرَفَهَا الشَّيطَانُ)[2] واتە: ئافرەت جێ نەزەرە، بۆیە هەر کە چووە دەرەوە، شەیتان زیاتر دەری دەخات، سەرنجی بۆ لا رادەکێشێت، تا پیاوان سەر هەڵبڕن بۆ تەماشاکردنی، بەو شێوەیە شەیتان ئافرەت دەکاتە مایەی گوناحکاریی..

---

[1] ابن حجر: فتح الباري (١٠/٦٤).

[2] شێخی ئەلبانی دەفەرموێ سەحیحە، بڕوانە: صحيح الترغيب و الترهيب (٣٤٦)، صحيح الجامع (٦٦٩٠)، صحيح ابن خزيمة (١٦٨٥)،

کەوابوو ئەوەی کە کۆلکەی هاوبەشی ئەم سێ توخمە باسکراوەیە، هەبوونی شەیتان و کاریگەرێتیەکەیتی، کە مەترسی ئەوەی لێ دەکرێت لە ساتەوەختی نوێژەکەدا شەیتان وایان لێ بکات بێنە بەر نوێژو ببنە هۆکاری بەتاڵبوونەوەی..

★ ★ ★

## باسی شەشەم: نوێژكردن ڕووەوڕووی گۆڕ

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم زۆر بە توندی بەرهەڵستی لەوە كردووە كە نوێژ لە گۆڕستان بكرێت، یان ڕووەو گۆڕ بكرێت.. وەك دەفەرموێ: (لا تصلُّوا الَى القُبُورِ وَلا تجْلِسُوا علَيهَا)[١] واتە: نە بەرەو ڕووی گۆڕ نوێژ بكەن و نە لەسەریشی دانیشن.. بێ گومان ئەمە مەبەست لە نوێژە فەرزەكان و سوننەتەكانە، نەك نوێژی جەنازە كە لە بازنەی پێداویستی كاروباری جەنازەدایە.

**كورتەباسـی نوێـژ لەسـەر گـۆڕ** : نوێـژ لەسـەر گـۆڕو گۆڕسـتان، چەندین حاڵەت دەگرێتەوە، كە هەر یەكەیان حوكمی شەرعی تایبـەت بـە خۆی هەیە نوێژ لەسەر گۆڕ دوو جۆرە:

### ـ جۆری یەكەم: نوێژێك كە بۆ خاوەن گۆڕەكە دەكرێت:

وەك ئەوانەی بە نەفامی و ناحاڵێتی نوێژ لەسەر مەرقەدی پیاوچاكان دەكەن، بەو نیەتەی كە نوێژەكە بۆ ئەوانە، ئەمە شیركەو هـیچ گومـانێكی تێدا نیە.. ئەگەر كابرا خاوەن عوزری شەرعی نـەبێت لـە دیـن و ئوممـەت چۆتە دەرەوەو لەسەر ئەو بتپەرستیە دەكوژرێت. بێ گومان نوێژەكەشی ـ بـێ ئـەو حوكمـەش ـ جـائیز نیـە.. چـونكە ڕاشـكاوانە خـوای گـەورە دەفـــەرموێ: ﴿وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗا﴾ النســـاء/٣٦ واتـــە: خـــوا بپەرستن و هاوبەشی بۆ دامەنێن..

---

[١] موسلیم (٩٧٢)، ئەحمەد (١٦٧٦٤)، ئەبوداوود (٣٣٩٩) ئەلبانی: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (ل ٥٨)

## ـ جۆری دووەم: نوێژ لە گۆڕستان:

ئەمەش بە گوێرەی هۆکاری نوێژکردنە :

١ ـ نوێژی جەنازەیەو لە گۆڕستان دەکرێت، وەکو ئەوەی کەسێك کۆچی دوایی کردووە، شۆراوەو کفن و دفن کراوە بەڵام لە مزگەوت جێ و ڕێ نەبووە نوێژی جەنازەی لەسەر بکرێت، ئەمە جائیزە نوێژەکەی لە گۆڕستان لەسەر بکرێت.. چونکە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم نوێژی جەنازەی لەسەر مجێوری مزگەوتەکە دوای ناشتنی لە گۆڕستان لەسەرکرد:

ـ: (عَنْ أبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أنَّ أسْوَدَ رَجُلًا أوْ امْرَأةً كَانَ يَكُونُ فِي الْمَسْجِدِ يَقُمُّ الْمَسْجِدَ فَمَاتَ وَلَمْ يَعْلَمْ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَوْتِهِ فَذَكَرَهُ ذَاتَ يَوْمٍ فَقَالَ مَا فَعَلَ ذَلِكَ الْإِنْسَانُ قَالُوا مَاتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ أفَلَا آذَنْتُمُونِي، قَالَ فَدُلُّونِي عَلَى قَبْرِهِ فَأتَى قَبْرَهُ فَصَلَّى عَلَيْهِ)[١] واتە:سەیدنا ئەبوهورەیرە خوا لێی ڕازی بێت باسی ئەو قولە ڕەشەی گێڕایەوە کە مجێوری مزگەوت بوو، کۆچی دوایی کردبوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم هەواڵی پرسی ووتیان کۆچی دوایی کردووە! فەرمووی: بۆچی پێتان نەوتووم؟! پاشان تەشریفی بردە سەر گۆڕەکەی و لەوێ نوێژی جەنازەی لەسەر کرد.

٢ ـ جەنازەیەو لە گۆڕستان دانراوە بۆ نوێژ لەسەر کردنی: وەکو حاڵەتی یەکەمە، مردووەو کفن کراوە بەڵام نەنێژراوە، پێش ناشتنی

---

[١] بوخاری (١٣٣٧)، موسلیم (٩٥٦).

هەر لە گۆڕستانەکە نوێژی لەسەر دەکرێت، ئەمەش جائیزە.. چونکە نوێژی جەنازە پێش و پاش ناشتنی مردووەکە جیاوازی نیە[١].

٣ـ نوێژی فەرزو سوننەتی تر، نابێت لەسەر گۆڕستان یان بەرەو گۆڕ بکرێت، ئەگەر کرا باتڵە.. بەڵگە لەسەر ئەم حوکمە زۆرە، وەکو:

ـ فەرموودەی: (الأرْضُ كُلُّهَا مَسْجِدٌ إلا المَقْبَرَةُ والحَمَّامُ)[٢] واتە: هەموو شوێنێکی سەر زەوی جێی نوێژە جگە لە گۆڕستان و گەرماو (حەمام).

ـ هەروەها عائیشە خان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (لَعَنَ اللهُ اليهودَ وَالنّصَارَى اتخَذُوا قُبُورَ أنبِيائِهِمْ مَسَاجِدَ)[٣] واتە: نەفرینی خوا لە جولەکەکان، گۆڕی پێغەمبەرانی خۆیان کردە جێی خواپەرستی.

٣ ـ نوێژی فەرزو سوننەتی تر بەڵام رووەو گۆڕ یان گۆڕستان: راستتر وایە کە ئەمەش حەرامە، وەکو ئەوەی کەسێك نوێژ دەکات بەڵام مەرقەدی پیاوچاکەکە وا لەبەر دەستیدا، وەکو ئەوانەی نوێژ لەسەر گۆڕی کاك ئەحمەدی شێخ و شێخ عبدالقادری گەیلانی و پیاوچاکاتی تر رەحمەتی خوایان لێ بێت دەکەن، کە گۆڕەکە دەکەوێتە نێوان ئەوان و قیبلەوە! یان نوێژەکە لەسەر پارچە زەویەکی تری غەیری زەوی مەرقەدەکە یان گۆڕستانەکە دەکات، بەڵام مەرقەدەکە یان گۆڕستانەکە بە دیوارێك یان فاسڵێکی تر لە جێ نوێژەکە جودا نەکراوەتەوە.. سەیدنا ئەبومەرسەد خوا لێی رازی بێت دەڵێ:

---

[١] فتاوى اللجنة الدائمة (٨/٣٩٢).

[٢] ترمزی (٣١٧)، ئیبنوماجە (٧٤٥) شێخی ئەلبانی لە صحیح ابن ماجة (٦٠٦) بە سەحیحی ناساندووە.

[٣] بوخاری (٤٣٥)، موسلیم (٥٢٩).

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (لا تجْلِسُوا عَلَى الْقُبُورِ وَلا تصَلُّوا إِلَيهَا)[1] واتە: لەسەر گۆڕ دامەنیشن و نوێژیشی لاوە مەكەن.. ئەمە هەموو جۆرە نوێژكردنەكانی غەیری جەنازە لەسەر گۆڕستان یان رووەو گۆڕو مەرقەدو شەخسەكان دەگرێتەوە.. بەلاّم ئەگەر دیوارێك یان پەرژینێك یان جادەیەك لە نێواندا بوو، ئەوە نایگرێتەوە[2]..

٤ ـ ئەگەر مەرقەدەكە یان گۆڕەكان كەوتبوونە دوای جێ نوێژەكەوە، یان كەوتبوونە لاتەنیشتی راست یان چەپەوە، ئەویش كەراهەتی هەیە نوێژی فەرزو سوننەتی لێ بكرێت بەلاّم نوێژەكە تەواوە.. والله اعلم.

پێم وایە هەتا زۆر ناچار نەبیت نوێژ لە مزگەوتی گۆڕداردا نەكەیت، بە تایبەتی ئەگەر لە دیدی خەلّكیدا خاوەن گۆڕەكە پیاوچاك ناسرابوو ئەسلّیش ئەوەیە ئەگەر گۆڕەكە هەبووبێت و مزگەوتی لەسەر دروست كرابێت، دەبێت مزگەوتەكە بڕوخێندرێت، ئەگەر مزگەوتەكە دروست كراو گۆڕی لەناودا دروست كرا، وەكو ئەوانەی مزگەوت دروست دەكەن و جێی گۆڕی خۆیانی تێدا دەهێڵنەوە، ئەوە جائیز نیەو دەبێ مردووەكە دەربهێنرێتەوەو ببرێتە گۆڕستانی گشتی موسوڵمانان تا خەڵكی وا نەزانن ناشتنی مردوو لە مزگەوتدا چاكترە.

★ ★ ★

---

[1] موسلیم (٩٧٢).

[2] ابن قدامة (٤٠٣/١)، ابن عثیمین: الشرح الممتع (٢٣٢/٢).

## باسی حەوتەم: نوێژکردن بە پێڵاوەوە

حەتمەن خەڵکانێکی زۆر کە ئەم سەردێڕە دەخوێننەوە بەسەرسامیەوە دەپرسن: نوێژکردن بە پێڵاوەوە؟! چونکە نازانن کە نەك جائیزە بەڵکو سوونەتێکی سەلمێنراوی پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وسلم، کە چەندین ریوایەتی لەسەر هەیە:

١ـ سەیدنا عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکیەوە ئەویش لە باپیریەوە خوا لێیان رازی بێت دەگێڕێتەوە (كَانَ يَقِفُ حَافِياً أَحْيَاناً، وَمُنْتَعِلاً أَحْيَاناً)[1] واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم جاری وا هەبوو لە وەستانی نوێژیدا پێی پەتی بوو، جاری وا هەبوو نەعلەکانی لە پێدابوو..

٢ ـ سەیدنا ئەبوهورەیرە خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو: (إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيَلْبِسْ نَعْلَيهِ، أو لِيَخْلَعْهُمَا بَينَ رِجْلَيهِ، وَلا يُؤْذِي بِهِمَا غَيرَهُ)[2] واتە: ئەگەر کەسێکتان نوێژی دەکرد با نەعلەکانی لە پێدا بێت، یان داینێ و بیخاتە نێوان پێیەکانیەوە، نەبادا خەڵکی پێ ناڕەحەت کات..

---

[1] شێخی ئەلبانی لە أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم صلى الله عليه وسلم (ل ٥٤) دا دەفەرموێ: ئەبوداوودو ئیبنوماجە گێڕاویانەتەوە، فەرموودەیەکی متەواترە..

[2] حاکم (٢٥٩/١) بە سەحیحی ناساندووەو فەرموویەتی بە پێی مەرجەکانی موسلیمە، ئیمامی زەهەبیش لایەنگریی کردووەو شێخی ئەلبانیش دەفەرموێ: هەر وایە وەکو هەردووکیان فەرموویانە.. پاشان دەفەرموێ: ئەبوداوود (١٠٦/١)، بەیهیقی (٤٣٢/٢) یش لە رێی ئەوزاعیەوە گەیاندوویانەتەوە بە ئەبو هورەیرە .. أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم صلى الله عليه وسلم (١٠٨/١).

٣ ـ سەیدنا شەددادی کوڕی ئەوس خوا لێیان رازی بێت لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (خَالِفُوا الْيَهُودَ، فَإِنَّهُمْ لا يُصَلُّونَ فِي نِعَالِهِمْ وَلا خِفَافِهِمْ)[1] واتە: پێچەوانەی رەفتاری جولەکەکان بکەن، ئەوان نوێژ بە پێڵاوو خوففەکانیانەوە ناکەن..

٤ ـ کە جوبرەئیلی بەڕێز سەلامی خوای لێ بێت هەواڵی دایە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە نەعلەکانی پیسایيان پێوەیە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەردوو جووتە نەعلەکەی لە پێ دانا (أَنَّهُ صَلَّى فِي نَعْلِهِ، وَصَلَّى أَصْحَابُهُ فِي نِعَالِهِمْ، فَخَلَعَ نَعْلَيْهِ، فَخَلَعُوا نِعَالَهُمْ، فَلَمَّا سَلَّمَ قَالَ: لِمَ خَلَعْتُمْ نِعَالَكُمْ؟ قَالُوا: رَأَيْنَاكَ خَلَعْتَ نَعْلَيْكَ فَخَلَعْنَا نِعَالَنَا، فَقَالَ: إِنَّ جِبْرِيلَ أَتَانِي فَأَخْبَرَنِي أَنَّ فِيهِمَا أَذًى )[2] واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە نەعلەکانیەوە نوێژی کرد، یاوەرانیش لە دوایەوە بە نەعەلەکانیانەوە نوێژیان دابەست،، لە نوێژەکەدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەعلەکانی دانا، یاوەرانیش لە دوایەوە نەعلەکانیان دانا، کە سەلامی (کۆتایی نوێژی) دایەوە پێی فەرموون: بۆچی نەعلەکانتان لە پێ کردەوە؟! فەرموویان:

---

[1] ئەبوداوود (١/١٠٥)، تەبەرانی: لە الزوائد (٧/٣٤٨)، حاکم (١/١٦٠) لە رێی بەیهیقیەوە (٢/٤٣٢) و فەرموویەتی سەنەدەکەی سەحیحەو زەهەبیش لایەنگری بووەو شێخی ئەلبانیش دەفەرموێ: (وهو کما قالا، ورجاله کلهم ثقات) أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم صلى الله عليه وسلم (١/١٠٩).. شەوکانیش دەفەرموێ: کەس قسەی لەسەر سەنەدەکەی بۆ لاواز کردنی نەکردووە. نیل الاوطار (٢/١٠٩)..

[2] الألباني: ارواء الغليل (٢٨٤) و صحيح سنن أبي داود (٦٥٧).

دیمان جەنابت نەعلەکانت دانا، ئێمەش دامانان، فەرمووی: جوبرەئیل هات و هەواڵی دامێ کە نەعلەکان پیسییان پێوە بوو..

٥ ـ سـەیدنا ئـەبوهورەیرە خـوا لێـی رازی بێـت دەگێڕێتـەوە کـە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویـەتی: (إذَا صَلَّى أحَدُكُمْ فَلْيَلْبسْ نَعْلَيهِ أو لِيَخْلَعْهُمَا بَينَ رِجْلَيهِ وَلا يُؤْذِي بهِمَا غَيرَهُ)[١] واتە: ئەگەر کەسێکتان نوێژی کرد با نەعل (پێڵاو) ەکانی هەر لە پێدابن، یان با دایاننێت وبیانخاتە مابێنی پێی خۆیەوە، تا کەسیان پێ ئیزعاج نەکات.

ئـەم فەرموودانـە دەسـەلمێنن کـە نوێـژ کـردن بـە پـێڵاوەوە کـە پێـی ووتـراوە نـەعل، سـووننەتە.. کـەوابوو نوێـژ کـردن بـە پـێڵاوەوە زینـدوو کردنەوەی سووننەتێکی فەرامۆش کراوە.. والله اعلم..

★ ★ ★

---

[١] ریوایەتی سەحیحی زۆرە لای نەسائی وئەبوداوودو ئیبنوخوزەیمە (٣/١١٠/١) شێخی ئەلبانی دەفەرموێ سەنەدەکانیان سەحیحە.. الالباني: صحيح الجامع (٦٥٣).

## روکنەکانی نوێژ

# روکنی دووەم

# تەکبیرەی ئیحرام

### تەکبیرەی ئیحرام (الله اکبری دەسپێکی نوێژ):

شەرعناسان جگە لە ئیمامی ئەبو حەنیفە لەسەر ئەوە کۆن کە دەستپێکی نوێژ بە ووتنی (الله اکبر) دەبێت چونکە لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم یان لە یەکێك لە یاوەرانی بەرێزیەوە نەبیستراوە لە دەسپێکی نوێژدا غەیری ئەوەی فەرموو بێت[١]. ئەمەش روکنێکی نوێژە، چونکە:

١ ـ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: (مِفْتَاحُ الصَّلَاةِ الطُّهُورُ، وَتَحْرِيمُهَا التَّكْبِيرُ، وَتَحْلِيلُهَا التَّسْلِيمُ)[٢] واتە: کلیلی نوێژ دەستنوێژە، دەسپێکی تەکبیرەی ئیحرامە، تەواوبوونی سەلام دانەوەیە..

٢ ـ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە کابرای خاوەن نوێژهەڵە (المسئ صلاته) ی فەرموو (إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلَاةِ فَكَبِّرْ)[٣] واتە: کە هەستایت بۆ نوێژ تەکبیرەی ئیحرام بکەو نوێژ دابەستە..

---

[١] ابن القیم: تهذیب السنن (٤٩/١).

[٢] ئەبوداوود (٦١)، ترمزی (٣) شێخی ئەلبانی بە سەحیحی داناوە: الارواء (٣٠١).

[٣] بوخاری (٧٢٤) بروانە پەراوێزی ژمارە (٧٤ و ٧٥).

٣ـ لە ریوایـەتێکی تـردا پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیـه وسـلم بـە کـابرای خـاوەن نوێژهەڵـە (المسئ صلاته) ی فـەرموو: (لا تـتِمُّ صَلاةُ أحَـدِكُمْ حَتّـى يُسْـبِغَ الْوُضُـوءَ كَمَـا أَمَـرَهُ اللَّـهُ عَـزَّ وَجَـلَّ، فَيَغْسِـلَ وَجْهَـهُ، وَيَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ، وَيَمْسَحَ برأسِهِ وَرِجْلَيْهِ إِلَى الْكَعْبَيْنِ، ثـمَّ يُكَبِّـرَ اللَّـهَ وَيَحْمَدَهُ وَيُمَجِّدَهُ)[١] واتـە: نوێـژی کەسـتان تـەواو نابێـت هـەتا وەکو کـە خــوای گــەورە فــەرمانی پێداوە،دەســتنوێژ بــە رێکــوپێکی نــەگرێت، دەموچاوی بشوات، ئینجا دووباسکی تا ئانیشکی، پاشان مەسحی سـەری بکات و پێیەکانی بشوات، ئینجا الله اکبر بکات و نوێـژ دابەسـتێ، ئینجا سوپاس و ستایشی خوا گەورە بکات..

٤ـ عائیشـەخان خـوا لێـی رازی بێـت لـە باسـی نوێـژی پێغەمبـەری خوادا صلی الله علیه وسـلم دەفـەرموێ: (كَـانَ رَسـولُ اللهِ صَـلَّى اللهُ عَلَيـهِ وَسَلَّمَ يَسْتَفْتِحُ الصَّلاةَ بالتَّكْبيرِ)[٢] واتە: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسلم نوێژەکەی بە تەکبیر دەست پێ دەکرد..

٥ـ پێغەمبــەری خــوا صــلی الله علیــه وســلم لــە ووتــنی تــەکبیرەی ئیحرامدا جاری وا هـەبوو دەنگـی بـەرز دەکـردەوە تـا بزانرێـت نوێـژی دابەسـت، تـا ئەوانـەی دوای خۆشـیەوە ببیسـتن[٣].. ئەمـەی لـە هـەموو

---

[١] الالباني: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٥٥/١).

[٢] موسلیم (٤٩٨)، ئەبوداوود (١٢٥/١)، بەیهیقی (١١٣/٢)، ئەحمەد (٣١/٦)، الالباني: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (١٧٧/١)..

[٣] حاکم (٢٢٣/١)، بەیهیقی (١٨/٢)، ئیمامی ئەحمەد (١٨/٣)، زەهەبی دەفەرموێ: بە پێی مەرجی بوخاری وموسلیمەو سەحیحە. ریوایەتی تری هاوشێوەی لە بوخاریدا (٢٤٢/٢) هەیە. بڕوانە: الالباني: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (١٨٦/١)

نوێژێکدا نـەدەکرد، مەگـەر ئیمامـەتی بکردایـە. بۆیـە دەیفـەرموو: کـە ئیمام الله اکبری کرد ئێوەش بڵێن الله اکبر[١]..

ئەگەر ئیمام دەنگی کز بوو یان لەبـەر پیریـی و نـەخۆشـی نەیـدەتوانی دەنگ بەرز کاتەوە، دەشێت کەسێکی تر لە دوایەوە تەکبیرەکانی بە دەنگی بەرز بۆ بڵێتەوە، هەر وەکو کە سەیدنا ئەبوبەکری سدیق خـوا لێـی رازی بێت لە کۆتا نەخۆشی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم تەکبیرەکانی بە دەنگی بەرز دەووتەوە[٢]. راجوێیی لەمەدا نیە[٣]..

ئەگـەر مەئمومـەکان دەنگـی ئیمامەکـەیان دەبیست پێویست ناکات کـەس تـەکبیرەکان بـە دەنگـی بـەرز بڵێتـەوە، چـونکە ئـەوە بـە کـۆڕای شەرعناسان جائیز نیە[٤]..

کەم لە شەرعناسان فەرموویانـە کـە غـەیری ئـەم تـەکبیرەی ئیحرامـە (الله اکبرە)، بۆ نوێژدابەسـتن دەبێـت. ئیمـامی ئـەبو حەنیفـەی رەحمـەتی فەرموویـەتی: تـەکبیر بـۆ دەسـپێکی نوێـژ مـەرج نیـە، بـەڵکو دەشـێت زیکرێکی تریش بێت وەك (سـبحان الله) یـا (الحمـد لله) یـا (الله الجلیـل) یـا (الله العظـیم) یـان لـەفزێکی تـر لـەو بـارەوە، لەبـەر ئـەوەی هـەمووی هـەر زیکرە!! دیارە ئەم بۆچوونە بێ بەڵگەیـەو بـە پێـی قیاسـە! ئـەو قیاسـەش لێرەدا (قیاسی فاسـید)ە چـونکە بەرامبـەر دەقـی راشـکاوە.. بـە هـەر حـاڵ بۆچوونی بەڵگەی جمهوری شەرعناسان بەهێزترە..

---

[١] حاکم لە (المستدرك) دا هێناوێتیەوەو زەهەبیش لایەنگیری کردووەو فەرموویانە سەحیحە بە پێی مەرجەکانی بوخاری و موسلیمە الالباني: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (١٩٢/١).

[٢] بوخاری (١٦٢/٢)، موسلیم (٢٣/٢).

[٣] النووی: المجموع (٣٩٨/٢).

[٤] ابن تیمیة: الفتاوی (٦٩/١).

## نوێژ بە غەیری زمانی عەرەبی نابێت:

گومـان لـەوەدا نیـە کـە نـە پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم نـە یەکێك لە یاوەرە بەڕێزەکانی نوێژیان بە غەیری عەرەبی نەکردووە، نەك لەبــەر ئــەوەی خۆیــان عــەرەب بــوون، خــۆ غــەیرە عــەرەبیش لــە کۆمەڵگەکەیانـدا هـەبووە، دواتـریش یـاوەران تێکـەڵ بـە دەیـان میللـەتانی تـری غـەیرە عـەرەبی بـوون، بـەڵام کـەس نوێـژی بـە غـەیری عـەرەبی نـەکردووە، لـەم روانگەوەیـە کـە زۆرینـەی زۆری شەرعناسان فەرموویانـە نوێژ کردن هەر دەبێت بە زمانی عەرەبی بێت، مەگەر کەسێك موسـوڵمان ببێـت و پـێش ئـەوەی کـاتی نوێـژی یەکـەمی تـەواو ببێـت نـەتوانێت تەکبیرەی ئیحرام بە عەرەبی بڵێت، ئەو کاتە بـۆی هەیـە بـە زمانێك کـە خــۆی بەســەریدا زاڵــە بیڵێــت.. ئــەمما هــەموو نوێژەکــە ئــەوە تــەنها حەنەفیــەکان فەرموویانــە دەشــێت بــە غــەیری عــەرەبی بیخوێنێــت! بەڵگەشیان نیەو پشتیان بە قیاس بەستووە!!

★ ★ ★

## روکنەکانی نوێژ

# روکنی سێیەم

# خوێندنی سورەتی فاتیحە لە هەموو رکاتەکانی نوێژدا

شەرعناسان ـ جگە لە ئیمامی ئەبو حەنیفەو هەندێك لە یاوەرانی ـ خوێندنی سورەتی فاتیحە لە هەموو رکاتێکی نوێژدا ـ فەرز بێت یان سوونـنەت، بە دەنگی بەرز بخوێندرێت یان پەنهانی ـ بە روکنێکی نوێژ دادەنێن.. ئەمە بۆچوونی ئیمامی مالیك وشافیعی وئەحمەدو سوفیانی سەورییەو لە سەیدنا عومەری کوڕی خەتتاب و سەیدنا عوسمانی کوڕی ئەبولعاسەوە خوا لێیان رازی بێت ریوایەت کراوە[1].. بەڵگەشیان:

١ ـ سەیدنا عوبادەی کوڕی سامیت خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لا صَلاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الكِتَابِ)[2] واتە: هەر کەسێك سورەتی فاتیحەی لە نوێژدا نەخوێندبێت نوێژەکەی گیرا نەبووە..

٢ ـ سەیدنا ئەبوهورەیرە خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (كُلُّ صَلاةٍ لا يُقْرَأُ فِيهَا بِأُمِّ الْكِتَابِ فَهِيَ خِدَاجٌ هِيَ خِدَاجٌ هِيَ خِدَاجٌ، غَيْرُ تمَامٍ)[3] واتە: هەر نوێژێك کە سورەتی فاتیحەی تێدا نەخوێندرێت، ئەو نوێژە نوقسانە،

---

[1] المدونة (٦٦/١)، الام (٩٣/١)، المجموع (٢٨٥/٣)، المغني (٣٤٣/١)، الاوسط (١٠١/٣).
[2] بوخاری (٧٥٦)، موسلیم (٣٩٤).
[3] موسلیم (٤١)، ئەبوداوود (٨٢١)، نەسائی (١٣٥/٢)، ترمزی (٣١٢)، ئیبنوماجە (٨٣٨).

ئەو نوێژە نوقسانە، ئەو نوێژە نوقسانە، تەواو نیە.. نوێژەکە هەر پێی ووتراوە نوێژ بەڵام نوقسانە، نوقسانیش یەعنی تەواو نیەو نوێژەکەی پێ نەهاتۆتە دی و قبوولْ نەبووە.. ئەبوسائیب کە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە دواتر دەڵێ لە ئەبو هورەیرەم پرسی: ئاخر جاری وا هەیە لە دوای ئیمامەوەم؟! دەستی راوەشاندم و فەرمووی: لە دڵی خۆتدا بیخوێنە..

٣ ـ لە ریوایەتی سەیدنا روفاعەی کوڕی رافیعەوە خوا لێی رازی بێت بۆ فەرموودەی خاوەن نوێژە هەڵەکە (المُسئ صلاتهُ) پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ثمَّ اقْرأ بأمِّ الْقُرآنِ، ثمَّ اقْرأ بمَا شِئتَ.. ثمَّ اصْنَعْ ذَلِكَ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ)[١] واتە: پاشان سورەتی فاتیحە بخوێنە، پاشان چەندی تر دەتوانیت بخوێنە. پاشان لە هەموو رکاتەکاندا وا بکەرەوە..

ئیمامی ئەبو حەنیفەو محمدی کوڕی حەسەنی شەیبانی فەرموویانە: لە نوێژدا مەرج نیە سورەتی فاتیحە بخوێندرێت، بەڵکو دەشێت هەر سوورەتێکی تر بێت!!!! ئەگەر چی یەك کورتە ئایەتیش بێت وەکو ﴿ثُمَّ نَظَرَ﴾ المدثر/٢١.. بەڵگەیان بۆ بۆچوونی خۆیان:

١ ـ خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِ﴾ المزمل/٢٠ واتە: ئەوەندی لاتان ئاسان بوو قورئان بخوێنن.. وەڵامدراونەتەوە بەوەی کە لەوانەیە مەبەست لەم ئایەتە: خوێندنی سورەتی فاتیحەو

---

[١] ئیمامی ئەحمەد (٣١/٣٢٨ ـ ١٨٩٩٥) ئیبنوحیبان (٥/٨٨ ـ ١٧٨٧)، ئەبوداوود (٨٩٥) شێخی ئەلبانی بە حەسەنی ناساندووە (صحیح أبي داود ٨٥٩) بەڵام شێخ شوعەیبی ئەرنائووت بە سەحیحی ناساندووە..

ئایەتی تری قورئان بێت، ئەوەندەی بۆ نوێژخوێنەکە ئاسانە. یان لەوانەیە ئەو رایە پەسەند بێت کە دەڵێ: ئەم ئایەتە پێش هاتنە خوارەوەی سورەتی فاتیحە بووە.. چونکە باسی فەرزبوونی شەونوێژ دەکات لەسەر پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەوەش لە مەککە بووەو سورەتی فاتیحەش لە مەدینە هاتۆتە خوارەوە..

٢ ـ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە فەرموودەی کابرای خاوەن نوێژی هەڵەدا فەرمووی: (وَيَقْرَأَ مِنَ الْقُرْآنِ مَا أَذِنَ اللَّهُ لَهُ فِيهِ وَتيَسَّرَ)[١] واتە: ئەوەندەی بۆی ئاسان بوو، خوا یارمەتیدا قورئان بخوێنێت.. لەمەشدا بەوە وەڵامدراونەتەوە کە (وَتيَسَّرَ) و (وَما تيسر) کە لە ریوایەتەکانی تردا هاتوون، هەردوو ماناکە دەبەخشن.. دشێت گشتی بن و روون بکەنەوە، یان رەها بن و دیاری بکەن، یان نادیار بن و بە رستەی (اقرأ بِأُمِّ القُرْآنِ) رۆشن بکرێنەوە.. چونکە ئەو ئایەتانەی بۆ هەموو موسوڵمانانی سەردەمی یەکەم ئاسان بوو بیخوێنن: سورەتی فاتیحە بوو..

دیسان وەکو گونجاندنی بەڵگەکان پێکەوە ووتراوە کە خوێندنی فاتیحەیەو پاشان ئەوەندە ئایەتی تر دەخوێنێت کە بۆی دەلوێت..

٣ ـ ئەگەر خوێندنی سورەتی فاتیحە روکنێکی نوێژ بوایە دەبوو ئەو خەڵکە فێر کرایە تا بتوانن بیخوێنن.. بەڵگەشمان هەیە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە ریوایەتێکی تری فەرموودەی خاوەن نوێژە هەڵەکەدا پێی فەرموو: (فَإِنْ كَانَ مَعَكَ قُرْآنٌ وَإِلَّا فَاحْمِدِ

---

[١] بجۆرەوە پەراوێزی ژمارە (٧٤ و ٧٥).

اللهَ.)[١] ئەگەر قورئانت لەبەر بوو ئەوە بیخوێنە، ئەگەر نا ئەوە سوپاس و ستایشی خوای گەورە بکە..

ـ سەیدنا ئیبنو ئەبی ئەوفا خوا لێی رازی بێت دەڵێ: (جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي لا أَسْتَطِيعُ أَنْ آخُذَ شَيْئًا مِنَ الْقُرْآنِ، فَعَلِّمْنِي مَا يَجْزِينِي ، فَقَالَ: قُلْ: سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلَا إِلَهَ إِلا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ وَلَا قُوَّةَ إِلا بِاللَّهِ)[٢] واتە: کابرایەك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا من ناتوانم هیچ لە قورئان فێرببم، شتێکی ترم فێرکە جێم بۆ بگرێت، فەرمووی: بڵێ: پاك وبێ عەیبی بۆ خوا، سوپاس بۆ خوا، هیچ خوایەك نیە شایانی پەرستن بێت جگە لە الله، خوا گەورەیەو هیچ دەسەڵات و هیچ هێزێك نیە مەگەر ئەوەی خوا بە خواو لە خواوەیە..

وەڵامی ئەمیشیان وا داوەتەوە کە فەرموویانە: ئەم کابرایە هیچی لە قورئان لەبەر نەبووە، نەشیتوانیووە لەبەری کات..

زۆرن ئەوانەی بەرپەرچی ئەم بۆچوونە سەیرەی ئیمامی ئەبو حەنیفەیان داوەتەوەو زۆر لاوازیان کردۆتەوە، لەبەر گەورە نەبوونی قەبارەی ئەم کتێبەکە نەبوایە هەموو رەدو بەدەلەکانیانم دەهێنایەوە، تا

---

[١] ترمزی (٣٠٢) بە حەسەنیشی ناساندووە، ئەبوداوود (٨٥٨)، ئەلبانی بە سەحیحی ناساندووە لە صحيح أبي داود (٧٦٧).

[٢] ئەبو داوود (٨٣٢)، شێخی ئەلبانی لە ارواء (٣٠٣) دا دەفەرموێ: حەسەنە، بەڵام فەرموودەوانانی تر قسەیان لەسەر کردووەو هەندێکیان بە زەعیفیان داناوە لەبەر ئەوەی لە سەنەدەکەیدا (يزيد بن أبي زياد الهاشمي) هەیە..

بزانرێت تەقلید چی بەم ئوممەتە کردووە کە حەنەفی مەزهەبەکانن، کە ئەمڕۆ حەوت سەد ملیۆن موسوڵمان زیاترن!! [١].

گومانی تێدا نیە کە بۆچوونی جمهوری شەرعناسان راستترەو بەڵگەی بەهێزتر پاڵپشتێتی. چی لەوە بەهێزترە کە لە بوخاریدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە هەموو رکاتەکانی نوێژدا سورەتی فاتیحەی دەخوێند[٢]!!

خەتتابی لە (معالم السنن) دا دەڵێ: ئەسڵ ئەوەیە کە نوێژ بە بێ خوێندنی سورەتی فاتیحە جائز نیەو قبووڵ نابێت، بەڵام بە تەئکید ئەمە بۆ کەسێکە کە بتوانێت لەبەری کات و بیخوێنێت، ئەمما ئەگەر بۆی لەبەر نەکرا، دەبێت بە قەدەر ئەو (حەوت ئایەت) ی تر لە قورئان بخوێنێت، چونکە زیکری دوای فاتیحە خوێندن هەر قورئانە، ئەگەر لەبەر لاوازی زاکیرەی یان لەبەر قورسی لەبەر کردنی قورئان، ئەوەشی بۆ لەبەر نەکرا، ئینجا بۆی هەیە ئەو زیکرانە بخوێنێت کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەو یاوەرەی فێر کردووە..

من پێم وایە هەر کەسێك بتوانێت سورەتی فاتیحە لەبەر کات بۆی نیە هیچی تر لە نوێژدا لە جێی ئەو بخوێنێت، نە قورئان و نە زیکری تر.. والله اعلم.

---

[١] دەتوانرێت بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەم بۆچوونە سەیری ئەم سەرچاوانە بکرێت: ئیمامی بوخاری: خير الكلام في القراءة خلف الإمام، بەیهیقی: القرءة خلف الإمام، ئیبنوحەزم: المحلى مسألة رقم (٣٥٩ و ٣٦٠)، ئەحمەد شاکر: شرح سنن الترمذي (٢/ ١٢٤)، محمد بن عبدالرحمن المباركفوري: تحقيق الكلام في وجوب القراءة خلف الكلام، شێخی ئەلبانی: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (ل ٣٠٠-٣٢٦)..

[٢] بوخاری (٥٧٩).

## خوێندنی سورەتی فاتیحە، ئایەت ئایەت، هێدی و لەسەرخۆ:

لە ئوممووسەلەمە خانیان پرسی: قورئان خوێندنی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە نوێژدا چۆن بوو: فەرمووی: ئایەت ئایەت دەیخوێند: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ پاشان دەوەستا، پاشان دەیفەرموو: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾، پاشان دەوەستا، پاشان دەیفەرموو: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، پاشان دەوەستا، پاشان دەیفەرموو: ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾، ئاوا تا کۆتایی سورەتەکە.. هەموو قورئان خوێندنێکی هەر وا بوو، لە کۆتایی هەموو ئایەتێکدا دەوەستا، بێ ئەوەی کۆتایی یەکێکیان بە سەرەتای ئەوی دوایەوە پەیوەست کاتەوە[١]..

ئەمە خوێندنی سوونەتانەیە، نەك کێبڕکێی ئەوەی کە کێ زۆرترین ئایەت بە هەناسەیەك دەخوێنێت!! یان خوێندنێکی بە لرفەلرف لەگەڵ هەناسەوەرگرتن و هەناسەدانەوەدا ووشەکان دەربڕێت!!

## خوێندنی بەسمەلە لە سەرەتای سورەتی فاتیحەدا:

شەرعناسان لە باسی خوێندنی بەسمەلە (ووتنی بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ) لە سەرەتای سورەتی فاتیحەدا راجوێن، ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە راجوێیی پێشتریان لەسەر ئەوە هەیە کە ئایا بەسمەلە ئایەتێکی سورەتی فاتیحەیە یان نا؟

---

[١] ئیمامی ئەحمەد (٣٠٢/٦)، ئەبوداوود (١٦٩/٢)، ترمزی (١٥٢/٢)، دارەقوتنی (١١٨) و دەفەرموێ: سەنەدەکەی راستەو هەموویان جێ متمانەن، حاکمیش (٢٣١/٢) دەفەرموێ: بە پێی مەرجەکانی بوخاری موسلیم سەحیحە، زەهەبیش لایەنگیریی بووە.. بڕوانە الالباني: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٢٩٣/١).

فەرموودەوانی گەورە شێخی ئەلبانی رەحمەتی گەیشتۆتە ئەوەی كە خوێندنی بەسمەلە لە سەرەتای خوێندنی سورەتی فاتیحەدا لە نوێژدا بەشێكە لە سورەتەكەو پێویستە لە نوێژی جەهریدا بە پەنهانی (بەبێ دەنگ) بخوێندرێت[1].. ئەمەش بۆچوونی ئیمامی ئەبو حەنیفەو ئیمامی ئەحمەدە كە بەڵگەی زیاتریان لە پشتە كە بە سێزدە رێگا ئەو فەرموودانە سەلمێنراون كە دەڵێن بە پەنهانی دەخوێندرێت[2].. منیش پابەندی ئەم بۆچوونەم.. چونكە بەڵگەكانی بەهێزترە لە بەڵگەی مەزهەبی شافیعی.. والله اعلم.

## خوێندنی سورەتی فاتیحە لە نوێژی جەماعەتدا:

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خوێندنی سورەتی فاتیحەی زۆر بەلاوە گرنگ بوو، بۆیە لە باسی مەزنی سورەتی فاتیحەدا دەیفەرموو: (مَا أنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ فِي التَوراةِ وَ لا في الإنْجيلِ مِثلَ أُمِّ القُرآنِ وَ هيَ السَّبْعُ المَثانيَ وَ القُرآنُ العَظيمُ الَّذي أُوتيتَهُ)[3] واتە: خوای گەورە نە لەتەورات ونە لە ئینجیلدا وەكو سورەتی فاتیحەی نەناردۆتە خوارەوە، ئەو حەوت ئایەتەی لە هەموو ركاتێكی نوێژدا دووپات دەبێتەوە، كە قورئانی مەزنە..

---

[1] ئەلبانی رەحمەتی لە كتێبی (أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم) كە سێ بەرگە، لە بەرگی یەكەمدا لە لاپەرە (٢٧٧ ـ ٢٩٢) توێژینەوەی لە هەموو ریوایەتەكان و بۆچوونی مەزهەبەكان كردووە ، ئینجا گەیشتۆتە ئەو بۆچوونەی خۆی..

[2] الالباني: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (١/٢٧٧ ـ ٢٩٢).

[3] نەسائی (١/١٤٦)، ترمزی (٢/١٩١)، ئەحمەد (٥/١١٤)، سەحیحە، بڕوانە: الالباني: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (١/٢٧٧ ـ ٢٩٢).

چەندین ریوایەت هەیە كە دەیفەرموو: نوێژ بە بێ خوێندنی سورەتی فاتیحە قبووڵ نیە.. ئەمەش هەندێكیانە:

١ ـ (كُلُّ صَلاةٍ لا يُقْرَأُ فِيهَا بِأُمِّ الْكِتَابِ فَهِيَ خِدَاجٌ هِيَ خِدَاجٌ هِيَ خِدَاجٌ، غَيْرُ تَمَامٍ)[١] واتە: هەر نوێژێك كە سورەتی فاتیحەی تێدا نەخوێندرێت ئەو نوێژە نوقسانە ئەو نوێژە نوقسانە ئەو نوێژە نوقسانە تەواو نیە.

٢ ـ (لا صَلاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ)[٢] واتە: بە هیچ شێوەیەك[٣] نوێژی كەس قبووڵ نابێت ئەگەر سورەتی فاتیحەی تێدا نەخوێنێت..

٣ ـ (لا تجْزِئ صَلاةٌ لا يَقْرَأُ الرَّجُلُ فيهَا بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ)[٤] واتە: نوێژێك كە كابرا سورەتی فاتیحەی تێدا نەخوێندبێت، قبووڵ نابێت..

٤ ـ سەیدنا ئەبو سەعیدی خودری خوا لێی رازی بێت دەڵێ: (أَمَرَنَا نَبِيُّنَا أَنْ نَقْرَأَ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَمَا تَيَسَّرَ)[٥] واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێ دەكردین كە (فاتحه الكتاب) بخوێنین، لەگەڵ ئەوەندەی تر لە قورئان كە دەتوانین.

---

[١] موسلیم (٤١)، ئەبوداوود (٨٢١)، نەسائی (٢/١٣٥)، ترمزی (٣١٢)، ئیبنوماجە (٨٣٨).

[٢] بوخاری (٢/١٩٠)، موسلیم (٢/٩،٨)، ئەبوداوود (١/١٣٠)، نەسائی (١/١٤٥)، ترمزی (٢/٢٥)، ئیبنوماجە (١/٢٧٦)، داریمی (٢/١٨٣)، دارەقوتنی (١٢٢) تەبەرانی: الصغیر (٤٢)، بەیهیقی (٢/٣٨) ئیمامی شافیعی (١/٩٣)،ئیمامی ئەحمەد (٥/٣١٤) ئەلبانی: الارواء (٣٠٢).

[٣] بۆیە بەو تەئكیدەوە تەرجەمەیم كردووە چونكە (لا) كە لای نافیە للجنسە.. كە نەفی قبووڵ بوونی هەموو جۆرە نوێژێك دەكات بە بێ خوێندنی سورەتی فاتیحە..

[٤] بوخاری (٢/١٩٠)، موسلیم (٢/٩)، ئەبو عەوانە (٢/١٢٤)، ئەلبانی: أصل صفة صلاة النبي صلی الله علیه و سلم (١/٣٠٠).

[٥] ئەبو داوود (١/١٣٠)، بەیهیقی (٢/٦٠)، ئیمامی ئەحمەد (٢/٩٧)، ئیبنو حەجەری عەسقەلانی لە تلخیص الحبیر( ٣/٣١٤) دا دەفەرموێ: أسناد صحیح ، ئیمامی نەوەوی لە: المجموع (٣/٣٢٩) دا دەفەرموێ: صحیح علی شرط البخاري و مسلم..

## روکنێتی خوێندنی سورەتی فاتیحە لە نوێژی جەماعەتدا

شەرعناسان لەم باسەدا سێ پۆلە بۆچوونن:

## یەکەم: ئەوانەی پێیان وایە کە فاتیحە لە نوێژی جەماعەتدا ناخوێندرێت:

ئیمامی ئەبوحەنیفەو هەندێك لە قوتابیانی پێیان وایە کە خوێندنی فاتیحە لە نوێژدا هەر فەرز نیە، خوێندنیشی لە نوێژی جەهری و پەنهانیدا بە مەئموومی نە فەرزە نە واجب، کابرا دەتوانێت لە جیاتی ئەوە سێ ئایەت لە سورەتێکی تر بخوێنێت، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِ﴾المزمل/٢٠ واتە: ئەوەندی لاتان ئاسان بوو قورئان بخوێنن.. کابرا ئەوەندی لا ئاسان بووەو تەواو!! فەرمووشیانە: خوێندنی خودی قورئانیش لەسەری فەرز نیە بۆیە دەتوانێت سوبحانەاللەو اللە اکبر و زیکری تر بکات.بە بەلگەی فەرموودەکەی سەیدنا ئیبنو ئەبی ئەوفا خوا لێی رازی بێت کە دەڵێ: (جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي لا أَسْتَطِيعُ أَنْ آخُذَ شَيْئًا مِنَ الْقُرْآنِ، فَعَلِّمْنِي مَا يُجْزِينِي ، فَقَالَ: قُلْ: سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلَا إِلَهَ إِلا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ وَلَا قُوَّةَ إِلا بِاللَّهِ)[١] واتە: کابرایەك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا من ناتوانم هیچ لە قورئان فێرببم، شتێکی ترم فێرکە جێم بۆ بگرێت، فەرمووی: بڵێ: پاك وبێ عەیبی بۆ خوا، سوپاس بۆ خوا، هیچ خوایەك

---

[١] ئەبو داوود (٨٣٢)، هەندێك لە فەرموودەوانان قسەیان لەسەر کردووەو بە زەعیفیان داناوە.. بەڵام شێخی ئەلبانی لە ارواء (٣٠٣) دا دەفەرموێ: حەسەنە..

نیە شایانی پەرستن بێت جگە لـە اللە، خـوا گەورەیـەو هـیچ دەسـەڵات و هیچ هێزێك نیە مەگەر ئەوەی خوا بە خواو لە خواوەیە..

لـەوەش کـەمترو ئاسـانتریان فـەرمووە: مـەئمووم لای ئـەمان نـە لـە نوێژی جەهریدا نە لە نوێژی پەنهانیدا هیچ ناخوێنێت[١]، با سەعاتێکیش لە دوای ئیمامەوە بێت! چونکە بـە لایانـەوە فاتیحـە خوێنـدنی ئیمـام بـۆ هەموانە.. بە بەڵگەی فەرموودەیەکی زەعیف، کە دەفەرموێ: (مَنْ كَانَ لَـهُ إِمَـامٌ فَقِرَاءَتُـهُ لَـهُ قِـرَاءَةٌ)[٢] واتـە: هـەر کەسـێك پێشـنوێژی هـەبوو، فاتیحـە خوێندنەکـەی ئـەو بـۆ ئـەمیش فاتیحـە خوێندنـە.. ئەمـە لـە هـەموو لایەکەوە ڕەت کراوەتەوە..

## دووەم: ئەوانەی پێیان وایە کە فاتیحە لە نوێژی جەماعەتدا دەبێت بخوێندرێت:

زۆرینەی شەرعناسانی ئیسلام لە مەزهەبی مالیکی و شافیعی و حەنبەلی و ئیبنو حەزم و بوخاری و قورتوبی، لەسەر ئەوەن کە مەئمووم دەبێت سورەتی فاتیحە لە نوێژی جەماعەتدا بخوێنێت، جا لە نوێژی جەهریدا بێت یان پەنهان جیاوازی نیە[٣] .. لە هاوچەرخانیش: بن بازو بن عوسێمین و زانایانی لیژنەی هەمیشەیی فەتواو ئیرشادی وڵاتی حیجاز[٤].. منیش شوێن کەوتووی ئەمەم.. بەڵگەش ئەو هەموو فەرموودەیە کە لە سەرەوە هەندێکمان هێناوەتەوە کە دەڵێن نوێژ بە بێ

---

[١] الشوكاني: نيل الاوطار (٢/٥٧٢).

[٢] ئیبنوماجە (٨٥٠)، ئیمامی ئەحمەد (١٤١١٦).

[٣] الشوكاني: نيل الاوطار (٢/٥٧٢)، ابن حزم: المحلى (٣/٢٣٦).

[٤] فتاوى اللجنة الدائمة (٦/٣٨٧،٣٨٦).

خوێندنی سورەتی فاتیحە دروست نیە. حوکمەکەش گشتیەو هەموو نوێژێك دەگرێتەوە..

ـ سەیدنا عوبادەی کوڕی سامیت خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە جارێك: (صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الصُّبْحَ، فَثَقُلَتْ عَلَيْهِ الْقِرَاءَةُ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: إِنِّي لَا أَرَاكُمْ تَقْرَءُونَ وَرَاءَ إِمَامِكُمْ. قَالَ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ؛ إِي وَاللَّهِ. قَالَ: فَلَا تَفْعَلُوا إِلَّا بِأُمِّ الْقُرْآنِ فَإِنَّهُ لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِهَا)[١] پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە نوێژی بەیانیدا پێشنوێژی دەکرد، کە قورئانی دەخوێند لێی قورس دەبوو، کە لە نوێژ بۆوە، فەرمووی: دەڵێی لە پشت ئیمامەکەی خۆتانەوە دەیلێنەوە؟! فەرموویان: بەڵێ قوربان بە هێواشی، فەرمووی: وا مەکەن، مەگەر یەکێکتان فاتیحەکەی بخوێنێت، چونکە نوێژی بێ فاتیحە دروست نیە..

تەنانەت لەم حاڵەتەشدا کە خوێندنی مەئموومەکان خوێندنی پێغەمبەری خوایان صلی الله علیه وسلم قورس و سەخت دەکرد، هەر نەیفەرموو مەیخوێنن.. کەوابوو خوێندنی سورەتی فاتیحە لە نوێژی فەرزو سووننەتدا بە تەنهاو لە جەماعەتدا فەرزە.. ئەم پۆلە شەرعناسە دەڵێن: لەگەڵ ئەوەشدا کە سەختییان بۆ خوێندنەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دروست کرد رێی لێ نەگرتن، چونکە خوێندنی سورەتی فاتیحە بۆ مەئموومیش فەرزە..

---

[١] ئەبوداوود (١٣١/١)، ترمزی (١١٦/٢)، ئیمامی ئەحمەد (٣١٣/٥) دارەقوتنی (١٢٠) بەیهیقی (١٦٤/٢)، تەحاوی (١٣٧/١).. ئەلبانی: سەحیحە (أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٣٣٧/١).

## سێیەم: ئەوانەی پێیان وایە کە فاتیحە لە نوێژی جەهری جەماعەتدا ناخوێندرێت:

هەندێك لە شەرعناسان پێیان وایە مەئموم لە نوێژی جەهریدا فاتیحە ناخوێنێت، چونکە ئیمام بە دەنگی بەرز دەیخوێنێت.. ئەمەش بۆچوونی ئیمامی زوهری و ئیسحاق و عبداللەی کوڕی موبارەك و قەولێکی ئیمامی ئەحمەدەو[١] ئیختیاری ئیبنوتەیمییەیە[٢]، لە هاوچەرخانیش بۆچوونی شێخی ئەلبانی[٣] و سەید سابق[٤] و ئەبوبەکری جەزائیریە[٥]..

شێخی ئەلبانی رحمەالله لەگەڵ توێژینەوەی ووردەکارانەی بەڵگەی هەموو لایەك و ئیعتیراف بە بەهێزی بەڵگەی جمهور کردووە، بە تایبەتی قەولی ئیمامی شافیعی کە دەرهەقی دەڵێ: (ڕاسترینی ئەم سێ بۆچوونە کە لە هەموان نزیکتر بێت لە هەقەوە، قەولی ئیمامی شافیعیە ڕەحمەتی خوای لێ بێت، لە قەولە قەدیمیەکەیدا)[٦] کەچی پێی وایە خوێندنی فاتیحە لە لایەن مەئموومەوە لە نوێژی جەهریدا نەسخ بۆتەوە..

شێخ بن باز رحمە الله لە سەرخستنی رای جمهوردا دەڵێ[٧]: مەئموم هەر دەبێت سورەتی فاتیحەکەی بخوێنێت، ئیتر نوێژەکە جەهری بێت یان

---

[١] نيل الاوطار (٢/٥٧٢).
[٢] ابن تيمية: مجموع الفتاوى (٢/١٤)
[٣] إرواء الغليل (٢/٢٨٢-٢٨٣).
[٤] سيد سابق: فقه السنة (١/١٥٩).
[٥] ابوبكر الجزائري: منهاج المسلم (ل ١٩٤).
[٦] أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (١/٣٣٢) قەولەکەی ئیمامی شافیعی لە ئیمامی ئەبو ئیسحاقی شیرازیەوە وەرگرتووە لە: المهذب (٢/٣١٣).
[٧] عبدالعزيز بن باز،: مجموع فتاوى ومقالات متنوعة (١١ /٢١٧).

پەنهان جیاوازی نیە، دەبێت دوای خوێندنی ئیمام، لەو بێدەنگیەیدا ئەمیش بیخوێنێت، ئەگەر نا لەگەڵ قورئان خوێندنەکەی ئەودا بیخوێنێت.. چونکە فەرموودەکەی عوبادەی کوڕی سامیت راشکاوانە دەڵێ کە لەگەڵ قورئان خوێندنی ئیمامەکەدا لەگەڵی ناخوێندرێت، یەعنی ئایەتی سورەتی تر ناخوێندرێت، رێ لە خوێندنی فاتیحەکە ناگرێت کە لەسەر مەئمووم فەرزە بیخوێنێت.. ئەوەی کە هەندێك لە ئەهلی عیلم فەرموویانە: فاتیحە خوێندنی ئیمام بۆ مەئموومیشە کە گوایە پشتیان بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیە بەستووە کە دەفەرموێ: (مَنْ كَانَ لَهُ إِمَامٌ فَقِرَاءَتُهُ لَهُ قِرَاءَةٌ)[١] واتە: هەر کەسێك پێشنوێژی هەبوو، فاتیحە خوێندنەکەی ئەو بۆ ئەمیش فاتیحە خوێندنە.. چونکە ئەم فەرموودەیە زەعیفە حوکم دەگەڕێتەوە لای بەڵگە بەهێزەکان کە دەڵێن دەبێت بیخوێنێت زەعیفیش نەبوایە، دەبوو بۆ پێکەوە گونجاندنی فەرموودەکان بووترایە: مەبەست لە غەیری سورەتی فاتیحەیە.. ئەوەش کە هەندێکی تریان فەرموویانە: بەڵگەمان ئەو ئایەتەیە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾ الاعراف/٢٠٤ واتە: کاتێك قورئان دەخوێندرێت بێ دەنگ گوێی لێ بگرن تا بکەونە بەر بەزەیی.. ئەوە بۆ قورئان خوێندنی گشتیەو تایبەت ناکرێت بە خوێندنی سورەتی فاتیحەوە لە نوێژدا..

بەڵام ئەگەر مەئموومێك ئەو حوکمەی نەدەزانی و فاتیحەکەی نەخوێند، یان بیری چوو بیخوێنێت، یان فریای خوێندنی نەکەوت و ئیمام چووە رکووع و ئەمیش فریای نییەتهێنان کەوت و چووە رکووع،

---

[١] ئیبنوماجە (٨٥٠)، ئیمامی ئەحمەد (١٤١١٦).

ركاتەكەی دروستەو نوێژەكەی تەواوە.. چونكە فەرموودەكەی ئەبوبەكرەی سەقەفی خوا لێی رازی بێت سەحیحە كە فەرموویەتی: (أنّه أدْرَكَ النّبيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم رَاكِعاً فرَكَعَ دُونَ الصَّفِّ، ثمَّ دَخلَ فِي الصَّفِّ، فقَالَ لَهُ النّبيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم: زَادَكَ اللهُ حِرْصاً وَلا تعُدْ..وَلَمْ يَأمُرْهُ بقَضَاءِ الرَّكْعَةِ)[1] واتە: فریای ركووع كەوت لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم، خێرا پێش ئەوەی بگاتە ریزەكە چووە ركوع، پاشان چووە ریزەكەوە، كە نوێژ تەواو بوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: خوای گەورە زیاتر سوورت كات، بەڵام وا مەكەرەوە.. فەرمانیشی پێ نەدا كە ركاتەكەی بكاتەوە..

شێخ ئیبنوعوسێمین رحمەالله دەڵێ: ئەگەر پێشنوێژەكە لە نێوان سورەتی فاتحەو سورەتی تردا كە دەیخوێنێت بواری نەدا مەئموومەكان فاتیحەكەیان بخوێنن، دەتوانن بە هێواشی لەگەڵ قورئان خوێندنەكەی ئەودا بیخوێنن.. ئەگەر دەشیانزانی وایە دەتوانن لەو كاتەی ئیمامەكە فاتیحە دەخوێنێت، ئەمانیش لەگەڵیدا بیخوێنن[2]..

---

[1] بوخاری (٧٨٣).

[2] ابن عثيمين: فتاوى أركان الاسلام (ل ٣٢٣).

**روكنەكانی نوێژ**

# روكنی چوارەم و پێنجەم

# ركوع و سرەوتنی لەش تێیدا

شەرعناسان لەسەر ئەوە كۆن كە چەمانەوە (ركوع)ی دوای خوێندنی فاتیحە لە نوێژدا روكنی ركاتی هەموو نوێژێكە[1]. بەلگەشیان:

١ ـ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرْكَعُواْ وَٱسْجُدُواْ﴾ الحج/٧٧ واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ركوع وسوجدە ببەن.

٢ ـ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە كابرای خاوەن نوێژەهەڵەكەی فەرموو: (ثمَّ يُكَبِّرَ فيَرْكَعَ، فيَضَعَ كَفَّيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ حَتَّى تطْمَئِنَّ مَفَاصِلهُ وَتسْترْخِيَ)[2] واتە: پاشان تەكبیر دەكات ودەچێتە ركووع، هەردوو لەپی دەستی دەخاتە سەر ئەژنۆی ودەمێنێتەوە تا جومگەكانی دەسرەون و هێدی دەبنەوە..

٣ ـ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەردەوام لە هەموو ركاتی هەموو نوێژێكیدا چۆتە ركوع وياوەران بينيويانە.. فەرمووشيەتی: (صَلُّوا كَمَا رَأَيْتمُونِي أُصَلِّي)[3] واتە: نوێژ وا بكەن وەكو كە من دەبينن نوێژ دەكەم..

---

[1] ابن حزم: مراتب الاجماع (ل ٢٦).
[2] پەڕاوێزی (٧٤ و ٧٥).
[3] بوخاری (٥٩٥).

## چۆنیەتی رکووع:

شەرعناسان فەرموویانە بڕی چەمانەوەی رکووع ئەوەندەیە کە دەستی بگاتە سەر کەلکەی ئەژنۆی، هەندێکی تر فەرموویانە ئەوەندە بچەمێتەوە کە لە چەمانەوە نزیکتر بێت وەك لە بە پێوە بوون.. پەنجەکانی دەستی وا بەسەر ئەژنۆیدا بلاوکاتەوە وەکو کە چنگی پێدا کردبێت.

ـ موسعەبی کوڕی سەعد دەڵێ: (صَلَّيْتُ الَى جَنْبِ أبي، فَطَبَّقْتُ بَينَ كَفَّي، ثمَّ وَضَعْتهُمَا بَينَ فخِذَيَّ، فنهَاني أبي وَقَالَ: كُنَّا نَفْعَلُهُ، فَنهِينَا عَنْهُ، وَأُمِرْنَا أنْ نَضَعَ أيْدِينَا عَلَى الرُّكَب)[١] واتە: نوێژم لە تەنیشت باوکمەوە کرد، کە چووینە رکووع، پەنجەی هەردوو دەستم تێکپەڕاندو دەستم خستە ناودەستم و خستمنە نێوان رانەکانم، کە لە نوێژەکە بووینەوە فەرمووی: کاتی خۆی ئێمەش وامان دەکرد بەلام بەرهەڵستیمان لێکرا، فەرمانمان پێکرا کە لەپی دەستمان بخەینە سەر ئەژنۆکانمان..

ـ ریوایەتی سەحیحی سەیدنا وائیلی کوڕی حوجر خوا لێی رازی بێت لە وەسفی چۆنیەتی دەست دانانی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم لەسەر ئەژنۆی دەفەرموێ: (وَكَانَ يُمَكّنُ يَدَيهِ مِنْ رُكْبَتَيهِ، كَأنَّهُ قَابِضٌ عَلَيهِمَا)[٢] واتە: هەردوو دەستی لە هەردوو ئەژنۆی قایم دەکرد، وەك ئەوەی چنگی پێداکردبن و گرتبنی..

---

[١] بوخاری (٢١٧/٢)، موسلیم (٦٩/٢). ئەبوداوود (١٣٨/١).

[٢] شێخی ئەلبانی دەفەرموێ: ئەمە لە فەرموودەی ئەبو حومەیدەوەیە کە دە لە یاوەرانی پێغەمبەری خواوە گێڕراوەتەوە.. (أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٦٣١/٢)).

ـ لە فەرمودەکەی سەیدنا وائیلی کوڕی حوجردا خوا لێی رازی بێت هاتووە کە کە پەنجەکانیشی بەسەر کەڵکەی ئەژنۆکانیدا بڵاو دەکردنەوە: (كَانَ إِذَا رَكَعَ فَرَّجَ بَينَ أَصَابِعِهِ)[١]..

ـ لەو کاتەی چنگی لەسەر کەڵکەی ئەژنۆیەتی و پشتی راست راگرتووە ئانیشکەکانی لە لەشی دوور دەخاتەوە، وەك ئەوەی باڵ فش بکاتەوە نەك قۆڵی بە لەشیەوە بنوسێنێت.. لە فەرموودەکەی سەیدنا وائیلی کوڕی سەعددا خوا لێی رازی بێت هاتووە: (وَوَضَعَ كَفَّيهِ وَجَافَى)[٢] واتە: لەپی دەستەکانی لەسەر ئەژنۆکانی دادەناو ئانیشکەکانی دوور دەخستنەوە..

ئەمە لە رکوع و سوجدەدا هەر وایەو بۆ ژن و پیاویش جیاوازی نیە، بەڵگەی حەنەفیەکان و ئەو شەرعناسە شافیعیانە زەعیفە کە فەرموویانە: ژن دەبێت لە رکوع وسوجدەیدا قۆڵ وباڵی بە جەستیەوە بنوسێنێت.. ئیمامی ئیبنو حەجەری عەسقەلانی دوای ئەوەی ئەو فەرموودانەی رەت کردۆتەوە کە ئەوان پشتیان پێ بەستووە (کە

---

[١] بەیهیقی (١١٢/٢)، الحاكم (٢٢٤/١) دەشفەرموێ: بە پێی مەرجی موسلیم سەحیحە و زەهەبیش فەرموویەتی: وایە و ئەلبانیش فەرموویەتی وەکو هەردووکیان فەرموویانە، وایە.. أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٦٣٢/٢)

[٢] ئیمامی ئەحمەد (٣١٦/٤) لە رێی شوعبەی کوڕی عاسمەوە کە دەفەرموێ: باوکم فەرمووی: بە پێی مەرجەکانی موسلیم سەنەدەکەی سەحیحە.. ابن حجر: تلخيص الحبير (٣٨١/٣)، ترمزی دەفەرموێ: ئەهلی عیلم ئەمەیان ئیختیار کردووە کە لە رکووع و سوجدەدا دەبێت باڵ و قۆڵی لە جەستەی دوورخاتەوە، شێخی ئەلبانی دەفەرموێ: تەحاوی (١٣٥/١) کۆڕای موسوڵمانانی لەسەر نەقڵ کردووە، نەوەویش فەرموویەتی: وانازانم لە بەچاك وەرگرتنیدا راجوێیی لە نێوان شەرعناساندا هەبێت، ئەلبانی: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٦٣٦/٢).

مورسەلێکی ئەبوداوودو مەتروکێکی ترمزیە) فەرموویەتی: هیچ فەرموودەیەکی مەقبوول لەم بارەوە نەسەلمێنراوە[١].

## رێك راگرتنی پشت:

کە چووە رکووع دەبێت پشتی لەگەڵ پشتی ملی رێك کات، واتە لە پشت سەریەوە تا سمتی لە یەك ئاستدا بن (بێ گومان بۆ ئەو کەسەی دەتوانێت)، چونکە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم وای دەکرد، تەنانەت ئەگەر دڵۆپە ئاو لەسەر پشتی دانرایە لە هیچ لایەکەوە نەدەتکایە خوارەوە: (وَكَانَ إِذَا رَكَعَ بَسَطَ ظَهْرَهُ وَسَوَّاهُ، حَتَّى لَوْ صَبَّ عَلَيْهِ المَاءَ لَاسْتَقَرَّ)[٢] واتە: کە دەچووە رکووع پشتی درێژو رێك دەکردەوەو، تەنانەت ئەگەر ئاو بکرایە سەر پشتی قەتیس دەما..

## مانەوەی لە رکووعدا:

سەلمێنراوە کە رکوع و هەستانەوەی دوای ئەوو سوجدەو مانەوەی نێوانی دوو سوجدەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم بەقەدەر یەك بوون، هەر یەکەیان بە قەدەر خوێندنی زیکری رکووع بوو[٣]..

---

[١] ابن حجر: التلخيص الحبير (٣٨١/٣) لە (أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٦٣٧/٢) وەرگیراوە..

[٢] شێخی ئەلبانی بە دوای پێنج ریوایەتیدا چۆتەوەو لە هەر یەکەیان هۆکارێکی زەعیف کردنی لێ دۆزیوەتەوە، بەڵام لە کۆتاییدا دەفەرموێ: الحديث بمجموع الطرق صحيح ثابت.. (أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٦٣٨/٢).

[٣] بوخاری (٢١٩/٢)، موسلیم (٤٥/٢)..

**ئەمما سرەوتنی لەش:**

لەبەر ئەوەیە كە لەو فەرموودەی خاوەن نوێژە هەڵەكەدا فەرمووی (حَتى تطْمَئِنَّ مَفَاصِلُهُ وَتسْترْخِيَ) تا جومگەكانی دەسرەون و هێدی دەبنەوە..

ـ دیسان لەبەر ئەو فەرموودەیەی كە دەفەرمویٚ: (لَا تجْزِئُ صَلَاةٌ لا يُقِيمُ الرَّجُلُ فيهَا صُلْبَهُ فِي الرُّكوعِ و السُّجُودِ)[1] واتە: ئەو نوێژە جێ ناگرێت كە خاوەنەكەی لە ركوع و سوجدەدا نەسرەوێت و لەشی تێیاندا هێدی نەبێتەوە. ئەمەش روكنی نوێژە بە پێچەوانەی بۆچوونی ئیمامی ئەبو حەنیفەوە[2] كە لەگەڵ زۆرینەی شەریعەتناساندا یەك ناگرێتەوە..

سرەوتن وهێدبوونەوەی لەش بەوە دێتەدی كە هەر یەك لە جومگەكان لە جووڵە بكەون، ئەمەش لەو فەرمانەدا دیارە كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە خاوەن نوێژەهەڵەكەی فەرموو: (ثمَّ يُكَبِّرَ فيَرْكَعَ، فيَضَعَ كَفَّيْهِ عَلَى رُكْبَتيْهِ حَتى تطْمَئِنَّ مَفَاصِلُهُ وَتسْترْخِيَ)[3] واتە: پاشان تەكبیر دەكات و دەچێتە ركووع، هەردوو لەپی دەستی دەخاتە سەر ئەژنۆی و دەمێنێتەوە تا جومگەكانی دەسرەون و هێدی دەبنەوە..

ماوەی ئەمەش ئەوەندەیە تا زیكری ركوع دەخوێنێت..

---

[1] نەسائی (٢/١٨٣)، ترمزی (٢٦٤)، ئەبوداوود (٨٤٠) ئیبنوماجە (٨٧٠). سەحیحە : صحيح فقه السنة (١/٣٢١).

[2] المبسوط (١/٢١)، المدونة (١/٧١)، المجموع (٣/٤٠٧)، المغني (١/٣٦٠).

[3] پەراوێزی (٧٤ و ٧٥).

**روکنەکانی نوێژ**

## روکنی شەشەم و حەوتەم

## هەستانەوە لە رکوع و سرەوتنی لەش تێیدا

لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە خاوەن نوێژە هەڵەکەی فەرموو: (ثُمَّ يَقُولُ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، وَيَسْتَوِيَ قَائِمًا حَتَّى يَأْخُذَ كُلُّ عُضْوٍ مَأْخَذَهُ، وَيُقِيمَ صُلْبَهُ)[١] سەری لە رکوع بەرز دەکاتەوەو دەڵێ: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) واتە: خوای گەورە سوپاسی ئەو کەسە دەبیستێت کە ستایشی دەکات.. بە پێوە دەوەستێت قامەتیشی بە تەواوی راست دەکاتەوە..

ـ هەروەها لە فەرموودەکەی سەیدنا ئەبو حەمیدی ساعدیدا خوا لێی رازی بێت هاتووە کە لە وەسفی نوێژی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (فَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ اسْتَوَى قَائِمًا حَتَّى يَعُودَ كُلُّ فَقَارٍ مَكَانَهُ)[٢] واتە کە سەری بەرز دەکردەوە رێك رادەوەستاو دەسرەوت تا هەموو برِگەکانی برِبرِەی پشتی دەگەرِانەوە جێی خۆیان[٣]..

★ ★ ★

---

[١] پەراوێزی (٧٤ و ٧٥).
[٢] بوخاری (٨٣٦)، صحيح أبى داود (١٧٢).
[٣] فتح البارى (٢/٣٠٨).

**روكنەكانی نوێژ**

## روكنی هەشتەم و نۆیەم

## سوجدە بردن و سرەوتنی لەش تێیدا

دووجار سوجدە بردن، لە هەر ركاتێكی نوێژدا لە روكنەكانی نوێژە، ئەمەش كۆڕای شەرعناسانی لەسەرە، بەڵگەشیان:

١ ـ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱرْكَعُوا۟ وَٱسْجُدُوا۟﴾ الحج/٧٧ واتە: ئەوی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە ركوع و سوجدە ببەن..

٢ ـ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە كابرای خاوەن نوێژەهەڵەكەی فەرموو: (ثمَّ يُكَبِّرَ فيَسْجُدَ، وَيُمَكِّنَ جَبْهَتَهُ مِنَ الأرْضِ حَتّى تطْمَئِنَّ مَفَاصِلُهُ وَتسْترْخِيَ)[١] واتە: پاشان تەكبیر دەكات و دەچێتە سوجدە، ناوچەوانی بە تەواوی دەخاتە سەر زەوی، ئاوا دەمێنێتەوە تا هەموو جومگەكانی لە جووڵە دەكەون و جەستەی دەسرەوێت..

٣ ـ هەروەها لە فەرموودەی سەحیحدا فەرموویەتی: (لَا تجْزِئ صَلَاةٌ لا يُقِيمُ الرَّجُلُ فيهَا صُلْبَهُ في الرُّكوعِ و السُّجُودِ)[٢] واتە: ئەو نوێژە جێ ناگرێت كە خاوەنەكەی لە ركوع و سوجدەدا نەسرەوێت و لەشی تێیاندا هێدی نەبێتەوە.

---

[١] پەراوێزی (٧٤ و ٧٥).

[٢] نەسائی (١٨٣/٢)، ترمزی (٢٦٤)، ئەبوداوود (٨٤٠) ئیبنوماجە (٨٧٠). سەحیحە : صحیح فقه السنة (٣٢١/١).

٤ـ فەرموودەی سەحیحی ترە کە دەفەرمویٚ: (لا صَلَاةَ لِمَنْ لا يُصِيبُ أَنْفَهُ مِنْ الأَرْضِ مَا يُصِيبُ جَبِينَهُ)[1] واتە: ئەو کەسە نویٚژەکەی گیرا نابێت ئەگەر لووتی بەو شێوەیە بەر زەوی نەکەوێت وەکو کە ناوچەوانی بەر زەوی دەکەوێت..

٥ـ هەروەها پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە فەرموودەی سەحیحی تردا دەفەرمویٚ (أَقِيمُوا الرُّكُوع والسُّجُودَ، فَوَاللهِ إِنِّي لَأَرَاكُمْ مِنْ بَعْدِ ظَهْرِي إِذَا رَكَعْتُمْ وَسَجَدْتُمْ)[2] واتە: رکووع و سوجدەکانتان بە تەواوی ببەن، بەوەی گیانی منی بەدەستە کاتێك رکووع و سوجدە دەبەن من لە پشتەوە دەتانبینم..

سوجدە دەبێت لەسەر حەوت ئەندامی لەش بێت، کە بریتین لە: هەردوو لەپی دەست، هەردوو کەڵکەی ئەژنۆ، هەردوو پیٚ، ناوچەوان و لووتیش پێکەوە.. چونکە فەرموودەی سەیدنا ئیبنوعەبباس خوا لێی رازی بێت دەڵێ: (أُمِرْنَا أَنْ نَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةِ أَعْظُمٍ: عَلَى الْجَبْهَةِ (وَأَشَارَ بِيَدِهِ عَلَى أَنْفِهِ) وَالْيَدَيْنِ (لە لەفزێکی تردا: الْكَفَّيْنِ)، والرُّكْبَتَيْنِ، وَأَطْرَافِ الْقَدَمَيْنِ، وَلا نَكْفِتَ الثِّيابَ و الشَّعْرَ)[3] واتە: فەرمانمان پیٚ کراوە کە سوجدە بە حەوت ئەندامی بەدەنمان ببەین: ناوچەوان (ئاماژەشی بۆ لووتی کرد)، هەردوو دەست (یان هەردوو لەپی دەست)، هەردوو ئەژنۆ، قەراغەکانی هەردوو پیٚ، ناشبێت جلوبەرگ یان قژمان بکەوێتە ژێریانەوە.. یەعنی ناوچەوان و لەپی دەستەکان بە رووتی بەر زەویەکە بکەون، بۆ ئەوەی

---

[1] دارەقوتنی (٣٤٨/١) شێخی ئەلبانی بە سەحیحی داناوە: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (ل ١٤٢).

[2] بوخاری (٤١٨)، موسلیم (٤٢٤).

[3] بوخاری (٨١٢)، موسلیم (٤٩٠).

زەلیلی و بەندایەتی زیاتری پێوە دیار بێت، نەك لووت بەرزیی و هەڕاڵیی..

## چۆنیەتی چوونە سوجدە:

هەرچەندە خەڵكێك بە غەریب و نامۆی دەزانێت كە لە چوونە سوجدەدا دەستەكان پێش ئەژنۆ بخرێتە سەر زەوی، چونكە هەر وا زانراوە كە نوێژخوێن سەرەتا دێتە سەر چۆك (ئەژنۆ) ئینجا لەپی دەستەكانی دادەنێت، شێخی ئەلبانی بە هەموو سەنەدەكاندا چۆتەوە و گەیشتۆتە ئەوەی كە ئەو ریوایەتانەی ئەم چۆنیەتیە باس دەكەن زەعیفن، منیش ئەوەی شێخی ئەلبانیم پێ بەهێزترە..[1]:

١ـ (وَ كَانَ يَضَعُ يَدَيهِ عَلَى الأَرْضِ قَبْلَ رُكْبَتيهِ)[2] واتە: دەستەكانی پێش هەردوو ئەژنۆی دەخستە سەر زەوی..

٢ ـ (إِذَا سَجَدَ أَحَدُكُمْ فَلا يَبْرُكْ كَمَا يَبْرُكُ الْبَعِيرُ، وَلْيَضَعَ يَدَيهِ قَبْلَ رُكْبَتيهِ)[3] واتە: ئەگەر یەكێكتان سوجدەی برد با وا نەچێتە سەر زەوی وەكو كە حوشتر دەچێت، با دەستەكانی پێش هەردوو ئەژنۆی دابنێت..

---

[1] أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٢/٧١٤-٧١٩)، الارواء (٣١٣).

[2] ئیبنوخوزەیمە (١/٣١٨) بە سەحیحی ناساندووە وەكو ئیبنو حەجەر دەفەرموێ: بلوغ المرام (١/٢٦٣)، دارەقوتنی (١٣١)، تەحاوی لە شرح المعاني (١/١٤٩)، حاكم (١/٢٢٦)، بەیهیقی (٢/١٠٠)، حاكم دەفەرموێ: بە پێی مەرجی موسلیم سەحیحە، زەهەبیش لایەنگرێتی و شێخی ئەلبانیش دەفەرموێ: وەكو فەرموویانە، هەر وایە..

[3] ئەبوداوود (١/١٣٤)، ئیبنوحەزم (٤/١٢٨)، نەسائی (١/١٦٥)، داریمی (١/٣٠٣)، بەیهیقی (٢/٩٩) ئیمامی ئەحمەد (٢/٣٨١). ریوایەتی دارقوتنی و نەسائی دەڵێن: (فَلْيَضَعْ يَدَيهِ قَبْلَ رُكْبَتيهِ، وَلَيَبْرُكْ بُرُوكَ الْبَعِيرِ).. ئەمەش سەنەدی سەحیحە وەكو ئیمامی نەوەوی لە المجموع (٣/٤٢١) و زورقانی لە شرح المواهب (٧/٣٢٠) دا فەرموویانە، شێخی ئەلبانیش هەر حوكمی سەحیحی داوە لە الارواء (٣٥٧) و صحيح سنن أبي داود (٧٨٩) ، تمام المنة (ل ١٩٣).

### چۆنیەتی سوجدە:

١ ـ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: (إنَّ اليَدَينِ تسْجُدَانِ كمَا يَسْجُدُ الْوَجْهُ فأذَا وَضعَ أحَدُكُمْ وَجْهَهُ فلْيَضعْ يَدَيهِ، وَإذَا رَفعَ فلْيَرْفعْهُمَا)[١] واتە: دەستەكانیش سوجدە دەبەن وەكو كە روو (دەموچاو) سوجدە دەبات، جا هەر كەسێكیتان سەری خستە سەر زەوی با دەستەكانیشی بخاتە سەری، ئەگەر سەری بەرز كردەوە با دەستەكانیشی بەرز كاتەوە.. ئاشكرایە كە مەبەستی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە دەستەكان لەپی دەستەكانە..

٢ ـ سەیدنا بەرائی كوڕی عازیب خوا لێی رازی بێت كە وەسفی چۆنیەتی سوجدە بردنی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەكات دەڵێ: (كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ يَسْجُدُ عَلَى أَلْيَتَي[٢] الْكَفِّ)[٣] واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم كە دەچووە سوجدە كۆتایی لەپی دەستەكانی دادەنا ئینجا هەموو لەپی..

---

[١] ئەبوداوود (١٤٢/١)، ئیمامی ئەحمەد (٦/٢)، نەسائی (١٦٥/١)، ئیبنوخوزەیمە (٣٢٠/١)، حاكم (٢٢٦/١)، بەیهیقی (١٠١/٢)، حاكم دەفەرموێ: بە پێی مەرجەكانی بوخاری موسلیم سەحیحە، زەهەبیش لایەنگرێتی و ئەلبانی دەفەرموێ: إسناده صحيح.. (أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٢/ ٧٢٥).

[٢] أَلْيَة: سمتە، كە دەوترێت أَلْيَتيه، یەعنی هەردوو سمتی، مەبەستی سەیدنا بەراء ئەوەیە كە ئەو بەشە گۆشتنەی لەپی دەستی لە پێشدا دادەنایە زەوی كە بە مەچەكەوە نوساون، كە وەكو سمت وان..

[٣] حاكم (٢٢٧/١)، بەیهیقی (١٠٧/٢)، ئیمامی ئەحمەد (٢٩٥/٤)، حاكم دەفەرموێ بە پێی مەرجی بوخاری موسلیم سەحیحەو زەهەبیش لایەنگیریی بووە، بەڵام شێخی ئەلبانی دەفەرموێ: بە پێی مەرجەكانی موسلیم سەحیحە نەك مەرجی هەردووكیان چونكە لە سنەدەكەدا حوسەینی كوڕی واقید هەیە كە بوخاری فەرموودەی موعەللەقی لێوە گێڕاوەتەوە، نەك سەحیح!! ئەم زەنگیانە بژێرییە قابیلی شێخی ئەلبانی رەحمەتیە..

٣ ـ (كَانَ يَعْتَمِدُ عَلَى كَفَّيهِ ﴿وَيَبْسُطُهُمَا﴾ وَيَضُمُّ أَصَابِعَهُمَا، وَيُوَجِّهُهَا قِبَلَ القِبْلَةِ)[1] واتە:: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە چوونە سوجدەیدا ئیعتیمادی دەکردە سەر لەپی دەستەکانی، پەنجەکانی ڕووەو قیبلە جووت دەکردن و لەپە دەستەکانی پانەوپان دەخستنە سەر زەوی..

٤ ـ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کە پەنجەکانی دەستی لە سەر زەوی دادەنا، دەیگەیاندنە ئاستی شانەکانی، جاری واش هەبوو دەیگەیاندنە ئاستی گوێچکەکانی: (وَكَانَ يَجْعَلُهُمَا حَذْوَ مَنْكِبَيهِ[2]، وَأَحْيَاناً حَذْوَ أُذُنَيهِ)[3].

٥ ـ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کە لە سوجدەدا دەبوو، ئانیشکی نەدەخستە سەر زەوی، ئەوەندی لە زەویەکەوە بەرز دەکردنەوە کە لە دواوە بن باڵی دەردەکەوتن، بەرهەڵستی لەوە دەکرد کە بازووەکانیان بخەنە سەر زەوی، وەکو لە فەرموودەکەی سەیدنا ئەبو حەمیدی ساعدیدا خوا لێی ڕازی بێت هاتووە: (كَانَ لا يَفْتَرِشُ ذِرَاعَيهِ، بَلْ كَانَ يَرْفَعُهُمَا عَنْ الأَرْضِ وَيُبَاعِدُهُمَا عَنْ جَنْبَيهِ حَتَّى يَبْدُو بَيَاضُ إِبْطَيهِ

---

[1] شێخی ئەلبانی لە (أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٢/ ٧٣٩) دا دەفەرموێ: وسنده صحيح كما في الدراية (٧٩) مەبەستی لە کتێبی (الدراية في تخريج أحاديث الهداية) کە ئیمامی ئیبنوحەجەر کردوێتی، الهداية کتێبێکی بەناوبانگی حەنەفیەو لە بەربڵاوی و کاریگەرییدا وەکو مغني المحتاج ی شافیعیەکانە..

[2] شێخی ئەلبانی بە سەحیحی داناوە (الارواء (٣٠٩) دەشفەرموێ کە ئەبوداوود و ترمزی بە سەحیحیان داناوە، هەروەها ئیبنول مولەققین (٢/٨٢/١).

[3] بەیهیقی (١١٢/٢)، تەحاوی (١٥١/١)، ئیمامی ئەحمەد (٣١٧/٤)، الالبانی (أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٢/ ٧٣٩).

مِنْ وَرَائِهِ١، وَحَتَّى لَو أَنَّ بَهْمَةً أَرَادَتْ أَنْ تَمُرَّ تَحْتَ يَدَيهِ مَرَّتْ)[٢] واته: بازووەکانی لەسەر زەوی ڕانەدەخست، بەڵکو لە ئاستی زەوی بەرزی دەکردنەوە، تا لە دوایەوە سپێتی بن باڵی دەردەکەوت، تەنانەت ئەوەندەی ئانیشك و بازووی بەرز دەکردەوە کە ئەگەر بەرخۆلەیەك یان کاریلەیەکی بە بندا بڕۆیشتوایە دەیتوانی..

ـ وەك بەرهەڵستی لە ڕاخستنی ئانیشك و بازووەکانیش دەیفەرموو: (لا يَبْسُطُ أَحَدُكُمْ ذِرَاعَيهِ انبسَاطَ الْكَلْب)[٣] واته: کەستان بازووەکانی لەسەر زەوی ڕانەخات وەکو کە سەگ دەیکات..

٦ ـ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کە دوای ئەوەی بەو شێوەیە سوجدەی دەبرد، دەست و پەنجەی دەخستە سەر زەوی، ئینجا ناوچەوان و لووتی لە زەوی قایم دەکرد، وەکو فەرموودەکەی ئەبو حەمیدی ساعیدی دەڵێ: (وَكَانَ يُمَكِّنُ أَنْفَهُ وَجَبْهَتَهُ مِنْ الأَرْضِ)[٤] واته: لووت و ناوچەوانی لە زەوی قایم دەکرد..

---

[١] بوخاری (٢٣٤/٢)، موسلیم (٥٣/٢)، نەسائی (١٦٦/١)، بەیهیقی (١١٤/٢)، ئیمامی ئەحمەد (٣٤٥/٥)..

[٢] ئەمەیان ڕیوایەتی خاتوو مەیموونە خانی کچی حارسی خێزانێتی خوا لێی ڕازی بێت موسلیم (٥٣/٢)، ئەبوداوود (١٤٣/١)، نەسائی (١٦٦/١)، داریمی (٣٠٦/١)، ئیبنوماجە (٢٨٧/١)، بەیهیقی (١١٤/٢).

[٣] بوخاری (٢٤٠/٢)، موسلیم (٥٣/٢)، ئەبوداوود (١٤٣/١)، ترمزی (٦٦/٢)، نەسائی (١٦٧/١)، داریمی (٣٠٣/١).

[٤] ترمزی (٥٩/٢) و بە سەحیحیشی ناساندووە، ئەبوداوود (١١٧/١)، تەحاوی (١٥١/١) شێخی ئەلبانی: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٢/ ٧٣١)..

ـ هەروەها: (لا صَلاةَ لِمَنْ لا يُصِيبُ أنْفَهُ مِنْ الأرْضِ مَا يُصِيبُ الجَبينَ)[1] واتە: نوێژی ئەو کەسە قبوولْ نیە کە وەکو کە ناوچەوانی خستۆتە سەر زەوی و پێوەی چەسپاندووە، لووتیشی نەخاتە سەری و پێوەی نەچەسپێنێت..

٧ ـ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سوجدەی دەبرد، هەردوو ئەژنۆی لەسەر زەوی دەبوون، هەردوو پێیەکانی هەڵدەناو پەنجەکانی روویان لە قیبلە دەبوو: (كَانَ يُمَكِّنُ أيْضاً رُكْبَتيهِ وأطْرَافَ قَدَمَيهِ، وَيَسْتَقْبِلُ بأطْرَافِ أصَابعِهَا القِبْلَةَ، وَيَنْصِبُ رِجْلَيهِ)[2]..

★ ★ ★

---

[1] دارەقوتنی (١٣٣)، بەیهیقی (١٠٤/٢٠)، حاکم (٢٧٠/١) و فەرموویەتی بە پێی مەرجەکانی بوخاری سەحیحە، زەهەبیش لایەنگیری کردووە، شێخی ئەلبانیش دەفەرموێ: هەر وایە وەکو فەرموویانە، سەنەدەکەی سەحیحە. أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٧٣١/٢)..

[2] بوخاری (٢٤٥/٢)، ئەبوداوود (١١٧/١)، بەیهیقی (١١٦/٢).

## روکنەکانی نوێژ

# روکنی دەیەم و یازدەیەم

# دانیشتنی نێوان سوجدەکان و سرەوتنی لەش تێیدا

ئـەم دانیشـتنەی نێـوان دوو سـوجدەی هـەر رکـاتی نوێـژێك روکنـە، چونکە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە فێرکردنـی خـاوەن نوێـژە هەڵەکـەدا جـەختی لەسـەر کـردەوەو فـەرمووی: (ثـمَّ اسْجُدْ حَتـى تطْمَـئِنَّ سَاجِدَاً، ثمَّ ارْفَعْ حَتى تطْمَئِنَّ جَالِسَاً، ثمَّ اسْجُدْ حَتى تطْمَئِنَّ سَاجِدَاً)[1] واتە: پاشان سوجدە ببە تا لـە سـوجدەدا سـرەوت دەگریـت، ئینجا سـەرت بـەرز کەرەوەو دانیشە، تا لە جوڵە دەکەویت و سرەوت دەگریت، ئینجا بچۆرەوە بۆ سوجدەو بمێنەرەوە تا سرەوت دەگریت..

ئەم هەموو تەئکید کردنەوەیە لە جووڵە کەوتن و لە سرەوت گرتن و وەستانەوە، هەمووی بەڵگەی روکنێتی ئەو رەفتارە خواپەرستیەیە.. ـ عائیشەخان خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە: (كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ إِذَا سَجَدَ رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ السَّجدةِ لَمْ يَسْجُدْ حَتَّى يَسْتَوِيَ جَالِسًا)[2] واتە: کاتێك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەری لە سوجدە بەرز دەکردەوە، سوجدەی نەدەبردەوە تا بە تەواوی دادەنیشت.. دانیشتنی نێوان دوو سوجدەکە لای ئیمامی شافیعی و ئیمامی ئەحمەد روکنن، لە

---

[1] بوخاری (١١/٣١ ـ ٤٦٧)، موسلیم (٢/١٠ ـ ١١)، ئیبنوماجە (١/٣٢٧)، الالبانی: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (١/٥٥)..

[2] موسلیم (٤٩٨)، ئیبنوماجە (٨٩٣)..

ئیمامی مالیکەوە شتێکی وا ریوایەت نەکراوە، ئیمامی ئەبو حەنیفەش بەلایەوە روکن نیە! کابرا هەرچۆنێك سەری بەرز کاتەوە با بە قەدەر نووکی شمشێرێکیش بێت بەسە[١]!!

## چۆنیەتی دانیشتنی نێوان دوو سوجدەبردنەکە:

هەرچەندە دانیشتن لەسەر ئەژنۆ لە خوێندنی تەحیاتی نوێژدا ئەوەندە زانراوە، کە زۆر کەس لە کورددا پێی دەڵێن دانیشتنی تەحیات، بەلاَم هەر پێویستە ئەوەندە بڵێیین کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کە سەری لە سوجدەی یەکەم بەرز دەکردەوە، لەسەر ئەژنۆ دادەنیشت، دەستەکانی دەخستنە سەر رانەکانی، پەنجەکانی وێك دێنانەوە (پێکەوە جووتی دەکردن) و رووی دەکردنە قیبلە، لە دواوە پێی راستی هەڵدەناو لەسەر پێی چەپی دادەنیشت، جاری واش هەبوو هەردوو پێیەکانی هەڵدەناو لەسەر پاژنەپێکانی بە شێوەیەکی کاتی دادەنیشت.. هەموو جارێك لانی کەم بە قەدەر ماوەی سوجدەبردنێکی لەم دانیشتنەدا دەمایەوە، جاری واش هەبوو ئەوەندەی درێژ دەکردەوە کە خەڵکانێك وایان دەزانیٚ بیری چۆتەوە کە سوجدەی دووەمی نەبردووە! بە یاوەرانیشی دەفەرموو: نوێژەکانتان قبووڵ نابێت ئەگەر ئێوەش وا نەکەن و ئەوەندە نەمێننەوە.. ئەمەش هەندێك فەرموودە کە وەسفی ئەوانە روون دەکاتەوە کە باسمان کرد:

١ ـ (ثُمَّ كَانَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ مِنْ السُّجُودِ مُكَبِّرَاً)[١] واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دوای ئەوەی سوجدەی دەبرد تەکبیری دەکردو، سەری بەرز دەکردەوە..

---

[١] الام (١/١٠٠)، المجموع (٣/٤١٢)، المغني (١/٣٧٥)، المدونة (١/٧٠)، ابن عابدين (١/٤٧٤).

٢ ـ (كَانَ يَفْرِشُ رِجْلَهُ الْيُسْرَى وَيَنْصِبُ رِجْلَهُ الْيُمْنَى)[٢] واتە: پێی راستی رادەخست (لەسەری دادەنیشت) و پێی راستی هەڵدەنا..

٣ ـ جاری وا هەبوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە سەری لە سوجدەی یەکەم بەرز دەکردەوە دەستیشی لەگەڵدا بەرز دەکردەوە: (وَكَانَ يَرْفَعُ يَدَيهِ مَعَ هذَا التَكْبِيرِ)[٣]..

٤ ـ جاری وا هەبوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەردوو پێیەکانی هەڵدەناو لەسەریان هەڵدەتروشکا: (وَكَانَ أَحْيَانَاً يَقْعِي (يَنْتَصِبُ عَلَى عَقِبَيهِ)[٤]. ئەمەشی بۆیە کردووە تا جۆراو جۆری حاڵەتەکانی خواپەرستی بۆ ئوممەتەکەی روون کاتەوە، دەنا ئەو ریوایەتەی کە دەڵێ پێی چەپی رادەخست و لەسەری دادەنیشت ریوایەتی دە لە یاوەرانی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم و دیارە وەکو شێخی ئەلبانی دەڵێ: زۆرینەی کاتەکانیش هەر وا دانیشتووە[٥]..

★ ★ ★

---

[١] ئەبوداوود (١٣٧/١)، أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (١٨٨/١).

[٢] موسلیم (٥٤/٢)، ئەبو داوود (١٢٥/١)، بەیهیقی (١٧٣/٢)، ئیمامی ئەحمەد (٢٨١/٦).

[٣] ئەبوداوود (١١٥/١)، نەسائی (١٧٢/١)، ئیبنوحەزم (٩١/٤)، الالباني: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (١٨٨/١).

[٤] موسلیم (٧٠/٢)، ئەبوداوود (١٣٤/١)، ترمزی (٧٣/٢)، بەیهیقی (١١٩/٢).

[٥] الالباني: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٨٠٧/٢).

## روکنەکانی نوێژ

# روکنی دوازدەیەم و سێزدەیەم

# تەحیاتی دوایی و دانیشتنەکەی

خوێندنی تەحیاتی ئەخیر روکنە، هەر کەسێك بەئاگا یان بێ ئاگایانە وازی لێ بهێنێت نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە.. چونکە:

١ ـ سەیدنا ئیبنو مەسعوود خوا لێی رازی بێت دەڵێ: (كُنَّا نَقُولُ قَبْلَ أَنْ يُفْرَضَ عَلَيْنَا التَّشَهُّدُ السَّلَامُ عَلَى اللهِ مِنْ عِبَادِهِ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ لا تَقُولُوا السَّلَامُ عَلَى اللهِ وَلَكِنْ قُولُوا التَّحِيَّاتُ للهِ)[١] واتە: پێش ئەوەی تەحیاتمان لەسەر فەرز ببێت، دەمانووت: سەلام لە خوا لە عەبدەکانیەوە، ئیتر پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: مەڵێن سەلام لە خوا، بڵێن: ئەتتەحییاتو لله.. ئەمە بەڵگەیە کە تەحیات پێشتر فەرز نەبووەو دواتر لەسەر موسوڵمانان فەرز کراوە..

٢ ـ هەر سەیدنا ئیبنو مەسعوود خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (إذَا قَعَدَ أَحَدُكُمْ فِي

---

[١] ئەم فەرموودەیە زۆرینەی فەرموودەوانانی وەکو ئیمامی ئەحمەدو بوخاری و موسلیم و خاوەن سونەنەکان و داریمی و دارەقوتنی و تەبەرانی و ئیبنوحیببان و ئیبنوخوزەیمەو ئیبنوئەبی شەیبەو عبدالرزاق ریوایەتیان کردووە، لە بیستوقسوور رێگاوە هاتووە، بەڵام لای زۆریان ئەو زیادەیەی تێدا نیە کە دەفەرموێ (قَبْلَ أَنْ يُفْرَضَ عَلَيْنَا التَّشَهُّدُ) ئەسڵەکەشی وەکو شێخی ئەلبانی دەفەرموێ لە سەحیحەیندایە، خۆشی بە سەحیحی ناساندووە (الارواء (٣١٩).

الصَّلاةِ فَلْيَقُلْ التحيَّاتُ للهِ..)[١] واتە: ئەگەر یەکێکتان لە نوێژدا بۆ تەحیات دانیشت با بڵێت: التحيَّاتُ للهِ..

٣ ـ بەردەوام بوونی پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم لەسەر خوێندنی. ئەمەش مەزهەبی ئیمامی شافیعی و ئیمامی ئەحمەدە، ئیمامی مالیك دەڵێ: سوونەتە نەك فەرز، مەگەر ئا ئەو بەشەی کە سەلام کردنەکەی تێدایە!! ئیمامی ئەبو حەنیفە دەڵێ: دانیشتنەکەی بە قەدەر خوێندنی تەحیاتێك روکنە، دەنا خویندنەکەی واجب نیە[٢]!!! هەنجەتیشیان ئەوەیە کە دەڵێن: ئەگەر وەکو ئێوە دەڵێن روکن بوایە، حەتمەن پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم کابرای نوێژهەڵەی فێر دەکرد..

ئەوانیش وەڵامی ئەمانیان بەوە داوەتەوە کە دەشێت فەرموودەی خاوەن نوێژە هەڵەکە پێش فەرزبوونی تەحیاتەکە بووبێت. چونکە هەموو رەفتاری نوێژکردن لە یەك فەرموودە وەرنەگیراوەو ناشکرێت تەنها یەکێکیان بکرێتە سەرچاوەی لێوەرگرتن، بە تایبەتی کە فەرموودەی تریش لەو بارەوە هەبن، چونکە ئەوە داخستنی دەرگاکانی زانینی حوکمە شەرعیەکانن..ئەگەر بەروارو پاش و پێشی کاتی دوو حوکمی شەرعی نەزانرا، هەر دەبێت وەرگیرێن نەك رەت کرێنەوە، چونکە هاتن و ناساندنیان وەك حوکمی شەرعی سەلمێنراوە، ئەمما کامیان پێش ئەوی ترە، ئەوە لێکۆڵینەوەی دەوێت، یان پێکەوە سازاندنی دەوێت..[٣] .

---

[١] بوخاری (٨٣١)، موسلیم (٤٠٢).

[٢] الام (١/١٠٢)، المغنی (١/٣٨٧)، مواهب الجلیل (٢/٥٢٥)، المبسوگ (١/٢٩).

[٣] نیل الاوگار (٢/٣٠٩)، السیل الجرار (١/٢١٩).

## چۆنیەتی دانیشتن بۆ تەحیات:

بزانە کە پێویستە موسوڵمان دانیشتنەکانی تەحیات ونێوانی دوو سوجدەکان بزانێت، تا بەو شێوەیە نوێژەکانی بکات کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کردوونی، دانیشتنی نێوان سوجدەکانمان باس کرد کە بە شێوەی دانیشتنی تەحیات بووەو جاری واش هەبووە هەردوو پێی هەڵناوەو لەسەر پاژنەکانیان دانیشتووە.. ئەمما دانیشتنی تەحیات، ئەوە بزانە کە دوو جۆرە:

## دانیشتنی تەحیاتی ناوەند (ئیفتیراش):

وەکو دانیشتنی نێوان دوو سوجدەکانە، دانیشتنێکی تەحیاتییە لەسەر ئەژنۆ، پێی راستی وا هەڵدەنێت، رووی پەنجەکانی لە قیبلە بن، پێی چەپیشی رادەخات وسمتی چەپی دەخاتە سەر.. ئەمە شێوەی زۆرینەی دانیشتنی نێوان سوجدەکان وتەحیاتی ناوەندی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم، وەکو:

١ ـ لە فەرموودەی سەحیحی بوخاریدا هاتووە کە سەیدنا ئەبو حەمیدی ساعیدی خوا لێی رازی بێت دەڵێ: (ثمَّ كَانَ يَجْلِس لِلتَّشَهَّدُ بَعْدَ الفَرَاغِ مِنْ الرَّكْعَةِ الثانِيَةِ، فإذا كَانَتْ الصَّلاةُ رَكْعَتين كَالصُبْحِ جَلَسَ مُفْتَرِشاً كَمَا كَانَ يَجْلِسُ بَينَ السَّجْدَتين وَكَذلِكَ فِي التشَهُدِ الأَوَّلِ مِنْ الثلاثيَةِ أو الرُبَاعِيَّةِ)[١] واتە: دوای تەواوبوونی رکاتی دووەم، بۆ تەحیات خوێندن دادەنیشت، ئەگەر نوێژەکە دوو رکاتی بوایە وەکو نوێژی بەیانیان، بە شێوەی ئیفتیراش تێیدا دادەنیشت، هەر وەکو کە لە نێوان

---

[١] بوخاری (٢/٢٤٦)، ئەبو داوود (١/١٥٢)، بەیهیقی (٢/١٢٧).

دوو سوجدەکان و تەحیاتی یەکەمی نوێژی سێ رکاتیی و چوار رکاتیی.

٢ ـ هەروەها سەلمێنراوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (فَإِذَا جَلَسْتَ فِي وَسَطِ الصَّلَاةِ فَاطْمَئِنْ وَافْتَرِشْ فَخِذَكَ الْيُسْرَى ثُمَّ تَشَهَّدْ)[١] واتە: کاتێك لە ناوەندی نوێژدا دادەنیشیت، هێمن ببەرەوەو رانی چەپت راخە (بە شێوەی ئیفتیراش بیخەرە سەر زەوی)[٢] ئینجا تەحیات بخوێنە..

ئەلبانی دەڵێ: ئەم دوو فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە سوونەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وایە کە لە کۆتایی رکاتی دووەمدا بۆ تەحیات خوێندن بە شێوەی ئیفتیراش دانیشێت، ئەوەش مەزهەبی ئەبو حەنیفەو شافیعی و ئەحمەدە بە پێچەوانەی مالیکەوە کە فەرموویەتی لە هەموو دانیشتنەکانی نوێژدا دەبێت بە شێوەی تەوەررووك دابنیشێت ، ئەم فەرموودەیە ئەوە رەت دەکاتەوە[٣]..

ئەمما ئەو فەرموودانەی تر کە بەرهەڵستی دەکەن لەوەی کە وەکو هەڵتروشکانی سەگ دانیشێت، ئەوە لە لایەکەوە شێخی ئەلبانی بە توێژینەوەی ووردی خۆی سەلماندویێتی کە تەنها دوو فەرموودەیان لەوانەیە وەرگیرێت، هەرچەندە خۆی قسەی لەسەر هەردووکیشیان هەر کردووە، ئەمما ئەوانی تر زەعیفن و نابنە بەڵگەی خواپەرستی.. لە لایەکی ترەوە لە حاڵی سەحیح بوونیشیاندا بەرهەڵستی لە شێوەیەکی

---

[١] ئەلبانی دەربارەی دەفەرموێ: ئەبو داوود ریوایەتی کردووەو سەنەدەکەی حەسەنە الالباني: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٨٣٣/٣).

[٢] الشوكاني: نيل الاوطار (٢٢٩/٢).

[٣] الالباني: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٨٢٩/٣).

هەڵتروشکان دەکەن کە ئەو هەڵتروشکانە ناگرێتەوە کە جاری وا هەبووە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کردوێتی[١].. ئەمیان شتێکەو ئەویان شتێکی ترە! ئەویان هەڵتروشکانی سەگە، کە زمانەوانان فەرموویانە ئەوەیە کە سمتەکانی بخاتە سەر زەوی و قاچەکانی لە پێش خۆیەوە هەڵنێت و دەستی بباتەوە بۆ دواوە.. دیارە ئەوە لە کۆڕو کۆمەڵیشدا زۆر ناقۆڵایە چ جای ناو نوێژ.. بۆیە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە شێوازی تری بێزراو وەسفی تری فەرمووە، وەك:

٢ ـ سەیدنا ئیبنو عومەر خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بینی کەسێك لە تەحیاتدایەو دەستی چەپی داداوەو تینی خستۆتە سەری، پێی فەرموو: (إِنَّهَا صَلاةُ الْيَهُودِ) ئەم شێوەیە نوێژی جولەکەکانە.. لە ریوایەتێکی تردا: (لا تجْلِسْ هكَذَا، إِنَّمَا هذِهِ جَلْسَةُ الَّذِينَ يُعَذَّبُونَ)[٢] واتە: وا دامەنیشە، ئەوە دانیشتنی ئەو کەسانەیە کە ئەشکەنجە دەدرێن..

٢ ـ سەیدنا عەمری کوڕی شەرید لە باوکیەوە خوا لێیان رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەرهەق ئەو جۆرە دانیشتنە لە تەحیاتدا فەرموویەتی: (هِيَ قِعْدَةُ الْمَغْضُوبِ

---

[١] ئەوەی کە دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم (وَكَانَ أَحْيَانَاً يَقْعِي (يَنْتَصِبُ عَلَى عَقِبَيهِ) هەردوو پێیەکانی هەڵدەناو لەسەریان هەڵدەتروشکا..

[٢] ئەبوداوود (١/١٥٧)، حاکم (١/٢٧٢) لە رێی بەیهیقیەوە (٢/١٣٦) و فەرموویەتی بە پێی مەرجەکانی بوخاری و موسلیم سەحیحە، ئیمامی زەهەبیش لایەنگیری بووە، هەروەرها ئەلبانی لە: الارواء (٣٨٠)دا.

عَلَيهِمْ)[١] واتە: ئەوە دانیشتنی ئەو کەسانەیە کە خوا غەزەبی لێگرتوون..

٣ ـ سەیدنا ئەبوهورەیرە خوا لێی رازی بێت دەڵێ: (نَهَانِي خَلِيلِي صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ أنْ أنْقُرَ فِي صَلاتِي نَقْرَ الدِّيكِ، وأنْ ألْتَفِتَ الْتِفَاتَ الثعْلَبِ، وأنْ أقْعِيَ كَإِقْعَاءِ الْقِرْدِ)[٢] واتە: خۆشەویستم پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەرهەڵستی ئەوەی لێکردووم کە لە نوێژەکانمدا وەکو کەڵەشێر دەندووك بدەم بە زەویدا، وەکو ڕێوی هەر سەیری ئەملاولای خۆم کەم، وەکو مەیموونیش هەڵتروشکێم..

## دانیشتنی تەحیاتی ئەخیر (تەوەڕوك):

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: (وَإِذَا جَلَسَ فِي الرَّكْعَةِ الْآخِرَةِ قَدَّمَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى وَنَصَبَ الْأُخْرَى وَقَعَدَ عَلَى مَقْعَدَتِهِ)[٣] واتە: کە لە تەحیاتی ئەخیریدا دادەنیشت پێی چەپی پێش دەخست و ئەوی تریانی هەڵدەناو لەسەر سمتی دادەنیشت.

ئەمەش دوو شێوەیە:

**یەکەم:** سمتی چەپی دەخاتە سەر زەوی و لەسەری دادەنیشێت و هەردوو پێیەکانی دەکەونە لای راستیەوە، پەنجەکانی پێی چەپی لە بن لوولاقی چەپیەوە دێنێتە دەرەوە..

---

[١] ئەبوداوود (٤٨٤٨)، ئەحمەد (٣٨٨/٤) ئەلبانی دەفەرموێ بە پێی مەرجەکانی بوخاری و موسلیم سەحیحە.. (الالباني: أصل صفة صلاة النبي صلی الله علیه و سلم (٨٣٧/٣).

[٢] ئەلبانی دەفەرموێ: تەیالیسی و ئەحمەدو ئیبنوئەبی شەیبە ریوایەتیان کردووەو فەرموودەیەکی حەسەنە وەکو لە: صحيح الترغيب و الترهيب (٥٥٥) دا باسم کردووە.

[٣] بوخاری (٨٢٨).

**دووەم:** لەسەر سمتی چەپی دادەنیشێت و هەردوو پێیەکانی رادەخات و لای راستیەوە دەریان دەهێنێت. ئەوە سەلمێنراوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە تەحیاتی ئەخیری نوێژەکانیدا ئەم دوو شێوەیەی کردووە..

**بۆچوونی مەزهەبەکان لەسەر دانیشتنی تەحیات:**

ـ مەزهەبی ئیمامی ئەبو حەنیفەو یاوەرانی ئەوەیە کە لە هەموو تەحیاتێکدا بە شێوەی ئیفتیراش دادەنیشێت.

ـ مەزهەبی ئیمامی مالیك و یاوەرانی ئەوەیە کە لە دانیشتنی هەموو تەحیاتێکدا بە شێوەی تەوەڕڕووك دادەنیشێت..

ـ مەزهەبی ئیمامی شافیعی دەڵێ: لە تەحیاتی یەکەمدا بە شێوەی ئیفتیراشەو لە تەحیاتی ئەخیری هەموو نوێژێکدا (کە سەلامدانەوەی بەدوادا دێت) بە شێوەی تەوەڕڕووك دادەنیشێت[١].. هەردووکیشیان سووننەتن..

ـ مەزهەبی ئیمامی ئەحمەدو هاورایانی ئەوەیە کە لە تەحیاتی نوێژێکدا بە شێوەی تەوەڕڕووك دادەنیشێت کە دوو تەحیاتی تێدا بێت، تا لێك جویێ بکرێنەوە[٢] ..

ئیمامی ئیبنولقەییم دوای بەدواداچوونی بەڵگەکان رای ئیمامی ئەحمەدی پێ پەسەندتر بووە[٣]. شێخی ئەلبانیش هەروەها[٤]..

ئەمە فەتوای لیژنەی هەمیشەیی فەتوای زانایانی حیجازیشە[١].

---

[١] المجموع (٤٣١/٣).

[٢] كشاف القناع (٣٥٤/١).

[٣] ابن القيم: زاد المعاد (٩١/١).

[٤] أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٩٨٢/٣).

منیش ئەمیان پێ پەسەندترە.. چونکە فەرموودەکەی سەیدنا ئەبو حەمیدی ساعیدی کە دە لە یاوەران گێڕاویانەتەوە پشتگیریی دەکات.. والله اعلم.

## ویردەکانی تەحیات:

سەیدنا ئیبنومەسعود خوا لێی رازی بێت دەڵێ: دەستم لەناو لەپی دەستی پێغەمبەری خوادا بوو صلی الله علیه وسلم کە تەحیاتی هەر وەکو سورەتێکی قورئان فێر کردم، فەرمووی بڵێ: (التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا اللَّهُ ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ)[٢] واتە: سڵاوو ستایش بۆ خوایە، هەروەها پاڕانەوەو پاکیی، سڵاوو بەزەیی و بەرەکەتی خوات لێ بێت ئەی پێغەمبەری خوا، سڵاو لە ئێمەو لە بەندە پیاوچاکەکانیش، شایەتی دەدەم کە تەنها خوای تاك و پاك شیاوی خوایەتییەو هیچی تر شایانی خوایەتی نیە، شایەتی دەدەم کە موحەممەد بەندەو نێرراوی خوایە..

ئەمە راستترین ریوایەت و بەناوبانگترینیانە، ئەمە وەرگیراوی ئیمامی ئەبوحەنیفەو یاوەرانی مەزهەبەکەی و سوفیانی سەوری و ئیمامی ئەحمەدو ئیسحاق و ئەبوسەورو جمهوری ئەهلی عیلمە[٣].. بێگومان شێوازە سەلمێنراوەکانی تری ئەم ویردە پاکە هەموو هەر شیاون..

ئەم ویردە لە چەندین ریوایەتی ترەوە هەر لە سەیدنا ئیبنو مەسعودەوە بە شێوازی (السَّلاَمُ عَلَى النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ) هاتووە،

---

[١] فتاوى اللجنة الدائمة (١٥/٧).
[٢] بوخاری (٦٢٦٥)، موسلیم (٤٠٢).
[٣] الاوسط (٢٠٧/٣).

ئیبنومەسعود خۆی ئەوەی روون كردۆتەوە كە فەرموویەتی: ئەو كاتەی كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم زیندوو بوو لەناوماندا بوو دەمانووت: (السَّلامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ) كە كۆچی دوایی كرد ئیتر لەوەو دوا دەمانووت: (السَّلامُ عَلَى النَّبِيِّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ)[١]

★ ★ ★

[١] (السَّلامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ) ریوایەتی بوخارییە (٦٢٦٥)، روون كردنەوەكەی ئیبنومەسعوود وا لە فتح الباریدا (٣٦٦/٢) كە حافز ئیبنوحەجەر پشتگیریی لێ كردووەو بەهێزی كردووە.. شێخی ئەلبانیش لە صفة صلاة النبي (ل ١٩١) دا دەفەرموێ: عائیشەخانیش ئاوای تەحیات فێر دەكردن و خۆشی ئاوای خوێندووە كە دیارە بە رەزامەندی و ئاماژەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بووە..

**روکنەکانی نوێژ**

# روکنی چواردەیەم

# سەلامدانەوە

شەرعناسان جگە لە ئیمامی ئەبو حەنیفە پێیان وایە سەلامدانەوەی کۆتایی نوێژ، روکنە، چونکە:

١ ـ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: (مِفْتَاحُ الصَّلَاةِ الطُّهُورُ، وَتحْرِيمُهَا التَّكْبِيرُ، وَتحْلِيلُهَا التَّسْلِيمُ)[1] واتە: کلیلی نوێژ دەستنوێژە، دەسپێکی نوێژ تەکبیرەی ئیحرامە، تەواوبوونیشی سەلام دانەوەیە..

٢ ـ وەسفەکەی عائیشەخان خوا لێی رازی بێت کە دەڵێ: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ يَخْتِمُ الصَّلَاةَ بِالتَّسلِيمِ)[2] واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژەکەی بە سەلامدانەوە کۆتایی پێ دەهێنا..

٣ ـ بەردەوام بوونی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەر کردنی.

ئیمامی ئەبوحەنیفەو هەندێك لە یاوەرانی دەڵێن: ئەمانە نابنە بەڵگەی بە روکن بوونی سەلام دانەوە، چونکە باسی سەلامدانەوە لە فەرموودەی خاوەن نوێژە هەڵەکەدا نەهاتووە.. مەگەر بووترێت لەوانەیە

---

[1] ئەبوداوود (٦١)، ترمزی (٣) شێخی ئەلبانی بە سەحیحی داناوە: الارواء (٣٠١).
[2] موسلیم (٤٩٨)، ئەبوداوود (٧٨٣).

فەرموودەی خاوەن نوێژەهەڵەکە پێش ئەو فەرموودەیە بێت کە دەفەرموێ: (وَتحْلِيلُهَا التَّسْلِيمُ)..

٤ ـ ئەو فەرموودەیەی سەیدنا ئەبو سەعیدی خودری خوا لێی رازی بێت دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (إذَا شَكّ أحَدُكُمْ فِي صَلَاتِهِ فَلَمْ يَدْرِ كَمْ صَلَى أثَلَاثا أمْ أرْبَعًا فَلْيَطْرَحْ الشَكّ وَلْيَبْنِ عَلَى مَا اسْتَيْقَنَ ثمّ يَسْجُدُ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ أنْ يُسَلّمَ)[١] واتە: ئەگەر کەسێکتان لە نوێژەکەیدا گومانی بۆ دروست بوو کە سێ رکاتی کردووە یان چوار، با گومانەکەی بخاتە لاوەو هەڵوێست لەسەر دڵنیابوونی دروست کات، ئینجا پێش سەلامدانەوەی دوو جاران سوجدە ببات..

٥ ـ لە فەرموودەکەی سەیدنا ئیبنو مەسعوود خوا لێی رازی بێت دەربارەی سوجدەی سەهوو، دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (وَإِذَا شَكَّ أحَدُكُمْ فِي صَلاَتِهِ فَلْيَتَحَرَّ الصَّوَابَ، فَلْيُتِمَّ عَلَيْهِ ثمَّ يُسَلِّمْ، ثمَّ يَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ)[٢] واتە: با بگەڕێت تا دەزانێت کامیانی راستە (یەعنی گومانی بەهێزی بێتە سەر ئەوەی کە پێی وایە کردویێتی) پاشان تەواوی کات، پاشان سەلام بداتەوەو ئینجا دوو سوجدەکەی سەهوو ببات.. ئەوەی لێرەدا مەبەستە ئەوەیە کە تەنانەت لە نوێژێکیشدا کە سوجدەی سەهووی تێدەکەوێت سەلامدانەوەکە هەر هەیە..

بەم کۆمەڵە بەڵگەیە دەسەلێت کە سەلامدانەوە فەرزە.. والله اعلم..

---

[١] بوخاری (٤٠١)، موسلیم (١٢٤٧).

[٢] بوخاری (٤٠٤)، موسلیم (٥٧٢).

بەڵام ئیمامی ئەبو حەنیفەی رەحمەتی دەڵێ: سەلام دانەوە لە نوێژدا فەرز نیە، نوێژخوێن سەربەستە لە ئەنجامدان ونەدانی هەردوو سەلامدانەوەکە، تەنانەت کە تەحیاتەکەشی ـ بە بۆچوونی ئیمامی ئەبوحەنیفە ـ لەسەر فەرز نیە، کەوابوو دەتوانێت بە بڕی ئەوەندەی تەحیات دەخوێندرێت دانیشێت و دوای ئەوە بێ سەلامدانەوە هەستێ و بڕوات!! ئیمام لەمەدا ئیعتیمادی کردۆتە سەر فەرموودەیەك کە سەیدنا ئیبنومەسعوود دەیگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەوی فێری نوێژ دەکرد، پێی فەرمووە: (فإذا قُلْتَ هذا فَقَدْ قَضَيتَ صَلاتَكَ، إنْ شِئتَ أنْ تقُومَ فقُمْ، وإنْ شِئتَ أنْ تقْعُدَ فاقْعُدْ)[1] واتە: ئەگەر ئەمەت کرد ئەوە نوێژەکەت بەجێهێناوە، ئیتر ئەگەر حەز دەکەیت هەستیت، هەستە، ئەگەر حەزیش دەکەیت دانیشیت، دانیشە.. بەڵام فەرموودەوانان لە توێژینەوەی ئەم فەرموودەیەدا گەیشتوونەتە ئەوەی کە فەرموودەکە مودرەجە[2]، چونکە لەفزەکانی (إنْ شِئتَ أنْ تقُومَ فقُمْ، وإنْ شِئتَ أنْ تقْعُدَ فاقْعُدْ) فەرمایشتی سەیدنا ئیبنو مەسعوودەو لە دەقی فەرموودەکەدا نیە.. بە هەر حاڵ ئێستا باسمان کێشەو راجوێیی شەرعناسان نیە کە سوجدەی سەهوو دەکەوێتە پێش یان پاش سەلامدانەوە.. باسی ئەوە دواتر دێت ان شاء الله، بەڵام مەبەستمان لە

---

[1] ئەبوداوود (٩٦٨)، ئەحمەد (١/١٢٩)، دارەقوتنی (١/٣٥٣)، المحلى(٣/٢٧٨).

[2] مودرەج: ئەوەیە کە راویەك یەکسەر لە دوای تەواوبوونی فەرموودەکە قسەیەکی خۆی یان قسەی یەکێکی تر بەدوادا دێنێت، گوێگرەکان وا دەزانن ئەو قسەیەش لە بەردەوامی فەرموودەکەیەو بە دەقەکەیەوە دەنوسێنن.. ئەمەش جۆرێکە لە فەرموودەی زەعیف (السيوطي: تدريب الراوي (ل ١٧٥).

روكنێتی سەلامدانەوەیە كە بە لای سەیدنا ئیبنو مەسعوودیشەوە روكن بووە[١]..

## سەلامدانەوە یەكجارە یان دووجار[٢]؟:

شـافیعیەكان و مالیكیـەكان و زۆرینـەی شەرعناسـان رایـان وایـە كـە سەلامدانەوەی یەكەم (بە لای راستدا) روكنـەو سـەلامدانەوەی دووەم (بـە لای چـەپدا) سـوونەتە. ئیبنـول مـونزیر دەڵـێ: هـەموو ئـەو زانایانـەی زانستیم لێوە وەرگرتوون فەرموویانە: نوێژی ئـەو كەسـەی یـەك سـەلامی داوەتـەوە تـەواوە.. ئیمـامی نـەوەوی دەڵـێ: هـەموو ئـەو زانایانـەی رایـان وەردەگیرێت لەسەر ئەوەن كە فەرزی سەلامدانەوە یەكە..

بۆچـوونی ئیمـامی ئەحمـەد جیـاوازە، لـە قەولێكیـدا دەڵـێ: هـەردوو سەلامدانەوەكە فـەرزن، مەزهـەبی حەنبـەلی و هەنـدێك لـە شەرعناسـانی مالیكی وئەهلی زاهیرو ئیبنوحەزم لەسەر ئەمەیە.. بەڵگەشیان:

١ ــ پێغەمبـەری خـوا صـلى الله علیـه وسـلم بـەردەوام لـە هـەموو نوێژێكیدا دووجار سەلامی داوەتەو یاوەران بینیویانـە.. ئەوەشـی بێتـە پاڵ كە فەرموویەتی: (صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي)[٣] واتـە: نوێـژ وا بكـەن وەكو كە من دەبینن نوێژ دەكەم.. نـەبینراوەو نەبیسـتراوە كـە جارێـك لە جاران لە نوێژێك لە نوێژەكانیدا یەكجاری سەلام دابێتەوە..

٢ ــ پێغەمبـەری خـوا صـلى الله علیـه وسـلم كـە یـاوەرانی بـینی لـە سـەلامدانەوەدا بـە دەسـت ئامـاژە دەكـەن، پێـی فـەرموون: (إِنَّمَـا يَكْفِـي

---

[١] شەوكانی توێژینەوەی لەسەر كردووەو بە سەحیحی داناوە: نیل الاوطار (٢/٢٥١)، پێش ئەویش ئیبنو حەزم: المحلى (٣/٢٧٩).

[٢] الام (١/١٢١)، المجموع (٣/٤٢٥)، الدسوقي (١/٢٤١)، كشاف القناع (١/٣٦١)، الاوسط (٣/٢٢٣).

[٣] بوخاری (٥٩٥).

أحَـدُكُمْ أنْ يَضَـعَ يَـدَهُ عَلَـى فَخِـذِهِ وَيُسَـلِّمَ عَلَـى أخِيـهِ مِـنْ عَلَـى يَمِينِـهِ وَشِمَالِهِ) [١] واتە: ئەوەنـدە بەسـە کـە یـەکێکتان کـە دەسـتی لەسـەر رانـی داناوە سەلام لەو برایـەی بکـات کـە لەسـەر راسـت و چـەپێتی.. یـەعنی پێویست بە دەست بەرز کردنەوە ناکـات، بـەڵکو لاکـات بـە لای راسـت و چەپیداو بە دەم سەلامەکە بکات.. ئەم پۆلە شەرعناسە بەرێزە دەڵێن: دیـارە هـەردوو سـەلامەکەی بـە فـەرز زانیـووەو دەیزانـی کـە تـەنها سەلامێکیان بەس نیە..

جمهوری شەرعناسان کە دەڵێن: تەنها یەکجار سەلامدانەوە بۆ بەجێهێنانی روکنێتی سەلامدانەوەکە بەسە، بەڵگەیان ئەمانەیە:

١ ـ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفـەرموێ: (مِفْتـاحُ الصَّلَاةِ الْطُهُـوْرُ، وَتحْرِيمُهَـا التكْـبِيرُ، وَتحْلِيلُهَـا التَسْـلِيمُ) [٢] واتـە: کلیلـی نوێــژ دەســـتنوێژە، دەســـپێکی تـــەکبیرەی ئیحرامـــە، تـــەواوبوونی ســـەلام دانەوەیە..

سەلامدانەوە ووشەیەکی گشتیە یەکجارو دووجار دەگرێتەوە، کەوابوو ئەگەر یەکجار سەلام درایەوە، روکنی سەلامدانەوەکەی پێ دێتە دی

٢ ـ فەرموودەکەی سەیدنا زوراره‌ی کوڕی ئەبی ئەوفا خـوا لێـی رازی بێـت کـە فـەرمووی: دەربـارەی شـەونوێژی پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیه وسلم پرسیارم لە عائیشەخان کرد، فەرمووی: (فَلا يَقْعُدُ فی شَیءٍ مِـتهُنَّ إلا فِـی الثامِنَـةِ فإنَـهُ يَقْعُـدُ فِيهَـا ، فَيَتَشَـهَّدُ ثـمَّ يَقُـومُ وَ لا يُسَـلِّمُ ، فيُصَـلِّی رَكْعَـةً وَاحِـدَةً ، ثـمَّ يَجْلِـسُ فيَتَشَـهَّدُ وَيَـدْعُو ثـمَّ يُسَـلِّمُ تَسْـلِيمَةً

---

[١] موسلیم (٤٣١).

[٢] ئەبوداوود (٦١)، ترمزی (٣) شێخی ئەلبانی بە سەحیحی داناوە: الارواء (٣٠١).

واحِدَةً: السَّلامُ عَلَيكُمْ يَرْفَعُ بِها صَوْتَهُ حَتى يُوقِظَنَا)[١] واتە: لە هیچیاندا دادەنیشت تا رکاتی هەشتەم، کە تێیدا دەدەنیشت وتەحیاتی دەخوێند، سەلامی نەدەدایەوە، هەڵدەستایەوە بۆ رکاتێکی تر، ئینجا دادەنیشت و تـەحیاتی دەخوێنـدەوەو یـەکجار سـەلامی دەدایـەوە، بـە دەنگـی بـەرز دەیفـەرموو: (السَّـلامُ عَلَـيكُمْ) بـە شـێوەیەك کـە ئێمـەی پـێ خەبـەر کاتـەوە.. لـە ریوایـەتی موسـلیم و نەسـائیدا دەڵـێ: (ثـمَّ يُسَـلِّمُ تسـلِيماً يُسْمِعُنَاهُ)[٢] واتە: پاشـان بـۆ یـەکجار وا سـەلامی دەدایـەوەو دەنگـی بـەرز دەکــردەوە کــە ئێمــە ببیســتین. ریوایــەتی لای ئیبنوحــەزم و ئیبنوحەجـەر دەڵـێ: (ثـمَّ يُسَـلِّمُ تسـلِيمَةً يُسْمِعُنَاهُ)[٣] .. بـە هـەر حـاڵ یەکجار سـەلام دانـەوە لـە رێگـای کۆمـەڵێك لـە یـاوەرانی بـەرێز لەوانـە سەیدنا ئەنەسی کوڕی مالیـك و سـەیدنا ئیبنـو عومـەرەوە خـوا لێیـان رازی بێت سەلمێنراوە..

## لە سەلامدانەوەدا چی دەوترێت؟

لانی کەم دەبێ بووترێت: (السلام عليكم)، لەو باشتر تەواوکردنێتی: (السلام عليكم و رحمه الله) کە جیاوازی لە لای راست و چەپ تێدا نیە.. چونکە ریوایەتی سەحیح لە یاوەرانی وەك سەیدنا جابری کوڕی سەمورەو سەیدنا ئیبنو عومەرو سەیدنا ئیبنو مەسعوودەوەی لەسەر هاتووە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە سەلامدانەوەیدا دەیفەرموو (السَّلامُ عليكُمْ ورحمةُ اللهِ)..

---

[١] ئیمامی ئەحمەد (١/٢٣٦)، شێخی ئەلبانی دەفەرموێ: سەحیحە:الارواء (٢/٣٢).
[٢] موسلیم (٢/٧٠ ـ ٧٤٦) نەسائی (١/٢٥٠).
[٣] ابن حزم: المحلى (٣/٤٩)، ابن حجر: التلخيص الحبير (ل ١٠٣) .

## زیادەی ( و برکاته ):

بە سەنەدی راست سەلمێنراوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم جاری وا هەبوو لە سەلامدانەوەی لای راستیدا دەیفەرموو: (السَّلامُ عليكُمْ رحمةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ)[1]، بەڵام بە لای چەپیدا (وبركاتُهُ)ی نەدەفەرموو..

من پێم بە پێی بەڵگەی سەلمێنراو لە سەلامدانەوەی هەردوولای راست وچەپدا بووترێت (السَّلامُ عليكُمْ رحمةُ اللهِ).. والله اعلم..

★ ★ ★

---

[1] ئەلبانی رەحمەتی دەفەرموێ: ئەبو داوودو ئیبنوخوزەیمە (٢/٨٧/١) بە سەنەدی سەحیحەوە ریوایەتیان کردووە ، هەروەها عبدالحق و نەوەوی و ئیبنوحەجەرو تەبەرانی و عبدالرزاق بە سەحیحیان ناساندووە: (أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (یەك بەرگیەکەی) ل ١٤٩)..

**روکنەکانی نوێژ**

# روکنی پازدەیەم

# ریزبەندی روکنەکانی نوێژ

شەرعناسان لەسەر ئەوە کۆن کە نوێژ دەبێت بە ریزبەندیی ئەو روکنانە بێت کە باس کرا، چونکە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەموو جارێك کە نوێژی کردووەو بە پێی ئەو ریزبەندییە کردوێتی، لەبەر ئەوەی فەرمووشیەتی (صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي)[١] واتە: نوێژ وا بکەن وەکو کە من دەبینن نوێژ دەکەم.. کەوابوو هەر دەبێت نوێژکردن بەو شێوەیە بێت، ئەمەش روکنێکی تری نوێژەکەیە..

★ ★ ★

---

[١] بوخاری (٥٩٥).

# باسی چوارەم

# واجبەکانی نوێژ

واجبی یەکەم: دوعای ئیستیفتاح.

واجبی دووەم: ووتنی ئیستیعازەی پێش خوێندنی فاتیحە.

واجبی سێیەم: ووتنی ئامین لە دوای خوێندنی فاتیحە.

واجبی چوارەم و پێنجەم و شەشەم: تەکبیر کردنی چوونە روکنەکان و ووتنی (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) و (ربَّنَا لَكَ الحَمْدُ).

واجبی حەوتەم: ووتنی سوبحان الله لە رکووعدا.

واجبی هەشتەم ونۆیەم: تەحیاتی ناوەڕاست و تێدا دانیشتنی.

## واجبەكانی نوێژ

**كورتە باسێكی واجب:** ڕەنگە زۆر لەوانەی كە زانستیە شەرعیەكانیان خوێندووە بە تایبەتی ئوسوڵی فیقھ بە سەرسامیەوە بپرسن كە بۆچی ڕوكنەكانی نوێژت باس كردووە كە فەرزی نوێژن، سونەتەكانیشت باس كردووە، كەچی (واجب) یشت داھێناوە، مەگەر ئەو دابەشبوونە ھەر دوو بەش نیە (فەرزو سوونەت)؟! دەڵێین: بەڵێ، ئەمە لای مالیكیەكان و شافیعیەكان وھاوڕایانیان وایە، بەڵام مەگەر سونەتیش لای ئێوە نەبۆتەوە بە دووبەشی تر: سونەتی جەخت لێكراو (موئەككەدە)و سونەتی ڕاتب.. ئێوە كاتێك كەسێكتان تەحیاتی ناوەڕاستی نوێژی بە بێ ئاگایی بیر دەچێت بخوێنێت، نافەرموون سوجدەی سەھووی بۆ ببە تا جەبرانی كاتەوە؟! بەڵێ.. وایە..

باشە ئێوەش پێتان وا نیە كە دوو ركات سوونەتی سپێدەی بەیانی و وترەكان كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەردەوام لە سەفەرو نەخۆشیشدا ھەر كردوونی، جیاوازییان لەگەڵ ركاتەكانی پێش و پاشی فەرزی نیوەڕۆدا ھەبێت؟! دیارە ئەمانە فەرز نین، بەڵام بەردەوامیش كردوونی، كەوابوو جۆرێكی نێوان فەرزو سوونەتن، بۆیە حەنەفی و حەنبەلیەكان ناویان ناوە واجب..

ئێ ئەم دابەشبوونەش زۆری وەك ئەوە، بەڵام زاراوەكانی گۆڕاون.

واجب لە ڕووی شەرعیەوە ئەوەیە كە شەرع ئەنجامدانی بە پێویستی سەرشان وئەركی ئەستۆ ناساندووە، ئەگەر ئەنجام نەدرا گلەیی دەكەوێتە

سەرو سزا دەدرێت، ئەگەر ئەنجامیش درا بکەرەکەی مەدح دەکرێت و پاداشت دەدرێتەوە[1]..

دابەشبوون بۆ (فەرز)و (واجب)و (سوونەت) دیدو پێناسەی حەنەفی و حەنبەلییەکانە، حەنبەلیەکان پێیان وایە ئەنجام نەدانی واجبێك بە ئەنقەست نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە، بەڵام حەنەفیەکان پێیان وایە نوێژەکە تەواوە، ئەنجام نەدەرەکە تاوانبارو گوناحبارو فاسق بووە..

لە مەزهەبی ئیمامی ئەبو حەنیفەدا ئەو فەرمانەی کە بە بەڵگەیەکی بنبڕ (قەتعی) وەکو ئایەتی قورئان و فەرموودەی موتەواتر داوای ئەنجامدانی کردووە، ئەوە فەرزە. وەك نوێژ لەسەر موکەللەف. ئەو فەرمانەی کە بە بەڵگەیەکی بنبڕ (قەتعی) سەلمێنراوە بەڵام مانای ئیحتیمالی فەرزو سوونەتی بەردەوامی لێ فامراوەتەوە، ئەوە (واجب) ە.. بۆنموونە قوربانی کە بە فەرموودەی ئاحاد فەرمانی پێ دراوە، لای حەنەفیەکان واجبە..

حەنبەلیەکان دەڵێن: هەر فەرمانێك بە ئایەتی قورئان داواکرابێت فەرزەو هەر فەرمانێك بە سوونەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم داواکرابێت واجبە..

بەڵام جمهوری شەرعناسانی تر کە فەرزو واجب لایان هەر یەکن، سەیری خودی فەرمانەکەیان کردووە کە لە موکەللەف داواکراوە، بێ ئەوەی جۆری بەڵگەکەیان پێ کاریگەر بێت، کە ئایا بەڵگەی بنبڕە یان بەڵگەی ئیحتیمالی. قورئانە یان سوونەت.. ئەمەش لە حوکمداندا

---

[1] ابن حزم: الاحکام (٣٢١/٣).

کاریگەرە، چونکە هەر فەرزێك بە بەڵگەی بنبڕ داواکرابێت نکووڵی کردنی کوفرە[1]..

هەندێك رەفتاری نوێژ هەن لای حەنبەلی و حەنەفیەکان واجبن.. ئەگەر نەکران بە سوجدەی سەهوو چارەسەر دەکرێن، بەڵام ئەگەر بە ئەنقەست نەکران یان نەووتران نوێژەکە بەتاڵ دەبێتەوە، بەو مەرجەی کابرا ئەم حوکمەی زانیبێت..

بە هەر حاڵ پێم گرنگ بوو کە ئەو رەفتارانەی نوێژ بزانین کە لای حەنەفیەکان واجبە ولای جمهور هەیانە فەرزەو هەیانە سووننەتی موئەککەدەیە. تا ئێمەش بە جیددی بیانگرین..

★ ★ ★

---

[1] ابو حامد الغزالي: المستصفى (٦٦/١).

## واجبەکانی نوێژ:

# واجبی یەکەم

# دوعای ئیستیفتاح

پەسەندتر ئەوەیە کە لە نوێژی فەرزو سوونەتدا واجبە، شوێنی ووتنی یەکسەر دوای تەکبیرەی ئیحرام و پێش خوێندنی سورەتی فاتیحەیە، چونکە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە فەرموودەکەی ریفاعەی کوڕی رافیعدا کە بە فەرموودەی خاوەن نوێژەهەڵەکە بەناوبانگە فەرمووی: (إنَّهُ لا تتِمُّ صَلاةٌ لِأحَدٍ مِنْ النَّاسِ حَتَى يَتوَضَأَ.. ثمَّ يُكَبِّرُ، وَيَحْمَدُ اللهَ عَزَّوَجَلَّ وَيُثنِي عَليهِ وَيَقْرَأُ مَا تيَسَّرَ مِنْ القُرْآنِ.. فَإِذَا فعَلَ ذَلِكَ فقَدْ تمَّتْ صَلاتهُ)[1] واتە: لەم خەڵکەدا نوێژی ئەو کەسە تەواوە کە پێشتر دەستنوێژی گرتبێت، پاشان تەکبیر بکات و بچێتە نوێژەکەیەوە، ئینجا سوپاس و ستایشی خوای گەورە بکات و ئەوەندەی بۆی ئاسانە قورئان بخوێنێت.. ئەگەر ئاوای کرد ئەوە نوێژەکەی تەواوە..

شەرعناسان دەڵێن: زاهیرەن مەبەست لە سوپاس و ستایش کردنی خوای گەورە کە لێرەدا هاتووە، دوعای ئیستیفتاحی نوێژە.. ئیمامی ئەحمەد بە واجبی دەزانێت[2].. ئیبنوروشد خۆی بە واجبی زانیووە،

---

[1] لە پەراوێزی ژمارە (٧٤ و ٧٥) دا بە دووروودرێژی دوو لە ریوایەتەکانی هێنراوەتەوە، ئەمەش بەشێکە لە ریوایەتێکی تری ئەو فەرموودەیە کە ئەبوداوود (٨٥٩)، نەسائی (٢/٢٠)، ترمزی (٣٠٢) ئیبنوماجە (٤٦٠) هێناویانەتەوەو کەمال ابن السید دەفەرموێ سەحیحە: صحيح فقه السنة (١/٣٢٨).

[2] الفروع (١/٤١٣)، الانصاف (٢/١٢٠).

فەرمووشیەتی بۆچوونی ئیمامی ئەبو حەنیفەو ئیمامی شافیعیش هەر واجب بوونێتی[١]!! بۆ ئیمامی ئەبو حەنیفە وایە[٢]، بەڵام لە ئیمامی شافیعیەوە نەهاتووە فەرمووبێتی واجبە، بۆیە لە مەزهەبی شافیعییاندا واجب نیە[٣].. ئیمامی مالیك فەرموویەتی دوای تەکبیر یەکسەر سورەتی فاتیحە دەخوێنێت.. بۆیە خوێندنی دوعای ئیستیفتاح لای مالیکیەکان نە فەرزە و نەسووننەت[٤]..

سەنعانی دەڵێ: لەم فەرموودەیەوە ئەوە وەردەگیرێت کە سوپاس و ستایش کردنی خوای گەورە هەر بە رەهایی دوای تەکبیرەی ئیحرام واجبە[٥]..

دوعای ئیستیفتاح بە پەنهانی دەخوێندرێت، مەگەر پێشنوێژ بیەوێت مەئموومەکانی فێر کات، لەو حاڵەتەدا بۆی هەیە بە دەنگی بەرز بیخوێنێت[٦].. چونکە سەیدنا عومەر خوا لێی رازی بێت بە دەنگی بەرز (سبحانك اللهم و بحمدك...)[٧] ی خوێند..

---

[١] بداية المجتهد (١/١٧٢).

[٢] الدر المختار (١/٤٧٦).

[٣] ئەبوئیسحاقی شیرازی: المهذب (١/٢٣٦)..

[٤] ئیمامی نەوەوی لە: المجموع (٣/٢٧٨) دا باسی لێوە کردووە..

[٥] الصنعاني: سبل السلام (١/٣١٢)..

[٦] ئیبوقودامە: المغني (٢/١٤٥).

[٧] موسلیم (٣٩٩)، دارەقوتنی (١/١٩٩)، بەیهیقی (٢/٣٤)، عبدالرزاق (٢٥٥٥)، ئیبنو ئەبی شەیبە (١/٢٣٠).. ئەلبانی بە سەحیحی ناساندووە: الارواء (٣٤٠).

**بەڵام ئەمە لە دوو شوێندا ناشێت:**

**١ . لە نوێژی جەنازەدا:** دوعای ئیستیفتاحی نیە، چونکە نوێژەکەی وا تایبەت کراوە تا زووتر ئەنجام بدرێت، نەخوێندنی ئیستیفتاحیش کورتتری دەکاتەوە.. سەیدنا تەڵحەی کوڕی عوبەیدوالله خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: (صَلَّيْتُ خَلْفَ ابْنِ عَبَّاسٍ عَلَى جَنَازَةٍ، فَقَرَأَ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ، قَالَ لِيَعْلَمُوا أَنَّهَا سُنَّةٌ)[1] واتە: لە دوای ئیبنوعەبباسەوە نوێژی جەنازەم کرد، سورەتی فاتیحەی خوێند، پاشان فەرمووی: تا بزانن ئەوە سووننەتە.. ڕیوایەتی تری لای نەسائی ڕوون دەکەنەوە کە فاتیحەی خوێندو سورەتێکی تر بە دوایدا.. یەعنی بێ ئەوەی دوعای ئیستیفتاح بخوێنێت، بە دەنگی بەرزیش خوێندویەتی تا ئەو خەڵکە بزانن کە دوعای ئیستیفتاح سووننەتەو بۆیان هەیە لە نوێژی جەنازەدا نەیخوێنن..

**٢ . ئەو کەسەی فریای وەستانی ڕکاتی یەکەمی نوێژ ناکەوێت:** ئەمە دوعای ئیستیفتاح ناخوێنێت چونکە کاتەکەی بەسەرچووە..

**دەقی دوعایەکی ئیستیفتاح:**

ئاشکرایە کە دەقەکانی دوعای ئیستیفتاح زۆرن، چونکە لە زۆر فەرموودەی سەلێنراودا هاتوون، مەزهەبەکانیش هەر یەکەیان یەکێکیانی گرتۆتە بەر.. ئێمەش هەر ئەو ڕیوایەتەیان هەڵدەبژێرین کە لە مەزهەبی ئیمامی شافیعیدا هەیەو کۆمەڵگەی کوردەواری ئێمە خوویان پێوە گرتووە:

---

[1] بوخاری (١٣٣٥)، ئەبوداوود (٣١٨٢)،نەسائی (٧٤/٤)، ترمزی (١٠٣٢)، ئیبنوماجە (٢٤٩٠)..

ـ سەیدنا عەلی خوا لێی رازی بێت دەڵێ: كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەڵدەستا بۆ نوێژ ئەمەی دەخوێند: (وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفاً وَمَا أَنَا مِنْ الْمُشْرِكِينَ، إِنَّ صَلاتي ونُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي للهِ رَبِّ العَالمين، لا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وأَنَا مِنْ الْمُسْلِمِينَ) واته: ئارەزوومەندانەی هەقخوازی وا رووی خۆم كردە ئەوەی ئاسمانەكان و زەوی دروست كردووە، من لە ریزی موشریكاندا نیم، نوێژو خواپەرستیم و ژیان و مردنم هەر بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانە كە بە هیچ شێوەیەك شەریكی نیە، بەوەش فەرمانم پێدراوەو من لە ریزی موسوڵمانانندام..

★ ★ ★

**واجبەكانی نوێژ:**

## واجبی دووەم

## خوێندنی ئیستیعازە (اعوذ بالله من الشيطان الرجيم)

پەسەندتر ئەوەیە كە خوێندنی ئیستیعازە پێش خوێندنی سورەتی فاتیحە لە نوێژدا فەرز بێت یان سوونەت، واجبە.. چونكە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾ **النحل/٩٨** واتە: كاتێك وویستت قورئان بخوێنیت، پەنا بگرە بە خوای گەورە لە شەیتانی رەجمكراو.. ئەمە فەرمانە كە هەر كاتێك وویسترا قورئان بخوێندرێت، دەبێت ئیستیعازەی بۆ بكرێت،، فەرمانیش بۆ واجب بوونە.. كەوابوو ووتنی ئیستیعاوە لە پێش خوێندنی سورەتی فاتیحە لە نوێژدا واجبە. ئەمەش بۆ دەركردنی شەیتان و وەسوەسەو كاریەگەرێتیەكانێتی. مادام ئومێدی ئەوە هەی كە شەیتان بە ووتنی ئیستیعازە دوور بكەوێتەوە كەوابوو خوێندنی واجبە.. ئەمەش بۆچوونی عەتاء و سوفیانی سەوری و ئەوزاعی و داوودی زاهیریی و قەولێكی ئیمامی ئەحمەدە[١].. بەلآم جمهوری شەرعناسان لە پێشەوایانی ترو غەیری ئەوانیش پێیان وایە ووتنی ئیستیعازە پێش خوێندنی سورەتی فاتیحە لە نوێژدا سوونەتە.. سەیر ئەوەیە كە بەلای ئیمامی مالیكەوە هەر نابێت بخوێندرێت[٢]..

---

[١] المحلى (٣/٢٤٧)، المجموع (٣/٢٨١)، الفروع (١/٤١٣)، الانصاف (٢/١٢٠).

[٢] ابن عابدين (١/٣٢٨)، الدسوقي (١/٢٥١)، مغني المحتاج (١/١٥٦)، كشاف القناع (١/٣٣٥)

## دەقێكی ئیستیعازە:

چەندین دەقی ئیستیعازە هەیە كە هەمووی بە سەنەدی راست و دروستەوە سەلمێنراوە، ئیبنو قودامە دەڵێ: بە هەر شێوەیەك ئیستیعازە بڵێ هەر جائیزە.. ئەوەی لێرەدا هەڵێدەبژێرین لە هەموویان زانراوترە كە بریتیە لە: (أعُوذُ باللهِ مِنْ الشَّيطانِ الرَّجيمِ) واتە: پەنا دەگرم لە شەیتانی رەجمكراو..

## ئیستیعازە بە دەنگی نزم دەوترێت:

ئەوەی لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم هاتووەو ئەوەی لە یاوەرانەوە گێرراوەتەوە بە تایبەتی لە چوار خەلیفەی راشیدینەوە خوا لێیان رازی بێت، ئەوەیە كە ئیستیعازە لە نوێژدا بە پەنهانی دەخوێندرێت، موسوڵمانان بەردەوام نوێژی جومعەو جەماعەت و جەژنەكانیان لە دوای ئەم خەلیفە بەرێزانەوە دەكرد، ئەگەر جارێكیان ئیستیعازە بە دەنگی بەرز بخوێندایە ئاشكرا دەبوو حەتمەن ریوایەت دەكرا.. لەگەڵ ئەم رۆشنیەشدا مالیكیەكان ئیستیعازە لە نوێژدا بە دەنگی بەرز دەخوێنن.. ئەم ریوایەتەش دەخوێنن كە بە ئاشكرا نەخوێندراوە: (أعُوذُ باللهِ السَّميع العَلِيمِ مِنْ الشَّيطانِ الرَّجيمِ مِنْ هَمْزِهِ وَنَفْخِهِ وَنَفْثِهِ)[١].. واتە: پەنا دەگرم بە خوای بیسەرو زانا لە شەیتانی رەجمكراو، لە سەرلێشێواندنی و لە فووی جادویی و لە وەسوەسەی ..

---

[١] شێخی ئەلبانی لە سەنەدەكانی كۆڵیەوەتەوەو لە ارواء الغليل (٣٤٢) دا بە سەحیحی ناساندووە.

## ئایا ئیستیعازە لە هەموو رکاتێکدایە؟

زۆرینەی شەرعناسان وەکو ئیبنو حەزم فەرموویانە: هەر لە رکاتی یەکەمدا واجبە[١]. هەندێکی تریان لەوانەی پێیان وایە ووتنی لە نوێژدا واجبە، وەکو ئیبنوسیریین دەڵێن: لە هەموو رکاتەکاندا واجبە، چونکە فاتیحە قورئانەو لەگەڵ هەموو قورئان خوێندنێکیشدا ووتنی ئیستیعازە واجبە[٢].. ئیمامی شافیعی دەڵێ: باشتر وایە لە هەموو رکاتێکدا بیڵێت[٣]..

منیش ئەمەم پێ پەسەندترە.. پێشم و ایە لە هەموو رکاتەکاندا هەر سووننەتە. والله اعلم..

*　　*　*

---

[١] المحلی (٢٥٤/٣).

[٢] الوسط (٨٩/٣).

[٣] الام (٢٠٩/١)، المجموع (٢٧٩/٣)، المهذب (٢٣٧/١).

## واجبەکانی نوێژ:

# واجبی سێیەم

## ووتنی ئامین لە دوای خوێندنی سورەتی فاتیحە

جمهوری شەرعناسانی دەڵێن: ووتنی ئامین لە نوێژدا لە دوای خوێندنی سورەتی فاتیحە، سوونەتە، بەڵام هەندێکیان فەرموویانە واجبە، چونکە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: (إذا أمَّنَ الإمَامُ فأمِّنوا، فإنَّ مَنْ وَافقَ تأمينهُ تأمِينَ المَلائِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تقَدَّمَ مِنْ ذَنبهِ)[١] واتە: ئەگەر پێشنوێژ ووتی ئامین، ئێوەش بیڵێنەوە، هەر کەسێك ئامین ووتنەکەی بکەوێتە ساتی ئامین ووتنی فریشتەکانەوە لە گوناحی رابوردووی دەبوررێت..

ئیبنوحەزم دەڵێ: لەسەر مەئمووم واجبە ئامینەکە بڵێتەوە، ئەمما پێش نوێژ ئەو کەسەی بە تەنها نوێژی خۆی دەکات سوونەتە بۆیان بیڵێن[٢]..

- (انَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ كَانَ إذَا انْتهَى مِنْ قِرَاءَةِ الْفَاتِحَةِ قَالَ (آمِينْ) يَجْهَرُ بهَا وَيَمِدُّ بهَا صَوْتهُ)[٣] واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە لە خوێندنی سورەتی فاتیحە دەبۆوە بە دەنگی بەرز دەیفەرموو: ئامیین، دەنگیشی لەگەڵدا درێژ دەکردەوە..

---

[١] بوخاری (٧٨٠)، موسلیم (٤١٠)..

[٢] ابن عابدين (٣٢٠/١)، الدسوقي (٢٤٨/١)، مغني المحتاج (١٦٠/١)، كشاف القناع (٣٣٩/١)، المحلى (٢٦٢/٣)، نيل الاوطار (٢٥٨/٢).

[٣] ئەبوداوود (٩٣٢) ئەلبانی بە سەحیحی ناساندووە: صفه الصلاه (ل ١٠١)..

پێم وایە ووتنی ئامین لە دوای خوێندنی فاتیحە لە نوێژدا سوونەتە نەك واجب.. واللە اعلم.. قسەی ئەوانە كە دەڵێن ئامین لە قورئاندا نیەو ووتنی نوێژ بەتاڵ دەكاتەوە، وەرناگیرێت، چونكە بەڵگەكان گومانیان تێدا نیەو نكووڵی ناكرێن.

*　　*　*

## واجبەکانی نوێژ:

# واجبی چوارەم و پێنجەم و شەشەم

## تەکبیرەی بزاوتەکان، سمع الله لمن حمده، ربنا لك الحمد

١ ـ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە یاوەرانی بەڕێزی دەفەرموو: ئەگەر ئیمام تەکبیری کرد ئێوەش بیڵێنەوە: (وَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا.. وَإِذَا قَالَ سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ فَقُولُوا: اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ)[١].. ئەوانیش لە دوای ئەوە تەکبیریان دەکردەوەو دەچوونە روکنەکانی نوێژ ..

٢ ـ سەلمێنراوێکی بەڵگەنەوویستە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەردەوام لە نوێژەکانیدا تەکبیری بۆ روکنی نوێژەکانی دەکرد، وەکو لە فەرموودەی ئەبوبەکری کوڕی عبدالرحمانی کوڕی حارسدا هاتووە کە وەکو ریوایەتەکانی سەیدنا ئەبو حەمیدی ساعیدیە خوا لێی رازی بێت، کە دەڵێ: گوێم لێبوو ئەبو هورەیرە دەیفەرموو: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ يُكَبِّرُ حِينَ يَقُومُ ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْكَعُ ثُمَّ يَقُولُ سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ حِينَ يَرْفَعُ صُلْبَهُ مِنْ الرَّكْعَةِ ثُمَّ يَقُولُ وَهُوَ قَائِمٌ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ صَالِحٍ عَنْ اللَّيْثِ وَلَكَ الْحَمْدُ ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَهْوِي ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَسْجُدُ ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ ثُمَّ يَفْعَلُ ذَلِكَ فِي الصَّلَاةِ كُلِّهَا حَتَّى يَقْضِيَهَا وَيُكَبِّرُ حِينَ يَقُومُ مِنْ الثِّنْتَيْنِ بَعْدَ الْجُلُوسِ)[٢] واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کە

---

[١] بوخاری (٧٢٢)، موسلیم (٤٠٩).

[٢] بوخاری (٢٨٩)، موسلیم (٣٩٢).

هەڵدەستا بۆ نوێژ تەکبیری دەکردو (نوێژەکەی دادەبەست)، ئینجا کە دەیوویست بچێتە رکووع تەکبیری دەکرد، کە هەڵدەستایەوە بۆ راوەستانی دوای رکووع دەیفەرموو سمع الله لمن حمده، کە رێك دەوەستایەوە دەیفەرموو: ربنا لك الحمد.. ئینجا کە دەچووە سوجدە تەکبیری دەکردەوە، کە سەری لە سوجدە بەرز دەکردەوە تەکبیری دەکرد، کە دەچووەوە سوجدە دیسان تەکبیری دەکرد، ئینجا کە هەڵدەستیاەوە سەر پێ تەکبیری دەکردەوە.. ئیتر ئاوا تا نوێژەکەی تەواو دەکرد، تەکبیری دەکرد..

٣ ـ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە یاوەرانی بەرێزی دەفەرموو (صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي)[١] واتە: نوێژ وا بکەن وەکو کە من دەبینن نوێژ دەکەم..) هەموویان ئاوا تەکبیریان لە نوێژەکانیاندا دەکرد..

٣ ـ فەرموودەی خاوەن نوێژەهەڵەکە هەموو ئەو تەکبیر کردنانەی تێدایە: (إِنَّه لا تَتِمُّ صَلاةٌ لأَحَدٍ مِنْ النَّاسِ حَتَّى يَتَوَضَّأَ فَيَضَعُ الوُضُوءَ مَوَاضِعَهُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ، وَيَحْمِدُ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ وَيُثْنِي عَلَيهِ، وَيَقْرَأُ بِمَا شَاءَ مِنْ الْقُرْآنِ ثُمَّ يَقُولُ اللهُ أَكْبَرُ، ثُمَّ يَرْكَعُ حَتَّى تَطْمَئِنُّ مَفَاصِلَهُ، ثُمَّ يَقُولُ سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، حَتَّى يَسْتَوِي قَائِماً ثُمَّ يَقُولُ اللهُ أَكْبَرُ، ثُمَّ يَسْجُدُ حَتَّى تَطْمَئِنَّ مَفَاصِلَهُ، ثُمَّ يَقُولُ اللهُ أَكْبَرُ، وَيَرْفَعُ رَأْسَهُ حَتَّى يَسْتَوِي قَاعِداً، ثُمَّ يَقُولُ اللهُ أَكْبَرُ ثُمَّ يَسْجُدُ حَتَّى تَطْمَئِنَّ مَفَاصِلُهُ ثُمَّ يَرْفَعُ رَأْسَهُ فَيُكَبِّرُ، فَإِذَا فَعَلَ ذَلِكَ فَقَدْ تَمَّتْ صَلاتُهُ)[٢] .

---

[١] بوخاری (٥٩٥).

[٢] ئەبوداوود (٨٥٩)، نەسائی (٢/٢)، ترمزی (٣٠٢)، ئیبنوماجە (٤٦٠). سەحیحە: صحيح فقه السنة (٣٣٤/١). بڕوانە پەڕاوێزی ژمارە (٧٤ و ٧٥)

٤ ـ تەكبیر نیشانەی تەواوبوونی روكنێكی نوێژو دەسپێكی روكنێكی ترێتی، یان كۆتایی رەفتارێك و دەسپێكی رەفتارێكی تری نوێژە[1].

ووتنی ئەم سێیە (**تەكبیری بزاوتەكان، سمع الله لمن حمده، ربنا لك الحمد**) لای جمهوری شەرعناسان سووننەتەو لای حەنبەلیەكان واجبە[2]..

من پێم وایە بەڵگەی جمهور بەهێزترەو ووتنی ئەو سێیە سووننەتە.

والله اعلم.

* * *

---

[1] ئیبنوعوسێمین: الشرح الممتع (٣/٤٣٢).

[2] ابن عابدین (١/٣٣٤)، الدسوقي (١/٢٤٣)، مغني المحتاج (١/١٦٥)، كشاف القناع (١/٣٤٨).

## واجبەکانی نوێژ:

# واجبی حەوتەم

## سوبحانەالله کردن لە رکووع و سوجدەدا

واتە ووتنی (سُبْحَانَ رَبِّي الْعَظِيمِ) لە رکووع و(سُبْحَانَ رَبِّي الأَعْلَى) لە سوجدەدا.. جمهوری شەرعناسان پێیان وایە سووننەتەو ئیمامی ئەحمەدو ئیسحاق و داوودو ئیبنوحەزم پێیان وایە واجبە[1]، بەڵگەشیان:

١ ـ فەرموودەکەی سەیدنا عوقبەی کوڕی عامرە کە دەڵێ: (رَوَى أبوداوَدَ موسى بنُ أيُّوبَ الغافِقي قالَ: سَمِعْتُ عَمِّي إيَّاسَ بنَ عَامِرٍ يَقولُ: سَمِعْتُ عُقْبَةَ بنَ عَامِرٍ الجُهَنِي يَقولُ: لَمَّا نَزَلَتْ (فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ) قَالَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ:اجْعَلُوها فِي رُكُوعِكُمْ.. فَلَمَّا نَزَلَتْ: (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى) قَالَ: اجْعَلُوها فِي سُجُودِكُمْ)[2] واتە: کە ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە کە دەفەرموێ: (دەی سا بە ناوی خوای مەزنتەوە ستایش بکە) پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: بیخەنە رکووعەکانتانەوە، کە ئەو ئایەتەش دابەزیە خوارێ، کە دەفەرموێ: (بە ناوی خوای باڵاتەوە ستایشی خوای گەورە بکە) فەرمووی: بیخەنە

---

[1] ابن عابدين (٤٧٤/١)، مواهب الجليل (٥٢٥/١)، الام (١٠١/١)، المجموع (٤١٠/٣).

[2] ئیمامی ئەحمەد (١٥٥/٤)، ئەبوداوود (٨٦٩)، ئیبنوماجە (٨٨٧)، ئیبنوخوزەیمە (٦٠٠)، ئیبنوحیببان (١٨٩٨)، حاکم (٣٤٧/١) فەرموشیەتی: صحيح الاسناد، هەروەها ئیمامی نەوەوی لە: المجموع (٣٧٢/٣) دا فەرموویەتی سەحیحە، ئیمامی ئیبنوحەجەر لە: التهذيب (١٩٦/١) دا فەرموویەتی: (قال العجليُّ: لا بأس به، وذكره ابن حبَّان في الثقات، وصحَّح له ابن خزيمة) بەڵام شێخی ئەلبانی بە زەعیفی داناوە لە: الارواء (٣٣٤). بەڵام دیارە فەرموودەکە بە کۆی سەنەدەکانی تری بەهێز دەبێت..

سوجدەكانتانەوە.. ئەم پۆلە شەرعناسە بەڕێزە دەڵێن: ئەمە فەرمانی خواو پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم بۆیە بە واجب دەبێت وەرگیرێت، بەڵام ئەوەی هەیە كە توانج لە قبووڵێتی خودی فەرموودەكە دراوە، بۆیە بە تەنها ناكرێت بكرێتە بەڵگەی فەرز كردنی خواپەرستیەك..

٢ ـ فەرموودەكەی سەیدنا ئیبنوعەبباس خوا لێیان رازی بێت كە دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (أَلَا وَإِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَقْرَأَ الْقُرْآنَ رَاكِعًا أَوْ سَاجِدًا أَمَّا الرُّكُوع فَعَظِّمُوا فِيهِ الرَّبَّ وَأَمَّا السُّجُودُ فَاجْتَهِدُوا فِي الدُّعَاءِ فَقَمِنٌ أَنْ يُسْتَجَابَ لَكُمْ )[1] واتە: من ڕێی ئەوەم لێگیراوە كە قورئان لە كاتی ركووع و سوجدەبردنمدا بخوێنم، بۆیە ئێوە لە ركووعدا خوا بە مەزن بگرن و لە سوجدەكانیشتاندا دوعای زۆری تێدا بكەن، ئومێد زۆرە كە دوعاكانتان گیرابێت..

٣ ـ فەرموودەكەی سەیدنا حوزەیفە خوا لێی رازی بێت كە دەفەرموێ: (صَلَّيْتُ مَعَ رَسولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ فَرَكَعَ، فَقَالَ فِي رُكُوعِهِ: سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظيمِ، وَفِي سُجُودِهِ: سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى)[2] واتە: نوێژم لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم كرد، لە ركووعیدا دەیفەرموو (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ) لە سوجدەكانیشیدا دەیفەرموو: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى)..

---

[1] موسلیم (٧٣٨)، نەسائی (١٠٣٥)، ئەبوداوود (٧٤٢)، ئیبنوماجە (٣٨٨٩)، ئیمامی ئەحمەد (١٨٠١)، داریمی (١٣٩١).

[2] موسلیم (٥٣٦/١)، ترمزی (٢٦٢)، ئەبوداوود (٨٧١)، نەسائی (٢٢٦/٣)، ئیبنوماجە (٨٨٨).

پێم وانیە ووتنی (سُبْحَانَ رَبِّي الْعَظِيمِ) لە ركووع و(سُبْحَانَ رَبِّي الأعْلَى) لە سوجدەی نوێژدا واجب بن، چونكە بەلگەیەكی زۆر بەهێز فەرمانیان پێ ناكات.. والله اعلم..

## واجبەکانی نوێژ:

## واجبی هەشتەم و نۆیەم

## تەحیاتی ناوەڕاست و دانیشتن تێیدا

بەڵگە لەسەر ئەوە زۆرە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی بە نوێژخوێن دەکرد: (فَإِذَا جَلَسْتَ فِي وَسَطِ الصَّلَاةِ فَاطْمَئِنْ وَافْتَرِشْ فَخِذَكَ الْيُسْرَى ثُمَّ تَشَهَّدْ)[١] واتە: ئەگەر لە ناوەڕاستی نوێژدا دانیشتیت، پێی چەپت راخە و ئارام بگرە تا ئەندامانی جەستەت دەسرەون، ئینجا تەحیات بخوێنە..

ئیمامی ئەحمەدو ئیسحاق و لەیسی کوڕی سەعدو ئەبو سەورو داوودو ئیبنو حەزم هەموو پێیان وایە کە تەحیاتی ناوەڕاست واجبە، بەڵام باقی جمهوری شەرعناسان، لەوانیش سێ پێشەواکەی تری شەرع پێیان وایە سووننەتە[٢].. وا دیارە بەڵگەی جمهور بەهێزتر بێت، چونکە ئەوە سەلمێنراوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە تەحیاتی ناوەڕاستی نەخوێند بە سوجدەی سەهوو جەبرانی کردەوە[٣] و نە نوێژەکەی کردەوەو نە رکاتێکی تر: (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى بِهِمْ الظُّهْرَ ، فَقَامَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ ، وَلَمْ يَجْلِسْ ، فَقَامَ النَّاسُ مَعَهُ ،

---

[١] ئەبوداوود (٨٦٠)، بەیهیقی (١٣٣/٢) شێخی ئەلبانی لە الارواء (٣٣٧) دا بە سەحیحی داناوە..

[٢] المحلى (٢٦٨/٣)، المجموع (٤٣٠/٣).

[٣] ئیبنو عوسێمین: الشرح الممتع (٤٤١/٣).

فَلَمَّا قَضَى الصَّلَاةَ وَانْتَظَرَ النَّاسُ تَسْلِيمَهُ كَبَّرَ وَهُوَ جَالِسٌ ، فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ)[١]..

لەبەر ئەم بەلگانە پێم وایە تەحیاتی ناوەڕاست و دانیشتنەکەی سوونەتەو بە دەنگی نزمیش دەبێت بخوێندرێت[٢] .. والله اعلم..

## وێردەکانی تەحیاتی ئەخیر:

چەندین ریوایەتیان هەیە، بەناوبانگترین و بەهێزتریان ئەمەیە کە لە سەیدنا ئیبنومەسعودەوە گێڕراوەتەوە:

ـ (التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا اللَّهُ ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ)[٣] واتە: سڵاوو ستایش بۆ خوایە، هەروەها پاڕانەوەو پاکیی، سڵاوو بەزەیی و بەرەکەتی خوات لێ بێت ئەی پێغەمبەری خوا، سڵاو لە ئێمەو لە بەندە پێاوچاکەکانیش، شایەتی دەدەم کە تەنها خوای تاك و پاك شیاوی خوایەتییەو هیچی تر شایانی خوایەتی نیە، شایەتی دەدەم کە موحەممەد بەندەو نێرراوی خوایە.. ئەمە فەرزی تەحیات خوێندنە، تەحیاتی ناوەڕاست و ئەخیر بێ ئەمە نایاتە دی.

بەڵام تەحیاتی ئەخیر بەرەکەتی زیادەی تری لەگەڵدایە وەکو کە لە ریوایەتی سەیدنا سەعدی کوڕی عوبادەدا خوا لێی رازی بێت هاتووە کە لە پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم پرسی: چۆن سەڵاواتت لێ بدەین؟ فەرمووی: (قُولُوا: اللهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيتَ

---

[١] بوخاری (١٢٣٠)، موسلیم (٥٧٠).
[٢] المبسوط (٣٢/١)، الاوسط (٢٠٧/٣)، المجموع (٤٤٤/٣).
[٣] بوخاری (٦٢٦٥)، موسلیم (٤٠٢)

عَلَى آلِ إبراهيمَ وَبَارِكْ عَلَى محَمَّدٍ وَعَلى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إبراهيمَ فِي الْعَالَمِينَ إنَّكَ حَمِيدٌ مَجيدٌ والسَّلامُ كَمَا عَلِمْتمْ)[1] واته: بڵێن: خوای ڕێزو لێبوردنت بە موحەممەدو خانەوادەی موحەممەد ببەخشە، هەر وەك کە بە خانەوادەی ئیبراهیمت بەخشی، خوایە بەرەکەتی خۆت بڕژە بەسەر موحەممەدو خانەوادەیدا هەر وەکو کە بەسەر ئیبراهیم و خانەوەدەیدا ڕژاندت، تۆ سوپاسکراوو بەڕێزیت.. سڵاو کردنیش ئەوەیە کە دەیزانن..

کەوابوو ئەو تەحیاتەی لە کۆتایی نوێژدا دەخوێندرێت ئەمەیە:

ـ (التَحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتهُ، السَّلامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إلا اللَّهُ ، وَأَشْهَدُ أنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ اللهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيتَ عَلَى آلِ إبراهيمَ وَبَارِكْ عَلَى محَمَّدٍ وَعَلى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إبراهيمَ فِي الْعَالَمِينَ إنَّكَ حَمِيدٌ مَجيدٌ) .

★ ★ ★

---

[1] ئیمامی ئەحمەد (٤/١١٨و ٥/٢٧٤)، بوخاری (٦/٢٧ و ٧/١٥٧)، موسلیم (١/٣٠٥ و ٣٠٦)، نەسائی (٣/٤٥).

## سوونندتەکانی نوێژ

**کورتە باسێك:** سوونندتەکانی نوێژ بریتین لەو گوفتارو رەفتارانەی کە باشتر وایە لە نوێژەکەدا بکرێن، بکەر بە کردنیان پاداشت دەدرێتەوەو بە نەکردنیان ـ بە ئەنقەست و بە لەبیرچوون ـ سزا نادرێت، نەکردنیشیان سوجدەی سەهووی ناوێت..

سوونندتەکانی نوێژ زۆرو جۆراو جۆرن، هەیانە کۆڕای لەسەرەو هەیانە راجوێیی شەرعناسانی لەسەرە.. لەبەر گەورە نەبوونی قەبارەی کتێبەکە نامەوێت هەموویان باس کەم، بەڵکو تەنها ئەوانەی کە بەڵگەی بەهێزتریان لەسەرە، ئەمانیش بێ رەددو بەدەلی شەرعناسان باس دەکەم مەگەر کەمێك، چونکە مەبەست لێرەدا زانینی هەندێك لەو سوونندتانەن کە پێغەمبەری پێشەوا بەردەوام پێیانەوە پابەند بووە، تا ئەوانەی هیممەت بەرزترن هەوڵ بدەن پێوەی پابەند بن و بشزانن کە سوونندتن تا بە زۆر خەڵکانێکی بەردەستیان ناچار نەکەن پێوەی پابەند بن!

سوونندتەکانی نوێژ دوو پۆلن: سوونندتە گوفتارییەکان وسوونندتە کردارییەکان..

## سوونەتەکانی نوێژ:

# سوونەتە گوفتارەکان

# ( السنن القولیه )

### ١ـ قورئان خوێندنی دوای سورەتی فاتیحە :

بە کۆڕای شەرعناسان سوونەتە دوای خوێندنی سورەتی فاتیحە لە رکاتی یەکەم و دووەمی نوێژدا سورەتێکی تر (یان چەندین ئایەت لە سورەتێکی تر) بخوێندرێت:

ـ سەیدنا ئەبو قەتادە خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتِينِ الأُولَيَينِ مِنْ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ بِفَاتِحَةِ الْكِتابِ وَسُورةٍ  وَيُسَمِّعُنا الآيَةَ أحْيَاناً، وَيَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتينِ الأخِيرَتينِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ)[١] واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە رکاتی یەکەم و دووەمی نوێژی نیوەڕۆو عەسردا سورەتی فاتیحەو سورەتێکی تری دەخوێند، جاری وا هەبوو دەنگی بەرز دەکردەوە تا بیبیستین، لە دوو رکاتەکەی دواییشدا هەر سورەتی فاتیحەکەی دەخوێند..

ـ هەندێك شەرعناسی تر لایەنگیری ئەوەن کە لە رکاتی سێیەم و چوارەمیشدا خوێندنی سورەتێك لە دوای خوێندنی فاتیحە جائیزە.. بەڵام لە دوو رکاتی یەکەمیاندا زیاتر لە دوو رکاتی سێیەم و چوارەمیان دەخوێنێت:

---

[١] بوخاری (٧٥٩)، موسلیم (٤٢١).

ـ سەیدنا ئەبو سەعیدی خودری خوا لێی رازی بێت دەفەرموێ: (كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ يَقرَأُ فِي صَلاةِ الظُّهْرِ فِي الرَّكْعَتَينِ الأوْلَيَينِ
فِي كُلِّ رَكْعَةٍ قَدْرَ ثلاثِينَ آيَةٍ وَفِي الأُخْرَيَينِ قَدْرَ خَمْسَ عَشْرَةَ آيَةً)[1] واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە دوو ركاتی یەكەمی نوێژی نیوەڕۆدا نزیكەی سی ئایەتی دەخوێند، لە دوو ركاتەكەی تردا نزیكەی پازدە ئایەتی دەخوێند..

لە سوننەتەوە دیارە كە قورئان لە ركاتی یەكەم و دووەمدا زۆرتر دەخوێندرێت وەك لە ركاتی سێیەم و چوارەم..

سوونەتە قورئان خوێندنی ناو نوێژەكە هێدی و لەسەرخۆ بێت نەك بە پەلەپەل و خێرایی.. چونكە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا﴾ المزمل/٤ واتە: قورئان لەسەرەخۆ بخوێنە..

## سوونەتە وەڵامی هەندێك ئایەت بداتەوە:

ـ بۆ نموونە: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴾ الاعلى/١ دەڵێ: سوبحانەالله..

ـ لە وەڵامی: ﴿أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧىَ ٱلْمَوْتَىٰ﴾ القيامة/٤٠ دا دەڵێ: (سُبْحَانَكَ فبَلَى) چونكە بەڵگەیان لەسەرە، بەڵام كە لە كوردەوەرایدا لە وەڵامی: ﴿أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَحْكَمِ ٱلْحَٰكِمِينَ﴾ التين/٨ دا دەڵێن: (بَلَى وَانَا عَلَى ذَلِكَ من الشَّاهِدِينَ الشَّاكِرِين) هیچ بەڵگەیەكی لەسەر نیە ئەو زیكرەی پێ بچەسپێت.. یان هەندێك كەس لە وەڵامی: ﴿فَبِأَيِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ﴾

---

[1] موسلیم (٤٥٢).

المرسلات/٥٠ دا دەڵێن: (آمَنّا باللهِ) یان لە وەڵامی ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ الفاتحة/٥ دا دەڵێن: (اسْتعَنْتُ باللهِ) ئەمانە هیچ بەڵگەیەکی شەرعییان لەسەر نیە بۆیە باشت روایە موسوڵمان نەیانڵێت، تا نەبێتە داهێنەر یان رەواج پێدەری بیدعەیەك..

## ٢ ـ زیکرەکانی رکووع:

ئەمانەی خوارەوە لەو زیکرانەن کە پێغەمبەری خوا لە رکوعدا دەیخوێندن.. دیارە زیکرەکان و جۆرییان زۆرن، بەڵام ئێمە لێرەدا هەندێکیان لە (أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه وسلم (٢/٦٥٠)) شێخی ئەلبانی رەحمەتیەوە نەقڵ دەکەین، کە لە هەموو فەرموودەوان و شەرعناسان زیاتر بە توێژینەوەو سەلماندنیانەوە ماندوو بووە:

١ ـ (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ) سێ جار[١].

٢ ـ (سُبْحَانَ رَبِّي الْعَظِيمِ وَبِحَمْدِهِ) ئەمەشیان سێ جار.

٣ ـ (سُبّوحٌ، قُدُّوسٌ، رَبُّ الملائِكَةِ والرُّوحِ).

٤ ـ (سبحانك اللهم ربنا وبحمدك، اللهم اغفر لي).

٥ ـ (اللَّهُمَّ لَكَ رَكَعْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَلَكَ أَسْلَمْتُ، أَنْتَ رَبِّي، خَشَعَ لَكَ سَمْعِي وَبَصَرِي، وَمُخِّي وَعَظْمِي وَعَصَبِي، وَمَا اسْتَقَلَّتْ بِهِ قَدَمِي ؛ للهِ رَبِّ العَالَمِينَ).

---

[١] شێخی ئەلبانی سێ جارەکەی دەسەلمێنێت و بەڵگەی شەرعناسانی وەکو ئیمامی ئیبنولقەییم (كتاب الصلاة ل ١٩١)لاواز دەکاتەوە کە پێیان وایە ئەو زیکرە ژمارەی تایبەتی نەبووە.. الالباني: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٢/٦٥٠).

بزانە كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەرهەڵستی یاوەرانی دەكرد كە قورئان لە ركوعیاندا بخوێنن.. بۆیە نابێت لە ركووعدا قورئان بخوێندرێت[١]..

**٣ ـ زیكرەكانی هەستانەوەی دوای ركووع و دوای ( سمع الله لمن حمده ):**

١ ـ (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) واتە: خوای گەورە ئەو كەسەی بیست كە ستایشی كرد.. ئینجا كە قامەتی راست دەكردەوەو دەسرەوت دەیفەرموو: (رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ)[٢] واتە: دەی سا خوایە هەموو جۆرێكی سوپاس و ستایش هەر بۆ تۆیە.. یان (اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ)[٣].. ئەمە زیكرێكی گەورەیەو جێ بایەخی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بووەو زۆر جار یاوەرانی لەسەر هانداوە.دەیفەرموو: (فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ قَوْلُهُ قَولَ الْمَلَائِكَةِ؛ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ)[٤] واتە: خوێندنی هەر كەسێك لەگەڵ خوێندنی فریشتەكاندا هاوكات بێتەوەو ببێتە مایەی لێخۆشبوونی خوای گەورە لە هەموو ئەو گوناحانەی كردووتانن..

٢ ـ جاری واش هەبوو ئەم زیكرەی بە دوایدا دەخوێند: (مِلْءَ السَّمَاوَاتِ، وَمِلْءَ الأَرْضِ، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ)[٥].

٣ـ یان ئەم زیكرە: (مِلْءَ السَّمَاوَاتِ، ومِلْءَ الأَرْضِ، ومِلْءَ ما بَيْنَهُمَا، ومِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ).

---

[١] موسلیم(٤٨/٢)، ئەبوداوود (١٧٤/٢)، نەسائی (١٦٠/١).
[٢] بوخاری (٢١٦/٢)،موسلیم(٨/٢)، نەسائی (١٧٢/١). بوخاری (٢٢٥/٢)، موسلیم (١٧/٢)، مالك (١١١/١/)، ئەبوداوود (١٧٤/٢)، نەسائی (١٦٠/١)
[٣] موسلیم(١٩/٢).
[٤] بوخاری (٢٢٥/٢)، موسلیم (١٧/٢)، مالك (١١١/١/)، ئەبوداوود (١٧٤/٢).
[٥] موسلیم (٤٦/٢)، ئەبوعەوانە (١٧٧/٢)، ئەحمەد (٣٥٥/٤).

٤ـ جاری وا هەبوو لە دوای ئەمەشەوە دەیفەرموو: (مِلْءَ السَّمَاوَاتِ، ومِلْءَ الأرضِ، ومِلْءَ ما بَينَهُمَا، ومِلْءَ مَاشِئتَ مِنْ شَيءٍ بَعْدُ أهْلُ الثَّناءِ وَالْمَجْدِ، لامَانِعَ لِمَا أعْطَيْتَ، وَلا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، ولا يَنْفَعُ ذَا الجَدِّ مِنْكَ الجَدُّ).

٥ـ جارێكیان كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە نوێژەكەدا فەرمووی: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) یاوەرێك لە ناو نوێژەكەدا فەرمووی: (رَبَّنَا وَلَكَ الحَمْدُ؛ حَمْدَاً كَثِيراً طَيِّبَاً مُبَارَكَاً فِيهِ، مُبَارَكَاً عَلَيهِ؛ كَمَا يُحِبُّ رَبُّنَا وَيَرْضَى) كە لە نوێژەكە بوونەوە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پرسی: ئەوە پێش ئێستا ئەوەی ووت؟ كابرا فەرمووی: من، ئەی پێغەمبەری خوا.. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (لَقَدْ رَأيْتُ بِضْعَةً وَثَلاثِينَ مَلَكَاً يَبْتَدِرُونَهَا؛ أيُّهُمْ يَكْتُبُهَا أوَّلاً) واتە: سیو قسوور فریشتەم بینی لەناو خۆیاندا كێبڕكێییان بوو كە كامیان دەسپێشخەر بێت و یەكەمین كەس تۆماری كات..

**٤ ـ زیكرەكانی سوجدە:**

كە بە یەكێك لەمانەی خوارەوە دێتە دی، كە لە كتێبە دەگمەنەكەی شێخی ئەلبانی رەحمەتیەوە نەقڵیان دەكەم[١]:

١ ـ (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأعْلَى) سێ جار..

٢ ـ (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأعْلَى وَبِحَمْدِهِ) سێ جار

٣ـ (سُبُّوحٌ قُدُّوسٌ، رَبُّ الْمَلائِكَةِ والرُّوحِ).

٤ـ (سبحانك اللهم ربنا وبحمدك، اللهم اغفر لي).

---

[١] الالباني: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٧٦١/٢).

٥ـ (اللَّهُمَّ لَكَ سَجَدْتُ؛ وَبِكَ آمَنْتُ، وَلَكَ أَسْلَمْتُ، وَأَنْتَ رَبِّي، سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ وَصَوَّرَهُ، فَأَحْسَنَ صُوَرَهُ، وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ فَتَبَارَكَ اللهُ أَحْسَنَ الْخَالِقِينَ).

٦ـ (اللَّهُمَّ اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُوراً، وَفِي لِسَانِي نُوراً، واجْعَلْ فِي سَمْعِي نُوراً، واجْعَلْ فِي بَصَرِي نُوراً، واجعلْ مِنْ تحْتِي نُوراً، واجْعَلْ مِنْ فَوقِي نُوراً، وعَن يَمينِي نُوراً، وَعَنْ يَسَارِي نُوراً، وَاجْعَلْ أَمَامِي نُوراً، واجْعَلْ خَلْفِي نُوراً، وَاجْعَلْ فِي نَفْسِي نُوراً، وَأَعْظِمْ لِي نُوراً).

٧ـ (اللَّهُمَّ إنِّي أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ، وَأَعُوذُ بِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْكَ، لا أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيكَ، أَنْتَ كَمَا أَثْنَيتَ عَلَى نَفْسِكَ).

٨ـ هەروەها: (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي كُلَّهُ، دِقَّهُ وَ جِلَّهُ، وَأَولَهُ آخِرَهُ، وَ عَلانِيَّتَهُ وَ سِرَّهُ)[١].

### ٥ ـ دوعای نێوانی سوجدەكان:

ئیمامی نەوەوی رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ[٢]: ئەوە سەلمێنراوە كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەندێ جار یەكێك لەم حەوت زیكرانەی تێدا دەخوێند، ئێمە دوانیان دێنینەوە:

١ ـ (رَبِّ اغْفِرْ لِي، رَبِّ اغْفِرْ لِي)[٣].

---

[١] موسلیم (٤٨٣).

[٢] النووی: المجموع (٣/٤٩٧).

[٣] ئیبنوماجە (١/٢٩٠) شێخی ئەلبانی دەبارەی دەفەرموێ: (هذا الاسناد صحيح، رجاله كلهم ثقات).

٢ـ (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، وَارْحَمْنِي، وَاجْبُرْنِي، وِارْفَعْنِي، وَاهْدِنِي، وِعافِنِي، وِارْزُقْنِي)[١]

**٦ ـ سەلاواتدانی ناو تەحیات:**

وەکو:

١ ـ (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى محمدٍ، وعَلَى آلِ محمدٍ؛ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إبْرَاهِيمَ وعَلَى آلِ إبْرَاهِيمَ، إنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ. اللَّهُمَّ بَارِكَ عَلَى محمدٍ، وعَلَى آلِ محمدٍ؛ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إبراهِيمَ، وَعَلَى آلِ إبْراهِيمَ، إنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ)[٢].

٢ ـ (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى محمدٍ، وَعَلَى آلِ محمدٍ، وَبَارِكْ عَلَى محمدٍ، وَعَلَى آلِ محمدٍ؛ كَمَا صَلَّيْتَ وَ بَارَكْتَ عَلَى إبراهِيمَ، وَآلِ إبراهِيمَ، إنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ)[٣].

**٧ ـ دوعای دوای تەحیاتی ئەخیر:**

١ ـ بەم دوعایە دەست پێ دەکەم کە نیوەی نوێژخوێنانی کورد دەیخوێنن و الحمدلله سەنەدەکەی تەواوە:

ـ (اللَّهُمَّ حَاسِبْنِي حِسَاباً يَسِيراً)[٤]

٢ـ زۆر جار پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم یاوەرانی فێری دوعای تایبەت دەکرد، لەوانە ئەم دوعایەی دوای تەحیاتی نوێژە کە

---

[١] ئەبوداوود (١/١٣٥)، ترمزی (٢/٧٦)، وئیبنوماجە (١/٢٩٠)، الحاكم (١/٢٦٢ و ٢٧١)، وبەیهیقی (٢/١٢٢)، وئیمامی ئەحمەد (١/٣١٥ و ٣٧١).

[٢] بوخاری (٦٣٥٧)، موسلیم (٤٠٦).

[٣] نەسائی (٤٧/١٥٩)، تەحاوی (٣/٧٥) ئەلبانی دەفەرموێ: (وهذا إسناد صحيح على شرط مسلم).

[٤] ئیمامی ئەحمەد (٦/٤٨)، الحاكم (١/٢٥٥) شێخی ئەلبانی لە (أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٣/١٠٠٨).) دا دەفەرموێ: (هذا إسناد جيد).

ئیبنوعەبباس خوا لێی رازی بێت دەڵێ: وەکو سورەتێکی قورئان فێری یاوەرانی دەکرد[١] کە دەفەرموێ:

ـ (اللّهُمَّ إنّي أعُوذُ بكَ مِنْ عذَابِ جهَنّمَ، وَمِنْ عذابِ القَبْرِ، وَمِنْ فِتنَةِ المَحْيَا والمَمَاتِ، وَمِنْ شَرِّ فِتنَةِ المَسِيحِ الدَّجَّالِ)[٢].دوای ئەمە دوعای تر بۆ خۆت دەکەیت..

٣ـ سەیدنا ئەبوبەکری سددیقشی فێر کرد خوا لێی رازی بێت کە لە دوای کۆتایی تەحیات ئەم دوعایە بخوێنێت:

ـ (اللّهُمَّ إنّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْماً كَثِيراً، وَلا يَغفِرُ الذُّنُوبَ إلّا أنتَ؛ فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِندِكَ، وَارْحَمْنِي إنّكَ أنتَ الغَفُورُ الرَّحِيمُ)

ـ (اللّهُمَّ بعلْمِكَ الغَيبِ، وقُدْرَتِكَ عَلَى الخَلْقِ؛ أحْيِنِي مَا عَلِمْتَ الحياةَ خَيراً لِي، وَتوَفَّنِي إذَا كَانَتِ الوَفَاةُ خَيراً لي. اللّهُمَّ وأسَألُكَ خَشْيَتَكَ في الغَيبِ والشَّهادَةِ، وَأسألُكَ كَلِمَةَ الحَقِّ وَالعَدْلِ في الغَضَبِ والرِّضَى، وأسألُكَ القَصْدَ في الفَقْرِ وَالغِنَى، وَأسألُكَ نَعِيماً لا يَبِيدُ، وَأسْألُكَ قُرَّةَ عَينٍ لا تَنْفَدُ و لا تَنْقَطِعُ، وأسألُكَ الرِّضَى بَعدَ القَضَاءِ، وَأسألُكَ بَرْدَ العَيشِ بَعْدَ المَوتِ، وأسْألُكَ لَذَّةَ النَّظَرِ إلَى وَجهِكَ، وَأسألُكَ الشَّوقَ إلَى لِقَائِكَ؛ فِي غَيرِ ضَرَّاءَ مُضِرَّةٍ، ولا فِتنَةٍ مُضِلَّةٍ. اللّهُمَّ زَيّنّا بزِينَةِ الإيمانِ واجْعَلْنَا هُدَاةً مُهْتَدِينَ)[٣]

---

[١] موسلیم (٢/٩٤) لە ئیمامی مالیکەوە (١/٢١٦)، ئەبوداوود (١/٢٤١). نەسائی (٢/٣٢٠)، ترمزی (٢/٢٦٣)، ئیمامی ئەحمەد (١/٢٤٢).

[٢] موسلیم (٢/٩٣)، ئیبنوماجە (١/٢٩٤)، ئەحمەد (٢/٢٣٧).

[٣] نەسائی (١/١٩٢)، ئیبنوخوزەیمە: (التوحید ل ٩)، الحاكم (١/٥٢٤) دەرهەقی دەفەرموێ: (صحیح الاسناد) زەهەبیش لایەنگرێتی و ئەلبانیش دەفەرموێ: (وهو كما قالا)..

**٨ ـ سەلامدانەوەی دووەم (بە لای چەپدا):**

واتە ووتنی (السلام عليكم ورحمه الله): سەیدنا عامری کوڕی سەعد لە باوکیەوە خوا لێیان رازی بێت دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم دەبینی بە لای راستیدا لای دەکردەوەو سەلامی دەکرد، پاشان بە لای چەپیدا لای دەکردەوەو سەلامی دەکرد، لە پشتەوە سپێتی روومەتیم دەبینی[1]..

سەلام دانەوەی یەکەم بۆ لای شانی راست روکنی نوێژە، بەڵام سەلامدانەوەی لای چەپ سوننەتە.عائیشەخان خوا لێی رازی بێت دەفەموێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم: (كَانَ يُسَلِّمُ فِي الصَّلَاةِ تَسْلِيمَةً وَاحِدَةً تِلْقَاءَ وَجْهِهِ، يَمِيلُ الَى الشِّقِّ الأيْمَنِ قَلِيلاً)[2].

★ ★ ★

---

[1] موسليم (١/٥٨٢).

[2] ترمزی (٢٩٥) فەرمووشیەتی کە سەنەدەکەی سەحیحە..

# سوونەتە کردارییەکان

## ( السنن الفعلیە )

### ١ ـ سوترە دانان:

سونەتە نوێژخوێن لە دووری هەنگاوو نیوێکەوە لە پێش خۆیدا شتێك دانێت تا بزانرێت لە نوێژدایەو کەس بەبەر نوێژەکەیدا تێنەپەرێت و خۆشی چاوی لەو سنورە تێنەپەرێنێت.. چونکە سەیدنا سەهلی کوڕی ئەبو حەسەمە خوا لێی رازی بێت کە دەگێرێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (إذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ إِلَى سُتْرَةٍ فَلْيَدْنُ مِنْهَا لا يَقْطَعُ الشَّيطانُ عَلَيهِ صَلاتَهُ) [١].. واتە: ئەگەر کەسێکتان نوێژی بەرامبەر سوترەیەك دەکرد با ئەوەندە لێی نزیك ببێتەوە کە رێ نەدات شەیتان نوێژەکەی پێ ببڕێت..

دەشێت سوترە دیوارێك بێت نوێژخوێن لێی نزیك ببێتەوە بە شێوەیەکی وا کە بوار نەدا کەس بەبەر نوێژەکەیدا گوزەر کات، هەر وەکو دەشێت دارێك بێت چەقاندبێتی یان شتێکی تر کە بستێك بەرزەو دایناوە.. یان کەسێکەو لە پێش نوێژخوێنەکەوە دانیشتووە..

کەس بۆی نیە بەبەر نوێژی کەسێکی تردا گوزەر کات مەگەر لە نوێژی جەماعەتدا بێت، ئەو کاتە سوترەی ئیمامەکە بە سوترەی هەموان

---

[١] ئیبنوئەبی شەیبە لە: (المصنف ٣١٢/١)، ئیمامی ئەحمەد لە المسند/تویژینەوەی شێخ ئەحمەد شاکر کە بە سەحیحی ناساندووە (٤٥٢/١٢ ـ ١٦٠٥٥)، نەسائی (٧٤٥) شێخی ئەلبانیش لە (تمام المنة ل ٣٠٤) دا هەر بە سەحیحی ناساندووە ..

حسێبەو تۆ دەتوانیت بۆ پێویستی خۆت یان زەرووورەتی تر بە نێوانی ریزی نوێژخوێنەکانیشدا بەبەردەمیاندا بڕۆیت..

تێپەڕبوونی ئافرەتی بالّغ بەبەر نوێژدا بەتالّی دەکاتەوە، ئەم حوکمە بەوە ناگۆڕێت کە ئافرەتەکە پاك بێت یان لە سوڕی مانگانەدا بێت یان زەیستان یان غوسلّی تری لەسەر بێت.. مەگەر بچووك بێت و نەگەیشتبێتە سنوری عوزر شۆریی..

### ٢ ـ دەست بەرز کردنەوەکان:

لە کاتی نیەت هێنان و دەسپێکی نوێژ، لە چوونە رکوع، لە هەستانەوە لە رکوع، لە هەستانەوە لە تەحیاتی یەکەم و لە هەموو چوونە خوارەوەو هەستانەوەکانی ناو نوێژ..

ـ (سەیدنا وائلی کوڕی حوجر کە فەرمووی:(رَأَى النَّبيَّ صلى الله عليه وسلم رَفَعَ يَدَيهِ حِينَ دَخَلَ فِي الصَّلاَةِ كَبَّرَ حِيالَ أُذُنَيهِ، ثمَّ الْتحَفَ بثوبهِ، ثمَّ وَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى الْيُسْرَى، فلَمَا أَرَادَ أنْ يَرْكَعَ أَخْرَجَ يَدَيهِ مِنَ الثَّوبِ ثمَّ رَفعَهُمَا ثمَّ كَبَّرَ فرَكَعَ، فلَمَا قالَ (سَمِعَ اللهُ لمَنْ حَمِدَهُ) رَفَعَ يَدَيهِ..)[١] واتە: پێغەمبەری خوای صلى الله عليه وسلم بینی کە بە تەکبیرەی ئیحرام داخلّی نوێژەکەی بوو، دەستەکانی تا ئاستی هەردوو گوێچکەی بەرز کردەوە، پاشان پۆشاکەکەی لە خۆوە پێچاو دەستی راستی خستە سەر دەستی چەپی، کە وویستی بچێتە رکوع دەستی لە پۆشاکەکەیەوە دەرهێناو بەرزی کردنەوە، پاشان تەکبیری کردو چووە رکوع، کە فەرمووی (سَمِعَ اللهُ لمَنْ حَمِدَهُ) دەستەکانی جارێکی تر بەرز کردەوە ).

---

[١] بوخاری (١٦)، موسلیم (١٣/٢)، بەیهیقی (٢٨/٢، ٧١)، ئەحمەد (٣١٧/٤)..

ـ نافیع لە ئیبنوعومەرەوە خوا لێیان رازی بێت دەگێڕێتەوە: (كَانَ إِذَا دَخَلَ فِي الصَّلَاةِ كَبَّرَ وَرَفَعَ يَدَيهِ، وَإِذَا رَكَعَ رَفَعَ يَدَيهِ، وَإِذَا قَالَ سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَفَعَ يَدَيهِ، وَإِذَا قَامَ مِنَ الرَّكْعَتَينِ رَفَعَ يَدَيهِ، وَرَفَعَ ذَلِكَ الَى نَبِيِّ اللهِ صلى الله عليه وسلم)[١] واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کە تەکبیری دەسپێکی نوێژەکەی دەکرد دەستی بەرز دەکردەوە، کە دەچووە رکوع دەستی بەرز دەکردەوە، کە دەیفەرموو (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) دەستی بەرز دەکردەوە، کە لە دوای دوو رکات هەڵدەستایەوە دەستی بەرز دەکردەوە..

دەست بەرز کردنەوە لە پاش و پێش و کاتی تەکبیرەی ئیحرامدا تا ئاستی گوێچکە دەبێت، سەری پەنجەکان ئاسایی روویان لە ئاسمانەو لەپی دەستەکان روویان لە گوێچکەیە، پەنجەکان ئاسایی دەگیرێن و نە گرمۆڵە دەکرێن ونە لێك بڵاو دەکرێنەوە.. هەموو ئەمانەش بەڵگەیان لەسەرە، کە لە باسی دووەمی وەستانی نوێژدا باس کراوە..

**٣ ـ دانانی دەستی راست لەسەر چەپ و لەسەر سنگ:**

سەیدنا وائیلی کوڕی حیجر خوا لێی رازی بێت دەڵێ: نوێژم لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم کرد بینیم کە دەستی راستی لەسەر دەستی چەپی و هەردووکیانی لەسەر سنگی دانابوو[٢]..

ـ دانانی دەستی راست لەسەر دەستی چەپ لە نوێژدا رەفتارێکی زانراوی ناو موسوڵمانانە کە لە یاوەرانەوەو ئەوانیش لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم هێناویانە.. سەهلی کوڕی سەعد خوا لێی رازی

---

[١] بوخاری (٧٣٩)، موسلیم (٣٩٠)، ئەبوداوود (٧٢٧).

[٢] ئیبنوخوزەیمە (٤٧٩)، ئەلبانیش بە لە (الارواء ٣٥٢) دا بە سەحیحی ناساندووە.

بێت گێڕایەوە کە فەرمان بە خەڵکی دەدرا کە لە نوێژدا دەستی راستیان لەسەر دەستی چەپیان دانێن[١].

### ٤ـ چاوبڕینە شوێنی سوجدە:

نوێژخوێن دەبێت لە کاتی بەپێوە وەستانی نوێژیدا تەماشای شوێنی سوجدەکەی بکات.

ـ (كَانَ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ إِذَا صَلَّى طَأطَأَ رَأْسَهُ وَرَمَى بِبَصَرِهِ نَحْوَ الأَرْضِ)[٢] واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، کە نوێژی دەکرد سەری نزم دەکردەوەو چاوی دەبڕییە شوێنی سوجدەکەی لەسەر زەوی..

### ٥ـ راست و ڕێك راگرتنی پشت لە رکووعدا:

لە رکوعدا سوننەتە موسوڵمان پشت و پشتە سەری لە یەك ئاستدا راگرێت، پشتی ڕێك کات، دەستەکانی وەکو چنگ لە کەلکەی ئەژنۆکانی گیر کات، پەنجەکانی لێك بلاوکاتەوە، ئانیشك و قۆڵەکانی لە لەشی دوورخاتەوە (باڵ فش کات).. چونکە ئەبو حەمید خوا لێی رازی بێت لە وەسفی نوێژی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو: (وإِذَا رَكَعَ أمْكَنَ يَدَيهِ مِنْ رُكْبَتيهِ،ثمَّ هَصَرَ ظَهْرَهُ حَتى يَعْتَدِلَ وَلَا يَبْقَى مُحْدَوْدَبَاً)[٣] واتە: کە دەچووە رکوع هەردوو دەستی لە هەردوو ئەژنۆی گیر

---

[١] بوخاری (٧٤٠)، ئیمامی مالیك لە (الموطأ (٣٧٦).

[٢] حاکم (٣٩٣/٢) فەرمووشیەتی بە پێی مەرجی بوخاری و موسلیم سەحیحە، بەڵام شێخی ئەلبانی دەفەرموێ بە پێی مەرجەکانی موسلیم سەحیحە.. أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه وسلم (٢٣٦/١).

[٣] بوخاری (٨٢٨)، ئەبوداوود (٧١٧).

دەكرد، ئینجا پشتی ڕێك و ڕاست دەكرد بە شێوەیەك كە چەمانەوەی تێدا نەبێت..

ـ عائیشەخانیش خوا لێی ڕازی بێت لە وەسفی ركووعی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: (إذَا رَكَعَ لَمْ يُشَخِّصْ رَأْسَهُ وَلَمْ يُصَوِّبْهُ وَلَكِنْ بَينَ ذَلِكَ)[١] واتە: كە بۆ ركووع دەچامەیەوە سەری نە بەرز رادەگرت و نە دەشیهێنایە خوارەوە، لە نێوان هەردوو شێوەكەدا رایدەگرت..

ـ ڕیوایەتی سەحیحی سەیدنا وائیلی كوڕی حوجر خوا لێی ڕازی بێت لە وەسفی چۆنیەتی دەست دانانی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم لەسەر ئەژنۆی دەڵێ: (وَكَانَ يُمَكِّنُ يَدَيهِ مِنْ رُكْبَتَيهِ، كَأَنَّهُ قَابِضٌ علَيهِمَا)[٢] واتە: هەردوو دەستی لە هەردوو ئەژنۆی قایم دەكرد، وەك ئەوەی چنگی پێداكردبن و گرتبنی..

ـ لە فەرمودەكەی سەیدنا وائیلی كوڕی حوجردا خوا لێی ڕازی بێت هاتووە كە كە پەنجەكانیشی بەسەر كەڵكەی ئەژنۆكانیدا بڵاو دەكردنەوە: (كَانَ إذَا رَكَعَ فَرَّجَ بَينَ أَصَابعهِ)[٣]..

---

[١] موسلیم (٤٩٨)، ئەبوداوود (٧١٧).

[٢] شێخی ئەلبانی دەفەرموێ: ئەمە لە فەرموودەی ئەبو حومەیدەوەیە كە دە لە یاوەرانی پێغەمبەری خواوە گێڕراوەتەوە.. (أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٢/٦٣١)).

[٣] بەیهیقی (٢/١١٢)، الحاكم (١/٢٢٤) دەشفەرموێ: بە پێی مەرجی موسلیم سەحیحە و زەهەبیش فەرموویەتی: وایە و ئەلبانیش فەرموویەتی: وەكو هەردووكیان فەرموویانە، وایە.. أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٢/٦٣٢)

## ٦ ـ دەستدانان بۆ سوجدە بردن پێش ئەژنۆ دانان :

هەرچەندە زۆر لە زانایانی ئیسلام پێیان وایە کە بەڵگەی بەهێز لەسەر ئەوەیە کە چوونە سوجدە بە ئەژنۆ دەبێت پێش دەستەکان، ئەمەش بە سەنەدی سەحیحەوە دەبەنەوە سەر یاوەری وەکو سەیدنا عومەرو سەدان شەرعناسی وەکو ئیمامی ئەبو حەنیفەو شافیعی و ئەحمەدو سوفیانی سەوری و بەڵگە بە چەندین فەرموودە دەهێننەوە وەکو ریوایەتی سەیدنا وائیلی کوڕی حوجر خوا لێی رازی بێت کە دەڵێ: پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بینی کە دەچووە سوجدە هەردوو ئەژنۆی پێش دەستەکانی دەخستە سەر زەوی، کە هەڵیش دەستایەوەهەردوو دەستی پێش ئەژنۆی بەرز دەکردەوە)[١].

بەڵام زانایانێکی تری توێژەرەوەی وەکو شەوکانی و ئەلبانیش دەیسەلمێنن کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەپی دەستەکانی پێش ئەژنۆی دەگەیاندە سەر زەوی و فەرمانیشی بەوە دەکردو بەرهەڵستی لەوە دەکردکە بە ئەژنۆ بچنە سوجدە، وەك دەڵێ:

١ ـ (وَ كَانَ يَضَعُ يَدَيهِ عَلَى الأرْضِ قَبْلَ رُكْبَتيهِ)[٢] واتە: دەستەکانی پێش هەردوو ئەژنۆی دەخستە سەر زەوی..

٢ ـ (إذَا سَجَدَ أحَدُكُمْ فلا يَبْرُكْ كَمَا يَبْرُكُ الْبَعيرُ، وَلْيَضَعَ يَدَيهِ قَبْلَ رُكْبَتيهِ)[١] واتە: ئەگەر یەکێکتان سوجدەی برد با وا نەچێتە

---

[١] ئەبوداوود (١٣٤/١)، نەسائی (١٦٥/١)، ترمزی (٥٦/٢) بە حەسەنی ناساندووە..

[٢] ئیبنوخوزەیمە (٣١٨/١) بە سەحیحی ناساندووە وەکو ئیبنو حەجەر دەفەرموێ: بلوغ المرام (٢٦٣/١)، دارەقوتنی (١٣١)، تەحاوی لە شرح المعاني (١٤٩/١)، حاكم (٢٢٦/١) بەیهیقی (١٠٠/٢)، حاکم دەفەرموێ: بە پێی مەرجی موسلیم سەحیحە، زەهەبیش لایەنگرێتی و شێخی ئەلبانیش دەفەرموێ: وەکو فەرموویانە، هەر وایە..

سەر زەوی وەكو كە حوشتر دەچێت، با دەستەكانی پێش هەردوو ئەژنۆی دابنێت..

كەوابوو دەشێت بڵێین مەسەلەیەكە راجوێیی هەڵدەگرێت، هەرچەندە من ئەوەی شێخی ئەلبانیم پێ بەهێزترە..[2]: چونكە لە هەموو سەنەدی ریوایەتەكان كۆڵیوەتەوەو ووردەكارانە سەلماندوێتی كە پێغەمبەری پێشەوا صلى الله عليه وسلم لە چوونە سوجدەیدا دەستەكانی پێش ئەژنۆی دەخستە سەر زەوی..والله اعلم..

## ٧ ـ دانانی لووت و ناوچەوان بە تەواوی لەسەر زەوی:

دانانی ناوچەوان و لووت و لەپی دەستەكان لەسەر زەوی و باڵ كردنەوەو رێك دانانی پەنجەكان لە ئاستی شان و گوێچكە، رووەو قیبلەو هەڵنانی پێیەكان و گیردانیان لەسەر نووكی پەنجەكانی پێ، بە شێوەیەك كە روویان لە قیبلە بێت.. ئەمانە هەمووی سوننەتن و هەموویان فەرموودەی سەحیحیان لەسەرە كە زۆریمان لە چۆنیەتی سوجدەبردندا لە باسی روكنی هەشتەم و نۆیەمی نوێژدا هێناوەتەوە..

لەم رەفتارانەدا ژن و پیاو وەكو یەكن.. ئەو شەرعناسە بەرێزانەی فەرموویانە ژن دەبێت ئانیشكی بخاتە سەر زەوی و رانی وێك نێت و خۆی كوشمەڵە بكات بەڵگەیان لەسەری نیە.. ئیمامی ئیبنوحەزم هەموو

---

[1] ئەبوداوود (١٣٤/١)، ئیبنوحەزم (١٢٨/٤)، نەسائی (١٦٥/١)، داریمی (٣٠٣/١)، بەیهیقی (٩٩/٢) ئیمامی ئەحمەد (٣٨١/٢). ریوایەتی دارقوتنی و نەسائی دەڵێن: (فَلْيَضَعْ يَدَيهِ قَبْلَ رُكْبَتَيهِ، وَلْيَبْرُكْ بُرُوكَ الْبَعيرِ).. ئەمەش سەنەدی سەحیحە وەكو ئیمامی نەوەوی لە المجموع (٤٢١/٣) و زورقانی لە شرح المواهب (٣٢٠/٧) دا فەرموویانە، شێخی ئەلبانی لە الارواء (٣٥٧) و صحيح سنن أبي داود (٧٨٩) ، تمام المنة (ل ١٩٣)هەر حوكمی سەحیحی داوە.

[2] أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٧١٤/٢ـ٧١٩)، الارواء (٣١٣).

هەنجەتەكانی برِیوون[١]و شێخی ئەلبانیش فەرموویەتی كە هیچ جیاوازیەك لە نێوان چۆنیەتی نوێژی ژن و پیاودا نیە..

**٨ ـ راخستنی پێی چەپ و هەڵنانی پێی راست لە دانیشتنی نێوان دوو سوجدەكەدا:**

ـ عائیشەخان خوا لێی رازی بێت دەگێرِێتەوە: (كَانَ يَفْرِشُ رِجْلَهُ الْيُسْرَى وَيَنْصِبُ رِجْلَهُ الْيُمْنَى)[٢] واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێی چەپی رادەخست (لەسەری دادەنیشت) و پێی راستی هەڵدەنا.. ریوایەتی سەحیح هەیە لە تاووسەوە هاتووە كە ئیبنوعەبباس[٣] خوا لێی رازی بێت كە سەری لە سوجدەی یەكەم بەرز دەكردەوە هەردوو پێیەكانی هەڵدەناو لەسەریان هەڵدەتروشكا و دەیفەرموو سوننەتە. بە هەمان شێوە ریوایەت لە ئەبوزوبەیرەوە هاتووە كە سەیدنا ئیبنوعومەریش خوا لێی رازی بێت وای كردووەو فەرموویەتی سوننەتە[٤]..

**٩ ـ درێژكردنەوەی دانیشتنی نێوان دوو سوجدەكە:**

ئەمە سوننەتێكە لە دێر زەمانەوە ئیهمال كراوە، بە داخەوە خەڵكی پەلەی زۆر تێدا دەكەن. سەیدنا ئەنەس خوا لێی رازی بێت دەڵێ: جاری وا هەبوو پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەوەندەی كاتی نێوان دوو

---

[١] المحلى (١٢٤/٤)، الالباني: أصل صفة صلاة النبي صلى الله عليه و سلم (٧٢٥/٢).
[٢] موسلیم (٥٤/٢)، ئەبو داوود (١٢٥/١)، بەیهیقی (١٧٣/٢)، ئیمامی ئەحمەد (٢٨١/٦)..
[٣] موسلیم (٤٩٨)، ئەبوداوود (٧٦٨).
[٤] موسلیم (٥٣٦)، ئەبوداوود (٨٣٠)، ترمزی (٢٨٢). بوخاری (٢٤٩/٢)، موسلیم(٤٧٣).

سوجدەکانی درێژ دەکردەوە وامان دەزانی بیری چۆتەوە یان لێی تێکچووە[١]..

سابیت رەحمەتی خوای لێ بێت دەگێڕێتەوە کە سەیدنا ئەنەسیش خوای لێ رازی بێت جاری وا هەبوو ئەوەندە ئەو ماوەیەی نێوان دوو سوجدەکانی خۆی درێژ دەکردەوە ئێمەش وامان دەزانی بیری چۆتەوە یان لێی تێکچووە[٢]..

سەرنج لەو رەفتارەی سەیدنا ئەنەس بدە کە چۆن بەو سونەتەوە پابەند بووەو تەنانەت واشی ئەنجامداوە چۆن خۆیان وایان دەزانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بیری چۆتەوە یان لێی تێکچووە وا دەزانێت سوجدەی دووەمیشی بردووە، ئەمیش خوا لێی رازی بێت بە هەمان شێوەی تەواو کردوێتیەوە.. ئاوا دەبینیت ئەو یاوەرە عەزیزانەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سوور بوون لەسەر نەقڵ کردنی رەفتاری هەموو سات و ئانێکی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم!!

### ١٠ ـ دانیشتنی دوای سوجدەی دووەم و پێش هەستانەوە:

پێشی دەوترێت: دانیشتنی حەوانەوە.. شوێنی ئەمە دانیشتنێکی کەمە لە دوای سوجدەی دووەمی رکاتی یەکەم و پێش هەستانەوەیە بۆ رکاتی دووەم، هەروەها دوای سوجدەی دووەمی رکاتی سێیەم و پێش هەستانەوەیە بۆ رکاتی چوارەم.. سەیدنا مالیکی کوڕی حوەیریس دەگێڕێتەوە: (رَأَى النَّبيَّ صَلَّى اللهُ عليهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي، فَإِذَا كَانَ فِي وِترٍ مِنْ

---

[١] موسلیم (٤٧٣).
[٢] بوخاری (٢/٢٤٩)، موسلیم(٤٧٣).

صَلاتِهِ لَمْ يَنْهَضْ حَتى يَسْتَوِي قَاعِدًا)[١] واتە: پێغەمبەری خوای صلى الله عليه وسلم بینی لە رکاتە تاکەکانی نوێژەکانیدا هەڵنەدەستایەوە تا کەمێك دانەنیشتایە..

## ١١ـ هەستانەوە بۆ رکاتی نوێ بە ئیعتیماد کردنە سەر دەست نەك ئەژنۆ:

سەیدنا مالیکی کوڕی حوەیریس خوا لێی رازی بێت فەرمووی: (أَلَا أُحَدِّثُكُمْ عَنْ صَلاةِ رَسولِ اللهِ؟ فَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنْ السَّجْدَةِ الثَّانِيَّةِ جَلَسَ وَاعْتَمَدَ عَلَى الأرضِ ثُمَّ قَامَ)[٢] واتە: ئەرێ دەربارەی نوێژی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم شتێکتان بۆ باس نەکەم؟! کە سەری لە سوجدەی دووەم بەرز دەکردەوە دادەنیشت سرەوتی دەگرت، پاشان هەڵدەستایەوە سەر پێ..

## ١٢ ـ دانیشتنی ئیفتیراش لە تەحیاتی یەکەم و دانیشتنی تەوەڕوك لە تەحیاتی ئەخیردا:

**ئیفتیراش:** دانیشتنێکی تەحیاتییە لەسەر ئەژنۆ، پێی راستی هەڵدەنێت و پێی چەپیشی رادەخات وسمتی چەپی دەخاتە سەر.. وەکو دانیشتنی تەحیاتی یەکەم..

**تەوەڕوك:** دانیشتنێکی تری تەحیاتانەیە، سمتی چەپی دەخاتە سەر زەوی و لەسەری دادەنیشێت و هەردوو پێیەکانی دەکەونە لای راستیەوە، پەنجەکانی پێی چەپی لە بن لوولاقی چەپیەوە دێنێتە دەرەوە..

---

[١] بوخاری (٨٢٣)، موسلیم(٨٢٩).
[٢] بوخاری (٨٢٤).

ئەم دوو جۆرە دانیشتنەش لە تەحیاتەکاندا سوننەتە، ئەو نوێژانەی دوو رکاتین تەنها بە شێوەی ئیفتیراش تێیدا دادەنیشرێت[١]..

- سەیدنا ئەبو حەمید خوا لێی رازی بێت لە وەسفی نوێژی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: (وَإِذَا جَلَسَ فِي الرَّكْعَةِ الْآخِرَةِ قَدَّمَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى وَنَصَبَ الْأُخْرَى وَقَعَدَ عَلَى مَقْعَدَتِهِ)[٢] واتە: کە لە تەحیاتی ئەخیریدا دادەنیشت پێی چەپی پێش دەخست و ئەوی تریانی هەڵدەناو لەسەر سمتی دادەنیشت.

## ١٣- بەرز کردنەوەی پەنجەی شایەتمان هەر لە سەرەتای لە تەحیاتەوە:

ئەو پەنجەیەی لە کوردەواریدا بە پەنجەی شایەتمان ناسراوە[٣]، سوننەتە سوننەتە لە سەرەتای دانیشتنی تەحیاتەوە بەرز بکرێتەوەو لە کاتی ووتنی شایەتمانەکەدا چاوی تێببڕرێت..

سەیدنا ئیبنوعومەر خوا لێیان رازی بێت لە باسی نوێژی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (كَانَ إِذَا جَلَسَ فِي الصَّلَاةِ وَضَعَ يَدَيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ، وَرَفَعَ إِصْبَعَهُ الْيُمْنَى الَّتِي تَلِي الإِبْهَامَ فَدَعَا بِهَا وَرَمَى بِبَصَرِهِ إِلَيْهَا وَيَدَهُ الْيُسْرَى بَاسِطُهَا عَلَيْهَا)[٤] واتە: کە بۆ نوێژەکانی دادەنیشت هەردوو دەستی دەخستنە سەر هەردوو رانی، پەنجەی شایەتمانی راستی کە بە تەنیشت پەنجە پانەکەیەوەیەتی[٥]بەرز دەکردەوەو دوعای پێوە

---

[١] موسلیم (٣٥٧/١).
[٢] بوخاری (٨٢٨).
[٣] هەر ئەوەشە کە پێی دەوترێت دۆشاوەژە.
[٤] موسلیم (٥٨٠).
[٥] هەر ئەوەشە کە پێی دەوترێت ئەسپێ کوژە.

دەكرد، چاوی تێدەبڕی، دەستی چەپیشی لەسەر رانی چەپی بە كراوەیی دادەنا..

سەیدنا سەعدی كوڕی ئەبی وەققاس خوا لێی رازی بێت دەڵێ: جارێكیان دوعام دەكردو پەنجەكانم بەرز كردبۆوە، فەرمووی: (أحَدْ أحَدْ) واتە: یەكە یەكە و ئاماژەشی بۆ پەنجەی شایەتمانی كرد[١]..

بەرز كردنەوەی پەنجە بە غەیری پەنجەی شایەتمان نابێت.. كەسێك ئەگەر پەنجەی شایەتمانی قرتابوو یان بۆی بەرز نەدەبۆوە، ئەوە عوزری شەرعی هەیەو پێویست ناكات بە بێ هەبوونی بەڵگەی شەرعی پەنجەیەكی تری دەستی راستی یان پەنجەی دۆشاومژەی دەستی چەپی بكات بە پەنجەی شایەتمان..والله اعلم..

★ ★ ★

---

[١] ئەبوداوود (٨٠/٢)، نەسائی (٣٨/٣).

# ئەو ڕەفتارانەی لە نوێژدا ڕێدراون بکرێن

## یەکەم: گوفتاری ڕێدراو

## (الاقوال المباحة)

### ١ ـ ڕاستکردنەوەی هەڵەی ئیمام:

ئەگەر ئیمام خوێندنی قورئانەکەی لێتێکچوو، یان بە هەڵەیەکی وا خوێندیەوە ماناکەی خراپ هاتەوە، مەئمووم بۆی هەیە بۆی ڕاست کاتەوە.. چونکە سەیدنا ئیبنوعومەری خوا لێیان ڕازی بێت دەڵێ: جارێکیان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی دەکرد، خوێندنەکەی لێتێکچوو، کە تەواوی کرد، بە ئوبەی (کوڕی کەعب)ی فەرموو: (أصَلَّيْتَ مَعَنَا)؟ نوێژەکەت لەگەڵ ئێمەدا کرد؟ فەرمووی: بەڵێ، فەرمووی: (فَمَا مَنَعَكَ إِذَنْ)[1]؟: ئەدی چی ڕێی لێ گرتیت بۆم ڕاست نەکەیتەوە؟

### چەند خاڵێکی بیرخستنەوە

١ـ ئەگەر بیسترا وا ئیمامەکە بە هەڵەکەیدا دێتەوەو دەیەوێت بیری بکەوێتەوەو ڕاست بیخوێنێت، دەبێ بواری بۆ بکرێتەوەو ئەوەندەی بۆ نەووترێتەوە ئەوەی خۆشی لێ تێکچێتەوە..

---

[1] ئەبوداوود (٨٩٤)، ئیبنوحیببان (٣١٦/١) بسند جيد.. ئیمامی ئەحمەد فەرمووشیەتی سەحیحە..

٢- ئەگەر ئیمامەكە هەستی بە هەڵە خوێندنەوەی خۆی كردو بێدەنگ وەستا باشترە بۆ ماوەیەك وازی لێ بهێنرێت، بەڵكو خۆی بیری بكەوێتەوە، ئەگەر بێدەنگبوونەكەی توولی كێشا پێویستە بیری بخرێتەوە..

٣- ئەگەر هەڵەی ئیمامەكە مانای ئایەتەكەی نەدەگۆڕی، دەشێت لێگەڕێن بەسەریدا رابورێت.. بۆ روون كردنەوەی هەڵەی وایە كە سەیدنا ئوبەی كوڕی كەعب خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خواصلی الله علیه وسلم فەرمووی: (إنّي أُقْرِئتُ الْقُرْآنَ عَلَى سَبْعَةِ أحْرُفٍ لَيسَ مِنْهَا إلّا شَافٍ كَافٍ، إنْ قُلْتُ غَفُوراً رَحِيماً أو قُلْتُ سَمِيعاً عَلِيماً، أو قُلْتُ عَلِيماً سَمِيعاً فَاللهُ كَذَلِكَ، مَا لَمْ تَخْتِمْ آيَةُ عَذَابٍ بِرَحْمَةٍ أو آيَةُ رَحمَةٍ بِعَذَابٍ)[1]واتە: من قورئانم بە حەوت شێوەی خوێندنەوە فێركراوە، هەر هەمووی مانای تەواوو گشتگیرە، ئەگەر ووتم: غَفُوراً رَحِيماً یان سَمِيعاً عَلِيماً یان بڵێم: عَلِيماً سَمِيعاً خۆ خوای گەورە هەر وایە، ئەوە گرنگە كە كۆتایی ئایەتی سزا بە رەحمەت نەهێنرێت، یان ئایەتی رەحمەت بە سزا كۆتایی نەهێنرێت..

## ٢ - زۆر دووپات كردنەوەی ئایەتێك لە نوێژی سوننەتدا:

سەیدنا ئەبوزەڕی غیففاری خوا لێی رازی بێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تا سپێدەی بەیانی هەر ئەم ئایەتەی بەردەوام دووپات دەكردەوە: ﴿ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾

---

[1] ئیمامی ئەحمەد (٢٠٦٤٦) فەرمووشیەتی سەحیحە..

المائدة/١١٨ واتە: ئەگەر سزایان دەدەیت، خۆ هەر بەندەی خۆتن، ئەگەر لێشیان خۆش دەبیت ئەوە خۆت خاوەن دەسەڵاتیت و هەر خۆتیت کە هەموو کارێك لە شوێنی خۆیدا دەکەیت[١]..

دیارە ئەمە لە شەونوێژیدا بووە نەك لە نوێژی فەرزدا. چونکە لە هیچ یاوەرێکەوە باس لەوە نەکراوە لە نوێژی فەرزیدا ئایەتێکی بەردەوام دووپات کردبێتەوە.. رەفتاری یاوەرانی تریش وابووە..

سەیدنا تەمیمی داری خوا لێی رازی بێت ئەم ئایەتەی زۆرجار بەردەوام لە نوێژەکانیدا دووپات دەکردەوە: ﴿أَمۡ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجۡتَرَحُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجۡعَلَهُمۡ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَوَآءٗ مَّحۡيَاهُمۡ وَمَمَاتُهُمۡۚ سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ﴾الجاثیة/٢١ واتە: چما ئەو کافرانەی خراپەکارییان کردۆتە بە پیشە، پێیان وایە وەکو ئەو کەسانەیان هەژمارد دەکەین کە باوەڕیان هێناوەو کاروکردەوەی چاکەیان کردۆتە سیماو مۆرکی خۆیان؟! ئای چ داوەرییەکی ناقۆڵایە!!

لە تابعینیشدا زانایەکی بەڕێزی وەکو سەعیدی کوڕی جوبەیر ئەم ئایەتەی دووجارو سێجار دووپات دەکردەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ ۝٦ ٱلَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ﴾ الانفطار/٦-٧ واتە: ئەرێ هۆ مرۆڤ! ئەوە چی بەرامبەر خوای پەروەردگاری بەخشندەو بەڕێزت ئاوا هەڕاڵی کردوویت؟! ئەو خوایەی دروستی کردوویت و رێك و پێك سازاندووتی و پاشان (بۆ دەوروبەری خۆت) گونجاندووتی..

---

[١] نەسائی (١٠١٠)، ئیمامی ئەحمەد (٢٠٨٣١).

## ٣ـ گريان و نوزەو ناڵين:

گريان و نوزەو ناڵين لە نوێژدا جائيزن.. جا لەبەر دينداريى و تەقواو لە خواترسان بێت يان لەبەر ژان و ناسۆرى بەڵاو موسيبەتێك كە بەسەر نوێژخوێنەكەدا هاتووە.. بە تايبەتى كە نوێژخوێنەكە ناتوانێت خۆى بگرێت.. نوزەو ناڵينيش ئەوەيە كە كابرا لە تاواندا دەڵێ: (ئاه، ئاى، واى، ئۆه) ئەمانە هيچيان نوێژ بەتاڵ ناكەنەوە، بەڵام باشيش نيە بووترێن.. ئەو كەسانەى كە دەڵێن: گريان نوێژ بەتاڵ دەكاتەوە بەڵگەيەكى وايان نيە حوكمى شەرعى پێ دەرچێت.. لە چەند لايەكەوە قسەكەيان رەت دەكرێتەوە:

١ـ خواى گەورە مەتحى ئەو كەسانەى كردووە كە لە كاتى يادو زيكرى خوادا دەگرين و بۆ رەحمەت و لێبوردنى دەكوڕزێنەوە وەك دەفەرموێ: ﴿إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ آيَاتُ الرَّحْمَٰنِ خَرُّوا سُجَّدًا وَبُكِيًّا﴾ مەريەم/٥٨ واتە: كاتێك ئايەتەكانى خوايان بەسەردا دەخوێندرێتەوە بە گريانەوە دادێنەوە بۆ سوجدە بردن.. يان دەفەرموێ: ﴿ وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا﴾ الاسراء/١٠٩ واتە: بە پەرۆشەوە بۆ سوجدەبردن دەمەوڕوو دادێنەوەو دەگرين.. ئەمەش ملكەچييان زياتر دەكات..

٢ـ سەيدنا عبداللەى كوڕى شەخير خوا لێى رازى بێت دەڵێ: هاتمە خزمەت پێغەمبەرى خواصلى الله عليه وسلم نوێژى دەكرد، دەنگێك لە سينەيەوە دەهات دەتووت قوڵپەقوڵپى مەنجەڵى سەر ئاگرە[١]..

٣ـ سەيدنا عەلى خوا لێى رازى بێت دەڵێ: لە غەزاى بەدردا هەر ميقدادمان تێدا بوو سوارە بوو، ئەوانى ترمان هەموو لە ماندوويى و

---

[١] نەسائى (١٣١٤)، ئەبوداوود (٣٢٨/١)، ئيمامى ئەحمەد (٢٥/٤) دەشفەرموێ سەحيحە.

هیلاکیدا نوستبووین، پێغەمبەری خواش صلی الله علیه وسلم لە بن دارێکدا تا سپێدەی بەیانی هەر نوێژی کردو گریا[١]!

٤ـ سەیدنا ئیبنوعومەر خوا لێیان رازی بێت دەڵێ: کاتێك پێغەمبەری خواصلی الله علیه وسلم لە نەخۆشی سەرەمەرگیدا ئازاری زیاتر بوو، کاتی نوێژ نوێژەکەیان بیر خستەوە، فەرمووی: (مُرُوا أبَابَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بالنَّاسِ) واتە فەرمان بگەیێننە ئەبوبەکری سددیق با ئیمامەتیەکە بۆ خەڵکەکە بکات، عائیشە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەبوبەکر پیاوێکی دڵنەرمە، لە قورئان خوێندنەکەیدا دەگری، فەرموویەوە: (مُرُوهُ فَلْيُصَلِّي)، واتە: فەرمانی پێ بکەن با نوێژەکە بکات، دیسان عائیشە فەرموویەوە، پێغەمبەری خواصلی الله علیه وسلم فەرموویەوە: (مُرُوهُ فَلْيُصَلِّي إنَّكُنَّ صَوَاحِبِ يُوسُفَ)[٢] واتە: ئێوە فەرمانی نوێژەکەی پێ بدەن، ئێوە وەك ئافرەتە مەکربازەکانی دەوری یوسفن..

٥ـ سەیدنا عبداللەی کوڕی شەدداد خوا لێی رازی بێت دەڵێ: لە کۆتاریزی نوێژخوێنانی جەماعەتی مزگەوت بووم،لەو دوورەوە گوێم لە لووشکەو هەنیسکدانی عومەری کوڕی خەتتاب بوو لە پێشنوێژیەکەیدا کە بەدەم خوێندنی ئەو ئایەتەوە دەیکرد کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ یوسف/٨٦ واتە: ئاهو سکاڵاو خەمی خۆم لای خوای گەورە دەردەبڕم[٣]..

---

[١] ئیبنوخوزەیمە (٥٣/٢)، ئیمامی ئەحمەد (١٠٢٦). فەرمووشیەتی سەحیحە.

[٢] بوخاری (٦٨٢).

[٣] بوخاری بە موعەللەقی لە باسی بانگدا هێناویێتیەوە، بڕوانە فتح الباری (٢٠٦/٢)، ئیمامی ئیبنو تەیمییەش لە(الفتاوی ٦٢٣/٢٢)دا دەفەرموێ: ئەم ئاسەوارە لە ئیبنوعومەرەوە هاتووەو زانراوە.

### ٤ـ فوو کردن:

بۆ لابردنی شتێك کە بە فووکردن دەڕوات، وەکو تۆزو خۆڵ و پەڕو موو ئەوانە.. سەیدنا ئیبنوعومەری خوا لێیان رازی بێت دەڵێ: لە سەردەمانی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم خۆر گیرا، پێغەمبەری خواصلی الله علیه وسلم لە کۆتا سوجدەی نوێژەکەیدا فووی کردو فەرمووی: (أفٌ أفٌ) واتە: فوو فوو.. پاشان لە پاڕانەوەکەیدا فەرمووی: (رَبِّ أَلَمْ تعِدنِي أَلَّا تعَذِّبْهُمْ وَأَنَا فِيهِمْ؟ أَلَمْ تعِدنِي أَلَّا تعَذِّبْهُمْ وَهُمْ يَسْتغْفِرون)[1]؟.واتە: خوایە! مەگەر جەنابت بەڵێنی ئەوەت نەداومەتێ کە تا لە ناویاندا بمێنم سزایان نادەیت؟ خوایە! مەگەر جەنابت بەڵێنی ئەوەت نەداومەتێ کە تا داوای لێبوردن بکەن سزایان نادەیت؟! ئەیمەنی کوڕی نابل فەرمووی: بە قودامەی کوڕی عبداللەی کوڕی عەممارم ووت کە یاوەری پێغەمبەری خوا بوو صلی الله علیه و سلم، لە حەرەمی کەعبە کە نوێژ دەکەم لە کاتی سوجدەدا بێزم دێتەوە لە پەڕی باڵندەکان کە دەکەونە پێشم، فەرمووی: بە فوو لایان بە[2]..

### ٥ـ کۆکین و ئحم کردنی پێویست:

ئەمەش جائیزە. ئیمامی ئیبنوتەیمییە ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێ: کۆکین و ئحم کردن ووشەو قسە نین تا بکەونە بەر ئەو نەهیەوە کە پێغەمبەری خواصلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (إنّهُ لَا يُصلِحُ فِيهَا شَئٌ

---

[1] ئەبوداوود (١١٩٤)، نەسائی (١٣٧/٣)، ئیمامی ئەحمەد (١٥٩/٢) ، فەرموویەتی پیاوانی سەنەدەکەی جێ متمانەن..

[2] بەیهیقی (٢٥٣/٢)، حافز ئیبنو حەجەری ڕەحمەتی لە فتح الباری (٨٥/٢) دا بە سەحیحی ناساندووە.

مِنْ كَلامِ النَّاسِ)[1] واتە: نوێژ نابێت هیچ قسەیەكی خەڵكی بكەوێتە ناو..بەڵكو لە حوكمی ئاماژەكردندان[2]..

### ٦ـ قسەیەكی كەم كە بۆ نوێژەكە زەرووری بێت:

هەر نوێژخوێنێك ـ ئیمام بێت یان مەئمووم یان تەنها. ئەگەر پێویستی بە دەربڕینی ووشەیەك یان زیاتر هەبوو كە لە بەرژەوەندی نوێژەكە بێت، بۆی هەیە بیكات، بەو مەرجەی كارەكە لەسەر دەربڕینی ئەو ووشەیە وەستا بێت.. بەڵگەش فەرموودە بەناوبانگەكەی سەیدنا زولیەدەینە خوا لێی رازی بێت كە كاتێك پێغەمبەری خواصلی الله علیه وسلم نوێژی عەسری پێ كردن، دوای دووەمین ركات پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەلامی دایەوە، سەیدنا زولیەدەین لێی پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا نوێژ كەم بۆتەوە یان جەنابت بیرت چوو؟! پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (كُلُّ ذَلِكَ لَمْ يَكُنْ) واتە: هیچیان نەبووە.. زولیەدەین فەرمووی: بەڵام ئەی جەنابت وات كرد. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رووی كردە خەڵكەكەو فەرمووی: (أَصَدَقَ ذو الْيَدَين)؟ واتە: ئەری زولیەدەین راست دەكات؟ فەرموویان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، ئیتر یەكسەر پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گەڕایەوەو دوو ركاتەكەی تریشی تەواو كردو پاشان دوو سوجدەی برد.. دیارە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و زولیەدەینی بەڕێز هەردووكیان قسەیان لە بەرژەوەندی نوێژەكە كردو گەڕانەوە سەر

---

[1] موسلیم (٣٣/٥٣٧).
[2] مجموع الفتاوی (٦١٧/٢٢).

نوێژەکەو بێ نیەتێکی نوێ نوێژەکەیان تەواو کرد.. کەوابوو ئەو جۆرە قسەکردنە ڕێدراوە..

## ٧ـ هەر کەس لە نوێژدا پژمی بۆی هەیە بڵێ: الحمد لله:

هەر کەس لە نوێژدا پژمی بۆی هەیە بڵێ: الحمدلله.. سەیدنا روفاعەی کوڕی مالیك خوا لێی رازی بێت دەڵێ: لە دوای پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم نوێژم دەکرد، پژمیم، ووتم: (الْحَمْدُ للهِ حَمْدَاً كَثِيرَاً طَيِّبَاً فِيهِ مُبَارَكَاً عَلَيهِ كَمَا يُحِبُّ رَبُّنَا وَ يَرْضَى) کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە نوێژ تەواو بوو پرسی: (مَنْ الْمُتَكَلِّمُ فِي الصَّلَاةِ)؟ ئەوە کێ بوو لە نوێژەکەدا قسەی کرد؟ روفاعە دەڵێ: ووتم: من ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم، ئینجا فەرمووی: (والَّذي نَفْسِي بيَدِهِ لَقَدْ ابْتَدَرَهَا بِضْعَةٌ وَثلاثونَ مَلَكَاً أَيُّهُمْ يَصْعَدُ بهَا..)[1] واتە: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە سیوقسوور فریشتە کێبڕکێیان بوو کامیان زووتر بەرەو ئاسمان بەرزی کاتەوە.. ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەر کەسێك لە نوێژدا پژمی بۆی هەیە بڵێ الحمد لله..

بەڵام کەس بۆی نیـە لـە نوێـژدا بێـت و پێـی بڵێتـەوە یرحمـك اللـە.. لەبەر ئەو فەرموودەیەی لای سـەیدنا معاویـەی کـوڕی حەکـەمی سـولەمی خـوا لێـی رازی بێـت کـە دەڵـێ: (صَلَّيْتُ مَـعَ النَّبـيِّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ فَعَطَسَ رَجُـلٌ إِلَـى جَنْبـي، فَقُلْتُ: يَرْحَمُـكَ اللَّـهُ، فَرَمَـانِي الْقَـوْمُ بِأَبْصَـارِهِمْ، فَقُلْتُ: وَاثكْلَ أُمِّيَاهُ، مَا لِيَ أَرَاكُمْ تَنْظُـرُونَ إِلَـيَّ وَأَنَـا أُصَلِّي، فَجَعَلُوا يَضْـرِبُونَ بِأَيْدِيهِمْ عَلَـى أَفْخَـاذِهِمْ يُصَـمِّتُونِي فَلَمَّـا قَضَـى رَسُـولُ اللَّـهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ صَلَاتَـهُ، فَبِأَبِي وَأُمِّي مَا رَأَيْتُ قَبْلَهُ وَلا بَعْدَهُ أَحَـدًا أَحْسَـنَ تَعْلِيمًـا مِنْـهُ،

---

[1] ترمزی (٤٠٤)، نەسائی (٢/٢٤٥)، بوخاری (٧٩٩) بەڵام بڕگەی پژمینەکەی تێدا نیە..

وَاللّهِ مَا كَهَرَنِي، وَلا سَبَّنِي، وَلا ضَرَبَنِي، وَلَكِنَّهُ قَالَ لِي: إِنَّ صَلاتَنَا هَذِهِ لا يَصْلُحُ فِيهَا شَيْءٌ مِنْ كَلامِ النَّاسِ، إِنَّمَا هُوَ الصَّلاةُ، وَالتَّسْبِيحُ، وَالتَّحْمِيدُ، وَقِرَاءَةُ الْقُرْآنِ)[1] واته: لـه خزمـەت پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم نوێژم دەكرد، كابرایەك لە تەنیشتمەوە پژمی، منیش ووتم: یرحمك اللـه، ئیتر هەر هەموو خەڵكەكە چاویان تێبڕیم، ووتم: هەی دایكم رۆڵەڕۆڵم بۆ بكات، ئەوە بۆچی وا داوتانمەتە بەر تیلەی چاو كە لە نوێژیشدام؟! بینـیم خێرا خێرا بە چەپۆك بـە رانـی خۆیـان دەكێشن تـا بێـدەنگم كـەن.. كـە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی تەواو كرد ـ دایك و باوكم بـە قوربانی بێت، قەت پێش ئەوو دوای ئـەویش بـۆ فێركـردن مامۆسـتای وام نەبینیووە ـ نە سەرزەنشتی كردم، نـە قسـەی پـێ ووتم، نـە لێیـدام، بـەڵكو فەرمووی: نوێژەكانمان نابێـت هـیچ قسـەیەكی خـەڵكی تێبكـەوێت، بـەڵكو هەر دوعاو سوبحانەالله كردن و سـوپاس و سـتایش كردنـی خـوای گـەورەو قورئان خوێندنی تێدا دەووترێت..

### ٨ـ ووتنی الحمد لله بۆ بیستنی هەواڵێكی خۆش:

سەیدنا سەهلی كوڕی سەعد خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواصلی الله علیه وسلم تەشریفی برد بۆ لای تیرەی بەنی عەمری كوڕی عەوف تا رێكیان خاتەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گەیشتە شوێنەكە، سەیدنا ئەبوبەكری سددیق نوێژی بۆ دەكردن، كە هەستی كرد پێغەمبەری خواصلی الله علیه وسلم تەشریفی هێناوە، وویستی پێشنوێژیەكە واز لێ بهێنێت و بێتەوە دواوە بۆ ریزی مەئموومەكان، بەڵام پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئاماژەی بۆ كرد

---

[1] موسلیم (٥٣٧)، ئەبوداوود (٩٣٠)، ئەحمەد (٢٣٢٥٠)، داریمی (١٥٠٢).

كە لە شوێنی خۆت بمێنەرەوە، ئەبوبەكر هەر لە نوێژەكەدا دەستی بەرز كردەوەو سوپاسی خوای لەسەر ئەوە كرد كە پێغەمبەری خواصلی اللە علیە وسلم فەرمانی مانەوەی پێكرد تا لە دوایەوە نوێژ بكات[1]!!

ئا ئەوەیە رێزلێنان.. خوا بە كوێرایی چاوی شیعە بمانكاتە خزمەتكاری سەیدنا ئەبوبەكرو یاوەرانی تر..

## ٩- پرسیار كردن لە نوێژخوێن بۆ پێویستی:

ئەمەش جائیزە خاتوو ئەسمائی كچی سەیدنا ئەبوبەكری سددیق خوا لێیان رازی بێت دەڵێت: (أَتَيْتُ عَائِشَةَ حِينَ خَسَفَتْ الشَّمْسُ وَالنَّاسُ قِيَامٌ وَهِيَ قَائِمَةٌ تُصَلِّي فَقُلْتُ مَا لِلنَّاسِ فَأَشَارَتْ بِيَدِهَا نَحْوَ السَّمَاءِ فَقَالَتْ سُبْحَانَ اللَّهِ) [2]. كە خۆر گیرابوو هاتمە خزمەت عائیشەخان، دیتم پیاوان نوێژ دەكەن و ئەویش لە نوێژدایە لێم پرسی: ئەوە پیاوان چییانە؟ پەنجەی بۆ ئاسمان راكێشاو فەرمووی: سوبحانەاللە.

★ ★ ★

---

[1] بوخاری (٦٨٤)، موسلیم (٤٣١).
[2] بوخاری (٢٤).

## دووەم: کرداری ڕێدراو

## (الافعال المباحة)

### ١ـ هەڵگرتنی زارۆك:

چونکە سەیدنا ئەبوقەتادە خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە نوێژیشدا بوو ئومامەی کچی زەینەبی کچی (کچەزای خۆی) بە باوەشەوە بوو، کە دەچووە سوجدە لەسەر زەوی دایدەناو کە هەڵدەستایەوە دەیکردەوە باوەش[١].. هەڵگرتنی حەسەن و حوسەینیش خوا لێیان ڕازی بێت کە کچەزای خۆی بوون لە هەندێ کاتی نوێژکردنیدا بەناوبانگە[٢]..

### ٢ـ ڕۆیشتنێکی کەم لەبەر زەرورەت:

عائیشەخان خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: جارێکیان هاتمەوەماڵەوە، دەرگای دەرێ لە ناوەوە داخرابوو، نەمتوانی بیکەمەوە، پێغەمبەری خواش صلی الله علیه وسلم، لە نوێژدا بوو، بێ ئەوەی نوێژەکەی ببڕێت بەدەم نوێژکردنەکەوە تەشریفی هێناو لێی کردمەوەو گەڕایەوە شوێنی خۆی، نوێژەکەی تەواو کرد، ئەوەشی فەرموو کە ئاڕاستەی دەرگاکە ڕووەو قیبلە بوو[٣]..

---

[١] بوخاری (٥١٦)، موسلیم (٥٤٣).

[٢] ئیمامی ئەحمەد (٥١٣/٢)، هەیسەمی: مجمع الزوائد (١٨٤/٩) ئەلبانی بە چەندین سەنەدەوە لە سلسلة الاحادیث الصحیحة (ژمارە ٣٣٢٥) دا هێناویەتیەوە.

[٣] ترمزی (٥٩٨)، ئەبوداوود (٩١٠)، نەسائی (١١/٣)شێخی ئەلبانیش بە حەسەنی ناساندووە..

## ٣ ـ بزاوتێكی كەم بۆ زەروورەت:

ئەزرەقی كوڕی قەیس دەڵێ: لە ئەهواز بووین لە جەنگی خەواریجەكاندا، لەو كاتەی لە كەناری روبارێك دانیشتبووم، كابرایەك (ئەبو بەرەزەی ئەسلەمی بووە) نوێژی دەكردو جڵەوی ئەسپەكەشی بە دەستەوەبوو، ئەسپەكە هەوڵی دەدا خۆی راپسكێنێت، هەر بەملاولایدا دەهێناو دەبرد، كابراش بە دەم بزاوتی ئەوەوە دەجوڵاو نوێژەكەشی نەدەبڕی.. دوایی فەرمووی: شەش یان حەوت یان هەشت غەزام لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم كردووەو ئەو ئاسانكاریەم لێ بینیووە.. ئەوەم پێ باشتربوو ئاوا بە دوای ئەسپەكەمدا بێم و بچم وەك لەوەی بەرەڵای كەم و بچێتەوە ئەو شوێنەی لێی راهاتووە، دوایی منیش بە زەحمەت بۆم دێتەوە[١]..ئیمامی ئیبنوحەجەری عەسقەلانی دەڵێ[٢]: لە ریوایەتێكی تردا كە عەمری كوڕی مەرزووق دەیگێڕێتەوە دەڵێ: (لەگەڵ بزاوتی ئەسپەكەدا دەهات و دەچوو، پاشان پشتاوپشت دەگەڕایەوە شوێنی خۆی) لە گێڕانەوەكەدا دەردەكەوێت كە ئەبوبەرەزە نوێژەكەی نەبڕیووە، چونكە ئەگەر بیبڕیایە ئیتر پشتاوپشت بگەڕایایەتەوە یان رووەوڕوو چ كاریگەرییەكی دەبوو؟! رەفتارەكەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە بزاوتێكی كەم بۆ هێنانەدی مەبەستێكی زەرووری نوێژەكەی پێ بەتاڵ نابێتەوە.. ئەمەو چەندین فەرموودەو رەفتاری تر هەن كە بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە نوێژ بە سێ بزاوت بەتاڵ

---

[١] بوخاری (١٢١١).
[٢] فتح الباری (٣/٨٢).

نابێتەوە وەکو مەلای کورد بە بەبێ بەڵگەی شەرعی سێ جووڵەی ناو نوێژ دەکەنە مایەی بەتاڵ بوونەوەی!

شەرعناسان فەرموویانە بزاوتن بۆ رزگارکردنی نقووم بووی ناو ئاوو کوژاندنەوەی ئاگرو دەستگرتنی کوێرو پەك کەوتەو قوتار کردنی زارۆك و ئەوانە هەمووی جائیزە بێ ئەوەی نوێژەکەی ببڕێت.. کەوابوو دەتوانین ئەمە بکەینە بەڵگەی شیاوێتی هەندێك بزاوتی ناو ماڵ کە ئافرەت زیاتر پێویستی پێیەتی وەك کوژاندنەوەی تەباخ و هیتەرو شتی وا یان بۆ هەڵگرتنی تەلەفۆن و هێنانی سەماعەکەی بۆ لای دەمەوە تا دوێنەر تەکبیرەی نوێژەکان ببیستێت و بزانێت دوێنراوەکەی لە نوێژدایە..

### ٤ـ راکێشان و پاڵنان بەو کەسەوە کە دێتە بەر نوێژەکەی:

فەرموودەی لەو بابەتەمان لە باسی نوێژدا هێنایەوە، بەلاّم بۆ بیر خستنەوە:

ـ سەیدنا ئیبنوعومەر خوا لێیان رازی بێت گێڕاوێتیەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لا تصَلِّ إلَّا إلَى سُترَةٍ، وَلا تدَع أحَدً يَمُرُّ بَينَ يَديكَ؛ فَإنْ أبَى فَليُقاتِلْه، فَإنَّ مَعَهُ قَرينٌ)[١] واتە: نوێژ بەرەو سوترە نەبێت مەیکە، نەشهێڵیت کەس بەبەر نوێژەکەتدا بڕوات، ئەگەر هەر گوێی نەدایەو رۆیشت، پاڵی پێوەنێ، ئەوە هاوڕێی پاڵنەری) خراپی لەگەڵدایە.. لە ریوایەتەکانی تردا دەفەرموێ ئەوە شەیتانی لەگەڵدایە..

---

[١] موسلیم (٥٠٦) و سەحیحی ئیبنوخوزەیمە ژمارە (٧٩٣).

## ٥ـ کوشتنی مارو دووپشك:

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: (اقْتُلُوا الأَسْوَدَيْنِ فِي الصَّلاةِ: الْحَيَّةُ والْعَقْرَبُ)[١] واتە: لە نوێژیشدا بن ئەو دوو رەشتاڵانە بکوژن: مارو دووپشك.. یاوەر هەبووە لە ناو نوێژەکەیدا دووپشکی کوشتووەو نوێژەکەشی نەبڕیووە!

## ٦ـ ئاماژەی حاڵی کردن بە چاو، بە دەست:

عائیشەخان خوا لێی رازی بێت دەڵێ: جارێکیان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی دەکردو منیش لەبەر نوێژەکەیدا راکشابووم، کە وویستی سوجدە ببات بە چاو ئاماژەی بۆ کردم، منیش قاچم هەڵکێشا، کە هەستایەوە قاچم درێژ کردەوە[٢]..

## ٧ـ پێڵاو لە پێ کردنەوە:

لای زۆر کەس سەیرە کە ئەمە ببێتە باسێکی ناو نوێژ، چونکە لە کۆمەڵگەی کوردەواریدا کەس بە پێڵاوەوە نوێژ ناکات، بە تایبەتی نەعل! بەڵام ئەمە باسی شەرعەو ئەم رەفتارە لای تۆ لەم زەمانەدا نابینرێت

---

[١] ئەبوداوود (٩٢١)، ترمزی (٣٩٠)، نەسائی (١٠/٣)، ئیبنوماجە (١٢٤٥)، ئیبنوحیببان (٢٣٥٢/٦)، ئەحمەد (٤٧٣/٢) شێخ ئەحمەد شاکرو شێخی ئەلبانیش بە بە سەحیحیان داناوە.. (تحفة الاشراف ١١٧/١٠).

[٢] بوخاری (١٢٠٩)، موسلیم (٥١٢). رەنگە کەسانێك ئەو رەفتارەی خاتوو عائیشەی پێ سەیر بێت، بەڵام دەبێ ئەوە لەبەرچاو بگیرێت کە ماڵەکەیان بچووك بووەو پێغەمبەری خواش صلی الله علیه و سلم بەردەوام نوێژی لە ماڵەوەدا کردووە بە تایبەتی شەونوێژەکانی، عائیشەخانیش کە راکشاوە خێزانێتی و ماڵی خۆیەتی و ئەوەش مێردی خۆیەتی و شوێنی حەوانەوەشی ئێرەیە، رەفتارەکەش لای هەردووکیان و یاوەران شتێکی ئاسایی بووە.

مەرج نیە بۆ هەتا هەتایی وا بێت، خۆمان ناچاربووین لە پێشمەرگایەتیدا بە پێڵاوەوە نوێژ بكەین.. دەشێت ئاسانكاریی شەرع نیشان كاروانچی و گەشتیارو كرێكارو سایەق و دەیان پیشەوانی تر بدرێت، تا ئەوانیش بزانن كە شەرع ئاسانەو ئەوانیش دەتوانن بە پێڵاوەوە نوێژ بكەن، كە زانییان پیسایی پێوەیە دەبێت دەسبەجێ لە پێی خۆیانی بكەنەوەو نوێژەكەش بێ خەم تەواو كەن..

- جوبرەئیل سەلامی خوای لێ بێت هەواڵی دایە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم كە نەعلەكانی پیساییان پێوەیە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەردوو جووتەكەی لە پێ دانا (أَنَّهُ صَلَّى فِي نَعْلِهِ، وَصَلَّى أَصْحَابُهُ فِي نِعَالِهِمْ، فَخَلَعَ نَعْلَيْهِ، فَخَلَعُوا نِعَالَهُمْ، فَلَمَّا سَلَّمَ قَالَ: لِمَ خَلَعْتُمْ نِعَالَكُمْ؟ قَالُوا: رَأَيْنَاكَ خَلَعْتَ نَعْلَيْكَ فَخَلَعْنَا نِعَالَنَا، فَقَالَ: إِنَّ جِبْرِيلَ أَتَانِي فَأَخْبَرَنِي أَنَّ فِيهِمَا أَذًى)[١] واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە نەعلەكانیەوە نوێژی كرد، یاوەرانیش لە دوایەوە بە نەعەلەكانیانەوە نوێژیان دابەست، لە نوێژەكەدا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەعلەكانی دانا، یاوەرانیش لە دوایەوە نەعلەكانیان دانا، كە سەلامی (كۆتایی نوێژی) دایەوە پێی فەرموون: بۆچی نەعلەكانتان لە پێ كردەوە؟! فەرموویان: دیمان جەنابت نەعلەكانت دانا، ئێمەش داماننان، فەرمووی: جوبرەئیل هات و هەواڵی دامێ كە نەعلەكان پیسییان پێوە بوو..

---

[١] الألباني: ارواء الغليل (٢٨٤).

## ٨ ـ تف کردنە ناو دەسرِ:

ئەگەر بە هۆی گریان یان نەخۆشی لە نوێژدا بەڵغەم کەوتە ناو دەمەوە، نابێت قووت بدرێتەوە بەڵکو دەکرێت بکرێتە دەسرِێکەوە، ئەگەر دەست کەوت، ئەگەر نا لکی پۆشاکێکی، هەروەها چڵم و ئاوی لووت کە بە هۆی گریان یان نەخۆشی و پیرییەوە یان هەر هۆیەکی تر دێنە خوارەوە.. ئەگەر هەر نەبوو دەتوانێت بە دەست لە دەم و لووتی خۆی بکاتەوەو فرِێی داتە لای چەپی خۆی یان ژێر پێی خۆی، نەك پێش یان لای راستی خۆی، چونکە نەهی لێکراوە..

ـ سەیدنا جابری کورِی عبدالله خوا لێیان رازی بێت گێرِایەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا قَامَ فِي صَلَاتِهِ فَإِنَّهُ يُنَاجِي رَبَّهُ أَوْ إِنَّ رَبَّهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ فَلَا يَبْزُقَنَّ أَحَدُكُمْ قِبَلَ قِبْلَتِهِ وَلَكِنْ عَنْ يَسَارِهِ أَوْ تَحْتَ قَدَمَيْهِ ثُمَّ أَخَذَ طَرَفَ رِدَائِهِ فَبَصَقَ فِيهِ ثُمَّ رَدَّ بَعْضَهُ عَلَى بَعْضٍ فَقَالَ أَوْ يَفْعَلُ هَكَذَا)[١] هەر کەسێکتان هەستا بۆ نوێژ با بزانێت کە لەگەڵ خوای پەروەردگاری خۆی دەدوێت، یان خوای گەورە وا لە نێوان ئەوو قیبلەکەیدا، نەکات تف بەرەو قیبلەکەی بکات، با بیکاتە لای چەپی خۆی یان ژێر پێی.. پاشان سەیدنا جابر خوا لێی رازی بێت لکی پۆشاکەکەی گرت و تفێکی تێکردو پێچایەوەو فەرمووی: ئاوا..

## ٩ ـ پۆشاك رێك كردنەوەو خۆ خوراندن:

لە مەزهەبی شافیعیدا لە نوێژدا نابێت لە سێ بزاوت زیاتر بکرێت، ئەگەر وویستی شوێنێکی بخورێنێت دەبێت لەپی دەستی لەو نزیك ئەو

---

[١] موسلیم (٣٠٠٨)، ئەبوداوود (٤٧٧).

شوێنە راگرێت و بە پەنجەیەك خۆی بخورێنێت!! بەڵام ئەمە بەڵگەیەکی وای لەسەر نیە، بە پێچەوانەوە یاوەرانی پێغەمبەری خواصلی الله علیه وسلم زۆر لەوە زیاتر لە نوێژدا دەبزوان و بە لاشیانەوە ئاسایی بوو..

جەریری زیببی رەحمەتی خوای لێ بێت دەگێڕێتەوە کە سەیدنا عەلی خوا لێی رازی بێت کە هەڵدەستا بۆ نوێژ، لەپی دەستی راستی دەخستە سەر مەچەکی دەستی چەپی و تا دەچووە رکوع هەر وا دەمایەوە مەگەر پۆشاکەکەی رێك بخستایاتەوە یان لەشی بخوراندایە[1]..

ئیبنو عەبباسیش خوا لێی رازی بێت دەیفەرموو: پیاو (مەبەستی نوێژخوێنە) لە ناو نوێژدا چەند بیەوێت دەتوانێت ئەندامانی لەشی بۆ ببزوێنێت[2]..

## ١٠ ـ سوبحان الله وتنی پیاوان و چەپڵە لێدانی ژنان بۆ راست کردنەوەی هەڵەی ئیمام:

ئەگەر پێشنوێژ هەڵەیەکی کرد پێویستی بە راستکردنەوە هەبوو مەئموومەکانی بۆی راست دەکەنەوە، بۆ نموونە ئیمام دەیەوێت هەستێتەوە بۆ رکاتی پێنجەم، پیاوەکان لە دواوە دەڵێن: سبحان الله، ئەگەر مەئمووکان ژن بوون ـ یا ژن و کچی خۆشی بن ـ لەپی دەست بە لەپی دەست، یان دەست بە پشتەدەستی خۆیاندا دەکێشن[3] کە وەکو چەپڵە دەنگی بێت.. چونکە پێغەمبەری خواصلی الله علیه وسلم دەفەرموێ:

---

[1] بوخاری بە مەعەللەقی (٥٨/٢)، ئیبنوئەبی شەیبە (٣٩١/١).
[2] بوخاری بە مەعەللەقی و لەگەڵ تەئکید کردنەوەی (٥٨/٢).
[3] ابن الاثیر: النهایة (٣٤/٣).

(التَسْبِيحُ لِلرِّجَالِ وَالتَصْفِيقُ لِلنِّسَاءِ)[1] واتە پیاوان سوبحانەالله دەڵێن و ژنان چەپڵە لێدەدەن..

بەڵام ئەگەر هەر ژنان خۆیان لە نوێژدابوون بۆیان هەیە سوبحانەالله بۆ تێگەیاندنی یەكتری بكەن.. خاتوو ئەسمائی كچی سەیدنا ئەبوبەكری سدیق خوا لێیان رازی بێت دەڵێت: (أَتَيْتُ عَائِشَةَ حِينَ خَسَفَتْ الشَّمْسُ وَالنَّاسُ قِيَامٌ وَهِيَ قَائِمَةٌ تُصَلِّي فَقُلْتُ مَا لِلنَّاسِ فَأَشَارَتْ بِيَدِهَا نَحْوَ السَّمَاءِ فَقَالَتْ سُبْحَانَ اللَّهِ)[2]. كە خۆر گیرابوو هاتمە خزمەت عائیشەخان،دیتم پیاوان نوێژ دەكەن و ئەویش لە نوێژدایە بەڵام لێم پرسی: ئەوە پیاوان چییانە؟ پەنجەی بۆ ئاسمان راكێشاو فەرمووی: سوبحانەالله.

## ١١ ـ لاكردنەوە بەلای راست و چەپ بۆ زەروورەت:

ئەوی لە نوێژدایە ئەگەر زەرووەتێكی هاتە پێش پێویست كات بە لای راستیدا یان بە لای چەپیدا لا كاتەوە، بۆی هەیە.. وەك ئەوەی شتێك لە مەئموومەكانی بگەیێنێت، یان تەنهایەو دەیەوێت شتێك لە كەسێك بگەیێنێت.. عائیشەخان خوا لێی رازی بێت دەڵێ: (اشْتَكَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَدَخَلَ عَلَيْهِ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِهِ يَعُودُونَهُ، فَصَلَّى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَالِسًا فَصَلُّوا بِصَلَاتِهِ قِيَامًا، فَأَشَارَ إِلَيْهِمْ أَنْ اجْلِسُوا فَجَلَسُوا فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: إِنَّمَا جُعِلَ الْإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا، وَإِذَا صَلَّى جَالِسًا فَصَلُّوا جُلُوسًا)[3] واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەستی بە نەخۆشی كرد، خەڵكیش بۆ دیدەنی هاتنە خزمەتی، كە نوێژی

---

[1] بوخاری (١١٤٥).
[2] بوخاری (٢٤).
[3] موسلیم (٤١٣)، نەسائی (٣/٩)، ئەبوداوود (٥٨٨).

بە دانیشتنانەوە کرد خەڵکەکە بە پێوە لە دوایەوە نوێژیان کرد، لە نوێژەکەدا لای کرد بە لایانەوەو ئاماژەی بۆ کردن کە ئێوەش دانیشن، کە لە نوێژ تەواو بوو فەرمووی: ئیمام بۆیە دانراوە تا ئیقتیدای پێ بکرێت، کە چووە رکوع ئێوەش بچنە رکوع، کە هەستایەوە ئێوەش هەستنەوە، کە نوێژی بە دانیشتنانەوە کرد ئێوەش نوێژ بە دانیشتنانەوە بکەن..

### ١٢ـ ئاماژە کردن بە دەست یان بە سەر:

سەیدنا جابر خوا لێی رازی بێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ بەنیلموستەلیق دەچوو، ناردمی بۆ کارێك، کە گەڕامەوە خزمەتی دیتم لەسەر حوشترەکەیەتی، بۆم باس کرد کە چیم کرد، ئاماژەی بە دەست ئاوا بۆ کردم، دواتر هەر قسەم کرد، ئەمجارەش بە دەست ئاماژەی بۆ کردم (سەیدنا جابر ئاماژەی بە دەستی خۆی کرد) گوێشم لێبوو ویردی دەخویندو بە سەریشی ئاماژەی دەکرد.. کە تەواو بوو فەرمووی: (مَا فَعَلْتَ فِي الَّذِي أَرْسَلْتُكَ؟ فَإِنَّهُ لَمْ يَمْنَعْنِي مِنْ أَنْ أُرُدَّ عَلَيْكَ إِلَّا أَنِّي كُنْتُ أُصَلِّي)[١] واتە: چیت بۆ ئەو کارەی بۆم ناردیت؟ ئەوە بۆیە وەڵامم نەدەدایەوە چونکە نوێژم دەکرد..

### ١٣ـ وەڵامدانەوەی سڵاو بە ئاماژە کردن:

ناشێت کەسێك کە لە نوێژدایەو سڵاوی لێ دەکرێت بە ووتن وەڵام بداتەوە، بەڵام بۆی هەیە بە دەست یان هەر ئاماژەیکی تر کە لە ناو ئەو کۆمەڵگەدا باوە وەڵام بداتەوە..

سەیدنا ئیبنوعومەری خوا لێیان رازی بێت فەرمووی: پێغەمبەری

---

[١] موسلیم (٥٤٠)، ئەبوداوود (٩٢٦).

خوا صلى الله عليه وسلم تەشریفی برد بۆ قیباء، لەوێ نوێژی دابەست، ئەنساریەکان هاتن و سڵاویان لێکرد، بە بیلالم ووت: ئەرێ کە سەلامیان لێ دەکردو ئەویش لە نوێژدا بوو چۆن وەڵامی دەدانەوە؟ فەرمووی: ئاوا (دەستی راستی لەسەر مەچەکی چەپی بەرز کردەوە، لەپی دەستی رووی لە زەوی کردو پشتە دەستیشی روو لە ئاسمان)[١]..

## ١٤ ـ سەر بەرز کردنەوە لە سوجدە لەبەر دواکەوتنی ئیمام بۆ دڵنیابوون لە بارودۆخەکە:

ئەسڵ ئەوەیە مەئمووم بە هیچ شێوەیەك پێچەوانەی ئیمامەکەی ناکات، پێش ئەو سەر لە سوجدە بەرز ناکاتەوە، بەڵام ئەگەر نە تەکبیری سەر بەرز کردنەوەی سوجدەی ئیمامەکەی گوێی لێبوو نە هەستی بە بەرز بوونەوەی کرد، بۆی هەیە سەر بەرز کاتەوە تا دڵنیابێت لە بارودۆخەکە، نەبادا ئەو تەکبیری کردبێت و ئەم گوێی لێ نەبووبێت، یان ئەو شتێکی لێ قەوما بێت..

عبداللەی کوڕی شەدداد خوا لێی رازی بێت فەرمووی: جارێکیان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم تەشریفی هێنایە لامان، حەسەن یان حوسەینیشی بە باوەشەوە بوو، دایناو نوێژی دابەست، لە نوێژەکەدا سوجدەیەکیانی زۆر درێژکردەوە، باوکم دەڵێ: سەرم بەرز کردەوە، بینیم وا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە سوجدەدایەو منداڵەکە چۆتە سەر شان و ملی، چوومەوە سوجدە، کە نوێژەکەی تەواو کرد خەڵکەکە پرسیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سوجدەیەکیانت زۆر درێژکردەوە، گومانمان کرد شتێك رووی دا بێت، یان وەحیت بۆ بێت،

---

[١] ئەبوداوود (٩١٥) كمال ابن السيد سالم: صحيح فقه السنة ٣٥١/١.

فەرلامووی:(كُلُّ ذَلِكَ لَمْ يَكُنْ، وَلَكِنَّ ابْنِي ارْتَحَلَنِي، فَكَرِهْتُ أَنْ أُعَجِّلَهُ حَتَّى يَقْضِيَ)[١] واتە: هیچ لەوانە نەبوو، بەڵام ئەم کوڕەم (کە کچەزایەتی) سواری کۆڵم بووبوو، پێم خۆش نەبوو پەلەی لێ بکەم، تا خۆی دێتە خوارەوە..

## ١٥ ـ قورئان بە دەستەوەگرتن لە نوێژدا:

ئەگەر کەسێك کە قورئانی زۆر لەبەر نیەو وویستی نوێژەکەی درێژکاتەوە، وەك ئەوانەی شەونوێژ دەکەن، بۆی هەیە قورئان یان ئامێرێکی ئەلیکترۆنی بە دەستەوە بگرێت و لەوێدا بیخوێنێت، ئەم رەفتارە ئێستا لە زۆر وولاتانی جیهاندا تەنانەت لە حەرەمی کەعبەش بووە بە باوێکی قبووڵبوو، جگە لە مەئموومەکان ئیمامەکانیش کە قورئانیان لەبەرەو هەیانە دکتۆرایان لە قیرائاتدا هەیە زۆرجار موسحەفێکی ئەلیکترۆنی گەورەیان لەبەر چاودا دادەنرێت.. کۆمپانیا زەبەلاحەکانی ئەلیکترۆنی کێبڕکێییان لەم جۆرە ئاسانکاریانەدا هەیە، دەیان ئامێریان بۆ دروست کردووە.. کابرا لە نوێژدایەو مۆبایلەکەی بە دەستەوەیە کە قورئانەکەی تێدا تۆمار کراداوەو لەوێدا تەماشای دەکات..

بەڵگەی ئەمەش رەفتارەکەی خاتوو عائیشەیە کە قورئانیشی لەبەر بوو، بەڵام لە رەمەزاناندا لە موسحەفدا قورئانی دەخوێند[٢]..

---

[١] نەسائی (٢/٢٣٠) پلەی فەرموودەکە حەسەنە، بۆ راڤەشی بڕوانە: حاشية السندي على النسائي ٢/٢٣٠).

[٢] عبدالرزاق: المصنف (٢/٢٤٠)، ابن ابي داود: المصاحف (ل ١٩٢).

هەروەها ئەو ریوایەتەی قاسمی کوڕی سەیدنا ئەبوبەکر خوا لێیان رازی بێت کە دەڵێ: عائیشەخان (کە پورێتی) کۆیلەیەکی هەبوو پێشنوێژی بۆ دەکردو لەبەر موسحەف قورئانی ناو نوێژەکەی دەخوێند[١]..

* * *

---

[١] بوخاری لە: کتاب الاذان/ باب إمامة العبد دا بە موعەللەقی هێناویێتیەوە (٢/٣٣٨)، ئیبنوئەبی شەیبەش بە سەنەدی تەواوە هێناوێتیەوە (٢/٣٣٨)، ئیبنوئەبی داوودیش لە (المصاحف ل ١٩٢) باسی کردووە..

# ئەو ڕەفتارانەی لە نوێژدا ڕێ نەدراون بکرێن

ئەمانە ئەو ڕەفتارانەن کە دەقێك لەسەر حەرام کردن یان بەرهەڵستی کردنی لە نوێژدا هەیە، بەڵام ئەنجامدانیان لە نوێژدا نوێژەکە بەتاڵ ناکەنەوە، بەڵکو لە پاداشتەکەی کەم دەبێتەوە. لەوانە:

**١ـ دانانی دەستەکان لە کەللەکەی ( بەر پەراسووەکان : لە لاقە پرغە ):**

ئەمە جائیز نیە:

ـ سەیدنا ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێت دەڵێت: (نَهَى عَنْ الْخَصْرِ فِي الصَّلاةِ)[1] پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەهی کردووە لەوەی کەسێك دەستەکانی بخاتە کەللەکەی.

ـ زیادی کوڕی سەبیح ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێ: جارێکیان لە تەنیشت سەیدنا ئیبنوعومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت نوێژم دەکرد، دەستم خستبووە کەللەکەم، کە لە نوێژ بووینەوە فەرمووی: ئەم نوێژە سەلیبە چیە؟ خۆ پێغەمبەری خواصلى الله عليه وسلم نەهی لێ کردووە[2].. شێخی سندی ڕاڤەکاری سونەنی نەسائی دەڵێ: شێوەی سەلیب ئەوەیە کە بە پێوە بوەستێت و دەستەکانی بخاتە کەللەکەی و باڵەکانی فش کات..(وەکو هەنگڵی گۆزە)..

---

[1] بوخاری (١٢٢٠)، موسلیم (٥٤٥).

[2] ئەبوداوود (٩٠٣)، نەسائی (١٢٧/٢)، ئیمامی ئەحمەد (٣٠/٢).

## ٢ـ چاوهەڵبڕین بەرەو ئاسمان:

جائیز نیە، بە تایبەتی کە هەندێك کردوێتی بە عادەت و لەگەڵ هەستانەوەی رکوع و ووتنی (سمع الله لمن حمده) چاوی بەرەو ئاسمان بەرز دەکاتەوە..

ـ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: (لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ يَرْفَعُونَ أَبْصَارَهُمْ إِلَى السَّمَاءِ فِي الصَّلَاةِ أَوْ لَتَخْطَفَنَّ أَبْصَارُهُمْ)[1] با ئەو کەسانەی چاویان لە نوێژدا بۆ ئاسمان هەڵدەبڕن، وازی لێ بهێنن یان ئەوەتا خوا نووری چاویان دەبات..

## ٣ـ چاوبڕینە شتێك کە مەشغووڵی دەکات:

وەك ئەوەی چاو دەبڕێتە شێوەی چنینی بەرماڵ و رایەخەکەی ژێری، یان مەشغووڵ دەبێت بە تەماشای زەخرەفەی دارو دیواری پێشی، یان بە شێوەی دوورینی پۆشاکەکەیەوە یان بە دەیان شتی تر کە شەیتان پێوەی مەشغووڵ دەکات.. باشتر وایە پێشتر ئەگەر لە توانایدا هەبوو تەگبیری ئەوانە بکات، ئەوەش مانای ئەوە نیە لایانبدات، خۆشی کۆنترۆڵ کات نەك بەردەوام خەیاڵی بڕوات، ئەگەر نا خۆ لەسەر زەویە رووتەکەش نوێژ بکات خەیاڵی دەچێتە سەر خۆڵ و وورده زیخ و چاڵ و چۆڵی ئەرزەکە!!

ـ عائیشەخان خوا لێی رازی بێت دەڵێ: (اذْهَبُوا بِخَمِيصَتِي هَذِهِ إِلَى أَبِي جَهْمٍ، فَإِنَّهَا أَلْهَتْنِي آنِفًا عَنْ صَلَاتِي، وَائْتُونِي بِأَنْبِجَانِيَّةِ)[2] واتە: ئەم خەمیسەم ببەن بۆ ئەبوجەهم، چونکە نەخشەی درومانەکانی لە نوێژەکەمدا مەشغووڵی کردم، ئەنبیجانیەکەم بۆ بهێنن..

---

[1] موسلیم (٤٢٩)، نەسائی (٣/٣٩).
[2] بوخاری (٤٢٩)، موسلیم (٣/٣٩).

خەمیسە: ئیمامی نەوەوی ڕەحمەتی لە ڕاڤەیدا دەڵێ: پۆشاکێکی خوری چوار گۆشە بوو (وەکو فەرەنجی کوردەواری و عەبای عارەب قۆڵی تێ هەڵدەکێشرا).. ئەنبیجانیە: پۆشاکێکی ئەستوورو سادە بوو لە لۆکەو کەتان دروست دەکرا..

ئیمامی نەوەوی دەڵێ: کۆڕای زانایان و شەرعناسان لەسەر ئەوەیە کە کابرا هەرچەند لە نوێژەکەیدا خەیاڵی بڕوات نوێژەکەی هەر قبووڵە[١]..

**٤ـ لا کردنەوە بەملاولادا:**

جائیز نیە، مەگەر بۆ زەروورەت وەکو لە ڕەفتارە ڕێگادراوەکانی ناو نوێژدا باس کرا.. پێغەمبەری خواصلی الله علیه وسلم ئەم ئەملاولا کردنەی ناو نوێژی ناوناوە ناخونەکی[٢] شەیتان!

ـ عائیشەخان خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: دەربارەی ئەملاولا کردنی نوێژم لە پێغەمبەری خواصلی الله علیه وسلم پرسی، فەرمووی: (هُو اخْتِلاسٌ يَخْتَلِسُهُ الشَّيطانُ مِنْ صَلاةِ الْعَبْدِ)[٣]واتە: ئەوە ناخونەکە، شەیتان لە نوێژی بەندەی دەدات..

**٥ـ تێکهەڵکێشانی پەنجەکان:**

واتە تێکپەڕاندنی پەنجەی هەر دەستێك لە نێوان پەنجەی دەستەکەی تردا. ئەمە لە نوێژدا جائیز نیە. ناشێت نوێژخوێن لە جیاتی ئەوەی دەستی ڕاستی لەسەر مەچەکی چەپی و هەردووکیان لەسەر سینەی

---

[١] شەرحی سەحیحی موسلیم (٥٥٦).
[٢] کەسێك بە لای گوڵەبەڕۆژە یان پاقلەفرۆشێکدا تێدەپەڕێ، لێی ناکڕێت بەڵام کەمێکی لێ هەڵدەگرێت و دەیخوات، بەمە دەوترێت ناخونەکدان..
[٣] بوخاری (٧٥١)، ئەبوداوود (٨٩٧)، نەسائی (٨/٣).

دابنێت، پەنجەی دەستەکانی لە یەکتر بپەڕێنێت و وا نوێژەکەی بکات!! چونکە سەیدنا ئەبوهورەیرە خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ ثُمَّ خَرَجَ عَامِداً إِلَى الْمَسْجِدِ فَلا يُشَبِّكَنَّ يَدَيهِ فَإِنَّهُ فِي صَلاةٍ)[١] واتە: کەسێکتان کە دەستنوێژی گرت و بەرەو مزگەوت کەوتە رێ و داخڵی نوێژکەی بوو، با پەنجەی دەستەکانی نەکا بەیەکدا..

ـ ئیسماعیلی کوڕی ئومەییە فەرمووی: لە نافیعم پرسی (رەنجبەرەکەی ئیبنوعومەر خوا لێیان رازی بێت) کابرایەك لە ناو نوێژەکەیدا لە جێی دەست لەسەر یەکدانان، چنگ بە یەکدا دەکات (پەنجەی دەستەکانی لە یەکتری تێدەپەڕێنێت) فەرمووی: ئەوە نوێژی ئەو کەسانەیە کە خوا غەزەبی لێ گرتوون[٢]..

### ٦ـ پەنجە تەقاندن:

ئەگەر کەم بوو مەکرووهە، چونکە مەشغووڵ بوونێك دێنێتە پێش، ئەگەر زۆریش بوو حەرام دەبێتن چونکە دەبێتە یاریکردن..

ـ شوعبەی رەنجبەری سەیدنا ئیبنوعەبباس خوا لێیان رازی بێت دەڵێ: لە تەنیشت ئیبنوعەبباسەوە نوێژم کرد، لە نوێژەکەدا پەنجەکانم تەقاند، کە تەواو بووین، فەرمووی: ئەرێ بێ داك (یان وەکو کورد دەڵێ: ئەرێ هەتیو) تۆ لە نوێژیشدایت و پەنجە دەتەقێنیت[٣]؟!

---

[١] ئیمامی ئەحمەد (٤٢/٣)، الحاكم (٢٠٦/١) شێخی ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٤٤٥) دا بە سەحیحی ناساندووە.

[٢] ئەبوداوود (٢٦١/٢)، شێخی ئەلبانی لە (الارواء ١٠٣/٢)دا بە سەحیحی ناساندووە.

[٣] ئیبنوئەبی شەیبە (٣٣٤/٢)، شێخی ئەلبانی لە (الارواء ٩٩/٢)دا بە حەسەنی ناساندووە.

## ٧ـ نوێژ بە بەتانی و لێفەوە یان بە پۆشاکێکەوە کە بەسەر شاندا دراوە:

نوێژ کردن بە لەخۆ پێچانی بەتانی و لێفەو شتی وا بە شێوەیەك کە دەستەکان لە ناوەوە بن جائیز نیە.. ئەگەر لە دەرەوە بوون جائیزە.. هەروەها نوێژ بە پۆشاکێکەوە کە قۆڵەکەی تێهەڵنەکێشرا بێت، وەکو پاڵتۆو عەباو شتی وا، ئەمە بە عەرەبی پێی دەوترێت (السدل)، ئەمە جائیز نیە. سەیدنا ئەبو هورەیرە خوا لێی رازی بێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەهی کردووە لە سەدل لە نوێژدا[١]..

## ٨ـ باوێشکدان:

باوێشکدان لە نوێژدا خۆی لە خۆیدا جائیزە، بەڵام نابێت بواریشی ئەوەندە بۆ بکاتەوە بۆ خەڵکانی تریش بهێنێتە باوێشکدان!! دەبێت نەهێڵێت زۆر باوێشك بدات، بەوەی خۆی زیاتر بە هۆش بهێنێتەوەو خەیاڵ بخاتەوە سەر نوێژەکەی و دەست بە دەمیەوە بگرێت..

ـ سەیدنا ئەبو هورەیرە خوا لێی رازی بێت دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (التَّثَاؤُبُ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِذَا تَثَاوَبَ أَحَدُكُمْ، فَلْيَكْظِمْ مَا اسْتَطَاعَ)[٢] واتە: باوێشکدان لە شەیتانەوەیە، ئەگەر یەکێکتان باوێشکی دا با تا دەتوانێت بیخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە..

هەندێ کەس راهاتوون دوای باوێشکدان ئیستیعازە دەکەن (واتە دەڵێن: أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) ئەمە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیەو بیدعەیە..

---

[١] ئەبوداوود (٦٤٣)، ترمزی (٣٧٦) ئەحمەد (٢/٢٩٥). ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٦٨٨٣) و (صحيح أبي داود ٦٣٧) دا دەفەرموێ: حەسەنە.

[٢] بوخاری (٣٢٨٩)، موسلیم (٢٩٩٤)، ترمزی (٣٦٨).

**٩ـ تف رۆكردن ڕووەو قیبلەو لای ڕاست:**

لەبەر ئەو فەرموودەیەی سەیدنا جابر كە هاتووە:

ـ سەیدنا جابری كوڕی عبدالله خوا لێیان ڕازی بێت گێڕایەوە كە پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم فەرموویەتی: (إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا قَامَ فِي صَلَاتِهِ فَإِنَّهُ يُنَاجِي رَبَّهُ أَوْ إِنَّ رَبَّهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ فَلَا يَبْزُقَنَّ أَحَدُكُمْ قِبَلَ قِبْلَتِهِ وَلَكِنْ عَنْ يَسَارِهِ أَوْ تَحْتَ قَدَمَيْهِ ثُمَّ أَخَذَ طَرَفَ رِدَائِهِ فَبَصَقَ فِيهِ ثُمَّ رَدَّ بَعْضَهُ عَلَى بَعْضٍ فَقَالَ أَوْ يَفْعَلُ هَكَذَا)[١] هەر كەسێكتان هەستا بۆ نوێژ با بزانێت كە لەگەڵ خوای پەروەردگاری خۆی دەدوێت، یان خوای گەورە وا لە نێوان ئەوو قیبلەكەیدا، نەكات تف بەرەو قیبلەكەی بكات، با بیكاتە لای چەپی خۆی یان ژێر پێی.. پاشان سەیدنا جابر خوا لێی ڕازی بێت لكی پۆشاكەكەی گرت و تفێكی تێكردو پێچایەوەو فەرمووی: ئاوا..

**١٠ـ چاونوقاندن:**

ناشێت لە نوێژدا بە نیەتی لە خوا نزیكبوونەوەی زیاترو ملكەچی زیاتر چاو بنوقێنێت، چونكە وەكو ئیمامی ئیبنولقەییمی ڕەحمەتی دەڵێ[٢]: ئەوە حەرامە، چونكە بیدعەیەو پێچەوانەی ڕەفتاری پێشەوای خۆشەوویستە صلى الله علیه و سلم.

**١١ـ خۆلێك كێشانەوە:**

خۆ لێككێشانەوە بۆ ساتێكی كەم جائیزە، بەڵام كە زیاتر بوو سیماو ڕەونەق و ملكەچی نوێژەكە دەشێوێنێت.. سەعیدی كوڕی جوبەیری

---

[١] موسلیم (٣٠٠٨)، ئەبوداوود (٤٧٧).

[٢] ابن القیم: زاد المعاد (٢٩٤/١).

ڕەحمەتی خوا لێ بێت دەیفەرموو: خۆلێككێشانەوە لە نوێژەكە كەم دەكاتەوە[١]..

### ١٢ـ قورئـان خوێندن لە ركوع و سوجدەدا :

ناشێت لە ركوعدا یان لە سوجدەدا قورئان بخوێندرێت، چونكە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: (أَلَا وَإِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَقْرَأَ الْقُرْآنَ رَاكِعًا أَوْ سَاجِدًا أَمَّا الرُّكُوع فَعَظِّمُوا فِيهِ الرَّبَّ وَأَمَّا السُّجُودُ فَاجْتَهِدُوا فِي الدُّعَاءِ فَقَمِنٌ أَنْ يُسْتَجَابَ لَكُمْ)[٢] واتە: من ڕێی ئەوەم لێگیراوە كە قورئان لە كاتی ركووع و سوجدەبردنمدا بخوێنم، بۆیە ئێوە لە ركووعدا خوا بە مەزن بگرن و لە سوجدەكانیشتاندا دوعای زۆری تێدا بكەن، ئومێد زۆرە كە دوعاكانتان گیراببێت..

### ١٣ـ ئانیشك دانانە سەر زەوی لە كاتی سوجدەبردندا :

ناشێت چونكە پێغەمبەری خواصلی الله علیه وسلم نەهی لێكردووە: (لا يَبْسُطْ أَحَدُكُمْ ذِرَاعَيهِ انْبِسَاطَ الْكَلْب)[٣] واتە: كەستان (لە نوێژدا) ئانیشكەكانی لەسەر زەوی ڕانەخات وەكو كە سەگ ڕایدەخات..

### ١٤ـ قۆڵ هەڵكردن و پۆشاك كۆكردنەوە :

چونكە عەرەبەكان دشداشەو عەباو پۆشاكی تری درێژو ئاودامانیان لەبەر دەكرد، زۆر جار بۆ كاری پێویست دەبوو هەڵیكەن، یان بۆ خۆ

---

[١] ئیبنو ئەبی شەیبە (٣٤٩/١)..

[٢] موسلیم (٧٣٨)، نەسائی (١٠٣٥)، ئەبوداوود (٧٤٢)، ئیبنوماجە (٣٨٨٩)، ئیمامی ئەحمەد (١٨٠١)، داریمی (١٣٩١).

[٣] بوخاری (٢٤٠/٢)، موسلیم (٥٣/٢)، ئەبوداوود (١٤٣/١)، ترمزی (٦٦/٢)، نەسائی (١٦٧/١).

گورج کردنەوە دەبوو پۆشاکەکانیان کۆکەنەوەو بیخەنە نێوان رانیان یان بندەستیان، زۆریان بۆ ئەوەی خۆڵاوی نەبن لە قول و قاچیانەوە بەرەو ئەژنۆیان هەڵیان دەکرد.. یان ئەوانەیان کە قژیان درێژ دەکردەوە، بۆ ئەوەی لە نوێژکردندا خۆڵاوی نەبن جلوبەرگەکەیان کۆدەکردەوەو قژیان دەبەست.. پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم رێی ئەوەی لێگرتن..

ـ سەیدنا ئیبنو عەبباس خوا لێی رازی بێت گێڕایەوە کە پێغەمبەری خواصلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (أَمَرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةِ أَعْظُمٍ، وَلا يَكُفَّ ثوبَهُ، ولا شَعْرَهُ)[1] واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانیداوە کە لەسەر حەوت ئەندامی لەش سوجدە ببرێت، بەرهەڵستیشی کردووە کە (لە کاتی نوێژدا) پۆشاکی بەر گرمۆڵە کرێت یان هەڵکرێت هەروەها قژ ببەسترێت..

قۆڵ هەڵکردنیش هەمان حوکمی نەهی هەیە. نابێت لە نوێژدا قۆڵی هەڵکات..

## ـ قژ درێژکردنەوە:

قژ درێژکردنەوە هەر بۆ ژنان نیە! سوونەتە پیاویش چەند بیەوێت قژی درێژ بکاتەوەو لە دواوە بە کلاڤەو لاستیك بیبەستێت، ئەوەندە هەیە کە دەبێ لە کاتی نوێژدا بیکاتەوە.. چونکە ئیبنومەسعوودو ئەبوهورەیرە خوا لێیان رازی بێت دەیانفەرموو: مووەکانی قژیش سوجدە دەبەن[2]..

---

[1] بوخاری (٨٠٩)، موسلیم (٤٩٠).
[2] فتح الباری (٨١٥).

## ١٥ـ هەڵتووتـان:

هەڵتوووتان غەیری هەڵتروشکانە، هەڵتروشکان خۆ کوشمەڵە کردن و دانیشتنە لەسەر پێیەکان بە شێوەیەك کە سمت بە بەلەکەوە بنوسێت. بەڵام هەڵتووتان وەکو دانیشتنی سەگە.. کابرا سمتی دەخاتە سەر زەوی، رانەکانی هەڵناوەو پاژنە پێیەکانی لە پێش خۆیەوە لەسەر زەوین، دەستەکانیشی بردۆتەوە بۆ دواوەو لەپی دەستی لەسەر زەوی داناوەو برێك تینی لەشی خۆی خستۆتە سەر.. ئەمە کە بە عەرەبی پێی دەووترێت: (الإِقْعَاء) لە نوێژدا حەرامەو نابێت بکرێت.. یاوەران پێیان دەوت: دانیشتنی شەیتانی..

ـ عائیشەخان خوا لێی رازی بێت لە وەسفی نوێژی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دا فەرمووی: (وَكَانَ يَنْهَى عَنْ عُقْبَةِ الشَّيطانِ)[1]..

## ١٦ـ ئیعتیماد کردنە سەر دەستی چەپ لە چوونە سوجدەو دانیشتندا:

سەیدنا ئیبنوعومەر خوا لێیان رازی بێت دەڵێ: (نَهَى النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ إِذَا جَلَسَ الرَّجُلُ فِي الصَّلَاةِ أَنْ يَعْتَمِدَ عَلَى يَدِهِ اليُسْرَى)[2]واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردووە کە کابرا بۆ دانیشتنی نوێژ ئیعتیماد بکاتە سەر دەستی چەپی.. بە داخەوە ئەمە لە کوردەواریدا زۆر باوە، هەزاران کەس دەبینیت لە هەستان و دانیشتنی نوێژەکاندا لەسەر دەستی چەپ دادەنیشن و هەڵدەستنەوە! لە کاتێکدا کە هەموو

---

[1] موسلیم (٤٩٨).

[2] ئەبوداوود (١/٢٦٠)، ئەحمەد (٢/١١٦)، بەیهیقی (٢/١٣٦). الحاكم (١/٢٣٠)، شێخی ئەلبانی رەحمەتی لە: سلسلة الاحاديث الضعيفة (٢/٣٨٩)دا دەفەرموێ: (وقال الحاكم على شرط الشيخين ووافقه الذهبي وهو كما قالا).

ریوایەتەکان ئەوە دەسەلمێنن کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەر هەردوو دەستی پیرۆزی دادەهاتەوەو هەڵدەستایەوەو دەستیشی وا مشت دەکرد وەکو کەسێك هەویر بشێلێت..

### ١٧ـ سوجدەبردنی نەخۆش لەسەر شتێکی بەرز:

هەندێك کەسی نەخۆش کە هەوڵ دەدات لە نوێژکردنیدا سەری بگەیێنێتە سەر زەویەکەو ناتوانێت، سەرینێك یان شتێکی بەرز دادەنێت تا ناوچەوانی بکاتە سەر! ئەمە چ پێویست دەکات کە نەخۆش و ناتوانا عوزریان هەیەو هەر چۆنێك توانیان سوجدە ببەن قبووڵە..

ـ سەیدنا جابر خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە (أنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَادَ مَرِيضًا فَرَآهُ يُصَلِّي عَلَى وِسَادَةٍ، فَأَخَذَهَا فَرَمَى بِهَا، وَقَالَ:صَلِّ بِالْأَرْضِ إِنِ اسْتَطَعْتَ، وَإِلا فَأَوْمِئْ إِيمَاءً، وَاجْعَلْ سُجُودَكَ أَخْفَضَ مِنْ رُكُوعِكَ)[١] پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەردانی یەکێك لە یاوەرانی نەخۆشی کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دیتی سەرینێکی بۆ خۆی داناوە تا لە کاتی سوجدەیدا ناوچەوانی بخاتە سەر، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەرینەکەی لاداو فەرمووی: ئەگەر توانیت سەر بکەرە سەر ئەرزەکە، ئەگەر نا هەر ئاماژە بکە بەسە، بەڵام ئاماژەی سوجدەکەت (کە بە سەر دانەواندنە) کەمێك نزمتر کە لە ئاماژەی رکوعەکەت..

---

[١] الطبراني: الكبير (١٢/٢٧٠)، البزار: كشف الاستار (١/٢٧٥) شێخی ئەلبانیش لە (سلسلة الصحيحة ٣٢٣)دا دەفەرموێ سەحیحە.. ریوایەتی ئیبنوعومەریش هەیە خوا لێیان رازی بێت کە شێخی ئەلبانی ئەویشی هەر لەوێدا بە سەحیح داناوە..

### ١٨ـ زۆر خەریکبوون بە لابردنی زیخ و چەوو بەردی شوێن نوێژەکەی:

دەشێت کابرا پێش نوێژ کردن، شوێنی نوێژەکەی رێك خات، وەك ئەوەی تاتەنوێژ تەرتیب بکات، یان زیخ و چەوو بەرد لاببات، یان درِك و گیای شوێنەکە برنێتەوە.. ئەگەر لە کاتی نوێژەکەشدا پێویستی بە رێکخستنەوەی تر هەبوو وەکو دەرهێنانی بەردێك یان درِکێك لە بن لاقی یان ئاستی دەموچاوی، بۆی هەیە لایدات، بەڵام بۆی نیە هەر پێوەی مەشغووڵ بێت، چونکە هەموو ملکەچی و هۆش و بیری خواپەرستیەکەی بەوەوە دەڕوات..

- سەیدنا موعەیقیب خوا لێی رازی بێت فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە کابرایەکی فەرموو کە لە کاتی سوجدە بردنەکەیدا شوێنی نوێژەکەی رێك دەخست: (إنْ كُنْتَ فَاعِلاً فوَاحِدَةً)[1] واتە: ئەگەر هەر وا دەکەیت، با یەکجار بێت..

- لە ریوایەتێکی تردا کە هەر شەش پێشەواکەی فەرموودە گێڕاویانەتەوە[2] پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: (لَا تمْسَحْ الْحَصَى، وَأَنْتَ تصَلِّي، فَإِنْ كُنْتَ لَا بُدَّ فَاعِلًا، فوَاحِدَةً)[3] واتە: لەو کاتەی خەریکی نوێژکردنیت، بەردووچکەو چەو مەسرە (دەیانسرِی لە خۆڵ و تۆز)، ئەگەر هەر دەشیکەیت، جارێك بیکەو بەس..

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە سوجدەی ببردایەو خۆڵ و تۆز، یان قوڕ بە ناوچەوانی پیرۆزیەوە بنوسایە خۆی بە

---

[1] بوخاری (١٢٠٧)، موسلیم (٥٤٦).

[2] الزیلعی: نصب الرایه فی تخریج أحادیث الهدایه /کتاب الصلاه (٢/٩٩).

[3] ئەبوداوود (١/٢٤٩)، نەوەوی رەحمەتی دەفەرموێ: (اسنادە علی شرگ مسلم).

لێکردنەوەیەوە مەشغووڵ نەدەکرد..

- سەیدنا ئەبو سەعیدی خودری خوا لێی رازی بێت دەڵێ: پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینی سوجدەی لە شوێنێکی قوڕاودا برد، قوڕاوێتیەکەم بە ناوچەوانی پیرۆزیەوە بینی[١]..

- سەیدنا ئیبنومەسعوود خوا لێی رازی بێت دەڵێ: چوار ڕەفتار هەن بە لووت بەرزی دەژمێررێن:...لەوانە: سڕینی ناوچەوان لەو تۆزو خۆڵەی کە لە کاتی سوجدبردندا پێوەی دەنوسێت[٢]..

## ١٩ـ پێشکەوتنی ئیمام:

ناشێت لە هیچ بزاوت و سرەوتێکدا مەئمووم پێش ئیمامەکەی بکەوێت، ئەمە خەتەرە.. هەندێك لە شەرعناسانی وەکو ئیمامی ئیبنوحەجەری هەیتەمی لە کتێبی (الزواجر عن اقتراف الكبائر)ەکەی خۆیدا بە گوناحی گەورەی هەژمارد کردووە! چونکە هەڕەشەی سەختی پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم لەسەرە..

- پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: (أمَا يَخْشَى أحَدُكُمْ إذَا رَفَعَ رَأسَهُ قَبْلَ الْإمَامَ أنْ يُحَوِّلَ اللَّهُ رَأسَهُ رَأسَ حِمَارٍ، أوْ يُحَوِّلَ اللَّهُ صُورَتَهُ صُورَةَ حِمَارٍ)[٣] واتە: ئەرێ ئەو کەسەتان کە پێش ئیمام سەری لە سوجدە بەرز دەکاتەوە لەوە ناترسێت خوای گەورە سەری وەکو سەری گوێدرێژ لێ بکات؟! یان بیخاتە سەر شێوەی کەر؟!

---

[١] بوخاری (٦٦٩)، موسلیم (١١٦٧).

[٢] بەیهیقی (٢٨٥/٢)، شێخی ئەلبانی لە (ارواء ٩٧/١)دا بە سەحیحی ناساندووە.

[٣] بوخاری (٦٩١)، موسلیم (٤٢٧).

## ٢٠ـ نوێژ لە کاتی ئامادەبوونی خواردن یان کاتی تەنگەتاویی:

کە خورادنێکی خۆش دانراوەو کاتەکەش کاتی نوێژە، دەشێت نوێژەکە مادام کاتی ماوە، دواخرێت، چونکە نوێژکردن نە لە کاتی ئامادەبوونی خواردندا دەکرێت، نە لەو کاتانەدا کە کەسێك تەنگەتاوەو پێویستی بە چوونە سەر ئاوە (چوونە ئاودەست)..

ـ عائیشە خان خوا لێی رازی بێت دەڵێ: گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (لاصَلاةَ بِحَضْرَةِ الطَّعَامِ وَلا وَهُوَ يُدَافِعُهُ الأخْبَثانِ)[1] واتە: نوێژ بە ئامادەبوونی خواردن ناکرێت، هەروەها لە کاتێکدا کە میزو پیسایی تەنگیان (بە کابرا) هەڵچنیووە؟؟

★ ★ ★

[1] موسلیم (٥٦٠)، ئەبوداوود (٨٩).

# ئەو رەفتارانەی نوێژدا بەتاڵ دەکەنەوە

## ئەوانەی نوێژ بەتاڵ دەکەنەوە

## ( مبطلات الصلاة )

**١ ـ دڵنیا بوون لە نەمانی دەستنوێژ:**

کابرایەك کە گومانی لە نەمانی دەستنوێژی خۆی دەکرد، سکاڵای هێنایە لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و بۆیان پرسی کە چی بکات؟ فەرمووی: (لا يَنفَتِلُ حَتى يَسْمَعَ صَوتاً أو يَجِدَ رِيحَاً)[١] واتە: نوێژەکەی واز لێ نەهێنێت تا گوێی لە دەنگێك دەبێت یان بۆنێك دەکات.. یەعنی بایەکی دەنگداری لێ دەبێتەوە کە خۆی هەستی پێ دەکات، یان بۆنی بای بێ دەنگی خۆی بەسەردا دێتەوە.

**٢ ـ وازهێنان لە یەکێك لە مەرجەکان یان لە روکنەکانی نوێژ بە بێ عوزری شەرعی:**

چونکە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی کابرای نوێژهەڵەی بە راست نەزانی، لەبەر ئەوەی مەرج و ئەرکانی فەوتاندبوو، یەکێکیش لەوانە سرەوتن بوو.. بۆیە پێی فەرموو: (ارْجِعْ فصَلِّ فإنَّكَ لَمْ تصَلِّ)[٢] واتە: بگەڕێرەوە نوێژەکەت بکە، چونکە تۆ نوێژت نەکرد..

---

[١] بوخاری (١٣٧)، موسلیم (٣٦١).
[٢] بوخاری (١١/٣١، ٤٦٧)، موسلیم (٢/١٠).

### ٣ـ خواردن یان خواردنەوە بە ئەنقەست:

شەرعناسان کۆڕا (ئیجماع)یان لەسەر ئەمە هەیە. ئیبنولمونزیر دەڵێ: ئەهلی عیلم لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە هەر کەسێك لە نوێژدا بە ئەنقەست شتێکی خوارد یان خواردەوە، نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوەو دەبێت بیکاتەوە.. بە لای جمهورەوە نوێژی فەرزو سووننەت لەم حوکمەدا وەکو یەکن..

### ٤ـ قسەکردن بە ئەنقەست کە لە بەرژەوەندی نوێژەکە نەبێت:

سەیدنا ئەنەس خوا لێی رازی بێت دەڵێ: سەرەتا کە نوێژمان دەکرد، قسەمان لە ناو نوێژەکەدا لەگەڵ ئەوانەی تەنیشتمان دەکرد، تا ئەو ساتەی فەرمایشتی خوا هاتە خوارەوە کە دەفەرموێ: ﴿وَقُومُواْ لِلَّهِ قَـٰنِتِينَ﴾البقرة/٢٣٨ واتە: ملکەچانە لەبەر خاتری خوا بۆ نوێژەکان هەستن.. ئەوەش فەرمانی بێدەنگبوون بوو کە نەدەبوو ئیتر قسەی تێدا بکەین[١]..

پێشتریش ئەو فەرموودەمان هێنایەوە کە سەیدنا معاویەی کوڕی حەکەمی سولەمی خوا لێی رازی بێت کە دەڵێ: (صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَعَطَسَ رَجُلٌ إِلَى جَنْبِي، فَقُلْتُ: يَرْحَمُكَ اللَّهُ، فَرَمَانِي الْقَوْمُ بِأَبْصَارِهِمْ، فَقُلْتُ: وَاثُكْلَ أُمِّيَاهُ، مَا لِيَ أَرَاكُمْ تَنْظُرُونَ إِلَيَّ وَأَنَا أُصَلِّي، فَجَعَلُوا يَضْرِبُونَ بِأَيْدِيهِمْ عَلَى أَفْخَاذِهِمْ يُصَمِّتُونِي فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَاتَهُ، فَبِأَبِي وَأُمِّي مَا رَأَيْتُ قَبْلَهُ وَلَا بَعْدَهُ أَحَدًا أَحْسَنَ تَعْلِيمًا مِنْهُ، وَاللَّهِ مَا كَهَرَنِي، وَلَا سَبَّنِي، وَلَا ضَرَبَنِي، وَلَكِنَّهُ قَالَ لِي: إِنَّ صَلَاتَنَا هَذِهِ لَا يَصْلُحُ فِيهَا شَيْءٌ مِنْ كَلَامِ النَّاسِ، إِنَّمَا هُوَ الصَّلَاةُ، وَالتَّسْبِيحُ، وَالتَّحْمِيدُ،

---

[١] بوخاری (١٢٠٠)، موسلیم (٥٣٩).

وَقِرَاءَةُ الْقُرْآنِ)[1] واتە: لە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژم دەكرد، كابرایەك لە تەنیشتمەوە پژمی، منیش ووتم: یرحمك الله، ئیتر هەر هەموو خەڵكەكە چاویان تێبڕیم، ووتم: هەی دایكم رۆڵەڕۆڵم بۆ بكات، ئەوە بۆچی وا داوتانمەتە بەر تیلەی چاو كە لە نوێژیشدام؟! بینیم خێرا خێرا بە چەپۆك بە رانی خۆیان دەكێشن تا بێدەنگم كەن.. كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی تەواو كرد ـ دایك و باوكم بە قوربانی بێت، قەت پێش ئەوو دوای ئەویش بۆ فێركردن مامۆستای وام نەبینیووە ـ نە سەرزەنشتی كردم، نە قسەی پێ ووتم، نە لێیدام، بەڵكو فەرمووی: نوێژەكانمان نابێت هیچ قسەیەكی خەڵكی تێبكەوێت، بەڵكو هەر دوعاو سوبحانەالله كردن و سوپاس و ستایش كردنی خوای گەورەو قورئان خوێندنی تێدا دەووترێت..

### ٥ ـ پێكەنینێكی وا كە دەنگ دروست كات:

ئیبنولونزیر رەحمەتی خوای لێ بێت كۆڕای شەرعناسان نەقڵ دەكات كە نوێژ بە پێكەنین بەتاڵ دەبێتەوە، چونكە سوكایەتی كردنە بە نوێژ.. ئەگەر نوێژ بە قسەكردنی ئاسایی بەتاڵ بێتەوە، حەتمەن بە پێكەنین بەتاڵ دەبێتەوە چونكە پێكەنین بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ خواپەرستیدا ناسازێت..

ئیبنو ئەبی شەیبە لە زۆر یاوەرەوە فەتوای ئەو حوكمەی نەقڵ كردووە، وەكو سەیدنا جابرو ئەبوموسای ئەشعەری خوا لێیان رازی بێت[2]..

---

[1] موسلیم (٥٣٧)، ئەبوداوود (٩٣٠)، ئەحمەد (٢٣٢٥٠)، داریمی (١٥٠٢).
[2] ابن أبي شيبة: المصنف (٣٨٧/١).

ئەم حوکمە زەردەخەنە ناگرێتەوە، هەرچەندە ئەمیش مەکرووهە بەڵام نوێژی پێ بەتاڵ نابێتەوە.. چونکە سەیدنا جابر خوا لێی رازی بێت دەڵێ: زەردەخەنە نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە بەڵکو قاقای پێکەنینە کە نوێژەکە دەبڕێت..

★ ★ ★

## قنووت لە نوێژی فەرزدا

خوێندنی قنووت لە نوێژی فەرزی بەیانیدا یەکێکە لەو مەسەلە خیلافیانەی راجوێییەکی زۆری لە ناو شەرعناساندا هەیە[١]، دەتوانین پوختەی بۆچوونی شەرعناسان لەم باسەدا بکەینە چوار پۆل:

### ١ـ قنووت سوننەتێکی موئەککەدەیەو باشتر وایە بەردەوام بخوێندرێت:

ئەمە مەزهەبی ئیمامی مالیك و ئیمامی شافیعیە[٢]، بەلگەشیان ئەمانەیە:

١ ـ سەیدنا بەرائی کوڕی عازیب خوا لێی رازی بێت دەڵێ: (أنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ كانَ يَقْنُتُ في الصُّبْحِ و المَغْرِبِ)[٣] واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە نوێژی فەرزی بەیانیان و شێواندا قنووتی دەخوێند..

٢ ـ لە سەیدنا ئەنەسیان پرسی خوا لێی رازی بێت: ئایا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە نوێژی بەیانیاندا قنووتی دەخوێند؟ فەرمووی: بەڵێ. پرسییان: قنووتی پێش رکوع دەخوێند یان دوای رکوع؟ فەرمووی: دوای رکوع بە ماوەیەکی کەم[٤]..

---

[١] کتێبێکی تایبەتی لەسەر قنووت و راجوێیی شەرعناسان هەیە، کۆکراوەی زۆرینەی بۆچوونەکانە، بە ناوی: (إسفار الصبح في قنوت الصبح) نوسەرەکەی مەجدی عبدالهادی میسرییە..

[٢] المدونة (١/١٠٠)، الاستذكار (٦/٢٠١)، الأم (٨/٨١٤)، المجموع (٣/٤٩٤)، الأذكار (٦٩).

[٣] موسلیم (٦٧٨)، ترمزی (٤٠١)، ئەبوداوود (١٤٤١)، نەسائی (٢/٢٠٢)..

[٤] بوخاری ١٠٠١)، موسلیم (٦٧٧).

٣ ـ سەیدنا ئەبوهورەیرە خوا لێی رازی بێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لە نوێژی بەیانیاندا قورئانی دەخوێند پاشان دەچووە ركووع، ئینجا كە سەری لە ركوع بەرز دەكردەوە دەیفەرموو: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ) پاشان هەر وا بە پێوە دەمایەوەو دەیفەرموو:(اللَّهُمَّ! أَنْجِ الْوَلِيدَ بنَ الوليدِ وَسَلَمَةَ بْنَ هِشَامٍ وعَيَّاشَ بنَ أبي رَبِيعَةَ، والْمُسْتَضْعَفِينَ مِن المؤمنينَ، اللَّهُمَّ! اشْدُدْ وَطْأَتَكَ عَلَى مُضَرٍ، وَاجْعَلْهَا عَلَيهِمْ كَسِنِيِّ يُوسُفَ. اللَّهُمَّ! الْعَنْ لِحْيَانَ وَرَعْلاً وَذَكْوانَ وَعَصِيَّةَ، عَصَتِ اللهَ وَرَسُولَهُ..) واتە: خوایە وەلیدی كوڕی وەلیدو سەلەمەی كوڕی هیشام و عەییاشی كوڕی ئەبو رەبیعەو موستەزعەفی موسوڵمانان قوتار كە.. خوایە زەبرو زەنگی خۆت بخە سەر هۆزی موزەر، خوایە ساڵانیان (كاتەكانی ژینیان) لێ بكە بە ساڵە گرانیەكانی زەمانی یوسف، خوایە لەعنەت كە (لەعنەت: دوورخستنەوەیە لە رحمەتی خوا) لە هۆزەكانی لیحیان و رەعل و زەكوان و عەسییە كە كە لە خواو پێغەمبەری خوا یاخی بوون.. پاشان كە ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە كە دەفەرموێ: ﴿ لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ﴾آل عمران/١٢٨ واتە: تۆ هیچی ئەم مەسەلەیت بە دەست نیە، هەقت نەبێت، لێیان خۆش بێت یان سزایان دات، ئەوە ئاشكرایە كە ئەوانە ستەمكارن.. بیستوومە[١] كە لەوەو دوا

---

[١] ئەوە وەكو ئیمامی ئیبنو حەجەری عەسقەلانی بەڕێز لە (فتح الباری ٧٥/٨) دا روونی كردۆتەوە: ئەوە ئیمامی زوهریە وا دەفەرموێ، كە شەرعناسێكی تابعینەو یەكێكە لە گێڕەوانی فەرموودەكە..

پێغەمبەری خواش صلى الله عليه وسلم وازی لە دوعا لێکردنەکە هێنا[١]..

٤ـ سەیدنا ئیبنوعومەریش خوا لێیان رازی بێت ریوایەتێکی تری وەکو ئەوەی پێشووی هەیە کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە رکاتی دووەمی نوێژی بەیانیاندا کە سەری لە رکوع بەرز دەکردەوە دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ! الْعَنْ فُلاناً وَفُلاناً وَفُلاناً.. بَعْدَمَا يَقُولُ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ) تا ئەو کاتەی ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە کە دەفەرموێ: ﴿ لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴾آل عمران/١٢٨) [٢].

خاوەنی ئەم بۆچوونە دەڵێن: دیارە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەسەر خوێندنی قنووت لە نوێژی بەیانیدا بەردەوام بووە.. هاتنە خوارەوەی ئایەتەکەیە کە کۆتایی بە خوێندنی قنووتەکە هێناوە[٣].. قسەکەی زوهریش لێکدانەوەیەکە نەفی ئەوە ناکات کە دوعاکردنەکە بەردەوام بووبێت[٤]، چونکە دەشێت وازی لە لەعنەت کردنەکە هێنابێت و لەسەر قنووت خوێندنەکەی بەردەوام بووبێت..

---

[١] بوخاری (٨٠٤)، موسلیم (٦٧٥).

[٢] بوخاری (٤٥٥٩).

[٣] الأم(٨/٨١٥)، المجموع (٣/٥٠٥)، ابن خزيمة(١/٣١٦)، معالم السنن(١/٢٥٠)، إسفار الصبح(ل ٥٢).

[٤] ابن حجر: فتح الباري (٨/٧٥)، البيهقي:معرفة السنن والآثار (٢/٧٤).

## ٢ـ قنووت سوننەتێکی مەنسووخەو خوێندنی بیدعەیە :

ئەمە مەزهەبی ئیمامی ئەبوحەنیفەیە، بەڵگەشی ئەمانەیە:

١ ـ ئەبو مالیکی ئەشجەعی دەڵێ: ووتم: ئەرێ بابەگیان! جەنابت لە دوای پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم هەروەها لە دوای ئەبوبەکرو عومەرو عوسمانەوە نوێژت کردووە، ئا لەم کوفەیەدا نزیکەی پێنج ساڵی شلە دوای عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە نوێژت کرد،ئایا ئەم پێشەوایانە قنووتیان لە نوێژی بەیانیدا دەخوێند؟ فەرمووی: بە راستی کوڕی خۆم ئەمەیان داهێناوە[1]..

شەرعناسانی بەرامبەر وا ئەم بەڵگەیان رەت کردۆتەوە کە باوکی ئەبو مالیکی ئەشجەعی کە ناوی تاریقی کوڕی ئوشەیمە خوا لێی رازی بێت یەکێکە لەو یاوەرانەی کەمیان لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم گێڕاوەتەوەو واش نەناسراوە کە هاوڕێیەتی پێغەمبەری خوای صلى الله عليه وسلم کردبێت. بۆیە دوور نیە ئەو قنووت خوێندنەی لا رۆشن نەبووبێت، خۆ زۆر باسی لەوەش بەناوبانگتر هەیە کە لای گەورەیاوەرانێك رۆشن نەبووە یان نەیانبیستووە کە نزیکتربوون لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم..

٢ـ ئیبنوعومەر خوا لێیان رازی بێت دەیفەرموو: کەسم نەبینیووە خوێندبێتی[2].. واتە کەسی نەدیووە قنووتی لە نوێژی بەیانیدا خوێندبێت!!

---

[1] ترمـــزی (٤٠٢)، ئیبنوماجـــە (١٢٤١)، بـــەیهیقی (٢/٢٠١) فەرمووشـــیەتی کـــە ســـەنەدەکەی سەحیحە..

[2] عبدالرزاق: المصنف (٤٩٥٤) سەنەدەکەشی سەحیحە..

### ٣ـ قنووت لە كاتی هاتنی موسیبەتدا دەخوێندرێت:

واتە كاتێك كارەساتێك، بەڵاو موسیبەتێك روو لە گۆمەڵێك لە موسوڵمانان دەكات دوعای قنووتیان لە نوێژەكاندا بۆ دەخوێندرێت.. ئەمەش مەزهەبی ئیمامی ئەحمەدو هەندێك لە شەرعناسانی دواییی حەنەفیەكانە، بەڵگەشیان فەرموودەكەی سەیدنا ئەنەسە خوا لێی رازی بێت كە دەڵێ:

ـ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قنووتی نەدەخوێند مەگەر موسیبەتێك رووی بكردایەتە موسوڵمانان، ئەو كاتە دوعای بۆ دەكردن یان دوعای لە خەڵكانێك دەكرد[١]..

### ٤ـ خوێندن و نەخوێندنی قنووت لە نوێژی بەیانیدا شیاوە:

ئەوەش بۆچوونی سوفیانی سەوری و تەبەری و ئیبنوحەزمو ئیمامی ئیبنولقەییمە[٢]..

<u>**پەسەندترین بۆچوونیان:**</u> گومان لەوەدا نیە كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قنووتی لە نوێژی بەیانی و غەیری بەیانیدا خوێندووە، بەڵام وا پێناچێت ئەوە بسەلمێت كە بەردەوام لە هەموو نوێژێكی بەیانیدا قنووتی خوێندبێت، چونكە ئەوە نەدەبووە شتێك یاوەرانی تێدا راجوێ بن، ئەگەر وا بوایە كە هەموو رۆژێك لەبەرچاوی سەدانیان دووبارە دەبۆوە، نامومكین بوو سەد یاوەر بە متەواتری ریوایەتیان نەكردایە.. بۆیە وام بۆ دەركەوت كە پێغەمبەری خوا صلی الله

---

[١] ئیبنوخوزەیمە (٦٢٠). سەنەدەكەی زەعیفی تێدایە..
[٢] تهذیب الآثار (٣٣٧/١)، المحلی (١٤٣/٤)، زاد المعاد (٢٧٤/١)..

علیه وسلم لە کاتی رووداني پێشهاتە سەختەکاندا (کە پێی دەوترێت نازیلە) قنووتی خوێندووە.. بۆیە دەبینین پێشەوایەکی وەکو سەیدنا عومەری کوڕی خەتتابیش خوا لێی رازی بێت لو کاتانەدا قنووتی ئاوا خوێندووە: (..وَانْصُرْهُمْ عَلَى عَدُوِّكَ وَعَدُوِّهِمْ، اللَّهُمَّ الْعَنْ كَفَرَةَ أَهْلِ الكِتابِ.... اللَّهُمَّ خَالِفْ بَينَ كَلِمَتِهِمْ، وَزَلْزِلْ أَقْدَامَهُمْ، ،أَنْزِلْ بِهِمْ بَأْسَكَ الَّذي لا تَرُدُّهُ عَنِ الْقَومِ المُجْرِمينَ)[١]

## شوێنی قنووت خوێندن:

ئەوەی کە فەرموودەکانی لای زۆر لە یاوەرانی وەکو سەیدنا ئەنەس و ئیبنو عومەرو ئەبوهورەیرەو ئەوانی تر هەیە هەمووی ئەوە دەسەلمێنن کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە دوای هەستانەوەی لە رکوعی رکاتی دووەمی نوێژی بەیانی قنووتی خوێندووە.. ئەمەش بۆچوونی ئیمامان شافیعی و مالیك و ئەحمەدو ئیمامی ئیسحاقە.. هەرچەندە بۆچوونێکی تری ئیمامی مالیك هەیە کە دەڵێ: خوێندنی قنووت پێش رکوعە.. دەشیباتەوە سەر سەیدنا عومەرو سەیدنا عەلی خوا لێیان رازی بێت.. بەڵام وا دیارە هەردوو ریوایەتەکەی پێ پەسەندبووە، بەڵام فەتوای لەسەر یەکەمیان زانراوترە[٢]..

## قنووت لە پێنج نوێژەکەدا:

کاتی هاتنی بەڵاو موسیبەت بەسەر موسوڵمانانندا سووننەتە دوعای قنووت لە هەر پێنج نوێژەکاندا بخوێندرێت، چونکە لە رێی سەیدنا

---

[١] ابن القیم: كتاب الصلاة (ل ١٢٠).

[٢] كمال ابن السید سالم: صحیح فقه السنة (١/٣٦٧).

ئیبنوعەبباسەوە خوا لێی رازی بێت ئەوە سەلمێنراوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ ماوەی مانگێك لەسەر یەك لە هەموو نوێژەکاندا قنووتی دەخوێند، لە دوای (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) دوعای لە بەنی سولیم و رەعل و زەکوان و عەسییە دەکردو یاوەرانیش لە دوایەوە ئامینیان دەکرد[1]..

## ئادابی قنووت خوێندن

١ـ ئیمام دوعاکان بە دەنگی بەرز دەخوێنێت چونکە وەکو لە فەرموودەکانی لای سەیدنا ئەبو هورەیرەو ئیبنوعەبباس و ئەنەس خوا لێیان رازی بێت دەردەکەوێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وای دەکرد.

٢ـ مەئموومەکان بە ووتنی ئامین وەڵامی دوعای ئیمامەکە دەدەنەوە..ئیبنوقودامەی مەقدیسی لە موغنیەکەی خۆیدا دەڵێ: راجوێییم تێدا نەدیووە..

٣ـ ئیمام و مەئموومەکان لە کاتی خوێندنی قنووتدا دەستیان وەکو شێوەی دوعاکردن و پاڕانەوە بەرەو ئاسمان بەرز دەکەنەوە.. ئەوەش رای جمهوری شەرعناسانە: ئیمامان ئەبو حەنیفەو شافیعی و ئەحمەدو ئیسحاق و ئەوانی تریش، جگە لە ئیمامی مالیك کە دەڵێ: دەست بەرز ناکرێتەوە، بەڵام دیارە رای جمهوور پەسەندترە[2]..

---

[1] ئیبنوخوزەیمە (٦١٨)، ئیبنولجاروود (١٩٧)، ئەحمەد (٣٠١/١)دەفەرموێ: سەنەدەکەی حەسەنە.

[2] الاوسط (٢١٢/٥)، المغني (٥٨٤/٢)، المجموع (٤٩٩/٣)..

هەندێك باسی تر هەیە لەسەر قنووت لەگەڵ باسی وتردا دێت ان شاء الله..

★ ★ ★

به پشتیوانی خوا وا بەرگی یەکەم تەواو بوو

بەرگی دووەم بە نوێژە سوونەتەکان دەست پێ دەکات

ان شاء الله

# سەرچاوەکان


سەرچاوەکانی ئایاتی ئەحکام

ـ أحكام القرآن، محمد بن عبدالله الاندلسي (ابن العربي) دار الكتب العلمية ط١ ٤ جزء.

سەرچاوەکانی فەرموودەی ئەحکام

ـ نيل الاوطار، محمد بن علي الشوكاني دار الحديث ١٤١٣ هـ / ١٩٩٣ ط١ ٨ جزء.

ـ نصب الراية في تخؤيج أحاديث الهداية، جمال الدين عبدالله بن يوسف الزيلعي دار الحديث ١٤١٥ هـ / ١٩٩٥ ٦ جزء.

ـ التلخيص الحبير، احمد بن علي محمد الكتاني العسقلاني مؤسسة قرطبة ١٤١٦ هـ/ ١٩٩٥ ط١ ٤ جزء.

شەرحەکانی فەرموودە

ـ تحفة الاحوذي في شرح سنن الترمذي، محمد بن عبدالرحمن بن عبدالرحيم المباركفوري دار الكتب العلمية ١٠ جزء.

ـ فتح الباري شرح صحيح البخاري، احمد بن علي بن حجر العسقلاني دار الكتب العلمية ١٤١٠ هـ/ ١٩٨٩ ١٣ جزء.

ـ شرح النووي على صحيح مسلم، يحيى بن شرف الدين ابو زكريا النووي دار الخير ١٤١٦ هـ/ ١٩٩٦ ٦ جزء.

ـ عون المعبود في شرح سنن أبي داود، محمد شمس الحق العظيم آبادي دار الفكر ١٤١٥هـ/ ١٩٩٥ ١٤ جزء.

- المصنف، عبدالله بن محمد ابـن ابـي شـيبة ابـو بكـر دار الفكـر ١٤١٤هـ/ ١٩٩٤ ٨ جزء.

- المصنف، ابوبكر عبدالرزاق بن همـام الصـنعاني المكتـب الاسـلامي ١٤٠٣ هـ/ ١٩٨٣ ١١ جزء.

مەزهەبی حەنەفی

- البحر الرائق شرح كنز الدقائق، زين الـدين بـن ابـراهيم (ابـن نجـيم ٩ دار الكتاب الاسلامي ط٢ ٨ جزء.

- بدائع الصنائع في ترتيـب الشـرائع، ابـوبكر مسعود احمـد الكاسـاني دار الكتب العلمية ١٤٠٦ هـم ١٩٨٦ ط٢ ٧ جزء.

- رد المحتار على الدر المختار، محمد امين بن عمر بن عابدين دار الكتـب العلمية ١٤١٢ هـ/ ١٩٩٢ ٦ جزء.

- فتح القدير، كمال الدين بن عبدالواحد بن الهمام دار الفكر ١٠ جزء.

مەزهەبی مالیكی

- المدونة، مالك بـن أنـس الاشـجعي (ئیمـامی مالیـك) دار الكتـب العلميـة ١٤١٥ هـ/ ١٩٩٥ ط١٨ ٤ جزء.

- منـح الجليل شرح مختصر خليل، محمد بـن احمـد بـن محمـد (علـيش) دارالفكر ١٤٠٩هـ / ١٩٨٩ ٩ جزء.

مواهب الجليل في شرح مختصر خليل، محمد بن محمـد بـن عبـدالرحمن (حطاب) دارالفكر ط٢ ١٤١٢ هـ/ ١٩٩٢ ٦ جزء..

- حاشية الدسوقي على الشرح الكبير، محمد بن احمد بن عرفة الدسوقي دار احياء الكتب العربية ٤ جزء.

مەزهەبی شافیعی

ـ الأم، محمد بن ادريس الشافعي (ئيمامی شافيعی) دار المعرفـة ١٤١٠ هـ / ١٩٩٠ ٨ جزء.

ـ تحفة المحتاج في شرح المنهاج، احمد بن محمد بن علي بن حجر الهيتمي دار احياء التراص العربي ١٠ جزء.

ـ نهاية المحتاج الى شرح المنهاج، محمد بن شهاب الدين الرملي / دار الفكر ١٤٠٣ هـ / ١٩٨٤ ٨ جزء.

ـ المهذب في فقه الامام الشافعي، ابو اسحق ابراهيم بـن علـي الشيرازي دار المعرفةطا ١٤٢٤ هـ/٢٠٠٣ ٣ جزء

مەزهەبی حەنبەلی

ـ الإنصاف، علي بن سليمان المرداوي دار إحياء التراث العربي بـلا تـاريخ ١٢ جزء.

ـ الفروع، محمد بن مفلح بن محمد المقدسي عـالم الكتـب ١٤٠٥ هـ/ ١٩٨٥ ط ٤ ٦ جزء.

ـ كشاف القناع عن مـتن الاقنـاع، منصـور بـن يـونس البهـوتي دار الفكـر ١٤٠٢ هـ / ١٩٨٢ ٦ جزء.

ـ الشـرح الممتـع علـى زاد المسـتقنع، محمـد بـن صـالح العثـيمين دار ابـن المديني / الجزائر طا ١٤٢٦ هـ/ ٢٠٠٥.. ٦ جزء

ـ شرح منتهى الارادات ، منصور بن يونس البهوتي عالم الكتب ٣ جزء

مەزهەبی زاهیری

ـ المحلى بالآثار، علي بن احمد بن سعيد بن حزم دار الفكر ١٢ جزء.

سەرچاوەکانی بەراوردی مەزهەبەکان

ـ المجموع، محي الدين بن شرف النـووي - دار النشـر: دار الفكـر، بـيروت، ١٩٩٦-١٤١٧، الطبعة: الأولى

ـ المغني، موفق الـدين عبـدالله بـن احمـد بـن قدامـة المقدسـي دار احيـاء التراث العربي ١٤٠٥ هـ / ١٩٨٥ ط١ ١٠ جزء.

سەرچاوەکانی فەتوا

ـ مجموع الفتاوى، تقي الدين بن تيمية مجمع الملك فهد ١٤١٦ هـ/ ١٩٩٥ـ ٣٧ جزء.

ئوسوڵی فیقھ و ڕێساکا فیقهیەکان

ـ الآداب، لأبي بكر أحمد بن الحسين بن علي البيهيقي ت ٤٥٩ هـ تحقيـق محمد عبدالقادر احمد عطا ـ ط دار الكتب العلمية، الاولى ١٤٠٦ هـ / ١٩٨٦ م.

ـ الآداب الشـرعية والمـنح المرعيـة، لشـمس الـدين أبـي عبـدالله محمـد بـن مفلح المقدسي الحنبلي ت ٧٦٣ هـ، تخريـج و تعليق أبي معاذ أيمن بـن عـارف الدمشقي ـ ط دار الكتب العلمية، الاولى ١٤١٧ هـ / ١٩٩٦م.

ـ الإجماع، لأبي بكر محمد بن ابراهيم بـن المنـذر النيسـابوري ت ٣١٨ هـ، تحقيق أبي حماد صغير أحمد بـن محمـد حنيـف ـ ط دار طيبـة، الاولى ١٤٠٢ هـ / ١٩٨٢ م.

# ناوەڕۆك